# دیوانی نالی

.. مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی ..

لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی

مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم

محمدی مەلا کریم

پیا چوەتەوە

# دیوانی نالی

« مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی »


لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی

مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم

محمدی مەلاکریم

پیا چوەنەوە

# پێشەکی

## ئەم لێکۆڵینەوەیەمان چۆن ئامادە کرد ؟

دەمێك بو خولیای لێکۆڵینەوەی دیوانی ( نالی ) و ( سالم )م لە کەللەدا بو . بە دل حەزم ئەکرد بەرهەمی ئەم شاعیرە هەلکەوتوانە بە شێوەیەکی پاك و پوختە و ڕێکخراو بخرێتە بەردەستی خوێندەوارانی بەڕێزی کورد و ، ڕۆشنبیرانی تازە پێگەیشتوی ئەم بەرەیە زیاتر لە کەلەپوری پڕ شانازیی ڕابوردومان بزانن ، تا لەبەر ڕۆناکیی رابوردودا و بە سود وەرگرتن لە ڕابوردو ، لە داڕشتن و نوسینی تازەدا سەرکەوتوتر بن و لە هەنگاو نانیاندا بەرەو ئەدەبی پێشکەوتوی دوارۆژ جێ پێیان پتەوتر بێ . دیارە سامانی هەر نەتەوەیەك لە هەر سوچێکەوە بیگری برتییە لە کەلەپوری ڕابوردو و دەسمایەی ئەمڕۆ و ڕونیی ئاسۆی بەرەو دوارۆژی . پشت گوێ خستنی هەر یەك لەم سیانە مانای پشت گوێ خستنی ڕێبازی زانیارییە و ، لە ڕێ هەلە کردن و سەرەسوڕە بەولاوە هیچی تیا نابێ .

چەند سالێك لەمەوبەر ڕۆژێکیان لەگەل باوکم باسی کەلەپوری ئەدەبیی کوردمان ئەکرد . تا باس هاتە سەر باسی ( نالی ) و ( سالم ) و ( کوردی ) و ئەو وەچەیەی شاعیرانی کورد . پێشنیارم لا کرد کە خەریکی دیوانەکەی ( نالی ) بێ . باوکم ، لەگەل ئەوەشدا کە وەختی ئەوەندە

نەبوو و زیاتر بە دەرز وتنەوەی فەقێکانیەوە خەریك بوو ، گفتی دامێ •
زۆری نەبرد لەسەر بناخەی نوسخە لەچاپدراوەکان دەستی بە کار کرد و
شەرحێکی لەسەر کۆکراوەی هەمو نوسخەکان نوسی • دارشتنەوە و
رێکخستنیشی خستە ئەستۆی من •

**من چیم کرد ؟**

پاش ئەوەی لێکۆلینەوەکەی باوکم هەمو خوێندەوە و سەرلەنوێ
بە نوسخە چاپەکانیدا رۆیشتمەوە ، بەتایبەتی چاپەکەی مامۆستا ( عەلی
موقبیل ) و ، پاش ئەوەی چەند جارێك چومە خزمەتی مامۆستای ئەدیب و
زانا ئەندامی کارای کۆری زانیاری کورد مامۆستا مەسعود موحەممەد و
بەرکولێکی بەردلگرم سەبارەت بە ( نالی ) و هەست و چەشنی ( نالی ) لا
کرد ، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە لێکۆلینەوەی شیعری ( نالی ) کارێکی
گەورەیە و بە پشتیوانیی تەنها نوسخە لەچاپدراوەکان ، بەتەواوی ناگاتە
ئەنجام • لەم رووەوە چومەوە خزمەتی باوکم و لەگەلی لە مەسەلەکە
کۆلیمەوە • بریارمان دا کارەکە راگرین و دەس‌کەین بە گەران بەدوای
نوسخەی دەستنوسدا ، بۆئەوەی هەمویان بەراورد بکەین و لەو بەراوردە
نوسخەیەکی تا بکرێ پاکتر و وردتر ئامادە بکەین • باوکم تەواوکردنی
کارەکەی لەسەر ئەم بناخەیە خستە ئەستۆی من •

منیش بەم پێیە دەستم کرد بە کار و لە ماوەی بەراورد و لێکدانەوەدا
قۆناغ بە قۆناغ ئەچومەوە لای باوکم و پێویستم بە هەر لێکدانەوەیەکی
نوێ بوایە یا هەر گیروگرفتێکم بهاتایەتە رێ لێم ئەپرسی • سەرەنجامی
کارمان ئەم بەرهەمە بو کە ئێستا ئەیخەینە بەردەستی خوێندەواران •

**ئەو نوسخانەی لە بەردەستما بوون :**

بێ‌گومان ئەو هەولەی مامۆستایان ( کوردی ) و ( مەریوانی ) و
( عەلی موقبیل ) و ( گیو ) لەپێناوی کۆکردنەوە و چاپ‌کردن و لەسەر
نوسینی دیوانی ( نالی )دا داویانە رەنجێکی مەردانەیە و جێگای شانازییە و

لەسەر ئێمە و بەرەی داهاتو پێویستە بایەخێکی تایبەتیان بۆ دانێن و لە لاپەڕەی مێژوی خزمەتی ئەدەبی کورددا بۆیان بنوسین . بەڵام لەڕاستیدا ئەم نوسخە چاپانە هیچیان کەلکی ئەوەیان پێوە نیە بە تەواوی بکرێنە بەڵگە بۆ لێکۆڵینەوە و مەعنا لێدانەوە . هەندێکیان تەنها ڕۆتوسێکی ڕوونن و لە هەندێکی‌تریاندا بێ لێکۆڵینەوە و چوونە بنج و بناوان ( بە ئارەزو ) دەستکاریی وشەکان کراوە .. ئەمانە بە جاری مەعنا لێدانەوە و ڕوون کردنەوەی وشەکاندا نەڕۆیشتون . تەنها مامۆستا عەلی موقبیل نەبێ ، کاری ڕاست بێ ، لە داوێنی لاپەڕەکاندا مەعنای هەندێ لە وشەکانی بە فارسی لێداوەتەوە ، بەڵام بەداخەوە ئەو وشانەش کە ئەو مەعنای لێداونەتەوە زوربەیان ئاسانن و لەوانەیە هەر خوێندەوارێکی زۆر پاش لەختێك تێبینی بیانزانێ !

لەمە بەولاوە ئەم چاپانە بە هیچ جۆرێ خۆیان لە قەرەی مێژو و بۆنە و هۆی وتنی هیچ غەزەل و قەصیدەیەك نەداوە کە نەختێ ڕوناکی بخاتە سەر هەندێ لای تاریکی ژیانی شاعیر و وتنی شیعرەکانی ( بێجگە غەزەلەکەی کە بەبۆنەی مردنی سلێمان پاشای بابانەوە وتویەتی کە هەمویان یەك لەدوای یەك تەئریخەکەیان بە حیسابی « ئەبجەد » نوسیوە ) .

گەڕان بەدوای دەستنوسدا :

لە زۆر کەسم بیستبو کە خوالێخۆش‌بو مامۆستا مەلا موحەممەدی چروستانی شیعری نالیی زۆر چاك زانیوە و نوسخەیەکی پاکی دیوانەکەی بە دەستخەتی خۆی ــ چروستانی ــ هەیە(١) . کە باوکم بۆ ئەم مەبەستە

---

(١) لەبارەی مێژوی ژیانی مامۆستا مەلا موحەممەدی چروستانییەوە ، کاك یەحیای کوڕی ئەم چەند دێڕەی بۆ نوسیوین :

خوالێخۆش‌بو ناوی ( مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا عەبدوڕڕەحیمی چروستانی )یە . ساڵی ١٣١٢ی کۆچی لە دێی ئابلاخ لە نزیکی سولەیمانی هاتوەتە دنیاوە و لە پێنج‌شەممەی ١٦ی ئاوجەژنانی ١٢٨٢ی کۆچی ، ڕێکەوتی نیسانی ١٩٦٢ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە و لە

ـ

نامەیەکی بۆ کاك ئەحمەدی کوڕی خوالێخۆشبوو نوسی کە ئێستە مودیر مالە لە ڕانیە لە پارێزگای سولەیمانی ، خوا هەقە و پیاوەتی نایێ بشاردرێتەوە ، وەك دلسۆزێکی بەهیممەت دیوانە نالیەکەی بۆ ناردین • جێگای شانازی و سەربەرزی و شایانی سوپاسە •

هەر لەم بابەتەوە سۆراخی نوسخەیەکی تریشمان کرد کە دەستوسی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عارفی چنگنیانی (٢) بوو • باوکم لەم بارەیەوە

---

سولەیمانی نێژراوە . بە منالی لای باوکی خوێندویەتی و پاشان بە فەقێیەتی چوەتە سولەیمانی و هەولێر و کۆیە . لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهاندا ، بۆ دەرباز بون لە سەفەربەر ، چوەتە ناوچەی ڕانیە و پژدەر و لەوێ بوە بە مەلا . پاش بۆردومان کردنی ڕانیە لەلایەن ئینگلیزەوە کە مالەکەی ئەویشی بەرکەوتوە ، چوە بۆ ناوچەی شارباژێر و سیوەیل و پاشان هاتوەتە سولەیمانی و تا کۆچی دوایی کردوە ، لەوێ بوە .

خوالێخۆشبوو پیاوێکی خۆش خولق و شیرین ڕەوشت و شاعیرێکی ورد بوە . بە کوردی و عەرەبی و فارسی شیعری هەیە . لە شیعرەکانیدا ڕێ و شوێنی نالیی گرتوە ، چونکە نالی زانێکی باش بوە و هۆگریی نالی کاری تێ کردوە .

(٢) کاك موعتەسەم لەبارەی مێژوی ژیانی باوکیەوە نامەیەکی درێژی بۆ ناردین ، وا لێرەدا پوختەیەکی ئەخەینە بەر چاو :

خوالێخۆشبو کوڕی مەلا قادری چنگنیانییە ، سالی ١٨٨٧ی زاینی لە دێی چنگنیانی سەر بە قەزای شارباژێر لە پارێزگای سولەیمانی لەدایك‌بوە و شەوی پێنج شەممەی ١٩٦٧/٥/١١ ، ڕێکەوتی ١ی سەفەری ١٣٨٧ لە سولەیمانی دنیای بەجێ‌هێشتوە و لە گردی سەیوان نێژراوە .

خوێندنی تا پلەی ناوەندی لای باوکی خوێندوە و پاشان بە فەقێیەتی چوەتە بانە لە کوردستانی ئێران و لە سولەیمانیش لای مامۆستا مەلا حوسەینی پیسکەندی خوێندویەتی . هەروەها لە کەرکوکیش خوێندویە . کە بوە بە مەلا هاتوەتەوە بۆ چنگنیان . لە سەردەمی شێخ مەحمودی ڕەحمەتیدا بۆ ماوەیەك بوە بە قازی و پاشان خۆی

نامەیەکی بۆ کاك موعتەصەمی کوڕی نارد • ئەویش زۆ ئەو دەستوسەی بۆ ناردین(٣) •

نامەوێ بیشـــارمەوە کەوا پێش ئـــەوەی نوســـخە دەستوسـەکانی خوالێخۆشبوان چروستانی و چنگنیانیمان بـــۆ بێ ، هیوایەکی گەورەم هەبو کــە بەهۆی ئەو دۆ نوسخەیەوە گــەلێ گیروگرفتی لێکۆلینەوەمان بۆ ئاسـان بێ ، چونکە هەر لە زووەوە ناوبانگی شیعر دۆستی و ئەدیبی ئەو دۆ ذاتەم بیـستبو • بێجگە لەوە کە خۆم سالی ١٩٥٣ بە میوانی چۆبۆمە دێی چنگنیان بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا عارف و بۆم دەرکەوتبو کەوا سەرەڕای پایەی بەرزی لە زانـــتە ئاینیەکاندا فارسیزانێکی وریا و ئەدەب دۆستێکی ورد و خـــەت خۆشێکی نایابیشـــە • ئەمانە هــەمو کۆلێ هیـــوایان تێدا بۆژاندمەوە و ، لـــە دلی خۆمدا وامدانا کە دەستنوسی ئـــەم دۆ مامۆستا زەحمەتیە پڕبانـــە لە داوێن و پەراوێز و ، گەلێ وشـــەی قورسیان ڕۆن کردوەتەوە و دوریش نیە هەندێ لایـــەلی وشە ئارایشیان خستبێتە ڕۆ • بەلام بەداخـــەوە وەك من دامنابو وا نەبو • ئەو هەلبەســـتە جوانانە بێ بەرگ و ڕۆت و قۆت نوسرابۆنەوە • بەلام لەوەدا لـــە چاپەکان جیا بۆن کە دۆ خوێندەواری ئەدەب دۆست بەپێی توانایـــان بە فارسی نوسیـــەکی جوان شیعرەکانیان نوسیوەتەوە و گەلێك لە نوســـخە چاپەکان زیاتر لە ڕاستیی ئەصـــلی وشەکان نزیك کەوتونەتەوە • جاروبـــاریش بە شێوەی

---

-

وازیلێهێناوە . لە ســـالی ١٩٥٤دا بوە بە مودەڕیس لـــە قزرابات ( سعدیە ) و تا ١٩٥٨ لەوێ بوە ، ئەنجا گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی و بوە بە مامۆستای مزگەوتی حاجی مەلا شەریف و تا مردن لەوێ بوە .

خوالێخۆشبو مەلایەکی زانا بو . زانیاری میرات ( فرائض )ی زۆر چاك ئەزانی . دەستێکی بالای لەفارسی زانیدا هەبو . موەممما زانێکی باشیش بو .

(٣) یارمەتیی کاك ئەحمەدی چروستانی و کاك موعتەصەمی چنگنیانی لە مەیدانی ڕاست کـــردنەوە و ڕۆن کـــردنەوەی ئەم دیوانـــەی نالیدا بە هاوکاریەکی گەورە دائەنرێ .

( نوسخە ) لەملاولای وشەکانەوە هەندێ وشە و نیوە بەیتیان نوسیوەتەوە، ئەوەش شتێکی بەبایەخ بو بۆ ئێمە •

من لەو باوەڕەدام ئەم دوو مامۆستایە ، بەتایبەتی مامۆستای چروستانی ــ لەبەرئەوەی لەگەڵ زاراوەی سولەیمانی و شێوەی قسەی ( نالی )دا زیاتر ئاشنا بوە ــ دیوانی ( نالی )یان زۆر باش زانیوە • بەڵام کەم و زۆر خۆیان بە مەعنا لێدانەوە و دەرخستنی جوانیی ئەدەبییەوە ماندوو نەکردوە • بۆچی ؟ نازانم !!

وەك بیستوم و لە دەستنوسەکەی مامۆستای چروستانییەوە لەکاتی خۆیدا بۆم دەرکەوت ، ئەم ذاتە لە خەستەخانەی ( تورتە ) لە بەغدا نەخۆش بوە و مامۆستا هەژاری موکریانیش(٤) لەوێ بوە و ، دیوانە دەستنوسەکەشیان لەبەردەستا بوە • کەچی چەند وشەیەکی کەم و کورت لەبێ هیچیان لەسەر ئەو نوسخەیە نەنوسیو •

من کە سەرێکی پانە خوێندەواریی مەلاکانی کوردستان دێنمەوە پێش چاوم و هەندێ لەو بەرهەمە گەورە و گرنگانەیان دێنمەوە یاد ، کە سەیری لێکۆڵینەوەی یەك لەسەریەکیان ئەکەم ، کە ئەبینم کتێبێکی نەحو یا صەرف یا مەنطیق یا بەلاغە یا کەلام یا فیقە و ئوصوڵی فیقە و فەلەکیات نەماوە لە کوردستاندا مامۆستا کوردە زاناکان شەرحێك یا حاشیەیەکیان لێ نەکردبێ،

---

(٤) لە یەکەم لاپەڕەی سپیی نوسخەکەدا مامۆستا هەژار نوسیویە :
« شەوی ٩٥٦/١/٢٩ لە خزمەتی مامۆستا مەلا موحەممەددا دیوانە نالییەکمان خوێندەوە ، زۆر مەمنون بوم کە زۆر ئیستیفادەم لە حوضوری کرد و لە موستەشفادا بوم بۆ بەمایەی فەیض و ئونس ــ هەژار » .
مامۆستای چروستانییش لە داوێنی ئەو چەند دێڕەوە ئەم بەیتەی نوسیوە :

« کە بێ ( ژێ ) هاوڕێیو ، بێ ( هێ ) کە ژاری
وەها وریا و ژیری ، چۆن هەژاری ؟ »
چروستانی

ئەگەمە ئەو باوەڕە کە لێ ئەکۆڵینەوەیـان لە نوسـینی کوردێ ، لە دیوانی یەکێکی وەك نالی ، خانی ، مەولەوی ، مەلای جزیری .. تاد ، هیی ئەوەیە نوسینی خۆمالیان لا بە بایەخ ئەبوە ، بۆیە گوێی خۆیان لێ کەڕ کردوە . ئەگینا ئەدەبی کوردی و شیعری کوردێ لە ئەدەب و شـیعری عەرەبی و فارسـی گرانتر ئەبـوە و وەك ئەوانیـان زۆر باش زانیـوە ، لەوپەڕی ئەمانیشەوە هاتونەتەوە !!

ئەی بۆ وەك مەعنا لێدانەوەی کتێب و دیـوانی زمـانە دراوسێکان مەعنایەکی ئەمانەشیان لێ نەداوەتەوە ، تا ئێمەش پـاش ئەوان بەشێوەیەکی ڕازاوەتر و لەبارتر تازەمان بکردنایەتەوە ؟ !

لێکدانەوە چیی پێویستە ؟

بۆ مەعنالێدانەوە و ڕوونکردنەوەی دیوانێکـی وەك دیوانی ( نالی ) ئەم شتانە پێویستن :

١ ــ ڕاست کردنـەوەی شـیعرەکان و گۆڕینی شـێوە نوسـیە فارسـیەکەیان بۆ شێوە نوسی کوردیی ئەمڕۆ . ئەمەش پێجگە لە کوردێ زانین پێویستی بە زانینی فارسی و شێوە نوسیی فارسی و زانینی عەرەبی و ئەو زاراوانەی زانیارە ئاینیەکان هەیـە کە دێنە ڕێـگای لێکۆڵەوە . کەمێکیش ئاگاداریی لـە مەرز و بـوم و ڕێ و شـوێنی ئەو شـاعیرە و کورتەیەکی ژیانو بەسـەرهاتی ژیانی پێویستە .

٢ ــ دڵنیابون لەوەی کە ئەو قەصیدەیە یا ئەو غەزەلە هیی ئەو خاوەن دیوانەیە و هیی یەکێکی‌تر نیە .

٣ ــ ئەو بۆنەیەی کە شیعرەکەی بۆ وتراوە .

٤ ــ دیاری کردنی ئەو سەردەمـەی کە شـاعیری تیـا ژیاوە و ئەو ڕێبازەی گرتویەتی و چەندی لـە خـەڵك وەرگرتوە و چەنـدی زیادەی خستوەتە سەر .

٥ ـ ئەو کەسەی کە لە دیوانێك ئەکۆڵێتەوە پێویست لیە شاعیر یـا ئەدیب بێ ، بەڵام پێویستە چەشێکی ئەدەبیی هەبێ و بچێتە پێستی خاوەن شیعرەکەوە تا بتوانێ حوکمێکی بەئینصافانە بدا و نرخی ڕاستەقینەی بۆ دابنێ و بە چاوێکی بێلایەن و بێ ئەوەی خۆبەتیی خـۆی کاری تێ بکا سەیری ئەو بەرهەمە بکا و هەڵیسەنگێنێ •

٦ ـ ئاگاڵیبوون و زانینی نەفسییەتی شاعیر و دیاری کردنی چەشنی چەش و هەست و خەیاڵی •

**ئەو ڕێگایەی لە بەسەردا هاتنەوەی شەرحەکەی باوکمدا گرتمەبەر :**

پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ خەریکی لێکۆڵینەوەکەی باوکم ببم هەمو نوسخە چـاپ و دەستنوسەکانم کۆ کرد و فیهرستێکم بـۆ ڕێكخستن و بەراوردێکی وردم لەنێوانیاندا کرد و چی لە هەموویانا هەیە و چی تەنها لە هەندێکیانا هەیە هەموم دەست نیشان کرد و لەسەر بناخەی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە لەگـەڵ باوکم تێکستێکم لە تێکڕای نوسـخە دەستنوس و لەچاپدراوەکان هەڵبژارد و نوسیمەوە و هەر جیاوازییەکی ڕێنوێچۆریش هەبۆ لە پەراوێزا دامنا و ئەم ئیشارەتانەم بۆکردن بەنیشانە :

( چر ) : چروستانی • ( چن ) : چنگنیانی • ( عم ) : عەلی موفیل •
( کم ) : کوردی و مەریوانی • ( گم ) گیوی موکریانی •

پاش لێبونـەوەش لە نوسـینەوەی لێکدانـەوە و لێکۆڵینـەوەی کتیبەکە ، لە ڕێگای برای بەڕێز شێخ عـەلی قەرەداغییەوە سێ کەشکۆلم دەسگیر بۆ لە هەموویانا شـیعری نالی هەبو • یەکێکیان ڕەسـوڵ ناوێکی کوڕی حاجی ئەحمەدی توربەیی لە ساڵی ١٣١٠ کۆچیدا نوسیبویەوە ، بۆ ئەم نوسخەیە نیشانەی ( ت )م دانا • یەکێکیشیان مەلا فەتاحی کاگردەلی لە ١٣٢٧ی کۆچیـدا نوسیویەوە ، بۆ ئەمیش نیشانـەی ( ك )م دانا • ئەویشیان مەلا عەزیزی ڕێشاوی نوسیویەوە ، بۆ ئەمیش نیشانەی (عز)مان دانا • چی زیادە لەم سێ نوسخەیەشدا هەبۆ خستمە سەر تێکستە ئامـادە

کراوەکە و جیاوازییە زێتێچوەکانی ئەمانیشم لە پەراوێز ا دانا .

هەروەها لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کوردیشدا دوو نوسخەی دەستنوسیترم دۆزییەوە یەکێکیان هی کتێبخانە دەستنوسەکەی مامۆستا توفیق وەهبی بوو کە بەخشیوی بە کۆڕ . ئەمەیان هۆی دانانی چەند قەصیدەیەکی تیا نوسرابو . ئەویشیان هی کتێبخانەکەی خوالێخۆشبو مامۆستا موحەممەد ئەمین زەکی بو کە پاشماوەکانی بەخشیویان بە کۆڕ و لە ۱۳۲۱ی کۆچیدا نوسرابووەوە . ئەمانە هیچ زیادەیان تیا نەبو ، بەڵام کەڵکم لە جیاوازییە زێتێچووەکانیان وەرگرت . بۆ یەکەمیان نیشانەی ( تو ) و بۆ دوەمیان نیشانەی ( مز )م دانا .

بۆیەش تەنها جیاوازییە زێتێچوەکانم لە پەراوێزا داناوە ، چونکە لە هەمو نوسخەکانا گەلێ جیاوازیی‌وام هاتوەتە زێ سۆر زانیومە یا هەڵەی نوسیار یا هەڵەی چاپە .

پاش ئەوەی پرسم بە هەندێك لە زانا و ئەدەب دۆستان کرد ، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کەوا پێویستە کەمێك تەرتیبی دیوانەکە بگۆڕم . بۆ ئەم مەبەستە بەپێی پیتی دوایی غەزەل و قەصیدەکانم وەك نوسخەکانی لەمەوپێش ڕیز کرد . بەڵام لەم ڕیزکردنەدا پیتی پێش پیتی دوایشم ڕچاو کرد ، واتە : ئەو غەزەلەی کە پیتی دوایی بەیتەکانی ئەلفە و پێش ئەلفەکە ( بێ )یە خستمە پێش ئەو غەزەلەی کە پیتی دوایی ئەلفە و پێش ئەلفەکە (پێ)یە . ئەم تەرتیبەم لە هەموانا بەکارهێناوە تەنها ئەوە نەبێت کە سەرەتام بە غەزەلی :

ئەی جیلوەدەری حوسن‌و جلەوکێشی تەماشا ..

دەستپێکردوە ، چونکە :

۱ ــ لە زوربەی نوسخەکانا کراوە بە سەرەتا .

۲ ــ لەوە لەچێ کە نالی خۆیشی بەتایبەتی خستبێتیە پێشەوە . ئەوەتا لە یەکەم بەیتیا ئەوە دەرئەخا کە خوا جوانی ئەبەخشێ و هەر

ئەویشە سەرنجی خەڵق ڕائەکێشێ و لەناو خەڵقدا بایەخ بەو جوانیە ئەدا • هەروەها لە پایانی ئەم غەزەلەدا ئەڵێ :

**نالی ، نیەتی سیحری بەیان ، حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما نیەتی قووەتی دڵ ، قودرەتی ئینشا**

واتە : نالی نیـازی وتنی شیعری پڕ لە حیکمەت و بەیـان و وتاری سیحراویی هەیە ، بەڵام هێزی دڵ و توانای داهێنانی نیە ، تەنها خودا ئەم هێزەی ئەداتێ • ئەمـەش بە بەستنەوە لەگـەڵ تێکڕا و پـاش و پێشی غەزەلەکەدا سـەرەتای دەست پێکردن ئەگەیەنێ • ئەمانە وایان لێ کردم منیش وەك پێشوان ــ بەڵام بە بەڵگەوە ــ ئەم غەزەلە لەپێش هەموانەوە دابنێم و بە سـەرەتای دیوانەکەی حـیێب بکەم •

بۆ ڕاست کردنەوەی شیعرەکان ، پاش ڕێكخستنی فیهرستەکەی باسم کرد ، هەمۆ نوسخە چاپ و دەستنوسەکانم لە بەردەستما ڕیزکرد و نرخێکی تایبەتیم بۆ نوسخە دەستخەتەکان دانا نەك تەنها لەبەر دەستخەتێتی، بەڵکو لەبەرئەوەی خاوەن خەتەکان کورد و خوێندەوار و ئەدەب دۆست و نزیکە چەرخی ( نالی ) بوون و ، هیچ نەبێ خوێندەوارییوایـان دیـوە کە نالیی دیبێ • ئەمەش مرۆڤ زیاتر لە ڕاستییەوە نزیك ئەکاتەوە •

نە باوکم لە سەرەتادا و نە خۆشم لە قۆناغی دوەممدا ، هیچ وشەیەکی گران و بەئاسانی نەزانراومان نەکردوەتە ماڵ تا لە فەرهەنگێکی فارسی یا کـوردی یا عەرەبیـدا نەماندۆزیبێتەوە و هـەر وشەیەك پەیـوەندی بە زاراوەیەکی شەریعەت یا تەصەووف یـا هەر زانیاریەك لـە زانیاریەکانی ئیسلامەوە بوبێ بەپێی توانا چۆینەتە بنج و بناوانی •

کە بەتەواوی لە کارەکەم بومەوە ، کتێبەکەم بە شێوەی کوردیی نوێ و بە پـێی ڕێنوسـی کۆڕی زانیـاری کـورد نوسیـیەوە ، بەڵام وشـە عەرەبییەکانم ــ لە هەندێ شوێنا نەبێ ــ بە پێی عەرەبێ و شێوەنوسی کوردی نوسیوەتەوە و لە نوسینەوەمدا دەسکاریی هیچ وشەیەکم نەکردوە ،

واتە چۆنم دیوە لە هەمۆ نوسخەکاندا یا لە هەندێکیاندا بێ گۆڕین نوسیومەتەوە • جا ئەگەر بە تەواوم نەزانیبێ ئەوا لەکاتی مەعنا لێدانەوەو لێکۆلینەوەدا باسم کردوە •

لە داوێنی لاپەڕەکانەوە مەعنای یەکە یەکەی وشە گرانەکانم نوسیوە • ئەنجا مەعنای تێکڕای بەیتەکەم لێکداوەتەوە و پاش ئەوەش ئەوەی پەیوەندی بە وشەئارایێ و ( بەدیع )ەوە هەبێ ، ئەوەندەی هەستم پێ کردبێ ، خستومەتە ڕۆ • دوای هەمۆ ئەمە نوسخەکانیترم ( لەو شوێنانەی کە نوسخەیتر هەبێ ) نوسیوەتەوە و نیشانەی سەرچاوەی ئەو نوسخانەم ، وەك پێشان باسم کرد ، داناوە •

**ئەو زاراوانەی لەم لێکۆلینەوەیەدا بەکارمانهێناون :**

وەك لەمەوپێش باسمکرد ئەو بار و دۆخە ئەدەبییەی نالیی تیا ژیاوە ، کاری تێکردوە و ، زیرەکێ و بلیمەتییەکەشی پالی پێوە ناوە هەرچی جوانکارێ و وشە ئارایێ هەیە بەکاریبێنێ • لەبەرئەوە شیعرەکانی بێجگە لە قولیی مەعنا و ناسکیی هێما ، پڕیشن لە ( موحەسسیناتی بەدیعێ ) • ئێمە پاش هاوڕێیەتیی چەند سالی دیوانەکەی نالێ ، بە بیر و بۆچۆلی خۆمان گەیشتۆینەتە ئەوە کە نالێ بەدەگمەن وشەیەکی بێجێ و بێمەبەستی داناوە و لە هەندێ شوێنیشدا دۆ وشەی کۆکردوەتەوە کە بە واتا پەیوەندییەکیوایان بە یەکەوە نیە ، کەچێ بەدیمەن ، کۆکردنەوەیان لە جوانێ بێبەش نیە وەك لە گەلێ شوێنی لێکۆلینەوەکەدا ڕۆنمان کردوەتەوە •

جا لەبەرئەوەی کە نالێ بۆ دەرخستنی ئەو جوانییانەی شیعرەکانی ڕێبازی عیلمی ( بەدیع )ی گرتوە و شوێن پێی زەوانێژێ ( بەلاغە )ی عەرەبیی هەلگرتوە ، بە پێویستمان زانێ یەکە یەکەی ئەو موحەسسیناتە بەدیعییانە ڕۆن بکەینەوە کە ئەو بەکاری هێناون • زاراوەکانی ئەو موحەسسیناتەشمان هەر بە عەرەبێ هێشتەوە ، چونکە هێشتا وشەی پڕبەپێستیان لە کوردیدا بۆ دانەنراوە و هەرچییش تائیستا لێرە و لەوێ بەرچاو ئەکەوێ کال و کرچە • مەبەست لای ئێمە دەرخستنی جوانیی

شیعرەکەیە ، ئیتر بە زاراوەی عەرەبی بێ یا کوردی • دیارە ئەگەر بکرایە بە کوردی بوایە ، چاکتر بو • بەڵام هێشتا ئەو توانایەمان بۆ نەڵواوە • ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە دیوانەکەی نالی کەلەپوور ( تراث )ێکی نەتەوەییە و ئەبێ بەو چاوە لێی بکۆڵینەوە و جوانیەکانی دەرخەین •

ئێستا پوختەیەکی ئەو زاراوانە ئەخەینە پێش چاو و مەعناشیان لێ ئەدەینەوە و نمونەیان بۆ ئەهێنینەوە :

یەکەم ـ هەندێ لەو جوانیانەی پەیوەندیان بە مەعناوە هەیە :

١ ـ ( طباق ) کە ( تەضادد )یشی پێ ئەڵێن • واتە : کۆکردنەوەی دوو مەعنای دژی یەکتر • ئەگەر دوو مەعناکە مەعنای دوو ڕستە ، یا دوو کار ، یا دوو ناو ، یا دوو پیت بوون ، ئەوا پێی ئەڵێن ( طباق الایجاب ) • ئەگەر بوون و نەبوون ( نفی و اثبات )یش بوون ، ئەوا پێی ئەڵێن ( طباق السلب ) •

نمونەی یەکەم : ئەو دژایەتییەی لەنێوان ( ڕەقی ) و ( نەرمی )دا هەیە ، وەك لەم بەیتەدا :

صابونی کەفی پێتە کەفی زاری چاپلوس
خاصییەتی ( ڕەقی )ی هەیە نەرمیی زوبانی لوس

نمونەی دووەمیش وەك لەم بەیتەدا :

لە کن من با وجودی ناس و لەجناس
کەسی تێدا نیە لەم شارە بێ تو

ئەوەتە لێرەدا « با وجودی •• تاد » ، بوون و « کەسی تێدا نیە » نەبوون ئەگەیەنێ •

٢ ـ ( تەناسوب ) واتە : کۆکردنەوەی دوو یا چەند شتی هاوجۆر و پێکەوە گونجاو ، وەك کۆکردنەوەی ( شەمس ) و ( قەمەر ) و ( ئەستێرە ) لەم بەیتەدا :

لەستێرە هەمو مەحوە لەنێو نوری قەمەردا
یا شەمسی جەمالت شەوی گیراوە بە قەمەردا

٣ ـ ( تەشابوهی ئەطراف ) کە بەشێکە لە تەناسوب ، واتــە : دوایی هێنانی قسەیەك بە شتێك کە لەگەڵ سەرەتای قسەکەدا بگونجێ ، وەك لــەم بەیتەدا :

بونیانی کیبر و سەرکەشییە طاقی کیسرەوێ
دانانی ظوڵم و ڕۆژەشییە تەختی ئابنۆس

٤ ـ ( تەوریە ) واتە : وشەیەك دوو مەعنای هەبێ ، یەکێکی نزیك و یەکێکی دوور و مەعنا دوورەکەیان مەبەست بێ ، وەك وشــەی ( ئاو ) لەم بەیتەدا :

ڕێی حورمەت و بێحورمەتیی هەرگیز نەگوتابێ
چەن ئاوی ڕژابێت و چ ئاوی نەڕژابێ

٥ ـ ( حوسنی تەعلیل ) کە ئەوەیە بەڵگەیەك بۆ دۆخێك دابنرێ ، ئەو بەڵگەیە شتێکی ڕاستەقینە نەبێ ، تەنها بۆ ئیعتیبارێکی ناسك و شاعیرانە بێ ، وەك نیوەی دووەمی بەیتی داهاتو لەگەڵ نیوەی یەکەمیدا :

شیعری خەڵقێ کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکێ ؟
کەی لە دیققەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا ئەکا ؟

ئیستا ئەمە شتــێکی خەیاڵییە پــەتك و هــەودا بێن بە هــەرایان و بەربەرەکانێی یەکتر بکەن لە ناسکیدا .

٦ ـ ( کینایە ) واتە : بەکارهێنانی وشەیەك یا ڕستەیەك و مەبەست نەبونی مەعنا ڕاستەقینەکەی و لەدڵگرتنی مەعنایەکیتر کە پەیوەندییەکی بە مەعنا ڕاستەقینەکەیەوە هەبێ ، بە مەرجێ ڕێگا لە مەبەست بــونی مەعنا ڕاستەقینەکەش نەگرێ ، وەك لەم بەیتەدا :

عەجەب ئەستێرە شەو هەڵدێ لە ناوی خوسرەوی خاوەر
لە ڕۆی تۆم دیبە هەڵنایە شەو و ڕۆژ گەرچی بێبدارم

ئیستا لێرەدا ( خوسرەوی خاوەر ) کینایەیە لە خۆر .

٧ ــ ( ئیستیعارەی موسەڕڕەحە ) واتە : شوبهاندنی شتێك بە شتێکیتر و ناوهێنانی پێشوبهێنراوەکە لەجیاتی شوبهێنراوەکە بە مەرجێ نیشانەیەکیوا لە ئارادا بێ پەیوەندی بە شوبهێنراوەکەوە بێ ، وەك لەم بەیتەدا :

کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت
لەو تەختە کەوا صاحیبی مۆرن بە صەدارەت

لێرەدا جۆتە مەمکی یار شوبهێنراوە بە بەی و هەنار . مەمك ناوی نەهێنراوە ، بەی و نار لە جێگەیدا دانراون . صیفەتی ( نەگەیشتو )یش کە ئیضافە کراوەتە پاڵ ( ت ) نیشانەیەکە پەیوەندی بە مەمکەوە هەیە چونکە مەمك هیی یارە نەك هیی بەی و نار .

٨ ــ ( ئیستیعارەی مەکنیە ) واتە : شوبهاندنی شتێك بە شتێکیتر لەگەڵ ناوهێنانی شوبهێنراو ، بە مەرجێ شتێکیواش باس بکرێ پەیوەندی بە پێ شوبهێنراوەکەوە بێ ، وەك لەم بەیتەدا :

دەست بەندییانە ، دێن و دەچن سەرو و نارەوەن
یا حەلقەیانە صوفییی مڵخواری مندەبۆر ؟

لێرەدا سەرو و نارەوەن شوبهێنراون بە کوڕە لاو لەکاتی هەڵپەڕکێدا ، ( دێن و دەچن )یش کە لەگەڵیاندا وتراون کاری پیاون نەك هیی دار و درەخت .

ڕاستەکەی ئێمە لەم لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەیەماندا هونەری ئیستیعارەمان زۆر نەخستوەتە ڕۆ چونکە لە زوربەی شیعرەکاندا هەیە . خوێندەواری زیرەك هەر کە کەمێك ئاشنایەتیی لەگەڵ شیعرەکانی نالی پەیدا کرد خۆی ئەیاندۆزێتەوە .

٩ ــ ( لەف و نەشر ) ئەوەیە لەپێشدا دوو شت یا زیاتر باس بکرێ و لە دواییدا بۆ دیاریکردن باسی چەند شتێکیتر بکرێ کە پەیوەندیان بەوانی پێشوەوە هەبێ . جا ئەگەر تەرتیبی شتە دواییەکان وەك هیی

پێشوەکان بۆ ئەوە پێی‌ئەڵێن ( لەف و نەشری مورەتتەب ) و ، ئەگەر پاش و پێشیش بۆن واتە یەکەم بۆ دووەم و دووەم بۆ یەکەم ئەگەڕایەوە ، ئـەوە پێی‌ئەڵێن ( لەف و نەشری موشەووەش ) •

نمونەی لەف و نەشری مورەتتەب وەك لەم بەیتەدا :

ئەم ئەرضە مەزرەعەی عەمەلە و گولخەنی ئەمەل
هێندی بوە بە مەسجید و هێندی بە مەزبەلە

لەپێشدا دوو شتی وت : ( مەزرەعەی عەمەل ) و ( گولخەنی ئەمەل ) • لەدوایشدا دوو شتی‌تری وت : ( بوە بە مەسجید ) و ( بوە بە مەزبەلە ) • مەسجید لەگەڵ مەزرەعەی عەمەل و مەزبەلەش لەگـەڵ گولخەنی ئەمەل لەبارە •

نمونەی لەف و نەشری موشەووەشیش وەك لەم بەیتەدا :

بە ناری عەشق و ئاوی دڵ جەسـەد وەك حەزرەتی موسا
طەریقی بەحری فیرعەون و زەفیقی ئاتەشی طورە

لێرەدا ، لەپێشـــدا ( نار ) و ( ئـــاو )ی وت و لەدوایـــدا ( بەحری فیرعەون ) و ( ئاتەشی طور ) کە یەکەمیان لەگەڵ دووەم و دووەمیان لەگەڵ یەکەم لەبارە •

١٠ـ ( موبالەغە ) : ئەوەیە صیفەتێك ئەوەندە بەهێز یا بێ‌هێز پیشان بدرێ کە یا نەشیاو ( موستەحیل ) یا زۆر گران بێ ، وەك لەم بەیتەدا :

شوعاعی زۆت لە گەردنتا دیارە دڵ دەسوتێنێ
بنازم بەم تەجەللایە چ خورشید و بلوریکە !

١١ـ (لەطافەت) : ئەوەیە وشـەیەك دوو مەعنا هەڵبگرێ وەك وشـەی (زار) لەم بەیتەدا کە هەم مەعنای ( لاواز ) و هەم مەعنای ( دەم )یش ئەگەیەنێ :

جان بەو لەبی بۆسەی لەبتە عاشقی زارت
( فالبائس یستوهب من فیك معاشا )

١٢ــ ( تەشبیهی مەقلوب ) واتە : شوبهاندنی پێچــەوانە کە ئەوەیە شتێك بشوبهێنی بە شتێکیتر کە لەڕاستیدا ئەبێ بە پێچــەوانەوە بوایە . ئەمەش بۆ موبالەغەیە لە هاتنەدیی هۆی شوبهاندنەکە لە شوبهێنراوەکەدا ، وەك لەم بەیتەدا :

شەرمەری تابش و بارش لە دەمی زەعدی بەهار
ئەثەری جۆششی گریانە لە ئەفغانمدا

دووەم ــ هەندێ لەو جوانیانەی پەیوەندییان بە وشەوە هەیە :

١ ــ جیناس : ئەوەیە دوو وشە وەك یەك بن . ئەمەش چوار جۆری هەیە :

أ ــ ( جیناسی تەواو ) : ئەوەیە پیتەکانی ئەو دوو وشەیە لە چەشن و ژمارە و ڕیز و سەروژێردا تەنبەتەن یەك بن . جا ئەگەر هەردوو وشەکە یەك وشەیی بوون ، ئــەوا پێیئەڵێن ( جیناسی تەواوی موماثیــل ) ، وەك لەم بەیتەدا :

شەبەهی زولفی شەبەهـ گونەیە زۆ گەردانی
بە سەری ئەو کە بە سەودا سەر و سامانم دا

لێرەدا لەنێوان دوو وشەی ( شەبەهـ )دا جیناسی تــەواوی موماثیل هەیە .

خۆ ئەگەر یەکێ لــە دۆ وشەکان لە دوو وشــە دروست کــرابێ و ئەوی‌تریان یەك وشەیی بێ ، ئەوا پێیئەڵێن ( جیناسی تەرکیب ) ، وەك لەم بەیتەدا :

موطمەئین خاطر و لەیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕی
نەفسی ئەممارە ، کە لەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕییە

ب ــ ( جیناسی ناقیص ) : ئــەوەیە یــەکێ لە دوو وشــەکە پیتێکی لەوی‌تریان زیاتر بێ . ئیتر ئەو زیادەیە لە سەرەتاوە بێ یا لە ناوەڕاست یا لە

دوایی وشەدا ، وەك وشەی ( پۆش ) و ( پۆشتو ) لەم بەیتەدا :

زەقیب و موددەعی وەك پۆش و پۆشتۆن
بسوتێنین کە وەك بەرقین ، لەبەر قین

ج ــ ( جیناسی موحەڕڕەف ) : ئەوەیە دو وشەکە لە هەمو شتدا یەك بن ، تەنها سەروژێریان جیاواز بێ ، وەك ( جەنان ) و ( جینان ) ، بەپێی شێوە نوسینی عەرەبی ، لەم بەیتەدا :

جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا
حەبیبەی ( مالیاوا ) مالی ئاوا

د ــ ( جیناسی موضاریع ) : ئەوەیە دو وشەکە وەك یەك بن و تەنها لە یەك پیتدا جیاواز بن و ئەو دو پیتەش کە تیادا جیاوازن لەیەکەوە نزیك بن ، وەك وشەی ( دیبا ) و ( زیبا ) لەم بەیتەدا :

کوڵ تازەوو تەڕ مادام سادە وەکو خوشکی بێ
لەمما کە ڕوا سەبزە دیبا کوڵ و زیبا کچ

هـ ــ ( جیناسی لاحیق ) : ئەوەیە دو وشەکە وەك یەك بن و تەنها لە یەك پیتدا جیاواز بن و دو پیتەکەش بەتەواوی جیاواز بن ، وەك سێ وشەی ( ئاسك ) و ( ناسك ) و ( باسك ) لەم بەیتەدا :

لەلا ئەی ئاسکی ناسك بە باسك
شکاندت گەردنی صەد شێری شەرزە

جیناس جۆری تریشی هەیە ، بەڵام ئێمە لە دیوانەکەی نالیدا هەر نمونەی ئەمانەمان بەرچاو کەوت . لەوانەیە جۆری تریشی تیابێ و بەسەرماندا تێپەڕیبێ .

٢ ــ ( ئیقتیباس ) : وەرگرتنی شتێك لە ئایەتی قورئانی پیرۆز یا فەرمودەی پێغەمبەر یا سەرچاوەیەکی ئەدەبی و بەکارهێنانی لە ڕستەدا ، نەك بە شێوەی ئەوە کە تێکستێکە وەرگیراوە ، وەك ( سیحری بەیان ) و ( حیکمەتی شیعر ) لەم بەیتەدا :

**نالی نیەتی سیحری بەیان ، حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما نیەتی قووەتی دڵ ، قودرەتی ئینشا**

کە لە حەدیثی ( ان مـــن الشعر لحـــکمة و ان من البیان لســـحرا ) وەرگیراون •

٣ ــ ( تەلمیح ) کە هێمـــایە بۆ شـــیعرێك یـــا ڕۆداوێك ، وەك لـــەم بەیتەدا :

**هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین**
**خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا**

کە هێمایە بۆ حیکایەتی حـــەزرەتی سولەیمان و پەپوە سلێمانەکە و بەلقیسی شاژنی یەمەن کە لە شاری سەبەء ژیاوە ••

ئەمە جگە لە گەلێ جۆری جوانی و هونەری وشە ئارایی کە ئەگەر یەکێك بەتایبەتی بەدوایانا بگەڕێ ، لەوانەیە باسێکی دوور و درێژیان لەسەر بنووسێ •

**گیروگرفتی ناسینەوەی شیعری نالی :**

سەبارەت بە دڵنیا بوون لەوەی ئەم غەزەلە یا ئەو قەصـــیدەیە یا ئەو بەیتە هی ( نالی )یە یا هی ئەو نیە ، بەڕاستی پیاو تووشی سەرئێشە ئەبێ و ناچارە گومان بکاتە بنچینەی کار !

جێی ســـەر سوڕمان نیـــە خەڵك شـــیعریان وتبێ و ( نالی )یەکیان خستبێتە دوا بـــەیت و بوبێتە شـــیعری نالی ! یا لـــەکاتی نووســـینەوەدا بە ( ئیجتیهاد ) ئەم غەزەلـــە یا ئەو بەیتە کرابێتە هی نالی هـــەر لەبەرئەوەی نەیانزانیوە هی کێیە و توانای خۆ ماندوو کردن و دۆزینەوەی خاوەنەکەیان نەبووە •

مەسەلەی شیعر بەدەم خەڵکەوە هەڵبەســـتن ( ئینتیحال ) لە ( نالی ) کۆنترە و لەناو ئەدەبی کۆنی گەلە دراوسێکانیشدا بووە • ئێمەش بەشێکێن

لە گەلالی ئـەم سەرزەویە و ئەدەبەکەشـان یەکێکە لــە ئەدەبەکانی ئەو جیهانە ٠

ئەوەی لەم بابەتـەوە کـەمێك دڵنیایی بە خوێنـەر ئـەدا ئەوەیە کە سەردەمی شاعیرەکەمان زۆر دوور نیە و ، سولەیمـانی و دەوروبەری خاڵی نەبوە لە شاعیر و خوێندەوار و بلیمەتی وەکو مەحوی و شـاعیری ناسکی وەك بێخود و پیرەمێـردی لێ نەبڕاوە و تا ئەم دوایـیـەش گـەلێ ئەدەب دۆستی بەعومریوای تیـا بوە کە لە نالی و سـەردەمی نالی و هاوڕێیانی نالی دوور نەبوون و ئەم کۆمەڵە شیعرانە کە دراونەتە پاڵ نالی و پێیدەڵێن (دیوانی نالی) زوربەیان کەس ڕەخنەی لێ نەگرتوون و نەیوتوە ساختەن ! ٠٠

ئەمە لەلایەك ٠ لە لایەکیتریشەوە شـیعرەکانی نـالی تێکڕا خاوەنی چەند سیفەتێکی تایبەتین و ، پاش ئەوەی کە ماوەیـەك ئەدیبی ڕەخنەگر لەگەڵیاندا بێ و ، تەماشای شیعری شاعیرانیتری ئەو سـەردەمە بکا و بە وردی چاو بە وشەی ئەو سـەردەمەدا بگێڕێ و دلی بـۆ مەعنا و نهێنیی وشە و ڕستە و تەعبیری تێکڕای ئەو زۆرانە بکاتـەوە و ، ئەنجا بێتە سەر بەرهەمەکانی نالی و خاسیەتە تایبەتییەکانی وشە و ڕسـتە و وشە ئارایی و خەیاڵ تەنی و جونبوشی هەسـت و قوڵیی مەعنا و تاوتوێیان بکا ، لەوانەیە بتوانی شیعری زادەی بیری ( نالی ) لە هیی ساختە جیا بکاتەوە ٠

# ژیانی نالی و سەردەمی

نالی ناوی خدر ( خضـر )ە و کوڕی ئەحمەدی شاوەیـسـی ئـالی بەگیی مکایەلیـیە(٥) ٠ لە گوندی ( خـاك و خۆڵ ) لە دەشـتی شـارەزوور

---

(٥) نالی خۆی ناوە نـاوە لە شیعرەکانیدا ناوی ( خضر )ی بـە لەطانەت یا تەوریە بەکارهێناوە . سـەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکە :

١ ــ هەرچەندە کە عومری ( خضر ) و جامی جەمت بۆ

چونکە ئەصلەن زۆرە چ عومرێکی کەمت بۆ (٣)

هاتوەتە دنیاوە • بەپێی ڕێبازی خوێندنی ئەو سەردەمە لە سەرەتاوە قورئانی پیرۆز و وردە کتێبی فارسیی خوێندوە و چوە بۆ فەقێیەتی و لەپێناوی وەرگرتنی زانستە ئاینییەکاندا شار و دێهاتە قوتابخانەدارەکانی بەشێکی کوردستان گەڕاوە و دوا پلەی ئەو خوێندنەی بڕیوە و ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتوە • ئەو شوێنانەی کە زۆر تیایانا مابۆیتەوە سنە و سابلاغ و زەردیاوای قەرەداغ و هەڵەبجە و سولەیمانین • لە قەرەداغ لای شێخ موحەممەدی ئیبنولخەییاط خوێندویەتی • لە تەکیەی قەرەداغیش ڕیاضیاتی لای شێخ عەلیی مەلا خوێندوە• لە سولەیمانی لە مزگەوتی (سەیید حەسەن) لای مەلا عەبدوللای ڕەش بوە • زۆرتر دەوری موستەعیدیی لە خانەقای ( مەولانا خالید ) لە سولەیمانی ڕابواردوە • هەروەها گەلێکیشی لە هەڵەبجە و سولەیمانی لای شێخ ئەولای خەرپانی خوێندوە (٦) •

ئەم مەعلوماتەی سەرەوە کە بە ئەمانەت نەقلم کردن ، دوور نیە ڕاست بن ، هەرچەند لایەنی مێژوی هەرکەس پێویستە زۆر بە وردی دەستی بۆ ببرێ و بەلگەی دیاری هەبێ •

خوالێخۆشبو موحەممەد ئەمین زەکی بەگ ئەلێ : نالی لە سالانی

---

٢ ـ خەطی سەبزی لە کەناری لەبی ( نالی ) هەروەکو
( خضر )ی زیندە لەسەر چاە زولالێکی هەیە

٣ ـ سەری زولفت کە ڕشتەی عومری (خضر)ە نیوە هەودایە
چ هەودایە ؟ کە هەر حەلقەی دوصەد زنجیری تێدایە

٤ ـ تا گەرمڕەوی قەطرەیی ظولماتی بەقا بێ
( ماء الخضر ) ت قەطرە لەسەر قەطرە فیدا بێ

٥ ـ لەبی تۆ ئاوی بەقا ، من ( خضر ) م
فەیضی تۆ ڕەحمەت و ، من سەوزە گیا

(٦) علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٠ . ( چاپی دووەم ) ل ٢٤٠ ـ ٢٤١ .

١٢١٥ ــ ١٢٧٣ی کــۆچی ، ١٨٠٠ ــ ١٨٥٩ی زاینیــدا ژیاوە(٧) • د • مەعروف خەزنەداریش هەر هەمان مێــژو دیاری ئــەکا(٨) • هەروەها دە کەمال فوئادیش(٩) • مامۆستا عەلائەددین سەججادیش ئەلێ : لە ١٧٩٧ی زاینیدا هاتوەتە دنیاوە و لە ١٨٥٥دا مردوە (١٠) •

وا هەمو ئەم مامۆستایانە ، مامۆســتای ســەججادی نەبێ ، مێژوی لەدایکبون و مردنی نالیان وەك یەك دانا و بەو پێیە نالی ٥٦ سال ژیاوە • تەنها بەپێی بۆچونەکەی مامۆستای سەججادی تەمەنی بوە ٥٨ سال •

وابزانم هۆی یەکنەکەوتنی قــەی مامۆســتا ســەججادی لەلایەك و دوکتۆر خەزنەدار و دوکتــۆر کەمال فوئاد لــە لایــەکی‌ترەوە دەربارەی تەمەن و سالی لەدایکبونی نالی ئەو بەراورد کردنەی کوردی و مەریوانی و بەدوای ئەوانیشدا مامۆستا عەلی موقبیلە کە لە پێشەکیی دیوانەکەیاندا سالی ١٢١٥ی کۆچیــان لەگەل سالی ١٧٩٧ی زاینیدا بەراورد کــردوە • جا ئەگەر وابێ ئەوا وەك کوردی و مەریوانی و موقبیل و سەججادی ئەفەرمون نالی (٥٨) سال ژیاوە• بەلام لە جەدوەلەکەی زۆرزەلاتناسی ئەرمەنیی سۆڤێتی یوسف ئەبگارەڤیچ ئۆربێلی (١١)دا سالی (١٢١٥)ی کۆچی لەگەل سالی (١٨٠٠ ــ ١٨٠١)ی زاینی بەرابەر کراوە • بەپێی ئەمە وەك دوکتۆر مارف

---

(٧) محمد امین زکی ، خلاصة تاریخ الکــرد و کردستان ، ( ترجمة محمد علی عونی ) ، القاهرة ، ١٩٣٩ ، ص ٢٥٨ •

(٨) مارف خەزنەدار ، لەبابەت مێژوی ئەدەبی تازەی کوردیەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ٣٦ « بە زمانی رۆسی » •

(٩) کــەمال فوئــاد ، دەستنوســی کوردی ، ڤیزبــادن ١٩٧٠ « بە زمانی ئەلمانی » •

(١٠) علاءالدین ســجادی ، مێژوی ئــەدەبی کوردی ، ل ٢٤٠ ، ٢٤٤ ، چاپی دووەم ، بغدا ، ١٩٧١ •

(١١) یوسف ابگاروڤیچ اوربــلی ، جداول لتحویل الســنوات الهجریة الی الســنوات المیلادیــة ، ( ترجمــة الدکتور حســین قاسم العزیز ) ، مجلة المورد ، المجلد الثالث ، العدد الرابع ، بغداد ١٩٧٤ •

خەزنەدار و دکتۆر کەمال فوئاد لەسەری ڕێشتون سالی لەدایکبونی نالی دەکاتە (١٨٠٠)ی زاینی و تەمەنیشی دەبێتە (٥٦) سال •

لە ڕاستیدا هیچکام لەمانە باسی ئەو سەرچاوەیەیان نەکردوە کە ئەم سالی بون و مردنەیان لێ وەرگرتوە کە ئەمەش شتێکی بنەڕەتی و زۆر گرنگە • بێگومان مەسەلەی دیاری کردنی مێژو بە (ئیجتیهاد) نابێ و بناغەیەکی ڕاست و دروستی ئەوێ • بەلام هەندێ شت هەیە دەبنە هۆی ڕون کردنەوەی سەردەمی (نالی) و نزیك بونەوە لە زانینی سالی لەدایکبون و مردنی •

١ ــ نالی پەیوەندیەکی تایبەتیی لەگەل سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕیدا بوە • ئەم پەیوەندییەیش بەم بەلگانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێ :

أ ــ ئەو غەزەلەی کە سەرەتاکەی ئەم بەیتەیە :

**بولبولی طەبعم لەنوا دیسان لەناخوانی دەکات**

کە تیا ئەلێ :

**هودهودی دل حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین**
**خۆی کە دامێن‌گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکات**

شاهی ئاصەفی یەکەم حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر بوە کە وەزیرەکەی ناوی ئاصەفی کوڕی بەرخیا بوە و مەبەستی لە شای دووەمی ئاصەفیش ، سولەیمان پاشای بابانە (١٢) •

ب ــ ئەو غەزەلەی کە یەکەم بەیتی ئەمەیە :

**لەم نالەمە موعتازە کەوا خاصەیی شاهی**
**ناشۆبی دلی مەملەکەت و قەلبی سوپاهی**

---

(١٢) بڕوانە : مەسعود موحەممەد ، حاجی قادری کۆیی ، بەرگی دووەم ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ١٥٥ ــ ١٥٦ •

که هەمتوی برتییە لە پیاهەڵدان و وەسف‌کردنی تاقمە سوپایەك ٠ ئەبێ ئەو سوپایە سوپای کێ بوبێ ئەگەر هی سلێمان پاشا یا ئەحمەد پاشای کوڕی ئەبوبێ ، بەتایبەتی که کتیبەکانی مێژو ئەڵێن ئەم ئەحمەد پاشایە سوپایەکی زێك‌وپێك و تازە بابەتی پێکهێناوە ٠ جا نازانم (نالی) لەکاتی دەستەڵاتی ئەحمەد پاشادا لە سولەیمانی ماوەتەوە و ئەو سوپایەی بە چاوی خوی بینیوە و وەصفی کردوە ، یا پێش زێکخستنی سولەیمانی بەجێ‌هێشتوە و باسەکەیان بو گێڕاوەتەوە و دوربەدور تەعریفی کردوە ، یاخو مەبەستی سوپای سلێمان پاشای باوکیەتی که لە ( ١٢٣٤ )ی کوچییەوە تا ١٢٥٤ حوکمڕانیی سولەیمانیی کردوە ؟ !

ج ــ قەصیدە درێژەکەی که بو سالی هاوڕێی‌گیانی بە گیانیی خوی ناردوە ، کەتێکڕا پرسیارە لە وەزعی سولەیمانی پاش نەمانی دەوری بابانەکان ٠

د ــ غەزەلەکەی که بەبونەی سەفەری حەجی ( توری زوّدباری )یەوە وتویەتی که وەك لە تێکڕای بەیتەکانەوە دەرئەکەوێ خاوەنی زێبازی نەقشبەندی و یەکێك بوە لە موریدە ناودارەکانی مەولانا خالید ( ١١٩٧ی ٠ ك ــ ١٧٨٣ی ٠ ز ، ١٢٤٢ی ٠ ك ــ ١٨٢٦ی ٠ ز ) ٠

هـ ــ قەصیدەکەی که بە ( مەستورە )یا وتوە(١٣) :

خوسرەو خانی ئەردەڵان مێردی مەستورە خانم که بە ( خوسرەو خانی ناکام ) بەناوبانگە لە سالی (١٢٤٠)ی کوچی و (١٨٢٤)ی زایینییەوە لە سنە ( والی ) بوە ٠ خوسرەو خان لە سالی ١٢٤٤ی کوچیدا ، لەگەڵ ئەوەش که ( حوسن جیهان )ی کچی فەتح عەلی خانی قاجار ژنی بوە ، بو خوش‌کردنی ناوبەین و دڵدانەوەی ئەبولحەسەن ( مەستورە )ی ئەدیب و شاعیریش

---

(١٣) مەستورە : ماه شەرەف خانمی کچی حەسەن بەگ وەك ماموستا سەججادی ئەڵێ ، یا کچی ئەبولحەسەن بەگ وەك خوالێخوشبو ماموستا ئایەتوللای مەردوخی لە لاپەرە ١٥٩ی بەرگی دووەمی کتیبی ( تاریخ مردوخ )دا ئەڵێ ٠

ئەخوازێ • بە حیسابە پێشوەکە لەوکاتەدا کە مەستورە شوی بە خوسرەو خان کردوە ( نالی ) ۲۹ سالان بوە •

ئیتر هەرچون بێ ، نالی خەوەکەی ـ کە لە قەسیدەکەیا بۆ مەستورە باسی لێئەکا ـ پێش شوکردنی مەستورە دیبێ و قەصیدەکەی بۆ هاتبێ یا پاش شوکردنی وتبێتی ، ئەم کەین و بەینە زۆ ناکیەك هەر ئەگرێتە سەردەمی ژیانی ( نالی ) •

و ـ کۆمەلـە کتێبێکی دەسنـوسی پێکەوە جوزوبـەند کراوی کتێبخانـەی بنەمالـەی موفتیی هەلەبجـەم (۱٤) دی • دو غـەزەلی تیا نوسرابوەوە(۱٥) لە سەرەوەیان نوسرابو ( نالی ) واتە ئەم غەزەلانە هیـی نـالین • هەرچەند لـە هیـچ لایەکی غـەزەلەکانەوە نەنوسرابو کـەی نوسراونەتەوە ، بەلام دیار بو وەك کتێبەکان خۆیان زۆ نـوسرابونەوە • کتێبەکانیش لە تەئریخی جیـا جیادا نوسرابونەوە • بۆ نمونە یەکێکیـان ( کفایة )ی پێنوشێ بو بە دەستی مەعروفی کوڕی شێخ ئەولای خەرپانێ نوسرابوەوە لە سالی ۱۲٦۹ی کۆچیدا • یەکێکیتریان قەصیدەی ( بانت سعاد ) بو لە سالی ۱۲۳۲دا نوسـرابوەوە • یەکێکیکەشیان قەصـیدەیەکی

---

(۱٤) بنەمالەی موفتیی هەلەبجە ئەچنەوە سەر شێخەولای خەرپانێ •

(۱٥) دو غەزەلەکە ئەو غەزەلانە بون کە سەرەتای یەکێکیان ئەم بەیتەیە :

> ئەمردم من لەگەر ئەمجارە بێ تۆ
> ئەچم ، شەوت بێ ، هەتا ئەو خوارە بێ تۆ

سـەرەتای ئەویشـیان ئەم بەیتەیە :

> عاشقی بێ دل دەنالێ ، مەیلی گریانی هەیە
> بێ شکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هەیە

غەزەلی یەکەمیـان ، زیاد لە هەمـو نوسـخەکانی بەردەسـتم ئەم بەیتەشی تیابو :

> هەمو ئەعضایی نالینم دەنالێ
> سەراپام میثلی مۆسیقارە بێ تۆ

١٥٠ بەیتیی جەلالەددینی سیوطی بو رەسوڵ ناویك لە ساڵی ١٢٣٢دا لە مەدرەسەی مەولانا ئەحمەدی کوڕی مەولانا سلێماندا نوسیویەوە •

هەروەها لە لاپاڵی کومەڵە دەستوسێکی‌تری پێکەوە جوزوبەند کراوی هەر ئەم کتێبخانەیەدا(١٦) شیعرێکی‌ترم دی درابوە پاڵ نالی (١٧) • کتێبەکانی ئەم کومەڵە لە ساڵانی ١٢٧١ و ١٢٧٢دا نوسرابونەوە •

هەرچۆن بێ دیارە ساڵانی ١٢٣٢ و ١٢٦٩ و ١٢٧١ و ١٢٧٢ کە ساڵی نوسینەوەی ئەو کتێبانەن جۆرە ڕۆشناییەك ئەخەنە سەر ساڵانی ژیانی نالی •

نابێ ئەوەش لەیادکەین کە وەك ئەڵێن نالی لای شێخی خەرپانی خوێندویە • لە باوکم بیست فەرموی لە شێخ بابەرەسوڵی عەبابەیلی ( ١٨٧٨ ــ ١٩٤٣)م بیستوە نالی لەگەڵ موفتیی زەهاوی و مەلا یاسینی تەشاری و مەلا یوسفی تەوێڵەیی موستەعید ( قوتابیی دوا پلە ) بوون لای شێخ ئەولای خەرپانی • گومانیش لەوەدا نیە کە شێخ ئەولا ساڵی (١٢٥٤)ی کوچی وەفاتی کردوە (١٨) •

ز ــ بەلام وابزانم لە هەمو ئەم بەڵگانە گرنگتر ئەوەیە کە ڕۆژەلاتناس خودزکو کە شابەندەری ڕوسیا بوە لە پاریس ئەیگێڕێتەوە کەوا لە ساڵی ١٨٥٣دا لە پاریس چاوی بە ئەحمەد خان ناوێکی بابان

---

(١٦) هەردو کومەڵە دەستوسەکەم لای بەڕێز شێخ عەلیی شێخ موحەممەدی قەرەداغی دی •

(١٧) شیعرەکە ئەمەیە کە لەبەر ڕاست نەبونەوەی مەعناکەی بوم ، بە شێوە نوسینی فارسی ، وانە وەك خوی ، ئەینوسمەوە :

بعور دایری فنجان چینی
شکاندی دالری فنجان چینی

(١٨) محمد علی القرەداغی ، الشیخ عبدالله الخرپانی من خلال مخطوطات مکتبته ، گوڤاری کوڕی زانیاری کورد ، بەرگی ( ٢ ) ژمارە ( ٢ ) ، بەغدا ، ١٩٧٤ •

ئەکەوێ کە خەڵکی کوردستان بوە و لە ئەستەمۆڵ دانیشتوە • خۆدزکۆ ناوی نالیی لەم ئەحمەد خانە بیستوە کە دۆست و هاوڕێی بوە(١٩) •

وەك وتمان مەسەلەی دیاری کردنی سالی لەدایکبوون و مردنی کەسێك ، شتێك نیە بنیادەم بتوانێ بە ( ئیجتیهاد ) بڕیاری بدا و ، بە بەڵگەو نیشانەی مێژوویی لەوە زیاترمان پێ نەکرا کە تێکڕا هەندێ لەو سالانە دیاری بکەین کە نالییان تیا ژیاوە • بەلام بەڵگەی تریش بە دەستەوە هەیە پێمان ئەسەلمێنێ کەوا نالی نە لە سالی ١٨٥٥ و نە لە سالی ١٨٥٦دا مردوە و نە تەمەنیشی ٥٦ یا ٥٨ سال بوە ، جا خواە ئیتر لە ١٧٩٧دا لە دایك بوبێ وەك عەلی موقبیل ئەڵێ یا لە ١٨٠٠دا وەك ئەوانی تر ئەڵێن •

أ ـ گەلێ بەیتی نالی هەیە وائەگەیەنن نالی گەیشتوەتە تەمەنی پیریەکی ڕاستەقینەو بێهێز بون کە دیارە ئەوەش لە ٥٨ سالیدا پەیدا نابێ، وەك ئەمانە :

١ ـ مۆی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرە شەط
٢ ـ بۆ مەمك ( نالی ) چ مندالانە وەی وەی کردوە
گەرچی مۆی وەك شیرە ، بەو شیرە شکۆفەی کردوە
٣ ـ ئەی تازە جوان ! پیرم و نوفتادە و کەوتوم
٤ ـ من پیرم و فانی

ب ـ ئەوەی پێشتر وتمان کە ئەحمەد پاشای بابان لە ١٨٥٣دا لە پاریس باسی نالیی بو خۆدزکۆی شابەندەری ڕۆسیا کردوە وائەگەیەنێ نالی لەو سەردەمەدا لە شام ژیاوە • چونکە شیرەکەشی کە پاش تێکچوونی حوکمی بابانییەکان بۆ سالی ناردوە بۆ سولەیمانی ، لە شامەوە ناردویە • لە لایەکیکەشەوە هەمو ئەوانەی مێژوی ژیانی نالییان خستوەتە سەر کاغەز باسی ئەوەیان کردوە کەوا نالی پاشان چوەتە ئەستەمۆڵ و لەوێ لەگەڵ

---

(١٩) بڕوانە : محمدی مەلا کریم ، بەرهەمی ئەم چەند سالەی بزوتنەوەی ڕۆشنبیریی کورد و پلانێك بۆ لەمەوپاشمان ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ( ٤ ) سالی ( ٢ ) حوزەیرانی ١٩٧٢ •

ئەحمەد پاشای بابان ماوەیەکی دوّر و درێژیان پێکەوە بەسەربردوە • جا سەرەڕای ئەوە کە لەوانەیە نالی ماوەیەکی زۆریش لە شـام مابێتەوە ئەنجا چوبێتە ئەستەمۆل ، ئەو ماوەی کەمتر لە دوّ ساڵەی تێوان یەکتری دیتنی خۆدزکۆ و ئەحمەد پاشا و مردنی نالی لە ئەستەمۆل لـە ١٨٥٥دا کە ئەڵێن لەو ساڵەدا لەوێ مردوە ، بە پێی توانای هات و چۆی ئـەو سەردەمە بـە حـاڵ بەشی تەنها ڕۆیشتنێکی لەسەرخۆی ئەو چەرخـە ئەکـا ، چ جـای ئەوەش ماوەیـەکی دوّر و درێژی لە ئەسـتەمۆل لەگەڵ ئەحـمەد پاشا بەســەربردبێ •

ج ــ نالی لە شیعرێکیا لە بەرابەری مەرقەدی پێغەمبەر ( د )دا ئەڵێ :

**موددێکە کە هەم گەردشی دەورانی سوپیهرم**

واتە : دەمێـــکە ئــاوارەی نیشتمانــم و ئەســوڕێمەوە و ئێــستا گەیشتومەتە ئێرە • ئەبێ ئــەم ( دەم )ە چەنــد ساڵی خایانــدبێ و ئــەو ماوەیەی لەکوێ بەسەربردبێ و کــوێ گەڕابێ ؟ دیارە نالی ئەم شــیعرەی پاش بۆنەکەی لە شامدا وتوە کە باســان لێ کرد ، کە وەك ڕۆنمان کردەوە ئەبێ لەپێش ساڵی ١٨٥٣دا لەوێ بوبێ ، چونکە هەر لەم پارچە شــیعرەیدا گلەیی لە دەست پیری ئەکا و ئەڵێ :

**ئەی تازە جوان ! پیرم و لوفتادە و کەوتوم**

هەروەها ئەڵێ :

**من پیرم و فانی**

د ــ حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە ( باوکی جەنابی مەلای گەورەی کوّیە ) گێڕاویەتەوە و بێ گومان قسەشی جێگای متمانەیە ، کەوا لە ساڵی ١٢٨٨ی • ك ( ١٨٧١ ــ ١٨٧٢ی • ز )دا نالیی لە مەککە دیوە و کە دیویشیە زۆر پیر بوە ( ٢٠ ) •

---

(٢٠) ئەم بەڵگانـەم هەمو لە دەسنوسێکی مامۆسـتا مەسـعود موحەممەد وەرگرتوە •

# نالی و دلبەرەکەی

کوردی و مەریوانی لە پێشەکیی دیوانەکەی نالیدا (٢١) باسی (حەبیبە)یان کردوە کە نالی گیرۆدەی خۆشەویستیی بوە و کارێکی زۆری کردوەتە بزواندنی هەستی شاعیرانە و خەیالی قوڵی • ئەوەشیان وتوە کە خواستویەتی و بوە بە هاوسەری ژیانی و لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی خۆشەویستیان وەك یار و دلدارێك هەر بەردەوام بوە •

خوالێخۆشبو ئەمین زەکی بەگیش ئیشارەتی بۆ ئەم بابەتە کردوە(٢٢) • هەمو ئەوانەیتریش کە لەبارەی نالیەوە نوسیویانە لەم بابەتە دواون(٢٣) • مامۆستا عەلائەددین سەجادیش باسی ئەمەی کردوە(٢٤) و لەمەش زیاتر ئەڵێ : « نالی لە تەکیەی قەرەداغیش دۆستێکیتری بوە « ئایشە »ی ناو بوە • ئایشە هەمو جار خۆی بەوەوە هەڵئەکێشا کە دلخوازی « نالی » بوە • ئەم ئایشەیە تا ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەهەم مابو • تەنانەت من ئەمەم لە مامۆستا شێخ نوری بابەعەلیەوە وەرگرت کە خۆی ئایشەی دیبو »(٢٥) •

جا مادام مەسەلەی ئەم ئایشەیە پەیوەندی بە تەکیەی قەرەداغەوە هەیە و نالیش لە تەکیە خوێندویەتی و سەرچاوەی قسەکەش خوالێخۆشبو

---

(٢١) کوردی و مەریوانی ، سەرگوزەشتەی نالی ، دیوانی نالی ، بەغدا ١٩٣١ ، ل ( ج ) •

(٢٢) محمد امین زکی ، خلاصة تاریخ الکرد و کردستان ( ترجمة محمد علی عونی ) ، القاهرة ١٩٣٩ ، ص ٣٥٩ •

(٢٣) بۆ نمونە بڕوانەرە : دیوانی نالی کە مەلی موقبیلی سنەیی بلاوی کردوەتەوە . چاپخانەی بەهرامی ، ١٣٢٧ •

(٢٤) علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، ، بەغدا ١٩٧١ ( چاپی دووەم ) ، ل ٢٤١ •

(٢٥) سەرچاوەی پێشو ، ل ٢٤٣ •

مامۆستا شێخ نوری شێخ بابەعەلیـە ( ١٨٩٠ ــ ١٩٥٥ی • ز ) کە پیاوێکی زانا و شیعر دۆست بوو زوربەی تەمەنی لە تەکیەی قەرەداغدا بەسەربردبو و مامۆستا سەجادیش خۆی لێی بیستوە ، ئـەم ڕیوایەتە ڕێی تێئەچێ و بە دوری نازانم •

بەڵام بەداخەوە لـە دیوانەکەیا کەم و زۆر هیچ جـۆرە هێمایەك بۆ ئەم ئایشێیە نیە و تائێستەش چ غەزەل و قەصیدەیەك کە بۆنی ئایشێی لێوە بێ نەبینراوە • بەڵام تێکڕا بۆنی دوو ئافرەت یا زیاتر لە ژیانی شـاعیرێکدا بەتایبەتێ لە هەڕەتی لاویدا شتێکی دور نیە • دڵی لاوێك تا سـەری بـە پەتەوە ئەکرێ و لەتێو ( قەفەزی پۆلاین ! ) یا ( هێلانەی زێڕین ! ) دا توند ئەکرێ سەر بە دەیان لاوە ئـەنێ • نالیش یەکێك بوە لەو هەمو خەڵکی خوایە !

نالی لە چەند لایەکی دیوانەکەیدا ناوی ( حەبیـە ) و لە دو لاشدا ناوی ( مەحبوبە )ی هێناوە • لاموایە مەبەستی لە ( مەحبوبە )ش هەر ( حەبیبە ) بوە ، چونکە بە زاراوی ( صەرف ) ( حەبیب ) لەسەر کێشی ( فەعیل ) پێش ئەوەی بکرێتە ( عەلەم ) بۆ نێر و مێ بەکاردێت و ، حەبیبە تەنها بۆ ئافرەت پاش ئەوەیە کە کراوە بە عەلەم • جا هەندێ جار ( حەبیبە )ی بەکارهێناوە و جاروبارێش ( مەحبوبە ) • هەروەها لاشموایە چ ( حەبیبە ) و چ ( مەحبوبە ) هیچکامیان ناوی ڕاستەقینەی یارەکەی نالی نین ، چونکە لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای ئەوڕۆژەی کوردەواریدا ئاسان نەبوە بۆ مەلایەك دڵی بە ئافرەتێکەوە بۆبێ ، ناوی ئەو ئافرەتە بزڕێنێ و بیخاتە شیعری خۆیەوە ، نەخوازەلا ئەگەر بەتەمای خواستنیشی بۆبێ •

وا لێرەدا ئـەو شیعرانە ئەخەمە پێش چـاو کە ناوی ( حەبیبە ) یا ( مەحبوبە )یان تیایە :

١ ــ جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا

( حەبیبە )ی ( مالیاوا ) ، مالی ئاوا

٢ ـ خەندەو دەمی ( مەحبوبە ) کەوا زۆر نمەکینن
بەس خۆشە ئەگەرخۆ نمەکی زەخم و برینن

٣ ـ پێمدەلێن ( مەحبوبە ) خێل و فیچە ، مەیلی شەڕ دەکا
خێل و فیچە ، یا ترازۆی نازی نەختێ سەر دەکا ؟!

٤ ـ موژگانی سییەهـ مەستە وەکو چاوی ( حەبیبە )
غارەت کە بکەن دێن و دەچن ڕۆح بڕفێنن

٥ ـ لە دنیا جەننەتی باقی تەلاری شاهییە ساقی !
( حەبیبە ) طوڕڕەیی طەوقی ملی شیرین و عەزرایە

٦ ـ ناخ لەگەڵ ئێمە ( حەبیبە ) سەری پەیوەندی نیە
نەیشەکەر قەددە ، بەڵێ بەندی هەیە ، قەندی نیە

٧ ـ ( نالی ) لەبی ( حەبیبە ) هەم طیبە ، هەم طەبیبە
خولاصەیی لەبیبە ، فەرمانبەری لەبی بە

٨ ـ دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی ( حەبیبە )
وەبزانە خوێنی خۆمە ، یا مینەتی ڕەقیبە

وەکو لەپێشەوە باسم کرد ئەوانەی شتێکیان لەبارەی نالیەوە نوسیوە وتویانە ( حەبیبە )ی خواستوە و بووەتە هاوسەری .. بەڵام ناوونیشانی ( حەبیبە )ی هاوسەری نالی ، بەتایبەتی لە ساڵانی دەرەوەیدا ، ونە ، نە لەوە ئەچێ کە لەگەڵ خۆی بردبێتی بۆ حەج و بۆ ئەستەمۆڵ و نە لەوەش ئەچێ کە ئەو دۆستە گیانییەی بە زیندوێ لە کوردستاندا بەجێهێشتبێ .. دوور نیە ، وەك مامۆستا سەججادی لە مێژووەکەیدا ئەفەرموێ ، ( حەبیبە ) پێش سەفەری (نالی) کۆچی دوایی کردبێ .. نەبوونی منداڵ و نەوەش ئەوەندەی تر ڕێ و شوێنی ئەم مەسەلەیەی تاریك کردوە .

لێرەدا جێی خۆیەتی کەمێ لەسەر هەندێ لایەنی بۆچونەکەی مامۆستا ( سەججادی ) بڕۆم و هەندێ شت بخەمە ڕوو :

مامۆستا دەربارەی مان و نەمانی ( حەبیبە ) ئەفەرموێ :

« .... وە زۆرتریش کە نەهاتوەتەوە بۆ سولەیمانێ ( واتە نالی ) هەر لەبەر ئەوە بوە تەماشای کردوە ( حەبیبە )یە نەمـاوە ، دۆستەکان و ئەربابی زەوقی خۆی کە لەگەڵیان ڕابواردوە نەماون ، سەرەڕای ئەمـەش جەوری تورکان ( عوسـانییەکان ) هەر زیادی کردوە . ئیتر دڵخۆشییەکی شك نەبردوە تا زۆ بکاتەوە سولەیمانێ ، بەڵکو لەو بڕە شیعرەیدا کە ئەڵێ :

هەتا تۆم ئاشنا بویت ئاشنا بۆم (٢٦)
ئەمیستا مۆ بە مۆ (٢٧) ئەغیارە بێ تۆ

لە کن من با وجودی ناس و ئەجناس
کەسی تێدا نیە ئەم شارە بێ تۆ

هەمۆ ڕۆژێ لەناو هیجرانی ئەم ساڵ
تەمەننای مردنی پێوارە بێ تۆ ...

وا ئەگەیەنێ کە ( حەبیبە ) تەنیا دۆ ساڵ لەگەڵ ( نالی ) بوە ، چونکە دەردمدلی ئەوە ئەکا ئەڵێ : تا تۆ دۆست و ئاشنام بویت هەمۆ کەسم هەبۆ ، ئیستە کە تۆ نەمـایت هەمۆ کەسم لێ بـۆ بە بێگانە ، لەگەڵ ئـەو هەمۆ مەردمەشا کە لـەم شارە ــ سولەیمانێ ــ دا هەیە هەر لەبەرئەوە کـە تۆ ئەماوی کەسی تێدا نیە ، لەبەر ئەو کۆچە کە ئیمـاڵ تۆ کردت داوای مردنی پێرار ئەکەم ، چونکە پێرار لەبەرئەوە بە تۆ شاد ئەبۆبۆم هەمـۆ دەمێك ئاواتی مردنم ئەخواست ، ئیستە کە تۆ نەمایت کەوتۆمەتە داوا کردنی ئەو مردنە ! .. » (٢٨)

ئەمە ئەصمی فەرمۆدەکەی مامۆستا ( سەجادێ ) بۆ .

---

(٢٦) ڕاستەکەی : ئاشنام بون . (ف)

(٢٧) ڕاسـتەکەی : مۆ بە مۆم . (ف)

(٢٨) علاءالدین سـجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، بەغدا ١٩٧١ ، ل ٢٤٢ ، ( چاپی دووەم ) .

دەبا پێکەوە چاوێ بە غەزەلەکەدا بخشێنین و بزانین ئاخۆ بۆ شێعری پاش مردنی خۆشەویست ئەشێ ، یا هەر مەبەست جیا بوونەوە و دوورکەوتنەوەی بێ مردنە ؟

١ ـ نالی لە سەرەتای غەزەلەکەدا ئەڵێ :

**نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ**
**نەچم شەرط بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ**

با مەعنای ( شەرط و جەزا )ی ڕستەی « ئەگەر نەمردم بێ تۆ ، شەرط بێ نەچم بێ تۆ » لێبدەینەوە . نالی ئەڵێ : تازە ئەمجارە تێکەوتم ، تۆش بۆم ، بێ تۆ چۆم بۆ ئەو خوارە . ئەگەر خوا کردی و لە مەرگ ڕزگار بۆم ، شەرط بێ جارێکیتر بێ تۆ نەچم . ئەمە لەگەڵ مردوودا ئەوترێ یا لەگەڵ زیندوودا ؟ ! ئەی ئەگەر ( نالی ) نەمرد ، هەر وەك نەمرد ، یاری لە گۆڕ دەرئەهێنێ و لەگەڵ خۆیا ئەیبا ؟!

٢ ـ لە بەیتێکیتری ئەم غەزەلەدا ئەڵێ :

**لە کن تۆ خار و خەس گوڵزارە بێ من**
**لە کن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ !**

ئەم گلەیی و بناشتە لەگەڵ مردوودا ئەکرێ یا لەگەڵ زیندوودا ؟ تۆ بڵێی نالی مەبەستی ئەوە بێ بڵێ : تەنانەت لە گۆڕیشدا ، بێ من دڕك و داڵت لە لا گوڵزارە ؟ باوەڕ ناکەم !

٣ ـ ئەمە لەلایەك . لە لایەکیتریشەوە ئەم غەزەلەی کە مامۆستا سەججادی کردوویە بە بەڵگەی بۆچوونەکەی خۆی ، وەك ئەو واتایە هەڵئەگرێ ، ئەوەش هەڵئەگرێ کە دەربڕینی ئازاری جیاییەکیتر بێ ، بەتایبەتی تێکڕای شیعرەکان جیابوونەوەی دووری ئەگەیەنن ، نەك مردن :

**هەموو ڕۆژێ لەناو هیجرانی ئەمساڵ**
**تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ**

قۆندەرە بەکارئەهێنرێ ، بەڵام مانای وشەکە لە بنەڕەتدا وەك وتم پێڵاو و نالی وڵاخ بوە ، ئەوسای زۆر کۆن قۆندەرە نەبوە تا نالی لێ بدرێ ،

ئەمە ئەگەر ناو ( اسم ) بێ ، خۆ ئەگەر کار ( فعل ) بێ ، ئەوا شێوە تۆسینە فارسییەکەی دوو بار هەڵئەگرێ ، یەکەم : نالێ ، واتــە : ناڵاندی و هاواری لێ بەرز بوەوە ، دووەم : نالێ ، واتە قــە ناکات ،

با جارێ واز لــە ( نالێ ) بێنــین و نــەختێ ( نالێ ) و ( نالی ) تاوتۆ بکەین ، بزانین سەرمان لە چیەوە دەرئەچێ ؟

ئەگەر وشەکە ئیسم بێ ئیسبەتە ئەلای نالی وڵاغ و کەوش و بــە مەعنا شتی سەرکوتکراو و ژێر پێ خراوە ، ئەگەر فیعل بێ و وەك مامۆستا سەججادێ ئەڵێ و بۆ غائیب ( نادیار ) بێ ئەوا بە مەعنا ( ناڵاندی ) ئەبێ کە کاری ڕابوردوو ( فعلی ماضی )یە ، یا ( نالێ )یە کە کاری ئێستا و لەمەوپاش ( فعلی مضارع )ە و بە مەعنا ( لا یقول )ی عەرەبییە !

من لام‌وایە نازناوی شاعیر نە ( نالێ )ی مەنسوب ئەلای ( نال )ە و ، نە ( نالێ )ی فیعلی ماضییە و نە ( نالێ )ی موضاریعە ،

یەکەمیان نیە ؛ چونکە زۆر دوورە چەشنی شاعیرێکی پایەبەرزی باوەڕ بەخۆکردووی بەخۆدا نازیوی نا صۆفیی وەك مەلا خدر لەناو هەرچی ناو و نازناوی ئاودار و پــاراوی کوردەواریدا هــەیە وشەی ( نــال )ی وڵاغی هەڵبــژاردبێ و خــۆی دابێتە پــاڵی و خۆی کردبێتــە شتێکی ســواوی سەرکوتکراوی ژێرپێ‌خراوی وەك نال !

ناشتوانین بڵێین ( نالێ ) ئیسمە و نیســبەت دراوەتە پاڵ ( ناڵە )ی بە مەعنا هاوار ، چونکە نیــبەت ئەلای ناڵە ( ناڵەیی )یە نــەك ( نالێ ) وەك ( سالەیی ) نیسبەت ئەلای خێڵی ( ســالە ) یا ( پاوەیی ) نیســبەت ئەلای شاری ( پاوە ) یا ( قاوەیی ) نیسبەت ئەلای ڕەنگی ( قاوە ) ، مەگەر لەسەر ڕێ و شوێنی نیسبەتی عەرەبێ نیسبەتی خۆی دابێ وەك (بەرزنجەیی)یەکان کە بە خۆیان ئەڵێن ( بەرزنجێ ) ، بەڵام ئەوەش دوورە ، چونکە لە مەسەلەی

سالم ئەڵێ :

**توخوا بڵێ بە حەضرەتی ( نالی ) : دەخیلی بم**
**بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانییا گوزەر !**

**ئەم مولکە نەظمی نابێ بە بێ عەدلی واریثی**
**بێ ئەو بە قەصدی ئەم طەرەفە با نەکا سەفەر !**

# نالِیٓ یا نالٓی یا نالیٓ ؟

لە پێشدا با نەختێك لە واتای ئـەم دوو وشـەیە بکۆڵینەوە : ( نالی ) یانێ چی و لە چیەوە هاتوە ، یاخۆ ( نالی ) یانێ چی و بناخەکەی چیە ؟

یەکەم : ( نال ) ، لە فەرهەنگی ( برهان قاطع )دا ئـەڵێ : « ( نال ) لەسەر کێشی ( سال ) نەیچەیەکە ناوەکەی بۆش بێ ، بە عەرەبی پێی ئەڵێن « مزمار » ( واتە : شمشاڵ ) ، هەروەها بە قەڵەمی نوسێن ئەڵێن و بـەو تاڵە باریکانـەش ئەڵێن کە لەناو قەڵـەمی نەیچەدایە ( کە ئەوسـا پێیان نوسیوە و تائێستەش ماوەی ماوە ) ، بەو نەیچە ناوبڕەش ئەڵێن کە تیری لێ دروست ئەکەن ( ئەلبەت مەبەستی حەیزەرانە ) ، بە قامیشی شەکریش ئەڵێن ، بە جۆگەی بچکۆلە و گەورەش ئەڵێن ، ناوی باڵندەیەکی بچوکی زۆر خۆش ئاوازیشە ، بە مەعنای نالە ( نالین )یش هاتوە » (٣٥) .

ئەمانە هەموو مەعنای ( نال )ی فارسی بـوون لـە بورهـانی قاطیعەوە وەرمگێڕانە سەر کوردی ، بەلام ( نال )ی بە لامی بچـوکم لە کوردیدا دەست نەکەوت .

دووەم ( نال ) ، نەعل : بەمەعنا هەر شـتێ لـە پێ بکرێ و پێی پێ بپارێزرێ ، یا نالی ولاخ و ولاخی بەرزە . لەم دواییەشدا بۆ نال و نالچەی

(٣٥) محمد حسین بن خلف تبریزی ، برهـان قاطع ، باهتمام دکتر محمد معین ، تهران ١٣٤٢ ص ٢١٠٤ ، ج ٤ ، چاپ دوم .

( تاریخ جم ) به حیسابی ئەبجەد ئەکاتە ۱۲۵٤ ی کۆچی کە ڕێکەوتی ۱۸۳۸ ی زایینییە (۳۳) .

٦ ـ ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشا لەدوای مردنی باوکی فەرمانڕەوایی سولەیمانیی گرتە دەست و تا سالی ۱۲٦٤ ی کۆچی و ۱۸٤۷ ی زایینی فەرمانڕەوایی کردوە . لەم سالەدا لەگەل سوپای نەجیب پاشای والیی بەغدادا گژان و لەئەنجامدا شکاو ڕایە ئەستەمۆل . عەبدوللا پاشای برای وەك قایمقامێکی مۆچەخۆری عوسمانی لە سولەیمانی دانرا و سوپای تورکیش ڕژایە شار و سەربەخۆیی بابان دوایی هات . عەبدوللا پاشا تا سالی ۱۸۵۱ ی زایینی مایەوە ، ئەنجا ئەویش بەتەواوی لابرا و کاربەدەستێکی تورکی لە شوێندا دانرا (۳٤) .

کەواتە لەگەل ئەم هەموە ڕاستییە تەئریخییانەدا چۆن ئەگونجێ ( نالی ) لە سالی ( ۱۸۳٤ )ی زایینیدا کە هێشتا سلێمان پاشا بەسەر زیندو بوە و سولیمانیی بەتەواوی بۆ تەخت بوە ، نامەی وا پڕ ئازار و جەخاری بۆ سالمی برادەری نوسیبی ؟!

من لاموایە ( نالی ) ئەم نامەیەی یا دوابەدوای شکانی ئەحمەد پاشا و بانگکردنی بۆ ئەستەمۆل ناردوە ، کە ئەکاتە سالی ۱۸٤۷ ی زایینی ، یا پاش بەئێجگاری دەس لەکار کێشانەوەی عەبدوللا پاشای برای و نەمانی دوا دەسەلاتی بنەمالەی بابان ، واتە سالی ۱۸۵۱ ی زایینی کە ئەکاتە سالی ۱۲٦۸ ی کۆچی .

---

(۳۳) یوسف ابکاروفیچ اوربلی ، جداول لتحویل السنوات الهجریة الی السنوات المیلادیة ، ( ترجمة الدکتور حسین قاسم العزیز ) ، مجلة المورد ، الجزء الثالث ، العدد الرابع ، بغداد ، ۱۹۷٤ .

(۳٤) سی . جی . ادموندز ، کرد و ترك و عرب ( ترجمة جرجیس فتح‌الله المحامی ) ، بغداد ۱۹۷۱ ، ص ۵۷ .

شێخ ڕەزای تاڵەبانی ئەڵێ :

له بیرم دێ ( سولەیمانی ) کە داروملوکی ( بابان ) بو
نه مەحکومی عەجەم ، نه سوخرەکێشی ئالی عوسمان بو

له بەر قاپیی ( سەرا ) صەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید
مەطافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت ( گردی سەیوان ) بو

لەبەر تابۆری عەسکەر ڕێ نەبو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای مۆزیقەوو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بو

که عەبدوللاە پاشا لەشکری والیی سنەی شڕ کرد
( ڕەضا ) ئەو وەختە عومری پێنج و شەش طیفلی دەبوستان بو

ئەو ساڵە کە عەبدوڵلا پاشای برای ئەحمەد پاشا لەشکری ( ڕەضا قولی خانی کوڕی خوسرەو خانی ناکام )ی والیی سنەی شکاند ، کە بۆ یارمەتیی مەحمود پاشای مامی عەبدوڵلا پاشا لەشکر کەشیی کردبو ، بەوجۆرە کە ئایەتوڵڵای مەردۆخی نوسیویەتی ، بریتیە له ساڵی ۱۲۵۷ی کۆچی (۳۱) ڕێکەوتی ۱۸٤۱ ـ ۱۸٤۲ی زایینی •

مامۆستای سەججادی تەئریخی لەدایکبون و مردنی شێخ ڕەزای بەمجۆرە نوسیوە ۱۸۳۵ ـ ۱۹۰۹ی ز (۳۲) •

٥ ـ له ساڵی ( ۱۲۵۲ )ی کۆچیدا بە تەواوی فەرمانڕەوایی سولەیمانی بۆ سلێمان پاشا تەخت بو و له (۱۲٥٤)دا وەفاتی کرد • نالی خۆی ئەڵێ :

شاهی جەم جا نالیا ! ( تاریخ جم ) تەئریخیه
تا نەڵێن لەم عەصرەدا ئەسکەندەری جەم جا نەبو

---

(۳۱) شیخ محمد مردوخ کردستانی ، تاریخ مردوخ ، جلد دوم ، بدون ذکر محل و سال طبع ، ص ۱٦٦ ـ ۱٦۷ •

(۳۲) علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، بەغدا ۱۹۷۱ ، ل ۳۷٤ ، ( چاپی دووەم ) •

— ٢ —

ئەستێرە هەمۆ مەحوە لەنێو نوری قەمەردا ،
یا شەمسی جەمالت شەوی گێڕاوە بە فەردا ؟ (١)

خاکی بەری پێت هەم گل و ، هەم گول بە سوروشکم
وەقتی غەم و شادی ئەوە کردۆمە بەسەردا (٢)

---

ڕستەیەوا هەیە بنیادەم سەرسام ئەکا . لە نیوەی دوەمیشیدا لیقتیباس لە ئایەتی «ا انتم انشأتموها ، ام نحن المنشئون» هەیە کە واتە : ئاخۆ ئێوە دروستتان کردووە ( باسی زیان ئەکا ) یان ئێمە دروستمان کردووە ؟ لە کۆکردنەوەی هەردو وشەی ( نیەتی )یشدا سەرەڕای جیناس طیباقیش هەیە .

— ٢ —

(١) فەردا : سبەینێ .

واتە : نازانم چۆنت بشوبهێنم و چۆنت لەگەڵ خەڵکدا بەراورد بکەم ؟ ئاخۆ شەوە و ڕۆناکی و جریوەی ئەستێرەکان لەبەر ڕۆناکیی دەم و چاوت ناتوێنن ( مەبەستی ئەوەیە : جوانەکانیتر هەمو لەماستی تۆدا ون و نادیارن ) ، یاخود خۆری جوانییە بێهاوتاکەت شەوی تاریکی کردووە بە سبەینێی ڕۆشن و ئیتر نە ئەستێرەیە و نە مانگ ؟ نالی لێرەدا شاکارێکی ڕاستەقینەی پیشانداوە ، لە تەشبیهێکەوە بەرز بووەتەوە بۆ تەشبیهێکی بالاتر ، بێجگە لەوە کە گۆڕانی شەو بە ڕۆژ شتێکی نایابە .

لە کۆکردنەوەی ( ئەستێرە ) و ( نور ) و ( قەمەر ) و ( شەمس )دا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی ( شەمس ) و ( شەو ) و ( فەردا )شدا طیباق هەیە .

شەمسی ( جن ) : ڕۆژی .

(٢) خاکی بەری پێت : ئەو خاکەی تۆ بەسەریا ئەڕۆی . سوروشك : فرمێسك . ئەوە : ئەو خاکەیە .

واتە : خاکی بەری پێت بە فرمێسکی چاوم ئەبێ بە لیتە و جاروباریش بە هۆی بارانی فرمێسکی بێ وچانمەوە گوڵی لێ ئەڕوێ و من ئەو خاکە بەو هەردو شێوەیە بەکاردێنم : لەکاتی خەفەتدا وەك تۆز ئەیکەم بە سەرما و لەکاتی خۆشییشدا گوڵە و ئەیدەم لە سەرم .

تەلبیسی نیە ئەو کەسە دێوانەیی ڕۆتە
بێچارە ئەما غەیری حەیاتێکی لەبەردا ! (٣)

ڕەنگی نیە ڕوخسارەیی ڕەنگین و لەطیفی
ڕۆشن بووە ئەم نوکتە ثەباتی لە بەصەردا (٤)

---

لە یەکخستنی ( گڵ ) و ( گوڵ )دا جیناسی موحەڕڕەف و طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( غەم ) و ( شادیی )دا طیباق هەیە . هەروەها هاتنی ( غەم ) و ( شادیی ) دوابەدوای ( گڵ ) و ( گوڵ ) لەف و نەشری مورەتتەبە .

(٣) تەلبیس : ڕیا و فێڵبازیی . لەبەرکردن ( پۆشین ) . دێوانە : شێت . ڕۆت : دەم و چاوت . ڕۆت و قوت .

واتە : ئەوەی عاشق و گورفتاری ڕوخساری نازاری تۆ بێ ، یا لەوکەسەی عاشق و هەژار و بێ بەرگە و ڕۆت و قوت بێ ، ڕیا و فێڵ نازانێ ، یا هیچی نایێ داپۆشێ و خەڵکێ هەمو بە ڕازی ئەزانن ، چونکە ئەم بێچارەیە تەنها گیانێکی لاوازی لە لەشدایە یا لەبەردایە و مرۆڤی‌وا بێ‌هێز و ڕۆت و قوت ڕیا و فێڵبازیی لەکوێ پێ لەکرێ .

لە بەکارهێنانی ( تەلبیس ) و ( ڕۆت )دا بە مەعنای دوهەم طیباق هەیە . لەوەشدا کە ( تەلبیس ) و ( ڕۆت ) و ( لەبەردا ) دوو مەعنا هەڵئەگرن لەطافەت هەیە . شاعیر لەم بەیتەدا ، بەپێی مەعنای دوهەم ، گیانی شوبهاندووە بە پۆشاك و کردویەلیە بەری عاشق .

ڕۆتە ( چیر ) : تۆیە . بەپێی ئەم نوسخەیە ( تۆیە )ش دوو مەعنا هەڵئەگرێ : ( تۆ )ی ضەمیری خیطاب و ( تۆ )ی بەمەعنا لەناو .

(٤) ڕوخسارە : ڕۆمەت . لەطیف : ناسك .

واتە : ڕۆمەلی جوان و ڕەنگینی لەبەر ناسکێ و شەفافێ ڕەنگی نیە و چاو نایبینێ و ئەم شتە لای کەسانی بینا و وریا سەلمێنراوە و جێگیر بووە چونکە چاو ناتوانێ شتی بێ‌ڕەنگ ببینێ .

زاراوەی ( ڕەنگ ) و ( لەطیف ) لە عیلمی کەلام وەرگیراون لە باسی مەلائیکەدا کە جیسمی لەطیفن . لە یەکخستنی ( ڕەنگی نیە ) کە ( بێ‌ڕەنگ ) ئەگەیەنێ و ( ڕەنگین )دا طیباق هەیە .

هەرچەندە کە ئینسانە لە بەرچاوی من و تۆ ،
موسکین نییە ئەم لوطفە لە ئینسان و بەشەردا (٥)

ئیثباتی خەط و خالە ، بە صەد شوشتن و گریان
ناچێتەوە ئەم نوقطە لەنێو دیدەیی تەڕدا (٦)

شەوقی کە ئەبێ باصیرە ، مەئیوسە لە دیتن
هەر شەوقی ئەوە قووەتی دینی بە نەظەر دا (٧)

---

(٥) لوطف : ناسکی .

واتە : هەرچەندە یار بەدیمەن ئادەمیزادە ، بەڵام ئەم جۆرە ناسکییە هەرگیز لە بەرەی ئادەمیزاددا هەڵناکەوێ .

(٦) خەط : خەطی جەوهەری کە لای فەیلەسوفەکان شتێکی وەهمییە و تەنها بە باری درێژیدا بەش ئەکرێ . خال : جەوهەری فەرد کە بە هیچ بارێکا بەش ناکرێ . ناچێتەوە : ناسڕێتەوە . دیدەیی تەڕ : چاوی فرمێسکاوی .

واتە : وێنەی باڵای یار کە وەك خەطی جەوهەریی لای فەیلەسوفەکان وایە لەگەڵ وێنەی دەمی کە وەك جەوهەری فەردە ، لە گلێنەی چاوم دوور ناکەونەوە و بە صەد جار شتن و گریان داناشۆردرێن و ناسڕێنەوە . ئەمەش بەلگەی بوونی خەط و جەوهەری فەردە ، بەپێچەوانەی قسەی فەیلەسوفەکانەوە کە ئەڵێن نین .

لە کۆکردنەوەی ( خەط ) و ( خال ) و ( نوقطە ) و ، ( شوشتن ) و ( گریان ) و ( دیدە ) و ( تەڕ )دا تەناسوب هەیە .

شوشتن و ( هم ) و ( کم ) و ( گم ) : دیدەیی .

(٧) باصیرە : چاو . دین : بینین . نەظەر : چاو . یاخود تەنها سەیرکردن کە مەرج نییە بکاتە زادەی بینین ، چونکە گەلێ جار بنیادەم سەیری شت ئەکا ، بەڵام نایبینێ .

لەوانەیە ئەم شیعرە وەڵامی پرسیارێك بێ لە شیعری پێشووەوە هەڵئەستێ . گوایە یەکێك پرسیار لەکا ئەڵێ ئەگەر ڕاستە باڵای یار خەطی جەوهەرییە و دەمی جەوهەری فەردە ، ئەی تۆ چۆنی ئەبینی ؟ ئەمیش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێ : چاو ئەگەر شەوق و ئیشتیاقی نەبێ نابینێ و هەر شەوق و ئیشتیاقی یارە هێز و توانا ئەدا بە چاو . منیش ئەو شەوق و ئیشتیاقەم هەیە بۆیە ئەیبینم .

ئالوودە نەبێ دا ، بە زەبوونگیریی خوێنم
بۆ کوشتنی من دامەنی پاکی لە کەمەر دا (٨)

« نالی » خەبەری بێ ئەثەری غائیبە ، ئەمما
نالێکی حەزین دێ لە موناجاتی سەحەردا (٩)

---

ئەگەر بشڵێین نالی وەك خەڵكی وشەی شەوقی بە ڕۆناکی مەعنا لێدارەتەوە ، مەعنایەکی تریش ئەگونجێ . واتە : ڕۆناکیی ڕوومەتی یار کە وەك هەتاوە ، بووەتە هۆی بینین ، ئەگینا چاو لە تاریکیدا نابینێ .

قووەتی دینی بە نەظەر دا ( چـر ) : بامینی دیتن بە نەظەردا . ( چن ) و ( لد ) : بامینی بینش لە بەصەردا .

(٨) ئالوودە : گرفتار . تێکەڵ . دا : تا . زەبوونگیریی خوێنم : خوێنی بە داماوێ و بێ‌کەسێ کوشتنم . دامەن : داوێن . کەمەر : پشتێن .

واتە : یار ، بۆئەوەی داوێنی پاکی بە خوێنی بە زەبوونێ کوژراوێکی وەك مـن خوێناوێ نەبێ ، لەکاتی کوشتنما چاکی کرد بە بەری پشتێنەکەیدا . یاخود : یار ، بۆئەوەی زۆ لە کۆڵم بکاتەوە و تووشی گوناهی بە ستەم کوشتنم نەبێ ، چاکی لێ کرد بە لادا و زوو کوشتمی . لەسەر مەعنای یەکەم وشەی ( دامەنی ) ، بەپێی ڕێبازی عیلمی نەحو ، ( متنازع فیە )یە لەنێوان ( ئالوودە ) و (لە کەمەر دا )دا ، واتە هەردوکیانی بەسەرا دێتەوە . لە بەکارهێنانی وشەی ( دامەن ) و ( پاکی )دا لەطافەت هەیە کە ئیشارەتە بۆ داوێن‌پاکیی یار .

دا ( مم ) و ( کم ) و ( گم ) : تا . پاکی ( جن ) و ( لد ) : چاکی .

(٩) خەبەری بێ‌ئەثەر : دەنگ‌وباسی بێ سەر و شوێن . غائیب : نادیار ، ئەوەی ماڵ و حاڵ و کەس و کاری خۆی بەجێ‌هێشتبێ و نەزانن لەکوێیە . نالێکی : نالەیەکی . موناجاتی سەحەر : پاڕانەوە لە خوا لەکاتی بەرەبەیاندا .

واتە : نالی تەنها دەنگ و باسی کەسێکی نادیاری بێ سەر و شوێنە ، ئەوەندە هەیە کە نۆزەیەکی خەمگینی پاڕانەوەی دەمەوبەیان بەرگوێ ئەکەوێ ، هەر ئەوە هەیە ڕێ‌بەدێ‌یەکی ئەوی پێ بکرێ و سەر و شوێنێکی ئەوی پێ بدۆزرێتەوە .

لە کۆکردنەوەی ( نالی ) و ( نالێکی ــ نالەیەکی ) دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە . ئەمەش یەکێکە لەو بەڵگانەی بۆمان دەرئەخەن نازناوی شاعیرمان ( نالی ) بووە نەك ( نالێ ) .

بێ‌ئەثەری ( چر ) : بێ‌ئەثەرە . ( ت ) : بێ‌ئەثەر و .

تا تایی سەری طوڕڕەیی پڕ پێچشی با دا ،
هەر تایەکی بارێکی گوڵ و نافە بە با دا (١) ■

گوڵ هاتەدەرێ ، لافی لە حوسنی بوتی ما دا
لەرزێ قەدی بەرزی ، لە ڕقا زوڵفی کە با دا (٢)

شەو چەپکەنی نەیلۆفەرێ‌بو جیلوەیی ڕەقصی
شەرمندە دەکا زوهرەیی زەهرا لە سەمادا (٣)

---

- ٢ -

(١) تا : تاڵ . طوڕڕە : زوڵف . پڕ پێچش : ئەوەی لوولیی زۆر تیابێ .
تایەکی : تەلە مویەکی . نافە : موشکی بۆنخۆشی بن ناوکی ئاسك .

واتە : هەر ئەوەندە کە یار سەری زوڵفی لوولی خۆی با دا ، هەر تەلە مویەکی یەك بار گوڵ و موشکی بۆنخۆشی دا بە دەم باوە و دنیای پڕ کرد لە بۆن و بەرامەی خۆش .

لە کۆکردنەوەی ( تا )ی یەکەم و دووەم و سێهەم و کۆکردنەوەی ( تـا )ی دووەم و ( بار )دا ، کە بار دوو تایە ، تەناسوب هەیە . جگە لەو موبالەغەیەش کە لە کات و کۆکردنەوەی تا و باردا هەیە کە چۆن یەك تەل موی بەرامبەر یەك بار گوڵ و نافە داناوە لەو کاتە کەمەدا .
لەنێوان هەردو ( با دا )شدا جیناس هەیە .

بارێکی ( چن ) و ( ت ) : صەد باری .

(٢) بوت : بت . ما : ئێمە ، وشەیەکی فارسییە .

واتە : گوڵ لەژێر ئەرز هاتەدەرێ ، کەوتە فیشاڵ کردن گوایە لە یارە باڵا وەك پەیکەرەکەی ئێمە جوانترە .. بەڵام کە یار لە ڕقی ئەم قسەیەی گوڵ زوڵفی خۆی با دا ، باڵای بەرزی گوڵ بە بای تاڵە موەکانی زوڵفی یار کەوتە لەرزین و خۆی پێ ڕاگیر نەکرا و کەوت ..

لە کۆکردنەوەی ( ما دا ) و ( با دا ) و ، ( لەرزێ ) و ( بەرزێ )دا جیناسی لاحیق هەیە .

ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەکانی ( عم ) و ( گم )دا هەیە .

(٣) چەپکەن : جل و بەرگی ڕازاوەی شەو . نەیلۆفەرێ : ڕەنگی وەك ڕەنگی گوڵە نەیلۆفەر شین . نەیلۆفەر گوڵێکە لە ئاوا لەڕوێ ، لەگەڵ

■ بە بڕوای من بارێنە و تایە · چونکە هەم جیناسی تێدایە و هەم لوتفی شیعرەکە زیاتر دەکا ·-تا-یانی لایەکی بار کە کەمتری موبالەغە تێدایە· تایە بە مانا کێشەشی هەیە وموبالەغە پترە

خۆش صوبح دەمێکە کە بە خەندە دەنوێنێ
بەس ذەڕڕەیی خۆرشید لە ذەڕڕێکی سوهادا (٤)

دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە
بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا (٥)

---

خۆرکەوتندا سەر دەرئەهێنێ و لەگەڵ ئاوابونیا ئەچێتەوە ناو ئاوەکە . ڕەقص : سەما . زوهـرە : یەکێکە لە ئەستێرە گەورە گەڕۆکەکـان ، پێیشی ئەڵێن زوهرەی ڕەققاص ، واتە سەماکەر . زەهرا : جوان . سەما : ئاسمان یاخود هەر بە مەعنا کوردیەکەی .

واتە : جلی شینی شەوانەی یار و دەرکەوتنی لە مەیدانی سەمادا ، ئەستێرەی جوانی زوهرە لە ئاسمانا یـا لەکاتی سەماکردنا شەرمەزار ئەکا هەرچەند ناوبانگیشی بە سەماکەر دەرچووە .

(٤) صوبحدەم : بەرەبەیان ، یان دەمی وەك ڕۆژ پاك و ڕۆشن . دەنوێنێ : دەرئەخا . بەس : زۆر . ذەڕڕەیی خورشیـد : وردە تیشکی خـۆر . سوها : یەکێکە لە ئەستێرە نادیارەکانی حەوتەوانە ( بنات النعش ) .

واتە : ئای بەرەبەیانێکی چەند خۆشە کەوا یار بە پێکەنینی خـۆی ناز و خۆشـیی وەك وردە تیشکی خـۆر لە دەمێکی بچکـۆلانەی وەك ئەستێرەی سوهاوە بـڵاو ئەکاتەوە کە لە بچکۆلەییـدا وەك جەوهەری فەرد وایە . یان : ئای ، دەمی یار چۆن دەمێکی وەك بەرەبەیان خاوێن و جوان و ڕۆشـنە کە بە پێکەنین دانەکانی ـ کە وەك وردەی خـۆر وان ـ لە دەمێکی وەك ئەستێرەی سوها بچکۆلەوە دەرئەخا .

لە کۆکردنەوەی (خورشید) و (سوها)دا لەو ڕووەوە کە هەردوکیان لە یەك جۆرن ، تناسـب و ، لەو ڕووەوە کە گەورە و بچوکن ، طیبـاق هەیە . لە کۆکردنەوەی ( دەنوێنێ )یشدا کە بە مەعنا ( ئەخەوێنێ )یش دێت ، لەگەڵ ( صوبحدەم )دا کە کاتی خـەو نیبە لەطافەتێك هەیـە . پیشاندانی ( ذەڕڕاتی خورشید )یش لە ئەستێرەی ( سوها )دا کە لـە خورشید زۆر بچوکترە ، موبالەغەیەکی جوانی تیایە .

(٥) دەم دەم : جار جار . زار : دەم . گۆیا : گوایە .

واتە کە یار جار و بار دەمـی ئازاردەری خـۆی ئەکا بە خونچـەی نەپشکوتو و قوتی ئەکاتەوە ، بەم کردارەی وەڵامی دڵدارەکانی ئەداتەوە کە داوای ماچی لێئەکەن و ئەم بە خونچە کردنەی دەمی مەعنای ئەوەیە کە ماچی دەمی نادا و گوایە ئەڵێ وەرن ماچی لێوم بکەن . یاخود مەعنای

**سهم ألف القد فقد صاد فؤادي •**
**صاد هو من عينه ، قد صاد فـادا (٦)**

---

ئەوەیە دەمی بۆ ماچکردنی لێوی بانگەواز ئەکا . بەم‌پێیە وشەی ( نادا ) عەرەبییە و لە بناخەدا ( نادی )یە .

ئەم مەعنایەش ئەگونجێ : یار کە جار جار بە خونچەی لێوی دەست ئەکا بە گریان و دڵی دلدارانی بریندار ئەکا ، بەو گریانەی بانگیان ئەکا بێن لێوی ماچکەن ، بۆیە دەمی گریای ناخاڵە کار و بە وتن بانگیان ناکا .

لە کۆکردنەوەی ( دەم دەم ) و ( دەم )دا تەناسوب و جیناس و لە کۆکردنەوەی ( زار ) و ( ئازار )دا جیناسی ناتەواو هەیە . جگە لەو جوانییەش کە لە کۆکردنەوەی ( دەم ) و ( زار )دا هەیە .

دەم دەم کە دەکا ( چر ) و ( چن )و ( ك ) : هەرچەندە دەکا .

(٦) واتە : باڵای وەك پیتی ( ئەلف ) باریك و بەرزی یـار ، تیرە ، چـونکە ئەوەتە دڵمی ڕاو کردووە . لە چاویشـیا وەك پیتی ( صـاد ) وابـە ، کردۆمی بە نێچیری خۆی و بەسەرما سەرکەوتووە . جاران باو بـووە چاویان لە گەورەییدا ، کە نیشانـەی جوانییە ، شوبهاندووە بە پیتی ( صـاد ) .

لەم شیعرە بۆ ئەوە دەست ئەدا گەلێ جۆرە یاریی تیا بە وشە بکرێ. بۆ نموونە بشخوێنرێتەوە :

**صه من الف القد ، فقد صاد فوآدي**
**صاد هو من عينه ، قد صار فسادا**

واتە : تۆ لێ‌گەڕێ لە ئەلفـی باڵای یار .. ئەو بـە پیتی ( صـاد )ی چاوەکانی منی ڕاو کردووە و بـووە بە هۆی مـاڵ وێرانیم . یـاخود ( صادِ ) بێ بە مەعنا تینۆ و مەعنای شیعرەکە وای لێ‌دێتەوە : تینۆیەك لە چاوی یارەوە ، یا تینۆیەك لەسەر کانیی یارەوە منی کردووە بە نێچیر . بەم پێیە ( عین) لە یەك‌کاتا هەم بە مەعنا ( چاو )و هەم بە مەعنا (کانی)یش بەکارهێنراوە .

بەپێی ئەوەش کە مامۆستای جنگنیانی لەجیاتیی ( قد صاد فسادا ) نوسیوبە ( قدصاد فصادا ) و لەسەری نوسیوە ( من الفصد ) ، مەعنای ئاخری شیعرەکە وای لێ‌دێتەوە : بۆ بە هۆی خوێن لێ چۆنم .

لە کۆکردنەوەی ( الف ) و ( عین ) و ( صاد ) و ، ( الف ) و ( قد )دا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی ( صادْ ) و ( صادً ) یا ( صادٍ )دا جیناسی

بۆ ماچی دەمی ڕەنگە لە عیشوەی خەمی ئەبرۆی
جۆیایی بەقا خۆی لە دەمی تێغی فەنا دا (٧)

« نالی » کە غولامی مەدەدی زولف و برۆتە
شاهێکە لە بن سایەیی بالی دوو هومادا (٨)

---

موحەڕڕەف و ، لە کۆکردنەوەی ( صاد ) و ( صار ) و ، ( صاد ) و ( ساد )دا جیناسی لاحیق و ، لە بەکارهێنانی ( عین )دا بە دوو مەعنا لەطافەت هەیە .

عینە ( کم ) : عینك . قد صاد فسادا ( چن ) : قد صار فصادا . ( عم ) و ( گم ) : قد صادف صادا .

(٧) عیشوە : ناز . خەم : چەماوە ، وەك کەوان . جۆیایی بەقا : ئەوەی بەتەمای ژیانی هەمیشەییە .

واتە : ناز و خەمزەی کەوانی ئەبرۆی ئەوەندە دڵ ڕاکێشەرە لەوانەیە ئەوەی بەتەما بێ بگاتە کانیی ئاوی حەیات ( کە دەمی یارە ) تا لێی بخواتەوە و نەمرێ ، گوێ نەداتە ئامانجەکەی خۆی کە نەمردنە و بۆ گەیشتن بەو کانییە خۆی بداتە بەر تێغی برۆی یار و لەپێناوی ژیانا بمرێ ! چەند جوانە نازی یار ئەوەندە کاریگەر بێ دلدار ڕابکێشێ و وای لێبکا لەپێناوی ژیانی هەمیشەییدا گوێ بە مردن نەدا .

لە کۆکردنەوەی ( دەم ) و ( ئەبرۆ ) و ( دەمی تێغ )دا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی ( بەقا) و ( فەنا )دا طیباق هەیە . جگە لەوەش کە وشەی ( بەقا ) و ( فەنا ) ئیشارەن بە دوو حالی صوفییانە و ، سەرەڕای ئەو حوسنی تەعلیلەش کە تیایەتی .

(٨) غولام : نۆکەر . مەدەد : یارمەتی . هوما : باڵندەیەکە ئەڵێن بەسەر هەرکەسێکەوە بنیشێتەوە ئەبێ بە پادشا .

واتە : نالی کە لەڕاستیدا بەندەی جوتی زولف و برۆی تۆیە ، لە بن سێبەری باڵی ئەو جوتە زولف و برۆیانەدا کە سێبەریان بۆ کردووە و بەسەر سەریەوە نیشتوونەتەوە ، بووە بە پادشا .

لە ( باڵی دوو هوما )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و ( زولف ) و ( برۆ )ش قەرینەیە و ، لە کۆکردنەوەی (زولف) و (برۆ)دا تەناسوب و، لە کۆکردنەوەی ( غولام ) و ( شاه )دا طیباق هەیە .

نیوەی دووەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( کم )دا بەم جۆرەیە :

**شاهێکە لە بن سێبەری دوو باڵی هومادا** *

*. بە من ئەم نیوە شیعرە ڕاستترە ، چونکە هوما کە بە کوردی پێی دەکوترێ ( بەرۆزە ) وەك هەموو باڵندەیەکی بەرزەفڕ دوو باڵی هەیە و برۆش لە بەرزایی باڵای یاردا هەڵکەوتوە .

— ٤ —

تەبەسوم دەردمخا حوققەی دەم و جەوهەر لەبێو ئەودا
بەلێ مثقالە ذەڕڕە ظاهیرە جیلوەی لە پڕتەودا (١)

بە پارێك نامەوێ دەرمان ، لە نەشئەی چاریە عیللەت
بە پوڵێك ناکڕم عەنبەر ، لەگەڵ زولفی ئەوە سەودا (٢)

ڕەقیبی جوفتەلێ ، نایێتە نەخچیرت ، کە خەرکوڕڕە
ئەلیفی چایرە دائیم لە قەشقەی کەردڕ و جەودا (٣)

---

— ٤ —

(١) تەبەسوم : زەردەخەنە . حوققە: قوتوی بچوك . جەوهەر: جەوهەری فەرد ، ئەو پارچەیەی کەرت ناکرێ . پڕتەو : تیشك ، ڕووناکی .
واتە : زەردەخەنەی وەك زۆر جوانی یار ، دەمی دەرئەخا کە وەك قوتوی بچوکی مەتلار وایە و ، لەناو قوتووەکەشدا ددانەکانی دەرئەخا کە ئەوەندە وردن ئەڵێی جەوهەری فەردن . ئەمەش شتێکی سەیر نییە ، چونکە شتی لەوەندەی ذەڕڕە ورد ، هەر لەبەر تیشکی خۆردا دەرئەکەوێ . .
لە هێنانی نیوەی دوەمی ئەم بەیتە بەدوای نیوەی یەکەمیدا ، حوسنی تەعلیل هەیە . نالی لەم بەیتەدا دەمی یاری شوبهاندووە بە قوتوی بچوکی بۆن خۆشێ و جەوهەری خواستووە بۆ ددانەکانی و پڕتەوێشی خواستووە بۆ زەردەخەنە . لە کۆکردنەوەی ( حوققە ) و ( جەوهەر )یشدا تەناسوب هەیە .

(٢) پارێك : پارەیەك . نەشئە : مەستێ . پوڵ : نەختێکی کەم و بێبایەخ بووە . سەودا : مامەڵە .
واتە : من دەردەداری چاوی مەستی یارم ، لەبەرئەوە دەرمانم بە پارەیەکی کەمیش ناوێ .. مادەم سەودا و مامەڵەشم لەگەڵ زولفی بۆنخۆشی یارە ، عەنبەر بە پوڵێ ناکڕم .
لە هەردو نیوە شیعرەکەدا حوسنی تەعلیل و لە کۆکردنەوەی (پوڵ) و (پارە) و (دەرمان) و (عیللەت) و (ناکڕم) و (سەودا)دا تەناسوب هەیە .

(٣) ڕەقیب : بەدکار . جوفتەلێ : جوتە هاوێژ . نەخچیر : نێچیر . خەرکوڕڕە : جاشۆلکە . ئەلیف : هۆگر . چایر : هەرێز و سەوزەگیا

سیلاحی پەرچەمی پڕ خەم ئەگەر تارە و ئەگەر مارە
برۆ و غەمزەی کەوان و تیر ئەگەر هەودا و ئەگەر مەودا (٤)

لە ئەشکەنجەی شکەنجی زولفی ئەو بێ وەعدە مورغی دڵ
دەناڵێنێ وەکو بولبول لە صوبحی کاذیبی شەودا (٥)

---

کە وڵاخی پیا لەلەوەڕێ . لەشقە : بۆمان ڕاست نەکرایەوە مەعنای چییە . وای بۆ ئەچین بەپێی موناسەبەلی شوێن ( مەشقی ) یا ( مەلقی ) بێ . کەردز : گیایەکە لە چەشنی کنگرە کەرانە . جەو : جۆ .

واتە : بەدکاری جۆلە هاوێژ کەی بۆ ئەوە ئەشێ ببێ بە نێچیری تۆ ؟ ئەو هەمیشە هەر لەگەڵ ئالیك و لەوەڕدا سەر و سەودایەتی .

ڕەقیبی جوفتەلێ ( کم ) و ( گم ) : ڕەقیبت خوفتە بێ . ( ت ) : ڕەقیبێ خوفتە بێ . نەخچیرت ( کم ) و ( گم ) : نێچیرت .

(٤) پەرچەم : زولف . پڕ خەم : پڕ پێچ و لوول . تار : تاریك . تاڵی مو . غەمزە : چاو داگرتن ، ئیشارە کردن بە چاو . هەودا : تاڵ . مەودا : تیژێ .

واتە : چەکی زولفی لوولی یار کاریگەر و ترسێنەرە ، چ ئەگەر لەبەر ڕەشی و تاریکی بێ و چ ئەگەر لەبەر پێچ و لوولی بێ . برۆی وەك کەوان و ئیشارەتی چاوی وەك تیریشی هەر کاریگەرن چ لەبەر باریکی بێ و چ لەبەر تیژی بێ .

لە کۆکردنەوەی ( پەرچەم ) و ( پڕ خەم ) و ، ( تار ) و ( مار ) و ، ( هەودا ) و ( مەودا )دا جیناسی لاحیق هەیە .

(٥) ئەشکەنجە : ئازار . شکەنج : لوولێ و چین چینیی زولف و قژ . مورغ: پەلەوەر . صوبحی کاذیب . کاتێ کە پێش ڕۆژبوونەوە کەناری ئاسمان تۆزێ ڕۆشن ئەبێتەوە و نەشارەزا وائەزانێ بەرەبەیانە .

واتە : پەلەوەری دڵم کە گرفتاری داوی زولفی یاری بێ‌گفت و پەیمانە و ، ئازاری پێوە ئەچێژێ ، لەناو داوی زولفەکانیەوە و بە دەم ئەو ئازار و سزایەوە ، سەیری ڕوومەت و ڕۆی ئەو ئەکا و بەو هیوایە بێ‌سوود بۆ خۆی ئەناڵێنێ ، وەك ئەو بولبولەی لە تاریکیی شەودا بەیانییە درۆزنە بە کەناری ئاسمانەوە بەدی ئەکا و دەست ئەکا بە خوێندن ، بە تەمای ئەوەیە شەبەق بدا و ڕۆژ بێتەوە کەچی لە شەوی تار بەولاوە هیچی دەسگیر نابێ .

بە تیری دوو نیشانە چا نیە ئەی ڕۆحەکەم ! شیرین
بە غەمزەی ، تاقە یەك تیری لە فەرهاد و لە خوسرەو دا (٦)

وەها مەستی تەماشای چاوتە « نالی » کە نازانێ
بە بێداری دەبینێ ، یا لە نەشئەی مەستیی‌ یو خەودا ! (٧)

— ٥ —

جۆشش و تابە لەنێو دیدەیی گریانمدا
چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی طۆفانمدا (١)

---

لەنێوان ( ئەشکەنجە ) و ( شکەنج )دا جیناسی ناتەواو هەیە ، جگە لەو تەناسوبەش کە لە یەکخستنی ( مورغ ) و ( دڵ ) و ( نالین ) و ( بولبول )دا هەیە . لە یەکخستنی ( صوبح ) و ( شەو )یشدا طیباق هەیە . ( صوبحی کاذب )یش ئیشارەتە بۆ زاراوێکی ئایینێ کە دوو فەجری تیا بەکارئەهێنرێ ( فەجری کاذب ) و ( فەجری صادق ) و یەکەمیان هێشتا هەر شەوە و دووەمیان کاتی نوێژی بەیانی دادێ .

(٦) چا : چاك .

واتە : گیانە ، باش نیە بە تیرێ دوو نیشانە بپێکی . ئەوە پەشیمانی و ماڵ وێرانیی لەدوایە . نابینی کە شیرین بە تاقە تیرێك دڵی خوسرەویش و فەرهادیشی پێکا ، کەچی لەئەنجاما هیچ کامیانی دەست نەکەوت و تەنانەت خۆیشی بە فەتەرات چوو . لەوانەیە مەبەستی نالی لە دوو نیشانەکە دین و دنیا بێ ، واتە : بە تیری چاوت دینیش و دنیاشت لە دەست دام .

(٧) واتە : نالی بە ڕادەیەك بە تەماشا کردنی چاوە مەستەکانت گرفتار بووە و کەوتووەتە دەریای خەیاڵەوە ، نازانێ ئاخۆ بێدار و بەخەبەرە کە ئەلبینێ ، یاخود خەو ئەبینێ و کاسی سەرخۆشییە !!

— ٥ —

(١) جۆشش : کوڵان . تاب : تاوی باران . دیدەیی گریان : چاوێ کە بگرییت . تەندوورە : تەنوورە ، گێژی قووڵی ئاو . طۆفان : لافاو .

واتە : لە چاوی بەگریانەوەمدا هەم کوڵان و هەم تاوی بارانیش هەیە . چەند سەیرە لەناو تەنوورەی گێژی لافاوی فرمێسکی چاومدا تەنوورێکی

شەبەهی زوڵفی شەبەهـ گونەیە ، ڕوگەردانی •
بە سەری ئەو کە بە سەودا سەر و سامانم دا (٢)

شەرەر و تابش و بارش لە دەمی ڕەعدی بەهار
ئەثەری سوزشی گریانە لە ئەفغانمدا (٣)

---

بە گڕ و بڵێـــە بگرێ و ئـەو ئاوە زۆر و بەگوڕمــە ئەو ئاگرەی پــێ نەکوژێتەوە !

لە کۆکردنەوەی ( جۆشـش ) و ( تـاب )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( تەنور ) و ( تەنـدور )دا بێجگە لە طیبــاق جیناسی ناتــەواو و ، لە کۆکردنەوەی ( تەنور ) و ( طوفـان )دا ئیقتیبـاس لە ئـایەتی ( و فـار التنور ) هەیە کە واتە تەنوری ئاگر هەڵچو و ئاوی بەگوڕم هەڵقوڵـێ ، کە باسی لافاوەکەی حەزرەتی نوح ئەکا ( د . خ ) .

تابە (چن) و (عم) و (گم) و (ك) : تاوە . لەنێو (چن) و (کم) : لەناو .

(٢) شەبەهـ ( ی یەکەم ) : وەك . شەبەهـ ( ی دووەم ) : موروی شــەوە . گونە : چەشن . ڕوگەردان : ڕو وەرچەرخاندن . سەودا : عەشق . ســامەڵە .

واتە : کە من سەر و سامانی خۆم لە دلداریدا ، یا بە مامەڵــە ، دا بە سەری زوڵــفی یار و ئەویش نەیدا و ڕوی وەرچــەرخاند ، زوڵفی ڕەشی دەرخـــست و دنیای لێ تاریك کردم . ئەو ڕو وەرچەرخاندنــەی ئەو ، بە وێنەی زوڵفەکانی ، وەك شەوە ڕەش و تاریك بون .

ئەشکونجێ مەعنای بەم جۆرە بێ : ڕو وەرچەرخاندنی یــار لە مــن تاڵ و تاریکە وەك ڕەشـیی زوڵفەکانی کە وەك شـەوە وان . بەڵام تازە من گوێ بەم جۆرە دەرد و ئازارانە نادەم ، چونکە سەر و ماڵم لە ڕێگـای عەشقیدا داناوە و هیچم بەدەستەوە نەماوە و کەوتومەتە سەر ســاجی مەلێ .

لەنێوان هەردو ( شەبەهـ ) و هەردو ( سەر )دا جیناسی تەواو هەیە . لە کۆکردنەوەی ( ڕو ) و ( گونە )یشدا تەناسوب هەیە .
بە سەودا ( چر ) : بۆ سەودا .

(٣) شەرەر : پریسکە . تابش : گڕ سەندن . بارش : بــارین . دەم : کات. ڕەعد : هەورە گرمە . سوزش : سوتان . ئەفغــان : هاوار .

تۆ کە حۆریت ، وەرە ئێو جەنەتی دیدەم ، چۆنەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانمدا ؟! (٤)

قیمەتی ماچی دوصەد کیسەیی ساغە و ، نیمە
غەیری یەك کیسەیی صەد پارە لە گیرفانمدا (٥)

---

واتە : بریسکە و گڕ سەندن و بارانی سەردەمی هەورە بروسکە ، لە دڵ هەڵقرچان و گریان و هاواری منەوەیە .

لە دێڕی یەکەمدا لەف و لە دێڕی دووەمدا نەشری مورەتتەب هەیە، بێجگە لەو موبالەغە و زیادە ڕەوییەش کە نیایەتی کە تێکرای چەخماخە و هەور و بارانی کردووە بە بەکێ لە نیشانەکانی گریانی خۆی .

نالی لەم شیعرەیدا تەشبیهی مەقلوبی بەکارهێناوە . چەخماخەی هەوری شوبهاندووە بە سۆتانی خۆی و باران بە فرمێــــك و گرمەی هەور بە نالینی .

شەرەر و تابش و بارش ( چن )و ( ك ) : تابش و بارش و نالــش .
سۆزشی ( چن ) : جۆشش .

(٤) حۆری : حۆریانی بەهەشت . سۆزان : گڕ لێبەربو .

واتە : تــۆ کە حۆریت ، جێگەت ئەبێ بەهەشــت بێ . کەواتە چۆن ئەکەی لەناو دۆزەخی دڵــەی پڕ لە بڵێســەی ئاگــر و ســینــەی گــڕ لێبەربوی منــدا . وەرە ناو بەهەشتی چاوەکانم کە بەهۆی فرمێسکەوە هەموی بووە بە باخ و گوڵ و گوڵزار .

نالی بەم شیعرەی ئەیەوێ بڵێ با بەسی بێ دۆری و با بەس جەر بیر لێ کردنەوەتم پێ ببڕێ . نزیك بکەوەرەوە لێم و وەرە بەرچاوی پــڕ لە گریانم ، بزانە لە چ حاڵێکدا ئەژیم ..

لەم ( کم ) و ( ت ) و ( ك ) : لە .

(٥) کیســە : لەندازەیەك پــارە بووە وەك بڵێی هــەزار دینار ، خــراوەتە تورەکەیەك و بە دەســت هەڵگیراوە . صــەد پارە : پینە پینەی لە صــەد پارچە دراوە یەك .

واتە : پێداویستی دەستکەوتنی ماچی یار لەکوێ و دەســەڵاتی من لەکوێ ! ماچێکی یار بە صــەد کیســەی ســاغ پارە دەست ئەکەوێ و منیش لە کیســەیەکی شڕی لە صــەد پارچە پەڕۆ دروستکراو بەولاوەم نییە کە خستومەتە گیرفانم .

لەنێوان هــەردو وشــەی ( کیســــە )دا جیناسی تــەواو و ، لەبەینی ( دوصــەد ) و ( صــەد ) و ( یەك )دا تەناسوب و ، لە بەینی ( ســـاغ ) و

شیرەیی جاله وتم یا مەیە ؟ چا بۆ فەرمۆی
عەکسی لەعلی لەبی مەرجانه له فنجانمدا (٦)

بەحثی سیڕڕی دەمەنی نوقطه بە نوقطه بگەڕێی
سەری مۆیێ نییه بێ نوکته له دیوانمدا (٧)

« نالی » ، ئەو نوقطه کەوا بۆ بە نیشانەی چاوی
من له صەفحەی ڕوخی ئەو دولبەرە نیشانم دا (٨)

---

( صەد پارە )دا طیباق و ، له بەینی ( ساغ ) و ( نیمە )شدا هەر طیباق هەیە .

یەك ( مم ) : ئەم .

(٦) شیرە : شیلە . جان : گیان . چا : چاك ، یا چایێ . عەکس : وێنە . لەبی مەرجان : لێوی وەك مەرجان سوور .

واته : وتم ئاخۆ شیلەی گیانە و خوێنە کراوەتە کاسە ، یاخود شەرابە و ئامادەی لێو کراوە ؟ باش بو یار له وەڵامدا فەرمۆی وێنەی لەعلی لێوی وەك مەرجانمە لەناو پیالەکەمدا . یاخود : هیچیان نەبو ، چایێ بوو بە دەمی یارەوە وێنەی لەعلی لێوی وەك مەرجانی ئەوی وەرگرتبو چونکە لەو نلبۆی بە لێویەوە و لێوی له پیالەکەدا ڕەنگی ئەدایەوە .

له بەکارهێنانی وشەی ( چا )دا کە دۆ مەعنا ئەگەیەنێ لەطافەت هەیە .

شیرەیی جانه ( « بەراوێزی » چر ) و ( عم ) : شێوەیی جامە .

(٧) سیڕڕ : نهێنی . دەهەن : دەم .

واته : خاڵ بە خاڵی باسی ڕازی جوانیی دەمی یار بکەڕێی له دیوانەکەمدا ، ئەوەندەی سەرەمۆیەك بابەتی بێ نوکتە و وردەکاریت ناکەوێتە بەردەست . ئەمەیش شتێکی زۆر لەجێیە ، چونکە دەمی یار ئەوەندە بچوکە وەك جەوهەری فەرد وایە ، هەرچییش پەیوەندی بەو دەمە جوانەوە بێ ، پێویستە زۆر ورد و بە مەعنا بێ .

بگەڕێی ( چر ) و ( عم ) و ( ت ) و ( ك ) و ( مز ) : بکرێ .

(٨) نوقطه : خاڵ . صەفحە : تەخت . ڕوخ : ڕۆ .

واته : ئەو خاڵەی بۆ بە نیشانە بەسەر چاوی نالییەوە ، بە تەختی ڕۆی یارەوە بۆ ، من پیشانی ئەوم دا و لەوەوە ئیتر لەسەر چاوی ئەو جێی خۆی گرت . لەوانەیە ئەم بەیتە بکرێ بە بەڵگەی ئەوە کە نالی چاوی لانەی بەسەرەوە بووە .

— ٦ —

گەر بێیە دەرێ ، سەروی زەوانی لە ئیرەمدا
وەرە نەیە دەرێ ، ئاهوری چینی لە حەرەمدا (١)

عیشقت لە دڵ و دیدەیی پڕ ئەشك و ئەلەمدا
گونجایش و تەسکینی نیە ، زۆرە لە کەمدا ! (٢)

---

— ٦ —

(١) زەوان : ڕێك وپێك . ئیرەم : باخی ئیرەم ، ئەو بەهەشتەی کە شەدداد دروستی کردبو و قورئان لە ئایەتی ( ارم ذات العماد ، التي لم يخلق مثلها في البلاد )دا ئیشارەتی بۆ ئەکا . مەبەستی لە کۆمەڵگای کچانی شۆخ و نازدارە . ئاهـۆ : ئاسك . حەرەم : حەرەمی کەعبە کە ڕاوکردنی تیا قەدەغەیە .

واتە : تۆ لە هەمو حاڵێکدا جوان و نازداری ، چ لە دەرەوە بی و چ لە ژورەوە . لە دەرەوە بی وەك سەرو باڵابەرز و دیاری لەناو جوانانا و لە ژورەوەش بی وەك ئاسکی چینیی ناو حەرەمی کەعبە وای کە کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ . شوبهاندنی یار بە ئاسکی چینێ ئەبێ لەبەر ئەوە بێ ئەو جۆرە ئاسکانە زۆر بەرچاو نەکەون .

لە کۆکردنەوەی ( ئیرەم ) و ( حەرەم )دا جیناسی موضاریع و لەنێوان ( بێیە دەرێ ) و ( نەیە دەرێ )دا طیباق هەیە .

بێیە دەرێ ( مم ) : بێتەدەرێ . زەوانی ( مم ) : زەوانە . نەیە دەرێ ( مم ) : نەیەتەدەرێ . بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبێ هەڵەیەك لە وشەی ( چینی )دا هەبێ و ئەبو ( چینە ) بوایە .

(٢) ئەشك : فرمێسك . گونجایش : گونجان . تەسکین : دامرکان ، ئۆقرە گرتن .

واتە : خۆشەویستی و حەزلێکردنی من بۆ تۆ ئەوەندە زۆرە و جێگەی خۆشی پێویستە ، لەناو دڵەی پڕ ئازار و دیدەی پڕ لە فرمێسکمدا جێی نابێتەوە و دانامرکێ و ئۆقرە ناگرێ ، چونکە دڵ و دیدەم هەم بچوکن و هەم ناخۆشیشن .

لەم بەیتەدا نالی هونەری حوسنی تەعلیلی بەکارهێناوە . لە هێنانی ( ئەشك ) و ( ئەلەم )یشدا بەدوای ( دڵ ) و ( دیدە )دا لەف و نەشری موشەووەش هەیە .

لافی دەمی تۆ ، غونچە لە دەمیا بو ، بە ( عمداً )
با خوستی بڕێ ، خستی ، کە مستێکی لە دەم دا (٣)
دڵ موضمەحیلی دەردە وەکو دیدە لە نمدا
حەیران و پەرێشانە وەکو قطرە لە یەمدا (٤)

---

(٣) لاف : ئیددیعا و دەم درێژی . عمداً : دەسەنقەست . خوست : داوێن . مست : مستە کوڵە .

واتە : خونچەی نەپشکوتو کە نیشانەی نەکراوەیی و بچوکییە ، نیازی لاسایی کردنەوەی دەمی تۆی لە دڵا بو و ئەیویست بڵێ منیش وەك ئەو بچوکم ، بەڵام ( با ) لەسەر تۆ هاتە دەنگ ، داوێنی قرتاند و مستەکوڵەیەکیشی دا بەدەمیا پشکواندی و دەمی پڕکردەوە و چی بۆنی خۆشی ئابو هەموی بە دەور و پشتیدا بڵاو کردەوە ، گوایە ئەو بۆنە خۆشەی گوڵ لە نیازی لاسایی کردنەوەی دەمی تۆی کاتی کرانەوەیەوە هاتووە ! مەبەست لە داوێن قرتاندنیش لێك جوێکردنەوەی بەرگە سەوزەکەی سەر پەڕەکانی خونچەی نەپشکوتووە و ، لە خستنیش لاربونەوەی گوڵە پاش پشکوتنی . *

لە ( دەمی ) و ( دەمیا ) و ( دەم )دا جیناسی لاحیق و تەناسوب و ، لە ( خوستی ) و ( خستی ) و ( مستێکی )دا دیسان جیناسی لاحیق هەیە .

خستی کە ( عم ) : خستبیو .

(٤) موضمەحیل : تەوتاو . نم : فرمێسك . قطرە : دڵۆپ . یەم : دەریا .

واتە : وەك چۆن چاوم لەناو فرمێسکی زۆرما خنکاوە ، دڵیشم هەروا گرفتاری دەردە ، سەرگەردان و پەرێشان بووە ، وەك دڵۆپە ئاوێك بکەوێتە ناو دەریاوە کە سەر و شوێنی نامێنێ .

نالی لەم بەیتەدا شاکارێکی جوانی دروست کردووە . لەجیاتی لەوەی فرمێسك بخاتە چاوەوە ، چاوی لە فرمێسکدا نوقم کردووە و ، فەوتانی دڵی لەناو دەرد و ئازارا شوبهاندووە بەوە کە دڵۆپێك ئاو بکەوێتە ناو دەریایەکی پان و بەرینەوە . ئەوەش ئەوپەڕی سەرگەردانی و بێ سەر و شوێن بونە .

لەنێوان ( دەرد ) و ( دیدە ) و ( یەم ) و ( نم )دا جیناسی لاحیق هەیە .

دڵ موضمەحیلی دەردە ( چەر ) و ( چەن ) و ( ك ) و ( مز ) : دڵ موضمەحیل و دیدە .

* خوستی کە بە مانا داوێن بێ . داوێن برین کینایەیە بە سوکایەتی پێ کردن یانی با سووکایەتی پێ کرد و داوێنی بری . کورد بەوانەی کەوای شۆڕیان لە بەر دابێ ئەکەر هەرەشەی لێ بکا دەڵێ تاتەکت دەبڕم .

« نالی » مەثەلی حالی لە ئەشکەنجەیی غەمدا
وەك نالە لە نەیدا ، وەکو نالە لە قەلەمدا (٥) ■

— ٧ —

ڕوخم ڕەنگینی ڕەنگی ڕومەتی ڕەنگینتە ، بازا !
قەدی سەروم کەمانینی قەدی شیرینتە ، بازا ! (١)

---

(٥) مەثەل : نموونە : ئەشکەنجە . ئازار . نالە : هاوار . نەی : شمشاڵ . نالە باریکەکانی ناو قەڵەمی قامیش .

واتە : نموونەی حاڵی نالی بەدەست دەرد و ئازار و گیروگرفتی خەم و پەژارەوە وەك نموونەی نالەی شمشاڵی لێهاتووە کە هەمیشە سکاڵای دووری لەکا و هەرگیز شکاڵی نابڕێتەوە ، یا وەك ئەو نالە باریکەیە کە لەناو قەڵەمدایە و هەر تاوێك قەڵەمەکە دابدری ، ئەویش لێی لەبڕێت .

نالی لەم شیعرەدا ئیشارەتێکی بۆ بەیتەکەی مەلنەوی جەلالوددینی ڕۆمی کردووە کە ئەڵێ :

بشنو از نی چون حکایت میکند
وز جدائیها شکایت میکند

واتە : گوێ شل کە بۆ قامیش . قامیش ، کە لەژێر پێدا زیکەی دێ ، ڕازی خۆی ئەگێڕێتەوە و سکاڵای دەردی دووری ئەکا .

لەنێوان (نالی) و (حاڵی)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (نالە) و (نالە)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

نالی ( عم ) : نالی و .

— ٧ —

(١) بازا : باز ئا ، وەرەوە . وشەکە لەبنەڕەتا فارسییە . قەد : باڵا . قەدای دووهەم) مەعنای ( چەماندنەوە )ش ئەگەیەنێ . کەمانین : وەك کەوان لێهاتوو .

واتە : بەهۆی ڕەنگی ڕومەتی جوانی تۆوە ڕوم زەرد هەڵگەڕاوە ، جا یا لە خەفەتی دووریت یا بەهۆی شەرمەزار بوونەوە لە بەرچاوی خەڵك . باڵای وەك سەرو بەرزی جارانیشم بەهۆی باڵای جوانی تۆوە وەك کەوان چەمیوەتەوە ، یا بەهۆی چەماندنەوە جوانەکەی تۆوە بووە بە کەوان ، کەواتە وەرەوە بۆ لام تا منیش بچمەوە سەر دۆخی جاران .

■ بەم سیعرە زۆر باش دەرد مکەوێ کە ناز ناوی نالی لە ڕیشاڵی قامیش وەرگیراوە و قسەی ئەوانە جێی متمانە نیە کە دەڵێن نالی) یە .

غەریب و بێکەس و زار و فەقیری خانەدانی تۆ
جگەر سۆتاو و ماڵوێرانی زولفی چینتە ، بازا ! (٢)

( معاذ الله ) کە ڕەحمێکت بە حاڵی زاری مندا بێ
کە ئاخر بەندەیی خاکی دەری پێشینتە ، بازا ! (٣)

ئەگەر خوێنم دەڕێژی تۆ ، ئەوە تێغ و ئەمیش گەردن
ئەگەر بنیادی پەیمان ، دەستی من دامێنتە ، بازا ! (٤)

لە چاوانم هەتاکەی قەطرە قەطرە خوێن دەکەی ئەی دۆست !
کوا ئەم عەهد و پەیمان و وەفا کابینتە ، بازا (٥)

---

(٢) زار : داماو . لاواز . زولفی چین : زولفی جوانی چین لەسەر چین .
واتە : ئەوکەسەی لە خانەدانی تۆ دوورکەوتووەتەوە و نامۆ و بێکەس و هەژار کەوتووە ( کە منم ) ، بەهۆی زولفی چین‌چینی تۆوە جگەر سۆتاو و ماڵوێران بووە . کەواتە دە وەرەوە !

(٣) معاذ الله : پەنا بە خوا ، خوا نەکا ، هەرگیز ڕوو نادا . دەر : بەردەرگا .
پێشین : کۆن .
واتە : هەرگیز بەزەییەکت بە حاڵی مندا نایەتەوە ، ئاخر خۆ من بەندەی کۆنی خاکی بەردەرگای خۆتم ، دە وەرەوە !

(٤) بنیاد : بناخە . پەیمان : گفت .
واتە : هەرچیم لێ ئەکەی ئامادەم . ئەگەر سەرم ئەبڕی ، ئەوە تێغی تۆ و ئەمەش گەردنی من . ئەگەر بناخەی گفت و پەیمانیشم لەگەڵ داڵەنێی ، دەسم دامێنت ، دە وەرەوە !

(٥) کابین : ئەو ئەندازە پارەیەی پیاو لەکاتی ژن‌هێنانا لەئەستۆی ئەگرێ بیدا بە ژنەکە . لەو مەعنایەشەوە وەرگیراوە بۆ هەر شتێ مرۆ لەئەستۆی خۆی بگرێ .
واتە : تا کەی ، گیانە ، چاوم دڵۆپ دڵۆپ ئەکەی بە خوێن ؟ کوا ، تۆ کەی وا دەرئەکەوێ گفت و پەیمانت لە ئەستۆ گرتبێ ، دە وەرەوە !
ڕێیشی لێ‌ئەچێ ( کابینتە ) هەڵەی نووسیار بێ و ڕاستەکەی ( کاینتە ـ کە لاینتە ) بێ ، واتە : کوا ، کەی گفت و پەیمان ڕاگرتن ڕەوشتی تۆیە ؟

بە « نالی » باوەڕت نایێ ، خەیالت بێت و ببینێ
کە چۆن مەشغوڵی نەغمەی گۆشەیی نالینتە ، بازا ! (٦)

— ٨ —

ئەحوەلی تەفرەقە نەظەر تەقویەتی سەبەب دەکا
عاریفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا (١)

---

(٦) واتە : ئەگەر باوەڕ بە نالی ناکەی ، بە خەیالت بەهەرمۆ منی بە بیردا بێ و ببینێ چۆن لە سۆچێکا کەوتووم خەریکی ئاوازی نالینم لەناو دۆریت .. دەسا وەرەوە .

ڕێیشی لێ ئەچێ ( نالینتە ) هەلەی نووسیار بێ و ڕاستەکەی ( بالینتە ) بێ ، واتە : لە سوچی جێگە سەرەکەتا کەوتووم لەنالێنم ..

ئەم پارچە شیعرە لە هیچ‌کام لە دەستنووسەکانی بەردەستمانا و هەروەها لە چاپەکەی ( کم )یشدا نییە . دوکتۆر مارف خەزنەداریش ئەڵێ هێشتا بۆم ڕاست نەبوەتەوە هی کێیە ، بەڵام بە هی نالیی نازانێ . ( د. مارف خەزنەدار ، چەند پەراوێزێکی دیوانی نالی ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ٣٤ ، کانوونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانوونی دووەمی ١٩٧٦ ) . پارچەکە هەرچەند سادەیە ، شەقڵی نالییشی پێوە دیارە .

— ٨ —

(١) ئەحوەل : خێل ، یەك بە دوو بین . تەفرەقە نەظەر : ئەوەی هێزی بینینی پەرێشانە و سەرنجی چاوی بەم لا و بەولادا ئەڕوا و یەکی بە دوان دێتە پێش چاو . عاریف : خوداناسی دڵ وریا . وەحدەت ئاشنا : ئەوەی لەگەڵ بیری خوا بە یەك زانیندا ئاشنایی هەیە .

واتە : ئەوەی چاوی دڵی خێل بێ تاماشای (سەبەب) ئەکا و هەرچی کە ڕوو ئەدا ئەیبەستێ بە هۆیەکی تایبەتییەوە و ئەوەش لەئەنجاما ئەکێشێتەوە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانان ، وەك چۆن ئەوەی چاوی ڕاستەقینەی خێل بێ یەکی بە دوو دێتە پێش چاو . بەڵام ئەوەی کە خوا بناسێ و دڵی بە بیری یەکێتیی خواوە ڕاهاتبێ ، شەرم ئەکا قسەی وای لە دەم بێتە دەرەوە .

ئەڵێن نالی ئەم پارچە شیعرەی لە بەرپەرچ دانەوەی زانای ناوداری کورد موفتیی زەهاویدا وتووە لەئەنجامی دەمەتەقێیەکی فەلسەفیدا

بەندە ئەزەل بە خەططی خۆی قابیلی قیسمەتی بووە
ئیستە بە ئیقتیضای عەمەل جێگەیی خۆی طەلەب دەکا (٢)

داری ئیراك و داری هیند هەردوو کە عوودە ئیسمیان
هەمدەمی سوننەتە ئەوەم مەیلی ئەبولەهەب دەکا (٣)

---

کە لەباردی سەبەبەوە لەنێوانیانا ڕۆی داوە . ئەگەر ئەمە ڕاست بێ لەوانەیە بێ بە بەلگەی ئەوە کە زەماوەنی خێل بوبێ .

(٢) ئەزەل : ئەوەی ئەبوونی لێ پێش نەکەوتبێ . خەط : پێ‌لێ‌نان . قابیلی قیسمەت : لەوەی بە بەشی خۆی ڕازی بێ یا ئەوەی بۆ دابەش کردن بشێ . ئیقتیضا : پێویست . عەمەل : کردەوە .

واتە : ئادەمیزادی موسولمان لە ڕۆژی ئەزەلدا بە دان‌پیانانی خۆی ڕازی بووە بە بەشی خۆی و لە وەلامی « ا لست بربکم ! »دا واتە : ئاخۆ من خوای ئێوە نیم ! کە پەروەردگار لـە خەلکی پرسیوە ، وتویەتی : « بلی » واتـە : تۆ خوای ئێمـەی . بەم‌پێیە ئیتر ئەبۆ سـەبەب و سەبەبکاری ئەماتایەتە ئاراوە . کەچی ئیستا وا بە کردار بەپێچەوانەی پێ‌لێ‌نانەکەی خۆی ئەجولێتەوە و بـە نیسـبەت دانی کار بۆلای خۆی داوای جێ و ڕێ‌یەك ئەکا بۆ خۆی گوایە ئەویش لەگەل خوادا هاوبەشە لە دروست‌کردنی کردارا . .

نالی لەم‌بەیتەدا ئیشارەتیشی بەو وتە فەلسەفییە کردووە کە ئەلێ ( خەت بۆ دابەش کردن ئەشێ ) .
خەططی ( عم ) : حەظظی .

(٣) ئیراك : دارێکـە لە لقـەکانی ، سـیواك دروسـت ئەکـەن و لەکاتی دەسـتنوێژ گرتن و گەلێ کاتی‌تریشدا بەپێی ڕەوشتی پێغەمبەر ( د.خ ) ئەیهێنن بە دەما بۆ پاك‌کردنەوەی بێخی ددان و خۆش‌کردنی تامی دەم. داری هیند : داری بخور کە بـۆ بۆن‌خۆشی ئەیسـوتێنن . هەمدەم : هاودەم ، هاوڕێ . سـوننەت : گوفتار و ڕەوشتی پێغەمبەر . ئەوەم : ئەو ، ئەم . ئەبولەهەب : یەکێکە لە ناوەکانی ئاگر ، ئیشارەیشە بە ناوی ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەر .

واتە : بۆ ئیسـپاتی لەوە کـە ئەنجامی هیـچ شـتێ پەیوەندی بە بناخەکەیەوە نییە و هەموی هەر بە دەستی خوا خۆیەتی و ئەو چارەنوس دائەنێ ، سەیری داری ئیراك و داری هیند بکە ، هەردوکیان دارێکی عادەتین کەچی لەویـان سوننەتی پێغەمـبەری پـێ جێ‌بەجێ ئەکرێ و

سەهم و نەصیبی ئەصلیە ، بەحشی گیاە و گڵ نیە
تۆتنە خەرجی سۆتە ، مۆدنە ماچی لەب دەکا (٤)

لەومەی زەمان دەکەی کە بۆچ خواریی ڕاستی دەویٚ !؟
غافڵی دەستی ڕاستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا (٥)

---

ئەمیان بە لای ئەبولەھەبدا ئەڕوا ، واتە ئەسوتێنرێ و دۆکەڵی پێ ئەکرێ .

نالی لەم بەیتەدا ئیشارەتی بە دوو ئایەتی « تبت یدا ابی‌لهب ... وامراته حمالة الحطب » کردووە کە واتە : دەسەکانی ئەبولەھەب وشك بن .. ژنەکەشی کۆڵەدار هەڵەگرێ بۆ ئازاردانی موسوڵمانان . لەناو ناوەکانی ئاگریشدا ناوی (ابولهب)ی هەڵبژاردووە و بەکاری‌هێناوە ، بولەوەی لە بەرابەری وشەی ( سونەت )دا داینێ چونکە سونەت هی پێغەمبەرە و ئەبولەھەبیش دوژمنی پێغەمبەر بووە .

لە دوو نیوەی ئەم بەیتەدا لەف و نەشری مورەتەب هەیە .

لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا لەجیاتیی ( ئەوەم ) نوسراوە : ( لەمەو ) . تەنها لە پەراوێزی نوسخەی ( چر )دا نەبێ بە نوسخە نوسراوە : ( ئەوەم ) . ئێمە ئەمەمان لا پەسەند بو چونکە سەرچاوەی هەردو ئیشارەتەکە بە ڕێك‌وپێکی ئەڕوا و مەعناکە بێ پێچ و پەنا دێ .

(٤) سەهم و نەصیب : بەش و چارەنوس . گیاە : گیا ، سەوزە . خەرج : بەش . مۆدن : دار جگەرە .

واتە : چارەنوسی هەرکەس چۆن بێ هەر ئەوە دێتە ڕێی. مەسەلەکە پەیوەندی بە ڕیشە و بنەڕەتەوە نیە . ئەوەتە تۆتن کە مەبەستی ئەسڵیی جگەرەخۆرە ، بەشی سوتانە ، ئەوەش دار جگەرەیە کە لە هۆیەکی جگەرەکێشان بەولاوە نیە ، بە شوێنێکی نازداری وەك لێوەوەیە و هەمیشە ماچی لێو ئەکا !

سەهم و نەصیبی ( چر ) و ( گم ) : قیسمەت و سەهمی .

(٥) لەومە : سەرزەنشت . خوارێ : دەلیلێ . غافل : بێ‌ئاگا .

واتە : سەرزەنشتی گەردون ئەکەی کەوا بۆچ کارێك ئەکا ڕاستی هەر لەبنەوە بێ .. ئاگات لەوە نیە کە تەنانەت لە خۆیشتا دەستی ڕاستت خزمەتی دەستی چەپت ئەکا و ملکەچی ئەوە .. واتە : باری ژیان وایە تالیستاش خراپە و درۆ لەسەرەوە بێ و چاکە و ڕاستی بۆ سودی ئەوان هەڵسوڕێن ..

**طوطیی تۆ لە حیرصی دڵ داوی طەمەع دەکاتە مل**
**بولبولی من لە عەشقی گوڵ تەغنیەوو طەرەب دەکا (٦)**

**« نالی » حەریفی کەس نیە ، ئیلف و ئەلیفی کەس نیە**
**بەیتی ڕەدیفی کەس نیە ، هەرزە نویسە ، گەپ دەکا (٧)**

---

(٦) حیرص : تەماع . تەغنیە : گۆرانی وتن . طەرەب : ساز و ئاواز .

واتە : من و تۆ ، ئەی بەدکار ، زۆرمان جیایە لە یەك . تۆ طووطیت . . ئیش و کارت هەر قسەی ئەم و ئەو گێڕانەوە و هێنانەو بردنە ، بۆیە لەبەر تەماع کۆلی بەندەگیت لە مل کردووە و بووی بە نۆکەری ئەم و ئەو . بەلام من بلبلم ، دلداری گوڵ و باخم ، هەمیشە گۆرانی بۆ جوانی و شینایی و سروشت ئەلێم . .

ئەگەر وەك لەپێشەوە وتمان ڕاست بێ نالی ئەم پارچە شیعرەی بەرابەر بە مولتیی زەهاوی وتبێ ، ئەوا مەبەستی لە طوطیەتی لاسایی کردنەوە و وتنەوەی قسەی موعتەزیلەکانە کە بەندە بە دروستکەری کاری خۆی ئەزانن و دەورێکی گەورە ئەدەن بە ( سەبەب ) .

طوطیی تۆ لە حیرصی دڵ ( چر ) : طوطیی دڵ لە حیرصی گوڵ . بەم‌پێیە مەعنای نیوە شیعرەکە وای لێ دێتەوە : دڵ طوطیە و بەخیلی بە گوڵ ئەبا بۆیە داوی تەماعی لە مل کردووە . لە پەراوێزی هەر ئەم نوسخەیەشدا بە نوسخە نوسراوە :

**طوطیی تۆ لە حیرصی دڵ داوی قەفەس دەخاتە مل**

(٧) حەریف : هاودەم . ئیلف و ئەلیف : هاوشان . ڕەدیف : هاوسەر . هەرزە نویس : ئەوەی شتی پڕ و پوچ ئەنوسێ . گەپ : گاڵتە .

نالی لەم شیعرەیدا ، لەپاش دەربڕینی بێزاری لە باری ژیان کە ئەوی خستووەتە بنەوە و خەڵکی سەرخستووە و پایەبەکی کۆمەڵایەتیی نزمی بەم داوە و خەڵکی کردووە بە خاوەن ڕێز و شوێن ، هەڵوێستێکی کەمتەرخەمانە لە ژیان وەرئەگرێ و ئەڵێ چش ، هەرچۆنە با هەر وایێ . . دیارە من شایانی پایە و ڕێز و شوێنی ئەم خەڵکە نیم و لە نمونەی کەسیان نیم و شیعرەکانیشم شیعری هەرزە نوسیە ، بۆیە ڕێز و شوێنیشم لە کۆمەڵدا نیەیە کە هەیە . .

ئەلیف ( چن ) : ئەنیف . ئەبێ بەپێی ئەم نوسخەیە ( ئەنیف ) لە

— ٩ —

بولبولی طەبعم ئەوا دیسان ئەنا خوانی دەکا
نوکتە سەنجی و ، بەذلە گۆیی و ، عەنبەر ئەفشانی دەکا (١)

هەرکەسێ ئیظهاری دانایی بکات و ، مەقصەدی
خود پەسەندی بێ ، یەقین ئیظهاری نادانی دەکا (٢)

خەرقە پۆشێ کەی دەپۆشێ جەوهەری ذاتی ئەمن ؟
بێتە تێو ، جیلوەی ، بە زوشتی خۆی بە عوریانی دەکا (٣)

---

( لەنف ) وەرگیرانی و مەعناکەی ( هاولوت ) بێ وانە نزیك و هاودەم .

ئەگەر ئەوەی لەپێشەوە وتمان کەوا نالی ئەم پارچە شیعرەی لە بەربەرچدانەوەی موفتیی زەهاویدا وتووە ، وا بێ ، لەوا ئەبێ لە لێکۆلینەوەی باری کۆمەلایەتی و دەروونیی نالیدا بایەبەکی تایبەتی بۆ ئەم پارچە شیعرە دانرێ .

— ٩ —

(١) طەبع : طەبیعەت . ئەناخوانی : پیا هەلدان و ستایش کردن . نوکتە سەنجی : وتنی شتی ورد و قسەی پڕ مەعنا . بەذلە گۆیی : قسەی خۆش کردن . عەنبەر ئەفشانی : عەنبەر بلاو کردنەوە ، کینایەیە لە قسەی نەستەق و شیعری نایاب وتن .

وانە : تەبیعەتی عاشقی بە شەوق و ذەوقم دیسانەوە کەوتەوە ستایش و پیا هەلدان و وتنی قسەی نەستەق و خۆش و بلاو کردنەوەی بۆن و بەرامەی خۆشی شیعری جوانی وەك عەنبەر کە هەموو لایەك ئەگرێتەوە .

عەنبەر ( عم ) و ( کم ) : گەوهەر .

(٢) دانایی : زانایی .

وانە : ئەوەی بە نیازی خۆهەلدان ، زانایی و تێگەیشتنی خۆی دەربڕێ ، دیارە نەفامیی خۆی دەرئەخا .

مەقصەدی ( کم ) : مەطلەبی .

(٣) خەرقەپۆش : صۆفی . جیلوە : ورشە . زوشتی : ناشیرینی . عوریانی : ڕووت و قووت .

ضایبطەی طەبعم سوارە ، ئیدیعای شاهیی هەیە
موحتەشەم دیوانە ، داوای تەختی خاقانی دەکا (٤)

---

وانە : سۆفیـەکی خەرقە لەبەر چۆن ئەتوانێ جەوهەری شەخصی من یا جەوهەری خۆ بەخۆ پەیدا کردۆی من بشارێتەوە ، یاخود بیداتە پاڵ خۆی و بیکاتە بەری خۆی ؟ ئەگەر بێتو بێتە ئەم مەیدانەوە ، ورشەی جەوهەری من ، ئەو بەو ناشیرینییەی خۆیەوە زۆت و قوت ئەکاتەوە و ئەیخاتە بەرچاوی خەڵك . یاخود ئەگەر بێتە ناو ورشەی جەوهەری منەوە و بیەوێ بیکا بە بەرگ بۆ خۆی ، بەو ناشیرینییەیەوە کە هەیە ، لەجیاتیی ئەوەی خـۆی داپۆشێ ، خۆی زۆت و قـوت ئەکاتەوە و ئابڕۆی خۆی ئەبا .

شێوەی نوسـینەوەی ئـەم بەیتە لە نوسخەکانی بەردەسـتمانا زۆر ئاڵۆز و شێواوە و هەرکام بە جۆرێکیان وەرگرتووە :

( چر ) : بیننی جیلوەی بە زوشتی خۆی بە قوربانی دەکا

( چن ) : پینەیی جیلوە بە زوشتی خۆی بە عوربانی دەکا

( عم ) : بیننی جیلوەی بزشتی خۆی بە عوربانی دەکا

( کم ) : بێتە نێو جیلوەی بە زوشتی خۆی بە عوربانی دەکا

( ت ) : بیننی جیلوە بە زوشتی خۆی بە عوربانی دەکا

(ك) و (مز) : بیننی جیلوەی بە زوشتی خۆی بە عوربانی دەکا

لە سـەیر کردنی تێکڕای نوسـخەکان و بـە نیشانەی شـوێن و موناسەبەتەکەشدا ، ئەچێتە دڵەوە پێشان بەمجۆرە بۆبێ .

**خەرقەپۆشێ کەی دەپۆشێ جەوهەری ذاتی ئەمن ؟**

**بێتە نێو ، جیلوەی ، بزشتی خۆی بە عوربانی دەکا**

وانە : ئەقیرێ و بەربۆنێ کەی زیرەکێ و بلیمەتیی من دائەپۆشێ ؟ کە کاتی خۆی هات ، بەهرەی من بزشت و کاری خۆی بە زۆڵێ ئەکا ، خەنجەری دەبانە و لە کێلان دەرچووە !

(٤) ظابیطەی طەبعم : تەبیعەتی بەدەوق و ڕێكوپێکم . سوارە : بەنەشئەیە و لەسەر پێیە . شاهی : پادشایەتی ، یاخـود ئیشارەتە بۆ ( شاهی )ی شاعیر . موحتەشـەم دیوان : دیوەخانی قەرەبالغ ، یا دیوانی شیعری گەورە ، یان ئیشارەتە بە گەورەیەکی ( محتشم الدیوان ) ناو . خاقانی : خاقانیبەتیی چین ، یا تێکڕای گەورەیێ ، یـا ئیشارەتە بۆ ( خاقانی )ی شاعیر . ■

■ موحتەشەمیش شاعیرێکی فارسە و ئیشارەتی بۆ ئەویش تێدا .

شاهیدی فیکرم که بێتە جیلوەگاهی دولبەرێ
شاهی خوسرەو ڕۆحی شیرینی بە قوربانێ دەکا (٥)

نۆکی خامەی من کە بێتە مەعنائارایی کەمال
خەط بە خەط ئیظهاری نەقشی صورەتی ( مانێ ) دەکا (٦)

---

واتە : ذەوقی شیعر وتنم سوارە ، لە مەیدانی شیعر وتندا لێدیمای پادشایەتی ئەکەم ، یاخود ئیددیعای پایەی ( شاهێ )ی شاعیر ئەکەم و دیوەخانم پڕە لەوانەی حەز لە شیعرم ئەکەن ، یاخود دیوانێکی گەورەم هەیە و داوای بۆن بە خاقانی وڵاتی شیعر ئەکەم ، یا ئەمەوێ جێگەکەی ( خاقانێ )ی شاعیر بگرمەوە .

ڕێیشی لێ ئەچێ لەجیاتیی ( ضابطەی طەبعم ) ، ( ضابطی طەبعم ) بێ ، واتە : سروشتی وەك ئەفسەرم سوار بووە لەیەوێ ببێ بە پادشا . ( محتشم الدیوان )ێکە بۆ خۆی ڕاست بووەتەوە داوای تەختی خاقانی چین ئەکا .

لە وشەکانی (سوار) و (شاهێ) و ( موحتەشەم دیوان ) و ( خاقانێ )دا تەوریە هەیە بەگوێرەی ئەو مەعنایانەی لێمان دانەوە .

(٥) شاهید : یار . لە شیعردا ئەو وشەیەیە کە ئەبێتە نموونە ( مثال ) بۆ بناغە ( قاعدە )یەك . ئەو بیرەی کە پوختەی شیعرەکەیە . شاهیدی فیکر : ئەو مەبەستەی کە شاعیر کردوێە بە شامەبەستی بەیتێك یا هەڵبەستێك . واتە : لەو مەعنا وردەی کە شیعرەکەی بە دەورا ئەسوڕێتەوە .

واتە : ئەو بیرەی کە کردوومە بە بناغە و مەبەستی شیعرم ، ئەوەندە جوانە ئەگەر بێتە مەیدانی خۆنواندنی دولبەریەوە ، خوسرەو گیانی شیرینی خۆی ، یاخود گیانی ( شیرین )ی یاری خۆشەویستی ، بۆ ئەکا بە قوربانێ و لەبەرپێیا سەری ئەبڕێ .

لە کۆکردنەوەی ( شاهید ) و ( شاه )دا جیناسی ناتەواو و ، لە کۆکردنەوەی ( خوسرەو ) و ( شیرین )دا تەناسوب و ، لە وشەی ( شیرین )دا ( لطافت ) هەیە .

فیکرم ( کم ) : بیکرم . لەوانەیە ( بیکرم ) بووبێ ، واتە : لەو مەبەستەی کە من بۆ یەکەمجار لە شیعرمدا دەرمبڕیوە و کەس پێش من نەیتوانیوە وا بڵێ .. تاد .

(٦) خامە : قەڵەم . مەعنا ئارایی : مەعنا ڕازاندنەوە . خەط : دێڕ .

ئیستیطاعه و قووەتی طەبعم ، بە کوردی و فارسی
عارەبی ، ئیظهاری چالاکی بۆ چەسپانی دەکا (٧)

خاطرێکی شۆخ و خۆش و بێ غەم و جەمعم هەبۆ
ئیستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا ! (٨)

---

مانی : هونەرمەندێکی ئێرانی بووە ناوبانگی بە وێنەی جوان کێشان دەرچووە .

واتە : نۆکی قەڵەمی من کە بیبەوێ مەعنا بڕازێنێتەوە و باسی جوانی بکا ، هەر دێڕێکی ئەوەی ئەینوسێ نیگارێك ئەنوێنێ لە نیگارە نایابەکانی ( مانی )ی نیگارکێشی بەناوبانگ و مەعناکە بەڕادەیەك ڕۆشن ئەکاتەوە بێ بە شتێکی دیاری و هەست پێ کراو و بینراوی وەك نیگارە دیاریەکانی مانی .

مەعنا ئارایی کەمال ( مر ) : صەنعەتی نەقشیگەری .

(٧) چەسپانی : گورج وگۆڵی .

واتە : توانا و هێزی لەبیعەتی شیعر وتنم بە هەر سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی لەوە دەرئەبڕێ کە چەند لەم مەیدانەدا چالاك و گورج و گۆلم .

(٨) خاطر : دڵ و دەروون . شۆخ : ساز . جەمع : کۆمەڵ . پڕژ و بڵاو نەبۆ . مەشق : خۆڕاهێنان لەسەر فێربونی شتێ . پەرێشانی : بڵاوی .

واتە : بەرلەوەی بکەومە داوی خۆشەویستیی یارەوە ، دڵ و دەروونم ساز و خۆش و لەجێی خۆیا بو . بەڵام ئیستا لەپێناوی زولفی بڵاوی ئەودا ، ئەمیش خەریکە خۆی فێری بڵاوی و پەرێشانی و پەرت بون ئەکا . مەبەستی لەوەیە بڵێ دڵ و دەروونم مەشقی پەرێشانیی لە زولفی یارەوە وەرئەگرێ .

لە کۆکردنەوەی (شۆخ) و (خۆش)دا جیناسی قەلب و ، لە یەکخستنی ( زولف ) و ( پەرێشانی )دا تەناسوب هەیە . لەمەشدا کە ( مەشق ) بۆ ( زێك وپێکی )یە و کەچێ بۆ ( پەرێشانی ) بەکارهێنراوە هونەرێکی جوان بەکارهاتووە .

تەنها لە نوسخەی ( عـم )دا نوسرابۆ ( هەبـۆ ) ، لە هەمـو نوسخەکانی تری بەردەستمانا نوسراوە ( هەیە ) . ئێمە ( هەبو )ەکەمان لا لەبارتر بو .

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە ، یەقین
خۆی کە دامێن‌گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا (٩)

ئەو کەسە تەحدیثی نیعمەت بێ موراد و مەطلەبی
میثلی « نالی » ئیمتیثالی ئەمری یەزدانی دەکا (١٠)

---

(٩) هودهود : پەپوە سلێمانە . بەلقیس : شاژنی یەمەن . سەبا : سەبەء ، پایتەختی ئەو سەردەمەی یەمەن . ئاصەف : ئاصەفی کوڕی بەرخیای وەزیری حەزرەتی سولەیمان . شاهی ئاصەف : حەزرەتی سولەیمان . شاهی ئاصەفی ثانی : سولەیمان پاشای بابان .

واتە : پەپوە سلێمانەی دڵم بەندیخانەی خۆشەویستیی یاری دیوە کە وەک بەلقیسی شاژنی سەبەء بەدەستەڵاتە ، بۆیە دەس لەکا بە پشتێنی سلێمان پاشای باباندا کە پادشاهی ئاصەفێکی دووەمی وەک ئەحمەد پاشای کوڕیەتی ، کە بۆ بارگی ، لەجێی ئاصەفی کوڕی بەرخیادا بووە بۆ حەزرەتی سولەیمان ، بۆئەوەی بکاتە فریای و لە داوی دیلیی یاری دەربهێنێ ، بەوە کە بیگەیەنێتە دەستی .

بەپێی ئەوە کە مەشهوورە دایکی بەلقیس دێو بووە ، ئەشکونجێ وشەی ( دیوە ) بە ( دێوە ) بخوێنرێتەوە .

ڕێیشی لێ‌ئەچێ مەعنای شیعرەکە بەم‌جۆرە بێ : پەپوە سلێمانەی دڵم بە چاوی خۆی بینی کەوا سولەیمان چەنند بەدەستەڵاتە و چۆن بەلقیسی سەبەئی بە دیل گرت ، بۆیە دەستەو دامێنی ئاصەفی دووەم بۆ تا لای سولەیمان تکای بۆ بکا ئەوەک تووشی شتێ بێ ..

نالی ، لەم شیعرەیدا خۆی شوبهاندووە بە پەپوە سلێمانە و ، سلێمان پاشای بابان بە حەزرەتی سولەیمان و ، ئەحمەد پاشای کوڕی بە ئاصەفی کوڕی بەرخیا و ، خۆشەویستیی یارەکەی بە بەند بوون لە بەندیخانەی شاژنە بەلقیسدا . لە کۆکردنەوەی ( هودهود ) و ( بەلقیس ) و ( سەبەء ) و ( دێو ) و ( ئاصەف )یشدا هونەری تەناسوب و موراعاتی نەظیری بەکارهێناوە .

تەنها لە نوسخەی ( عم ) و ( گم )دا نوسراوە : ( سەبای دیوە ) . لە نوسخەکانی‌تری بەردەستمانا نوسراوە : ( هەوایێکە ) . ئێمە نەسی ( عم ) و ( گم )مان لا بەجێ‌تر بو .

(١٠) تەحدیثی نیعمەت : باس کردنی ناز و نیعمەتی گەورە گەوران . موراد : ئارەزوو . ئیمتیثال : گوێ ڕایەڵی .

— ١٠ —

طەبعی شەککەرباری من ، کوردیّ ئەگەر ئینشا دەکا ،
ئیمتیحانی خۆیە مەقصوودی ، لە ( عمدا ) وا دەکا (١)

یا لە مەیدانی فەصاحەتدا بە میثلی شەهسەوار
بێ تەئەممول بەو هەموو نەوعە زوبانی ڕادەکا (٢)

---

واتە : من کە تەعریفی خۆم ئەکەم و لە قسە ڕەوانی و زیرەکیی خۆم ئەدوێم ، یا کە ئیشارەت بۆ پیاوەتیی سلێمان پاشای بابان ئەکەم بەسەرمەوە ، شتێکی بێ ڕێ و جێم نەکردووە ، شوکرانە بژێریی نیعمەتی خوام کردووە و فەرموودەی ئەوم بەجێ‌هێناوە کە لە نورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی : « و اما بنعمة ربك فحدث » واتە : باسی ناز و نیعمەتی خوا بەسەرتەوە ، لە هەموو شوێنێ بگێڕەوە .
مەطلەبی ( چر ) و ( کم ) : مەقصەدی .

— ١٠ —

(١) شەککەربار : شەکر هەڵگر . شەکر بارێن ، مەبەست شیرینە . ئینشا : دانان . ئیمتیحان : ئەزموون ، تاقی‌کردنەوە .

واتە : زەوقی شیرینی من کە بەلای ئەوەدا ئەچێ بە کوردیّ شیعر بڵێ، لەبەرئەوە نییە کە کوردییەکە ئاسانە و دەسەڵاتی بەسەر عەرەبی و فارسیدا ناشکێ ، بەڵکو لەبەرئەوەیە ئەیەوێ خۆی تاقی بکاتەوە بزانێ شتێکی تازەی لە دەست دێ لەمەوپێش کەس نەیکردبێ کە شیعر وتنە لەسەر عەرووزی عەرەبی بە زمانی کوردیّ ، یا نە ؟

(٢) شەهسەوار : شاسوار ، شۆڕەسوار و لاوچاك . تەئەممول : ورد بوونەوە . ڕادەکا : غار ئەکا ، یا ڕائەهێنێ .

واتە : یاخود مەبەستی خۆ تاقی کردنەوە نییە ، تەبیعەتی شیعریەتی ئەوەندە سوارە ، بێ‌گوێدانە ئەوە کە مەیدان مەیدانی فارسییە یا عەرەبی یا کوردیّ ، ئەو هەر لەخۆیەوە بە هەموویاندا ئەداتە غار ، یا لە هەموویاندا خۆی ڕائەهێنێ .

لە کۆکردنەوەی (مەیدان) و ( شەهسەوار ) و ( ڕادەکا )دا تەناسوب هەیە .

یا (چن) و (کم) و (ت) و (ك) : یا . (من) : ئەو . بەو (چن) و (ك) :

کەس بە ئەلفاظم ئەڵێ خۆ کوردییە خۆکردییە
هەرکەسێ نادان ئەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا (٣)

بێتە حوجرەم ، پارچە پارچەی موسوەدەم بکڕێ بە ڕۆح ،
هەرکەسێ کۆتاڵ و پارچەی بێ بەدەڵ سەودا دەکا (٤)

شیعری خەڵقێ کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکێ ؟!
کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا ؟! (٥)

---

بــی . (کم) و (گم) : بەم . زوبــانی (گم) : زمانی . (مز) : لیـــانی .
ڕادەکا ( کم ) : وائەکا .

(٣) خۆکردییە : دەسکردی خۆماڵییە . نادان : نەزان و نەفام .
واتە : با کەس توانجم لێ نەگرێ بڵێ شــیعرەکانی کوردین و هەر شاعیرێك بگری ئەتوانێ شیعری کوردێ بڵێ . بەڵێ ڕاســتە زۆر کۆلکە شاعیر هەن ئەتوانن ( شــیعر ) بە کوردێ ڕێكخەن .. بەڵام خۆ شــیعر هەر هاوســەنگیی دێــڕەکەی و یەکێتیی دوا پێتەکانی نییە . شیعر بەر لە هەرچی ناوەڕۆکی ورد و مەعنای قوڵە و دانایان لە شــیعردا بەدوای ئەوەدا ئەگەڕێن و ئــەوەش دەســتی کۆلکە شاعیرەکان ناکــەوێ بیخەنە شیعرەکانیانەوە .
لــە کۆکردنــەوەی ( خۆ کوردییــە ) و ( خۆکردییــە )دا جیناســی تەرکیب و ، لەنێــوان ( کوردێ ) و ( کــردێ )دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .
طالیبی ( لا ) : تالیبی . خۆکوردییە ( چر ) : خۆ کوردییو .

(٤) موسوەدە : موســەووەدە ، ڕەشنووس ، نووســراو بەر لە پاکنووس کردنی .
بێبەدەڵ : لەوەی ئەوەندە بەنرخ بێ شتێ ئەبێ بۆئەوە بشــێ لەبریتیی ئەوا بدرێ .
واتــە : ئەوەی بــەدوای پارچــەی گرانبــەهادا لــەگەڕێ ، با بێتە حوجرەکەی من ، پارچە پارچەی ڕەشنووســەکانم بکڕێ و لەبریتیدا گیانی خۆی دانێ ، بەمە هێشتا هەر ئەو قازانج ئەکا .
حوجرەم ( کم ) و ( گم ) : حوجرە . موسوەدەم ( ت ) : ئەسوەدم .
ســەودا ( کم ) داوا .

(٥) دیققەت : وردێ . بــاریکی . پەتك : ئــەو بەنــەی بەڕە و جەواڵی لێ دروست ئەکەن . هەودا : تاڵی ڕێســمانی ئاوریشم .

— ١١ —

پێم‌دەڵێن : مەحبوبە خێل و قیچە ، مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە ، یا ترازووی نازی تەختی سەر دەکا !؟ (١) ⁕

---

واتە : شیعری خەلکی هەرگیز لە ناسکیدا ناگاتە زادەی شیعری من . شیعری من لە چاو شیعری خەلکیدا وەك تالی ئاوریشم وایە لەچاو پەتکدا و دیارە پەتکیش هەرگیز ناتوانێ لە باریکی و ناسکیدا بەربەرەکانێ لەگەل تالی ئاوریشم بکا .

لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا حوسنی تەعلیل هەیە .

بۆ نازکێ (کم) : ئەی نالیا .

لە خوێندنەوەی ئەم قەصیدەیەوە ، ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە و خۆی دادەسەپێنێ : ئاخۆ ئەو شاعیرە هاوچەرخەی نالی کێ بووبێ کەوا بە فارسی ( یاخود بە عەرەبی ) شیعری وتبێ و گاڵتەی بە شیعرە کوردیەکانی ئەم کردبێ ؟ تۆ بڵێی ئەم مەسەلەیەش پەیوەندیکی بە ( مەستورە خانمی ئەردەڵان )ەوە نەبێ ، بەتایبەتی کە دیارە نالی لەم قەصیدەیەی لە سەردەمی فەقێیەتیدا وتووە : « بێتە حوجرەم ! ... تاد ؟ تەنها مەگەر لێکۆڵینەوەی لەمەوپاشی ڕۆشنبیرانمان وەڵامی ئەم پرسیارەمان بۆ بداتەوە !

— ١١ —

(١) هەر وەك لەم بەیتەوە دەردەکەوێ ، مەشهووریشە کەوا حەبیبەی یاری نالی خێل بووە . خێلیش لەناو خەلکدا بە عەیب لەژمێردرێ و ڕوانینی خێل نیمچە خێسە کردنێکە . هەروەها خێل جارجاریش وانەزانێ ئەڵێی چاوێکی ئەنووقێنێ و چاوەکەی‌تری ئەکاتەوە . نالی لەم غەزەلەیدا بەربەرچی ئەوانە ئەداتەوە کە خێلی حەبیبەیان بە عەیب داناوە ، ئەڵێ : ناحەزان پێم ئەڵێن خۆشەویستەکەت خێل و چاولارە ، خێسە لە خەلکی ئەکات وەك بڵێی شەڕیان پێ بفرۆشێ . نەخەیر نە خێلە و نە خێسەش لە کەس ئەکا .. تەنها ئەوەندەیە ترازووی نازی ، کە چاویەتی ، کەمێك سەرئەکا و بەسەر لایەکا ناز زۆرتر ئەکا تا بەسەر لایەکی‌ترا .. سەرکردنی ترازوو لەوەیە کە هەڵی‌ئەبڕی هەردوو سەرەکەی هاوسەنگ نەبن .

لە کۆکردنەوەی ( شەڕ ) و ( سەر )دا جیناسی موضاریع هەیە .

⁕ لێرەدا نالی شەڕ و سەری کردۆتە قافیە بە بڕوای من
(ڕ) و (ر) لە کوردی و فارسی قافیە نین .

خێل و قیچە ، یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو
مەیلی ڕاست هاوێتنی موژگانی دڵ پەی‌کەر دەکا ؟! (٢)

چاوی هەم‌ڕەنگی گوڵی ، مەستی شەو و ڕۆژن مەدام
یەك لە نەشکوفتەی بەنەفشە ، یەك لە نەیلۆفەڕ دەکا (٣)

عەکسی چاوی تۆ لە چاویدا بە خواری تێ‌دەگەی
کەچ نەظەر کەی فەرقی خوار و ڕۆر و ، خێر و شەڕ دەکا ؟! (٤)

---

(٢) هاوێتن : هاویشتن . موژگان : برژانگ . پەی‌کەر : ئەوەی پەی ئەکا . پەی‌کردن : بڕینەوەی چوار پەلی وڵاخە . .

واتە : یار خێل و قیچ نییە ، بەڵکو ئەیەوێ بە غەمزەی چاوی ، تیری برژانگی کە دڵی دلدار پەی ئەکا ، ڕاست بهاوێ بـۆ دڵ و چوار پەلی دڵی پێ‌ببڕێتەوە تا مەیدانی دەربازبونی نەمێنێ . دیـارە تیرهاوێژیش بۆئەوەی نیشانە بپێکێ ، چاوێکی ئەگرێتـە نیشانەکە و ئەو چاوەکەی ئەنوقێنێ .

ئەشکونجێ ( مەیلی ) نەبێ و ( میلی ) بێ و لەم‌حالەدا ( پەی‌کەر )یش بە ( پەیکەر ) ئەخوێنرێتـەوە بەمەعنا نیشـانە ، واتە : مـیلی ڕاسـت هاویشتنی گوللەی برژانگی ، دڵ ئەکا بە نیشـانە .

خێل ( عم ) : خوێل . چاو ( کم ) : ئاو . هاوێتنی ( چر ) : ئاوێتنی . (چن) و (ك) : ناوێتنی . (گم) : هاێژتنی .

(٣) هەم‌ڕەنگ : هاوڕەنگ . مەدام : هەمیشـە . نەشکوفتە : نەپشکوتو . بەنەفشـە : وەنەوشـە .

واتە : چاوەکانی یار وەك گوڵ وان ، چـۆن گوڵ هەندێکیان بە شـەو مەسـت و خەواڵون و هەندێکیان بە ڕۆژ ، ئەمانیش هەر وان . چاوە خێلەکەی ، دڵی بە شـەوەوەیە وەك وەنەوشـە کە لە سێبەردا گەشـە ئەکا و چاوەکەی‌تری وەك گوڵە نەیلۆفەڕە کە لەبەر خۆردا هەڵدێ .

گوڵی (عم) و (کم) و (گم) : گوڵە . نەشـکوفتەی (چر) و (عم) و (ت) : نەشکوفتە . بەنەفشـە (کم) و (گم) : وەنەوشـە .

(٤) عەکس : وێنە . کەچ‌نەظەر : لەوکەسـەی کە ڕاسـت نەبینێ .

واتە : چاوی یار وەك ئاوێنە وایە و تۆیش ، ئەی ناحەز ، لە چاوی یاردا وێنەی چاوی لاری خۆت ئەبینی . بۆیە وائەزانی چاوی یار خێل و قیچە . مەبەستی ئەوەیە بڵێ چاوی خۆت خێل و قیچە نەك هیی یار ،

هەرکەسێ نوقصانیی ڕۆی باوێتە سەر ڕۆی ئاینە
شاهیدی هەرچەندە ( رأي العین )ە ، کێ باوەڕ دەکا ؟! (٥)

کاتبی خێر و شەڕی عوششاقە ، بۆ وەصل و فیراق ،
لوطف و قەهری هەر بە جارێ سەیری دۆ دەفتەر دەکا (٦)

---

بەڵام چونکە تۆ لاربینی خوار و ڕۆر و خێر و شەڕ لە یەك ناکەیتەوە و ، لەجیالیی خۆت یار بە خێل ئەزانی ..

لەنێوان ( خێر ) و ( شەڕ ) و ، ( خوار ) و ( ڕۆر )دا طیباق هەیە .

(٥) باوێتە : بخاتە . ئاینە : ئاوێنە . رای العین : ئەوەی زەق بە چاو ببینرێ .

واتە : وەك وتم ناحەز خۆی ناشیرین و خێل و قیچە ، ئەك یاری من کە ڕۆی وەك ئاوێنە پێگەردە . جا هەرکەس بێت و ناشیرینیی خۆی بخاتە ئەستۆی ئاوێنە و ئەو ئاوانبار بکا و بڵێ خەتای ئەوە کە من ناشیرینم ، با شایەتیشی هەبێ ، کە دیمەنەکەیەلی کە لە ئاوێنەکەدا بە ناشیرینێ دەرلەکەوێ ، کەس باوەڕی پێ ناکا .

نوقصانیی ڕۆی (چن) و (هم) و (ت) و (ك) و (مز) : نوقصانی ڕۆ .

(٦) واتە : یار وەك فریشتەی تۆمارکردنی چاکە و خراپەی بەندەکانی خوا وایە . چۆن ئەوان بەجارێ چاکە و خراپەی بەندە ئەنۆسن و بەپێی ئەوەی ئەینۆسن کۆمەڵە بەندەیەك ئەنێرنە دۆزەخ و کۆمەڵێکیتر ئەنێرنە بەهەشت ، ڕۆخۆشێ و ڕۆگرژیی ئەمیش بەجارێ سەیری دەفتەری کرداری دڵدارانی ئەکا تا بڕیار بدا کامیان بخاتە بەهەشتی (پێگەیشتن) و کامیان بخاتە دۆزەخی ( دوری ) . دیارە کە بە جارێکیش تەماشای کرد، چاوە سافەکەی ئەبینێ و چاوە خێلەکەی نابینێ .. جا ئەگەر بە نیازی پێگەیشتن تەماشای دەفتەرەکەی کردبو ، هەندێك بەرئەکەون و پێیئەگەن و هەندێکیش ئەکەونە پشت گوێ . ئەگەر بە نیازی بڕیاردانی دوریش تەماشای کردبۆ ئەوا ئەو هەندەی ئەکەونە بەر چاوە سافەکەی بێبەش ئەبن و ئەو هەندەکەیتر ئەو بڕیارە سەختەیان بەسەرا نادرێ .

لەم‌بەیتەدا لیشارەت بەو واتە ئاینییە کراوە کە ئەڵێ هەمو مرۆیەك دۆ فریشتەی بەسەر شانەوەیە چاکە و خراپەی تۆمار ئەکەن .

« نالی » ئەو وەحشی غەزالە کەس ئەبەر داوی ئەکەوت
چونکە شاهێنی ذوو چاوی تیژە ، دائیم سەر دەکا (٧)

— ١٢ —

چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی میسکین دەکا
مەستە ، مەیلی چەن کەبابێکی دلی خوێنین دەکا (١)

طالیبی لێوین و ئەلقەی زولفمان نیشان دەدا
زازەوی میصرین و ئەو ڕۆمان لە مولکی چین دەکا (٢)

---

(٧) وەحشی غەزال : ئاسکی کێوی . لەبەر : بەر .

واتە : نالیا ! ئایستا کەس نەکەوتووەتە داوی ئەو یارەوە کە بیگرێ و ئەویش بێ بیگرێ و بیبا ، چونکە چاوە وەك شەهێنەکانی ئەوەندە تیژ و زۆبینن ، کە بۆ کەسێ ئەڕوانن تیری نیگایان سەر ئەکا و نایپێکێ .

لە کۆکردنەوەی ( سەر ) و ( بەر )دا جیناسی لاحیق هەیە .

لەبەر داوی (چر) : لەبەر زاوی . (چن) و (ك) : لەبەر داوی . (مز) : وەبەر داوی . (گم) : بەسەر داوی . سەردەکات (مم) : شەڕ دەکات .

— ١٢ —

(١) واتە : چاوت ئاگر بەرئەداتە سینەی دلداری بەسەزمان کە هێلانەی دلیەتی .. بەلام ناهەقی نیە واتەکا .. سەرخۆشە . سەرخۆشیش بۆ مەزە حەزی لە کەبابە . چیش لە دلی خوێناوێ چاترە بۆ کەباب !! .

لەم بەیتەدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە : مەست بۆ چاو و کەباب بۆ سینە و دل بۆ عاشق ئەگەڕێتەوە .

ئاگر (عم) : ئاور . بەلام ئاشکرایە هەڵبەستی نوسەرێکی موکریانییە ، چونکە ئەمە زاراوەی ئەو ناوچەیەیە .

ئەم پارچەیە تەنها لە نوسخەکانی ( عم ) و ( گم )دا هەبون .

(٢) زازەو : زێبوار . .

واتە : ئێمە داوای ماچی لێوی سوری لێ ئەکەین ، کەچی ئەو ئەلقەی زەشماری زولفیمان پیشان ئەدا و پێیمان ئەترسێنێ . سەیرە .. ئێمە ئەمانەوێ بۆ میسر بڕۆین کە ( یوسف )ی ونبوومانی تیایە ، کەچی ئەو

تا موعەیەن بێ کە زۆرن دەس گرییو دەس کوژی
فەرقی سەر ، پەنجەی بە خوێناوی حەنا ڕەنگین دەکا (٣)

بێ قسەی غونچەی دەمت کاتی تەبەسسوم ڕۆبەڕۆ
هەتکی شوعلەی بەرق و نەظمی دائیرەی پەروین دەکا (٤)

---

بەرەو وڵاتی چینمان ئەنێرێ و ئەمانخاتە ئەودیوی کێوی ( قاف ) .. لە وشەی ( چین )دا ئیشارەت کراوە بــە چــین چینیی زولف و ڕەشێ و بۆنخۆشییەکەی وەك موشکی خەتا و خوتەن .

لە کۆکردنەوەی ( لێو ) و ( زولف )دا تەناســوب و لــە یەکخســتنی ( میصر ) و ( چین )دا طیباق هەیە ، چونکە میصر لە خۆراوا و چین لە خۆرهەڵاتە . لە هێنانی میصر و چینیــدا بەدوای لێو و زوڵفدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

ئەلقەی ( مم ) : حەلقەی . ڕازەوی ( مم ) : ڕەهرەوی . ئەو ڕۆمان ( مم ) : واریدمان . بەڵام ئاشکرایە هەڵبەستی نوسەرێکی موکریانییە ، چونکە لەمە زاراوەی ئەو ناوچەیەیە .

(٣) موعەیەن : ئاشکرا و دیارێ . دەس گر : دیل ، دەستگیر . دەس کوژ : بە دەس کوژراو . فەرقی سەر : تەوقی سەر . حەنا : خەنە .

واتە : بۆئەوەی لای هەموکەس ئاشکرا و دیاری بێ کە یار زۆر کەسی بە دیل گرتووە و زۆریشی بە دەســتی خۆی کوشتووە ، خەنــەی وەك خوێن سوور ئەدا لە تەوقی سەر و لە پەنجەکانی ، گوایە ئەو خەنەیە کە سەر و دەستی پێ ڕەنگین کردووە خوێنی قوربانییەکانیەتی .

دەس گرییو دەس کوژی ( گم ) : دەستگروی دەستکوژی .

(٤) تەبەســـوم : زەردەخەنە . هەتــك : ئابڕۆ بردن . بــەرق : برۆسکەی هەور . پەروین : چەنــد ئەستێرەیەکی وردن لە دەوری ئەســتێرەی ( ئەور ) کۆبونەتەوە .

واتە : خونچەی دەمت بێئەوەی هیچ بڵێ ، هــەر تەنها بە بەرەوڕوو وەستان، لەکاتی زەردەخەنەدا، بە خۆیی خۆی و بە دەرخستنی ڕیزی دانە سپییەکانت ، ئابڕۆی ڕۆشنایی کاتی هەورە برۆسکە و ڕێکوپێکی بازنەی دەوری ئەستێرەی پەروین ئەبا .

ئەشکونجێ ( ڕۆبەڕۆ ) نەبێ ( ڕۆ و برۆ ) بێ . بەمپێیە مەعنای بەیتەکە وای لێدێتــەوە : ڕۆت لەبەر ڕۆشــنێ و برۆت لەبــەر کەوانییەتی ،

تیری موژگانت لە سینەمدا دەچێ بۆ پیری دڵ
هێندە کەچ ئایینە قەصدی خانەدانی دین دەکا (٥) ■

گوڵ بە دەم بادی صەباوە پێکەنێ یەعنی وەرە
تۆ لە وەصلم بۆ بەرە ، ئەو بۆیە بولبول شین دەکا (٦)

---

بێئەوەش کە موحتاجی قسەکردنی دەمت بێن ، تەنها بە زەردەخەنەیەکی لێو ، ئابڕۆی ئیشکی هەورە بروسکە و بازنەی دەوری ئەستێرەی پەروین ئەبەن . بەپێی ئەم مەعنایە مەبەست لە ( قسەی دەمی کاڵی زەردەخەنە ) ئەوە ئەبێ دەم بە تەنها زەردەخەنەکەی وەك هاتبێتە دەنگ و شابەلیبەکی دابێ وابە .

ئەشبێ وشەی ( بێ قسەی ) لەپێشانا ( بێ قسە ) بوبێ و بە هەڵەی نوسیار ئەو ( ی )یەی هاتبێتە سەر . بەم پێیە مەعناکە وای لێدێتەوە : خونچەی دەمت لەکاڵی زەردەخەنەدا هەر بەتەنها خۆی و بێئەوەی پێویستی بە وتنی هیچ هەبێ ، ئابڕۆی ڕۆشنایی کاڵی هەورە بروسکە و، ڕێکوپێکیی بازنەی دەوری ئەستێرەی پەروین ئەبا .

(٥) کەچئایین : بێدین .
وانە : تیری برژانگت کە لە کەوانی بڕۆوە ئەقاندۆتە سینەم ، لە هەمو شوێنەکانی سینەمدا پیری دڵمی کردوە بە نیشانە ، کە لەبۆ لەبەر پیری و پێشەوایی ئەدری بزانێ و خۆینەدانە قەرەی . برژانگت لەوەندە بێدین و ئایینە کەسی نەدۆزیوەتەوە بیکا بە نیشانەی تیری خۆی ، دڵ نەبێ کە لانەی خواناسیبە .

ئەشگونجێ ( لە سینەمدا ) بەمجۆرە بێ : ( لە سینەم دا ) وانە : تیری برژانگت نا بە سینەمەوە و ئەویش ئەچێ لە پیری دڵم ئەدا .. تاد .

لە دۆ نوسخەکەی بەردەستمانا لەجیاتیی ( پیری دڵ ) نوسرابۆ ( پری « پەڕی » دڵ ) . ئێمە ئەومان بە هەڵە زانێ و کردمان بە ( پیری دڵ ) چونکە هەم مەعناکەش بەمجۆرە بە باشتر دێ و ، هەم لەبەر هاوسەنگیی ( تیری ) و ڕێکیی تێکڕای نیوە شیعرەکەش .

بۆ پیری « پەڕی » ( عم ) : لۆ پەڕی .

(٦) وانە : گوڵ بە دەم شنەی بای سبەینێوە پێکەنێ و خونچەی پشکوت . ئەو پشکوتن و دەم کردنەوەیەی ئەوەبو بە بای سبەینانی وت وەرە بۆنی خۆشی وەصلی یار لە من وەرگرە و بە جیهانا بڵاوی کەرەوە . بولبولی زار و دڵداریش کە بەم کەین و بەینەی زانێ و ئەم قسەیەی

■ گومانم هەیە کە پیری دڵ بێ،بەڵام دیسان لە (پیری) یا ( لوپەری ) باشترە . وشەی (دین ) لێرەشدا مانای بینین دەدا .

چاوی من بەحری موحیطی تۆیە بۆ دەفعی گەزەند
لێت موعەییەن بێ کە « نالی » گوڵ بە دڵ پەرژین دەکا (٧)

— ١٣ —

یا بدرُ علواً و ضیاءً و کمالا
فالغصنُ مع الأصلِ الی فرعِكَ مالا (١)

---

گوڵی گوێ لێ بۆ و تێگەیشت خۆشەویستەکەی لەگەڵ یەکێکی‌ترا گفت و پەیمانی هەیە ، لەداخا کەوتە گریان و شین .

بەم‌پێیە ڕستەی ( ئەو بۆیە ) لەبناخەدا ( ئەوە بۆیە ) بووە و لەبەر خاتری ڕێکیی شیعرەکە سوك کراوە . ئەمە ڕای مامۆستا عەلی مرقبیلە ، بەڵام ڕێیشی تێ‌ئەچێ ( ئەو بۆیە ) نەبێ ، ( ئەو بەویە ) بێ . واتە : گوڵ لەگەڵ بای سبەیناندا ئەم قسەیە ئەکا و بولبول لەولاوە بۆ خۆی لەداخا دەست ئەکا بە گریان .

(٧) بەحری موحیط : دەریای بەرین و بێ سنوور ، ئوقیانۆس . گەزەند : زیان .

واتە : تۆ لەناو چاوی منداى و هەمیشە لەبەر چاومی و چاوم وەك دەریایەك وایە دەوری تۆی گرتووە بۆلەوەی هیچ زیانێکت تۆش نەبێ . تۆیش دڵنیا بە من هەمیشە بە دڵ و گیان تۆ ئەپارێزم و برژانگەکانی چاومت بۆ ئەکەم بە پەرژین تا دەستی کەست نەگاتێ ، یا دڵت بۆ ئەکەم بە پەرژین .

لە شیعرەکەدا ئیشارەتێکی ناسکیش بۆ ئەوە هەیە کە خەڵك چاوی پیس بەهۆی زیان گەیشتن دائەنێن ، کەچێ ئەم بە چاوی ، یارەکەی ئەپارێزێ ..

لە ڕستەی ( گوڵ بە دڵ پەرژین دەکات )دا لەطافەت هەیە چونکە (دڵ) ، هەروەك ڕۆنمان کردەوە دوو مەعنا ئەدا .

دەفعی ( گم ) : بەحری .

— ١٣ —

(١) واتە : ئەی ڕۆی وەك مانگی چواردە جوانی یار ، تا لەتوانی بەرزتر و ڕۆناکی بەخشتر و پڕ و تەواوتر بە ، چونکە شان و قۆڵی یار لەگەڵ لەش و لاریدا ، بەرەو زوڵفی درێژی بۆ داوێن شۆڕ بووەوەی ، لار بۆنەتەوە و ئەگەر تۆ بەرزتر نەبیتەوە و ڕۆشن‌تر نەبی شەوی درێژی زوڵفی ئەو ئەگاتە زەوێ و دەوروبەر ئەگرێتەوە و ئەیکا بە تاریکستانێ .

تا سونبولی زولفت لە نیهالی قەدت ئالا
من دۆدی هەناسەم گەییە عالەمی بالا (٢)

ما عادَلَكَ البانُ ، ولا اللينةُ لينا
اذ عَدَّلَكَ البارىءُ حسناً و جمالا (٣)

من گریە ، ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ، ئەتۆ لوئلوئی لالا (٤)

---

نالی لەم شیعرەیدا ڕۆی یاری شوبهاندووە بە مانگی چواردە و لەش و لاری بە ساقی درەخت و قۆل و بالی بە لقەکانی و زولفی ڕەشی درێژیشی بە شەو . بۆیە پێویستی بە مانگێکی خۆی چواردەیە بە ناوەڕاستی ئاسمانەوە ڕۆی زەویی بۆ ڕۆشن کاتەوە .

لە (بەدر)دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و ، گفتوگۆی لەگەڵ یاردا بەلگەکەیەتی .

لە کۆکردنەوەی ( کمالا ) و ( فرعك مالا )دا جیناسی تەرکیب و ، لە کۆکردنەوەی ( غصن ) و ( اصل ) و ( فرع )دا تەناسوب هەیە .

یا بدر ( چر ) و ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) و (مز) : یا بدری . فالغصن ( عم ) و ( گم ) : الغصن .

(٢) نیهال : نەمام . دۆد : دوکەڵ . بالا : بەرز .

واتە : کە دیم زولفی وەك گوڵی سونبولت باوەشی بە نەمامی بالاتا کرد و لێی ئالا ، خەم و پەژارە دایگرتم کەوا چۆن خۆم لێی بێبەش بۆم . بۆیە دوکەڵی هەناسەم بەرز بووەوە و گەیشتە ئاسمان .

ئەم بەراوردەی نالی لەنێوان شۆڕ بونەوەی زولفی یار و گەیشتنە ئاسمانی دوکەڵی هەناسەی خۆیدا کردویە ، شاکارێکی هونەریی بەرزە .

لە کۆکردنەوەی ( ئالا ) و ( بالا )دا جیناسی لاحیق هەیە .

(٣) واتە : ڕێکی و بەرزیی درەختی بان ( کە درەختێکی بەرزە گەڵای وەك گەڵای بی وایە ) ناگاتە ڕێکی و بەرزیی بالات و نەرمیی سەرینی زۆر نەرمیش ناگاتە نەرمیی لەشت ،چونکە تۆ خوا خۆی بەتایبەتی بە جوانی و شۆخی ڕێکی خستوی .

(٤) گریە : گریان . خەندە : پێکەنین . لەعلی بەدەخشان : لەعل بەردێکی سوری گرانبەهایە لە کان دەرئەهێنرێ و بەدەخشانیش وڵاتێکە لە ڕۆژهەڵاتی باشوری ئێران بە کانی لەعل ناوبانگی دەرکردووە . لوئلوە : مرواری . لالا : لەئلاء ، درەخشان .

بادِرْ ، وَ أغِرِ كوكبةَ البدر بدارا
قد فقتَ سَنا الشارقِ ، لا ذقتَ زوالا (٥)

طورڕەت وەکو تۆماری شکستە و ، سەری کولمت
بۆ تۆری سەوادم بووەتە شەمعی موتالا (٦)

---

واتە : من گریان بە تۆ ئەفرۆشم و فرمێسکی خوێنینی خۆمت ئەدەمێ و تۆیش لەباتیدا پێکەنینم پێ ئەفرۆشی و گاڵتەت بە ڕازی خۆشەویستییەکەی من دێ و مرواریی ڕیزی دانە سپییەکانتم پیشان ئەدەی .

ئەشکونجێ مەعناکەی وابێ : من کە گریانت پێ ئەفرۆشم تۆ دڵۆپی فرمێسکی سپیت لە منەوە دەسگیر ئەبێ و ، تۆش کە پێکەنینم پێ ئەفرۆشی من دیتنی لێوی وەك لەعل سوورلم پێ ئەبڕێ .

لە کۆکردنەوەی ( گریە ) و ( خەندە )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( لەعل ) و ( لوئلوء )دا تەناسوب هەیە .

من گریە ، ئەتۆ خەندە ( مم ) و ( کم ) : من گریەوو تۆ خەندە . بەیەکدی ( چر ) : بەیەکتر . بەدەخشان و ( مم ) : بەدەخشانی . (کم) و (ت) : بەدەخشان .

(٥) واتە : زۆکە دەستوبرد کە هێرش بەرە سەر تیپی لەشکری مانگی چواردە و لەناوی‌بەرە . تۆ لە خۆر بەرزتر و بەڕێزتری ، یاخوا هەرگیز نوشوستی نەهێنی !

لە کۆکردنەوەی ( بدر ) و ( بدارا ) دا جیناسی ناقیص و ، لە کۆکردنەوەی ( فقت ) و ( ذقت )دا جیناسی لاحیق هەیە . جگە لەوەش کە لە باس‌کردنی ( زەوال )دا ئیشارەت بە لادانی خۆر هەیە لە ناوەڕاستی ئاسمان کە زاراوەیەکی فیقهییە و بەکارهێنانەکەی تەناسوبی تیایە .

وابڕ ( چن ) : وامن .

(٦) طورڕە : زولف. تۆمار : جاران ئەو نامانەی بە خەتی خۆش ئەنوسران و ڕستەی جوانیان تیا ئەهۆنرایەوە ، کۆیان ئەکردنەوە و بەڕیز ئەیانلکاندن بەیەکەوە و پاشان لوولیان ئەکرد و نامە نامە بە دەرس بە منداڵیان ئەوت بۆئەوەی نوسەری خەت خۆش و زەوان‌بێژیان لێ دەرچێ . بەوەیان ئەوت تۆمار . شکستە : جۆرە خەتێکی فارسییە بەئاسانی بۆ هەموکەس ناخوێنرێتەوە و کەسی شارەزای ئەوێ . سەواد : خەتی ڕەشی بەردەست . جاران بە خوێندەواریش ئەوترا . موتالا : تەماشا کردن و خوێندنەوەی کتێب .

ئەو چاوە غەزالە فەتەراتی سەر و ماڵە
ئەو نەرگسە کاڵە نە منی هێشت و نە کاڵاّ (٧) *

حوققەی فەلەکول ئەطلەس و ئەستوونەیی زێڕین
بێ پێکە بە تارای سەرو ترکەی خەز و والاّ (٨) * *

---

واتە : زوڵفی ڕەشی پێچ پێچت تۆماری نامەی بە خەتی شکستە نووسراوە ، هەموو کەس سەری لێ دەرناچێ . سەری کولمیشت وەك مۆمی داگیرساو وایە من لەبەر ئەو مۆمەدا بەرچاوی خۆم ڕۆشن ئەکەمەوە و تۆماری زوڵفت لەکەمەوە و لەیخوێنمەوە و لە جوانی و پڕ مەعنابییەکەی ئەگەم .

نالی لەم شیعرەیدا دوو شێوەی لە زوڵف و ڕوومەتی دۆستەکەی دروست کردووە لە یەك جیان و بێ یەکیش نابانکرێ ، جگە لە طیباقی ڕووناکی و کراوەیی ڕوومەت و لوولی و ڕەشیی زوڵفیش .

شکستە و ( چن ) و ( ك ) : شکستە . ( مز ) شکستەی . کولمت ( مز ) : زوڵفت .

(٧) غەزال : ئاسك . فەتەرات : فەوتان . کاڵاّ : پارچە ، کەل و پەل .

واتە : چاوی یار لەو ڕووەوە کە لە گەورەییدا وەك چاوی ئاسك وایە، هۆی لەناوچوونی سەر و ماڵی دڵدارە . لەو ڕووەشەوە کە لە مەستیدا وەك نێرگسی کاڵ وایە ، خۆیشم و هەرچیم هەیە هەموو لەناوبرد .

نالی لەم شیعرەدا چاوی یاری بە دوو جۆر شوبهاندووە . لەلایەکەوە لە گەورەیی و تیژیدا شوبهاندوویەتی بە چاوی ئاسك . لە لایەکی کەشەوە لە خەواڵوویەتی و لە مەستیدا شوبهاندوویەتی بە نێرگسی کاڵ .

لە کۆکردنەوەی (چاو) و ( سەر ) و ، ( سەر ) و (ماڵ)دا تەناسوب و ، لە یەکخستنی ( ماڵ ) و ( کاڵ )دا جیناسی لاحیق و ، لە یەکخستنی ( کاڵە ) و ( کاڵاّ )دا جیناسی ناقیص هەیە .

نەرگسە (کم) : نێرگسە . (گم) : نێرگزە . (ت) : نەرگسی .

(٨) حوققە : ئاسمان . فەلەکول ئەطلەس : لای فەیلەسوفە کۆنەکان ناوی ئاسمانی نۆهەمە چونکە ئەوان ( عەرش ) و ( کورسی )یشیان بە ئاسمان داناوە . ئەستوونە زێڕینە : کۆڵەکە زێڕینە ، ( قوس قزح ) . تارا : سەرپۆشی بوك . ترکە : چارۆکەی کوڵ . خەز : ئاوریشم . والاّ : جوان . پایەبەرز .

* ( کالا ) بەلامی بچوکە .

* * ( والا ) ش هەر وایە . بەم وایە هەموو لامە قڵەوەکان هەر دەبێ بە لامی بچوك بن، چونکە نەماناپان دەگۆڕێ و نە قافیە. لە لەهجەکانی کوردیدا لەهجەی وا هەن کە ئەم وشانە بە لامی بچوك بەکار دەبن .

دنیا بە فیدای قەددی بکە ، دامەنی بگرە
طوبی لِمن اختارَ علی المالِ مآلا ! (٩)

« نالی » بە ئومێدی ظەفەری طەوقی تەلیسمت
ماری سرِی زولفت لە سەر و گەردنی ئالاّ (١٠)

— ١٤ —

حیرەتزەدە وا دیدە وەکو حەلقەیی دەر ما
بێمایە نییە عاشیقی بێچارە ، ( بفرما ) ! ٠ (١)

---

واتە: تۆ شایانی ئەوەی ئاسمانی فەلەکول ئەطلەس بکەی بە سەرپۆشی ڕۆژی بۆکێنیت و کوڵەکە زێڕینە بکەی بە چارۆکەی ئاوریشمی جوانی کوڵت . دوور نییە لەو سەردەمەشدا دوو قوماشی گرانبەها بووبن بە ناوی ( فلك الاطلس ) و ( ستونی زێڕین )ەوە ، تەنانەت کە ئێستاش قوماشی ( ئەطلەس ) هەیە .

(٩) واتە : دارایی و سامانی دنیا بکە بە قوربانی بالاّی و ، دەسەو داوێنی بە، پارە قیمەتی نییە ، سەرەنجامی خۆش شتە . خۆزگە بەوەی بیر لە دوارۆژ ئەکاتەوە و ئەیخاتە پێش ڕابواردنی ئێستاوە و سەرەنجامی خۆشی لا لە پارە و دارایی بەنرختره !

لە کۆکردنەوەی ( قەد ) و ( دامەن )دا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی ( مالّ ) و ( مەئال )دا جیناسی ناقیص هەیە .

بکە ( چر ) و ( عم ) و ( گم ) : بکەو . علی المال ( ت ) : علی الحال .

(١٠) ظەفەر : دەستکەوتن . طەوق : کۆت . طەلیسم : ئەفسانە و جادوی پەی پێ نەبراو .

واتە : نالی بە هیوای پەیپێبردن و کردنەوەی طەلیسمی گەنجینەی ڕۆت هات ، بەلاّم لە جیایی ئەوەی بە مرازی دلّی خۆی بگا ، ماری سرِی زولفتی لە سەر و گەردن ئالاّ و بۆ بەداوەوە . لە ئەفسانەی کۆندا هەیە مار بەسەر گەنجینەی شاراوەوە پەبکە ئەخوا .

لە کۆکردنەوەی ( سەر ) و ( سر )دا جیناسی ناقیص هەیە .

ظەفەری طەوقی ( ك ) : ظەفەری طەوق و . ( مر ) : ظەنەر و طەوق . سرِی ( كم ) : سەر و . ( گم ) : سەری . سەر و ( كم ) : مل و .

— ١٤ —

(١) حیرەتزەدە : سەرسام و سەرگەردان . حەلقەیی دەر : ئەلقەڕێزی

بێ ، سەروی ڕەوانم ! کە لەبەر ئەشکی ڕەوانم
خەرقە بووەتە غەرقە ، کەوا سەوزە لەبەرما (٢)

ئەی واعیظی بارید چیە هەروەك هەرەسی کێو
بەو وەعظە کە بایە هەمو ، هاتویی بەسەرما ؟! (٣)

---

دەرگا کە هەمیشە لە دەرەوەیە و سەر بانەدا و چاوەڕوانە .. بێمایە : بێکارە و بێدەسەڵات و هیچ لە دەست نەهاتوو . بفەرما : وشەیەکی فارسییە واتە فەرمو .

واتە : چاوم سەرگەردان و سەرسامە وەك ئەڵقەزلێزی دیوی دەرەوەی دەرگا کە هەمیشە لەدەرەوەیە و بەهۆی هاتوچۆی خەڵکەوە لەلەرێتەوە و هەردەم چاوەڕوانە یەکێکی تر دەرگاکەی بۆ بکوتێتەوە . دە فەرمو بکەرە فریام ، وامەزانە عاشقی بەدبەخت هیچی لە دەست نایەت و هیچی لەبارەدا نییە .. گەورەترین سەرمایەی بەدەستەوەیە کە سەرچاوەی لەبن‌نەهاتوی خۆشەویستییە .

بێمایە ( کم ) و ( گم ) : بێبایە .

(٢) بێ : وەرە . ڕەوان ( ی یەکەم ) : بەرز و قنج . ڕەوان ( ی دووهەم ) : جاری ، ئەوەی ئەڕوا . خەرقە : عابا . پاڵتۆ . غەرقە . نوقمی ئاو .

واتە : لەی یاری باڵا وەك سەرو بەرزم ! وەرە لام و بکەرە فریام ، وا من بەهۆی ڕێژەنی فرمێسکمەوە هەمو گیانم لە ناو هەڵژەنراوە . خەرقەکەی بەرمە لە ئاوا نوقم بووە و ، کەواکەمە ئەویش ئەوەندەی ئاو بەسەرا ڕۆیشتووە گیای لێ ڕواوە .

ئەشکونجێ ( بێ )ی سەرەتای شیعرەکە مەفعولی ( بفەرما )ی دوا وشەی شیعری پێشوو بێ ، واتە بڵێ : وەرە ! ئاد .. هەروەها ئەگونجێ ( کەوا ) بە مەعنا ( کە ) بێ واتە : ئەوەتە .. ئەوەش ئەگونجێ کە ( لەبەر ) بەمەعنا ( لەپێشی ) و ، ( ما )ی ( لەبەرما ) مەرەبێ بێ و کورتەی ( ماە ) بێ واتە : کەواکەم لەبەر ئاو یا لە بەراوا سەوز بووە ..

لەنێوان هەردو ( ڕەوان )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان ( خەرقە ) و ( غەرقە )دا جیناسی موضاریع و ، لەنێوان ( خەرقە ) و ( کەوا )و ، ( غەرقە ) و ( سەوزە )دا تەناسوب هەیە .

(٣) بارید : سارد . هەرەسی کێو : بەفری زۆر کە لە دەمەو بەهارا بنەکەی ئەتوێتەوە و لەجێی خۆی ئەجوڵێ و لە لاپاڵەکانەوە لێژ ئەبێتەوە بۆ ناو چەم و دۆڵ و دار و بەردێکی زۆریش لەگەڵ خۆی دێنێ و وا ئەبێ

بۆ هەرکەسێ مەبذۆلە طەریقێکی ئەمانەت
هەر عاشقی بێچارە لە ڕێی خەوف و خەطەر ما (٤)

دیدەم هەموشۆراوە بە شۆراوی سوروشکم
لەم لەوحە نیگارینە نە عەین و نە ئەثەر ما (٥)

---

ئاوایی و باخ و باخاڵی بەرنەکەوێ وێرانی ئەکا و بنیادەمی دێتە ڕێ ڕای ئەساڵێ و ئەیکوژێ . بایە : سوک و بێ‌بایەخە .

واتە : ئەی ئامۆژگاریکەری قسە سارد ! ئەوە چییە ، وا وەك هەرەسی کێو بە ئامۆژگاریە سوك و بێ‌بایەخەکانت هاتوی بەسەرما دائەگرێیەوە ، یاخود بە سەرمای زستان هاتوی ئامۆژگاریە وەك ( با ) بێ‌مایەکانت لەدەی بەگوێما .. *

لەنێوان ( بارید ) و ( هەرەس ) و ( کێو ) و ( با )و (سەرما)ی ( بەسەرما )دا تەناسوب هەیە .

کە بایە هەمو ، هاتوی (گم) : کە وەك بایە لەوەند هاتوە .

(٤) مەبذۆل : ئاسان . ئەمانەت : سەلامەتی . ما : مایەوە .

واتە : هەرکەس ڕێگایەکی بێ‌وەی و سەلامەتی بۆ ئەلوێ بیگرێتەبەر ، عاشقی داماو نەبێ ڕێگاکەی هەمو مەترسی و مەینەتە .

طەریقێکی ( چر ) : طەریقێکە .

(٥) شۆراو ( ی دوەهەم ) : شۆرئاو ، ئاوی سوێر . لەوح : تەختە . نیگارین : وێنە لەسەر کراو . عەین : چاو . ذات . ئەثەر : نیشانە . عەرەض .

واتە : چاوم هەموی بە فرمێسکی وەك ئاو و خوێ سوێراوم شۆراوەتەوە ، بەڕادەیەك ئەو تەختە نیگارینە کە هەزاران وێنەی تێدا نەخش کرابو ئێستا هیچی تیا نەماوە ، نە چاو و نە پاشماوەی چاو ، یان نە خۆی و نە نیشانەکانی .

نالی لەم شیعرەدا ئیشارەتێکی ئاسکیشی بە ئایەتی « في لوح محفوظ » کردووە و ، ویستویە بڵێ : بەپێچەوانەی لەوحە پارێزراوەکەی ئایەتەکەوە ، لەوحی چاوی ئەم هیچی نەماوەتەوە .

لەنێوان هەردو ( شۆراو )دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان ( عەین )و ( ئەثەر )دا کە بەمەعنا ( مادده ) و ( عەرەض )ن طیباق هەیە .

لەوحە ( عم ) : لەوحی . عەین و ( چن ) و ( عم ) و ( گم ) و (لك) و ( مز ) : لەوح و .

* بە بای وادە رنوو بەفر هەرەس دێنن . نالی ئەوەشی مەبەست بووە .

وا ظەن مەبە ڕوخسارەیی تۆ غالیبە قوربان
بنوارە چلۆن نەقشە لەنێو دیدەیی تەڕما (٦)

یا توربەتێ ، یا غوربەتێ یا ڕێ بشکێنین
هەر موتەنظیرە « نالی » ئەگەر مرد و ئەگەر ما (٧)

---

(٦) ظەن : گومان . چلۆن : چۆن .

واتە : ئازیزەکەم ! لەم قسانەوە کە کردمن وا گومان نەبەی کەوا وێنەی ڕوخسارە نازدارەکەی تۆش وەك وێنەکانیتر شۆراوەتەوە و لەناو چاوما نەماوە . نەء .. وێنەی تۆ هەمیشە هەر ئەمێنێ .. سەیرکە چۆن لەناو چاوە بە فرمێسك تەڕەکەمدا نەخشە و دیاریبە . لەم شیعرە موبالەغەیەکی زۆر جوانی تیایە ، چونکە نەخش بە عادەت ئەبێ لەناو ئاوا بکوژێتەوە ، کەچی نەخشی لەم لەناو ئاوا جێگیربووە .

لەنێو ( کم ) : لەناو .

لە نوسخەکانی ( چر ) و ( چن ) و ( عم ) و ( ت ) و ( ك ) و (مز)دا ئەم شیعرە لەپێش شیعری پێشووەوەیە ، تەنها لە نوسخەی ( کم ) و (گم)دا بەمجۆرەیە کە لێرەدا دامانناوە . ئێمە ئەمەمان بەلاوە لەبارتر بو .

(٧) توربەت : گۆڕ . غوربەت : غەریبی . ڕێ شکاندن : هاتوچۆکردن .

واتە : یا غەریبیم بشکێنە و بانگم کە بێمەوە ئەگەر بەسەر زیندوێ بۆم ، یا لەگەر مردم سەرێ لە گڵکۆکەم بدە و گۆڕەکەم پێشێل کە .. هەرچۆن بێ من هەمیشە چاوەڕێی پێگەیشتنتم ، چ بە زیندوێ بێ و چ بە مردوێ . کەواتە با ئەم لێکبڕانە بەس بێ و ڕچەی نێوانمان بشکێنین و بە یەك بگەینەوە .

لەنێوان ( توربەت ) و ( غوربەت )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (مرد) و ( ما )دا بەدوای ( توربەت ) و ( غوربەت )دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

لە داڕشتنی ئەم پارچە شیعرەوە وادەرئەکەوێ نالی پاش چونی بۆ شام داینابێ ، چونکە بە عادەت چۆن بۆ فەقێیەلی لە کوردستاندا بە چونە غەریبی دانانرێ مادەم فەقێکە هەر لە وڵاتەکەی خۆیایەلی و نیازی گەڕانەوەشی هەیە پاش لێبونەوە لە خوێندن . جا ئەگەر وابێ کە ئێمە بۆی چووین ، ئەوا وانەگەیەنێ کە ( حەبیبە )ی نەهێنابێ ، چونکە ئەگەر هێنابۆیایە و ژنی بوایە پێویستی نەئەکرد ئەو بانگی کاتەوە بێتەوە .

بشکێنین ( کم ) و ( گم ) و ( عم ) : بشکێنن .

— ١٥ —

جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا
( حەبیبە )ی ( مالیاوا ) مالی ئاوا ! (١)

حەلالی بێ لیکاحی حۆری عینم
بە جۆتێ ناظیری شەرع و فەتاوا (٢)

---

— ١٥ —

(١) جەنان : دڵ . جینان : جەمعی ( جەننەت ) ە بەمەعنا بەهەشت . ماوا : مەئوا ، جێگە . مالیاوا : دڵی خۆشەویستەکەی نالی بووە .
وانە : حەبیبەی مالیاوایێ ، خوا مالـی ئاوا کا ، دڵی وەك بەهەشت ئاوەدان کردمەوە و کردی بە جێ و ماوای خۆی .
لە کۆکردنەوەی ( جەنان ) و ( جینان )دا جیناسـی موحەڕڕەف و ، لەنێوان ( مالیاوا ) و ( مالی ئاوا )دا جیناسی تەرکیب هەیە .
جەنانی ( چر ) : جەنـانت . بـەڵام ئـەم خیطابە لـەگەڵ غیابی نیوە شیعری دووەمدا ناگونجێ .

(٢) حۆری عینم : حۆریە سپییەکانم ، مەبەست لە گلێنەی چاوە . یاخود : حۆریی مەینم ، واتە چاوی وەك حۆریم . ناظیر : چاو . سەرپەرشتیکەر .
وانە : کە دڵم بـۆ بە بەهەشت و یـار تێیدا جێگیر بـۆ ، ئەبێ وەك دانیشتووانی تری بەهەشـت حۆریی لێ مارە ببڕرێ ، بۆیـە وا گلێنەی چاویشمی پێشکەش ئەکەم . دەبا لەم حۆریە سپیانەی چاومی ، یا ئەم گلێنـەی چـاوی وەك حۆریـەمی لـێ حـەڵاڵ بـێ بـە مـارەبڕێ ، بەپێی فەرمـوودەی جـۆتێ چاودێریکەری کاروباری شـەرع و فتوای شەرع .
ئەشگونجێ مەعنای شـیعرەکە بەمجۆرە لێكبدرێتەوە : یـا حۆریی سـپیی چاوم ، یا چـاوی وەك حۆریم ، حـەڵاڵی پێویست بە مارەبڕین نەکردۆی یـار بێ کـە دڵمی کرد بـە بەهـەشت و لیـا دانیشـت .. بەمپێیە شیعرەکە ئیشارەت ئەبێ بەوە کـە حۆریی بەهەشت مارەبڕینی ناوێ و بـۆرە لیشارەتێکیشی لیـا ئەبێ بۆئـەوە کە نالیش حەبیبـەی نەهێناوە .

مەبەستیش لـەم مارەبڕینی چاوە لە یار و نیشتەجێ بۆنیـە لیایدا ،

زەفافەنگاهی پەردەی ئالی چاوم ،
موبارەك حەجلە بێ بۆ بۆك و زاوا (٣)

سیداقی رۆنماوو ، وەصلی شاهید
لەگەڵ شایی‌کەران بێ دەنگ و داوا (٤)

---

ئەوەتە مادەم کە خۆشی ویستووە ، هەرگیـر شێوەیی لە بەرچـاو ون نابێ .

ناظیری (چر) و (ت) : ناظیر و .

(٣) زەفافەنگاه : شوێنی گواسـتنەوە ، پەردە کـە بۆکی پێ‌ئەبرێ بۆ زاوا . حەجلە : شوێنی تایبەتیی یەکەم شەوی بۆك و زاوا .

واتە : پەردەی سووری خوێناویش کە بەهۆی گریانی زۆرەوە بەسەر ڕۆی چاوما هاتـووە ، ببێ بە شوێنێکی پـیرۆزی گواستنەوە و شەوی یەکەم بۆ ئەم بۆك و زاوایە .

ئەشتوانرێ نیوەی دووەمی ئەم شیعرە بەم‌جۆرە بخوێنرێتەوە :

موبارەك حەج لەبێ بۆ بۆك و زاوا

واتـە : حەجێکی پیرۆزی لێو بۆ بۆك و زاوا . مەبەستی لەوەیە هەرکام لە بۆك و زاوا کە دەم ئەبەن بەلای یەکترەوە بۆ ماچ ، لێوی هەرکامیـان حەجی کەعبەی لێوی ئەویانی کردووە .

زەناقەنگاهی پەردەی (ت) : زەفافەت پەردەگاهی . حەجلە بێ (کم) : حوجرە بێ (گم) : حەجلەیە .

(٤) سـیداق : مارەیی . رۆنما : ئەو ئاوێنەیـەی لەکاتی گواستنەوەی بۆکدا ئەیگرن بەرۆیەوە و تیا دەرئەکەوێ . ■

واتە : مارەیییەکەشی ئەو ئاوێنەیە بێ کە تیا دەرئەکەوێ کە ڕوخساری خۆیەتی و ، شاهیدی ئەم مارە بڕینەش بەیەك‌گەیشتنەکەیان بێ و لەگەڵ شایی‌کەرانیشـا کە برازانگەکانمن بێ هەرا و ئاژاوە دانیشن .

ئەبۆ ئەم شـیعرە لەپێش شـیعری پێشـووەوە بوایە چونـکە دیارە مارەبـڕین و شایەت‌گـرتن و گەیشتـن بەیـەکی بۆك و زاوا بـەر لـە گواستـنەوە و چوونە پەردە ئەبێ . لەوانەیە بە هەڵەی نووسیار دواکەوتبێ .

سـیداقی (ك) : سـیداق و . شایی‌کەران (کم) و (ك) : شـایێتییان .

■ روونەکەشەو ئاوێنە نیە کە بەرەو بووکی ڕادەگرن بەڵکووشەم دیاری‌یە کە زاوا کاتێ تارای لە سەر بووك لادا دەیداتێ و بە کوردی پێی دەڵێن شەرمەشکانە .

ویساڵی بێ کەم و کەیفی حوضووری
لە « نالی » گەر دەپرسێ ، یەعنی ئاوا (٥)

— ١٦ —

پەچەیی پەرچەمی‌بوو ، پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگە شەوە کوڵمی تیا (١)

---

(٥) بێ کەم : بێ چەندیەتی . کەیف : چۆنیەتی . حوضوور : هاتنە خزمەت .
واتە : ئەگەر باسی پێگەیشتنی ، لە پێگەیشتنی کەس نەچۆی بێ چەند و چۆنی یار ئەپرسێ لە نالی ، لە وەڵاما ئەڵێ تا بەمجۆرە ئەبێ کە حەبیبە و چاوەکانم بەیەك گەیشتن .
ئەم شیعرەش هەر لەوانەیە بکرێ بە بەڵگە کەوا نالی و حەبیبە بەیەکەوە نەگەیشتوون .
کەیفی (گم) : کەیف و .

— ١٦ —

(١) بەچە : ڕووپۆش . پەرچەم : قژی پێشی سەر . پرچ : زولف . سیا : ڕەش . تیا : تیایدا .

واتە : پەرچەم و پرچی ڕەشی یار کە بوونەتە پەچە بەسەر ڕوویەوە ، لەگەڵ کوڵمی جوان و ورشەداریا ئەڵێی شەوی مانگە شەوە ، شەوەکەی پەرچەم و پەچەکەیەتی و مانگەکەشی ڕووەکەیەتی .

نالی لەم شیعرەدا تەشبیهی مورەککەبی بەکارهێناوە ، شێوەیەکی تێکەڵاوی شوبهاندووە بە شێوەیەکی‌تر . هەروەها سەنعەتی ئیهامیشی بەکارهێناوە ، واتە شوێنە گومکێ پێکردن . ئەوەتە شوبهاندنی پەچە و پەرچەمی ڕەش بە مانگە شەو شتێکی سەیرە بەڵام وشەی ( کوڵمی تیا ) مەسەلەکە ڕوون ئەکاتەوە .

لە وشەی ( پرچ ) و ( پەرچەم )دا جیناسی ناقیص و ، لە ( سیا ) و ( تیا )دا جیناسی موضاریع هەیە .

لە نوسخەی ( تو )دا لەسەر ئەم پارچە شیعرە نوسراوە : « در مدح نقاب کە بر سر نسائی دیدە ، گفتەاند » واتە : لە تاریفی پەچەیەکدا فەرموویانە کە بە سەری ئافرەتێکیەوە دیوە . بە شیعری شەشەمیشدا لەوە ئەچێ لە ئەستەمبوڵ وتبێتی ، چونکە هەر لە شارێکی‌وادا ئەگونجێ ئافرەتێکی‌وای دیبێ نەزانێ لە چ‌نەتەوەیەکە .

لادە دەسرۆکەیی هەورێ لە جەبین
دەرکەوێ شەمس و قەمەر ، نور و ضیا (٢)

لێوی تۆ ئاوی بەقا ، من خضرم
فەیضی تۆ ڕەحمەت و ، من سەوزە گیا (٣)

---

پەچەیی ( هـ م ) و ( گـم ) و ( ت ) و ( لـۆ ) و (مـز) : پێچەیـی .
پرچی ( چن ) و ( ت ) و ( ك ) : زولفی .

(٢) دەسرۆکە : دەسـتەسڕی بچوك . سەرپۆش . هەورێ : سـرکەیێ ، جۆرە سـەرپۆشێکی ناسـکی ڕەش و سـپیی ئاوریشـمە . جەبـین : ئەوێل ، ناوچاو . ضیاء : ڕۆشنێ .

والە : سـەرپۆشی سرکەیێ لەسەر ناوچـاوت لادە با مـانگ و ڕۆژ و شەوق و ڕۆناکیی ڕۆت دەرکەوێ .

لە کۆکردنەوەی ( دەسرۆکە ) و ( هەورێ ) و ( جەبـین )و هەروەهـا لـە کۆکردنـەوەی ( شـەمـس ) و ( قەمـەر ) و ( نـوور ) و ( ضـیاء )دا تەناسوب هەیە . لە وشەی ( هـەورێ )یشـدا لەطـافەت هەیە چونکە هەروەکو مەعنای سرکەیێ ئەگەیەنـێ ، ئیشارەتێکیشی بە ( هـەور )ی ئاسـمان تیایە کە لەگەڵ ( مـانگ ) و ( ڕۆژ )دا پەیـوەندی و تەناسوبی هەیـە . لە هێنانی ( نـوور ) و ( ضیـا )یشـدا بەدوای ( شـەمـس ) و ( قەمەر )دا لەف و نەشری موڕەتتەب هەیە .

هەورێ ( ت ) هەوریـن .

(٣) ئاوی بەقا : ئەو کانییەی ئەڵێن هەرکەس لێی بخواتەوە نامرێ . خضر : حەزرەتی خضر کە ئەڵێن ئاوی ژیانی خواردووەتەوە بۆیـە تا قیـامەت نەمرێ . ئیشارەتیشـی بە ناوی نالی خۆی تیایـە . فەیض : میهرەبانێ و ڕۆخۆشێ . ڕەحمەت : بارانی ڕەحمەت .

والە : یارە نازدارەکەم ! لێوی تۆ کانیی ئاوی حەیاتە ، منیش خدری زیندەم ، هاتومەتە سەری لێم خواردوەتەوە و هەرگیز نامرم . میهرەبانیی تۆ لەگەڵ من بارانی ڕەحمەتە و منیش سەوزە گیـای ڕوواوی ئەو بارانی ڕەحمەتەم . لەنێوان ( ئاوی بەقـا ) و ( خضر ) و ، لەنێـوان ( بـارانی ڕەحمـەت ) و ( سـەوزە گیـا )دا تەناسـوب هەیـە . لـە وشـەی ( خضر )یشدا لەطافەت هەیە ، چونکە هەم نـاوی حەزرەتی خضر و هەم ناوی مەلا خدری نالی و هەم مەعنای سەوزە گیاش ئەگەیەنێ کە لەبـەر ئاوا نەمرێ .

ئاوی ( چـر ) و ( کـم ) و ( ت ) و (مـز) : ئـاپی .

فەرشی کەففی بەری پێتە نەرگس
سەری داخستووە وەك چاوی حەیا (٤)

مەمخەرە هاویەیی هەولی فیراق
دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی قیا (٥)

« گێل » ئەگەر تورکی ، «تعال » ئەر عەرەبی
« بێ » ئەگەر کوردی ، ئەگەر فورسی « بیا » ! (٦)

---

(٤) فەرش : ڕایەخ . کەف : سوڵ . بەری دەست .

واتە : نەرگسی نازداری جوان و بۆن خۆش لەعاست جوانی و بۆن خۆشیی تۆدا ئەوەندە خۆی بە کەم ئەزانێ ، بووە بە ڕایەخی ژێر سوڵی بەرپێت ، وەك چاوی شەرم ڕۆی نایەت سەر هەڵبڕێ ، بۆیە وا ملی لار کردووەتەوە . یاخود : نەرگس لەعاستی تۆدا ئەوەندە خۆی بە هیچ ئەزانێ بەری دەستی کراوەی بۆ تۆ بووە بە بەری پێ .. چەند زیادەڕەویيەکی جوانە ! چاوەکە خۆی بووە بە شەرم نەك چاوی کەسێکی شەرمن ..

نەرگس ( کم ) و ( گم ) : نێرگس .

(٥) هاویە : دۆزەخ . تۆنی قوڵ . هەول : ترس . شوێنێکە لە دۆزەخدا . قیا : کورت کراوەی ( قیام ) یا ( قیامەت )ە .

واتە : وەك کەسێك لە ڕۆژێکی ڕەش و سەختی وەك ڕۆژی قیامەتدا دەسەو داوێنی کەسێکی‌تر بێ بەفریایا بگات ، منیش وا دەسەو داوێنی تۆ ئەبم کەوا لێم دوورنەکەویتەوە و تۆشی داوی دۆزەخی دووریتم نەکەی .

ئەشکونجێ مەعنای وا لێك‌بدرێتەوە ئەگەر تۆشی داوی دووریتم بکەی ، لە ڕۆژی قیامەتدا لە کۆڵت نابمەوە و تۆشی لێ‌پرسینەوەت ئەکەم و تۆڵەت لێ‌ئەسێنمەوە .

لە کۆکردنەوەی ( هاویە ) و ( هەول ) و ( دۆزەخ ) و (قیا ـ قیامەت )دا تەناسوب هەیە . کورت‌کردنەوەی وشەی ( قیامەت )یش بە ( قیا ) کە نالی کردویەتی کردارێکی زمانەوانیی نوێیە هاوچەشنیمان پێشتر لە کوردیدا نەدیوە .

ڕۆژی ( ت ) : ڕۆزی .

(٦) واتە : لە هەر نەتەوەیەك هەی بە زوبانی ئەو نەتەوەیە بانگت ئەکەم ، ئەڵێم : وەرە .

سەری فەرهادم و ، دەندۆکی قولنگ
دەستی مەجنونم و ، دامێنی چیا (٧)

خاطری زاهیدی خاڵی ، خاڵی
نییە ، ئەلبەتە ، لە بێنێکی ڕیا (٨)

---

لەم شیعرەدا نالی ئەیەوێ زادەی خۆشەویستیی یارەکەی دەربڕێ و پێی بڵێ لە هەر نەتەوەیەك بێت بۆ من چونیەکە و هەرکەس بێت ئەوەی لای من مەبەستە، پێکەیشتنتە. بەڕاستییش توانیویە بە شێوەیەکی سادە، بەڵام جوان ، لەوپەڕی هەستی پەیوەندی خۆی پێوەیەوە دەربڕێ . .

لە هەمو نوسخەکانی بەردەستمانا ، چاپ و دەستنوسیان ، شیعرەکە لەبارەی ڕێزکردنی ڕستەکانیەوە بەمجۆرەیە کە پیشانمان داوە . تەنها لە نوسخەکەی چاپی مامۆستا گیودا نەبێ ( « بێ » ئەگەر کوردی )یەکەی پێشخراوە ، ئەوەش زیاتر لەوە ئەچێ دەستکاریی خۆی بێ . . چونکە لەبارەی هونەری جوانکاریەوە ( گێل ) و ( تعال ) کە دوا پێتیان لامە ، بەیەکەوە بن جوانترە و ( بێ ) و ( بیا )ش لەپاڵ یەکدا بن ، گونجاوترە بۆئەوەی جیناسێکی ناقیص پەیدا ببێ .

تورکی (ت) تورك و . ئەگەری چوارەم ــ (ت) : وەگەر . فورسی (کم) و (گم) : فارسی .

(٧) فەرهاد : فەرهادی دلداری شیرین . دەندۆك : نوك . قولنگ : چەکوشی بەرد پێ تاشین . مەجنون : قەیسی عامیریی شێتی لەیلا . دامێن : داوێن . بنار . چیا : شاخ .

واتە : ئەگەر نەیەیتەلام ، هەمو هۆیەکی گرفتاربونم بۆ کۆبووەتەوە . سەری فەرهاد و نوکی قولونگەکەیم ، ئیتر چیم ئەمێنێتەوە بۆ پان بونەوە !! دەستی مەجنون و داوێنی چۆل و بیابانم کە سەری خۆی بۆ هەلگرت . . ئیتر چیم ئەمێنێتەوە بۆ شێتبون و دەشتودەر گرتنەبەر !! .

لەنێوان ( سەر ) و ( فەرهاد ) و ( قولنگ ) و ، ( مەجنون ) و ( چیا ) و ، ( دەست ) و ( داوێن ) و ، ( سەر ) و (دەست)دا تەناسوب هەیە. لەنێوان ئەم شیعرە و شیعری پێشویشدا حوسنی تەعلیل هەیە ، واتە : لە حاڵێکی ناڕەحەتدام ، بە هەمو زوبانێ بانگت ئەکەم بێیتەلام و بەفریام بکەی ، ئەگینا . . . تاد .

دامێنی (چر) : دامەنی .

(٨) خاطر : دڵ . زاهیدی خاڵی : سۆفیی بەدیمەن دەست لە دنیا هەلگرتو . بێن : بۆن . ڕیا : ڕوپامالی .

دۆر لە تۆ ئیدی مەپرسە ، قوربان
حالی « نالی » کە نە مرد و نە ژیا ! (٩)

— ١٧ —

ڕیشەکەی پان و درێژە ، بۆ ژیا خزمەت دەکا
ظاهیرە هەرکەس بە طۆل و عەرضی ڕیشیدا ژیا (١)

---

واتە : دڵ و دەرۆنی پۆچ و بۆشی سۆفیی بەدیمەن دەست لە دنیا هەلگرتو ، هەرچۆن بێ ، بۆنێکی ڕۆپامالی و مەرایی کردنی هەر لێ دێ .

ئەشکونجێ مەعناکەی وا لێکبدرێتەوە : دڵ و دەرۆنی ئەو سۆفییەی کە گوایە وازی لە خالی گۆنای یار هێناوە ، خالی نییە لە ڕۆپامالی و درۆ .

زاهیدی خالی (مم) و (گم) : زاهید و حالی . (کم) : زاهید و خالی . ئەلبەتە لە بێنێکی (کم) : ئیستاکە بە بێنێکی . (گم) : ئیستاکە بە بەینێکی .

لەنێوان هەردو ( خالی )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان ( خالی ) و ( خالی نییە )دا طیباق هەیە .

لە کۆکردنەوەی ( حالی ) و ( نالی )دا جیناسی لاحیق و ، لە (نە مرد) و ( نە ژیا )دا طیباق هەیە .

(٩) ئیدی : ئیتر .

واتە : لەمەی زیاتر کە بۆم لێکدایتەوە ، چیتر هەواڵی نالیی مەپرسە بە دەست دەردی دۆریەوە چۆنە ، نە ئەوەتە بمرێ و بەجارێ لێبێتەوە و نە وەکو خەلکیش بە خۆشی لەژێ . . لە دۆزەخی دۆریدا وەک دانیشتوی دۆزەخی لێهاتوە کە قورئان باسی ئەکا و ئەفەرموێت : « لا یموت فیها ولا یحیا » واتە : نە تیا ئەمرێ و نە تیا ئەژێ .

— ١٧ —

(١) ژیا : دۆڕۆیی . طۆل : درێژی . عەرض : پانی .

واتە : فلانکەس ڕیشێکی پان و درێژی هەیە ، بەلام بۆ خوا خزمەت ناکا و پانی و درێژیی ڕیشەکەی نیشانەی خواناسیی نییە ، نیشانەی دۆڕۆییەلی . ئەگەر ئەو مەبەستی پەیڕەویی پێغەمبەر بوایە ( د . خ ) ، پێی مشتی ڕیشی ئەهێشتەوە .

گول بە دەم بادی سەباوە پێکەنێ ، بولبول فڕێ
یەعنی عاشق لازمە دوور بێ لە یاری بێوەفا (٢)

عاشقی صونعی حەقم ، قوربانی ڕەنگی قودرەتم :
چاوی ماوێ ، خالی شین ، کولمی سپێ ، زولفی سیا (٣)

---

نالی لەم شیعرەیدا گاڵتە بەوانە ئەکا کە بەدیمەن خۆیان بە پیاوچاك و لەخواترس ئەدەنە قەڵەم . بۆیەش لە نیوەی دووەمیدا بە تەوریە بلاوێکی تێکردوون و ڕستەکەی وا داڕشتووە مەعنایەکی کەش بکەبەنێ : وشەی ( ظاهیرە ) ببەسترێنەوە بە نیوە شیعری پێشووەوە و پاشمارەکەی وای لێبێتەوە : خەڵکی بە باری درێژێ و پانیدا بە ڕیشیا بژین ! .
لە کۆکردنەوەی هەردو ( ڕیا )دا جیناس هەیە .
درێژە (چن) و ( « پەراوێزی » چر ) و (عم) : درێژی .

(٢) واتە دوو ڕێین و نازاستێ نەك هەر لای ئادەمیزاد ، بەڵکو لای گیان لەبەرانیش شتێکی ناپەسەند و بێزراوە . نابینی کاتێ گول بە دەم بای سەباوە پێئەکەنێ و ئەلەرێتەوە ، بولبول دڵگران ئەبێ و هەڵئەفڕێ ، چونکە لای وایە یار پێویستە هەر یاری یەکێك بێ و عاشقیش ئەبێ خۆی لە یاری بێوەفا دوور بگرێ . .
چەند سورەتێکی جوانە هەڵفڕینی بولبولی لەسەر چڵ ، لە کاتی لەرینەوەی گولدا بە دەم بای سەبێوە ، بە تەواوی بێزارێ و نازەزایێ لە بێوەفایێ دەربڕین مەعنا ئیداوەتەوە !

(٣) صونع : کردار . ماوێ : کاڵ .
نالی لەم شیعرەیدا دیسانەوە ئەگەڕێتەوە سەر باسی سۆزی دڵداریی خۆی و ئەڵێ : برادەرینە ! ئێوە بێ و خودا لە عەشقبازیدا بەسەرمدا مەیەن و لۆمەم مەکەن ، چونکە عەشقی من عەشقێکی ڕاستەقینەیە و من عاشقی کرداری خوام ، بە قوربانی ئەو ڕەنگانەم کە لەو دایهێناون و خۆم لەپێناوی چاوی کاڵ و خالی شین و کولمی سپێ و زولفی ڕەشدا بەخت ئەکەم کە خوا هەمووی لە یاردا کۆکردوەتەوە .
لە کۆکردنەوەی ( چاوی ) و ( ماوێ ) دا جیناسی لاحیق و لە یەکخستنی ( ماوێ ) و ( شین ) و ( سپێ ) و ( سیا )دا طیباق هەیە .
صونعی ( عم ) : صوبغی ، بەڵام ئێمە ( صونعی )مان لا ڕاستترە چونکە سەرەڕای لەوە کە لە هەموو نوسخە دەستنوس و چاپەکاندا ، نوسخەی ( عم ) نەبێ ، نوسراوە ( صونعی ) ، ئەگەر ( صوبغی ) بێ لەگەڵ (ڕەنگی)دا ئەبێ بە یەك و ئەو دووبارە کردنەوەش پێویست نابێ . ■

■ بەڵام صوبغی هەقیش ماناکەی هەر جوانە .

سەرگرانە قافلە سالاری زلی چین و خەتا
چونکە باری عەنبەر و میسکە لە زولفەینی دو تا ! (٤)

حەلقە حەلقە زولفی سەر قوبەی هەیاسەی کەوتووە
مەحرەمی سیڕزە ، بەلێ گەنجوری گەنجە ئەژدەها (٥)

---

(٤) سەرگران : خەریك . قافلە سالار : پێشڕەوی کاروان : خەتا : خەتا و خوتەن ، ولاتێکە لە تورکمانستان . زولفەین : هەردو زولفەکە . تا : تای بار ، یاخود : تال .

واتە : یار کە پێشڕەوی کاروانی زلی چین و خەتایە و بارەکەی بریتییە لە بونی خۆش ، خەریکە و دەستی گیراوە چونکە هەردوو تا باری زولفەکانی عەنبەر و میسکی بۆن خۆشە کە خالەکانی گونایەتی .

یاخود : سەری سەرقافلەی زلی چین و خەتا قورس بووە ، چونکە هەر بە دوو تال لە زولفەکانی باری عەنبەر و میسکی هەلگرتووە ..

لە شوبهاندنی باردا بە سەرقافلە و ناونەهێنانی شوبهێنراودا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەلگەش ( زولفەینی دوو تا )یە کە پەیوەندی بە شوبهێنراوەوە هەیە .

لە کۆکردنەوەی ( قافلە سالار ) و ( زل ) و ( بار ) و ( تا )دا تەناسوب هەیە .

قافلە سالاری (عم) و (گم) : قافلەی سالاری .

(٥) قوبە : گۆپکە . هەیاسە : پشتێنێکی گۆیکەدارە لە زیو دروست ئەکرێ ، ژنان ئەیبەستنە پشت . گەنجور : گەنجینەدار .

واتە : زولفی یار چین چین و ئەلقە ئەلقە بەسەر هەیاسەکەیدا هاتووە و لەسەری لولی خواردووە . ئەمەش شتێکی سەیر نییە ، چونکە زولفی یار مەحرەمی ڕازە بۆیە گەیشتووەتە سەر هەیاسەکەی پشتی کە بەسەر ناوکیەوەیە و ، وەك ئەژدەها وایە بۆیە گەیشتووەتە سەر گەنجینەی ناوکی ... لە ئەفسانەی کۆندا هەیە کەوا لە هەر کوێیەکدا گەنجینەیەکی شاراوە هەبێ مار و ئەژدەها لەویا پەیکە ئەخۆن ..

لە ( گەنجوری گەنجە ئەژدەها )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەلگەش نیوە شیعری یەکەمە .

زولفی سەر (چن) و (ت) : زولف ئەبەر .

سۆفیی مەستوری ڕۆت و موفلیسی خستە طەمەع
سەیری خاڵی بێ حیساب و ماچی لەعلی بێ بەها (٦)

ظاهیر و باطین ، لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز
ئاشنای سیرڕی قەڵەم بێ ، غەیری « نالی » کەس نەما (٧)

---

(٦) مەستور : داپۆشراو .

واتە : ئەو گفتەی خوا بە ئەهلی بەهەشتی داوە کەوا لە بەهەشتا چەندیان ئارەزوو لێ بێ سەیری خاڵی حۆریان ئەکەن و لێوی ئاڵیان ئەمژن ، تەماعی خستەبەر سۆفیی لە مەیدانی خواناسیدا بەرچاو نەکەوتوی ڕۆڵی هیچ نەدارای بازاڕی قیامەت ، بەڵام دیارە خەیاڵی خاوی کردووە و تا بەڕاستی نەبێ بە خواناس و، لە مەیدانی کرداری چاکا داراییەکی گەورە کۆنەکاتەوە ، هیچی دەسگیر نابێ .

لە یەکخستنی ( مەستور ) و ( ڕۆت ) و ، ( موفلیس ) و ( طەمەع )دا طیباق هەیە . بە بەراورد لەگەڵ شیعری یەکەمیشدا کە باسی ڕیشی سۆفێ بو ، ئیشارەتێکی ناسك و جوان کراوە بەو قسەی ئەستەقی پێشینانە کە ئەڵێ : ڕیشی تەماعکار بە قنگی مفلیس ! لە وشەی ( بێ بەها )شدا ئەوەش مەبەست بووە کە واش بخوێنرێتەوە: (بیبە ، ها) واتە: ئەو ماچەی هیچی لێناچێ و حۆریی خاوەن لێو بە ماچکەر ئەڵێ : فەرمو بگرە !

مەستوری ڕۆت و ( چر ) : مەستور و ڕۆڵی . ( کم ) : مەستوری ڕۆڵی .

(٧) لەوح : تەختەی لەسەر نوسین ، یا ( لوح المحفوظ ) کە ئەو تەختەیەیە هەرچێ لە جیهانا ڕۆیدا و بە عیلمی خوادا ڕابوردبێ ، لیا نوسراوە .
حەقیقەت : ئەو وشەیەی بۆ مەعنای ڕاستەقینەی خۆی بەکارهێنرابێ .
مەجاز : ئەو وشەیەی لە غەیری مەعنای ڕاستەقینەیدا بەکارهێنرابێ بەمەرجی بونی پەیوەندییەك لەنێوان مەعنا ڕاستەقینەکە و مەعنا مەجازییەکەدا .

نالی دوای پەردە هەڵماڵین لە ڕۆی سۆفییە بەدیمەن خواناسەکان کە لیدیعای زانینی هەمو نهێنییەکی گیتی ئەکەن ، دێتە سەر شانازی کردن بە خۆی و ئەڵێ : ئەوەی بە ئاشکرا یا بە پەنهانی ئاگاداری ڕازی قەڵەم بێ ، ناوی لەسەر تەختەی ڕاستەقینەی ناوی ئاگادارانا نوسرابێ یا هەر لە عیلمی خوادا ڕابوردبێ کەوا لە ئاگادارانە ، یا خەڵك ئەوەندە

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

باسی ئاگاداریی بکەن وەك لەسەر تەختە ناوی نوسرابێ ، لەم جیهانەدا ، لە نالی بەولاوە ، کەس نەماوە ..

ئەمە ئەگەر مەبەست لـە ( نالی ) ، خاوەن شیعر خۆی بێ . بەڵام مەعنایەکی تریش ئەگونجێ و دیارە نالی ، بـە عادەتەکەی خـۆی ، ئـەو مەعنایەشی مەبەست بووە . ئەوەش ئەوەتە (نالی) درابێتە پاڵ (نال) کە نالی باریکی‌ناو قەڵەمی قامیشـە، کە ئەگەر لە گۆشـەی خەیاڵی وردی شاعیرانەوە مەعنای شیعرەکە لێبدەینەوە ، دیارە ئاگاداری هەمۆ ئەو بابەتانەیە قەڵەم بۆ نوسینیان بەکار ئەهێنرێ .

بەپێی ئەم مەعنایە وا بەڵگەیەکی تریش ڕاسـت بووەوە کەوا نازناوی ئەم شـاعیرە بەخۆدانازیوەمان ( نالی )یە نـەك ( ناڵی ) وەك هەندێ کەس وتویانە ..

یا مەجاز ( ت ) : تا مەجاز .

## تیپی بێ

— ١ —

زولفەینی بە خەم مار و بە حەلقەن وەکو عەقرەب
شیعری لەف و نەشرن ، چ موشەووەش ، چ مورەتتەب (١)

جێی دەم دەمە ، جێی لەب لەبە ، ساقی وەرە شەمشەب
هەم ماچی دەمادەم بدە ، هەم جامی لەبالەب (٢)

---

— ١ —

(١) خەم : لوول . عەقرەب : دووپشک . لەف و نەشر : لە پێشەکییەکەدا لە باسی زاراوە بەدیعییە بەکارهێنراوەکانی ئەم دیوانەدا ، بەدرێژی لەسەرمان نووسیوە .

واتە : زولفەکانی یار چ لە حالی ئالۆزی و چ لە حالی تەل تەل وەستان و شانە کراویدا ، لە ڕووی لوول خواردن و ئەلقەییانەوە لە مار و دووپشک ئەچن و وەک لەو شیعرانە وان کە لەف و نەشریان تیایە چ لەف و نەشری مورەتتەب بێ و چ لەف و نەشری موشەووەش . مەبەستی لەوەیە ئەتوانین بڵێین (خەم) بۆ (مار) ئەگەڕێتەوە و ( ئەلقە ) بۆ (عەقرەب) کە ئەبێ بە لەف و نەشری مورەتتەب یا بەپێچەوانەوە کە ئەبێ بە لەف و نەشری موشەووەش .

(٢) دەمادەم : دەم لەسەر دەم . جاروبار . لەبالەب : لێو لەسەر لێو . لێوانلێو .

واتە : دەم ئەبێ لەسەر دەم بێ و لێو لەبێ لەسەر لێو بێ . کەواتە ، ئەی یاری ئازیز ، ئەمشەو وەرە لامان ، لە دەمت ماچی دەم لەسەر دەم یا ماچی ئاونەئاومان بدەرێ و ، لە پیاڵەی لێوت جامی شەرابی لێو بە لێوەوە نان ، یا جامی پڕ لە مەیمان بۆ تێکە .

بەو شەهدی کەلامەت کە بە ئیشرابی لەطافەت
لەذذەت دەگەیێنی بە دڵ و ذیهنی موخاطەب (٣)

وەك صۆفیی صافی مەبە ئالودە بە دونیا
بێهودە موکەددەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب(٤)

---

ئەشەب (چر) و (مم) و (کم )و (گم) و (مز) : ئەمشەو . دەمادەم (گم) : دەماودەم .

(٣) شەهد : شیلەی هەنگوین . ئیشراب : پێ خواردنەوە . ذیهن : بیر . موخاطەب : گفتوگۆ لەگەڵ کراو .

واته : بەو قسەی وەك شیلەی هەنگوین شیرینەت ، کە وەك چۆن ئەو بە ئاسانی و خۆشی تۆت ئەچێ ، تۆیش ئەم وا بە ئاسکێ بە گوێی گوێدەرا ئەدەی ـ خۆشی و ئارامی بە دڵ و بیری ئەوانە ئەگەیێنی کە قسەیان لەگەڵ ئەکەی .

ئیشرابی ( چن ) و ( ك ) : ئەشرافی . لامانوایە لەسەر ئەم نوسخەیە ( ئیشراقی ) بێ و بەهۆی هەڵەی نوسیارەوە وای بەسەرهاتبێ . دەگەیێنی ( کم ) : ئەگەیێنی .

(٤) صافی : سادە لەوح و نەفام . ئالودە : تێکەڵ ، گرفتار . بێهودە : بێ سود . موکەددەر : لیڵ . مەشرەب : کانی . زەوشت .

واته : خۆت وەك سۆفییە نەفام و سادە لەوحەکان تێکەڵی دنیا مەکە و لە خۆڕایی سەرچاوەی کانیاوی ڕاستی و خواناسی لیڵ مەکە .

عاشق هەوەسی مەیکەدەوو عیلمی بەسیطە
عاقڵ طەلەبی مەدرەسەوو جەهلی مورەککەب (٦)

قارونە فەلەك ، موستەحەقی گرتن و خەسفە
زیو و زەڕی شەمس و قەمەرە ، دیرهەمی کەوکەب (٧)

---

لەنێوان ( موکەددەر ) و ( مەشرەب )دا تەناسوب هەیە .
ئالودە بە دنیا ( عم ) و ( کم )و ( گم ) و ( مز ) : ئالودەیی دنیا .

(٦) هەوەس : ئارەزو . مەیکەدە : مەیخانە . عیلمی بەسیط : زانستی سادەی بێ پێچ و پەنـا . طەلەب : داوا . جەهلی مورەککەب : نەزانینی دوباد ، نەزانین و نەزانین بە نەزانینەکەشی .

واتە : دلدار فرو فێڵ و پێچ و پەنا نازانێ ، بەدوای مەیکەدەی خۆی و زانستێکی سادەدا ئەگەڕێ و سەر لە خۆی ناشێوێنێ . بەڵام ئەوانەی کە خۆیان بە زانا و خوێندەوار دائەنێن ، بە خەیاڵی خۆیان هۆگری خوێندن و قوتابخانە و زانستن ، کەچی لەڕاستیدا شوێنی نەزانێ کەوتوون و بە خۆیشیان نازانن .

لە کۆکردنەوەی ( مەیکەدە ) و ( مەدرەسە ) و ، ( عیلم ) و ( جەهل ) و ، ( بەسیط ) و ( مورەککەب )دا طیباق هەیە .

هەوەسی ( کم ) : طەلـەبی . عاقڵ طەلـەبی ( عم ) و ( ت ) : جاهیل طەلەبی . ( کم ) : عاقڵ هەوەسی . ( گم ) : جاهیل هەوەسی .

هەرچەند لە هیچ کام لە نوسخەکانی بەردەستمانا لەجیاتیی (عاقڵ) لە ( جاهیل ) بەولاوە شتێکی‌تر نەبو ، ئێمە لامانوایە ڕاستەکەی ( غافڵ )ە و بە هەڵەی نوسیار بووە بە ( عاقڵ ) . مەعناکەش بەمجۆرە ڕەساتر دێ و وای لێدێتەوە : ئەوەی بێئاگا بێ لە عەشق ڕێگای خوێندن ئەگرێتەبەر ، بەڵام خوێندن لەوە زیاتری بەدەمەوە نییە کە نەزانینی بۆ دوپات ئەکاتەوە و نایگەیەنێ بە ناسینی ڕاستەقینە کە تەنها لە ڕێگای عەشقەوە پەیدا ئەبێ .

(٧) قارون : دەوڵەمەندێکی جولەکە بووە لە خۆی بایی بووە ، خوایش غەزەبی لێ‌گرتووە دارایی و سامانی بردووە بە ناخی زەویدا . خەسف : ڕۆچون . دیرهەم : پارەی زیو . کەوکەب : ئەستێرە .

واتە : چەرخی گەردون لە بەدکرداریی و کەچ ڕەفتاریدا وەك قارون وایە ، زێڕ و زیوەکەشی بریتییە لە ڕۆژ و مانگ و پارەی زیویش بریتییە

قەللابی جیهان نەقدی عەیاری نییە قوربان !
« نالی » مەحەکی هیممەتی کردۆیە موجەڕڕەب (٨)

له لەستێرەکان . بۆیە ئەمیش ، وەك قارۆن ، شایانی ئەوەیە خوا تێك و مەکانی بدا و بە ناخی زەویدا بیباتە خوار .

لەنێوان ( فەلەك ) و ( شەمس ) و ( قەمەر ) و ( کەوکەب ) و ، (زێڕ) و ( زیو ) و ( دیرهەم )دا تەناسوب و ، لە وشەی ( قارۆن ) و (خەسف)یشدا تەلمیح هەیە . هێنانی ( شەمس ) و ( قەمەر )یش بەدوای ( زیو ) و ( زێڕ )دا کە ( خۆر ) و ( زیو ) سپین و ( مانگ ) و (زێڕ)یش زەردن ، لەف و نەشری موڕەتتەبە .

گرێ (ت ) : گردن . ئەویش هەر بەمەعنا گرتنە .

(٨) قەللاب : بێبار . نەقدی عەیار : نەختی بێگەرد . مەحەك : بەردێکە زێڕی بێگەرد و ناپاکی پێ لە یەك جوێ ئەکرێتەوە .

واتە : گەردوونی بێبار چونکە هەر زۆرە لەسەر بارێکە زێڕ و زیوی ساغی لا نییە . زێڕ و زیوی ساغ لای کەسێکە هەم ساغ بێ و هەم زێکای خۆیشی نەگۆڕێ . بەڵام نالی، بەپێچەوانەی گەردوونەوە ، بەردی مەحەکی هیممەتی بەرزی خۆی تاقیی کردووەتەوە و دەری خستووە کەوا ساغ و بێگەردە .

لە کۆکردنەوەی ( نەقد ) و ( عەیار ) و ( مەحەك )دا تەناسوب هەیە .
قوربان ( ت ) و ( مز ) : سەدبار .

# تیپی تێ

— ١ —

ماتەم ، وەکو زولفەینی سیەهـ ، گرتی سەراپات
پۆشی لە ڕەوخت تەعبیەیی بەیدەق و شامات (١)

---

ڕوخ ئەسپ نیە قەلایە
— ١ —

(١) سیەهـ : سیاە ، ڕەش . ڕوخ : ڕۆ . ئەسپی شەترەنج . تەعبیە : کۆکردنەوە . زاراوەیەکی سوپاییشە . بەیدەق : ڕێگا پیشاندەری ڕێ . سەربازی شەترەنج ، لە ( پیادە )وە کراوە بە عەرەبی . شامات : یا مەبەست وڵاتی شامە ، یا جەمعی ( شامە )ی بە مەعنا خاڵە ، یا ڕستەی ( شاە مات )ە کە لە زاراوەکانی شەترەنجە .

واتە : خەم و پەژارە وەك زولفە درێژەکانت ، یاخود لەگەڵ زولفە درێژەکانتا ، کە هەمۆ لەشتیان داگرتووە ، لە تەوقی سەرتەوە تا بەری پێتی گرتەوە . ڕێگای لێ بڕیت چاوساغەکان کۆکەیتەوە و بەرەو وڵاتی شام بکەویتە ڕێ . بەمپێیە ئەبێ بخوێنینەوە (بەیدەقی شامات) . یاخود : ڕێگای کۆکردنەوەی خاڵەکانتی لێ گرتی و نیتر ناتوانی دەربانخەی ، چونکە کەسێ کە تازیەبار بێ خۆی بێ ئارایش نادرێ و ناتوانێ زولفەکانی لادا و خاڵەکانی لە بەرچاوی تەماشاکەرانا کۆکاتەوە . یاخود : ڕێگای کۆکردنەوەی پیادەکانی شەترەنجەکەی لە ئەسپەکان گرت و بەهۆی ئەوەوە ( شا ) مرد و ( کش مەلیك ! )ی لێ کرا و دۆڕاندت . .

هەرچۆن بێ ، دیارە ئەم قەسیدەیە بەبۆنەی مردنی یەکێکەوە وتراوە و ڕۆی دەمی تیا کراوەتە ئازدارێك و هەر بۆیەش ئەڵێن بۆ لاواندنەوەی باوکی ( حەبیبە )ی وتووە و ئێمەیش لەسەر ئەوە ئەڕۆین . جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ، لەگەڵ ڕەچاو کردنی مەعنای یەکەمدا واتەگەیەنێ نالی تەمای ئەوەی لە دڵا بووە حەبیبە بچێ بۆ لای بۆ شام ، بەڵام حەبیبە بەبۆنەی کۆچی دوایی باوکیەوە ڕێگای ئەوەی لێ بڕاوە و ( شامات ) تەنها

تاقانە یەتیمی خەلەفی ئاخری نیسان !
تۆ خۆش بی ، سەدەف بێ بە فیدات ، دوور بی لە ئافات (٢)

بۆ فەوتی سەدەف حەیفە بڕێژێ دوڕەری ئەشك
ضایع مەکە دوڕ دانە بە غارات و خەسارات (٣)

---

ئیشارەتێکی تیا ئەبێ بۆ مردنی باوکی ( حەبیبە ) چونکە باوکی حەبیبە بۆ حەبیبە لە حوکمی ( شا )دایە و ( مات )ەکەش مەعنای مردنەکەی ئەگەیەنێ .

بەپێی هەرکام لە مەعناکان جۆرە شوبهاندنێك و ، تەناسوبی نێوان چەند وشەیەك و ، تەلمیح بۆ چەند زاراوەیەك ، لە شیعرەکەدا هەیە .

(٢) تاقانە یەتیم : دوڕڕی تاقانە . خەلەف : پاشماوە . سەدەف : گیانلەبەرێکی دەریاییە لە بەهارانا دێتە سەر ئاو و سکی ئەکاتەوە دڵۆپی بارانی تێئەکەوێ لەنجا سکی ئەنێتەوە بە یەکدا ، ئەو دڵۆپە بارانانە لە سکیا لەبن بە مرواری . جا ئەگەر پتر لە دڵۆپێکی تێکەوتبو ، پتر لە مروارییەکی تیا پەیدا ئەبێ ، بەڵام مروارییەکانی ورد ئەبن و نۆر گرانبەها نابن . ئەگەر تاقەیەك دڵۆپیشی تێکەوتبو تاقە مروارییەکی لێ پەیدا لەبێ و ئەو مرواریيە زۆر گرانبەها ئەبێ . ئیستا هەرچی زۆر نایاب و گرانبەها بێ ، پێی ئەوترێ ( دوڕڕی یەتیم ) .

واتە : ئەی تاقانە مرواریی بەری دڵۆپی دواڕۆژەکانی بەهار ، کە دڵۆپی بارانیان تیا گەورە ئەبێ ، خۆت خۆش بی ( سەدەف )ەکەی باوکت کە ساڵەها تۆی لە پشتی یا لەژێر چاودێری و دەسەڵاتی خۆیا ڕاگرت ، مرد .. خۆت لە دەرد و بەلا دوور بی ! .

لەم بەیتەوە دەرئەکەوێ خۆشەویستەکەی نالی کە ئەم قەصیدەیەی بۆ وتووە تاقانەش بووە و بەری باوکێکی پیریش بووە ..

لە ( دوڕڕی یەتیم )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەڵگەش (دوور بی لە ئافات )ە .

تۆ خۆش بی ( چن ) و (مم) و (ك) و (ت) و ( مز ) : تۆ خۆش بە .

(٣) دوڕەر : جەمعی ( دوڕڕ )ی عەرەبییە . دوڕدانە : دەنکی مرواری . فرمێسك . غارات : تاڵان .

واتە : حەیفە لەبەر مردنی باوکت کە وەك سەدەف ، مرواریی تۆی شاردبووەوە و نەیئەهێشت بەو هەموو گرانبەهایی و نازدارییەوە کە هەی ،

دیمەت وەکو گول سورە ، پڕی شەبنمی ئەشکە ؟
یا لالەیی پڕ ژالەیە دوو نەرگسی شەهلات ؟ (٤)

بۆ گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگریێم
گەوهەر بڕژێنین بە بولەندیی قەد و بالات (٥)

لاکین ئەمە دونیایە ، گەهێ سورە ، گەهێ شین
لا یسألْ مَن عاشَ ، وَ مَنْ ماتَ ، وَ مَنْ فات ؟! (٦)

---

دەرکەوێ ، دلۆپ دلۆپ فرمێسکی وەك دەنکە مرواری هەلڕێژی و لەناویان‌بەری و بە تالانیان بدەی .. سەدەف کەی ئەوە دێنێ مرواری لەپێناویا بەخت بکرێ !

لە کۆکردنەوەی ( سەدەف ) و (دور)دا تەناسوب و، لە (سەدەف)یشدا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەلگەش وشەی ( فەوت ) و تێکڕای بابەتەکەیە .

دورەری ئەشك ( « پەراوێزی » چر ) و ( گم ) : دوڕی ئەشکت .

(٤) شەبنم : شەونم . لالە : گولە مێلاقە . ژالە : وشەیەکی فارسییە بەمەعنا شەونم یا تەرزە . شەهلا : چاوی ڕەشییەکەی مەیلەو شین بێ .

واتە : چاوی لەبەر گریانی زۆر سور هەلگەڕاوی ، پڕ لە فرمێسکی سپیت ، گوڵلە سورەیە شەونمی بەسەرا باریوە ، یان چاوە مەیلەو شینە وەك نەرگس مەستەکانت گولە مێلاقەن ، شەونمیان کەوتووەتە سەر ، یاخود تەرزە کوتاونیەتەوە ؟!

لە ( دوو نێرگسی شەهلات )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەلگەش بەیتی پێشووە .

شەبنمی ( هم ) و ( کم ) و ( گم ) و ( مز ) : شەونمی. نەرگسی (کم) و ( گم ) : نێرگسی .

(٥) گریە : گریان .

واتە : لەواتەیە منیش بەهۆی گریانی تۆوە لەوەندە بگریم ، بە هەردوکمانەوە بە بەرزیی بالات دلۆپی فرمێسکی وەك گەوهەر هەلڕێژین .

بۆ (کم) و (گم) : بەو . بڕژێنین (کم) : بڕژێنم .

(٦) سور : شایی . ڕەنگی سور . شین : گریان . ڕەنگی شین .

واتە : بەلام لەگەل ئەوەشدا گریان دادی کەس نادا . ئەمە دنیایە ،

بەس گریە بکە بۆ پەدەر و بابی حیجابت
بێبابیی تۆ مۆریشە بۆ وەصڵ و مولاقات ! (٧)

بێبابیی تۆ بۆ من و تۆ بابی فوتوحە
بێبابیی تۆ خواستەیی من بو بە ئاوات (٨)

---

جاریوا هەیە شایی و زەماوەندە و جاریواش هەیە شیین و شەپۆڕە . یاخود جاریوا هەیە جلی سوری دڵخۆشیی لەبەردایە و جاریواش هەیە جلی شینی ئازیەتباری ئەپۆشێ . ژیان و مردن بە دەست خوایە ، کەس لێیناپرسێتەوە کێ ژیا و کێ مرد و کێ لەکیس چو !

لە ( سور ) و ( شین )دا لەطافەت و ، لەنێوانیانا تەناسوب و طیباق و ، لەنێوان ( مات ) و ( فات )دا تەناسوب و جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ماش) و (مات)یشدا طیباق هەیە .

(٧) پودەر : وشەیەکی فارسییە بەمەعنا باوك . باب : باوك . دەرگا . حیجاب : پەردە . دەرگاوان .

واتە : بەس بۆ ئەو باوکەت بگری کە بوبو بە پەردە و دەرگا لەنێوان من و تۆدا ، نەیئەهێشت بە یەك بگەین . بێباوکیی تۆ ، یا نەبونی دەرگا لەنێوان من و تۆدا لەوانەیە ببێ بەهۆی بەیەكگەیشتنمان .

نالی لەم شیعرەدا وێنەیەکی زۆر جوانی داهێناوە . کە هەروا بە سەرپێیی سەیری شیعرەکە بکەین وای لێ تێئەگەین بنیادەم کە ماڵەکەی بێدەرگا بو هاتوچۆکەر بەئاسانی پێیئەگەن . بەڵام لا قوڵەکەی ئەوەیە باوك کە مرد فرزەند و کەسوکاری میرات و کەلەپورەکەی ئەبەن بۆ خۆیان و هەرکامیان شتێکی لێ پێ ئەبڕێ . ئەوەش کە لە باوکی ئەمەوە بۆ ئەم ئەمێنێتەوە نیمەتی بەیەكگەیشتنیەتی لەگەڵ خۆشەویستەکەی کە ئەوسا باوکی ڕێیی لێ گرتبو و لەبەر بونی ئەو ، ئەو ماڵەی نەبو .

کۆکردنەوەی وشەی ( حیجاب ) کە لە ( حەجب )ەوە هاتووە بەمەعنا ڕێگای میرات بردن لێ گرتن ، لەگەڵ ( مۆریث ) کە هەردوکیان زاراوەی زانستی ( فەرائیض )ن ، تەناسوبی تیایە و لەگەڵ شوێنەکەشدا زۆر ئەگونجێ کە بابەتی سەرخۆشی لێکردن و ئازیەتبارییە . ( بابی حیجاب )یش لەطافەتی تیایە چونکە بۆ مەعنای (باوك)یش و (دەرگا)یش دەستئەدا . لەنێوان (حیجاب) و (باب)یشدا تەناسوب هەیە .

(٨) فوتوح : کردنەوە . خواستە : داوا .

واتە : بێباوکیی تۆ یا بێ دەرگاییی ماڵی تۆ ، بۆ من و تۆ دەرگای ڕێگا

بێ بابی مورادی من و تۆ بۆ بە تەمەننا
بێ بابی دوعایی من و تۆ بۆ بە موناجات (٩)

ئەو بابە کە فەتح و ظەفەری قەلعەیە قەلعی
با قەلعی بکا زەلزەلەیی هاذیمی لەذذات (١٠)

ئەو پیری خەرەف ، ئافەتی مەردییو صەفا بو
تۆ شۆخ و جوان ، دوور بی لە ئافات و خەرافات (١١)

---

لە ڕۆدا کردنەوەیە و ، ئاواتی من بووە هەمیشە لە خوام خواستووە .

لەنێوان هەردو (بابی) و (بێبابیی)یدا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (باب) و (نوزۆح)دا تەناسوب هەیە .

(٩) بێ بابی : بێ باوکی . موراد : ئارەزوو ، مەبەست . موناجات : پاڕانەوە لە خوا لەژێر لێوەوە ، بە کزی .

(١٠) قەلعە : قەلا . قەلع : هەلکەندن و لەبنهێنان . زەلزەلە : بوومەلەرزە . هاذیم : لیژبۆ . هاذیمی لەذذات : مەرگ .

واتە : ئەو باوکەی ، یاخود ئەو دەرگایەی ـ کە مەبەست لەویش هەر باوکەکەیە ـ کە هەلکەندنی لە پابەی گرتنی قەلایەکدایە ، با بوومەلەرزەی مەرگ یاخود با بای بوومەلەرزەی مەرگ لە بنی بێنێ .

وشەی (هاذم اللـذات ) لە فەرمـوودەیەکی پێغـەمبەردا هاتـووە . ئەشکونجێ (هازم اللذات) بێ واتە : ئەوەی خۆشی ئەبەزێنێ و ڕاوی ئەنێ یاخود (هادم اللذات) بێ واتە : تێکدەری خۆشی .

لە وشەی (ئەو بابـە)دا تەورییە هەیە . هەروەهـا لەنێوان (باب) و (قەلعە) و (زەلزەلە) و ( با )دا بەمەعنا (ریح) تەناسوب هەیە و ، لەنێوان ( قەلعە ) و ( قەلع )یشدا جیناسی ناقیص هەیە .

ئەو بابە (چن) و (مم) و (ك) و (تۆ) : ئەو بابی ، کە بە (ئەو بابێ) یا (لەو بابەی)یش ئەخوێنرێتەوە .

فەتح و (چر) : بابی . قەلعی (مم) و (گم) : قەممی . هاذیم (چر) و (ك) : هازیم . (مم) و (کم) و (گم) و (مر) : هادیم .

(١١) خەرەف : خەلەفاو . مەردێ : پیاوەتی . صەفا : ڕابواردن . خەرافات : خەلەفان .

ئەو پیری خەرەف (چر) : ئەو پیر و خەریف . (کم): ئەو پیر و خەرەف . (ك) : ئەو پیری خەریف . مەردیو (چن) : مەردانی .

ئەو فەوت و وەفاتە سەبەبی عەهد و وەفاتە
چۆ صاعیقەیی بەردی عەجوز و ، گوڵ و مل هات (١٢)

گوڵ تاجی لەسەر نا و ، چەمەن مەخمەلی پۆشی
هات موژدە کە خەلعەت گەییە بەر بە موباهات (١٣)

---

(١٢) صاعیقە : هەورە بروسکە ، یا گرمەی وەك هەورە بروسکە لەسەر گوێ قورس . بەردی عەجوز : برجی پیرەژن لە دوازدەکانی زستانا ، یاخود مەبەست لە (بەرد) هەر بەردی کوردیێ و لە (عەجوز)یش بنیادەمی پیرە .

وانە : ئەو لەناوچوون و مردنی باوکتە ئەبێ بەهۆی جێبەجێ کردنی ئەو گفتەی پێتداوم .. خوا شوکر کەوا مرد .. بە مردنی ئیتر گوێمان لە گرمەگرمی وەك هەورە بروسکەی ، دوازدەکانی زیانی یا وەك بەرد هاویشتنی ئەو نابێ و لەمەوپاش بەهاری ژیانە و تۆیش وەك ملوانکەی گوڵ ئەکرێیتە ملی من .

لەنێوان هەردو (وەفاتە)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

عەهد و (چر) : وەعد و . چۆ (کم) و (گم) و (ك) و (ت) و (تۆ) : چۆن .

(١٣) چەمەن : چیمەن . خەلعەت : خەڵات . موباهات : فیز و کەشوفش .

وانە : گوڵ پشکوت و چیمەن بەرگی سەوزە گیای وەك مەخمەل ناسکی لەبەرکرد و موژدە هات کەوا خەڵاتی بەهار بە فیز و کەشوفشەوە گەیشتە بەرەوە .

لەسەر نا و (عم) و (کم): لەسەر ناوە. تێکستەکانی نیوەی دۆهەمی ئەم شیعرە ئاڵۆزییەکی زۆریان تیایە . ئێمە تێکستی نوسخەی (عم)مان پێ راستتر بو لە هەموان . را تێکستی نوسخەکانیتریش پیشان ئەدەین :

(چر) و (تۆ) : هات موژدەیی خەلعەت ، گەییە بەرگی موباهات
(چن) و (مز) : هات موژدەیی خەلعانی گیا بەرگی موباهات
(کم) : هات موژدەیی خەلعەت ، گەییە بەرگی موباهات
(گم) : ها موژدەیی خەلعەت گەییە بەر بە موباهات
(ت) : هات موژدە خەڵات و گەییە بەرگی موباهات
(ك) : هات موژدەیی خەلعات ، گەییە بەرگی موباهات

هات زەمزەمەیی بولبول و ئاوازەیی قومری
هات بادی صەبا ، دێن و دەچن عەرعەر و بانات (١٤)

نەجم و شەجەر و نەرگس و ئەنواری شکوفە
جیلوەی چەمەنن ، یەعنی زەمین بۆ بە سەماوات (١٥)

ماوەردە لەسەر خەرمەنی گوڵ عەطرفشانە ،
یا ئاوی حەیاتە : عەرەقی وردی موحەییات ؟! (١٦)

---

(١٤) زەمزەمە : هەرا و زەنا . قومری : کۆتر . بانات : درەختەکانی بان .

واتە : بەهار هاتووە ، لە شایی هاتنی بەهارا بولبول دەسیان کردووە بە خوێندن و کردۆیانە بە هەرا و ، کۆتر کەوتۆنەتە گمەگم و ، داری عەرعەر و بان بە دەم بای بەیانییەوە ئەشنن و دێن و دەچن .

بلبل و (مز) : قومریو . قومری (چر) و (ك) و (کۆ) و (مز) : قەماری . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ ( ئاوازەیی ) بە ( ئاوازی ) بخوێنرێتەوە .

(١٥) نەجم : گیای کورتی بێ لاسك . شەجەر : درەخت . ئەنوار : جەمعی (نەور)ە واتە : چرۆی ئەو درەختانەی گوڵ ئەکەن . شکوفە : پشکۆتو .

واتە : گیای کورت و دار و درەخت و نەرگسی سپی و زەرد و چرۆی پشکۆتوی درەختەکان ، ئەمانە هەمو مایەی ڕازانەوەی چیمەنی مەردن و زەویان پێ بووە بە ئاسمان ، ئەو چۆن بە مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەکانی ئەدرەوشێتەوە ، ئەمیش بەمان ڕازاوەتەوە .

(١٦) ماوەرد : ماء الورد ، گوڵاو . خەرمەن : خەرمان . عەطرفشان : ئەوەی بۆنی خۆش بڵاو ئەکاتەوە . ورد : بچوك ، یاخود وەرد : گوڵ . موحەیا : ئەوێل .

واتە : ئەو ئارەقە وردەی بەئەوێلتەوەیە ، یاخود ئەو ئارەقی گوڵی ناوچاوتە ، گوڵاوە پرژاندۆیانە لە خەرمانی گوڵ و بۆنی عەتر بڵاو ئەکاتەوە ، یاخود ئاوی حەیاتە هەرکەس بە زمان بیلێسێتەوە هەرگیز نامری ، یان ئارەقی شەرمە !

نیوەی دۆهەمی ئەم شیعرە لە تێکستەکانی بەردەستماندا زۆر ئاڵۆزە . ئێمە تێکستی (چن) و (مز)مان پەسەند کرد و وا ئەو تێکستەکانی تریش ئەخەینە پێش چاو :

(مم) : یا ئاوی حەیاتە عەرەق و وەردە موحەییات

گولشەن وەکو بەزمێکە کە ئاحادی هەزاری
بۆ تاقە گولێکی گەیبە ژوتبەیی مێئات (١٧)

تۆ باقیەیی ساقیەیی صەحنی چەمەن بە
مەیدان هەمو مەی دانە بە کاسات و بە طاسات (١٨)

« نالی » یەك و ئەو کەس کە تەمامی غەزەلی بیست
مەعلومی بووە زۆر و کەمیی خاریقی عادات (١٩) ■

---

(کم) و (ت) : یا ئاوی حەیاتە ، عەرەقی وەردە موحەییات
( گم ) و ( تۆ ) : یا ئاوی حەیاتە عەرەقی وەردە ( یا : وردە ) موحەییات
(ك) : یا ئاوی حەیاتی عەرەقی وەردی (یا : وردی) موحەییات

(١٧) ئاحاد : یەکە یەکە . هوزار : بولبول ، یاخود هەزار . میئات : سەدان .
واتە : باخی گولانی ژیان وەك سەیرانگەیەکی لێهاتووە یەکە یەکەی بولبولەکانی بۆ گەیشتن بە تاقە گولێکی کە ژۆی تۆیە، بوون بە سەدها ..
یاخود یەکە یەکەی هەزاران بولبولەکەی .. تاد . بەم پێیە مەعنای (بولبول)مان لەوەوە بۆ دێ کە چەمەن بێ بولبول نابێ و ئەو هەزارانە ئەبێ بولبول بن .
زیادەڕەوییەکی زۆر شاکارانەیە ئەمەی نالی کردوویەتی یەکە یەکە بکەنە سەدان ..

(١٨) باقیە : ماو . ساقیە : ئاوگێڕ . صەحن : مەیدان ، یاخود سینی .
کاسات : جەمعی ( کاسە )یە . طاسات : جەمعی ( طاسە )یە .
واتە : تۆ خۆش بی و هەمیشە هەر مەیگێڕی باخی ژیان بی .. جیهان مەیدانی ژیان و مەرگە ، بە کاسە و بە تاسە شەرابی مەرگی تیا دەرخواردی خەلکی ئەدرێ .. یاخود : چش لە خەلك ، تۆ بۆ خۆت بژی و لەسەر سینیی ژیان بمێنەرەوە ، دنیا هەمۆ مەیدانی خۆشی و ڕابواردنە .
لە شیعرەکەدا ئیشارەتێکیش بە زاراوەی ( ساقی و باقی ) هەیە کە بەوە ئەڵێن بۆ ئادەمیزاد ئەمێنێتەوە لە مامەڵەدا ..
باقیەیی ساقیەیی (مم) و (گم) : ساقییەرو باقیەیی . (کم) و (ت) و (مز) : باقییەوو ساقیەیی .

(١٩) خاریقی عادات : ئەو کردارانەی لە توانای هەموکەسدا نین و خواوەند بەهرەی لێهاتنیان تەنها بە هەندێ کەسی هەلبژاردەی خۆی ئەدا .

■ ئەم پارچە شیعرە بو قەسیدە دەبێ بەلام خۆی بە غەزەلی داناوە .

— ٢ —

چاوت لە برۆ یەعنی لەژێر طاقی نەظارەت
بێپەردە عەیان دێتە تەکەللوم بە ئیشارەت (١)

شایستەیی شان ، لایقی مل طوڕڕەیی تۆیە
نەك طوڕڕەیی شاهەنشەهی‌یو طەوقی وەزارەت (٢)

---

واتە : نالی یەك کەسە ، بەڵام ئەوەی ئاگای لە هەمو شیعرەکانی هەبێ ، بۆی دەرئەکەوێ کرداری (خرق العادة) زۆر ڕێئەدا یا کەم . مەبەستی لەوەیە بڵێ کردارە ئەدەبییەکانی من هەمویان (خرق العادە)ن .

لە نوسخەی (ق)دا لەلای سەرۆی ئەم قەصیدەیەوە نوسراوە « بند هفتم در مرثیەء یکی از محبان اسلامبولی فرمودە » . واتە : بەندی حەوتەم لە لاواندنەوەی یەکێ لە خۆشەویستە ئەستەمۆلییەکاندا فەرمویەتی . بەڵام بەئاشکرا دیارە لە دڵدانەوەی یارەکەیدا وتویەتی بەبۆنەی مردنی باوکیەوە کە نەیهێشتوە شو بکا بە نالی و مەقلیش نابکرێ نالی لە دراسالەکانی ژیانیا لە ئەستەمۆل یارێکی بوبێ بەتەمای هێنانی بوبێ و باوکی ڕێی لێ گرتبێ وەك لە قەسیدەکەوە دەرئەکەوێ ، تا مەعنای قەصیدەکە لەگەڵ ئەو قسەیەدا بەلەبخەین کە لە نوسخەکەی ( ق )دا نوسراوە .

— ٢ —

(١) طاق : تاق ، پەنجەرەی هیلالی . نەظارەت : وەزیرێ . عەیان : ئاشکرا . مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە .

(٢) شایستە : شایان . طوڕڕە (ی یەکەم) : زولفی لول . طوڕڕە (ی دوەهەم) : مۆر ، نیشانە . طەوق : ملەوانە .

واتە : چاوت بەئاشکرا و بێپێچ وپەنا لەژێر تاقی وەزیریدا کە برۆتە ، بە ئیشارەت دێتە قسە و ئەڵێ زولفت شایانی شان و ملی تۆیە ، لەکاتی بڵاوبدا شانت داپۆشێ و لەکاتی لولیشدا لە ملت بئاڵێ ، نەك نیشانەی شاهەنشایێ و ملوانکەی وەزیرێ کە لەماستی زولفتدا هیچ بایەخێکیان نییە .

بە وەزیر دانانی چاو لەبەر ئەوەیە کە چاوەکان دوانن و وەزیریش جاران دوان بون : وەزیری دەستە ڕاست و وەزیری دەستە چەپ .

سەر خاتیمەیی حوسنی عیادەت کە نەهاتی
بارێ بکەرە فاتیحەوو دەئبی زیارەت ! (٣)

کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتوت
لەو تەختە کەوا ساحیبی مۆرن بە سەدارەت ؟ (٤)

---

(٣) خاتیمەی حوسن : عاقیبەت خێری ، مردن . عیادەت : هەواڵ پرسینی نەخۆش . بارێ : کەڕەتێك . فاتیحە : سوورەتی فاتیحە خوێندن بۆ گیانی مردوو . دەئب : نەریت . زیارەت : زیارەتی گۆڕ .

واتە : کە نەخۆش بووم و کەوتبوومە گیانەڵا نەتکرد کەڕەتێ بێی سەرێکم لێبدەی و هەواڵێکم بپرسی .. ئێستا کە مردووم جارێ وەرە تەعزیەکەم فاتیحەیەکم بۆ بخوێنە و نەریتی زیارەتی گۆڕەکەم بەجێبێنە .

لە کۆکردنەوەی (خاتیمە) و (فاتیحە)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی (عیادەت) و (زیارەت)دا تەناسوب هەیە . ڕستەی (خاتیمەی حوسن)یش ئیشارەتە بۆ زاراوەی ( حسن الختام ) کە گەلێ جار بەمەعنای مردن بەکاردێ .

(٤) نار : هەنار . تەخت : تەختی سینە و تەختی ڕۆ . سەدارەت : کەوتنە لای سەرەوە . ئیشارەتیشە بە زاراوەی (صەدر) کە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بە سەرۆك وەزیران وتراوە .

واتە : کێ دەستی ئەگاتە بەهێی مەمك و هەناری ڕۆمەتت بەسەر تەختی سینە و ڕۆتەوە ، کە هێشتا کاڵن و پێنەگەیشتوون و فەرمانی گرتنی لای سەرەوەیان دراوەتێ ؟

لە خواستنی (تەخت)دا لە تەختی شاییەوە بۆ تەختی سینە و ، (مۆر) لە فەرمانی وەزیرییەوە بۆ کۆی مەمك و ناوەڕاستی کوڵم و ، (سەدارەت) لە سەرۆك وەزیرییەوە بۆ بەرزیی شوێنی مەمك و کۆنای یار،ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و بەڵگەش شوێنی بابەتەکەیە . لە کۆکردنەوەی ( تەخت ) و ( مۆر ) و ( سەدارەت )یشدا تەناسوب هەیە . لە وشەی (نەگەیشتوت)یشدا ئیشارەتێکی ناسك هەیە بۆ ئەوە کە جاران خەڵك بەئاسانی دەستیان نەئەگەیشتە کاربەدەستانی بەرز ، هەروەها لە وەصفکردنی پێشوبهێنراویشدا بە کاڵێ ، ئیشارەتە بۆئەوە کەوا کاربەدەست ئەگەر فامیدە و پێگەیشتو بێ خۆی لە خەڵك دوور ناگرێ .. لەوانەیە پلارێکی ( نەفامێ )یشی تیا بێ ، گرتبێتیە ئەوانەی لە کۆمەڵ و ژیانا لە سەرەوەن ..

دەسرۆکەیی هەوریی چ حیجابێکە کە تێیدا
شمسُ فلك الحسن أنارَتْ فتَوارت ! (٥)

هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو
حەددی چییە « نالی » کە بڵێ ماچە کەفارەت ؟! (٦)

---

کێ ( چـر ) و ( چـن ) و ( مـم ) و ( ك ) : کـەس . نـەگەیشـتوت
( چـر ) : نەگەیشتو .

(٥) واتە : سەرپۆشی ڕەنگی هەوریی چۆن جوزە سەرپۆشێکە ، ڕۆژی ڕووی جار جار لێوە دەرئەکەوێ و جار جار ئەشارێتەوە !!

لە وشەی ( هەوریی )دا ئیشارەت بەوەش کراوە کە ڕووی یـار لەژێـر سرکەییەوە وەك خۆری ژێر هەور وایە،چۆنهەورەکە هەمیشە ڕووی خۆر داناپۆشێ بەڵکو جارجار ئەیشارێتەوە و جار جار ئەڕەوێتەوە ، ئەمیش هەمیشە ڕووی یار داناپۆشێ،جار جار بەسەریەوە ئەبێ و جارجار لائەچێ.
لە (شمس)دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە و (دەسرۆکە) و (الحسن)یش بەڵگەکەینی .

دەسرۆکەی (کم) و (گم) : دەسرۆکەور . نیوەی دووەمی ئەم شیعرە لە پەراوێزی نوسخەی (چر)دا بەمجۆرەیە :
**شمس فلك الاطلس نارت فتوارت**

(٦) دەمەکەت : خوێنەکەت ، ئەو خوێنەی کردت . دەمت . (دە وامەکە)ت .
بار : ئەو توێژەی بەسەر لێوی وشکەوە پەیدا ئەبێ . باری هەڵگرتن .
حەد : سزای شەرعیی گوناه . توانا ـ کەفارەت : لەوەی گوناه یا شتێکی ماددی دابشوا .

لەتوانرێ مەعنای ئەم شیعرە بە چەند جۆر لێکبدرێتەوە :

یەکەم ـ هەرچەند خوێنی سووری ئەو دلدارەی بە ناحەق کوشتت بووە بە بار و بە لێوتەوە وشك بووەتەوە و بەئاشکرا پێوەی دیارە ، نالی هەر حەددی نییە بڵێ ماچی لێوت ئەو خوێنەی لێ دائەشوا و پاکی ئەکاتەوە . دیارە مەبەست لە خوێنەکە سووریی لێوی یارە کە هەرگیز لاناچێ .

دووەم ـ هەرچەند تاوانی دەمت کە بە دلداری وت ( نـا ) و ئەویش لە داخانا مرد، بووە بە بارێك بەسەر لێوتەوە و،لە ڕۆژی قیامەتا کە هەموو ئەندامی ئادەمیزاد شایەتیی لێئەدەن ، لێوت لێت دێتە دەنگ ، نـالی

— ٣ —

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم کە خانەی صەبرەکەم سووت (١)

لە ژووت و قووتی وەك من ژوو مەپۆشە
کە وەصلی تۆیە قووتی عاشقی ژووت (٢)

---

حەددی نییە بڵێ : ماچ ئەوبارە لە لێوت ئەکاتەوە .
سێهەم ـ هەرچەنـد بەهۆی تاوانی دەمتەوە کـە لەعاسـتی دڵدارانا تووقەپ بووە و هیچ نالێ ، لێوت باری لێ نیشتووە ، نالی حەددی نییە بڵێ ماچ ئەو بارە لە لێوت ئەکاتەوە .
چوارەم ـ هەرچەند لەوەندەت گوناە لەعاسـتی دڵدارانا کردووە و لە خۆلت دوور خـستونەتەوە و پێت وتوون « دە مەکەن ! » ، گوناە بووە بە بار و بەسەر لێوتەوە کەڵەکەی کردووە ، نالی بۆی نییە بڵێ کەفارەتی ئەو هەموو گوناهە ماچی لێوتە .
پێنجەم ـ لەگەڵ ئەوەندەی هەرکام لەم چوار مەعنایە کە پەیوەندی بە نیـوەی یەکەمی شـیعرەکەوەیە ، ئەشتوانرێ مەعنای نیوەی دووەمی بەمجۆرە لێ بدرێتەوە : نالی لەگەر بڵێ کەفارەتی ئەم گوناهە ماچی لێوتە، خۆی گوناهبار ئەبێ و ئەبێ حـەددی لێ بدرێ . یاخـود : نـالی ! بڵێ حەددی ئەم گوناهانە ئەوەیە ماچێك لە لێوی یار بـەنرێ . .
هەرچۆنێ مەعنا لێبدەینەوە ، لە کۆکردنەوەی (گوناە) و (دەم)دا کە بە شێوەی نووسینی کۆنی مەعنای خوێن ئەگەیەنێ ، لەگەڵ وشەی (حەدد) و (کەفارەت)دا، تەناسوبێکی جوان هەیە. هەروەها لە کۆکردنەوەی (دەم) و (لێو) و (ماچ) و (حەد بون)یشدا . .

— ٢ —

(١) ئیخلاف : پێچەوانە کردن . خانە : ماڵ . سـووت : سووتا . سۆیەت ، بەرەو تۆ ( بە فارسی ) .
واتە : دەسم داوێنت ، ئەو گفتەی داتمێ بەپێچەوانەی مەجوڵێرەوە و لێی پاشگەز مەبەوە ، چونکە وا خەریکە ماڵی سەبرم ئاگری لێبەرئەبێ ، یاخود چونـکە ژۆی ماڵی سـەبرم کردووەتە لـۆ ، بەڵکو لایـەکم بەلادا بکەیتەوە .
ئەو (کم) و (گم) و (ت) : ئەم . وەعدەی (چن) و (مم)و (لك) : وەعدە .
(٢) واتە : ژۆیخۆت لە هەژاری ژووت و قووتی وەك من مەشارەوە ، چونـکە

موژەت قوللابییە هەم تیر و هەم شیر
برۆت میحرابییە هەم تاق و هەم جۆت (٣)

لە سندۆقی پڕی سینەم بترسە •
کە ئاگر بەر بداتە تەخت و تابۆت (٤)

---

تاقە هۆیەکی زیان بۆ منی عاشقی ڕۆت بریتییە لە پێگەیشتنت کە ئەویش بەهۆی دیتنی ڕۆژەوە دێتەدی .

لەنێوان (ڕۆت) و (قوت)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان هەر سێ (ڕۆت)ەکەدا جیناسی تەواو و ، لە (ڕۆت)ی (عاشقی ڕۆت)دا لەطافەت هەیە . (ڕۆت و قوت) و (قوتی ڕۆت)یش لە جیناسی قەلبەوە نزیکن .

(٣) موژە : برژانگ . قوللابی : وەك قولاپ .

واتە : برژانگت وەك قولاپ وایە نوکی وەك تیر تیژە و وەك شمشێریش کەوانییە . برۆیشت هیلالییە وەك میحرابی مزگەوت و ، لە ڕۆی شێوەوە وەك تاق وایە و ، جۆتیشە واتە دوانە .

لە (تیر) و (شیر)دا جیناسی موضاریع و ، لە (تاق) و (جوت)دا طیباق و ، لە وشەی ( تاق ) خۆیدا لەطافەت هەیە چونکە بە دوو مەعنا بەکارهاتووە .

هەم تیر و هەم شیر ( مز ) : هەم شیر و هەم تیر . تاق و (مز) : تاقە .

ئەم شیعرە لە پەراوێزی نوسخەی (چر)دا بەمجۆرەش نوسراوە :

موژەت قوللابە ، یا هەم تیر و هەم شیر ؟!
برۆت میحرابە ، یا هەم تاق و هەم جۆت ؟!

(٤) واتە : سندۆقی سینەم پڕە لە ئاگری داخی دەردی تۆ . بترسە لەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بڵێسەی بنکرێتەوە : لە زیانا بی تەخت و تاراجت بسوتێنێ و ، مردبی تابوتەکەت بکا بە خەڵوز . یاخود لە سندوقی سینەی پڕ لە ئاگرم بترسە ، ئەوەندە بەهێزە بە مردنیشم دانامرکێتەوە و لەوانەیە لەسەر تاڵە شوریش بێ یا لەناو دارە مەیتا ئاگرم لێبەربدا .

پڕی (عم) : گڕی . بترسە (ت) : بترسی . ئاگر (عم) و (گم) : ئاور . بەربداتە ( چن ) و ( ت ) و ( ك ) : بەردەداتە .

لەبەر خەندەی لەبی لەعلی ئەتۆ بو
کەوا شەککەر دەبارێ ، گوڵ دەپشکوت (٥)

---

(٥) واتە : کە گوڵی سور ئەپشکوت و شەکر ئەبارێ ، هیی ئەوەبو تۆ پێئەکەنیت و لێوت ئەبزواند و دانت دەرئەکەوت . لە ڕەنگی سوری لێوتەوە ، کە ئەتجوڵاند ، گوڵ ئەپشکوت ر ، لە ددانی سپینەوە کە دەرئەکەوتن شەکر ئەبارێ . ڕەنگێ بێ مەبەستی لە بارینی شەکر پێکەنینەکەی یار بێ و بڕگە بڕگەکانی پێکەنینەکەی شوبهاندبێ بە کوڵۆ شەکر ، یاخود داوەرینی باری سپیی سەر لێوی یار خۆی و کەوتنە خوارەوەی بێ بەهۆی پێکەنینەکەیەوە و ، ویستبێتی باڵای یار بشوبهێنێ بە قامیشی شەکر و باری داوەریوی لێویشی بە شەکرەکەی. ئەم مەعنای دوەمە لە ڕێگای پەیوەندی نێوان ( بارین ) و ( بار )ەوە ڕێی لێئەچێ .
نالی لەم شیعرەدا تەشبیهی مورەککەبی بەکارهێناوە : پشکوتنی گوڵی سور و بارینی شەکری شوبهاندووە بە پێکەنینی یار و دەرکەوتنی لێو و ددانی . لەم شوبهاندنەدا زیادەڕەویەکی زۆر جوان و باڵا هەیە .
نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە ، بەمجۆرە کە لێرەدا نوسیومانەتەوە ، تەنها لە کەشکوڵێکا هەبو برای بەڕێز موحەممەد عەلی قەرەداغی پیشانی‌داین ، تێکرای ناواخنەکانی لە ساڵانی ١٣٢٨ ـ ١٣٣٦ی . ك ( ١٩١٠ـ١٩١٨ی . ز )دا نوسرابونەوە . نوسخەکانی‌تری بەردەستمان ، لەگەڵ ئەو وردە جیاوازییەش کە لێرەدا ئەینوسینەوە ، بەمجۆرە بون :

ئەوە لێوی ئەتۆیە پڕ لە خەندە ؟

ئێمە بۆیە ئەوەی کەشکوڵەکەی کاك موحەممەد عەلیمان لا پەسەندتر بو ، چونکە سەرەڕای ڕەسایی دارشتنەکەشی ، لێوی یاری تیا بە (لعل) وەصف کرابو . ئەوەش بۆ تەواوکردنی هەمو گۆشەکانی شوبهاندنەکە شتێکی بەبایەخ بو .
ئەوە ( کم ) و ( گم ) : ئەمە . دەبارێ ( مم ) : دەبارێ و .
لە نوسخەکەی ( مم ) و ( گم )دا لەپاش ئەم شیعرەوە شیعرێکی‌تریش هەیە . شیعرەکە ئەمەیە :

فیدای دەست و کەمالت بم ، بە تیرێ
دەپێکی سێ و دۆ هەم تاق و هەم جوت

ئێمە ئەم بەیتەمان بە هیی نالی نەزانی و نەمانخستە ناو شیرازەی ێکستەکەوە چونکە :

دەکەی نەخچیری صەد دڵ هەر بە تیرێ
ئیلاهی هەر بیێنێ دەست و بازوت !

چ شیرینە خوطوطی دەوری لێوت
بەلێ مەعلومە خۆشە خەططی یاقوت (٦)

هە « نالی » ! بەڵکو بیکێشی بە نالین
بناڵە ، دامەنیشە مات و مەبهوت (٧)

---

(١) دوا وشەی ، وشەی ( جووت )ەو لەم وشەیە دوا وشەی شیعری پێشوویشە و ، شاعیری سەرکەوتوویش دوو جار لەپاڵ یەکدا وشەیەك ناکا بە لەنگەری شیعر . (٢) ڕستەی ( بە تیرێ ) و تێکڕای مەعنای ئەم شیعرە لە شیعری دوایدا هەیە و هیچ پێویستییەکیش بۆ ئەم دووبارە بوونەوەیە نییە . (٣) شیعرەکە تەنها لە نوسخەی ( مم )و (گم)دا هەبوو و ئەگەر هیی نالی بوایە ئەبوو هیچ نەبێ لە یەکێك لە دەستنووسەکانیشا هەبێ. بۆیە ڕامان بۆ ئەوە چوو (مم) و(گم)یش یەکێکیان لەویانی وەرگرتبێ.

خۆ ئەگەر هەر بشڵێین شیعری نالییە ئەوە مەعنای وا لێ ئەدەینەوە : بەقوربانی ئیشارەلی دەست و کەوانی بڕۆت بم ، بە تاقە تیرێکی نیگای چاوت هەر سێ پارچەی دڵ و سێ و جگەر و هەردو گورچیلەی دلدار ئەپێکی و تاق و جوت گرفتاریان ئەکەی . بەمپێیە ڕستەی (تاق و جوت) وەك مەعناکەی خۆی ئەبەخشێ ، ئەشکەڕێتەوە بۆ ( سێ )و ( دو )وەکە .

(٦) واتە : ئای ئەو گەنە مووانەی بە دەوری لێوتەوەن کە جوانن .. دیارە ئەشێ هەر جوان بن ، چونکە ئەو گەنە مووە ( ڕەش )انە ، بەدەوری یاقوتی سووری لێوتەوەن ، کەواتە (خەتی یاقوت)ن . ئاشکرایە کە (خەتی یاقوت )یش ــ کە خەتخۆشێکی بەناوبانگ بووە ــ زۆر جوانە .

نالی لەم شوبهاندنەیدا کەلکی لە ڕستەی ( خەتی یاقوت ) و ئیشارەتە مێژوییەکە وەرگرتووە بۆ تێهەڵاندنی شوبهاندنی گەنەموی ناسکی سەر لێوی یار بە پێ‌شوبهێنراوێکی‌وا ، شتێکی ڕاستەقینە نییە لەگەڵ شوبهێنراوەکەدا کۆیان بکاتەوە . ئەمە یەکێکە لە خاسیەتەکانی شیعری نالی کە کەمترین و بچوکترین پەیوەند با زۆر بەدیمەن و خەیالیش بێ ، لەنێوان دوو شتا ، بەجێ‌ناهێڵێ بێ‌ئەوەی بۆ وشە ئارایی و مەعنا ڕێکخستن کەلکی لێ وەربگرێ .

(٧) هە : هۆ . مەبهوت : سەرسام .

— ٤ —

ئەی سەروی بولەند قەدد و ، برۆ تاق و ، مەمك جۆت !
کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتوت ؟! (١)

دەم هەمدەمی غونچێکە نەپشکوتووە هێشتا
با کەشفی نەکرد بەرگی عەطرپۆشی گولی زۆت (٢)

---

واتە : ئەی نالی ! مات و سەرسام دامەنیشە .. بنالێنە و هاوار بکە، لەوانەیە ئەگەر بنالێنی لەئەنجاما کار بکەیتە دلی و بتوانی زایکێشی بۆلای خۆت ، یاخود خەلی لێوی بەرەو دەمی خۆت ڕاکێشی ، واتە بیهێنیتە دەنگ و لێت بپرسێ چینە و دەم بنێ بە دەمتەوە ..

— ٤ —

(١) واتە : ئەی یاری بالا وەك سەرو بەرزی ، برۆ وەك تاق کەوانیی ، مەمك دوان ! تۆ بالات ئەوەندە بەرز بێ ، کێ دەستی ئەگاتە جۆتە مەمکی وەك کالە بەی و جوتە گۆنای وەك هەنارت کە هێشتا پێنەگەیشتوون !!

لەنێوان ( تاق ) و ( جوت )دا طیباقی لەفظی هەیە چونکە مەعنای (تاق) لێرەدا ( یەك ) نییە تا بەرابەری جوت بێ و ، لە کۆکردنەوەی ( بەی ) و ( نار ــ هەنار )یشدا تەناسوب هەیە و ، شیعرەکەش تێکڕا حوسنی تەعلیلی تیایە ، چونکە ئەگەر شوێنە گۆڕێ بە نیوە شیعرەکان بکەین ، هۆی دەس‌نەگەیشتن بە بەی و هەناری نەگەیشتوی مەمك و گۆنای یارمان بۆ دەرئەکەوێ کە بەرزیی بالایەتی . ئەمەش کە درەختی سەرو بەری بەی و هەنار بگرێ داهێنانێکی جوانە . پەیوەندیەکیش مولاحەزە کراوە لەنێوان وشەی ( نەگەیشتوت ) و ( کێ دەستی دەگاتە )دا واتە ( دەست پێ نەگەیشتو ) .

کێ ( ك ) : کەس .

(٢) دەم : هەناسە . دەم . هەمدەم : هاودەم ، هاوڕێ . غونچێکە : غونچەیەکە . کەشفی نەکرد : دەری‌نەخست ، لای‌نەدا .

واتە : هەناسەت کە وەك شنەی بای بەیانی ناسکە ، یا هەناسەی من کە وەك سروەی بای سبەینان ساردە ،بە دەوری دەمتایە کە وەك خونچەی نەپشکوتو نەکراوەیە ، یا دەمت هاوڕێی خونچەی نەپشکوتوی لێولە و ، هێشتا با لەگەل ئەو مەحرەمی و ناسکیەشی کە هەیەتی و بە هەمو

گریانی من و خەندەیی تۆ گیستە دەشوبهێ
بەو مەوسیمی بارانە کەوا خونچە دەپشکوێت (۳)

خلخالی قەدم ، وەك خەمی زولفەینی سەراپات ،
پشتانی قەدت بێت و فیدای بازنی بازوت (٤)

---

شوێنێکدا دێ و دەچێ، ئەو پەڕە ناسکەی لانەداوە کە مەلری گولی ڕۆلی شاردووەتەوە . مەبەستی لەوەیە هێشتا کەس دەستی بۆ نەبردووە یا لەنانەت بایش لە ڕازی جوانییەکەی نەگەیشتووە . ڕێیشی لێ ئەچێ ڕۆی دەمی لە کچێکی نۆستو بێ سەرپۆشێکی تەنکی دابێ بەسەر دەم و چاویا.

نالی لەم شیعرەدا لە لایەکەوە دەمی یاری شوبهاندووە.بە خونچەی نەپشکوتو و لە لایەکیکەشەوە ڕۆی شوبهاندووە بە گولی بۆندار کە پەڕەیەکی ناسکی بەسەرەوە بێ و هێشتا با لای نەدابێ .

لە وشەی ( دەم ) دا لەطائفەت و ، لە ( دەم ) و ( هەمدەم )دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی ( خونچە ) و ( با ) و ( بەرگ ) و ( معطر ) و ( گول )دا تەناسوب هەیە .

(۳) مەوسیم : وەرز .

وانە : گریان و فرمێسك ڕشتنی من لە دەردی دۆریی تۆ و گوێ نەدان و پێکەنینی بێباکانەی تۆیش بە من لەو کاتە لەچێ کە بەهاران باران ئەبارێ و خونچە ئەپشکوێ . وادیارە خونچەی دەمی تۆ بە بارانی گریانی من ئەپشکوێ .. دیارە ئەبێ دۆریی نێوان نالی و یارەکەی ئەوەندەی دۆریی نێوان هەور و زەوێ بێ کە ئەوبان بارانەکەی لێوە دێ و ئەمیان خونچەکەی تیا ئەپشکوێ .. لە لایەك شیوەن و گریان بێ و لە لایەك بەزم و پێکەنین !

نالی لەم شیعرەدا تەشبیهی مورەککەبی بەکارهێناوە . دۆ شتی جوێ و لە دۆ باری دژی یەکتریدا شوبهاندووە بە یەك . ئەمە یەکێکە لە شاکارەکانی نالی .

دەشوبهێ ( چر ) و ( کم ) و ( گم ) : دەشوبهێن .

(٤) خلخال : پاوانە . خەم : چەمیوە . پشتان : هاوبالا . بازۆ : قۆل .

وانە : یاخوا بالای وەك پاوانە چەمیوەی لە دەوری پێت گەڕاوم ، وەك زولفە لولەکانت کە لە تەوقی سەرتەوە تا بەری پێتیان گرتووەتەوە، ڕاست بێتەوە و ببێ بە هاوبالای قەدت .. لەجیاتیی ئەوەی بە سەر گەردی پێت

خالی نیه « نالی » دڵەکەت ساتێ لە هیجران
تا تاری وجوودت نەپسێنێ مەلەکولمەوت (٥)

---

بێ و هەر لەبەر پێتا کەوتبێ ، بە قوربانی بازنی قوڵت بێ و شان و باڵت بگرێتە باوەش !

ئەم ئاواتی گۆڕانە لە حاڵی ( لەبەر پێدا کەوتن )ەوە بۆ ( لە باوەش گرتن )ی یار، کە نالی لەم شیعرەیدا دەریبڕیوە گواستنەوە و بەراوردێکی گەلێ هونەرمەندانەیە .

لە کۆکردنەوەی ( خلخال ) و (بازن)دا تەناسوب و ، لە بەرانبەر بە یەك کردنی ( قەدەم ) کە لە شێوەی نووسینی جارانی ( قەدم )ەوە دەرئەکەوێ — و ( بازۆ ) و ، ( خەم ) و ( پشتان )دا طیباق و، لەنێوان ( قەدەم ) و ( قەدەت ) و ، ( بازن ) و ( بازۆ )دا جیناسی لاحیق هەیە .

قەدەت ( چر ) و ( چن ) و ( ك ) : قەدەم .

(٥) تار : تاڵ . مەلەکولمەوت ، مەلەکولمەوت ( ملك الموت ) : فریشتەی گیانکێشان ، عیزرائیل .

واتە : تا فریشتەی گیانکێشان بەنی ژیانت نەپچڕێنێ، بە یار ناگەیت و دڵت تاوێك لە خەمی دووریی یار خاڵی نابێ .

نالی لەم شیعرەدا ویستوویە وشەی ( مەلەکولمەوت ) بەمجۆرەش بخوێنرێتەوە ( ملی کەلمەوت ) واتە : ملی وەك مو باریکت ! بەمپێیە مەعنای شیعرەکە زیادەڕەوییەکی جوانی تێئەکەوێ . واتە : دڵت لە دەردی دووریی یار خاڵی نابێتەوە تا ئەوەندە لەڕ و لاواز ئەبێ بەلی ژیانت بە ملی وەك مو باریکت ئەپچڕێ . ئەمەش وا ئەگرێتەوە هەر بە سەر زیندوو بێ و لەڕاستیدا کەڵکی هیچی پێوە نەمابێ و ئەگەر بە یاریش بگا هیچی لێوە دەسگیر نەبێ . .

دڵەکەت ( چن ) : دەمەکەت . واتە : هەر باسی دووریی یار ئەکەی . . تاد .

## تیپی ئێ

— ١ —

عومری بێ حاصڵی من چۆ بە عەبەث
ئەمەکم هەرچی هەبۆ چۆ بە عەبەث (١)

میهری بێ میهری ڕۆخت گیراوە
لە منی سایە صیفەت چۆ بە عەبەث (٢)

---

— ١ —

(١) عەبەث : پڕوپوچ . ئەمەك : وەفا . ئومێدێك .

وانە : عومری بێهودەم لەخۆڕایی لەکیس چۆ ، هەرچی وەفـام بۆت پیشـاندا ، یا هەرچێ هیوایەکم هەبۆ ، هەمۆیم لە دەسـت دەرچۆ .

ئەمەکم ( چر ) : ئەمی‌کەم . (عم) و (گـم) : ئەمەلم . (کـم) : ئەمەکەم. ( ك ) : ماڵەکەم . چۆ ـ ی دۆهەم ـ ( عم ) : بۆ .

(٢) میهر : خۆر . خۆشەویستی . سایە : سێبەر . وانە : ڕۆی وەك خۆری بێخۆشەویستیی تۆم لێ گیراوە ، بەدکار کەوتووەتە بەینی من و ئەوەوە ، لە دەستی منی سێبەر ئاسا دەرچووە . نالی کـە خۆی کرد بە سێبەر و ڕۆی یاری کرد بە خۆر ، بەوە بڕیاری نەمانی خۆی دا چونکە سـێبەر لە بۆنی خۆرەوە پەیدا نەبێ .

نالی لەم شیعرەدا خۆی شوبهاندووە بە تۆپی زەوی و ڕۆی یار بە تۆپی خۆر و خۆشەویستییەکەی بە تیشکی خۆر و بەدکار بە مانگ .

لە وشەی ( گیراوە )دا تەوریە و ، لە کۆکردنەوەی ( میهر ) و (سایە)دا تەناسوب هەیە .

ڕۆخت ( چر ) و (عم) و (کم) و (گم) : دەرت . (مز) : ڕۆت . چۆ ـ ی دۆهەم ـ ( عم ) و ( کم ) و ( ت ) : بۆ .

قەسدی یارتە لەگن بەزمی ڕەقیب
یاری من ! خۆت مەکە بەدخۆ بە عەبەث (٣)

خانەیی دڵ کە خەرابە ، چ بڵێم
بە خەیاڵت کە : بفەرمۆ ، بە عەبەث ! (٤)

« نالی » ئەو غونچە دەمە بێزارە
مەکە ماچی دەمی ، ئەرجۆ ، بە عەبەث (٥)

---

(٣) واتە: گوایە بەڕاستت نییەو یاری ئەکەی کە لەگەڵ بەدکاردا ڕاڵەبوێری و ڕۆی خۆشی ئەدەیتێ . ئەی دۆستی خۆشەویستم ، لەخۆڕایی خۆت پیاو خراپ مەکە ، بەدکار بۆ ئەوە ناشێ بە هیچ ڕۆیەک ڕۆی بدەیتێ .

له (یارتە) و (یاری) دا جیناس هەیە .

لەگن ( « پەراوێزی » چر) و (گم) و (مز) : لەگەڵ .

(٤) خانە : ماڵ . خەراب : وێران .

واتە : مادەم ماڵی دڵم وێرانەیە و کەڵکی لیا دانیشتنی پێوە نییە ، چۆن ، بێهوودە ، بە یادت بڵێم فەرمۆ وەرە ناوی .

ئەمەی نالی ئەیڵێ وێنەیەکی ئێجگار ناسکە . ئەو تەنانەت بەوەش ڕازی نییە کە یادی یار بە دڵی پڕ ئازاریا تێپەڕێ ، نەبادا یادی ڕەنجیدە بێ !

(٥) بێ زار : بێ دەم ، یاخود بێزار بەمەعنا وەڕس و بێتاقەت . ئەرجۆ : تکا ، لە (ارجو)ی فیعلەوە وەرگیراوە بەمەعنا تکا لەکەم ، یاخود هەر فیعلەکە خۆیەتی .

واتە : لە خۆڕایی بەتەمای ماچی دەمی ئەو یارە مەبە کە دەمی وەک خونچەیە نەکراوەتەوە ، چونکە دەمی نییە . یاخود : ئەو یارە دەم وەک خونچەی نەپشکوتووە ، بێزار و وەڕسە ، تاقەتی ماچ دانی نییە ، بەتەمای ماچی مەبە . یاخود : تکات لێ لەکەم بە بێهوودە دەمی ماچ مەکە چونکە مادەم دەمی نەکاتەوە یا دەمی نەپشکوێ ، وەک دەمی نەبێ وایە .

## پیتی چیم

— ١ —

عیشقت ، که مەجازی بێ ، خواهیش مەکە ئیللا کچ
شیرین کچ و ، لەیلا کچ و ، سەلما کچ و ، عەذرا کچ (١)

فەرقی کوڕ و کچ ڕۆشن ، وەك فەرقی مەهـ و میهرە
ئەم فەرقی شەو ڕۆژە وەك فەرقە لە کوڕ تا کچ (٢)

---

— ١ —

(١) عیشقی مەجازی : لای ئەهلی دڵ عیشق دوو جۆرە ، عیشقی حەقیقی کە عیشقی خوایە و عیشقی مەجازی کە عیشقی جینسییە . خواهیش : داوا . ئارەزوو . شیرین : بێجگە لە مەعنا لەفظییەکەی و لەوەش کە ناوی ئافرەتە ، ئیشارەتیشە بۆ شیرینی خوسرەو و فەرهاد . لەیلا : بێجگە لە مەعنا لەفظییەکەی کە نەشئەی کاتی سەرخۆشییە و لەوەش کە ناوی ئافرەتە ، ئیشارەتیشە بۆ لەیلای قەیسی عامیری . سەلما : بێجگە لە مەعنا لەفظییەکەی کە سافی نەگەیەنێ و لەوەش کە ناوی ئافرەتە ، ئیشارەتیشە بۆ ( سەلما )ی ڕەمزی دڵداری لە ئەدەبی عەرەبدا . عەذرا : بێجگە لە مەعنا لەفظییەکەی کە واتە ( کچی دەست بۆ نەبراو ) و لەوەش کە ناوی ئافرەتە ، ئیشارەتیشە بۆ مەریەمی دایکی عیسا و ، بۆ عەذرای قارەمانی ڕازی خۆشەویستیی ( وامیق و عەذرا ) .

واتە : کە لە عیشقا ڕێگای عیشقی مەجازیت گرتەبەر ، هەر کچت بوێ .. چونکە هەر سیفەتێکی جوان لە مەعشقدا مەبەست بێ ، هەمووی لە کچدا کۆبووەتەوە .

نالی لە ناوەکانا لەطافەتی بەکارهێناوە ، وەك لە مەعنا لێدانەوەکانیاندا ڕۆنمان کردەوە .

عیشقت ( چر ) : عیشقی .

(٢) مەهـ : مانگ . میهر : خۆر .

واتە : جوانیی کچ وەك هیی خۆر وایە و هیی کوڕ وەك هیی مانگ .

مەهـ مەهـ لە مەهی سادە : یەعنی لە قەمەر لادە
هەم شەمس و ثورەییا کچ ، هەم زوهرەیی زەهرا کچ (٣)

بێ بێنە گوڵی ڕاڵە ، هەم بێ بەرە ، هەم تاڵە
قەد سەرو و سنەوبەر کچ ، چاو نێرگسی شەهلا کچ (٤)

کوڕ وەك گوڵی گوڵزارە ، ئەمما ئەمەری خارە
وەك هەڵگی چڕۆدارە ، هەنگوینی موصەففا کچ (٥)

---

خۆر نیشانەی ڕۆژە و مانگیش نیشانەی شەو و بەئەندازەی جیاوازیی نێوان خۆر و مانگ ، لەنێوان کوڕ و کچیشدا جیاوازی هەیە .

نالی لە نیوەی دووەمی ئەم شیعرەدا بە نیازی دووپات کردنەوەی جیاوازیی زۆری نێوان کوڕ و کچ بۆ مەسەلەی دڵداری ، تەشبیهی مەقلوبی کردووە ، ئەگینا ئەبوو بیوتایە : ئەم فەرقی کوڕ و کچە وەك فەرقی شەو و ڕۆژە .

لە هێنانی (شەو) و (ڕۆژ)دا بەدوای (مەهـ) و (میهر)دا ، لەف و نەشری مورەتتەب و ، لە کۆکردنەوەی (کوڕ) و (کچ) و ، (شەو) و (ڕۆژ)یشدا طیباق هەیە .

ئەم (ت) : ئەو . (عم) و (گم) : وەك . وەك ئەرقە (چر) : وەك فەرقی . وەك (عم) و (گم) : ئەم .

(٣) مەهـ مەهـ : (مە) ، وشەیەکی عەرەبییە واتە دەس‌بەردار بە ، دووبارە کراوەتەوە . سادە : بێ مۆ . ثورەییا : کۆمەڵە ئەستێرەیەکن لە گەردنی (ثەور)دا لێی جوێ نابنەوە . زوهرە : ئەستێرەی ناهید .

نالی لەم شیعرەدا لەطافەتی بەکارهێناوە ، چونکە لە زمانی عەرەبیدا (قەمەر) موذەککەرە و ، (شەمس) و (ثورەییا) و (زوهرە) موئەننەثن .

(٤) بێن : بۆن .

واتە : کوڕ وەك گوڵی ڕاڵە وایە ، نە بۆنی هەیە و نە بەریش ئەدا و تاڵیشە . بەڵام کچ باڵای وەك داری سەرو و سنەوبەر بەرزە و چاوی وەك نێرگسی مەست وایە .

ئەشگونجێ ( بێ بێنە ) بە (بیبینە) بخوێنرێتەوە ، واتە سەیری کە .

لەنێوان (بەر) و (بێن) و (تاڵ)دا تەناسوب و ، لەنێوان (ڕاڵە) و (تاڵە)دا جیناسی لاحیق هەیە .

(٥) خار : دڕك . موصەففا : پاڵفتە .

دوور نییە مەبەستی نالی لەم شیعرە ئەوە بووبێ بڵێ بەڵێ ڕاستە کوڕ

کچ پەرچەمی چین چینە ، دوو مەمکی لەسەر سینە
وەك شانەیی هەنگوینە بۆ لەززەتی دنیا کچ (٦)

جەزلی ئەمەر و سایە بۆ صەولەتی ئەعدا کوڕ
نەخلی ئەمەر و مایە بۆ دەولەتی دنیا کچ (٧)

کوڕ زیبی دەبوستانە ، کچ شەمعی شەبوستانە
بۆ بەزمی تەماشا کوڕ ، بۆ خەلوەتی تەنها کچ (٨)

---

وەك گوڵی گوڵزار وایە بەئاسانی بنیادەم ئەتوانێ بڕوا بیکاتەوە ، بەڵام بەرەکەی زیان و تاوانە . ڕاستە کچیش وەك هەنگی چزوودار وایە پیاو بێ مەینەت ناتوانێ بیبڕێتەوە ، چونکە نە خۆی خەڵوی هەروا لەدا بەدەستەوە و نە کەس و کاریشی بێ ئەرکێکی گران ئەیدەن بە شوو ، بەڵام لەپاش دەسگیر بوون وەك هەنگوینی پاڵفتە وایە ، چوون ئەو مۆمی پێوە نییە ، ئەمیش گوناه و ئابڕوو چوونی لەدوا نییە . ئەگەر مەبەستی نالی ئەمە بێ کە ئێمە تێی ئەگەین ئەوا ئەم شیعرە ئیشارەتە بەو ڕاستییە کە لە کۆمەڵگا داخراوەکانی وەك کۆمەڵگای ئێمەدا هەستی پێ ئەکرێ لەبارەی پەیوەندی جینسییەوە . شیعرەکە ئیشارەتێکی ئیرۆتیکی تیایە ، بەڵام بۆ باس کردن ناشێ .

(٦) لەم شیعرەدا ، لە کۆکردنەوەی (چینە) و (سینە)دا جیناسی لاحیق و ، لە یەکخستنی (شانە) و (پەرچەم)دا تەناسوب هەیە ، چونکە دوور لە مەعناکەشی کە (پوورە هەنگ)ە ، بە شێوەی نووسین لەگەڵ (شانە)ی سەر داهێنانیشدا یەك ئەگرێتەوە .

ئەم شیعرە تەنها لە دەستنووسەکەی (چر)دا هەبوو .

(٧) جەزل : بە دەس و دەهەندە . سایە : پەنا . صەولەت : هێرش . نەخل : دار خورما .

واتە : کاتی هێرش بردنە سەر دوژمن ، کوڕ قوربانیدەر و بە دەس و دەهەندەیە و سایە و پەنای لێقەوماوانە . بۆ ڕابواردن و شان و شکۆی دنیایش کچ دار خورمای بەردارە .

لە کۆکردنەوەی (سایە) و (مایە) و ، (صەولەت) و (دەولەت)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ئەمەر و (مم) و (گم) : ئەمەری . دەولەتی دنیا (چن) : خەلوەتی تەنها .

(٨) زیب : جوانی . دەبوستان : قوتابخانە . شەمع : مۆم . شەبستان :

مۆ سونبولی ئاشوفته ، دوڕ دانەیی ناسوفته
دەم غونچەیی نەشکوفتە ئێمکرە کوڕە یا کچ ! (٩)

کوڕ ئاینەیی حوسنی ، تا وەك کچە ، مەنظوورە
گرتی کە غوباری مۆ چینێ کوڕ و مینا کچ (١٠)

کوڕ تازەوو تەڕ ، مادام سادە وەکو خوشکی بێ
ئەمما کە ڕوا سەبزە ، دیبا کوڕ و ، زیبا کچ (١١)

---

تاریکستانێ .

واته : کوڕ مایەی جوانیی دەسگاکانی خوێندن و خوێندەواریبە .. کچیش بۆ ڕازاندنەوەی ماڵی دەرگا داخراوە .. بۆ بەزم و ئاهەنگ و تەماشا کوڕ ، چونکە ئەوسا کۆڕی ڕابواردن هەر بۆ پیاوان بووە .. بۆ بەسەربردنی تەنیایی شەویش کچان ..

لە کۆکردنەوەی ( دەبوستان ) و ( شەبوستان )دا جیناسی موضاریع هەیە .

(٩) ئاشوفته : تێکچوو . ناسوفته : نەسمراو . نەشکوفته : نەپشکوتوو .
واته: بیرکەرەوە بزانە کوڕ خاوەنی قژی تێکچوی وەك سونبولی ئاڵۆزاو و، دوڕێی نەسمراو و ، دەمی وەك خونچەی نەپشکوتوو بچوکە ، یا کچ ! دیارە کچ !

(١٠) مەنظوور : تەماشاکراو . مینا : شووشە . واته : ئاوێنەی جوانیی ڕۆمەتی کوڕ تا وەك هیی کچ وایە و مۆی لێ نەهاتووە ، بۆ تەماشاکردن لەشێ . بەڵام کە تۆزی دێزی گەنەتوکی لێ نیشت ، وەك قاپی نەخفووریی لێ دێ ، کەچێ کچ هەر بە شووشەیی خۆی ئەمێنێتەوە و هیچی لێ نایێ .
حوسنی (چر) و (گم) و (کم) : حوسنە .

(١١) دیبا : پارچە قوماشی نەخش لەسەرکراو . زیبا : جوان .
واته : ڕاستە کوڕ تا وەك خوشکی مۆی لێ نەهاتبێ ، تازە و تەڕ و پاراوە ، بەڵام کە شینایی گەنەتوکی لێ ڕوا ، ئەو موەوەی لێی‌ڕواوە ، ئەبێ بە نەخش و نیگاری دەستکرد بۆ دەم و چاوی . کەچێ کچ بە جوانێ و نەشەنگیی سروشتکردی خۆی ئەمێنێتەوە .
لە کۆکردنەوەی (دیبا) و (زیبا)دا جیناسی موضاریع هەیە .

بۆ شەربەتی شیرینی فنجانە لەسەر سینی
مەم توحفەیی توففاحی ، شەم عەنبەری بۆیا کچ (١٢)

هەم گولبەنی بێ خاری ، هەم مەزرەعی ئەزهاری
هەم مەخزەنی ئەسراری‌ئیثباتی مەزایا کچ (١٣)

جەنەت پڕی ویلدانە ، خادیم هەمو غیلمانە
خانم کە تێدا حۆرین‌ ،یەکسەر هەمو حەسنا کچ (١٤)

---

(١٢) مەم : مەمك . توحفە : دیاری . توففاح : سێو . شەم : شەمع ، مۆم. بۆیا : بۆندار .

واتە : مەمکی وەك سێو خڕ و ، وەك مالی دیاری نایابی کچ ، کە بالای وەك شەمع بەرز و ڕێکە و ، وەك عەنبەر بۆن‌خۆشە ، وەك فنجان وایە بەسەر سینیی سنگیەوە بۆ گێڕانی شەربەتی شیرینی .

(١٣) گولبەن : دار گوڵ یا چەپکە گوڵ . مەزرەع : مەزرەعە ، جێگای کشت‌وکاڵ . ئەزهار : جەمعی زەهرە ، واتە گوڵ . مەخزەنی ئەسرار : جێگای ڕاگرتنی ڕاز و نهێنی . ئیثباتی مەزایا : پێ سەلماندنی باشترێتی .

واتە : بەڵگەی سەلماندنی باشترێتیی کچ لە کوڕ ئەوەیە کە کچ چەپکە گوڵی بێ دڕکە و ، گوڵی بیا ئەچێنرێ واتە تۆوی مرۆڤی تیا دائەنرێ و منالی لێ ئەبێ و ، کە خاوەنی شتێکیشە ڕازی ڕاگرتووە وەك کچێتییەکەی بێ .

ئەشتوانرێ ( مەزرەعی ئەزهاری ) وا بخوێنرێتەوە :

( مەزرەعەیەزهاری ـ مەزرەعەی ئەزهاری ) . بەم‌پێیە وشەی (مەزرەعە) دەسکاری نەکراوە و تەنها بۆ هاوسەنگیی شیعرەکە لەگەڵ وشەی (ئەزهاری) تێکەڵی یەك کراون .

بێ خاری ، ئەزهاری ، ئەسراری (ئەم) و (کم) و (گم) : بێ خارە ، ئەزهارە ، ئەسرارە . ئیثباتی مەزایا (چن) و (کم) و (گم) و (لك) و (ژ) : لەسبابی موهەیبا .

(١٤) ویلدان : جەمعی وەلەدە واتە کوڕ . غیلمان : جەمعی غولامە واتە کوڕی تازە پێگەیشتو . خانم : ئافرەتی گەورە و سەرۆك . حەسنا : جوان .

واتە : بەهەشت پڕیەتی لە کوڕی جوان و ، خزمەتکارانی ناو بەهەشت

گەر ئەشرەف و مەحبوبە یوسف کوڕی یەعقوبە
کچ بۆ بە خڕیداری یەعنی کە زولەیخا کچ (١٥)

صیدیق و عەزیز هەروەك یوسف کە نەبی بۆ کوڕ
صیدیقەیی مەعصومە وەك داکی مەسیحا کچ (١٦)

بابێکی هەیە دونیا بۆ عەشقی مەجازی ، بەس
« نالی » چیە ئەو بابە : ئادەم کوڕ و حەووا کچ (١٧)

---

هەمو کوڕی تازە هەڵچون . حۆرییەکانی بەهەشت کە سەرکردە و خاوەن ماڵن ، هەمو لە بەرەی کچانن . ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کچ چاترە لە کوڕ ئەگینا ئەوان گەورە و ئەمان کارەکەر ئەبون .

(١٥) خڕیدار : کڕیار . زولەیخا : ژنی عەزیزی میسر کە دڵی چوبو لە یوسف .

واتە: ڕاستە یوسفی کوڕی یەعقوب کوڕێکی بەشەرەف و خۆشەویست بووە و ، ئەمەش واتەگەیەنێ کە کوڕ چاتــرە لە کچ ، بەڵام نابێ ئەوەش لەیادکەین کە ئەوی یوسفی کڕی ، زولەیخا بو کە کچ بو .

گەر (چەر) و (چەن) و (مەم) و (کەم) و (ك) و (کۆ) : کوڕ .

(١٦) صیدیق : زۆر ڕاستگۆ، حەزرەتی یوسف. لە قورئاندا هەیە «یوسف ایها الصدیق .. » واتە : یوسف ، هەی پیاوی ڕاستگۆ ! .. عەزیز : عەزیزی میسر ، مێردی زولەیخا . نەبێ : پێغەمبەر . صیدیقەیی مەعصومە : ئافرەتی باوەڕ پێکراوی بێگوناه ، حەزرەتی مریەمی دایکی مەسیح .

واتە : ئەگەر لەبەرەی کوڕانا کەسانی وەك حەزرەتی یوسف و عەزیزی میسر بوبن ، کە زولەیخای ژنی دۆهەمیان دڵی لە یەکەمیان چو ، ئەوە نابێ بە بەڵگە بونەوە کە هەمیشە کوڕ لە کچ داوێن پاکترە . لەناو کچانیشدا داوێن پاکی وەك مەریەمی دایکی مەسیح هەڵکەوتووە ..

(١٧) باب : دەرگا . جۆر .

واتە : عیشقی مەجازی یەك دەرگای هەیە مرۆ لێیەوە بچێتە ژورەوە ، یا یەك جۆری هەیە ، ئەویش ئەوەیە لەنێوان نێر و مێدا بێ ، چونکە ئێمە هەمو نەوەی ئادەم و حەووایین و ئادەم کوڕ بووە و حەووا کچ و کەواتە عیشقی مەجازی ئەبێ بە کوڕ و کچ بکرێ نەك بە کوڕ و کوڕ .

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

عیشقی مەجازی ( عم ) عیشقی مەجاز و .

ئەم قەسیدەیەی نالی کە بە مەبەستی بەرهەڵستی لە گرتنەبەری ڕێگای نادروست داینراوە لە کاروباری جینسدا ، ڕەنگدانەوەیەکی ئاشکرای باری کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژەیە لەم ڕووەوە و ، ئەگەر بەراوردێکیشی لەگەڵ ئەو قەسیدانەی شاعیرانی‌تری پاش خۆی بکەین کە بەئاشکرا لایەنی دلداری لەگەڵ کوڕدا ئەگرن ، بۆمان دەرئەکەوێ کۆمەڵ لە چ لێژێکی بێ‌ڕەوشتیدا تێکلابو . ■

■ من لەو ئاستە دا بە سووکی تێ ناپەڕم . پێم وایە ئەم شیعرە بێ وێنەی نالی کە لە گەڵ وەسفی جوانی کچ ڕەخنەی لە هاوجینس‌بازی گرتوە . جگە لە وەی کە هاوجینس‌بازی لەو سەردەمی دا باو بووە بە تایبەتی لە نێو تورك و عەرەب دا ، وەك مەلا یەکی شەرع زان بە گوناهێکی گەورەی زانیوە ، دە گەڵ بیر و ڕای ڕەوان شناسی ئەمڕۆش ڕێك دەکەوێ کە هاوجینس‌بازی بە نەخۆشی جینسی دەزانن یانی نالی نەك هەر شەرع زان بووە بەڵکە ڕەوان شناسیش بووە .

# تیپی حێ

— ١ —

ساقی ! وەرە ڕەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقداح
بەم ڕاحە ، لەسەر ڕاحە ، دەڵێن : ڕاحەتی ئەرواح (١)

بەم کاسە لەسەر پەنجە دەڵێن : نوری عەلا نور
ڕەخشانە لە میشکاتی قەدەحدا وەکو میصباح (٢)

---

— ١ —

(١) ساقی : مەیگێڕ . جاران لە کۆڕی خواردنەوەدا کچانی شۆخ مەییان گێڕاوە ، لەوەوە ( ساقی ) بووە بە کینایە لە کچی جوان . ئەقداح : جەمعی قەدەحە بە مەعنا پیاڵەی مەیخواردنەوە . ڕاح ( ی یەکەم ) : پێک .
ڕاح ( ی دووەم ) : لەپی دەست . ڕاحەتی ئەرواح : ئارامی گیان .

واتە : ئازیزە مەیگێڕەکەم ، وەرە قەراخی پیاڵەی مەی بە پەنجەکانت ڕەنگاوی کە ( مەبەستی ئەوەیە کە پەنجەکانی بە خوێنی دڵداران سوورن ، یا ڕەنگین کینایەیە لە پیرۆزی ، چونکە پەنجەی یار پیرۆزە ) . بەم پیاڵەی مەیە کە تۆ لەسەر لەپی دەستی دائەنێیت ، ئەڵێن ڕەحەتیی گیانە .

لە کۆکردنەوەی هەردو ( ڕاح )دا جیناسی تەواو ، لە کۆکردنەوەشیاندا لەگەڵ ( ڕاحەت ) جیناسی ناقیص هەیە .

(٢) ڕەخشان : تیشکدەرەوە . میشکات : تاقێکە دیوەودەر نەبێ . میصباح : چرا .

واتە : ئەم پیاڵەی مەیە بەسەر پەنجەی سوورتەوە ، وەك ئەوە وایە ڕووناکی لەسەر ڕووناکی دابنرێ . شەرابەکەش لەناو پیاڵەکەدا وەك چرایەك وایە لە تاقێکی نادیوەودەردا دانرابێ .

قەطرێکە لە بەحری کەرەم و ڕەحمەتی فەتتاح
نەك عارەقی کەرمی عینەب و شەربەتی توففاح (٣)

بەو دەستە کەوا مەرهەمە بۆ ئەم دڵی خەستە ،
بەو پەنجە کە بۆ بابی گوشایش ئەوە میفتاح ، (٤)

---

ئەشکونجێ دانانی پەنجەی یار بە ڕۆناکی لەوەوە بێ کە باسی ناسکیی کچێك لەکرێ ، ئەڵێن ئەوەندە ناسکە خوێنەکەی لەودیوی پێست و گۆشتەکەیەوە دیارە .

تێکڕا ئەم شیعرە لە ئایەتی ( الله نور السماوات والارض ، مثل نوره کمشکاة فیها مصباح ، المصباح فی زجاجة ، الزجاجة کأنها کوکب دري ) تا ئەگاتە ( نور علی نور .. ) وەرگیراوە .

(٣) قەطرێکە : قەطرەیەکە ، دڵۆپێکە . فەتتاح : خوا کە دەرگای ڕەحمەتی خۆی بۆ بەندە ئەکاتەوە . کەرم : داری مێو . عینەب : ترێ . توففاح : سێو .

واتە : وا ڕێنەگەن ئەو مەیەی یار بەو دەست و پەنجانەی ئەیگێڕێ ئارەقی ترێی ڕەزە مێو و شەربەتی سێوە ، وانییە . دڵۆپێکە لە دەریای میهرەبانی و ڕەحمەتی خوا کە دەرگای خێر و خۆشیی بۆ هەمو خەڵك کردووەتەوە ، یا دەرگای بۆ هەموان لەسەر پشتە .

لە کۆکردنەوەی ( قەطرە ) و ( بەحر )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( کەرەم ) و ( کەرم )دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لە کۆکردنەوەی ( فەتتاح ) و ( توففاح )دا جیناسی قەلب هەیە ؛ سەرەڕای ئەو تەناسوبە زۆرەش کە لە تێکڕای شیعرەکەدا هەیە .

کەرەم و (ك) : کەرمی . عارەقی (گم) و (ت) : ئارەقی . کەرمی عینەب و (ت) : کەرم و عینەب و . (مم) و (کم) و (گم) : گەرمیی عینەب و . (ك) : گەرمیی عینەبی و . بەپێی ئەم نوسخانەی دوایی وشەی (گەرمی) لەگەڵ ( عارەقی )دا ئەگونجێ .

(٤) گوشایش : کردنەوە . میفتاح : کلیل .
مەعنای ئەم شیعرە و دۆ شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ .
ئەم (گم) : ئەو . دڵی (کم) : دڵە .

بەو دەنی فوراتە کە دەکا پەشەشە بە عەنقا ،
نەك لەو خومی نیلە کە دەکا باخە بە تیمساح ، (٥)

پڕ کە قەدەحی پڕ فەرەحی بێ تەرەح و غەم
ناوِلْني ، وَنادِمني وغازِلني بالأفراح (٦)

---

(٥) دەن : کوپەی شەراب کە ئەیخەنە ژێر چاڵ بۆئەوەی شەرابەکە کۆن بێ و شەرابێکی چاکی لێ دەرچێ . فورات : سازگار و ساف و بێگەرد. ڕووبارێکە لە عێراقا ناوبانگی ئاوەکەی بە خۆشی دەرچووە . پەشەشە : مێشوولە . عەنقا : باڵدارێکی خەیاڵییە . خوم : کوپەی گەورەی مەی و سرکە و شتیوا . خاسەڕەنگ کە جلی پێ شین ئەکەن . نیل : شین . ڕووبارێکە لە میسر . باخە : کیسەڵ . لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا نووسراوە ( باغە) بەڵام هەڵەیە . تیمساح : نەهەنگ ، گیان لەبەرێکی ئاوییە لەشێکی گەورە و کلکێکی درێژ و دەس و قاچێکی کورتی هەیە و قەپالێکی ئەستووری هەیە وەك قەپاڵی کیسەڵ .

بەو (مم) : لەو . فوراتە ( مم ) و ( گم ) : فەڕابە . لەو ( چن ) و ( مم ) و ( کم ) و ( گم ) و ( ك ) : بەو .

(٦) تەرەح : خەفەت . لە هەموو نوسخەکاندا بە ( طەرەح ) نووسراوە ـ بەڵام هەڵەیە ، وشەکە عەرەبییە و ( تەرەح )یشە . دیارە نووسیارەکان لەوەندە ( ط )یان لە عەرەبیدا دیوە ، لەبەر کوڵکە خوێندەوارێتیی خۆیان ، وایانزانیوە هەرچێ (ت)یشە لەبێ (ط) بێ ! . نادمنی (چن) و (ك) : ناومنی.

واتە : دەی سا مەیگێڕ ! بەو دەستە جوانانەت کە تیماری دڵەی بیمارن و ، بەو پەنجە باریکانەت کە کلیلی کردنەوەی دەرگای ئاواتن ، لەو کوپەی شەرابی سازگار و بێگەردی کۆنە کە هیچ لە دڵا ناهێڵێ ، پیالەیەکی بێدەرد و خەمم بۆ پڕ کە ، بیدە بە دەستمەوە و ، خۆیشت لەگەڵما بخۆرەوە و ، قسەی خۆشم لەگەڵ بکە و، پیالەم بۆ لە پیالە بدە و بە خۆشی لەگەڵما دڵداریی بکە ، نەك لەو شەرابانەی کە سەری بنیادەم کاس ئەکەن و ، باری ئەوەندەی تر گران ئەکەن ، تا وای لێ دێ کیسەڵێکی بچووکی لەبەرچاو ئەبێ بە نەهەنگێك .

لە یەکخستنی (دەستە) و (خەستە) و ، (فەرەح) و (تەرەح)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی ( فورات )و ( نیل ) و ، (پەشەشە) و ( عەنقا ) و ( باغە ) و ( تیمساح )دا طیباق و ، لە وەصف کردنی ئەو شەرابەی ئەیەوێ بە ( فورات ) و ، ناوهێنانی کوپەکەی بە ( دەن ) و ،

لەم گەردشی مینایە کەوا دەورە ، لە جەورە
ساقی کەرەمی سایقە ، « نالی » مەکە ئیلحاح (٧)

وەصفکردنی شەرابە ناخۆشەکەش بە ( نیل ) و ناوهێنانی کوپەکەی بە (خوم)دا ــ لەطافەت هەیە .

نیوە عەرەبییەکەی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( مز )دا کوردییە و بەمجۆرەیە :

**تا بۆ بێ دڵ و ڕۆحی لەمن لیستا لە لەفراح**

(٧) مینا : چەرخی گەردوون . پیالەی شەراب . سایق : لێخوڕی چەرخی گەردوون ، خوا . بەتین و بەری پیالەی شەراب ، یار . ئیلحاح : پێ بەزەویدا کوتان و سوور بوون لەسەر شتێک .

واتە : چەرخی گەردوون ، چوون بۆ بنیادەم دێتە پێشەوە ، ستەم نییە و ، هەرکەس سەرەی خۆی هەیە و ، خوا خۆی ئەزانێ چی ئەکا . کەرەمی لێ خوڕەکەی کە خوایە،شەرابی بە ئاوات گەیشتن ئەدا بە دەستی هەرکەسێکەوە و ، سوور بوون و پێ بەزەویدا کوتان داد نادا . یاخود یار خۆی ئەزانێ کەی ومختی ئەوەیە دڵی نەرم بێ و ، پیالەی شەرابی بەئاوات گەیشتن بە تۆیش بدا و ، پێویست ناکا زۆری لەسەر بڕۆیت و ، لێیگەڕێ بۆ خۆی چیئەکا با بیکا .

لە یەکخستنی ( دەورە ) و ( جەورە )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( ساقی ) و ( سایق )دا جیناسی قەلب هەیە .

مەکە ئیلحاح ( عم ) و ( گم ) : بکە ئینجاح. لەبەراوێزی (عم)دا مەعنای ئینجاح بە ( شادکردن ) و لە بەراوێزی ( گم )دا بە ( شاد ) لێدراوەتەوە . دیارە ئەگەر بۆیان پیە نەکەین هەردوکیان بە هەڵەدا چوون .

# تیپی دال

## به فارسی

— ١ —

ابروان تو طبیبان دل افگاراند
هردو پیوسته ازان بر سر بیماراند (١)

گنج رخسار تو دیدن نبود زهره مرا
که ز زلف تو برو خفته سیه ماراند (٢)

ما هزاران ، ز غمت خسته و ناکام ، ولی
کامیاب از گل روی تو خس و خاراند (٣)

---

— ١ —

(١) واتە : برۆکانی تۆ پزیشکی دلدارە دڵ برینداره‌کانتن ، بۆیە هەمیشە بە ڕاسەری نەخۆشەکانەوە ڕاوەستاون .

لە وشەی (پیوستە)دا لەطافەت هەیە چونکە هەم مەعنای (هەمیشە) و هەم مەعنای (پەیوەست) و (یەکگرتووەوە)ش هەڵئەگرێ . هەروەها لە وشەی ( بیماراند )یشدا لەطافەت هەیە ، چونکە هەڵئەگرێ بمەعنا ( نەخۆش ) بێ و هەلیشئەگرێ بە مەعنا (مەست) بێ . ئەوەتە ئەوترێ ( چاوی بیمار ) واتە ( چاوی مەست ) . واتە ، برۆ بەسەر چاوەوەیە !

(٢) واتە : من هەرگیز ناوێرم سەیری گەنجینەی ڕوومەتی تۆ بکەم ، چونکە ڕەشمارەکانی زولفت بەسەر ئەو گەنجینەوە نوستوون و ئەیپارێزن . ئیشارەتە بەو ئەفسانەیە کە ئەڵێ مار بەسەر گەنجینەوە پەبکە ئەکا .

(٣) واتە : ئێمەی بولبولی نەغمەخوان کە ڕۆژ تا ئێوارە بە باڵای تۆدا ئەخوێنین،

بر سر کوی خود از گریه مکن منع مرا
زانکه گلهای چمن منتظر باراتند (٤)

نرگسان تو که خواب همه عالم بردند
خفتگانند ، ولی رهزن بیداراتند (٥)

« نالیا » ار چه سگانش همه شب نالانند
که نه آن شیفتگان نیز جگر خوارانند (٦)

---

لەناو دەرد و خەفەتی دووریت گرفتار بووین و ، هەر لەم چڵ و ئەو چڵ نەکەین و ، لە پێگەیشتنت ناومێد بووین . کەچی دڕك و داڵ هەمیشە بەلای گوڵی ژۆلەوەن . ئاشکرایە بلبل بەسەر چڵی درەختەوە نەبێ نانیشێتەوە ، کەچێ دڕك و داڵی بنی گوڵ هەمیشە هاوسەری پەڕەی گوڵن .

ئەتوانرێ وشەی ( هزار ــ هوزار ) بە ( هەزار )یش بخوێنرێتەوە ، واتە : ئێمە کە هەزاران دڵدارین .. تاد .

(٤) واتە : ڕێم لێ مەگرە بەسەر ڕێ و شوێنتا بگریم و فرمێسك بڕێژم . گوڵزاری باخچەکەت چاوەڕوانی بارانە پێی بگەشێتەوە . بۆیە منیش بارانی فرمێسکی خۆمی بەسەرا ئەڕێژم .

(٥) واتە : چاوە مەستە خەواڵووەکانت ، خەویان لە چاوی عالەم بڕیوە و ، بوون بە ڕێگری ڕێ و تالانکەری ماڵی ئەو دڵدارانەت کە لەناو دەردی دووریت خەو لە چاویان حەرام بووە .

زیادەڕەوییەکی ئێجگار شاکارانەیە : خەوتوو خەو لە خەڵك حەرام بکا و ڕێگا لە بێداران بگرێ .

لە کۆکردنەوەی ( خفتگان ) و ( بیداران )دا طیباق هەیە

بردند ( مم ) : بستند .

(٦) واتە : نالیا ! بەدکارەکانی بەردەرگای ماڵی یار، هەرچەند شەو تا بەیانی هەرایانە ، هەراکەیان لەوەوە نییە کە دڵیان پێوەیەتی ، تەنها ئەوەیان ئەوێ دڵی دڵدارەکانی بریندار بکەن و جگەریان بخۆن و نەهێڵن بە دیداری شاد بن .

ار چە (مم) و (لف) و (مز) : از چە . نالانند (چر) و (ك) و (مز): بیدارند.

# تیپی ڕێ

— ١ —

ئیلتیفای پۆڵا و ئاسن هەر لیزاعە و گیر و دار
جەمعی ماه و ئار و ، زەند و زەندەوو ، مەرخ و عەفار (١)

---

— ١ —

لە چاپکردنی ئەم دیوان و لێکۆڵینەوەی دیوانی ( نالی )یەدا گەیشتبوینە ( تیپی ڕێ ) ، کە برادەری دڵسۆز قوتابیی دوا پۆلی بەشی کوردۆلۆژیی زانکۆی سلێمانی ، کاك جمال محمد سێ دەستنوسی دیوانی نالیی بۆ ناردین و ، ئێمەش خستمانە بەردەست و لێرەوە تا دوایی کتێبەکە کەڵکیان لێ وەرئەگرین .

یەکەمی ئەم دەستنوسانە کە لە برادەری بەڕێز کاك عبدالرحمن مزوریی وەرگرتووە بۆمان ، ( مەلا عبداللەی گەلاڵی ) ناوێك لە سالی ١٣١٦ای کۆچی ، (١٨٩٨ — ١٨٩٩ای . ز)دا نوسیویەتەوە . بۆ ئەم دەستنوسە نیشارەلی ( عب ) دائەنێین . دوەمیشیان ( مەلا احمد ) ناوێك لە سالی ١٣١٧ای کۆچی (١٨٩٩—١٩٠٠ای . ز)دا نوسیویەتەوە . بۆ ئەمیش نیشارەلی ( اح )مان دانا . سێهەمیشیان مامۆستا نەجمەدین مەلا نوسیویەتەوە و سالی بۆ دانەناوە . بۆ ئەمیش نیشارەلی (من)مان دانا .

(١) گیر و دار : وشەیەکی فارسییە بەمەعنا بگرە و ڕاگرە . نیستا بەمەعنا هەرا و کێشە بەکاردێت . زەند و زەندە : دوو وشەی عەرەبین ، دوو جۆرە دارن ، سەرویان زەند و ژێرویان زەندەیە ، لە بەیەکگەیاندن و لێکدانیان ئاگر پەیدا ئەبێ . مەرخ : وشەیەکی عەرەبییە بە جۆرە دارێکی ناسك ئەڵێن زوو دائەگیرسێ . عەفار : جۆرە دارێکی‌ترە ئاگری لێ ئەبێتەوە .

بۆ لێکدانەوەی مەعنای ئەم بەیتە سەرەتایەك پێویستە : پۆڵا و ئاسن هەردوکیان لە یەك ڕەگەزن . لە زمانی عەرەبیدا پۆڵا ( فولاذ ) نێرینەیە و ،

ئاسن ( حدید ) مێینەیە . (ماه) و (نار)یش یەکەمیان نێرینە و دووەمیان مێینەیە . (زەند) و (زەندە)یش لە عەرەبیدا یەکەمیان نێرینە و دووەمیان مێینەیە . لە فارسییشدا ( زند ) بە چەخماخ ئەڵێن کە لە بەردە ئەستێ ئەدرێ و بە هەردوکیان ئاگر ئەکەنەوە . (مەرخ) و (عەفار)یش هەر بە عەرەبی دوو جۆرە دارن کە بدرێن لە یەك زوو دائەگیرسێن ، دیارە ئەمانیش لەبەرئەوەی کە داگیرسانەکەیان لە بەیەکگەیشتنەکەیان پەیدا ئەبێ ، یەکێکیان بە نێر و ئەویان بە مێ دانراوە .

ئەنجا دێینە سەر لێکدانەوەی مەعنای بەیتەکە وەك ئێمە لێی حاڵی بووین :

نالی ئەیەوێ بڵێ : بەیەکگەیشتن و پەیوەندی پۆڵا ( پیاو ) و ئاسن ( ئافرەت ) بریەتی لە هەرا و کێشە . ئەم دوانە بێ یەك نایانکرێ و پێکەوەش ژیانیان بریەتی لە ناکۆکی (التناقض) . وەك چۆن دوو تەلی سارد و گەرمی کارەبا : دژی یەکن و کەچی تەنها پێکەوەش تروناکی دێننە بەرهەم . ئەم پەیوەندییە پێویست و لە هەمان کاتیشدا پڕ لە ئاڵۆزییەی نێر و مێ ، وەك کۆبونەوەی ئاو و ئاگرە ، کە یەکێکیان گەرمە و ئەویان سارد و هەردوکیان بۆ ژیان پێویستن و ئاگر بە ئاو ئەکوژێتەوە ، یا وەك پەیوەندی (زەند) و (زەندە) و ، (مەرخ) و (عەفار)ە کە بە هەردولایان ئاگر ئەکەنەوە .

واتای ئاشکرای بەیتەکە ئەوە ئەگەیەنێ کە لە بەیەکگەیشتنی پۆڵا و ئاسندا ئاو و ئاگر بەکارئەهێنرێن . لە لایەکەوە کورەی ئاسنگەر بە مۆشەدەمە خۆش ئەکرێ و ، ئاسنەکە لەناو ئاگردا دائەنرێ ، تا سور ئەبێتەوە و بە چەکوشی پۆڵا لێی ئەدرێ و ، زێك ئەخرێ و ئامێری هەمە چەشنەی لێ دروست ئەکرێ و ، لە لایەکی کەشەوە ئاسنەکە ئەخرێتە ناو ئاو سارد ئەکرێتەوە و زاخاو ئەدرێ . ئەم شێوە وەصفە لەگەڵ پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەتیشدا ئەگونجێ و ئەمەش واتا پەنهانییەکەی شیعرەکە. هەروەها ( زەند ) و ( زەندە ) و ، ( مەرخ ) و ( عەفار )یش لێك ئەدرێن و لێك ئەخشێنرێن و لەو لێکدان و لێکخشاندنەیان ئاگر پەیدا ئەبێ . ئەمە واتا ئاشکراکەی دێرەکە . واتا پەنهانییەکەشی شێوەی پەیوەندی پیاو و ئافرەت و لەیەك نزیك بونەوەیانە کە ئەبێ بە هۆی پەیدابونی هەڕەتی ئارەزوو و ، پاشانیش ژیانێکی نوێی لێ دێتە بەرهەم .

دوور نییە ، جگە لە نێریی ( فولاذ ) و مێیی ( حدید )یش ، نالی بۆیە پیاوی بە ( پۆڵا ) و ئافرەتی بە ( ئاسن ) وەصف کردبێ ، چونکە بەعادەت

ئەم لەسەر تەعظیم و گەورە گرتنی ئەو بێ قوصوور
ئەو لەسەر تەحقیر و تەخفیف و شکستی زاری مار (٢)

---

پیاو ئافرەت ئەکوتێتەوە و ئافرەت بۆ پیاو نەرم ئەبێ ، وەك چۆن چەکوشی پۆڵا ئاسنی لە کورەی ئاسنگەریدا پێ نەرم ئەکرێ .

نیوەی دووەمی ئەم بەیتە ، لە نوسخەکانی بەردەستمانا ، جیاوازیی زۆری تیابو . لە هەموویانـدا نوسخەی ( ك ) زیاتر بەلای ڕاستیدا ڕۆیشتبو و ، ئێمەیش پشتمان بەو نوسخەیە بەست . تەنها ئەوەندە هەبو ( زەندە )ی بە ( زیندە ) و ( عەفار )ی بە ( عیفار ) نوسیبوەوە . جیاوازییەکانی نوسخەکانیتر هیچیان لەوانە نەبون مەعنایەکی ڕاست و گونجاو بەدەستەوە بدەن و هەمو هەڵەی نوسیاری حاڵی نەبو بون . بۆیە پشت گوێمان خستن .

(٢) ئەم : ئیشارەتە بۆ نزیك کە لێرەدا ( ئاسن )ەکەیە ، کەچی نالی ئیشارەتی بۆ ( پۆڵا )کە پێ کردووە . ئەو : ئیشارەتە بۆ دوور کە ( پۆڵا )کەیە ، کەچی نالی ئیشارەتی بۆ ( ئاسن )ەکە پێ کردووە . وادیارە نالی لەم ئیشارەتەیدا لای خۆیەوە دەستی پێ کردووە .

مەعنا دیارەکەی ئەم بەیتە ئەوەیە : پۆڵا هەمیشە خەریکی بە گەورە گرتنی ئاسنە ، ئەوەتە ، پارچە ئاسن ئەکا بە ئامێری جۆر جۆر کە هەریەکە بۆ چەند کار بەکاردێن . کەچی ئاسن هەمیشە لەسەر سوككردن و بە هیچ زانین و شکاندن و زەهری مار دەرخوارددانی پۆڵایە . ئەوەتە پۆڵا بووە بە خزمەتکاری ئاسن و کاری بۆ ئەکا و ، بە هەڵبڕینی زۆری بە دەستی وەستا سوك بووە و ، ئەو تاڵاوەی بە دەما ئەکرێ کە تاوئەتاو ئاسنگەر ئاسنەکەی تێئەخا بۆ سارد بونەوە .

مەعنا بەنهانییەکەشی ئەوەیە پیاو هەمیشە خەریکی گەورەکردنی ئافرەتە ، بە دوگیان کردن و چونەلا و ، بە هیچ جۆرێ کورتی ناکاتەوە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە .. کەچی ئافرەت پیاو ئەکا بە هیچ و سوکی ئەکا و خاڵیی ئەکاتەوە و لەدا بە دەمی مارەکەیدا .. مەبەست وێنەگرتنی کاتی پاش بەیەك‌گەیشتنی پیاو و ئافرەتە .

تەخفیف و ( « پەراوێزی » چر ) : تەحقیقی ، واتە : هێنانەدی .. (عم) و (کم) و (گم) : تەخفیف و . (عب) و (اح) : تەخفیفی . زاری مار : هەمو نوسخەکانی بەردەستمان (عم) و (گم) و (مز) نەبێ : زاری مار . (عم) و (گم) و (مز) : زارە مار .

وەك وتمان ، لە هەمو نوسخەکانی بەردەستمانا (زار) نوسراوە . ئێمە

ئەم بچێ ، ئەو دادەنیشێ دەم وەکو گوڵ خەندەران
ئەم دەبێ هەستێ کە ئەو بێ ، چاو یەك و قطرە هەزار (٣)

ئەم بە چاو دوڕژ و بە سەر لەعلی هەدییە بۆ دەبا
ئەو بە تف دەیکا بە میزابی شکستەی ئابشار (٤)

---

لامانوایە ئەمە هەڵەیە و ڕاستەکەی (زاری مار)ە ، چونکە زار هەم بە مەعنا (زار) و هەم بە مەعنا (دەم)یش دێ و ئێمەش هەردو مەعناکەمان بۆ دەرخستنی هەردۆ ڕووەکەی ئەم پارچە شیعرەی نالی پێویستە . بۆیە گۆڕیمان و کردمان بە (زاری مار) .

(٣) گوڵ خەندەران : گوڵێکی سورە ، ئەڵێن کە بنیادەم پێیبکەنێ ئەو لەناسکیدا لەت ئەبێ .

مەعنا دیارەکەی وایە : کە چەکوشی پۆڵا چو بدا بە ئاسندا ، ئەو ، چونکە لە کورەدا سور کراوەتەوە ، وەك گوڵ خەندەران بە ڕێیەکی گەشەوە لە بەردەمیا دائەنیشێ ، بەڵام کە ئاسن لە کورە دەرئەچێ و دێ ، چەکوشە پۆڵاکە ، ئەبێ بە یەك چاو و هەزار دڵۆپەوە هەڵسێتەوە . مەبەست لە یەك چاوی چەکوشە پۆڵاکە ئەوەتە کە ڕۆی کردووەتە ئاسنەکە و ، مەبەست لە هەزار قەترەکەشی ئەو پریسکانەیە کە لە کاتی پیادانی ئاسنە سورکراوەکەدا ، ئەکەونەوە . مەبەست لە هەستانی چەکوشە پۆڵاکەش بەرزکرانەوەیەتی بۆ پیادانی ئاسنە سورەوەکراوەکە .

مەعنا پەنهانەکەشی ئەوەیە : کە پیاو چو بۆ لای ئافرەت ، ئافرەت بە (دەم)ی وەك گوڵ خەندەران سوری ، کراوەیەوە، لە بەردەمیا دائەنیشێ . کە ئافرەتیش بێ بۆ لای پیاو ، ئەبێ ئەم بە یەك ( چاو ) و هەزار ( دڵۆپ )ەوە ( هەستێتەوە ) . .

بچێ (گم) : ئەچێ . (کم) و (ت) و (ك) و (مر) و (صب) و (اح) و (من) : نەچێ . واتە : بەئامادەیی دائەنیشێ و چاوەڕوان ئەکا .

(٤) میراب : پلوسك . ئابشار : تاڤگە .

مەعنا دیارەکەی وایە : ئەو پرشانەی لە ئاسنی سورەوە کراو ئەبنەوە ، مرواربن و ، سەری ئاسنەکەش کە لەناو کورەکەدا سور بووەتەوە لەعلە بەسەریەوە . ئەم مرواری و لەعلە ، پۆڵا بە دیاری بۆ ئاسنی هێناون . کەچێ ئاسن بەرابەر بەم قەدرزانینەی پۆڵا ، پۆڵاکە ئەکا بە پلوسکە شکاوی ئاو پیاهاتنە خوار . مەبەستی ئەوەیە کە ئاسنەکە هەڵئەکێشن لە ئاو بۆ

نەظمی « نالی » میثلی ئاو و ئاوێنە ڕەنگی نییە
دوو ڕووە بۆ سەیری خاطر : یەك خەفی و یەك ئاشكار (٥)

— ٢ —

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور !
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری ( شارەزوور ) ! (١)

---

ساردبوونەوە ، بەهۆی گەرماکەیەوە پرژێکی زۆر بە سەر و ڕووی چەکوشە پۆلاکەدا لەپرژێنێ .

مەعنا پەنهانەکەشی ئەوەیە پیاو بە ( چاو )ی ، دڵۆپی ( ئاو )ی وەك مرواری سپی و ، بە ( سەر )ەکەی سوورایی وەك لەعل ئەبا بۆ ئافرەت ، کەچی ئەو لەپاداشا ئەوەندە ( تف ) بە (دیاری)یەکەیدا هەڵئەدا ، وەك پلووسکە شکاوی ئافکەی لێ ئەکا .

دوڕڕ و (عب) و (من) : دەڕوا . لەعلی هەدییە (چر) و (ت) و (ك) و (عب) و (من) : لەعل و هەدییەی . (کم) و (گم) : لەعلی هەدییەی . دەبکا بە (من) : دەبکاتە .

(٥) خەفی : نهێنی . ئاشکار : دیاری .

واتە : شیعری ( نالی ) وەك ئاو و ئاوێنە وایە ڕەنگی نییە ، دوو ڕووە ، بەر و پشتی هەیە . لە ڕوویەکیا بنیادەم ، وەك چۆن لە ئاو و ئاوێنەدا خۆی ئەبینێ ، مەعنای ئاشکرای بۆ دەرئەکەوێ و ، لەو ڕووەکەشیا کە یا وەك بنی جام یا وەك جیوەی ئەودیوی ئاوێنە وایە هیچ دەرناکەوێ ، کەچی مەعنایەکی تریش هەیە .

ئاو و ئاوێنە (عم) و (ت) و (عب) و (من) : ئاو و ئاینە . (ك) : ئاوە ، وێنەوو . (اح) : ئاوە ، وێنەیی .

شاعیر و نووسەر کاك عبدالرزاق محمد بیمار بەشدارییەکی باشی لە لێکدانەوەی ئەم پارچە شیعرەدا لەگەڵ کردین . قەدر و سوپاسی ناخەینە پشت گوێ .

— ٢ —

(١) باد : با . مروور : گوزەر ، تێپەڕین . پەیك : نوێنەر ، نێردراو ، کەسێ بە کاری نێررایێ بۆ شوێنێك . شارەزوور : ئێستا ناوچەیەکی بچووکە لە پارێزگای سولەیمانی ، ( خاك و خۆڵ )ی زێدی نالی یەکێکە لە گوندەکانی . بەپێی دابەشبوونی بەڕێوەبەرێتیی ئەو سەردەمەی نالی ئەم پارچە شیعرەی تیا

ئەی لوطفەکەت خەفیی هەوا خواه و هەمدەمە !
وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حوضوور ! (٢)

---

وڵاوە ، بەشی زۆری کوردستانی ئێستای عێراقی گرتووەتەوە . بەڵام بە نیشانەی ئەوەدا کە نالی خۆی لەمەوپاش لە باسی سولەیمانیدا ئەڵێ :

**بۆ دەفعی چاوەزارە ئەڵێن شاری شارەزوور**

دیارە مەبەستی لێی ، تەنها شاری سولەیمانی و دەور و پشتیەتی .

نالی ، کوردی کەوتووە وڵاتان ، شاعیری خاوەن هەستی ناسک ، پاش ئەوەی لەئەنجامی تێکچوونی حوکمڕانیی بابانەکانا کوردستان بەجێ ئەهێڵێ و سەری خۆی هەڵئەگرێ و ڕوو ئەکاتە شام و ماوەیەک لە نامۆییدا ئەمێنێتەوە ، هەوای نیشتمان ئەداتەوە لە کەللەی ، ژانێکی قووڵ لە دەروونیا گینگڵ ئەخوا ، ئەنجامەکەی ئەم شاکارە هونەرییە ، ئەم تابلۆ پڕواتایە لەبێ کەوا لەوێوە بۆ هاودەردێکی خۆی ، بۆ ( عبدالرحمن بەگی سالم )ی ناردووە و ، ئەویش لە سولەیمانییەوە بە شاکارێکی تری لەم چەشنە وەڵامی ئەداتەوە ، کە پیاو هەردوکیان بەراورد ئەکا ، وائەزانێ دوو کەوون خراونەتە قەفەز ، قەفەزێکی دەربەدەری و یەکێکی دەستبەسەری ، لە بەرابەری یەکدا ئەخوێنن و بۆ یەکدیی ئەمێننەوە.

لەو ڕۆژەوە کە شیعر هەیە ، تەرازووی جیاکردنەوەی شیعری ڕاستەقینە لە شیعری تەنها بەدیبەمەن ، هەر ئەوە بووە ، شاعیر تا چ ئەندازەیەک لەگەڵ خۆیدا ڕاستی کردووە و ، شیعرەکەی چەند لە ناخیەوە هەڵقوڵاوە ، ئاخۆ دەنگدانەوەی ژانی دەروونی خۆیەتی ، یا بۆنە و پێویستی و باری ژیان زۆری لێ کردووە بیڵێ . وابزانین تاقە شتێ لە هەرچێ باشتر وەڵامی ئەم پرسیارەمان بداتەوە و ، ئەم ڕاستییەمان بۆ دەرخا ، ڕادەی لەگەڵدا گونجان و بە دڵا چوونی کۆمەڵی خوێندەوارانە . بۆیە ، بێ گومان ، ئەو پایەیەی ئەم پارچە شیعرە لە مێژووی ئەدەبی کوردا دەستی خستووە ، نیشانەی ڕاستیی شاعیرە لەگەڵ خۆی و ، بەڵگەی ئەوەیە شیعرەکەی لە قووڵایی دەروونیەوە سەری کردووە .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا بای لێزەو ئەکا بە نامەبەری خۆی و ، دەست ئەکا بە بەری پشتێنیا و ، پێی ئەڵێ : خوا بمکا بە قوربانی تۆزی ئەو ڕێگایەی تۆ بەسەریا ئەڕۆی ، تۆ شارەزای هەموو کون و کەلەبەرێکی شاری شارەزووری و ڕێت لێ ون نابێ ، بڕۆ ئەم نامەیەم بۆ بگەیەنە و هەواڵم بۆ بپرسە و بزانە ...

ئەی ـ ی دووەمم ـ (اح) : وەی .

(٢) خەفی : نهێنی . بەشارەت : مژدە . گۆشە : سووچ .

ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان :
طۆفانی دیدەوو شەرەری قەلبی وەك تەنـوور ! (٣)

گاهێ دەبێ بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دل
گاهێ دەبێ بە دەم دەدەمێنی دەمی غوروور (٤)

---

واتە : لەی ئەو بایەی کە نەوازش و دڵدانەوەت ، یاخود ناسکیت ، بەنهانە و کەس پێینـازانێ ، چـونکە با وەختێ بە بایـەکی خـۆش دائەنرێ کە بەئاسـتەم ، وەك بەدزییەوە ، بـوەزێ . هەوایەکی ئەوێ بجولێنــێ .. هاوڕێی بنیادەمــە ، چونکە ئەگەر نەبێ بنیــادەم خەفە ئەبێ .. ئــەی ئەو بایەی کە بەئاسـتەم هەلکـردنت ، مژدەیە بۆ دل و دەرۆنی ئەوانەی لەسـەر سۆجی بەرمالی بە دل ئامادەبێ و دۆرنەکەوتنەوە دانیشـتۆن .

مەبەسـتی گفتوگۆکە پاش چەند شیعرێکی‌تر دێ .

هەمدەمە (اح) : هەمدەم .

(٣) هەم‌میزاج : هاوسروشت .

مەبەسـتی ئەوەیە با لەوەدا کە جاروبار ساردە ، هاوسروشتی تۆفانی چاوی دلدارانە کە فرمێـسکی تەڕیانە . لەوەشـا کە جاروباریش گەرمە ، هاوسـروشتی بلێسـەی دلەی وەك تەنۆر گەرمیانە کە لە شێوەی فرمێـسکی گەرمدا دێتە دەرەوە .

(٤) گاهێ : جارێـکیان . ڕەوح : فێنکێ . دەم ـ ی یـەکەم ـ : دەمەی ئاسنگەر ، مۆشەدەمە .

مەعنای ئەم شـیعرە وەك لێکدانەوەی ئەو شـوبهاندنەیە کە لە شیعری پێشـودا هەبۆ . واتە : لەوکاتانەدا کە ساردی ، ئەبێ بە مایەی فێنکێ و باوەشێنی دل ئـەکەی . لەوکاتانەشدا کـە گەرمی ، ئەبێ بـە دەمەی ئاسـنگەر و خوێنی ، یاخود دەمـی ، لەخۆباییبۆن ئەبزوێـنی ، وەك مەشهۆرە بنیادەم لە کاتی گەرمادا تۆڕەیە و ئاگای لە خۆی نامێنێ چی ئەکا و چی ئەڵێ ..

لە کردنی (با)دا جارێك بە سروە و باوەشێن‌کەری دل و ، جارێکیش بە دەمەی ئاسنگەر ، طیباقێکی جوان هەیە ، سەرەڕای لەو جوانییەی لە کۆکردنەوەی طۆفانی دیدە و ئاگـری تەنۆری دلدا هەیە لە شـیعری پێشودا ، کە ئیشـارەتێکیشی تیا کردووە بە ئایەتی ( وَ فارَ التَّنُّورُ ) لە باسی تۆفانەکەی حەزرەتی نوحدا .

دل (ت) : تلاح .

مەحوی قەبوولی خاطری عاطر شەمیتە
گەردی شیمال و گێژی جەنووب و گزەی دەبوور (٥)

سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم ، دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی یا صەبوور (٦)

هەم هەمعەنانی ئاهم و ، هەم هەمڕیکابی ئەشك
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە ، هەستە بێ قوصوور (٧)

---

(٥) عاطر شەمیم : بۆنخۆش . شیمال : بای شەماڵ . جەنووب : بای گەرمی باشوور . دەبوور : ڕەشەبا .

واتە : ئەو تۆزەی بای شەماڵ ئەیجووڵێنێ و ، ئەو گێژەڵووکەی بای باشوور هەڵیئەکا و ، ئەو گزە ساردەی ڕەشەبا لەیبرووێنێ ، هەموو ئەوتاو و سەرگەردانی گەڕان بەدوای ئەوەدان کە دڵی بۆن و بەرامە خۆشی تۆ پەسەندیان بکا .

عاطر شەمیمتە (چن) و (ك) : پڕ نەبضی و عاطیرە .

(٦) ڕەواق : هەیوان . خانە : خانوو .

واتە : هەیوانی ماڵی خۆڕاگرتن و بوردەباریم سووتا ، سەبر جێگەیەکی نەما خۆی تیا حەشار بدا ، کەوتە دەشت . دڵ و دەروونم تەنها سووچێکیان بۆ ماوەتەوە دوعای ( یا صەبوور )ی تیا بخوێنن ، بەڵکو خوا دەروویەکی خێریان لێ بکاتەوە .

دڵ و («بەراوردی» چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : دەر و . بەپێی لەم نوسخانە مەعنای شیعرەکە وای لێدێتەوە : دەر و ناوی هەیوانی ماڵی سەبرم ئاگری تێبەربوو .. (مم) : وەکو . بەمپێیەش مەعناکەی وای لێدێتەوە : هەیوانی خانووی سەبرم ، هەروەك ناوەوەی ، ئاگری تێبەربوو . گۆشەیی ذیکرێکی (چرا) : گۆشەیی ذیکرێکە . (ت) گۆشەیی ذیکرێك کە .

(٧) هەمعەنان : هاوجڵەو . هەمڕیکاب : هاورکێف ، هاولاوزەنگی .

واتە : کە خانووی سەبرم ڕووخا و جێگەم نەما ئۆقرەی تیا بگرم ، هیچم بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ هەمیشە پێبەپێی ئاخهەڵکێشان و فرمێسك ڕشتن بڕۆم ، کەواتە ئەگەر بەزەییشت بە مندا نایێتەوە، با بەزەییەکت

وەك ئاهەكەم دەوان بە هەتا خاكی كۆیی یار
وەك ئەشكەكەم ڕەوان بە هەتا ئاوی ( شیوەسوور ) (٨)

بەو ئاوە خۆت بشۆ لە كودووراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەصلی یەكدی : كە تۆی طاهیر ، ئەو طەهوور (٩)

ئەمجا مەوەستە تا دەگەیە عەینی ( سەرچنار )
ئاوێكە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور (١٠)

---

بەواندا بێتـەوە . هەڵسە ، تۆ وەك ئـەوان نیت ، ڕێت لێ ون نابێ ، بكەوەرە ڕێ بڕۆ ...

ئاهـ و ئەشكە ( « پەراوێزی » چر ) : ئاهە وشكە . لەگونجێ لەمیش هەر ( ئاهە و ئەشكە ) بێ وا نوسرابێ .

(٨) دەوان : ئەوەی بە ڕاكردن بڕوا . كۆ : بەردەرگای ماڵ . ڕەوان : جارێ . شیوەسوور : شیوێكە لەنزیك چەمچەماڵەوە .

واتە : وەك هەناسەی ساردی درێژم بە پەلە بڕۆ تا ئەگەیتە بەردەرگای ماڵی دۆست و ، وەك فرمێسكم جارێ ببە تا ئەگەیتە ئاوی شێوە سوور .

لە كۆكردنـەوەی (ڕەوان) و (دەوان)دا جیناسـی لاحیـق و ، لە كۆكردنەوەی (ئاه) و (ئەشك) و، (خاك) و (ئاو) و (شیو)دا تەناسوب هەیە. لە هێنانی ناوی (شیوە سوور)یشدا ئیشارەت بەوە كراوە كە فرمێسكی شاعیریش خوێناوە و سوورە . ئەوەش گونجانێكی جوانی تیایە .

ئاوی شیوە سوور ( « پەراوێزی » چر ) و (كم) و (گم) و (اح) : ئاوی پردە سوور . ( « دیـانەوە پەراوێزی » چر ) : شیوی پردە سوور .

(٩) كودووڕات : تۆز و خۆڵ . طاهیر : پاك . طەهوور : پاك كەرەوە .

واتە : كـە گەیشتیتە سـەر ( شیوە سـوور ) و نزیكی سـولەیمانێ بوویتەوە ، لادە ، كەمێك بحەسێرەوە ، بەو ئاوە خـۆت بشۆ ، هەرچی تۆز و خۆڵی ڕێی زەویت لەو ڕێگەیەدا لێ‌نیشتووە ، هەمووی دابشۆ . تۆ خۆت پاك و ئاوەكەش پاكەوەكەر ، بە دیتنی یەك شاد ببن .

( طـاهیر ) و ( طەهوور ) لە زاراوەكانی فیقهن .

كە تۆی (كم) : ئەتۆ .

(١٠) عەین : كانێ . سـەرچنار : كانێ و سەراوێكە حـەوت كیلۆمەترێك لە سولەیمانییەوە دوورە . جێگای ڕابواردنی خەڵكی شارە . نار : هەنار .

چەشمێکە میثلی خۆر کە لە صەد جێ ، بە ڕۆشنێ
فەورانی ، نووری صافە لەسەر بەردی وەك بلوور (١١)

یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەك شەهابی نوور (١٢)

---

چنوور : گیایەکی بۆنخۆشی کێوییە ، بەڵام لە شوێنی وەك سەرچنار ناڕوێ ، وادیارە نالی هەر بۆ وەزنی شیعر هێناویێتی . دووریش نییە مەبەستی هەنار و چنار و چنووری ڕاستەقینە نەبێ ، بەڵکو کینایە بێ لە کچی باڵا بەرز و بۆن خۆش و مەمکی خڕ ، چونکە سەرچنار لەمێژە سەیرانگای خەڵکی سولەیمانییە و شۆخەکانی شار هەمیشە تیا کۆئەبنەوە .
لە وشەی (عەینی)دا لەطافەت هەیە چونکە هەم مەعنای (کانێ) و هەم مەعنای (خۆی)یش ئەگەیەنێ . لەنێوان (نار) و (چنار)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (چنوور) و (چنار)دا جیناسی لاحیق هەیە .
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و (کم) و (من) : ئاوێکی صافە پڕ لە چنار و . (عب) : ئاوێکە پڕ لە دار و چنار و . گوڵ و چنوور (ت) و (مز) : گوڵی چو نوور . واتە گوڵی وەك نوور .

(١١) چەشمێکە : چەشمەیەکە ، کانییەکە . فەوران : فەومران ، هەڵقوڵان .
واتە : سەرچنار کانییەکە وەك خۆر وایە ، وەك چۆن خۆر بەسەر پارچە بلووری ئاسمانەوە لە صەد لاوە تیشك بڵاو ئەکاتەوە ، ئەمیش پاك و ڕۆشن و بێگەرد لە صەد لاوە هەڵئەقوڵێ و بەسەر بەردی خاوێنی وەك بلوور سپیی ناو کانیدا ئەڕوا ..
ڕۆشنێ (چن) : ڕۆشنێ و .

(١٢) واتە : یاخود سەرچنار کانیاو نییە،ئاوێنەیەکە دانراوە ، دیمەنی ئاسمانی بە ئەستێرەکانیەوە تیا دیارە . ( وردە بەردەکانی بنی ئاوەکە ، جێگەی ئەستێرەکان ئەگرنەوە لە شوبهاندنەکەدا ) . بەڵام چونکە وێنەی ئەستێرەکان لە ئاوەکەدا ئەجوڵێنەوە ( مەبەست ئەوەیە کە ئاوەکە بەسەر وردە بەردەکانا ئەڕوا ، وا دێتە پێش چاو بجوڵێنەوە و بکشێن ) ، وەك ڕاکشابن و درێژ کشابن وایە و ، لەومدا لەوە ئەکەون کە لە ئەستێرەی عادەتی بچن و ، وەك ئەو ئەستێرانەیان لێ دێ کە بەدوای شەیتانە بۆ ئاسمان ڕۆیشتووەکاندا ئەکشێن . ■
ڕابکشێن (چر) و (ك) و (مز) و (نو) و (عب) و (اح) : ڕابکشێ .

■ پێم وایە مەبەستی نالی لە پێشدا ئەستێرەی زەوی بێ ئەستێرە بە کوردی بەو گوڵە دەڵێن کە دەیگرنەوە و خۆ ئاوی تێدا رادەگرن بو ئەوەی شەواو بە خۆرایی نەچێ • بە فارسی پێی دەڵێن ( استخر ) بەو حاڵەوە مەعنای ئەستێرەی ئاسمانیش هەر دەدا •

یا چەشمەساری خاطری پڕ فەیضی عاریفە
یەنبوعی نورە دابڕژێنێ لە کێوی طور (١٣)

دەمووت دو چاوی خۆمە ئەگەر ( بەکرەجۆ )یی ئەشك
نەبوایە تیژ و بێ ئەمەر و گەرم و سوێر و سور (١٤)

---

(١٣) چەشمەسار : سەرچاوە . عاریف : خواناس . یەنبوع : کانی . کێوی طور : ئەو کێوەی خوا قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسا تیا کرد و نوری خۆی تیا پیشان دا .

واتە : یا هیچیان نییە ، سەرچاوەی پڕ بەرەکەتی خواناسانە ، سەرچاوەی ڕوناکییە ، لە کێوی نورەوە دابڕژێتە خوارەوە .

پڕ فەیضی عاریفە (عم)و (ت) و (مز)و (عب)و (من) : پڕ فەیضو عاطیرە. (نو) پڕ فەیضی عاطیرە . یەنبوعی نورە دابڕژێنێ (کم) و (گم) و (من) : یا ئاوی ڕۆح بەخشە کەوا دێ . (چر) و (عم) و (ت) : ... دادەڕژێنێ . (چن) : ... دابڕێژێ یا دابڕێژێنێ .

(١٤) بەکرەجـۆ : شوێنێـکە دە کیلۆمـەترێك لە سولەیمانییـەوە دوورە ، جۆگایەکی لە سەرچنارەوە بۆ دێ .

واتە : ئەگەر فرمێسکی چاوەکانم تیژ و بێبەرهەم و گەرم و سوێر و سور نەبوتایە ، بە ئاوی بەکرەجۆم ئەوت فرمێـسکی منە ، بەڵام ناتوانم وابڵێم چونکە هەرچەند فرمێـسکی منیش وەك ئاوی بەکرەجـۆ زۆرە ، بەڵام ئەو خاسیـەتانەی باسم کردن و لە فرمێـسکی چاومدا هەن ، لە ئاوی بەکرەجۆدا نین .

نالی ، لە دانانی ئەم خاسیەتانەدا بۆ فرمێـسکی چـاوی خـۆی و ، دژەکانیان بۆ ئاوی بەکرەجۆ ، مەعنا ئارایییەکی زۆر جـوانی کردووە ، سەرەڕای لەو زیادە ڕەوییەش کە چاوی خۆی بە یەکێك لە جۆگاکانی سەرچنار داناوە .

وشەی (بەکرەجۆ) لەم شیعرەدا بەگوێرەی زانـستی نەحوی کوردی ( متنازع فیە )یە لەنێوان ( دەمووت ) و ( نەبوایە )دا و ڕاستکردنەوەی ڕستەکە بەمجۆرە ئەبێ : ئەگەر بەکرەجۆی لەشـك تیژ و بێ ئـەمەر و گەرم و سوێر و سور نەبوایە،ئەمووت جۆگەی بەکرەجۆ دو چاوی خۆمە. دو (چن) و (من) : کە .

داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی ( خاڵوخۆڵ )
هەتا نەکەی بە خاکی ( سولەیمانی )یا عوبوور (١٥)

یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چەن دەمێ
موشکین دەبێ بە کاکۆلی غیلمان و زولفی حۆر (١٦)

---

(١٥) سارا : صەحرا ، دەشت . خاڵوخۆڵ : دێیەکە لە نزیکی چەمی تانجەڕۆوە ، لە ناوچەی ( مەربەت ) ، ٢٤ کیلۆمەترێک لە ڕۆژاوای سولەیمانییەوەیە . سولەیمانی : یەکێکە لە بەناوبانگترین شارەکانی کوردستان ، ئیبراهیم پاشای بابان لە ساڵی ١٧٨٤دا دروستی کردووە و ، پێتەختی میرنشینیی بابانی لە ( قەڵا چوالان )ەوە بۆ گواستووەتەوە .

نالی کە لە شیعرەکانی پێشوویدا ( با )ی ئیزرەوی لەجیاتیی خۆی نارد و بەسەر کوردستانا فڕاندی ، تا گەیاندیە ( شیوە سوور ) و ، دەم و چاوێکی لەوێ پێ شۆردی و ، لەوێشەوە بردی بۆ ( سەرچنار ) و ، ئەو هەموو تەعریفەی سەرچناری بۆ کرد ، نەیهێشت لەوێ داکەوێ . لەوێشەوە ناردی بۆ ( خاڵوخۆڵ ) . بەڵام مەبەستی سەردان لە ( خاڵوخۆڵ ) نەبو ، تەنها بۆئەوەی بە ڕێوەفا دەرنەچێ ناوێکی ئەوێشی هێنا .. سولەیمانیی ئەویست ، ئەو سولەیمانییەی یەرەوەرییەکانی لە تەختی دڵی هەڵکەنراوبوون و ، خۆشترین ساڵەکانی ژیانی تیا بردبووە سەر . ئەوەتە بۆی دێ بە پیا هەڵدانی سولەیمانیدا و یەکە یەکە یەرەوەرییەکانی خۆی بۆ باس ئەکا و ئەڵێ : ئەگەی بەر لەوەی بە سولەیمانیدا تێپەڕی،بچێتە دەشتی وەك عەنبەر بۆنخۆشی (خاڵوخۆڵ). سولەیمانی لەپێش هەر کوێیەکەوەیە .

نەبی (عم) و (کم) و (گم) و (من) : مەبە . هەتا (چن) و (ك) : حەتتا . (عم) و (ت) و (مز) : هەرتا .

(١٦) ڕیاض : جەمعی (ڕەوضە)یە هەم بەمەعنا باخچە و هەم بەمەعنا بەهەشت بەکاردێ . لێرەدا هەردو مەعناکە مەبەستە . موشکین : موشکاری ، بۆنخۆش وەك کەسێك موشکی لە باخەڵدا بێ . کاکۆل : قژی درێژی پشتەسەر . غیلمان : جەمعی ( غولام )ە واتە کوڕی تازە پێگەیشتوو .

واتە : مەبەستم لە سولەیمانی ئەو باخچەی بەهەشتەیە کە هەر لەوێ ئەتوانی بە ماوەیەکی کەم بۆنی خۆشی کاکۆلی کوڕە لاو و زولفی حۆرییە نازدارەکان هەڵبگری . دیارە سولەیمانی کە بۆ بە باخچەی بەهەشت ،

خاکی میزاجی عەبەر و ، داری زەواجی عوود
بەردی خەراجی گەوهەر و ، جۆباری عەینی نوور (١٧)

شامی هەمو نەهار و ، فوصوولی هەمو بەهار
تۆزی هەمو عەبیر و ، بوخاری هەمو بوخوور (١٨)

---

ئەبێ پڕیش بێ لە (فیلمان)ی کاکۆڵ درێژ و بۆن خۆش و ، لە (حۆر)ی زولف وەك موشك خۆش بەرامە .

تێدا بە (چن) و (من) : تێیدایە . موشکین (اح) : زەلیف .

(١٧) میزاج : تێکەڵ . سروشت . جۆبار : جۆگە .

واتە : ئەو سولەیمانییەی کە بێبایەخترین شتی بەبایەخە .. خاکی سروشتی عەنبەری بۆنخۆشی هەیە یا لەگەڵ عەنبەردا تێکەڵە و ، داری وەك داری بۆنخۆشی عوود بەزەواجە و ، گەوهەر لە خەرج و باجی بەردیا ئەدرێ و ، جۆگەی ئاوی وەك نوور وایە یا سەرچاوەی نوورە .

لە کۆکردنەوەی ( میزاج ) و ( زەواج ) و ( خەراج )دا هەرچەند جیناس نییە ، بەڵام وشەئاراییەکی جوان هەیە کە لە زۆر شوێنیتریشدا نالی شتیوای هەیە . لە کۆکردنەوەی ( خاك ) و (دار) و (بەرد) و ( عوود )یشدا تەناسوب هەیە . لە ( عەین )یشدا لەطافەت هەیە .

میزاجی (کم) و (گم) و (من) : زەواجی . (من) : خەراجی . عەنبەر و (چن) و (گم) و (ك) و (تۆ) : عەنبەرە . گەوهەر و ( چن ) و (گم) و (ك) و (لۆ) و (مب) : گەوهەرە .

(١٨) شام : ئێوارە . نەهار : ڕۆژ . فوصوول : وەرزەکانی ساڵ . بوخار : هەڵم .

لە کۆکردنەوەی ( شام ) و ( نەهار )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( نەهار ) و ( بەهار ) و ، ( بوخار ) و ( بوخوور )دا جیناسی لاحیق و، لە کۆکردنەوەی ( تۆز ) و ( بوخار ) و ، ( عەبیر ) و ( بوخوور )دا تەناسوب هەیە . سەرەڕای جۆرە طیباقێکیش کە لەنێوان ( تۆز ) و (عەبیر) و ، (بوخار)و (بوخوور)دا هەیە لەوڕووەوە کە (تۆز) و (بوخار) بێبایەخ و بەڵکو خراپن ، بەپێچەوانەی (عەبیر) و (بوخوور)ەوە .

شارێکە عەدل و گەرمە ، لە جێگێکە خۆش و نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور (١٩)

---

(١٩) واتە : شارێکی بەداد یاخود شارێکی لەخت و ، گەرمە و لە شوێنێکی خۆش و نەرماندا دروست کراوە . کە پێیشی ئەڵێن شاری شارەزوورە ، لەبەرئەوە نییە ڕاستە شاری شارەزوورە ، بەڵکو بۆ چاوەزار و لێ لادانی چاوی پیس ، وای پێ ئەڵێن . مەبەست لە خراپیی دانە پاڵی سولەیمانێ بۆ شارەزوور یا لەوەیە کە شارەزووری ئەو سەردەمە دواکەوتوو و پڕ لە دەرد و ئازار بووە و ئاو و هەوایەکی ناخۆشی بووە ، یا ئەوەیە کە وشەی ( شارەزوور ) مەعنای شاری جەور و ستەم ، یا شاری درۆ و بوختان، یا شاری زۆری کوڕی ئەژدەهاك ئەگەیەنێ ، وەك لە کتێبە مێژوییە کۆنەکاندا نوسراوە . عادەتێکی میللیش هەیە منداڵی خۆشەویست بۆ دەفعی چاوی پیس ناوی ناشیرینی لێ ئەنێن ، گوایە بۆیەش بە شارێکی جوان و خۆشەویستی وەك سولەیمانێ وتراوە شاری شارەزوور .

نالی ئەوەشی لەم شیعرەدا مەبەست بووە کە لە بەرابەری وشەی ( عەدل )دا کە هەم مەعنای دادپەروەریێ و هەم مەعنای ڕێك و تەختیش ئەگەیەنێ ، وشەی ( شارەزوور ) دانێ کە وەك مەعنای ( شاری درۆ و بوختان ) ئەگەیەنێ ، وەك وتمان ، مەعنای ( شاری شیر )یش ئەگەیەنێ ، چونکە ( زور ) لە عەرەبیدا بەمەعنا شیریش هاتووە .

نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە جیاوازییەکی زۆری لە نوسخە دەستنوس و چاپەکانی بەردەستمانا تیا هەیە . ئێمە پشتمان بە نوسخەی (چر) بەست . لەبەر بایەخی جیاوازییەکانیان و ، بۆ یارمەتیدانی لێکۆڵینەوەی پتری دواڕۆژیش ، تێکستی نوسخەکانی تریش لێرەدا ئەنوسینەوە .

(چن) و (اح) : شارێکە عەدل و گەرم لە جێگێکی خۆش و نەرم
( عم ) : شارێکە پڕ لە عەدل لە جێگای خۆش و نەرم
( كم ) : شارێکە پڕ لە عەدل و گەرمم ، جێیەکی خۆشێ و بەزم
( گم ) : شارێکی عەدل و گەرم لە جێگەیێکی خۆش و نەرم
( ت ) : شارێکی عەدل و گەرمە لە جێگێکی خۆش و نەرم
( ك ) : شارێکە عەدل و گەرمە لە جێگێکی خۆش و نەرم
( تو ) : شارێکە عەدل و گەرم و لە جێگەیێکە خۆش و نەرم
( مز ) : شارێکە عەدل و گەرم جێگەییە ئەوق و بەزم
( مب ) : شارێکە عەدل و گەرم و لە جێگێکی خۆش و نەرم

ئەهلێکیوای هەیە کە هەمو ئەهلی دانشن
هەم ناظیمی عوقودن و هەم ناظیری ئومور (٢٠)

سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەللەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور (٢١)

داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام) ؟ !
پیر و فوتادە تەن نەبووە (داری پیرمەسوور) ؟ ! (٢٢)

---

(٢٠) دانش : زانین . ناظم : هۆنەرەوە . عوقود : جەمعی ( عەقد )ە بەمەعنا ملوانکە .

واتە : سولەیمانی وەنەبێ تەنها شوێنەکەی خۆش بێ، دانیشتووانیشی مرۆی زیرەك و زانا و خاوەن بیرن . ئەدیب و شاعیریوایان تیایە شیعری جوانیوا ئەڵێن وەك ملوانکەی مرواری هۆنرابێتەوە و ، کاروباری دنیایش ژانەپەرژێنن و لێهاتوون .

لەنێوان ( ناظم ) و ( ناظیر )دا جیناسی لاحیق هەیە .

نیوەی دوەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( چن )دا بەمجۆرەیە :

ئەهلێکن ئەهلی دانش و نێکن بوزورگ و خورد

لە نوسخەی ( ك )یشدا بەمجۆرەیە :

ئەهلی کە ئەهلی هونەر ، نێکن بوزورگ و خورد

بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبێ ( ن )یێك لە ( هونەر )ەکە بەزیبێ و ( هونەرن ) بێ ، ئەگینا مەعناکەشی نایەت و سەنگەکەشی لەنگ ئەبێ .

(٢١) مەحەللە : گەڕەك . دەور : خول . پرسش : پرسیار .

لەم شیعرەوە نالی ( با ) ئەخاتە ناو شار بۆ زانینی هەواڵی شوێن بیرەوەرییەکانی و یەکبەیەکیان باس ئەکا بۆی . پێیئەڵێ سەرێ لە دار و بەردی گەڕەکەکانی شار بدا بزانێ کامیان لە جێی خۆیان ماون و کامیان تێکچوون و ، خوار و ژووری شار بگەڕێ و خولی پیا بخوا و لەم و لەو بپرسێ .

لە بەرد و لە داری (چـر) و (عـم) و (ت) و (مـز) : لـە دار و لـە بەردی . تەفتیش و (عـم) و (گـم) و (گـم) : تەفتیشی .

(٢٢) سەرشەقام : گەرەکێکە لە گەڕەکەکانی بەشی خوارووی سولەیمانی .
پردی سەرشەقام : پردێك بووە لە نزیکی مزگەوتی مامۆستا مەلا

ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەمداری ( شێخ عەباس ) ،
یا بێ‌لەواوو بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور ؟! (٢٣)

---

حوسەینی پیسکەندیەوە . لوتادە : ئوفتادە ، کەوتوو . لەن : لەش . پیر مەسوور : پیر مەنصوور ، پیاو چاکێك بووە شەخسەکەی لە داوێنی گەڕەکی مەلکەندیەوەیە،ئیستا بەو دەوروبەرە ئەڵێن گەڕەکی پیر مەسوور. شوێنەواری گۆڕستانی دەوروبەری شەخسەکە خەریکە کوێر ئەبێتەوە و هەموی کراوە بە خانوو ، بەڵام شەخسەکە خۆی ماوە و دارێکیشی بەسەرەوەیە ، دیوارێکی بە دەورا کراوە . وادیارە دارەکەی پیر مەسوور لە سەردەمی نالیدا دارێکی گەورە بووە و وەك هەموو شەخسەکانی کوردستان ئاڵا و پەڕۆیەکی زۆری پێوە بووە و بەهاران جێگای کۆبونەوەی کوڕ و کچی شۆخی شار بووە ، بۆیە نالی وا بەسۆزەوە ناوی ئەبا .

لەم دوو شوێنە ( سەرشەقام ) و ( پیر مەسوور ) کە نالی ناویان ئەهێنێ سەر و خواری شار بوون . مەبەستی نالیش ئەوەیە ( با ) هەموو لایەکی شاری بۆ پشکنێ .

پیر و (ال) و (مب) : پیری .

(٢٣) بە بەرگ و بار : پۆشتە و پەرداخ . عەلەمدار : داری ئاڵایێ و پەڕۆ پیا هەڵواسراو ، یا مرۆی ئاڵا هەڵگر . شێخ عەباس : شێخ عەباس ، یەکێك بووە لە سەیدەکانی بەرزنجە ، قەبرەکەی زیارەتگای خەڵکە ، کەوتووەتە داوێنی سولەیمانییەوە . جاران بەو دەور و پشتەیان ئەوت گەڕەکی جولەکەکان . ئیستا پێی‌ئەڵێن گەڕەکی شێخەباس . بێ‌نەوا : هەژار و ڕووت و قوت . شەخس : بنیادەم ، یاخود قەبری پیاوچاك . عور : عوریان ، ڕووت .

واتە : سەرێ لە شەخسەکەی شێخەباسیش بدە ، بزانە وەك جاران زیارەتگا و سەیرانگای خەڵکە و ، دارەکەی سەری کە ئەوەندەی ئاڵایێ پیا کرابو بوبو بە دار ئاڵایێ ، یا لەئوت ئاڵایێ هەڵگری شێخەباسە ، وەك جاران بە پارچە پەڕۆی ئاڵا و واڵا ڕازاوەتەوە ، یان هیچی پێوە نەماوە و وەك پیاوی ڕووت و قوتی لێ هاتووە ، یاخود بووە بە شەخسێکی بێ پەڕۆ و باڵە ! هەرچەند ( دار ) و ( شەخس ) جیان لە یەك ، بەڵام چونکە ( شەخس ) بە ( دار )دا لەناسرێتەوە ، نالی دارەکەی کردووە بە شەخس .

عەلەمداری (چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) : عەلەمدارە .

ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری ( کانی با ) ،
یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆڕش و نوشۆر ؟! (٢٤)

( سەیوان ) ئەطیری گوڵبەدی کەیوانە سەبز و صاف ،
یاخۆ بووە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبۆر ؟! (٢٥)

---

بەپێی ئەم نوسـخانە مەعنای شـیعرەکە ئازادەیـەك ئەگۆڕێ و ( شـێخ عەباس ) ئەبێ بە ( موبتـەدا ) و ( عەلەمدار ) کـە بەپێی نوسخەکانیلر موبتەدا بو ، ئەبێ بە خەبەری دوهـەم . عـەباس (کم) و (گم) و (ت) و ( مز ) : عەباس . گەڕاوە ( عم ) و (کم) و ( گم ) و (من) : کراوە .

(٢٤) کانی با : کـانی و سـەراوێکـە لەودیوی گردی سـەیوانەوە سـەیرانگای بەهارانی خەڵکی سـولەیمانییە . ئەزمەرگەی شەخـسێکیشـە ئـەڵێن چاك کردنەوەی باداریی گرتووەتە خۆی . شـۆڕش : هەرا و هوریا. نوشـۆر : ڕۆژی قیامەت کە هەمۆ زیندووان ئەمرن .

واتە : ئاخۆ ئیـسـتاش دەوری کانی با خەڵکی لیا کۆئەبنەوە و بە دەوری کانییەکەدا ئەڵقە ئەبەستن بۆ شایی و ڕابواردن و هەڵپەڕکێ ، یاخود ، خەڵکەکەی بڵاوەیان لێ کردووە و وەك ڕۆژی قیـامەلی لێ هـاتووە کە هەرچی گیان‌لەبەر هەیە ئەمرن ؟

بە جەمع و ( عم ) و ( ت ) : بە جەمعی : لەفریقەیی شۆڕش و (مم) و (کم) و (ت) و (مز) : تەفریقـەیی شـۆڕشـی . (کم) و (من) : تەفریقەوو شـۆڕشی . (ك) و (تۆ) و (مب) : لەفریقەرو شـۆڕش و .

(٢٥) سـەیوان : گردی سـەیوان : گردێکە لە بەری ڕۆژەلالی سـولەیمانییەوە ، ناوبانگی بە گۆڕستانەکەیەوە دەرچووە . وەك لە پارچە شیعرێکی (شێخ ڕەزا)وە دەرئەکەوێ لە سـەردەمی بابانەکاندا جێگای ڕابواردنی میرەکان بووە. لەم شـیعرەی نالی خۆیشیەوە دەرئەکەوێ لە سـەردەمی ئەویشـدا هێشتا تاك‌وتەرا گۆڕی تیابووە. یەکەم‌جار هەر بابانەکان خۆیان،بە یادی سـەردەمی زیندوێەلی ، کردیان بە گۆڕسـتان بۆ خۆیان و ئەوانەی لێیانەوە نزیك بۆن و پاشـان وردە وردە بۆ بە گۆڕسـتـانی خەڵکیش .. کەیوان : ئەسـتێرەی ( زوحەل ) کە بازنەیەکی زۆر ڕۆناکی بە دەورایـە و بووە بە نمونەی شتی زۆر ڕۆشـن . ئەنجوم : جەمعی ( نەجم )ە واتە ئەسـتێرە .
واتە : وەك چۆن گومەزی شـینی ئاسمان کە ئەستێرەی زوحەلی پێوە دیار بێ ، ئەسـتێرەی‌تری پێوە بێ‌نمونە ، ئاخۆ گردی سـەیوانیش هەروا

## ئێستەش مەکانی ئاسکەیە ( کانیی ئاسکان ) ،
## یاخۆ بووە بە مەلعەبەیی گورگ و لورەلور !! (٢٦)

سەوز و سافە وەك جاران و گۆڕی کەسی ــ دیارە لەبەر کەمیی گۆڕەکان ــ پێوە دیار نییە ، یاخود گۆڕی زۆری تیا هەڵکەنراوە و وەك ئاسمانی تاریکە شەوی لێ هاتووە کە ئەستێرەی زۆری پێوەبێ ؟

ڕەنگەبێ مەبەستی نالی لەم شوبهاندنە ئەوە بوبێ جاران سەیوان گۆڕی تەنها چەند کەسێکی ناوداری تیا بووە وەك ئەستێرەی زوحەل بە ئاسمانەوە ، بەلام پاشان بووە بە گۆڕستانێکی گشتی و خەلکێکی زۆری لە زانایان و شاعیر و ئەدیب و پیاوچاکان تیا نێژراوە کە هەریەکەیان ، بەش بە حالی خۆیان ، لە مەیدانی خۆیانا ئەستێرەیەك بوون .

سەبز و ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) : سەوز و .

(٢٦) مەکان : شوێن . کانی ئاسکان : کانی و سەراوێك بووە لە ڕۆژاوای سولەیمانییەوە ، ئێستا گەڕەکێکە . لە سەردەمی بابانەکاندا ، وەك لە شیعرێکی شێخ ڕەزاوە دەرلەکەوێ ، مەیدانی ڕەمبازێ و پێشبڕکەی سوارێ بووە . مەلعەبە : گاڵتەجاڕ .

دوور نییە مەبەست لە ئاسکان کچانی شۆخی چاو جوانی شار بوبێ کە وەختی خۆی چوبنە سەر ئەو کانی و ئاوە و ، هەر بەو بۆنەیەشەوە شوێنەکە وا ناو نرابێ و کوڕانیش ئەو ناوەیان کردبێ بە مەیدانی گەڕان و ڕابواردنی خۆیان و ، هەر لەوەشەوە بابانەکان کردبێتیان بە مەیدانی ڕەمبازێیان. دیارە لاوانی پێشبڕکەکەر کە ببینن کچانی شۆخ لە نزیکیانەوە لەسەر ئاوەکە دانیشتوون ، گەرمتر ئەبن و ئارەزوی سەرکەوتنیان زیاتر ئەبێ .. جا لەوڕووەوە نالییش ئەپرسێ : ئاخۆ کانی ئاسکان هەروەك جاران جێگای کچە وەك ئاسك چاو جوانەکانە کەئەهاتنە سەر ئاو ، یا جێگای پێشبڕکەکەرەکانە کە وەك ئاسك تیژ ئەڕۆیشتن ، یاخود نەخەیر ، بە ڕۆژ بووە بە گاڵتەجاڕی ئەوانەی مەگەر تەنها لاسایی شۆڕە سوارانی بابانیان پێ بکرێتەوە و ، بە شەویش چۆڵ و هۆڵە و سەگ و گورگ تیا ئەلورێنێ . دووریش نییە مەبەستی لە گورگ سوپای داگیرکەری عوسمانی و لە لورەلور دەنگی بە گوێ ناسازی ئەوان بێ ..

ئەم شیعرە تەنها لە نوسخەی ( چر ) و (عم) و (کم ) و (گم)دا هەیە .
ئاسکەیە : ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) : ئاسکە .

ئێستەش سوورو شکی عیشقی هەیە ( شیوی ئاودار ) ،
یاخۆ بووە بە سۆفیی وشکی لە حەق بە دوور ؟! (٢٧)

داخو دەرۆنی صافە ، گوزەی ماوە ( تانجەرۆ ) ،
یاخۆ لەسیری خاکە بە لێلی دەکا عوبوور ؟ ! (٢٨)

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو ( خانەقا ) بکە
ئایا زەبیعی ئاهووە ، یا چایری ستوور ؟! (٢٩)

---

(٢٧) شیوی ئاودار : شیوێکە لە ڕۆژاوای باکووری سولەیمانییەوە بەلای سەرچناردا .

واتە : شیوی ( ئاودار ) وەك جاران فرمێسکی دڵداریی لە چاو ئەڕژێ ، واتە ئاوی پیا ئەڕوا ، یان وشکی کردووە وەك چاوی وشکە سۆفییە خوا نەناسەکان کە دڵۆپێ فرمێسکیان لە ترسی خوا لە چاو ناڕوا ؟ یاخود وەك وشکی و بێدڵیی سۆفییە لە ڕاستی دوورەکان وشکە ؟ بەگوێرەی مەعنای دوهەم ، شوبهاندنەکە شوبهاندنی مەحسوسە بە مەعقوڵ کە یەکێکە لە شێوە ناسکەکانی شوبهاندن .

عیشقی ( چر ) : ئەشکی :

(٢٨) تانجەرۆ : چەمێکە لە سەرچاوەکانی سەرچنارەوە پەیدا ئەبێ و ، لە داوێنی سولەیمانییەوە بە بناری چیای گلەزمردەدا بەرەو شارەزوور مل ئەنێ و لە ( دواوان )دا ئەڕژێتە سیروانەوە .

واتە : ئاخۆ تانجەرۆ کەسی هەیە گوێی بداتێ و هەمو ساڵێ جۆماڵی بکا و ، بە هێز و گوڕەکەی جارانیەوە ئەڕوا ، یا پڕ بووەتەوە و قوڕ و لیتە بەری گرتووە و لیخن بووە ؟

گوزەی ( مم ) : گوڕی .

(٢٩) خانەقا : خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندی ، لە گەڕەکی (دەرگەزێن) کە مەحموود پاشای بابان دروستی کردووە . زەبیع : بەهار . گژ و گیای بەهار . ئاهو : ئاسك : چایر : بەهاربەند . ستوور : چوارپێ .

نالی لەم پارچە شیعرە پڕ سۆزەیدا ، تا دێ میکنالیزی هەستی زیاتر بە شوێنێکی تایبەتییەوە گیر ئەبێ . وەك دیمان ( شارەزوور ) و ( شیوە سوور ) و ( سەرچنار ) و ئەنجا خوار و ژووری سولەیمانی و پاشان سەیرانگاکانی دەور و پشتی و ڕۆبارەکانی ، هیچ کامی لە هەستی بیر و

سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە وەك خەططی ڕۆیی یار
یا پۆشی وشك و زۆرە وەكو ڕیشی ( كاكە سۆر ) ؟ (٣٠)

---

یادی خۆی بێبەش نەكرد . بەڵام بنیادەم هەرچەند بازنەی خۆشەویستییشی بەدەرەتان و گوشاد بێ و كەسان و جێ و شوێنێكی زۆر بگرێتەوە ، شتێك یا كەسێكی هەیە لە هەر شتێك یا لە هەر كەسێكی زیاتر هەڵاوێری و جێگای لای سەرۆی لە دڵیا بۆ ئەو تەرخان كردبێ . ئەگەر ئەو جێگایە بەشی‌بەحاڵی نالی لە جیهانا كوردستان و لە كوردستانا سولەیمانی بوبێ ، كە وایشە ، لە سولەیمانییشا خانەقای مەولانایە و وەك پاشتر دەرئەكەوێ ، لە خانەقایشدا بەتایبەتی ژوورەكەی خۆیەتی . بەمجۆرە وا ئەبینین نالی ئیتر قورسایی سۆز و پرسیار ئەخاتە سەر خانەقا و دوایی پرسیاری بە هەواڵ پرسینی ژوورەكەی خۆی دێنێ . لە خۆڕایی نییە لەم قەسیدە ٤٣ بەیتییەدا ١١ بەیتی بۆ خانەقا تەرخان كردووە و لە هەمو دیمەنێكی باری ئاوەدانی و كۆمەڵایەتی و سروشتی و خوێندەواریی ناو خانەقای پرسیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا كە خانەقا لە بناخەدا شوێنی سۆفیگەرییە و نالییش هەرگیز دانۆلەی لەگەڵ سۆفیگەریدا پێكەوە نەكولاوە .

نالی لە سەرەتای پرسیاریا لە وەزعی خانەقا ، بە بای خۆش گوزەر ئەڵێ كە یەكەم جار سەرت كرد بە دەرگای‌حەوشی خانەقادا چیمەنەكەت ئەكەوێتە بەرچاو . دەسا جوان جوان لێی ورد ببەرەوە ، بزانە وەك جاران شوێنی گەشت و ڕابواردنی ئاسكە كە مایەی جوانییە بۆ چیمەن، یاخود هێستری چوار پەل قەویی لێ‌بەردراوە تیا ئەلەوەڕێن . . مەبەستی لەوەیە مەلا و خوێندەوار و ڕۆشنبیر و خواناسی ڕاستی تیایە ، یان پڕە لە كەسانی نەفام و بێ‌نەگەیشتو و لە ڕاستی دوور ، لەوانەی خوا پێیان ئەفەرموێت « اولئك كالانعام ، بل هم اضل » كە داگیركەرانی ئێمەن .
نار (اح) : نێو .

(٣٠) زۆر : زبر . كاكە سۆر : پیاوێكی پیری بەساڵاچو بووە لەو سەردەمەدا لە سولەیمانی . خۆی سوور بووە و ئەڵێن ناوی عەولا بووە ، ڕیشێكی ئێزێ درێژی هەبووە ، ڕیشی پیاوی سوور زەردكارە ، با سپییش بێ ئەو بەڵكەیە تیا هەر ئەمێنێتەوە* .

---

* علاءالدین سجادی ، دوو چامەكەی نالی و سالم ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، چاپخانەی مەعاریف ، ل ٥٤ .

قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین ،
یا وەك سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهۆر ؟ (۳۱)

---

واتە : سەرنجی گوڵەکانی حەوشی خانەقا بدە بزانە گیای سەوزی لەڕیان بەدەورایە وەك گوڵی ڕوومەتی یار و مووی زوڵفی بەدەوریا ، یاخود هەمووی هەر پۆشی وشکی زەرد هەڵکەڕاوە وەك ڕیشە زەرد هەڵکەڕاوەکەی کاکە سوور ؟

ڕیشی لێنەچین ( کاکە سوور ) ئیشارەت بێ بە سەربازی عوسمانی کە دەم و چاویان سوور و موویان زەرد بووە .

سەبزە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : سەوزە . لەڕە (مز) : پڕە . خەططی ( من ) : زوڵفی . زۆرە ( عم ) : زەردە .

(۳۱) قەلب : دڵ . دەروون . ناوەوە . مونەووەر : نوورانی ، ڕووناك . سەقەر : دۆزەخ . لەندەهۆر : چوارشانە و کەڵەگەت ، مەبەست لە کەسانی‌وایە لەوەندە زەبەللاح بن خەڵك لێیان بترسن .

واتە : ئاخۆ ناوەوەی خانەقا کەسانی خۆشەویستی نازداری تیایە کە ئەبن بە مایەی ڕووناکی بۆی ، وەك چۆن دڵی ئادەمیزاد بە یادی خوا ڕووناك ئەبێتەوە ، یاخود پڕە لە کەسانی بەدکار و بەدنەفسال و سیاچارە ، وەك دۆزەخ کە پڕە لە گوناهبار و پیاو خراپی‌وا ڕێگای چاکەیان لە خەڵك ئەگرت .

لە نوسخەکەی ( عم )دا ئەم شیعرە لەپاش شیعری ژمارە (۲۷)ەوەیە، بەڵام دیارە ئەوە هەڵەیە . سەرەڕای ئەوە کە لە هەموو نوسخەکانی‌ترا بەم‌جۆرەیە کە ئێمە دامان‌ناوە ، هەر ئەمەش لەگەڵ ڕێچکەی شیعرەکانا ئەگونجێ، چونکە ئەم شیعرە بۆ ئەوە دەس‌نادا باسی (شیوی ئاوداری)بکا و، لەگەڵ باسی ( خانەقا )دا جۆرە .

لە وشەی ( قەلب ) و ( مونەووەر )دا لەطافەت هەیە ، چونکە باس باسی خانەقایە و دڵی نوورانییش زیاتر پەیوەندی بە خانەقاوە هەیە . هەروا لە بەراورد کردنیشیا لەگەڵ (سەقەر) وردەکارییەکی جوان هەیە، چونکە خانەقا کە جێی خواناسییە ئەبێ وەك بەهەشت بێ و پڕ بێ لە حووری جوان ، نەك وەك دۆزەخ کەسانی گوناهبار و سیا چارە و خوێن تاڵی تیا بێ .

نازەنین ( « بەراوێزی » چر ) و (کم) و (گم) و (لد) و (عب) و (من) : نازدار .

دەس‌بەندیانە دێن و دەچن سەرو و ئارەوەن ،
یا حەلقەیانە سۆفیی مل‌خوار و مەندەبۆر ؟ (٣٢)

مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە :
ئەوراقیان موقەددیمەیی شینە یا نە سۆر ؟ (٣٣)

---

(٣٢) دەستبەند : دەستی یەك گرتن . ئارەوەن : درەختێکی بەرز و گەورەی لق و پۆپ چڕی گەڵا وردە ، لە حەوشی زۆر لە تەکیە و خانەقاکانا هەیە بۆ سێبەر، بەری نییە . حەلقە : کۆبونەوەی سۆفییەکان بۆ یادی خوا و پیرانی تەریقەت و بیرکردنەوە لـە مەرگ و قـەبر و قیامـەت ، لەگەڵ بەکارهێنانی وردە بەردی گـوێ چەمدا لەجیاتی تەزبێح . مەندەبۆر : بەدبەخت .

وانە : ئاخۆ سەرو و ئارەوەنەکانی حەوشی خانەقا لـە خۆشبدان و وەك لاوانی هەڵپەڕکێ‌کەر دەستیان گرتووە دێن و دەچن و لەسـەر ئاوازی شنە با سەما ئەکەن ، یاخود وەك سۆفییە کوڵۆڵەکان پەیوەندیان بە خۆشـیی ژیانـەوە نەمـاوە ، سـەریان کز کردووە و ملیـان خوار کردووەتەوە و بێ‌دەنگ و سەنگن ؟

مەندەبۆر ( مز ) و ( من ) : مەندەموور . ئەمیش هەر دەسکاریێ کراوی مەندەبورە .

(٣٣) ئەوراق : گەڵا . موقەددیمە . لای پێشەوە . قەراخ . سەرەتا .

وانە : لایەك بـە لای درەختە سـەوزەکانی لای حوجرەی فەقێکاندا بکەرەوە بزانە قەراخی گەڵاکانیان شینە یا سۆر هەڵگەڕاوە . مەبەستی ئەوەیە بزانێ درەختەکان خەرمەڵیان هەیە و ئاویان ئەدرێ یانە ، چونکە ئەگەر قەراخی گەڵاکانیان شین بێ، ئەوە وانە گەش و پاراون و نیشانەی خزمەت کرانیانە و ، ئەگەر سـۆر هەڵگەڕابێ ، ئەوە سـەرەتای زەرد بونیانە و وانەگەیەنێ کەس گوێیان نادانێ .

ئەشکونجێ مەبەستی لە درەختەکان مەلا و فەقێکانی مەدرەسە بێ و، مەبەستیشی لە ئەوراق زواڵەیان بێ چونکە وشکێ و لەڕیی درەخت ، بەر لە هەرچی بە ڕەنگـی گەڵایدا دیـارە و ، مەبەستیشی لـە شـین خەنەباریێ و لە سۆر شایێ و خۆشی بێ . بەم‌پێیـە مەعنای شـین و سۆر لە هەرکام لە دوو مـەعناکەدا پێچەوانـەی ئەوی‌تریانـە و ئەمەش نیشانەی دەسەڵاتی شیعریی نالییە کە لە یەك شیعردا دوو وشە هەر یەکی بە دوو مەعنای دژی یەکتر بەکاردێنێ .

حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ ،
لێلاوی دائەهاتووە وەك سەیلی ( شیوەسوور ) ؟ (٣٤)

ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە ،
یاریی تیایە ، یا بووەتە مەعرەضی نوفوور ؟ (٣٥)

---

ئەوانەی شارەزای کتێبە دەستنووسەکانی جارانی حوجرەکان بن ، ئەزانن وشەی (مقدمە) و سەرباسەکان لە زۆر لەو کتێبانەدا بە مەرەکەبی سوور یا شین ئەنوسران . هەرچەند پەیوەندێك لەنێوان ئەم بە شین و سوور نوسینە و خۆشی و ناخۆشیدا نییە ، نالی هەر ویستوویەتی ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە بکا . لە کۆکردنەوەی ( مەدرەسە ) و (ئەوراق) و ( موئەددیمە )شدا گەیاندنی جۆرە لەطانەتێکی مەبەست بووە .

بکە لە (چر) و (عم) و (مز) و (عب) و (من) : بکە بە . سەبزە (من) : سەوزە . (ك) و (کو) : دەکەی بە .

(٣٤) نائیب : جێنشین . سەیل : لافاو . شیوە سوور : یا شیوە سوورەکەیە کە پێشان باسمان کرد ، یا هەر شیوێکی کاتی لافاو هاتنە کە ئوڕاوی سووری پیا سەربکا .

واتە : حەوزە پڕەکەی خانەقا جێنشینی چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی منە کە پڕن لە فرمێسکی ساف و ڕۆشن . جا ئاخۆ ئەویش ئاوی پاك و ڕۆشنی تیایە ، یا کەس گوێی نادالێ و وەك ئاوی شیوە سوور قوڕاو و لێلی تیایە ؟

لێلاوی (مز) : لێشاوی .

(٣٥) کەنار : قەراغ . کەوشەك . باز : یاخود سێ باز : یارییەکە جاران فەقێ ، بەهاران و پایزان ، بە ڕۆژانی سێشەممە و جومعەدا ئەیانکرد . یارییەکە بەمجۆرەیە : کۆمەڵە هەرزەکارێك لە شوێنێکی نەرماندا سەرە ئەبەستن و ، شوێنی یەکەم پێدانان دیاری ئەکەن و ، هەرکامیان بە گوڕ دێن ، لەو شوێن پێیەوە بەولا ، سێ باری بەگوڕم ئەبەن و ، بەوجۆرە بەردەوام ئەبن تا دەرئەکەوێ کێ لە هەموان زۆرتری بڕیوە و کێ لە هەموان کەمتری بڕیوە . ئەمەیان کە لە هەموان کەمتری بڕیوە ، دائەبێ و پشت دائەکا و ، ئەوانەی کە زۆریان بڕیوە بازی بەسەرا ئەبەن . پێشەنگەکەیان کە لە هەمویان زۆرتری بڕیوە و پێی ئەڵێن ئیمام ، لە هەر بازێکی تازەیدا ، بکاتە هەر کوێ ، دابووەکە ئەگوێزنەوە بۆ

چاوێ بخە لەسەبزەوو سێرابی دائیرە
جێ جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمە یا لە زۆر ؟ (٣٦)

---

ئەوێ ، تا یەکێکیتریان توانای نامێنێ بە بازێك بکاتە لای دابووەکە و ، خۆی دائەنێ و ، دابووەکە ئەبێ بە ئیمام . کەوشەك : یاریەکیترە یەك بازی تیا ئەبرێ و ، لەدوا شوێنی بازدا کەوشێك دائەنرێ . لەمیشا کێ لە هەموان کورتتری بڕێ دائەنێ و ، کێ لە هەمـوان زۆرتری بڕێ ، ئەبێ بە ئیمام و بەر لە هەموان بازی بەسەرا ئەبا . لەگەڵ هەر بازێکی ئیمامدا دابووەکە بە ئەندازەی کەوشێك لەچێتە پێشەوە . بازدەر نابێ قاچی لە کەوشەکە بکەوێ . ئەگەر لێیکەوت خۆی دائەنێ . بازدانی کەوشەك لە هێی سێباز گرانترە ، چونکە بە سینگە و باز ئەبیا و ، ئەبێ یەکسەر لەو شوێنەوە کە بۆ سەرەتای باز دیاری کراوە ، خۆی فڕێ بدا و ، تەنها دەستی لە پشتی دابووەکە بکەوێ و خۆی بەسەریا فڕێ بداتە ئەودیویەوە .

واتە : ئاخۆ ئێستاش ئەراخی حەوشەکەی خانەقا وەك جاران جێگای سێباز و کەوشەکی فەقێیانە و یاریی تیا ئەکرێ ، یا بووە بە پێشانگای دڵ لێ بێزران و حەز لێ نەکران و ، کەس ڕوی لێ ناکا ! بەم شیعرەدا دەرئەکەوێ ئەو سەردەمە حەوشی خانەقا ئەوەندە گەورە بووە ، جێی تایبەتیی سێباز و کەوشەکی تیا بووە و ، لەوانەشە مەبەست ئەوە بووبێ فەقێکان هەرکاتێ ئارەزوی یاریان بۆ ، پێویست نەکا بچن بۆ دەرەوەی شار و هەر لە حەوشی خانەقادا ( وەرزش )ی خۆیان بکەن .
لە کۆکردنەوەی (حەوشەکە) و (کەوشەکە)دا جیناسی ناقیص هەیە .
باز و (کم) : بازی .
ئەم شیعرە و شیعری پێشەوەی لە نوسخەی ( من )دا بەر و دوان .

(٣٦) سێراب : تێراو . بەو چیمەنە ئەڵێن کە ئـاوی زۆری ئەدرێ بۆئەوەی هەمیشە گەش و تێراو بێ . دائیرە : بازنە ، دەوروبەر . جیلوەگـاه : جێگای دەرکەوتن و ورشەدانەوە . زۆر : زبر .
واتە : تەماشایەکی سەوزە و چیمەنەکەی دەور و پشتی حوجرەی فەقێکانی خانەقا بکە ، بزانە ئێستاش نەرم و سەوز و پاراوە و ئاو بزانی تیا کۆئەبنەوە ، یاخود کەس گوێی نادائێ و وشك بووە و بووە بە پوشی زبر .
ئەم شیعرە و شیعری پێشەوەی لە نوسخەی (صب)دا بەر و دوان .
لە کۆکردنەوەی (چاوێ) و (چاوەکەم)دا لەطائیفت و ، لە کۆکردنەوەی (نەرم) و (زۆر)دا طیباق هەیە .

توخوا فەضایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش
مەحشەر میثالە یا بووەتە ( چۆڵی سەلم و تۆر ) ؟ (٣٧)

---

لە سەبزەوو (عم) : بە سەوزەوو . (کم) و (گم) و (کۆ) : لە سەوزەوو . ( ك ) و (ت) : لە سەبزەیی . ( مز ) : بە سەبزەوو . سێرابی ( عم ) : سێراوی . (کم) : سەیرابی . دائیرە (چر) : دالیرەی .

(٣٧) فەضا : تەختان . دەشتی فەقێکان : تەختانێك بووە لە سەرکارێز لە بەر گردی سەیواندا و تۆزێ بە لای گردی حاجی ئەولاوە ، کەوتووەتە ژوورەلای شاری سولەیمانییەوە ، پردێکی بچکۆلەی دار هەبوو لە شیوەکەی سەرقەبران ئەپەڕیتەوە ئەچوویتە ناو دەشتی فەقێیانەوە . ئێستە شوێنەکەی هەموو بووە بە خانوو . تا سالانی ١٩٤٠ ئەو ناوە و ئەو ناوە هەبوو ، پاش ئەوە وردە وردە خانوو شوێنەکەی داگیر کرد * . فەقێ : کەسانێك بوون لە تەمەنی ١٠ ـ ١٢ سالانەوە حوجرەی تایبەتییان لە مزگەوتەکاندا هەبوو ، زانستەکانی ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی و هەندێ بابەتی فەلسەفە و مانطیك و ئاسمان شوناسییشیان ئەخوێند . تا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیش بناغەی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستانا ئەوان بوون . کە لە خوێندن ئەبوونەوە ، ئەبوون بە مەلا . لەناو ئەم مەلایانەدا زانای گەورە گەورە هەلکەوتووە . دەوری گەورەی پەیدا بوون و گەشە پێدان و پاراستنی ئەدەبی کورد ئەم مەلا و فەقێیانە دیویانە . ئێستاش لە زۆر لای کوردستانا فەقێیەتی ماوە ، بەلام زۆر تۆی کردۆتە کزێ . سەلم و تۆر : دوو کوڕی فەرەیدوونی پادشای پێشدادی بوون ، لەنێوانی خۆیانا بووە بە شەڕیان و لەو شوێنەدا کە شەڕەکەیان تیا کردووە کوشتاریکی گەورەیان لە یەکتری کردووە و قەلاچۆیان خستووەتە یەك . ئێستا بە هەر شوێنێ وێران و چۆڵ بێ ، ئەڵێن بووە بە چۆڵی سەلم و تۆر .

واتە : ئاخۆ ئێستاش دەشتی فەقێکان لەبەر زۆریی فەقێی یاریکەر و خەلکی تەماشاکەر وەك دەشتی مەحشەر وایە و پڕە لە مەشامات ، یاخود نە یاریکەری تیا ماوە و نە تەماشاکەر و وەك چۆڵی جێ شەڕی سەلم و تۆری لێهاتووە ؟ .

توخوا (عم) و (گم) : داخۆ . (ت) و (ك) : توخودا . فەقێکان (ت) و (ك) و (کۆ) و (مز) : فەقێیان . ئەمێستەکەش (عم) و (مز) : ئێستەکەیش .

---

* علاءالدین سجادی ، دوو جامەکەی نالی و سالم ، بەغدا ، ١٩٧٣ چاپخانەی مەعاریف ، ل ٦٤ .

واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چیی ماوە ، چیی نەماوە ، لە هەیوان و تاق و زۆر ؟ (٣٨)

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە ، یا نە خۆ
هەر غاری یارە ، یا بووەتە غاری مار و مۆر ؟ (٣٩)

---

(٣٨) واتە : بۆنی خۆشی سەلام و هەواڵپرسیم لەگەڵ خۆت هەڵگرە و بیبە و بیگەیەنە بە حوجرەکەم کە تیادا ئەژیام و ، بزانە هەیوان و تاق و ژووری چیی ماوە و چیی نەماوە !

وەك لە سۆزی شیعرەکانی پێشەوەی نالییەوە بۆ خانەقا ، دەرکەوت کەوا لەوێ خوێندوویە و زەنگێن هەر لەوێیش خوێندنی تەواو کردبێ ، لەم شیعرە و ( لە تێکڕای شیعرەکانیشەوە ) دەرئەکەوێ کە پاش بوون بە مەلایش خانەقای بەجێنەهێشتووە و نەچووەتە هیچ کوێیەکی تر و زێ و شوێنێکی دیاریشی لەوێ بووە،بەڵکو تا سولەیمانییشی بەجێهێشتووە هەر لەوێ بووە و ، لەوانەیە ئەوەش بکەیەنن کە ژنی نەهێناوە.بەڵکەمان بۆ ئەم بۆچوونەمان ئەوەیە لەتێ تا فەتێ بێ ژووری تایبەتیی نییە و لەگەڵ فەقێکانیتردا پێکەوە ئەژین . نالییش هەواڵی ژوور و هەیوانی ژوور و تاقەکەی ئەپرسێ . کەواتە دیارە ئەم ژوورە ئەو ژوورە نییە لەگەڵ فەقێکانا تیا ژیاوە . هەروەها لەتێ کە بۆ بە مەلا ئەو مزگەوتە بەجێدێڵێ کە تیا خوێندووە و ئەچێتە شوێنێکیکە و ژیانێکی نوێ دەست پێدەکا ، کەچی نالی سۆزێکی تەنانەت کەمیشی بۆ هەوارگەی نوێی پاش خانەقای ، ئەگەر بوبێ ، دەرنەبڕیوە . دووریشە بڵێین پاش بوون بە مەلا بووە بە مەلای خانەقا ، چونکە ئەو پرسیارەمان لێ ڕاست ئەبێتەوە : ئاخۆ مەلاکەی خانەقا چیی لێ هات ؟ هەروەها ئەگەر نالی پاش بوون بە مەلا و بەر لە چوونە دەرەوەی لە کوردستان ، خانەقای بەجێهێشتبایە ، بەو هەموو سۆزەوە باسی لێ نەئەکرد ، لەو هەموو سۆزە نیشانەی زامی نوێی لەبیرنەچووەیە .

هەیوان و (اح) : ئەیوان و .

(٣٩) غار : ئەشکەوت . ئەغیار : بێگانە . مۆر : مێروولە .

واتە : حوجرەکەم کە ئەوسا بۆ من و هاوڕێکانم وەك ئەشکەوتەکەی ( ئەور ) بو بۆ پێغەمبەر (د.خ) و ئەبوبەکری هاوڕێی ، ئێستا پڕ بووە لە بێگانە و کەسانی نەناس ، یا هەروەك جاران دۆست و برادەری

زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ !
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوطوور !؟ (٤٠)

---

تیایە ، یاخود کەسی تیا نییە ، چۆڵ و هۆڵە و مەگەر مار و مێرۆڵەی تیابێ !

نالی لەم پرسیارەیدا ئیقتیباسی لە بەسەرهاتی کۆچکردنی پێغەمبەرەوە کردووە لە مەککەوە بۆ مەدینە ، کە چۆن لەگەڵ ئەبوبەکردا ماوەیەك خۆیان لە ئەشکەوتی ( ثەور )دا شاردەوە تا کافرەکان دوور کەوتنەوە . هەروەها وشەی ( غاری مار )یش ئیشارەتە بەوە کە مارێك لەو ئەشکەوتی ئەورەدا پەنجەی ئەبوبەکری گەست .

لەنێوان (غار) و (یار) و (مار) و « (مار) و (مۆر)دا جیناسی لاحیق و « لەنێوان (ئەغیار) و (یار)دا طیباق هەیە . لە کۆکردنەوەی (غار) و (مار) و (یار)یشدا تەناسوب هەیە .

نسخە (ك) : داخۆ .

(٤٠) زار : لاواز : دەم . هیلال : مانگی یەك شەوە . نەحیف : لەڕ . خەیاڵ : خەیاڵ کردنەوە . سێبەر . خوطوور : تێپەڕین .

واتە : لاواز بووم وەك مانگی یەك شەوە و ، وەك خەیاڵ یا وەك سێبەر لەڕ بووم . بشێ بەم لەڕ و لاوازییەشەوە کە نابم بە باری مەینەت بۆ سەرشانی کەس ، جێگەم لە دەمی کەسێکا نەبێتەوە ناوێکم بێنێ ، یا لە دڵی کەسێکا بیرێکم لێ بکاتەوە . ئەم بەیتەی نالی لە زنجیرەی پێشەوەی شابەیتەکانی ئەم قەسیدەیەوەیەتی . شوبهاندنێکی بەرز و باڵای تیادا بەکارهێناوە . خۆی لەلایەکەوە تیا شوبهاندووە بە مانگی یەکشەوە لە زەردێ و بارێکی و چەماوەییدا . لە لایەکی‌کەشەوە خۆی تیا شوبهاندووە بە خەیاڵ واتە ماددەی نەماوە و ، لەم شوبهاندنەوە داوا ئەکا کە باسی بکەن و بیری لێ بکەنەوە ، چونکە باس کردن و بیر لێ کردنەوەی لەڕ و لاوازێکی وەك ئەو هیچی لێناچێ نە بۆ دەم و نە بۆ دڵ . ■

هیلال (چر) و (ك) : خیلال . خیلال جەمعی خەللە ، گەلێ مەعنای هەیە . ئەوەیان بۆ ئێرە: دەس بدا بۆ شتێکی تایبەتییە بۆ ددانی پێ خاوێن ئەکەنەوە . ( لۆ ) و ( عب ) : ظیلال . ظیلال جەمعی ظیللە بەمەعنا سێبەر . زار ( لۆ ) : زار .

■ کاتێ بە کاکە حەمە و کاك فاتیحم سەلماند کە خیلال راستەو هیلال هەڵەیە ئەم لاپەڕە چاپ کرابو بەڵام لەسەرەتاکەدا راست کراوەتەوە بخیلال بە شتێ دەکوترێ کە ددانی پێ دا ژەنەوە و لە زار دەنرێ بەم جۆرە شیعرەکە هەم لە باری شکل و هەم لە باری محتواوە جوانتر دەبێ .

لەم شەرحی دەردی غوربەتە ، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور ! (٤١)

ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە ،
یا مەصلەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی صوور ؟ (٤٢)

حالی بکە بە خوفیە : کە ئەی یاری سەنگ دڵ
« نالی » لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور ... (٤٣)

---

(٤١) هەرچی ژان و ناڵانەوە و سوێی نالی هەیە لەم قەسیدەیەدا ، هەمووی گوشێنراوەتە پیاڵەی ئەم بەیتەوە . وا نەبێ ، زۆر زەحمەتە هونەرمەند بیر لەوە بکاتەوە دڵی ببێ بە ئاو و سەرکەوێ ، کە ئاو سەرناکەوێ ، و بە چاویا تێپەڕێ و بێتەوە بۆ نیشتمان ..

غوربەتە (کم) و (گم) و (من) : میحنەتە . هیجرەتە (گم) و (من) : غوربەتە . (ت) : دوور وەطەن . (مز) : حەسرەتە . ڕەنگە (کم) و (گم) و (من) : وەختە . (ت) و (مز) : وەقتە .

چاوا : لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا ، نوسخەکەی ( من ) نەبێ ، (چاوما) بو . ئێمە ئەممان لا پەسەندتر بو .

(٤٢) ڕوخصەت : ڕێگادان . تەوەققوف : وەستان . چاوەڕوانی . یەوم : ڕۆژ . نەفخ : فووکردن . صوور : شاخێکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئیسرافیلی فریشتەی مراندن و ژیاندنەوە دوو جار فووی پیا ئەکا . بە فووی یەکەم هەموو زیندووان ئەمرێنێ و ، بە فووی دووەمیش هەموو مردووان زیندوو ئەکاتەوە .

واتە : ئاخۆ هەلی ئەوە هەیە لەم ماوەیەدا بێمەوە بۆ سولەیمانی ، یا باشتر وایە لێیڕاوەستین تا ڕۆژی قیامەت کە هەموو زیندەوەر لە سارای مەحشەردا خڕ ئەبنەوە و ئێمەش لەوێ بە دیداری یەکتر شاد ئەبین و خوایش تۆڵەی لەیەککردنمان لە بەدکار ئەستێنێ .

مەقامی ڕوخصەتە : (مم) و (گم) : مەجالی هاتنە .

(٤٣) خوفیە : نهێنی . سەنگدڵ : دڵڕەق وەک بەرد .

واتە : بەدزیشەوە بە یاری دڵڕەق بڵێ : لە ئارەزووی دیداری تۆوەیە نالی لە دوورەوە سەلام ئەنێرێ .

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

ڕەنگبێ مەبەستی نالی لەم بە نهێنی هەواڵ و سەلام بۆ یار ناردنە ئەوەبێ بیەوێ بڵێ ئەم پارچە شیعرەم بۆ مەسەلەیەکی گەلی گشتی تەرخان کردووە کە سۆزی نیشتمانە و ، نامەوێ کاروباری تایبەتیی تێکەڵ بێ .. خۆ ناشکرێ هەر بە یەکجاری یارەکەی پشت گوێ بخا ، بۆیە را بە ( با ) ئەڵێ بە دزییەوە وای پێ بڵێ ..

یاری (لۆ) و (عب) و (اح) و ( « پەراوێزی » من ) : داری .

★ ★ ★

لە خوێندنەوەی ئەم نامەی نالییەوە بۆ سالم ،بەئاشکرا بۆمان دەرئەکەوێ کەوا مەبەستی نالی تەنیا هەواڵپرسینێکی ئادەتی و دەربڕینی سۆزی نامۆیەك نییە بۆ وڵاتەکەی . شیعرەکەی شیعرێکی سیاسییە و ، لەبەرئەوەش کە بۆ وڵاتێکی ژێردەستەی ناردووە ، شێوەی (ڕەمز)ی تیا بەکارهێناوە . نالی لە هەر شیعرێکیا دوو پرسیار ئەکا.لە پرسیارێکیانا باری ڕابوردوو دێنێتەوە پێش چاو و ئەپرسێ ئاخۆ وەك خۆی ماوە و،لە پرسیاری دووهەمیشدا بەرامبەرەکەی دائەنێ ، بەڵام بە لای خراپترا ، نەك بەرەو باشتر بوون ، چونکە ئەزانێ (باشتر) لە داگیرکەر چاوەڕوانی ناکرێ . ڕابوردوو لەم شیعرانەدا سەردەمی حوکمی (بەبە) و ، کاتی پرسیاریش سەردەمی ڕۆمییەکانە . کەواتە نالی لایەنگریی خۆی بۆ سەردەمی بابانەکان دەرئەبڕێ و ، ڕێ لێ چوونی خراپتربوونی باری ژیانیش بۆ سەردەمی ڕۆمییەکان دائەنێ . ئەوەندەی کە بیری خۆشیی سەردەمی پێشوو ئەکاتەوە ، ڕێ لێ چوونی ناخۆشییەکی گەلێ زیاتریش بۆ سەردەمی ڕۆمییەکان ئەخاتە پێش چاو . تەنانەت پرسیار لە گۆڕانی گەلێ شتی وا ئەکا کە زۆر دوورە بە گۆڕانی ڕژێمی سیاسی بگۆڕێن .

وەك هەر ڕۆشنبیرێکی وریا و دووربین ، هەست بە پەیوەندی نێوان باری دەروونیی خەڵك و ڕژێمی سیاسی ئەکا. لەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە ئەپرسێ ئاخۆ خەڵك زەوقەکەی جارانیان ماوە و ، ڕابواردن و گەڕان و سەیرانەکەی ئەوسایان هەر ئەکەن یا نە ؟ فەقێ ئەچن بۆ یاریکردن و ، ڕمبازێ و غارغارێنی لاوان بەردەوامە ، یا لە سایەی ڕژێمی ڕەشی ڕۆمییەکانەوە ئەمیش شتێ سڕاوەتەوە ؟! شێوەی ڕەمز بەکارهێنانەکەشی ، وەك هۆیەك بۆ توانای دەربڕینی مەبەست لەگەڵ خۆ دەرباز کردنیشا لە چاوی ڕەق و گوێی قیتی خەلیفە و جلخوارەکان، بە سەرەتایەکی زیرەکانەی دانانی جۆرێکی نوێی ئەدەب دائەنرێ لە زمانی کورددا . ■

■ هەموو کەس دەڵێ نالی ئەم شیعرە بەرزەی خۆی بۆ سالم شاعیری باشی سەردەمی خۆی ناردوە ٠ لە حاڵێکدا کە نالی هیچ باسی سالم ناکا ،بە وەڵام دانەوەی ئازایانەی سالم ئەم بیرە پێدا بوە دەمنا

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

وەڵامەکەی سالم کە بۆ وڵاتێکی بەش‌بەحاڵی سولەیمانیی ئەو ڕۆژە — ئازادی ناردووە ، هەمو شتێ بەئاشکرا ڕوون ئەکاتەوە . سالم خۆی بە ناچاری پەردە دادانەوە نازانێ . هەر ئەوەندە مەبەستە نامەکەی لە سولەیمانێ دەرچێ .. ئیتر گەیشتنی دەستەبەر کراوە . وەڵامەکەی سالم کلیلی تێگەیشتنی گەلێ سەری شیعرەکەی نالییە ، بۆیە وا لێرەدا تێکستەکەی ئەویش بڵاو ئەکەینەوە :

### وەڵامەکەی سالم

جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر !
ئەی پەیکی موستەعید لە هەمو ڕاهی پڕ خەطەر !
ئەی مێروەحەی جەمالی مەعاسای دولبەران !
وەی شانەزەن بە کاکۆلی تورکانی سیتەم بەر !
جارۆکەشی مەنازیلی جانان لە خەلوەتا !
فەڕڕاشی فەرشی بەهاران لە دەشت و دەر !
مالش دەدەی بە دەم لە دەمی خوابی صوبحدەم
هەم زولفی قیرەگونەوو هەم چیهرەیی قەمەر
بارێ بە سروەکەت بە شنەی ، نەنکەهینی گەز
گرتوویە جونبوشت بە هەم ئاغوشی ئەی‌شەکەر
وەقتی طەوافی عاریضی دولبەر شنۆیی تۆ
لەغزش دەخا بە طوڕڕە لە سەر تا بە پێ کەمەر
کەی دێتە خەندە غونچە ، دەمی ، بێ وەزیدەنت ؟!
گەر تۆ نەبێ درەختی چەمەن ناگرێ ئەمەر
ئیحیاکونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی
ڕەعنا گوشا لە تەربییەتی قامەتت شەجەر
ئابی حەیات و ئاتەشی لەفسوردەیە دەمت
تەحریکی تۆیە گڕ لە تەنۆورا کە دێتەدەر
میحنەت لەوەندە زۆرە ، دڵم هێندە تەنگ بووە
دوودی هەناسەکەی سەحەرم هەوری گرتە بەر
هیممەت کە چابوکانە بە ئیجرایی مەطلەبم
لەم‌سەر بڕۆ وەکو بەرید و ، لەوێ بێ وەکو تەتەر
بۆ مولکی شامە نامەیی من ، سوێی ( نالی )یە
هەر حەرفی ئەو لە وەضعی ویلایەت دەدا خەبەر

حاڵێ بکە بە یاری خوێنیە کەشەی یاری سەنگدڵ
نالی لە شەوقی تۆیە دەنێری‌سەلامی دوور

وەک وەڵامێ بۆ سالمی شاعیری دڵ ناسک نووسرابێ •

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

پرسیویە ظاهیرمن لە ڕەفیقانی بەلا جیهەت
ئەحوالی ئەهلی شەهر و ڕەفیقانی سەربەسەر
لەو سایەوە کە حاکیمی ( بابان ) بە دەر کران
نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر !
تا بۆ بە جایی مەطلەعی خورشیدی بەختی تۆم
سۆتا گیاە و ، تەشنەوو خوشکیدە بۆ ئەمەر
ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ ئەلیلی شەهر
بوریانە بەس لە ناری غەما پارەیی جگەر
جوز گاەگاهێ ئاە و نالە لە ئەیامی ڕۆمییان
نەمدیوە وا بیێ لە عەدالەت لەبی بەشەر
( سەیوان ) پڕە لە شەخصی ستەمدیدە خوار و ژۆر
هەر قەبری پڕ غەمانە لە هەر لا دەکەم نەظەر
جێی تورکەکانی ڕۆمە دەر و ژۆری ( خانەقا )
غافڵ هەمۆ لە جایی موریدانی با خەبەر
ئەو حەوضە پڕ دەبۆ کە وەکو چاوەکانی تۆ
لەغیرە ئاوی وەک دلی مەردانی پڕ کەدەر
سۆتا دلم بە حالەتی جۆباری ( سەرچنار )
ئیلاوە چەشمەساری وەکو چاوی بێ بەصەر
ئەو دەشتە جایی یاریی یارانی حوجرە بۆ
یەکسەر مەقامی ڕۆمییە هەروەک تەعی سەقەر
زستانی ئەووەڵێ بو دنیا بەرگی ( شێخ عەباس )
ڕۆمێ ئەوەندە شۆمە لە شەخصیش دەخەن ضەرەر
وەک پیری ساڵخوردە ، خەمە ، داری ( پیرەمسۆر )
مەشغوڵی لەغزشە هەمە جا ، پایی تا بە سەر !
ئەو بەردەکانی ئاوی نرا قەصنی شەخصەکەی
دایان بە شاخی دارەکەیا تورکی بێ هونەر
وەک چاوی بێغەمانە هەمۆ ( شێوی ئاودار )
بەس موشکیلە لە چەشمەیی ئەو قەطرە بێتە دەر
ئەوسا مەکانی ئاسکە بۆ کانی ئاسکان
ئێستە لە دەنگ و ڕەنگیی ڕۆمێ پڕە لە کەر
تا دوزدی وەقتی نیمەشەبن تورکی بێ نیظام
دوزدن هەمۆ لە خەرمەنی مونعیم وەکو شەرەر

- ٣ -

سەیلی هیجرت بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامەدەر
باری فیکرت قەددی ڕاستی ێشکاندم وەك فەنەر (١)

---

شارێکە پڕ لە ظولم و ، مەکانێکە پڕ لە شین
جایێکە پڕ لە شۆڕ و ، ولاتێکە پڕ لە شەڕ
ئەمڕۆ فەضایی بلاێکەهی جایی ڕەهزەنە
ئەو دەشتە دڵ لە غەیبەوە ئاوازی ( الحذَرْ )
سەربانی پڕ لە ئەژدوم و دیواری پڕ لە مار
کۆلانی پڕ لە ڕەهزەن و صەحرایی پڕ خەطەر
دڵ نایەڵێ بڵێم چییە سامانی حوجرەکەت
هەر تاری عەنکەبۆتە حیجابی بەڕۆن و دەر
نایێ صەدا لە پەنجەرەکەی جوز فوغانی جوغد
لەبرەها شەقامی مۆڕ نییە شوێنی بێ گوزەر
تۆ خودا بڵێ بە حەضرەتی ( نالی ) : دەخیلی بم
بەم نەوعە قەط نەکا بە سولەیمانییا گوزەر
« سالم » صیفەت لە بێکەسییا با نەبێ هیلاک
من کردم ئەو نەکا لە قەضا خوێنی خۆی هەدەر
ئەم مولکە نەظمی نایێ بە بێ ضەبطی وارثی
بێ ئەو بە قەصدی ئەم طەرەفە با نەکا سەفەر

شیعرەکەی سالمیش پێویستی بە ئەندازەیەك لەسەر نوسین و لێکۆلینەوەر ، دەربڕینی جیاوازیی لێکستەکانی هەیە . بەلام بام ئەوە بمێنێ بۆ کاتی لەچاپدانی دیوانەکەی خۆی کە ئەگەر خوا یار بێ ئەویش بەدەستەوەیە.

- ٢ -

(١) سەیل : لافاو . هیجر : لە یار بڕان . فیکر : بیر لێکردنەوە . فەنەر : پارچە کاغەز یا پارچە قوماشێکە وەك لوولە لوول ئەدرێ و مۆمی داگیرساوی ئەخرێتە ناو بۆئەوەی کە لەشوێنێکەوە برا بۆ شوێنێکی کە با نەیکوژێنێتەوە . بە هەر شتێکی لوول دراویش ئەوترێ .

واتە : لافاوی دوریت بەردی بناغەی لە جێنی ژێرەوە هێناومەتەدەر و ها ئەوەندی نەماوە بڕۆخێ و ،باری گرانی بیر لێکردنەوەشت بالای ڕاستی تێشکاندوم و وەك فەنەر چەماندوویەتیەوە .

■ ماموستا مەسعود موحەممەد دیفەرمووجوا بە جەنگی سالم دەگەڵ نالی پلەی شاعیری ئەویشی بردۆتە سەر .

شیری ئەبرۆت ، تیری غەمزەت وا لەجەرگم کاریە
دێت لە تۆفانی دوو چاوم لەتلەتی خوێنی جگەر (۲)

چاو و دڵ شەڕیانە ، نازانم خەتای کامیانە خۆ
تا بە داری کەم ، دەری کەم بیخەمە شین و چەمەر (۳)

نوری چاوم ! چاوەکەم بێ نورە بێ تۆ ، ذەڕڕەیی
خاکی دەرگاکەت بیێژم بیکەمە کوحلی بەصەر (٤)

دڵ موشەبیەك بۆ لەبەر ئیشان و نێشانی موژەت
ئیشی چاو بو بۆیە هێند گریام و خوێنی کەوتە سەر (٥)

---

فیکرت قەددی ڕاستی (گم) : فیکری قەددی ڕاستت . ئێشکاندم (گم): ئێشکاندم . (ك) : ئێکشکاندم .

(۲) واتە : جگەرمت بەجۆرێ بە شیری برۆ و تیری ئیشارەی چاوت ئەنجن ئەنجن کردووە ، لەتەکانی بوون بە خوێن و وەك لافاو لە چاومەوە ئەڕژێن .

(۳) واتە : چاو و دڵم لەبەینی خۆیانا هەرایانە لەسەر تۆ ، چاو ئەیەوێ هەر بۆ خۆی بی سەیرت بکا ر ، دڵ ئەیەوێ هەر بۆ خۆی بی حەزت لێ بکا . منیش نازانم لەم شەڕەدا ئەم دوانە کامیان تاوانبارن تا لە جێی خۆی دەری‌کەم و لە داری بدەم و بیخەمە واوەیلا .. نالی لێرەدا ئەیەوێ بڵێ کەسیان تاوانی نییە و هەردوکیان ئەیانەوێ هەر لە نزیکتەوە بن و لێت دوورنەکەونەوە ، بۆیە ئەگەر هەرکامیان لە جێی خۆی دەرکەم و لە تۆی دوور خەمەوە ئەکەوێتە گریان و شیێن .

(٤) ذەڕڕە : تۆز . وردە . کوحل : کلە . بەصەر : چاو . بینایی .
واتە : تۆ دیار نیت ، تا خاکی بەری پێت هەڵگرم و بیبێژم و لەجیاتی کلە چاومی پێ بڕێژم تا بینێ ، بۆیە بینایی لە چاوم بڕاوە .

(٥) موژە : برژانگ . موشەبیەك : کون‌کون وەك پەنجەرە .
واتە : بەهۆی ئیش و نێشی برژانگەکانتەوە دڵم کون‌کون بۆ . ئەو کارە کاری چاوت بو موژەت لە دڵما کردی ، بۆیە ، چاوەکانی منیش کاریان پێ لێ‌کرا و زۆر گریام و خوێن لە دڵمەوە سەری‌کرد و کەوتە سەر چاوم .
نێشان ونێشانی موژەت (گم) : ئیشان و نیشانی برۆت . (مز):ئێشانی نێشانی فرەت . چاو (گم) : چا . گریام و خوێنی (ك) : گریام کە خوێنی .

لەت‌لەت و کون‌کون بووە دڵ وا لە شەوقی شیرەکەت
ڕۆحەکەم دێت و دەچێ ، داخۆ لە کامیان دێتە دەر ؟! (٦)

هەرچی مەحبوبەم دەبینێ وا تەحەییور دەیگرێ
سوێن دەخوا بە خوا دەڵێ « باللە ما هذا بشر » (٧)

چەندە خۆشە دابنیشین دۆ بە دۆ ئەمن و گوڵم
داکەوێتن موددەعی لەو خوارە هەروەك دەستی کەر (٨)

ڕۆژپەرستی ڕۆتە « نالی » بۆیە دائیم وەك غوڵام
زەرد و گەردن‌کەچ لە دەرگات حاضرە دەستەو نەظەر (٩)

---

(٦) واتە : دڵم لەناو ئارەزوی بینینی برۆی وەك شمشێری تۆ ، کون کون بووە . گیانم بەو کونانەدا دێ و دەچێ ، نازانم سەرەنجام لەکامیانەوە دێتە دەرەوە و ، ئەمرم !

ئەشتوانرێ نیوەی دۆهەمی ئەم شیعرە بەم‌جۆرە بخوێنرێتەوە :

**ڕۆحەکەم ! دێیت و دەچی ، داخۆ لە کامیان دێیتەدەر !**

واتە : ئازیزەکەم ، تۆ کە جێگات لەناو دڵمایە ، ئێستا بەناو کونەکانی دڵما دێیت و دەچی ، نازانم سەرەنجام لەبەر بۆ تیا ژیان ـ نەشیانی دڵم ، لە کام کونیانەوە دێیتەدەر ( چونکە بەو کون‌کون بونەی دڵم ئەمرم ) !

(٧) تەحەییور : سەرسامی .

واتە : یارەکەم ئەوەندە جوانە ، هەرکەس ئەیبینێ ، لە جوانیی سەرسام ئەبێ ، سوێند ئەخوا ئەڵێ قەسەم بە خودا « ئەمە لە جینسی ئادەمیزاد نییە » واتە فریشتەیە .

نالی لەم شیعرەدا ئیقتیباسی لە ئایەتی « فلما رأینه اكبرنه و قطعن ایدیهن و قلن حاش لله ما هذا بشرا ، ان هذا الا ملك كريم » کردووە کە باسی حەزرەتی یوسف و کەنیزەکەکانی زولەیخای ژنی عەزیزی میسر ئەکا و ئەڵێ : کە دیبان ، زۆر بە گەورەیان زانی و ، لەناو جوانیی دەستی خۆیان بڕی و وتیان قەسەم بە خوا ئەمە بنیادەم نییە ، ئەمە لە فریشتەیەکی نازار بەولاوە نییە .

(٨) داکەوێتن : داکەوێ . موددەعی : بەدکار . دەستی کەر : کینایەیە لە کەسێ یا شتێ کەڵکی هیچی پێوە نەمابێ و فڕێ درابێتە لاوە .

(٩) ڕۆژپەرست : گوڵی ڕۆژگارپەرست ، گوڵێکی زەردە هەمیشە لەگەڵ گەڕانی ڕۆژدا ڕۆ وەرئەچەرخێنێ .

— ٤ —

شەوی بەهاری جوانی خەوی بو پڕ تەشویر
لە فەجری پایزی پیری بەیالی دا تەعبیر (١)

---

واتە : زەردیی ڕۆم و ملکەچیم هیی ئەوەیە ڕۆژی تۆ وەك خۆر وایە و منیـــش وەك گولـــە ڕۆژگارپەرســــت وام بـــۆ ڕۆژی تۆ و ، گولـــە ڕۆژگارپەرستیش هەم زەردە و هەم ملکەچیشە ، وەك چـــۆن تۆکـــەر هەمیشـــە هەم ڕۆژەردە و هـــەم لە دەرگای ئاغایدا ملکـــەچ ئەوەســـتێ چاوەڕێی فەرمانە .

دەرگات (گم) : دەرگا .

لـــەم پارچە شیعرەدا سادەییەکی ئاشکرا ، بـــە بـــەراورد لەگـــەڵ شیعرەکانیتری نالی ، هەســـت پێ ئەکرێ . لە نوسخە دەستنوسەکانی بەردەستمانا ، ئەم پارچەیـــە تەنها لە نوســـخەکەی (چن) و (ك)دا و ، لە چاپەکانیشدا تەنها لە نوسخەکەی (گم)دا هەیـــە . چنگنیانی لە پەراوێزی نوسخەکەی خۆیدا نوسیویە : « ئەم غەزەلە لـــە فەرمایشی نالی ناچێت ، ظاهیر داخیلی نییـــە » . دیارە ئـــەویش هـــەر لەبەر سادەییـــەکەی وای نوســـیوە . بەڵام بە ڕای ئێمـــە شەقڵی نالیی پێوەیـــە . سادەییەکەشی لەوانەیە لەبەرئـــەوە بێ لە سەرەتای شـــیعر وتنیدا نوســـیبێتی . دیارە بەرهەمی هیچ شاعیرێك هەمـــوی لە یەك ئاست و پلەدا نابێ . هـــەر ئەم سادەییەشە وای لە د . مارف خەزنەدار کردوە دانە پاڵی ئەم پارچەیە ئەلای نالی لەلایەن گیوی موکریانییەوە ، بە هەڵە دانـــێ و ، بنوســـێ : « هێشتا بۆم ساغ نەبوەتەوە هیی کێیە » ( گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمـــارە ٣٤ ، کانونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانونی دوەمی ١٩٧٦ ، لاپـــەڕە ٤٢ ) .

— ٤ —

(١) لە هەمو نوسخە چاپ و دەستنوسەکانی بەردەستمانا ، ئەم قەصیدەیـــە تەنها لە نوسـخەکەی ڕەحمەتی مامۆستا مەلا ئەتاحی کاگردەلیدا هەبـــو کە ( ك )مان بۆ کردووە بە نیشـانە و کۆمـەڵێکیش هەڵە و ناتەواویی تیا بو . پاشـان د. مارف خەزنەداریش ، بە شێوەی ئاڵوگۆڕ ، نوسخەیەکی داینێ کە وەك ئەڵێ لە ڕۆژی دەستنوسێکی نوسیوەتەوە لە دوا ساڵەکانی ســـەدەی نۆزدەهـــەمدا نوسراوەتـــەوە . هەرچەند ئەو نوســـخەیەی د. خەزنەداریش هەڵەی گەورە و ئاشکرای لـــە هێنەکەی لای خۆمان

زۆرتر تیابو ، بەلام بۆ ڕاست کردنەوەی چەند شوێنێك کە لێرەدا بە پیتی ( د ) ئیشارەتمان بۆ کردووە ، کەلکێکی باشمان لێ وەرگرت .

ع نوسخەکەی (ك) و ع ئەوی د. خەزنەدار هەر ئەوەندەیان تیابو کە ئێمە لێرەدا نوسیومانەتەوە . بەلام دیارە ناتەواوی هەیە ، چونکە هەم بابەتەکە تەواو نەبوە و ، هەم نازناوی شاعیریش دیار نییە . لە نوسخەکەی ( ك )یشدا جێگای پێنج بەیت بە سپییەتی هێلراوەتەوە . ڕێی لێ‌ئەچێ بۆیان نەخوێنرابێتەوە ، یا نوسخەکەی بەردەستیان پەڕپوت بوبێ ، یا بە ( ئەدەبی ڕۆ هەلمالراو )یان دانابێ و نەیانوسیبێتەوە . هەرچۆن بێ ئەمە شتێکی سەرنجڕاکێشەرە : ئەم پارچە شیعرە تەنها لەم دۆ نوسخەیەدا هەیە و لە هەردوکیشیاندا ناتەواوییەکەی ئەوەندەی یەکە .

ئەم پارچەیە لە شیعرە بەرز و پڕ ماناکانی نالییە و دیارە هیی سەرەتای پیریشیەتی و ، یەکێکیشە لەو پارچە کەمانەی شیعری ئەو و تێکڕای شیعری کلاسیکی کوردی کە یەکێتیی بابەتیان تیایە ، هەرچەند بابەتەکە خۆی هەندێ وردە لقی لێ بووەتەوە .

تەشویر : گەلێ مەعنای هەیە وەك شەرمەزار کردن و ئالۆزاندن و سەرلێشێواندن و خۆشی . لێرەدا مەعنای دوایییان مەبەستە .

واتە : تەمەنی جوانی کە وەك شەوی بەهار درێژ و خەو تیا خۆش ئەهاتە پێش چاو ، خەونێکی خۆش بو دیمان و ، تەعبیرەکەی لە بەرەبەیانی پاییزی پیریدا دەرکەوت . تەعبیرەکەی ئەوەبو بنیادەم هەرچەند لە گەنجیدا خۆش ڕابوێری ، هەرگیز تا سەر نابێ بۆی و ئاخری لەبێ هەر تولی پیری دادەنێ و ، ئەوەندە دەردی پیری ئەچێژێ ، خۆشیی ژیانی بە تاوێکی ئێجگار کورت دێتە پێش چاو .

نالی لەم شیعرەیدا وەرزی جوانیی شوبهاندووە بە بەهار لەوەدا وەك چۆن بەهار خۆشترین وەرزەکانی سالە ، وەرزی جوانییش خۆشترین وەرزەکانی ژیانە . لە بەهاریشدا شوبهاندنێکی بە شەو ، چونکە شەوی بەهار درێژە و خەوی تیا خۆشە . لە شەویشدا شوبهاندنێکی بە خەونی بنیادەم ببینێ . ڕۆی شوبهاندنەکەش کورتیی خەو و ناڕاستییەتی . مەبەستی ئەوەیە بلێ مادەم لەپاش جوانی پیری دێ ، هەرچی خۆشیی ژیانە هەموی پولێك ناهێنێ .

لە نیوەی یەکەمی ئەم شیعرەدا سێ وشە و وێنەیەك و ، لە نیوەی دۆهەمیشیدا سێ وشە و وێنەیەکی تری دژی ئەوانی پێشو ڕیز کراوە : شەو و فەجر ، بەهار و پاییز ، جوانی و پیری ، خەوی پڕ تەشویر و

چ شەو ، چ ڕۆژ ؟ وەها کورتی لەهو و لەعب و میزاح
کە هەردو وەك یەکەچوِن بە نەغمەیی بەم و زیر (٢)

ئەسەف درێژی شەو و ڕۆژی ئەو شەو و ڕۆژەم
قوصوریان بووە طوولی نەدامەتی تەقصیر (٣)

سەوادی طوڕڕەیی ئەو ئیشتیباهی سەحەری جوان
بەیاضی غوڕڕەیی ئەم ئیشتیباهی سوجدەیی پیر (٤)

---

بەیان کردنی لەمبیر . ئەمە سەرەڕای لەناسوبی نێوان زۆر لە وشەکان و جیناسی لاحیقی نێوان (شەو) و (خەو) .

(٢) میزاح : گاڵتە . یەکەچوون : یەك نەچوون . بەم : دەنگی بەرز . زیـر : دەنگی نزم . بـەم و زیر ، یان زیر و بـەم ئالەتێکی مۆسـیقایە لە دوو پارچە پێکهاتووە بەمەکەیان دەنگی بەرز و زیرەکەیان دەنگی نزمە .

واتە : شەو و ڕۆژێکـی چەنـد کورت بـوون بەهـۆی گاڵتەکردن و ڕابواردنەوە هەستم بە بەسەرچوونیان نەئەکرد و ، هەردوکیان لەسـەر ئاوازەی بەم و زیر ، یا کورت و درێژ وەك ئاوازەی بەرز و نزمی بەم و زیـر نەبڕانەوە .

میزاح ( ك ) : میزاج .

(٣) ئەسـەف درێژ : کەسێ خەفەتی زۆر بێ . قوصـوور : کورتی . نەدامەت : پەشیمانی . تەقصیر : کەمتەرخەمی .

واتە : هەمیشـە خەفەتێکی زۆری ئەو عومرە درێژە ئەخۆم کە هەمووی وەك شەوێکی بەهاری خەو و بێئاگایی و ، ڕۆژێکی پاییزی بێدەسەڵاتی بەسەرچوو . داخی ئەوەم لە دڵایە کە چۆن وا کورتیی ئەو شەو و ڕۆژەی ژیان ، بووە بە هۆی پەشیمانیـیەکی دوور و درێژ و زۆر بۆم ، لەبەرئەو کەمتەرخەمییەی کردم . مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئیسـتا کە پیر بووم و پاییزی تەمەنم داهاتووە ، داخی ئەو مـاوە کورتەی ژیانم لە دڵایە کەوا ئەرکی سەرشانی خۆمم تیا بەجێنەهێنا و بۆم بۆ بەهۆی پەشیمانیـیەکی لە ڕادە بەدەر .

لەنێوان ( درێژ ) و ( شەو و ڕۆژ ) و ، هەردو ( شەو و ڕۆژ )دا کـە پێشوویان ( هەمیشـە ) و دوایەمیان ( شەو و ڕۆژی عومـری کورت ) نەگەیەنێ و ، لەنێوان (قوصـوور) و (طوول)دا طیباق هەیە .

(٤) سەواد : ڕەشی . طوڕڕە : زولـف . ئیشتیبـاه : بەهەڵەداچـوون .

وەکو ئەهاری بەهاری درێژ و پایزی کورت
ئەمەل گەلێك و طەویل و ، عەمەل کەمێك و قەصیر (٥)

---

بەیاض : سپێتی . طوڕڕە : ناوچاوان . لیشتیباه : ئاگادار بونەوە . سوجدە : سوجدەی سەهو کە لە هەندێ حالەتی بەهەڵەداچونی نـاو نوێژدا بەر لە سەلام دانەوە ــ ئەبرێ .

واتە : ڕەشیی کاکوڵی لاوان هیی ئەو هەڵەی بێئاگاییەیە لە سەردەمی هەرزەکاریدا ئەیکەن . سپێتیی ناوچاوی پیرانیش هیی وریا بونەوە و پاشگەز بونەوەی وەك سوجدەی سەهو بردنیانە .

نالی لەم بەیتەدا ڕەشیی کاکوڵی هەرزەکاری بەو قۆناغە پڕ لە ئارەزووە شوبهاندووە کە هەرزەکار پیا تێئەپەڕێ و ، بێجگە لە ڕابواردن بیر لە هیچ ناکاتەوە ، کە لەمەش ئەگەر بە چاوی ئایین سەیری بکرێ گومڕاییە و گومڕاییش ڕەشی و تاریکییە . سپێتیی ناوچاوانی پیاوی پیریشی بـە وریا بونەوەی کەسێك شوبهاندووە کە لە نوێژا هەڵەیەکی کردبێ و بەر لە سەلامدانەوە سوجدەی بـۆ بەرێ . ڕاچڵەکـان و بیرکردنەوەی بنیادەمیشی لە دوا ساڵەکانی ژیانیا شوبهاندووە بە وریا بونەوەی نوێژکەرێ کە هەڵەیەکی لە نوێژەکەیدا کردبێ و ، سەلامدانەوەی نوێژکەریشی شوبهاندووە بە مردن و نوێژەکە خۆی بە ژیان .

چەند گونجاو و جوانە نالی وا ڕەشیی کاکوڵی لاوانی ، لەگەڵ ناوچاوی لەبەر سوجدە بردن سپی بووەوەی پیران بەراورد کردووە ، ئەڵێی ئەم ڕەشی و سپێتییەی لە پیر و لاو خواستووە و داویە بە شەوەزەنگ و بەرەبەیـان !

لەنێوان ( سەواد ) و ( بەیـاض ) و ، ( طـوڕڕە ) و ( غـوڕڕە ) و ، (لیشتیباه) و (ئینتیباه) و ، ( سەهو ) و (سوجدە) و ، (جوان) و (پیر)دا طیبـاق هەیـە .

(٥) واتە : ئاوات و هیوای من وەك ڕۆژی بەهار زۆر و درێژ و نەبڕاوەن و ، کردەوەشم ، کە ئەبێ هەر لە ڕێگای ئەوانەوە بەئەمای هاتنەدیی ئاواتەکانم بم ، وەك ڕۆژگاری پایز کەم و کورتن .

لەنێوان ( ئەهار ) و ( بەهار ) و ، ( گەلێـك ) و (کەمێـك)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئەمەل) و (عەمەل)دا جیناسی موضاریع و ، لەنێوان (درێژ) و (کورت) و ، (طەویل) و (قەصیر)دا طیباق هەیە . لەنێوان دوو بڕگەکەی هەرکام لە دوو نیوە شیعرەکەشـدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە . بـڕگەی یەکەمی نیوە شیعری دووەمم بۆ بڕگـەی یەکەمی نیوە

غوباری ئەو شەو و ڕۆژەن ڕدێنی ماش و برنج
کە تێکەڵن شەبەهی صوبح و شام و شیر و قیر (٦)

سپی ئەذیرە هەمو مو لە سیڕڕی ( وَجْهُ ) لە سەر
موئەووەرە ، لە طەرەف نورەوە بووە بە لەذیر (٧)

---

شیعری یەکەم و ، بڕگەی دوەمی نیوە شیعری دوهەم بۆ بڕگەی دوەمی نیوە شیعری یەکەم ئەگەڕێتەوە .

(٦) غوبار : توز . ڕدێن : ڕیش . ماش و برنج : ئەو ڕیشەی بە ڕەشی نەماێتەوە و هێشتا تەواویش سپی نەبوبێ . شەبەه : وەك . شام : ئێوارە .

وانە : توز و گەردی گوناهی ئەو شەو و ڕۆژەی ژیانمە کاری کردووەتە سەر ڕیشم و بوزی کردووە و کردویە بە ماش و برنج و ، موی ڕەش و سپیی تیا تێکەڵ بووە وەك تێکەڵیی ( بەیانی ) و ( ئێوارە ) وانە شەو و ڕۆژ و ، لەیەکەوە نزیکیی (شیر) و (قیر) کە بە دیمەن تەنها لیپێکیان لە یەك جیایە و لە ڕاستیدا یەکێکیان سپی و ئەویان ڕەشە .

(٧) سپی نەذیر : تۆقێنەری سپی . جاران خێڵە عەرەب کە دوژمن بهاتایانە سەریان یەکێکیان بەرگێکی ئاودامانی سپیی ئەکردەبەر و ئەچوە سەر بەرزاییێك هاواری ئەکرد کە فریایان کەون . سپی نەذیر ، یاخود ( النذیر العریان ) بەوە ئەڵێن . موئەووەر : ڕۆناك ، نورانی .

وانە : هەرچی مو بەسەرمەوەیە بووە بە ( تۆقێنەری سپی ) و ترسی مردنم ئەخاتەبەر و ئایەتی ( كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ، وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ) م ئەدا بەگوێدا کە وانە هەرچی بەسەر ڕوی زەویەوەیە هەموی ئەفەوتێ و تەنها ڕوی خوای گەورەی لێ ئەمێنێتەوە . بەڵام ئەم موە سپییە تۆقێنەرە ، ڕۆناك و پیرۆزە چونکە ئەو ڕەشەکەی لە خواوە هێناوە کە ڕۆناکیی ئەرز و ئاسمانە وەك خوای ئەفەرموێت ( اللَّهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ ) .

ئەشکونجێ وشەی ( لەسەر ) مەعنای ( علی ) بێ و ئیشارەت بێ بۆ ( عَلَيْهَا )ی ئایەتەکە . هەروەها ئەشکونجێ نالی ویستبێتی ( هەمو مو ) بە ( هەموم و ) بخوێنرێتەوە ، وانە هەمو گیانم .

مرۆری ئەکسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە ڕەمەق
ذوبۆلی نیکسە دەگێڕێ کە عەکسی ڕیش بە شیر (٨)

دەلیلی ڕۆشنە بۆ بەدە و عەود و کورتیی عومر
تەنی هیلال کە بە طەلعەت جوان ، بە خەلعەت پیر (٩)

---

(٨) مرۆر : تێپەڕبون . نەکس : کزێ . سەرەوقنگ کردنەوەی شتێك . عەکس : دەرخستن . پێچەوانە . ڕەمەق : نیوەگیان . نیکس : شکاندنەوەی شتێك بەجۆرێك سەری بکەوێتەرە خوارەوە .

وانە : بەهۆی تێپەڕبونی سەردەمی پیرێ و کزێ و نزیكبونەوەی دواییەوەیە ، مانگی گەش و جوان لە دوازۆژەکانیا وا دەرلەکەوێ وەك لە حالی گیانەلادا بێ . یا خەتای بەشێوەی سەرەو قنگ تێپەڕبونی مانگە وا پێچەوانەی (قەمەر) ، (ڕەمەق)ە . بەهۆی سپیبونی بالای بنیادەم و چەمانەوەیەلی کە لەبەر پیرێ سەری ئەکەوێتە بەرپێی ، گیای ڕیشی وشك ئەبێ و سپی ئەبێتەوە ، یا لەبەر شکاندنەوەی وشەی (ڕیش)ە ، (شین)ەکەی ئەکەوێتە سەرەوە و (ڕێ)کەی ئەکەوێتە خوارەوە و ئەبێ بە (شیر) .

نالی ئەم شیعرەی لە ئایەتی ( وَمَنْ نُعَمِّرْهُ ، نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ ) ئیقتیباس کردووە کە واتە : ئەوەی زۆر بیژێنین ، پاشان بالای ئەچەمێنینەوە .

(٩) بەدء : سەرەتا . مەبەست سەرەتای دروستبوونی بنیادەمە کە هێشتا زۆر بچکۆلەیە . عەود : گەڕانەوە . مەبەست زیندو کردنەوەی بنیادەمە لەو دنیادا . تەن : لەش . هیلال : مانگی یەکشەوە . طەلعەت : هەلاتن ، دیمەن . خەلعەت : بەرگ .

وانە : مانگی یەکشەوە کە لە سەرەتای مانگدا هەلدێتەوە ، وا دێتە پێش چاو شتێکی نوێ بێ . کەچێ لە ڕاستیدا پیرەو هەر ئەو مانگەیە کە شەوی پێشو ، بەنیسبەت مانگی ڕابوردووەوە لە چلەپۆپەی پیریدا بو . بەلام لەگەل ئەوەشدا عومرێکی زۆر کەمی ڕابواردبو کە سێ ڕۆژە . ئەمە نیشانەیەکی ئاشکرا و بەلگەیەکی ڕۆشنە بۆ ئەوە کە عومری ئادەمیزاد لە دنیادا زۆر کورتە و ، ئەو خوایەی لە نەبون دروستی کردوە ، لەو دنیاش دروستی ئەکاتەوە ، وەك چۆن مانگی بەسەرچو هەلدێنێتەوە .

ئەم شیعرە ئیشارەتە بە ئایەتی ( کما بدأکم تعودون ) .

له شەرحی هەیئەتی مەتنی بەدەنی کە هەر جوزئی
سەقیمە ، عاجزە تەصحیح و ڕابیطی تەدبیر (١٠)

تێدا حەدیثی حەداثەت ضەعیف و مەترووکە
کە قەطعە صیحەتی ئیسنادی عەنعەنی تەقریر (١١)

---

(١٠) شەرح : لێکدانەوە . ئەو کتێبەی کە تێکستی کتێبێکی‌تریان ، وشە وشە و ڕستە ڕستە خستبێتە ناویەوە و ، مەعنای ئەو وشە و ڕستانەیان بۆ لێکدابێتەوە . هەیئەت : دیمەن . عیلمی ئاسمان‌شناسی کە جاران فەقێ لەیانخوێند . مەتن : پشت . تێکستی ئەو کتێبەی لەبەر گرانی ، وشە وشە و ڕستە ڕستە ئەیانخستە ناو چوار چێوەی کتێبێکی‌ترەوە و مەعنایان لێک‌ئەدایەوە . جوزء : پارچە . بەشێك لە چەند بەشێکی کتێبێك . سەقیم : نەخۆش . ڕستەیەك کە مەعناکەی نەیەت بەدەستەوە . تەصحیح : ساغ‌کردنەوە . ڕاست‌کردنەوەی هەڵەی ناو کتێب . ڕابیط : ئەو تەختەیەی ئەیخەنە سەر ئێسقانی شکستە بۆئەوەی بگیرسێتەوە و چاك بێتەوە . جۆرە ڕەمزێکی تایبەتی بوون وەك ( ، ) و ( ـ ) و ( ؛ ) و ( : ) و ( . )ی ئێستا لەسەر کتێب ئەیاننوسین بۆئەوەی خوێندەوار بەئاسانی ڕستەکانی کتێبەکە بەبەکەوە ببەستێ و بزانێ کوێ پەیوەندی بەکوێوە هەیە و لەکوێدا بوەستێ و لەکوێدا تێهەڵچێتەوە . جاران بەم کارەیان ئەوت ( خۆش‌کردنی کتێب ) .

نالی لەم شیعرەیدا خۆی شوبهاندووە بە کتێبێکی پڕ لە هەڵە کە بە کەس ڕاست نەکرێتەوە ، لەوەدا کە ئەمیش ئەوەندە نەخۆشە بە کەس تیمار ناکرێ . لەلێ منی پیر و لێ‌کەوتوو هەموو پارچەیەکی پشتم ئێش ئەکا و کەس ناتوانێ مەعنای مەتنی شێرازە پچڕاوی بەدەنم لێك‌بداتەوە . بۆیە خۆش‌کردن و دەست‌لێدان و پەیوەندی دروست کردن لەنێوان ئەندامەکانی لەشمدا هیچ بە هیچ ناکات و سوودێکی پێ ناگەیەنێ .

لامان دوور نییە وشەی ( تەدبیر ) هەڵە بێ و ڕاستەکەی ( تەضمیر ) بووبێ ، کە واتە نیشارەکردن بۆ بنەوانی ( ضەمیر ) لە ڕستەدا ، کە ئەویش یەکێك بووە لە شێوەکانی خۆش‌کردنی کتێب .

(شەرح) و (مەتن) و (جوزء) و (سەقیم) و (تەصحیح) و (ڕابیط) ، وەك لێکمان دانەوە ، زاراوەی خوێندنی حوجرەن .

(١١) حەدیث : قسە . فەرموودە یا کردەوەی پێغەمبەر ( د.خ ) یا ئەوەی پێی زانیبێ و ناڕەزایی لێ دەرنەبڕیبێ . حەداثەت . لاوێتی . حەدیث

چ مشت و پەنجە ؟ وەکو مشتی شانە زمق کە دەڵێی
لە شانیدا نەبووە دەستوبردی کوشتوگیر (١٢)

---

بە ( حدثني ) گێڕانەوە . ضەعیف : لاواز . لەو حەدیثەی کەوا ئەوانەی ئەیگێڕنەوە لەبارەی بێ‌گوناهی و متمانە پێ‌کراریەوە نەگەنە ڕادەی ئەوانەی حەدیثی ( حەسەن ) ئەگێڕنەوە . مەترۆك : خراوە لاوە . ئەو حەدیثەی تاقە یەك‌کەس گێڕابێتیەوە و بەئاشکرا گوناهبار بێ یا گێژ و ویژ بێ یا شتی لە بیر بچێ یا قسەی لێ بکەن کەوا درۆزنە . قطع . بڕین . حەدیثی مەقطوع ئەو حەدیثەیە زنجیرەی گێڕانەوەی نەگاتەوە سەر ئەصحابە ، بەڵکو لە تابیعین یا لە خواری ئەوانەوە بپچڕێ . صیحەت : دروستێ . حەدیثی صەحیح ئەو حەدیثەیە زنجیرەکەی لەوکەسەوە کە ئەیگێڕێتەوە تا ئەگاتە سەر پێغەمبەر ( د.خ ) نەپچڕابێ و ئەوانەش کە ئەیگێڕنەوە بێ‌گوناه و قسەڕاگر بن . ئیسناد : دانەپاڵ . دانی حەدیث ئەپاڵ ئەو کەسەی گێڕاویەتەوە . عەنعەن : عەن عەن ، لە فلانەوە و ئەویش لە فلانی‌ترەوە و بەوجۆرە .. حەدیثی موعەنعەن ئەو حەدیثەیە کە بیا بوولری فلان کەس لە فلان کەسی گێڕایەوە بۆم ، بێ‌ئەوەی بڵێ ئەو فلانە قسەی بۆ کردم کەوا فلان کەس قسەی بۆ کردووە .. تاد ، یا لێی‌بیستووە . تەقریر : بڕیاردان . ڕەزامەندیی پێغەمبەر (د.خ) لە شتێ بیستبێتی یا کردەوەیەك دیبێتی .

واتە : لەم کتێبی شەرحی هەیئەلی مەتنی بەدەنەدا کە لە شیعری پێشوودا باسی کرا ، تەنانەت حەدیثێکیش بە ( حدثني فلان ، قال حدثني فلان ) گێڕرابێتەوە بە حەدیثی ضەعیف و مەترۆك دائەنرێ ، چونکە ئەوەی ئەیگێڕێتەوە لە خۆیەوە قسە ئەکا و لەبەر پیری و پەككەوتەیی ئاگای لە خۆی نییە و حەدیثەکەی وەك حەدیثی موعەنعەنی بابەتی تەقریر تەماشا ئەکرێ و ، ئیسنادی حەدیثی موعەنعەنی تەقریری لەم جۆرەیش بە صەحیح دانانرێ و وەك مەقطوع ئەدرێتە قەڵەم .

ئەمە مەعنای شیعرەکە لە ڕووە زاراوەییەکەیەوە . لەو ڕووەکەی تریشیەوە واتە : باسی گەنجایەتی لەم مەسەلەی منەدا گوێی نادرێتێ ، چونکە ئەوەی ئەم باسە ئەگێڕێتەوە هەر لە خەڵکی بیستووە و خۆی نەیدیوم و ئاگای لە حاڵم نییە .

مەنمەنی (لە) : مەنمەن و .

(١٢) مشت (ی دوەهەم) : مشتێ . شان : شەنێ ، شان ، بار .. کوشتوگیر : جۆرە زۆرانگرتنێکی بێ نەخشە و پلانە .

چ قەد کەوانێ ! وەکو پێ شکاو و ئوفتادە ،
کە بازی سێ قەدەمی قەت نەداوە وەك پەڕی تیر (١٣)

لە نەحو و صەرفی ئەداتی مەپرسە ئەی موعریب
کە ڕەفع و نەصب و جەڕ و جەزمە ئالەتی تەقریر (١٤)

---

واتە : مشت و پەنجەیەکی چۆن ! مشت و پەنجەیەکی ڕەق و تەق و جرج و وشکی وەك مشتۆی شانەی قژ داهێنان کە تەختەیەکی ڕەقی بێ‌گیانە ، ئەلێی هەرگیز ئەوەی لەبارا نەبوە دەستوبردی زۆرانێکی هەڕەمەیی بێ .

ئەشکونجێ (کوشت‌وگیر) نەبێ ، (کوشتێ‌گیر) بێ ، واتە : زۆرانگر ، ئیتر زۆرانگرتنەکەی هەرچۆن بێ .

لەنێوان ( مشتۆ ) و ( مشتێ )دا و هەروەها لەنێوان ( شانە ) و ( شان )دا جیناسی ناقیص هەیە .

ئەچێ بە دڵ ، بەر لەم شیعرە ، لای کەمی شیعرێك بەڕبێ ، چونکە گواستنەوەی بابەتەکە لە ڕۆیەکیەوە بۆ ڕۆیەکی‌کەی ، نەختێ بە گران تەواو ئەبێ .

(١٣) قەدکەوان : ئەوەی قەدی وەك کەوان چەمیبێتەوە . ئوفتادە : لێکەوتۆ . سێ قەدەم : سێ پێ ، سێ باز ، جۆرە بازدانێکە ، لە پارچە شیعری پێشودا بەدرێژی لێی‌دواین . پەڕی تیر : پەڕێکی تیژ بووە بەسەر تیرەوە ، کە تیرەکەیان ئەقاندووەتە کەسێك و لێی‌داوە پەڕە تیژەکەی پیا چووە و لە لەشیا ماوەتەوە و تیرەکە خۆی کەوتووەتە خوارەوە .

واتە : باڵایەکی کەوانیی چەماوەی چۆنی هەیە ! وەك باڵای کەسێکی پیری لێکەوتۆی قاچ شکاو کە هەرگیز بازی سێ‌بازی نەدابێ و وەك پەڕی تیر تیژ نەفڕیبێ و نەگەیشتبێتە ئەو شوێنەی مەبەستیەتی .

ئەم شیعرە لە نوسخەکەی ( ك )دا هەڵەی زۆری تیابو . ئەمەی لێرەدا نوسیومانەتەوە ، تێکستی نوسخەکەی (د)ە لەگەڵ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیدا .

(١٤) نەحو : زانستی جۆنیەتیی سەر و ژێر کردن بۆ وشە لە زمانی عەرەبدا . وەك . ڕۆڵێ‌کردن . صەرف : زانستی داتاشینی فیعل لە زمانی عەرەبدا . ڕۆ لادان . ئەدات : زاراوەیەکی زانستی نەحوە . هۆ . (هێنی) پیاو . موعریب : ئەوەی سەر و ژێر ئەکا بۆ وشە و ڕستە

وەها سەقیم و موجەززا عەوامیلی ئەجزا
که ئالەتی عەمەلی نەحوی مەحوی صەحوی ضەمیر (١٥)

---

لێك نەداتەوە . لێرەدا ئەوەی (ئەمدیو و ئەودیو) بە ئافرەت ئەکا . زەفع: بۆر ( ُ ) . هەڵبڕین . نەصب : سەر ( َ ) . ڕاستکردنەوە . جەڕ : ژێر ( ِ ) . ڕاکێشان . جەزم : زەنە ( ْ ) . تەواوکردن . ئالەتی تەقریر : هۆی بڕیاردان . هۆی تەختکردن .

نالی لەم شیعرەیدا زاراوەکانی زانستی نەحوی بەکارهێناوە بۆ باسکردنی ئەوە کە توانای ( کردن )ی نەماوە ، هەرچەند بەدیمەن ئەڵێ : ئەی لەوکەسەی ئەتەوێ سەر و ژێر و بۆر و زەنە بۆ وشە بکەی ، باسی هۆیەکانی سەر و ژێر دانان بەپێی زانستی نەحو و صەرف ، لە من مەپرسە . بەهۆی سەر و ژێر و بۆر و زەنەوە بڕیار ئەدرێ شوێنی فلانە وشە لە ڕستەدا چییە ، ڕووەکەی تری مەعنای شیعرەکەی ئەوەیە : ئەی ئەوکەسەی سەر و ژێر ئەکەی بە ئافرەت ، باسی ڕۆیین کردن و ڕۆ پێلادانی ( هێنەکەمم ) لێ مەپرسە ، کەڵکی ئەوەی پێوە نەماوە . بە هەستان و قنج بونەوە و ڕاکێشان و تەواوکردنا دەرئەکەوێ کەسێك ئەو سەر و ژێر پێکردنەی لەتوانادا بێ یا نە ، خۆ منیش لەوانەم نییە !

ئەم شیعرەش لە نوسخەکەی ( ك )دا ناتەواویی هەبو ، بە نوسخەکەی ( د ) ڕاستمان کردەوە .

(١٥) سەقیم : پڕ لە هەڵە . نەخۆش . موجەززا : لە یەك جیا بووەوە و شیرازە تێکچو . پارچە پارچە بۆ . عەوامیل : ناوی کتێبێکی سەرەتاییە لە زانستی نەحودا و ، ئیشارەتیشە بۆ هەر وشەیەك بەپێی ئەو زانستە کار لە وشەیەکی تردا بکا . هۆیەکانی ئیشکردن . ئەجزا : بەشەکانی کتێب . ئەندامانی لەش . ئالەتی عەمەل : زاراوەیەکی زانستی نەحوە بەو وشانە ئەڵێن کار لە وشەی تردا ئەکەن . ئەندامانی لەش کە بۆ خواپەرستی بەکار ئەهێنرێن . ( هێنەکەی ) بنیادەم . صەحوی ضەمیر : وشیار بونەوەی ضەمیر ، واتە بە شێوەی (ئیسمی ظاهیر) بەکارهێنانی (ضەمیر) کە جۆرە وشەیەکن لە شوێنی تایبەتیدا لەجیاتیی ئیسمی ظاهیر بەکارلەهێنرێن وەك ( ئێمە ، ئەوان ، ئەو ، من ، تۆ .. تاد ) . ئاگاداریی دڵ و لەبیرنەچونەوەی خوا . هەستانی ( شتە ) شاراوەکەی بنیادەم ..

کەوابۆ ئەم شیعرە بە سێ جۆر مەعنای لێ ئەدرێتەوە . مەعنایەکی (نەحوی) کە واتە : بەشەکانی کتێبی عەوامیلم ئەوەندە پڕن لە هەڵە و ، پارچە پارچە بوون ، کەڵکی هیچیان پێوە نەماوە و بۆ لیا خوێندن

حورۆفی جەڕڕە تێیانا نەماوە ئاوی عەمەل

هەمۆ موعەللەق و مولغایی عامیلی تەقدیر (١٦)

---

ناشێن ، وەك ( عامیل )یان لێ هاتووە لە زانستی ( نەحو )دا کە بەرەو ( ضەمیر ) بڕوا کاری تێبکا ، کە وشیاریەکەی ئەو ضەمیرە واتە حاڵەتی ( ئیسمی ظاهیر )یەکەی مەحو بووەتەوە و دیار نییە ، چۆن عەمەلی عامیلەکە بەو ضەمیرەوە دەرناکەوێ ، کەلکی ( عەوامیل )ەکەی منیش وا نادیار بووە .

مەعنای دۆهەمیش مەعنایەکی صۆفییانەیە ، واتە : دەست و پەلم کە هۆی خواپەرستیمن ، وا لەکارکەوتۆن و گوناە دەستی بەسەریانا زاڵ بووە ، وەك بڵێی توانای کاریان بەرەو ئەوە کەوتووەتە ڕێ کە وریا بۆنەوەی دڵ و دەرۆنم بفەوتێنن و بەیەکجاری نوقمی چاڵی گوناهم بکەن ..

مەعنای سێهەمیش کە لەگەڵ تێکڕای بابەتەکە ئەگونجێ و ، لەگەڵ شکات لە پیری و لێقەومانا جۆرە ، ئەوەتە : ئەندامە ئیش‌کەرەکانی لەشم وا نەخۆش و پەككەوتۆن و پەیوەندیان بەیەکەوە بڕاوە ، وەك ئەوەن کە چۆن هۆی ( کردن )یشم بەرەو ئەوە ئەڕوا توانای ( هوشیار ) بۆنەوە لە ( شلڕراوە )کەم بستێنێ !

(١٦) حورۆفی جەڕڕە : چەند وشەیەکن لە زمانی عەرەبدا کە چۆنە سەر ئیسم ( ژێر )ی ئەدەنێ . ئەملا و ئەولای گۆزە ، چونکە ( حورۆف ) جەمعی ( حەرف )ە واتە ئەملا و ئەولا و (جەڕڕە)ش بەمەعنا گۆزەیە . موعەللەق : زاراوەیەکی زانستی نەحوە بەجۆرە عامیلێك ئەڵێن لە هەندێ حاڵدا لە لەفظدا کار ناکا و لە مەعنادا ئەیکا . شۆڕبووەرە . مولغا : زاراوەیەکی‌تری زانستی نەحوە بە جۆرە عامیلێك ئەڵێن لە هەندێ حاڵدا نە لە لەفظ و نە لە مەعنادا کار ناکا . لەکار کەوتۆ . عامیلی تەقدیر : لە نەحوی زمانی عەرەبیدا جۆرە عامیلێك هەیە کاریش ئەکاتە باشەوەی و خۆیشی نییە ، بە خەیاڵ دائەنرێ ، ئەوە پێی‌ئەڵێن عامیلی تەقدیری . قەزا و قەدەری خوا .

مەعنای ئەم شیعرە و شیعری پاشەوە پێکەوەدێ .

حورۆفی ( د ) : ظورۆفی . بەم جۆرەش مەعناکە هەر دێت ، وەکو لە شیعری دوایدا دەرئەکەوێ ، بەڵام نوسخەکەی ( ك ) گونجاوترە .

به غەیری ( عەن ) کە لە بۆ نەزع و عەزلی زەلبۆرە
کە ڕاری ماری لەچێژێ عوسەیلەیی هەنجیر (١٧)

---

(١٧) عەن : یەکێکە لە حەرفەکانی جەڕ هەرگیز لەکارناخرێ ، مەعنای لادان ئەگەیەنێ . نەزع : داماڵین . عەزل : لەکارخستن . زەنبور : مێش هەنگ، مەبەست لێی ئارەزوی بنیادەمە . عوسەیلە : شیلە ، (ئاو)ی بنیادەم .
نالی لەم شیعرەدا کەڵکی لە دیمەنی وشەی (عەن) وەرگرتووە کە بە شێوەی نوسینی کوردیی جاران لەگەڵ ( عَن ) یەکلەگرێتەوە و مەعنای (نەیهێشت) ئەگەیەنێ . جا ئەگەر بە شێوە زۆکەشیەکەیان مەعنای ئەم دوو شیعرە لێبدەینەوە ، ئەوە وایە : حەرفەکانی جەڕ ئاوی ئیش کردنیان پێ نەماوە ، هەمو لەکار خراون و عامیلێکی تەقدیری کار لە پاشەوەباندا ئەکا ، تەنها ( عەن ) نەبێ کە لە کار ناکەوێ . بەڵام ئەم مەعنایە نە پڕ بە پێستی هەردوو شیعرەکەیە و نە شتێکیوایش ئەگەیەنێ . مەبەستی ڕاستەقینەی نالی ئەوەیە بڵێ : گونەکانم کە وەك دەسکی ئەملاولای (گۆزە) کەم وان ، ئاوی کارکردنیان تیا نەماوە و ، بە قەزا و قەدەری خوا لەکار کەوتون و بەملاو بەولای گۆزەکەدا شۆڕ بونەتەوە ، تەنها زێگرێك ماوە کار بکا ، ئەویش کارەکەی بونەوەیە نەهێڵێ (دەمی) شیلەی (هەنجیر) ، ( ڕاری مار )ەکەی بچێژێ . دەنکی هەنجیر دەمێکی بچکۆلەی هەیە شیلەکەی لێوە دێتە دەرەوە . شوبهاندنەکە لەوپادایە .

لەشکونجێ مەعناکەی وا لێبدەینەوە :... ئەویش کارەکەی بونەوەیە نەهێڵێ ( دەمی مار )ی ئارەزوم ، وەك مێش هەنگ ، بچێ بەسەر ( هەنجیر )ەوە بنیشێتەوە ، شیلەکەی بچێژێ . بەمپێیە ئەبێ وشەی ( ڕار ) بە ( زار ) بخوێنرێتەوە و ، ڕستەکەش دوو شوبهاندنی تیا ئەبێ ، لەلایەکەوە شوبهاندنی ( ئارەزو ) بە مێش هەنگ لەورووەوە وەك چۆن مێش هەنگ بەسەر گوڵەوە ئەنیشێتەوە شیلەکەی ئەمژێ ، ئەمیش بەسەر ( هەنجیر )ەوە ئەنیشێتەوە بۆ هەمان مەبەست . لە لایەکیکەشەوە شوبهاندنی بە ( مار ) لە دوو سەرەوە ، یەکەم ئەوە کە ئاڵەتی لەو ئارەزووە بەدیمەن لە مار ئەچێ . دوەمیش لەوەوە کە ( نەفس و ئارەزو ) لە ئەدەبیاتی ئاینیدا بە مار شوبهێنراوە . دیارە لەم شوبهاندنەدا نابێ ئەو تەناسوبەیش پشتگوێ بخرێ کە لەنێوان ( زەنبور ) و (عوسەیلە)دا هەیە کە بە عەرەبی بچوككراوەی ( عەسەل )ە .

وشەی ( عوسەیلە ) لەم شیعرەدا ئیشارەتە بەوەی لە حەدیثێکی

خورۆجی ( با ) لە لوصوق و ( عەلا ) لە ئیستیعلا
دوخۆلی عەتبەیی ( عەن ) فاصیلە لە تیری جەفیر (١٨)

---

پێغەمبەردا لەبارەی حەلاڵبونەوەی ژنی سێ تەلاقە دراوەوە بۆ مێردەکەی ، ئەفەرموێ « ... حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ » واتە : تا تامی شیلەکەی نەکەی .

(١٨) با : ب ، بێ ، یەکێکە لە حەرفەکانی جەڕ ، مەعنای (لوصوق) ئەگەیەنێ کە واتە لکانی شتێك بە شتێکەوە . ئەو مانازەی لەدواوە لە بنیادەم دەرئەچێ . دەستیش ئەدا ( باە ) بێ واتە هێزی ( کردن ) . لوصوق : ئەو مەعنایەی کە حەرفی جەڕی ( بێ ) ئەیگەیەنێ . قنگی بنیادەم چونکە لەکاتی دانیشتندا ئەنوسێ بە زەویەوە . عەلا : علی ، یەکێکە لە حەرفەکانی جەڕ مەعنای سەرکەوتنی شتێك بەسەر شتێکدا ئەبەخشی . ( هینەکەی ) پیاو کە بەرز ئەبێتەوە . ئیستیعلا : ئەو مەعنایەی کە ( علی )ی حەرفی جەڕ ئەیگەیەنێ . بەرزبونەوەی ( هینەکەی ) پیاو . عەتبە : عەتەبە ، بەردەرگا ، کەوشکەن . عەن : عَنْ ، یەکێکە لە حەرنەکانی جەڕ بۆ لادانی شتێکە لە شتێکی‌کە . ئیشارەتیشە بە (عَنّ)ی بە مەعنا شلەپەتەیێ . فاصیل : جوێکەرەوە . جەفیر : هەگبەیەکە لە دار پێستی پێوە ئەبێ ، یا لە پێست داری تیا بەکارنەهێنرابێ ، تیردان .

مەعنا ( نەحوی )یەکەی ئەوەیە : دەرچونی حەرفی جەڕی ( بێ ) لە گەیاندنی مەعنای لکانی شتێکەوە بە شتێك و ، دەرچونی حەرفی جەڕی ( عەلا ) لە گەیاندنی مەعنای سەرکەوتنی شتێکەوە بەسەر شتێکدا ، بەنیسبەت ئەم دۆ حەرفەوە لە حوکمی نزیك بونەوەدایە لە حەرفی جەڕی ( عەن ) و وەرگرتنی مەعنای ئەو کە لادانی شتێکە لە شتێك .

مەعناکەی‌تریشی ئەوەیە پیربونی بنیادەم بەرادەیەك کە ( با ) لەدوایەوە دەرچێ ، یا هێزی ( کردن ) لە ( پیا نوسان )یا نەمێنێ و ، دەرچونی هینەکەی (کە بەرز ئەبوەوە) ـ لە حالەتی (بەرز بونەوە)و،چونە بەر کەوشکەنی قونافی شلەپەتەیێ ، ئەمانەن ( تیر )ی ئەو بنیادەمە لە ( تیردان )ەکەی جوێ ئەکەنەوە .

وشەی ( عەتبەیی )مان لەسەر نوسخەکەی ( د ) بۆ ڕاست کرایەوە . لە نوسخەکەی ( ك )دا بە هەڵە نوسرابو .

ئەلیف نەکیرەوو بێگانە ، ئایەتە تەعریف
عەلەم موشابیهی غەیر و مولازیمی تەنکیر (١٩)

— ٤ —

تیر ناز نگەهك هر دلە نیجە یری وار
عاشقك پاینە زولفك گیبی یوزبك سری وار (١)

---

(١٩) ئەلیف : ( ال ) ، ئەلفلامی تەعریف . ئیشارەتیشە بە ( هینەکەی ) پیاو کە وەك تیپی ( ئەلف ) درێژە . نەکیرە : لە نەحودا ئەوەی کەسێ یا شتێکی نادیاری بکەیەنێ . نەناسراو . تەعریف : کردنی نەکیرە بە مەعریفە. ناساندن . عەلەم : وشەیەکە لە خۆیەوە کەسێك یا شتێکی دیاری بگەیەنێ . موشابیە : وەك. غەیر : غیر ، وشەیەکە لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر ئیضافەش بکرێتە پاڵ مەعریفەیەك هەر نابێ بە مەعریفە و بە نەکیرەیی ئەمێنێتەوە . مولازیم : هاوسەر . تەنکیر : نەکیرەیەتی . نەناسراوی .

مەعنا نەحویەکەی وایە : ئەلفلامی تەعریفەکەم لەو جۆرە ئەلفلامانە نییە کە نەکیرە ئەکەن بە مەعریفە و ، عەلەمیشم وەك وشەی ( غَیْر ) وایە چۆن ئەو بە ئیضافە نابێ بەمەعریفە و هەمیشە هاوسەری نەکیرەیەتییە ، ئەمیش هەرگیز نابێ بە مەعریفە .

مەعناکەی‌تریشی ئەوەیە ( هینە ) وەك ئەلفەکەم ئەوەندە بێ‌کارە و بەڵاکەوتەیە کەس ( نایناسێ ) و ناتوانم بە کەسی ( بناسێنم ) ! ( هینەکەم ) کە جاران وەك ( ئالاێ ) تنج بو ، وەك شتی‌کەی لێ‌هاتووە و ( کیر )یش بووە بەهاوسەری ( ئەن ) واتە لەش و لێی جیا نابێتەوە بڕوا بۆ ( جێیەك ) !

ئەشکونجێ ( ئەلیف ) بە ( ئەلێف ) بخوێنرێتەوە واتە ئولفەت پێوە گیراو و ، ( غەیر )یش بە ( کەسێکی‌تر ) مەعنای لێ‌بدرێتەوە . بەم‌پێیە مەعنای شیعرەکە وای لێ‌دێتەوە : لەبەر پیری و نەخۆشی وام لێ‌هاتووە ناسراو و ئولفەت پێوە گیراوم لا بووە بە نەناسراو و بێگانە و ( ناو )ی ناسراوم لابووە بە ( یەکێکی‌تر ) کە هەمیشە لە بەرچاوما نەناسراو بێ .

نالی لەم شیعرەیدا ، بە عادەتەکەی خۆی لە یاری‌کردندا بە وشە ، ئەوەشی مەبەست بووە کە ( نەکیرەوو بێگانە ) بە ( نە کیرەوو بێ گانە )ش بخوێنرێتەوە . شتی‌کەش هەبە زۆری لێ‌ئەچێ بە خەیاڵیا هاتبێ ، بەڵام بۆ باس‌کردن ناشێ . .

— ٤ —

(١) واتە : تیری نازی نیگات ، لە هەر دڵێکدا چەندین جێگە تۆکی هەیە ، وەك

اول مى زهره جبين در" بناگوشنه چرق
تامور سبعه سياره گيبى مشترى وار (٢)

بزم مى در ، ندما جمع ، قدح گرد شده
صوفى‌لك ورد و دعاى سحريله يرى وار (٣)

عكس زولفلك قدحى ديدەى گريانده
نشئەى سنبل تر" ، شيوەى نيلوفرى وار (٤)

ناودان قلم « نالى » فصاحتده همان
نشئەى آب بقا ، زمزمه كوثرى وار (٥)

---

چۆن زولفت بۆ بەستنەوەی پێی دلدار هەزار سەری لێ بووەتەوە .

(٢) واتە : ئەو یارە ڕوو وەك مانگی ، ناوچاو وەك ئەستێرەی زوهرەیە ، زۆری وەك حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکە ، گوێاری مرواریيەکانی بناگوێینی .

(٣) واتە : کۆڕی خواردنەوەيە ، هاوڕێيان کۆبوونەتەوە . پیالە لە گەڕانایە بەسەر دانیشتواندا . تەنانەت سۆفییش بە ویرد و دوعای بەرى بەیانیەوە جێگای هەیە .

(٤) واتە : وێنەی زولفت لە پیالەی چاوی پڕ لە ئاوی فرمێسکمدا ، نەشئەی سونبولی تەڕ و شێوەی گوڵە نێلوفەری هەیە .

(٥) واتە : پلوسکی قەڵەمی نالی ، لە ڕەوانیدا ، نەشئەی ئاوی حەیات و هێزی هەڵقوڵینی حەوزی کەوسەری هەیە .
ئەم پارچە شیعرە لە دەستنووسەکانی ( چر ) و ( ت ) و ( ك ) و ( مز )دا هەیە . بەڵام نوسخەکان گەلێ وردە جیاوازییان لە یەکتر هەبوو . لەبەر ئەوەی کە جیاوازییەکان لە تورکی نەزانین و ناشییەتیی نووسەرەکانەوە پەیدا بوبون ، پشت گوێمان خستن .
مامۆستا شکور مصطفی کارگێر و ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد ئەم پارچە شیعرەی بۆ ڕاست کردینەوە و مەعنای بۆ لێکدایەوە . هەر ئەویش بو بۆی دەرخستین کەوا جیاوازیی نوسخەکان هیی هەڵەی نووسەرەکانە .

لەم پارچەیەشدا ، وەك لە هەر پارچە شیعرێکی تریدا ، نالی گەلێ هونەری وشە ئارایی و مەعنا بلاویی بەکارهێناوە، بەڵام چونکە لێکدانەوەی

— ٥ —

هر ساعت گیپی ایشلرسه گر یاد ایله طاعتدر
بر آنك تورمه‌سی پیریولنه احیای ساعتدر (١)

— ٦ —

آن زلف مشکبار بدان روی چون نگار
گر کوته‌است ، کوتهی از وی عجب مدار (١)

شب در بهار میل کند سوی کوتهی
آن زلف چون شب آمد و آن روی چون بهار (٢)

---

ئەو وشەئارایی و مەعنا بڵاوبیانە لەسەر زانینی تورکی وەستابو و بێ‌ئەوە کەلکی بۆ خوێندەواری کورد نەبۆ ، ئیشارەتمان بۆ هیچی نەکرد .

— ٥ —

(١) ئەم تاقە شیعرەش هەر مامۆستا شکور مصطفی بۆی ڕاست کردینەوە و مەعنای بۆ لێکداینەوە . مامۆستا شکور نوسیویە ئەڵێ واتە : ئەگەر هاتو هەناسە وەك سەعات بە یادی خواوە کار بکا ، ئەوە خواناسی و تاعەتە . کۆك‌کردنیشی بۆ تاوێك لەڕێی خوادا ، زیندوکردنەوەی سەعاتە (بەمەعنا کات ، واتە زیندو کردنەوەی شەوە بە تاعەت ) . لە هەمان‌کاتا زیندو کردنەوەی سەعاتەکە خۆیشیەتی .

مامۆستا شکور نوسیویشە ئەڵێ : لەشکونجی ( گر یاد )ەکە هەڵەی نوسیار بێ و ڕاستەکەی ( گریان ) بێ ، واتە : ئەگەر بێتو هەناسە وەك سەعات بە دەم گریانەوە کار بکا . . تاد . هەروەها نوسیویە ئەڵێ : چەند مەعنایەکی‌تریش بۆ شیعرەکە دەست ئەدا ، بەڵام ئەم مەعنایەم لا لە هەمو پەسەندتر بو .

ئەم شیعرە لە نوسخەی (ت) و (مز)دا هەبو . لە هەردوکیانا لەبارەی ڕێنوسەوە بە هەڵە نوسرابوەوە ، مامۆستا شکور هێنایەوە سەر ڕێنوسی تورکی .

— ٦ —

(١) مەعنای ئەم دو شیعرە فارسییە پێکەوە دێن .

(٢) واتە : ئەگەر ئەو زوڵفە وەك موشك ڕەش و بۆن‌خۆشانەی ، بەسەر

. . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

ڕۆی وەك وێنە ـ جوانی یـارەوەن ، کورت بن ، هیچ سـەرت سـوڕ نەمێنن ، چونکە شەوی بەهار کورتە و ، مادەم ئەو زوڵفانەش وەك شـەو ڕەشن و ، بە لای ڕۆمەتی وەك بەهار گەشی یارەوەن ، بوون بە شـەو و ڕۆمەتیشی بووە بە بەهار .

ئەم دۆ شیعرە وەرگێڕراوی دۆ شیعری عەرەبین . لە هیچ کام لە نوسخەکانی بەردەستمانا نین . کاك جمـال محمدی تولـابیی ڕانکۆی سولەیمانی بۆی ناردۆین و نوسیویە لە مەلایەکی وەرگرتووە و مەلاکە پێیوتووە شیعری نالین . لە تێکستەکەی کاك جمالدا لەجیاتی ( گر ) نوسرابو (گە ) و لەجیاتی ( بهار )ی دێڕی دوایین ، نوسرابو ( نگار ) . بەلام ئەوە هەڵە بو ، ئێمە خۆمان ڕاستمان کردەوە .

# تیپی زێ

— ١ —

خاو و بێخاوی دو زوڵفی خاوم ئەز
چاوە چاوی یەك غەزاڵە چاوم ئەز (١)

گەر نیە ئاور لە سینەمدا بە تاو
بۆچ لەبەر قوڵقوڵ غەریقی ئاوم ئەز ؟! (٢)

---

— ١ —

(١) خاو ( ی یەکەم) : دژی گرژ : بێ خاو : بێ خەو . ئەز : من . چاوەچاو : چاوەڕوانی .

وانە : بیرکردنەوە لە جوانیی دۆ زوڵفە خاوەکەی یار ، خاو و بێهێزی کردوۆم و خەو و خۆراسی لێ هەڵگرتۆم . هەمیشە چاوەچاومە، بەملا و بەولادا ئەڕوانم ، بەڵکو یاری چاو وەك چاوی ئاسك جوانم بێت و ، ئیتر ئەم بێئیسراحەتییەم بەسی بێ .

لە کۆکردنەوەی ( خاو ) و ( بێخاو )دا ، بە دیمەن طیباق و ، لە مەعنادا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی ( یەك ) و (دۆ)یشدا هەم طیباق و هەم تەناسوب و ، لەنێوان ( چاو ) و ( خاو )دا جیناسی لاحیق هەیە .

خاو و بێخاوی ( عب ) و ( من ) : خاوی بێخاویی .

(٢) ئاور : ئاگر . قوڵقوڵ : قوڵەقوڵ ، قوڵدان . غەریق : خنکاو ، نوقم .

وانە : ئەگەر ئاگری عیشق لە دەرۆنمدا بەتاو نییە ، بۆچی لەبەر قوڵدانی مەنجەڵی سینەم لە ئاودا نوقم بووم ! مەبەستی لە فرمێسکی چاوەکانیەتی .

لە وشەی ( ئاور )دا ئیستیعارەی موسەڕڕەحە هەیە و ئیضافەی ئاور بۆ ( سینە ) نیشانەیەتی ، چونکە بە ( سینە )دا ئەزانین کەوا ئاگرەکە ئاگری ڕاستەقینە نییە و ، شەوقە شوبهێنراوە بە ئاگر ، ئەگینا ئاگر لە سینەدا چی ئەکا . لە کۆکرنەوەی ( ئاو ) و ( ئاور )یشدا طیباق هەیە .

ناری سینەم گەر نەبێ ، غەرقم ئەمن
ئاوی چاوم گەر نەبێ ، سوتاوم ئەز (٣)

غەیری زولفی تۆ کە ڕشتەی عومرمە
دەس لە ( مافیها )ی زەمان بڕیاوم ئەز (٤)

---

(٣) نار : ئاگر . غەرق : غەریق ، خنکاو .

واتە : زیانم لەسەر بون و کۆبونەوەی دوو شتی دژی یەك بەندە : ئاگر و ئاو ، ئاگری سینەم و ئاوی چاوم . ئەگەر ئاگری سینەم نەبوایە کە ئەوەندە بەتینە تەنانەت بەری ئاویشی پێ ئەگیرێ ، لەبەر ترمێسکی زۆری چاوم ئەخنکام و ، ئەگەر ئاوی چاوم نەبوایە کە ئەوەندە بەهێزە هەر ئاگرێکی بێتە پێش ئەیکوژێنێتەوە ، بە ئاگری سینەم ئەسوتام .

لە کۆکردنەوەی (نار) و (ئاو) و (غەرق) و (سوتاو)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( سینە ) و ( چاو )دا تەناسوب و ، لە یەکخستنی (ئەمن) و ( ئەز )دا ( تەرادوف ) هەیە .

ئاوی چاوم گەر نەبێ ( ت ) : ئاوی چاوانم نەبێ . .

(٤) ڕشتە : دەزوێ پێ هۆنینەوەی تەزبیح و ملوانکە و شتیوا . (مافیها)ی زەمان : ئەوەی لە جیهاندا هەیە .

واتە : دەستم لە هەرچێ لە زەماندا هەیە بڕاوە ، تەنها تاڵی زولفی تۆ نەبێ .

لە نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەدا زیادەڕەویەکی ئێجگار باڵا هەیە . ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەگەر زولفی یار نەبێ ، کە هەناسە هەناسەی عومری شاعیر بە یەکەوە ئەبەستێ ، هەر هەناسەیەکی عومری بگری دوا هەناسە ئەبێ و ، پەیوەندی بە شتێکی ترەوە نابێ بە دوای ئەودا بێ . لە نیوەی دوەمیشدا ، بە عادەت ئەبو بیوتایە دەستم لە جیهان و هەرچێ لە جیهاندا هەیە ( الدنیا و ما فیها ) بڕاوە ، نەك لە کات و هەرچێ لە کاتدایە . بەڵام ئەم لەگەڵ ( عومر )دا وشەی ( زەمان )ی بەکارهێناوە و ئەیەوێ بڵێ تەمەنم تەنها ئەوکاتەیە کە هەست بە پەیوەندێ لەگەڵ تۆ بکەم و ، جگە لەو پەیوەندیە باریکەم بە تۆوە کە زولفت ڕاگیری کردووە ، هیچ هەستێکم بە کات و هەرچێ لەکاتدا ڕوبدا نەماوە . .

ئەبو بیشیوتایە (مافیە)ی زەمان ، چونکە (زەمان) موذەککەرە ، بەڵام چونکە ئەم (مافیها)یەی لە (الدنیا و مافیها) ئیقتیباس کردووە کە وەك

تازە ئەبرۆت وسمە کێشاوە بە ناز
دڵ لەتی شمشێری تازەساوم ئەز (٥)

ئەی ڕەفیقان ! صوحبەتی « نالی » مەکەن
بۆچ ؟ کە من لەوڕا وەکو بەدناوم ئەز (٦)

---

مەثەل وایە و مەلەلیش ناگۆڕێ ، دەسکاریی نەکردووە .

(٥) وسمە : گیایەکە ژنان لەناو ئاودا ئەیکوڵێنن و برۆی پێ ڕەنگ ئەکەن . جۆرە خەنەیەکیشە ، ژنان ، پاش خەنە ، ئەیگرنە سەر بۆ ڕەش‌کردنی قژیان .

واتە : بـرۆت تازە بۆ نازکـردن بـە وسمە ڕەنگ کـردووە ، وەك شمشێرێ تازە لە هەسان درابێ . بۆیە من کە ئەو برۆیانەی تۆ ئەبینم ، دڵمیان پێ لەت ئەبێ ، وەك بە شمشێرێکی تازە ساو لەت کرابێ .

لەنێوان (تازە) و (تازە)دا جیناسی لاحیق و ، لە (شمشێری تازە ساو)یشدا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە . نیشانەکەشی باسی برۆکەیە .

(٦) صوحبەت : هاوڕێیەتی .

واتە : برادەرینە ! لێم دوور کەونەوە و هاوڕێیەتیم مەکەن ، چونکە من چارەم ڕەشە و ناوبشم زڕاوە و ، لەوانەیە هەرکەسێش لەگەڵم هەڵسێ و دانیشێ ، نەگبەتیی من کاری لێ بکا .

لەوڕا (لە) : لەبرا . لەوڕا وەکو (کم) و (من) : ڕیسوایەك و .

نیوەی دووەمی ئەم شیعرە لە هەموو نوسخە چاپەکانا بە هەڵە نوسراوەتەوە .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا وشەی جیاوازی لە گەلێ زاراوەی کوردیێ وەرگرتووە : وەك (ئەز)ی کرمانجیی سەرێ کە واتە : من (کە زۆر لە کرمانجیی خوارێشدا بووە ، وەك لەو بەندی پێشینانەی کە ئەڵێ : « ئەزم هەڵئەبەزم » و ئەوەی‌تر کە ئەڵێ : « ئەگەر زانییان ئەزم و ئەگەر نەیانزانی دزم » ) و ، (ئاور = ئاگر) و (خاو = خەو) و (لەوڕا و لەبرا = لێرەدا) و (بڕیاوم = بڕاوم) کە هەریەکی لە ناوچەیەکی کوردستانی ئێران بەکارئەهێنرێن .

لەمەی نالی کردوویەتی ، وەك کەرەستەیەك بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد و موتوربە کردنی بە هەموو زاراوەکان شتێکی بەبایەخە .

# تیپی ژێ

— ١ —

هەی کەرێکم بۆ ، چ پەیکەر ؟ طەی‌کەری هەوراز و لێژ
سینە پان و ، مۆچە کورت و ، شانە بەرز و ، گوێ درێژ (١)

---

— ١ —

(١) هەی : وشەی ئاگادار کردنەوە و دەربڕینی سەرسامییە . پەیکەر : تیمثال . طەی‌کەر : ڕێبڕ و ماندوو نەبوو . هەوراز : بەرەو ژوورە . لێژ : بەرەو خوارە . مۆچە : مۆچ ، دەست .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا تەعریفی گوێدرێژێکی خۆی ئەکا ، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆیەلی و ، دیارە سوودێکی زۆریشی بووە بۆی . ئەلێ : کەرێکی زۆر چاکم هەبوو .. چۆن کەرێ بوو ! . تێکسمڕاو و جوان داڕێژراو ، پەیکەرێك بوو ، بەرەو ژوورە و بەرەو خوارەی هەمسوو لەی ئەکرد ، وەك گوێدرێژی‌تر نەبوو کە ناتوانن بە بەرەو ژوورەدا سەرکەون و لە بەرەو خوارەدا داپەڕن .. تاد .

لە کۆکردنەوەی (طەی‌کەر) و (پەیکەر)دا وشە ئارایییەکی جوان هەیە ، هەرچەند ناگاتە پلەی جیناس . لەنێوان ( هەوراز ) و ( لێژ ) و ، ( کورت ) و ( درێژ )یشدا طیباق هەیە . لە ( گوێ‌درێژ )یشدا تەورییە هەیە .

نالی کە لەم شیعرەیدا وتوویە «هەی کەرێکم بۆ ..» و نەیوتووە «من کەرێکم بۆ» ، چەند مەبەستی بووە . یەکەم : ئەگەر بیوتایە «من ..» تاد لەوانەبوو ئەوەی ئەیخوێنێتەوە بسلەمێتەوە ، چونکە بەر لە تەواوکردنی نیوە شیعرەکە ، مەعناکە باش نابێت .. دووهەم : وشەی « هەیکەر »

بن زك و جەبهەت سپی ، کلك ئێستر و دامەن سیا
یەککە تاز و ، سێ بڕ و ، دوّ باد و ، شەش دانگ و درێژ (٢)

کەللە وەك جەڕڕەی شەرابی پر نیشاط و تەڕ دەماغ
شێری نەڕ ، ئاهوّیی بەڕ ، گورگی سەفەر ، قەمچی نەچێژ (٣)

مل عەلەم ، شیرین قەلەم ، ئاهو شکەم ، مەیموّن قەدەم
سم خڕ و کلك ئێستر و ، مەنزل بڕ و ، عارەق نەڕێژ (٤)

---

خوّی لە فارسیدا بە ئەسپی کوێت ئەڵێن و نالی گەیاندنی ئەم مەعنایەشی مەبەست بووە . سێهەم : «هەی کەر» مەعنای بانگەوازێکیش ئەگەیەنێ و ئەمەش بوّ ئێرە زوّر لەجێیە . چوارەم : دروستکردنی جوّرە هاوئاوازییەکیشی لەنێوان (هەی‌کەر) و (پەیکەر) و (طەی‌کەر)دا مەبەست بووە . بوّیە دیارە ئەوەی کە لە (م) و (گم) و (س)دا نوسراوە «من ..» تاد ، هەڵەیەکی ئاشکرایە .

لە هەموّ نوسخەکانی بەردەستمانا نوسراوە ( ج پەیکەر ) . بەلام ئێمە لامانوایە ئەمە هەڵەی نوسیارە و ڕاستەکەی ( چو پەیکەر )ە ، واتە : وەك پەیکەر ، چونکە بەم‌جوّرە مەعناکە ڕەسا دێ .

(٢) بن زك : ژێر سك . جەبهەت : تەوێڵ . دامەن : داوێن ، بەشی خوارەوّی هەر چوار پەل . سیا : ڕەش . یەککە تاز : بەتەنها غارکەر ، واتە لە هەموان پێش‌کەوتوّ . سێ بڕ : بوّمان ڕاست نەبوەوە چییە . دوّباد : کرژ ، توند و تێکسمڕاو ، دژی خاو و خلیچك . شەش دانگ : بێ کەم و کوڕێ . ■

کلك ئێستر (مز) : کلك و سەر و . سێ بڕ و دوّ باد و شەش دانگ و (چر) : دوّ بڕ و سێ باد و شەش دانگ و . (عم) : سێ پەڕ و دوّ با و شەش دانگ و . (ك) : سێ پەڕ و شەش دانگ و سێ باد و . (من) : سێ پەڕ و دوّ باد و شەش دانگ و .

(٣) جەڕڕە : کوّبە . تەڕ دەماغ : بە شەوق . نەڕ : نێر : ئاهوّیی بەڕ : وەك ئاسك لە بڕینی دەختاندا . گورگی سەفەر : وەك گورگ ڕاکەر لە سەفەردا . قەمچی نەچێژ : ئەوەندە باش و گورج ، پێویست بە قامچی پیادان نەکردوّ .

(٤) مل عەلەم : مل وەك ئالای بەرز . شیرین قەلەم : قەوارە ڕێختە و

■ چەند ئازایانە و زانایانە فەرموویانە مانای ( سێ بڕ ) نازانین
سەیر نیە ماموّستا و کورە زاناکانی مانای سێ بڕ یان نەزانیوە
چونکە ئەگەر لە گوند پێ‌بووبن دەگەلّ زانست سەروو کاریان بووە
و کاریان بە حەیوان نەبووە لە شێوەی موکریانی دا بوّ یەکسم سە

زەرق و زەرڕاقیی وەکو خاکستەر ، ئەمما بێ غوبار
بەرق و بەرڕاقیی وەکو پیرۆزە ، لاکین بێ کرێژ (٥)

سم وەکو یەشم و لە یەشم و توکی پێدا سەرنگون
چاو وەکو بیجادە یا دۆ شەو چراغی شوعلە رێژ (٦)

---

ڕێکوپێك . ئاهو شکەم : ناوقەد باریك وەك ناوقەدی ئاسك . مەیموون قەدەم : پڕ بە ڕزق و ڕۆزی . ئەڵێن ساڵی مەیموون ساڵێکی پڕ خێر و بەرەکەتە . یاخود پێ وەك پێی مەیموون . کلك ئێستر : کلك وەك کلکی ئێستر . مەنزل بڕ : ڕێگای دوور و درێژ تەی ئەکەر . عارەق نەڕێژ : ماندو نەبو .

لەنێوان (مەلەم) و (قەلەم) و ، (خڕ) و (بڕ)دا جیناسی لاحیق هەیە .
عارەق نەڕێژ (مز) : عانیق درێژ ، واتە مل درێژ .

(٥) زەرق و زەرڕاقی : شین ڕەنگی . خاکستەر : خۆڵەکەوە . بەرق و بەرڕاقی : شەوق‌دانەوە . کرێژ : کرێش .

واتە : شین کار بو وەك خۆڵەمێش ، بەڵام تۆزەکەی ئەوی پێوە نەبو . ئەشبریسکایەوە وەك پیرۆزە ، بەڵام بریسکانەوەکەی هیی ئەوە نەبو کرێشی پێوە بێ .

لەنێوان (زەرق و زەرڕاقی) و (بەرق و بەرڕاقی)دا جیناسی ناقیص هەیە .

لە نیوە شیعری یەکەمدا ئیشارەتێك بە ڕەنگی ( کەر و خۆڵەمێش ) کراوە .

لاکین (چر) و (کم) و (مـن) : ئەمما .

(٦) یەشم : یەکێکە لە بەردە گرانبەهاکان ، ئەتاشرێ . یەشم : خوڕێ . سەرنگون : ون . بیجادە : جۆرە یاقوتێکە . ئاقیق . مۆرۆی کارەبا . شەوچراغ : گەوهەری شەوچراغ . شوعلەڕێژ : تیشك بڵاوکەرەوە .

واتە : سمی کەرەکەم وەك بەردی یەشم وابو ، ساف و بێ‌گەرد بو ، لە توکی پێیدا نوقم بو . چاوەکانیشی وەك بیجادە یا وەك گەوهەری شەوچراغ وابون دەوروبەری خۆیان ڕۆناك ئەکردەوە .

لە (یەشم) و (یەشم)دا بە لەفظ جیناسی لاحیق و ، بە مەعنا طیباق هەیە ، چونکە یەکەم ڕەق و دۆهەم نەرمە . لە کۆکردنەوەی (یـێ) و
یانی کەر و ئێستر و ئەسپ بڕ لە بری ساڵ بەکار دەبرێ . یەکبڕ دووبڕ سێبڕە بەڵام کە سێ ساڵی تەواوکرد وشەی بڕ دەبێتەوە ساڵ مەسەلەن دەڵێن ئەم ئەسپە سێبڕە و شەرەی بێ مـاوە ئەوەشیان چوار ساڵە و بەرازەی دەرکردوە .
٦

گوێ درێژێ بار و کورتان بەرز و ، پالانی بەزێن

چوست و وریاتر لە گوێ کورتالی پالانی و گێژ (٧)

قانیعی بابی ڕەضا و ڕاضی بە پۆش و دڕك و دال

سالیکی صەبر و تەحەمول ، بوردەبار و هیچ نەوێژ (٨)

---

(سەر)یشدا تەناسوب و طیباقیش هەیە ، لەو ڕووەوە کە هەردوکیان دوو ئەندامی لەشن و ، یەکەمیان نەرمی و دووەمیان بەرزی ئەگەیەنێ .

دوو ( مـــز ) : وەك . *

(٧) پالانی ( ی یەکەم ) : ئەسپی کوتەل . جاران لە هەندێ ناوچەی کوردستان کە گەورە پیاوێك بمردایە ئەسپێکی تا بلێی شۆخ و جوانیان ئەهێنـــا لەیانڕازاندەوە ، جـل و بەرگی مردووەکەیـان ئەدا بەســـەردا و بـــە گۆرانییەکی تایبەتی لەیانلاواندەوە و خەلکیش بۆی ئەکەوتنە شـــین و شەپۆر . بەوەیان ئەوت کوتەل . پالان : کورتان . پالانی ( ی دووەم ) : ئەسپی گێژ کە بۆ سـواری دەسنەدا و هەر بۆ باربردن بەکاربهێنرێ .

واتە : گوێرێژەکەم گوێرێژێکی ئەوەندە چاك بـــو کورتانی بەرزی لێ ئەکرا و باری زۆری هەڵئەگرت ( مەبەســت لە بەرزیی بار زۆرییەتی ) . ئەسپی کوتەلی لەبەزاند ، یاخود کورتانەکەی بە زین ئەچوو . زۆر لـــەو بـیادەمە گوێ کورت و گێژ و وێژانە وریاتر بو کە وەك ئەســـپی بار بردن وان و هەر بۆ ئیش پێکردن باشن .

لە کۆکردنەوەی هەردوو ( پالانی )دا طیـباق و جیناس و ، لە کۆکردنەوەی ( گوێ کورت ) و ( گوێ درێژ )دا طیباق هەیە .

گوێ درێژی (چر) و (ك) : گـــوێ درێژ و . گوێ کورتـــانی پالانی و گێژ (چر) و (اح) : لە صـــەد لینســـانی هەرزە و گێژ و وێژ .

(٨) ســالیکی صەبـــر و تەحەممول : ڕێگـــای ســـەبرکردن و بـــاری مەینـــەت هەلگرتنی گرتبوە بەر . بوردەبار : باربردوو ، خۆڕاگرتوو . هیچ نەوێژ : بێدەنگ و گلەیی نەکەر . قانیعی بابی ڕەضـا : لە دەرگای ڕەزامەندیدا بە بەشی خۆی قنیات کردوو .

ڕەضـا و (چر) و (عم) و (مز) و (عب) و (من) : ڕەضـا . (کم) و (گم) و (عب) و (مـــن) : نەیێژ .

* بەشم ڕەنگی ڕەشە و سەی ڕەش بۆ هەموو یەکسەنێك یەسەندە •

عاقڵێ بۆ ناوی کەر بو ، قاطیعی ڕێگەی سەفەر
خۆش سلوکتر بۆ لە صەد وێڵداشی هەرزە و گێژ و وێژ (٩)

( صائم الدهر )ی بە ڕۆژ ، ئەمما بەڕۆژوی بێ نیەت
( قائم اللیل )ی سلوك ، ئەمما سلوکی بێ نوێژ ... (١٠)

چەندە پێم خۆش بۆ زوبانی حالی دەیوت « نالیا »
هەردو حەیوانین ، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ (١١)

---

(٩) قاطیعی ڕێگەی سەفەر : ڕێگەی سەفەری ئەبڕی . یاخود بوبو بە جەتەی ڕێگەی سەفەر ، مەبەست لەوەیە ئەوەندە تێزەو بو ، ئەتوت ڕێگەی سەفەر تاڵان ئەکا ، یاخود ڕێگای سەفەر لە ترسی ئەو نەمابو ، واتە ئەوەندە زۆ لەی ئەبۆ بە هۆی ئەوەوە . خۆش سلوکتر : ڕەوشت باشتر . وێڵداش : برادەر . ■

ڕێگەی (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) : ڕێگە و . خۆش سلوکتر (ك) و (اح) : خۆش جلەوتر . وێڵداشی (مم) و (گم) و (ك) و (مز) و (اح) : نیـــانی .

(١٠) صائم الدهر : ئـەوەی بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژو بێ . نیـەت : نیازی ڕۆژو گرتن . قائم اللیل : ئەوەی بە شەو هیچ نەخەوێ . سلوك : گرتنی ڕێگای سۆفییەتی .

نالی کە ئەم زاراوانەی کۆڕی خواپەرستانـی خواستـووە و لێرەدا بەکاری‌هێناون ، تەنها مەعنا زمانییەکانی مەبەست بووە . ئەیەوێ بڵێ گوێدرێژەکەم بەدرێژایی ساڵ بە ڕۆژ هیچی نەئەخـوارد ، چونکە هەر خەریکی ڕەنج‌دان بو و ماوەی ئالیك خواردنی نەبو . بەڕۆژو بو ، بەڵام فەرقی لەگـەڵ ڕۆژووەواندا ئەوەبو ئێوارە نیـەتی ڕۆژوی سبەینێی نەئەهێنا . بە شەویش تا بەیانێ بە پێوە ئەوەستا ، سەری دائەنەواند ، سلوکی ئەکرد ، بەڵام سلوکەکەی نوێژی لەگەڵ نەبو .

دوریش نییە هەر مەبەستی پلار تێگرتنی سۆفییەکان بوبێ .. هەمو ئەزانین دانوی لەگەڵیان نەکوڵاوە .

ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (ت) و (مز) و (اح)دا نییە . وابزانین ئەوانەی ئەو نوسخانەیان نوسیوەتەوە ، ئەو شیعرەیان بە بێ‌ئەدەبی زانیوە بەرابەر بەڕۆژووەوان و شەونوخنی کێشانی خواناس ، بۆیە نەیانوسیوەتەوە .

(١١) ئەم شیعرەی نـالی هەستێکی بەرزی ( دڵ بە گیانـەوەرانا سوتان )ی

■ وێڵداش وشەیەکی تورکییە و بە مانای ئاواڵ و هاوڕێ یە .

• • • • • • • • • • • • • • •

---

تیایه . نالی ، بەرابەر بەم شیعرەی شایانی ئەوەیە بە یەکەم هونەرمەندی کوردی گیانەوەر دۆست دانرێ .

چەندە (هەم) و (کەم) و (گەم) : هێندە . زوبانی حالی دەیوت (من) : زوبانی حاڵ کە دەیگوت .

## تیپی سین

— ١ —

که تۆ هاتی له ئەومیدی ئەما باس
له هیجر و ئینتیظار ئیدی ئەما باس (١)

له سایەی زولفی تۆوە شەو درێژە
له صوبح و نوری خورشیدی ئەما باس (٢)

---

— ١ —

ئەم قەسیدە و قەسیدەی پاشەوەی له هەمو نوسخەکانی بەردەستمانا، تەنها نوسخەکەی ( گـم ) نەبێ ، خراونەتە ( تیپی ش )وە و وشەکانی (باس)ی لەنگەری شیعرەکانی بە (باث) نوسراون . ئێمە ئەممان بە هەڵە زانی ، چونکە هەرچەند (باث) له (بەحث)ەوە هاتووە و دوا پیتی (بەحث)یش (ث)یە ، مادەم تێکڕای وشەکە دەسکاری کراوە و (ح)کەی کراوە بە (ئەلف) و (ث)کەی بە (سین) ئەخوێنرێتەوە ، ئیتر بۆچی بە (سین)یش نەنوسرێ !

(١) ئەومیدی : نائومێدی . هیجر : دوری . ئینتیظار : چاوەڕوانی . ئیدی : ئیتر .

واتە : که تۆ هاتی ، بە دیدارت شاد بوین و ئاواتمان هاتەدی و ، ئیتر باسی نائومێدی و دوری و چاوەڕوانی لەئارادا نەما ، چونکە ئەو باسانە باسی کاتێ بون:که تۆ هێشتا دیار نەبوی و بە دەرکەوتنت پێویستیان پێ نەما .

هەڵیش ئەگرێ (ئەومیدی) بە (ئەوم ئیدی) بخوێنرێتەوە ، واتە : که تۆ هاتی ، ئیتر باسی خەو لەناو ئاوانا نەما .

ئینتیظار ئیدی (مز) : ئینتیظاری تۆ .

(٢) واتە : بە هۆی هاتنی تۆوەیە بەو زولفە ڕەشە درێژانەتەوە ، وا

فەلەك تۆی دا كە ئەمشەو ڕۆژمان بتۆی
لە ڕەجمی نەجمی ناهیدیێ ئەما باس (٣)

---

شەوگاریش درێژ بووە و باسی بەیانی و تیشكی خۆر لەئارادا نەماوە .

لە كۆكردنەوەی (شەو) و (ڕۆژ)دا طیبـاق و ، لە (ڕۆژ) و (نوور) و (خورشید)دا تەناسوب هەیە .

تۆوە شەو (عم) و (ت) : تۆیە شەو . (مز) : تۆ وەك .

(٣) ڕەجمی نەجم : لە قورئانا هەیە كەوا كاتێ ئەستێرە بە شەو ئەكشێ ، بۆ ڕاونـان و دەركـردنی ئەو ئەهریمەنانـە لەچێ كە چوون گـوێ لە دەنگ‌وباسی فریشتەكانی ئاسمان بگرن . ناهید : ئەستێرەی زوهرە كە پێیشی ئەڵێن زوهرەی ڕەققاص و لۆریش گەش و ڕۆشنە .

واتە : فەلەك تۆی بە ئێمە بەخشی ، هاتیتە لامان و شەوی تاریكت بۆ كردین بە ڕۆژی ڕۆشن . بۆیە ئیتر مەیدانی ئەوە نەما ئەهریمەنەكان بچن گوێ لە دەنگ‌وباسی فریشتەكانی ئاسمان بگرن و ، كە مەیدانی ئەوەش نەما ، هیـچ پێویستیەك نامێنێ خوا ئەسـتێرەی وەك ناهید گەشـیان بـە دوادا بكشـێنێ ، ڕەجمیـان بكا پێی و لـە ئاسمانیان دوورخاتەوە و ، ئەو بابەتە لەئارادا نەما .

یاخود بە هاتنی تـۆ ڕۆژ بووەوە و مەیدانی ئەوە نەمـا ئەهریمەنی بەدكار خۆی لە تاریكاییدا داگرێ گوێی لە ڕاز و نیازی نێوانمان بێ و ، ئێمەش ــ وەك چۆن ئەستێرە شەیتان ڕەجم ئەكا ــ بچین ئەو بەردەباران بـكەین و دووری‌بخەینەوە . هەروەها پێویـست بە ئەسـتێرەی ناهیدی سەماكەریش نەما كۆڕمان برازێنێتەوە ، تۆ جێگەی ئـەوت گرتەوە .

بەگوێرەی ئەم مەعنایە ئەبێ بخوێنینەوە : لە ڕەجم و نەجمی ناهیدیێ .. تاد ، وەك لە نوسـخەی (مب)دا نوسراوە .

نالی لە شیعری دوهەمی ئەم قەصـیدەیدا یاری كرد بە هۆی داهاتنی شەو . وا لێرەشدا كردی بە هۆی ڕۆژبوونەوە . جارێكیان لە زولفەوە بۆی چو ، دنیای پێ كرد بە تاریكـستانێ . جارێكی‌تریش لە ڕوومەوە بۆی هات ، جیهانی پێ كرد بە ڕۆژی نیوەڕۆ . بە هەڵهاتنی لە شەودا كردی بە نیشانەی ئاخر زەمان كە ڕۆژ لە ڕۆژاواوە ، واتە بە شەو ، هەڵدێ .. وابزانین مەبەستی لەم هەمو داهێنانە ئەوەبێ بڵێ یار هەمو سەرێكی ژیانی لەوی گرتووەتەوە : ڕۆژیەتی ، شەویەتی ، مانیەتی ، مردنیەتی ، لەم دنیایەتی ، ئەو دنیایەتی ..

حەوادیث جام و ، دەوران بۆ بە ساقی
لە بەزمی جامی جەمشیدی نەما باس (٤)

شوکر جەمعییەتێکی بێ نیزاعە
لە شەڕڕی موددەعی و کەیدی نەما باس (٥)

---

لە کۆکردنەوەی (شەو) و (ڕۆژ)دا طیباق و ، لە یەکخستنی (شەو) و (نەجم) و (ڕەجم) و ، (فەلەك) و (نەجم) و (ناهید)دا تەناسوب و ، لەنێوان (نەجم) و (ڕەجم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

بۆی (مم) و (گم) و (مب) : بی . ڕەجمی نەجمی (گم) : نەجم و ڕەجم و . ناهیدی (چر) و (چن) و (مز) : نەومیدی . ئەگەر هەڵەی نووسیار نەبێ ، ئەبێ بەپێی ئەم نوسخانە (ڕەجم) بە گومانی بێجێ و ، (نەجم) بە ئەستێرەی بەخت مەعنا لێبدەینەوە و دیارە (نەومیدی)یش نائومێدییە . واتە : بە هاتنت نائومێدی و گومانی بێجێ بردن و ئەستێرە گرتنەوە بۆ زانینی هەواڵی هاتن و نەهاتنت ، لەئارادا نەما .

(٤) حەوادیث : جەمعی حادیثەیە واتە ڕۆژدار . جام (ی ـ یەکەم) : جامی مەی . دەوران : هەڵسوڕانی گەردوون . جامی جەمشید : جەمشید یەکێك بووە لە پادشا ناودارەکانی ئێران ، ئەڵێن ئاوێنەیەکی بووە دنیای تیا دیوە . ئەوە جامەکەیەتی .

واتە : ڕۆژداری خۆش بووە بە پیاڵەی مەی و ، چەرخی گەردوون بووە بە مەیگێڕ ئەو پیاڵانە بەسەر خەڵکدا ئەگێڕێ و ، هەرکەس بگری شتێکی خۆشی لێ ڕۆژداوە و ، کەس باسی بەزم و ڕەزمی جامی جەمشید ناکا .

لە کۆکردنەوەی هەردوو (جام)دا جیناسی تەواو هەیە .

جام و (مم) : بەزمی . (گم) و (مب) : بەزم و .

(٥) کەید : فێڵ .

شەڕڕی (ت) : سیڕڕی . موددەعی و کەیدی (مب) و (اح) : موددەعی کەیدی . بەمپێیە ئەبێ (کەیدی) بە (کەی دی ؟) بخوێنرێتەوە ، هەروەك ئەم جۆرە خوێندنەوەیە لەگەڵ تێکستی پێشوویشدا ئەگونجێ .

ڕەقیب و موددەعی هەردوو لە خەودان
هەتا چەن ساعەتێکی‌دی ئەما باس (٦)

سەماعە ، گەردشی عیشقە ، حەقیقەت
لە سۆفی و ڕەقصی تەقلیدی ئەما باس (٧)

لە سایەی قەددی مەوزوون و دوو زولفی
لە « نالی » و شیعر و تەسویدی ئەما باس (٨)

— ٢ —

لەکن ئەو جەوهەرە فەردە لە هەیولا نیە باس
لە حیکەم پەروەریی بۆ عەلی سینا نیە باس (١)

---

(٦) ڕەقیب : بەدکار .
لە پەیوەندی ئەم بەیتەدا بە بەیتی پێشووەوە حوسنی تەعلیل هەیە .

(٧) سەماع : گوێ لە گۆرانی گرتن . گەردش : هەڵسووڕان .
واتە : بەزمی گوێ لە گۆرانی ڕاگرتن و ، هەڵسووڕانی خۆشەویستی و ڕاستکاریە . باسی سۆفی و سەمای ناڕەسەن و لەسەر شێوەی چاولێکەری و لاسایی‌کردنەوە نەماوە لە ناوا .

سەماعە ، گەردشی عیشقە (مب) : سەماعە و گەردشی عیشقە و .
(اح) : سەماعەی گەردشی عیشقە . ڕەقصی تەقلیدی (اح) : ڕەقص و تەقلیدی .

(٨) قەدد : باڵا . مەوزوون : ڕێکوپێک . تەسوید : نووسراوی پاکنووس نەکراو .
واتە : کە باڵای ڕێکوپێک و جووتە زولفی ڕەشی یار هاتە مەیدانەوە ، باسی نالی و شیعرە ڕێکەکانی و ڕەشنووسەکانیان لە مەیدانا نەما . ئێستا زۆر زۆری یار و باڵای ڕێک و زولفی ڕەشی ئەوە . هیچ کەسێکر لەعاستیا هیچ نیە و ، هیچ شیعرێك ئەوەندەی ئەو ڕێك نایێ و ڕەشیی هیچ نووسراوێك ناگاتە ڕەشیی زولفەکانی ئەو .
زولفی (چر) و (ت) و (مز) : زولفت .

— ٢ —

(١) جەوهەری فەرد : ئەو مادده بچکۆلەیەی بەش‌کردن هەڵناگرێ .

صۆفییان هاتنە مەجلیس وەرەقی دیدە بشۆن
لەگن ئەو دێمییە وشکانە لە دەریا نییە باس (٢)

---

بەرابەرەکەی جەوهەری مورەککەبە . هەیولا : ماددە . حیکەم : جەمعی (حیکمەت)ە واتە ژیری و زانایی . ناوی یەکێکیشە لـە زانستـەکان کە ئەگەر لەگـەڵ زاراوەی زانستیی ئەم چەرخـەدا بەراوردی بـکەین ، فەلسـەفە و پزیشکی و فیزیا و دەروون شناسـی ئەگرێتەوە . بوعەلی سینا : زانـا و فەیلەسوفی بەناوبانگی ئیسـلام ، (٩٨٠-١٠٧٣) ، لە بوخارا لەدایك‌بووە و لە هەمەدان مردووە .

واتە : یار ئەوەندە ناسکە وەك جەوهەری فەردی لێ هاتووە و باسی ماددە و هەیولا و صـورەتی لا ناکرێ . مایەی چاك بونـەوەی دەردی دڵدارانیشـە ، بەزادەیەك حەکیمێکی زانای وەك ئەبو عەلی ئیبنوسینا باسی ، لەعاستی ئەوا ، لەئارادا نەماوە .

نالی ، بە عادەتەکەی خۆی لەوەشی ویستووە کە وشەی (هەیولا) کە بە شـێوەی جارانی نوسـین ئەنوسـرا (هیـولا) ، بە (هەیـە و لا)ش بخوێنرێتەوە ، واتە : یار گوێی لە هیچ نییە و (هەیە و نییە)ی لا نییە .. هەروەها ویستوشیەتی (سینا) بە (سینە)ش بخوێنرێتەوە ، واتە : گوێ بە سنگی وەك ئیبنوسینا حیکمەت پەروەری من نادا .

(جەوهەری فـەرد) و (هەیولا) لـە زاراوەکانی عیلمی حـیکمەتن .

جەوهەرە (گم) : جەوهەری .

(٢) وەرەقی دیدە : ئەو کاغەزەی ئەدرێ بەسەر دەموچاودا بۆ شاردنەوەی دێوجامە . دەریا : بەحر ، مەبەست لە ڕاستییە .

واتە : سۆفییەکان هاتنە مەجلیسی ئێمە بە فرمێسکی درۆ دێوجامەی چاپلوسی و ڕیای سـەر دەموچاوی خۆیـان دابشـۆن . نـازانن ئـەو دێوجامەیە بە ئاوی دەریای ڕاستی و هەق‌پەرستی نەبێ داناشۆرێ ، بەڵام ئەوان دێمی و وشکن ، شارەزای دەریـا نین ، ئیتر لەکوێ بگەنە سەر دەریا ڕوی درۆزنانەی خۆیان داشۆن .

(دەریا) بەمەعنا خواش هاتووە . بەم‌جۆرەش مەعنـاکە هەر دێ و ئاشکرایە .

لەوانەشە وشەی (وەرەق) ئیشـارەت بێ بۆ ئەو گەڵای بەهەشـتەی کە ئادەم و حەووا پاش گەنم خواردن و عەورەت دەرکەوتنەکەیان لە بەهەشتا

بەزمی ڕەندانە ئەمە ، مەلعەبەیی وەعظ نیە
لە بەد و نێکیو قەللابییی دونیا نیە باس (٣)

ئەمە جێی ڕەمز و ئیشاراتی دەروونە ، لە گەرووی
تەنگی پڕ غەرغەرەیی واعیظی غەڕڕا نیە باس (٤)

بە سەراوێژەیی چاوێنەیی کەللەی سەریان
لە کەی و قەیصەر و ئەسکەندەر و دارا نیە باس (٥)

---

مەورەلی خۆیان پێ دائەپۆشن و ، کە خوا لـە بەهەشتی دەرکردن ، ئەویش لەسەر مەورەلیان کەوتە خوارەوە . ئەگەر وابێ ، نالی هاتووە دەموچاوی سـۆفیـە ڕیاکارەکانی شوبهاندووە بە مەورەلی ئەوان !

ئەشتوانرێ (وەرەق) بـە (وەریق) بخوێنرێتەوە واتە پـارەی زیو . بەمپێیە ئیشارەتێکی نالەواوی تیا ئەبێ بۆ حیکایەلی (اصحاب الکهف) و وای لێ دێتەوە سـۆفیـەکان لە ئەشکەوتی خەلوەتخانـەی خۆیانەوە هاتن بۆ شـاری کۆڕی دلداران ، پـارەی لە ڕەواج کەوتـوی خۆیان بگۆڕنەوە .

لەنێوان (بشۆن) و (دێمن) و ، (وشکانە) و (دەریا)دا طیباق و ، لەنێوان (بشۆن) و (دەریا) و ، (دلمن) و (وشکانە)شدا تەناسوب هەیە .

(٣) ڕەند : عاشق . مەلعەبە : گالتەجاڕ . نێکی : چاکە . قەللابێ : بێبارێ .

مەعنای ئەم شیعرەش ، وەك شیعری پاشەوەی ، پەیوەندی بە شیعری پێشووەوە هەیـە . واتە : بـا سۆفیی ڕیـاکار زۆر نەکاتە ئەم کـۆڕی ئێمەیە . کۆڕی ئێمە کۆڕی دلدارانی ڕاستەقینەیە و ، گالتە بازاڕی ئامـۆژگاریی بێکردار نییـە . ئێمە بە نـاخی خۆشەویستیی ڕاستدا چوینەتە خوارەوە و ، خۆمان بە باسی چاکە و خراپە و بێباریی دنیاوە خەریك ناکەین .

نێکیو (مز) نێکییی .

(٤) غەرغەرە : خرەخر و گیرانی قوڕگ و دەنگ دەرنەهاتن . غەڕڕا : بایێ .

واتە : کۆڕی ئێمە کۆڕی دلدارانە ، بە ئیشـارەت و ڕەمزی دەروون قسەی تیا ئەکرێ ، مەیدانی ئەوە نییە واعیظی لەخۆبایێ ، بێ بە گەرووی گیراو و هەناسەی سواریەوە دەستی تیا بکا بە پەند و ئامۆژگاری .

(٥) سەراوێژە : سەری داهێلراو و شۆڕ کراوە . چاوێنە : وەك لەناو چاڵ

**جێی زوبان گرتن و دڵ ڕۆشنی‌یو سۆتانە**
**موتەدا شەمعە کە خامۆش نیە ئەما نیە باس (٦)**

---

(چالە ئاو)دا . کەی : کەیخوسرەو یا کەیکاوس کە دۆ شای ئێران بوون . ئەسکەندەر : ئەسکەندەری مەکدۆنی کە لای هەولێردا لەشکری دارای شای ئێرانی بەزاند و وڵاتەکەی داگیر کرد . دارا : داریۆش ، دوا پادشای بنەماڵەی هەخامەنشی کە ئەسکەندەری مەکدۆنی بەزاندی .

واتە : بەهۆی سەر داهێلانی ، وەك بەسەر چالە ئاوا شۆڕکراوەی ئەم دڵدارانەوە کە سەرخۆشی بادەی خۆشەویستیی ڕاستەقینەن ، باسی هیچ بابەتێکی دنیایی لە کۆڕی خواردنەوەیاندا نەماوە و ، کەس ناوی قەیسەر و ئەسکەندەر و دارا ناهێنێ .

ئەشتوانرێ نیوە شیعری دۆهەم بەم‌جۆرە بخوێنرێتەوە :

**بەسەر ئاوێزەیە چا وێنەیە کەللەی سەریان**

واتە : کەللەی سەریان بەسەر پیاڵەی بادەدا شۆڕ کردووەتەوە ، وێنەی کەللەی سەریان لە پیاڵەی شەرابەکەدا وەك وێنەی کەللەسەری بەسەر چالەئاوا شۆڕکراوەوە وایە .. ئاگایان لە دنیا نییە و هیچ باسێکی دنیایی ناهێننە ئاراوە .

ڕێشی تێ‌ئەچێ (چا وێنەیی) بە (چاوێنیی) بخوێنرێتەوە ، بەوپێیە مەعناکە بە جۆرێکی‌تر لێ‌ئەدرێتەوە ، لەجیاتی ئەوەی باس باسی دڵدارانی ڕاستەقینەی کۆڕی بادەخواران بێ ، ئەبێ بە باسی صۆفیبانی دۆزۆ . واتە : ئەم سۆفییە بە دیمەن لە خوالرس و سەر دانەواندووانە ، ئەوەندە بۆش و کەللە پۆچن کەللەسەریان بۆ ئەوە ناشێ ئەنانەت بۆ مەنعی چاوی پیسیش هەڵواسرێ . ئەوەتە لە نەگبەتی و بێ‌کارەیی کەللەسەری بۆ چاوێنی بە ملا شۆڕ کراوەی ئەوانەوە ، باس و خواسی کەیخوسرەو و قەیسەر و ئەسکەندەر و دارا لەئارادا نەماوە .

بە سەراوێزەیی (عم) و (گم) و (ت) و (مز) : لەبەر ئاوێزەیی .

(٦) موتەدا : چاولێ‌کراو . خامۆش : بێ‌دەنگ . کوژاوە .

واتە : کۆڕی دڵدارانی ڕاستەقینە جێی ئەوەبە مرۆی تیا بێ‌دەنگ بێ ، بسۆتێ ، دڵی ڕۆشن بێ . چاو لە مۆم بکا تیایدا کە بۆ خۆی ئەسۆتێ و ورتەی لە دەم نایەت ، بەڵام دەوروبەری ڕۆشن ئەکاتەوە . بە دیمەن سەیری ئەکەی ، باس و خواسی نییە ، بەڵام لەڕاستیشدا

حەضرەتی هەیبەتە ، لەك غەیبەت و ڕەیبەت « نالی »
ئەللا ئەللا ، چ حوضوورێکە کە ( أصلاً ) نیە باس ! (٧)

— ٣ —

سابوونی کەفی پێیە کەفی زاری چاپلووس
خاسیەتی ڕەقیی هەیە نەرمیی زوبانی لووس (١)

---

بێدەنگ نییە ، چونکە دەنگی ڕاستەقینە ئەوەیە ئەنجامەکەی کار بێ و ، کاریش نییە لە کاری مرۆم بە بەرهەمتر کە بەرچاوی خەڵک ڕوون ئەکاتەوە .

لەنێوان (خامۆش نییە) و (نییە باس)دا طیباق هەیە .

(٧) حەضرەت : حازربێ . هەیبەت : سام . ڕەیبەت : گومان و دوودڵی .

واتە : کۆڕی دلدارانی ڕاستەقینە جێگای حازربی ترس و سامی خوایە و ، وەك کۆڕی سۆفییە تەنها بەدیمەن لەخواترسەکان ، جێگای پاشملە وتنی ئەم و ئەو و دوودڵی و گومان لەم و لەو کردن نییە . خوایە ! ئەمە چۆن حازربوونێکە بنیادەم ئەوەندە تووڵ هەستی پێ ئەکا ، باسکردنی بە هیچ کلۆجێ تیا پێویست نییە ، چونکە (باسکردن) بۆ کاتێ دەستئەدا باسکراوەکە خۆی دیار نەبێ .

ڕەیبەت (مز) : ڕەهبەت . (مب) : ڕەغبەت .

— ٢ —

(١) کەفی پێ : بەری پێ . زار : دەم . چاپلووس : مەرایی‌کەر و شانتەکێن . خاسیەت : نیشانەی تایبەتی . ڕەقیی : سابوونی ڕەقی .

واتە : لەبی دەمی پیاوی مەرایی‌کەر و ڕیاباز ، لە کاتێکا کە ئەدوێ و مەرایی ئەکا و کەف ئەچەرێنێ ، سابووناوی بۆ قسە لەگەڵ کراوەکە پێیە ، لەبەرپێیا بیڕێژێ تا هەڵیخلیسکێنێ .. یاخود ئەو کەفەی لە دەمی پیاوی مەرایی‌کەر و ڕیاباز ئەڕژێتە سەر زەوێ ، سابووناوی بەرپێیە ، بۆ هەڵخلیسکاندنی قسە لەگەڵ کراوەکەی ڕشتووە . نەرمیی زمانی لووسیش ، بۆ خەڵك هەڵخەڵەتاندن ، خاسیەتی سابوونی ڕەقیی پێوەیە و کە بنیادەمی دا بە عەرزا زرمەی لێ هەڵدەستێنێ .

ئەی دڵ ! خەراجی حاصلی ظولماتی بەحر و بەڕ
میراتی ئیعتیبارە لە فورزەندی فەیلەقوس (۲)

بونیانی کیبر و سەرکەشییە طاقی کیسرەوێ
داتانی ظولم و ڕۆژەشییە تەختی ئابنوس (۳)

---

بە نیشانەی شیعرەکانی پاشەوەدا ، وابزانین مەبەستی نالی لەم چاپلوس و زمانلوسە ( دنیا ) یێ کە بنیادەم لە خشتە ئەبا ، بەلام بە تێکڕایش هەر ڕاستە و دەست ئەدا .

لە کۆکردنەوەی ( کەنەف )و ( کەف )دا جیناسی ناقیص و ، لە ( ڕەنقێ ) و ( نەرمێ )دا طیباق و ، لە ( زار ) و ( زوبان )دا تەرادوف و ، لە ( ڕەقێ ) خۆیدا بەتایبەتی لەطافەت هەیە ، چونکە مەعنای وشەکە بە عەرەبی پێچەوانەی مەعنا کوردییەکەیەتی .

پێیە ( « بەراوێزی » چر ) و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (لد) و (مز)و ( اح ) و ( مب ) و ( من ) : پێتە .

(۲) ظولمات : تاریکێ ، بێ . ئیعتیبار : پەند وەرگرتن . فورزەندی فەیلەقوس: ئەسکەندەری کوڕی فیلیپی مەکدۆنی .

واتە : ئەی دڵ ! ئەوەی لە بەروبومی بنی دەریا و وشکانی بۆ بنیادەم ئەمێنێتەوە ، تەنها ئەو میراتەیە کە لە پێشینان بۆمان ماوەتەوە ، کە ئەوەتە پەند لە ژیانی ئەسکەندەری کوڕی فیلیپی مەکدۆنی وەرگرین کە دنیای هەمو گرت و ، کە مردیش لە بستێ زەوێ و چەند پارچە جاو زیاتری پێ نەبڕا .

ظولماتی بەحر و ( « بەراوێزی » چر ) و (چن) و (ت) و (لد) و(مز) و ( اح ) : ظولمەت لە بەحر و .

(۳) بونیان : کۆشك و سەرا . کیبر : فیز . سەرکەشێ : یاخیگەرێ . طاقی کیسرەوێ : تاقی کیسرا کە پاشماوەکەی ئێستا لە نزیکی شاری سەلمان پاکەوەیە . ئابنوس : درەختێکە دارەکەی زۆر قورس و ڕەقە .

واتە : تاقی کیسرا کە سەری گەیشتبوە کەشکەلانی ئەلەك ، کۆشکی فیز بەسەر خەلکا کردن و لە خوا یاخی بۆن بو . تەختی لە دار ئابنوسی ڕەشی بریقەداریش نیشانەی جەور و ستەم و ڕۆژەشیی ئەو پادشایەیە لە سەری دائەنیشێ .. نالی ئەیەوێ بڵێ : هەر ئەوەی کە زۆرداران بە

بنوازە بوونی ئەووەڵت و چوونی ئاخرت :
هاتنی چ ڕووت و قووت و ، هەڵاتنی چ لووس و پووس !؟ (٤)

گەر فەڕ و تاج و زینەت و شەوکەت وەفای دەبوو
بێ دەردیسەر دەمانەوە بۆ طاوس و خەڕووس (٥)

---

نیشانەی گەورەیی خۆیانی دانەنێن ، هەر ئەوە خۆی نیشانەی هیچ و پووچییانە .

لە یەکخستنی (بونیان) و (تاق) و (تەخت) و ، (ڕۆژەش) و (ئابنووس)دا تەناسوب هەیە .

(٤) واتە : ئەی ئادەمیزادی لە خۆ بایی بوو ! بیری لە خۆت بکەرەوە ، چۆن هاتیتە دنیاوە و چۆن ڕۆیشتی .. بە ڕووت و قووتی لە دایك بوویت و بە تاڵان کراوی و ڕووت کراوەیی ڕۆیشتی .. کەواتە دنیا بۆ ئەوە ناشێ پشتی پێ ببەستی ..

لە یەکخستنی (بوون) و (چوون) و ، (ڕووت) و (قووت) و ، (لووس) و (پووس)دا جیناسی لاحیق و ، لە یەکخستنی (ئەوەڵ) و (ئاخر)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی (ڕووت و قووت) و ، (لووس و پووس)دا تەناسوب هەیە .

لە وشەی (هاتن) و (هەڵاتن)دا ئیشارەت بۆ ئەوە کراوە کە بنیادەم کە دێتە دنیاوە ئاگای لە هیچ نییە و بەئاسانی دێ . بەڵام پاشان ئەوەندە ئەرك و مەینەتی ژیانی بەسەرا ئەڕژێتەوە ، خۆزگەی مەرگی خۆی ئەخوازێ و ئەیەوێ لە دەس ژیان هەڵبێ .. هەروەها لە وشەی (لووس و پووس)یشدا ئیشارەتێك بۆ ئەوە کراوە کە بنیادەم کە مرد ، هەرچی هەیە ، ، میراتگر لێی دائەماڵن بۆ خۆیان و ساوسیوەی لەدەن و لەوجا حەواڵەی ئەو دنیای ئەکەن .

(٥) فەڕ : جوانی . خەڕووس : کەڵەشێر .

واتە : ئەگەر جوانی و تاج و شان و شکۆ وەفایان بووایە ، بەئاسانی بۆ تاوس و کەڵەشێر ئەمانەوە ، کە هەمیشە نازیان پێوە ئەکەن و بەخۆیانیاڵەوە دەرلەخەن و بێ قەدر ڕایان ناگرن . مەبەست لە تاجی تاوس و کەڵەشێر پۆپنەکەیانە .

فەڕ و (چن) و (کم) و (ك) و (ت) و (مز) و (عب) و (من) : پەڕ و . تاج و (کم) و (من) : تاجی . دەمانەوە (کم) و (من) : دەمایەوە .

گەر ئاب و تابی جەننەتی‌یو دۆزەخیت دەوێ
بنوازە ئێو چەوانی بەشۆش و برۆی عەبۆس (٦)

بۆ مەشقی عیشقی زولفی نیگار و نیگارشی
« نالی » لە خامەدا بووەتە شاهی طوڕڕەنوس (٧)

---

(٦) ئاب : ئـاو ، ئەڕاین . مەبەسـت لێنکیە . ئاب و تـاو ، گەرمی . جەننەتی : بەهەشتی . دۆزەخی : جەهەننەمی . بەشۆش : ڕۆخۆش . عەبۆس : ڕۆگرژ .

واتە : ئەگەر ئەتەوێ چاوت بە ناوچاوی فێنکی بنیادەمی بەهەشتی و ، ناوچاوی ئاگرینی بنیـادەمی جەهەننەمی بکەوێ ، سـەیری ناوچاوی بنیادەمی ڕۆخۆش و بنیـادەمی ڕۆگرژ بکە . ڕۆی خـۆش نیشانەی بەهەشتی و ڕۆی گرژ نیشانەی جەهەننەمیە .

لەنێوان (ئاب) و (تاب) و ، (جەنـەتی) و (دۆزەخی) و ، (بەشۆش) و (عەبۆس)دا طیـباق و ، لەنێوان (ئاب و تاب) و (جەننەتی و دۆزەخی) و ، (بەشۆش و عەبۆس)دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

ئێو (کم) و (من) : ناو .

(٧) مەشق : ڕۆنوس کردنەوەی خەتی خۆش بۆ فێربونی نوسـینی جوان . نیگار : وێنە . ئافرەتی وەك وێنە جوان ، یار . نیگـارش : نوسـین و نەخش‌کردن . طوڕڕەنوس : ئەوەی نەخشـی لول و ئالۆز ئەنوسێ .

واتە : نالی ، بۆ ئەوەی فێر بێ مەشقی خۆشەویستیی زولفی یار و جوانی و ڕازانەوەی ئەو زولفە بکا ، بووە بە شای طوڕڕەنوسان ، لەناو قەلەمدا لولی خواردووە و پێچراوەتەوە . ئەیەوێ بڵێ ئەوەی دڵی بـە زولفی یارەوە بێ ، ئەبێ فێر بێ لەناو دەرد و ئازار وەك ئەو زولفە لول بخوا . منیش بۆ فێربونی ئەو خۆشەویستی و لول خواردنە ، بووم بە تاڵە باریکەکانی ناو قەلەم و ئەوەندە سـەرەکەیم هەڵمژیوە (مەشقم کردووە) ، لول بووم (تاڵە باریکەکانی ناو قەلەمی قامیش لولن) و ، لە ڕەشی و لولیدا بووم بە شـای طوڕڕەنوسـان ..

زیادە ڕەوێ و وێنەی ناسکی ئەدەبی وا نەبێ ، بۆچی باشە !

ئەم شیعرەش بەڵگەیەکی‌ترە کەوا نازناوی (نالی) بە لامی بچوکە نەك بە لامی قەڵەو ، چونکە (نال) لەناو قەڵەمدایە و (خامە)ش قەڵەمە .

لە کۆکردنـەوەی (مەشق) و (مەشـق)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (نیـگار) و (نگارش)دا جیناسـی ناقیص و ، لەنێـوان (مەشق) و (نیگار) و (نال) و (خامە) و (طورڕەنوس)دا تەناسوب هەیە .

مەشقی میشقی (ت) و (ك) و (مز) (اح) و (مب) : میشقی مەشقی . نیکار و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : نیگاری و . (عم) : نیگاری .

# تیپی طێ

— ١ —

مۆی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرە شەط
شۆرە شەط یەعنی کە تێدا خود بە خود قەل بۆ بە بەط (١)

---

—١—

(١) شوشتن : شۆردن . عەین : چاو . کانی . وەك . شۆرە شەط : سوێرە چەم ، فرمێسك . خودبەخود : لەخۆیەوە . قەل : قەلەڕەش . مەبەست ڕەشێنەی چاوە . بەط : مراوی ، مەبەست سپییە .

واتە : ئاوی فرمێسکی چاوم کە ئەوەندەی ڕۆبارێکی سوێر زۆرە ، بەهۆی گریانی زۆرمەوە ، ئەوەندە بەسەر ڕیشما هاتووەتە خوار ، ڕەنگەکەی شتووەتەوە و سپیی کردووەتەوە . ڕۆباری سوێری فرمێسکم ، ئەو ڕۆبارە ئەوەندە سوێرەیە کە ئەگەر قەلەڕەشی لێبچێ ، لەبەر زۆریی خوێی ، هەر لەخۆیەوە لیا سپی ئەبێتەوە و ئەبێ بە مراوی ، وەك چۆن ڕەشێنەی چاوی منی لیا سپی بووەوە و کوێر بۆ و ڕۆشکەی لێ بڕا .

لە وشەی ( عەین )دا لەطافەت هەیە ، چونکە ، وەك لە سەرتەرەوە ڕۆنمان کردووە سێ مەعنا ئەبەخشێ . لە کۆکردنەوەی ( شوشتن ) و ( ئاو ) و ، ( عەین ) و (شەط) و ، (قەل) و (بەط)یشدا تەناسوب هەیە . لە (قەل) و (بەط)دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحەیش هەیە ، ڕەشێنەی چاو شوبهێنراوە بە قەل و ، چاوی سپی بووەوە شوبهێنراوە بە مراوی و بێشوبهێنراو لەجیاتیی شوبهێنراو دانراوە و ، نیشانەشی ( عەین ) و ( مۆی سپی کردم )ە لە نیوە شیعری یەکەمدا .

شوشتن (چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (عب) و (اح) : شوستن ، کە ئەویش هەر بەمەعنا شوشتنە . خودبەخود ( عم ) : خۆبەخۆ .

هەڵگرا ، وەك مۆی کافوری بە شەودا ، مۆ بە مۆم
دا سیاهیی زۆ بخوێنم نوقطە نوقطە ، خەط بە خەط (٢)

من دەڵێم شەو بۆ بە ڕۆژ ، ئەفسم دەڵێ ڕۆژ بۆ بە شەو
ئەو مومەیبە ، چونکە چاوی پێ سپی بۆ ، من غەلەط (٣)

---

(٢) هەڵگرا : داگیرسا ، شەوقی دایەوە . کافوری : سپی وەك کافور کە بەرێکی سپی و بۆنخۆشی درەختێکە . دا : تارەکو . سیاهی : ڕەشی.

واتە : مووەکانی سەر و ڕیشم سپی بۆن و ، وەك مۆمی کافوری داگیرسێنی ، یەکە یەکە بە سپییەتی بە سەر و ڕۆمەوە دیاریان دا ، تا خەت بە خەت و نوختە بە نوختە کردەوەی بەدی خۆم ، لەبەر ڕۆشناییاندا بخوێنمەوە و تەماشای ڕۆی ــ لەبەر گوناه ــ ڕەشی خۆم بکەم . مەبەستی لەوەیە کە بنیادەم پیر بۆ ، ئیتر وەختی ئەوە دێ پەند و ئامۆژگاری لە مۆی سپیی خۆی وەرگری و چاوی بە ڕابوردوی خۆیدا بگێڕێتەوە و لە کردەوە ڕەشەکانی خۆی پاشگەز ببێتەوە .

ئەشگونجێ ( سیاهی ) نەبێ ( سیاهەی ) بێ ، واتە لیستەی . بەم پێیە مەعنای ڕستەکە وای لێ دێتەوە : بەرێکی سیاهەی کرداری خۆم بکەم .

هەڵگرا (ت) و (مز) و (مب) و (اح) و (مـن) : هەڵکرا . ئەمیش هەر ئەگونجێ ( هەڵکرا ) بێ ، چونکە لە نوسینی ئەوسادا (ك) و (گ) وەك یەك ئەنوسران . دا ( مب ) : وا .

(٣) مومەیب : ئەوەی باش بۆ شتێ بچێ و بیپێکێ .

واتە : منی نیازی گەڕانەوە و پاشگەز بونەوە کردۆ ، لەگەڵ نەفسی خۆ بەدەستەوە نەداو و حەز لە دنیا کردۆم ، کێشەمانە لەسەر مەعنای ئەم مۆ سپی بۆن و پیرییە . من ئەڵێم سەردەمی لاوی سەردەمی بێئاگایی و گومڕایی بۆ و ، ئیستا کە پیر بووم و ئەگەڕێمەوە و تۆ ئەکەمە خوا ، نیشانەی ئەوەیە شەوی بێئاگایی دوایی هاتووە و ئیتر ڕۆژی خواناسییە. ئەویش ئەڵێ وا نییە. سپی بۆنی مۆ نیشانەی ئەوەیە ڕۆژی زیانی خۆش و ڕابواردن دوایی هاتووە و ئیتر لەمەولا ئەوەی جارانم بۆ ئالوی و دنیام لەبەرچاو تاریك بووە .حەق بەلای ئەوەوەیە و من بە هەڵەدا چووم ، چونکە چاوم سنعەسای لێ بڕاوە و هیچ نابینم .. کەواتە ڕاستە ڕۆژ بووە بە شەو ، ئەگینا ئەبێ ڕۆژی کوێر چۆن ڕۆژێك بێ !

ڕەوغەنی دیدەم ڕژایە سەر کیتابی خەططی خۆم
چاو لە ئێشی ئەو سپێ ، تۆریش بەسەر ئەودا سەقەط (٤)

سەرد و گەرمی ئاهەکەم سەوزەی گیای کردم بە پووش
پایزی ، ڕۆ بۆ بە بوردی سوور و زەردی موختەلەط (٥)

---

تۆ بڵێی ئەم پارچە شیعرە ، وەك هەندێ هێمای تریش لە چەند پارچە شیعرێکی ترا ، نیشانەی ئەوە نەبێ کە نالی لە دوا ساڵەکانی ژیانیا کوێر بوبێ !

بێ ( چـن ) و ( ك ) : لـێ .

(٤) ڕەوغەن : ڕۆن. سەقەط: سەقەت ، پەككەوتو . سقط ، کەوتە خوار .

واتە : ڕۆنی چاوم کە مایەی تیشك دانەوە و گڕان و بینینی بو ، ڕژایە سەر ڕۆم کە وەك کتێب لە بەر دەمیا کراوەتەوە و مووە ڕەشەکانی وەك خەتەکانی کتێب بوون . ئیستا چاوم لەناو ئازاری ئەو ڕۆن ڕژانە کوێـر بووە،یاخود لەبەر ئەو کارەی کە ئەو ڕۆنە کردی کە ڕژا،سپێ بووەتەوە و بێ‌کار کەوتووە و ، ڕۆناکیی چاویشم بەسەر ئەودا ، واتە بەسەر چاومدا شەل و پەل و سـەقەت کەوتووە چونکە کەوتووەتە خوار بۆ سەر کتێبی ڕۆم ، یا بەسەر کتێبی ڕۆمدا کەوتووە . بەپێـی ئەم مەعنای دواییـە سەقەط ( سَقَطَ )ی فیعلی ڕابوردوی عەرەبییە .

دیدەم ڕژایە (چر) و (مز) و (عب) و (اح) : دیدەی ڕەضایە . (چـن): دیدەم ڕژاوە . ( هم ) و ( گم ) : دیدە ڕژایە . (کم) و (مـن) : دیـدەی خەطـایە .

(٥) بورد : پارچە قوماشێکی جوان بووە پێیان وتووە ( بوردی یەمـانی ) . موختەلەط : تێکەڵ .

واتە : وەك چۆن گۆڕانی هەوا کار ئەکاتە سەر شینایی و ، هـەوای سارد ڕەنگی لە ڕۆ ئەبڕێ و هەوای گەرم ئەیسووتێنێ و وشکی ئەکـا ، ئاه و هەناسەی سارد و گەرمی منیش ، ڕیشـی ڕەشـی وەك سـەوزە گیای وشـك کردم و سپیـی کردەوە و کردی بـە پووش . ڕۆی پـایز داهاتوم ، یاخود ڕۆم بە شێوەی باخی پایز ، بۆ بە پـارچەی بـوردی یەمەنی کە تێکەڵە لە ڕەنگی سوور و زەرد . ئەمیش هەندێکی بەتەواوی وشك بووە و سپێ بووەتەوە و ، هەندێکی کەشی ڕەنگی گۆڕاوە خەریکە وشك ئەبێ و سپێ ئەبێتەوە .

وەجهەکەم ئیسمی بەیاض ، ئەمما وەرەق زەرد و سیاه
با موخەططەط بێ بە کافوری کەشیدەی خۆش نەمەط (٦)

---

نیوەی دووەمی ئەم شیعرە لە نوسخەکانی بەردەستمانا جیاوازیی زۆری لیابو . ئێمە لەناو هەموو نوسخەکاندا پشتمان بە نوسخەی (مم) بەست . ئەمەش جیاوازییەکانی نوسخەکانیتر :

( چن ) : زۆر بۆتە بەردی سەوز و زەردی . ( کم ) : ئەو بو بە بەرد و ـ یا بورد و ـ سوور و زەرد و . (گم) : زۆر بو بە بەردی سوور زەردی . (ك) : زۆر بو بە زەردی سەرد و زەرد و . (مز) و (مب) : زۆر بو بە بەردی سەرد و زەردی . (اح) : زۆر بو بە زەردی سەرد و زەردی .

لەنێوان ( سەرد ) و (گەرم) و ، (گیا) و (پوش)دا طیباق و ، لەنێوان ( سوور ) و ( زەرد )دا طیباق و تەناسوب هەیە .

(٦) وەجه : ڕوو . بەیاض : سپێتی . ئەو پارچەیەی لە کەناری کتێبەکانەوە بە سپێتی ئەمایەوە . وەرەق : کاغەز . موخەططەط : خەت خەت کراو، لە ( میسطەرە ) دراو . جاران کە کاغەزی خەت خەت کراو نەبو ، مەقەبایەکیان ئەهێنا ، چۆنیان بویستایە دێڕەکانی کتێبەکە ڕێکبخەن ، بەوجۆرە تاڵە کندری چەند لوو بادراویان لێهەڵئەکێشا . پاشان پەڕەی کاغەزی سپیان ئەخستە سەری و توند پەنجەیان پیائەهێنا ، جێگەی کندرە بادراوەکەی لەسەر نەخش ئەبو ، ئەوجا بەسەر ئەو نەخشانەدا ئەیاننوسی . بەو مەقەبا کندر لێهەڵکێشراوەیان ئەوت ( میسطەرە ) . کافوری کەشیدە : خەتی کێشراوی سپی وەك کافور ، ئەو خەتەی کە لەئەنجامی لە میسطەرە دانی کاغەزەوە بە کاغەزەکەوە دەرئەکەوت . نەمەط : شێوە .

واتە : کاغەزی ڕووم، هەرچەند بە خەتی میسطەرە کێشی، وەك کافور سپی ، مووی سپیم ، سپی بووەتەوە ، هەر بەناو سپییە . لەڕاستیدا لە شەرمەزاریدا زەرد و ، لە گوناهباریدا ڕەشە . مەبەستی ئەوەیە بڵێ وەك چۆن خەتی میسطەرە کاغەزی زەردو ڕەش سپی ناکاتەوە ، مووی سپیی سەر و ڕیشی منیش ڕووزەردی و ڕووڕەشیی شەرمەزاریی دەرگای خوا و گوناهباریی دوارۆژم هەڵناگرێ .

لە کۆکردنەوەی ( بەیاض ) و (وەرەق) و (زەرد) و (سیا) و ( موخەططەط )دا تەناسوبێکی جوان هەیە .

چونکە لەوحی ڕۆسیەهـ ڕۆژەردی بێتەزیینییە
خوێنی چاوم جەدوەلی بێ ، قەطرەکانیشی نوقەط (٧)

نەقشی دۆ مۆیێ بە دۆ ڕۆیێ دەبێتە عەیبی شەیب
ئاینەی ڕۆ پاکییە ، ڕۆناکییە نوور و شەمەط (٨)

---

(٧) بێتەزیینێ : جوان نەکردن و نەڕازاندنەوە . جەدوەل . جۆگا . ئەو خەتانەی جاران لەکاتی کتێب نووسینەوەدا بە مەرەکەبی سوور لەسەر کتێب ئەکێشران بۆ جیاکردنەوەی دێڕەکان و شوێنی دێڕەکان لە یەکتر . نوقەط : جەمعی نوقطەیە واتە نوختە .

جاران فەقێ ئەهاتن کاغەزی سپییان زەرد ئەکرد ئەوجا کتێبیان لێ ئەنووسییەوە بۆئەوەی لەکاتی خوێندنەوەدا ئازاری چاو نەدا . دیارە کتێبەکەشیان بە مەرەکەبی ڕەش ئەنووسییەوە . بۆ جوانیش خەلی سووریان لەنێوان دێڕەکاندا ئەکێشا و نوختەی پیتەکانیشیان بە ڕەنگی سوور ، ئەکرد . جا نالیش هاتووە ڕووی خۆی شوبهاندووە بە پەڕە کتێبێکی لەو کتێبانە و ئەڵێ مادەم تەختەی کتێبی ڕووم لەبەر گوناه ڕەشە و ، بەهۆی نەڕازاندنەوەیەوە بە کرداری چاك زەرد و شەرمەزارە، من ئەمەوێ بە خوێنی چاوەکانم بیڕازێنمەوە . بە خوێنی بە ڕوومدا هاتووە خوار جەدوەلی بۆ ئەکەم و خەلی بۆ ئەکێشم و ، بە دڵۆپەکانیشی نوختەی سووری بۆ دائەنێم .

نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی (كم) و (من)دا بەم جۆرەیە :

**چونکە لەوحەی ڕۆ سیاه و زەردی بێتەزیینییە .**

سییەهـ ( گم ) و (مز) : سیاه . بێتەزیینییە (چن) : بێ تێراوییە .

(٨) شەیب : پیری . شەمەط : بۆزی .

واتە : بوونی نەخشی دۆ جۆرە مۆ ( مۆی سپی و مۆی ڕەش ) بە دەم و چاوی بنیادەمەوە ، کاتێ ئەبێتە عەیب و مایەی ناشیرینێ ، ئەگەر ئەوکەسە دۆ ڕۆ بێ ، بەدیمەن خۆی بە پیاوچاك و خواناس پیشان بدا ، وەك پێویستە بۆ کەسێ چووبێتە سالەوە و ، لەڕاستییشدا پیاوێکی ئارەزۆباز بێ وەك ئەوانەی هێشتا هەرزەکارن و مۆی سەر و ڕیشیان ڕەشە . ئەو ئاوێنەیەی کە ڕووی ڕاستەقینەی بنیادەمی تیا دەرئەکەوێ، مۆی ڕەش و سپی نییە ، پاکیی کردەوەی بنیادەمەکە خۆیەتی ، بوونی

یا گەدایێکە غەنی ، یا پادشاهێکە فەقیر
لەم دووە خالی نییە « نالی » لە ڕۆی حەددی وەسەط (٩)

مۆی ڕەش و سپی نیشانەی ڕۆناکییە ، چونکە لە ڕۆناکیدا ڕەش و سپی لە یەك ئەکرێنەوە .

نوسخەکانی بەردەستمان لەم شیعرەشدا ناکۆکیی زۆریان لەنێواندایە. ئێمە پشتمان بە نوسخەی ( مب ) بەست . ئەمەش جیاوازییەکانی نوسخەکانیتر :

نەقشی (چن) : نەقصی . (ك) و (مز) و (اح) : نەقضی . بە دۆزۆیی دەبێتە (چر) و (گم) و (ك) و (مز) و (اح) : بە دەوری ڕۆی دەبینی . (چن) : بە دەوری ڕۆ دەبینی . (عم) و (گم) : بە دەوری ڕۆی دەبێتە . ( من ) : بە دۆ ڕۆیی دەبینی . ڕۆناکییە ( چن ) : ڕۆ ناکەیە .

(٩) حەددی وەسەط : ڕادەی مامناوەندی . لە زانستی مەنطیقدا ( حەددی ئەوسەط ) وشەی دۆبارە کراوەی ناو ( صوغرا ) و ( کوبرا )یە .

وانە : دۆ ڕێگا هەیە لە ژیاندا بۆ خۆمیان هەلبژێرم و ڕێگایەکی سێهەمیان لەنێواندا نییە . یا ئەبێ خۆم بە پیاوی دنیا و دەسەلاتدارا هەلنەواسم و لەبارەی دارایییەوە هەژار بم ، بەلام لە دەرۆنی خۆمدا گەورەترین سامانم هەبێ کە کەسایەتیی سەربەخۆی خۆمە ، یان ئەبێ دەسبەرداری کەسایەتیی خۆم ببم و لەوبارەوە ببم بە بنیادەمێکی لات و بێدەسەلات ، بۆئەوەی لەبارەی ژیانی ماددییەوە وەك پادشا بژیم .

نالی هەرچەند نەیوتووە کام ڕێگایان هەلئەبژێری ، بەلام هەر بە بەرچاوخستنی دۆ ڕێگاکەدا دیارە ڕێگای یەکەمیانی بۆ خۆی دیاری کردووە ، کە ڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی دڵ و دەرۆنە هەرچەند سکیشی لەبرسا قۆڕەی بێ و ، چاو لە دەستی کەس نەبوە لەم دنیایەدا.

گەدایێکە ، پادشاهێکە ( چن ) و ( ك ) و ( مز ) و (اح) : گەدایێکی ، پادشاهێکی .

## تیپی قــاف

— ١ —

قوربان مەحاڵە پێکەوە بێ صەبر و ئیشتیاق
خاریج لە نەصصی ئایەیە تەکلیفی ( لا یطاق ) (١)

مەعنایی نوور و ظولمەت و نەشری حەیات و مەوت
بۆ ، ڕوو و زولف و ڕۆژی ویصال و شەوی فیراق (٢)

---

— ١ —

(١) تەکلیفی (لایطاق) : داوای کردنی کارێ کەردەنێ نەبێ و لەتوانای بنیادەما نەبێ بیکــا .

واتە : گیانە ! هەرگیز ناکرێ یەکێ سۆزی تۆی لە دڵا بێ و بیشتوانێ خۆی ڕاگرێ و ، شتێوا بە داوای شتی لەتوانادا نەبۆ دائەنرێ .

ئەم شیعرە ئیشارەتە بە ئایەتی ( لا یکلف الله نفــا الا وسعها ) واتە : خوا داوای شتێ ناکا لە کەسێ کە لەتوانایدا نەبێ .

ئایەیە : (چن) و (ەم) و (گم) : ئایەتە . (عب) و (کم) و (من) : ئایەتی .

(٢) نەشر : بڵاوکردنەوە .

واتە : ئەگــەر ئەتەوێ بــزانی مەعنای ( ڕۆنــاکێ ) و ( تــاریکێ ) و بڵاوکردنەوەی ( ژیــان ) و ( مردن ) چییە ، سەیری ڕووی ڕۆناك و زولفی ڕەشی خۆت بکە و، سەرنجی خۆشیی ئەوکاتەی من بدە کە پێت ئەگەم و دنیام لە بەرچاوا ئەبێ بە ڕۆژی ڕۆشن ، یا دوورم لێت و دنیام وەك شەوی تار لە بەرچاوا ڕەش ئەبێ .

لەنێــوان ( نــوور ) و ( ظولمــەت ) و ، ( حەیــات ) و ( مــەوت ) و ، ( ڕۆژ ) و ( شــەو ) و ، ( ویصــال ) و ( فــیراق )دا طیبــاق و ، لــە

ئیظهاری ئیددیعایی تەصەبور لە وەصلی تۆ
یا مەکرە ، یا دەسیسەیە ، یا کیذبە ، یا نیفاق (٣)

بۆ تۆ کە بیکر و تازە ، وەکو حۆریی جەنەتی
قەیدی چییە عەجۆزەیی دونیا بدەم طەڵاق ؟ ! (٤)

شیرینیو ، لە تاڵیو ترشیی عیتابی زۆت ،
خاڵت لەسەر جەبین بووەتە دانەیی سماق (٥)

---

یەکخستنی (بۆ) و (زۆ)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (زۆ) و ( زوڵف )دا تەناسوب هەیە .

بۆ (چـر) و (عـم) و (کـم) و (گـم) و (مـن) : وەك . (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : بۆ . (مز) : لەو . زوڵف و ( هەمۆ نوسخەکان جگە لە « چن ؟ ) : زوڵفە . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ ( ویصال و ) بە (ویصالە) بخوێنرێتەوە .

(٣) تەصەبور : ئەوەتە بنیادەم خۆی وا پیشان بدا کە لەعاستی دەرد و نارەحەتیدا دان بە خۆیدا ئەگرێ .

واتە : ئەوەی لاف لێبدا بڵێ من ئەتوانم لەعاستی دەردی دۆریی یاردا خۆم ڕابگرم، یا فێڵ ئەکا ، یا پیلانێکی بەدەستەوەیە، یا درۆ ئەکا ، یا دۆڕووە .

تەصەبور ( « پەراوێزی » چر ) و (عم) و (من) : تەبەصور ، کە واتە دۆربینی ، بەڵام مەعنای نایەت . کیدبە : ( « پەراوێزی » چر ) : کوفرە .

(٤) بیکر : کچ ، بەرابەری ژن . عەجوزە : پیر و فەرتوت .

واتە : تۆ بۆ من هەمۆ دنیا ئەهێنی . ئیتر چیی تیایە ئەگەر لەپێناوی تۆدا کە تازە کچێکی وەك حۆریی بەهەشتی ، دەس لە دنیا هەڵبگرم کە ئەڵێی پیرەژنێکی فەرتوتە .

(٥) عیتاب : گلەیی و بناشت . جەبین : ناوچاو . دانە : دەنك . سماق : ترشە سماق .

واتە : ئازیزەکەم ! تۆ لەخۆتدا شیرینی ، بەڵام بەهۆی ئەو هەمۆ گلەیی و بناشتە تاڵ و ترشەوە کە ئەیکەیت و بە زۆڵەوە دەرئەکەوێ و

صۆفی لە فەقر و فاقە وەکو فاقە فاقی دا
تەسبێحی دام و دانەیە ، ڕیشی دو فاقی فاق (٦)

ئەی میری میهرەبان وەرە سەر بامی بامیداد
دا مەهرووان بین بە هیلالی شەوی میحاق (٧) ▪

---

ڕۆنی پێ گرژ بووە ، خاڵەکەی بە ناوچاوێشـتەوەیە وەك دەنکی ترشـە سماق دێتە پێش چاو .

شیرینی‌بو (عم) : شیرینییە و . (گم) : شیرینییە . عیتـابی (چن) و (ت) و (مز) و (عب) و (اح) : عەتابی ، بەڵام هەڵەیـە چونکە ( مەتـاب ) شـیرینە .

(٦) فەقر و فاقە : لاتی و هەژاری . فاقە ( ی دووەم ) : تەڵە ، داو . فاقی دا : لەڕ بۆ . چەمییەوە . دام : داو . دانـە : ئەو گەنمەی لەبـەر داوا دائەکرێ تا چۆلەکە بێتە سـەری و بێ بـە تەڵـەوە . دوو فـاق : دوو فلیچقان .

وانە : وشکە سۆفی لەبـەر لاتی وەکـو تەڵە چەمیوەتـەوە ، بۆیـە کەوتووەتە فێڵ . تەزبێحەکەی لەو ڕووەوە کە بازنەییە وەکو داو وایە و ؛ لەو ڕووەوە کە دەنك دەنکە وەکو ئەو دانەیە وایە کە دائەکرێ بۆ چۆلەکە . ڕیشی دوو فلیچقانیشی ئەم سەر و ئەوسەری دارەکەیـە کە خەڵکی پێوە ئەبن ، مەبەستی لەوەیە بڵێ : سۆفی بە تەزبێحەکەی و مووی ڕیشی کە نیشانەی خواپەرستییەکی ساختەن ، عالەم ڕائەکێشێ بۆلای خۆی و گرفتاریان ئەکا .

دانەیـە (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (عب) : دانەیی .

(٧) میهر : خۆر . میهرەبان : بەبەزەیی . بام : بان . بامیداد : سبەینان . مەهرووان : ئەوانەی ڕووبان وەك مانگ وایە . شەوی میحاق : شەوی سیی مانگی عەرەبی کە مانگی تیا دەرناکەوێ .

وانە : ئەی یاری ڕوومەت وەك خۆر و ، بە بەزەیی ! لە ئاسۆ هەڵبێ و وەرە سەر بانی سبەینان ، تا هەرچی جوانی‌تر هەن لەناو جوانیی تۆ هەمویان خۆیان بشارنەوە و ، وەك مانگی ڕۆژی سیی مانگ باریك و بێهێز ببن .

لە کۆکردنەوەی ( میهر ) و ( میهرەبان ) و ( مەهرووان ) و ، ( بام ) و (بامیداد)دا جۆرە وشەئارابییەکی نزیك لە جیناس هەیە. لە کۆکردنەوەی

▪ ( دا ) لە بری ( تا ) لە شێوەی موکری دا بە کار هاتوە لە بەیتە کۆنەکان دا زۆر هەیە و وەفایی شاعیری سابڵاغیش گەلێکی بە کار هێناوە • نالی مەزنیش شێوەی جار و بار ڕە چاو کردوە •

« نالی » کە صەدری مەسنەدی تەمکینی تەکیە بۆ
بۆ تۆ بووە بە دەربەدەری کۆچەوو سوقاق (٨)

— ٢ —

چیە گوارە گوناهی ، وا بە ئەستەق
بە گوێ هەڵئاوەسیوە ، سەر موعەللەق ؟! (١)

---

(هیلال) و ( میحاق )یشدا تەناسوب هەیە . سەرەڕای ئەو تەناسوبەیش کە لەنێوان ( سەربام ) و ( بامیداد )دا هەیە لەڕووەوە کە لە کوردستانا باوە موسوڵمانان سبەینێی سیی مانگ ئەچنە سەربان بزانن مانگ دیارە کە نەبێ بە نیشانەی ئەوە ئەو ڕۆژە دوازرۆژی مانگ نییە ، یا نە، تا ئێوارە بۆ مانگی نوێ بگەڕێن .

ئیضافەکردنی ( سەربام ) بۆلای ( بامیداد ) مەعنائارایییەکی زۆر جوانی تیایە ، چونکە ( بامیداد ) کاتە نەك شوێن ، کەچی نالی کردوویەتی بە شتێکی ماددی .

دا (م) و (کم) و (گم) و (من) : تا . (مز) : با .

(٨) صەدر : لای سەرووی مەجلیس . مەسنەد : جێگای پاڵدانەوە . پاڵ پشت . تەمکین : ڕێز و قەدرلێگرتن . تەکیە : ئەوەی پاڵی پێوە بدریێ ، پشتێ . کۆچە : کۆڵان سوقاق : ئاگاتە ڕادەی شەقام و لە کۆڵانیش گەورەترە .

واتە : نالی کە جاران پاڵی بەو پشتیەوە ئەدایەوە کە بۆ نیشانەی قەدر و حورمەت گرتن لای سەرەوە دائەنرا ، ئێستا لەپێناوی خۆشەویستیی تۆدا دەربەدەری کۆچە و کۆڵانان بووە .

دوور نییە وشەی (تەکیە) ئیشارە بێ بۆ (تەکیەی قەرەداغ) کە مەشهوورە نالی لەوێ خوێندوویە و (ئایشێ) ناوێکیشی تیا خۆشویستووە .

تەکیە بۆ ( چن ) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : تەکیەیە . بۆ تۆ (چن) : بێ تۆ . کۆچەوو ( مم ) : کۆچەیی .

— ٢ —

(١) ئەستەق : ڕێكوپێك . موعەللەق : هەڵواسراو .

واتـە : گوارە گوناهی چییە ، چیی‌کردووە ، وا ڕێك و جوان

دەخیلت بم نەخیلی یا ڕوطابی
وەها شیرین و ، سینە نەرم و ، دڵ ڕەق ! (٢)

سەراپای گرتووی زوڵف ، بۆیە بۆیی
موقەییەد ، هەم موخەلخەل ، هەم موطەووەق ! (٣)

---

هەڵتواسیوە بە گوێتدا ، یا بە گوێ هەڵتواسیوە ، سەری شۆڕ بووەتەوە !!

هەڵتاوەسیوە ( مز ) : هەڵداوەسیوە .

(٢) نەخیل : دار خورما . ڕوطاب : خورمای شلی تازە .

واتە : لە ڕێی خوادا بێم بلێ بۆ چیت : دار خورمای ، وا دڵت کە ناوکی خورماکەیە ئەوەندە ڕەقە ، یا خورمای شلی تازەی ، وا تامت شیرین و سنگت کە گوشتەکەیەتی ئەوەندە نەرمە !! چەند جوانی هێناوەتەوە : دڵ کە گۆشتە ڕەق بێ ، کەچێ سینە کە ئێسقانە نەرم بێ !

لە کۆکردنەوەی ( دەخیل ) و ( نەخیل )دا جیناسی موضاریع هەیە .
لە کۆکردنەوەی ( نەرم ) و ( ڕەق )یشدا طیباق هەیە .

دەخیلت بم ( «بەراوێزی» چر ) و ( کم ) و ( گم ) و (عب) و (من) : ئەتۆ قوربان .

(٣) موقەییەد : دەست بەسراو . موخەلخەل : پێ بە زنجیر . موطەووەق : ئەوق لە گەردن .

واتە : زوڵفت ئەوەندە درێژە لە لەوقی سەر تا کەلەنگوسی پێتی گرتووەتەوە،بۆیە وا هەندێکی لە دەستت و هەندێکی لە پێت و هەندێکی لە گەردنت ئاڵاوە ، لە ملتا بووە بە ملوانکە و ، لە دەستتا بووە بە بازن و، لە پێتا بووە بە پاوانە .

لەنێوان ( بۆیە ) و (بۆیی)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (موقەیەد) و (موخەلخەل) و (موطەووەق)دا تەناسوب هەیە . لەطافەتیشیان تیایە .

لە نوسخەی ( کم ) و ( من )دا نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە بەمجۆرەیە :

**سەراپای گرتووی زولفەینی خاوت**

گرتووی زوڵف ( اح ) : تۆیە زوڵفت . موتەییەد ( چر ) و ( کم ) : موسەلسەل .

لە پێت ئاڵاوە حەڵقەی ماری گیسوت
عەجایەب حەییی بێ جان قەیدی موطڵەق ! (٤)

کە لێڵ و سوور و کول بوو چاوی تیژت
ئەوەندە پێی دەڕێژێ خوێنی ناحەق (٥)

---

(٤) گیسو : زوڵف . حەی : زیندوو . مار ، سوڵکراوەی ( حەییە )یە . بێجان : بێگیان . قەید : زنجیر . موطڵەق : بەرەڵڵا .

واتە : ئەڵقەی زوڵفت کە وەك ڕەشمار وایە ، لە پێت ئاڵاوە . ئەم ئەڵقەی زوڵفی وەك ڕەشمارە ، شتێکی زۆر سەیرە : لەلایەکەوە کە مارە و ماریش ( حەییە )یە و (حەی)یشە ، زیندووە . لە لایەکی کەشەوە کە مووە ، گیانی لەبەردا نییە و مردووە . قەیدە ، دەست و پێ و گەردنی بەستووەتەوە، کەچی ئەم دەست و پێ و گەردنەشت بەرەڵڵان و قەیدەکە لە کاری نەخستوون، یاخود قەیدەکە خۆی موطڵەقە، بەرەڵڵایە، لەجیاتی ئەوەی کە شوێنێکی بەستەوە هەر بەوەوە خەریك بێ ، بە هەر لایەکیدا ئارەزووی بێ پەل ئەهاوێ .

وشەی ( قەید ) و ( موطڵەق ) لە گەلێ لە زانستەکانیشدا بەکاردێن ، یەکەم بۆ گەیاندنی مەعنای بەستنەوەی وشەیەك یا حوکمێك بە بارێکی تایبەتییەوە و ، دووەم : بۆ گەیاندنی مەعنای بەرەڵڵایی ئەو وشەیە یان ئەو حوکمە .

ئەگونجێ مەعنای ئەم شیعرە بەمجۆرەش لێك بدرێتەوە : سەیرە ! زوڵفی یار مارێکی بێگیانە ، کەچی بووە بە هۆی پێوەند کردنی یار کە بنیادەمێکی ئازاد و زیندووە .

گیسوت ( « بەراوێزی » چر ) و ( ت ) : زوڵفت .

(٥) واتە : چاوی تیژت ئەوەندە بە ناحەق بۆ ڕشتنی خوێنی دلداران بەکارهێنا ، لەبەر زۆریی بەکارهێنان کول بوو ، بە خوێنی کوژراوەکان سوور بوو ، بە هۆی ماندووبوونیشیەوە لێڵ بوو و بەری تاریك بوو . دەسا با بەسی بێ ئیتر بەکارهێنانی .

سوور و کول (مز) و (عب) و (اح) : سوورەکول . ئەوەندە پێی . (چر) : ئەوەندەی پێ . (عم) و (ت) و (مز) و (عب) و (اح) : ئەوەندە پێ . (مز) : ئەوەندی پێ . دەڕێژێ ( چر ) : بڕێژێ . ( کم ) و ( من ) : ئەڕێژێ .

شوكر « نالی » سەری خەصمت وەكو گۆ
به خواری ، نەك به یاری ، كەوتە بەر شەق (٦)

---

(٦) خەصم : دوژمن . گۆ : جۆرە تۆپێكی دارینــه به دارێك لێیان داوه و یاریان پێ كردووه ، به دارەكەیان وتووه چەوگان واته گۆچان . خواری : زەلیلی . یاری : دۆستایەتی . یاری كردن .

نالی لەم شیعرەیدا زولفی یاری به دوژمنی خۆی دانـاوه ، چونكــه مادەم ئەو زولفه دەســت و پێی یاری بەستووەتەوه و له ملی ئالاوه و ، به شۆڕبونەوەشی بەسـەر سنگ و ڕۆی یارا ڕێگای له نالی تەنیوه ، دیاره كاری دوژمنانەی كردووه ، چ لەگەڵ نالی خۆی و چ لەگەڵ دۆستەكەی، كه ئەمەش هەر وەك ئەوەیه كاری دوژمنانەی لەگەڵ نالی خۆی كردبێ . شوبهاندنۆبشیەلی به سەر چونكه مادەم لوله ، دیاره خڕه و وەك ســەر وایه . دایشیناوه كەوا مادەم شۆڕ بووەتەوه بۆ بەرپێی یار و هەمیشــه ئەكەوێتە بەری ، وەك گۆیەك وایه بدرێته بەر شەق .

نالی به خۆی ئەڵێ شوكری خوا بكه كەوا ســەری دوژمنەكەت كــه سەری زولفی یاره ، وەك گۆی مەیدان كەوتووەته بەر پێی یار . كەوتنه بەر پێكەشی به زەلیلیه ، نەك به دۆستایەتی و له حاڵی یــاری كردنا وەك گۆی ڕاستەقینه .

به خواری ( مز ) بــه زاری . كەوتــه ( هەمۆ نوســخەكان » جگه له نوسخەی لە » ) : دایه . لێمه ئەمسان لا پەسەند بۆ چونكه ئەگەر ( دایه ) بووایه مەعناكه ئەئەهات لەبەرئەوه كه نالی سەری دوژمنی ــ كه سەری زولفی یاره ــ نەداوەته بەر شەق ، یــار خۆی داویەته بــەر شــەق ، بــەلكو ئەشیداوەتــەوه به شەق ، زولفەكــه خــۆی لەبەر درێــژی شۆڕبووەتەوه و كەوتووەته بەرپێی . هەروەها چونكه سوپاسی خوا زیاتر لەسـەر شتێك ئەكرێ لــەخۆیەوه به باشی بۆ بنیادەم ڕێبكەوێ ، نەك بنیادەمەكه خۆی به دەسـەنقەسـت بیكا . لەسـەر نوسخەی (دایه) ئەبێ وشەی (نــالی)یش به (نالێی) بخوێنرێتەوه .

# تیپی کـاف

— ١ —

ئەی شۆخی بێ نیاز و گران ناز و غەمزە سۆك !
تیری موژەت نیشانەیی دڵ کون دەکا بە نۆك (١)

کوشتەی نیگاهی دیدەتە ، گەر مەست ، ئەگەر خەراب
بەستەی کەمەندی زوڵفتە ، گەر شێخ ، ئەگەر سولۆك (٢)

---

— أ —

(١) گران‌ناز : ئەوەی نازی بە گران بکەوێتە سەر خەڵك . غەمزە سوك : ئەوەی بە تیلی چاو ئیشارەتێکی زۆر کەم بکات .

واتە : ئەی نازداری بە کەس موحتاج نەبوی ، ناز بە گران کەوتووە سەر دڵدارانی ، وردە ئیشارەت بە چاو کردۆ ! تیری برژانکت بە نۆکی تیژی خۆی نیشانەکەی کون ئەکا کە دڵی دڵدارە .

لە هەرکام لە ( تیری موژە ) و ( نیشانەی دڵ )دا شوبهاندن و ، لە کۆکردنەوەی ( نیاز ) و ( ناز )دا جیناسی ناقیص و ، لە ( سۆك ) و ( نۆك )دا جیناسی لاحیق و ، لە ( گران ) و ( سوك )دا طیباق هەیە .

بێ‌نیاز و (چن) و (ك) : دیدە مەست و . دەکا (کم) و (من) : ئەکا .

(٢) کوشتە : کوژراو . نیگاهی دیدە : بە لاچاو تەماشاکردن . خەراب : ئەو سەرخۆشەی لەتام‌بەدەر سەرخۆش بێ ، کە پێیشی ئەڵێن بەدمەست . بەستە : کەمەندکێش ، گیرۆدە . شێخ : پیری تەریقەت . سولۆك : سالیك ، مرید ، ئەوەی خەریکی خواپەرستییە .

واتە : چئەوانەی مەستی عادەتین و چئەوانەی لەتام‌بەدەر سەرخۆشن هەمۆ کوژراوی تۆن کە بە لاچاو بۆیان ئەڕوانی . شێخانی تەریقەتیش کە خەڵك کەمەندکێش ئەکەن بۆلای خۆیان و مریدەکانی بەردەستیشیان

نەقدی دڵێ کە ڕائیجی سەودایی تۆ نەبێ ،
مەغشۆش و کەم عەیارموو هەم قەلب و هەم چرۆك (٣)

سۆفی ! وەرە ئەسەیری ظوهۆراتی باغ و ڕاغ
لایێ هەمۆ شکۆفەوو ، لایێ هەمۆ گوڵۆك (٤)

---

کە ئەوان کەمەندکێشیان کردۆن ، هەمۆ بەکێش کراوی کەمەندی زوڵفی ئۆن .

لەنێوان ( کوشتە ) و ( بەستە ) و ، ( مەست ) و ( خەراب ) ، و ( شێخ ) و ( سولۆك )دا تەناسوب و ، لەنێوان ( مەست ) و ( بەستە )دا جیناسی لاحیق هەیە .

گەر ـ لە هەردۆ نیوە شیعرەکەدا ـ (کم) و (گم) و (عب) و (من) : ئەگەر . بەپێی ئەم نوسخانە لەبێ (دیدەلە) و ( زوڵفتە )یش بە (دیدەت) و ( زوڵفت ) بخوێنرێنەوە و لەگەڵ هەمزەی ( ئەگەر )ەکە تێکەڵی یەك بکرێن . خەراب ( چر ) : شەراب . بەپێی ئەم نوسخەیە ، بە بەراورد لەگەڵ وشەی (سولۆك) لە نیوەی دۆهەمی ئەم شیعرەدا ، زیادەڕەویەکی بەجگار زۆر پەیدا ئەبێ . سولۆك (مز) : مولۆك . ئەشگونجێ وشەی (سولۆك) خۆی (سەلۆك) بێ کە ڕاستەوخۆ واتە : سالیك .

(٣) نەقد : نەخت ، پارە . ڕائیج : ڕەواجدار . سەودا : مامەلە . مەیدانی خۆشەویستێ . مەغشوش : تێکەڵ لە مس و شتیوا . ناپاك . کەمعەیار : ئەو زێڕەی بێگەرد نەبێ . سۆك . چرۆك : پوچ .

واتە : زێڕی دڵێ کە لە بازاڕی خۆشەویستیی تۆدا نەڕوا و تۆ پەسەندی نەکەیت و وەری نەگری ، زێڕێکی خاوێن نییە ، مس ئامانجی ناپاکی تیایە ، لەگەڵ زێڕی بێگەردی خۆشەویستیی ڕاستەقینەدا بەراورد ناکرێ ، قەلبە ، بۆش و پوچە .

لە دانانی دڵدا بە نەقد ، شوبهاندن و ، لە نیسبەتدانی بێڕەواجێ و قەلبێ و کەمعەیاریدا بۆ لای دڵ مەجاز هەیە .

تۆ ( چن ) و (مم ) : تۆی . کەم عەیارەوو هەم ( چر ) و (مب) : کەم عەیارەیە ، هەم . ( چن ) : کەم عەیارە هەمۆ . قەلب و (چر) و ( ت ) : قەلبە .

(٤) ظوهورات : دەرکەوتن و دیارێدان . ڕاغ : مێرغوزار . بناری سەوز . شکۆفە : خونچە . گوڵی درەختی بەردار . گوڵۆك : وردە گوڵ .

واتە : ئەی وشکە سۆفیی لە خێر و خۆشێ بێبەش ! وەرە دەرێ

دەستی چناری ڕۆت و ، سەری شاخ و ، لێوی گوڵ
ڕازانەوە بە خەلعەتی دیباوو بەرگ و تۆك (٥)

دەس‌بەندیانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن
ساحێب کولاە و سایەوو بەرگن وەکو مولوك (٦)

---

تویژی فرێدە و بایێکی باڵی خۆت بدە،سەیرێکی دنیا بکە چۆن هەمیشە لە گۆڕان و نوێ بونەوەدایە ، تەماشاکە باغ و مێرغوزار چۆن خۆیان ڕازاندووەتەوە ، لەلایەکەوە خونچەیە ئەپشکوێ و ، لە لایەکی‌کەوە درەختە گوڵی کردووە و وردە گوڵی گرتووە .

لەنێوان ( باغ ) و ( ڕاغ )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( باغ ) و (شکۆفە) و (گوڵۆك)دا تەناسوب هەیە .

ئە سەیری (چر) و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (من) : بچینە . شکۆفەوو ( ك ) و ( مب ) : شکۆفەیە .

(٥) خەلعەت : خەڵات . دیبا : ئاوریشمی هەمەڕەنگ .
واتە : چنارە ڕۆتەکەی جاران کە ئەوەندە لق و پۆپیشی نەبۆ وەك درختەکانی‌تر سەر و سیمایەکی بداتێ و ، تۆتکەی جاران کەچەڵی شاخەکان و ، لێوی گوڵەکان کە ئەوسا خونچە بۆن و تۆقابۆن ، ئەمڕۆ هەمۆ ڕازاونەتەوە . چنارە ، ئاوریشمی گەڵای لەبەرکردووە و ، شاخە، بەرگی گوڵ و گیای ڕەنگاوڕەنگی پۆشیوە و ، گوڵە ، پشکوتووە و تۆکی کردووە . مەبەست لە تۆکی گوڵ ئەو پڕۆشە وردەیە بەودیوی پەڕەکانیەوەیە . نالی بۆ چنار دەستی داناوە چونکە لقەکانی بە پاڵ چنارەکە خۆیدا سەرئەکەون وەك دەستی بنیادەم کە بەپاڵیا شۆڕ ئەبێتەوە . لە شاخیش سەری باس کردووە ، چونکە سەری شاخ بە زستانا سپی ئەبێ و زۆتریش بەفرەکەی ئەچێتەوە و ڕەش ئەبێتەوە و لە هەر کوێیەکی‌کەی دیارێ‌تره . بۆ گوڵیش لێوی باس کردووە چونکە پشکوتن لە لێوەوە دیارێ ئەدا و گوڵیش بە پشکوتنا ئەناسرێتەوە . سەرەڕای ئەوە کە مەبەستیشی بووە دەست و سەر و لێو بەلابخا .

نیوەی یەکەمی ئەم شیعرەمان بەگوێرەی نوسخەی (مز) نوسیەوە کە لەوانی‌تر ڕاستتر بۆ لامان و ، تێکستی نوسخەکانی‌ترمان لەبەر زۆریی هەڵە و مەعنا بەدەستەوە نەدان ، خستە پشت گوێ . بەرگ و (کم) و (گم) و (من) : بەرگی .

(٦) دەس‌بەند : دەست‌گرتنی هەڵپەڕکێ . کولاە : کڵاو ، سایە : سێبەر .

کانی دەزێن بە ئاو و ، درەخت ئاوسن بە با
شایی بەهارە ، بولبولە داماد و غونچە بوك (٧)

---

مولوك : جەمعی مەلیکە بەمەعنا پادشاە .

واتە : سەرو و نارەوەند لەلێی دەستەی کوڕە لاو و کچی شۆخن لای یەکا دەستیان بۆ هەڵپەڕکێ گرتووە و لەبەر شنەی بادا ئەلەرێنەوە، کڵاوی کوڕیکەی گوڵیان لەسەر ناوە و سێبەریان کردووە بۆ ئەوانەی لەبنیاندا دائەنیشن و ، بەرگی گەڵای سەوزی نوێیان پۆشیوە ، ئەڵێی پادشاهن بەم تاج و بەرگ و سایە و ڕێ و شوێنەیانەوە .

ئەم شیعرە و شیعری پێشوویمان لەبەر ڕۆناکیی بابەت و تێکستی نوسخەکانی (چر) و (کم) و (گم) و (من) دا لێرەدا دانا . لەنوسخەکانیتردا لەپاش شیعری دەهەمەوەن و بەروودوایشن . لە نوسخەی (عم)یشدا ئەم شیعرە لێرەدایە و شیعری پێشووی لەپاش شیعری دەهەمەوەیە . ئێمە خۆمان لامانوایە جێگای ڕاستەقینەیان پاش شیعری نۆهەمە .

(٧) دەزێن بە ئاو : بەهاران کە کانی ئەلەتێ و ئاوێکی ئێجگار لە جاران زۆرتری پیادێ . ئاوسن بە با : بای داراوس کە لە دوازۆژەکانی زستانا ئەوەزێ و درەختی پێ ئەگەشێتەوە و ئەوەندەی پێناچێ کوڕیکە و گەڵا ئەکا . داماد : زاوا .

نالی لەم شیعرەیدا یەکێ لە وێنە شاکاریەکانی خۆی پیشانداوە . بەهاری کردووە بە شایی و لەم شاییەدا بولبولی کردووە بە زاوا و خونچەی بۆ کردووە بە بوك و ، بای داراوسی دوازۆژەکانی زستان و درەختی ئەڕایی تێکەوتووەوەشی هێناوە بۆ پیشاندانی وێنەی ئاوس بونی بوك پاش گواستنەوەی و ، ئەقینی کانی و ئاوی زۆر پیا هاتنیشی کردووە بە منالەکەی کە ئەیبێ ..

لەنێوان (دەزێن) و (بەئاو)دا لەطافەتێکی جوان هەیە ، چونکە هەرچەند لێرەدا لاوەکە زادەکەیە و پەیدا ئەبێ ، بەڵام وردە ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە کراوە کە ئافرەت بەهۆی (ئاو)ەوە ئەزێ و ئیشارەتێکیتریش بۆ ئەوە کراوە کە خوا ئەفەرموێت ( وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ) واتە هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە . لە ئاوس بوونی داریشدا بە با ئیشارەتێك بۆ ئەوە کراوە کە (باە) واتە هێزی پیاو بۆ چوونە لای ژن ، وەك چۆن ئیشارەت بۆ ( بای داراوس)یش کراوە .

لەنێوان (کانی) و (ئاو) و (درەخت) و (با) و ، هەروەها لەنێوان

وەك چاوی وشكە سۆفیـە كانێ لە دار و بەرد
دەردێن بە صەد تەرەنوم و گریان و تۆكەتۆك (٨)

ڕاێێڵ و تار و ، پۆپی كولۆی بەفرە ، ئابشار
با بای دەدات و ماسیی پێدا دێ وەك مەكۆك (٩)

---

(بەهار) و (بولبـول) و (غونچە) و ، لەنێوان (دەڕژێـن) و (ئاوسن)یشـدا تەناسوب هەیە .

تێكستی نیوەی یەكەمی ئەم شیعرە لە نوسخەكانی بەردەستماتا جیاوازیی زۆری تیابو . ئەمەی ئێمە نوسیومانەتەوە لەسەر نوسخەی (كم)ە . ئەمەش تێكستی نوسخەكانی تر :

(چر) و (كم) و (ت) : كانێ دەڕژێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بە با
(چن) و (ك) و (اح) : كانێ دەڕژێن و درەخت هەمو ئاوسن بە با
(مم) : كانێ دەڕژێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بە بار
(كم) : كانێ دەڕژێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بە با
(مب) : كانێ دەڕژێن و درەخت ئاوسن بە با
(من) : كانێ ئەڕژێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بە با

(٨) تەرەنوم : لەبەرخۆوە گۆرانێ وتن .

واتە : كانییەكان كە لەناو دار و بەرد و شاخەكانەوە هەڵئەقوڵێن و هاژەیان دێ ، كە ئەڕژێنە خوارەوە و ئاوازی جۆراو جۆریان لێ بەرز ئەبێتەوە ، ئەڵێی چاوی وشكە سۆفین كانێ كە ئەوانیش ئەگرین و فرمێسك ئەڕێژن و لەبەر خۆیانەوە تۆكەتۆك ئەكەن .

نالی مەگەر ئەوەی مەبەست بوبێ كە دڵی ڕەقی وشكە سۆفی بشوبهێنێ بەو شوێنە ڕەقەنانەی كانییان لێ هەڵئەقوڵێ ، ئەگینا زۆر دورە لێیەوە شكۆی وایان بداتێ ئاوی كانێ بكا بە فرمێسكی چاویان و تۆكەتۆكیان بكا بە هاژەی ئاو !

(٩) ڕاێێڵ : ڕایەڵ ، تان ، ئەو تاڵە بەن یا دەزووە ستونییانەی لەكاتی ئەنینی شاڵ یا جاو یا بەڕە و قاڵی و شتیوادا تاڵە ئاسۆییەكانیان پیا تێئەپەڕێنرێ . تار و پۆ : تان و پۆ . كولووە بەفر : دانە دانەی بەفری شێ كە بەتوندێ و گەورەیی بیارێ یا با لە شوێنێكەوە هەڵیگرێ بۆ شوێنێكی كە . ئابشار : تانگە . مەكۆك : مەكۆ .

شەبنم کە نەظم و نەثرە لە ئەوراقی غونچەدا
گۆیا بووە بە زار و زوبان و ددان و پۆك : (١٠)

« نالی » عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا
مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفظی کەم و بچۆك (١١)

---

واتە : تانگەکان بوون بە ڕایەڵ و تان و ، پۆکەشیان کولۆی بەفرە کە با ڕای ئەمالی و ئەیدا بە ناویاندا وەك لە هەردوکیان قوماشێك بچنێ . مەکۆی ئەم جولاین کردنەش ماسییە کە بەناو تان و پۆکەدا ئەڕوا .

بۆ (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (مب) و (من) : پۆد .

(١٠) نەظم : ڕێكدانراو . شیعر . نەثر : بلاو . بەخشان . ئەوراق : گەڵا . کاغەز . گۆیا : هاتووە زمان .

مەعنای ئەم شیعرە و شیعری دوایی پێکەوەدێ .

(١١) عەجەب : چەندسەیر . ئەدا دەکا : ئەگەیێنێ .

واتە : لەم بەهارە جوانەدا شەونمی ناو پەڕەکانی گوڵ ، چ ئەوانەیان ڕێك نیشتونەتە سەر پەڕەکان و چ ئەوانەیان پرژ و بڵاون ، هەمو لەماست هونەری نالیدا هاتونەتە دەنگ و ، بە دەم و زمان و ددان و پۆك ئەڵێن : نامەخوا لە نالی ! چۆن وا بە هێزی وردیی خۆی ئەتوانێ مەعنای گەورە گەورە لە چوارچێوەی وشەی کەم و بچوکدا جێگا بکاتەوە .

بە شیعری پێشوودا کە شەونمی لەسەر (ئەوراق) بە (نەظم و نەثر) تیا پیشاندرا و، لە هەردو حاڵەکەیدا بۆ هەڵدان بە شان و باڵی ڕەوانبێژیی نالیدا هاتبوە دەنگ ، لەوانەیە بگەینە ئەوە کە نالی پەخشانی جوانیشی نوسیوە و ، ئەم بەکارهێنانی وشەی ( نەظم و نەثر )ە کە هەریەکی دوو مەعنا ئەگەیەنن ، بۆ ئەم مەبەستەیە .

:

★ ★ ★

## تیپی میم

— ١ —

بە هاوین جەستە خەستەی دەردی گەرمام
بە زستان دڵ شکستەی بەردی سەرمام (١)

لە هێلانەی زەمیندا وەك شتور مورغ
منی قودس ئاشیان بێ باڵ و پەڕ مام (٢)

---

— ١ —

(١) جەستە : لەش . خەستە : نەخۆش .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا گلەیی لە بەختی خۆی و ناباری چەرخی گەردوون ئەکا کەوا نە کات و نە شوێن هیچکامیان بە ئارەزووی دڵی ئەو نەهاتوون و هیچیان نەیانتوانیوە حەسانەوەی دڵ و گیانی بۆ دابین بکەن. لەم شیعرەیدا گلەیی لە کات ئەکا و ئەڵێ هیچکام لە وەرزەکانی ساڵ دڵی ئاو نادا و لە هیچ کامیاندا ناحەسێتەوە ، نە لە وەرزی گەرما دا و نە لە وەرزی سەرما دا .

لە یەکخستنی ( هاوین ) و ( زستان ) و ، ( گەرما ) و ( سەرما )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( جەستە ) و ( خەستە ) و ، ( دەرد ) و ( بەرد ) و ، ( گەرما ) و ( سەرما )دا جیناسی لاحیق و ، لە وشەی (بەرد)یشدا لەطافەت هەیە چونکە (بَرْدْ) بە عەرەبی واتە سەرما .

بەردی سەرمام (چن) و (مم) و (کم) و (ت) و (مز) و (من) : بەرد و سەرمام . دڵ شکستە ( چن ) : پا شکستە .

نیوەکانی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( مم ) و ( کم ) و ( گم ) و ( عب ) و ( من )دا بەرودوان .

(٢) شتورمورغ : باڵندەیەکی گەورەیە پێی درێژ و کلکی کورت و باڵی بچوکە . ناتوانێ بفڕێ ، بەڵام زۆر تیژڕەوە ، بە سەعاتێ ٠٤ کیلۆمەتر

له قوربی ( قاب قوسێن )ی دو ئەبرۆت
منی ( أدنی ) چ دوور و دەربەدەر مـــام ! (٣)

بەلا گەردانی بالآت بم ئەگەر چووم
فیدای هیندوویی خالت بم ئەگەر مـــام (٤)

---

زۆنەکا . بالای دوو میتر و نیو بەرزە . ئالف و گیانەوەر ئەخوا . بەسەر لەپۆلکەی چەو و وردە بەردەوە هێلانە ئەکا ، قودس ئاشـیان : ئەوەی ئاسمان جێی بێ . قودس : پیرۆز . ئاشیان : هێلانە .

نالی لەم شیعرەشیدا گلەیی لە دەست لەنگەلانی و بێدەسەلاتیی خۆی ئەکا کە چۆن ئـەو هەل و دەرفـەتەی بـۆی لواوە بەشی بەجێهێنانی ئەرکەکانی سـەرشانی ناکا و لە ئاستی ئەودا نییە . ئەلێ : من کەسـێکم جێگام ئەبێ بە ئاسمانی بەرزەوە بێ و هێلانـەم لەوێ بێ ، کـەچی وەك وشتر مورغم لێهاتووە ، هەم هێلانەشم بەسـەر تەختی زەویـەوەیە و هەم پەڕ و بالیشم نییە پێی بفڕم .

(٣) قورب : نزیکی . قاب قوسێن : ئەوەندەی دوو کـەوان . ادنی : ئەدنـا ، نزیك . سـوك . مام : مامەوە .

واتـە : پێـوانەی نێوانمان ئەوەندەی پێـوانەی نێـوانی دوو کەوانی برۆکانتە . کەچی منی ئەوەندە لێتەوە نزیك ، دوور و دەربەدەر کـەوتووم لێت و ، دەسـتم ناتگاتێ .

نالی لەم شیعرەدا ئیقتیباسی لـە ئایەتی ( ثمّ دَنی فَتَدَلّی ، فَكانَ قابَ قَوْسَیْنِ اوْ ادنی )ی کردووە .

ئەم شـیعرە و شـیعری پێشـەوەی لە نوسـخەکانی ( عم ) و ( کم ) و ( گم ) و ( عب ) و ( من )دا بەرودوان .

(٤) هیندوو : هیندی . خال . بە خال ئەلێن ( خالی هیـندوو ) واتە خالی وەك هیندی ڕەش .

مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شـیعری پاشەوەیەوە .

لە کۆکردنەوەی (بەلا) و (بالا) دا جیناسی ناقیص و ، لە کۆکردنەوەی ( چووم ) و ( مام )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( خال ) و ( مام )یشـدا تەناسوب هەیە هەرچەند بەمەعنا ( خالۆ ) و ( مامە )ش نین .

ئەم شـیعرە لە نوسـخەکانی ( عم ) و (کم) و (گم) و (عب) و (من)دا شیعری حەوتەمە .

ئەفەس هەروا لە زێندا دێت و نایێ
لە سەیر و مەیری ئەسبابی سەفەرمام (٥)

دەمێکە وا لەسەر پێیەك دەسوتێم
لە شەوقی تۆ بە مێشلی مۆم و ، هەر مام (٦)

---

(٥) مەیر : دووپاتکردنەوەی وشەی ( سەیر )ە بەپێی ڕێ و شوێنی زمانی کوردێ وەك ( نان ) و ( مان ) و ( پیاو ) و ( میاو ) و شتی‌وا . ئەم دووپاتکردنەوەیە جۆرە بێ‌موبالاتی و بە سووك سەیر کردنێکیش ئەگەیەنێ. مەیر هەروەها بە مەعنا خواردەمەنێ و ئازووقەیش هاتووە . سەفەرمام : سەفەرمدام .

واتە هەناسەم بەڕێوەیە لەبەوێ بێت دەرچێت ، کەچێ دەرێش‌ناچێ . دۆدڵە ، نازانێ چی بکا ! خۆیشم خەریکی تەماشای تۆیشوی سەفەری دوایێم ، بەڵام لەوەندەش گوێی نادەمێ . مەبەستی لەوەیە بڵێ خۆم بۆ سەفەری ئەو دنیام باش ئامادە نەکردووە . جا ئەگەر ڕۆیشتم ، ئەوا عومری درێژم بۆ تۆ بەجێ‌هێشتبێ و بەقوربانی باڵای تۆ بم . ئەگەر مایشم ، ئەوا بۆ تۆ ئەژیم و لە دەوری خاڵی ڕەشت ئەگەڕێم .

ئێمە وای بۆ ئەچین نالی خۆی ئەم شیعرە و شیعری پێشووی لە شوێنی یەکتری ئێستایان دانابێ ، چونکە را باشتر مەعنا ئەدەن بەدەستەوە .

لە کۆکردنەوەی ( دێت ) و ( نایێ )دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی ( سەیر ) و ( مەیر )دا جیناسی لاحیق هەیە .

سەیر و مەیری (چر) و (عب) : سەیری مەیر و . (ت) : لە سەبری سەبری . سەبر : واتە تاقی‌کردنەوە . (اح) : لە سەیر و مەیرو .

(٦) واتە : دەمێکە بەدەوام لە مێشقی تۆدا وەك مۆم ئەسوتێم ، یا وەك مۆم لەسەر یەك پێ وەستاوم ئەسوتێم ، کەچێ هەر ناشبڕێمەوە و دوایێم نایەت . ئەشگونجێ ( مۆم ) بە ( مۆم ) بخوێنرێتەوە . بەم‌پێیە مەعناکەی وا لێ‌ئەدرێتەوە کەوا لە عیشقی تۆدا وەك مۆ باریك و لەڕ و لاواز بووم .

لەنێوان (مۆم) و (مام)دا جیناسی لاحیق هەیە .

لەسەر پێیەك ( « پەراوێزی » چر ) و (عم) : لەسەر یەك پێ . (مز) : لەسەر خۆم هەر . تۆ ( « پەراوێزی » چن ) : ڕۆت .

وەرە قوربان ! بە جان هەردوو برا بین
کە تۆ بێ مادەر و من بێ پودەر مام (٧)

لە (دار العلم)ی تەحصیلی مەعاریف
وەکو « نالی » جەهول و بێخەبەر مام (٨)

— ٢ —

ئــەی تازە جــەوان ! پیرم و ئوفتــادەوو کەوتوم
تــا مــاوە حــەیاتم

دەستێ بــدەرە دەستی شــکستەم ، کە بەسەرچووم
قوربانی وەفــاتم (١)

---

(٧) بە جان : بە گیان . مادەر : دایك . پودەر : باوك .
واتە : هەردوکمان هاودەرد و هاوئــازارین . تۆ دایکت نییە و من باوك . کەواتە وەرە گیانە ، با هەردوو ببین بە برای گیانی بەگیانیی یەك .
لەنێوان (برا) و (مادەر) و (پودەر)دا تەناسوب هەیە .
هەردوو (عب) : یەك دوو . بەمپێیە شیعرەکە مەعنایەکی‌تری زۆر جوان ئەبەخشێ . واتە : وەرە بە گیان یەك کەس بین ، بە دیمەنیش دوو برا بین .

(٨) دارالعلــم : خوێندنخانە . تەحصــیل : دەستخســتن . مەعاریف : زانــت . جەهول : هیچ نەزان .
لەوانەیە نــالی مەبەستی لەم شیعرە هەر خۆ بــە کەم دانان بێ و ، لەوانەشە لــە ناموێیدا دایناــبێ و مەبەســتی بێئاگایی بێ لــە هەواڵی سولەیمانی .
بێخەبەر (چن) و (عم) و (عب) و (اح) : بێبەصەر . (ت) : دەربەدەر .

— ٢ —

(١) تازە جەوان : جوانی لە تافی لاوێتیدا . شکستە : شکاو .
ئەم پارچە شیعرە لەو جۆرەیە کــە پێی‌ئەڵێن ( موستەزاد ) چونکە ئەوەتە لەدوای هەر نیوە شیعرێکیەوە بڕگەیەکی لێ زیاد کراوە .

تۆ یوسفی ئەو حوسنی لەسەر میصری جیانی
من پیرم و فانی
لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندوم و نە مردوم
هەروا بە تەماتم (۲)

---

نالی لەم پارچە شیعرەیدا ڕووی دەمی کردووەتە پێغەمبەر ( د.خ ) و سکاڵای خۆی لا ئەکا . دیارە ئەم شیعرەی لەوکاتەدا داناوە کە لە سەردەمی پیریدا چووەتە مەدینە و زیارەتی قەبری پیرۆزی پێغەمبەری کردووە .

نالی ئەڵێ : ئەی ئەو جوانەی کە ئێستاش ، پاش مردنت بە هەزار و چەندصەد ساڵ ، هەر لە مەزنت و ئاڵی جوانیدای و هێزت هەرگیز کز نابێ ، من پیر و ئوفتادە و لێکەوتۆم . دەسا هەی بەقوربانی وەفات بم ، تا گیانێکم تیا ماوە دەستێ بدەرە دەستی شکستەم و ڕاستم کەرەوە ، چونکە ئەوەندە پیر بووم پشتم کۆم بووەتەوە و وام لێهاتووە وەك سەرم ئیشتبێتە زەوێ و بەسەر بڕۆم بە ڕێدا . یاخود ئێستا دەستێ بدەرە دەستی شکستەم و فریام کەوە . کە مردیشم ، چش ! بەلاگەردانی تۆ بم و بەقوربانی وەفات چوبم .

لە کۆکردنەوەی (تازە جەوان) و (پیر) و ، ( حەیات ) و ( وەفات )دا طیباق و ، لە (دەستێ) و (دەستی)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

لە تەنها نوسخەی (کم) و (من)دا نوسراوە (پیرم و ئوفتادەوو کەوتۆم) . لە نوسخەکانی تردا نوسراوە (پیر بی ئوفتادەوو کەوتۆم) . ئێمە ئەوەی نوسخەکانی (کم) و (من)مان پێ ڕاستتر بو ، چونکە نالی لەپێشاندا بە ( تازە جەوان ) قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد و ، ( پیر بی )یش دوعای پیربونە . پیربونیش لەگەر پیربونی ڕاستییە واتە عومری درێژ ، ئەوە دوعای وا بۆ پێغەمبەر ناکرێ چونکە لەدنیادا نەماوە . خۆ ئەگەر کینایەش بێ لە بێهێزیی ئاین و بیروباوەڕ ، بەوپێیە کە دژی ( تازە جەوان )ە ، لەوە ئەبێ بە دوعای شەڕ و ، هەرگیزیش ڕێی لێناچێ نالی دوعای شەڕ لە پێغەمبەر بکا . لەبەرئەوەش کە زەحمەتە ئەم هەمو نوسخەی دەستنوسە لەسەر هەڵەیەك یەکیان گرتبێ ، ئێمە لامانوایە هەڵە لە نوسینەوەکەدایە و ئەم (پیر بی ئوفتادەوو کەوتۆم)ە لەپێشا بەمجۆرە بووە : (پیر پی افتادە کوتوم = پیری پێ ئوفتادەوو کەوتۆم) .

(۲) یوسف : حەزرەتی یوسف کە مەشهورە بە یوسفی میسر و ، لەبەر جوانی لە ئەدەبیات و فۆلکلۆری میللیدا کراوە بە نمونە . ئەوحوسن :

فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت
وەحشی لە ویلایەت

لەم گۆشەیی ویرانەیە هەر مامەوە وەك بوم
وەیشومی ولاتم (٣)

ئەی قوبەیی طەیبە کە دەڵێی حوققەیی طیبی !
مەئوایی حەبیبی !

مسکینم و بۆ خاکی عەطرناکە کە هاتوم
بەو بۆنەوە هاتم (٤)

---

تازە جوان . جینان : بەهەشت . کولبە : کەلاوە . ئەحزان : جەمعی (حوزن)ە واتە خەم .

نالی لەم شیعرەیدا بەراورد لەنێوان توانای پێغەمبەر و بێدەسەڵاتیی خۆیدا ئەکا و دەری ئەبڕێ کەوا چەند پێویستی بە بەزەیی پێغەمبەرە . ئەڵێ : تۆ لە مەملەکەتی بەهەشتدا وەك یوسفی تازە لاوی لە میسردا و ، منیش پیرێکی لێکەوتوی کونجی کەلاوەی خەفەت گرتوم . نە ئەوەتە زیندو بم و بتوانم بۆ خۆم بژیم و ، نە ئەوەشە بمرم و بۆ خۆم بحەسێمەوە .

ئەم شیعرە ئیشارەتێکیشی بە چاوەڕوانیی کردنی حەزرەتی یەعقوبی کوێر و پیر تیا کراوە کە هەواڵێکی یوسفی کوڕی بۆ بێ .

لە کۆکردنەوەی (یوسفی ئەوحوسن) و (پیرم و فانی) و ، (میصری جینان) و (کولبەی ئەحزان)یشدا طیباقێکی جوان هەیە .

(٣) نەفیس : حەسود . عینایەت : گوێپێدان و خزمەتکردن . وەحشی : کێوی . ویلایەت : ئاوەدانی . بوم : کوندەبەبو . وەیشوم : وەیشومە ، نەگبەتی .

واتە : نەفسی بەد و حەسودم هەروەك خۆی ماوەتەوە و هەرچی خزمەتی کراوە چاکتری نەکردووە . لەبەر خراپیی خۆم زۆری ئاوەدانیم نیيە و ، دوورە پەرێز لە کونجی ویرانەدا مارمەتەوە وەك کوندەبەبو و ، بچمە هەر لایەك ئەبم بە مایەی نەگبەتی بۆ ئەو شوێنە .

لەنێوان ( مامەوە ) و (بوم)دا تەناسوبی لەفظی و ، لەنێوان (ویرانە) و

هەرچەنـدە کە من عەبـدم و ڕۆزەردم و عاصیم
مەئمولـە خەلاصـیم
قوربـانی بیـلالم کـــە هیـلالانە هەڵاتـــۆم
هەر عەفوە خەڵاتم (٥)

---

( بۆم ) و ( وەیشۆم )یشدا تەناسوب هەیە .

هەر (مز) : ئەوا .

(٤) قوبە : گومەزێ . طەیبە : ناوی شاری مەدینەیە کە قەبری پیرۆزی پێغەمبەری لیایە . حوققەی طیب : سندۆق یا قوتوی بۆن خۆشێ . مسکین : فەلاحی بێزەوێ. عەطرناك: مەتراوێ، بۆنخۆش . بەوبۆنەوە: بە بۆنی ئەو خاکەوە ، یا بەهۆی ئەو خاکەوە .

نالی لەم شیعرەیدا ڕۆی دەمی ئەکاتە گومەزی مزگەوت و مەرقەدی پێغەمبەر و ئەڵێ : لەی ئەو گومەزیەی مەرقەد و مزگەوتی پێغەمبەر لە شاری مەدینەدا ، کە ئەڵێی سندۆقی بۆنخۆشیت ( مەبەست لە بۆنخۆشییەکە لاشەی پێغەمبەرە لەناو خاکا ) ، لە جێگای خۆشەویستەکەی منی کە پێغەمبەرە و ، منیش مسکینێکی بێزەوێم بۆ ئەم خاکە بۆنخۆشە عەتراویە هاتۆم ، بۆنی لەم خاکە ڕایکێشاوم ، یا بەبۆنەی ئەم خاکە مەتراویەوە هاتۆم .

لە یەکخستنی (طەیبە) و (طیب) و ، (هاتۆم) و (هاتم)دا جیناسی ناقیص و لە (بەوبۆنەوە)شدا ، وەك ڕۆنمان کردەوە ، لەطافەت هەیە . ئەشگونجێ (مسکین) بە (مسکین) بخوێنرێتەوە واتە میسکاوێ و حەز لە میسك کردۆ . بەمپێیە لەنێوان (میسکین) و (عەطرناك)یشدا تەناسوب پەیدا ئەبێ .

بۆ خاکی عەطرناکە کـە هاتۆم (مم) و (گم) : بەو خـاکە عەطرناکەوە هاتۆم . (کم) : بەو خاکی عەطرناکەوە هاتۆم . (مب) و (تو) : بۆ خاکی عەطرناکێکە هاتۆم . (من) : لەو خاکی عەطرناکە کە هاتۆم . بەپێی لەم نوسخەیە (خاکی عەطرناك) صیفەتی مەککە ئەبێ .

(٥) عاصی : گوناهبار . مەئمول : چاوەڕوانی کراو . خەلاصی : ڕزگاربون . بیلال : بیلالی حەبەشی ، بانگدەری پێغەمبەر (د.خ) . هیلالانە : وەك مانگی یەکشەوە .

واتە : هەرچەند من بەندە و ڕۆزەرد و گوناهبارم ، هەر چاوەڕوانی ڕزگاربونم بەهۆی تۆوە . بەقوربانی بیلال بم کە بانگی دا و خەڵکی بانگ

موددێکە کە هەمگەردشی دەورانی سوپیهرم
موغبەڕ بووە میهرم
ئاوێنەیی دڵ شاهیدە هەرچەندە سیەهـ ڕۆم
میرئاتی جەلاتم (٦)

---

کرد ڕۆبکەنە تۆ بۆئەوەی لەسەر دەستی تۆدا ئازاد بن و گوناهیان ببەخشرێ و ، منیش ڕۆزەرد و لەڕ و لاواز ، وەك مانگی یەکشەوە ، هەلاك و هالم و ڕۆم‌کردە تۆ . دیارە خەڵاتی منێ کە ئەڵێی مانگی یەکشەوەم ( و کەواتە مانگی یەکشەوەم پیشان داوی ) هەر ئەوەیە ئازادم کەیت و لە گوناهم خۆش بێ .

ئەم شیعرە ئیشارەتە بەوەکە جاران مژدەی بینینی مانگی یەکشەوەیان (دیارە بۆ مانگە گرنگەکانی وەك موحەڕڕەم و مەولوود و ڕەجەب و ڕەمەزان و شەشەڵان و قوربان) ببردایە بۆ گەورەی سەردەم ، مژدەبەر خەڵات ئەکرا . ئیشارەتێکیشی تیا کراوە بۆئەوە کە لەکاتی دیتنی مانگی نوێدا بانگێك ئەدرا بۆ ئاگاداری . ئیشارەتێکی ناسکیشی تیایە بۆئەوە کە نالی (کە بە خۆی ئەڵێ : کۆیلە) بەدەم بانگی کۆنە کۆیلەیەکی تری وەك بیلالی حەبەشییەوە ڕۆیشتووە .

هیلالانە (عم) و(گم): بیلالانە. بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبێ ڕۆی شۆبهاندن بە بیلال ئەوەبێ وەك چۆن بیلال لەناو جەور و ستەمی قورەیشییەکان ڕای‌کرد بۆ لای پێغەمبەر ، ئەمیش لەناو زۆر بێ‌سەندنی گوناه ( یا ئەگەر سەرنجێکی قەسیدە شارەزۆرییەکەی بدەین ، لەناو جەور و ستەمی داگیرکەران) ڕای‌کردووە بۆ لای پێغەمبەر . هەڵاتوم (چن) : هەلاكم . بەلام هەلەیە چونکە لەگەڵ لەنگەری شیعرەکانی‌تردا ڕێك‌ناکەوێ ، سەرەڕای ئەوەش کە حالەتە تەصویرییەکەی خەبەردانەکەی ، بەپێچەوانەی شیعرەکانی‌ترەوە تیا ئەگۆڕێ بە خەبەردان لە شتێکی ڕابوردوی بڕاوە .

(٦) هەمگەردش : هاوڕێ . دەوران : خولخواردنەوە ، سوڕانەوە . سوپیهر : ئاسمان . گەردوون . موغبەڕ : تۆزاوی . میهر : خۆر . سیەهـڕۆ : ڕۆڕەش . میرئات : ئاوێنە . جەلا : ڕۆشنی و پاکی و بێ‌گەردی . دەرکەوتن .

واتە : دەمێکی زۆرە لەگەڵ چەرخی گەردوونا ئەسوڕێمەوە بە هەموو چاکە و خراپەیەکیەوە ، هەتاوم لێڵ و مینام گەردی ئەم ڕێگا دوورەی لێ

ئەی مەسجید و میحرابگەهت قیبلەیی حاجات
بۆ ئەهلی موناجات !
مەحجوبی هەوام و ، ئەمەتە مەشهەدی مەعلوم
بۆ ڕاهی نەجاتم (٧)

ئەی مەطلەعی ئەنواری هەمو قاصی و دانی
شەمسی صەمەدانی
وەك ذەڕڕەیی بێجیلوە نە مەوجود و نە مەعدوم
جۆیایی بەراتم (٨)

---

نیشتووە . بەلام لەگەل ئەوەشدا هەر دل حسێبە ، سەیری دلم بکە کە ئاوێنەی ڕوناکی و نوری تۆیە و تۆی تیا دەرئەکەوێ ، سەیری کە چەند پاك و خاوێنە و چەند جوان تۆی تیا دیاری .

لەنێوان (ئاوێنە) و (ڕو) و ، (میرئات) و (جەلا)دا تەناسوب هەیە .
موغبەڕ ( مم ) : تەغبەر .

(٧) مەسجید : مزگەوت . میحرابگەه : شوێنی میحراب . ئەو شوێنەی مزگەوت کە پێش نوێژی تیا ئەوەستێ . قیبلەیی حاجات : ئەو شوێنەی موحتاجان ڕوی تێ ئەکەن . موناجات : پاڕانەوە . مەحجوب : شەرمەزار . هەوا : ئارەزوی نەفس . مەشهەد : جێگەی کۆبونەوەی خەلك . ڕاه : ڕێگا .

وانە : ئەی ئەوکەسەی کە مزگەوت و میحرابت قیبلەی موحتاجانە و ، لە هەمو لایەکەوە ڕوی تێئەکەن و تیا ئەپاڕێنەوە لە خوا .. منیش یەکێکم لەوانە و شەرمەزاری ئارەزوی نەفسم ، هاتومەتە ئێرە و ، ئێرە ئەو شوێنەیە ڕێگای ڕزگاری و سەرفرازیی خۆمی لێوە ئەدۆزمەوە .

(٨) مەطلەع : ئەو شوێنەی خۆر و مانگی لێوە هەلدێ . قاصی : دور . دانی : نزیك . صەمەدانی : خوایی . بێجیلوە : بێمایە . جۆیا : ئەوکەسەی بەدوای شتێکدا بگەڕێ . بەرات : خەلات .

وانە : ئەی ئەوکەسەی ڕوناکی بۆ دور و نزیك ، هەمو لای تۆوە هەلدێت ! . ئەی خوری خواکرد بۆ ڕوشنکردنەوەی جیهان ! . منی نابوت وەك تۆزێکی بێمایە و هیچ و پوچ وام لەبەر تیشکی خوری تۆدا ،

لەم خاکی دەری ڕەحمەتی بێ زەحمەتە ، « نالی »
فیردەوسە مەئالی
حاشا کە لەمێدا بمە سائیلی مەحرووم
هەرچەند لە عوصاتم (٩)

---

بۆ ئەوە ناشێم نە بە بۆ و نە بە نەبۆ دابنرێم . چاوەڕوانی خەڵات و بەرائی تۆم بمگرێتەوە .

نالی لە دوو نیوەکەی ئەم بەیتەدا ، بەرابەر بە هەر وشەیەکی یەکەمیان دژەکەیی لە دووەمیانا داناوە : (مەطلەعی ئەنوار) بەرابەر بە (ذەڕڕەیی بێ‌جیلوە) . (قاصی و دانی) بەرابەر بە (مەوجوود و مەعدووم) . (جۆیای بەرات) بەرابەر بە (شەمسی صەمەدانی) چونکە صەمەدانی نیسبەتە بۆلای ( صەمەد ) کە واتە ( بێ‌ئیحتیاج ) و دژی ( جۆیای بەرات )ە . لە بەراورد کردنی (شەمس) و (ذەڕڕە)شدا طیباقێکی ئێجگار قووڵ هەیە . هەروەها لە (قاصی) و (دانی)یشدا طیباق هەیە .

بێ‌جیلوە (کم) و (من) : پێچیدە .

(٩) فیردەوس : بەهەشت . مەئال : سەرەنجام . لەمێدا : لێرەدا . سائیلی مەحرووم : سوالکەری بێ‌بەش . عوصات : گوناهباران ، جەمعی عاصییە .

واتە : لەم خاکی دەرگای ڕەحمەتی بەناسانی و بێ مەینەت دەس‌کەوتووەی پێغەمبەردا ، نالی سەرەنجام بەهەشتی دەسگیر ئەبێ . من هەرچەند گوناهباریش بم ، هەرگیز لەم شوێنەدا بێ‌بەش نابم و ، نابم بە سوالکەرێ بە ناوومێدی بگەڕێتەوە .

لە کۆکردنەوەی (ڕەحمەت) و (زەحمەت)دا جیناسی موضاریع هەیە و لە ڕستەی (دەری ڕەحمەت)دا ئیشارەت کراوە بۆ ئایەتی ( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ) و ، لە ( سائیلی مەحرووم )یشدا ئیشارەت کراوە بۆ ئایەتی ( وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ ، لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ) . نالی کە لە نیوە شیعری یەکەمدا خۆی بە (نادیار) و ، لە نیوەی دووەمدا خۆی بە ( دیار ) داناوە ، شێوەی ئیلتیفاتی بەکارهێناوە لە غائیبەوە بۆ موتەکەللیم .

ڕەحمەتی ( چر ) : ڕەحمەتە . بەپێی ئەم نوسخەیە ( نالی ) موبتەدا و (بێ‌زەحمەتە) خەبەری ئەبێ . بەپێی نوسخەکانی‌تریش (بێ‌زەحمەتە)

— ٣ —

حەنایی کردووە پەنجەی بە خوێناوی دلی زارم
ئەمە ڕەنگە شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دلدارم (١)

گوتم : ئایا بە زاری خۆت دەپرسی حالی زاری من ؟
برۆی هێنایە یەك ، وەك شکلی ( لا ) یەعنی کە بێ زارم (٢)

---

صیفەتی (ڕەحمەتی) و ، (نالی) هەر موبتەدا و ، خەبەرەکەی ڕستەی (فیردەوسە مەئالی) ئەبێ .

بەرابەر بە یەك دانانی (نالی) و (مەئالی) ، وەك لە سەرەتاکەدا ڕوون کراوەتەوە ، بەلگەیەکی‌تری ئەوەیە کەوا نازناوی نالی بە لامی سوکە نەك بە لامی قەلەو .

— ٢ —

(١) حەنایی : خەناوی ، سوور . زار : بریندار . شەهادەت : شەهیدی . شایەتی .

واتە : یار پەنجەی خۆی بە خوێناوی دلی بریندادی من سوور کردووە و نەلێی خەنەم تێکردووە . لەوانەیە ئەم پەنجە سوور بوونەی یار بێ بە بەلگەی بە شەهیدی مردنی من کەوا بە دەستی کافرێکی بێ‌ڕەحمی وەك ئەو کوژراوم ، یا بێ بە شایەتی بۆم کەوا کوشتەی دەستی ئەوم .

حەنایی (کم) و (گم) و (من) : خەناوی (هب) : حەناوی . لەوانەیە ئەمیش (خەناوی) بووبێ . کردووە (ت) و (مز) : گرتەوە . پەنجەی (چر) و (جن) : پەنجە . (ت) : یارم . خوێناوی (ت) : خۆناوی . ڕەنگە (کم) و (گم) : ڕەنگی یا ڕەنگێ .

(٢) زار (ی یەکەم) : دەم . زار (ی دووهەم) : ناڕەحەت . لا : لامەلفەلا کە واتە نەء ، کە ئەگەر وابنووسرێ : ( لا ) ، ئازادەیەك وەك کەوانی لێ دەرئەچێ و لە (برۆ) ئەچێ . زار (ی سێهەم) : دیسانەوە دەم ، یاخود لەگەل (بێ)کەدا پێکەوە وشەی (بێزار) پێك دێنن .

واتە : بە یارم گوت ئاخۆ هەرگیز ڕێ‌ئەکەوێ ئەوەندە لوتفت لەگەلم هەبێ بە دەمی خۆت هەوالێکی حالی ناڕەحەتم بپرسی ؟ ئەویش برۆکانی وەك وشەی (لا) هینایەیەك و هیچی نەوت ، تەنها بەو برۆ هێنانە یەکەی

عەجەب ئەستێرە شەو هەڵدێ لە تاوی خوسرەوی خاوەر
بە ڕۆژی تۆم دیدە هەڵنایێ شەو و ڕۆژ ، ئەرچی بێدارم (٣)

---

پێی ڕاگەیاندم کە دەمی ئەوەندە بچوکە قسەی بێ ناکرێ ، یاخود بێزار و وەڕسە لێم و وەڵامم ناداتەوە .

لەنێوان سێ وشەی ( زار )دا جیناسی تەواو و ، لە (بێزارم)دا لەطافەت هەیە . لەبەینی ( خۆت ) و ( من )یشدا تەقابول و لە کۆکردنەوەی (وتم) و (بڕۆی هێنایەبەك)دا کە یەکەمیان قسە کردن و خۆ بە کەم دانان و دووەمیان فیز و خۆ بە زل زانین ئەگەیەنێ ، طیباق هەیە . هەروا لە ( ڕۆژی هێنایە یەك ) و (بێزارم)دا بە هەردۆ مەعناکەی تەناسوبێکی جوان هەیە ، چونکە ناوچاو هێنانەیەك و ڕۆگرژکردن لەگەل ( نا ) وتن و ( بێزارێ ) یا ( بێزارێ )دا گەلێ گونجاوە .

گوتم (چر)و (چن) و (کم) و (من) : وتم .

ئەشکونجێ (لا)کە و (یەعنی)یەکە بەیەکەوە ببەستێ و ببێ بە (لایعنی) واتە : گوێی لێ نییە . بەمجۆرە مەعناکەی وای لێدێتەوە : برۆی بەشێوەیەکی بێموبالاتانە هێنایە یەك ، واتە دەمی نییە ، یا تاقەتی نییە وەڵام بداتەوە .

(٣) خوسرەوی خاوەر : پادشای ڕۆژهەڵات ، کینایەیە لە خۆر .
واتە : من سەرسام ماوم ! من بە شەو و بە ڕۆژ بێدارم و لەگەڵتام ، لەگەل ئەوەش نە بە شەو و نە بە ڕۆژ چاوم لە ڕۆژتا هەڵنایەت و ناوێرم سەیرت بکەم ، کەچێ ئەستێرە کە تا خۆر دیار بێ ئەو دیار نییە و بە ڕۆژ نوستووە ، لە خۆر نالرسێ و بە شەو هەڵدێ و ئەکەوێتە جریوە جریو !

نالی لەم شیعرەیدا ڕۆی یاری بەرابەر بە خۆر و چاوی خۆی بەرابەر بە ئەستێرە داناوە و بڕیاری داوە کەوا ڕۆی یار لە خۆر کاریگەرترە . ئەوەتە چاوی خۆی کە هەمیشە بە شەو و ڕۆژ لە بەرابەر ڕۆی یارەوەیە و ساتێ لێی دۆر ناکەوێتەوە،هەرگیز بارای هەڵهاتنی لەماستی ئەودا نییە. کەچێ ئەستێرە کە تیشکیشی لە خۆر وەرئەگرێ و بە ڕۆژیش لایا نییە، نالرسێ ، بە شەو هەڵدێ .

لە کۆکردنەوەی (ئەستێرە) و (شەو) و ، (ڕۆ) و (دیدە)دا تەناسوب و، لە بەینی (هەڵدێ) و (هەڵنایێ) و ، (شەو) و (ڕۆژ)دا طیباق هەیە .

شەو هەڵدێ (چر) و (عب) : هەڵدێن شەو. لە تاوی (عب) : لە تاپی. بە ڕۆی (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (عب) و (من) : لە ڕۆی . ئەرچی (عم) و (کم) و (گم) و (طن) : گەرچی .

طەبیبی من دەبێ دەخلی هەبێ ، صاحیب ئیشارەت بێ
مەگەر چاوت بزانێ من لەبەر چی مەست و بیمارم ! (٤)

بە سەروم وت کە ڕاستە سەرکەش و بەرزی ، کەچی لەرزی :
کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان بەندەی قەدی یارم ! (٥)

---

(٤) دەخل : پەیوەند .

وات‌ە : مەگەر هەر چاوەکانت عیلاجی دەردی من بکەن ، چونکە حەکیمی من ئەبێ حەکیمێ بێ پەیوەندی بە نەخۆشەکەیەوە هەبێ و لە دەردی بزانێ و ئیشارەتی پێ بکرێ و بتوانێ ڕێی بۆ دانێ . بۆیە مەگەر هەر چاوە مەستە بیمارەکانت کە پەیوەندی مەستێ و بیماریان لەگەڵ من هەیە ، بزانن بۆچی من ئاگام لە خۆم نییە و بیماری چیم .. ئەبێ چاوەکانت کە بە ئیشارەتی خۆیان وایان لە من کرد ، ئیشاردت بکەن و ڕێ و شوێنم بۆ دانێن و دەرمانی دەردم بدۆزنەوە . (لە ئەدەبیاتدا چاو بە مەست و بیمار وەصف ئەکرێ ) .

لە کۆکردنەوەی ( ئیشارەت ) و ( چاو )دا تەناسوب و ، لە (هەبێ) و ( دەبێ )دا جیناسی لاحیق هەیە .

دەبێ (کم) و (من) : ئەبێ . هەبێ (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) : ببێ . ئیشارەت (عم) و (گم) : مرووەت. مەست و ( اح ) : ست و .

ئەم شیعرە و شیعری پاشەوە لە نوسخەی ( چر )دا بەرودوان . لە نوسخەی ( عم )یشدا بەیتی حەوتەم لەپێش هەردوکیانەوە دانراوە .

(٥) سەرکەش : یاخی و ملبەرز . فەرق : تەپلی سەر . قەد : بالا .

وات‌ە : بە داری سەروم وت ڕاستە تۆ بەرز و یاخیت و سەر بۆ کەس دانانەوێنی ، کەچی ئەو لەجیاتی ئەوەیبەو پیا هەڵدانەی من لە خۆی بایێ ببێ ، کەوتە لەرزین و موچوڕکە بە لەشیا هات و وتی : سەریشم بگاتە ئاسمان ، هەر بەندە و ملکەچی بالای یارم ، واتە سەرم لەبەر پێیایەتی .

لەنێوان (بەرزی) و (لەرزی)دا جیناسی لاحیق هەیە .

وت (عم) و (گم) و (مز) و (هب) : گوت . کە ڕاستە (چر) و (کم) و (گم) و (هب) و (من) : کە ڕاست و . (عم) : کە ڕاس و . سەرکەش و ( هب ) : سەرکەشی .

له شیرینیی ئەتۆ ، ئەی خوسرەوی تەختی زەمین ، ڕەنگە
بگاتە ئاسمانی بێستون فەرهادی هاوارم (٦)

بڕۆت بالی هوما سایەی سەری سولطانی حوسنت بۆ
خەطت هات و وتی : من ناسیخی طوغرایی خونکارم (٧)

---

(٦) شیرین : سەرەڕای مەعنای خۆی ئیشارەتیشە بە شیرینی داستانی شیرین و فەرهاد . خوسرەو : پادشا . خوسرەوی پەرویز . بێستون : ئەو شاخەی فەرهاد تاشیی . بە ئاسمانیش ئەڵێن ، چونکە بێستون واتە بێ کۆڵەکە و ئاسمانیش کۆڵەکەی نییە . فەرهاد : دلداری شیرین و بە هەر بەدبەختێکی هاوارکەریش ئەڵێن و لە وشەی (فەریاد)یشەوە نزیکە.

واتە : لەی پادشای سەر تەختی زۆری زەوی ! ڕەنگبێ من لە مەزرەت جوانی و شیرینیی تۆ هاوارم بگاتە ئاسمان !

لە یەکخستنی (شیرین) و (خوسرەو) و (تەخت) و (بێستون) و (فەرهاد) و ، (زەمین) و (ئاسمان)دا تەناسوب و ، لە بەرانبەری یەك دانانی (زەمین) و (ئاسمان)دا طیباق هەیە .

لە شیرینیی ئەتۆ ( جن ) و (ك) و ( عب ) : بە شیرینیی ئەتۆ . (مم) : بە شیرینیی تۆ . تەختی (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مز) و ( من ) : زۆرین . فەرهادی (چر) و (ت) : فەرهاد و . ( عم ) و (کم) و (گم) و (مز) و (من) : فەریاد و .

(٧) هوما : بالدارێکی ئێستان خۆرە ئەڵێن سێبەر بەسەر هەرکەسەوە بکا بەختەوەر ئەبێ یا ئەبێ بە پادشا . خەط : مۆی تازە دەرهاتووی سمێڵ ، ئەڵێن فلانکەس خەطی داوە واتە سمێڵی بۆز کردووە . جارانیش لە داوێنی لێوی خواروومەوە بۆسەر لۆتکەی چەناکە نەخشێکی ستوونیان ئەکوتا ، بەوەشیان ئەوت خەت . ناسیخ : هەڵوەشێنەرەوە . لەو ئایەتەی قورئان کە حوکمی ئایەتێکی تر لەناوا هەڵگرێ . طوغرا : مۆری پادشا . زولفی لول . خونکار : خوێنڕێژ . پادشا .

واتە : جاران کە هێشتا منال بوویت و مۆت لێ نەهاتبوو ، برۆکانت بالی هوما بوون ، سێبەری سەری پادشای جوانیت بوون ، بۆ هەرکەست بڕوانییایە بۆی ئەبوون بە بالی هوما ، بۆی ئەبوون بە سێبەری سەری پادشا بەسەریەوە . یاخود جاران برۆکانت بالی ، سێبەر وەك سێبەری هوما پیرۆزی ، سەری پادشای جوانیت

سەراپا هەروەکو حەلقەی زرێ پەرویزەیی خوێنم
بە یەك یەك تیری موژگانی زرێ دۆزت برینداریم (٨)

حەمایڵ کە دەمی تێغت لە حەڵقەی گەردنی « نالی »
مەگەر تێراو بیم بەو ڕەنگە ، تیتوی ساعیدی یارم (٩)

---

بون ، هەرکەس بهاکایانە ڕژیان ، واتە بۆ هەرکەسێت بڕوانییایە و بکەوتایەتە بەر نیشارەتیان ، بەختی نەبڕا .. ئێستا کە سمێلت بۆز کردووە ، بەربەرەکانێی زولفی ، وەك ئیمزای توغرایێ پێچپێچی ، کچانی خوێنڕێژ نەکا و ، نەڵێ دەسەڵاتی ئەو زولفانەم لە مەیدانا هەڵگرتووە و ئیتر ڕۆژ ڕۆژی منە . یاخود ئێستا ئەو دەورە نەك هەر برۆکانت نایبینن، زولفی وەك توغراشت نایبینێ .. لەوەڵەی خەتی ژێر چەناکەت هاتووەتە ئاراوە حوکمی زولفیشتی هەڵوەشاندووەتەوە .

ئەم شیعرە دۆ ئیستیعارەی موصەڕڕەحەی تیایە : (خەط) لە مەعنای خۆیەوە کە نوسینە ، خوازراوە بۆ کەتمۆی سمێل ، یا بۆ ئەو نەخشە ستونییەی لەژێر لێوی خوارووەوە ئەکوترێ . (طوغرا)یش لە مەعنای خۆیەوە کە موری شاهانەیە ، خوازراوە بۆ زولفی پێچپێچی کچان . ئیستیعارەکان لەوەوە دروستکراون کە جاران پادشاهان وابووە بۆ ڕاسپێرییێك هەر موریکیان بە کاغەزا ناوە و ، واشبووە کاغەزیان نوسیوە . دیارە کە کاغەزیان نوسیبێ لە مورە ڕۆتەکە ڕەواتر بووە .

سایەی سەری (عم) : سایە لەسەر . ولی (عم) و (گم) : گولی . خونکارم (مب) : خەطکارم .

(٨) زرێ : جۆرە کراسێکی کونکونی میتالێ بووە جەنگاوەرانی کۆن لەبەریان کردووە لە لێدانی شیر و تیر پاراستونی . پەرویزە : بێژنگ . زرێدوز : زرێسم .

واتە : بە نوکی تیری بژانگی زرێ سمت برینداز بووم ، سەرتاپای لەشم وەك بێژنگی لێ هاتووە خوێن دائەدا .

بە یەك یەك (چن) و (کم) و (لد) و (اح) و (من) : بە یەیکی . (گم) : بە نوکی .

(٩) حەمایڵ : ئەوەی ڕاست و چەپ لە مل کرابێ وەك فیشەکلغ و شمشیر و شتیوا یا دوعای لەکیفگیراو . ساعید : باسك .

واتە : دەمی تێغت ڕاست و چەپ بدە لە گەردنم یا باش بیبڕێ و

— ٤ —

دەورانییە ، وەك هێلەكی سەودا ، سەری گێژم
بۆیە بە دەقیقی مەثەلە هەرچی دەبێژم (١)

---

خوێنی زۆری لێ بێ ، چونکە تینوی باسکی یارم مەگەر هەر بەوڕەنگە تێراو ببم .

حەلقەی گەردەنی ( « بەراوێزی » چر ) و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (من) : حەلـق و گەردەنی . ببم (مم) و (کم) و (گـم) و (ت) و (مب) و ( من ) : ببێ . بەمڕەنگە مەعناکـەی وای لێدێتەوە : مەگـەر بەوڕەنگە باسکی تینوی یارم تێراو ببێ . بەو ڕەنگە ( چن ) و ( ك ) : بەو نەوعە . ( « بەراوێزی » چر ) و ( اح ) : بەمنەوعە . ( مم ) : بەم ڕەنگە .

— ٤ —

(١) دەورانی : ئەوەی بە دەوری خۆیا خولبخوا ، یا ئەمدەس و ئەودەسی پێبکەن . هێلەك : هێلەکی ئارد بێژان کە ئاردە وردەکە لە سۆسەکەی جوێ ئەکاتەوە . سەودا : سەرەخولە تووشهاتوو . دەقیقی : بە وردی . وەك ئارد . دەبێژم : ئەڵێم . لە بێژنگ یا لە هێلەکی ئەدەم .

واتە : سەری گێژم وەك هێلەکی بەدەستەوە خولاوە ، چۆن هەمیشە بە دەستی ژنی ئاردبێژەوە ئەخولێتەوە ، ئەمیش هەمیشە هەر وا ئەخولێتەوە بە دەوری خۆیا و ، ئەو بیرانە لە تەتەڵە ئەدا کە بە مێشکیا دێن و بڕ و پووچیان لە یەك جوێ ئەکاتەوە . بۆیە هەرچی بڵێم و هەر شیعرێ بنووسم ، لە بێگەردی و وردیدا نموونەیە ، وەك چۆن ئاردێ ترابێ لە هێلەك لەوپەڕی خاوێنی و وردیدایە و هیچ سوس و پل و پووشی پێوە نییە .

جگە لەو لەطافەتانەی لە هەندێ وشەی ئەم شیعرەدا هەن و لە مەعنا لێدانەوەکەدا ئیشارەتمان بۆ کردن ، لە وشەی ( گێژ )یشدا لەطافەتێك هەیە چونکە ( گێژ ) بە جۆرە بێژانێکیش ئەوترێ . ( گێژ و تەتەڵە ) لەناو ژنانا وشەیەکی باوە . لە کۆکردنەوەی ( هێلەك ) و ( گێژ ) و (دەقیق) و ( دەبێژم )یشدا تەناسوب هەیە .

هێلەکی (چر) و (چن) و (مب) و (مز) : هێلەك . ئەمە دەست ئەدا ( هێلەکی ) بێ و دەستیش ئەدا (هێلەکە) بێ . (ك) و (اح) : هێلەکە . لەسەر نوسخەی (هێلەکە) و زۆڵێچوونی (هێلەکـە) لە نوسخەکانی

هەر پەرچەم و پێشانیە فیکری شەو و ڕۆژم
هەر گەردەن و زولفە ئەمەلی دوور و درێژم (٢)

بێ دیدەوو دیداری ، هەمو خوێنە گر یەنم
یەعنی گوڵ و نەرگس کە نەبێ ، لالە دەنێژم (٣) ■

---

(هێلکە)دا نیوە شیعرەکە وا ئەخوێنرێتەوە :

**دەورانیە ، وەك هێلەکە ، سەودا سەری گێژم**

مەعناکەشی وای لێدێتەوە : سەری گێژی تۆشی دەردی سەودا بوم ، وەك هێلکە وایە بە دەوری خۆیا خول ئەخوا . سەری ( ت ) و (ك) و(ح) : سەر و .

(٢) پەرچەم : ئەو قژەی ناوچاوان ئەگرێتەوە . پێشانێ : ناوچاوان . ئەمەل : هیوا .

لە هەردوو نیوەکەی ئەم شیعرەدا لەف و نەشری مورەتەب هەیە ، چونکە دیارە (شەوەزەنگ) لەگەڵ (زولف) و ، (ڕۆژ) لەگەڵ (ناوچاوان) و، هەروا (دوری) لەگەڵ (گەردن) و ، (درێژی) لەگەڵ (زولف)دا پەیوەندیان هەیە . لە کۆکردنەوەی (شەو) و (ڕۆژ)یشدا طیباق و ، لە یەکخستنی (گەردن) و (زولف)دا تەناسوب هەیە .

شەو و ( چن ): شەب و .

(٣) لالە : گیایەکی بچوکی کێویە زیاتر لە شوێنی شێداردا ئەڕوێ،مالیش ئەکرێ . لە سەرەتای ناوەڕاست مانگی بەهارا پێ ئەگا . جۆرە کێویەکەی گوڵێکی سوری هەیە .

واتە : هەرچەند چاو و ڕوی تۆم لێ نادیار بێ ، من لە خەفەتدا لەجیاتی فرمێسك خوێن لە چاوانم دێ . دیارە کە گوڵ و نەرگسم نەبێ، ئەبێ لالە لە زەویدا بنێژم .

مەبەستی ئەوەیە بڵێ چاوی تۆ وەك نەرگسی مەست و ڕوخسارت وەك گوڵی سوور وایە لە بەرچاوی مندا . تا ئەوان دیار بن شادێ و خۆشیمە ، بەڵام کە ئەوان نەبون ، لە خەفەتدا فرمێسکی سوور لە چاوانم ئەڕژێنمە زەوێ و ئەوەندەش زۆری ئەڕژێنم ، بەرز بێتەوە ، وەك بڵێی نەمامی لالەم ناشتبێ .

لە (گوڵ) و (نەرگس)دا لیستیعارەی موسەڕەحە هەیە . (ڕومەت)ی یار بە (گوڵ) و (چاو)ی بە (نەرگس) شوبهێنراوە . ئەنجا

■ لام وایە دەبێ وا بێ .

بێ دیدە و دیداری هەموو خوێنە گرینم
یەعنی گوڵ و نەرگس‌کە نەبێ لالە دەنێژم

ڕەنگ و ئەثەری شۆڕشی لەعلی لەکینە
ئەم ئەشکە کە بەم سوورییو سوێرتیە دەڕێژم (٤)

---

(ڕزمەت) و (چاو) لابراون و پێ شوبهێنراوەکان کە (گوڵ) و (نەرگس)ن لەجێیان دانراون . نیوە شیعری یەکەمیش نیشانەی ئەمەیە . هەروەها لە (لالە)شدا ئیستیعارەیەکی موصەڕڕەحە هەیە ، چونکە (فرمێسکی سوور) شوبهێنراوە بە (گوڵی لالە) و ئەنجا (فرمێسکی سوور) لابراوە و (لالە)ی لە شوێندا دانراوە و نیشانەش ڕستەی (خوێنە دەگریێم)ە لە نیوە شیعری یەکەمدا .

لە هێنانی (گوڵ) و (نەرگس)دا بەدوای (دیدە) و (دیدار)دا لەف و نەشری موشەووەش هەیە .

دیدەوو (چر) و (ت) و (اح) : دیدەیی . بەڵام مەعنای بەئاسانێ نایەت. (مز) : دیدەنی . هەمۆ ( « پەراوێزی » چر) و (عم) و (مـن) : ئەتـۆ . دەگریێم («پەراوێزی»چر) و (چـن) و (عـم) و (کـم) و (گـم) و (من) : گرینـم . (ك) : ئەگریەم . گوڵ و نەرگس کە نەبێ («پەراوێزی»چر) : کە نەبێ نەرگس و گوڵ . نەرگس (کم) و (گم) و (من) : نێرگس .

(٤) شۆڕش : هەرا . لەعل : کینایەیە لە لێوی یار . لەکین : خوێناوێ ، سوێر . کینایەیە لە خۆش و بەتام .

. واتە : ئەو ماچەی لێوی وەك لەعل سوور و ، وەك خوێ بەتام و خۆشەت کە کردم ، هەرایەکی لە دەروونما بەرپا کرد ، ئەنجامەکەی ئەوەبۆ ئیستا کە لێمەوە دوورێت ، ئەم فرمێسکە زۆرە وەك خوێن سوور و وەك خوێ سوێرە لە چاوانم ئەڕێژم .

لە ( سووریێ ) و ( سوێریێ )دا جیناس هەیە . لە هێنانی ( سووریێ ) و ( سوێریێ )یشدا بەدوای ( ڕەنگ ) و ( ئەثەر )دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

نیوە شیعری دۆهەم جۆرە لەنگییەکی تیایە لەگەڵ زەوقی نالیێ ناگونجێ . هیچ نەبێ ئەبۆ بووترایە (بەم سووری‌یو بەم سوێریە ..) . خۆ ئەگەر واش‌داڕێژرایە لەدوای (سوێریێ)یەوە هیچ پاشگرێکی‌تر نەبوایە گەلێ ڕێکتر و جوانتر ئەبۆ . نوسخەکانی بەردەستمان ، هیچ‌کامیان مەودای دۆزینەوەی شێوەیەکی ڕاستتریان نەدایێ . بۆیە ئێمەش وەك خۆیمان هێنستەوە .

ڕەنگ و ئەثەری شۆڕشی : ئەمە تێکستی نوسخەی (چر)ە .

بێ نییەتی تەقبیلی دەست عاطیلە ڕۆژووم
بێ حەضرەتی میحرابی برۆت باطیلە نوێژم (٥)

« نالی » وەکو لالە کە شەهیدی غەم و داغە
لەم باغە بفەرموو کە ئەویش لێرە دەنێژم (٦)

---

نوسخەکانی تر لە دانان و دانەنان و چۆنیەتیی دانانی (واوەکانی عەطف) و (یێکانی ئیضافە)دا جیاوازییەکی زۆریان تیایە . بە ڕای ئێمە هەر ئەمەی نوسخەی (چر) ڕاست و ئەوانی تر هەمو هەڵە بوون یا ئیحتیمالی ڕاست و هەڵەیان هەبوو ، بۆیە گوێمان نەدانێ . سوریو سوێرتیە («پەراوێزی» چر) و (کم) و (ت) و (اح) : سوێریو سوریە. (مز) : سوریو شورتیە .

(٥) نییەت : نیاز . تەقبیل : ماچکردن . عاطیل : پەککەوتوو . حەضرەت : دیاربوون . میحراب : میحرابی مزگەوت ، تاقێکی بەرزە لە ناوەڕاستی دیواری پێشەوەی مزگەوتدا سەرەکەی وەک کەوان هاتووەتەوە و پێشنوێژ تیا ئەوەستێ . باطیل : بەتاڵ ، دانەمەزراو .

وانە : وەک چۆن ئەگەر ڕۆژووەوان تا دواکاتی حەرامبوونی خواردن و خواردنەوە ، نیازی ڕۆژوگرتنی سبەینێی لە دڵا نەبێ ، ڕۆژووەکەی دانامەزرێ ، منیش ئەگەر بەر لە دەستپێکردنی ڕۆژووم نیازی ماچکردنێکی دەمی تۆم لە دڵا نەبێ (دیارە کە بنیادەمیش نیازی کردنی شتێکی بۆ ، ئەیکا)، ڕۆژووەکەم دانامەزرێ . هەروەها هەر نوێژێ ئەیکەم، ئەگەر لە حوزووری میحرابی برۆی تۆدا نەبێ و لە بەردەمی تۆدا نەوەستابم و ڕوم نەکردبێتە قیبلەی تۆ ، ئەو نوێژەم بەتاڵ و بێسودە.

لە کۆکردنەوەی (ڕۆژوو) و (نوێژ) و ، (دەم) و (برۆ)دا تەناسوب و ، لەنێوان (عاطیل) و (باطیل)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (نییەت) و (حەضرەت)دا کە یەکەمیان مەعنای حازرنەبوون ئەگەیەنێ ، طیباق هەیە . ( نییەت ) زاراوەیەکی فیقهە .

(٦) داغ : داخ .

وانە : نالی لە خەمی دووریت و بەهۆی سۆزی زۆریەوە بوت ، شەهید بووە. نیشانەی شەهیدیەکەشی ئەوەلە وەک لالەی سور،سور و خوێناویە . دەسا بفەرموو ئەویش لە باخی بۆ لە گوڵی ڕوخسارتا بنێژە و بیخەرە چاڵ و با لەپاڵ نەرگسی چاوتا بێ ، خۆ لەویش هەر هیچ نەبێ ، مادەم لالەیە ، گوڵە ..

— ٥ —

عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم
زۆرم وت و کەس تێی نەگەیێ ، ئێستە خەمۆشم (١)
لەو گەردەنی و عیقدە کە پڕە گەردەنی و گۆشت
بەو پێیە کەنارم کە پڕە دامەنی و کۆشم (٢)

---

لەنێوان ( نالی ) و ( لالە ) ، و ( باغ ) و ( داغ )دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی ( لالە ) و ( باغ ) و ( دەنێژم )دا تەناسوب هەیە .

وەکو لالە کە (ك) و ( مز ) : کە وەکو لالە . غەم و داغە (گم) : خەم و داغــە . ( مز ) : غــەم و دەردە . ئەویش ( عم ) : ئــەمیش . ( گم ) : منیش !

— ٥ —

(١) میزان : تەرازو . توحفە : عەنتیکە . دیاری . خەمۆش : بێدەنگ .

واتە : دەمێك بو بە سـەنگ و تەرازوی ئەدەب شیعری جـوانم بەناو خەلکا بلاو ئەکردەوە و عەنتیکە فرۆشـیم ئەکرد. بەلام‌ئاسـتی لێ‌گەیشتنی خەلك ئەوەندە نەوێ بو ، هەرچیم وت کەس لێم حالی نەبو . بۆیە ئێـستا وا بێدەنگ بووم .

ئەم شیعرەی نالی هاوارێکی ناڕەزاییە لە ڕۆی کۆمەلدا دەری‌ئەبڕێ. ئەو کۆمەلەی کــە چینی بنـەوەی لەبــەر بەدبـەختێ و کوێرەوەرێ و دواکەوتن نە ئەتوانێ لە هونەری جـوان بگا و نــە لەئاسـتی ئەوەشدایە قەدری هونەرمەنـد بگرێ . چینی سەرەوەشـی تا بینەقـاقەی نوقمی ڕابواردن و نازەزۆبازێ و خـەلك چەوسـاندنەوەی خۆیەتی و ، ئەگەر جاروبارێکیش لایەك بە لای هونەری جواندا بکاتەوە ، هەر بۆ ڕابواردنی خۆشی خۆیەتی .

لەنێوان ( میزان ) و (فرۆش )دا تەناسوب هەیە

توحفە ( چن ) : نوکتە . وت و ( عم ) و (گم) و (مز ) : گوت و .

(٢) گەردەن ( ی یەکەم ) : گەردن‌بەند ، گەردانە . عیقد : گوارە . کەنار : دۆرپەرێز . دامەن : داوێن .

واتە : من بۆیە لەو گەردن‌بەند و گوارەی تۆیە کە گەردن و گوێتیـان

وەك طوڕڕەیی پێچیدەیی تۆ ساغ و شکستەم
وەك نەرگسی نادیدەیی تۆ خۆش و نەخۆشم (٣)

---

ڕازاندووەتەوە ، دۆر کەوتۆمەتەوە و کەنارەگیر بووم ، چونکە داوێن و کۆشم پڕن لە شیعری وەك گەردنبەند و گوارەکانی تۆ ، بۆیە ئیتر پێویستم بەوانەی تۆ نییە . یا پڕن لە فرمێسکی وەك دەنکی مرواری ، یاخود بەو ( پێ )یە لێیان دۆر کەوتۆمەتەوە کە داوێن و کۆشم گیراوە و ناتوانم هەڵسم بێم بۆلات . بەمپێیە نالی زۆر جوان وشەی ( پێ )ی لە مەعنای ( هۆی ڕۆیشتن )ەوە خواستووە بۆ هۆی (نەتوانینی ڕۆیشتن) .

دۆریش نییە (گەردەن)ی یەکەم لەپێشاندا (گەرزەن) بوبێ و لە نوسینەوەدا کرابێ بە (گەردەن). گەرزەن بەو کۆمەڵە مرواری و گەوهەرە نایابانە ئەڵێن پادشاکانی ساسانی تاجیان پێ ئەڕازاندەوە .

لەنێوان هەردۆ ( گەردەن )دا جیناس و ، لەنێوان ( گەردەن ) و (گۆش)دا تەناسوب و ، لەنێوان (گۆش) و (کۆش)دا جیناسی موضاریع هەیە .

گەردەن و گۆشت ( چر ) : دامەن و کۆشم . ( چن ) : گەردەن و کۆشم . ( کم ) و (ك ) و ( من ) : گەردەن و گۆشم . (ت) : کەردەن و کۆشت . ( مب ) : کەردەن و کۆشم . ( کاف )ەکانی ئەم دۆ نوسخەیە نەشکونجێ ( گاف ) بن ، چونکە جاران ( کاف ) و ( گاف ) وەك یەك ئەنوسران . بەوپێیە ( « پەراوێزی » چر ) و (مز) و (ت) و (اح) : بۆ بێیە . ( « پەرواێزی » چر ) : بۆ بێنە . ( مب ) : بۆچ بێیە .

(٣) طوڕڕە : زولف . ئیمزای توغرایێ . پێچیدە : لوولخواردۆ و لەیەکئالاو. شکستە : تێکشکاو . خەتی شکستە کە جۆرە خەتێکی فارسییە. نادیدە: نەبینراو ، نەکراو .

واتە : من وەك زولفی لولی تۆ هەم ساغیشم و هەم تێکیش شکاوم . یاخود وەك زولفی لە مۆری توغرایێ چوی تۆ، هەم وەك خەتی ساغیشم و هەم وەك خەتی شکستەشم . وەك چاوی ، لە مەستیدا وەك نەرگس و ، لە خەوالۆیەتیدا وەك نەبینراو و نەکراوەی تۆ ، هەم خۆشیشم و هەم نەخۆشیشم . ساغی و شکاویەکەی زولفی یار لەوەوەیە کەوا لەو ڕووەوە کە نەقرتاوە ، ساغە و ، لەو ڕووەشەوە کە لولە ، شکاوە . خۆشی و نەخۆشیی چاویشی لەوەوەیە کەوا لەو ڕووەوە کە هیچی نییە، ساغە و لەو ڕووەشەوە کە مەست و خەوالووە، وەك نەرگسی نەپشکوتوو، نەخۆشە .

سەرخۆشی شەرابی دەمی تۆ بۆم و ، ئەمێستاش
قوربان ، سەری تۆ خۆش ، کە نەماوە سەری خۆشم ! (٤)

شێخی‌یبو سەراپا دەڵەك و زێوی دەپۆشێ
« نالی »م و بە ڕۆژێ لە هەمۆ دیدە دەپۆشم (٥)

---

. لە کۆکردنەوەی (ساغ) و (شکستە) و ، (خۆش) و (نەخۆش)دا طیباق و ، لە (طوزرە) و (شکستە)دا کە هەردوکیان لە بابەتی نووسینن ، تەناسوب هەیە .

نەرگسی (چن) و (ك) و (اح) : دیدەیی. (کم) و (گم) و (من) : نێرگسی.

(٤) واتە : تا تۆم هەبوی و لێم نزیك بوی و قسەت بۆ ئەکردم ، سەرخۆشی ماچی لێو و قسەی خۆشت بوم . ئێستا کە لێم بڕاوی ، سەری تۆ خۆش بێ ، هۆی ئەو سەرخۆشییەی جارانم نەماوە و لەئەنجامی ئەوەوە سەریشم لیا چووە یاخود. سەری چاك و سەلامەتی جارانم تۆشی دەرد بووە .

وەك دەرکەوت نالی لەم شیعرەدا (سەرخۆش)ی بە چوار مەعنا بەکارهێناوە : مەست ، دوعای عومر درێژی ، سەری خۆم ، سەری چاك و سەلامەت . لە ڕتنەوەی سێ جاری (سەر) و (خۆش)دا جیناس هەیە .

قوربان (چر) و (چن) و (ك) : ئێستە . بەڵام جۆرە دۆبارە کردنەوەیەکی بێتامە . ئەم شیعرە لە نوسخەکانی (ت) و (مز) و (عب) و (اح)دا نییە .

(٥) دەڵەك : گیانلەبەرێکی کێوییە پێستەکەی بارەیەکی زۆر ئەکا .

واتە : تۆ شێخی ، بەڵام هەر بە قسە ، ئەگینا بە کردار لەجیاتیی ئەوەی وەك پیاوانی ڕاستەقینەی خوا بە کەم قنیات بکەی ، لەسەر تا پێت بە بەرگی گرانبەهای پێستی دەڵەك و زێوێ دائەپۆشێ و بۆیە وەك دەڵەك و زێویش دێتە بەرچاوی خەڵك ، یا کرداری ئەوانە ئەپۆشێت کە وەك دەڵەك و زێوێ زیانبەخش و فێڵبازن . منیش نالییەکی هەژار و ڕۆت و قوت و بێپێچ و پەنام و لە هەمۆ نالەواوێ و کەم و کورتییەك چاو لەپۆشم ، یا لە هەمۆ گیانمدا هەر چاوم دائەپۆشم بۆئەوەی عەیب و عاری خەڵك نەبینم .

لەنێوان (دەپۆشێ) و (دەپۆشم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

دەپۆشێ (چن) : ئەپۆشێ . لە هەمۆ (چر) و (عب) :لە هەوا .

— ٦ —

شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم
مەشغوولی نەفەس گرتنی موشکین نەفەسێکم (١)

لەم حوجرە ، لەبەر پەنجەرە کەوتوم و دەخوێنم
بێعەینی دەڵێی بولبولی گۆشەی قەفەسێکم (٢)

هەم وارسی فەرهادم و هەم نائیبی مەجنوون
وا تێمەگە ، قوربان ، کە گەدا ، بولهەوەسێکم (٣)

---

— ٦ —

(١) نەفەس : هەناسە . موشکین نەفەس : ئەوەی هەناسەی بۆنی موشك بدا .

وانە : وا زۆر تەواو بۆ و شەو داهات ، کەچی من هێشتا مەستی بیر کردنەوەم لە یارێك و ، خەریکی لەوەم هەناسەی خۆم ئەگرم و خۆم وەك زاوچن مات ئەدەم ، بەڵکو یاری هەناسە وەك موشك بۆن خۆش گوزەر بکا و بۆنی هەناسەی بێ بەسەرما .

شەو هات و ئەمن (عب) : شەو هاتووە ، یا هاتەوە ، من .

(٢) بێعەینی : بعێنیه ، کوت و مت .

وانە : لەم ژوورەدا تاق و تەنیا لەبەر پەنجەرەکەدا کەوتوم ، گۆرانی ئەڵێم بۆ خۆم ، کوتومت ئەڵێی بولبولێکم لە سوچی قەفەزێکدا ، لەناو دەردی دیلیی خۆم ئەخوێنم .

(٣) گەدا : لات و بێکەس . بولهەوەس : ابوالهوس ، ئارەزۆباز ، دەس‌بەتاڵ و پووچ و بێمایە .

وانە : ئازیزەکەم ! وا تێنەگەی من کابرایەکی ئارەزۆبازی لاتی بێدەس‌مایەم و لەخۆڕایێ ئیدیعای عەشقی تۆ ئەکەم . من میراتگری فەرهادی بێستوون‌تاش و مەجنوونی بیابان‌گەردم ، هەرچی سامانی خۆشەویستیی ئەوانە بۆ من ماوەتەوە و لە ئاگری دڵداریدا سوتاوم .

ئەم شیعرە لە نوسخەی (چن)دا نییە .

گەدا (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : گەدا و .

گەردەن کەچی تۆم بێ کەشش و ڕست و قەلادە
وا ظەن مەبە ناعارف و هەرزە مەرەسێکم (٤)

وەڵڵاهی کڵاوی سەری من چەرخی دەماڵێ
بیوایە بە دامانت ئەگەر دەستڕەسێکم (٥)

باوەڕ مەکە ڕۆح سەختی غەمی فیرقەتی تۆ بم
بۆ هاتنی تۆ باقییە نیوە نەفەسێکم (٦)

---

(٤) کەشش : بەکێشکردن . ڕست : ئەو پەتەیە ئەکرێتە ملی ئانجێ . قەلادە : گەردنبەند . ظەن : گومان . ناعارف : نەفام و نەزان . هەرزە مەرەس : ئەو ئانجییەی بە ڕەحەتێ نەدرێتەبەر بۆ ڕاو .

واتە : پێویست بەوە ناکا بە زۆر بەکێشم بکەیت و پەت و گەردنبەندم بخەیتە مل . من خۆم لە خۆمەوە گەردنکەچتم و کەوتۆمەتە دوات . وا گومان مەبە نەفامم و ئەگەر بەدوای خۆتا ڕامنەکێشی ئەڕۆم بەملا و بەولادا یا مان ئەگرم ، نەخەیر هەمیشە هەر بەدواتەوەم و لەگەڵتام ..

کەشش و (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : کەشش . بەپێی ئەم نوسخانە دەستئەدا (کەشش و) یا (کەششی) بێ . (عم) و (کم) و (گم) : کەششی . ڕست و (چر) و (عم) و (عب) : دەستی .

(٥) چەرخ : ئاسمان . دەماڵێ : ئەکوتایەوە . دەستڕەس : دەست پێگەیشتن .

واتە : قەسەم بە خوا ئەگەر ئاقە جارێك دەستم بگەیشتایە بە دامێنت . پایەم ئەوەندە پێی بەرز ئەبووەوە کڵاوی سەرم دەرگای ئاسمان بکوتێتەوە .

ئەم شیعرە و شیعری پاشەوەی تەنها لە (عم) و (گم)دا هەن .

(٦) ڕۆحسەخت : ئەوەی بە زەحمەت گیان بەدەستەوە بدا و بمرێ . فیرقەت : جیایێ . نیوە نەفەس : نیوە گیان .

واتە : وا مەزانە بەرگەی خەفەتی دووریی تۆ ئەگرم و بە گران گیان بەدەستەوە ئەدەم . نەخەیر ، لەبەرئەوە نییە هێشتا ماوم و نەمردۆم . ئەو نیمچە گیانەم بۆیە بیا ماوە ، چاوەڕوانی هاتنی تۆم ، لەمەوێ پێشکەشی هاتنتی بکەم و لەبەرپێی تۆدا بەختی بکەم .

هەر لەحلە دەڵێم من سەگی دەرگام و ، ڕەقیب
دێتە سەر و چاوم کە منیش سەگ مەگەسێکم ! (٧)

گرتوویە سەگت چاکم و لای تۆمەوە دێنێ
یەعنی وەرە « نالی » کە منیش دادڕەسێکم ! (٨)

---

(٧) ڕەقیب : بەدکار . سەگ مەگەس : مێشە سەگانە ، ئەو مێشەی بە سەر و چاوی سەگەوە ئەنوسێ .

واتە : من هەمیشە ئەڵێم سەگی بەردەرگای یارم و ، بەدکاریش دێتە ویزەم و لە کۆڵم نابێتەوە ، ئەڵێ ئەگەر تۆ سەگی بەردەرگای یاری ، منیش مێشە سەگانەم دێم بە سەر و چاوتەوە ئەنیشمەوە بەرت لێ لەگرم و ناهێڵم چاوت بە یار بکەوێ .

دەرگام و (مز) : دەربان و . دەربان : دەرگاوان . دەڵێم (کم) و (من) : ئەڵێم .

(٨) دادڕەس : کەسێ دادێ کەسێ بدا .

واتە : سەگەکەت کە بەدکارەکەی بەینمانە ، چاکی گرتوم و بۆلای تۆوەم دێنێ . ئەمەش واتە پێم ئەڵێ : نالی منیش کەسێکم ئەتوانم فریات‌کەوم و شتێکت بۆ بکەم . دیارە دوژمنیش جاروبار ئەبێ بەهۆی ئازانجی بنیادەم . ■

چاکم و لای (مب) : چاکم لەلای .

لەوە بەولاوە کە وەك ولمان شیعری سێیەم لە نوسخەی (چن)دا نییە و شیعری پێنجەم و شەشەم تەنها لە نوسخەی (مم) و (گم)دا هەن، ڕیکخستنی شیعرەکان لە نوسخە دەستنوسەکاندا بەم‌جۆرەیە کە ئێمە لێرەدا نوسیومانەتەوە . بەلام لە نوسخە چاپەکان و نوسخەکەی (من)دا جیاوازە و بەم‌جۆرەی بنەوەیە :

(١) لە هەر چواریاندا (١) . (٢) لە هەر چواریاندا (٤) . (٣) لە (مم)دا (٣) ، لە (کم) و (گم) و (من)دا (٢) . (٤) لە (مم)دا (٢) ، لە (کم) و (گم) و (من)دا (٥) . (٥) و (٦) لە (مم) و (گم)دا (٥) و (٦) ، لە (کم) و (من)دا نین . (٧) لە (مم)دا (٧) ، لە (کم) و (گم) و (من)دا (٣) . (٨) لە هەر چواریاندا (٨) .

■ چاك بە مانای باڵدیەشاقعل ور دامێك هاتوە • ڕەنگبێ مەبەستی نالی کە هەموومان دەزانین چەندی یاری بە وشەکردوە لە بەندا ئەوەیان بێ مانی سەگەکەت داوێنی ←

— ٧ —

ماچی دەمەکەی دامێ کە دامێ سەر و ماڵم
بنوازە چ سەیادە ، چ جەللادە بە حاڵم ! (١)

— ٧ —

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە نوسخەی چاپی (عم) و (گم)دا هەیە. چاپی (گم) و نوسخە دەستنوسەکانی بەردەستمان ، هیچ کامیان سۆکە ئیشارەتێکیشیان بۆ نەکردووە . شیعرەکە هەرچەند لە چەند لایەکیدا نیمچە شەقڵێکی نالی پێوەیە ، لاوازیشی زۆرە . لەوجۆرەش نییە کە بڵێین لەوانەیە نالی لە سەرەتای شیعر وتنیدا وتبێتی ، بەڵکو لە شیعری شاعیرێکی خاوەن مومارەسەی ، بەڵام سەرنەکەوتوو ئەچێ . وێنەکانیشی هەرکام یەکی چەند جار لە شیعری شاعیرانی‌تردا دووبارە کراونەتەوە و هیچ‌کامیان هونەرێکی جوانی ئەوتۆیان تیا نییە. سەرەڕای ئەوە کە هەڵەی نوسینەوەش کارێکی کردووە هەندێ شوێنی ڕاست نەکرێتەوە . بۆیە ئێمە بە شیعری نالیی نازانین . مامۆستا مەسعود موحەممەدیش کە خاوەنی گەلێ لێکۆڵینەوەی وردە لەبارەی نالییەوە ، لە گفتوگۆیەکی تایبەتیدا وتی « بە هیی نالیی نازانم » . دوکتۆر مارف خەزنەداریش ئەڵێ : «ئاشکرایە هیی نالێ نییە» . ( د. مارف خەزنەدار ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ٢٤ ، کانونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانونی دووەمی ١٩٧٦ ) . بەڵام ئێمە لەبەر پشت‌گوێ نەخستنی کرداری ( مامۆستا هەڵێ موقبیل ) کە بۆ یەکەمجار ئەو بڵاوی کردووەتەوە ، بەبێچەوانەی بۆچونی خۆمان ، لێرەدا بڵاوی ئەکەینەوە و هەرکاتێکیش هەواڵێکی‌کەمان لەبارەیەوە دەسگیر بۆ ، ئاسانە لەسەر لاپەڕەی یەکێ لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانمان چی پێویست بێ بینوسین . ■

(١) واتە : کە سەر و ماڵم لەپێناوی یارا دانا و بەتەواوێ لەناوچووم ، ئەوسا ماچێکی دەمی دامێ . هاوار لە یار چۆن ڕاوچییەکی دڵدارانەتێ ، چۆن داوێکیان بۆ ئەنێتەوە .. هاوار ! چۆن خۆنکار و خوێن‌ڕێژێکە .

لەنێوان هەردو ( دامێ )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (دەم) و (دامێ) دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (ماڵم) و (حاڵم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

گرتووم و بۆ لای تۆم دێنێ‌ەد یارە لێکدانەوەی مامۆستاکانیش تەواوەبەڵام ڕەنگبێ ئەویان باشتر بێ .

■ منیش‌هەر لەم باوەڕە دام کە ئەم غەزەلە قوی بە سەر نالی‌یەوە نەبێ؟ .

عاشق ــ دەڵێ ــ نابێ کە بدا خۆی لە داوم
زوڵفم کە هەمو داوە ، هەمو دانەیە خاڵم (٢)

بۆ تۆزی ڕەهەت دیدە سەقاوو موژە جارۆب
ترسام کە لە پێت چێت دەمێ جێت بماڵم (٣)

باری غەمی جان ئەبرووەتی تیر و کەمان کرد
یەعنی قەدەکەی ئەلفی منە ئێستە کە داڵم (٤)

---

(٢) ڕستەی (دەڵێ نابێ) لە هەردو نوسخەکەی (عم) و (گم)دا بە (دڵی نابێ) نوسراوەتەوە . ئەگەر بشڵێین مەعنای شیعرەکە بەمجۆرە ئەگونجێ ، لەوەمان هەر لە ئەستۆدا ئەمێنێتەوە کە پێشان قسەیەک بە دەمی یارەوە ئەکراوە تا وتنی ئەم شیعرەش بگێڕینەوە بۆلای ئەو . کەوانە لەبێ بڵێین (دەڵێ)یە و (دڵی) نییە ، پاش ئەوە ئەتوانین بڵێین وشەی دوهەم (نابێ)یە یا (نابێ)یە و ئێمە دوهەمیان هەڵبژارد ، لەگەڵ ئەوەش کە لە تێکڕای مەعنای هەردو بۆچونەکە نازازین کە وانە : یار ئەڵێ عاشق نابێ ، یاخود نابەت ، خۆی بدا لە داوم چونکە ئەگەر خۆی لێ بدا تۆش ئەبێ ، زوڵفمە هەمو تاڵەکانی داون و نراونەتەوە و ، خاڵیشمە دانەی داوەکەیە .
لەنێوان ( داو ) و ( دانە )دا تەناسوب هەیە .

(٣) ڕەهـ : ڕێگا . سەقا : ئاوهەڵگر . ئاوڕشێنیکەر . جارۆب : گسک .
وانە : چاوم داناوە بە فرمێسک ئاوڕشێنی ڕێت بکا و ، برژانگیشم داناوە گسکی بدا بۆت ، بۆئەوەی تۆزی ڕێ نەبەت بە سەر و ڕوتا . بەڵام لەوە ترساوم کاتێ کە جێگاکەت گسک ئەدەم برژانگێکم بەجێبمێنێ و پاشان بچێ بە پێتا و ئازارت بدا ..
لەنێوان (تۆز) و (ڕەهـ) و (سەقا) و (جارۆب) و ، (دیدە) و (موژە)دا تەناسوب و ، لەنێوان (پێت) و (چێت) و (جێت)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (چێت) و (جێت)دا جیناسی موضاریع هەیە .

(٤) ئەبرووەتی : ئەبرۆتی . لە نوسخەی (عم)دا نوسراوە (ابرولی = ئەبرۆلی) بەڵام شیعرەکە بەمجۆرە لەنگ ئەبێ ، بۆیە لە نوسخەی (گم)یشدا وەلا لای ئێمە پینە کراوە . لەگەڵ ئەوەشدا مەعنای شیعرەکە هەر نایەت چونکە (برۆ) بە (کەمان) کراوە نەک بە (تیر و کەمان) و ، سەرەڕای ئەوە (برۆ) هەر خۆی (کەوانێ) بووە .. دیارە شیعرەکە بە جۆرێکیتر بووە و

دەستم مەخە سەر ، تا قەدەمم سوتووە ، چاوم !
یاخۆ بە شیفا هاتووی ؟ چەندێکە ئەنالم (٥)

ڕەنگینە بە خوێناوی دەروونی ، دلی « نالی »
بنوارە دەلێ خۆ خەنەیە پەنجەیی ئالم (٦)

— ٨ —

لایقی مەخزەنی طەبعە هەمو گەنزی غەزەلم
قایلی ضەربی ڕەواجە زەڕ و زیوی مەثەلم (١)

---

هەڵەی نوسیار وا ئالوزاندوویەتی و ، لەوانەیە ، بە نیشانەی نیوە شیعری داهاتوودا ، بلێین بەمجۆرە بووە :

**باری غەمی جان ئەبروی شیری بە کەمان کرد**

واتە : باری خەمی سەر دڵ و دەروونە وا بڕۆی وەك شمشێرلی کردووە بە کەوان ، وەك بلێی برۆت وەك بالای جاران وەك ئەلفی من بو کە ئێستا چەمیوەتەوە و بووە بە دال .

(٥) واتە : چاوەکەم ! دەستم لەسەر دامەنێ ، سەراپام سوتاوە ، یا زامم نەکولێنەوە ، یان بۆیە دەستم لەسەر دائەنێی ، چونکە هاتوی شیفای دەردم بی ، لەبەرئەوەی کە دەمێکە ئەنالێنم . عادەتە کەسێك کە ئەچن هەوالی نەخۆشێ بپرسن ، دەستی ئەنێنە سەر سەری .

(٦) واتە : یار بە خوێناوی ناوەوەی دلی نالی ، دەستی خۆی ڕەنگاوی کردووە . کەچی سەیری کە ئەلێ پەنجەم بۆیە ئال نییە کە خوێنی کەسی پێوەبێ ، بەلکو خەنەم لێ گرتووە .

لەنێوان دوا وشەکانی هەموو بەیتەکانا جیناسی لاحیق هەیە .

— ٨ —

ئەم پارچە شیعرە نایابەی نالی لە هیچکام لە نوسخە دەسنوس و چاپەکانی بەردەستمانا نییە . بە خەتێکی خۆش لەسەر پارچە کاغەزێکی کۆن نوسرابووەوە لەگەل چەند پارچە شیعرێکی فارسیدا ، لەوە ئەچێ پەڕەی دڕاوی کتێبێك بێ ، برای بەڕێز کاك محمد فرج محمد قولابی دوا پۆلی کولیەی ئیمامی ئەعظەم داینێ . شایانی سوپاسێکی زۆرە .

سایەیی پایە وەکو باڵی هوما و بازی سپیم
نە وەکو بۆمی قەدەم شوم و ، نە هەمزەلکی قەلم (۲)

---

ناوەڕۆکی شیعرەکە لەوە ئەچێ وەڵامی هەندێ کەسی بەدکار بێ کە لە بارەگای دەرباری بابان یا شوێنێکیتری خاوەن پایەیدا خراپەی نالیان وتبێ و ، ئەویش بە دەربڕینی شان و شکۆی خۆی بەرپەرچی دابنەوە . شیعرەکە یەکێکە لە شاکارەکانی شیعری نالی و ، ئەوەی مایەی سەر سوڕمانە ، ئەوەیە چۆن ئەوەندە زۆر بڵاو نەبوەتەوە ، لە هەمو یا لە زۆر لە دەستنوسەکاندا هەبێ .

(۱) مەخزەنی طەبع : شوێنی چاپ . کەنز : گەنجینە . ضەرب : دراو لێدان . ڕەواج : ڕۆیشتنی پارە لە بازاڕا . مەثەل : قسەی نەستەق و بەتوێکڵ .

واتە : هەرچێ شیعرم هەیە وەك زەڕ و زیوی ناو گەنجینە وایە و شایانی ئەوەیە لە عەماری چاپخانەدا دابنرێ،واتە لە چاپبدرێ و،هەرچی قسەی نەستەق و بەتوێکڵم هەیە بۆ ئەوە ئەشێ بڵاو بێتەوە بە وڵاتانا و ، وەك پارەی ڕەواجی وەخت چۆن لێ ئەدرێ و خەڵك دەستاو دەستی پێ ئەکەن ، ئەمیش خەڵك دەما و دەم بۆ یەکتری بگێڕنەوە .

ئەشکونجێ مەبەست لە (طەبع) چاپ نەبێ ، بەڵکو (طەبیعەت) بێ ، واتە : گەنجینەی شیعری من شایانی ئەوەیە لە عەماری طەبیعەت و بەدڵبوندا دابنرێ .. تاد . ئەگەر مەبەست لە (طەبع) مەعنای یەکەم بێ کە چاپخانەیە ، ئەوا نالی شایانی قەدر زانین و شانازی پێوە کردنێکی زۆرە وا بەجۆرێك ئاواتی لەچاپدانی بەرهەمەکانی دەرئەبڕێ . ئەوەندەی ئێمە بزانین هیچ ڕۆشنبیرێکی کورد ، بەر لە نالی ، ئەم ئاواتەی دەرنەبڕیوە .

(۲) سایە : سێبەر . هوما : باڵندەیەکی پیرۆزە ئەڵێن بەسەر هەرکەسێکەوە بنیشێتەوە و سێبەری بەسەردا بکا ، ئەبێ بە پادشا . بازی سپێ : جۆرە بازێکی بەنرخە . بۆم : کوندەبەبۆ کە کەلاوە و وێرانە ئەکا بە مەنزڵگای خۆی و نیشانەی نەگبەتییە . قەل : قەلەڕەش کە هەر ئەقڕێنێ و خەڵك بە نیشانەی خێری نازانن .

واتە : من لە هەرکوێ بم مایەی فەڕ و بەرەکەتم بۆ ئەو شوێنە و ، کەسێکم سێبەرم لەئاستی سێبەری باڵی هومادایە خێرم بەدەمەوەیە و ، وەك بازی سپێ بۆ کەشکەلانی لەلەك لەفڕم و بە شوێنی ئەوێ و شتی

کەوکەبەی طەلعەتی شاهانەیی تۆم بورهانــە :
کە لەسەر موددەعی ، سولطانی موبینە جەدەلم (٣)

زۆر سەری کولتە ڕۆناکیی نوری بەصەرم
شەو خەمی زولفتە تاریکیی طوولی ئەمەلم (٤)

حەرەکاتم سەکەنات و ، سەکەناتم حەرەکات
چوستە ، سستی ، قەوییە ضیعف و ، سەریعە کەسەلم (٥)

---

هیچ و پوچ زازی نــابم .. کوندەبەبۆ نیم نیشـانەی ویرانە و نەگبەتی بم و ، فەل نیم هەر دەنگم بێ و بە ئاوازێکی ناساز بقرێنم

(٣) کـەوکەبە : شان و شکۆ . طەلعەت: ناوچاوان . بورهان : بەلگە . موددەعی : ناحەزی لاف و گـەزاف لێدەر . سـولطان : دەسەڵات . موبین : ئاشکرا و دیاری . جەدەل : بەربەرەچدانەوەی یەکتر بە گفتوگۆ.

والە : بەلگەی زالیی قسەی من بەسـەر قسەی بەدکاری ناحەزدا ، ئەو شان و شکۆ و پایەی بەرزەیە کە تۆ هەتە و لــە سایەی منی هوما ئاسا و وەك بازی سپیەوە دەسگیرت بووە !

هەزار ئافەرین لە نالیی هونەرمەندی سەربەرز .. بە خۆدا نازین و باوەڕ بە خۆ کردن و سەرکوت‌کردنی دوژمن ئاوا نەبێ ، بۆچی باشە ! !

(٤) بەصـەر : چاو . خەم : چەمیوە و لوول . طوول ئەمەل : درێژیی هیـوا.

والە : ڕۆناکیی نوری چاوم بە زۆردا بە پێشکی سەری کولمی تۆیە و، ئاواتی دووری بەرچاو تاریك و نەهاتووەدیشـم کە بە شەو بیری لـێ ئەکەمەوە ، زولفی ڕەش و ئالۆزتە کە لە ڕەشبیەکەیدا لە بەرچاو تاریکیی ئاواتەکەم و لەو کاتە ئەچـێ کە بیری لێ ئەکەمـەوە لیایـدا و ، لـە ئالۆزیەکەیشیدا لە ئالۆزی و گرێ تێکەوتنی ئاواتەکەم ئەچێ .

(٥) حەرەکات : جوولە . سەکەنات : دامرکان . چوست : چالاك . کەسـەل : تەمەڵی .

والە : جوولەم وەك دامرکـان وایە و کـەس پێی نـازانێ ، کـەچی لەڕاستیشدا هەر لە حالی جوولەدام و کار ئەکەم و ، ئاوێکیش دامرکانم نیە هەمیشە هەر لە جوولە و کاردام . سستیم لە ئاستی بزێویـی خەلکدایە و ، بێ‌هێزیم لەئاستی هێزیـاندایە و ، تەمەلیم لەئاسـتی

بێش و کەم بێ شکەم و حیرص ، وەکو طیفلی ڕەضیع
زاویە بێشکەم و ، بێ شکم و بێ حیلەم (٦)

خوانی ذی شانی جیهان هەنگی خۆشاهەنگە ، وەلێ
مێشی دەم نۆشم و ، دوم نێشم و ، عەکسی عەسەلم (٧)

---

پەلەکردنیانایە . مەبەستی لەوەیە لە هیچدا لە کەس ناچم و لە هەموو دیمەنێکی بزێوی ئادەمیزاددا لە خەڵك بالاترم .

نالی لەم مەسەلەی (حەرەکات) و (سەکەنات)ەدا ئیشارەلی بۆ وتەیەکی عیلمی کەلام کردووە کە (حەرەکە) و (سوکون) بەمجۆرە ئەناسێنێ : (الحرکة کونٌ ثانٍ ، في آنٍ ثانٍ ، في مکانٍ ثانٍ . والسکون کونٌ ثانٍ ، في آنٍ ثانٍ ، في مکانٍ اولٍ ، ولایشترطُ فیه اللبث ) . واتە : جوڵە بونێکی دووەمە ، لە کاتێکی دووەمەدا ، لە شوێنێکی دووەمەدا . دامرکانیش بونێکی دووەمە ، لە کاتێکی دووەمەدا ، لە شوێنێکی یەکەمدا و ، مانەوەشی لەو جێگا یەکەمەدا تیا نەکراوە بە مەرج ، ئەگینا سەرلەنوێ ئەبێتەوە بە جوڵە و جوڵەیەکی نوێ پێکدێنێ .

(٦) بێش : زۆر . شکەم : سك . حیرص : تەماع . ڕەضیع : شیرەخۆرە . زاویە : سووچ ، گۆشە . بێشکە : بێشکەی منال . شك : گومان . حیەل : حِیَلْ ، جەمعی حیلەیە واتە فێڵ .

واتە : کەم و زۆر بەدوای ورگ و نەوسدا ناگەڕێم و تەماعم نییە ، وەك منالی شیرەخۆرە وام کە بە زۆر کەم قنیات ئەکا . لەم جیهانەدا تەنها بەشی خۆم جێگام هەیە ، وەك منالێك لە بێشکەدا ڕاکشاوم و ،دڵپیس و گوماناوی نیم لە خەڵك و فڕ و فێڵ نازانم .

لە یەکخستنی وشەکانی (بێش و کەم) و (بێ شکەم) و (بێشکەم) و (بێ شکم )دا ، جیناس و وشەئارایییەکی زۆر باڵا هەیە .

(٧) خوان : سفرە . ذی‌شان : ذي‌شانْ ، خاوەن پایە . خۆشاهەنگ : خۆش ئاواز و خۆش بزوێن . پورەی هەنگ کە لە دەوری کورەکە کۆلەبنەوە . وەلێ : بەلام . مێش : مێش هەنگ . دەم نۆش : خوێن‌مژ، ماچکەر و شیلەکری دەمی وەك گوڵ . دوم نێش : چزوو ئازاراوی . عەکسی عەسەل : پێچەوانەی هەنگوین ، تاڵ ، لەسەع ، لسْعْ واتە پێوەدان و گەستن .

واتە : خوانی پیاوی گەورە لەوە ئەچێ کە پورە هەنگ لە دەوری

عاجیزی شوکری تەمامی نیعمەم سەر تا پا
کە نە ڕیش بەلم و ، نە کۆسە و ، نە کەل و گۆج و شەلم (٨)

« نالی »یو سینەیی بێ کینەیی چاکم ، ئەمما
چاکی دامەن تەڕم و ، وشکە سەرابی عەمەلم (٩)

---

کوڕەکە خۆ ئەبنەوە . ئەو خۆی کوڕەی هەنگە و ئەوانەش لە دەوری خۆ بونەتەوە پۆرە هەنگن ، منیش یەکێکم لەو هەنگانە ، بەڵام من هەنگێکیوام خولێنی بەدکار ئەمژم ، یاخود کام گوڵ وەك دەمی یار جوانە بەوەوە ئەنیشمەوە، چزۆ ئازاراویم بۆ هەرکەس بیەوێ بە خراپ توخنم بکەوێ، پێچەوانەی عەسەلم ، تاڵم ، بۆ کەس قوت ناچم ، یاخود لەجیاتیی هەنگوین بەخشین ( لَسع )م هەیە کە واتە پێوەدان .

نالی لە وشەی (خۆشاهەنگە)دا ویستویەلی ئیشارەتێك بۆ وشەی (شاهەنگ)یش بکا کە سەرگەورەی هەنگەکانە و بەڕێوەبەری کاروباریانە.

(٨) نیعەم : نِعَم ، جەمعی (نِعمَة)بە واتە نیعمەت . ڕیش بەلم : ڕیشی سپیی مەیلە و زەرد و ڕیشی زۆر و فش و فۆل . کەل : ددان کەوتو .

واتە : هەرگیز ناتوانم بەتەواوی شوکرانە بژێریی نیعمەتی خوا بکەم ، یاخود ناتوانم شوکرانە بژێریی نیعمەتی خوا بکەم کە لە تەوقی سەر تا نوکی پێمی گرتووەتەوە ، نە بەلمە ڕیشم و ، نە کۆسەم و ، نە پیر و دانکەوتوم و ، نە گۆج و شەلم . ئەشکونجێ (کەل) نەبێ (گول) بێ ، چونکە جاران هەردو وەك یەك ئەنوسران .

(٩) چاك : کراوە و ئاشکرا . چاکی دامەن : چاکی داوێن . سەراب : دەشتی لمێ کە لەدوورەوە ئەبریسکێتەوە و تینو وائەزانێ ئاوە و ئەچێتە سەری و ، کە بۆی دەرئەکەوێ هیچ نییە بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە . یاخود : سەراو . ■

واتە : من نالیم و هیچم لە کەس ناشارمەوە و سنگم کراوەتەوە بۆ خەلك و ، هیچ کینەیەکم لە دلدا هەلنەگرتووە بۆ کەس . کەچی لەگەل نالەباریی گەردوون تێکلاوم و چاکی داوێنم تیا تەڕ بووە و ، سەرابی کرداری باشم بۆ ڕۆژی قیامەت وشکە و ئاوی تیا نییە ، یاخود کانیاوی کردارم وشکە .

■ لێرەشدا ( چاك ) چاك لێك نەدراوە تەوە •

— ٩ —

عەزیزم ، ڕۆحی شیرینم ، دو چاوم !
دەوای زامی دڵ و جەرگی بڕاوم ! (١)

ئەتو شا ، من گەدا ، دادم بپرسە
لە طولی چاوی بیمارت کوژاوم (٢)

ئەگەر نەیدەیتە دەس خۆم قاتیلی خۆم
لە ڕۆژی ئاخیرەتدا بێ پێناوم (٣)

---

— ٩ —

(١) ئەم پارچە شیعرەیش تەنها لە نوسخەکەی ( عم ) و ( کم )دا هەیە . ئێمە ئەمیش هەر بە شیعری نالی نازانین . بەڵکو لامانوایە شیعری ( کاکە حەمەی ناری)یە. بەداخەوە دیوانەکەی ناریمان لا نەبو تا بتوانین تەماشای بکەین . ئەم بۆچونەی ئێمە لەوەوەیە کە یەکەم : شێوەی شیعرەکە زۆر لە شێوەی شیعری ناری ئەچێ . دوهەم : تەعبیری ( کوژاوم ) کە لە بەیتی دوهەمدا هاتووە و تەعبیری ( دەس خۆم ) کە لە بەیتی سێهەمدا هاتووە ، شێوەی مەریوانن و کاکە حەمەش خەڵکی ئەوێیە . سێهەمیش زۆر نزیکە کەسێکی کۆلکە خوێندەوار ( ناری )ی لێ بوبێ بە ( نالی ) . بلاوکردنەوەی شیعرەکەش یەکەمجار لە چاپی (عم)دا کە لە (سنە) چاپکراوە ، ئەم بۆچونەی ئێمە بەهێز ئەکا ، چونکە پەیوەندی (مەریوان) بە (سنە)وەیە . مامۆستا مەسعود موحەممەدیش ، لە گفتوگۆیەکی تایبەتیدا ولی بە شیعری نالیی نازانم . د. مارف خەزنەداریش هەر بەممەعنایە ڕایەکی بلاو کردووەتەوە . ( د. مارف خەزنەدار ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ٢٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانوونی دوهەمی ١٩٧٦ ) بەڵام دیسان بۆ ڕێزگرتن لە بۆچونی مامۆستا عەلی موقبیل کە یەکەمجار ئەو ئەم شیعرەی بە ناوی نالییەوە بلاو کردووەتەوە ، ئێمەش لێرەدا بلاوی ئەکەینەوە و چاوەڕوانی دەرکەوتنی شتێکی نوێ ئەبین لەبارەیەوە . ■

(٢) واتە : شکاتی خۆت لای خۆت ئەکەم ، چونکە هەر تۆی بتوانی دادم بدەی .

(٣) واتە : ئەگەر چاوتم نەدەیتە دەس کە خوێنمی ڕشتووە ، تا منیش تۆڵەی

دەسا لادە سەری زولفت لەسەر ڕۆت
کە ڕۆتی ڕۆتم و مایل بە تاوم (٤)

لەباتی خوێنی خۆم ڕاضیم بە ماچێ
دەسا بیدە هەتا زیندۆم و ماوم

ئەوا نیشانەیی مەرگم عەیانە
کە من غەرقی خەم و خوێن و زوخاوم (٥)

مەکەن مەنعم لە شیوەن ئەی ڕەفیقان !
کە مەحزوون و غەمین و دڵ شکاوم

لە ژینی خۆم ئومێدم قەطعە « نالی » !
کە سوتاوە هەمو جەرگ و هەناوم (٦)

---

خۆمی لێ بکەمەوە و تێر تێر ماچی کەم و خوێنی بمژم ، یاخوا لە ڕۆژی قیامەتدا بکەوێتە بەر لێپرسینەوە و لەپێناوی ئەو تاوانەدا لەگەڵ منت کرد ، تیا بچی .

لارازیی نیوەی دوەمی ئەم شیعرە لەبارەی دارشتنەوە ، یەجگار ئاشکرایە .

(٤) مایل : حەزکردو . تاو : هەتاو ، خۆر .

واتە : سەری زولفت لەسەر ڕومەتی وەك ڕۆژت لادە ، چونکە من بەهۆی عەشقی ڕۆتەوە ڕوت و قوت کەوتوم و ئارەزوی ئەوەم هەیە خۆری ڕۆژت لێم بدا و گەرمم کاتەوە .
لەنێوان (ڕۆتی) و (ڕۆتم)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ئەم دوانە و ( ڕۆت )دا جیناسی ناقیص هەیە .

(٥) عەیان : ئاشکرا و دیارێ .

(٦) ئومێدم قەطعە : هیوام بڕاوە .

* منیش بەشی نالی نازانم و پێم وایە لێرە دا چاپ نەکرابا باشتر بوو

— ١٠ —

گەر دەپرسێ من لەبەر چی کەم دەخۆم
من بە برسێ قەط مەزانە ، غەم دەخۆم (١)

---

— ١٠ —

لە ئامادەکردنی ئەم لێکۆلینەوەی دیوانی نالیمەدا بۆ چاپ، گەیشتبوینە ئەم پارچە شیعرە ، ئەندامی کاراى کۆڕی زانیاری کورد ماموستا شێخ موحەممەدی خاڵ دوو دەستنوسی دیوانی نالیی داینەلا . نوسخەیەکیان دوو ـ سێ کەسی خەتخۆش لـە نوسینەوەیدا بەشداریان کردبو ، بەلام کەسیان ناوی خۆی نەنوسیبو . یەکێ لەمانە لە داوێنی بەشێکی دیوانەکەوە نوسیویە کـەوا لە سولەیمانی نوسـیویەتەوە و بـۆ ( مەلا عبدالحمید ) ناوێکی نوسیوەتـەوە . ئەمەیـان بایەخێکی زۆری بـە نوسینەکەی داوە و سەر و ژێرێکی زۆری بۆ وشەکان کردووە و لە چەند شوێنێکیشدا چەنـد وشەیەکی مەعنا لێداوەتەوە . یەکێکیکەشیان نوسیوبە کەوا لە ١٣٢١ی . ك ( ١٩٠٣ — ١٩٠٤ی . ز )دا نوسیویەتەوە. نوسخەکەیتریشیان کە دبارە نوسخەیەکی تازەترە ، وەك ئەوی پێشو بە خەتێکی خۆش نوسراوەتەوە، بەلام لەبارەی وردی و بایەخی زانستییەوە نوسخەیەکی عادەتییە . نوسیاری ئەمیش نە نـاوی خۆی و نە سالی نوسینەوەی نەنوسیوە . بە وەرگرتنی ئەم دوو نوسخەیە ئەمانیشمان بۆ کەلك لێ وەرگرتن خستە بەردەست و بۆ یەکەمیان ئیشارەتی ( خـا ) و بۆ دوەمیان ئیشارەتی ( خب )مان دانا .

بەرابەر بە بەردەستخستنی ئەم دوو نوسخەیە سوپاسێکی زۆری شێخی خاڵ ئەکەیـن .

(١) واتە : ئەگەر لێم ئەپرسێ بۆچی خواردنێکیوام نییە و کەم ئەخۆم ، لـە وەلامدا پێت ئەلێم کەوا من برسێ نیم ، وا لێنەگـەی . خـواردنی من خەم و پەژارەیە و ئەوەندە زۆری ئەخۆم پێی لێو ئەبم و پێویسـتم بـە خواردنیتر نییە .

دەپرسێ ( کم ) : ئەپرسێ . ( خا ) : بپرسێ . دەخۆم ( «پەراوێزی» چر ) و ( کم ) : ئەخۆم .

ئاوی سوێری چاو و باری تاڵی لێو
سوێر و تاڵی دەمدەم و ژەمژەم دەخۆم (٢)

تا سەری زوڵفت لەسەر ڕۆ حەلْقە دا
من وەکو ماری سەر ئاگر خەم دەخۆم (٣)

---

(٢) واتە: خواردنی من بریتییە لە ئاوی سوێری چاو کە فرمێسکە کە بە چاوما دێتە خوار و بە لێو ئەیلێسمەوە و، لە باری تاڵی لێوم کە بە ددان لێی ئەکەمەوە و ئەیخۆم. من ئاو بە ئاو و ژەم بە ژەم، سوێری و تاڵی ئەخۆم ..

لەنێوان (ئاو) و (چاو) و، (دەم دەم) و (ژەم ژەم)دا جیناسی لاحیق و، لەنێوان (چاو) و (لێو)و، (سوێر) و (تاڵ)دا تەناسوب هەیە.

تاڵی لێو (ك) و (عب): تاڵە لێو. بەپێی ئەم نوسخانە لەبو (سوێری)یش (سوێرە) بووایە. (« بەراوێزی » چر) و (اح): لێوی تاڵ. (خا): لێوی ئاڵ. نیوە شیعری دوهەم لە (« بەراوێزی » چر) و (خا)دا بەم جۆرەیە:

سوێری‌یو تاڵی ئەمن ژەم ژەم دەخۆم

(٣) دا: بدا. خەم: پێچ.

واتە: هەرچەند سەری زوڵفت کە وەك مار وایە، بەسەر ڕۆیەوە کە وەك ئاگر گەشە، لوول بخوا و ببێ بە ئەڵقە، منیش لەئاستی خۆمەوە وەکو مارێك کە بەسەر ئاگرەوە ڕاگیرابێ قرچ ئەبم و بە دەوری خۆمدا پێچ ئەخۆم و دێمە یەك.

ئەم بەراوردەی کە نالی لەم شیعرەیدا کردویە: سەری زوڵفی یاری بەسەر ڕۆمەتیەوە داناوە بە مار کە بخرێتە سەر ئاگر و، پێچ خواردنی خۆیشی لەئاو ئاگری خۆشەویستی لە بەرابەری ئەوەدا داناوە، وردەکاریەکی یەجگار جوان و باڵا و وێنەیەکی کەمهاوتایە.

لە (حەلْقە) و (خەم)دا تەرادوف هەیە.

زوڵفت (عم) و (گم) و (مز) و (عب) و (اح): زوڵفی. دەخۆم (کم) و (من): ئەخۆم.

ئاوی کەوثەر تۆشی سۆفی بێ کە من
ئاوی ئینسان ، یەعنی ماچی دەم دەخۆم (٤)

شەربەتی خەوف و ڕەجای ئەغیار و یار
ترش و شیرین هەم دەچێژم ، هەم دەخۆم (٥)

من لە طەوری عالەم و دەوری فەلەك
ضەربی لازب ، زەخمی بێ مەرهەم دەخۆم (٦)

---

(٤) ئاوی کەوثەر : ئاوی حەوزی کەوثەر لە بەهەشتدا .
ئەم بەیتە لە نوسخە دەستنوسەکاندا ، تەنها لە نوسخەی ( من )دا هەیە . ئێمە وای بۆ ئەچین هی نالی نەبێ ، یەکەم لەبەرئەوە کە پێچەوانەی هەمو بەیتەکانی ترە کە تێکڕا باسی دەرد و پەژارەن . دوەمیش لەبەرئەوە کە تەعبیری ( ئاوی ئینسان ) هەرچەند پاشانیش بە ( ماچی دەم ) مەعنای لێدراوەتەوە ، تەعبیرێکی ئازادەیەك نا شایانە .
دەخۆم ( کم ) و ( من ) : ئەخۆم .

(٥) خەوف : ترس . ڕەجا : ئومێد . خەوف و ڕەجا دۆ حالەتی تایبەتین لە موسولمانی ڕاستەقینەدا کۆئەبنەوە ، لەلایەکەوە هەرگیز ترسی خودای لە دڵ دەرناچێ و ، لە لایەکی‌کەشەوە هەمیشە هیوای ڕەحمی خوای لە دڵدایە و نائومێد نابێ . ئەغیار : بێگانە و ناحەز . هەم : دیسان . خەم .
واتە : من ئەو شەربەتە ترش و ناخۆشە ئەچێژم و ئەو شەربەتە شیرین و خۆشە ئەخۆمەوە کە بریتیین لە ترسی بێگانە و ناحەز و هیوای نەوازش و بەزەیی یار ، ، ساتێ حەسانەوەم نییە و لەنێوان ئەم دوانەدام .
لە کۆکردنەوەی (شەربەت) و (ترش) و (شیرین) و (دەخۆم) و (دەچێژم)دا تەناسوب و ، لە هێنانی (ئەغیار) و (یار) و ، (ترش) و (شیرین)دا بەدوای (خەوف) و (ڕەجا)دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە . سەرەڕای طیباقی نێوان (خەوف) و (ڕەجا) و ، (ترش) و (شیرین) و ، (ئەغیار) و (یار) .
لە (هەم دەچێژم) و (هەم دەخۆم)یشدا لەطافەت هەیە،چونکە (هەم) بە مەعنا (دیسان)یش و بە مەعنا (خەفەت)یش هاتووە .
دەچێژم (کم) و (من) : ئەچێژم . دەخۆم (کم) : ئەخۆم .

(٦) طەور : کردار و ڕەوشت . گۆڕان . دەور : سوڕان . فەلەك :

تالی بێ‌یار و دیار و تار و مار
عەلقەمی چی ؟ ئەرقەمی چی ؟ سەم دەخۆم ! (٧)

نەوعە ئینسانێ هەیە غەم قوتییە
من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم (٨)

غەم دەڵێ : « نالی » کە غەمخوارتم نەکا
ناعیلاجم من بەنێ ئادەم دەخۆم (٩)

---

گەردوون . ضەربی لازیب : لێدانێوا کە بە بنیادەمەوە بنووسێ و لێی نەبێتەوە . مەرهەم : مەلهەم .

واتە : من بەدەست ڕەوشت و کرداری خەڵکی و گۆڕانی دنیا و سوڕانی چەرخی گەردوونەوە ، گیرم خواردووە . کوتەکی‌وام پیا ئەمالرێ هەرگیز لێم نەبێتەوە و ، زامی‌وام لێ ئەکرێ هەرگیز لیماری نەبێ .

عالەم و (چن) عالی . ئەگونجێ عالی‌یی بێ یا عالی‌بو . دەوری (چر) و (خا) : جەوری . دەخۆم . (کم) : ئەخۆم .

(٧) دیار : وڵات . تار و مار : سەرەوژێر بو و تێکچو و پرژ و بڵاو . عەلقەم : کاڵەکە مارانە . ئەرقەم : ماری شل ، پیسترین جۆری ماری کوشندەیە . سەم : زەهر .

واتە : من تالی و ناخۆشییەك ئەخۆم کاڵەکە مارانە و ژاری ماری شل لە چاویا هیچ نین .. من تالیی غەریبی و بێ‌کەسی و دەربەدەری ئەخۆم .. من ژاری ڕاستەقینە ئەخۆم !

تالیی (کم) و (مـن) : تابشی . دیار و (چـن) و (ت) و (مز) و (اح) : دیار . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . (مم) و (گم) : دیاری . عەلقەمی چی ؟ ئەرقەمی چی ؟ : ئەمە بەگوێرەی نوسخەی (خا) و (خب)ە ، ئەگینا لە هەمو نوسخەکانی‌تردا بەرودوان . ئێمە ئەوەی نوسخەی(خا) و (خب)مان لا پەسەند بو چونکە ئەبێ سەرکەوتن لە سۆکەوە بێ بۆ نورس .

(٨) مەعنای ئەم شیعرە بەستراوە بە مەعنای شیعری پاشەوەیەوە .

نەوعە ئینسانێ هەیە (خـا) : ئەوعی ئینسانێ هەمو ، یاخود هەم و . من غەمی خۆم و غەمی (چر) و (مز) و (عب) و (من) و (خب) : من غەمی خۆم هەم غەمی . (گم) : من غەمی خۆم و هەمو . (خا) : هەم غەمی خۆم هەم غەمی . دەخۆم (کم) و (من) : ئەخۆم .

(٩) واتە : کەسانێوا هەن ژیانیان لەسەر خەم و خەفەت بەندە و بە خەم

— ١١ —

وەی کە ڕۆژەردی مەدینە و ڕۆسیاهی مەککە خۆم !
دەرکراو و دەربەدەر ، یا ڕەب دەخیلی عەفوی تۆم (١)

---

خواردن نەزین . من یەکێکم لەوانە ، بەڵام تەنها بە خواردنی خەمی خۆم داناکەوم ، خەمی خەڵکی‌کەش ئەخۆم ، چونکە (خەم) ئەڵێ ئەگەر نالی خەمم نەخوا و بەڵەنگەوە نەیەت و ، هەمووم ئەگرێتە ئەستۆی خۆی ، ناچار ئەبم دنیا هەموو بگرمەوە و هەموو ئەم خەڵکە بخۆم و گشتیان لەناوبەرم . بۆیە من خۆم ئەکەم بەقوربانیی ئەم خەڵکە و سەربەرشتیی خەم ئەکەم تا ئەم خەڵکە لە خوران ڕزگار بکەم ، چش کە خۆیشمی تیا بچم .

لەنێوان (هەم) و (غەم)دا جیناسی موضاریع و ، لە (خۆم) و (دەخۆم)دا جیناسی ناقیص هەیە .

دەڵێ (کم) و (من) : ئەڵێ . غەمخواریم (عب) : غەمخواری . ئەکا (ت) : ئەکەی . ناعیلاجم (چر) و (مر) و (عب) و (خا) : بێ‌عیلاجم .

— ١١ —

ئەم پارچە شیعرە بۆ لێکۆڵینەوەی باری دەروون و جۆری بیرکردنەوەی نالی پایەیەکی تایبەتیی هەیە . دیارە پاش دەرچوونی لە کوردستان ، لە مەککە لەکاتی ماڵاوایی چوندا بۆ ئەستەموڵ وتویەتی . هەندێ نیشانەی ئەوەی تێدایە کە نالی لە مەیدانی بیری ئایینیدا پیاوێکی (دیمەن پەرست) نەبوە . نالی لەم پارچە شیعرەیدا بەئاشکرا لەوە دەرلەخا کە دووری و نزیکی لە ماڵی خوا لە خۆیدا هیچ نییە و کار لەسەر (نیاز) بەندە و ، گوناە بە (ئاوی زەمزەم) داناشۆردرێ .. بێزاریی خۆی لەوە دەرلەبڕێ کە بنیادەم بە خێر و حەسەناتی ئەم و ئەو بژێ و کاتی بە بێ‌کار و کاسبی بەرێتەسەر و ، ئەوە بە شابانی خۆی نازانێ . وای بێ چارە لەنانەت لە خاکی ڕۆمدا گولوچنی بکا ، تا ئەوە کە بە بەرووبوومی وەقفی پیاوچاکان بژێ لە مەککە .. لای شورەییە پێشەی بنیادەم هەر خواردن و نوستن بێ و بەرهەمێکی بۆ خۆی و بۆ کۆمەڵ لێ نەوەشێتەوە.

هەروەها بە بەراوردی ئەم پارچە شیعرەدا لەگەڵ ئەوی‌کەی کە پێشتر بڵاومان کردەوە و لە مەدینە وتبوی و سەرەتاکەی ئەوەبو : « ئەی تازە

دەفتەری ئەعمالی من ، بێ قەطرەیێکی ڕەحمەتت ،
کەی بە صەد زەمزەم سیاهیی نوقطەیێکی لێ دەشۆم ؟! (٢)

---

جەوان .. ئاد » ، بۆمان دەرئەکەوێ کـە نالی دوو سـەفەری حیجازی هەیە و ئەمەیـانی لە سەرەتای بەجـێـهێشتنی کوردسـتان و گوزی بیرکردنەوە و سـۆزدا وتووە و ، ئەویانی لە سـەفەرێکیتری سـەردەمی پیریدا داناوە .. چونـکە ئەو هەڵوێـستە ئازایانەی نـازەزایی لە زیانی ئەوەڵی و بێکارێ کە لەمیانیدا دەربڕیوە ، بە هیـچ جۆرێ لەگەڵ ئەو نیشانانەی پیرێ بەلاناکەوێ کە لەوی‌کەیاندا بۆمان دەرئەکەوێ ..

(١) واتە : هاوار بۆ من کە ڕۆژەردی مەدینەی شـاری مەرقـەدی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ) و ڕۆژەشی مەککەی دابەزگەی سرۆشم و ، پێم‌ناکرێ تیایاندا بمێنمەوە و بەجێیان‌ئەهێلم .. خوایە ! من کە لـەم دوو شـارە پیرۆزەدا نامێنمەوە ، وەك دەرکراو و دەربـەدەر وام و ، ئەبـێ تۆ لێـم ببورێ و چاوەڕوانی لێبوردنتم .

دوریش نیـیە مەبەستی لە (ڕوزەردیی مەدینە) و (ڕوسـیاهیی مەککە) ئەوە بێ کەوا تـا ئەوکاتە مەدینەی نەدیـوە و ، ناشتوانێ لـە مەککەدا بمێنێتەوە . هەروا دووریش نییە مەبەسـتی لە (دەرکراو و دەربەدەر) ناچار بوونی بەجێ‌هێشتنی کوردستان بێ ...

لەنێوان (خۆم) و (ڕۆم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

(٢) دەفتەری ئەعمال . کردارنامە. لە ئایەتدا هەیە کە خوا لە ڕۆژی داوەریدا ئەفەرموێت هەرکەسێك کردارنامەی خۆی بدرێتێ کە ڕزی ئەو چاکە و خراپانەی تیا نوسراوە کە لە دنیادا کردوونی . وشەی (دەفتەری ئەعمال) لەوە وەرگیراوە . زەمزەم : بیرێکە لە مەککە ، خەڵکی بۆ پیرۆزێ ئاوی لێ ئەخۆنەوە و حاجی لێیشی دێننەوە بۆ وڵاتی خۆیان .

ئەم شیعرە و شـیعرەکانی پاشەوەی ، بەڵگەی پێویـسـت نەبوونی مانەوەن لـە مەککە ، نـالی لەیانهێنێتـەوە . واتە : خـوایە ، بۆچی بمێنمەوە ! دەفتـەری کردارم پـڕە لە گوناە و بە صەد ئـاوی زەمزەم نوختەیەکی ناکوژێنرێتەوە و ، هەموو شتێ لەسەر ڕەحمەتی تۆ بەندە . ڕەحمەتی تۆیش ج لێرە و ج لە هەر شوێنێکی‌کە چون یەکە .

چەند تەعبیرێکی جوان و زیادەڕۆوییـەکی وردە ، لەلایەکەوە ئاوی صـەد بیری زەمزەم ناقە نوختەیەکی کردارنامەی نالی ناشواتەوە ، کەچێ لەولاوە ناقە دڵۆپێکی بەزەیی خوا بۆ لابردنی هەموی بەسـە ..

کەعبە ئیشراقی وەکو خورشیدە ، من چاوم ضەعیف
لێم بووە ڕۆشن کە بوعدی قوربە ، قوربی بوعدە بۆم ! (۳)

بۆ جیواری حەق لە هەر جێ صیدقی نییەت کافییە
من لە ( بیت الله ) ئینشەللا ( باذن الله ) دەڕۆم (٤)

لێم حەرامە دانەوو ئاوی حەماماتی حەرەم
من کە بازی دیدە بازم نەك شەوارەی دەستەمۆم (٥)

---

(۳) ئیشراق : ئیشك‌دانەوە . خورشید : خۆر . بوعد : دووری . قورب : نزیکی .
واتە : کەعبە ئیشکی وەکو خۆر وایە ، منیش کابرایەکم چاوی دڵم کز و کوێرە . کەسێکیش چاوی کز و کوێر بێ ، تا لە خۆرەوە دوورتر بێ و نەچێتە بەری و لە سێبەردا بمێنێتەوە ، باشتر کەڵك لە ئیشکی وەرئەگرێ و بەپێچەوانەشەوە . من خۆم بەم چاوە کز و کوێرانەمەوە ئەم ڕاستییەم بۆ ڕۆشن بووەتەوە و بۆم دەرکەوتووە کەوا تا لە خۆری کەعبەوە دوورتر بم ، لەڕاستیدا لێیەوە نزیکترم و ، تا زۆرتر بچمە بەری ، کەمتر کەڵکی لێ وەرئەگرم .
لە کۆکردنەوەی (قورب) و (بوعد)دا طیباق هەیە .
کەعبە ئیشراقی : (چر) و (ك) و (اح) و (خا) : کەعبەیی ئەشراف . ( « پەراوێزی » چر ) و ( « پەراوێزی » خا ) : کەعبەیی ئەشرەف . (کم) و (من) : کەعبەیی ئەشواق . (کۆ) و (عب) و (خب) : کەعبە ئەشواقی . وادیارە ئەمیش هەر (ئیشراقی) بووە و بە هەڵەی نووسیار گۆڕاوە . نیوەی لەم شیعرە لە (چن)دا نییە .

(٤) جیوار : دراوسێیەتی . حەق : خوا . صیدقی نییەت : ڕاستیی نیاز . بیت الله : ماڵی خوا ، کەعبە ، مەککە . ئینشەللا : ان‌شاءالله ، خوا بیکا . باذن الله : خوا ڕازیی لێ بێ .
واتە : بۆئەوەی بنیادەم لەپاڵ خوادا بێ و دراوسێیی بێ ، مەرج نییە دانیشتووی مەککە بێ ، لە هەرکوێ بێ ، هەر ئەوەندە نیازی پاك و ڕاست بێ ، دراوسێیی خوایە . بۆیە ، منیش خوا یار بێ ماڵی خوا بەجێ‌نەهێلم و ئەڕۆم ..
لە هەر جێ (چر) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : لە هەرچێ .

(٥) دانە : ئەو دانەی بۆ پەلەوەر دانەکرێ . حەمامات : کۆترەکان . حەرەم :

تا بەکەی وەك ڕاویە و ، وەك سانیەی سێ پەل شکاو
بێ طەواف و سەعی و عەمرە هەر بخەوم و ، هەر بخۆم ! (٦)

---

حەرەمی کەعبە . یاخود مەککە و دەوروبەری . دیدە باز : چاو کراوە . شەوارە : ئەو باڵندەیەیە کە بە شەوی تاریك ڕۆشنایی ئەبینێ و ڕۆژ ون ئەکا و بە ئاسانی ئەگیرێ . دەستەمۆ : ئەو پەلەوەرەی سڵ نەکاتەوە لە خەڵك و بەئاسانی بگیرێ .

واتە : من کە بازی چاوکراوەم و ئەتوانم زۆر بەرز بفڕم و بە هێزی خۆم نانی خۆم پەیدا بکەم و ، پەلەوەرێکی بە شەوارە کەوتوی دەستەمۆ نیم هەرکەس لە ئارەزوی لێ بێ بمگرێ و بمبا بۆ خۆی و بمکا بە هی خۆی ، حەرامە لەم دەور و بەری حەرەمی کەعبەدا لێیبکەوم و وەك کۆترە دەستەمۆ بووەکانی ، خێرۆمەند دانم بۆ داکەن و ئاوم بدەنێ !

نالی لەم شیعرەیدا ئەوکەسانەی کە بێ ئیش و کار لە دەوروبەری حەرەمی کەعبەدا دانیشتون و بە خێری خێرۆمەندان ئەژین و هێز نادەنە بەر خۆیان کاسبیەك بکەن و بە ڕەنجی شان و ئارەقی ناوچاوان نان پەیدا بکەن ــ شوبهاندووە بە کۆترە بێدەسەڵاتە دەستەمۆکانی حەرەم . جا ئاخۆ نالیەك کە هەڵویستی بەرابەر بەوانە ئاوا بوبێ و وا ئازایانە ڕەخنەی لێ گرتبن ، لەبێ هەڵویستی بەرابەر بە سۆفی و دەرویشەکانی خانەقا و تەکیەکانی کوردستان چۆن بوبێ !! دیارە گەلێ لەوە لیژتر بووە کە جارجار لە هەندێ شیعریدا دەرئەکەوێ .

لە یەکخستنی (حەرام) و (حەمام) و ، (بازی) و (بازم)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (حەرامە) و (حەرەم)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (دانە) و (ئاو) و (حەمامات)دا تەناسوب و ، لە بەراورد کردنی (دیدەباز) و (شەوارە)دا طیباق هەیە .

شەوارەی (چر) و (چن) و (ك) و (مز) و (اح) و (خا) : ڕیشۆلەی .

(٦) ڕاویە : حوشتر یا هەر ولاخێکی تر کە ئاوی پێ بگوێزنەوە . وشەکە بە عەرەبی واتە (ئاودەر) . جاران لە سەردەمی حەجدا بە ولاخ ئاویان بەسەر ڕەشماڵی حاجیەکاندا بەشیوەتەوە . سانیە : ئەو حوشترەی ئاوی لە بیر بێ هەڵئەگۆزن . طەواف : یەکێکە لە کارەکانی حەج ، گەڕانە بە دەوری ماڵی کەعبەدا . سەعی : کارێکی تری حەجە ، ڕاکردنە لەنێوان (صەفا) و (مەروە)دا کە دوو شوێنن . عەمرە : واجبێکی تری وەکو حەجە ، جیاوازیی لە حەج لەوەدایە مەرج نییە هەر لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی قوربانا بکرێ و وەستانی (عەرەفە)شی تیا پێویست نییە .

من لەوانەم چێ کەوا ئەهلی وەسیلەو مەسئەلەن
عامیل و ناچار و مەعذور ئەر بڵێن هەر بێنە بۆم ! (٧)

---

واتە : تا کەی من وەك وشترێکی سێ پەل شکاوی ئاو هەڵگوستن و ئاوگێڕان بم ، نەك هەر تەنها هیچم بۆ نەکرێ ، بەڵکو ئەگەر هیچیشم بۆ بکرێ هیچێکی ئەوتۆ نەبێ .. تا کەی من بێ ئەوەی لەبەر پەل شکاوی بتوانم بە دەوری ماڵی خوادا بگەڕێم و ، لەنێوان صەفا و مەروەدا ڕابکەم و ، واجبی عەمرە بەجێبێنم ، کار و پیشەم هەر نوستن و خواردن بێ . یاخود تا کەی من وەك حوشتری سێ پەل شکاوی ئاو هەڵگوستن و ئاو گواستنەوە ، لەجێیدا کەوتبم و بخەوم و بخۆم و کارێکی سوودمەندم لێ نەوەشێتەوە ، یا تەنانەت ئاودانیش بێ بە خەڵك !!

لەنێوان (بخەوم) و (بخۆم)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

وەك ڕاویە و وەك سانیە (چن) و (ت) و (خا) و (خب) : وەك ڕاویە ، وەك سانیەی . (عب) و (اح) : وەك ڕاویە ، وەك سانیە . طەواف و سەعی و عەمرە : ئەمە بەپێی لێکستی نوسخەی (چر) و (خا)یە . نوسخەکانی تر هەندێ وردە جیاوازیان تیایە ، بەڵام هەموی هەڵەیە . هەر بخەوم و هەر بخۆم (ك) و (ئو) و (عب) و (خا) : هەر بنوم و هەر بخۆم (ت) و (مز) و (اح) و (خب) : هەر بخۆم و هەر بنوم . ئەوانی دیکە هەمو هەڵەن .

(٧) وەسیلە : هۆی خۆ نزیك‌کردنەوە لە خەڵك . مەسئەلە : داوا ، سواڵ . مەعذور : بیانودار .

واتە : من حەقم چییە بەسەر ئەو کەسانەوە کە فێری خۆ هەڵواسین بوون بە خەڵکا و بە سواڵ و صەدەقە ئەژین .. من چیمە بەسەر ئەو کەسانەوە کە ناچارن و بیانویان هەیە هەر داوای زیاتر ئەکەن چونکە خۆیان کاسبیان پێ ناکرێ .. من لەوانە هیچیان نیم و ، ئەتوانم بە ڕەنجی شانی خۆم بژیم . لەبەرئەوە لە مەککەدا نامێنمەوە و پشت بە زیانی چاو لەدەستی نابەستم و ئەڕۆمە شوێنێکی‌کە بۆ خۆم ئیشێك ئەکەم و پێی ئەژیم .

وشەی (عامیل) لەم شیعرەدا زۆر بێ‌جێیە . ڕەنگە ڕێی تێ چێ یا (خامیل) بوبێ یا (عاطیل) و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ . لە نوسخەی (خب)یشدا نوسراوە (عالم) . ئەمە بۆرەڕێیەکی ڕێ‌ئەچێ ، لەوڕووەوە کە (مەلا) زیاتر هەر چاو لە دەستی خەڵك بوون و بە خەڵات و بەراتی گەورە گەوران و پارمەتیی خەڵك ژیاون .

خەوفی من لێرە لەبەر زۆریی گوناهە یەك بە سەد
گەرچی عاصی و موذنیبم ئەمما موقیڕ و بێ درۆم (٨)

شادمانی بێ وەفایە ، یاری تێری و مەستیە
یاری تەنگانەم غەمە با هەر غەمی خۆم خۆم بخۆم (٩)

لامەدە « نالی » لە ئەنباری جیرایەی صالحان
گەرچی ببیە خۆشەچینی دانەیی خەرمانی زۆم (١٠)

---

ڕەسیلە و : لە هەمو نوسخەکانی بەردەستمانا ، جگە لە (چن) ، نوسرابو (وەسیلەی) . ئێمە ئەوی (چن)مان لا پەسەند بو . مەعلوور (چر) و (چـن) و (ك) و (مز) و (اح) : مەغرۆر . (الـۆ) و (من) و (خا) : مەغلۆر .

(٨) موذنیب : گوناهبار . موقیڕ : بێلێنەر .

واتە : من درۆ ناکەم و پێی لێ ئەنێم کەوا کابرایەکی گوناهبارم . گوناهیش لە مەککە یەك بە سەد ئەژمێررێ لای خوا . بۆیە من لە زۆریی گوناهی خۆم ئەترسم و ناتوانم لێرە بمێنمەوە و ئەڕۆم .

(٩) واتە : شادمانی وەفای بۆ کەس نییە ، تەنها لە سەردەمی تێری و مەستیدا لەگەڵ ئینساندایە . کە بنیادەم کەوتە تەنگانەوە هەر خەم و خەفەت یار و یاوەر و دۆستی ئەبێ . منیش ئێستا لەم تەنگانەیەدا هەر خەم برادەر و هاوڕێمە ، کەواتە با خۆم خەمێکی خۆم بخۆم و چارەیەکی دەردی خۆم بکەم .

مەستییە ( « پەراوێزی » چن ) : مەستییە . تەنگانەم (خب) : تەنگامەم .

(١٠) ئەنبار : عەمار . جیرایەی صالحان : ئەو بەراتەی بۆ پیاوچاکان تەرخان ئەکرێ کە پێی بژین و خەریکی خواپەرستیی خۆیان بن . خۆشەچین : گولۆچنیکەر . لەوەی خێر و بەرەکەتێکی زۆری دەسگیر بێ . ئەم دۆ مەعنا دژی یەکن و وادیارە نالی خۆیشی هەردۆ مەعناکەی مەبەست بوبێ وەك باش کەمێك ڕۆنی ئەکەینەوە .

نالی لەم بەیتەیدا ، بە عادەتی شاعیرە کلاسیکەکان کە لە دوا بەیتدا پەشیمانییەك پیشان ئەدەن و ، ئەکشێنەوە ، ئەڵێ : نالی ! ئەو تسانەی

— ١٢ —

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە ، جەوابی نادەم
موددەتێکە لە قەفەسدایە ، عەزابی نادەم (١)

---

کە لەبارەی بەجێهێشتنی مەککەوە کردێ ، هەمۆ خەیاڵ بۆن و ، هەر ئەوەت بۆ باشە لێرە بمێنیتەوە نەچی بۆ هیچ کوێ . دەس‌بەرداری مەماری بەرات و مۆچەی خواناسان مەبە و هەر لە مەککە بژێ ، بیری چۆن بۆ ئەستەمۆڵ لە مێشکت دەرکە ، مەچۆ ، هەرچەند ئەگەر بچی ، بیشبی بە هەڵگر و چنەوەی دانەوێڵەی خەرمانی وڵاتی رۆم و بکەوێتە خێر و خۆشییەوە .

رستەی (لامەدە) لە چەند نوسخەیەکدا بە (لابدە) نوسراوە . بەمپێیە ئەم شیعرەش هەر بە رێگای شیعرەکانی پێشودا ئەڕوا . واتە : دەس‌بەرداری مۆچە وەرگرتن بیە لە مەماری بەراتی خواناسان و مەککە بەجێبێڵە و برۆ بۆ وڵاتی رۆم ، هەرچەند لەوێ لەبەر هەژاری و نەدارێ موحتاجی گوڵۆچنی کردنیش بی .

لامەدە (لۆ) و (عب) و (خب) : لابدە . جیرایەی (چر) و (ك) و (اح) و (خا) : جیرابەی . لەسەر ئەم نوسخانە ئەبێ (جیرابی) بێ چونکە (جیراب) بەمەعنا هەمانەیە نەك (جیرابە) . (کم) و (عم) و (من) : خەزێنەی . (مز) : جەنابی . (خب) : خەرابەی . واتە : وێرانەی .

تێکڕای ئەم پارچە شیعرە بەبابەخەی نالی لە نوسخەی (کم)دا نییە . ئەگەر بیشڵێین ماموستا گیو هیچ نوسخەی دەستنوسی لا نەبوە ، خۆ هیچ نەبێ ئەیتوانی لەبەر نوسخەکانی (عم) و (کم) بینوسێتەوە .

— ١٢ —

(١) چەمەن : باخ و گوڵزار . جەوابی نادەم : رێی لێ ناگرم . دڵی ناشکێنم . یاخود وەڵامی نادەمەوە ، چی ئەکا با بۆ خۆی بیکا .

واتە : ماوەیەکی زۆرە دڵ گیرۆدەی بەندی قەفەزە . ئیستا ئەیەوێ بایەکی باڵی خۆی بدا و گەشتێکی ناو باخ و گوڵزار بکا . بۆیە کە باسی خۆشیی دەر و دەشتم بۆ ئەکا و بەمەعنا دارام لێ ئەکا رێگای بدەم بۆرێك بۆخۆی رابوێرێ ، بێ‌دڵیی ناکەم ، یاخود وەڵامی نادەمەوە ، با بۆخۆی حەزی لە چییە بیکا .

لەنێوان (دڵ) و (دەڵێ)دا جیناسی ناقیص و ، لە رستەی ( جەوابی نادەم)دا لەطافەت هەیە . لە (قەفەس)یشدا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە

مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گول و مول
بە دوصەد مەدرەسەوو دەرس و کیتابی نادەم (٢)

گوتم : ئەی ماه ، دلی من بە دلی خۆت بگۆڕە !
گوتی : من بەردی بەقیمەت بە کەبابی نادەم (٣)

---

هەیە چونکە بێبەشێ و دنیا بەئارەزوو نەبوون شوبهێنراوە بە قەفەس ، نیشانەش ئەوەیە کە دڵ لە ناڕەحەتیدا ئەبێ بەڵام لە قەفەزدا نابێ .

موددەتێکە (عب) و (خب) : موددەیێکە .

ڕەنگە بێ نالی ئەم غەزەلەی لە یەکێ لە ناوەکانی بێتاقەتی و وەڕزبوونی فەتێیەتیدا وتبێ . شیعری پاشەوەش ئەم بۆچوونە ئەگەیەنێ .

(٢) گول : گوڵ . مول : جۆرە مەیێکە .

نالی لەم شیعرەشیدا بەڵگە بۆ ئەو قسەیە دێنێتەوە کە لە شیعری پێشوویدا کردی . ئەڵێ دڵ حەقیەتی ئارەزووی ڕابواردنی سەیری باخ و چەمەنی هەبێ و ، لە حوجرە و ژیانی حوجرە بێزار بێ . من خۆیشم کۆڕێکی ناوباخ و بولبولان و بەزمی یارانی وەك گوڵ ڕازاوە و ، مەیخواردنەوە لەگەڵیانا بە دووصەد قوتابخانە و دەرس و کتێب ناگۆڕمەوە .

لە یەکخستنی (مەجلیسێك)دا کە مەعنای (زۆر کەم) ئەگەیەنێ ، لەگەڵ (دووصەد) کە کینایەیە لە (زۆر) ، طیباق هەیە .

مەجلیسێکی (چر) و (ت) : مەجلیسێکە . بەزمی گول و مل (گم) و (لك) و (اح) و (من) : بەزم و گول و مول . ( « پەراوێزی » چر ) و (مم) و (عب) : هەر بەرگە ، یا بەرگی ، گوڵێ . دەرس و (خا) : دەرسی(پشی) .

(٣) ماه : مانگ . بەردی بەقیمەت : (احجار کریمة) .

واتە : بە یارم وت : ئەی نازداری وەك مانگ جوان ! وەرە با دڵمان بگۆڕینەوە بە یەك ، واتە یەکترمان خۆشبوێت .. ئەویش لە وەڵاما وتی : من مامەڵەیوا ناکەم . دڵی من دڵی دولبەرە ، دڵی دولبەریش ڕەقە ، دڵێکیش کە دڵی دولبەر بێ و ڕەق بێ وەك بەرد ، دیارە لە بەردە گرانبەهاکانە . دڵی تۆیش دڵی عاشقە ، دڵی عاشقیش سووتاوە ، دڵی سووتاویش کەبابە . کەبابیش هەرگیز بەردی بەقیمەت ناهێنێ . لەبەرئەوە دڵم ناگۆڕمەوە بە دڵت .

گۆشەگیرم لە برۆت و ، موتەوەححیش لە موژەت
ڕۆحی شیرینم ئەبەر شیر و قولاپی نادەم (٤)

طەلەبی سینەیی چاکم مەکە بەو چاوانە
سینەکەم چاکە بە ئینسانی خەرابی نادەم (٥)

---

لە کۆکردنەوەی (قیمە)دا کە لە وشەی (بەقیمەت) دەرئەکەوێ لەگەڵ (کەباب) ، جۆرە تەناسوبێك هەیە . لە بەکارهێنانی (بەرد)یشدا کە ڕەق و سەختە بە مەعنا دڵی یار کە گۆشتە و نەرمە ، جوانکارییەکی ئێجگار باڵا هەیە .

تەنها لە نوسخەکانی (گم) و (مب)دا نوسراوە : (گوتم ، گوتی) . لەوانیتردا نوسراوە : (وتم ، وتی) . بە دڵی (خا) : بەدەلی .

(٤) گۆشەگیر : دوورەپەرێز . موتەوەححیش : هەڵاتوو و داوە کێو .

واتە : برۆت وەك شمشێر و برژانگت وەك قولاپ وایە . منیش نامەوێ گیانی شیرینی خۆم بخەمە بەر شمشێر و قولاپی تۆ ، بۆیە خۆم لە برۆ و برژانگی تۆ دوورەپەریز گرتووە و لە دەستیان هەڵاتووم .

لە کۆکردنەوەی (برۆ) و (موژە) و ، (شیر) و (قولاپ)دا تەناسوب هەیە .

ڕۆحی شیرینم نەبەر (مم) : ڕۆح شیرینە ، لەبەر . (گم) : گیانی شیرینم نەبەر (ت) : ڕۆح شیرینە، نەبەر . شیر و (« بەراویزی » چر) و (کم) و (گم) و (من) : تیر و .

(٥) چاك (ی یەکەم) : لەتلەت ، کراوە . ئینسان : گلێنەی چاو . بنیادەم .

واتە : نەتەوێ بە نیگای چاوت دەستم بەسەردا بگری و سینەی کراوەم بەری بۆ خۆت و دڵم دەربێنی .. سینەی من سینەیەکی چاکە نایدەم بە بنیادەمێکی خراپ ، یاخود نایدەم بە چاوێکی خراپیوا کە بە تیری نیگای سینەی خەڵك لەتلەت ئەکا .

لە کۆکردنەوەی (چاکم) و (چاکە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (چاك) و (خەراب)دا طیباق و ، لە وشەی (چاك) و (ئینسان)دا لەطافەت هەیە .

بەو (« بەراویزی » خا) : بەم .

« نالیــا » ئەم غەزەلەت تازە بە تازە وتووە

بە دوصەد ( مەثنەوی )یو ( لوبی لوباب )ی نادەم (٦)

— ١٣ —

( فاتیحە ! ) تەسخیرە شاری دڵ بە طابوری ئەلەم

موددەتێکی زۆرە پاتەختە لەبۆ خاقانی غەم (١)

---

(٦) مەثنەوی : کتێبێکی بەناوبانگی شیعری سۆفییانەیە بە فارسی ، مەولانا جلال‌الدینی رۆمی نوسیویە کە لە ٦٧٠ی . ك (١٢٧١ — ١٢٧٢ی . ز)دا مردووە . لوبی لوباب ، لب اللباب ، کتێبێکە سیف‌الدینی ئامودی نوسیویە کە لە ٦٣١ی . ك (١٢٣٣ — ١٢٣٤ ی . ز)دا مردووە . لەوانەیە کتێبی تریش بەم ناوە هەبێ .

واتە : ئەی نالی ! تازە ئەم غەزەلە جوانەت وتووە .. ئەوەندە ناسك و پڕمانایە بە دۆصەد کتێبی بەناوبانگی وەك (مەثنەوی) و (لب اللباب)ی ناگۆڕمەوە ..

— ١٢ —

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە دەستنوسەکەی ڕەحمەتی مەلا عەزیزی ڕێشاویدا هەبۆ کە لە پێشەکییەکەدا ئیشارەتی (عز)مان بۆ دانا . لەمەوە ئەچێ نالی ئەم شیعرەی لەوکاتەدا وتبێ کە قاجارییەکان لە ١٢٤٦ی . ك (١٨٣٠ — ١٨٣١ی . ز)دا بە ناوی یارمەتیدانی مەحمود پاشای بابانەوە هاتنە ناو شاری سولەیمانی و ، سلێمان بەگ (سلێمان پاشا) کە ڕۆمەکان پشتگیری بون ، شاری بەجێ‌هێشت و ڕۆی کردە ( زەنگاباد ) .

(١) فاتیحە : سورەتی (الفاتحة) ، داوای خوێندنی سورەتی فاتیحە بۆ گیانی کەسێکی مردو . تەسخیر : داگیرکردن و سەر پێ نەوی‌کردن . مەبەست لێرەدا داگیرکراوەکەیە . ئەلەم : ئازار . خاقان : پادشا .

نالی ئەم شیعرەی بە دادانی (فاتیحە)یەك دەست پێ‌ئەکا بۆ گیانی شاری دڵ و ئەڵێ ئەم شارە کەوتووەتە ژێر باری تابوری سوپای خەمەوە و ، دەمێکی زۆرە بووە بە پایتەختی خاقانی خەم و خەفەت و ، ئەو حوکمڕانیی تیا ئەکا و ، بە بەراورد لەگەڵ جارانی وەك نەمابێ وایە .

حوکمی قانونی صەفا ڕۆیی لە ڕەومی ڕۆمەدا
تا هووەیدا بۆ لە ڕۆما گەردی ئاشوبی عەجەم (۲)

لەززەتی دنیا کە هیچ و پوچە لای ئەهلی ئەدەب
ئەووەڵ و ئاغازی جەور و دەردە ، ئەنجامی ستەم (۳)

تۆزی ئاینەی سکەندەر وا بەدەم باوە ، وەلێ
گەردی دامانی غەریبانە بلوری جامی جەم (٤) ■

---

(۲) صەفا : ڕابواردن . ڕەوم : جۆرە شەرابێکە لە قامیشی شەکر دروست لەکرێ . تا : لەوکاتەوە . هووەیدا : ئاشکرا .

واتە : ئەوەتی تۆز و گەردی ئاشوب و ئاژاوەی عەجەم لە وڵاتی ڕۆمدا ئاشکرا بووە و دەرکەوتووە ، شەرابی ڕوخساری منیش حوکمی ناچاریی خۆشی و سەرخۆشکردنی لێ هەڵگیراوە . مەبەستی ئەوەیە بڵێ وەك چۆن ئانۆنێکی سروشتکردە شەراب بنیادەم سەرخۆش ئەکا ، هەروا قانونێکی سروشتکرد بو ڕۆی منیش هەمیشە خۆش بێ و دڵی خەڵکی پێ بکەشێتەوە ، بەڵام لەوکاتەوە کە ئێرانییەکان ئەم خاکی ڕۆمەیان پێشێل کردووە ، منیش گەشی و خۆشی لە ڕوخسارم هەڵگیراوە .

لەشکونجێ (ڕەومی) نەبێ و (ڕۆمی) بێ ، واتە : خۆشی لە وڵاتی ڕۆمی ڕۆمدا نەماوە .

(۳) ئاغاز : سەرەتا .

واتە : خۆشی و ڕابواردنی دنیا کە لە بەرچاوی پیاوی هونەرمەند و دنیا دیدە و زیرەکدا هیچ نایەنێ و قیمەتی نییە ، سەرەتاکەی بریتییە لە زوڵم کردن لە ژێردەست و ، چەشتنی دەرد و ئازەحەتی بەدەست کاروباری حوکمڕانییەوە و ، ئەنجامەکەشی کەوتنە ژێر چەپۆکەی زۆردارێکی‌تر ، وەك خەڵکی‌تر .

(٤) ئاینەی سکەندەر : ئاوێنەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنی کە ئەڵێن ئەوەندە بەرز بووە دنیای هەمو لێوە دیوە . وەلێ : بەڵام . جامی جەم : ئاوێنەکەی جەمشید ، ئەویش ئاوێنەیەکی وەك ئەوەی ئەسکەندەر بووە .

واتە : دنیا بۆ کەس نامێنێ تا سەر . ئەوەتە ئاوێنە گرانبەهاکەی پادشایەکی بە شان و شکۆی وەك ئەسکەندەر ، ورد و خاش بووە و تۆزەکەی بەدەم باوەیە ، شوشەی ئاوێنەکەی جەمشیدیش بووە بە تۆزی



■ بێ گومان دەڵێ راستە .

بۆ دەکەی تەکلیفی ڕەسمی ئولفەت و یاریی لە من ؟
کەی بە صوحبەت ئاشنایە سالیکی ڕێگەی عەدەم ! (٥)

من مەتاعم جاوە ، چاوم ! باخەبەر بێ موشتەریی
تا غەزەل سەودا نەکا لای تاجری چیتی بەقەم (٦)

---

داوێنی غەریبان کە لە شوێنێك لە جلەکانیان نەنیشێ و لە شوێنێکیتر لێیان دائەنەکێ .

مەبەستی نالی لە هێنانی وشەی (وەلێ) ئەوەیە بڵێ تۆز هەر هیچ و بێمایەیە ، خوا با بە ئاسمانیا بەرێ یاخود لە زەویدا دایتەکێنێ و ، ئەو شان و شکۆیەی لە دنیادا هەیە هەر دیمەنە و لەڕاستیدا بایەخی وردەیەکی تۆزی هەیە .

وشەی (وەلێ) بەگوێرەی تێکستی دەستنوسەکە بو ، ئێمە خۆمان لامانوایە لە ئەسڵدا ( دەلێ ) بوبێ و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ . بەمپێیە نیوە شیعری دوهەم شتە وتراوەکەیە کە تۆزی ئاوێنەی ئەسکەندەر وتویەتی .

(٥) ڕەسمی ئولفەت : نوسولی ناسیاوی . یاری : دۆستایەتی . صوحبەت : ڕابواردن . سالیك : ڕێبوار . ڕێگەی عەدەم : ڕێگای مەرگ .

واتە : بۆچی داوای نوسولی ناسیاوی و دۆستایەتی لە من ئەکەی ؟ من ڕێبواری ڕێگای نەبونی و مەرگم و ، کەسێکیش ڕێبواری ڕێی نەبونی و مەرگ بێ ، شارەزای هاوڕێیەتی نییە .

(٦) مەتاع : کەل و پەلی فرۆتەنی . جاو : خامی گازری نەکراو . غەزەل : جۆرە قوماشێکی گرانبەهایە . سەودا : مامەڵە . ئارەزۆ . باخەبەر : ئاگادار . بەقەم : ڕەنگێکی سورە قوماشی پێ ڕەنگ ئەکەن . لەوانەشە لە ( باقی ماندە )وە هاتبێ واتە ( عەمارەبو ) .

واتە : ئازیزەکەم ! من کابرایەکی لاتم ، دوکانەکەم شتی گرانبەهای تیا نییە ، دەسمایەی دەسم جاو و شتیوایە . با کڕیار ئاگای لە خۆی بێ ، ئەگەر ویستی (غەزەل) بکڕێ ، لای فرۆشیاری چیتی بە بەقەم ڕەنگکراو بەدوایا ئەگەڕێ .

ئەم شیعرە ، بەشیبەحالی شیعری پێشو ، وەك حوسنی تەعلیل وایە .

لە دەستنوسەکەدا لەجیاتیی (چیتی بەقەم) نوسرابو (چیت بە قەسەم) . ئێمە خۆمان وامان ڕاست کردەوە .

کەی دەکا شەرح و بەیانانی ڕوموزی دەردی دڵ
ڕۆژەشی هەروەك دەوات و ، دوو زوبانی وەك قەڵەم ! (٧)

« نالیا » بێ هیمەتی تا کەی بە دەست میحنەتەوە
فاتیحی بو ڕۆستەماسا ، صاحیبی تیغ و عەلەم (٨)

---

(٧) ڕوموز : جەمعی (ڕەمز)ە واتە ئیشارەت . مەبەست شتی بەئاسانی لێحاڵینەبووە . دەوات : شووشەی مەرەکەب .
واتە : ڕۆژەشی وەك شووشەی مەرەکەب و دوو زمانی وەك قەڵەم ، کەی ئەتوانن نهێنییەکانی دەردی دڵ لێکدەنەوە !

دەوات بۆیە بە (ڕۆژەش) وەصفکراوە ، چونکە جاران مەرەکەبی نووسین زیاتر ڕەش بووە . قەڵەمیش بۆیە بە (دوو زوبان) وەصف کراوە ، چونکە قەڵەم لە لایەکەوە چاك و خراپی پێ ئەنووسرێ و ، لە لایەکی کەشەوە دوولای هەیە و درزێك لەنێوان لاکانیایە . کەواتە قەڵەم هەم بە مەعنا و هەم بە دیمەنیش دوو زمانە .
موفتیی زەهاویش ئەم بیرەی لە شیعرێکی فارسیدا داڕشتووە . جا نازانین ئەو و نالی کامیان لەویانی وەرگرتووە . شیعرەکەی موفتی ئەمەیە :

نامە ننویسم مباد از راز دل آگە شود
دو زبانی همچو خامە ، روسیاهی چون قلم

واتە : نامە نانووسم نەوەك دوو زمانێکی وەك خامە و ڕۆژەشێکی وەك قەڵەم بە ڕازی دڵم بزانن .

(٨) فاتیح : وڵاتان داگیرکەر . ڕۆستەماسا : ڕۆستەمئاسا ، وەك ڕۆستەم .
واتە : نالی ! تا کەی وا بە دەست دەرد و بەڵاوە ، بێهیممەتانە گیرئەخۆی ؟ ڕابەڕە .. تۆ کە ئازایەکی وڵات داگیرکەری،وەك ڕۆستەم و، خاوەنی شمشێر و ئاڵایت .. لەسەرچی پەکت کەوتووە ، هەستە !

لە دەستنووسەکەی (مر)دا وشەی (میحنەتەوە) بە (میحنەلەوە) نووسرابو . دیارە لەسەر شێوەی نووسینی کۆن هەردوو (ت)کە لە یەك گیرکرابون ، ئێمە کردمانەوە . وشەی (فاتیحی‌بو)یش بە (فاتیحی) نووسرابو ، لەنگ بو ، ئێمە خۆمان بەمجۆرە ڕاستمان کردەوە ، چونکە شتیوا لە شیعری کۆندا هەیە . لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لامانوایە ڕاستەکەی وا نییە ، لەوانەیە (فاتیحێکی) یا (فاتیحی تۆ) یا شتێکیوا بوبێ .

— ١٤ —

لەبت میم و ، قەدت ئەلف و ، زولف چیم
دەزانی بەم سیانە طالیبی چیم ! (١)

وەفای عەهدە لە من زۆر و ، لە تۆ ماچ
چیە چارەی ئەمانەت غەیری تەسلیم (٢)

کە هاتی تیغی بیزاریت لە سەر دام
سەری خۆم خود بە خود هەڵگرت و زۆریم (٣)

---

— ١٤ —

(١) لەب : لێو .

وانە : لێوت لە بچوکیدا وەك (سەلکی) تیپی (میم) وایە کە کونێکی بچوکی تیایە و ، بالاێشت وەك تیپی (ئەلف) بەرز و باریکە و ، زولفیشت وەك حەرفی (چیم) پێچی خواردووە . دیارە بەم شوبهاندنەدا خۆت لێ ئەگەی چیم لێت ئەوێ .. ماچم ئەوێ !

نیوە شیعری یەکەم لە نوسخەی (عم) و (مز) و (خب)دا بەمجۆرەیە :

**لەبت میم ، قەد ئەلیف ، زولفت وەکو چیم**

بەم سیانە (کم) و (گم) و (مز) و (مب) : بەو سیانە .

(٢) وەفای عەهد : گفت بەجێهێنان . ئەمانەت : شتێکی کەسێك لای کەسێکی‌تر دانرابێ . تەسلیم : دانەوە .

وانە : من و تۆ گفتێکمان لەنێواندایە ، من گیانی خۆمت بۆ بەخت بکەم و تۆش ماچێکم بدەیتێ .. کەسێکیش کە گفتێکی دا بە کەسێك ، ئەو گفتە وەك ئەمانەتی ئەوکەسە بێ لای ، ئەکەوێتە ئەستۆی . لەبەرئەوە هەردوکمان چارمان ناچارە ئەبێ گفتەکەمان بێنینەدی و ئەمانەتی یەکتر بدەینەوە . ئەم شیعرە ئیشارەتە بە دو ئایەتی (إنّ العهدَ کانَ مسؤولا) و (إنّ اللهَ یأمرُکم أنْ تؤدّوا الأماناتِ الی أهلِها ) .

(٣) بێزاری : تۆرەیی و نارەزایی . خود بە خود : لەخۆوە .

وانە : کە تۆ هاتی بۆ لام لەجیاتیی دڵدانەوە و دڵ شاد کردن ، تیغی

— ١٥ —

سوی مصر است مرا عزم از این لجه غم
تا که در نیل کشم جامه ز بی‌داد و ستم (١)

میرود نالی از اینجا چو حریص از دنیا
با لب خشك و کف خالی و چشم پر نم (٢)

---

تۆزەبیت دا لە سەرم ، منیش لەداخانا سەری بزاوی خۆم هەلکرت و تۆیشتم . یا : کە دیم تۆ لیم زویر و زیزی ، منیش سەری خۆم هەلکرت و ئاوەدانیم بەجێهێشت .

لە کۆکردنەوەی (سەر) و (سەری)دا جیناسی ناقیص و ، لە (سەری خۆم هەلکرت)دا لەطافەت هەیە ، چونکە دوو مەعنا ئەگەیەنێ .

— ١٥ —

(١) ئەم چوارینە فارسییە تەنها لە دەستنووسەکەی (چ)دا هەیە .

واتە نیازی ئەوەم هەیە خۆم لەم گێژاوی غەمە دەرباز کەم و بڕۆم بۆ میسر ، تا بۆ دەربڕینی بێزاری و ناڕەزایی لە جەور و ستەم ، کراسەکەی خۆم لە ئاوی نیل هەلکێشم ، شین ببێ .. ئەم (شین‌بوونی کراس)ە لەوەوە دەرئەکەوێ کە قوماش خرابە نیلەوە دیارە ئەبێ بە (نیلی) و (نیلی)یش جۆرە شینێکە .

(٢) واتە : زۆرم پێ ناخۆشە ئەم وڵاتە بەجێدێلم .. کە ئەڕۆم ، خۆم بەو دەولەمەندە زۆرە تەماکارە ئەشوبهێنم کە ئەمرێ ، لە لێوێکی وشك و دەستێکی خالی و چاوێکی پڕ لە فرمێسك بەولاوە ، هیچ لەگەڵ خۆی نابا .

زۆر لەوە ئەچێ نالی ئەم شیعرەی باش تێکچوونی میرنشینیی بابانەکان ولبێ ، بۆیە وا کۆچ‌کردنی خۆیشی ئەشوبهێنێ بە مەرگی کەسێك نەیەوێ بمرێ . ئەبێ دەربڕینی بێزارییەکەشی ، لە جەور و ستەمی داگیرکەرە عوسمانییەکان بووبێ و ، بۆیەش ویستبێتی بۆ میسر بچێ ، دەنگوباسی ئەوەی زانیبێ کە لەناو هەموو وڵاتە موسوڵمانەکانا (جگە لە ئێران) هەر میسر لەژێر دەستی عوسمانیدا نەبووە ، سەرەڕای بوونی (ئەزهەر) و ناوبانگی مەلایەتی و خوێندنیش تیایدا . دووریش نییە زۆتر لە دەرباری

. . . . . . . . . . . . . . .

---

بابانا شتێکی لەبارەی پەیوەندی ئیبراهیم پاشای کوڕی حەمە عەلی پاشای میسر و میری ڕەواندزەوە بیستبێ ..

بەداخەوە هیچ لەبارەی ئەنجامی ئەم نیازەی نالیەوە نازانین : چووە یا نە و ، ئەگەر نەچوە ، چی پەکی خستووە ؟ !

## تیپی نوون

— ١ —

که تۆی قیبله ، دەمت سا پێنە ، قوربان !
لەسەر قوبله دڵم مەشکێنە ، قوربان ! (١)

وەرە بنوارە دوو دەستی حەنایم
حەنایی چی ؟ هەمو خۆ خوێنە قوربان ! (٢) ■

---

— ١ —

(١) قیبله :ماڵی خوا لە مەککە کە موسوڵمانان پێنج فەرزە ڕووی تێ ئەکەن .
قوبله . ماچ .

واتە : قوربان ! مادەم تۆ قیبلەی منی و من هەمیشە ڕووم لە تۆیە ، دەسا ماچێکم بدەرێ و بە نەدانی ئەو ماچە دڵم مەشکێنە .

نالی کە لەم‌بەیتەدا یاری شوبهاندووە بە ماڵی قیبلە ، دیارە دەمیشی شوبهاندووە بە (حجر الاسود) کە بەردێکە لە دیواری کەعبەدا ، خەڵکی لە سەردەمی حەجدا بۆ پیرۆزی ماچی ئەکەن .

لەنێوان (قیبلە) و (قوبلە)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

کە تۆی قیبلە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : کە تۆ قیبلەی . (ت) : کە تۆی قیبلەم . لەسەر قوبلە (عم) : لەبۆ قوبلەی . دیارە لە ئەسڵدا (لە بۆ قوبلێ ـ قوبلەیەك) بووە .

(٢) حەنایی : خەناوی ، گیراوە خەنە .

واتە : قوربان وەرە سەیری دەستەکانم بکە کە ئەڵێی گرتومنەتە خەنە .. بەڵام خەنەی چی ! لە خەنەم نەگرتوون . بۆیە سوورن چونکە خوێنیان پێوەیە ، ئەوەندەت بە تیری خۆشەویستی بریندار کردووم ، دەس بۆ هەر کوێی گیانم ئەبەم هەر خوێنە ، بۆیە دەستم خوێناوییە .

■ بە بڕوای من خەناوی هەم لە بار وەزنی شیعر و لە باری جوانی وشەوە باشترە ، هەرچەندە نالی وشەی بێگانەی زۆر لە شیعردا هەیە بەڵام لە بەکاربردنی ئەو وشانەی لە کوردیدا گۆڕاوە باکی نەبوە .

شەقی کە ، غەیری حوببی تۆی تێدا بێ ،
بە دەستی خۆت دڵم دەربێنە ، قوربان ! (٣)

لە بۆ خەڵقی خەڵات بەخشانی ماچە
خەڵاتی من هەمۆ خۆ جوێنە ، قوربان ! (٤)

فوتوری چاوەکانت نانوێنێ
بە « نالی » فیتنە بەس بنوێنە ، قوربان ! (٥)

---

لەنێوان هەردۆ وشەی (حەنایی)دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (خوێن) و (قوربان)دا تەناسوب هەیە ، چونکە هەرچەند مەبەست لە (قوربان) مانگی قوربان نییە ، بەڵام وشەکە ئەو مەعنایەش هەڵئەگرێ .

حەنایم (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (خا) و (خب) : حەنائیم . (مم) : حەنایبت . (کم) و (من) : خەناویم . (گم) : خەناویت . حەنایبی چێ (چر) و (ت) و (مز) و (اح) و (خا) : حەنائیی چێ . (کم) و (گم) و (من) : خەناویی چێ . هەمۆ (چن) : هەمۆی . خۆ خوێنە (کم) و (گم) و (من) و (خب) : هەر خوێنە . (مز) : خوێنینە .

(٣) شەق : لەت . حوبب : خۆشەویستی .

واتە : قوربان ! دڵم لەت کە ، ئەگەر لە خۆشەویستیی خۆت بەولاوە شتێکت تیا دێ ، بە دەستی خۆت دەریبێنە (واتە : دڵەکە) و فڕێی‌دە ، من دڵی‌وام ناوێ .

وشەی (دڵم) لە لایەکەوە مەفعوولیبهیی (شەقی کە)یە و ، لە لایەکی‌کەوە موبتەدایە و (غەیری .. تاد) خەبەریەتی و ، لە لایەکی‌تریشەوە مەفعوولیبهیی (دەربێنە)یە .

شەقی کە ( « پەراوێزی » چر و خا ) و (اح) : شتێکی . (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (خب) : ئەگەر دڵ . (ك) : دڵێ کە .

(٤) بەخشان : بەخشینەوە .

واتە : بەسەر خەڵکی‌دا ماچ دابەش ئەکەیت و بە ماچ خەڵاتیان ئەکەی ، کەچێ خەڵاتی منی دڵسۆزیش جنێو و قسەی دڵ بریندارکەرە .

لە بۆ (مز) : لەنێو . خەڵقی (چن) و (ت) و (ك) : خەڵکی . بەخشانی (چن) : بەخشانە .

(٥) فوتور : ساردێ و بێ‌مەیلی . نانوێنێ : ناخەوێنێ . فیتنە : گوروفتار و

— ٢ —

ڕەفیقان ! من ئەوا ڕۆیم لەلاتان
لە مەظلومان بلا چۆڵ بێ ولاتان (١)

---

گیرۆدەکردن . بنوێنە : دەرخە .

واتە : مادەم نیازت نییە ساردێ و بێمەیلیی چاوەکانت بەرابەر بە من بخەوێنێ و لەکاربخەی ، هیچ نەبێ بەس گرفتاریێ و گیرۆدەییم پێ بنوێنە و بەسم ڕاکێشە بولای خوت .

لە کوکردنەوەی (ناوێنێ) و (بنوێنە)دا لە شێوەی نەفی و ئیثباتەکەدا طیباق و ، لە مەعنادا لیشتیراك هەیە ، سەرەڕای ئەو طیباقەش کە لە مەعنا لێدانەوەی (نواندن)دا هەیە بە (خەواندن) و بە (پیشاندان) .

— ٢ —

ئەم پارچە شیعرە لە دەستنوسەکانی (چر) و (چن) و (ك) و (ت) و (مز) و (مز) و (اح) و (خا)دا هەیە و دراوەتە پاڵ نالی . هەروەها لەناو کومەڵێ دەستنوسی مەلا موحەممەد ناوێکی گەلالەییشدا هەیە بە ناوی نالییەوە و کاك جەمال موحەممەدی توتاییی دوا پولی بەشی کوردولوژیی زانکوی سولەیمانێ وێنەیەکی لێ بو گرتین و بوی ناردین . لەسەر قسەی کاك جەمال لە بەیاضێکی کونی مەلا سەیید عەبدولقادری وامیظیشدا هەر هەیە و دراوەتە پاڵ نالی . ئەمانە هەمو بەڵگەی ئەوەن کە شیعرەکە شیعری نالییە . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە نوسخە دەستنوسەکەی (کو) و لە هەردو چاپی (کم) و (گم)ی دیوانی کوردیدا پارچە شیعرێکی ١٢ بەیتێ بلاو کراوەتەوە بەیتی یەکەم و سێهەم و چوارەم و پێنجەم و حەوتەمی ئەم پارچە خراوەتە جوار چێوەیەوە ، بەیتی یەکەمی ئەم لەوێش هەر یەکەمە ، سێهەم هەشتەمە ، چوارەم دوانزەمەمە ، پێنجەم دەهەمە ، حەوتەم سیانزەهەمە کە دوا بەیتە لەوێ . جیاوازیی بەیتەکان لێرە و لەوێ هەر ئەوەندەیە سەرەتا لێرە (ڕەفیقان)ە و لەوێ (عەزیزان)ە و ، لەجیاتیی (نالی)ی ئێرەش لەوێ (کوردی)یە .

ئێمە لامانوایە کوردێ لەو چەند شیعرەی لە نالی وەرگرتووە و خستونیەتە چوارچێوەی شیعرەکانی خویەوە و ، شتیوا لە جیهانی ئەدەبدا کەم نییە و ، جیاوازیی پلەی هونەریش لەنێوان ئەمانەی نالی و لەوانەی کوردیدا زور ئاشکرایە .

بلا سا شار به شار و دێ به دێ بێن
لە دەس یاران بکەین طەییی ولاتان (٢)

مەڵێن کەلکی نەبۆ ، ڕۆیی ، جەهەننەم !
سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەضاتان (٣)

---

سەیرئەوەیە لە نوسخەی (خب)دا شیعری چوارەمی پارچەکەی کوردیشی هەر بە هی نالی دانراوە . ئەو شیعرە ئەمەیە :

کە من ڕۆیم جەهەننەم بۆ مەکەن لێم
لە من خالێ مەکەن کۆشك و سەراتان

(١) بلا : با ، باوەکو ، لێی گەڕێ . ولاتان : سوكکراوەی (ولاتتان)ە ، یاخود (ولاتان)ی جەمعی (ولات)ە .

واتە : برادەرینە ! وا من ڕۆیشتم و بەجێم هێشتن ، سا خوا بکا پاش من ولاتەکەتان ستەم لێکراوێکی تیا نەبێ ، یاخود هیچ ولاتێك ستەم لێکراوی تیا نەبێ ، تا وەك منی بەسەر نەیەت .

چۆڵ بێ ( «پەراوێزی» چر) و (چن) و (ت) و (مز) و ( «پەراوێزی» خا) و (خب) : چۆڵ بۆ . بەپێی ئەم نوسخانە مەعنای نیوە شیعری دوەم وای لێدێتەوە : لێی گەڕێ ، باش بو ولاتەکەتان پیاوی ستەم لێکراوی تیا نەما .

(٢) بلا : چش . طەی : پێچانەوە ، تەیکردن .

واتە : چش قەید ناکا ، با لە دەست دۆست و برادەر و بەهۆی ئەوانەوە ، دەربەدەر و ئاوارە ببین و ڕێی دوری ولاتان ببڕین و سەری خۆمان هەلگرین .

بلا (مز) : بلێ . سا (چن) و (ت) : با .

(٣) قەڵغان : بەرگرێکی لە پۆلا دروستکراوە لە چەشنی ساج ، جاران شەڕکەر گرتویانە بە ڕویانەوە بۆ خۆپاراستن لە تیر و شیری دوژمن . قەضا : قەزا و قەدەری خوا .

واتە : مەڵێن نالی کەلکی هیچی پێوە نەبو ، ڕۆیی ، دەبا بڕوا ، بە جەهەننەم . . من ، هەرچەند ئێوەش لەگەڵم خراپ بون و بون بە مایەی ڕۆیشتنم ، هەر دڵسۆزەکەی جارانتانم و سەری خۆم ئەکەم بە قەڵغان بۆ تیری قەزا و قەدەر نەیەت بتانپێکێ .

سەفەرمان چونکە ژێی هات و نەهاتە
دوعامان بۆ بکەن ، ئێوە و خوداتان ! (٤)

منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم
دەترسم من بڕۆم ، بشکێ سوپاتان (٥)

شکاری وەحشییان بەس دەستەمۆ کەن
ئەوەك بەر بێ شکاری خانەزاتان (٦)

---

(٤) هات و نەهات : هاتنەوە و نەهاتنەوە . بەخت بۆ هاتن و بەخت بۆ نەهاتن . مان و مردن .

واتە : ئەم سەفەرەی ئەیکەین سەفەری ژێی ژیان و مەرگە ، لەوانەیە جارێکی‌تر چاومان بە یەك بکەوێتەوە و لەوانەشە نە . کەس نازانێ سەرەنجام چۆن ئەبێ . کەواتە ئێوە و خواتان لە دوعای خێرتان بێبەشمان مەکەن .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە نوسخەی (چر)دا بەرودوان .

خوداتان (عز) : خواتان . دیارە ئەبێ تۆزێ (واو)ەکەی بگرین .

(٥) واتە : ئەگەر خەم خواردن بۆ ئێوە دابنێین بە لەشکرێك ، ئەوا سەرلەشکری ئەو لەشکرە منم و من لە هەموکەس خەمی ئێوەم زیاتر لەدڵدایە . جا بۆیە ئەترسم ئەگەر من بڕۆم لەشکری خەم بۆ خواردنتان پەکی بکەوێ و بێ سەرلەشکر بمێنێتەوە و بیەزێ و کەس نەبێ خەمتان بخوا .. مەبەستی ئەوەیە بڵێ کەس نازانێ وەك من خەم بخوا و ئاگاداریی خەم بکا و کاروباری بەڕێوەبەرێ .

دەترسم (ك) و (مز) : ئەترسم .

(٦) شکار : ڕاو . ڕاوکراو . لێرەدا مەبەست مەعنای دوهەمە . دەستەمۆ : ماڵی و بەئاسانی گیراو . خانەزا : لە ماڵا لەدایکبو ، ماڵی .

واتە : بەس نێچیری کێوی (مەبەستی لە بێگانەیە) دەستەمۆ بکەن و بلاوێننەوە ، ئەگینا نێچیری پەروەردەکراوی بەردەرگا و بەوەفای خۆتان لەداخانا سەری خۆی هەڵئەگرێ و ئەڕوا و خاك و بومتان بەجێدێڵێ .

ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەی (چر)دا هەیە . سەیر ئەوەیە نوسخەکەی (تو) کە ئەم پارچە شیعرەی بە ١٢ بەیت تیا هەیە و داویەتە بە (کوردی) ، ئەم بەیتەی تیا نییە .

ئەوەند ئەرجۆ دەکا « نالی » کە جار جار
بکەن یادی موحیببی بێ زیاتان (٧)

— ٣ —

لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان (١)

---

(٧) ئەرجۆ : تکا . لە ( ارجو — ئەرجـو )ی فیعلی موضاریع وەرگیراوە .
موحیبب : خۆشەویست .

واتە : نالی تەنها یەك تکای لێتان هەیە ، ئەویش ئەوەیە جاروبار یادێکی ئەم خۆشەویستە ڕاستگۆ بێدرۆ و زیایەتان بکەنەوە .

ئەوەند (ك) و (عز) : ئەوەن . دەکا (چن) : ئەکا . (اح) و (خا) : دەکەم .

نەزانینی هۆی دانانی ئەم پارچە شیعرە ، لە گەڵ پارچە شیعرێکی تری نالی زیاتر مایەی داخە . لەم پارچە شیعرەوە بەئاشکرا دیارە کە نالی لای کەسانێکی بەدەسەڵاتی‌وا بووە وەك دۆست و برادەر لەگەڵی جوڵاونەتەوە و ، پاشان بۆ کەسێکی بێگانە دڵیان پەشاندووە و ناچاری ڕۆیشتنیان کردووە ، بەڵام ئەو هەر خۆشی ویستوون و دڵی پڕ بووە لە سۆز بۆیان . بریا ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆمان دەرکەوتایە ڕوداوەکە چۆن بووە .

— ٣ —

(١) دوگمە : قۆپچە . نوێژی شێوان : نوێژی ئێوارە . بەیانی‌دا : دەرکەوت . سفیدە : سپیدە ، ڕۆناکی . باغی سێوان : مەبەست سنگی یارە کە مەمکی وەك سێوی پێوەیە .

واتە : دوێنێ ئێوارە لەکاتی نوێژی شێواندا لەودیو دوگمەی سوخمەی وەك خۆر زەرد و سووری یارەوە ، سنگی وەك سپیدەی بەیانی سپی ، باخی سێوی مەمکەکانی دەرکەوت .

ئەشکونجێ مەعنای نیوە شیعری دووەم بەمجۆرە بێ : گوڵی سپی درەختی سێو ، بەهێی بەخشی . ئەوەش بزانین کە مەمکی کچان ، وەك بە سێو ئەشوبهێنرێ ، بە بەهێیش ئەشوبهێنرێ .

هەرچەند مەبەست لەم (بەیانی دا)یە ئیشارەت کردن بە (بەرەبەیان) و

له خەوفی طەلعەتی ڕۆژ هەروەکو شێت
بە ڕۆژمەردیی هەڵات و کەوتە کێوان (٢)

دو چاوی من کەوا کەیلی سوروشکن ،
دەپێون ئاوی بەحری خوێ بە پێوان (٣)

---

(نوێژی بەیانی) نییــە ، بەڵام کۆکردنەوەی لەگــەڵ (نوێژی شێوان)دا طیباقێکی جــوانی بەدیمەن ئاوێــە . هەروەها (دەرکــەوتنی سپیدەی بەیانی)ش لەکاتی (نوێژی شێوان)دا کە شەوی تاریکی کردووە بە ڕۆژی ڕۆشن ، ئەگەر لەگەڵ (باغی سێوان)ەکەیدا ڕانەگرین ، زیادەڕەویەکی باڵای تیایە . لە خواستنی (سفیدە)شدا کــە هیی بەیانیانە ، بۆ سنگی یار و ، لــە بەکارهێنانی (باغی ســێوان)دا لەجیاتیی ســنگ و مەمك ئیستیعــارەی موصــەڕڕەحــە هەیە . لــە کۆکردنــەوەی (شــێوان) و (سێوان)یشدا جیناسی لاحیق هەیە .

سفیدە (گم) : سپیدە .

(٢) طەلعەت : ڕوخسار . هەڵاتن . ڕۆژ : خۆر . ڕۆژمەردیی : خەجاڵەتی و شەرمەزاریی . کاڵی و زەردیی . هەڵات : ڕای‌کرد . هەڵهات . کێوان : شاخەکان ، یاخود کەیوان واتە ئاسمان .

واتە : خۆر ، لە ترسی ڕۆناکیی ڕوی یار ، لە شەرمەزاریدا ، وەکو شێت هــەڵات و ڕای‌کرد و دایە شــاخەکان . مەبەستی لە زەردەی خۆراوایــە کــە خۆرێــکی زەردی کاڵ تەنها بــە لوتــکەی چیــاکانەوە ئەمێنێتەوە .

یاخود : خۆر ، لە ترسی هەڵهاتن و دەرکەوتنی ڕوی یار ، ڕەنگی لە ڕۆ بڕا ، زەرد هەڵگەڕا ، بە زەردیی لە ئاسۆ هەڵهات و لیزگی دای لە لوتکەی چیاکان و پاشان خۆرشی بۆ ناوەڕاستی ئاسمان بەرز بووەوە . مەبەستی لە کاتی هەڵهاتنی خۆرە لە سبەیناندا .

لە وشەی (طەڵعەتی) و (ڕۆژمەردیی) و (هەڵات) و (کەوتە کێوان)دا ، وەکو ڕۆنمان کردەوە ، لەطافەت هەیە ، چونکە یەکێ دوو مەعنا ئەگەیەنن .

ڕۆژمەردیی (چن) : ڕوی زەردی .

(٣) کەیل : پڕ ، لێوان‌لێو . سوروشك : فرمێــسك . دەپێون : وەك پێوانە کردن هەڵئەگۆزن . بە پێوان : بە پێوانە کردن .

مەکەن لۆمەی پەشێوی دڵ کە ئەمشەو
پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان (٤)

شەرابی لەعلی ڕوممانی لە « نالی »
حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان (٥)

---

واتە : چاوەکانم کـە پڕن لە فرمێـسك و هەمیشـــە فرمێـسکیان لێ ئەڕژێ ، فرمێـسکیان بەڕادەیەك زۆرە و لێ نابڕێ ، ئەڵێی ئاوی بەحری خوێ هەڵئەگوزن و دایئەڕێژن . .

لەنێوان (چاو) و (ئاو)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (چاو)دا کە مەعنای سـەرچاوەش ئەبەخشێ ، لەگەڵ (ئاو) و (بەحر) تەناسوب هەیە .

کەیلی (چر) و (مم) و (کم) و (گم) و (اح) و (من) و (خا) : سـەبلی . دەبێون (مب) و (خا) : دەبێوێ . خوێ ( « پەراوێزی » چر ) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (من) و (خب) : خوێن . بەپێی ئەم نوسـخانە ئەبێ (سوروشك)یش کە واتە فرمێـسك ، هەر بە خوێن مەعنای لێ بدرێتەوە .

(٤) واتە : گلەیێ لە دڵەکەم مەکەن کە ئەمشـەو لەسـەر خۆی نییە . هۆی ئەم لەسـەرخۆ نەبونەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئاڵۆزیی پەرچەمی یاران کە کاری لەمیش کردووە .

لەنێوان (پەشێویی) و (پەشێواوە) و (پەشێوان)دا ، بێجگە لەوە کە لەگەڵ هاوڕیشـــەیی وشـەکانیشـــدا هەریەکی بە مەعنایـــەکی تایبەتی بەکارهێنراون ، جۆرە جیناسێکی لاحیقیش هەیە .

مەکەن (چر) و (مم) و (کـم) و (گم) و (مـز) و (اح) و (مـن) و (خـا) : مەکە .

(٥) ڕوممانێ : وەك هەنار .

واتە : چەشـــنی شەرابی ڕەنگ سوری کـاڵی وەك ڕەنگی لەعل و هەنارم لێ حەرامە ، ئەگەر ماچی لێوی یار نەبێ بە مەزەی .

لەنێـوان (لەعل) و (ڕوممـانێ) و (لێو)دا کە ڕەنـگیان لەیەکئەچێ تەناسوب هەیە . تەناسوبێکی جوانیش لەنێوان (شەراب) و (حەرام)دا هەیە چونـکە بەپێی ڕێ و شوێنی ئایـین شەراب حەرامـە . لەنێوان (شەراب) و (مەزە)ش‌دا تەناسـوبێکی‌تر هەیە . لە تێکـڕای وشـەکانی دوایی بەیتەکانیشـدا جیناسی لاحیق هەیە .

— ٤ —

ئەهلی تەعدادی مەحاسین تۆسیان
خاڵ یەك و ، زوڵفی دووان ، هەر دۆ سیان (١)

کوفری زوڵفە تار و ، ماری ئەرقەمن
سفری خاڵە ، حەڵقەیی هیندۆسیان (٢)

---

— ٤ —

(١) تەعداد : ژمارەکردن . مەحاسین : چاکە و جوانی . سییان : سێن . سیاهن ، ڕەشـن .

واتە : ئەوانەی بەدوای جوانیدا ئەگەڕێن و لەیژمێرن ، تۆ سیویانە یار خاڵێکی پێوەیە و دۆ زوڵفی هەیە کە بە هەردوکیان (واتە بە خاڵ و زوڵف) ئەبن بە سێ ، یان خاڵ و زوڵفی ، یان تەنها هەردۆ زوڵفەکەی ، ڕەشن .

لە کۆکردنەوەی (یەك) و (دۆ) و (سییان)دا بەپێی ئەوە کە ڕەقەمی ژمارەن تەناسوب و ، بەپێی ئەوە کە جیان لە یەك ، طیباق هەیە . هەروەها لە کۆکردنەوەی (تۆسیان) و (دۆسیان)دا جیناسی لاحیق و ، لە (سییان) خۆیشیدا لەطافەت هەیە .

تەعدادی مەحاسین (« بەراوێزی » چر و چن) و (کم) و (گم) و (ك) و (ت) و (مز) و (صب) و (اح) و (من) و (خا) : تەعداد و موحاسیب . خاڵ یەك و (« بەراوێزی» چرا و (مم) و (صب) و (خا) : خاڵی یەك . (گم) : خاڵ یەك .

(٢) تار : تاریك . تار و مار : پرژ و بڵاو و ئاوارەکراو . ئەرقەم : مارێکی پیسی کوشندەیە . ناوی ئەو ئەصحابەیەشە کە پێغەمبەر (د.خ) و هەندێ لە یارانی لە سەرەتای پەیدابونی ئیسلامدا شەوان بەنهێنی لە ماڵی ئەودا کۆلەبونەوە . سفری خاڵ : خاڵی وەك نوختەی سفر . سفر ، خۆیشی واتە بۆش و پوچ . حەڵقەیی هیندۆسیان : ئەڵقەی ڕەش وەك هیندۆکێ کە پێستیان ڕەشتاڵەیە . تۆلەوانە .

نالی لە شیعری پێشودا جوانییەکانی یاری ژمارد . لەم شیعرەشدا دێتە سەر باس و لێدوانیان ، ئەڵێ : هەرچی کە زوڵفەکانیەتی ، بەهۆی کوفریانەوە (کە ڕەشییەکەیانە و ڕەشییش نیشانەی کوفرە) ، تاریکن و

زولفی جەزڕازی صەفاصەف خستە پێش
یەعنی زەنگی لەشکری قیرۆسیان (٣)

ئەم غەزالانە کە نەقشی دیدەمن
تەن سپین و چاو و خاڵ و مۆ سیان (٤)

---

بوون بە ماری ئەرقەم . هەرچی خاڵی وەك سفریشیەتی بەهۆی بۆشی و پۆچییەوە ، ئەڵقەی هیندۆسییەکانە کە ئەیکەنە لوتیان . بەپێی ئەم مەعنای دوایییە ئەبێ خاڵەکە بەسەر لێوی یارەوە بێ،تا وەك لەبارەی شێوەوە شوبهاندی بە حەڵقەی هیندۆسییەکان کە هەم ڕەشە و هەم خڕە ، لەبارەی جێگاشەوە بشێ بە لوتەوانە دابنرێ .

نالی لە نیوە شیعری پێشودا ویستویە ئیشارەت بە کۆبونەوەی موسوڵمانانی سەرەتای پەیدابونی ئیسلام بکا لە ماڵی (ابن الارقم) و ئەو مەعنایەش بکەیەنێ کەوا : خەتای کوفری زولفە پەرەوازەی ماڵی ئەرقەم بوون . هەرچەند ئەم مەعنایە شتێکی تەواو نادا بەدەستەوە و نازانرێ مەبەست کێیە ، بەڵام نالی ، لە هیچە ، ئەوەشی هەر مەبەست بووە . ئەمە یەکێکە لە خاسییەتەکانی نالی . لە وشەی (هیندۆسیبان)یشدا ویستویە ئەوە بکەیەنێ کە زولفەکانی یار بە خاڵی وەك ئەڵقەی هیندۆیەوە لەکەنە سێ .

(٣) جەزڕاز : ڕاکێشەر . سوپای بێشومار . صەفاصەف : ڕیز بە ڕیز و چین چین . زەنگی : قولەڕەش کە جاران کۆیلە بوون و کڕراون و فرۆشراون . قیرۆسیا : کینایەیە لەوەی بە هیچ دابنرێ و گوێی نەدرێتێ ئەگەر لەناوبچێ . یاخود ( قیر و سیا )یە واتە قیر و ڕەش .

واتە : یار ، زولفی دڵداران کەمەندکێشکەر و ، وەك لەشکری بێ شومار تاڵ ـ زۆری ، ڕیز بە ڕیز و چین چین هێنا پێشەوە و دایهێنا و شانەی کرد . مەبەستی یار لەم زولف خستنە پێش ڕووەی ، ئەوەبە بڵێ زولفەکانم وەك سوپای زەنگی بێبایەخن و ئەگەر شتێکیشیان لێ بێ مەبەست نییە ، یاخود وەك سوپای زەنگی قیرین و ڕەشن .

زەنگی (چن) : هیندێ . (کم) و (گم) و (من) و (خب) : ڕەنگی ، واتە : وەك .

لە وشەی (قیر و سیا)دا ، وەك وتمان ، لەطافەت هەیە .

(٤) غەزال : ئاسك . تەن : لەش . سیان : سیاهن ، ڕەشن .

حاكمانی مەحكەمە نامە سیان
قەت نەماوە غیرەت و نامۆسیان (٥)

نەرم و زەرقیی خەرقەیی سالۆسیان
شاهیدی زۆرە زوبانی لۆسیان (٦)

---

واتە : ئەو یارە وەك ئاسك نازدار و جوانانە كە وێنەیان بووە بە نەخش و لەناو چاوما كێشراوە ، لەشیان سپی و ، چاو و خاڵ و مۆیان ڕەشە .

لەنێوان (سپی) و (سیان)دا طیباقی لەفظی هەیە .

دیدەمن («پەراوێزی» جر و چن و خا) : دیدەئن . چاو و خاڵ و (عم) و (كم) و (گم) و (من) : دیدە كاڵ و .

(٥) نامە سیان : نامەی كرداریان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەشە ، تاوانبارن .

واتە : داوەرانی دادگا نامەی كرداریان ڕەشە و ، غیرەت و نامۆسیان نەماوە ، لەجیاتیی گوناهبار بێگوناه تاوانبار ئەكەن و ، بەپێچەوانەشەوە .

بە نیشانەی شیعرەكانی پاشەوەدا مەبەستی نالی لە (حاكمانی مەحكەمە) ئەوانەیە خۆیان بە ناحەق كردووە بە پاسەوانی ئایین .

دوریش نییە (مەحكەمە نامەسیان) جەمعی (مەحكەمە نامەسی) بێ و وشەكە توركی بێ و ، بەوپێیە شیعرەكە پلار بێ لە حوكمڕانانی عوسمانی .
لەنێوان (نامە سیان) و (نامۆسیان)دا جۆرە جیناسێكی تەركیب هەیە .

مەحكەمە نامە سیان (عم) و (كم) و (گم) و (من) و (عب) و (اح) و («پەراوێزی» خا) : مەحكەمەی نامە سیاە . (ك) و (مز) : مەحكەمە نامە سیاە . (ت) و (خب) : مەحكەمەی نامەی سیاە .

(٦) زەرق : ئارایش و ڕەنگا و ڕەنگی . سالۆس : فڕ و فێڵ . زۆر: ساختە و دەست هەڵبەست .

واتە : نەرمی و جوانیی جبەی فش و فۆڵی پڕ لە فڕ و فێڵیان كە بۆ نیشانەی لە خوا ترسانی خۆیان لەبەریان كردووە و ، زمانی لۆسی خەڵكی ساویلكە هەڵخەڵەتێنیان ، هەمو شایەتی درۆن و نابن بە بەڵگەی ڕاستگۆییان .

لەم بەیتە و بەیتی پێشودا ، لەنێوان (حاكمان) و (مەحكەمە) و (نامە

چاوەکەم ! مەنوازە ڕەنگی ظاهیری
خۆ دەزانی ( ڕۆ سپی ) چەند ڕۆ سیان (٧)

ناوی مەخمووران ئەبەی « نالی » ! لەنێو
حەلقەیی واعیظ ، لەوێن جاسووسیان ! (٨)

ـ ٥ ـ

ڕەقیب و موددەعی فیتنە و عیلاقەی چاوی جادووتن
لە گۆشەی گۆشەوارەت نائیبی هارووت و ماررووتن (١)

---

سیا) و (خەرقە) و (شاهیدی ڕۆژ)دا تەناسوب هەیە .
نەرم و (عم) : بەزم و . خەرقەیی (عم) و (ك) و (ت) و (اح) و (خب) : فیرقەیی . ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەی (عم)دا بەیتی پێنجەمە ، بەڵام ئەوە هەڵەیە .

(٧) ڕۆ سپی : ئافرەتی داوێن پیس . ڕۆ سیا : ڕۆ ڕەش .
واتە : گیانەکەم ! نەکەی هەرگیز بە ڕواڵەت و دیمەن هەڵخەڵەتێی . خۆت ئەزانی ڕۆسپییەکان کە بەدیمەن جوان و ڕازاوەن ، لای خوا چەند گوناهبار و ڕووڕەشن .
لەنێوان (ڕۆ سپی) و (ڕۆ سیا)دا طیباق و ، لە نیوە بەیتی دووەمدا بەرابەر بە نیوە بەیتی یەکەم حوسنی تەعلیل هەیە .

(٨) مەخموور : سەرخۆش و بەدمەست . لەنێو : لەناو .
واتە : نالی ! نەکەی لەناو کۆڕی ئەوانەدا کە کۆبوونەتەوە لە واعیظ ، گوێیان بۆ پەند و ئامۆژگارییەکانی شل کردووە ، ناوی سەرخۆشان بە خراپە بێنی .. سەرخۆشان لەوێش خەفیەیان هەیە ، خۆی بە گوێگری واعیظ داوەتە قەڵەم ، قسەکەیان پێ ئەگەیەنێتەوە و ئەنجامەکەی بۆ خۆت باش نابێ .. لەوێش ئەچیتە ژێری خەرقە پۆشانی زمان لووسی تەنها بەدیمەن پیاو چاکەوە .. کۆڕی مەیخواران لەناو ئەنجومەنی واعیظیشدا کەسیوایان هەیە لەبنەوە لەگەڵیان بێ .

ـ ٥ ـ

(١) ڕەقیب : بەدکاری نێوان یاران و دڵداران . موددەعی : ئەوەی ئیدیعای شتێ بکا . مەبەست لێرەدا کەسێکە بە درۆ خۆی بە خۆشەویستی جوانێك

نەباتاتی زەوی وەك مونزەوی هاتونەدەر ، یەعنی
هەمو سەرخۆش و مەست و زۆرپەرست و عاشقی ڕۆتن (٢)

---

دابنێ . فیتنە : مایەی نەگبەتی و خراپە . عیلاقە : لەوەی بە شتێکدا هەلواسرابێ . جادو : سیحرباز . گۆشە : سوچ . گۆشەوارە : گوارە . ڕەقیب : جێنشین . هارووت و مارووت : دوو فریشتە بوون ، ناو و باسیان لە قورئانیشدا هاتووە ، خەلکیان فێری سیحر کردووە ، پاشان خوا غەزەبی لێگرتون لە بیرێکا لە (بابل) سەرەوخوار هەلیواسیون و تا ڕۆژی قیامەت هەروا ئەمێننەوە و هەمیشە تینویانە ، بەلام هەرچی ئەکەن دەمیان ناگاتە ئاوی بنی بیرەکە ...

واتە : بەدکار و خۆهەلپەسێن مایەی خراپە و بەدین لەنێوان مـن و تۆدا و بە چاوی ئەفسوناویتدا هەلواسراون ناهێلن من ببینی و ، لـە سوچی گوارەی گوێتدا شۆڕکراونەتەوە ، جێگای هارووت و مارووتیان گرتووەتەوە ، ناهێلن گوێت لە من بێ .

وەك دیمان نالی ئەم شیعرەی لە ڕازی هارووت و مارووت وەرگرتووە و تەنانەت وشەی (فیتنە)شی لە ئایەتەکە ئیقتیباس کردووە. نالی ویستویە بلێ وەك چۆن هارووت و مارووت لەنـاو چالەکەدا سەر بەرەوخوار هەلواسراون ، ڕەقیب و مودەعیش هەروا لە بەرچاوی تودا هەلواسراون و ، چۆن لەوان سوچێکی چالەکەیان گرتووە ، ئەمانیش سوچی گوارەی گوێتیان گرتووە و ، وەك چۆن ئەوان مایەی فیتنە و خراپە بوون بۆ خەلك ، ئەمانیش بۆ من و تۆ بوون بە مایەی فیتنە و خراپە و ناهێلن بتبینم و گوێم لێت بێ . دیارە بۆ تەواوکردنی تەشبیهەکە کەلکی لەوەش وەرگرتووە کە چاو و گوێ بەدیمەن لە چال ئەچن و چاو لە شەفافییەتەکەیدا لە ئاو لەچێ . هەروا ئەوەشی ڕەچاو کردووە کـە وەك چۆن هارووت و مارووت هەرگیز دەمیان ناگاتە ئاوەکـە ، ئەمانیش ناتوانن بگەنە ناخی چاو و گوێی یار و ، خۆیان بخەنە دلیەوە .

(٢) نەباتات : گژوگیا . مونزەوی : گۆشەگیر و کەنارەنشین . ڕۆژ پەرست : گولە بە ڕۆژە . ڕۆت : ڕۆمەلت .

واتە : جاران کە تۆ دیار نەبـوی ، گول و شیناوی لەژێر زەویدا گۆشەگیر بوون ، بەلام کە تۆ هەلهاتی ، هەمو لە عەشقی ڕۆی تۆدا مەست و سەرخۆش بوون و ، جێی خۆیان بەجێهێشت و هاتنەدەر و ، ئێستا هەمو وەك گولـە ڕۆژگار پەرست ڕۆیان لە تۆیە . نالی لەم بەیتەدا ئیشارەتی بە پەیوەندی دەرهاتنی گول و گژوگیا کردووە بە خۆرەوە .

ڕۆژپەرست و (چر) و (ت) و (عب) : ڕۆژپەرستی .

وەرە نێو بەزمی گولزاران و گوڵ زاران ، تەماشاکە :
سەراسەر پێکەنینی گوڵ ، لەبالەب غونچە پشکوتن (٣)

چ قەصر و دائیرە و تاقێ ، تیا تۆ تاقی ئافاقی ،
نەی و موطرب ، مەی و ساقێ ، گوڵ و بولبول هەمۆ جۆتن (٤)

---

(٣) گولزاران : باخچەکان . گوڵزاران : ئەوانەی دەمیان وەك گوڵ جوان و بۆنخۆش و نازدارە . لەبالەب : لێوان لێو . لێو بە لێو . غونچە پشکوت: خونچە پشکوتۆ . دەمکراوە .

واتە : وەرە ناو بەزم و ئاهەنگی باخچەکان و سەیری جوانان و نازداران بکە ، ببینە چۆن لە هەمۆ لایەك گەشەی گوڵ و پشکوتنی خونچەیە ، یان چۆن لە هەموولایەك کچانی وەك گوڵ پێئەکەنن و دەمی وەك خونچەیان ئەکەنەوە قسەی خۆش ئەکەن .

لە کۆکردنەوەی (گولزاران) و (گوڵزاران)دا جگە لە لەطافەت ، جیناسی تەواو و ، لە کۆکردنەوەی (سەر) و (لەب) و ، (گوڵ) و (خونچە)شدا تەناسوب هەیە .

نێو بەزمی (چن) و (کم) و (من) : ناو بەزمی . (عم) و (ك) و (مز) و («پەراوێزی» خا) : نێو ئەصری . (خب) : سەر قەصری .

(٤) چ : هەر . قەصر : کۆشك و تەلار . دائیرە : باخ و باخچەی دەوری ماڵ . تیا : تێدا . تاق (ی یەکەم) : تاقی سەرپەنجەرە . تاق (ی دۆهەم): تەنها . ئافاق : دنیا .

واتە : هەر کۆشك و تەلار و باخ و باخچە و پەنجەرە و هیلالییەك تۆ تاقانە بێ تیایا ، لە خۆشیی تۆی تۆوە ئەبێ بە بەزم و مەیدانی خۆش بەسەربردن : شمشاڵ و گۆرانیبێژ و ، مەی و مەیگێڕ و ، گوڵ و بولبولی تیا کۆئەبێتەوە .

لەنێوان هەردۆ (تاق)دا جیناس و ، لەنێوان (قەصر) و (دائیرە) و (تاق)دا تەناسوب هەیە . هەروا لەنێوان (نەی) و (موطریب) و ، (مەی) و (ساقی) و ، (گوڵ) و (بولبول)یشدا .

ع (چن) : لە . قەصر و (عم) و (کم) : قوطر و . بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبۆ (قوطری) بووایە ، چونکە (قوطری دائیرە) زاراوەیەکی زانستی ئەندازەیە ، هێڵێکی ڕاستە لە مەرکەزی دائیرەوە ئەڕوا و موحیطی دائیرەکە ئەکا بە دۆ بەشی چونیەکەوە . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ مەعنای

لە شەوقی ڕۆیی شەمع و ، زولفی دوود و ، طوڕڕەیی مەجمەر
سوپەند و ، عوود و ، پەروانە ، بخوور و ، غالیە سوتن (٥)

---

(تاق)ی یەکەمیش بە نیوە دائیرە لێك‌بدەینەوە و لەوەوە بچین بۆ تاقی هیلالی . تیا : تەنها نوسخەی (چن) . نوسخەکانی‌تر هەمو (تێدا) .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەی (مب)دا بەم‌جۆرەیە :

**بەلی لەم جێیەدا میثلت نییە ، ( باللە ) تۆ تاقی**

ئێمە لامان‌وایە ئەمە هی نالی نییە و ، لەئەنجامی نەتوانینی خوێندنەوە و تێکەیشتنی نیوە شیعرەکەوە ، بە ناوی ئەوەوە دروست‌کراوە .

نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و نیوەی دووەمی بەیتی پێشوو ، لە نوسخەی (کم) و (من)دا لەجێی یەکتردان . بەوجۆرەش مەعناکە هەر دێ .

(٥) شەمع : مۆم . دوود : دوکەڵ . طوڕڕە : ناوچاوان . مەجمەر : پشکۆدان . سوپەند : گیایەکی کێوییە ، تۆوێکی وردی ڕەشی هەیە ئەیکەنە ناو ئاگرەوە ئەیسوتێنن ، بۆنێکی خۆشی هەیە . ئەڵێن بۆ چاوەزار باشە ! عود : دارێکی بۆن‌خۆشە . غالیە : دەرمانێکی زۆر بۆن‌خۆشە لە چەند ماددەی جیاجیا دروست ئەکرا و بۆ بەهێزکردنی دڵ و بیر بەکارلەهێنرا . سوتن : سوتان .

واتە : لەتاو ڕوناکیی ڕوی وەك مۆم ڕۆشن و ، زولفی وەك دوکەڵ درێژ و ڕەش و ، ناوچاوانی وەك پشکۆدان درەخشانی یار ، سوپەند و عود و پەروانە و بخور و غالیە هەمو سوتان . سوپەند لەتاو خاڵەکانی ڕوی و ، عود لەتاو زولفی ڕەشی بۆن‌خۆشی لەسەر ڕومەتی و ، پەروانە لە عەشقی شەمعی ڕوی و ، بخوری دوکەڵ بارێك و بۆن‌خۆش لەتاو تاڵی بارێك و بۆن‌خۆشی زولفی و ، غالیەش بۆ بەهێزکردنی دڵ و بیری ئەوانەی بە دیتنی یار گرفتار بوبون و بیریان پەرت و دڵیان ڕۆیشتبو . .

ڕۆیی (چن) و (کد) : ڕوت . ئەبێ ڕۆلی بێ ، واتە : ڕۆلی وەك شەمع و .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەی (مب)دا بەم‌جۆرەیە :

**بە میشك و زەعفەران پڕ بوون قوتوی عەطر و لەگەڵ مەجمەر**

حەبیبان هەمدەمی ئاهۆ دەنۆشن ڕاحی ڕەیحانی
ڕەقیبان هەمدەمی ئاه و دەکێشن دووکەڵی تووتن (٦)

گەلێ شێر و پڵەنگ و باز و شاهێنی شەهەنشاهی
وەکوو « نالی » بە دڵ نێچیری ڕاوی چاوی جادووتن (٧)

---

(٦) ئاهۆ : ئاسک . ڕاح : مەی . ڕەیحانی : بۆنخۆش وەک ڕێحان . ئـاه : ئـاخ .

واتە : یاران لەگـەڵ ئـازداران شـەرابی بۆنخـۆش ئەنۆشـن و ، بەدکارانیش هەناسـەی خەفەتبارانە هەڵئەکێشـن و لە خەمگینیـدا دووکەڵی تووتن بە با ئەدەن .

بەرابەر بە یەک دانانی (دەنۆشن) و (دەکێشن) زۆر جوانە ، چونکـە (نۆشکـردن) مەعنای ئاسانی و حەسانـەوە و ، (کێشان) مەعنای بار هەڵگرتن و ماندووبون ئەگەیەنێ .

لە دووبارەکردنەوەی (هەمدەم)دا جیناس هەیە . بەکارهێنانی جاری دووەمی (هەمدەم) زۆر لەبارە چونکە (ئاه) لە دەم دەرئەچـێ و لەگـەڵ دەمدایە . لە کۆکردنەوەی (ئاهۆ) و (ئاه)یشدا جیناسی تەرکیب هەیە .

هەمدەم (مم) و (گم) و (مز) و (خب) : هەمزەم . هەمزەم : هاوزەوک ، هـاوگەلە .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە نوسخەی (چن)دا بەرودوان .

(٧) واتە : هەر تەنها من نیم گیرۆدەی تـۆ بوم و بە تیری چاوی سیحربازت ڕاوت کردوم . گەلێ کەسی ئازا و ڕاوچیی وەک شێر و پڵەنگ و باز و شاهێنی شاهانەش دیل و نێچیری تۆن ..

لە کۆکردنەوەی (شێر) و (پڵەنگ) و ،(باز) و (شاهێن)دا تەناسوب و، لە یەکخستنی (چاو) و (ڕاو)دا جیناسی لاحیق هەیە .

باز و شاهێنی شەهەنشاهی (چر) : فەهد و بازی شاهێنی شـاهی . (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : فەهد و باز و شاهێنی شاهی . نێچیری (چن) و (مم) و (ت) و (مز) : نەخچیری .

— ٦ —

ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بۆمن
موشکیل ، بکەنە ساعیدی شاهێکی وەکو من (١)

تا نەشئە ئەچێژن لە لەبی کەوثەری ساقی ،
بێچارە چوزانن کە هەمو مەستی زەقۆمن !؟ (٢)

ڕۆناکیی ڕۆ شەوقە لە نێو ظولمەتی مودا
وەجهی ئەمەتە دڵ هەمو پەروانەیی مۆمن (٣)

---

— ٦ —

(١) سەرسەری باز : ئەوەی خەریکی شتی هیچ و پوچ بێ . بازی بێ سەر و پێ و بێکارە . هەمسەر : هاوسەر . بۆم : بایەقوش . موشکیل : زەحمەت . ساعید : باسک .

واتە : ئەم بازە بێکارانە کە هەر بە ناو بازن و لەڕاستیدا هاوسەری بایەقوشن ئەوەندە نەگبەتن ، زۆر زەحمەتە بگەنەوە بە باسکی شاهێکی وەکو مندا و ، دەستیان بگاتە دەستی من و ببن بە هاوشان و هاوڕێم .

نالی ئەم پارچە شیعرەی بە زوبانی یارەوە وتووە . یاخود لە شێوەی قسەکردنا بە زوبانی ئەوەوە ، بە شان و باڵی خۆیا هەڵئەدا .

(٢) لەب : لێو . کەوثەر : حەوزی کەوثەر لە بەهەشتدا . زەقۆم : خۆراکی دۆزەخییەکان .

واتە : ئەم دڵدارە سادە لەوحانە تا تامی شەرابی لێوی یار نەکەن کە لەلێی ئاوی حەوزی کەوثەرە ئاوگێـڕ لەیکێڕێ ، ئەوەندە بەدبەخت و چارەڕەشن تێنـاگەن تائێستاش سەرخۆشی خواردنەوەی زەقۆمی ئەهلی دۆزەخن و خۆشەویستیی ڕاستەقینەیان نەهاتووەڵەڕێ .

(٣) وەجه : هۆ .

واتە : ڕۆناکیی ڕۆم لەناو تاریکایی زوڵفمدا شەوق ئەداتەوە . بۆیە دڵان هەمو بوون بە پەروانە و بەدەوری مۆمدا ئەسوڕێنەوە . مەبەستی ئەوەیە بڵێ وەك چۆن پەروانە بەدەوری مۆمدا ئەسـوڕێتەوە ، دڵانی دڵدارانیش بەدەوری زوڵفی ڕەشی منـدا ئەسوڕێنەوە کە ڕۆی وەك مۆمیان لەناودا شارراوەتەوە .

زولفم بە نەسەب سیلسیلەیی ڕفعەت و شانە
من دەیخەمە بەر پێ کە حەبەش‌زادەیی ڕۆمن (٤)

من سەروی ڕەوالی چەمەنی عالەمی بالآم
« نالی » بە طوفەیلی بووەتە سایە لە دوٚ من (٥)

---

لە کوٚکردنەوەی هەردوٚ وشەی (موٚ)دا جیناس و ، لەنێوان (ڕوٚناکی) و (ظولمەت)دا طیباق و ، لەنێوان (ڕوٚ) و (وەجھ)دا جوٚرە لەرادونێك هەیە . هەروەها لەگەل ئەوەشدا کە مەبەست لە (موٚمن) ، (موٚی منن)ە ، بەلام لێکرا وشەکە بەپێی نوٚسینی جاران ( مومن = موٚمن ) لەگەل (پەروانە)دا تەناسوبی هەیە .

نالی لەم بەیتەیدا ، بە زمانی یارەوە ، ڕەشیی زولفی خوٚی شوبھاندووە بە شەو و ، دایناوە کەوا پەروانەش ، کە دلی دلدارانە ، لەوناوەدا بە دەوری ڕوٚمەتی یاردا ئەسوٚڕێتەوە .

لەنێو (کم) و (من) : لەناو .

(٤) ڕیفعەت : بەرزی . شان : شەئن ، پایە . حەبەش‌زادە : بەچکەی ڕەشی حەبەشەیی ، کوٚیلە .

واتە : زولفم لەبارەی بن و بنەچەوە ، زنجیرەی پشتاوپشتی بەرزی و شان و شکوٚیە ، بەلام چونکە کوٚیلە و زەڕخرێدە و لە وەچەی حەبەشەیی و ڕوٚمییە ، من قەدری ناگرم و ئەیخەمە بەرپێم . ئەمە مەعنا دیمەنییەکەی بەیتەکە . مەعنا ڕاستەقینەکەشی ئەوەیە کەوا زولفم هەرچەند لەبارەی بن و بنەچەوە ئەگەڕێتەوە سەر زنجیرەی بەرزی سەر و شانم ، بەلام چونکە ڕەشە و کوٚیلەی ڕوٚمە ، لێی ئەگەڕێم درێژ بێ تا وای لێ دێ بکاتە بەر پێم .

لەنێوان (نەسەب) و (سیلسیلە) و ، (شان) و (بەرپێ)دا تەناسوب هەیە . هەروەها لەنێوان (حەبەش‌زادە) و (ڕوٚم)ی (ڕوٚمن)یشدا لەلایەکەوە تەناسوب هەیە چونکە دوٚ ولآت ئەگەیەنن ناویان زوٚر جار پێکەوە دێ . لە لایەکی‌کەشەوە طیباق هەیە چونکە ( حەبەشەیی) ڕەش و (ڕوٚمی) سپین .

(٥) ڕەوان : ڕاست . عالەمی بالآ : جیھانی گیان کە دوٚرە لە هەموٚ زوالەتێکی دنیا . طوفەیلی : ئەوەی لە خوٚڕایی خوٚی بە کەسێکدا هەلواسێ ، خوٚبڕە . دوٚ : دوا .

— ٧ —

دۆری لە من خستەوە بێ سەبەبێ یاری من
باری خودایا کە تۆ بگری سەبەبکاری من ! (١)

---

والە (یار ئەڵێ) : مـن سـەروێکی قنجی بالابـەرزی جیهانی بەرزی گیانم و خەڵکی ئەم دنیایە نیم ، جیسمی لەطیفم ، سێبەرم نییە . نالێ بەمە نـازانێ ، هەر لە ڕۆژی خـۆ پیا هەڵواسینەوە خـۆی کردووە بە سێبەرم و کەوتووەتە شوێنم .

ئەم شیعرەش دیـــان بەڵگەیەکی ترە کەوا نازنـاوی (نالی) بە لامی سۆکە . ئەوەش لە بەراورد کردنی (سەرو) و (نال)ەوە دەردەکەوێ کە نالی وبستۆیە بڵێ پۆشێکی باریکی کورتی ناو قەڵەمێکی قامیش چۆن ئەتوانێ خۆی بکا بە سێبەری دار سـەروێکی بەرز ؟

طونەیلی (چر) : سەفیلی .

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە دەستنوسـەکانی (چر) و (من) و چاپەکانی (مم) و (کم) و (گم)دا هەیە .

— ٧ —

(١) باری خودایا : خودای بارێ ، خودای دروستکەری دنیا ! سـەبەبکار : ئەوەی ببێ بەهۆی شتێکی خراپ کە بەسەر کەسێکدا بێت . ■

والە : سـەبەبکارەکەم ، لەخۆڕایی ، یاری لێ دۆر خستمەوە . خوایە بە غەزەبی خـۆت بیگری و گرفتاری کەی کـەوا بەوجۆرە بۆ بەهۆی ئازاری دڵم .

وشەی ( سـەبەبکاری من) لەلایـەکەوە فاعیلی فیعلی (دۆری لە من خستەوە)یە و ، لە لایەکی‌کەشـەوە مەفعولوبیهی فیعلی (بگری)یە . ئەمەش بەگوێرەی زانستی نەحو پێی‌ئەڵێن (التنازع) ، والە : شەڕی دۆ فیعل لەسەر ئیسمێك .

لەنێوان (باری) و (یاری) و (کاری)دا جیناسی لاحیق هەیە .

خستەوە (مم) : کردووە . (گم) : کـردووە . بێ سـەبەبێ (گم) : بە بێ سـەبەب . (ك) و (اح) و (« بەراوێزی » خا ) : بێ سەبەبە . کە تۆ بگری (ح) : کەسێ بۆ بە . .

مەستی خەیاڵی ئەوە ، لەحظە ژمێری شەوە

دوژمنی خوێنیی خەوە ، دیدەیی بێداری من (٢)

دیدە نیگەهبانی یار ، تیپی سرشکم هەزار

ناڵەیی دڵ نەی سەوار ، ئاهە عەلەمداری من (٣)

گریە بە خوڕ دێتە خوار ، هەروەکو عەینی بەهار

خۆش بووەتە ئابشار مەدمەعی سەرشاری من (٤)

---

(٢) لەحظە ژمێر : ئاو ئاو ژمێر . دوژمنی خـوێنی : دوژمنێ کە بەهۆی خوێن ڕشتنەوە بۆبێ بە دوژمن .

واتە: چاوی هەرگیز نەچوە خەوی من مەستی بیرکردنەوەیە لە یار و، هەناسە بە هەناسەی شەوگاری درێژ ئەژمێرێ و ، لەگەڵ خەودا وەك دوژمنێکن خوێن لەنێوانیانا ڕژابێ .

بێداری : (چر) و (خا) : دیداری . لە پەراوێزی ئەم دوو نوسخەیەشدا ( بێداری ) هەیە .

(٣) نیگەهبان : ئاگاداریکەر ، پاسەوان . تیپ : تیپی لەشکر . نەیسەوار: مەعناکەیمان بۆ ڕاستنەکرایەوە . دوور نییە (نێزەدار) بووبێ و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ . عەلەمدار : ئاڵا هەڵگر .

واتە : منی دڵدار هەموو تەرخانە بۆ یار و لەپێناوی ئەومدا داناوە . چاومە ، کردوومە بە پاسەوان بۆی و بە هەموولایەکدا ئەڕوانم نەبادا دوژمن لێی نزیك بێتەوە و تووشی زیانێکی بکا . سوپای فرمێسکیشم بە هەزاران ئامادەن بۆ پاراستنی . ناڵەی دەروونیشم ... ! ئاه و هەناسەی بەرزیشم ئاڵا هەڵگریەتی .

(٤) گریە : گریان ، مەبەست فرمێسکە . عەین : کانی . چەشن . خۆش : چاك . ئابشار : تافگە . مەدمەع : ئەو شوێنەی فرمێسکی لێوە ئەڕژێ، چاو . سەرشار : لێپشاوکردوو .

واتە : فرمێسك ، هەروەك کانیاوی بەهار بەخوڕ لە چاوم ئەڕژێ ، چاوی پڕ لە فرمێسکم زۆر چاك بووە بە تافگە و بەهەموولایەکدا ئاو ئەپرژێنێ .

دولبەری عالی دەماغ ، هەمقەدەمی سەروی باغ
بێتە نەظەرگەی قەراغ دیدەیی جۆباری من (٥)

حیکمەتی تۆ مولهەمە ، هەم قەدەمت مەرحەمە
موستەحەقی مەرهەمە سینەیی ئەفگاری من (٦)

---

بەخوز (چن) : بەگوز . لە («پەراوێزی»چن)یشدا دیسان : بەخوز . عەینی (چن) و (عم) و (کم) و (ك) : سەیلی . (اح) : زەمەدی . (خب) : مەوری .

(٥) عالی دەماغ : بیر و سروشت بەرز . هەمقەدەم : هاوڕێ ، هاوڕێی . جۆبار : جۆگا .

مەعنای ئەم شیعرە بەسراوە بە شیعری پاشەوەیەوە .

هەمقەدەمی (چر) و (ت) و (مز) و (خب) : هەمقەدەمت . قەراغ (چن) و (عم) و (کم) و (ك) و (ت) و (مز) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) و (خب) : فەراغ ، واتە : بۆشایی . جۆبار (چن) : خۆنبار ، واتە : خوێناوی .

(٦) حیکمەت : فەرمودەی بەمەعنا . مولهەم : لە خواوە هاتۆ و خوا خستووە دڵ . هەمقەدەمت . هاوڕێت . پێپێشت ، پێ و قودومت . مەرحەمە : ڕەحمەت . مەرهەم : مەڵهەم ، دەرمان . ئەفگار : برینداو و ماندو و شەکەت .

واتە : با یاری خاوەن بیر و سروشتی بەرز ، کە لە باڵا بەرزی و جوانیدا وەکو سەروی ناوباغ وایە ، بێتە سەیرانگای کەناری جۆگەی ئەو فرمێسك و خوێنەی لە چاوی منەوە سەرلەکا . ئازیز ! فەرمو وەرە سەیری ، چونکە ئەگەر بێیت ، هەرچی بفەرمۆیت ، فەرمودەت ئیلهامی خواییە و ، پێ و قودومت ڕەحمەتە و ، سینەی برینداری منیش شایانی مەڵهەم و دەرمانی تۆیە .

لەنێوان (مولهەم) و (مەرهەم)دا جیناسی لاحیق و ، لە (مەرحەمە) و (مەرهەمە)دا جیناسی موضاریع هەیە . لە بەیتی دۆهەمیشدا ، بە بەراورد لەگەڵ بەیتی پێشو ، شێوەی ئیلتیفات بەکارهێنراوە لە غائیبەوە بۆ موخاطەب ، مەگەر بڵێین (بێتە) هەڵەی نوسیارە و ڕاستەکەی (بێیتە)یە . ئەوهەڵەیەش دور نییە لە شێوەی نوسینی جارانەوە .

شاهیدی عەدلە و وەفا ، مەعدەنی صیدقە و صەفا
هاتووە دەرمان بکا قەلبی برینداری من (٧)

ئەی تەلەفی گفتوگۆ ، جامیعی کیذب و درۆ
واعیظیە ئیشی تۆ ، عاشقیە کاری من (٨)

مەشرەبی « نالی » گەلێ ئابیەو ترشە ، بەڵێ
موعتەریفە خۆی دەڵێ : چا نیە ئەطواری من (٩)

---

ئەفکار (ت) و (مز) و (عب) و (اح) و (خب) : ئەفکار . بەمپێیە مەعناکەی وای لێدێتەوە : سینەی پڕ لە بیر و خەیاڵی من .

(٧) شاهید : یار . عەدل : عادل ، بەداد . وەفا : بەوەفا . مەعدەن : کان . صیدق : ڕاستی . صەفا : خاوێنی و پوختەیی . قەلب : دڵ .

لەم بەیتەدا نالی باسی هاتنەجێی ئەو دارایە ئەکا کە لە بەیتی پێشوودا کردی .

لە وشەی (شاهید)دا تەوریە هەیە چونکە هەم مەعنای شایەتی دادکا و هەم مەعنای یاریش ئەگەیەنێ . بەڵام کۆکردنەوەی لەگەڵ ( عەدل و وەفا )دا پڕە لە جوانکاری ، چونکە (عەدل) لەگەڵ مەعنا دوورەکەی و ( وەفا )یش لەگەڵ مەعنا نزیکەکەی ئەگونجێ .

(٨) تەلەف : فەوتاو .

لەم بەیتەدا نالی باری قسە وەرنەچەرخێنێ و ڕووی دەمی ئەکاتە ئەوەی لۆمەی دلداران ئەکا و پێی ئەڵێ : ئەی ئەرکەسەی کە فەوتاوی دەستی زۆربلێییت و چەند جۆرە دەلەسەت لە خۆتدا کۆکردووەتەوە ، دەست لە بەخەم بکەرەوە و دەست بەردارم بە ، من و تۆ ناکەوینە یەك ، من عاشقم و ڕاست و ڕەوان و ، درۆ لای من باوی نییە و ، تۆیش کار و پیشەت هەر ئامۆژگاری کردنە بێئەوەی خۆت بەگوێرەی قسەکانی خۆت بجوڵێیتەوە و ، بۆیە هەرگیز ناگەینە یەك و لە یەکتری حاڵی نابین .

لیشی تۆ (مز) : کاری تۆ .

(٩) مەشرەب : خو و ڕەوشت . ئابی : وەك بەی (بەهی) . موعتەریف : کەسێ دان بە شتێکا بنێ . چا : چاك . ئەطوار : جەمعی طەورە ، واتە: خو و ڕەوشت .

— ٨ —

خەندە و دەمی ( مەحبوبە ) کەوا زۆر نمەکینن
بەس خۆشە ئەگەر خۆ نمەکی زەخم و برینن (١)

غیلمانە ، گوتم ، خالی لەطیفت کە لە سەر دا
ئەم قیبلە برۆیانە کە غارتگەری دینن (٢)

---

واتە : ڕاستە خۆم ددانی پێدا دەنێم کەوا خۆ و ڕەوشتم گەلێ ترش و تووڕەیە وەك بەهێی ترش و ئەتوارم چاك نییە و ، بۆیەش وا بەئاسانی لەگەڵ واعیظ ناگونجێم .

لە ڕستەی (گەلێ ئابی‌یو) دا نالی ئەوەشی مەبەست بووە کە بە (گولی ئابی‌یو)یش بخوێنرێتەوە . گولی ئابێ ، گولابێ : هەرمێ . بەم‌پێیە مەعناکەی وای لێ‌دێتەوە : ڕەوشتم چاك و خراپە ، ترش و شیرینە . . هەروەها دانانی (چا)ی (چا نییە)شی بەرابەر بە (ئابێ) مەبەست بووە .

لە کۆکردنەوەی (گەلێ) و (بەلێ) و (دەلێ)دا جیناسی لاحیق هەیە .

مەشرەبی («بەراوێزی» چر و خا) و (چن) و (ك) و (اح) : مەذهەبی .

— ٨ —

(١) خەندە : پێکەنین . نمەکین : خوێیاوێ . خۆش . لەگەرخۆ : هەرچەند . نمەك : خوێ .

واتە : دەم و پێکەنینی یار ، هەرچەندە وەك خوێ زام و برینی دڵ ئەکولێننەوە ، هێشتا هەر زۆر خۆش و بەتامن .

لەنێوان (خەندە) و (دەم)دا تەناسوب و ، لەنێوان (نمەکین) و (نمەکی)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (زەخم) و (برین)دا تەرادوف هەیە .

نابێ سەرنجێکی ئەوەش نەدەین کە نالی وێنەیەکی زۆر ناسکی لەم بەیتەدا پیشان داوین ، ئەویش ئەوەتە کە یار لەولاوە دەمی کردەوە و خەندەی بڵاو کردەوە ، لەم‌لاوە زامی دڵی دلدارێش ئەکرێتەوە و برینی ئەکولێتەوە .

(٢) غیلمان : جەمعی غولامە بەمەعنا بەندە . قیبلە برۆ : ئەوەی برۆی بووە بە قیبلەی دلداران . غارەتگەر : تالانکەر .

واتە : کە خالە جوانەکانت بەسەر برۆتەوە کوتا (وەك گوڵ بدەی لە

ئاهۆیی حەرەم قیبلەیی ئەبرۆن کە بە دیدە ،
ئەم شەهد لەبانە کە هەمۆ شاهیدی چینن ، (٣)

سیمین بەدەن و ، سەرو قەد و ، لەنجە تەذەروون
کافر لیگەهـ و ، ڕەشك ، لە بوتخانەیی چینن (٤)

---

سەرت) ، وتم یار بووە بە غولام . ئای لەم کچە نازدارانـە کە برۆیـان قیبلەی دلدارانە ، چۆن تالان‌کەرێکی دینی دلدارەکانیانن ؟ !

بۆ تێگەیشتنی تەواوی مەعنای ئەم بەیتە ، ئەبێ بزانین کەوا غولام ، تێکڕا ، ڕەشە و خالیش ڕەشە و ، کە یار خالی کوتا ڕەشـاییەك بـە ناوچاویەوە پەیدابۆ و لەوەوە دانرا بە غولام . لە ڕوویەکی‌کەشەوە ئـەو خالە ئەبێ بە تەماشـاگەی دلداران و ئەبێ بە قیبلەیان و ، ڕوی دل کردنە ناوچاو و برۆی یاریش جۆرە پەرستنێکە . بنیادەمیش کە نوێژ ئەکـا ، ڕوئەکاتە قیبلە و ، نوێژ کردن تێکڕا پەیوەندی بە میحرابی مزگەوتەوە هەیە و میحرابیش هیلالییە وەك برۆ و کەواتە وا برۆ لە سەرێکی‌کەشەوە بۆ بە قیبلە . هەروەها ڕوکردنە قیبلە ئەبێ بە مایەی بە هێز و پتەو بونی ئایین ، کەچی ڕوکردنە قیبلەی برۆی یار مایەی بە تالان چونی ئاینـی ئەوانەیـە ڕوی تێ‌ئەکـەن ، لـەو ڕووەوە کە خواپەرستییـان لە یـاد ئەباتـەوە و ، بەدیمەنیش لـەو ڕوەوە کەوا برۆ وەك شـمشێر وایە و شـمشێریش بۆ تالان‌کردنی مالی خەلك بەکارئەهێنرێ .

ڕێیشی تێ‌ئەچێ مەبەست لە (دین) بینـین بێ . بەم‌پێیـە مەعنـای شیعرەکە وای لێ‌دێتەوە : ئەو نازدارانە کە برۆیان ئەوەندە جوانە ، بووە بە قبلە و ، ئاوی چاوی تەماشـاکەر ئەبەن .

(٣) ئاهۆ : ئاسك . حەرەم : ئەو شوێنەی کەس ئەتوانێ دەستی لیا بەرێ بۆ کەسێك ، وەك حەرەمی مەککە . دیدە : چاو . شەهد لەب : ئـەوەی لێوی وەك هەنگوین خۆش و شیرینە . شـاهید : نـازدار . شـاهیدی چینێ : کینایەیە لە نازداری ئێجگار جوان .

مەعنای ئەم شیعرە و شیعری پاشەوەی پێکەوە دێ .

(٤) سیمین بەدەن : لـەش وەك زیو سپی . تەذەرو : جـۆرە چۆلەکەیەکە گوشتی ئەخورێ ، کلکێکی درێژ و پەڕێکی جوانی هەیە ، لە دارستان و کێلگەکانا ئەژێ . هێلانە لە زەویدا ئەکا و بیـست و چوار تۆز بەسەر دە

دندان گوهەر و ، لەب شەکەر و ، پەنجە بلوورن
نازك بەدەن و ، مو کەمەر و ، سیم سرینن (٥)

زولفانی سیەهـ ماری بە ئازاری دلی زار
گاهێ لە یەسارن ، بە جەفا ، گەهـ لە یەمینن (٦)

موژگانی سیەهـ مەستی وەکو چاوی ( حەبیبە )
غارەت کە بکەن ، دێن و دەچن ، ڕۆح بڕفێنن (٧)

---

هێلکەوە نەنیشێ تا هەڵیاندێنێ . کافر نیگەهـ : ئـەوەی بێ ڕەحمانـە بڕوانێتە یەکێك . ڕەشك : بەخیلێ ، ئێرەیی .

واتە : ئەم کچە شۆخانەی کە ئەگەر لە چارەوە بۆیان بڕوانی ، وەك ئاسکی حەرەم وان کەس ناتوانێ دەستیان بۆ بەرێ و ، حەرەمەکەشیان قیبلەگای بڕیانە و ، ئەم یارە قسە خۆشە ئیـو وەك هەنگوینانـە کە هەریەکێکیان بکری نازدارێکی چینە ـ لەشیان وەك زیو و ، باڵایان وەك سەرو و ، لەنجەیان وەك قونەی تەزەرو و ، لاکـردنەوە و تەماشـایان کافرانە و حەسوودانەیە و ، وەك لە بتخانەی چینەوە هاتبن وان .

(٥) دندان : ددان . گوهەر : گەوهەر . بلوور : شوشە . مو کەمەر : قـەد باریك وەك مو . سیم : زیو . سورین : سـمت .

(٦) سیەهـمار : ڕەشمار . گاهێ : هەندێجار. گەهـ : هەندێ جاریکەش. یەسـار : لای چەپ . یەمین : لای ڕاسـت .

واتە : زولفەکانی کە لەلێی ڕەش‌مارن و دلی برینداری عاشـق ئازار ئەدەن ، جارێ بەم‌لادا ئەکەون و جارێ بەولادا .

(٧) موژگان : برژانگ . سیەهـ مەسـت : بەدمەسـت ، زۆر سەرخۆش . غارەت : تالان .

واتە : برژانگەکـانی وەك چـاوی (حەبیبـە) یەجکـار زۆر خـراپ سـەرخۆشن کە بیانەوێ تالان بکەن دێن و دەچن گیانی دلدار لەفڕێنن . ( ی )ی وشەی ( بڕفێنن ) ، هەرچەند کراوەیە ، کورت نییە ، درێژە . ئەم وشەیە ئیـسمی فاعیلە بۆ صیغەی جەمع و موفرەدەکەی ( بڕفێن )ە وەك ( بکوژ ) و ( بیژ ) و شتی‌وا .

« نالی » وەرە لادە لە خەدەنگی موژەیی یار
ئەو کافرە مەستانە کە غارەتگەری دینن (٨)

— ٩ —

ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصصەیی شاهن
ئاشوبی دلی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن (١)

---

(٨) خەدەنگ : تیر .

واتە : خۆت لە تیری برژانگەکانی یار دوور ڕاگرە ، کافریشن و سەرخۆشیشن ، ئاگات لە خۆت نەبێ دینت بە تالان ئەبەن . ■

ئەم پارچە شیعرە کە هیچ مەیدانی گومانکردن نییە لەوەدا کە هیی نالییە ، تەنها لە چاپەکانی (مم) و (گم)دا هەیە .

— ٩ —

نالی ئەم پارچە شیعرەی لەبارەی خولامە تایبەتییەکانی دەرباری بابانەوە وتووە کە دیارە هەڵبژاردەترین و شۆخترین و تازە هەڵچووترین کەسی ئەو دەوروبەرە بوون . لە نوسخەی (عب)دا نوسراوە «در مدح غلامان احمد پاشای سلیمانیە » واتە : لە پیاهەڵدانی خولامەکانی ئەحمەد پاشای سولەیمانیدا .

(١) مومتاز : هەڵاویردە . خاصصە : تایبەتی . قەلبی سوپاه : جاران سوپا کراوە بە چەند بەشەوە : موقەددەمە و موئەخخەرە و مەیمەنە و مەیسەرە و قەلب ، واتە ئەوانەی لەپێشەوە ئەڕۆن و ئەوانەی لەدواوە ئەڕۆن و ئەوانەی لای ڕاست ئەگرن و ئەوانەی لای چەپ ئەگرن و ئەوانەی لە ناوجەرگەدان . ئەرکی هەرە زۆری جەنگ ئەکەوتە ئەستۆی ئەمانەی دوایی . قەلب : بەمەعنا وەرگێڕانەوەش دێ . قەلبی سوپاه زاراوەیەکی سوپاییە .

واتە : ئەم کۆمەڵە هەڵاویردەیە کە دەست و دائیرەی تایبەتیی پادشان، لە جوانیدا بوون بە مایەی هەرا و ئاشوبە لە هەموولایەکی وڵات و لە ناوجەرگەی سوپاشدا ، یان بوون بە مایەی وەرگێڕانەوەی سوپا و لەکارخستنی ، یان دلی سوپا و خۆشەویستینی . .

تێکڕای پارچە شیعرەکە واتەگەیەنێ هەڵەیە بڵێین (قەلبی سوپاهن)

■ رەنگبێ دینی بەمانای بینیش بووبێ یانی بینایی
یاویش بەغارەت دەبەن .

صەف صەف کە دەوەستن بە نەظەر خەططی شوعاعن
حەلقە کە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن (٢)

نەرگس نیگەهـ و ساق سەمەن ، کورتە بەنەفشەن
مۆ سونبول و ، ڕۆمەت گوڵ و ، هەم لالە کولاهن (٣)

---

عەطف کراوەتەوە سەر (ئاشوبی دلی مەملەکەت) و هەردو نیمچە جوملەکە خەبەری (ئەم طاقمە)ن ، مەگەر لە حالێکا کە (قەلب) بە (وەرگێڕانەوە) واتە (مایەی وەرگێڕانەوە) یا بە (دڵ) مەعنا لێبدەینەوە . ڕاست ئەوەیە عەطفی (قەلبی سوپاهن) بکەینەوە سەر (دلی مەملەکەت) و (ئاشوبی) بەسەردا بێتەوە .

لە کۆکردنەوەی (شاە) و (سوپاە)دا تەناسوب و ، لەنێوان (دڵ) و (قەلب)دا جۆرە تەرادوفێك هەیە . هەروەها لە (قەلب)دا لەطافەیش هەیە ، چونکە هەم مەعنای دڵ و هەم مەعنای وەرگێڕانەوە و هەم مەعنای زاراوە سوپاییەکەش ئەگەیەنێ کە باسمان‌کرد .

ئەم (عب) : ئەو . طاقم (کم) : تاقم . سوپاهن («پەراوێزی» چر) و (مز) : سیاهن . هەرچەند مەعناکەش ئەگونجێ ، واتە ئاشوبی دلی کەسانی دڵڕەشن ، بەلام جوان نییە .

(٢) بەنەظەر : لە بەرچاودا . شوعاع : تیشك . ماە : مانگ .

واتە : کە ڕیز ڕیز ئەوەستن ، لە بەرچاودا وەکو هێلی ڕوناکین ، لارێ و خواریان تیا نییە ، یاخود بەهۆی بریقەدانەوەی جل و بەرگی جوانیان و چەکی دەستیانەوە تیشك ئەدەنەوە . کە ئەلقەش ئەبەستن وەك خەرمانەن بەدەوری مانگدا . دیارە مانگە خەرمانە داوەکەش پادشا خۆیەتی .

صەف صەف («پەراوێزی» چر) و (عب) : یەك صەف . ئەوەستن (چر) و (چن) و (مز) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : ئەبەستن . لە («پەراوێزی» چر)دا : ئەوەستن . (ت) : ئەوێستن .

(٣) نەرگس نیگەهـ : ئەوەی بە چاوێکی وەك نەرگس مەستەوە بڕوانێ . ساق : باڵا . سەمەن : گوڵی شینابییەکە پێی‌ئەڵێن سێ‌پەڕە ، صەد گەڵای هەیە . گوڵەکە،زەرد و سپی و شینی هەیە . دووریش نییە لە ئەسلدا (سیمین) بووبێ ، واتە : باڵا سپی وەك زیو . کورتە بەنەفشە : کورتەکی بەریان وەنەوشەیی ڕەنگ ، مەبەستی لە کەوای تاقەی شینە کە ئەو

گولزاری دەر و دەشتن و غیلمانی بەهەشتن
ئاهو صەف و ، ئاتەش بە کەف و ، تیز نیگاهن (٤)

صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و ، مەظهەری ئەلطافی ئیلاهن (٥)

---

خولآمانە لەبەریان‌کردووە . مۆ سونبول : ئەوەی تازە مۆی لێ هاتبێ و مووەکانی زۆی وەك سونبول ناسك بن . زۆمەت گول : ئەوەی زۆمەتی وەك گول گەش بێ . لالە کولاە : کلآو سوور وەك گولی لالە .

کورتە (مز) : کورت و . بەنەفشەن : (عم) و (گم) و (مز) و (اح) و («پەراوێزی» خا) : وەنەوشەن . (کم) : ئەپۆشن . (ك) : دەپۆشن .

(٤) ئاتەش : ئاگر . کەف : دەست . تیز : تیژ .

واتە : مایەی زازانەوەی دەرەوە و ناوەوەن . لە دەرەوەدا وەك گولن، لە کۆشکی پادشاشدا وەك غیلمانی بەهەشتن . لە مەیدانی سەیران و زابواردنیشدا وەك ئاسك زێك زیز ئەبەستن ، تفەنگ و بارۆت بەدەستەوە ئەگرن ، یاخود ئاگر بەرئەدەنە دلی تەماشاکەر هەروەك بلێی ئاگریان بەدەستەوە بێ، چاویان تیژە ، هیچیان لێ ون نابێ، یان دلی تەماشاکەر ئەسمن .

صەف و (چن) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خب) : صیفەت . تیز (چن) : تیژە .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەی (خب)دا بەم‌جۆرەیە :

**غیلمانی دەر و دەشتن و حۆرانی بەهەشتن**

ئەم بەیتە و بەیتی شەشەم لە نوسخەی (عب)دا لەجێی یەکتردان .

(٥) تەجەللی : دەرکەوتن . دەرکەوتنی نۆری خودا . وادیی ئەیمەن . شیوی لای زاست . ئەو شیوەی کە نۆری خوای بۆ حەزرەتی مۆسا تیا دەرکەوت لە کێوی تۆر و بانگی تیا لێ کرا . شەجەر : درەخت . ئیشارەتە بۆ ئەو درەختەی کە لەنزیکیەوە بانگ کرابە حەزرەتی مۆسا .

واتە : ئەم لاوانە کە ئەکەونە دەر و دەشت ، بە جوانیی خۆیان ئەیزازێننەوە . بالآیان وەك درەخت بەرزە و ، لوتفی خودا زۆی لێ کردۆن .

لە سەرێکی‌کەشەوە نالی شوێنەکەی ئەم لاوانەی شوبهاندووە بە

گەهـ طاوس و ، گەهـ کەبکن و ، گەهـ بۆقەلەمۆنن
گەهـ ئاتەش و ، گەهـ شوعلە ، گەهێ دۆدی سیاهن (٦)

لالەن بە بەدەن ، ئەطلەسی ئەخضەر کە لەبەرکەن
نەوڕەستە گولن ، بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن (٧)

---

وادیی ئەیمەن کە نوری خوای تیا دەرکەوت بۆ حەزرەتی مۆسا و ، خۆیانی لەلایەکەوە شوبهاندووە بە نوری خوا کە لەو شێوەدا دەرکەوت بۆ مۆسا (دیارە مۆساکەش ئەبێ ئەحمەد پاشا بێ) . لە لایەکی کەشەوە دایناون بەو درەختەی بانگی حەزرەتی مۆسای لێوە کرا و ، کردوونی بە جێگای دەرکەوتنی لوطفی خوا . ئێکڕای شیعرەکە ئیقتیباسە لە ئایەتی (فلمّا اتیها نودیَ منْ شاطیءِ الوادِ الایمنِ فی البقعةِ المبارکةِ من الشجرةِ ، أنْ یا موسی انیْ انا اللهُ ربُّ العالمین) .

صەحرا (مز) : یەکتا . دەکەنە (گم) : لەکەنە . تەجەللی (گم): تەجەللا . مەظهەری (صب) : مەنظەری . لەلطانی (مم) و (گم) و (خب) : ئەنواری .

(٦) گەهـ : جار جار . کەبك . کەو . بۆقەلەمۆن : عەلیشیش . دۆد : دۆکەڵ .

واتە : ئەم کوڕگەلەی دەوروپشتی پادشا هەر تاوێ لەسەر بارێکن ، جارێك وەك تاوس خۆیان ئەنوێنن و، جارێك وەك کەو بە لارە و لەنجەوە ئەڕۆن بە ڕێدا و ، جارێك وەك بۆقەلەمۆن خۆیان فش ئەکەنەوە . کە ڕۆژەش ئەبن جارێك ئەڵێی ئاگرن و ، جارێك ئەڵێی بڵێسەن ئەچن بەئاسمانا و ، جارێکیش ئەڵێی دۆکەڵی ڕەشن بەری چاو و دڵی خەڵك ئەگرن .

شوعلە ، گەهێ (هەموو نوسخەکان جگە لە «چر») : شوعلەور ، گەهـ . لە نوسخەی (عب)دا (شوعلە) خراوەتە پێش (ئالەش)ەوە .

(٧) ئەطلەس : جۆرە قوماشێکە . ئەخضەر : سەوز . نەوڕەستە : تازە پێگەیشتوو . بەستە : بەسراو ، کراو بە چەپك . گیاه : گیا .

واتە : لەش و سەر و ڕوویان لە گەشی و جوانی و خوێن ێراویدا وەك گوڵی لالە وایە ، کە بەرگی ئەطلەسی سەوزیش لەبەرئەکەن ، ئەڵێی گوڵی تازە پێگەیشتوون لەگەڵ چەپکە گیادا بەسراون .

لەنێوان (ڕەستە) و (بەستە) و (دەستە)دا جیناسی لاحیق و ،

تەنهایی سەمەن بەرگی بەنەوشە کە لەبەرکەن ،
وەك نوری دلی موئمین و ظولماتی گوناهن (٨)

بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەم سەرو قەدانە ،
صۆفی لە طەڵەبدان و ، هەمو سالیکی ڕاهن (٩)

---

لەنێوان (گوڵ) و (گەڵ)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لەنێوان (گوڵ) و (گیاه)دا تەناسوب هەیە .

لالەن (چر) و (کم) و (من) و (خا) : لابیس . («پەراوێزی» چر) و (چن) و (ك) و (اح) : لایق . (صب) : لالە . بە بەدەن (خب) : بە زوبان . ئەخضەر (خب) : دیبا . لەبەرکەن (چن) : دەپۆشن . (ك) و (مز) و (اح) : بپۆشن . نەوڕەستە گوڵن ، بەستە لەگەڵ .. تاد (عم) : نەوڕەستە گوڵ و .. تاد . (کم) : نەوڕەستەوو گوڵ بەستەوو .. تاد.

(٨) تەنها : لەشەکان ، جەمعی (تەن)ە واتە لەش . مولمین : کەسێ باوەڕی بە خودا هەبێ . ظوڵمات : تاریکایی .

واتە : کە کەوای تاقەی مۆری تۆخ لەبەرئەکەن ، لەشی وەك گوڵە یاسەمەن ، یا وەك زیو سپییان ، وەك نوری دلی موسولمان و تاریکایی گوناه دێتە بەرچاو .

ئەو شوبهاندنەی لەم بەیتەدا هەیە شوبهاندنی تێکەڵە و ، شوبهاندنی شتی ماددییە بە شتی مەعنەوی .

تەنهایی سەمەن (ت) : تەن یاسەمەن و . بەنەفشە (عم) و (گم) : وەنەوشە . لەبەرکەن (عم) : دەپۆشن . موئمین و (هەمو نوسخەکان جگە لە «چر») : لەرقەیی . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ بەمجۆرە بوایە : ( وەك نوری دڵ و ، لەرقەیی .. تاد ) .

(٩) خەرامیدەن : لارە و لەنجە کردن . طەڵەب : پەیجۆر ، داوا . سالیکی ڕاه : ڕێگرتووەبەر .

واتە : هەرچی صۆفی هەیە هەمو ڕێیان گرتووەتەبەر و کەوتونەتە پەیجۆری ئەوە چۆن چاویان بە لەنجە و لارەی ئەم شۆخە باڵا بەرزانە بکەوێ .

ئەم (چن) و (ك) و (صب) : ئەو . سەرو قەدانە (کم) و (من) : مەهوەشە ، نالی .

بۆ زوڵف و ڕوخ و ئەبرووی چون زوڵفی سیاتان
عالەم وەکو « نالی » هەموو با ناڵەوو ئاهن (۱۰)

« نالی » ! بە خودا حەیفە دەڕەنجێنی دڵی خۆت
ئەم طائفە مەخصوصە هەتۆ صاحیبی جاهن (۱۱)

— ۱۰ —

خەطات فەرمۆ کە خۆشە چین و ماچین
کە ناچین ، لێرە خۆشە چینی ماچین (۱)

---

(۱۰) ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەکانی (عم) و (گم)دا هەیە .

(۱۱) ئەم بەیتەش تەنها لە نوسخەکەی (مب)دا هەیە .

وەك زانیمان ئەم دوو بەیتەی دوایی لە جگە لە نوسخەکانی (عم) و (گم) و (عب)دا نین . نازناویش لەسەر بەیتی نۆهەم تەنها لە نوسخەی (کم) و (من)دا هەیە ، تەنانەت لەوێیش هەڵەیەکی ڕێزمانی بەبۆنەی ئەو نازناوەوە پەیدا بووە ، چونکە ئەبوو لەبریتیی (ئەم مەعوەشە ، نالی) بووترابە (ئەم مەعوەشانە ، نالی) لەبەرئەوە کە باس باسی کۆمەڵێکە نەك یەکێك ، کە ئەوەش پارسەنگی نیوە شیعرەکە خوار ئەکا . دووبارە و سێبارە بۆنەوەی نازناوی (نالی) بەمجۆرە شتێکی نەك هەر نامادەنییە ، بەڵکو ڕاستیش نییە . ئاڵۆزییەك لە داوێنی ئەم پارچە شیعرەوە هەیە ئێمە سەرمان لێ دەرنەکرد و بۆمان ساغ نەکرایەوە . مەسەلەکە با بمێنێ بۆ وەڵامدانەوەی دواڕۆژ .

— ۱۰ —

(چر) لە پەراوێزی ئەم پارچە شیعرەوە نوسیویە : «خود در جواب خود فرمودە» واتە : نالی خۆی لە وەڵامی خۆیدا فەرمویەتی . مەبەستی ئەوەیە لە وەڵامی ئەو پارچە شیعرەیدا وتویەتی کە لەم دیوانەدا لەپاش ئەم پارچە شیعرەوە بلاوی ئەکەینەوە . لە نوسخەی (کۆ)یشدا هەر لەسەر ئەم پارچە شیعرەوە نوسراوە : « از ردیف این غزل خودش جواب خود بدینگونە دادەاست» واتە : لە چەشنی ئەم غەزەلە خۆی وەڵامی خۆی بەمجۆرە داوەتەوە و ئەنجا ئەم پارچە شیعرەی بەدوادا نوسیوەتەوە. بەڵام وەك لە سەرەتای پارچەی داهاتوودا ڕوونی ئەکەینەوە،

برۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین
ئەمەندە چینە ، قوربان ، پێم بڵێ چین ؟! (۲)

---

ئەم دوو پارچەیە هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە و ، شتێکی ون لەم نێوانەدا هەیە هێشتا ڕوون نەبوەتەوە .

هەروەها لە نوسخەی (ل ـ و)دا لە سەرەتـای ئەم پارچە شیـعرەوە نوسراوە «این غزل دلخواه حضرت نقیب مرحوم جناب میره سوره رحمه الله اسـت » . واتە : ئەم غەزەلە بە ئارەزووی حەزرەتی نەقیبی ڕەحمەتی جەنابی میرە سورەیە ڕەحمەتی خـوای لێ بێ . بەڵام نەقیب کێیە و میرە سورە کێیە و مەسەلەکە چۆنە ! هیچمان بۆ ڕوون نییە .

(۱) خـەطا : هەڵە . چین و ماچین : وڵاتی چین . خۆشنە چین : گوڵوچن، ئەوەی لەبەر دەس‌کورتیی خۆی ، پاش خەرمـان هەڵگرتن بە شوێن دەغڵەکەدا ئەگەڕێ ، ئەگەر گوڵە گەنمێك بەپێوە مابێ یا لـە زەویـدا کەوتبێ هەڵیئەگرێ . هەروەها خۆشەچین بەوکەسەش ئەوترێ لەکوێ گوڵێ یا هێشوێەکی جوان بەدی بکا ، ئەیکاتەوە .

واتە : هەڵەیە کە ئەڵێیت وڵاتی چین و ماچین خۆشـە . چین و ماچین خۆش نییە ، ئێرە خۆشـە. ئێمەش بۆیە ئێرە لاناچین بەهیوایـن ماچێکمان دەسگیر ببێ ، یان ئێرە لەملا و لەولا ماچ کۆئەکەینەوە !

لە کۆکردنەوەی (خەطا) و (چین و ماچین)دا تەناسوب هەیە بەدیـمەن، چونکە (خـەطا) سـەرەڕای مەعنای هەڵـە نـاوی شارێکیشـە لـە تورکستان .. لەنێوان (خۆشـە چین) و (خۆشـەچین)یشـدا جیناسـی تەرکیب هەیە . لەنێوان (ناچین) و (ماچین)یشدا جیناسی لاحیق هەیە.

(۲) واتە : بڕۆکانت پەیوەسـت و چین چینن . پەرچەمیشت هەروا چـین لەسەر چینە بەسـەر ناوچاوانتا هاتوەتەوە . ئازیز ، توخوا پێم نالێی ئەم هەموو چینانە چین کۆت‌کردوونەتەوە ؟

لەنێوان چوار وشەی (چین)ی یەکەم و (چین)ی پێنجەمدا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان چوارەکە خۆیشیاندا جیناسی تەواو هەیە .

ئەشکونجێ مەعنای بەیتەکە وا لێبدرێتەوە کە ببـێ بە (حوسـنی تەعلیل) بۆ بەیتی پێشو . واتە : بڕۆت شارێکی چین و ، پەرچەمت شارێکیتری چین و ، مادەم لای خۆمان ئەم هەموو شاری چینە هەبێ ، ئیتر بۆچی بچین بۆ چین و ، لەڕێی خوادا پێم نالێی ئەم هەموو شـاری چینە ، چین کۆت‌کردوونەتەوە ؟

شکافێکە کلاڧەی نافی زولفت
دەرێژێ میسك و عەنبەر لێرە تا چین (٣)

لەسەر بەرگی گولێکی باغی حوسنت
هەزار ، گولچینی بێ بەرگ و نەواچین ! (٤)

---

هەر (چر) : بۆ .(مز) : هەم . پێم بلێ (ت) و (خب) : پێم بلێن .
(تۆ) و (مب) : بێخەطا .

(٣) شکاف : ئاوریشمی کلافەکراو . درز . لەت . ناف : مۆی بۆنخۆش. ناوك .

واتە : کلافە مۆی بۆنخۆشی زولفت ، کلافە ئاوریشمێکە ، لێرەوە تا چین موشك و عەنبەر بلاو ئەکاتەوە . یاخود ئەلێین نالی زولفی یاری شوبهاندووە بە ناوکی لەو ئاسکانەی موشکیان تیایە و ، ئەلێ وەك چۆن بن ناوکی ئەو ئاسکانە هەلئەدڕن و موشکەکەی لێ دەردێنن و بۆنی خۆش بە هەموولایەکدا بلاو ئەبێتەوە ، تۆش زولفی وەك ناوکی ئاسکی خۆت بکەرەوە و لەتی کە ، با بۆنی خۆشی لێرەوە تا چین بگرێتەوە . بەمپێیە ئەبێ (شکافێکە) بە (شکافی کە) بخوێنرێتەوە .

شکافێکە (عم) و (ك) و (لو) و (مز) و (مب) و (اح) و (خا) و (خب) : شکافێکی . نافی زولفت ( تۆ ) : چینی زولفت . ( «بەراوێزی» چر) و (ك) و (مز) و (اح) : زولفی موشکین. دەرێژێ (چن) : دەکێشێ. میسك و (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (اح) : موشك و .

(٤) بەرگ : پەڕە . نەواچین : جەمعی ( نەواچی )یە ، واتە ژۆژێخوا و دەرۆزەکەر ، یاخود گۆرانیبێژ ( خاوەن نەوا ، خاوەن ئاواز ) .

واتە : هەزارانکەس لەسەر تاقە گولێکی باخی جوانیی تۆ، گولۆچنی هەژار و بێجل و بەرگ و دەرۆزەکەر و ژۆژی خوازن، یان گۆرانیبێژن. جاران باو بۆ لە کوردستانا زۆر کەسی هەژار بە لادێکانا لەگەڕان گۆرانییان ئەوت و شمشالیان لێئەدا و بەوە ئەژیان . یاخود : هەزارانکەس ئەیانەوێ تامی جوانیی تۆ بچێژن و پەڕەی گولی تۆ بکەن بە بەرگی خۆیان و گۆرانی بە بالای تۆدا ئەلێن .

لەنێوان یەکێتیی مەعنای (گولێکی) و نۆریی مەعنای ( هەزار گولچین) و ، ئەو بۆنەی لە مەعنای (بەرگی گولێکی)یەوە دەرئەکەوێ و ئەو نەبوونەدا کە لە (بێبەرگ)ەوە دەرئەکەوێ ، طیباقێکی ئێجگار

ئەتۆ میهرییو مەهرۆیان ستارەن
لە خزمەت شەوقی تۆدا شەوچرا چین ؟! (٥)

هەمو ذەرڕاتی میهری زۆتە با قین
خودامان بۆ بەقایە لێرە لاچین ! (٦)

---

هونەرمەندانە هەیە . هەروا تەناسوبێکی جوانیش لەنێوان مەعنای ( بولبول ) ، کە لە شێوەی نوسینی جارانی ( هەزار ـ هەزار )ەوە دەرنەکەوێ ، لەگەڵ (نەوا)ی (نەواچین)دا هەیە .

(٥) میهر : خۆر . مەهرۆیان : ئەوانەی ڕۆیان وەك مانگ جوانە . ستارە : ئەستێرە . شەوچرا : گەوهەری شەوچراغ ، گەوهەرێکە بە شەو وەك چرا ئەدرەوشێتەوە . چرای شەو . جۆرە کرمێکە بە شەو تیشك ئەداتەوە ، بە کوردی ( گوِ ئەستێرە )ی پێ‌ئەڵێن .

واتە : تۆ خۆری و ئەوانەش کە لە جوانیدا ناوبانگیان دەرکردووە و ڕۆمەتیان وەك مانگ وایە،ئەستێرەن و هەمو لە تۆوە ڕۆناکی وەرئەگرن. کەواتە ئیتر گەوهەری شەوچرای داماو چۆن ئەتوانێ بەرابەر بە جوانیت خۆی بنوێنێ .

ئەشکونجێ مەبەست لە ( شەوچرا ) گەوهەری شەوچراغ نەبێ ، ( چرای شەو ) یا کرمە بە شەو تیشکدەرەوەکە بێ . بەم‌پێیە مەعنای ئەوە شیعری دوهەم وای لێ‌دێتەوە : کە مادەم تۆ خۆر بی و هەمو جوانان لەئاستی تۆدا ئەستێرە بن ، تیشکیان لەچاو تیشکی تۆدا وەك چرای شەو یا وەك کرمی شەوچرا وایە ، جا توخوا لەبێ شەوقی چرای شەو یا شەوقی کرمی شەوچرا لەئاستی شەوقی ڕۆژدا چی بێ ؟

(٦) میهر : خۆشەویستی . با قین : لەگەڵ ڕق و کینەدا . یاخود جەمعی (باقی)یە واتە ماونەتەوە .

واتە . هەرچی زەرڕەی خۆشەویستی بە تۆتەوەیە هەمو لەگەڵ ڕق و کینە و تۆڕەییدایە و لەوانەیە ئێمەشی بەرکەوێ . بەڵام ئێمەش خوامان بۆ ماوەتەوە یاریدەمان بدا و بتوانین لەبەر ئەم ڕق و کینەیەی ڕۆی تۆدا لاچین .

ئەشکونجێ کە ( میهر ) هەر بە خۆر مەعنا لێ‌بدەینەوە و مەعنای ئەوە شیعرەکە وای‌لێ‌بێتەوە کە هەمو وردەکانی تیشکی خۆری ڕۆت بە قین و کینەوەن و لەوانەیە بنیادەم بسوتێنن ..

بلێ « نالی » بە ئەربابی وەفا : پێن
هەمو موحتاجی خاك و بێل و پاچین (٧)

— ١١ —

بە جان سەختی ڕیو دڵ بەردی ، من و تۆ
بیەینی هەروەکو پۆڵاوو بەردین (١)

---

لەنێوان ( دەرزە ) و ( میهر )دا بەوپێیە کە ( میهر ) بە مەعنا ( خۆر ) بێ ، طیباق و ، لەنێوان (میهر) و (زۆت)دا بەوپێیە کە دبسان (میهر) بەمەعنا ( خۆر ) بێ جۆرە ئەرادوفێك و ، لەنێوان ( میهر ) و ( قین )دا بەوپێیە کە (میهر) بەمەعنا ( خۆشەویستی ) بێ طیباق و ، لەنێوان (باقین) و (بەقایە)دا جۆرە جیناسێك هەیە .

زۆلە باقین (چن) : زۆلە باقی . (عم) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و ( «بەراوێزی» خا ) و (خب) : زۆلە پڕ قین. (تۆ) و (مب) زۆت و باقین. ( «بەراوێزی» خا ) : زۆت و بەرقین . لەوانەشە ( پڕ قین ) بێ . خودامان بۆ بەقایە (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) و (خب) : خودا یاری بدە تا ، یاخود : خودایا زێ بدە لا .

(٧) واتە : نالی ، بە خاوەن وەفاکان بڵێ بێن ، یا بڵێ با لەناو خۆماندا بەوەفا بین ، چونکە دنیا لەوەندە ناهێنێ و هەموومان بەرەو مەرگ ئەچین و پێویستمان بە بێل و پاچە گۆڕی بێ هەڵکەنین بۆ خۆمان و ، خاکمان ئەوێ پاش مردن لیا بنێژرێین .

ئێمە وای بۆ ئەچین لە نوسخەی ئەسڵیدا ( و )ێك لەدوای وشەی ( وەفا )وە بووە و نیوە شیعرەکە بەم جۆرە بووە :

**بلێ « نالی » بە ئەربابی وەفا و بەین :**

بلێ (ك) و (ت) و (اح) و (خب) : بلا . ( «بەراوێزی» چر ) و (کم) و (گم) و (من) : وەرە . خاك و بێل و (چن) و (ك) و (اح) : بێل و خاك و.

— ١١ —

لە تێکڕای نوسخە دەستوس و چاپیەکاندا ئاڵۆزییەك لەنێوان ئەم پارچە شیعرە و پارچەی پێشودا ڕوویداوە . (چر) و (ت) و (ك) و (تۆ) و (مز) و (مب) و (اح) و (خا) و (خب) بەیتی یەکەم و دووەمی پارچەی پێشو و ، (چن) و (کم) و (گم) و (من) تەنها بەیتی یەکەمیان لێرەدا

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

---

داناوە و کردوویانە بە سەربەند . (عم)یش تەنها بەیتی سێهەمی ئەوتی هێناوە و لێرەدا کردوویە بە سەربەند ، جیاوازیی بەکارهێنانی ئەو دوو بەیتە لە پارچەی پێشوو و لەم پارچەیەدا ، بەگوێرەی لەم نوسخانە تەنها ئەوەندەیە لەجیاتیی ( خەطات فەرموو )ی پارچەی یەکەم ، لێرە ( مەکە مەدحی )یە و ، لەجیاتیی ( پێم بڵێ )ی ئەوێ لێرە ( بێخەطا )یە .

بەرابەر بەمە لە نوسخەی (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (خب)دا ئەم دوو بەیتە لە پارچەی پێشوودا نین و، هەروەها لە (مز)دا بەیتی چوارەمیش و، لە (عم)دا تەنها بەیتی سێهەم نییە .

ئاڵۆزییەکی‌تریش لە ئارادایە : لە نوسخەکەی ( چز ) و (کو)دا ـ وەك لە سەرەتای پارچە شیعری پێشوودا باسمان کرد ـ پارچە شیعری پێشوو بە وەڵامی ئەم پارچە شیعرە دانراوە ، گوایە نالیی خاوەنی ئەم پارچە شیعرە ، بەوی پێشوو وەڵامی خۆی داوەتەوە ، جا خواه ئەوی پێشووی بە ناوی کەسێکی‌ترەوە دانابێ ، وەك لە نوسخەی ( کو )دا نوسراوە ، یا نە . .

بەڵام ئەوەی لە بەراورد و لێکۆڵینەوەی ئەم دوو پارچە شیعرەوە بەئاشکرا بۆ ڕەخنەگر دەرئەکەوێ ، ئەوەیە ئەم دوو پارچەیە ، هەرچەند لە وەڵام ئەچن ، بەڵام هیچکامیان وەڵامی ئەوی‌تریان نییە و هیچ پەیوەندیکیان بە یەکەوە نییە ، ئەوە نەبێ کە لەبارەی سەنگی عەروزییەوە هاوجۆرن . کە دوو بەیتی یەکەم و دووەمی پارچەی پێشوو ئەخەینە لای سەرەوەی ئەم و دەست ئەکەین بە خوێندنەوەیان و پاشان ئەگەینە بەیتە بڕبڕە پشتییەکانی ئەم پارچەکە ، بەئاشکرا هەست ئەکەین کە لە جیهانێکەوە چووینەتە جیهانێکی‌تری بێپەیوەند . خۆ ئەگەر بەیتی سێهەمی ئەو بکەین بە سەربەندی ئەم ، ئەوە جگە لە بێپەیوەندییە مەعنابییەکە ، لەبارەی نایەکێتیی ڕەوی و قافیەیەی بەیتەکە خۆی و نەگونجانیشیەوە لەگەڵ ئەم پارچەیە لەبارەی لەنگەرەوە ، گیر ئەخۆین . .

ئێمە لامان‌وایە ، هەروەك دوو پارچەکە پەیوەندیان بەیەکەوە نییە ، ئەم پارچەیەش لای کەمی بەیتێکی ناتەواوە ، هەر هیچ نەبێ چونکە خۆ پێویستە بەیتی یەکەمی ( موصەڕڕەع ) بێ واتە ( ڕەوی ) و (قافیە)ی جوت‌یەك بێ . مایەی خۆش بەختییە چروسنانییش لە بەراوێزی ئەم پارچەیەدا نوسیویە : « در اکثر نسخ دو شعر در اول این غزل مفقود است » واتە : لە زوربەی نوسخەکاندا دوو بەیت لە سەرەتای ئەم

وەرە با ئاگرێکی وەصلی خۆمان
بخەینە قاوی عومری دوشمنی دین (۲)

---

غەزەلەوە نەماوە . بەڵام بۆ کەس بۆی نەگێڕاینەوە کە لە «اقل نسخ»دا ئەو بەیتانە کامەن !!

جیاوازیی ڕستەی یەکەمی بەیتی یەکەم و ڕستەی پێش دوایی بەیتی دۆهەمیش لە پارچەی پێشوودا لەوەی لە نوسخە ناوبراوەکاندا کراون بە بەیتی یەکەم و دۆهەمی ئەم پارچەیە ، تەنها جیاوازیی نوسخە لەگەڵ چوار چێوەی پارچەی پێشوودا و ، نیشانەی ئەوە نییە شیعری سەربەخۆن و هیی ئەم پارچەیەن .

(۱) جان سەختی : گیان سەختی ، زۆ گیان دەرنەچون . خۆ بەدەستەوە نەدان . دڵ بەردی : دڵڕەقی وەك بەرد . بێڕەحمی . بیمەیلی : بمینەی دەق وەك ..

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ .

لە هێنانی (من) و (تۆ)دا بەدوای (جان سەختی) و ( دڵ بەردی )دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

جان (عم) : گیان . پۆلاور (کم) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : پۆلاد و .

(۲) قاو : پۆشۆ ، پیفۆ ، ناوپۆرگی پیرەدارە ، هەبەتی زۆر نەرمە و هەیەتی کەمتر . زۆ ئاگر ئەگرێ و ، کە ئەسوتێ بۆنێکی خۆشی هەیە . دین : ئایین . چاو پێکەوتن .

واتە : من و تۆ هەردوکمان لە یەك بابەتین و پێکەوەمان کار مەیسەر ئەبێ . من لە گیان سەختی و خۆ بەدەستەوە نەدانا وەك پۆلا وام کە بە هیچ ناشکێ و ، تۆیش لە دڵڕەقیدا وەك بەردە ئەستێ وای . بە بەیەکگەیشتنی هەردوکمان ئاگر ئەکرێتەوە . کەواتە ، وەرە با بەیەکبگەین و بە بەیەکگەیشتنمان ئاگر بەربدەینە پۆشۆی ژیانی ئەوەی ناحەزی یەکتر دیتنمانە کە وەك ناحەزی ئایین وایە ..

جاران لە لادێکانی کوردستانا باو بو جوتیارەکان کە بەهانویستایە سەبیل داگیرسێنن ، تۆزێ پۆشۆیان ئەخستە سەر بەردە چەخماخ و ئەستێکەیان پیا ئەدا ، ئاگرێکی لێ ئەبوەوە و پوشووەکە گورج ئاگری ئەگرت .

ڕەقیب و موددەعی وەك پووش و پووشوو
بسووتێنین ، کە وەك بەرقین ، لەبەر قین (٣)

مەفەرموو دڵ وەکوو ئاوێنە صافە
بەڵێ بەم ئاینە بۆی بۆی بە خودبین (٤)

وەرە تا عالەمی قەلبت نیشان دەم :
کەوا فەقری غینایە ، مردلی ژین (٥)

---

ئەم بەیتە لە نوسخەی ( مز ) و ( عب )دا نییە .

ئاگرێکی ( مم ) : ئاورێکی .

(٣) واتە : من و تۆ کە لە بەیەکگەیشتنمانا وەك برووسکەی هەورین و زۆر ئاگر ئەکەینەوە ، با لەداخانا بەدکار و خۆهەڵبەستێن بسووتێنین ، کە ئەوانیش وەك پووش و پووشوو وان و زوو ئاگر ئەگرن .

لە کۆکردنەوەی ( پووش ) و ( پووشوو )دا جیناسی ناقیص و ، لە کۆکردنەوەی ( بەرقین ) و ( لەبەر قین )دا جیناسی تەرکیب هەیە .

پووشوو : ئەمە تێکستی (ت) و (مز)ە . نوسخەکانی تر هەموو : پووشوون .

(٤) ئاینە : ئاوێنە . خودبین : ئەوەی هەر خۆی لە بەرچاو بێ .

واتە : مەفەرموو دڵم وەك ئاوێنە ساف و بێگەردە . ئەگەر ڕاست دڵت وا بووایە ، هەموو شتێکت تیا ئەدی و ، خەڵکی تریشت ئەهاتە بەرچاو و ، بەزەییت بە کەسانی تریشدا ئەهاتەوە . دڵت وەك ئاوێنە ساف نییە . ڕەشە و ، تۆیش ئاوێنەیەکی چڵکن بەکاردێنی . بۆیە وا خودبین و خۆپەرستت لێ دەرچووە و لە خۆت بەولاوە کەست نایەتە بەرچاو .

مەفەرموو (مم) و (گم) و (تۆ) و (من) و (عب) : دەفەرمووی . ئاوێنە (تۆ) و (عب) : ئاینە . بەم ئاینە (چر) و (چن) و (ك) و (مز) و (خا) : بەم ئاوێنە . ئێمە (بەم ئاینە)مان پەسەندکرد تا سەرەڕای بەکارهێنانی دوو وشەی جیا و ئەوای مۆسیقایی ، مەعنای پێزەو و ڕەوشتیش بکەیەنین . بۆی بۆی : ئەمە تێکستی (چر) و (اح) و (خا)یە . نوسخەکانی تر هەموو : بۆبێ .

(٥) عالەمی قەلب : جیهانی دڵ ، جیهانی خۆشەویستی . فەقر : لاتی . غینا : دەوڵەمەندی .

تێدا ئومێد و بیم و گریەوو سۆز
بەهار و پایز و زستان و هاوین (٦)

---

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ .

لەنێوان ( فەقر ) و ( غینا ) و ، ( مردن ) و ( ژین )دا طیباق هەیە . هەروەها لە ( عالەمی قەلب )یشدا لەطافەت هەیە ، چونکە وات (عالەمی قەلب ) عالەمێکی سەر هەڵەوگەڕاوە ، هەموو شتێکی تیا بەپێچەوانەوەیە .

تا (کم) و (ت) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : دا . (عم) و (لو) و (من) : با . فەقری (کم) و (گم) و (من) : فەقر و . غینایە (خا) : غینایە و . مردنی (کم) و (گم) و (لو) و (عب) و (من) : عالەمی .

(٦) ئومێد : هیوا . بیم : ترس . گریە : گریان .

واتە : وەرە با جیهانی دڵت پیشاندەم تا بزانی دڵداران لە چ جیهانێکی خۆشدا ئەژین .. جیهانی دڵداران لە هیچ جیهانێکی تر ناچێ .. بنیادەم تیایا تا هەزارلر بێ و پتر لەپێناوی خۆشەویستیدا دەست لە دنیا بشوا ، لەڕاستیدا دەوڵەمەندترە .. تا باشتر لەپێناوی خۆشەویستیدا بمرێ و تیا بتوێتەوە ، ژیانی ڕاستەقینەی باشتر بۆ ئەنوسرێ .. جیهانی دڵداران جێگای کۆبونەوەی چەندها شتی بەدبەمەن دژی یەك و ؛ لەڕاستیدا پێکەوە بەستراوە : هیوای گەیشتن بە یار و ترسی دورێ لێی .. گریان لەناو دورێ و سۆز لە خۆشیی بەیەکگەیشتندا .. بەهاری ئاوالی گەش و ، پایزی هیوای وەریو .. زستانی فرمێسکی بەخوڕ و ، هاوینی بە گڕی وەصڵ سوتان وەك پەروانە ..

بەپێی ئەم لێکدانەوەیە لەمبەیتەدا لەف و نەشری موڕەتتەب هەیە ، چوارەکانی هەرکام لە دوو نیوە بەیتەکە بەڕیز بەکتر لێكئەدەنەوە . وەك چۆن لەنێوان (ئومێد) و (بیم)دا طیباق و ، لەنێوان ناوی چوار وەرزەکەدا تەناسوب هەیە .

لە لایەکی کەشەوە (ئومێد) و (بیم) کە واتە (خەوف) و (ڕەجاء) دوو زاراوەی عیلمی تەصەوفن .

تێدا (چن) و (کم) و (گم) و (عب ) و (من) : بەنا . دیارە هەڵەیە و ئەسڵەکەی ( تیا ) بووە لە نەزانیی نوسیارەوە وای بەسەرهاتووە . ( مز ) : بە صەد . ( خب ) : لەبەر .

لەگەڵ مورغی چەمەن « ناڵێ » دەناڵێ
کە یەعنی عاشق و هەم فەرد و فەردین (٧)

---

(٧) مورغی چەمەن : پەلەوەری ناو مێرغوزار . هـەمفەرد : هاوسـەر و هاودەرد . فەرد : تاقانە .

واتە : ناڵی لەگەڵ بولبولی ناو باخاندا هەمیشـە خەریکی ناڵانە ، چونکە دلدارێکی ڕاستەقینەن ، بە سۆز پێکەوە ئەناڵێنن و بە جیهانی پیشان ئەدەن کـەوا هەردوکیان گرفتـاری دەردی دڵن : پەلەوەری چەمەن دلداری گوڵە و ، ناڵیـش گرفتاری یار !

لەنێـوان (نـاڵێ) و (دەنـاڵێ) و ، (فەرد) و (فەردین)دا جینـاسی ناقیص هەیە . هەروەها لەنێوان ( هەمفەرد ) و ( فەرد )یشـدا طیباق هەیە .

عاشق و (کم) و (گم) و (ك) و (اح) و (من) : عاشقی . (لق) و (عب) : عاشقین .

# تیپی واو

— ١ —

وەك قەفەس ئەم حوجرە کونە تێیە کەوا گرتومیە ناو
تار و پۆی عەنکەبوتە ، زۆرە لێی کردومە داو (١)

— ١ —

(١) حوجرە : ژوورێکە لەپاڵ مزگەوتدا فەقێ تیا ئەژین و تیا ئەخوێنن . عەنکەبوت : جاڵجاڵۆکە .

واتە : ئەم حوجرە کونە تێدا بووە کەوا منی لە چوارچێوەی خۆیدا گلداوەتەوە ، ئەوەندە وێران و شەق و شڕە، تان و پۆی ئەڵێی تەنراوی جاڵجاڵۆکەیە ، بنیادەم بەئاسانی ئەتوانێ لێی دەرباز بێ ، بەڵام حوکمی زۆر و ناچارییە لە منی کردووە بە داو و ناتوانم بەجێی بهێڵم .

ئەبێ ئەم حوجرەیە حوجرەی مزگەوتی کوێ بووبێ وا نالی بەدەستیەوە هاواریەتی ؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە ئەبێ بگەڕێینەوە سەر ئەو ئاگادارییە کەمەی هەمانە لەبارەی ئەو شوێنانەوە نالی تیایاندای خوێندووە . دیارە حوجرەی خانەقای مەولانا نییە ، چونکە خانەقا سەرەڕای ئەوە کە بەگوێرەی باری ئەو زۆرەی کوردستان کۆلکە زانکۆیەك بووە بۆ خۆی ، نالی خۆیشی لە نامەکەیدا بۆ سالم یەجگار زۆر بە شان و باڵیا دێ و ، بەتایبەتی بەشانازییەوە باسی حوجرەکەی خۆی تیا ئەکا . زیاد لەوە لە بەیتی دوهەمیشدا باسی ئاگردانی ناو حوجرەکە و دوکەڵی بە دۆزنج بۆی میچەکەشی ئەکا کە پیا شۆڕ بووەتەوە خوارەوە، لەشرانێ لە زستانی سولەیمانیدا خەڵوز گەشکردنەوە باو بووە ، نەك ئاگر کردنەوەی ناو ئاگردان . دووریشە لە سنە بووبێ ، چونکە حوجرەکانی ئەو سەردەمەی سنەیش حوجرەی پۆشتە و پەرداخ بوون و ئاگریان لە بوخاریدا تیا کراوەتەوە . لە سەرێکی کەشەوە کە نالی باسی گەرمای بەلێنی هاوینی ئەو شوێنە و سەرمای سەختی زستانی ئەکا ،

دۆدی سەرمیچی گوڵەنگی لەتلەتی دەسرازە کۆن
باڵ و دیواری بە میثلی لانکەی ئەجزا شکاو (٢)

---

دڵنیا نەبین کەوا نە سولەیمانییە و نە سنەیە . کەواتە ئەبێ حوجرەی مزگەوتی کوێرە دێیەك بوبێ . ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە کە نالی خۆی لە دوا بەیتەکاندا باسی (دۆکان) و (جەڕڕاح) و (طەبیب) ئەکا کە وا ئەگەیەنێ شوێنەکە ئاوەدانییەکی بێشکەوتو بووە ، لەوانەبو بڵێین باس باسی مزگەوتی خەرپانییە کە نالی لەوێ لای زانای گەورە شێخەوڵای خەرپانێ خوێندویەتی و هاوڕێی موفتیی زەهاوێ و مەلا یاسینی ئەشارێ و مەلا یوسفی ئەوێڵەیێ بووە ، نەخوازەڵا کە باسی گەرما و سەرماکەشی بۆ خەرپانێ دەست ئەدا چونکە خەرپانێ زستانێکی سارد و هاوینێکی گەرمی هەیە و شیعرێکیش لەمبارەیەوە هەیە ئەڵێ :

گر جهنم بود چو خرپانی
( وَقِنَا رَبَّنَا عَذَابَ النَّار )

واتە : ئەگەر دۆزەخ وەك خەرپانێ بێ ، خوایە بمانپارێزە لە ئاگری دۆزەخ . ✱

هەرچۆن بێ ئێستا ناتوانین بڕیار بدەین حوجرەکە حوجرەی کوێ بووە و ، مەگەر لەمەوپاش بە تەواوێ بۆمان ڕۆن بێتەوە .

تار و پۆیی (مم) و (کم) و (ت) و (مز) و (مب) و (اح) و (خا) : تار و پۆدی . (ك) : دار و پەردۆی . مەنکەبۆتە (چر) و (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مب) و (من) و (خا) و (خب) : مەنکەبۆلی . زۆرە (ك) و (اح) : زۆری . لێی کردۆمە داو (مم) و (گم) و (خب) : لیی کردۆم بە داو .

لەنێوان (قەفەس) و (کرۆمیە) و (داو)دا تەناسوب هەیە .

(٢) دۆد : دۆکەڵ . سەرمیچ : سەقف . دەسرازە : دۆ پارچە توماشی بەر و پشتدارە ، لۆکەی تێخراوە و بەتێکی هۆنراوەی ڕەنگاوڕەنگی پێوەیە ، منالی ناو بێشکەی پێ ئەپێچرێتەوە ، پارچە توماشەکان بەسەر سنگ و سك و قاچی منالەکەدا دێنەوە و ، بەتەکەش بەسەر ناوی بێشکەکە و

---

✱ مامۆستا شێخ بابەڕەسوڵی هەبابەیلێ ئەیگێڕایەوە کەوا ئەم بەیتە تاکی پارچە شیعرێکی درێژە . دۆر نییە هەر هی نالی بێ . ئەگەر ئەم پارچە شیعرە بدۆزرایەتەوە لەوانەبو ئەم پارچەیەی ئێرەشمان زیاتر بۆ ڕۆن بووایەتەوە .

هەر لە سەربان دار بە داری ڕایەڵی بژمێرە وەك
لا پەراسوی بارگیرێکی کە زیندو بێ بە ناو (٣)

---

غەوارەکەی نێوان کەڵەکانیا . لانکە : بێشکە .

واتە : دۆکەڵی سەرمیچی حوجرەکە کە بووە بە دۆرنج و بە دار و بەردووەکانیدا شۆڕ بووەتەوە ، ئەڵێی گوڵەنگی داڕزاوی دەسرازە کۆنە بە غەوارەی بێشکەدا شۆڕ بووەتەوە . بان و دیوارەکانیشی ئەڵێی بێشکەیەکن پارچەکانی شکابێ .

نالی لەم بەیتەدا وێنەیەکی جوانی پیشانداوە کە فەقێکانی لە بێدەسەڵاتیدا بەرابەر بەو زۆرە شەق و شڕە ، کردووە بە ساوای بێدەسەڵاتی پێچراوەی ناو بێشکە . زیادەڕەویەکی وردیشی کردووە کە حوجرەکەی شوبهاندووە بە بێشکەی شکاو چونکە ئەنانەت بێشکەی ساغیش سەربان و دیواری ئەوەندە نییە ڕێی هیچ بگرێ ، جا نەخوازەڵا بێشکەکە شکابێتیش ..

سەرمیچی (اح) و («پەراوێزی» خا) : میچی سەر . گوڵەنگی (جن) و (لد) : گوڵەنگەی . (خا) گوڵەنگە . لانکەی (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (مز) و (عب) و (اح) و (من) : لانکی . ئەشکونجێ لانکەی بێ .

(٣) ڕایەڵ : ئەو دارە ئەستورانەی بەسەر دیواری ئەم سەر و ئەو سەری خانوودا ڕائەکێشرێن و پاشان وردە دار و تەنکە بەرد و گەڵا و قوڕ و ئەمجار خۆڵیان ئەکرێ بەسەردا و بانەکەیان پێ دائەپۆشرێ .

ژماردنی داری میچ واتە ڕایەڵ لە زۆری هۆدەوە شتێکی ئاسان و عادەتییە ، بەڵام لە سەربانەوە ناکرێ ، چونکە داپۆشراوە . جا نالی ئەڵێ بانی حوجرەکەی ئێمە خۆڵ و قوڕ و تەنکە بەرد و وردە داری بەسەرەوە نەماوە ، تەنها هەر ڕایەڵەکانە و هیچی تر . بۆیە ئەتوانی هەر لە سەربانەوە داربەداری ڕایەڵەکانی بژمێری وەك لاپەراسوی ئێسترێکی لەڕ و لاواز کە هیچ گۆشتی پێوە نەبێ و هەر بەناو زیندو بێ و بە تەنها دەست پیا هێنانێ بتوانی پەراسووەکانی لە یەك جیا بکەیتەوە !

بارگیرێکی (چر) و (خا) : کۆنە ئەسپێکی . لە («پەراوێزی» چر)یشدا هەر : بارگیرێکی . ●

● بارگیر ڕاستە بەڵام ئێستر نیە مەبەس نارەسە نە بارگین و یا بوورشی بێ دەڵێن . ئەسپێك کە بە کار سواری نەیە .

زۆرو شەو خۆش خۆش لەباتیی کا گەڵای پێدا دەکەن
وەك گەڵارێزانی پایز یەك یەكی دەڕژێتە ناو (٤)

هەر لە ئیستاوە وەها سەرمای تێدا سەرما دەبێ
ژەنگە ناوی لێ بتێی چوار طاقی سەرما تێخزاو (٥)

ئاسمان هەورین دەبێ ، ئێمەش بە غەمگینی دەڵێین :
ئەی خودا چبکەین لەژێر ئەم کاولەی کەس تیا نەماو ؟! (٦)

---

(٤) لە کوردستانا عادەتە کە باران ئەبارێ و خانوو دڵۆپە ئەکا ، کای پیا ئەکەن و بە بانگردێن ئەیکێرن بۆئەوەی تۆزەکەی بنیشێتە سەر یەك و ناو دانەدا . نالی ئەڵێ حوجرەکەی ئێمە ئەوەندە شەق و شڕ بووە بۆئەوە ناشێ کای پیا بکەن ، گەڵای درەختی پیا ئەکەن وەك بڵێی تازە دارەڕا کرابێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەڵاکان یەك یەك ئەکەونە خوار وەك بڵێی گەڵارێزانی پایز بێ .

پێدادەکەن (کم) و (گم) و (من) و (عب) و (خب) : پێ وەردەکەن .

(٥) چوارطاق : جۆرە دەوارێکی چوار گۆشەییە .

واتە : هەر لەئیستاوە کە سەرما هێشتا بەتەواوی هێرشی نەهێناوە ، حوجرەکەی ئێمە ئەوەندە ساردە ، سەرما خۆی سەرمای ئەبێ تیایدا . ئەڵێی حوجرەکە دەواری چوار تاقە و سەرمای تێخزاوە ، بۆیە سەرما کە دێتە ژوورەوە ، بە هەرلایەکدا ئەڕوا تووشی سەرما ئەبێ .

زیادەڕەوییەکی ئێجگار بالایە ، نالی حوجرەکە ئەوەندە بە سارد بدالە قەڵەم ، تەنانەت سەرما خۆیشی سەرمای بێ تیایا .

ئەشکونجێ مەعناکەی هەر ئەوەندە بێ : هەر لەئیستاوە سەرما لە حوجرەکەی ئێمەدا ئەوەندە ساردە .. تاد .

وەها (چن) و (کم) و (عب) و (من) و (خا) و (خب) : وەهای . سەرمای تێدا (کم) و (عب) و (خب) : سەرما تێدا . (ت) : سەرمای تیا . (خا) : سەرما تیا . دەبێ (کم) . ئەبێ . لێخزاو (چر) : لێخراو .

(٦) هەورین : هەور پێوە بوو .

واتە : ڕووی ئاسمان هەور دایئەگرێ و ، ئێمەش پەژارە دامان ئەگرێ چونکە هەور نیشانەی بارانە و حوجرەکەی ئێمەش باران گل نادانەوە و، بۆیە بە دڵێکی خەفەتبارەوە ئەڵێین خوایە چیبکەین لەژێر میچی ئەم

ڕۆژی هاوینی وەها مثقالە ذەڕڕەی پڕ دەبێ
نیمە ذەڕڕێك سێبەری تێدا نیە غەیرمز هەتاو (٧)

فەصلی هاوینی جەهەنەم ، فەصلی ئێستای زەمهەریر
زەمهەریر کەی وا بە تەئثیرە و ، جەهەنەم وا بە تاو !؟ (٨)

---

حوجرە کاولەدا کە بۆنەوە ناشێ کەسی تێدا بمێنێ !؟

دەبێ (کم) : نەبێ . (گم) : دەبێ و . ئێمەش (چر) و (عم) و (کم) و (ك) و (اح) و (خا) : ئێمەیش. دەڵێین (کم): لەڵێین. خودا («بەراوێزی» چر) و (ك) و (عب) و (اح) : خودایا . (کم) : خوا . (من) : خودایە . لەژێر (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (خب) : لەدەس . («پەراوێزی» چر) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) : لەم . تیا نەماو (ت) و (عب) و (اح) و (خب) : لێنەماو . بەشێبەحالی (عب) بۆ (لێنەماو)یش دەستلەدا .

(٧) نیمە ذەڕڕێك : نیوە ذەڕڕەیەك .

واتە حوجرەکەمان ئەوەندە لەومەوە دوورە کە پێی بوولێ ژۆر ، بە ڕۆژی هاویندا تەنانەت ئەوەندەی مثقالە ذەڕڕەیەکیش شوێنی لیا نامێنێ خۆر نەیگرێتەوە و ، ئەوەندەی نیوە مثقالە ذەڕڕەیەك سێبەری تیا نیە ، هەمووی هەر خۆرە !

ذەڕڕەی (عم) : ذەڕڕە . نیمە (عم) و (مز) : نیوە . ذەڕڕێك سێبەری تێدا نیە (عم) و (عب) و (خب) : ذەڕڕێکی نیبە سێبەر تێدا . (ك) و (اح) : ذەڕڕێکی سێبەر تێدا نیبە . غەیرمز (چن) و (عم) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : غەیری .

لەم بەیتە لە (کم) و (گم) و (من)دا نیبە . لە هەموو نوسخەکانی بەردەستیشمانا لەم شوێنەدایە کە ئێمەش لیاماندا داناوە . بەڵام لامانوایە جێگای ڕاستەقینەی پاش بەیتی داهاتووە .

(٨) زەمهەریر : شوێنێکی ئێجگار ساردە لە جەهەنەمدا ، پلەی سەرمای لەئاستی گەرمای ئاگرەکەیدایە .

لەصل ـ ی یەکەم ـ (چن) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : وەقتی . ئێستای («بەراوێزی» چر و خا) و (چن) و (عم) : زستان . (خب) : ئێستا . بە تەئثیرە و (چن) و (ت) و (مز) و (اح) : بە تەئثیر و .

نەیری ئەعظەم وەها تاوی دەدا وەك مەنجەنیق

بۆ دەوامی زۆرپەرستی جەمعی حەربای دێتە ناو (٩)

---

(٩) نەیری ئەعظەم (النیر الاعظم) : ڕۆناکی مەزن ، خۆر . مەنجەنیق : ئامێرێك بووە لە شەڕەکانی کۆنا بەردی زل یا گوللەی ئاگریان پێ فڕێدەداوەتەوە ناو لەشکری دوژمنەوە . حەرباء : یەکێکە لە گیانلەبەرە خشۆکەکان ڕەنگی بەگوێرەی ئەو شوێنەی تیایەتی ئەگۆڕێ ، حەزی زۆر لە بەرخۆرە . کینایەیە لەو کەسانە کە بۆ هەر دەور و سەردەمێ بەرگی ئەو دەور و سەردەمە لەبەر ئەکەن .

واتە : خۆر بە هاویندا حوجرەکەمان وا تاو ئەدا ئەڵێی مەنجەنیقە . کۆمەڵەی حەرباکانیش کە حەزیان لە خۆرە ، بۆ بەردەوام بوونی زۆرپەرستی دێنە ناوی ، ڕۆی تێدا ئەکەنە خۆر ، چونکە خۆر لەم حوجرەیەدا لە هەر شوێنێکی‌کە کاریگەرتر و دیارترە .

زۆر ڕێی تێ ئەچێ مەبەستی نالی لە بەکارهێنانی وشەی (حەرباء) و ( زۆرپەرستی ) پلارگرتن بێ لە هەندێ لە فەقێکانی ئاوەڵی و، مەبەستی ئەوە بوبێ بڵێ ئەگەر لەبەر خۆ هەڵواسین نەبوایە بە مامۆستای حوجرەدا کە لە ڕۆی پایەی زانستەوە وەك زۆر وایە لەم حوجرەیەدا ، ئەو ئاوەڵە حەربا سیفەتانە نەئەهاتنە ئەم حوجرەیە کە بۆئەوە ئاشێ کەسی تیا بژێ . ئەگەر بگەینە ئەوە کە نالی ئەم شیعرەی لە خەرپانیدا وتووە لە خزمەتی شێخەوڵادا ، ئەم بۆچوونەمان باشتر ئەچەسپێ * .

دەدا (کم) و (خا) : ئەدا . زۆرپەرستی (مز) : ڕۆژپەرستین . جەمعی (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خب) : جینسی . حەربای (ك) : سەرمای . دێتە ( ت ) : تێتە ..

---

* مامۆستا شێخ بابەڕەسوڵی عەبابەیلێ ئەیگێڕایەوە کەوا بیستوویە لەناو فەقێ موستەعیدەکانی شێخەوڵای خەرپانیدا تا موفتیی زەهاوی لە مەجلیسدا بوبێ مەلا یاسینی ئەشارێ مافی قسەکردنی نەبووە و ، تا مەلا یاسین لە مەجلیسدا بووبێ مەلا یوسفی ئەوێڵەیێ مافی قسەکردنی نەبووە و ، تا مەلا یوسفیش لە مەجلیسدا بوبێ نالی مافی قسەکردنی نەبووە ، واتە : نالی پلەی چوارەمی بووە لەناویانا . لەوانەیە ئەم بەیتی « حەربا »یەش پەیوەندێکی بەم مەسەلەیەوە هەبێ ، هەروەها لەوانەیە پارچە شیعری « ئەحوەلی ئەفرەقە نەظەر ... »یش ، وەك لە شوێنی خۆیدا ئیشارەتمان بۆ کرد ، لایەکی ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕوون بکاتەوە .

دار و بەردی پەنجەرەی وەك ئەسجی بەیتی عەنکەبوت
مەنعی هیچ ناکا حەتا مێشیش کە خۆی لێدا بە تاو (١٠)

زۆری ئەرزە چەندە مینای دڵ شکێنە و سەر شکێن !
زۆری باران چەن شڕە و بێ عیصمەتە و ئابڕۆ تکاو ! (١١)

زۆری بەفر و با وەکـنا شە زۆری باران قوففەیە !
صاحیبی لازم کە بیبێ سەوڵ و کاسێکی شکاو (١٢)

کاسە بۆیە لازمە تا ئاردەلۆکی دەربدا
سەولی بۆیە لازمە نەك جۆگەلە بیبا بە تاو (١٣)

---

(١٠) نەسج : نەسیج ، ئەنراو . بەیت : ماڵ . حەتا : هەتاوەکو . تەنانەت .
بەردی (چن) و (من) : پەردۆی. (عم) و (ت) و (عب) و (اح) و (خا) : بەرد و . ناکا حەتا مێشیش کە (چن) و (ك) و (اح) و (خب) : ناکات و حەتتا مێش کە . (عم) و (ت) و (مز) : ناکات حەتتا مێش کە . (کم) و (من) و (صب) : ناکا کە حەتتا مێشیش . (گم) : ناکا هەتا مێشیش کە .

(١١) مینا : شوشە . عیصمەت : پاراستن .
واتە : کە ئەرزە لەبارێ ، شوشەی دڵ و ، سەرمان نەشکێنێ،چونکە هیچ نییە بەری لێ بگرێ . لە زۆری بارانیشدا شڕە ئاوی پێوە زاناوەستێ . بنیادەمی پێ ناپارێزرێ . ئابڕۆی تکاوە ، هەمو گیانی بەدمرەوەیە ، یاخود ئاوی بارانەکە کە نایگرێتە خۆی و پیا دێتە خوارەوە لابڕووە تکاوەکەیەتی .

زۆری ئەرزە چەندە مینای ( کم) : زۆر مینای چەند مینای . دڵ شکێنە و سەر شکێن (چر) و (خا) : دڵ شکستە سەر شکێن . (کم) و (گم) و (مز) : دڵ شکێن و سەر شکێن .

(١٢) وەکاشە : وەك ئاشە . قوففە : قوفە .
مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .
نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەی (خب)دا بەمجۆرەیە :
**زۆری بەرف و با وەکو ئاش ، زۆری باران قوففەیە**

(١٣) ئاردەلۆك : ئەوەی لە وردێ و سپێتیدا لە ئارد بچێ .

وەضعی ئاشی گەر نەبێ ، بۆچی دەبێ پڕ ئاردەڵۆك ؟!
طەبعی قوففەی گەر نەبێ ، بۆچی دەنیشێتە سەراو ؟! (١٤)

کاسەوو کەوچك ، حەسیر و بەڕ لە ئاودا هەروەکو
کیسەڵ و ماسی و جلە دێن و دەچن پرژ و بڵاو (١٥)

---

واتە : حوجرەکەمان لە زۆری بەفر بـارینا وەك ئاشی لێ دێ ، چۆن ئاش بەهۆی پڕۆشی ئاردەوە هـەموولایەکی سپی ئەکاتـەوە ، ئـەمیش بەهۆی بەفرەوە وایە . لە زۆری بارانیشدا ئەبێ بە قوفە و ئەکەوێتـە سەر ئاو . بۆیە هەرکەسێ خاوەنی ئـەم حوجرەیـە بێ و تیایـا بژێ ، پێویـستی بە کاسـەیەکە بەفرەکەی وەك ئارد پێ لابدا و ، سـەوڵێکیشی ئەوێ ئاوی پێ لابدا لە دەوری زۆرە سەر ئاو کەوتووەکە ، ئەوەك ئـاو بەئاو بیبا .

سەوڵی (چن) : قوففـە . بەڵام هەڵـەیە ، چونکـە زۆرەکە خـۆی کەوتووەتە سەر ئاو و بووە بە قوفە . لازمەـ ی بەکەم ـ (ت) و (خا) : پێدەوێ . تا (چر) و (مز) و (عب) و (اح) و (خا) : دا .

(١٤) وەضع : بار . طەبع : سروشت .

ئەم بەیتە وەك ( حوسنی تەعلیل ) وایە بۆ دوو بەیتەکەی پێشـەوەی . واتە : ئەگەر ئەم حوجرەیە وەك ئاش نییە ، بۆچی هەمیشـە پڕە لـە ئاردەڵۆك و ، ئەگەر وەك قوفە نییە بۆچی ئەکەوێتە سەر ئاو ؟ دیـارە وەك ئاش وایە بۆیە وا هەموو سوچێکی لەبەر ئاردەڵۆك سپی ئەکاتەوە و، وەك قوفە وایە بۆیە کەوتووەتە سەر ئاو .

وشەی ( وەضع ) ئیشارەتە بـە عیلمی ( وەضع ) کـە یەکێکە لـەو عیلمانەی فەقێ چەنـد کتێبێکی تیـا ئەخوێنن . وشـەی ( طەبع )یش ئیشارەتە بە بابەتی ( طەبیعیات ) کە بەشێکە لە عیلمی کەلام .

دەبێ ، دەنیشێتە ( کم ) : ئەبێ ، ئەنیشێتە .

(١٥) بەڕ : بەڕە . جلە : جڵتە ، بەمەرەبێ جۆرە بەلەمێکی گەورەیە .

نالی لەم بەیتەدا باسی کاسە و کەوچکی نان خواردن و حەسیر و بەڕە شڕی فەقێکان ئەکا کە لەناو زۆری حوجرەکەدا ئەکەونە سەر ئاو .

لەم دوو نیوە بەیتەدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

پرژ و (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (لك) و (اح) و (من) و (خب) : پرش و .

زۆر پڕە گوێمان لەبەر ئەنهار و جۆگە و هاژە هاژ
شەو نیە خەومان لەبەر قرژاڵ و بۆق و ڕاوە ڕاو (١٦)

ئەو دەلاقەی تێدەخا چشت و مەکی پێدا دەبـا
من لەوێ حەیران دەبم وەك ماڵ بڕاو و ماڵ براو (١٧)

حوجرەکە ئاوس بو ، وەعدەی خۆی بەهاری بۆ بڕێ
وەضعی حەملی کەوتە پایز ئابەکام و ناتەواو (١٨)

---

(١٦) ئەنهار : جەمعی ( نەهر )ە واتە جۆگە . هاژەهاژ : دەنگی ئاوە کە بەخوڕ بڕوا . ڕاوەڕاو : دەنگی بۆقە لەناو ئاودا .

واتە : نە بە ڕۆژ و نە بە شەو ســتار ناگرین . ڕۆژ لەبــەر خوڕەی ئاو و شەو لەبەر دەنگی قرژانگ و بۆقی ناو ئاوەکە . .

(١٧) دەلاقە : کون . کەلەبەر . پەنجەرە . مال بڕاو : لـەوەی کون کرابێتە دیواری ماڵی بۆ دزێ لێکردنی ، کینایەیە لە دزێ لێکران . ماڵ براو : ئەوەی دز ماڵیان بردبێ .

واتە : لەو ــ مەبەســتی لە ئــاوە ــ لــەولاوە کون ئەکاتــە دیواری حوجرەکە شتومەکی پیا ئەباتە ژوورەوە و لێیــەوە ئەباتــە دەرەوە و ، منیش لەملاوە ســەرسام ئەبم وەك کەسێك ماڵیان بڕیبێ و ماڵیان بــە تالان بردبێ ، نازانم چی بکەم .

ئەو (چن) و (عم) و (کم) و (ت) و (ك) و (مز) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : ئاو . تێدەخا (کم) : تێئەخا . دەبا (کم) : ئەبا . ماڵ بڕاو و ماڵ براو (چر) : ماڵ بڕاو و ماڵ بەراو . ئەم نوســخەیە (بەراو)ی بە (بەر ئاب) واتە : ( ســەر ئاو کەوتوو ) مەعنا لێداوەتــەوە . (چن) و (عم) و (کم) و (عب) : ماڵ براو و ماڵ بڕاو . (ت) و (ك) و (مز) و (اح) : مــاڵ دزاو و ماڵ براو . ( خا) : ماڵ بەراو و ماڵ بڕاو . ئــەم نوســـخەیەش مەعنای (بەراو)ی بە ( بەر ئاب ) لێداوەتەوە . ڕاستەکەی هەمو لەو نوسخانەی نوسیویانە (براو) و گیرە ( شەددە ) یان بۆ ( ر )کە نەکردووە لەوانەیــە مەبەســتیان ( بەراو ) بێ .

(١٨) ئاوس : دوگیان ، سكپڕ . وەضعی حەمل : لێ جیابونەوەی سك،منال بون . نابەکام : منالێ بەر لە پڕکردنەوەی نۆ مــانگ و نۆ ڕۆژەکــەی لەدایك بوبێ .

خۆ زگی نیشتۆتە ئەرضی و ، تۆمەزا هێشتاوەکۆ
نوطفەکەی هەر ئاو بو ، بەرباوێت لەبەر هەور و هەلاو (۱۹)

---

واتــە : وەك چــۆن ژنی دۆگیــان وردە وردە ســکی دەرئــەپەڕێ ، حوجرەکەی ئێمەیش وا سکی داێو ، لامانوابۆ تا بەهاری داهاتو خۆی زانەکرێ و لە بەهارا ئەزۆخێ . بەلام خۆی پێ ڕاگیر نەکرا ، هەر لــە پایزدا قەوماندی و سکەکەی دانا و لەباری‌چۆ و ڕۆخا ..

حوجرەکە (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مب) و (خب) : حوجرەمان . ئــاوس بو وەعدەی خۆی (عم) و (کم) و (گم) و (مب) و (من) و (خب) : ئاوس بووە وەعدەی .

(۱۹) زگ : سك . بەرباوێت : بەری‌ئاوێت ، بەری‌خست . ■

واتــە : حوجرەکەمــان لەبــەر ئەو هەمۆ لــاوەی لە ســەر بان و دیوارەکانیەوە هەلیمژیبۆ ، سکی نیشتبوە زەوێ ، ئەلوت ئافرەتی سك پڕە ، کەچێ کە بەهۆی هەور و هەلا و هەوای ناسازەوە تلیــایەوە و لەبێ ، بۆمــان دەرکەوت نوطفەکەی ناو سکی هێشتا هەر ئاو بۆ نەبوبۆ بە خوێن و گۆشــت ..

پەیوەندی ( بەرهاویشتن ) بە هەور و هەلاوە لەم بەیتەدا لەوەوەیە کە گەلێ جار وائەبێ چرۆ و گوڵی تازە دەرکەوتوی درەخت بــەهۆی بــا و بارانەوە ئەوەرێن و ئەکەونە خوار و ئیتر ئەوە وەك منالْ لــەبارچوون ، وایە بۆ درەختەکان .

نالی لەم‌بەیتەدا ئەوەی هێناوەتەوە پێش چاو کە زۆر جــار وائەبێ ســەربانی خانوی قوڕی لادێکــانی کوردەوارێ بــارانێکی زۆری لیــا ئەوەستێ و ســەربانەکە چاڵ ئــەبێ و وردە وردە دیــوار ئــەو ئــاوە هەلئەمژێ و لەئەبێ . جا کە ڕۆخا دیارە چێ ئاو لەسەر بانەکە مــاوە هەمۆی ئەرژێ وەك بلێی لە سکی دیوارەکەوە ڕژابێ . ئــەو نوطفــە و سك و بەرخستنەی نالی لەم بەیتەدا پیشانی داوە ئەمەیە .

لەم بەیتەدا چوار ئیــستیعارەی موســەڕەحە هەیە لە (ئاوس بون) و (زان) و (وەضعی حەمل) و (نابەکامی)دا .

تۆمــەزا (عم) و (گم) : نەزا . (کم) و (خب) : تومــەز . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ (ئەرضی و) بە ( ئەرضییو ) بخوێنرێتەوە .

■ کورد دەلێ : ژن منداڵی لە بەر چوو نالێ بەری ئاوێت بەر ئاوێتن تەنیا بۆ ئاژەڵ دەکوترێ . باشماناى لێ نەدراوەتەوە .

ئاسمان تەرزەی کە لێدا ، بەردەبارانمان ئەکا
سوختەکانمان ڕادەکەن ، پالتۆ پساو و قۆن دڕاو (٢٠)

ڕادەکەن بۆ جانیبی دوککانی جەڕڕاح و طەبیب
چاك و دامەن هەڵکراو و ، سەر شکاو و تەنگەتاو (٢١)

لوطفی بانگوش بۆ کەوا لەم حوجرەدا زانادمان
گەر بەنێ ئادەم بخنکێنن ، سەراوە نەك بناو (٢٢)

---

(٢٠) سوختە : فەقێ لە پلە سەرەتاییەکانی خوێندندا . لەوان بەرەوژوورتر (موستەعیدد)ە. سیستەمی خوێندنی حوجرە وابوو سوختە ئیش و کاری نان و چێشت کۆکردنەوە و گسك لێدانی حوجرە و قاپ و قاچاخ شتن و چا لێنانیان بەجێ‌لەهێنا و موستەعیدد ئیشیان نەئەکرد . سوختە لای موستەعیدد ئەیان‌خوێند و موستەعیدیش لای مامۆستا . پالتۆ : لاپاڵ ، لا پەراسووەکان .

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی داهاتوو پێکەوەدێ .

تەرزەی کە (چر) و (کم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خب) : تەرزێکی یا تەرزەیکی . (مم) : تەرزەیکی . (گم) : تەرزێکی . لێدا (مم) و (مز) و (عب) : لێدا و . بەردەبارانمان (ت) و (خا) و (مز) : بەردەبارانی. دەکا (کم) : ئەکا . پساو : (چن) . نوسخەکانی‌تر هەمو : شکاو . چونکە وشەی (شکاو) لە بەیتی داهاتوودا دوبارە بووەتەوە ، ئێمە (پساو)مان لێرەدا پەسەند کرد . قۆن (کم) و (گم) و (من) : قنگ .

(٢١) جانیب : لا . جەڕڕاح : ئەوەی ئیماری زام ئەکا . طەبیب : ئەوەی ئیماری نەخۆشی ئەکا .

واتە : کە تەرزە ئەبارێ تەرزەکەی ئەوەندە زل و ناقۆلایە سەری بنیادەمی پێ ئەشکێ . بۆیە سوختەکان بە سەر و پەراسووی شکاو و قنگی دڕاوەوە ، چاکی لێنەکەن بەلادا و داوێنیان هەڵئەکەن و بە هەڵەداوان ڕائەکەن بۆ دوکانی جەڕڕاح و حەکیمەکان ئیمارێکیان بکەن .

ڕادەکەن (کم) و (من) : ڕائەکەن . دوککان (چر) : دوککان و . چاك و (چر) و (عم) و (ت) و (ك) و (مز) و (عب) و (اح) و (خب) : چاکی . دامەن (چن) و (ك) : داوێن . (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (خا) و (خب) : دامێن .

(٢٢) زانادمان : زانیمان .

چرلکە ئەتکرد قوڕ بە سەریا تاوەکو تەسکین بێ
مەیدەرە بەر پێلەقە ، توخودا ، بلا بگری بە تاو ! (٢٣)

---

واتە : پیاوەلیی بانگوش بو بانەکەی نەگێرا و ، بەهۆی ئەوەوە بانەکە دلۆپەیەکی زۆری کرد و ، ناوەوەی پڕ بۆ لە ئاو و ، ئێمەش کەوتینە سەر ئاو و خنکاین و ، لەم حوجرەدا بۆمان دەرکەوت و زانیمان کەوا خنکاو ئەکەوێتە سەر ئاو و ناکەوێتە بنی .

بانگوش (مم) : بانکوت . حوجرەدا (مم) و (گم) : حوجرەیە . زانانلمان (چر) : زانانمان .

(٢٣) نالی لەم بەیتەدا ڕۆنەکانە بانگوشەکە، کە دیارە لە ناوەختا هاتووە بانەکە بکوتێتەوە و ، لە کاتی پێویستا بە قوڕ سواغی نەداوە تا کە باران باری دلۆپە نەکا .. پێی ئەڵێ : تۆ لەکاتی خۆیدا ئەحاتی توز بکەی بەسەریا تا بۆ خۆی داسەکنێ و ئۆقرە بگرێ ، ئستایش لێی گەڕێ ، دەس‌مەکە بە کوتانەوەی و پێلەقەی لێ مەدە ، توخوا با بۆخۆی بەتاو بگرێ و هەر دلۆپە بکا ..

پەیوەندی ( قوڕبەسەراکردن ) و ( تەسکین‌بۆن ) لەوەوەیە کە ئافرەتی تەعزیەبار ، کەف و کوڵی گریانی ئەنیشێتەوە ، بەڵام قوڕی بە سەر و شانەوە هەر ئەمێنێ . جا ئەگەر قوڕی نەدابێ لە سەر و شانی ، ئەوە وائەگەیەنێ هێشتا تازە سوێیە و لە گەرمەی گریاندایە .

لەم‌بەیتەدا دۆ ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە لە (قوڕ بەسەراکردن) و (گریان)دا .

نەبۆنی نازناو لە نوسخە پشت پێ‌بەستراوەکانی ئەم پارچە شیعرەدا* و گواستنەوەکەی نالی لە باسی غائیبەوە بۆ خیطاب و تۆی دەم لێ‌کردن ، لەوانەیە نیشانەی ئەوە بێ کە پارچە شیعرەکە ناتەواو بێ و چ لە پێش دوابەیت و چ لەدوایەوە لێی فەوتابێ .

نالی لەم پارچە شیعرەیدا چوار تەعبیری کوردیی بەکارهێناوە ، ئەوەندەی ئێمە ئاگامان لێ بێ بەر لەو کەس بەکاری‌نەهێناون : (١) لە بەیتی یەکەمدا تەعبیری ( کون تێیە ) واتە : کە کونی تیایە . (٢) لە بەیتی پێنجەمدا تەعبیری (وەها سەرمای تێدا سەرما دەبێ) کە ئەبۆ بیوتایە :

---

* ئێمە لەوباوەڕەداین ئەو نوسخانەی نازناویان تیایە ، نوسیارەکان خۆیان گۆڕیویانە ، چونکە داڕشتنی دوا بەیت لەو نوسخانەدا هونەرمەندانە نییە .

— ٢ —

هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بێ
چونکە ئەمەلت زۆرە ، چ عومرێکی کەمت بێ ! (١)

---

وەها سەرما تێیدا سەرمای دەبێ . (٣) لە بەیتی شەشەمدا تەعبیری (هەورین) کە ئێمە ئەڵێین : هەوری پێوەیە . (٤) لە بەیتی بیست و دۆهەمدا تەعبیری (زاناندمان) کە فیعلی جوڵاو (متعدی)یە و ئەو لەجیاتی نەجوڵاو (لازم) بەکاری هێناوە .ئەمانە هەمو نیشانەی دەوری نالین لە بوژێنەوە بردنی زمانی کوردیدا .

چونکە (کم) و (گم) و (من) : تۆ کە . نەلکرد (مز) و (خا) : نەیکرد . ئاوەکو ئەسکێن بێ (چن) : تا وەکو تەسکێن بێ . (مم) : نالی تا تەسکینی بێ . (کم) و (گم) و (من) : نالییا تەسکینی بێ . (ت) و (مز) : ئاوەکو تەسکێن دەبێ . (مب) و (خا) : ئاوەکو ئەسکینی بێ . پێ‌لەقە ( ت ) و (ك) و (اح) : پێ‌لەقان . تۆخودا (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (من) : تۆخوا. بلا (مز) : بلێ. بەئاو (چن) و (مم) و (مز) و (مب) و (اح) و (خا) : تەواو .

— ٢ —

(١) خضر : خدری زیندە کە مەشهورە ئاوی حەیاتی خواردووەتەوە و تا قیامەت نامرێ . جامی جەم : ئاوێنەکەی جەمشید کە مەشهورە هەمو دنیای تیا دیوە .

واتە : هەرچەند عومری خدری زیندەشت بۆ بنوسرێ و وەك جەمشید خاوەن شکۆ و پایە بێ ، مادام ئاوات و هیوات زۆرە و هەرگیز نابڕێتەوە و هەموی نایەتەدێ ، عومرت عومرێکی کەمە ، چونکە عومری زۆر لەوەیە بنیادەم هەمو ئاواتەکانی تیا بێتەدێ و ، ئەوەش هەرگیز نابێ . ئەم بەیتە ئیشارەتە بە حەدیثێکی پێغەمبەر کە ئەفەرموێت : «یشیب ابن آدم ویشب فیه خصلتان : الحرص وطول الامل» واتە : بنیادەم پیر ئەبێ ، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ پیربونەکەیدا دۆ خەسڵەتی تیا گەنج ئەبێتەوە : تەماع و هیوای دوور و درێژ .

لەنێوان (جام) و (جەم)دا بێجگە لە تەناسوب جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (جەم) و (کەم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

زۆرە (مز) : زۆر بو .

ئەی جامیعی دونیاوو قیامەت بە خەیاڵات
ئەو ڕۆژە کە مردی ، نە ئەوت بۆ و نە ئەمت بۆ ! (٢)

بێزارە لە تۆ ئێستە ، هەماغۆشی عەدۆتە
دونیا ، کە دوێنێ حەرەمی موحتەرەمت بۆ ! (٣)

دوێنێ چ بو دەتدا بە زوبان لافی کەرامەت ؟!
ئەمڕۆ نەدەمت بۆ ، نە دەمت بۆ ، نە دەمت بۆ ! (٤)

---

(٢) واتە : ئــەی ئەوکەســەی کە بــە خەیــاڵ دنیایش و قیامـەتیشت کۆکردبوەوە و بردبوونەوە ، ئەو ڕۆژەی کە مردی هیچیانت پێ نەبڕا ، چونکە دنــیا و قیامــەت دژی یــەکن و بنیــادەم ئەبێ هــەر هەوڵی یەکێکیان بدا .

لە هێنــانی ( نە ئــەوت بۆ و نــە ئەمت بۆ )دا بــەدوای (دونیا) و (قیامەت)دا لەف و نەشری موڕەتتەب هەیە .

ڕۆیت (چن) و (ت) و (اح) و (عب) : ڕۆیی . (هم) و (ك) : مردی .

(٣) هەماغۆش : هەمئامێز ، هاوباوەش . حەرەم : ژن .

واتە : دەســەڵات و سامانی دنیا کە تا دوێنێ وەك ژنی خۆت لەژێر دەســەڵاتدا بو ، ئەمڕۆ کە مردۆی لێت بێــزار بووە و پەیوەندی پێتەوە نەماوە و لە باوەشی دوژمنەکەتدایە !

دوێنێ (چر) و (مز) و (خا) : بەموشرەت . ( « پەراوێزی » چر ) : لەلای خــۆت . (کم) و (گم) و (من) و (عب) : لەکــن خۆت . (ت) : بەحورمەت .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشو لە نوسخەی (عب)دا لەجێی یەکتردان .

(٤) لاف : هاش و هۆش . نەدەم : پەشیمانێ . دەم ( ی یەکەم ) : دەمی قســەکردن . دەم ( ی دۆهەم ) : هەناســە .

واتە : تا دوێنێ کە بە ســەر زیندۆ بۆی ، بە ڕاســت و چەپدا لاف و گەزافت لێئەدا و خــوت ئەبێ کەســت بە هیــچ نەئەزانێ . ئەمــڕۆ کە ڕاســت و ڕەوان بەرابــەر بە دەســەڵاتی مەرگ وەســتایت و هیچت لەئاستیدا پێنەکرا ، لەو هەمو لاف و گەزافە پەشیمان بویتەوە و ، نە توانیت هەناسەیەك بدەیت و نە دەمت کوی کرد هیچ بڵێ .

عومرت ئەفەسێکی کە هەمۆ عالەمی دێنـا
بمرە لە غەمیدا کە هەمۆ صەرفی غەمت بۆ (٥)

وەك شەڵتە پەین گەهـ پڕ و گەهـ خالیە بەطنت
صەوم و ئەمەلت باعیثی ئەفس و شکەمت بۆ (٦)

---

ئەشکونجێ (ئەدەمت)ی دوایێ بە مەعنا پەشیمانێ بێ .

لەنێوان هەر سێ (ئەدەمت)دا جیناسی تەرکیب و ، لە بەکارهێنانی (دەم)دا بە دۆ مەعنا ئیشتیراك و ، لەنێوان (دەم)ی بە مەعنا (هەناسە) و (دەم)ی بە مەعنا (زوبان)دا تەناسوب هەیە .

دەلێدا بە زوبان لافی کەرامەت (چر) و (عب) و (خا) : دەلێدا بە زوبان لافی کەرامات . (ت) : لافی ئەفەس و زاری کەرامەت . (ك) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : ئەفەس و حوسن و ــ یا حوسنی ــ کەرامات .

(٥) ئەفەسێکی : هەناسەیەکی . دێنا : ئەهێنا .

واتە : زیانت کە تاقە هەناسەیەکی ــ بە خەیالی خۆت ــ هەمۆ جیهانی ئەهێنا ، لە خەفەتیدا بمرە چونکە هەموت لە خەم و پەژارەدا بەسەربرد .

ئەفەسێکی (چر) و (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (خا) : ئەفەسێکە . کە (کم) و (گم) : لە . دێنا (چر) و (عم) و (ت) و (خا) : دونیا . (مز) : بالا .

(٦) شەڵتە : دەفرێکی دۆلایی شاش تەنـراوە وەك ڕەشکە ، پەین و کا و شتیوای پێ ئەگوێزنەوە . گەهـ : جار جار . بەطن : سك . صەوم : ڕۆژۆ . شکەم . سك .

واتە : سکت خالێ بێ یا پڕ بێ لە خۆراك ، لە هەردۆ حالەکەدا هەروەك شەڵتەی پەین وایە کە جاریوا هەیە خالیە و جاریواش هەیە پڕە ، چونکە ڕۆژۆ گرتن و هیوای ئەو دنیات هیچیان لە نیازی خاوێنەوە نین ، ڕۆژووەکەت بۆ ئەوە ئەگرێ و سکتی پێ هەڵئەگوشێ ، لە بەرباندا دۆ قاپی زۆر بخۆیت و ، هیوای ئەو دنیاکەشت بۆ ئارەزۆی ئەفستە کە بەتەمای زیانی خۆشتری . ئەگینا خوا پەرستی ڕاستەقینە ئەوەیە بە بێ ئامانج خوا بپەرستێ ، وەك حەزرەتی عومەر لە فەرمودەیەکیدا لەبارەی صوهەیبی ڕۆمییەوە ئەفەرموێت : « نِعمَ العبدُ صُهَيبٌ ، لوْ لَمْ يَخَفِ اللهَ لَمْ يَعْصِهِ » واتە : صوهەیب بەندەی چاکە،ئەگەر

« نالی » چییە وا میثلی جوعەل غەرقی شیاکەی ،
خۆ تۆ بە حیسابی وەکو پەروانە شەمت بۆ !! (٧)

— ٣ —

تا فەلەك دەورەی نەدا — صەد کەوکەبی ئاوا نەبۆ —
کەوکەبەی میهری موبارەك طەلعەتی پەیدا نەبۆ (١)

---

لە خواش نەترسایە بێگوێیی نەئەکرد .

لەنێوان (بەطن) و (شکەم)دا تەرادوف و ، لە هێنانی (نەفس) و (شکەم)دا بەدوای (صەوم) و (ئەمەل)دا لەف و نەشری موشەوەوەش هەیە .

ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەی (چر)دا هەیە .

(٧) جوعەل : قالۆنچە . شەم : شەمع ، مۆم .

واتە : نالی چیت لێ قەوماوە ، بۆ وا گۆڕاوی ! بۆ وا وەك قالۆنچە لە شیاکەی دنیادا نوقم بووی ! خۆ تۆ بە سەنگ و تەرازوی دلدارە ڕاستەقینەکانی وەك پەروانە مۆمێکت هەبۆ بۆ خۆت ڕۆت لێ نەکرد و لەپێناویا نەسوتای ، بۆ وا ئێستا خەریکی کاری پەست و نەویت !

نەشکونجێ (بە حیسابێ) بێ و بەوجۆرەش مەعناکەی دێت .

— ٣ —

نالی ئەم پارچە شیعرەی بەبۆنەی کۆچی دوایی سلێمان پاشا و لەسەر تەختی بابان دانیشتنی ئەحمەد پاشاوە وتووە . ئەم پارچە شیعرە بایەخێکی تایبەتی هەیە چونکە ئاقە پارچە شیعرێکی نالییە ئیشارەتی بە مێژوی ڕوداوێك تێدا کردبێ .

(١) فەلەك : ئاسمان . دەورە : خول . صەد : هەرچەند . کەوکەب : ئەستێرە . کەوکەبە . شان و شکۆ . میهر : خۆر .

واتە : تا ئاسمانی ژێن خولی خۆی تەواو نەکرد و مانگی سلێمان پاشا ئاوا نەبۆ ، هەرچەند ئەستێرەکانی دەور و پشتیشی هەر مانەوە و ئاوا نەبون ( مەبەست لە ئەستێرەکان شازادەکانی تری بابانە ) ، شان و شکۆی خۆری هەڵاتی — بەرزی ئاسمان کە ئەحمەد پاشایە ، دەرنەکەوت .

تا نەگریا ئاسمان و ، تەم وڵاتی دانەگرت ،

گوڵ چەمەن ئارا نەبو ، هەم لێوی غونچە وا نەبو (٢)

---

ئەشکونجێ ڕستەی ( صەد کەوکەبی ئاوا نەبو ) جوملەی موعتەرەضە نەبێ و وەڵامی جوملەی پێشو بێ و (صەد) کینایە بێ لە (زۆر) و مەعنای نیوە شیعرەکە وای لێ بێتەوە : تا ئاسمان خولی خۆی تەواو نەکرد و هەمو ئەستێرەکانی ئاوا نەبون بەهۆی نزیك بونەوەی هەڵهاتنی ڕۆژی ئەحمەد پاشاوە .. لەمحاڵەدا مەبەست لە ئاوابونی ئەستێرەکان بەشێ‌بەحاڵی سلێمان پاشا مردن و ، بەشێ‌بەحاڵی میرزادەکانی‌تری بابان دەرنەکەوتنیانە لە ڕۆژی ئەحمەد پاشادا .

نالی بۆیە وەها باسی خۆری ئەحمەد پاشـای کردووە ، ناوی مانگی سلێمان پاشای نەهێناوە و هەر ئەوەندەی بە بەس زانیوە کە ئیشارەت بۆ سوزانەوەی ئاسمان بکا ، چونکە ئەیویستووە وا پیشان‌بدا کە سلێمان پاشا لە ئەحمەد پاشا کەمترە ، کەچێ لەولاشەوە بە وەصف کردنی ئەحمەد پاشا بە خۆر دەری‌خستووە کە ئەم لەو گەورەتر و پایە بڵندترە .

دەورەی (عم) و (ك) و (عب) و (من) و (خا) : دەوری . ئەمیش ئەگونجێ (دەورەی) بێ . کەوکەبی ( « پەراوێزی » چر و خا ) و (چن) و (کم) و (گم) و (اح) : کەوکەبەی . (ت) : کەوکەبە . کەوکەبەی (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (من) و (خا) و (خب) : کەوکەبی . ئەمیش ئەگونجێ (کەوکەبەی) بێ . میهری (عم) : ماهی . طەلعەتی (عم) و (کم) و (گم) و (مز) و (اح) و (من) و (خب) : طالیعی .

(٢) چەمەن ئارا : چیمەن ڕازێنەوە . وا : کراوە .

واتە : تا ئاسمان لە خەفەتی مردنی سلێمان پاشادا دەستی نەکرد بە گریان و ، بارانی فرمێسکی خۆی نەڕژاند بەسەر زەویدا و ، تەمی هەناسەی ساردی وڵاتی بەبەی دانەگرت ، چیمەنی سولەیمانی و دەور و پشتی بە گوڵی ئەحمەد پاشا نەڕازایەوە و خونچەی لێوی پادشاهی نوێ نەپشکوت .

چەند وێنەیەکی جوانە : لەئەنجامی گریان و فرمێسك ڕشتن و تەماوی بونی وڵاتەوە ، چیمەن بە گوڵ بڕازێتەوە و لێوی خونچە بپشکوێ .

لێوی غونچـە (گم) : لێوی خونچە . (ك) و (مز) و (اح) و (خب) : غونچە لێوی .

تا چەمەنپیرا لە سەر ، ئەصلی دەرەختی لانەدا ،
فەرعی تازە ، خوڕڕەم و بەرز و بولەند بالا نەبۆ (٣)

تا ( سولەیمانان ) نەبۆنە صەدری تەختی ئاخیرەت ،
( ئەحمەدی موختار )ی ئیمە شاهی تەخت ئارا نەبۆ (٤)

---

(٣) چەمەن پیرا : وشەیەکی فارسییە واتە ئەوەی باخ ئەڕازێنێتەوە ، باخەوان . فەرع : لق . خوڕڕەم : تازە و تێراو .

واتە : تا باخەوانی قەدەر ساقی دەرەختی ، لای سەرەوە نەبڕیەوە کە سلێمان پاشایە ، لقی تازە کە ئەحمەد پاشایە تێراو نەبۆ و بالای بەرز نەبۆ و هەڵنەچۆ . نالی بەم وەصفەی ئەحمەد پاشا ئەیەوێ بلێ پادشای تازە بۆیە وا وەك لقی تێراو و بالابەرز و گەش و هەڵچۆ وایە ، چونکە ڕیشە و ساقەکەشی هەر وا بووە و دیارە گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە .

تا چەمەن پیرا لە سەر (چر) و (عب) و (خا) : تا چەمەن پیرانەچۆی . وابزانین هەڵەی نوسیارە و ڕاستەکەی بەمجۆرەیە : تا چەمەن پیرا نەچۆ . ( « بەراوێزی » چر و خا ) و (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مز) و (اح) و (من) و (خب) : تاچەمەن پیرانە سەر . تازە خوڕڕەم و بەرز و (چر) و (اح) و (خب) : تازە خوڕڕەمی بەرز و . (کم) و (من) : تازە خوڕڕەم و بەزمی . (گم) : تازە و خوڕڕەم و بەرزی . (مز) : تازەی خوڕڕەمی بەرز و . (خا) : تازە خوڕڕەم و بەرزی .

(٤) صەدر : جاران لەقەبی سەرۆکی وەزیران بووە . ئاخیرەت : ئەو دنیا .
واتە : تا سولەیمانەکان لەو دنیا نەبۆن بە سەرۆك وەزیرانی تەختی پادشاهی ، ئەحمەدی موختاری لای ئێمەش نەبۆ بە شاهی تەخت ڕازێنەوە .

نالی لەم بەیتەدا لە یەلوکالدا ویستویە (سولەیمانەکان) بۆ حەزرەتی سولەیمان و بۆ سلێمان پاشای بابان و لەوانەیە بۆ سولەیمان ناریش بەکاربێنێ . هەروەها ویستویە مەبەستی لە (ئەحمەدی موختار) پێغەمبەریش (د.خ) و ئەحمەد پاشای بابانیش بێ . زۆر جوانیشی هێناوەتەوە ، چونکە ئەگەر مەبەستی لە سولەیمان حەزرەتی سولەیمان و ، لە ئەحمەدی موختار پێغەمبەر بێ ، ئەوا حەزرەتی سولەیمانی کرد بە وەزیر و پێغەمبەری کرد بە شا . هەروەها ئەگەر مەبەستیشی سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا بێ وا ئەحمەد پاشای لە

قیصصه بێ پەردە و کینایەت خۆشە : شاهی من کەوا
عادیلێ بۆ قەت عەدیلی ئەو لە دنیادا نەبۆ ، (٥)

بۆ نشینگەی مورغی ڕۆحی ئەو کە عالی فیطرەتە
جێگەیێ خۆشتر لە ڕەوضەی ( جنة المأوی ) نەبۆ (٦)

وەك قیاسێکی کە موثبەت بێ ، نەتیجەی پێتەچێ
حەمدو لیللا شەهـ کە عالی جا بو ، خالی جا نەبۆ (٧)

---

سلێمان پاشا بە گەورەتر دانا .

نەبۆنـــە (چــر) و (خـــا) : لە بـــۆتەی . تەخت ئـــارا (ك) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : نەخرئارا .

(٥) قیصصە . قـــــە . بێپەردە و کینـــایەت : ئاشـــکرا و بێپێچوپەنا . عەدیل : هاوتا ، هاوڕێ .

مەعنای ئەم بەیتەو بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .

ئەو (چر) و (چـــن) و (کم) و (ت) و (عـــب) و (من) و (خـــا) : وا .

(٦) نشـینگە : جێگای تیا دانیشتن . عالی فیطرەت : ئەوەی خوا بە بەرزێ دروستی کردبێ . مـــورغ : پەلەوەر . ڕەوضـە : باخ . جنـــة المأوی : بەهەشت .

واتە : بـــا ئیتر قـــسەکردن بـــە کینایە و پێچوپەنا بـــەس بێ . قــــە بەئاشکرا خۆشـە و مەســـەلە مەســـەلەی کۆچی دوایی سـلێمان پاشا و لەسەر تەخت دانیشتنی ئەحمەد پاشایە . سلێمان پاشای پادشاهی من کە دادپەروەرێکیوا بۆ هاوتای لە جیهاندا نەبۆ ، کۆچی دوایی کرد و ، شوێنێکی ئەوتۆ شایانی ئەوە بێ مەلی ، خوا بە بەرزێ دروست‌کردۆی ، گیانی پاکی ئـــەوی تیا بنیشێتەوە و بحەسێتەوە ، لــــە باخی بەهەشت بەولاوە نەبۆ ، بۆیە بەهەشت بۆ بە جێی .

بشێ ئەم بەیـــتە ئیشارەتێکی بۆ ئەوە تیا نەبێ کــــە سلێمان پاشا بە جۆرێکیوا مردبێ ، پێشـــــان وبـــــترابێ هەوالی مردنەکەی تا ماوەیەك بشارنەوە ؟

بۆ نشـینگەی ( « پەراوێزی » چر ) و (خا) : بۆ نیشـانگەی . دیـــان ( « پەراوێزی » چر ) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (خب) : نەشئەگاهی . (عم) و (کم) و (من) : بۆ نیشـانگەی . ڕەوضـــەی (چر) و (کم) و (من) و (عب) و (خا) : باغی . (کم) : باخی .

شاهی جەم جا « نالیا » ( تاریخ جم ) تەئریخیە
دا ئەڵێن لەم عەصرەدا ئەسکەندەری جەم جا ئەبێ (٨) *

---

(٧) قیاسی موئبەت : لە عیلمی مەنطیقدا (قیاس) بە دوو ڕستە ئەڵێن هەریەکی لای کەمی لە دوو وشە پێکدێن . جا ئەگەر هەردوو ڕستەکە مەعنای بوونیان ئەگەیاند ، ئەوە قیاسەکە قیاسی موئبەتە و دیارە ئەنجامەکەشی هەر بوون ئەگەیەنێ .

واتە : وەك چۆن نەتیجەی قیاسی موئبەت بە ناچاری ئەبێ بێتەجێ ، لە سایەی خواوە سلێمان پاشاش چونکە پیاوێکی پایەبەرز بوو ، پیاوی پایە بەرزیش جێگای کوێر نابێتەوە ، جێگای کوێر نەبووەوە و پایە بەرزێکی وەك ئەحمەد پاشا جێگای گرتەوە .

لە سەرێکی‌کەشەوە ، نالی لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا ئەیەوێ بڵێ زیاتر وایە پیاوی پایەبەرز وەچەیەکی وای لەپاش بەجێ‌نامێنێ بەوەندە پایەبەرز بێ جێگەکەی بگرێتەوە . بەڵام سلێمان پاشا وا نەبوو ، لەگەڵ ئەو پایە بەرزەشیدا کە بووی ، پایەبەرزێکی وەك ئەحمەد پاشای کوڕی لێ بەجێ‌ما جێگەکەی گرتەوە .

پەیوەندی نێوان (عالی جا) بوون و (خالی جا) نەبوون لەوەوەیە بنیادەم کە لە جێگایەکدا دانیشتبێ دیارە ئەو جێگایەی گرتووە و ، کە لەو جێگایە بەرز بووەوە دیارە جێگاکەی چۆڵ ئەبێ چونکە خۆی چووە بۆ جێگایەکی بەرزتر . نالی ئەڵێ : بەڵام سلێمان پاشا وانەبوو ، هەرچەند بەرز بووەوە بۆ جێگایەکی بەرزتر لە تەختی شاهی کە بەهەشتە ، شوێنەکەی خۆی بە خالی نەمایەوە ئەحمەد پاشای تیا دانیشت .

بێتەجێ (چر) و (عب) : حاصلی . ( « پەراوێزی » چر ) : بێتەدی . لە ( « پەراوێزی » چر )دا (بێتەجێ)یش هەیە .

لەنێوان (عالی‌جا) و (خالی‌جا)دا جیناسی لاحیق هەیە . لە نیوەی دووەمی بەیتەکەشدا حوسنی تەعلیل هەیە بۆ نیوەی یەکەمی .

(٨) جەم‌جا . جێ‌نشینی جەمشید .

واتە : سلێمان پاشا کە پادشایەك بوو جێگەی جەمشیدی گرتبووەوە ، مێژووی مردنی بە حەرفی ئەبجەد ئەبێ بە ڕستەی (تاریخ جم) کە ئەکاتە ١٢٥٤ . بۆیەش ئەم ڕستەیە بوو بە تەئریخی کۆچ‌کردنی ، تا کەس نەڵێ لەم چەرخەدا پادشایەکی‌تری وەك ئەسکەندەر نەبوو جێگەی جەمشید بگرێتەوە ، ئەگەر سلێمان پادشا جێ‌نشینی جەمشید نەبوایە تەئریخی

* لەم سەرەوە جوانە دەر دەکەوێ کە نالی لە ١٢٥٤ دا گەیوەتە پۆپەی هەرە بەرزی شاعیری و عالمی کەوا بوو دیارە تەمەنی بەرە ژوور چووە .

— ٤ —

دڵ شیشەیی پڕ خوێنی فیراقی ، فەرەقی بۆ
مەکسوری زۆقی بەو دڵی وەك بەردی زەقی بۆ (١)

---

مردنی نەئەبوو بە (تاریخ جم) . مەبەستی ئەوەیە بڵێ سلێمان پاشا ، تەنانەت ساڵی مردنەکەشی هەر وا ئەگەیەنێ سەردەمی ئەو سەردەمی جەمشید بووە .

حورۆفی ئەبجەد هەر حەرفەکانی ئەلف و بێن بە جۆرێکیتر ڕیز کراون : ( ابجد ، هوز ، حطي ، كلمن ، سعفص ، قرشت ، ثخذ ، ضظغ) . نۆ حەرفی یەکەمیان یەکان (آحاد) و ، نۆی دووەمیان دەیان (عشرات) و ، نۆی دواییان سەدان (مئات)ن . بەمپێیە لە (تاریخ جم)دا (ت) ئەکاتە (٤٠٠) و (ا) ئەکاتە ( ١ ) و ( ر ) ئەکاتە (٢٠٠) و (ی) ئەکاتە (١٠) و (خ) ئەکاتە (٦٠٠) و (ج) ئەکاتە ( ٣ ) و ( م ) ئەکاتە (٤٠) و تێکڕایان ئەکەنە ١٢٥٤ واتە سلێمان پاشا لە ١٢٥٤ی . ك (١٨٣٨–١٨٣٩ی.ز)دا کۆچی دوایی کردووە و ئەحمەد پاشایش هەر لەو ساڵەدا چووەتە سەر تەخت .

لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا حوسنی تەعلیل هەیە .

دا (مم) و (كم) : تا . (مز) : با .

— ٤ —

(١) فیراق : دووری لە یار. فەرەق : فەراق، تەق ، تەقینەوە. سەرچاوەکەی هەر وشەی (فیراق)ە . ئەشکونجێ بەمەعنا هەڵچوون بێ و سەرچاوەکەی وشەی (استفراغ) بێ . مەکسور : شکاو .

وەك لە جیاوازیی تێکستەکانی ئەم بەیتەوە دەرئەکەوێ ، نووسیاران لیپەکانی هەندێ وشەیان بە چەند جۆری جیا جیا دابەش کردووە کە هەریەکی مەعنایەکی تایبەتی ئەگەیەنێ ، سەرەڕای ئەوە لە هەندێ وشەیتریشیدا تێکستی جیاواز گەلێ زۆرە . وشەیتریشی هەیە بەپێی شێوەی نووسینی کۆن بۆ گەلێ مەعنا دەست ئەدا . ئەمە بووە بەهۆی سەرلێشێوان و ئاڵۆزانێکی زۆر و ڕێنەبردنە سەر مەعنای ڕاستەقینە بەتەواوی . هەرچۆنێ بێ لەو مەعنایەی ئێمە لای خۆمانەوە پەسەندمان کردووە ، لێرەدا لەبنووسینەوە و لاشمانوایە بەیتەکە و بەیتی پاشەوەشی و بەیتی چوارەمیش هێشتا پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی بترە .

ئەو نەشئە کەوا ساقی منی پێ لە خودێ سەند
نەك نەوعە ڕەقێ بۆ کە لە قەطرەی عەرەقی بۆ ، (٢)

خەندەی نەفەسی تۆ بو وەکو صوبح و نەسیمی
یا گوڵ دەمی پشکوتن و ، عەطری وەرەقی بۆ (٣)

---

نالی ئەڵێ : دڵ کە بەهۆی دۆریی یارەوە بووە بە شوشەیەکی پڕ لە خوێن ، لەقیکردبۆ ، یاخود یەقی کردبوەوەلە خوێن و هەڵچۆبۆ ، چونکە بە بەردی ڕەق و قینی دڵی وەك بەرد ڕەقی ـ یار شکابۆ .

لەنێوان ( عیراق ) و ( عەرەق )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( ڕقی بەو) و ( ڕەقی بۆ )دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

شیشەیی ( عم ) و ( گم ) : شوشەیی . خوێنی ( کم ) و (گم) و (مز) و (عب) و (من) و (خا) : خۆنی . ڕقی بەو ( ا پەراوێزی « چر و چن ) و (ك) و (عب) : ڕەقیب و . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : ڕەقیب بۆ . دڵی وەك بەردی ڕەقی بـۆ (چر) و (چن) و (کم) و (ت) و (ك) و (مز) و (اح) و (خا) : لە منی خەستە ڕقی بۆ .

(٢) نەشئە : سەرخۆشی . خودێ : ئاگا لای خۆ بۆن . ڕەق : بە تورکی واتە مەرەقی خواردنەوە .

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .

لەنێوان (ساقی) و (پێ)دا تەناسوبێکی تەنها بەدیمەن هەیە .

منی پێ لە خودێ (عم) و (گم) : بە ئـەو عەقڵ و دڵی . نەوعە ڕەقێ (چر) و (عب) : ئـەو عـەرەقێ . (کم) و (گم) و (من) : ئـەوعی ڕەقێ . قەطرەی (چر) و (کم) و (ت) : قەطرە .

(٣) خەندە : پێکەنین . کرانەوە . نەسیم : شنەی بای بەیانی . وەرەق : گەڵا .

نالی لە بەیتی یەکەمدا باسی شکانی شوشەی دڵی پڕ لە خوێنی خۆی کرد کە بە بەردی ڕق و کینەی دڵی وەك بەرد ـ ڕەقی یار شکا . وتیشی دڵی لەقییەوە یا هەڵچو و هۆشـی لای خۆی نەما . لێرەشدا باسی هۆش لانەمانەکە ئەکرێ کە چۆن بۆ و بۆ بە چی و ئەڵێ : ئەو نەشئەی سەرخۆشییە کە مەیگێڕ ، منی لە حـالی هوشیاری پێ دەرکرد ، ئەو جۆرە مەرەقە نەبو کە لـە دڵۆپی ئارەقی ڕۆیـا دەرئەکەوێ ، بمـداتێ بیخۆمەوە و پێی سەرخۆش ببم ، بەڵکو کرانەوەی بە پێکەنینەوەی دەمی

ڕەقەبەیی تەن و ، ڕیقەتی دڵ ، ڕوقبەتی طاعەت
مەخصوصی ڕەقیب بۆ لە منی خەستە ڕقی بۆ ! (٤)

هێند موتەظیری تۆ بو هەتا چاوی سپی بۆ
نەرگس ، کە لەسەر یەك قەدەم و دیدە چەقیبۆ (٥)

---

یار و بڵاوبونەوەی هەناسەی بۆن خۆشی و دەرکەوتنی دانە سپییەکانی بۆ کە وەك بای نەسیم وایە سبەینان هەڵئەکا و ئاسۆ ڕۆن ئەبێتەوە ، یاخود گوڵی سەردەمی پشکوتن و ، بۆنی خۆشی گەڵاکانی بو . .

بەگوێرەی ئەو نوسخانەی کە ڕستەی ( ئەوعە ڕەقێ )ی بەیتی دوەمیان بە (ئەو عەرەقێ) نوسیوە، مەعنای ئەو بڕگەیە وای لێدێتەوە : ئارەقێکی تازە نەبو لە دڵۆپی ئارەقی کۆنای . .

دەمی پشکوتن ( «پەراوێزی» چر ) و (کم) و (من) : دەمێ پشکوتووە.

لە هەمو نوسخەکانی بەردەستماندا نوسراوە ( خەندەی نەفەس ) ، بەڵام ( خەندە و نەفەس ) لەبارترە و لەگەڵ بەراوردەکەیدا بە ( صوبح و نەسیم ) باشتر ئەگونجێ .

(٤) تەن : لەش . ڕیقەت : ناسکی . ڕوقبەت : گەردن .

والە : بوردەباریی لەش و بەرگە گرتنی و ئامادەییی بۆ هەڵگرتنی هەر بارێ بدرێ بەکۆڵیا و ، ناسکیی دڵ و ملکەچی و بەگوێکردنی هەرچی بویستری ، هەموی لە منا کۆبووەتەوە . ئیتر نازانم بەدکار بۆچی لەناو هەمو دڵدارانی یاردا بەتایبەتی ڕقی لە منی خەستە بو !

لەنێوان ( ڕەقبەتی ) و ( ڕیقەت ) و (روقبەت ) و ( ڕەقیب )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( ڕەقیب ) و ( ڕەقی بۆ )دا جیناسی تەرکیب هەیە .

ڕوقبەت (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (اح) و (من) : ڕیبقەت . ڕیبقەت واتە : زنجیر لە مل کردن . ڕەقیب بۆ (چر) و (عب) : ڕەقیبت . (چن) و (مز) و (من) : ڕەقیب و . (ت) و (اح) : ڕقی بو . (لك): ڕەقیبش.

(٥) واتە : نەرگس ئەوەندە لەسەر یەك پێ وەستا و ، بە یەك چاو بۆی ڕوانیت و تۆ هەر نەهاتی ، چاوی سپی بۆ ، واتە مرد یا کوێر بۆ . نەرگس خۆی یەك چاوی هەیە ، بەڵام ئاڵێ کە ئەڵێ بە یەك چاو بۆی ڕوانیت ، مەبەستی ئەوەیە بڵێ هەردو چاوی کردبۆ بە یەك و بۆ تۆی تەرخان کردبون و هەر بۆ لای تۆوەی ئەڕوانێ و لای بە لایەکی کەدا

تا پێ‌ئەکەنێ گوڵ بە دەمی بادی صەباوە ،
ئەمگوت : کە شەوێ بولبولی بێچارە حەقی بۆ (٦)

« نالی » لە هەوا کەوتە سەما ، بۆ بە شەناوەر
بەو وشکە مەلە بیمی هیلاکی غەرەقی بۆ (٧)

---

نەئەکردووە . هەروەها نەرگس خۆی چاوی سپییە . بەڵام نالی ئەیەوێ بڵێ لە چاوەڕوانیی تۆدا چاوی سپی بووە . ئەوەش بزانین کە چاو سپی بوون کینایەیە لە مردن یا کوێر بوون . لە لایەکی کەشەوە نیسبەتدانی ( چەقین ) بۆ لای ( دیدە ) زیادەڕەوییەکی زۆر جوانە بۆ گەیاندنی مەعنای چاوەڕوانی .

وشەی ( نەرگس ) هەم فاعیلی ( مونتەظیر ) و هەم فاعیلی ( چاوی سپی بۆ )یشە ، واتە هەرای لەسەرە لەنێوان ئەو دوو فیعلەدا .

(٦) واتە : کە سەر لە بەیانێ دیم گوڵ بەدەم سروەی بای بەیانییەوە پێکەنێ و دەمی کردەوە و پشکوت ، بۆم دەرکەوت بولبول حەقی بووە شەو لەوەندە بەکوڵ ناڵاندویە ، چونکە بولبول لە هەرچییەڕ عاشقترە بە گوڵ ، کەچی گوڵ هیچ گوێ نادا بە بولبول و بەدەم بای بەیانیانەوە پێ‌ئەکەنێ ، کە لەبۆ بەدەم بولبولەوە پێ‌بکەنیبایە .

پێکەنینی گوڵ بەدەم باوە مەجازی مەقلیبە .

نالی بیری ئەم بەیتەی لە شوێنی‌تریشدا وتووەتەوە .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشەوەی تەنها لە (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (من)دا هەن .

(٧) هەوا : خۆشەویستی . ئاسمان . سەما : ئاسمان . سەماکردن . شەناوەر : مەلەوان . وشکەمەلە : مەلە لە شوێنی بێ‌ئاوا. بیم : ترس . غەرەق : خنکان .

واتە : نالی لە خۆشیی دلداریدا فڕێ بۆ ئاسمان ، یاخود بەئاسمانەوە کەوتە سەماکردن و ، لەو بۆشاییەدا بۆ بە مەلەوان و ، لەگەڵ ئەوەشدا کە شوێنەکەی ئاوی تیا نەبۆ ، لەخۆیەوە وشکە مەلەی ئەکرد ، کەچی ترسیشی لێ نیشتبۆ بخنکێ !

لە هەوا (کم) و (گم) و (من) : بە هەوەس . (عب) : بە هەوا . بۆ بە (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : بۆیە . بەو (چن) : لەو . هیلاکی (چن) و (کم) و (گم) و (لد) و (مز) و (عب) و (من) : هیلاکە و .

— ٥ —

دەرۆنم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ
دڵم گەرمە و هەناسەم سەردە بێ تۆ (١)

خەریکی شەش‌دەری هات و نەهاتم
خەلاصیم قەت نیە لەم نەردە بێ تۆ (٢)

لیباسم ماتەمە ، شینە ، لە شیندام
سوروشکم سوورە ، ڕەنگم زەردە بێ تۆ (٣)

---

— ٥ —

(١) پڕ کەباب : لەناو دەردی دووری سووتاو و بە کەباب بوو .

لەنێوان ( گەرم )و (سەردە )دا طیباقیش و تەناسوبیش هەیە . لەنێوان (دەردە) و (سەردە)شدا جیناسی لاحیق هەیە .

(٢) خەریك : گیرخواردوو و داماو . شەش‌دەر : زاراوەیەکە لە یاریکردن بە ( نەرد )دا بەکارئەهێنرێ ، بریتییە لەوە یەکێ لە یاریکەرەکان بەردەمی پوولەکانی بەرابەرەکەی گرتبێ و نەهێڵێ زارەکەی هەڵدا . کینایەشە لە سەرلێشێواوی .

واتە : بە دەست شەش‌دەری هات و نەهاتەوە گیرم خواردووە و هەرگیز بێ تۆ لەم دەردە ڕزگار نابم .

لەنێوان ( شەش‌دەر ) و ( نەرد )دا تەناسوب هەیە .

نەردە ( « پەراوێزی » جر ) : هەردە . (چن) و (لە) و ( مز ) و (من) : دەردە .

(٣) ماتەم : خەمباریی بەبۆنەی مردنی کەسێکەوە . شین : ڕەنگی شین ، دروشمی کەس مردوویی . گریانی بەکوڵ .

واتە : بەهۆی دووریی تۆوە هەرچی نیشانەی خەم و خەفەتە لیامدا کۆبووەتەوە : جلی شینی ئازیەتباریم لەبەردایە و ، خەریکی گریان و شینم و ، فرمێسکی خوێن لە چاوم ئەڕژێ و ، ڕەنگم زەرد هەڵگەڕاوە .

لە ڕستەی (لیباسم ماتەمە)دا زیادەڕەوییەکی زۆر جوان هەیە،چونکە واتەکەیەتی ماتەم بەجۆرێ داگیری کردووم بۆم بووە بە جل و بەرگ .

عەزیزم ! دڵ ڕەقە و ، خۆم فەرد و تەنهام
دەترسم بمکوژێ ئەم دەردە بێ تۆ (٤)

بە بێ دیداری تۆ خۆ لاڵە « نالی »
عەجەب هەستاوە ئەم چەن فەردە بێ تۆ ! (٥)

— ٦ —

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ
نەچم ، شەرطە بێ ، هەتا ئەم خوارە بێ تۆ (١)

---

لەنێوان ( مالەم ) و ( شین )دا بە هەردوو مەعناکەی و ، لەنێوان (شین) و (سوور) و (زمرد)دا تەناسوب هەیە . نالی ئەوەشی مەبەست بووە کەو، ( سوور ) کە مەعنای ( شایێ )یش ئەگەیەنێ ، بەرابەر بە ( شین )دانێ کە واتە گریان ، هەرچەند ئەو مەعنایەشی مەبەست نەبوە .

مالەمە (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (مز) و (اح) و (من) و (خا) : مالەم و . (ك) : مالەمە و . لە شیندام (چن) : لە شیندا . بەمپێیە پەیوەندی بە نیوەی دووهەمی بەیتەکەوە ئەبێ . سوورە (کم) و (گم) : سوور و .

(٤) واتە : نازیزەکەم ! دڵم ڕەقە و بۆم نەرم نابێ و ، خۆیشم بەتەنهام و دەرەقەتی دڵ نایەم . بۆیە ئەترسم مادەم تۆم لەگەڵ نەبێ ئەم دەردی دڵە بێ تۆ بمکوژێ .

ئەشکونجێ مەعنای بەیتەکە بەمجۆرە لێکبدەینەوە کەوا : یار دڵی ڕەقە و نایێ بەلاما و منیش بەتەنهام بۆ خۆم . ئەنجا شاعیر وەرچەرخێ و ڕووی دەمی بکاتە یار و بڵێ : ئەترسم ئەم دەردی دڵڕەقیی تۆ و دووریە لە تۆ ، بێ تۆ ، بمکوژێ .

دلڕەقە و ( چن ) و ( ك ) : دڵ ڕەق و . دەترسم (گم) : ئەترسم .

(٥) واتە: دیداری تۆم لە بەرچاودا نەبێ زمانم گۆ ناکا قسە بکەم. بۆیە خۆیشم سەرم سوڕماوە چۆن ئەم چەند فەردە بێ تۆ هەستاونەتەوە و بە ڕێك و ڕەوانی بۆم وتراون .

— ٦ —

(١) واتە بەڵێ من ئەمجارە بێ تۆ نەمردم ، بەلام ئەوەندە دەردی بێ تۆییم

دەروونم خاڵییە ، وەك نەی دەناڵێ
هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ ! (٢)

بینایم کوێرە ، هەڵنایێ بە ڕووی کەس
موژەم یەك یەك دەڵێی بزمارە بێ تۆ (٣)

---

چێشت تۆبەی لەوە پێکردم کە بێتۆ بۆ هیچ کوێیـەك بڕۆم ، مەرجێ جارێکی‌تر بێ تۆ تەنانەت تا ئەو خوارەش نەچم .

ئەم خوارە (چر) و (چن) و (ەم) و (مز) و (عب) و (من) و (خا) : ئـەو خوارە .

(٢) نەی : نامیش ، شمشاڵ . هـەوار : نشـینگەی هـاوین و زسـتانی کۆچەرییەکان .

واتە : وەك قامیشێ کە گرێکانی ناوی لابرابێ و کرابێ بە شمشاڵ و شمشـاڵی پێ لێبدرێ و بناڵێنێ ، دەروونی لـە غەیری یادی تـۆ خاڵیی منیش هەر هاوار و ناڵەیەتی ، لەپاش ڕۆیشـتنی تـۆ وەك هەوارێکی چۆڵی لێ هاتووە ، تەنها هاواری منی تیایە بەدوای تۆدا .

وردەکارییەکـی جـوان لەم بەیتـەدا هەیە کە ئەوەتـە ناڵی هەواری شوبهاندووە بە ئەشکەوتێکی چۆڵ، لەکاتێکا کە هەوار یا شاخێکی وشك و ڕەقی بەرز یا دەشـتێکی کاکی‌بەکاکییە و ، دای‌ناوە کەوا ئەم ئەشکەوتـە بەتەنها دەنگی هاواری خۆی پڕ بووە ، لەکاتێکا کە لە دەنگی بابردۆی خۆی بەولاوە هیچ نییە و هیچ کوێیەکیش نییە دەنگ پڕی کاتەوە .

لەنێوان (خاڵی) و (پڕ)دا طیباق و ، لەنێوان (هەوار) و (هاوار)یشدا جیناسی ناقیص هەیە .

هەوارێکی (چر) و (ت) و (مز) : هەوارێکە .

(٣) موژە : بژانگ .

واتە : بێ دیتنی دیداری تۆ چـاوم کوێرە و بـە چاوێ‌کەوتنی ڕووی کەسی‌تر هەڵنایەت .. برژانگەکانم ئەڵێی بزمارن بە چاومدا چەقیون و ناهێڵن چاو هەڵێنم .

بزمارە (ك) و («پەراوێزی» خا) : بسمارە .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (خا)دا پێنجـەم بەیت و ، لـە ( کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خب)دا شەشەم بەیتە بەگوێرەی ژمـارەی بەیتـەکان لێرەدا .

هەمو ئەعضایی نالینم دەناڵێ
سەراپام میثلی مۆسیقارە بێ تۆ (٤)

قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکەت
شەرابم عەینی ژەهری مارە بێ تۆ (٥)

لەکن تۆ خار و خەس گوڵزارە بێ من
لەکن من خەرمەلی گوڵ خارە بێ تۆ (٦)

---

(٤) مۆسیقا : سازێکی سێ سوچە لە قامیشی گەورە و بچوك دروستی ئەکەن . وئراویشە کەوا ناوی پەلەوەرێکە کونی زۆر لە دەنوکیدا هەیە ، ئاوازی جۆراوجۆر لەو کونانەوە دەرئەچێ . ئەم مەعنای دوهەمە بۆ ئێرە زۆر لەبارە .

والە : هەرچی بەشێکی لەشم هەیە کە لەوانەیێ ناڵەی لێوە بێ، لەتاو دوریی تۆ ئەناڵێنێ . هەمو گیانم وەك دەنوکی پەلەوەری ( مۆسیقار )ی لێهاتووە و لەبەر بێتۆیێ ناڵەی لێوە دێ .

ئەم بەیتە تەنها لـە کۆمەلە دەستوسێکی بنەماڵەی موفتیی هەڵەبجەدا هەبو کە دوو پارچە شیعری نالیشی تیا بو یەکێکیان ئەم پارچەیە بو و ، شێخ موحەممەد عەلیی قەرەداخی پیشانی داین . ( لە پێشەکییەکەدا بەدرێژی باسی ئەم دەستوسانە کراوە ) .

(٥) والە : قەسەم بە شەربەتی شیرینی دیداری پاکت ، بەهۆی بێتۆییەوە هەر شەربەتێ ئەخۆمەوە لە دەمما وەك ژەهری مار وایە ، یا لە تاڵیی دوریی تۆ وەك ژاری مار بخۆمەوە وام .

ناڵی ئەم بەیتەی زۆر جوان هێناوەتەوە کە سوێن پێخوراو و سوێن لەسەرخوراو هەردوکیان لە یەك بابەتن و دژی یەکیشن : شەرابی وەصلی یار کە لە هەمو شەرابێك شیرینترە و ، ژەهری مار کە لە تاڵیدا هاوتای نییە .

ژەهری (چر) : ژاری . (گم) : ژەهری .

(٦) خار : دڕك . خەس : وشترخوار . ■

والە : تۆ ئەوەندە لە من بێزاری ، ئەگەر لەسەر دڕك و داڵ و وشترخواریش دابنیشی ، مادەم منت لا نەبێ ، بە گوڵزاری ئەزانی .. منیش ئەوەندە حەزم لە تۆیە و ئارەزومەندی نزیکیتم ، مادەم لە تۆوە دوور بم ،

لەکن من با وجودی ناس و ئەجناس
کەسی تێدا نییە ئەم شـارە بێ تۆ (٧)

هەتا تۆم ئاشنا بوی ، ئاشنام بون
ئەمێستا مۆ بە مۆم ئەغیارە بێ تۆ (٨)

---

خەرمانی گولیشم بەلاوە دڕکە . مەبەستی لـەوەیە بێ تـۆ خەرمانێك گوڵ دەنکە دڕکێك ناهێنێ لام ، یا لەسەر گوڵ دانیشتنیشم لا وەك لەسەر دڕك دانیشتنە .

ئەم بەیتە لە نوسخەی ( خا )دا نییە .

لەنێوان (تۆ) و (من) و ، (خار) و (گوڵ)دا طیباق هەیە .

لەکن (چر) و (کم) و (گم) و (من) : لەلای .

(٧) ناس : خەڵك . ئەجناس : هەمو جۆر و ڕەگەزێك .

واتە : من بەڕادەیەك دنیا هەموی لە تۆدا ئەبینم ، لاموایە ئەم شارە لەگەڵ ئەم هەمو خەڵکە زۆرەی تیایەتی لـە هەمو جـۆر و ڕەگەزێك ، مادام تۆی تیا نیت ، کەسی تێدا نییە و چۆڵ و وێرانەیە .

لەنێوان ( با وجودی ناس و ئەجناس ) و ( کەسی تێدا نییە )دا طیباق هەیە .

لەکن (هم) و (گم) و (ت) و (مز) و (اح) : لەلای .

ئەم بەیتە لە (عب) و (خا) و (خب)دا لەپاش بەیتی نۆهەمی ئێرەوەیە و ، لە (کم) و (گم) و (من)یشدا لەپاش بەیتی سێهەمی ئێرەوەیە .

(٨) ئاشنا : ناسیاو .ئەغیار : بێگانە .

واتە : تا تۆ ئاشنام بوی بە چاوێکی گەش و ڕونەوە سـەیری دنیـام ئەکرد و هەرچی لەم شارەدا هەیە ( کە لە بەیتی پێشـودا باسـی کردن ) هەمو ئاشنام بون و بە هۆی دڵی شادمەوە لەگەڵ ئەو هەمو خـەڵکەدا هەڵئەستام و دائەنیشتم . بەڵام ئێستا کە تۆم نەماوێ و ڕۆیشتوی، لە گیانی خۆم بێزار بوم و گوێ نادەمە هیچ شتێك و هیچ کەسێك ، تەنانەت مۆبەمۆی لەشی خۆیشم لا بووەتە بێگانە ..

ئەشکونجێ مەعنای نیوەی یەکەمی بەیتەکە بەمجۆرە بێ : تا تۆ ئاشنام بوی ، ئاشنام هەبو ..

لەنێوان (بوی) و (بون)دا جیناسی لاحیق ، لەنێـوان ( ئاشـنا ) و

هەمو ڕۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمەننای مردنی پێراره بێ تۆ (٩)

لە حەسرەت سەروی قەددت چاوی « نالی »
دو جۆگە ، بەڵکو دو ڕۆباره بێ تۆ (١٠)

— ٧ —

زوڵفت کە لەسەر ڕۆ بە خەم و تابشە ئەمڕۆ ،
دۆدی سیەهی عۆده لەسەر عاریضی پشکۆ (١)

---

( ئەغیار )دا طیباق هەیە .

ئاشنام بۆن (عم) و (ك) و (خا) : ئاشنا بون . (عب) : ئاشنا بوم .
مۆبەمۆم (چر) و (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (مز) : مۆبەمۆ .

ئەم بەیتە لە (کم) و (من)دا نیيە .

دانانی ئەم بەیتە لەم شوێنەدا بەگوێرەی نوسخەی (چر)ە .
نوسخەکانی تر لەگەڵ بەیتی پاشەوەدا بەرودوایان داناون .

(٩) واتە : ئەو دوریيەی تۆ کە ئەمساڵ من ئەیچێژم ، کارێکی پێ کردوم هەمو ڕۆژێ خۆزگەی ئەوە ئەخوازم کە پێرار بمردمایە .

نالی لەم بەیتەدا بەوەشەوە دانەکەوتووە ، وەك خەڵك ، بڵێ : ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار .. بەڵکو بە خۆزگە بە پێراریشەوە دانەکەوتووە ، ئاواتی مەرگی پێراری خواستووە .. خۆشەویستی بەمجۆرە بەهێز نەبێ چیی پێ ئەڵێن !

لەنێوان (ئەمساڵ) و (پێرار)دا طیباق هەیە .

تەمەنناى (عب) : تەمەننا .

(١٠) قەددت : قەد و باڵات . ڕۆبار : چەم .

واتە : لەتاو دوریی باڵای وەك سەرو بەرزت ، چاوەکانم ئەوەندە بەکوڵ ئەگرین ئەڵێی دو جۆگە بەڵکو ئەڵێی دو چەمن .

لەنێوان (سەرو) و (جۆگا) و (ڕۆبار)دا تەناسوبێکی جوان هەیە .

سەروی قەددت (چر) و (عم) و (ت) و (عب) و (خا) و (خب) : قەددی سەروت .

— ٧ —

(١) خەم : پێچ و لول . تابش : تاو ، گەرمی ، تین . دۆد : دوکەڵ .

دەستم کە بە سەد وەعدە لە سەد جێگە شکاوە ،
جەبری نیە ئەم کەسرە هەتا نەیخەیە ئەستۆ (٢)

---

سیبەهـ : ڕەش . عود : دارێکی بۆنخۆشە ئەیسوتێنن بۆنەوەی بۆن بداتەوە . عاریض : ڕوومەت ، کولم .

واتە : زولفت کە ئەمڕۆ بەسەر ڕوتەوە لولی خواردووە و شەوقی ڕوت لەناو تاڵەکانیەوە دیارە و بە تینی خۆی ئاگر بەرئەداتە دڵی دڵدار و بۆنی خۆشی لێوە بڵاو ئەبێتەوە ، وەك دۆکەڵی داری ڕەشی بۆنخۆشی عود وایە کە خرابێتە سەر ئاگر و بسوتێ و ئاگرەکە شەوق بداتەوە و بۆنی عودەکە بەملا و بەولادا بڵاو ببێتەوە .

نالی لەم بەیتەدا شێوەی تەشبیهی مورەککەبی بەکارهێناوە .

زولفت (عب) : زولفی . ئەمڕۆ (عب) : ئیمڕۆ .

(٢) جەبر : گرتنەوەی شکستە . کەسر : شکان . شکستە . ئەستۆ : گەردن .

واتە : دەستم لە سەد کاتی جیا جیادا ، هەر کاتێ لە شوێنێکدا ، شکاوە . ئەم شکاویانەش چاك نابنەوە تا پاش گرتنەوەیان بۆ ماوەیەك دەستم نەکەمە ملم و بە ملمیدا هەڵنەواسم .

ئەمە مەعنا دیاریەکەی بەیتەکەیە . بەڵام نالی ئەم مەعنا دیاریەی تەنها وەك ڕێگایەك پێویستە بۆ گەیاندنی مەعنای مەبەستی ڕاستەقینە . دەست شکان لە کوردیدا کینایەیە لە ئاوات نەهاتنەدی و نائومێد بون . نالی ئەیەوێ بڵێ یار سەد جار گفتی دامێ و هیچ جارێکیان گفتەکەی خۆی نەهێنایەدی و بەوە دەستم لە سەد لاوە شکاوە .. ئەنجا بە خۆی ئەڵێ : تا دەستت بە ملی یاردا هەڵنەواسی و دەست نەکەیتە ملی ، شکستەکانی دەستت چاك نابنەوە و ئاواتت نایەتەدی .

بەمجۆرە دەرکەوت لەم بەیتەدا تەوریەیەکی زۆر جوان هەیە . هەروەها لەنێوان (جەبر) و (کەسر)یشدا طیباق هەیە .

ئەشگونجێ شاعیر ڕاستەوخۆ بە یار بڵێ دەستی شکاوم چاك نابێتەوە تا تۆ بە ملی خۆتیا هەڵنەواسی و نەیکەیتە ملت .. بەمپێیە زیادەڕەویەکی وردی تیا ئەبێ ، چونکە وائەگەیەنێ خەڵکی کە دەستیان ئەشکێ ئەیکەنە ملی خۆیان ، بەڵام دەستی شکاوی من تا یار خۆی نەیکاتە ملی خۆی ، چاك نابێتەوە و ناگیرسێتەوە ! .

کە بە سەد وەعدە لە سەد جێگە (کم) : لە سەد جێگە بە سەد وەعدە .

خاڵت چییە ؟ دانەی گەنمی جەنەتی ڕۆتە
چاوت چیە ؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ (٣)

شەو بۆیی سەری سونبولی زولفت لە سەری دام
ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ ! (٤)

نەمیستووە هەرگیز لە دەمت بێنی وەفایێ
هەرچەندە سەراپا گوڵی ، ئەمما گوڵی هێرۆ (٥)

---

لەم نوسخەیەدا (کە)یەك بەسەر (لە سەد)ەکەوە ناتەواوە . (گم) : کە بە سەد وەعدە لە سەد لاوە . (من) : کە لە سەد جێوە بە سەد وەعدە . نەیخەیە (چر) و (کم) و (گم) : نەیخەمە . (عب) : نەیخەنە .

(٣) واتە : ڕۆمەتت بەهەشتە و ، خاڵەکەی سەر گۆناشت ئەو دەنکە گەنمەیە کە حەزرەتی ئادەم لە بەهەشتدا خواردی و لەسەر ئەوە لە بەهەشت دەرکرا . بۆیە هەرکەس دەست بۆ خاڵی سەر گۆنات بەرێ ، دەری ئەکەی و لە دیداری بەهەشتی ڕۆمەتتی بێبەش ئەکەی و ئەیخەیتە خوارەوە بۆ زەویی بەرپێت .. برۆیشت قیبلەیە و ، چاویشت مایەی لە دین لادان و تاقی کردنەوەی ئەو کەسانەیە دێن بۆ زیارەتی حەرەمی قیبلەی برۆت ، پێویستە ئاگایان لە خۆیان بێ چاوت مەست و سەرخۆشیان نەکا تا لە بەری زیارەت و عیبادەتەکەیان بێبەش نەبن ..
نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە سەرگوزەشتەکەی ئادەمەوە وەرگیراوە .
چییەی یەکەم و دووەمم (عب) : بووە . گەنمی جەنەتی ڕۆتە (چر) و (کم) و (ك) و (عب) و (اح) : گەنمی جەنەتی ڕۆمەت . (ت) و (خا) : گەنم و جەننەتە ڕۆمەت .

(٤) واتە : بە شەو بۆنی سەری زولفی وەك سونبول تاڵ تاڵ و بۆنخۆشت دای لە سەرم . لەووەختەوە تائێستا سەرم مەست و سەرخۆشی بۆنی ئەو گوڵی شەوبۆی زولفتەیە .
لە بەکارهێنانی وشەی (سەر)دا بە سێ مەعنای بەدیمەن لە یەك جیاواز ئیشتیراك و ، لە وشەکانیاندا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (شەو بۆیی) و (شەوبۆ)دا جیناسی تەرکیب هەیە .
ئێستەش سەرەکەم (جن) : ئێستەیشە سەرم . (هم) و (کم) و (ك) و (اح) و (خا) : ئێستەیش سەرەکەم .

(٥) بێن : بۆن . گوڵی هێرۆ : گوڵێکە ڕیشەی بە ناخی زەویدا ئەچێتە

قوربان وەرە تا ئەم غەزەلە تازە لەبەرکەین
عیزز و شەرەفی « نالی » بە تەشریفی قەدی تۆ (٦)

— ٨ —

شەوی یەلدایە ، یا دەیجوورە ئەمشەو
کە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەمشەو !؟ (١)

---

خوارەوە و هەمیشە لەو شوێنەیدا ئەڕوێتەوە ، بۆنی هیچ نییە ، بەڵام بەدیمەن زۆر جوانە ، گوڵە هەرمەڵەشی پێ ئەڵێن .

واتە : هەرگیز بۆنی وەنام لە دەست نەبیستووە . بۆیە تۆ هەرچەند لەناو جوانانددا گوڵی ، بەڵام گوڵە هێرۆی کە بۆنی نییە .

ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەکەی (ك)دا هەیە .

(٦) غەزەل : پارچە شیعر . جۆرە قوماشێکی جوانە .

واتە : قوربان ، وەرە با ئەم غەزەلە لەبەرکەین کە تازە دامناوە و پێکەوە بیخوێنینەوە ، چونکە هاتنی تۆ بۆ لەبەرکردن و خوێندنەوەی ئەم غەزەلە مایەی شان و شکۆ و سەربەرزییە بۆ نالی .

یاخود نالی هاتووە غەزەلە شیعرەکەی شوبهاندووە بە غەزەلی قوماش و ، خوێندنەوەی غەزەلەکەی بە باڵای یاردا شوبهاندووە بەوە کە قوماشی غەزەل بکاتە بەری قەد و باڵای .

لەبەرکەین (گم) و (من) : لەبەرکەی .

— ٨ —

ئەم پارچە شیعرە لە نوسخەکانی (چر) و (چن) و (گم) و (مز) و (مز) و (اح) و (خا)دا هەیە و دراوەتە پاڵ نالی . لەنوسخەی (ت)یشدا هەیە و نۆ بەیتە و دراوەتە پاڵ (کوردی) . هەروەها لە نوسخەکەی چاپی (کم)ی دیوانی کوردیشدا . چواربەیتی یەکەمی ئەم پارچەیە لە هەموو نوسخەکاندا هەیە . بەیتی پێنجەمی تەنها لە (چر) و (مز) و (اح) و (خا)دا هەیە . بەیتی شەشەمی تەنها لە (چر) و (اح) و (خا)دا هەیە . بەیتی حەوتەمیشی تەنها لە (چن) و (گم) و (مز)دا هەیە .

د . مارف خەزنەداریش ، پشت بە دیوانە لەچاپدراوەکەی کوردی ، بە هی کوردیی داناوە (بڕوانەرە : د. مارف خەزنەدار ، گۆڤاری ڕۆژی

دلم وەك حاكمی مەعزوولە ، قوربان !
خەلاتی وەصلی توّی مەظلوورە ئەمشەو (٢)

دلیش مایل بە دیدەی توّیە ، بوّیە
لە من وەحشیی و رەمیدە و دوورە ئەمشەو (٣)

---

کوردستان ، ژمارە ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانوونی دووەمی ١٩٧٦ ، ل٢٤ ) . بەلام ئێمە بە شیعری نالیی ئەزانین و لامانوایە لەبەرئەوە کراوە بە هیی کوردیی ، چونکە کوردیی چەند پارچەیەکی لری لەم هەوایەی هەیە .

(١) یەلدا : وشەیەکی سەریانییە واتە لەدایكبوون ، درێژترین شەوی سالە کە دوا شەوی دوا مانگی پایزە . بوّیە وا ناونراوە چونکە حەزرەتی عیسا لەو شەوەدا لەدایكبووە . دەیجوور : شەوی زوّر تاریك و درێژ .

واتە: ئەمشەو لەبەر دووریی لە توّ ، چاوم ترووسکاییی لیا نییە ، یاخود: یاخوا حالیوا لە توّ بەدوور بیّ ؛ من ئەمشەو چاوم ترووسکاییی لیا نییە ، نازانم ئەمشەو شەوی یەلدایە ، وا هەر نابڕێتەوە ، یاخود شەوی دەیجوورە وا ئەوەندە تاریك و نوتەکە .

لەنێوان (دوور) و (نوور)دا جیناس هەیە .

ئەمشەو ــ لە هەموو بەیتەکاندا ــ (عز) : ئیمشەو .

(٢) مەعزوول : عەزلکراو و لەکارخراو . مەنظوور : مەبەست .

واتە : دلەکەی لە تەخت و تاجی گەیشتن بە توّ دوور خراوەم ، وەك فەرمانداری لەکارخراو وایە ، چوون ئەو هەمیشە بەتەمای لەوەیە بیگێڕنەوە بوّ سەر کارەکەی و خەلاتیشی بکەن ، ئەمیش هەر بەتەمای ئەوەیە بە خەلاتی گەیشتن بە توّ شاد ببێتەوە .

حاکمی (مز) : حالەکەم . مەعزوولە (چر) و (اح) و (خا) : مەعدوورە . (مز) مەعلوورە یا مەغدوورە . (عز) : مەغروورە . توّی (چن) و (گم) : توّ .

(٣) دیدە : دیتن . رەمیدە : هەلاتوو ، راکردوو .

واتە : دلیشم حەزی لە بینینی چاوە جوانەکانی توّیە ، بوّیە وا ئەمشەو لە من کێویی بووە و رای‌کردووە بوّ لای توّ و خوّم بیّ دل ماومەتەوە .

لەنێوان (توّیە) و (بوّیە)دا جیناسی لاحیق هەیە .

که تۆی شای کەچ کولاهی دیدە مەستان ،
چ باکم قەیصەر و فەغفورە ئەمشەو ؟! (٤)

لە خەو هەڵساوە ، یا ئاڵۆزە چاوت ؟
هەمیشە وایە ، یا مەخمورە ، ئەمشەو ؟ (٥)

سوروشکم نەقشی چاوی تۆ دەکێشێ
جێگەم سەر دارەکەی (مەنصور)ە ئەمشەو (٦)

---

دڵیش (مز) : دڵم . وەحشێ و ڕەمیدە و (چر) و (مز) : وەحشی ڕەمیدە . (اح) و (خا) : وەحشی ڕەمیدەی .

(٤) کەچ‌کولاە : کڵاولار . قەیصەر : لەقەبی پادشاهانی ڕۆم و ڕۆس بووە . فەغفور : لەقەبی پادشاهانی چین بووە .

وانە : کە تۆ بوی بە پادشای کڵاو بەفیزەوە لار لەسەر ناوی شۆخانی چاومەست ، ئیتر من هیچ پادشایەکی‌ترم لەم دنیایەدا مەبەست نییە و گوێ بە کەسیان نادەم .

کەچ‌کولاهی (گم) و (عز) : کەچ‌کڵاو و . (مز) : کولاە و .

(٥) مەخمور : مەست .

وانە : ئازیز ! تازە لە خەو هەستاویت وا تۆزەیت و چاوت ئاگری لێ ئەبارێ ، یا نە چاوت ئاڵۆزە ؟ چاوت هەمیشە وایە و وا تیژ و توند ئەڕوانێتە دڵداران ، یاخود ئەمشەو سەرخۆش و مەستە ؟

هەڵساوە ( « بەراوێزی » چر ) : هەڵساوی .

(٦) مەنصور : حوسەینی کوڕی مەنصوری حەللاج ، یەکێکە لە خواناسانی بەناوبانگی سەدەی سێهەمی کۆچی . کە ڕەجدی صۆفییانە ئەیگرت دەستی ئەکرد بە هاواری ( أنا الحقّ ) . سەرەنجام لەسەر قسەی مەلاکانی بەغدا گیرا و هەشت ساڵ خرایە بەندیخانەوە . لە سەردەمی خەلیفە ئەلموقتەدیری عەبباسیدا لە زیندان هێنایانە دەرەوە و هەزار داریان لێدا و هەردوو دەست و هەردوو قاچیان بڕییەوە و لاشەکەشیان سووتاند . ئەڵێن گوایە کە خوێنەکەشی ئەڕژێشت ڕستەی ( أنا الحقّ )ی ئەنووسی .

وانە : ئازیز ! بەجۆرێ گەیشتومەتە حاڵەتی (وحدة الوجود) و لەگەڵ

موسولمانان دەپرسن حالی « نالی »
لە کونجی بێکەسی مەهجوورە ئەمشەو (٧)

---

تۆدا بووم بە یەك ، فرمێسکم کە لە چاوم ئەڕژوا ، نەخشی چاوی تۆ ئەکێشی، وەك چۆن خوێنی حەللاج ڕستەی ( انا الحق )ی ئەنووسی. بۆیە وادیارە سەرەنجامی منیش وەك هی ئەو ئەبێ و ، چۆن ئەویان لەسەر ئیدیعای (وحدة الوجود) لەگەڵ خوادا لەسەر تەختە ڕاکێشا و دارکاریان کرد و دەست و قاچیان بڕییەوە ، منیش هەر وا لێئەکەن .

چاوی ( « پەراوێزی » چر ) : ناوی . جێگەم (اح) و (خا) : جێگام .

(٧) مەهجوور : خراوە لاوە و پشتگوێ خراو . ■

★ ★ ★

■ ئەمنیش پێم وایە ئەم غەزەلە وەك شیعری کوردی پتر دەچێ تا نالی چونکە کوردی شیعری ( سهل ممتنع ) ی کوتوە و ئەو غەزەلەش لە شیعوکانی نالی هاسان ترە . بەلام زۆریش جوان و بەرزە . لە بەیتی ششەم دا جێگەم کێشی شیعرە قورس دەکا چ ئی نالی بێ وچ ئی کوردی هیچ کامیان لە وانە نەبوون، کێشی شیعریان قورس بێ کە وا بوو نابێ ( جێگەم ) بێ . دیارە هەقم نیە شیعرەکە بگۆڕم ، بەلام بۆم هەیە بڵێم ڕەنگە میسرەعەکە ئاوا بێ .

( کە جێم سەر دارەکەی مەنسوورە لە مەشعو )

— ١ —

ساقی ! بە مەیی کۆنە لەسەر عادەتی نەو بە
بشکێنە بە یەك نەوبە دوصەد ماتەمی تەوبە (١)
ساقی ! قەدەحی گەردشی گەردوون دەشکێنێ
باری ، کە دە بێ موعتەقیدی گەردشی ئەو بە ! (٢)

---

— ١ —

(١) نەو : نوێ . نەوبە : نۆبە ، جار . ماتەم : تازیەتباری .

واتە : مەیگێڕ ! وەرە سەر نەریتی نوێ ، شەرابی کۆنە بگێڕە بەسەرمانا و تەزیەی تۆبەکاریمان بۆ بشکێنە . مەبەستی لە تەزیەی تۆبەکاری لەوەیە حالەتی تۆبەکاری لەبەرئەوە کە مەیدانی خۆشی لە بنیادەم لەگرێ ، بنیادەمی تۆبەکار وەك تەزیەدار لێ ئەکا .

لەنێوان (کۆنە) و (نەو)دا طیباق و ، لەنێوان (نەو بە) و (نەوبە)دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان (نەوبە) و (تەوبە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (یەك) و (دوصەد)دا طیباق هەیە .

پێشینانی کورد وتویانە « صەد گوناە و یەك تۆبە » ، بەڵام نالی لێرەدا ئەیەوێ بە یەك «گوناە» صەد تۆبە بشکێنێ .. جۆرە «یاخیبوون»ێکی سەیرە ئەمەی نالی ئەیەوێ ..

کۆنە (چن) و (عم) و (کم) و (اح) و (من) و (خا) : کوهنە . ماتەمی (کم) و (گم) و (من) : ماتەم و .

(٢) قەدەح : پیالە . گەردش : سوڕانەوە . باری : خوا .

واتە : ئەی مەیگێڕ ! خوا پیالەی سوڕانەوەی چەرخی گەردوون ئەشکێنێ ، لەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە وەرە باوەڕت بە گەردشی

ئەشکونجێ مەبەست لە وشەی (ساقێ) مەیگێڕ نەبێ ، بەڵکو (ساق) بێ لەگەڵ ( ی )ی ئیضافەدا . واتە : خوا دەسکری پیاڵەی سوڕانەوەی چەرخی گەردوون ئەشکێنێ .. تاد .

دەشکێنێ (گم) : ئەشکێنێ . دە بێ (کم) : ئەبێ .

(٣) نەفس : گیان ، بنیادەم . موراێ : ڕیاباز . گرانبار : ئەوەی باری گرانی لەسەر شان بێ . تەکالیف : ئەرك . عیبادەت . هەڕۆ : بڕۆ . ڕێش : بە وڵاخێك ئەڵێن پشتە ڕێشە بوبێ . جەدەو : وڵاخێکە برین لە پشتی ملی هالبێ و برینەکەی لەشەنەی کردبێ و چاك نەبێتەوە

واتە : ئەی بنیادەمی ڕیاباز ! ئەرکێکی چەند قورست خستووەتە ئەستۆی خۆت ، عیبادەت بۆ خوا نا ، بۆ ڕووبامایێ ئەکەی .. دە بڕۆ ، دەی ! با لەژێر ئەم بارە گرانەدا پشتە ڕێشەت تۆش بێ و جەدەو بێ و ناوشانت داڕزێ ..

گرانباری (عم) و (کم) و (من) و (خا) : گرانبارە . دەکێشێ دە هەڕۆ (چر) و (ت) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : دەکێشێ کە هەڕۆ . ( « پەراوێزی » چر ) و ( عب ) : دەکێشیبو دە هەر . (چن) و (ك) : دەکێشێ وەرە هەر . (عم) و (گم) : دەکێشێ بڕۆ هەر . ( کم ) و (من) : ئەکێشێ کە هەڕۆ . (خا) : دەکێشێ کە دە هەر .

(٤) بوغض : کینە . خەرز و بەز : غەز و بەز ، پیو و چەورێ . هیزە : حیزە ، نامەرد . خیگەی ڕۆن لێکردن .

واتە : قوربان ! جەنابێ ورگن ! بۆچێ ڕقتە لە کەسانی لەڕ و لاواز و هەژار هەر لەبەرئەوە کە ناتوانن هیچ قازانجێکت پێ بگەیەنن .. ئەڵێی قەسابێ کە چەند ڕقیەتی لە حەیوانی لەڕ ، چونکە پارەی باشی بۆ دەرناهێنێ .. کابرای نامەرد ، تۆ بڕۆ بۆ خۆت خۆت بە غەز و بەزی بەرتیلی ئەم و ئەو قەڵەو کە و حەقت بەسەر خەڵکیترەوە نەبێ ..

ئەشکونجێ مەعنای (هیزە) نامەرد نەبێ ، (خیگە) بێ .. واتە : ئەی ئەوکەسەی ئەڵێی خیگەی بزی ئەوەندە قەڵەوی .

ئەسپی ئەفەست دێت و دەچێ ، گەرمە عەنانی
ئەی مەستی ڕیاضەت هەڵە ! هوشیاری جڵەو بە (٥) ▪

وەك ماه و ستارەت کە بێ مەیلی هەڵاتن
سەرکردەیی ڕۆژ ، ڕەهزەوی شەو ، ڕەهزەنی خەو بە (٦)

« نالی » مەبە عاجز ، کە ئەمە دەورە نە جەورە
ساقی کەرەمی یەك بە یەکە و نەوبە بە نەوبە (٧)

---

ضەعیفان (چن) و (ك) و (اح) : ڕەفیقان .

خەزز و بەزی (چر) و (ت) و (ك) و (اح) : خەزز و بەز و . (خب) : حەزز و بەزی . ڕیشوەلە (خب) : ڕەشتەوە . (کم) : فرصەتە .

(٥) نەفەس : هەناسە ، ژیان . عەنان : جڵەو .
واتە : تۆ ئاگات لە خۆت نیيە و ئەسپی ژیانت داویەتە غار بۆ خۆی دێ و دەڕوا ، جڵەوی گەرم بووە .. دەسا ئەی سواری ، سەرخۆشی ، لەغاو گرتنەوەی ئەسپی نەفس هەڵەکردنۆ و پشتگوێ خستنۆ ، ئاگاداری جڵەوی ئەسپەکەت بە ، ئەلدا بە هەڵدێریکدا !

گەرمە عەنانی (چر) و (ك) و (خا) : گەرمی یا گەرمە عەنانە . (کم) و (من) : گەرمی عەنانە . (خب) : گەرمە عەنانە .

(٦) ستارە : ئەستێرە . ڕەهزەو : ڕێگا تەیکەر ، ڕێبوار . ڕەهزەن : چەتە و جەردە ، ڕێگر .

واتە : ئەگەر ئەتەوێ هەمیشە وەك مانگ و ئەستێرە هەڵبێیت و لە بەرچاودا بی ، ئەبێ بە ڕۆژا لەپێشی هەموانەوە دەرکەوی وەك خۆر و ، بە شەو ڕێگا تەی بکەی وەك مانگ و ئەستێرە و ، خەو نەچێتە چاوت و وەك جەردە لێی‌دەی و لەناوی‌بەری .. مەبەستی ئەوەیە بڵێ ئەبێ بە شەو و بە ڕۆژ ڕاوەستانت نەبێ ..

بێ مەیلی ( « بەراویلری » چر ) و (کم) و (صب) و (من) : هەبێ شەوقی . (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : هەیە مەیلی . (مم) و (کم) : هەیە شەوقی . (خب) : نەبێ شەوقی . ڕۆژ ، ڕەهبەری شەو (من) : شەو ڕەهبەری ڕۆژ .

(٧) دەور : زەمانە . جەور : ستەم .
واتە : نالیا ! لە ناڵەباریی زەمانە زویر مەبە و خەم و بەزارە

— ٢ —

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی ( حەبیبە ) !
وەبزانە خوێنی خۆمە ، یا مینەتی زەقیبە (١)

---

داتنەگرێ .. ئەمــە کاری زەمانەیــە و زەمانە هەروا بــووە و وەنەبێ ستەمێ بێ لە تۆ کرابێ .. بەخشش و نەوازشی ساقێ ، واتە خوای گەورە ، یەکە یەکە و بە نۆبە خەڵك ئەگرێتەوە و وەنەبێ بە جارێ بەری هەموان بکەوێ .

مەلا جەلالی مــەلا ئەحمەد لە پەراوێزی نوســخەی (من)دا مەعنای نیوەی دۆهەمی ئەم بەیتەی وا لێداوەتەوە : « یەعنی : ئەی ساقێ ! تۆ وەك ساقیــە کۆنەکان مەبە ، هەر شــەراب بدەی بــە عاشقە کۆنەکان ، چونکە ئەگەر وابکەی شەراب بەر من ناکەوێ . تۆ شەراب بگێڕە و نۆرە بە عاشــقی نــەو بدە یەعنی عاشــقی تــازە پێگەیشــتو » . بەپێی ئەم مەعنایە ، کە ئێمە لامانوایە پەیوەندێکی بە مەعنای نیوە بەیتی یەکەمەوە نییە و لەبەر ئەوە بێجێیە ، ئەبێ (نەوبە بە نەوبە) بە (نەوبە بە نەو بە) بخوێنرێتەوە واتە : نۆبە بە تازە بدە .

لەنێوان (دەور) و (جەور)دا جیناسی لاحیق هەیە .

کەرەمی یەك بە یەکە (چر) و (چن) و (عــم) و (گم) و (ت) و (خا) : کەرەمی یەك بە یەك و . (کم) و (من) : کەرەمێکی بکە تۆش . (ك) و (اح) : کەرەمی یەك بە یەك .

— ٢ —

(١) واتە : گیانەکەم ! ناچــاری دەســت بەردار بۆنی خــۆتم مەکە ، با هەر مەودال و ســەوداســەرت بم ، ئەمەت لا گران نەبێ کەوا من دلداری تۆم و هەرگیز دەست لە یەخەت ناکەمەوە .. خۆ تۆ منت کوشتووە و خوێنم لە ئەستۆتایە ، دە وابزانە ئەم دەست لە یەخە نەکردنەوەشم بارێکیترە بەسەر شانتەوە وەك گوناهی خوێنم کە زشتۆتە و لە ئەستۆتایە ، یا وەك ئەو منەتەی کە بەدکار لەبارەی منەوە ئەیێنێتە سەرت .

ئەشکونجێ مەعنــای نیوە شیعری یەکەم بەمجــۆرە بێ : لێم گەڕێ با دەستم هەر لە ملتا بێ .. تاد ...

وەبزانە (مم) و (کم) و (من) : وابزانە .

سەر بەردەبازی ڕێتە ، تەن تەختە بەندی جێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە ، ڕۆح ماڵی خۆتە ، بیبە (٢)

تۆ نەو شکوفتە وەردی ، من مایلم بە زەردیی
تۆ هەمسەرت نەسیمە ، من هەمدەمم لەهیبە (٣)

---

(٢) بەردەباز : ئەو بەردەی لە بوارا لەناو چەم و ڕۆباری بچوکدا دائەنرێ و خەڵکی بەسەریا ئەپەڕنەوە . تەختە بەند : شوێنێ بە تەختەی بە بزمار داکوتراو فەرش کرابێ .

واتە : سەرم بۆ کردوی بە بەردەباز بەسەریا پەڕیتەوە بەرەو ئەو شوێنەی ئارەزوت لێیە . لەشیشم تەختە بەندی جێگای حەسانەوەتە . . دڵیش ئارەزوی لە خاکی بەری پێتە ، دەسا پێی پیا بنێ با خاکی بەری پێتی پێوە بنوسێ . گیانیش ئەوە هیی خۆتە ، بیبە ، چیی لێ ئەکەی بیکە . .

لەنێوان (ڕێتە) و (جێتە) و (پێتە)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ڕێتە (چر) و (چن) و (ت) و (خا): پێتە. مەیلی («پەراوێزی» چر) و (عب) : وێڵی . پێتە (چر) و (چن) : ڕێتە .

(٣) نەوشکوفتە وەرد : گوڵی تازە پشکوتو . نەسیم : شنەبا . لەهیب : بڵێسە .

واتە : من و تۆ ئەوەندە لە یەك دوورین هەر خوامان یەکە . تۆ گوڵ خونچەیەکی تازە پشکوتوی بە ڕەنگ و بۆی و ، منیش خەریکە زەرد ئەبم . . لەو هاوڕێی شنەی لێنکی بەیانیانی و تازە لە ڕۆی ڕیانا ئەکرێتەوە ، منیش هەناسەی گەرمی وەك گڕەی بڵێسەی ئاگری دووری سوتاندومی و هەڵیبڕوزاندوم .

لەنێوان (هەمسەر) و (هەمدەم)دا تەناسوب و ، لەنێوان (نەسیم) و (لەهیب)دا طیباق هەیە . بەکارهێنانی (لەهیب) بۆ (هەمدەم) لەوەوەیە کە هەناسەی گەرم لە دەسی دڵداری گرفتارەوە دەرئەچێ . هەروەها لەنێوان (وەردی) و (زەردیی)یشدا جیناسی لاحیق هەیە . دووریش نییە (نەسیم) تەوریەی تیابێ و ئیشارەت بێ بۆ (نەسیمی مەیار) و کینایەش بێ لە بەدکار .

هەمسەرت (کم) و (من) و (خا) : هەمدەمت . بەڵام دوبارەکردنەوەیەکی بێجێیە .

شاهێنی دیده بازه ، مەستی شەرابی نازه
دڵدار و دڵنەوازه ، دڵکێش و دڵفریبه (٤)

ئەو طیفله خورد ساله ، هەر چەنده وەك غەزاله
ئەمما كه هاته نەخچیر ، شێر صەولەتی مەهیبه (٥)

---

(٤) دیده باز : چاوکراوه و وریا ، یان چاو وەك چاوی باز . دڵنەواز : ئەوەی دڵی خەڵك بداتەوه . دڵکێش : ئەوەی دڵی خەڵك ڕاکێشێ بۆلای خۆی ، یا له ڕێگای دلداریيەوه دڵیان له ڕیشه بێنێ . دڵفریب : ئەوەی دڵی دلدار هەڵخەڵەتێنێ و گرەوبدەی خۆیی بکا .

واته : یار شاهێنێکی وریا و چاوکراوەیه بۆ ڕاوکردنی دلداران ، یاخود چاوی وەك چاوی باز تیژه بۆ دۆزینەوه و ڕاوکردنیان ، مەست و سەرخۆشی شەرابی نازداریی خۆیەتی ، دڵی دلداران لای خۆی ڕادەگرێ و دڵیان ئەداتەوه ، دڵیان کێش ئەکا بۆ لای خۆی و دڵیان هەڵئەفریوێنێ ... مەبەستی لەوەیه سەرخۆشێ کار ناکاته سەر وریاییەکەی و ، خۆشێ و ناخۆشێ به دەستی خۆیەتی .

لەنێوان (باز) و (ناز)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ناز) و (نەواز)دا جیناسی ناقیص هەیه .

شەرابی نازه (چر) : خەیاڵی نازه .

(٥) خورد ساڵ : منداڵ . غەزال : ئاسك . نەخچیر : ڕاو . صەولەت : هەڵمەت . مەهیب : ترس لێکراو .

واته : یاری منداڵی نازه پێگەیشتوم ، هەرچەند ناسکه وەك ئاسك ، بەڵام که هاته ڕاوکردن وەك شێر هەڵمەت ئەبا و بەسامه ، یاخود بەڵام لەڕاستیدا شێره و شێریش که هاته ڕاوکردن هەڵمەتێکی سام لێکراوی هەیه و له چاو بەیەکادانێکا هەزاران بۆ ڕاو ئەکات .

هەرچەنده وەك : ئەمه لێکتی نوسخەی (چر) و (کم) و (گم) و (من) و (عب)ه ، نوسخەکانی تر ، (خب) نەبێ که نوسیویه (بیمەینی وەك) ، هەمو لەگەڵ جیاوازیی شێوەی نوسینیانیشیا ، نوسیویانه( یعنینه ) . نەخچیر (کم) و (گم) و (من) و (عب) : نێچیر . شێر صەولەتی (چن) : شێر صەولەت، که ئەمیش ئەگونجێ (صەولەتی) بێ . (هم) و (ت) و (له) و (اح) (خا) و (خب) : شێر صەولەت و . (من) : شێری صەولەت .

دڵ پەی دەکا نیگاهی سەهمی موژەی سیاهی
ڕەمزی هەمتۆ بەڵایە ، غەمزەی هەمتۆ موصیبە (٦)

ئەی چاوی پڕ نەدامەت ، دڵ پڕ غەم و غەرامەت
بگری ، کە وشکە صۆفی لەم فەیضە بێ نەصیبە (٧)

ئەی خەلوەتیی مورائی ، بێ ڕەنگی خود نومائی
ڕەنگ زەردی عاشقی بە ، نەك زەردڕۆ و شەقی بە (٨)

---

(٦) پەی دەکا : پەیکردن واتە بڕینەوە ، لێرەدا کینایەیە لە سمین و لەتکردن . نیگاه : تەماشا . سەهم : تیر . ڕەمز : ئیشارەت . غەمزە : ئیشارەت بە چاو . موصیب : ئەوەی پێبکێ .

واتە : نیگا و تەماشای تیری برژانگی ڕەشی یار دڵ لەت ئەکا یا دڵ کون ئەکا . هەرچەند ئیشارەتێك ئەکا بۆ دڵدار گرفتاری بەڵایەکی ئەکا ، یاخود هەرچەند بە لاچاو ئیشارەت بۆ دڵداران ئەکا و ، هەرچەند نازێك ئەکا دڵی دڵداران ئەپێکێ ، یاخود نازەکەی مایەی بەڵا و مصیبەتە بۆ گیانی دڵداران .

ئەم بەیتە و بەیتی دوایی لە (چن)دا بەردوان .

(٧) نەدامەت : پەشیمانی . غەرامەت : دەرد و ئازار . فەیض : لافاوی بەرەکەت .

واتە : ئەی چاوی گریاناوی پڕ لە پەشیمانی ! بە دڵی پڕ لە خەم و ئازار و دەردەوە بگری و خۆت بە بەختەوەر بزانە ، چونکە ئەو گریان و خەلەلەی تۆ نیشانەی خۆشەویستییە و وشکە سۆفیی ڕیاباز لەو خێر و بەرەکەتە بێبەشە ..

(٨) خەلوەتی : ئەوەی بچێتە خەلوەتەوە بۆ خوا پەرستی . مورائی : ڕیاباز . خودنومایی : خۆدەرخستن. زەرد ڕۆ : شەرمەزار و ترسنۆك . شەقی : چارەڕەش .

واتە : ئەی سۆفیی خەلوەت نشینی ڕیاباز .. ئەی بە زۆر و ساختە خۆت بە بێڕەنگ و ڕۆ پیشانددەر ، تا خەڵك وابزانن لە خوا پەرستیدا وا لەڕ و لاواز بویی .. با لە ڕێگای پڕ مەینەتی عەشقدا ڕەنگت زەرد بێ ، نەك لە شەرمەزاریی حوزووری خوا و چارەڕەشیی ڕۆژی قیامەتدا لەبەر کردەوەی بەدت !

« نالی » لەبی ( حەبیبە ) هەم طیب و هەم طەبیبە
خولاصەیی لەبیبە ، فەرمانبەری لەبی بە (٩)

— ٣ —

خالی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی کاتیبە
یەعنی نوقطەی فەرقی ئیبنو موقلە ویبنو حاجیبە (١)

---

موراثی (چر) و (کـم) و (گـم) و (عب) و ( اح ) : مورایی یا مەرایی . ئەگەر (مەرایی) بێ والـە : ئەی ئەوکەسـەی بۆ مەرایی کـردن جۆیتە خەلوەوە. زەرد زۆ و شـەقی بە (چر) و (عم) و (گم):زەردی زۆ شەقی بە. (چن) : زەردییو شـەقی بە . (ك) و (خا) : زەرد و زۆ شـەنی بە . (عب) : زەرد زۆی شـەقی بە . (ت) و (مـن) و (خـب) : زەرد زۆ و شەقی بە ، یا زەردی زۆ شەقی بە ، یا زەرد و زۆ شەقی بە .

(٩) لەب : لێو . طیب : شتی بۆنخۆش . طەبیب : پزیشك ، مەبەست لێی دەرمانە بە مەجاز . لەبیب : عاقل .

واتە : نالی ا لێوی (حەبیبە) هەم بۆنی خۆشە و شایانی بۆن پێوە کردنە وەك گوڵ و ، هەم دەرمانیشـە شـایانی ئەوەیە بمژرێ و بخورێ وەکو دەرمان .. ئەو خولاصەیەیە کە بەسە بۆ پیاوی عاقل بۆ تێگەیشتن وەك عەرەب ئەڵێن « اللبیبُ تکفیهِ الاشارةُ » یا وەك کورد ئەڵێن : مشتێ نمونەی خەروارێکە .. کەواتە مادەم لێوی یار بەمجۆرە بێ ، بڕۆ بیە بە قوربانی .

لەنێوان (حەبیب) و (طەبیب)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (طیب) و (طەبیب)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (لەبیبە) و (لەبی‌بە)دا جیناسی تەرکیب هەیە . خولاصەیی (چر) و (ك) : خولاصـەیی و خولاصەوو . هەمو نوسخەکانیتر : خولاصەوو .

— ٣ —

(١) ئینتیخاب : هەلبژاردن ، بەمەعنا هەلبژاردەیـە . کـاتیب : نوسەر . مەبەست لە خوایە . ئیبنوموقلە ویبنو حاجیبە : ئیبنو موقلە و ئیبنو حاجیبـە . ئیبنـو موقلە : ابن مقلـة ، خەتخۆشـێکی بەناوبـانگ بووە . ئیشارەلیشە بە وشەی (مقلة) واتە پێلوی چاو . ئیبنو حاجیب : ابن حاجب ، نەحوزانێکی بەناوبانگی کوردە . ئیشارەلیشـە بـە وشەی ( حاجب ) واتە برۆ .

عەیب و لەعبی خەڵقی کرد تا یاری خستە داوی خۆی
خەصمەکەی من کەلبی ئاهۆ گیرە ، خیرسی لاعیبە (٢)

لەشکری خەططی شکستە و ، تیپی زوڵفی تار و مار
پادشاهی حوسنی عالەمگیری هێشتا غالیبە (٣)

---

واتە : ئەو خاڵەی لەنێوان چاو و برۆدایە نوختەیەکە خوا دایناوە کە لە جوانیی نەخشەکانیا سەردەستەی هەموانە ، نوختەیەکە بۆ لەیەك جیاکردنەوەی پێڵوی چاو ( موقلە ) و برۆ ( حاجیب ) کە هەردوکیان ئەوەندە جوانن کەس ناتوانێ بڵێ کامیان لە کامیان جوانترە ، وەك چۆن کەس ناتوانێ بڵێ ئاخۆ ( ابن مقلة ) لە هونەری خۆیا سەرامەدتر و لەپێشتر بووە ؛ یاخۆ ( ابن حاجب ) ؟

لەنێوان (چاو) و (ئەبرۆ)دا تەناسوب و ، لەنێوان (خاڵ) و (نوقطە)دا تەرادوف و ، لە ( ئیبنو موقلە ) و ( ئیبنو حاجیب )یشدا تەوریە هەیە .

(٢) لەعب : یاری . خیرس : ورچ . لاعیب : یاریکەر .

واتە : بەدکارە ناحەزەکەی من ئەوەندە ناو و ناتۆرەی لە خەڵك نا و ئەوەندەی یاری بەم و بەو کرد و هەڵیخەڵەتاندن ، تا یاریشی خستە داوی خۆی و هەڵی خەڵەتاند . ئەم بەدکارە ناحەزەی منە لەلایەکەوە بووە بە سەگی ئاسككر ، ئەوەتە یاری خستە داوی خۆی و ، لە لایەکی کەشەوە بووە بە ورچی یاری پێکردن ، ئەوەتە بە یارییەکانی خەڵك ڕاتەکێشێ بۆ لای خۆی تا پاشان ئەیانخاتە داوەوە .

(٣) خەط : گەنەمۆی تازە ڕوواوی سەر ڕوی نازداران . شکستە : شکاو ، تێکەڵ و پێکەڵ . تار و مار : پەرت و بڵاو . ڕەش و لول .

واتە : ئەو لەشکرەی یار کە دڵی دڵدارانی پێ داگیر ئەکا کە گەنمۆی تازە ڕووای سەر ڕویەتی ؛ تێكشکاو و تێکەڵ و پێکەڵە ، هەر کەمێکی لەلایەکەوەیە و ، لیپی زوڵفە ڕەش و لولەکانیشی پەرت و بڵاو بونەتەوە. بۆیە ئەبو نەیتوانییایە دڵی دڵداران داگیرکا چونکە هیچ پادشاهێك بە لەشکری شکستەی واوە شەڕی پێ ناکرێ،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پادشای جوانیی ئەو کە جیهانی هەمو داگیر کردووە ، هێشتا هەر بەسەر مەملەکەتی دڵاندا زاڵە .

وشەی ( خەططی شکستە ) ئیشارەیشە بە زاراوەیەکی نوسین ، چونکە ( خەططی شکستە ) جۆرە نوسینێکی فارسییە .

حاضری ئەمر و خیطابە دڵ ، ئەگەرچی مەنهییە !
راجیعی تۆیە ضەمیری من ، ئەگەرچی غائیبە ! (٤)

« نالی » ئێستە تاجی شاهی و تەختی خاقانیی هەیە
شەوکەت ئارا ، موحتەشەم دیوانە ، فیکرەت صائیبە (٥) ■

---

خەططی (چن) و (ت) : خەططت . شکستە (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : شکست . زوڵفی (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : زوڵفت .

ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە نوسخەی ( کم )دا بەرودوان .

(٤) حاضر : ئامادە . لە عیلمی نەحویشدا جۆرە ضەمیرێك و لە عیلمی صەرفیشدا جۆرە فیعلێکە . ئەمر : فەرمان . لە عیلمی صەرفیشدا یەکێکە لە فیعلەکان . خیطاب : فەرمودە . لە عیلمی نەحویشدا جۆرە ضەمیرێك و لە عیلمی صەرفیشدا جۆرە فیعلێکە . مەنهی : مەنع‌کراو . لە عیلمی صەرفیشدا جۆرە فیعلێکە . ڕاجیع : گەڕاوە . لە عیلمی نەحویشدا ضەمیرێکە بگەڕێتەوە سەر ئیسمێك . ضەمیر : جۆرە وشەیەکە لەجیاتیی ئیسمی ظاهیر بەکاردێ . دڵ . غائیب : نادیار . لە عیلمی نەحویشدا جۆرە ضەمیرێك و لە عیلمی صەرفیشدا جۆرە فیعلێکە .

واتە : دڵی من هەرچەند وەصڵی تۆی لێ قەدەغە کراوە و نابێ نزیکت بکەوێتەوە ، ئامادەیە بۆ هەر فەرمانێکت و چیی پێ بڵێی جێبەجێی ئەکا . ضەمیری منیش کە ئەبێ هەر بۆ خۆم بگەڕێتەوە ، بۆ تۆ ئەگەڕێتەوە و بۆنی بەستەیە بە تۆوە ، هەرچەند لەوەش کەوتووە کە بۆ خۆم بێ و سەرلێ‌شێواو و سەرگەردان بووە . چەند جوانە ضەمیرێ کە هیی ( من )ی موتەکەللیم بێ بگەڕێتەوە بۆ ( تۆ )ی موخاطەب و خۆیشی غائیب بێ .. نالی لەم موبالەغە و جوانکارییەیدا لە ئەهلی نەحو و بەلاغەش تێپەڕی کردووە .

ئەشگونجێ مەعنای ( ضەمیر ) بە دڵ لێبدەینەوە .

لەنێوان ( حاضر ) و ( ئەمر ) و ( خیطاب ) و (مەنهی) و ( ضەمیر ) و ( غائیب )دا تەناسوب و ، لە ( دڵ ) و ( ضەمیر )دا تەرادوف و ، لە ( ضەمیر )دا تەورییە هەیە .

ئەم وشانە زاراوەی عیلمی نەحو و صەرف وئوصولی فیقهیشن .

(٥) شەوکەت ئارا : لەوەی شان و شکۆ بەوەوە بڕازێتەوە . موحتەشەم

— ٤ —

دَرْونِي لِدارِ الـ ( شَارَزْورِ ) وَ بَرْدِهِ
كَفَرْمِيسْكِ گَرْمِ الِى آوِ سَرْدِهِ (١)

---

دیوان : ئەوەی کۆڕی گەورە و پایە بڵنــد بێ . فیکرەت : بــیر و ڕا . صـائیب : ڕاست و دروست .

واتە : نالی ئیـــتا کابرایەکە لــە مەیدانی شـــیعر و ئەدەبــدا تاجی پادشـایەتی و تەختی خاقانیی هەیە . شـان و شکۆ بەوەوە ئەڕازێتەوە و ، کۆڕ و مەجلیـــی پایە بڵندە و ، بیر و ڕای ڕاسـت و دروستە .

لە ڕۆیەکی‌کەشەوە ( شـاهی ) و (خاقانی) و (شـەوکەت) و (فیکرەت) و ( صـائیب ) . هەریەکە ناوی شـاعیرێکی ئێرانین . ( دیوان )یش ئیشارەتە بە دیوانی شـــیعر . بەم‌پێیە ئـەتوانین مەعنـــای بەیتەکــە بەم‌جۆرەش لێك‌بدەینەوە کەوا نالی تاجەکەی ( شاهی )ی بەســەرەوەیە و ، لەســەر تەختەکەی ( خاقانی ) دانیشتووە و ، ( شـەوکەت ) بەوەوە شـان و شکۆی هەیە و ، دیوانی شـیعرەکەی گەورە و پایەبڵندەو (فیکرەت) و (صائیب)ی سەردەمی خۆیەتی ..

بەم‌جۆرە نالی بە پشت قایمییەکی تەواوەوە بە خۆیا ئەنازێ و ، خۆی لە تای تەرازۆیەك و ئــەو هــەموو کەلە شـــاعیرانەی ئێران لە تاکەی‌تری تەرازووەکەدا دائەنێ و، حەقیشیەتی ، چونکە ئەوەی باشـتر بێتە ئاراوە، هەر ئەوەندە بەهرەی هــەبێ وەك نــالی ، ئــەتوانێ کــەڵك لە هــەموو پێشینەکان وەربگرێ و هیی خۆیشی بخاتە سەر . دەسا صـەد ئافەرین لەم ڕۆڵە سـەربەرزەی مەیدانی ئەدەبی کورد !

ئارا (کم) و (گم) و (من) : ئارا و . دیوانە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : دیوان و . (اح) و (خب) : دیوان و یا دیوانی . (خا) : دیوانی .

— ٤ —

نالی لەم پارچە شـیعرە نایابەیدا ، کە چ لەبارەی دەوڵەمەندیی سۆز و چ لەبارەی تەکنیکی هونەرییەوە ، پێشـــەنگە و بـــەر لــەو چەشنی لە کوردیدا نـــەبینراوە ، کۆمەڵێ وشــەی کوردی و عەرەبی و کوردی — عەرەبیی بەکارهێناوە و ، تێکرا بە شێوەی عەرەبی دایڕشتۆن و پێڕەوی دەستوری زمانی عەرەبی و سەر و بۆر و ژێری دوا پیتی وشـەی لە زمانی عەرەبیدا بەسەردا بڕیون .

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

هونەرەکەی نالی لەم پارچە شیعرەیدا ، لەوەدایە کە ئەو وشە کوردیانەی بەکاریهێناون ، بخرێنە قالبی عەرەبییەوە . نوسینەوەی ئەم پارچە شیعرە بە شێوەی دەستوری کوردی ، ئەو خاسیەتەی لەناوئەبرد ، سەرەڕای ئەوە کە بونی سەر و بۆر و ژێری تەواویش لە چاپخانەی کوردا مەترسیی ئەوەی نەئەهێشت کە هەندێ کەس نەتوانن لە حالی نەبونی سەر و ژێر و بۆردا شیعرەکە بێ هەڵە بخوێننەوە . زیاد لەوەش پارچە شیعرەکە وشەیوای تیایە نالی ویستویەتی بە عەرەبییش و بە کوردییش مەعنا بەخشن و ئەگەر ئەو وشانەمان بە کوردی بنوسیبایەتەوە ، مەعنا عەرەبییەکەیانمان لەکیس ئەچو . بۆیە وامان بە باش زانی لە نوسینەوەی ئەم پارچە شیعرەدا شوێنپێی دەستوری نوسینی عەرەبی هەڵگرین .

(١) دار : داری بەرابەری بەرد . ماڵ . برد : بەرد ، بەرابەری دار . ئەشکونجێ تێکڕای ( بردە ) بەمەعنا ( بەر دیمی ) بێ واتە : بەری دێی . سرد : سارد . ئەشکونجێ تێکڕای ( سردە ) بەمەعنا ( سەر دیمی ) بێ واتە : لای سەرۆی ئاواییەکەی .

واتە : سوزی دڵ و دەرونم بۆ دیتنی دار و بەردی شارەزۆر ، یاخود بۆ دیتنی ماڵی شارەزۆر و بەری ئاوایی لە دێهاتی شارەزۆر ، وەك سوزی فرمێسکی گەرم وایە ــ کە فرمێسکی چاوەکانمە ــ بۆ ئاوی سارد یا بۆ کانیاوی لای سەرۆی ئاوایی تا لێیبخۆمەوە و بیدەم بە چاوما گریانم بنیشێنێتەوە و کەف و کوڵی دەرونم دامرکێنێ . زیاتر وایە دێهاتی کوردستان لە پێینی کانیاوەوە دروست ئەکرێن بۆئەوەی پیسایی ناو ئاوایی نەچێتە سەر کانیاوەکە و ، بەپێچەوانەوە کانیاو ، ئەگەر ئاوەکەی زۆر بێ ، پیسایی ئاوایی ڕامالێ .

کفرٚمیسکٍ : نوسخەکانی بەردەستمان هیچیان (لەنوین)یان نەخستبوە سەر دوا پیتی ئەم وشەیە ، ئێمە خۆمان دامانتا چونکە هەم لە ڕوی ژێرمانەوە و هەم لە ڕوی سەنگی بەیتەکەوە پێویست بو . (چر) و (چن) و (مب) و (خا) و (خب) : کفرمیسكٍ . (مم) و (گم) : کفرمیسکی . (کم) و (من) و (ت) و (ك) : کفرمیسك . (اح) : کە فرمیسك . گرٚمٍ : (چن) و (گم) : گرمی . (مم) و (ت) و (ك) : گرم .

لەنێوان (دار) و (برد) و (آو)دا تەناسوب و لەنێوان (گرم) و (سرد)دا طیباق هەیە . لە (دار) و (بردە) و (سردە)یشدا لەطافەت هەیە .

تَرى وَرْدَهْ قَوتاً وَ جَوتاً وَ سايِقاً
فَيا قُوتَتى مِنْ جَوتِهِ ثُمْ فَرْدِهِ (٢)

تَرى عِينَةَ الأبْدانِ مِنْ ( خاكْ خولِ ) هِ
تَرى مَنْدَلَ الأوْراقِ مِنْ تُوزْ گَرْدِهِ (٣)

---

(٢) وَرْد : وەرد ، زەویی هەڵكێڕراوەی ئامادە كراو بۆ جوت كردن و تۆو یا چاندن . قوت : ڕۆزی . جوت : جوتەگا و جوت كردن . دوانە . سایِق : جوتیار ، لێخوڕی گای جوت . فَرْد : تاك .

واتە : وەردی دەشتی شارەزوور ئەبێتە مایەی ڕۆزییە ، جوتەگایە ئیشی پیا ئەكا ، جوتیارە لە گاگانی ئەخوڕێ .. ئای چۆن ڕۆزییەكم هەبوو لە جوتەگای دەشتی شارەزوور و لە تاقە جوتیارێوە كە لە گاگان ئەخوڕێ !

لەوانەیە لەم بەیتەوە بگەینە ئەوە كـە نالی لـە بنەماڵەیەكی لەبارەی ئابوورییەوە مامناوەندی بووە .

لەنێوان (ورد) و (فرد) و ، (قوت) و (جوت)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (قوت) و (جوت) و (ورد) و (سـایق)دا تەناسوب و ، لەنێوان (جوت) و (فرد)دا طیباق هەیە .

قوتتی (چن) و (خب) : قوتی .
وسایقا ( « بەراوێزی » چن ) : وَطاقة ، واتە : بەتەنها . لە (تاك)ەوە هاتووە .

(٣) عِینَة : كەرەسـتە . اَبْدان : جەمعی بەدەنە واتـە لەش . مَنْدَل : چیلكەی بۆن خۆش .

واتە : كەرەستەی لەشی ئادەمیزاد لە خـاك و خۆڵی شـارەزوورە . مەبەسـتی ئەوەیە ئەو قوڕەی حـەزرەتی ئادەمی لێ دروسـتكرا ، هی شارەزوور بۆ . تۆز و گەردیشـی بـۆنی دارێ بـۆن خۆشـی لێ دێ .

وشەی (خاك و خۆڵ) ئیشارەیشـە بە دێی (خاك و خۆڵ)ی زێدی نالی . كەواتە لە وشەی (خاك و خۆڵ)دا تەورییە هەیە .

عینة (چن) : طینة . واتە : ئەو قوڕەی ئادەمی لێ دروست كرا . خاك (چن) : خاك . مندل (چر) : منزل . تۆزْ (عب) : تۆزِ .

تَرى دَشْتَةً بِالنّوَرْدِ كانَتْ بَهَشْتَةً
نَمْ النّوَرْدِ بارانْ عَلى خاكْ بَرْدِهِ (٤)

شَوانىِ ( سُلَيْمانىِ ) ، صَبایْ ( پیرْمَصْورَ )كَنیْ
كِوانىِ ( قَرَهداغْ ) ، هَوایْ ( دارِزَرْدِ )هِ (٥)

---

(٤) دَشْتَةَ : دەشـتێك . وَرْد : گوڵ . بَهَشْتَةَ : بەهەشـتێك . نم النّوَرْد : ئاونگی سەر پەڕەی گوڵ .

واته : لـه شارەزوورا دەشـتێك ئەبینی بەهەشـتێ بۆ بـۆ خۆی ، ئەو ئاونگەی بەسـەر پەڕەی گوڵدا ئەبارێ ، وەك باران بەسـەر بەرد و خۆڵیا ئەبـارێ .

نم الورد (مم) نمْ النوْرْدیِ ، واته ورده نم ، وەك خـۆی مەعنـای لێداوەتەوە .

(٥) شوانی : شـەوانی ، یاخـود برژاندمی . پـیر مصور : پیر مەسـوور ، گەڕەكێكی سـولەیمانییە . كوانی : كێوەكانی ، یان : كوانی ، واته داخی كردم . دارزرده : داریزەرد ، شاخێكە لە قەرەداغ .

واته : باسـی كام لای لـەو وڵاته خۆشـە بكـەم ! باسـی شەوانی سولەیمانی بكەم ، یان باسی شنەبای دەمەوبەیانی پـیر مەسـوور ! باسی چیاكانی قەرەداغ بكەم ، یان باسـی هـەوای سـازگاری داریزەردی قەرەداغ !

نالی مەبەسـتی بووە بە (شوانی) مەعنای (برژاندمی) و ، بە (كِوانی) كە بەدیمەن لە (كوانی)یش ئـەچێ ، مەعنـای (داخی كردم)یش بگەیەنێ . بەمپێیە لەدوای (سلیمانی)یشـەوە بۆرێـك دائەنرێ و مەعنای بەیتەكە وای لێدێتـەوە كـەوا یادی سـولەیمانی و بـای بەیانیانی پـیرمەسـوور برژاندمی و ، بیری قەرەداغ و هەوای داری زەرد داخی كردم .

ئەشكونجێ (كِوانی) نەبێ (كوانێ) بێ ، واته : لەكوێیە !

صـبای (ت) و (عب) : صبا . (من) : صـدای . داری (مم) و (كم) و (گم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) : دارْ . (خب) : دارْ یا دار .

لەنێوان (شوانی) و (كوانی)دا جیناسـی لاحیق هەیە .

كأنَّ كنارَ أرضِهِ آسْمانَةٌ
لِبَرْزِيِّ دُورِيّ لِسَبْزِيِّ عَرْدِهِ (٦)

أما ( سَرْچِنارٌ ) ، عَيْنِي جارِيَةٌ لَهُ
أما ( تانْجَرُو ) قَدْ صارَ مَجْنُونَ هَرْدِهِ (٧)

فَباغاتُهُ داغاتٌ جَرْكِ الشَّقائِقِ
فَوا دَرْدَتِي مِنْ خارْ خارِي لِوَرْدِهِ (٨)

---

(٦) كنار : کەنار ، قەراغ . آسْماتَةٌ : ئاسمانێکە . عَرْد : عەرد ، عەرز ، زەوی . لِسَبْزِيِّ : لەبەر سەوزیی ..

والە : وەك بڵێی ئەراخی خاکی قەرەداغ لەبەر بەرزی و دووریی کێوەکانی و لەبەر سەوزیی زەویەکەی ، ئاسمانێکە بۆ خۆی .

لە شێوەی سەر و ژێر و بۆر بۆ کردنی وشەکانی نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا نوسخەکانی بەردەستمان جیاوازییەکی زۆریان تیابو ، لەبەر بێبایەخی باسمان نەکردن . جیاوازیی گرنگیان تەنها لەمەبوو : دُورِيّ ( «پەراوێزی» چر ) و (گم) و (من) و (عب) و (خا) : وَرْدِهِ . لِسَبْزِيِّ : ئەمە بەگوێرەی تێکستی ( « پەراوێزی » چر )ە بەڵام بێ سەر و بۆر . نوسخەکانی‌تر ، (عم) و (گم) نەبێ ، ( ل )یان پێوە نییە . عَرْدِهِ (چن) : هَرْدِهِ .

(٧) اما : امّا ، هەرچییەکو ..

والە : هەرچی سەرچنارە ، ئەوە چاوم ، یا سەرچاوەکەم کە چاومە فرمێسکی لێ ئەڕوا بۆی ، یاخود چاوم کەنیزەکیەتی . مەبەستی لەوەیە بڵێ چاوم بەقوربانی بێ ، یاخود چاوم وێنەیەکی بچووکیەتی لە ناو لێڕۆیشتنا . هەرچی تانجەڕۆیشە ، ئەوە بووە بە (مەجنون)ی هەردی شارەزوور و ژێی گرتووەتەبەر .

عینی : ئەمە تێکستی (چن)ە، نوسخەکانی‌تر هەمو نوسیویانە (عَيْنِ؟) . بەمپێیە مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێدێتەوە : هەرچی سەرچنارە ، کانییەك لە خەمی یادیا ئەڕوا کە کانیی چاومە . بەڵام نیوە بەیتەکە لاسەنگ ئەبێ بەمجۆرە .

هردە (چن) و (ك) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : هَرْدِهِ .

(٨) داغات : داخەکانی . دَرْدَتِي : دەردی من . خارْخارِي : دڵەکوتە و

وەکەم نالەی « نالی » مەن شفا ساقیانە
شفا ، هەل شفا مەن نالەی « نالی » بدەردە !! (٩)

— ٥ —

لە دلدا ئاتەشی عیشقت بلێسەی میثلی تەندورە
شەطی ئەشکم ئەبێ مانیع ، دەسوتێم دەبمە کۆی تورە (١)

---

یاد و ئارەزۆ .

واتە : باخەکانی سەرچنار ئەوەندە جوان و ڕازاوەن لە جوانیدا داغ بە جگەری گوڵی لالەدا ئەنێن . لەی هاوار لەو دەردەی بەهۆی یاد و ئارەزۆی گوڵەکانی سەرچنارەوە تۆشی من بووە .

جزرگ (چر): قلب. دردلی: ئەمە تێکستی (م) و (کم)ە ، نوسخەکانی‌تر هەمۆ نۆسیویانە (درونی) ، بەڵام نیوە بەیتەکەی پێ لاسەنگ ئەبێ . خارخاری (کم) و (کم) و (ت) و (من) و (خب) : خار خار .

لەنێوان (باغات) و (داغات)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (باغات) و (شقائق) و (ورد)دا تەناسوب و ، لەنێوان (خار) و (ورد)دا طباق هەیە بەدیمەن .

(٩) ساقیان : کچە ئاوگێڕەکان .

واتە : ئای چەند جار نالی لە لێوی کچە ئاو گێڕەکانی سەرچنار بەهرەمەند بووە و لێوی مژیون و لە دەردی دڵ ڕزگاری بووە .. مەبەستی لەوەیە بلێ ئای چەند جار دەمم ناوەتە جۆگاکانی سەرچنار و ئاوم لێ خواردۆتەوە و کۆی دەرۆنم بەو ئاوە دامردووەتەوە . سا لوخوا بشێ ئەوکەسەش کەوا نالی گرفتاری دەردی دۆری کرد ، ئێستا دڵی ڕەحەت بۆبێ و حەسابێتەوە و کرمی دڵی مردبێ !! بێ‌گومان ئەم چونکە پیاوی حەسۆد و دڵپیس بە مەرگە نەبێ ڕزگاری نابێ و دڵی داناسرکێ ..

ئەم بەیتەمان بەمچەشنە ، تێکڕا ، لەبەر ڕۆشنایی نوسخەکانی (چن) و (ك)دا نۆسیوەتەوە . نوسخەکانی‌تر جیاوازیی زۆریان لیابۆ کە هەمۆ لە هەڵەی نۆسیارەوە بۆن و شتێکی نوێیان نەئەدا بەدەستەوە ، بۆیە پشت گوێمان خستن .

— ٥ —

(١) شەط : ڕۆبار . کۆ : کۆمەڵ ، کۆگا ، تورە : ئاهەلە و ڕزنیخی تێکەڵی پەلە کراو .

به ناری عیشق و ئاوی دڵ ، جەسەد وەك حەضرەتی مۆسا
طەریقی : بەحری فیرعەون و ، ڕەفیقی : ئاتەشی طوورە (٢)

---

واتە : دوو شتم تیا کۆبووەتـەوە کە دژی یەکن و پێکەوە نـاگونجێن ، بەهۆی بەربەرەکانێی یەکتری کردنی ئـەو دووانەوە مـاوم ، ئەگەر تەنها یەکێکیانم تیادا بووایە لێـــتا فەوتابووم . ئەو دووانە یەکێکیــان ئاگری عەشقە کە تەنوورێکی لە دڵما ناوەتەوە و ئەویشیـان دەردی دوورییە کـە هەمیشـە بەهۆیەوە ئەگریم . ئەگەر ئەمەی دووەمیان نەبوایە کە کەمێك لێنی ئەویان دائەمرێنێتەوە ، ئەسووتام و ئەبوومە کۆی نوورە ...

لە کۆکردنەوەی ( ئاتەش ) و ( شـەط )دا طبـاق و ، لە کۆکردنەوەی ( تەنوورە ) و ( نوورە )دا جۆرە وشـەئارایییەك هەیە .

ئاتەشی (گم) : ئاگری . دەسووتێم (چن) و (عم) و (کم) و (من) و (خا) : دەسـووتم .

(٢) بەحـری فـیرعەون : ئـەو بەحـرەی حەزرەتی مۆســا و پەیڕەوەکانی لێیەڕینەوە و فیرعەون و کۆمەڵەکەشی دوایانکەوتن و نیشتنە مل ئاو و خودا نوقمی کردن و خنکاندنی . ئاتەشی طـوور : ئاگری نـووری خـودا کە بـۆ حەزرەتی مۆســا دەرکەوت و دای لە کێوی طوور و ســووتاندی .

واتە : بەم ئاگری عەشــقە و بەم ئاوی چـاوە کە لە قوڵایی دڵمەوە هەڵئەقوڵێ ، لاشـەم وەك حەزرەتی مۆســای لێ هــاتووە ، ئەبێ بەســەر جۆگای فرمێسـکی خۆیا بپەڕێتەوە کە وەك بەحرەکەی فیرعەون وایە و ، لەگەڵ ئاگری دەروونیا بگەڕێ کە وەك ئاگرەکەی کێوی طوور وایە .

لەم ( بەحری فیرعەون ) و ( ئاتەشی طوور )ەدا ئیشـارەتێکیش بۆ ئەوە کراوە کە ئەم عەشقەی ناڵی هەرگیز ناکاتە ئەنجـام ، چونکە مۆسا لــە بەحرەکەی پەڕیەوە و ڕزگاری بوو . بەڵام بەحری فرمێسـکی ئەم هەرگیز دوایی نایە تا لێی ڕزگار بێ . ئـاگرەکەی کێوی تووریـش نووری خوا بوو دەرکەوت و نیشـانەی ئەوەبوو کە مۆســا خوا خۆیی چـاو پێ ناکەوێ . کەواتە ئاگری عیـشقەکەی ئەمیش کە هەمیشـە لەگەڵیا ئەبێ ، نیشـانەی ئەوەیە کە هەرگیز ناگا بە یار .

لە کۆکردنەوەی (نار) و (ئاو) و ، (مۆسـا) و (فیرعەون)دا طیباق و ، لەنێوان (مۆسا) و (بەحر) و (طوور)دا تەناسوب هەیە .

بە ناری عیـشق و ئاوی دڵ (عم) و (گم) : بە ئاوی چـاو و ناری دڵ . بەحری (عب) و (خب) : بەحر و .

دەچێ بۆ لای ڕەقیب ، خۆشە ، وەلێ ئەو داغە کوشتوومی
لە کن ئەو چەندە مەجبوورە ، لە لای من چەندە مەغرورە ! (٣)

پەیامت هات و پەیکت ڕۆی ، خەیاڵم نارد و نەیگەیێ
ڕەسوڵم کەوتە ڕێ ، گرتی ، هێنای وەك ئاگرە سوورە (٤)

---

(٣) واتە : قەید ناکا ، ناخۆش نییە یار ئەچێ بۆلای بەدکار و سەری لێ ئەدا ، ئارەزوی خۆیەتی . بەڵام من داخی ئەوە کوشتوومی کەوا چەند لای ئەو ناچار و مەجبوور و ملکەچە و وەك بڵێی ئەم موحتاجی ئەو بێ ، کەچێ ئەگەر جارێك بێتە لای من، ئەوەندە لەخۆی باییە و فیزم بەسەردا ئەکا !

ئەشکونجێ مەعنای ئەم بەیتە بەپێچەوانەوە لێك بدەینەوە کەوا بگەیەنێ: بەدکار ئەچێ بۆ لای یار ، قەیدی نییە با بچێ بۆ لای ، بەڵام من داخی ئەوە ئەمکوژێ کەوا لای من خۆی لێ بایی ئەبێ و فیزم بەسەرا ئەکا کەوا یار لەگەڵ ئەو جۆرە ، کەچێ کە ئەشچێتە لای ئەو ، ئەوەندە ذەلیل و سەرشۆڕە .

-- دەچێ (کم) و (من) : ئەچێ . داغە (مم) و (گم) و (ك) : داخە . لەلای من (مم) و (من) : لەکن من .

(٤) پەیام : نامە یا هەواڵی نێرراو . پەیك : نامەبەر . ڕەسوڵ : فروستادە . ئاگرە سوورە : کینایەیە لە گورج و گوڵی و دەستوبرد .

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەیمان بەئارەزوی دڵی خۆمان بۆ ڕاست نەکراوەتەوە . لەوەندەی بۆی چووبێن لێرەدا ئەینووسین و چاوەڕوانی بەشداریی هەر کەسێکی کەشین کە زیاتری بۆ ساغ کرابێتەوە لێی .

نالی لە بەیتی پێشوودا بڕیاریدا کەوا بەدکار واتە ڕەقیب هەمو جارێ چاوی بە یار ئەکەوێ ، جا یا ئەم ئەچێ بۆلای ئەو یا ئەو دێ بۆلای ئەم . دیارە لەم حاڵەدا بەدکار ئەم هەواڵە دڵ ئازاردەرە بە نالی ئەگەیەنێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر دڵی بکولێنێتەوە . نالی بە یار ئەڵێ هەواڵت هات کە چوویتە لای بەدکار یا بەدکار هاتووەتە لای تۆ و ، فروستادەکەت کە بەدکار خۆی بوو کە هەواڵەکەی پێ گەیاندم ، گورج وەك جنۆکە ڕای کرد . منیش خەیاڵم نارد بەدوایا ، واتە کەوتمە بیرکردنەوە لەمە چۆن وا تۆ ڕێگای ئەوە ئەدەی ئەو ببینێ ، بەڵام خەیاڵ کوڵ بوو ، نەگەیشت بەوە لە ڕازی ئەم ڕووداوە بگا . ناچار بۆم هەناسەی گەرم و ئاگراوی و بەسۆزی خۆم بەدوادا هەڵکێشا ، ئاهی هەناسەکەم ئەوەندە تووند و تیژ بوو هێنای

که دیتم شەکلی سەد ڕەنگی ، گوتم : بابایی عەیارە
که بیستم لەفظی بێ دەنگی ، گوتم : شەیپوری شاپوورە (٥)

گوتم : ڕاستی سەبا هەڵسە ! گوتی : مەشرەب موخالیفیە
گوتم : ناری ، گوتی : بایە ، گوتم : ئەوجێ ، گوتی دووره (٦)

---

( ئەشکونجێ هێنانەکە کینایە بێ لە تێگەیشتنی مەسەلەکە ) .
نەیگەیێ (چن) : نەیگەشتێ . (ك) : نەیگەییە .
نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (عم) و (گم)دا بەمجۆرەیە :
**پەیامت هات و پێ گوت ، ڕۆی ، خەیاڵم ناردە دوّی ، گەییە**
ئەم بەیتە لە (کم) و (من) و (خا)دا نییە .

(٥) بابای عەییار : وەك لە ئەفسانەدا ئەیگێڕنەوە کابرایەك بووە لە دەستە و دائیرەی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا ، ئارەزووی لە کێ بوایێ بچێتە شێوەیەوە، چووەتە شێوەیەوە . شەیپور : ئالەتێکی مۆسیقایە فوی پیا ئەکرێ .

واتە : که شێوەی سەد ڕەنگیم دیێ ، وتم ئەمە بابای عەیارە ، چۆن ئارەزوو بکا وا خۆی ئەگۆڕێ ، بۆیەش توانیویە جێی خۆی لە دڵی یاردا بکاتەوە . کە دیتیشم دەم ئەجوڵێنێتەوە و هیچیش نالێ ، وتم بێ و نەبێ ئەمە کەڕەناکەی شاپوورە . هەرچەند لە سەرچاوەکانی بەردەستمانا شتێکی لەوتوومان لەبارەی ئەم کەڕەنایەوە بۆ ساغ نەکرایەوە ، بەڵام دوور نییە جۆرە بلوێرێکی جادووگەرانە بوبێ توانای کارکردنی لە دڵی خەڵك و ڕاکێشانیانا بوبێ ، بۆیە نالیش وا بەدکاری پێ ئەشوبهێنێ .

که دیتم (عم) و (گم) و (من) : که من دیم . گوتم ــ ی یەکەم ــ (چر) و (کم) و (من) :وتم . گوتم ــ ی دووەم ــ (چر) و (چن) و (کم) و (من) و (ك) و (خب) : وتم .

(٦) ڕاستی سەبا : ئیشارەتە بە دوو ئاوازی مۆسیقا : (ڕاست) و (سەبا) . مەشرەب : ذەوق . موخالیف : پێچەوانە . ئاوازێکی مۆسیقایە . نار : ئاگر . با (باد) : سەرەڕای مەعنا دیارەکەی ئاوازێکی مۆسیقایشە. ئەوج : چلە پۆپە . ئاوازێکی مۆسیقایە .

مەعنای ئەم بەیتەمان بە یەکجاری بۆ ڕاست نەبوەوە ، بەڵام دیارە داوای لەم ئاوازە مۆسیقاییانە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە بەدکار لە بەیتی پێشوودا کرا بە شەیپوری شاپور . دوور نییە لە ( ڕاست ) و (سەبا) و (موخالیف) و (نار) و (با) و (ئەوج) و (دوور)دا تەورییە هەبێ ،

گوتم : قوربانی تۆ من بم ، گوتی : قوربانی تۆ سەگ بێ
گوتم : شیشەی دڵم ناتوێ ؟ گوتی : بۆچیمە ؟ مەکسوورە (٧) ■

---

چونکە ئاشکرایە ئەم وشانە هەمۆیان ناوی ئاوازی مۆسیقان ، (نار) و (دۆر) نەبێ ، کە لەمبارەوە شتێکیان لێ نازانین . بەمپێیە ئەبێ مەعنای بەیتەکە بەمجۆرە بێ : بە بەدکارم وت بەم (بەیانی)یە (ڕاست) بە لەگەڵم ، ولی ئارەزۆم (موخالیف)ی ئەوەیە لەگەڵت ڕاست بم . وتم کەواتە (ئاگر)ی باسی پەیوەندی خۆت و یار بنێ بە جگەرمەوە ، ولی ( با )یە و ئاگرەکە بە هەمۆلایەکا بڵاوە ئەکا . وتم کەواتە دۆرکەومرەوە لە یار با من بگەمە (ئەوج)ی بەختەوەری ، ولی ئەوەش (دۆر)ە .. یاخود کە دیم بەدکار وەك شەیپۆری شاپۆر وایە ، وتم مەقامێکی (ڕاست) و (صەبا)م بۆ لێدە ، ولی ئارەزۆم لە مەقامی (موخالیف)ە . وتم مەقامی (ئاتەش)م بۆ لێدە ، ولی ئێستا کاتی مەقامی ( باد )ە و ( باد ) و ( ئاتەش )یش ناکەونەیەك . وتم مەقامی (ئەوج)م بۆ لێدە ، ولی مەقامی (ئەوج) مەقامێکی ( دۆر )ە و نایگەیتێ .

وشەی (موخالیفیە) لە هەمۆ نوسخەکانی بەردەستمانا بە (موخالیفە) نۆسرابۆ . نیوە شیعرەکە بەوە لاسەنگ ئەبۆ ، ئێمە خۆمان کردمان بە (موخالیفیە) و بەوە نیو شیعرەکەشمان ڕاست کردەوە و مەعناکەش تێکناچێ . بەڵکو ئیمە لامانوایە لە ئەسڵیشدا یا ( موخالیفیە ) بووە یا (موخالیفمە) .

دانانی (گوتم) و (گوتی) لە تێکڕای ئەم بەیتەدا بەپێی تێکستی نوسخەکانی (عم) و (گم) و (عب) و (خا)یە ، نوسخەکانیتر لەنێوان (گوتم) و (وتم) و (گوتی) و (وتی)دا تێکەڵ و پێکەڵن . هەڵە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : هەستە . بایە (چن) : بادە .

(٧) ناتوێ : ناتەوێ . مەکسوور : شکاو .

واتە : بە یارم وت : بەقوربانت بم ، کەچێ ئەوەندە دڵڕەق بۆ ، دڵی شکاندم و لە وەڵاما وتی : سەگ بە قوربانت بێ .. لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەستبەرداری نەبۆم و پێشنیارم کرد کە شوشەی دڵمی بدەمێ ، بچێتە ناوی و رازێ بێ بە خۆشەویستێ لە دڵما جێگیر بێ ، بەڵام قایل نەبۆ ، وتی : تۆ دڵت شکاوە و منیش ناچمە ناو دڵی شکاوەوە .

لەمبەیتەشدا دانانی (گوتم) و (گوتی) بەپێی تێکستی نوسخەکانی (چر) و (عم) و (ك) و (عب) و (خا)یە . نوسخەکانیتر لەنێوان (گوتم) و (وتم) و (گوتی) و (وتی)دا تێکەڵ و پێکەڵن . شیشەی دڵم ناتوێ (چن) و

■ گوتم شیشەی دڵت ناوێ ، گوتی بۆ چیمە مەکسورە

خەراباتی دڵی « نالی » مەفەرمۆ : خاڵییە ، ئابەم !
بە مەرگی تۆ قەسەم ، چاوم ! بە ذیکرت بەیتی مەعمورە .. (٨)

— ٦ —

وەصفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بە دەرە
ئیبتیدای مەدحی دەمی وەك خەبەری بێ ئەثەرە (١)

---

(ك) : شیشەی دڵم بۆ تۆ . (عم) و (كم) و (گم) : شیشەی دڵت ناوێ .
(من) : شوشەی دڵت ناوێ .

(٨) خەرابات : وێرانە و كاول . بەیتی مەعمور : ماڵی ئاوەدان . بە ماڵی كەعبەیش ئەڵێن . شوێنێكیشە لە ئاسمان .

ئەم بەیتە جۆرە پەیوەندییەكی بە بەیتی پێشووەوە هەیە ، ئەوەش ئەوەیە كە لە بەیتی پێشودا دڵی نالی كرا بە شوشەی شكاو ، واتە وەك شوێنێكی كاول و وێرانەی لێ هات . لێرەشدا نالی ، وەك بڵێی بەرپەرچی قسەكەی یار بداتەوە ، ئەڵێ : چارەكەم ! پێم مەڵێ‌ڕمۆ دڵت شكاو و وێرانەیە و خاڵییە ئابەم تیا دانیشم ، بە مەرگی تۆ قەسەم دڵم بە یادی تۆ ئاوەدانە هەرگیز یادی تۆی لێ نابڕێ . ئیتر چۆن ئەتوانی بە وێرانەی ناو بەی !

لەنێوان (نالی) و (خالی)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (خەرابات) و (مەعمور)دا طیباق هەیە . خاڵییە (چر) و (عم) و (گم) و (عب) و (خا) و (خب) : چا نییە .

— ٦ —

(١) خەبەر : دەنگوباس . بێ‌ئەثەر : لەوكەسەی ڕۆیشتبێ بۆ سەفەرێكی وەك جەنگ و ماوەیەكی زۆری بەسەرا تێپەڕبێ و كەس هەواڵێكی نەزانێ .

واتە : تەعریف‌كردن و پیاهەڵدانی جوانیی ڕوخساری یار لەوە بەدەرە كە بیری بنیادەم پەی پێ ببا و ، لە توانای تێگەیشتنی ئادەمیزادا نییە . سەرەتای مەدح‌كردنی دەمی ، وەك دوایییەكەی ، لە هیچ كوێیەكەوە نیشانەیەكی دیار نییە . مەبەستی لەوەیە دەمی یار ئەوەندە بچوكە یا ئەوەندە جوانە ، بنیادەم نازانێ لەكوێوە دەس بكا بە تەعریف‌كردنی و لەكوێوە دوایی پێ بێنێ . یاخود : سەرەتای

نەونیهالی قەدی تۆ عەرعەرە ، دڵخواهی منە
ڕاستە دڵدارە ، وەلێ حەیفە کەوا بێ ثەمەرە ! (٢)

قامەتی سەروی ، ئەگەر بێ بەرە بۆچ نارەوەنە ؟!
تۆ بڵێ زولفی ئەگەر دۆکەڵە ، بۆچ ناری بەرە ؟! (٣)

---

تەعریفکردنی وەك حەواڵی کەسێکی ونبۆ وایە ، جا ئەگەر سەرەتاکەی وابێ ، ئەبێ دوایەکەی چۆن بێ !

مەعنای پێشۆ لە زاراوەی (موبتەدا) و (خەبەر)ی عیلمی نەحو وەرگیراوە . چ بەپێی ئەم مەعنایە و چ بەپێی مەعنای دۆهەمیش ، تەناسوبێکی جوان لەنێوان (ئیبتیدا) و (خەبەر)دا هەیە . هەروەها ڕستەی ( خەبەری بێئەثەر )یش لە زاراوەیەکی شەرع وەرگیراوە .

ڕوخساری (چن) : ڕوخسارت ، بەڵام لەگەڵ نیوەی دۆهەمدا ناگونجێ . (خب) : ڕوخسارە .

(٢) نەونیهال : نەونەمام ، نەمامی تازە هەڵچۆ . عەرعەر : داری سەروی کێوێ . دڵخواه : ئەوەی دڵ بیبەوێ . دڵدار : داریدڵ . خاوەن دڵ .

واتە : نەونەمامی باڵای تۆ بەرز و ڕێك و ڕەوانە وەك سەرو و دڵی من گیرۆدەیەتی و حەزی لێیە .. ڕاستە ئەو نەونەمامە درەختی دڵانە و دڵی دڵدارانی پێوەیە ، بەڵام درەختێکی بێبەریشە ، ئەو دڵانەی پێوەینی هیچیان لێوە دەسگیر نابێ .

لە یەکخستنی (دار)ی (دڵدار) و (ثەمەر)دا تەناسوبێکی جوان هەیە .

نەونیهالی ( « پەراوێزی » چر ) و (کم) و (گم) و (عم) و (من) و (خا) : نەونەمامی .

(٣) نارەوەن : لە کوردیدا درەختێکی ساق ئەستورە ، لە بەرزێ و نزمیدا مامناوەندییە ، لق و پۆپ و گەڵای زۆری لێ ئەبێتەوە ، هیچ جۆرە بەرێکی نییە . بەممەعنایە بۆ ئەم شوێنە دەست نادا . لە فارسیدا بەمەعنای داری هەناریش هاتووە . ئەم مەعنایە بۆ ئێرە ئەگونجێ . دۆریش نییە وشەکە بەهەڵە نۆسرابێتەوە و (نارەبەن) بێ کە واتە درەختی هەنار . نار : هەنار .

نالی لە بەیتی دۆهەمدا بڕیاری‌دا کەوا نەمامی باڵای یار هەرچەند دڵی دڵدارانی وەك بەر پێوە پێوەند بووە ، بەڵام نەمامێکی بێبەرە بۆ دڵدارەکانی . لەم بەیتە و بەیتی پاشەوەشیدا ، کە مەعنایان تێکڕا وەك

زولف ئەگەر دڕکەلە ، دڕکەڵ بەری گولناری نیە !
سەروە گەر قامەتی ، کەی سەروی ڕەوان بارەوەرە ؟! (٤)

---

یەکە ، وەك لە قسەکەی پەشیمان بێتەوە وا پیشانئەدا و ئەیەوێ بڵێ
تەمامی باڵای یار بەری هەیە و بەرەکەی مەمکەکانیەتی ، بەڵام جۆرە
دڕدڵێ و گیرە و کێشەیەك دێنێتە ڕێی خۆی و ئەڵێ : ئەگەر ڕاستە
باڵای وەك سەروی یار درەختێکی بێبەرە ، ئەی بۆچی بووە بە داری
هەنار و جۆڕێ مەمکی وەك هەناری پێوە بەند بووە ؟ ئەگەر تاڵی
زولفیشی خەتی باریك و ڕەشی دڕکەلە ، ئەی بۆچی بەرەکەی هەنارە ؟
مەبەستی لەوەیە کە زولفەکانی شۆڕ بونەتەوە تا گەیشتونەتە سەر
مەمکەکانی و مەمکەکانی وەك هەنار بوون بە بەری .

سەروی (چن) : سەروە . نارەوەنە (کم) و (گم) و (ت) و (من) :
نارەوەرە . ڕەنگە مەعنای (نارەبەرە) بێ واتە : بەرەکەی هەنارە . (عم) :
بارەوەرە . ڕەنگە مەعنای (بارەبەرە) بێ واتە : گوڵێکی هەڵگرتووە .
ناری بەرە (چر) و (عب) : نارەوەرە . ( « پەراوێزی » چر ) : نازە سەرە .
(چن) و (خب) و (ك) : نارەبەرە . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : نارە سەرە .
ڕەنگە مەعنای ( لەسەر هەنارە ) بێ . (ت) و ( اح ) : ناربەرە . بۆ
ناریبەرە و نارەبەرەش دەستئەدا .

نیوەکانی ئەم بەیتە لە (عم) و (کم) و (گم) و (من)دا بەرودوان .

(٤) گولنار : گوڵی هەنار . بە گوڵی هەناری کێویش ئەڵێن کە هەر گوڵەکە
ئەکا و بەری نییە . گوڵەکەی گوڵێکی سوری جوانە سەد پەڕەی هەیە .
بارەوەر : بارەبەر ، بار هەڵگر .

واتە : ئەگەر بڵێین زولفی یار لەبەر ڕەشی و باریکیی تاڵەکانی دڕکەلە،
خۆ دڕکەڵ بەری گوڵە هەنار ناگرێ، کەچی زولفی یار بەری گوڵە هەناری
هەیە کە ڕوومەتی سوریەتی . خۆ ئەگەر بشڵێین سەروە ، کەی سەرو
باری میوە هەڵئەگرێ کە مەمکەکانی یارە کە بە داری باڵایەوەن !

گولناری (عب) : گوڵناوی . سەروە گەر قامەتی (چر) و (خا) : سەرو
ئەگەر قامەتی . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : سەرو ئەگەر قامەتە .
بارەوەرە (ت) : ناردەرە ، واتە : هەناربەخشە .

ئێمە وای بۆ ئەچین لەم دوو بەیتە هیی نوسخەی جیاجیا بێ و نالی
لەپێشا یەکێکیانی دانابێ و پاشان بیری گۆڕابێ و ویستبێتی ئەویکەیان
لە جێگەی دانێ ، بەڵام خەڵك کە پارچە شیعرەکەیان نوسیوەتەوە ،

به حەقی جەزڕی هەیاسەی زەڕ و کاکۆڵی سەری
دڵی گوم گەشتەیی من کوشتەیی پشت و کەمەرە (٥)

بێ ئەگەر بێتە دەرت ، دەیدەیە بەر شەق وەکو گۆ
نییە ذاتیشی لەبێ دڵ ، چ بکا ، قوڕ بە سەرە ! (٦)

---

هەردو بەیتەکەیان خستووەتە چوار چێوەبەوە . بەپێی بۆچونەکەی خۆشمان لامانوایە نالی بەیتی چوارەمی باشتر داناوە و ویستویەلی لە جێکەی بەیتی سێهەمیدا دانێ .

دانانی ئەم بەیتە لێرەدا بەگوێرەی نوسخەکانی (چر) و (مم) و (کم) و (گم) و (من) و (خا)یە . نوسخەکانیتر کردویانە بە بەیتی شەشەم .

(٥) جەڕ : بەستن . گومگەشتە : ونبو . کەمەر : پشتێنە .

واتە : قەسەم بە حەققی هەیاسەی زێڕ لە پشت بەستنی یار و ، قەسەم بە قژی سەری ، دڵی سەرلێشێواو و ونبوی من کوژراوی ناوشانی یارە کە قژەکەی پیا هاڵوەتە خوار و ، هیی پشتێنەبەلی کە هەیاسەکەی بەستووەلێ .

لەنێوان (جەڕ) و ( زەڕ ) و ( سەر )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (گەشتە) و (کوشتە)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

کاکۆڵی سەری ( « بەراوێزی » چر ) و (مم) و (کم) و (گم) و (من) : زولفەینی کەچی . گومگەشتەیی (ت) : سەرگەشتەیی . پشت و کەمەرە (خب) : پشتی پودمرە !

(٦) بێ : ئەگەر بێتو . دەرت : دەرگات .

واتە : دڵ ئەگەر بێتو بێتە بەردەرگای ماڵت دڵسۆزیی خۆیت بۆ باس بکا ، وەك گۆ ئەیدەیتە بەر شەق و سەری ئەکوتیتەوە و سەرزەنشتی ئەکەی .. ناشتوانێ نەیەت و ، بێ تۆ ئۆقرە ناگرێ .. قوڕبەسەرە ، داماوە نازانێ چی بکا !

لەنێوان (بێت) و (نەیێ)دا طیباق و ، لەنێوان (بێ) و (بێتە)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (نییە) و (نەیێ)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

وشەی (دڵ) فاعیلی (بێتە)ش و (نەیێ)یشە ، واتە ئەم دوو فیعلە هەرایانە لەسەری !

بێ (مم) و (گم) : سەر . دەرت (خب) : دەرێ . نییە ذاتیشی نەیێ

لە دەمی نالەیی زارم ، دلی پڕ زەمزەمەکەم ،
وەلوەلەی حەلق و گەرووی « نالی » لە گەردوون بە دەرە (٧)

— ٧ —

ئەی ساکینی ڕیاضی مەدینەی موئەووەرە
لوطفێ بکە ، بفەرموو : مەدینەی منە و ، وەرە (١)

---

(چر) و (خا) و (خب) : نییە ڤالیشی نییە . (ت) و (اح) : نییە ڕاطیش کە نەبێ . (ك) : نییە ڤالیش کە نەبێ .

(٧) زار : دەرد و ئازاراوی . زەمزەمە : هەرا و زەنا . وەلوەلە : هاوار و فوغان . حەلق : گەروو .

واتە : هاوار و فوغانی گەرووی نالی کە لە دەمی نالەی ئازاراوی و دلی پڕ هەرا و زەنایەوە دەرئەچێ ، ئەوەندە زۆرە لە چەرخی گەردوونیش تێئەپەڕێ .

دلی پڕ زەمزەمەکەم (مم) و (کم) و (گم) : لە دلی پڕ شەرەرم . وەلوەلەی (مب) : زەمزەمەی . حەلق ( خب ) : خەلق .

— ٧ —

ئەم قەسیدەیەش یەکێکە لەو قەسیدانەی کە نالی بۆ پێغەمبەر ( د . خ )ی وتوون . بەر لەم قەسیدەیە ، موستەزادەکەی ژمارە (٢)ی لیبی میم بلاوکرایەوە .

(١) ڕیاض : باخچەکان ، جەمعی (ڕەوضە)یە . مەدینەی موئەووەرە : شاری نوورانی و پیرۆز ، شاری مەدینە کە پێغەمبەر لە مەککەوە کۆچی بۆ کرد و لەوێ وەفاتی کرد .

واتە : ئەی دانیشتووی ناو گولزارەکانی شاری مەدینەی پیرۆز ! بەزەییەکت پیامدا بێتەوە و بفەرموو ئەم شارە شاری منە ، وەرە بۆ ئێرە، با منیش ئەوم بێ بێمە خزمەت .

نالی لە گفتوگۆ کردنیدا لەگەل پێغەمبەر (د.خ ) کە پێی ئەلێ (ساکن) ، ئەیەوێ ئەوە پیشان بدا کە پێغەمبەر لە ڕیزی مردووان نییە .. سەبارەت بەوەش کە بە مەرقەدی پێغەمبەر ئەلێن (ڕەوضەی موطەهەرە) ، لە وشەی (ڕیاض)یشدا ئیشارەت کراوە بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر کەئەفەرموێت : «مابَیْنَ بَیْتي و مِنْبَري رَوْضَةٌ مِنْ رِیاضِ الجَنَّةِ» ، واتە : بەینی مالەکەم و مینبەری مزگەوتەکەم ــ کە ئێستا مەرقەدی لەوێیە ــ باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت .

عەرشی بەرین کە دائیرەیە ، ڕەوضە مەرکەزە
فەرشی زەمین بە عەرصەیی طەیبە موجەوهەرە (٢)

طەیبە کە یەعنی عەکسی بەقیعی هەمۆ عەبیر
طەیبە کە یەعنی مایەیی ئەو میشکی ئەذفەرە (٣)

---

لەنێوان (مونەووەرە) و (منە و وەرە)دا جیناسی تەرکیب هەیە ، چونکە یەکەمیان یەك وشەیە و دۆهەمیان دۆ وشەی بەیەکەوە بەستراوە .

لوطفی (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : ڕەحمی .

(٢) بەرین : پان و پۆڕ و گەورە . دائیرە : خڕ و بازنەیی . ڕەوضە : مەرقەدی پێغەمبەر . عەرصە : پارچە زەوی . طەیبە : شاری مەدینە. موجەوهەر: گەوهەراوی ، بە گەوهەر ڕازێنراوە .

واتە : عەرشی پان و بەرینی خوا کە دائیرەیەکی گەورەیە دەوری هەمۆ جیهانی داوە ، مەرقەدی پێغەمبەر مەرکەزەکەیەتی . ڕۆی زەویش کە وەك فەرشێکی ڕاخراو وایە ، بە مەیدانی مەدینە ڕازاوەتەوە .

نالی لەم بەیتەدا زیادەڕەوییەکی ئێجگار جوانی کردووە ، چونکە ئەیی زەوی بە فەرشی جوان بڕازێتەوە ، نەك ئەرش بە زەوی . ئەمە لە لایەکەوە . لە لایەکی کەشەوە زەوی شتێکی نەجوڵاو و نەگۆڕاوە ، بەپێچەوانەی فەرشەوە . بۆیە ئەویش هاتووە زەویی هەمۆ لەناسنی شاری مەدینەدا بە فەرش داناوە و مەدینە بە زەوی . .

لەنێوان (دائیرە) و (مەرکەز)دا تەناسوب و ، لەنێوان (عەرش) و (فەرش)دا جیناسی لاحیق هەیە .

دائیرەیە (جر) و (چن) و (کم) و (من) : دائیرەیی . زەمین (گم) : زەوی. بە : ئەمە تێکستی نوسخەی (گم)ە . لە هەمۆ نوسخەکانیترا : کە ، بەڵام مەعنای نایەت . عەرصەیی (کم) و (ك) و (لـو) و (مب) و (اح) و (خا) : عەرصەیە . طەیبە موجەوهەرە (ت) : طەییبە جەوهەرە .

(٣) عەکسی بەقیع : پێچەوانەی بەقیع کە (عەبیق)ە واتە بۆن و بەرامەی خۆش . ئیشارەتیشە بۆ گۆڕستانی ( جنة البقیع ) کە یەکێکە لە گۆڕستانە بەناوبانگەکانی موسوڵمانان و بەشێکی زۆر لە هاوڕێ گەورەکانی پێغەمبەر لەوێ نێژراون . مایە : ماددە . مێشکی ئەذفەر : میشکی پوختە و بۆنخۆش .

واتە : ئەو شاری طەیبەیەی کەوا ڕەنگ و بۆن دانەوەی ( جنة

طەیبە کە یەعنی زۆرز و شەوی طیبی عالەمە
زۆری کە وشکە ، شەو تەڕە ، کافور و عەنبەرە (٤)

لێوم ، لە زۆری ڕۆشنی کافوری وشکی ، وشك
چاوم ، لە شەبنمی شەوی وەك عەنبەری تەڕە (٥)

---

البقیع )ەکەی ، هەمو عەبیری بۆنخۆشە ، یان پێچەوانەی وشەی ( بقیع )ەکەی ( عبق )ە کە واتە عەبیری بۆن خۆش .. ئەو شاری طەیبەیەی کە وشەکەی واتە بۆنخۆش و ئەوەش وانەگەیەنێ ئەو ماددەیەی لێی دروست کراوە میشکی پوختە و بۆنخۆشە .

کە یەعنی عەکسی بەقیعی (چن) : کە عەکسی ڕەبیعی هەمو . هەرچەند ئەم نوسخەیە بۆ بەراوردی ( عەبیر )ەکە باشتر دەستی ئەدا ، بەڵام لەبەر بۆنی ( بەقیع )ەکە ، ئێمە نوسخەکانیترمان لا پەسەندتر بۆ ، چونکە باس باسی مەدینەیە و بەقیعیش لەوێیە . مایەیی ئەو ( « پەراوێزی » چر ) : مائیدەیی و ، مایەیی وەك .

(٤) طیب : بۆنخۆشێ . کافور : دەرمانێکی بۆن خۆشی سپی ڕەنگە ، لە درەختێکی ئەکەنەوە . عەنبەر : شتێکی بۆن خۆشە ، ڕەنگی وەك ڕەنگی گڵ وایە لە گەدە یا لە ڕیخۆڵەی جۆرە ماسیەکی دەرئەهێنن .

واتە : لەو شاری طەیبەیەی کە بە شەو و بە ڕۆژ بۆنخۆشێ ئەدالەوە بە جیهانا و ، بە ڕۆژ وشك و سپییە وەك کافور و بە شەو شێدار و ڕەشە وەك عەنبەر .

ئەم بەیتە ئیشارەیشە بە ئاو و هەوای شەوو ڕۆژی مەدینە .

لەنێوان ( طەیبە ) و ( طیب )دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لەنێوان ( ڕۆژ ) و ( شەو ) و ، ( وشك ) و (تەڕ)دا طیباق و ، لەنێوان (کافور) و ( عەنبەر )دا تەناسوب هەیە .

عالەمە (ت) و ( « پەراوێزی » لە ) و (اح) : غالیبە . وشکە (من) : وشك و .

(٥) شەبنم : شەونم .

واتە : لە خەفەتی نەبینینی ڕۆژی وەك کافور وشك و ڕۆشنی مەدینەدا لێوم وشك و بەبارە و ، لە داخی هەڵنەمژینی شەونمی شەوی وەك عەنبەر ڕەش و تەڕیشیدا چاوم پڕە لە فرمێسك و هەمیشە هەر ئەگریم .

طەیبە کە یەعنی طەییب و طاهیر بە ڕەوحی ڕۆح
فەرقی ئەڵێن : گڵی لە گوڵ ، ئاوی لە کەوثەرە (٦)

یەعنی گوڵاوی قودسە گڵاوێ ڕەفع ئەکا
ئەو خاکە چاکە پاکەوو ئەو ئاوە مەطهەرە (٧)

★ ★ ★

---

لە کۆکردنەوەی ( ڕۆژ ) و ( ڕۆشنی )دا تەناسوب و ، لەنێوان هەردۆ (وشك)دا جیناس و ، جیایش هەیە چونکە دۆ جۆرە وشکیی جیاوازن . هەروا لەنێوان ( ڕۆژ ) و ( شەو ) و ، (تەڕ) و ( وشـك )دا طیباق و ، لەنێوان ( شەونم ) و ( شەو )دا تەناسوب هەیە .

شەبنمی (عـم) و (کم) و (گم) و (من) : شـەونمی . شەوی ( عم ) : تەڕی . وەك ( تۆ ) : چون .

(٦) طەییب ، طاهیر : پاك و خاوێن . ڕەوح : هەناسـە . ڕۆح : روح الامین ، جوبرەئیلی فریشتەی سرۆش هێنان بۆ پێغەمبەران ، یان کینایەیـە لە پێغەمبەر ( د. خ ) چونکە لای ئەهلي دڵ بە( روح الارواح )ی ناو ئەبەن . کەوثەر : حەوزێکە لە بەهەشتدا .

واتە : شاری طەیبە کە تەنانەت ناوەکەشی وائەگەیەنێ بە هەناسەی پیرۆزی جوبرەئیل ، یا لە بەرەکەتی پێغەمبەرەوە پاك و خاوێنە ، ئەڵێن جیاوازیی لە شوێنانیتر ئـەوەیە گڵی لـە گوڵ ئەچێ و ئاوی لـە ئاوی حەوزی کەوثەرە .

لەنێوان ( طەیبە ) و (طەییب ) و ، (ڕەوح) و (ڕۆح) و ، (گڵ) و (گوڵ)دا جیناسی موحەڕڕەف و، لەنێوان (گڵ) و (گوڵ) و (ئاو)دا تەناسوب هەیە .

دەڵێن (عم) و (کم) و (من) : ئەڵێن . گڵی لە گوڵ ، ئـاوی : شێوەی نوسینی هەمۆ نوسخە دەستنوسەکان و نوسخەکەی (عم)یش سـەیدانی ئەوە ئەدەن ئەم ڕستەیە واش بخوێنرێتەوە : گڵی لەگەڵ ئـاوی . بەم پێیە مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێدێتەوە : ئاو و گڵی مەدینە لە کەوثەرەوە هاتووە . کەوثەریش کینایە ئەبێ لە بەهەشت .

(٧) گڵاوێ ڕەفع ئەکا : گڵاوێ لائەبا . ئەگەر سەگێك یا بەرازێك دەم بخەنە قاپێك یا بکەون لە کەسێك یا لە شتێك و سەگەکە یا بەرازەکە یا ئەوەی لێی‌کەوتۆن ، یەکێکیان تەڕ بێ ، ئەوە قاپەکە ، یا ئەو کەسە یا ئەو شتە ،

« نالی » کەوا سەگی ئەو مەرز و بوومەیە
ئەمما سەگی موعەللەمی بێ دەنگ و بێ وەڕە ، (٨)

---

بە گوێرەی شەرع گڵاو ئەبێ و پێویستە حەوت جار بشۆررێ کە جارێکیان بە توزاوێکی خاوێن بێ . بەو شۆرینە ئەڵێن گڵاوێ دەرکردن . گڵاوێ لێرەدا کینایەیە لە گوناهبار بوون . مەطهەر : شوێنی پاك بوونەوەی گیانی گوناهبار لە گوناه .

واتە : مادەم گڵی مەدینە گوڵ و ، ئاوی لە ئـاوی کەوثەر بێ ، دیارە گڵ و ئاوی ئەبێ بە گوڵاوی خـوایێ و ، گڵاویی گیـانی گوناهبارانی پێ دەرلەکرێ و ، لەو خاکە چاك و پاکەی مەدینە و ئەو ئـاوە کەوثەریەی ئەبن بە شوێن و هۆی پاڵاکردنەوەی گیانی گوناهباران .

لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا وشـەی ( چاکە ) بێ (و)ی عەطف نوسراوە. ئێمە خۆمان بۆمان دانا ، چونکە یەکەم لە شێوەی نوسـینی کۆندا زۆر جار واڵەبێ (و)ی عەطف و (ی) ئیضافە نانوسرێن . دووەم لاسەنگ نەبوونی نیوە بەیتەکەش پێویستی بەوە بوو ، چونکە ، ئەگەر وامان نەکردایە ئەبوو وشەی (مەطهەرە)مان بە (موطەههیرە) یا (موطەهھەرە) بنـوسیبایە کە هیچیان بۆ ئەم شوێنە دەس‌نادەن ، یەکەم لە ڕووی مەعنا و دووەم لە ڕووی لەفظەوە کە لەگەڵ ڕەویی تێکڕای پارچە شیعرەکەدا ڕێك ناکەوێ.

لەنێوان ( گوڵاو ) و (گڵاوێ ) و ، ( ئەو ) و ( ئاو )دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (خاك) و (چاك) و (پاك)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ڕەفع (ەم) و (کم) و (گم) و (من) و (ت) و (تۆ) و (ەب) و (من) : دەفع. بەڵام دەفع لەم جۆرە شوێنانەدا بەکارناهێنرێ . چاکە باکە (چر) : پاکە چاکە . مەطهەرە ( چن) : میطهەرە ، بەڵام هەڵەیە چونکە ئیسمی ئالەت لە فیعلی نەجوڵاو دروسـت ناکرێ . ( اح ) و ( خـا ) : موطەهھەرە ، ئەمیش هەڵەیە وەك ڕوونمان کردەوە .

(٨) مەرز و بووم : لە دوو وشەی (مەرز) و (بووم) پێکهاتووە کە یەکەمیان واتە سنوور و دووەمیان واتە ڕێ و شوێن و خاك و وڵات . ئێستا تێکڕا بەمەعنا وڵات و ناوچە بەکارلەهێنرێ . سەگی موعەللەم : سەگی فێرکراو .

نالی لەم بەیتەدا خۆی لە ڕادە بەدەر بە کەم داوەتە قەڵـەم کە خۆی کردووە بە سـەگی بەردەرگای سـەگی لـەو ناوچەیـە و ، بەوەشەوە نەوەستاوە ، خۆی کردووە بە سەگێکی بێ هەرا و قڕە و نەوەڕ .

مەعنای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتەکانی پاشەوەیدا دێ بە دەستەوە و ، وەڵامەکەیان لە بەیتی سیازدەهەم و چواردەهەمدایە .

فەرشی پەلاسە ، دۆشەکی خاکە ، سەرینی بەرد
بێ تۆك و ، ڕۆت و قوت و ، فەقیر و قەلەندەرە (٩)

بێ تـۆکی جیفە خواریـو گورگێن و بێ وجود
لەم ئاو و خاکە ظاهیر و باطین موکەددەرە (١٠)

---

بۆنی نازناوی « نالی » لەم بەیتەدا نیشانەی دوایی هـاتنی پارچەکە نییە . بەپێچەوانەوە نیشانەی دەست پێ‌کردنی سەرەتای بابەتێکی نوێیە لە چوار چێوەی پارچە شیعرەکەدا : نالی پێشان تەعریفی مەدینەی کرد و لێرەوە دەست ئەکا بە باسی ناچیزی و داماویی خۆی .

سەگی ـ ی یەکەم ـ (عم) و (گم) : سەگە . (گم) و (من) : سەگ . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش و بۆ خەبەری موبتەداش دەست ئەدا .

(٩) پەلاس : فەرشێکی ڕەنگاوڕەنگە لە خوری ئەچنرێ ، کورکی نیـە ، وەك سوایی وایە . بە کراسی زبر و ئەستووریش ئـەلێن کـە دەروێشان لەبەری‌ئەکەن . بێ‌تۆك : کینایەیە لە هەژار و ناچیز . قەلەندەر : کەسێ هیچ پەیوەندێکی بە دنیاوە نەبێ .

لەوانەیە وشەی ( قەلەندەر )لەم بەیتەدا ، نیشانەی ئەوەبێ کە نالی ژن و منالی لەبوە .

لە کۆکردنەوەی ( بەرگ ) و (دۆشەك) و(سەرین) و ، (خاك) و (بەرد)دا تەناسوب و ، لەنێوان (ڕۆت) و (قوت)دا جیناسی لاحیق هەیە .

فەرشی پەلاسە : ئـەمە تێکـستی (عم) و (گم)ە ، (کم) و ( من )یش نوسیویانە : پاسی لیباسە . نوسخەکانی‌تر هەمو نوسیویانە : پاسی سوپاسە . مەعنای تێکستی لەم نوسخانەمان بـۆ ڕاسـت نەکرایەوە .
خاکە ( خا ) : خاك و .

(١٠) جیفە خواری : خواردنی مردارەوە بۆ . گورگێن : گەڕۆل . بێ‌وجود : ناچیز . موکەددەر : لێل . عاجز و خەمبار .

واتە : نالی لەم ولاتە دەر و ناو لێل و تاریکەدا ، سۆکی چاو لە دەسی ئەم و ئەو بونە کە وەك ئەوە وایە بنیادەم بە خواردنی مردارەوەبۆ بژی و ، گەڕۆل و ناچیز بووە کەس توخنی ناکەوێ ، چـاری نەماوە ئـەوە نەبێ سەری خۆی هەلبگرێ و بێ بۆ لای تۆ .

ئەشکونجێ نیوەکانی ئەم بەیتە یەکی ڕستەیەکی سەربەخۆ بن . بەم‌پێیە مەعنای نیوە بەیتی یەکەم وا لێ‌ئـەدرێتەوە کـەوا نـالی بە ئاشکرا و بە

گەردەن کەچی قەلادەیی ڕستی وەفاتە ، دێ
بۆ ڕاوی بێنی ئەو دەر و دەشتە موعەططەرە (١١)

دا کۆچە کۆچە خۆلی بەسەردا بکا بە چنگ
لەو خاکە ئەفخەرە کە هەمێ تاج و ئەفسەرە (١٢)

---

نەبێنێ لەم خاکە هاجر و دلگرانە .. تاد .

لە بەراوردی ئەم بەیتەوە لەگەڵ پارچە شیعرەکەی «وەی کە ڕۆژەردی مەدینە و .. تاد »دا ، وا دێتە پێش چاومان نالی ئەم پارچە شیعرەشی هەر لەو سەردەمەدا وتبێ کە ئەوی تیا وتووە و ، زیانی مەککەی زۆر لا تاڵ بوبێ . بەیتی سیانزەهەمیش پشتی ئەم بۆ چونەمان ئەگرێ .

جیفە (کم) : حیصـــصە . گورگـین و (چن) و (ت) و (لد) و ( اح ) : گورگین . بۆ (گورگین و) بۆ (گورگینی)یش دەستنەدا . (هم) و (کم) و (گم) و (من) : گورگینی . لەم « ( بەراوێزی » چن ) : لەو .

ئێمە وامان بە بیردا دێ وشەی ( بێتۆکی ) لـەم بەیتەدا لـە ئەسڵدا ( مەمتۆکی ) بوبێ ، چونکە (مەمتۆکی) لێرەدا باشتر دەست ئەدا و دوبارە بونەوەی ( بێتۆکی )یش جوان نییە .

لەم ( « بەراوێزی » چن ) : لەو .

(١١) قەلادە : گەردنبەند . ڕست : پەلی گەردنبەند . موعەططەر : بۆنخۆش .

واتە : وەفا و من لە یاد نەچونەوەت بووە بـە گەردنبەند و کراوەتە ملم و ، بە پەتیەوە بەسراومەتەوە و ملکەچیمی ، بۆیە وا دێم بۆ لات ، تا وەک سەگی بۆزەن ، ڕاوی بۆنی خۆشی ئەو دەر و دەشتە بۆن خۆشە بکەم .

ڕستی (چن) : ڕستەی . (کم) : ڕەستی . ڕاوی بێنی : ئەمە تێکستی (خا)یە . (چر) و (چن) و (گم) : ڕاوی بەینی . (تو) و (مب) : ڕاوە بێنی . بەپێی نوسخەکانیتریش بۆ هەردو جۆرەکە دەست ئەدا .

(١٢) دا : تاوەکو . کۆچە : کۆلان . ئەفخەر : پڕ شانازی و شکۆ . ئەفسەر : کڵاوی شاهانە .

واتە : بۆیە دێ تا کۆڵان بە کۆڵانی ئەو وڵاتە پیرۆزە بگەڕێ و خۆڵی ئەو خاکە پڕ شانازییە بکا بەسەریا کە هەمووی وەک تاجی شاهی وایە .

لەنێوان ( ئەفخەر ) و ( ئەفسەر )دا جیناسی لاحیق هەیە .

( کهف الأنام )ی هیجرەتی ئەصحابی بێ ڕوقوود !
بیکە بە خاکی خادیمی قیطمیری ئەو دەرە (١٣)

بەڵکو لە فەڕڕی طەیبە کە طیبی پەیەمبەرە
ساکن ببێ گەڕۆلیی ئەو کەلبە بێ فەڕە (١٤)

★ ★ ★

دا (عم) و (گم) : تا . خۆڵی : (چر) و (خا) و (من) : ســیره . (ك) و (ێ) و (عب) و (اح) : سر . بەداخەوە مەعنای هیچکام لەم دوو وشەیەمان بۆ ڕاست نەکرایەوە و بۆ ( سێر )ی بەمەعنا ( تێر ) و ( سەیر )ی بەمەعنا ( ڕۆیشتن )یشی دەستیان نەئەدا .

لەو خاکی ئەلخەرە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : لەو خاکی فەخرەدا . هەموو (چن) و (عم) و (کم) و (گم) : هەمووی .

(١٣) کهف الانام : ئەشکەوتی پەناگای خەڵك . هیجرەت : کۆچ . ئەصحاب : یاران . ڕوقوود : خەو ، ڕاکشان . قیطمیر : ناوی سەگەکەی ئەصحابولکەهفە .

نالی لەم بەیتەدا بە ئیقتیباس لە سەرگوزەشتەی (اصحاب الكهف)ەوە کە حەوت کەسی مەسیحی بوون ، بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام ، لە سەردەمی دەقیانۆسدا ، لە ترسی بتپەرستان پەنایان بردووەتە ئەشکەوتێك و لەوێ خەریان لێکەوتووە ، پاش سێصەد ساڵ خەبەریان بووەتەوە، هەروەها بە ئیقتیباس لە کۆچ کردنی ئەصحابەی پێغەمبەرەوە بە شەو بە شەونوخونییەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە ، ڕوو دەمی ئەکاتە پێغەمبەر و پێی ئەڵێ ئەی ئەوکەسەی کە وەك ئەشکەوتی پەناگای هەموو ئادەمیزادی نەك تەنها هیی ( اصحاب الكهف ) و ، ئەصحابە شەونوخونی کێشەکانت کۆچیان کردە لات ، کە ئەوان وەك ( اصحاب الكهف ) نەبوون خەو بیبان بالەوە بە لادا ، نالی بکە بە خۆڵی بەرپێی خزمەتکاری سەگی بەردەرگای خۆت . .

کهف الانام (چن) و ( « بەراوێری » ك ) : کهف الامان .

(١٤) واتە : بەڵکو ، لە فەڕ و بەرەکەتی مەدینەوە کە جێگای بوونی خۆشی تۆیە ، گەڕۆلیی ئەو سەگە گەڕالە بێفەڕە دامرێتەوە و چاك ببێتەوە .
مەشهوورە سەگی گەڕۆل خۆی لەناو گلدا ئەگەوزێنێ بۆئەوەی ئالۆشی

پەیغامبەر و حەبیبی خودا ، ( خاتَمْ الرُسُل )
ڕەوضەی لە ئەرض و سایە لەسەر چەرخی ئەخضەرە (١٥)

قەت سێبەری دەبێ لەسەر ئەم ئەرضە فانیە
ئەو تاقە نەخلی عەرشە کە طوبایی سێبەرە ؟! (١٦)

---

دابمرێتەوە و چاك ببێتەوە .

گەڕزلیبی ئەو کەلبە (عم) و (کم) : لە هەم دڵی ئەم بەندە. ئەو : (عب) و ( من ) : ئەم .

(١٥) پەیغامبەر : پەیامبەر ، پێغەمبەر . سایە : سێبەر . چەرخی ئەخضەر : ئاسمانی سەوز .

نالی لەم بەیتەوە ئەکەوێتە تەعریفکردن و پیاهەڵدانی پێغەمبەر ( د. خ ) و ئەڵێ : پێغەمبەر ئەوکەسەیە کە نامەی خوای هێناوە بۆ ئادەمیزاد و خۆشەویستی خوایە و دوا ئەڵقەی زیری پێغەمبەرانە ، مەرقەدی لە زەویدایە ، لیا ڕاکشاوە ، کەچی بە ڕاکشاویشەوە سەری ئەوەندە بەرزە بەسەر ئاسمانی سەوزدا سێبەری کردووە .

پەیغامبەر و (عم) و (من) : پەیغامبەری . سایە لەسەر (ت) : سایەیی سەر . ( اح ) : سایە سەری .

(١٦) فانی : فەوتاو . نەخل : دار خورما . طوبا : شجرة الطوبى ، درەختی طوبا ، درەختێکە لە بەهەشتدا .

لە کتێبەکانی سیرەتی پێغەمبەردا نوسراوە کەوا پێغەمبەر سێبەری نەبوە . نالیش بیری ئەم بەیتەی لەو ڕوەیە وەرگرتووە و ئەڵێ : پێغەمبەر ئەو دار خورمایەیە کە وا لە عەرشی خوادا و ئەوەندە پایە بڵندە تەنانەت درەختی ( شجرة الطوبى )ی بەهەشتیش لەژێر سایەی ئەودایە ، ئیتر لەوێ کە پایەی ئەوەندە بڵند بێ ، چۆن ئەبێ سێبەری لەم دنیا سەرەنجام فەوتاوەدا هەبێ ، چونکە ئەگەر سێبەری هەبێ ، دیارە سێبەرەکەی بەسەر زەویەوەیە و ، کە زەویش فەوتا ئەبێ سێبەرەکەی ئەویشی لەگەڵدا بفەوتێ و ، ئەوەش لەگەڵ شان و شکۆی ئەودا ناگونجێ .

دەبێ (عم) و (کم) و (من) : ئەبێ . ئەرضە (چر) و (لو) و (عب) و (خا) : خاکە .

ئەو سێبەرە کە قوبەیی فیردەوسی باقییە
ئەو سێبەرە کە خێوەتی صەحرایی مەحشەرە (١٧)

ئەو سێبەرە کە عالەمی عولوی لە نووریە
شەمس و نوجووم و هەرچی لەواندا موقەڕڕەرە (١٨)

ئەو سێبەرە کە مەظهەری حوببی خودایییە
کەنزی موطەلسەمی نەظەری حەبیی ئەکبەرە (١٩)

جێ بازی مەقدەمی شەوی قەدر و مەعاریجی
سەربانی عەرش و کورسی‌یو جوبریلی شەهپەڕە (٢٠)

---

(١٧) قوبە : گومەز . فیردەوس : بەهەشت .

واتە : سێبەری پێغەمبەر ئەو سێبەرەیە کە بووە بە گومەز بەسەر بەهەشتی هەرگیز نەفەوتاوەوە و ، بووە بە دەوار بەسەر ئەو هەموو خەڵکەدا کە لە بیابانی مەحشەردا کۆئەبنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ، ئیتر سێبەری وا چۆن بۆ ئەم دنیایە ئەشێ و چۆن لەوانەیە بفەوتێ ؟!

(١٨) عالەمی عولوی : جیهانی باڵا ، مانگ و خۆر و ئەستێرەکان . نوجووم : ئەستێرەکان . موقەڕڕەر : بڕیار دراو . جێگیر کراو .

واتە : سێبەری پێغەمبەر ئەو سێبەرەیە کە ڕۆژ و ئەستێرەکان و هەرچییان لیایە ، لە تیشکی ئەو پەیدا بوون .. چەند جوانە سێبەر کە خۆی نەبۆنی ڕۆناکییە ، ببێ بە سەرچاوەی هەموو ڕۆناکییەك .

ئەو سێبەرە (کم) و (من) و (لا) و (مب) : ئەو سێبەرەی .

(١٩) مەظهەر : شوێنی دیاریدان . کەنزی موطەلسەم : گەنجینەی تەلیسماوی . نەظەر : تەماشا . حەبیی ئەکبەر : ئەوەی نامرێ و لە هەموو کەسێ و لە هەموو شتێ گەورەترە ، خودا .

واتە : سێبەری پێغەمبەر مەیدانی دەرکەوتنی خۆشەویستیی خوایە بۆی و ، ئەو گەنجینە ئەفسوناوییەیە کە بەر بۆ ڕوانینی لوتفی خوا کەوتووە .

حوببی (چن) : لوطفی . (ت) و (ك) و (اح) : سیڕڕی .

(٢٠) مەقدەم : هاتن . شەوی قەدر و مەعاریج : شەوی ڕێزلێگرتن و سەرکەوتن بۆ ئاسمان . شەهپەڕ : شاپەڕ .

دنیای چلۆن دەوێ کە بە قەد هیممەتی ئەکرد
ئەم خەلعەتە کە ئەتلەسی نۆ چەرخی ئەستەرە (٢١)

---

واتە : لەو شوێنەی پێغەمبەر لە شەوی زێڕ لێگرتن و سەرکەوتنا بۆ ئاسمان هەنگاوی بۆ هەڵهێنایەوە ، سەربانی عەرش و کورسی و سەرشانی جوبرەئیل بۆ کە لەناو فریشتەکانا وەك ( شاپەڕ ) وایە لەناو پەڕەکانی پەلەوەرەکاندا .

وشەی ( سەرشان )مان لەوەوە هێناوە کە لە شەوی میعراجدا جوبرەئیل لەگەڵ پێغەمبەردا بووە، بەڵام ئەو تادواییێ لەگەڵی نەماوەتەوە. لەو شوێنەیدا کە بۆی دیاریێ کراوە وەستاوە و پێغەمبەر بەتەنها خۆی ڕۆیشتووە و سەرکەوتووە و جوبرەئیل لەخوارێیەوە ماوەتەوە ، کەواتە سەرشانی کەوتووەتە ئاستی ژێرپێی پێغەمبەرەوە .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بە ڕازی میعراج . لەبەرئەوە مەبەست لە (شەوی قەدر ) گەیاندنی مەعنای ( ليلة القدر ) نییە کە شەوە تاکەکانی سێیەکی سێهەمی مانگی ڕەمەزانە . بەڵام دیسان داتانەکەی لەگەڵ وشەی ( مەعاریج ) کە ئیشارەتە بۆ ( شەوی میعراج ) شتێکی جوانە .

جێ (چر) و (عب) و (من) : جێیی . بازی (چر) و (عب) و (لۆ) باز و . (جن) : باز . بۆ ( باز و ) و بۆ ( بازی )یش دەست ئەدا . شەوی قەدر و (چن) و (ت) و (ك) و (لو) و (اح) و (خا) : شەوی قەدری .

(٢١) خەلعەت : خەڵات . ئەتلەس : جۆرە قوماشێکە . نۆ چەرخ : حەوت ئاسمانەکە و مانگ و ڕۆژ . ئەستەر : مەعنایمان بۆ ساغ نەکرایەوە . لەوانەیە صیغە موبالەغەی (ستر) بێ واتە ئەوەی پتر داپۆشێ .

واتە : پێغەمبەر دنیای چۆن لەوێ ، لەکاتێکا کە خوا قوماشی ئەتلەسی هەر حەوت ئاسمانەکە و مانگ و خۆری کرد بە خەڵاتی ، کەچێ هێشتا کورت و لەسکتر بۆ لەوەی بە بەری هیممەتی بەرزی ئەودا بێتەوە .

سەرچاوەی بیری ئەم بەیتە لەوەوە هاتووە کە سیرەت نووسان نووسیویانە خوا لە شەوی میعراجدا پێغەمبەری کرد بە سەرپشك ، لە سامان و دارایی دنیا چیی ئەوێ هەڵبگرێ بۆ خۆی ، بەڵام ئەو هیچی نەویست و تەنها داوای پایە بلندیی لەو دنیای کرد .

دەوێ (من) : ئەوێ . ئەم (چر) و (خا) : لەو . نۆ (چر) و (کم) و (من) و (خا) : نەو . ئەستەرە (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) : ئەخطەرە . ئێمە (ئەستەرە)مان دانا چونکە (ئەخطەرە) جارێکیتریش وتراوە .

تەشبیهی حوسنی فائیقی ، ئاخر ، بە چی بکەم !
نوری سونوحی طەلعەتی صەد لەوحی ئەنوەرە (٢٢)

مەطلوعە چونکی جەمعی ڕوسول موقتەبیس لەون
یوسف یەکێ لەوانە کە سەرلەوحی دەفتەرە (٢٣)

گوفتاری نوشی شاهیدی صەد شەهدی فائیقە
ڕوخساری خۆشی ( اَظْهَرْ مِنْ ) شەمسی ئەنوەرە (٢٤)

---

(٢٢) سونوح : لاکردنەوە . طەلعەت : ڕوو . لەوح : هەر شتێکی پانتایی‌دار . ئەنوەر : ڕووناکتر .

والە : نازانم جوانیی لەڕادەبەدەری ئەو بە چی بشوبهێنم . تەنها لیشکی لاکردنەوەیەکی ڕووی ئەو ، ئەوەندەی صەد تەختەی زۆر ڕووناک ڕوونە .

(٢٣) موقتەبیس : ئەوەی (قەبەس) وەربگرێ . قەبەس : دەسەچیلە ، چەپکێك پووش یا چیلکە بنرێ بە ئاگرێکەوە تا داگیرسێ و ببرێ لە شوێنێکی‌تر ئاگری پێ بکرێتەوە .

والە : ئەوەی کە ولم ڕاست و ئاشکرا و دیاریە ، چونکە هەمو پێغەمبەرەکان نوریان لە نوری پێغەمبەرەوە وەرگرتووە و ، یوسف کە ناوی لە ڕیزی پێشەوەی دەفتەری جوانانا نوسراوە ، یەکێکە لەو پێغەمبەرانە .

کە (ك) و (اح) : لە .

(٢٤) نوش : لەوەی خواردنەوەی خۆش و بێ‌گرێ بێ . شەهد : هەنگوین .

والە : قسەی لەگوێدا خۆش و بێ‌گرلی ، بۆ ئەوە ئەشێ شایەلیی شیرینی بۆ صەد هەنگوینی زۆر چاك بدات . ڕوخساری خۆش و باشیشی لە ڕۆژی ڕووناك ئاشکرا و دیاریترە .

ئەشکونجێ (شاهید) بە (یار) مەعنای لێبدرێتەوە و ، بەوپێیە مەعنای نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە بەمجۆرە بێ کەوا : قسەی لەگوێدا خۆش و بێ‌گرێی ، وەك یار و مەعشوقە وایە بۆ صەد هەنگوینی زۆر شیرین . والە : تەنانەت هەنگوینیش بەو شیرینییەی خۆی دڵی لە شیرینیی ئەو ئەچێ .

لەنێوان (نوشی) و (خۆشی)دا جیناسی لاحیق و، لەنێوان (شاهیدی) و

ئەو شاھی ماھی میسرە ، ئەھالی لە ڕێی سوجوود
قورئان دەڵێ کە بەندە ئەمەو بەندە پەروەرە (٢٥)

ئەو دێ دەبا بە کەشمەکەش ، ئەم دێ دەبا بە لوطف
ئەو شاھی دلبەرە ، نە شەھەنشاھی دلدەرە (٢٦)

---

(شەھدی)دا جیناسی ناقیص ھەیە .

نۆش و خۆش ( « پەراوێزی » چر ) و (خا) : نۆشە و خۆشە .

بەڕای ئێمە جێگای ڕاستەقینەی ئەم بەیتە لەپێش بەیتی پێشووەوەیە.

(٢٥) ماە : شار (وشەیەکی کۆنی زمانی پەھلەوییە) . سوجوود : جەمعی (ساجید)ە واتە سوجدەبەر . ئەمەو : ئەم ، ئەو .

واتە : حەزرەتی یوسف پادشای وڵاتی میسر بوو و خەڵکی لەڕێگادا ئەوەستان ڕێزیان ئەبەست و سوجدەیان بۆ ئەبرد ، بەپێی فەرموودەی قورئان بەندە و زەڕخرِیدی عەزیزی میسر بوو . ئەمیش ، واتە پێغەمبەری موسوڵمانان ، بەندە پەروەر بوو ، ھەرچی بەندەیەکی دەستکەوتایە ئازادی ئەکرد . کەواتە ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی گەورەیی پێغەمبەری ئیسلام لەچاو حەزرەتی یوسفدا .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ بەسەرھاتەکەی یوسف کە براکانی بردیان خستیانە ناو بیرێك و ھاتنەوە بۆ ماڵ بە باوکیان وت کەوا یوسف گورگ خواردی و ، پاشان کاروانچی لەناو بیرەکەدا دۆزیانەوە و بردیانە میسر لەوێ فرۆشتیان و عەزیزی میسر کڕی بۆ خزمەت کردنی ژنەکەی خۆی .. تاد .

لەنێوان (شاە) و (ماە)دا جیناسی لاحیق و تەناسوب ھەیە .

لە ڕێی : ئەمە تێکستی (چر) و (عب)ە . نوسخەکانی تر ھەمو نوسیویانە : (لە ڕێ) ، بەڵام دیارە مەبەستیان (لە ڕێی)ە و ڕێنوسیان ناتەواوە . ئەمەو ــ ئەم ، ئەو ــ : ئەمە تێکستی (چر) و (او) و (خا)یە . (چن) و (لد) و (عب) : بەندە ئەم و ، واتە واوەکە واوی عەطف بێت . (مم) و (کم) و (گم) و (من) : بەندەیی ئەم . (ت) و (اح) : بەندە ئەم و یا بەندە ئەمەو ــ ئەم ، ئەو ــ .

(٢٦) واتە : حەزرەتی یوسف دێ بە کێشمەکێش دڵی خەڵك ئەبا بۆ خۆی و ، پێغەمبەری موسوڵمانانیش دڵی خۆیان ئەداتێ و بە قسەی خۆش دڵیان

ئەفرادی مورسەلین هەمو یەك ڕازە ، ئام کەلام
لەم جێگەدا بزانە موقەددەم موئەخخەرە (٢٧)

شوبهەی نیە کە شەمس و قەمەر سێبەری ئەون
نیسبەت بە هەردو وەجهی وەکو نور و سێبەرە (٢٨)

---

ڕانەکێشێ . بەڵێ ، حەزرەتی یوسف شای دولبەرانە و وەك پێغەمبەری ئێمە شای دڵدەران نیە .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ئیشارەتە بە کێشمەکێشەکەی نێوان زولەیخای ژنی عەزیزی میسر و حەزرەتی یوسف کە ئایەتی « وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا ، لَوْلا أَنْ رَأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ » باسی لێ ئەکا . نیوەی دوهەمیشی ئیشارەتە بە دو ئایەتی « وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ » و « لَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ » لە باسی خو و ڕەوشتی پێغەمبەردا .

دەبا ـ هەردوکیان ـ (عم) و (کم) و (گم) و (من) : ئەبا . (چر) و (ت) و (اح) : دەبێ .

(٢٧) ڕاز : قسە . ئام کەلام : هاودەنگ . موقەددەم : پێش‌خراو . موئەخخەر : دواخراو .

واتە : یەکە یەکەی پێغەمبەران هەمو یەك قسە و هاودەنگن کەوا ئەبێ بزانی لەو شوێنەدا کە پێغەمبەران هەمو کوبنەوە ، ئەوەیان ئەکەوێتە پێشی هەمویانەوە کە لەپاشی هەمویانەوە دێ .

یەك‌ڕازە ئام کەلام («بەراوێزی» چر) : یەك زارە ، ئەم کەلام . مەعنای بەیتەکە بەم‌جورە وای لێ‌دێتەوە کەوا یەکە یەکەی پێغەمبەران هەمو بریتین لە زمانێك و پێغەمبەری ئیسلامیش قسەی ئەو زمانەیە ، ئەمەش بویە وایە چونکە لە مەیدانێکا کە پێغەمبەرانی هەمو لیا خڕبوبنەوە ، ئەوەیان ئەکەوێتە پێشی هەمویانەوە کە لەپاش هەمویانەوە هاتبێ . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : یەك ڕاز و هەم‌کەلام .

(٢٨) واتە : گومان لەوەدا نیە کە ڕوژ و مانگ سێبەری پێغەمبەرن چونکە ڕوشنایی بەوپێیە کە سێبەری نیە ، سێبەرەکەی ئەبێ ڕوشنایی بێ و ، ڕوی پێغەمبەر بەنیسبەت هەرکام لە ڕوژ و مانگەوە وەکو ڕوشنایی وایە لەگەڵ سێبەردا .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بە حەدیثی قودسیی ( لَوْلاكَ ، لَوْلاكَ ، لَما

بورهانە صوورەتی بەشەریی چونکە نوورە ، نوور
بێ ظیللە ، ماسیوای بە دۆ نیسبەت موعەببەرە (٢٩)

واقیف بە هەرچی کەتمی خەبایایی ماضییە
عالیم بە هەرچی دێت و دەبێت و موقەددەرە (٣٠)

ئەو ڕوویی لە کەعبە ، کەعبە بە ڕووی ئەو موشەڕڕەفە
یەعنی جەبینی قیبلە وو میحراب و مینبەرە (٣١)

★ ★ ★

---

خلقتُ الافلاك ) ، واتە : ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئاسمانەکانم دروست نەئەکرد .

شوبهەی (ت) و (لو) و (عب) و (اح) : شوبهە .

(٢٩) بورهان : بەڵگە . صوورەتی بەشەریی : وێنەی ئادەمیزاد . ظیلل : سێبەر . ماسیوای : لەو بەولاوە . موعەببەر : لەعبیر لێدراوە ، ڕوون‌کراوە .

ماسیوا (عم) و (کم) و (گم) و (من) : ماسیوای .

(٣٠) واقیف : ئاگادار . کەتم : شاردنەوە . خەبایا : شاردراوە .

واتە : پێغەمبەر ئاگادارە لە هەرچی ڕاز و نهێنیی شاردراوەی ڕابوردووە و ، هەرچییش لەمەولا ڕوئەدا بە هەمووی ئەزانێ .

ئەمەی نالی ئەیڵێ ، مەگەر لە چوار چێوەی زیادەڕەویی شاعیرانا جێی بکرێتەوە ، ئەگینا لەگەڵ ڕێبازی ئایینا یەك ناگرێتەوە و ، بەگوێرەی ئایینی ئیسلام هەر خوا هەیە ستووری ئاگاداریی ئەوەندە بەدەرەتان بێ .

موقەددەرە (لو) : موقەڕڕەرە .

(٣١) جەبین : تەوێڵ .

واتە : خەڵك لەبەر پیرۆزیی ڕوو ئەکەنە کەعبە و لە نوێژدا ئەیکەن بە قیبلەی خۆیان و پێغەمبەریش لە ژیانیا هەروا بووە و ئێستاش لە قەبرا هەر ڕوو لە قیبلەیە ، بەڵام ڕاستەکەی کەعبە بە ڕوو لێ‌کردنەکەی پێغەمبەر شەرەفمەند بووە ، چونکە ئەگەر کەعبە تەنها قیبلە بێ ، پێغەمبەر تەوێڵی قیبلەیە و برۆکانی میحرابی مزگەوتن و نێوان برۆکانیشی مینبەری مزگەوتەکەیە .

با بێینە سەر وەجاهەتی قەدری لەکن خودا
بۆ عاصیان لە مەغفیرەت و صەرفی مەغفیرە (٣٢)

ڕەحمەت بە حوسنی صوورەتی ئینسان ظوهووری کرد
( خَیْرُ البَشَر ) لەقەب بە شەفاعەت موبەششەرە (٣٣)

---

لەنێوان ( کەعبە ) و (قیبلە ) و (میحراب ) و ( مینبەر ) و ، لە کۆکردنەوەی ( ڕۆ ) و ( جەبین )دا تەناسوب هەیە .

بە ڕۆی ئەو ( تو ) : بە ڕۆیی .

(٣٢) وەجاهەت : شوێن و پایە . عاصییان : گوناهباران . مەغفیرەت : لە گوناە خۆشبوون . صەرفی مەغفیرەت : جێبەجێکردنی لێخۆشبوونەکە .

واتە : پاش باسی گەورەیی پێغەمبەر ، با بێینە سەر باسی ڕێ و شوێنی پایەی لای خوا بۆ داوای لێبووردنی گوناهباران و لێبووردنی خوایش لەوان .

وەجاهەلی (مم) و (کم) و (گم) و (اح) و (من) : وەجاهەت و . (ت) و (ك) و (لو) و (مب) : وەجاهەت . (وەجاهەت و) ورووەجاهەلی)یش هەڵنەگرێ . قەدری (مم) و (کم) و (گم) و (من) : قەدرت . مەغفیرەت و (ت) و (ك) و (اح) : مەغفیرەت . (مەغفیرەت و) و (مەغفیرەلی)یش هەڵنەگرێ .

(٣٣) حوسنیصوورەت : جوانیی شێوە . خیر البشر : چاکرینی ئادەمیزاد . موبەششەر : مژدە پێدراو .

واتە : ڕەحمەتی خوا بۆ بەرەی ئادەمیزاد لە شێوەی جوانی ئادەمیزاددا دەرکەوت کە پێغەمبەرە . پێغەمبەرێ کە لەقەبی چاکرینی ئادەمیزادی هەیە ، مژدەی ئەوەی دراوەتێ کە شەفاعەت بۆ گوناهبارانی ئوممەتەکەی ئەکا و خوایش لێیان خۆش ئەبێ .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بە ئایەتی ( وَ ما أرْسَلْناكَ إلاّ رَحْمَةً لِلْعالَمِينَ ) . واتە : تۆمان بە هیچ جۆرێ نەناردووە بەوە نەبێ کە ڕەحمەتی بۆ هەموو جیهان .

صوورەتی (مم) و (کم) و (گم) : سیرەتی . لەقەب : (مم) و (گم) : کەوا . موبەششەرە (مم) و (کم) و (گم) و (من) : موخەییەرە .

مـوژده لە عاصـیان کە ئەو ئیقبالی ڕەحمەتە
ئیسمی ڕەحیم و غەوث و شەفیع و موخەییەرە (٣٤)

★ ★ ★

ئەی شەمسی مایە پەروەر و ئیکسیری قەلبی خاك !
بنوارە حالی هالیکی ئەم خاکە ئەحقەرە (٣٥)

---

(٣٤) ئیقبـال : ڕوکـردن ، هاتـن . غـەوث : فریـادڕەس . شـەفیع : شەفاعەتکەر : موخەییەر : سەرپشك . ئارەزو دراوە دەست .

واتە : مژدە بێ لە گوناهبـاران کەوا هاتنـی پێغەمبەر واتـە هاتنی ڕەحمـەلی خوا . پێغەمبـەر ، لەبەرئـەوە کە ڕەحمـەلی خوایـە بـۆ موسـولمانان ، ناوی (بەڕەحم) ە و (فریادڕەس) و (شـەفاعەتکەری ڕۆژی قیامەت) و (ئارەزو بەدەست) بـۆ ڕزگارکردنی هەرکەس کە بیـەوێ .

غەوث و (هم) و (کم) و (گم) و (من) : غەوثە .

(٣٥) مایە پـەروەر : ئەوەی کە مـاددەکان پـەروەردە ئەکـات . ئیکسـیر : زاراوەیەکی کیمیایی کۆنـە ، بە گەوهەرێك وتراوە چیبـەتیی تەنێکی گۆڕیوە بە چیبەتیەکیتر ، وەك ئەوە کە جیوە بکا بە زیو و مس بکا بە زێڕ .. ئائیسـتا لە زانستدا شتیوا ئەدۆزراوەتەوە . قەلب : گۆڕین . هالیك : فەوتاو . ئەحقەر : زۆر سوك و بێبایەخ .

واتە : ئەی پێغەمبەرێ کە وەك ڕۆژی مایـە پەروەردەکەر وایت بۆ پەروەردە کردنی دەرونی خەلك و ، ئەی ئەوکەسـەی وەك ئیکسـیر وای ، خاك وەرئەگێڕیتەوە و ئەیکەی بە زێڕ ! سـەیرێکی حالی فەوتاوی منیش بکە کە ئەوەندەی خاك بێبایەخ و سـوکم ، پاکم کەرەوە لە چلکی گوناە و بمکە بە زێڕ . یان سـەیرێکی حالی فەوتـاوی ئەم ولاتە بێبایەخە بکە و بیکە بە ولاتێکی پیرۆز و پایە بلند .

بە بۆچونی ئێمە وشـەی (هالیك) هەلەی نوسـیارانـە و ڕاستەکەی (حالیك) بووە واتە تاریك .

پـەروەری (چن) و (اح) : پـەروەر و . (ت) و (ك) و (لو) و (عب) : پەروەر . بۆ (پەروەر و ) و (پەروەری)یش دەسـتئەدا . ئەم (لو) : ئەو .

حیفظت شەبان و ، ئێمە ڕەمە و ، ئەو لەعینە گورگ
ئەم نەفسە گورگە مێشە لەگەڵ ئەو بەد ئەختەرە ، (٣٦)

دائیم لە جەنب و خوار و کەمیندا بە ڕۆژ و شەو
بۆ فرصەتە لە ڕێگەیی ئیمانی ئەم مەڕە (٣٧)

ئێمە بەقیعی غیرەتی تۆمان حەظیرەیە
ئەم نەفسە گورگە مێشە شەیاطینی عەسکەرە (٣٨)

---

(٣٦) شەبان : شوان . ڕەمە : ڕەوگ ، گەلە . لەعین : مەلعوون ، دوور لە ڕەحمەتی خودا . گورگەمێش : گورگ لە پێستی مەڕدا . بەد ئەختەر : بەد ئەستێرە ، چارە شوم .
مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوەدێ .
شەبان (چن) و (گم) : شوان . ڕەمە و (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) : ڕەمە .

(٣٧) جەنب : لا ، تەنیشت . خوار : نزم . کەمین : سپێر ، ئەو شوێنەی تفەنگچی خۆی تیا حەشار ئەدا بۆ تەقە .
واتە : ئەی پێغەمبەری خودا ! پارێزگاریی تۆ شوانی ئێمەیە و ، ئێمەیش مێگەلین و ، شەیتانیش وەك گورگ وایە لە مەلاسدابە و ، نەفسی بەدکرداریش کە وەك گورگە لە پێستی مەڕدا ، بووە بە دزدەسەکی شەیتانی شوم و ، لەگەڵ ئەودا شەو و ڕۆژ لە لاوە و لە خوار و لە سپێردا خۆی مات کردووە بۆ فرسەتێ ئەگەڕێ بتوانێ ڕێگە بە مەڕی ئیمانمان بگرێ و لە خشتەمان بەرێ و بیبا .
لە کۆکردنەوەی (شەبان) و (ڕەمە) و (گورگ) و (گورگەمێش)دا تەناسوب هەیە .
جەنب و خوار و (چن) : جەنبی خوار و . (عم) و (کم) و (گم) : جەنبی خواری . (ت) و (ك) و (ئو) و (اح) : جەنب خوار . هەرکام لە دۆ وشەکە بۆ ئەوە دەست ئەدەن (و) یا (ی)یان لەسەر دابنرێ . (عب) و (من) : جەنب و خواری .

(٣٨) بەقیع : جنة البقیع . حەظیرە : پەچە ، مۆڵگە .
واتە : شوێنی حەسانەوە و مۆڵگەی مێگەلی ئێمە ، بەقیعی غیرەتی تۆیە و ئێمە لە پەنای غیرەتی تۆداین . نەفسی گورگ ڕەوشتیشمان کە لە پێستی مەڕدایە ، شەیتانەکان جەنەڕمە و سەربازینی ، جا ئەگەر *

* گورگەمێش . بە سەگێك دەڵێن کە دەگەڵ گورگ ڕێك کەوێ و دزی لە شوان بکا .

خۆی کردووه بە گەورەوو قەزڕالی مولکی تەن
پشت و وەزیری ئەو سەگە دەججالی ئەعوەرە (٣٩)

قوربان ! دەخیلی حەلقەیی شوبباکی ڕەوضەتم
سێ ئیلتیجام هەیە ، کە لەگەڵ ئەو دووەم شەڕە (٤٠)

---

پەنامان نەدەی لەفەوتین و لەخوریین .

ئەم بەیتە لە (عم) و (کم) و (گم) و (من)دا نییە .

حەظیرە : لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا نوسرابو (خەطیرە) . ئاشکرایە نوسیارەکان یا پەنجەیان باش دانەناوە و نوختەکە لای‌داوە ، یا مەعنای وشەکەیان نەزانیوە .

لەنێوان وشەی (حەظیرە) و (مەسکەر)دا تەناسوب هەیە چونکە (مەسکەر)یش لە (حەظیرە)دا نەحەوێنەوە .

(٣٩) قەزڕال : قەزڕال ، پادشا . پوشت : پشت و پەنا . دەججال : هەڵخەڵەتێن و درۆزن . کابرایەکی ساختەچییە بەر لە قیامەت پەیدا ئەبێ و خەڵکێکی زۆری پێ هەڵئەخەڵەتێ و پاشان لەسەر دەستی موحەممەدی مەهدیدا ئەکوژرێ ... ئەڵێن یەك چاویشی هەیە . ئەعوەر : یەك چاو .

واتە : نەفسی بەدکردار بووە بە پادشای وڵاتی لەشم و ئەندامەکانی لەشم گشت بە ئارەزۆی ئەو ئەجوڵێنەوە و کردارم هەمو بە ئارەزۆی ئەوە . شەیتانی کوێری مەلعونیش کە وەك دەججاڵ وایە ، پشت و پەنا و ڕاوێژکەر و وەزیریەتی .

نالی مەبەستی بووە وشەی (پوشت) کە جاران بە (پشت) ئەنوسرا و بۆ (پشت)یش و بۆ (پوشت)یش دەست‌ئەدا ، مەعنای هەردو وشەکە بکەیەنێ .

پشت و وەزیری (چر) و (خا) و (اح) : پوشتی وەزیری . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : پشتی وەزیری . (عب) : پشت وەزیر . بۆ هەمو ئیحتیماڵەکان دەست ئەدا .

(٤٠) دەخیل : پەنا هاوردن . شوبباك : پەنجەرە . شیش‌بەند ، چوارچێوەیەکی ئاسنی ئان‌وپێچی کون‌کونی سەر بەرەڵلایە ، بەسەر قەبری پیاوچاکانیەوە دائەمەزرێنن بۆئەوەی کەس پێ نەنێتە سەر قەبرەکە خۆی . ئیلتیجا : پەنا ، هاوار . تکا .

ئەووەڵ لە ئیلتیجام ئەوەتە ئەی غەیووری دین
حاضر بێ لە کەشمەکەش و شۆڕی غەرغەرە (٤١)

گۆچانی غیرەتت لە ملمدا موعەوذە بێ
تا موژدە دێ کە نووری یەقینم موظەففەرە (٤٢)

---

واتە : قوربان ! دەسەوداێنی شێخیبەندی سەر مەرقەدت بم .. بەنام پێهێناوی ، لەگەڵ سەگی نەفس و لەگەڵ شەیتان لە هەرادام ، سێ تکام لێت هەیە ، بگەرە فریام .

تکاکانی لە بەیتەکانی پاشەوەدا ڕۆن ئەکاتەوە .

دووەم (چن) : عاقیبەت . بەمپێیە واتە : سێ تکام هەیە چونکە (ئەگەر هاوار نەهێنمەلات ) ئەنجامم لەگەڵ نەفسدا خراپ ئەبێ و عاقیبەت شەڕ ئەبم .

(٤١) غەیوور : بەغیرەت . کەشمەکەش : بگرە و بەردە ، کێشمەکێش . شۆڕ : هەرا و زەنا . غەرغەرە : کاتی گیانەڵا ، دوا قۆناغی ژیان و سەرەتای مەرگ .

واتە : تکای یەکەمم ئەوەیە لێت ، ئەی خاوەن غیرەت لەئاستی مەسەلەی دینا کە ناتەوێ کەسێ لەوانەی شوێنت کەوتوون بێئیمان بمرێ، لە هەرا و بگرە و بەردەی کاتی گیانەڵا و ماڵاوایی ئەم دنیایەمدا حازر بیو ئەهێڵی شەیتان سەلبی سەرەمەرگم بکا . مەشهورە شەیتان لە کاتی سەرەمەرگدا بە هەمو جۆرێ ئەیەوێ بنیادەمی موسولمان هەڵخەڵەتێنێ و کارێ بکا بە بێئیمان کۆچی دوایی بکا .

لە ـ ی یەکەم ـ : ئەمە تێکستی نوسخەی (ت)یە . (چر) و (اح) و (من) : کە . نوسخەکانیلر هیچیان دانەناوە ، بەڵام نیوە بەیتەکەی بێ لەنگ ئەبێ . ئەوەتە (ت) : ئەمەتە . کەشمەکەش و شۆڕی (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (تو) و (اح) : کەشمەکەش شۆڕ . بۆ ئەوە دەست ئەدا کە بۆر یا ژێر بە هەرکام لەدوو وشەکە بدرێ .(عم) و (کم) و (گم) و (من) : کەشمەکەشی شۆر و . (عب) : کەشمەکەشی شۆر . (خا) : کەشمەکەش و ، کەشمەکەشی شۆری .

(٤٢) موعەوذە : موعەووەیدە ، شتێ کەپەنای پێ بگیرێ لە مەترسییەك . یەقین : باوەڕ ، ئیمان . موظەففەر : سەرکەوتو .

نالی پێشان خۆی و هەمو موسوڵمانانی بە مێگەلێ دانا کە گورگی

فائیض دەبێ بە نووری نەجاتی حەبیبی حەق
لەو جێگەدا بە کوێریی ئەو خەصمە کەبتەرە (٤٣)

ڕۆ زەرد و وشك و خائیب و خاسیر بێ عەدوو
واصیل بیم بە ڕەحمەتی بارانی ، مەقبەرە (٤٤)

---

نەفس و شەیتان بیبەوێ تێی بەربێ . پێغەمبەریشی کرد بە شوان . وا لەم بەیتەدا غیرەتی پێغەمبەریش لەکا بــە کۆچان و ئەڵێ : تکام ئەوەیە لەکاتی گیانکێشاندا غــیرەت وەك کۆچان لە ملمدا بێ بــۆ پاراستن و پەنادانم و ، بەرەڵلام نەکەیت و ئاگادارم بێ تا مزدەی ئەوەم لای خواوە بۆ دێ کە نووری باوەڕم بەسـەر تاریکایی بێ باوەڕیدا سـەرکەوتووە .

وشەی (موعــەوذە) لە نوسـخەکانی بەردەستمانا لەبــارەی سەر و بۆرەوە بە چەنــد شێوەی جیا جیا نوسراوە ، بەڵام هــەر ئەم شێوەیان ئەگونجێ کە ئێمە لێرەدا هەڵمانبژاردووە .

(٤٣) فائیض : خــاوەن فەیض ، بەهرەمەند . خەصم : دوژمـــن . ئەبتەر . کلكبڕاو .

واتە : دەست لە ناڵی بەرنەدەی تا لەو شوێنەدا کە خەریکە هەنگاو بۆ ئەو دنیا هەڵێنێتەوە ، بەکوێرایی چاوی ئەو دوژمنە کلك بڕاوە کە شەیتانە ، لەسـەر دەسـتی خۆشـەویـستی خوادا کە خۆلی ، بە نووری ڕزگاری ئەگات .

فائیض دەبێ ( « بەراوێزی » چر ) : فائیز دەبم . لەم نوسـخەیەدا لەم شوێنەدا نوسـراویشـە : «طب» ، واتە : «ظاهیرا بدل» ، واتە : وادیارە لەبریتیا ئەبێ ئەم وشـەیترە دابنرێ . (عم) و (گم) : فالیض ئەبێ . ئەبتەرە (ك) و (اح) : بەدئەڕە .

(٤٤) خالیب : نائومێد . خاسیر : دۆڕاندوو .

واتە : بۆ ئەوەی دوژمن کە شەیتانە نائومێد و زەرەرمەند بێ و ، منیش بەهۆی بارانی ڕەحمەتی خواوە بکەمە گۆڕستان .

بێ عەدوو (چر) و (ت) و (ك) و (اح) : بە بێ عەدەد . مەقبەرە (عم) و (گم) : مەغفیرە .

دۆمینە ئیلتیجام ئەمەتە ئەو دەمەی دەبێ
ئەلواحی ئەلحەدم بە زەنابیلی مەعطەرە ، (٤٥)

تەنگە ئەوا دەبێ کە لە ئەو جێگە تەنگەدا
سائیل نەکیر و عاریف و مەعرۆف و مونکەرە ، (٤٦)

ئیمدادی فەتحی بابی زوبانم بە فەضلی تۆ
زۆ بێ ، کە ئەووەلین گوزەری پرد و مەعبەرە (٤٧)

---

(٤٥) دۆمینە : دۆهەم . ئەلواحی ئەلحەد : ئەو تەختە بەردانەی بە لای ئەلحەدی قەبردا هەڵدەسپێررێن . زەنابیل : جەمعی (زەنبیل)ە ، جۆرە سەبەتەیەکی دەستییە میوە و سەوزە و شتیوای تێئەکرێ . مەعطەرە : شوێنی عەتر و بۆنخۆشی ، دۆکانی عەتاری .

مەعنای ئەم بەیتە و دۆ بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ .

دۆمینە (چر) و (من) و (خا) : دۆمینی . (مم) و (گم) : دووەم . ئیلتیجام (مم) و (گم) : ڕجام . ئەمەتە (ت) : ئەوەتە . بە زەنابیلی مەعطەرە (چر) و (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (من) : بزنابیل معطرە . ئێمە بە (بە زەنابیلی مەعطەرە)مان خوێندەوە ، چونکە لە زۆری ڕێنوسیشەوە دەست ئەدات و مەعناکەشی دێت . (ك) و (کۆ) و (عب) و (اح) و (خا) : بە زەنابیل موعەططەرە . (ت) : وەکو خاکی موعەططەرە .

(٤٦) تەنگە : تەنگانە . نەکیر : یەکێکە لەو دۆ فریشتەیەی لە قەبرا دێنە سەر بنیادەمی گوناهبار بۆ پرسیار لێکردنی . عارف و مەعرۆف : ئەو دۆ فریشتەیەی لە قەبرا پرسیار لە پیاوی چاك ئەکەن . مونکەر : هاوڕێکەی نەکیر .

تەنگە ئەوا دەبێ (چر) و (چن) و (خا) : تەنگاو دەبێ . بەڵام (چر) ئەوەشی سەرنجی ڕاکێشاوە کە بەمجۆرە نیوە بەیتەکە دۆ بڕگەی کەم ئەبێ ، بۆیە لەجیاتیی ( دەبێ )کە لە پەراوێزا نوسیویە ( دەبم ئەمن ــ ط ب )* واتە : وادیارە ئەبێ ( دەبم ئەمن )ی لە جێ دابنرێ .

(٤٧) ئیمداد : یارمەتی . فەتح : کردنەوە . بابی زوبان : دەرگای زمان .

---

* ط.ب یا طب : یەکێکە لە نیشانەکانی نوسینی جارانی حوجرە ، لەبنچینەدا (ظ.ب) بووە ، بۆ کورتی نوختەی ( ظ )کەیان لابردووە . واتە : وادیارە ئەبێ ئەمەی لەجێ دابنرێ .

سێمینه ئیلتیجام دەڵێم ئەی غەوثی عاصیان
هاواری بگرە بەردەیی ئاشۆبی مەحشەرە (٤٨)

ئەو ڕۆژی ئاخیرەی کە چ ڕۆژی لە دۆ نیـە
زۆ ترش و قەمطەریر و عەبۆس و غەضەنفەرە (٤٩)

---

مەمبەر : شوێنی پەڕینەوە .

وانە : تکای دۆهەمم ئەوەیە لەوکاتەدا کە لە کەنەڕی ناو قەبرەکەمدا ڕام‌لەکێشن و تەلەبەرد بە لاپالی دەرگای ئەلحەدەکەیدا هەڵئەسپێرن و قەبرەکەم ئەبێ بە دۆکان بۆم و تەلەبەردەکان ئەبن بە زەنبیلەی بەدیوارەوە شۆڕکراوەی دۆکانی هەتار و ، تەنگانە ئاوا ئەبێ کەوا لەو شوێنە تەنگەدا پیاوی چاك بم یا پیاوی خراپ بم ، فریشتەی پرسیاری تایبەتی دێنە سەرم ، تا لەو شوێنەدا کە یەکەم گوزەری پەڕینەوەیە سا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ ، پارمەتیت زۆ بکاتە فریام و ، لە سایەی ئەوەوە زمانم زۆ بپشکوێ و وەڵامی فریشتەی پرسیارم پێ بدرێتەوە .

پرد و (مم) و (کم) و (گم) و (من) : پردی . (خا) : پردە .

(٤٨) غەوث : فریادڕەس . عاصیان : گوناهباران . بگرە و بەردە : کینایەیە لە هەرا و ئاژاوە و ئاگا نەبوونی کەس لە کەس .

وانە : تکای سێهەمم ئەوەیە ئەڵێم ئەی فریادڕەسی گوناهباران ، وا لە بگرە و بەردەی ئاشۆبی ڕۆژی مەحشەردام کە عالەم هەموو سەری لێ شێواوە و هەرکەس خەمی خۆیەتی .

لەم بەیتە بەدواوە نالی گەلێ باسی ڕۆژی مەحشەر ئەکا و ئەوجا داوای یارمەتی ئەکا لە پێغەمبەر .

سێمینە لیلتیجام دەڵێم (چر) و (ئا) و (عب) و (خا) : سێمینە ئیلتیجای دلم . (مم) و (گم) : سوومم ڕەجای دلم . (کم) و (من) : سێمینی ئیلتیجای دلم . ئەی (مم) و (گم) : ئەمەیە . هاواری (من) : هاوارە .

(٤٩) ئاخیرە : قیامەت . قەمطەریر : دژوار و تەنگ و نالەبار . عەبۆس : ناوچاو گرژ . غەضەنفەر : بەسام وەك شێر .

وانە : ئەو ڕۆژی دواییەی کە دواڕۆژی دنیایە و ڕۆژێکی بەدوادا نایەت و هەمیشەیی و نەبڕاوەیە و ، ڕۆژێکی زۆ ترش و لەسەر شان گرانە و وەك شێر بنیادەمی لێ ئەترسێ .

ئەم فەرشە خاکییە دەتەکێنن لە تۆز و گەرد
ئەم عەرشە تۆ صەحیفەیە دەیکەن بە یەك پەڕە (٥٠)

دەنگی فوغان و جۆش و خورۆشی جەمیعی خەڵق
گوێ لێرە دەبیستێ ، کە لەوێ گوێ هەمو کەڕە (٥١)

---

وەصف کردنی ڕۆژ بە ( ڕۆژرش ) مەجازە و زیادەڕەوییەکی زۆری تیایە و مەبەست لێی ئەوەیە خەڵك لەو ڕۆژەدا ئەوەندە دێز و مۆن و ڕۆگرژن ، ڕۆژەکەش وای لێهاتووە .

ڕۆژی ( (عم) : ڕۆژە . ئاخیرەی (عم) و (کم) و (گم) و (من) : ئاخیرە . ڕۆژی لە دۆ (چن) : ڕۆژێ لە دۆی . غەضەنفەرە (چن) : موقەنطەرە . موقەنطەر : ئەوەی باش گرێ درابێ یلخود زۆر ئاڵۆز بێ .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی ( وَ انا نخافُ مِنْ رَبّنا یَوْماً عَبوساً قَمطَریراً ) . واتە ئێمە ترسی ڕۆژێکی مۆن و دژوارمان لە خوای خۆمان هەیە .

(٥٠) صەحیفە : پەڕە ، چین .

واتە : ئەو ڕۆژی قیامەتەی کە ئەم فەرشە خاکێ ڕەنگەی زەویی تیا ئەبێتە جۆرە زەوییەکی‌تر و تۆز و گەردی پێوە نامێنێ و ، هەر نۆ چینەکەی ئاسمان ئەپێچرێنەوە و وەك یەك بەڕە تافەزی پێچراوەی لێ ئەکرێ .

ئەم بەیتەش ئیشارەتە بە ئایەتی ( یَوْمَ تُبَدَّلُ الارْضُ غَیْرَ الأرضِ وَٱلسَّماواتُ مَطْوِیاتٌ بِیَمینِهِ ) واتە : ئەو ڕۆژەی کە زەوی ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی‌تر و ، ئاسمانەکان بە دەستی ڕاستی خوا پێچراونەتەوە و ، ئایەتی ( یَوْمَ نَطْوِي السَّماءَ کَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْکُتُبِ ) واتە : ئەو ڕۆژەی ئاسمانەکان ئەپێچینەوە وەك چۆن تۆمار نامە ئەپێچێتەوە .

ئەمی یەکەم‌(ت) : ئەو. فەرشە (چن) : فەرشی . عەرشە (چن) : عەرشی . نۆ (چر) و (خا) : ئەو . دەیکەن (عم) و (کم) و (من) : ئەیکەن . پەڕە : هەمو نوسخەکان جگە لە « کم » و « گم » : بەڕە .

(٥١) فوغان : هاوار و گریان . دەبیستێ : ئەبیستێ .

واتە : ڕۆژێکی ئەوەندە سەختە ، هەرکەسێ تیا گرفتاری دەردی خۆیەتی و ، کەس لەبەر مەینەتی خۆی ئاگای لە کەس نەماوە و ، گوێی لە هاوار و فوغانی کەسی‌تر نییە ، کەچی لێرەوە دەنگی گریان و هاواریان ئەبیسترێ .

ڕۆژی قیامەتی ( فاذا هم قیام ) و ، شەخص
قائیم چەقیوە ، کێلە ، لەسەر خاکی مەحشەرە (٥٢)

ئایا قەد و قیافەیی خۆی بۆ بە کێلی خۆی ،
یا ساقی عەبهەرە کە دو چاوی لەسەر سەرە ! (٥٣)

---

زیادەڕەوییەکی زۆر جوانە ئەمەی کە نالی کردوێەتی ، بۆ پێشاندانی ڕادەی سەختیی ڕۆژی قیامەت وا ئەنوێنێ ( ئێرە ) ماوە تا ئێرەوە خەڵك گوێیان لە هاوار و فوغانی ئەهلی مەحشەر بێ !

دەنگی (چر) : دەنگ و . (چن) : دیگی ، واتە مەنجەڵی . شوبهاندنێکی جوانە . کە لەوێ گوێ هەمو کەڕە (کم) : کە لەوێ گوێی هەمو کەڕە . (تو) : کە هەمو گوێ لەوێ کەڕە .

(٥٢) قائیم : بنیادەمی قنج و قیت . مەحشەر : جێگای چاڵ هەڵکەندن ، گۆڕستان .

واتە : ئەو ڕۆژی قیامەتەی کە ئایەتی ( ثُمَّ نُفِخَ فِیهِ اُخری فاِذا هُمْ قیامٌ یَنظُرُونَ ) واتە : پاشان جارێکیتر فو کرایەوە بە صوردا و کوتوپڕ ئەبینێ ئەو هەمو مردووانە ڕاست بونەتەوە سەیر ئەکەن ، باسی ئەو ئەکا و ، بنیادەمی ڕاست بووەوەی تیا حەپەساوە ، بەپێوە وەستاوە، ئەڵێی کێلی سەر قەبرە لەسەر خاکی گۆڕستان چەقیوە ، ئاگای لە هیچ نییە .

شەخص (چن) و (ت) و (لد) و (اح) : خەڵق . مەحفەرە (تو) و (عب) و (من) و (خا) : مەحضەرە . دوریش نییە ( مەقبەرە ) بوبێ و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ .

لە ( فاِذا هُمْ قِیامٌ )دا ئیقتیباس لە ئایەتەکە و ، لە وشەی ( شەخص )دا ئیشارەت بۆ ئایەتی ( شاخِصَةٌ اَبصارُهُم ) واتە : چاویان ئەبلەق بووە ، کراوە . لەنێوان (قیامەت) و (قیام)یشدا جیناسی ناقیص هەیە .

(٥٣) عەبهەر . کەڵەگەت و زەلام . نەرگس .

ئەم بەیتەش لەبارەی مەعناوە پەیوەندی بە بەیتی پێشووەوە هەیە . واتە : کەس نازانێ ئەو بنیادەمەی بەسەر خاکی گۆڕستانەوە قنج قنج حۆل و بێئاگا وەستاوە ، چییە ؟ ئاخۆ : قەد و باڵای مردووە ڕاستەوە بووەکە خۆیەتی بووە بە کێلی قەبرەکەی خۆی و نیشانەی بونی خۆیەتی ،

دنیا بووە بە تاوەوو ، سەحرا بە زیلەمۆ
دنیا دەڵێن کە ئاگرە ، ئاری سەمەندەرە (٥٤)

دیوانی گەرمی باری خودایە ، بە پایە عام
ئیصغایی خەڵقە ، ساعەتێکی عەرضی مەحضەرە (٥٥)

---

یا شتێکی زەلامی کەڵەگەلی حەپەساوە هیچی لە بنیادەم ناچێ چاوەکانی نەبێ ، کە ئەوانیش پەڕیونەتە تەوقی سەری .. یاخود هەر بەحاڵ گیانی تیایە ، ئەوەندە لەڕ و لاوازە ئەڵێی ساقی نەرگسە و چاوەکانی لەترسا سپێ بوون و وەك چاوی نەرگس بەسەر سەریەوەن . مەشهورە بنیادەم لە ڕۆژی قیامەتا ، لەترسانا چاوی ئەپەڕێتە تەوقی سەری .

لەنێوان ( سەر ) و ( سەرە )دا جیناس و ، لەنێوان (قەد) و (چاو) و ( سەر )دا تەناسوب هەیە .

(٥٤) زیلەمۆ : خۆڵەمێش کە جێی بنەوەی ئاگر بێ . سەمەندەر : گیان لەبەرێکی ئەفسانەییە ئەڵێن هەر لەناو ئاگرا ئەژێ و هێلکە ئەکا و هەڵی‌دێنێ و ، ئەگەر بێتە دەرەوە ئەمرێ !

واتە : ئەو ڕۆژی قیامەتە ڕۆژێکە پلەی گەرمای تیادا بەڕادەیەکە دنیا هەمو وەك تاوەی نراوە سەر ئاگری لێ دێ و ، دەر و دەشت هەمو ئەبێ بە زیلەمۆ و بنەکەی ئاگر ئەبێ .. بنیادەمی ئەوڕۆژەش تەنها بە حوکمی ئەوە ئەژین و ناسوتێن کە خاسیەتی سەمەندەریان وەرگرتووە .

بە تاوەوو (« پەراوێزی » چر) : بە تازەوو . دنیا ــ ی دووەم ــ(عم) و (کم) و (گم) و (لو) و (عب) و (من) و (خا) : دەریا . دەڵێن (عم) و (کم) و (گم) و (من) : دەڕوێنی . (لو) و (عب) : دەڵێنێ . کە ئاگرە (مم) و (کم) و (گم) و (تو) و (عب) و (من) : ئاگرە . (ت) : کە ئاگر . بۆ (کە ئاگرە) و ( کە ئاگر و ) و (کە ئاگری) دەستنەدا . (ك) و (اح) : کە ئاگری . ناری (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (ك) و (تو) و (عب) و (خا) : ماری آ. (ت) : ماریش ..

(٥٥) بە پایە : بەپێوەیە . عام : خەڵك ، گشتێ . ئیصغا : گوێ شل‌کردن . عەرض : پیشان‌دان . مەحضەر : خزمەت . حوزوور .

لەم بەیتەوە نالی باسی ڕۆژی لێ‌پرسینەوەی خەڵك و ئامادەبونی خودا ئەکا بۆئەم داوەریە و ناردنی هەندێ بۆ دۆزەخ و هەندێ بۆ بەهەشت و ، لەم بەیتەدا باسی بەستنی دادگای خوا و ئامادەبونی خەڵك کراوە بۆ

لایەك ( زەبانیە ) لە سەروکاری ئارە ، ئار
( هَلْ مِنْ مَزِیدْ ) زوبانیە وەك ماری ئەژدەرە (٥٦)

---

وەڵام دانەوەی پرس . لە بەیتەکانی پاشەوەشدا دیمەنەکانی‌تری ئەو ڕۆژە پیشان دراون .

واتە : خـوا دیوانی گەرمی خـۆی بەستووە و خەڵك هەمـو بەپێوە ڕاوەستاون گوێیان شل‌کردووە ، کاتی عەرز کردنی سیاهەی کرداری خەڵکە لە حوزوری خوادا .

ڕاست کردنەوەی ئـەم بەیتەمان بەزەحمەت بۆ تەواو بـو . وشەی (بەپایە) لە هەمو نوسخەکاندا بە (پپای) نوسـراوە . وشەی (ئیصفای) تەنها لای (جـن) وایە . (جـر) و (ت) و (ك) و (لو) و (عـب) و (خا) : اصـفار . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : اصـفاری . (اح) اصفار . خودایە (چر) : خودایا . (کم) و (گم) و (من) : خوایە . خەلقە (چر) و (لو) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : خەڵك . (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (من) : خەڵق . ئێمە خۆمان بە (خەڵقـە)مان نوسییەوە . سامەتێـکی عەرضی مەحضەرە : جیاوازییەکانی نوسخەکان لەم ڕستەیەدا یا هەڵەی ئاشکرا بون یا هیی شێوە نوسینی جارانی فارسییانەیە . ئێمە وای بۆ ئەچین وشەی (سامەتێکی) لەپێشـدا (سامەلەکەی) بوبـێ . بەوجۆرە بەیتەکە ڕەسـاتر دێ .

(٥٦) زەبانییە : ئەو فریشتانەی بەرپـرسی ئاگری دۆزەخـن . سـەروکار : سەرپەرشتی . نار : ئاگر . هل من مزید : هیی‌تریش هەیە . ڕستـەیەکە خوا بەدەم ئاگری جەهەنمەوە ئەیگێڕێتەوە ، کە هەرچەند خەڵکی لـێ فڕێ بدرێ هەر تێر نابێ و چاوی لە هیی تریشـە بۆی بێنن . مـاری ئەژدەر : ئەژدەها ، بەگوێرەی ئەفسـانەی کۆن جۆرە مـارێکی ئێجگار گەورەیە ئاگر لە دەمیەوە دەرئەچێ .

واتە : لەلایەکەوە پێش‌خزمەتەکانی دۆزەخ خەریکی سـەروکاری ئاگری دۆزەخن و پەیتا پەیتا خۆشی ئەکەن و ، ئاگریش بە زوبانی ( هَلْ مِـنْ مَزِیدْ ! ) قسـە ئەکا و ، وەك ماری ئەژدەر زوبانی دەرکێشاوە و بڵێسـەی ئاگری شاڵاو ئەهێنێ .

لەم‌بەیتەدا ئیشارەت کراوە بە ئایەتی ( یَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ : هَـلْ امْتَلأتِ ، وتَقُولُ : هَلْ مِنْ مَزِیـدْ ! ) واتە : ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکە تیا ئەڵێین بە دۆزەخ : پڕ بوی ! ، ئەویش وەڵام ئەداتەوە ئەڵێ: هیی‌تریش هەیـە ! .

لایێکی‌کەش لە جەنەت و ڕیضوان تەدارەکە
حۆریی ئەوا بە مونتەظیری دێنە مەظەرە (٥٧)

ئەشخاصی خاصە ( تَشَخَصْ ابْصارُهُمْ ) هەمو
( وا نَفسی )یانە هەریەکە بۆ خۆی موحەیەرە (٥٨)

---

لەنێوان (رەبانییە) و (زوبانیە)دا جیناسی موحەڕڕەف و لەنێوان (کار) و (نار) و (مار)دا جیناسی لاحیق و ، لە ( هل من مزید )دا ئیقتیباس هەیە.
سەروکاری (چن) : سەرکارو . نارە ، نار (چن) : نار و مار . (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : نار و نار . مزید (چن) : مزیدی* . (ت) : مزیدیە ، بەلام زیادیی ع (ی)کە و ع (یە)کە ژمارەی بڕگەکانی نیوە بەیتەکە زیاد ئەکا . زوبانیە : ئەمە تێکستی (ت)یە . (چر) و (چن) و (ك) و (اح) و (خا): هەم زوبانیە ، بەلام (هەم)ەکە ژمارەی بڕگەکانی نیوە بەیتەکە زیاد ئەکا . (مب) : هەم زوبانەیی . ئەگەر ئەم نوسخەیە (هەم)ەکەی نەبوایە مەعنای ( زوبانەیی ) باش ئەهات ، هەرچەند ( هل من مزید ) وەستانێکی تیا نەبێ . وەك ماری (چر) و (تو) و (مب) : وەك مار و . (چن) و (ت) و (ك) و (اح)و (خا) : وەك ماری . (مم) و (گم) و (من) : وەکو ماری .

(٥٧) ڕیضوان : دەرگاوانی بەهەشت . تەدارەك : ئامادە . حۆریی : کچانی جوان کە ئامادە کراون بو بەهەشتییەکان . مونتەظیر : چاوەڕوان . مەنظەرە : تەماشا . بەرچاو .

والە : لە ڕۆژەخدا ئا وا بۆ کە وتمان . لە لایەکی‌کەشەوە لە بەهەشتدا خۆ ئامادەکردنە بو پێشوازیی لێ کردنی ئەوانەی دێنە بەهەشت و ، ڕیضوانی دەرگاوانی بەهەشت حازر بووە دەرگا بکاتەوە و حۆریی دێنە تەماشا ، چاوەڕوانی خاوەنی خۆیانن بە یەکتریی شاد بن ..
ئەم بەیتە لە (مم) و (کم) و (گم) و (من)دا نییە .

(٥٨) ئەشخاصی خاصە : پیاوانی تایبەتی . تَشَخَصْ ابصارُهُمْ : چاویان ئەبلەق ئەبێ . وا نفسی : هاوار بۆ خۆم . موحەیەر : سەرسام .

والە : لەو ڕۆژە بەسام و شوم و سەختەدا تەنانەت پیاوانی تایبەتییش چاویان ئەبلەق بووە و هاواری ( هاوار بۆ خۆم ! )یانە و سەرسام بوون نازانن چی بکەن .
ڕستەی ( تشخص ابصارهم ) لە ئایەتی قورئان ئیقتیباس کراوە .

---

* ئەم نیشانەی (ی)مانە بە پشتیوانیی ئەو کەشیدە بەرەو خوارە داناوە کە (چن) لە ژێری (ی)کەوە نوسیویە و نیشانەی (ی)ی بۆشە لای ئەو .

زێڕ و زەبەر دەبن بە دو فیرقە ، لە فیرقەتەین
واوەیل و ئیمتیازە کە کێ بێتە کێ بەرە (٥٩)

ئەکثەر کەسینە ، تابیعی بەرد و حەرارەتە
یەعنی وەقوودی نارە ، بوخاری موسەییەرە (٦٠)

---

(٥٩) زێڕ : ژێر . زەبەر : سەر . فیرقە : تاقم . واوەیل : هاوار . ئیمتیاز : جیاوازی .

واتە : ئەو خەڵکە ئەبن بە دوو تاقم ، تاقمێ لە ژێرەوە کە ئەهلی دۆزەخن و تاقمێ لە سەرەوە کە ئەهلی بەهەشتن . لە هەردوو تاقمەکەوە دەنگ دێ ، لە دۆزەخییەکانەوە هاواری ( یا وَیْلَنا قد کُنّا في غَفْلَةٍ مِنْ هذا ) واتە : ئۆزبەسەرمان! ئاگامان لەمە نەبوو، لە بەهەشتییەکانیشەوە هاواری ( امتازوا الیَوْمَ أیُّها المجرِمونَ ) کە بە دۆزەخییەکانی ئەڵێن ، واتە : ئەی تاوانبارینە ئەمڕۆ جوێ ببنەوە . هاوارەکەش بەهۆی ئەوەوەیە کە بانگ ئەکەن فلان بێتە بۆ بەهەشت و فیسار بەرە بۆ دۆزەخ.

بێتە (عم) و (کم) و (گم) : سینە . بەرە (عم) و (کم) و (گم) و (لو) و (مب) : سەرە .

(٦٠) ئەکثەر : زوربە . تابیع : شوێنکەوتوو . بەرد : یا سەرما یا هەر (بەرد)ی کوردی . حەرارەت : گەرما . وەقود : سووتەمەنی . نار : ئاگر . بوخار : هەڵم . موسەیەر : ژەوێنراو ، خراوەگەڕ .

ئێمە لەو باوەڕەدا نین مەعنای تەواوی ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەیمان بۆ ساغ کرابێتەوە . بەڵام وەنەبێ تێکڕاش نەمانزانیبێ . هەرچۆن بێ ، لەوەندەی کە بۆی چووبین ئەیخەینە ڕوو و چاوەڕوانی بەشداریی کەسانی تریشین .

نالی ئەڵێ : زوربەی ئەوانەی لە مەیدانی حیساب و داوەریدا خڕبونەتەوە ، کە کافرانن ، شوێنکەوتوی سەرمای زەمهەریری دۆزەخ و گەرمای ئاگرەکەیین ، یاخود لەگەڵ ئەو بەردانەدان کە لە دۆزەخدا ئەسووتێنرێن و لەگەڵ گەرمای دۆزەخدان ، واتە سووتەمەنیی دۆزەخن و هەڵمی کوڵانیان لەناو گەرمای دۆزەخدا و بەسەر ئاگری دۆزەخەوە ، ئەژەوێنرێ و سەرئەخرێ .

وشەی ( وَقود) و (بەرد) بەوپێیە کە بەمەعنا (حەجەر) بێ ، ئیشارەتە بۆ ئایەتی ( وَقودُها النّاسُ والحِجارَةُ ) لە باسی جەهەننەمدا ، کە

باقی کە ڕۆی لە کەففەیی میزانە ، یەکسەرە •
هەرچەند سەرە موتابیعی میعیاری دۆ سەرە (٦١)

---

واتە : سوڵەمەنیی دۆزەخ بریتییە لە ئادەمیزادی خوانەناس و لە بەرد .

کەسینە (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : کە بێنە ، یا کە بەینە . (تۆ) و (عب) : بەنیە . بەرد و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : هەردۆ .

(کەسینە) تێکستی نوسخەکانی (عم) و (کم) و (گم) و (من) بۆ کە لەچاو نوسخە دەستۆسەکاندا کەمتر جێگای باوەڕن و پشتمان پێ بەستۆن ، بەڵام لەبەرئەوە کە نەگەیشتینە مەعنایەکی گونجاو بۆ (بێنە) یا (بەینە) یا (بەنیە) ناچار ئەممان هەڵبژارد . ڕێیشی لێ‌نەچێ ڕاستەکەی (پێنە) بێ، واتە : زوربەی خەڵکەکە کە ئەوانەن لەبنەوەن و لەچاو موسوڵمانانندا وەك (پێ) وان لەچاو (سەر)دا ، یا دەست و پێی گەورەکانیانن کە گومڕایان کردن .

تۆ بڵێی لە وشەی (بەرد) و ڕستەی (وەقودی نارە) و (بوخاری موسەیەرە)دا نیشارەتێکیش بۆ شەمەندەفەر نەبێ کە جاران بە سوتاندنی خەڵوزی بەرد بەڕێوە ئەچۆ و هەڵمی بەرز لەبوەوە !! لەبارەی مێژووەوە ڕۆژهەڵات لە سەردەمی نالیدا شەمەندەفەری دیوە . یەکەمین شەمەندەفەر لە میسردا لە ١٨٥٧دا کەوتووەتە گەڕ . نالییش پاشتر مردووە و ئەم پارچە شیعرەشی لە مەدینە وتووە . هیچ‌نەبێ دەنگوباسی شەمەندەفەری لە ڕێبوارانی میسرێ بیستووە کە هاتون بۆ مەککە و مەدینە .

(٦١) کەففەی میزان : تای تەرازۆ . سەر : لا ، ڕێر . موتابیع : ئەوەی چاو لەدوی شتێك بێ .

واتە : ئەوانی‌کەش کە موسوڵمانن ، لە بێ‌گوناه و گوناهبار ، ڕۆیان لە تای تەرازۆی کێشانەی چاکە و خراپەیانە ، هەمو یەك لا و یەك ڕیزن ، هەرچەند ڕیزەکەشیان چاو لەدوی تەرازۆیەکی دۆسەرە تا بزانن سەنگی چاکە و خراپەیان چەندە و ئاخۆ بۆ ماوەیەك ئەچنە دۆزەخ تا سزای خراپەیان لێ بسەنرێ ، یا ڕاستەوخۆ ئەچنە بەهەشت ! .

میزانە (چن) : میزانی . هەرچەند سەرە (« بەراولێزی» چر) و (چن) و (خا) : هەرچەند یەکسەرە ، بەڵام ئەوە بەیتەکەی پێ لاسەنگ ئەبێ . (ت) : هەرچەندە یەك .

لەو کێشە کێشەدایە کەوا ڕەش سپی دەبێ
لەو کێشە کێشەدایە کەوا ئەحمەر ئەصفەرە (٦٢)

ئەعمالمان لەگەڵ هەمو ئەوضاعی حالمان
مەغشوش و جەمعی ، حاضرە ، گەر خەیر ، ئەگەر شەڕە (٦٣)

مەخزونی ڕوقعە ، حەبە بە حەبە ، لە کەففەدا
خالیص دیارە ، مس کە مسە ، عەینی زەڕ زەڕە (٦٤)

---

(٦٢) ئەحمەر : سور . ئەصفەر : زەرد .

واتە : لەو کێشە و هەرای ڕۆژی داوەریەدا موی ڕەشی لاو سپی ئەبێ و ، ڕوی گەش و سور و پاراو لەترسانا زەرد هەڵئەگەڕێ و خوێنی تیا نامێنێ .

ئەشکونجێ مەعنای بەیتەکە وا لێکبدەینەوە کەوا شتی نەزانراو هەمو دەرئەکەوێ و ڕۆشن ئەبێتەوە و ئەوەی خۆی لێ بایێ بۆبو و بە خۆیا ئەنازێ خەجاڵەت و ڕوزەرد ئەبێ .

بەپێی مەعنای پێشو ، ئەم بەیتە ئیشارەتە بە ئایەتی ( یَوْمَ یَجْعَلُ الوِلْدانَ شیبا ) واتە : ڕۆژێکە منداڵی تازە پێگەیشتو پیر ئەکا .

ڕەش (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : ڕیش . دەبێ (کم) و (مـن) : ئەبێ .

(٦٣) مەغشوش : تێکەڵ لە چاك و خراپ . جەمع : کۆمەڵ . حاضر : ئامادە .

واتە : چاك و خراپ و ، تێکەڵ و کۆمەڵی کردار و ئەحوالمان ، هەمو لە بەردەستا دانراوە .

مەغشوش و (خا) : مەغشوشی . (من) : مەغشوش . بۆ مەعطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . («بەراوێزی» چر) : مەخشوشی . (چن) و (ك) و (لو) و (مب) : مەخشوش و . (اح) : مەخشوش . بۆ مەعطفیش و بۆ ئیضافەش ئەگونجێ. جەمعی : تەنها («بەراوێزی» چر). نوسخەکانی تر هەمو : جەمع و . حاضرە («بەراوێزی» چر) : خاطرە . گەر (چن) و (ك) و (کۆ) و (اح) : ئەگەر . خەیر ، ئەگەر (ت) : خەیر و گەر . کەففە : تای تەرازو . خالیص : بێگەرد .

(٦٤) مەخزون : خراوە عەمار . نوسراوە . ڕوقعە : کاغەز . حەبە : دەنك . کەففە : تای تەرازو . خالیص : بێگەرد .

ذەڕڕێك لە چاوی بڕتەیی سەڕڕافی کەففەدا
مەخفی نیە ، دیارە ، وەکو ڕۆژی نیمەڕە (٦٥)

گریان هەمو ڕەشاوە لەبەر ئاهی دوود ڕەنگ
موژگان بووە بە خامەوو ، دیدە بە مەحبەرە (٦٦)

---

واتە : هەرچی لە کردارنامەماندا نوسراوە و تیا کۆکراوەتەوە ، دەنك دەنك لە تەرازوی کردارا دیارە ، مسی مسە ، وەك چۆن زێڕی زێـڕە . مەبەستی لەوەیە چاك و خراپی هەموی ئاشکرا و لەبەرچاوە .

مەیتی کە مس مـــە (چن) : مس کە مـــە هەیتی .

لە نوسخەی (لو)دا نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و نیوەی دوهەمی بەیتی پاشەوەی یەك بەیتن و ئەو دو نیوە بەیتەکە نییە .

حەبـە : زاراوەیەکە زێڕینکەرەکان لە دروستکردنی خشـــلی زێڕ و کڕین و فرۆشتنی زێڕدا بەکاری ئەهێنن .

(٦٥) بوتە : جێگای تاقی کردنەوەی مایـە بـــۆ جـوێ کردنـــەوەی بێگەرد و ناپاکی لـــە یەکتر . صـــەڕڕاف : ئەوەی پـــارە ئـــەگۆڕێتـــەوە و ســـاغ ئەکاتەوە . ڕەمزشناس . نیمەڕە : نیوەڕۆ .

واتە : ئەوەندەی تۆسقالێك لە کرداری چـــاك و بەدمان لە بەرچاوی بوتەی ڕەمزشناســی تای تەرازوی ڕۆژی قیامەت ون نابێ ، هەموی وەك ڕۆژی نیوەڕۆ دیارە .

ذەڕڕێك (گم) : ذەڕڕەی . صـەڕڕافی کەففەدا ( چن ) : صـەڕڕاف لە کەففەدا . نیمەڕە (چن) : نەیرە . واتە : ڕوناك .

(٦٦) ڕەشاو : ئاوی ڕەش . دوود : دوکەل . مەحبـــەرە : دەوات ، شوشـەی مەرەکەب .

واتە : دوکـــەلی هەناســـەی خـــەلکی مەبنەلێ ، ئاســـمان و زەویی گرتووەتەوە و ، بەهۆی ئەوەوە خەلکیش کە ئەگرین ڕەشـــاو لە چاویان دێ . بۆیە کە فرمێـــك بۆ بە مەرەکەب ، برژانگەکانیش ئەبن بە قەلەم و ، چاو خۆیشـی لەبێ بە شوشـەی مەرەکەب .

لە کۆکردنەوەی ( گریان ) و ( موژگان ) و ( دیدە ) و ، لەنێوان (خامە) و ( مەحبەرە )دا تەناسـوب هەیە

ڕەشـاوە ( « بەراوێزی » چر ) و (چن) و (ك) و (اح) و (خا) : ڕژاوە .

مه‌یداری شه‌هسه‌وارییی تۆیه که صه‌ف صه‌فه
کۆگایی حاصیلاتته به‌یدایی به‌یده‌ره (٦٧)

زۆڕی جه‌زا ڕجا بکه بۆ « نالی »ی ده‌ربه‌ده‌ر
چون له‌م جیهان گوناهی گه‌لێ زۆر و ئه‌کته‌ره (٦٨)

---

ڕه‌نگه مه‌عنای ( ئاوی ڕه‌زڕ ) بێ ، چونکــه (ڕه‌زڕ) به (خــه‌ڵوز) ئه‌ڵێن . ئامی : (ت) : ئاوی . دیاره مه‌به‌ســتی له ئاوی فرمێســکه . مه‌حبه‌ره (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (لو) و (اح) و (من) و (خا) : مه‌جمه‌ره .

(٦٧) میضمار : مه‌یدانی ڕمبازێ . شه‌هســه‌وار : شاسوار . به‌یدا : ده‌شت . به‌یده‌ر : خه‌رمان .

واته : له‌م ده‌شتی مه‌حشــه‌ره که ســوارانی ڕیز ڕیز و پۆل پۆل تیا وه‌ستاون . کۆگای به‌روبومی دەغڵ و دانی تۆیه ، ده‌شــتی پڕ خه‌رمانی تۆیه . مه‌به‌ستی له‌وه‌یه له‌م مه‌یدانه‌دا به‌روبوم و خه‌رمانی ئومێد ته‌نها بریتییه له شه‌فاعه‌ت و تکا کاریی تۆ .

به‌رابه‌ر به دانانی پێغه‌مبه‌ر به شاسواری مه‌یدانی مه‌حشه‌ر، مه‌به‌ست له سواره‌کانی‌تر پێغه‌مبه‌ره‌کانی‌تره .

شه‌هســه‌وارییی (چن) و (کم) و (گم) و (ك) و (لــو) و (عب) و (من) : شه‌هســه‌واره‌یی (ت) و (اح) و (خا) : شه‌هســه‌واری . تۆیه (ت) و (اح) و (خا) : ئه‌تۆیه .

(٦٨) واته : له ڕۆژی پاداش و سزا دانه‌وه‌ی یــار چاکان و تاوانبارانـدا ، تکا بۆ ئه‌م نالییه ده‌ربه‌ده‌ره بکه به‌ڵکو خوا لێی خۆش بێ ، چونکــه گوناهی له‌م جیهانه‌دا زۆر زۆر کردووه و پێویــستی به تکای تۆ و ڕه‌حمی خوایه .

ئه‌م به‌یته له هیچ‌کام له ده‌ستنوســه‌کانی به‌رده‌ســتمانا نییه . ته‌نها (چر) به قه‌ڵه‌می فه‌ڕه‌نگی له په‌راوێزی ده‌ستنوسه‌که‌ی خۆیه‌وه نوســیویه‌ته‌وه . ئه‌وه‌ش وادیاره نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه له یه‌کێ له نوسخه چاپه‌کانی وه‌رگرتبێ .

چون له‌م جیهان (چر) و (کم) و (من) : چونکه له ڕۆژی جیهــان . به‌ڵام ژماره‌ی بڕگه‌کانی نیوه به‌یته‌که زیاد ئه‌کا .

نوسخه ده‌ستنوســه‌کانی به‌رده‌ســتمان (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (خا) ، ئه‌م قه‌سیده‌یه و قه‌سیده‌کانی‌تری پیاهه‌ڵدانی پێغه‌مبه‌ر ( د. خ )یان که بریتین له ( له‌ی تازه جه‌وان . . ) و ( وه‌ی که ڕۆژمه‌ردی مه‌دینه و . . ) و ( ئه‌لا ئه‌ی نه‌فسی بۆم ئاسا . . ) که ( شوتوربانا . . ) و

— ٨ —

سەراپای گوارە زەردی ترس و لەرزە
دەڵێی عاصی بووە لەو جێگە بەرزە ! (١)
سوورو شکم ئاب و دانەی نارە ، کێ دێ :
بە گەرمیی داوەرێ بەم طەرزە تەرزە ؟! (٢)

---

( لە جوملـەی موعجیزنەندەر . . )یش بەشێکن لەو ، لەباڵ یەکدا ڕیز کردووە ، هەرچەند هەموو وەکو یەکیان ڕیز نەکردوون . دووریش نییە ئەم قەسیدانە ـ ( ئەی تازە جەوان ) نەبێ ـ هەموو لە یەك ماوەدا وترابن ، بەڵام ئاشکرایە ئەوان بۆیە پێکەوەیان ڕیز کردوون ، چونکە هەموو مەدحی پێغەمبەرن . ئێمە ، وەك لە پێشەکییەکەدا وتمان ، قەسیدەکانمان بەپێی ڕیزی ئەلفوبێ ڕێکخستووە .

— ٨ —

(١) سەراپا : سەر تا پێ ، هەموو گیان . عاصی بووە : گیری خواردووە .

نالی لەم بەیتەدا هۆی ( زەردێ )ی گوارە باس ئەکا وەك بڵێ گوارە بۆیە زەرد نییە کە لە زێڕ دروست کراوە و زێڕیش زەردە ، بەڵکو لەبەر ترس و لەرز زەرد هەڵگەڕاوە و ، خۆی بە شایانی ئەوە نازانێ بکرێتە گوێی یار و بە لامل و گەردنیا شۆڕ ببێتەوە و بگاتە ئەو پایە بڵندە ، وەك چۆن منداڵێك بچێتە سەر دارێکی بەرز یا تاشێکی تۆش و نەتوانێ بێتە خوار و ترسی لێ بنیشێ و لەترسانا زەرد هەڵگەڕێ ، ئەمیش هەروا بەو جێگا بەرزەوە گیری خواردووە و ، لەترسا کە ناتوانێ بێتە خوار ، زەرد هەڵگەڕاوە .

لە ( زەردی ترس و لەرزە ) و ( عاصی بووە )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە . لە وشەی ( زەرد )یشدا لەطافەت هەیە چونکە بێجگە مەعنای ڕەنگی زەرد ، مەعنای ترسیش ئەگەیەنێ . لەنێوان ( لەرزە ) و ( بەرزە )شدا جیناسی لاحیق هەیە .

سەراپای (چن) و (کم) و (من) : سەراپا . زەردی (چر) : زەرد هەر . دەڵێی (کم) و (من) : ئەڵێی . لەو جێگە (چر) : لەو بانە . (گم) و (ت) و (اح) : لەم جێگە .

(٢) ئاب : ئاو . دانە : دەنك . نار : ئاگر . هەنار . طەرز : جۆر .

واتە : فرمێسکم ، خوێ ، ئاوە ، بەڵام کە دایشئەوەرێ هەر دڵۆپێکی بگری ئەوەندە گەرمە ئەڵێی ئاگرە ، یاخود سوور و خوێنینە وەك دەنکە

ئەلا ئەی ئاسکی ناسك ، بە باسك
شکاندت گەردنی صەد شێری شەرزە ! (٣)

ئەلا ئەی نازەنین ئاهۆ ، بە باهۆ
دلی صەیادی خۆت هێنایە لەرزە ! (٤)

---

هەنار . پاشانیش ئەمەیێ و ئەیێ بە تەرزە .. زۆر سەیرە ! کێ دیویەتی تەرزە بەمجۆرە بە گەرمێ بیارێ؟! کێ‌دیویە شتێك لە یەك‌کاتدا هەم سپێ بێ و هەم سوور ! هەم ئاو بێ و هەم ئاگر ! هەم گەرم بێ و هەم سارد ! هەم شل بێ و بزوا ، هەم مەیبێ و بەستێتی !

لە کۆکردنەوەی ( ئاب ) و (نار) و ، (گەرمێ) و (تەرزە)دا طیباق و ، لەنێوان (طەرزە) و (تەرزە)دا جیناسی موضاریع هەیە . لە (تەرزە)شدا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە .

بۆ تەرزە ( بارین ) بەکارئەهێنرێ ، بەڵام نالی چونکە تەرزەی لەجیاتی فرمێسك بەکارهێناوە ، فرمێسکیش ( داوەرین )ی بۆ بەکاردێ ، بۆ ئەم تەرزەیەش هەر داوەرینی بەکارهێناوە .

ئاب و (چن) و (عم) و (گم) : ئاو و .

(٣) شەرزە : شێر بەچە ، شێرزاد ، ئازا .

واتە : ئەی دلبەری ناسکی وەك ئاسك ، تۆ بە هێزی باسك و قۆلی خۆت ملی صەد دلداری ئازای وەك شێری بەچکە شێرت شکاندووە ! تۆ چۆن ئاسکێکی کە شێر لە زۆرتا خۆی پێ ناگیرێ !

لەنێوان ( ئاسك ) و ( ناسك ) و ( باسك )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( باسك ) و ( گەردن )دا تەناسوب و ، لە کۆکردنەوەی (ئاسك) و ( شێر )دا طیباق هەیە . لە ( ئاسك ) و ( شێر )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحەش هەیە

ناسك (ت) و (خا) : نازك . شێری (ت) : شێرە .

(٤) ئاهۆ : ئاسك . باهۆ : شان و قۆل .

ئەم بەیتە وەك لێکدانەوەی بەیتی پێشوو وایە . نالی شتی‌وای هەیە ، لە شیعرەکانیا گەلێ جار بەیتێك بە بەیتێکی‌تر ڕوون ئەکاتەوە و دەسەڵاتی خۆی لە مەیدانی زمانزانیدا پیشان ئەدات .

واتە : ئەی ئاسکی نازدار ، من هاتم ڕاوی تۆ بکەم ، کەچی تۆ بە

دەفەرمۆی : چاوەکەت زەنجیر کە « نالی » !
کە موطلەق چا نیە ئینسانی هەرزە (٥)

– ٩ –

( حلقە در گوش )ی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە
با ئەنالێ ، لێی‌مەدە ( عَنْ لَطْمِہِ کَفِّہِ الشَّکْمَہ ) ! (١)

---

هێزی دەست و بازۆی خۆت دڵی ئەم ڕاوچیەی خۆت هێنایە لەرزە و بەخێرت کردم .

لەنێوان ( ئاهۆ ) و ( باهۆ )دا جیناسی لاحیق و ، لە ( لاهۆ ) و ( صەیاد )یشدا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە .

(٥) موطلەق : بەرەڵڵا . چا : چاك . ئینسان : بنیادەم . بیبیلەی چاو . هەرزە : ئەوەی باش پەروەردەی دانەدرابێ .

وانە : نازیز ! تۆ پێم ئەفەرمۆی چاوت وەك ئینسانێکی هەرزە وایە یا بیبیلەی چاوت وەك کەسێکی هەرزە و بێ‌تەربیەت وایە ، بەرەڵڵا کرابێ و کەس لێی نەپرسێتەوە چی ئەکا . بۆیە کەولووەتە دۆی من و هەر تەماشای من ئەکا . بیبەستەرەوە و مەهێڵە دوام بکەوێ ، چونکە باش نیە ئینسانی هەرزە ، یا چاوی هەرزە بەرەڵڵا بکرێ و جڵەوی بۆ شۆڕ بکرێ .

لەنێوان (چاوە) و (چاو)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (زەنجیر) و ( موطلەق )دا طیباق و ، لە ( زەنجیر کردنی چاو )دا ئیستیعارەی موصەڕڕەحە هەیە . لە (ئینسان)یشدا لەطافەت هەیە چونکە ، وەك ڕۆنمان کردەوە ، دوو مەعنا ئەگەیەنێ . تێکڕا لە دوا وشەی هەر پێنج بەیتەکەشدا ( لەرزە ، بەرزە ، ئەرزە ، شەرزە ، هەرزە ) جیناسی لاحیق هەیە .

دەفەرمۆی : هەڵیش‌ئەگرێ ( دەفەرموێ ) بێ . (مە) و (کم) و (گم) و (من) : دەفەرمو .

– ٩ –

(١) حلقە در گوش : ڕستەیەکی فارسیە ، وانە : ئەڵقە لەگوێ ، کینایەیە لە بەندە و خزمەتکار . زیاد لەو مەعنای کینایەیە ، کەڵلەی دەف خۆیشی کۆمەڵێك ئەڵقەی پێوەیە . کَفّہ : کەفە ، کَفّ ، کەف ، لەپی دەست .

ئەی ، کە صاحیب سیڕڕە ، سەر تا پا بە ئەمری ( کن ) کونە
باطینی ( قِف قِف عَلی سِرّی ) ، بە ظاهیر قەف قەفە (٢)

---

واتە : ئەم دەفە بەندە و خولامی ئەلقە لەگوێی لەپێ ڕەنگینی بە خەنە سوورکراوی تۆیە ، کەواتە تۆخوا لێیمەدە با نەناڵێنێ ، مەنعی لەپێ دەست بکە لەوە کە چەپۆلە بدا بەسەریا .. ڕستەی لێیمەدە هەردوو مەعناکەی لێدان ئەگرێتەوە .

لەنێوان (کەف) و (دەف)دا سەرەڕای تەناسوب جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( کَفّ ) و ( کَفَّە )دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

لێیمەدە : لە هەموو نوسخەکاندا ، جگە لە (چر) و (گم) و (من) ، بە ( لێمەدە ) نوسراوە ، بەوجۆرەش مەعناکە دێ .

(٢) ئەی : شمشاڵی قامیش . سیڕڕ : ڕاز و نهێنی . کُنْ : ئیشارەتە بۆ ناوی خوا ، لە ( کُنْ فَیَکُون )ەوە هاتووە .

واتە : شمشاڵی لە قامیش دروستکراو ، کە ڕازێکی بۆ خۆی هەیە لە وەختی لێدانیا ڕای ئەگەیەنێت ، سەرتاپای بە فەرمانی خوا کونکون بووە ، کەچی ڕازەکەشی نادرکێنێ و لێی ناکەوێ .. کە بە دیمەن قەفقەف و پارچە پارچەیە ، ئەوە لەدیوی ناوەوەیەوە بانگ ئەکا پێت ئەڵێ وەرە لە ڕازم ئاگادار بە ..

ئەو وردەکارییەی لەم بەیتەدا هەیە تەنها لە وشە عەرەبییەکانی ( قِفْ قِفْ ) ـ بە بەراورد لەگەڵ ( قەف قەف ) ـ و لە (ظاهیر) و (باطین)ەکەوە دەرئەکەوێ .

وشەی ( کُنْ ) ئیشارەتە بۆ ئایەتی ( اِنَّما اَمْرُهُ اِذا اَرادَ شَیْئاً اَنْ یَقولَ لَهُ کُنْ فَیَکُونْ ) واتە : کاری خوا وایە کە ویستی شتێ ببێ ، پێی ئەڵێ ببە و ئەویش ئەبێ .

لەنێوان هەردوو (سیڕڕ) و (سِر) و ، ( قِف قِف ) و ( قەفقەف)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لەنێوان ( کُنْ ) و ( کون )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (باطین) و (ظاهیر)دا طیباق هەیە .

سەرتاپا (چن) و (عم) و (گم) و (خب) : سەرتاپای . قِفْ ـ ی یەکەم ـ (چن) : قَفْ . قەف ، بەمپێیە لەبێ بە موطابەقەی (باطینی) . علی سری (چر) و (خب) : عَلی سِرِّهْ . (عم) و (ت) : علی سری و . (گم) : علی سر . (خا) علی سرّی‌یە . بە ظاهیر (عم) و (ت) و (مز) و (عب) و (خا) و (خب) : ظاهیر .

خۆشترە عوذری گونەهکاران لە سەد ذیکری ڕیا
ئەم بە ئەرمێ عەفوە عەفوە ، ئەو بە توندێ عەف عەفە (٣)

شێخی‌بو سەر لنگە دەستاڕێ بە دەستاری بوزورگ
ڕەندم و ، دەستاری کەللەی من دەفە ، نەك میندەفە (٤)

---

(٣) عەف عەف : حەو حەو ، وەڕەی سەگ .

واتە : ئەو عوزرەی گوناهباران ئەیهێننەوە بۆ داوای خۆش‌بوون لەو گوناهانەی کردوویانە ، گەلێ لەوە خۆشترە کە هەندێ کەس بە درۆ و بۆ ڕیا ناوی خوا ئەهێنن ، چونکە ئەوانەی عوزر ئەهێننەوە هەستیان بە تاوانی خۆیان کردووە و بەڕاستیانە و ئەیانەوێ پاشگەز بینەوە ، بەلام ئەمان بۆ ئەوە ناوی خوا دێنن دلی کەسانێك لە خۆیان ڕازێ بکەن . هەر بۆیەش ڕیا لە ئاینی ئیسلامدا بە هاوبەش دانانێکی بچوك دانراوە بۆ خوا .. کەواتە ذیکر کردنە بە درۆ و ڕیاکەی ئەمان کە بەدەنگی بەرز ئەنەڕێنن (حەی ! حەی !) ، لەئاستی داوای لێ‌بووردنەکەی گوناهبارانا بەئاستەم و لەگەڵ جۆرە کرۆزانەوەیەکدا ، وەك (عەو ! عەو !)کردن و وەڕینی سەگ وایە .

لەنێوان (عەفوە .. عەفوە) و (عەف .. عەف)دا جیناسی ناقیص و ، لە کۆکردنەوەی (نەرم) و (توند)دا طیباق هەیە .

ئەم ، ئەو (عم) و (عب) و (من) : ئەو ، ئەم .

ئەم بەیتە و بەیتی شەشەم لە نوسخەی (عب) و (من)دا لە جێگای یەکتردان .

(٤) دەستار (ی دۆهەم) : مێزەرە . بوزورگ : گەورە . ڕەند : قۆشمە و کەیفخۆش و خۆش . میندەف : گزی هەلاجێ کە لە ڕێ و کەوانەکەی ئەدەن و لۆکەی پێ شێ ئەکەنەوە .

واتە : تۆ بەناو شێخی تەریقەتی و مێزەرێکی زلت بۆ ڕیا لەسەر ناوە ئەوەندەی لنگە دەستاڕێك ئەبێ ، دەمێشت لەژێریەوە خەریکی بزوێش کردن و قسەی هەلەق مەلەق و هیچ و پوچە .. منیش کابرایەکی قۆشمە و کەیفخۆش و خۆشم و گوێ بە دنیا نادەم و ، لەجیاتی مێزەر دەفەکەم ئەنێم بە سەرمەوە ، نەك مێزەرێکی وەك گزی هەلاج ، لۆکەی ڕیای بۆ لەم و ئەو پێ شێ بکەمەوە ..

لەنێوان (شێخ) و (ڕەند)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی (دەستار) و

خادیمی مەخدومیە ، ماقولی ناماقولیە
لەم دەورە ئاصەف سولەیمانە ، سولەیمان ئاصەفە (٥)

صاحێبی ( علم الکتاب )ە موطریبی هودهود نەفەس
یا سولەیمانە لە ( اخوان الصفا ) ، ئاصەف صەفە (٦)

---

(دەستان)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لەنێوان (من دەفە) و (میندەفە)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

(٥) ئاصەف : ئاصەفی کوڕی بەرخیا وەزیری حەزرەتی سولەیمان . سولەیمان : حەزرەتی سولەیمان .

واتە : لە مەیدانی خواناسینی ڕاستەقینە و دلسۆزیی بێگەرددا خزمەتکاری گەورەییە و ، خۆ بە گەورە زانین ناماقولییە .. لەم مەیدانەدا ئەوەی خۆی بە ئاصەف دابنێ ئەبێ بە سولەیمان و ، ئەوەی خۆی بە سولەیمان دابنێ ئەبێ بە ئاصەف ...

لە ( ئاصەف ) و ( سولەیمان )دا تەنها مەعنای بچوك و گەورە وەرگیراوە .

سولەیمانە (مم) و (گم) و (مز) : سولەیمان و . (من) : سولەیمانە و .

(٦) هودهود : پەپوە سلێمانە . نەفەس : دەم و دۆ . اخوان الصفا : برایانی ڕاستی و خاوێنی و بێگەردی . ناوی حیزبێکی ئایینی و سیاسیی ئیسماعیلی مەشرەبیشە لە سەدەی دەهەمی زایینیدا کاری کردووە ، بنکەی لە بەسرە بووە و ، پەیڕەوەکانی بە فەلسەفەی ئیسلام و یۆنانەوە خەریك بوون . ئاصەف : ئیشارەتە بە ئاصەفی کوڕی بەرخیای وەزیری سولەیمان . صەف : ڕیز .

ئەم بەیتە وەك بەلگە وایە بۆ بەیتی پێشو . واتە : موطریبی دەم و دۆ وەك پەپوە سلێمانە ، کە نالی خۆیەتی ، لەبەرئەوەی کە بەدیمەن ڕەند و سادەیە و خۆی وەك ئەو باڵدارە بچوکە بە هیچ ئەزانێ ، بووە بە خاوەنی (علم الکتاب) . سلێمان پاشایش برایەکی بێئەرك و تەکلیفە لەگەل کەس و کار و هاوڕێیان و ، خۆی وەك ئاصەفی وەزیری سولەیمان پێغەمبەر ئەداتە قەلەم ، لەگەل ئەوەشا کە پادشایە و ئەو پایە گەورەیەی لەناو بنەماڵەی بابان و لەناو خەلکەکەدا هەیە .

وشەی (علم الکتاب) ئیشارەتە بە ئایەتی ( قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ ) لە باسی حەزرەتی سولەیمان و شاژنی سەبەئدا .

جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی قیندیلی دڵە
شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفڕەف شاهی عالی ڕەفرەفە (٧)

طەبعی « نالی » توندە ئەمڕۆ ، یا بە نەشئەی نیم نیگاه
مەستی ڕەحڕاح و مەی و ڕاح و قەراح و قەرقەفە !؟ (٨)

---

وەصف کردنی موطریبیش بە (هودهود نەفەس) لەوەوە هاتووە کە پەپوە سلێمانە بە لەفز و گفتێکی شیرین لای سولەیماندا قسەی کردووە .

نیشانەی ئەوە کە مەبەست لە (موطریب) نالی خۆیەتی ، بەیتی چوارەمە و ، پەیوەندی نالی لەگەڵ سلێمان پاشا و ، هەستی شانازی بە خۆ کردنی کە هەمیشە دەری ئەخا و ، وەصف کردنی پەپوە سلێمانە بە (هودهود نەفەس) و ، بەراورد کردنی پەیوەندی نالی و سلێمان پاشا و ، حەزرەتی سولەیمان و ئەوکەسەی ئایەتی ( قال الذي عنده علم من الكتاب ) لێی ئەدوێ .

موطریبی (چر) و (خا) : موطریب و . (چن) و (مز) و (عب) و (اح) و (خب) : موطریب . بۆ (موطریب و) و (موطریبی)یش دەستئەدا . اخوان الصفا (خب) : ئیخوانی صەفا .

(٧) جام : پیاڵەی مەی . مەیکەدە : مەیخانە . میشکات : دەلاقەی نادیوەودەر کە چرای لیا دائەنرێ . قیندیل : چرا . قەرقەف : مەی . ڕەفرەف : ڕایەخی جوان . تەختانی پڕ لە گوڵ و سەوزێ .

واتە : پیاڵەی شەراب کە لە دەلاقەی نادیوەودەری مەیخانەدا دانراوێ ، ئەو تاقەیە کە چرای دڵی سەرخۆشانی لیا دائەنرێ . شیشەی پڕ لە شەرابیش لەسەر جیمەنی پڕ لە گوڵ و شینایێ ، شاهێکی پایە و ڕێ و شوێن بەرزە هەرچەند لەسەر زەویش دانراوە .

ئەم بەیتە تەنها لە نوسخەکانی (مم) و (گم)دا هەیە .

(٨) طەبع : تەبیعەت . نەشئە : سەرخۆشی . نیم نیگاه : لاچاو . ڕەحڕاح : زیانی خۆش . ڕاح : مەی . بەری دەست ، قەراح : ناوی سازگار .

واتە : نازانم نالی هەر لەخۆیەوە ئەمڕۆ تەبیعەتی توندە و قسەی تیژ و بەتوێکڵ ئەکا و لە چەند لاوە لێ هەڵچووە ، یاخود مەستی بە لاچاو ڕوانینی یارە بۆی ، وەك بڵێی شەرابی سازگاری لە دەستی یار وەرگرتبێ و خواردبێتیەوە .

— ١٠ —

کەوا زەڕتایی یەکتایی دەڵێی خورشیدی ئافاقە
مەڵێ خورشیدی ئافاقە ، بڵێ میهرێ کەوا تاقە (١)

ڕەیاحین پەرچەم و ، لالە کولاە و ، یاسەمەن طوڕڕە
بەنەفشە خاڵ و ، نەرگس چاو و ، گوڵ زار و سەمەن ساقە (٢)

---

کۆکردنەوەی ئەو هەموو وشانەی لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا لەپاڵ یەکدا ڕیز کراون ، هەر بۆ دەربڕینی دەسەڵات و وشەئارایییە نالی هێناونی .

یا (جر) و (لە) و (اح) و («پەراوێزی» خا) و (خب) : وا .

— ١٠ —

(١) زەڕتا : ئەوەی تاڵەکانی لە زێڕ بێ . یەکتایی : بێ‌بەر . خورشید : خۆر . ئافاق : جیهان . میهر : خۆر . تاق : تەنها . تاقە : قوماشێکی ئاوریشمی جوان بۆ جاران ئەیانکرد بە کەوا و لەبەر تیشکی خۆردا ئەبریسکایەوە .

واتە : یاری کەوا تاڵ زێڕین و تەنك و بێ‌بەر لە خۆری جیهان‌تاب ئەچێ کە تیشك بە گێتیدا ئەداتەوە . . نەخەیر مەڵێ لە خۆری جیهان‌تاب ئەچێ کە تیشك بە گێتیدا ئەداتەوە ، بڵێ خۆی خۆرێکی تاقانەیە هاوتای نییە ، یاخود بڵێ خۆرێکە کەوای تاقەی لەبەر کردووە .

هێنانی ( مەڵێ خورشیدی ئافاقە ) بەدوای ( دەڵێی خورشیدی ئافاقە )دا کە (ئیجاب) و (سەلب)یان پێکەوە بێ کۆکراوەتەوە ، پێی‌ئەڵێن (طباق السلب) . لە وشەی (تاقە)شدا ، وەکو مامۆستا عەلی موقبیل نووسیویە ، لەطافەت هەیە چونکە هەم مەعنای (تەنهایە) و هەم مەعنای (تاقە)ی قوماشیش ئەگەیەنێ . لە کۆکردنەوەی (دەڵێی) و (مەڵێ) و (بڵێ)یشدا جیناسی لاحیق هەیە .

زەڕتای (عم) و (کم) و (عب) : زەڕتاری . یەکتایی (کم) و (من) : یەکتابە . دەڵێی (کم) و (من) : ئەڵێی .

(٢) ڕەیاحین : جەمعی ڕەیحانە . پەرچەم : مووی سەر کە ئەنیشێتە سەر ناوچاوان . لالە : گوڵێکی سووری بەهارییە . کولاە : کڵاو . یاسەمەن : گوڵێکی بۆن‌خۆشە سپی و زەرد و شینی هەیە . طوڕڕە : مووی لولی

بنازم دلبەری خۆم چەندە پڕ وەصف و چ بێ عەیبە :
بە چاو مەست و ، بە دڵ هوشیار ، بە ئەبرۆ جوت و هەم تاقە ! (٣)

ئەوای ئاهەنگی ( قَدْ قامَتْ ) طەریقی جەمعی زوههادە
قەد و قامەت بە لەهجەی ڕاستی طوبایی عوششاقە (٤)

---

لەملا و ئەولای ناوچاوان . بەنەفشە : وەنەوشە . زار : دەم . سەمەن : یاسەمەن . یاخود لە سیمین وەرگیراوە واتە زیوین . ساق : پوز .

لە کۆکردنەوەی نـاری چەند ئەندامێکی لەش و ، چەند گوڵێکدا تەناسوب هەیە . نەرگسیش ، سەرەڕای مەعنای خۆیشی ، کینایەشە لە مەستی .

کولاە و (عم) : کلاو ر . نەرگس (کم) و (گم) و (من) : نێرگس . گوڵ زار و (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : گوڵ زار . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستنەدا . (خا) : گوڵ زاری . سەمەن (چن) : سیمین .

(٣) بنازم : شانازیی پێوە بکەم .

واتە : مایەی شانازیمە کەوا یارم ئەوەندە چاك و جوان و بێخەوشە ، بە چاو مەستە و بە دڵ هوشیارە ، برۆکانی لەلایەکەوە جوتن ، دوانن و ، لە لایەکی‌کەوە کەوانین وەك تاق و هیلالن .

وەصف و (خب) : وەصفە و .

(٤) ئەوا : ئاواز . ئاهەنگ : بەزم : قَدْ قامَتْ : ڕستەیەکە ، بەشێکە لە دوعایەکی تایبەتی بەر لـە دابەستنی نوێژی جەماعەت ئەخوێنرێ . طەریق : ڕێگا . زوهاد : جەمعی زاهیدە ، واتە ئەوەی دەستی لە دنیا داشۆریبێ . لەهجە : زمـان . طوبا : درەختی طوبـا کە درەختێکە لـە بەهەشتدا . عوششاق : جەمعی عاشقە واتە دلدار .

واتە : بۆ ئـەوانەی ڕێـگای خوایان گـرتووە و دەسـتیان لە دنیا داشۆردووە ، ڕێگا بریتیە لە ڕێگای گوێ‌گرتن لە ئاوازی بەزمی ( قَدْ قامَتِ الصَّلاة ) .. بـە زمانی ڕاستیش قەد و بـاڵای یار ، درەختی طوبای بەهەشتی دلدارانە لە سایەیدا بحەسێنەوە .

لە ( قـد قامت )دا ئیقتیباس و ، لەنێوان ( قد قامت ) و (قەد و قامەت)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لە کۆکردنەوەی (طەریق) و (زوهاد)دا تەناسوب هەیە چونکە (طەریقـە)ی تەصەووفیش هیی زاهیدانە . لە (طوبا)یشدا لەطافەت هەیە ، چونکە جگە لەو مەعنایەی وتمان ، مەعنای (خۆزگە) و (ئاوات)یش ئەگەیەنێ .

به زولفی تۆیە وابەستە ، لە من دڵ گەر پەرێشانە
بە ئەبرۆی تۆیە پەیوەستە ، ئەگەر طاقەت لە من تاقە (٥)

بە نەهری کەوثەر و شیر و عەسەل چەند تینووە صۆفی
لەبی « نالی » دوچەندان بۆ لەبانی لەعلی موشتاقە (٦)

---

(٥) وابەسـت : پێوە بەستراو و پەیوەندیدار . طـاقەت : توانا . تـاق : تەریك کەوتۆ .

واتە : من کە دڵم پەرێشـان و بڵاوە و لای خۆم نییە ، هیی ئەوەیە کە پەیوەندی بە زولفی پەرێشانی تۆوە هەیە و ، ئەو پەرێشانییەی لەوەوە بۆ هاتووە . کە توانا و تاقەتیشم نەماوە و لێم تەریك کەوتـووە ، هیـی ئەوەیە ، هەمـوی لەگەڵ برۆی پەیوەست و وەك تـاقی تۆ پەیوەست بووە .

نالی لەم بەیتـەدا شاکارێکی جوانی هونەریی داهێنـاوە . ئەوەتە (وابەست) و (پەرێشان) ی لە نیـوە بەیتی یەکەمدا بەکارهێناوە کە بـۆ (زولف) ئەگونجێـن و داونیەتە پاڵ (دڵ) . لە نیـوە بەیتی دوەمیشـدا (پەیوەست) و (تاق)ی بەکارهێناوە کە بۆ (برۆ) ئەگونجێن چونکە بەیەکەوە پەیوەستن و بـە جیا جیاش تـاق و وەك تاق وان و ، داونیـەتە پاڵ (تاقەت) .

لە کۆکردنەوەی (وابەستە) و (پەرێشـان) و ، (پەیوەسـت) و (تاق)دا طیباق و ، لەنێوان (زولف) و (زۆ)دا تەناسوب هەیە .

تۆیە ـ ی یەکەم ـ (چن) : تۆوە . لە من دڵ گەر (گم) : لە من گەر دڵ .
تۆیە ـ ی دوەم ـ (چن) و (عب) : تۆوە . ئەگەر طاقـەت لە من تاقە (مم) و (گم) و (خا) : لە من طاقەت ئەگەر تاقە (بێ گوێدانە ئەوە کە لە هەندێ نوسـخەدا تاقە بە طاقە نوسراوە) .

(٦) نەهر : جۆگا . کەوثەر : حەوزێکە لە بەهەشتدا . عەسەل : هەنگوین .

واتە : صـۆفی چەند لێنۆی ئاوی حەوزی کەوثەر و شیر و هەنگوینی بەهەشتە ، لێوی نالی دوو ئەوەندە موشـتاقی لێوی وەك لەعل سـوری یارە .

نالی وشـەی (لینـۆ)ی بۆ صۆفی بەکارهێناوە کـە (مادده پەرستی) ئەگەیەنێ ، کەچی بۆ خۆی کە عاشقە (موشتاق)ی بەکارهێناوە کە (گیان پەروەری) ئەگەیەنێ . بەمە بەراوردی لەنێوان خۆی یاخود دڵداران و

— ١١ —

به مەرگی خۆت قەسەم ، زاهید ، هەمۆ عومرت عوبۆرێکە
مەقام و مەنزلت ، ئاخر ، لەکن جەمعی قوبۆرێکە (١)

دلم بەردە ئەگەر شاخە ، بە چاوی شۆکی مەنوازێ
بەخۆڕایێ نەسۆتاوە ، ئەمیشە شێ کێوی طۆرێکە (٢)

---

سۆفیاندا کردووە و ، ویستویە ئەوەمان لێبگەیەنێ کەوا سۆفییەکان هەرچەند بەدیمەن خواپەرستن ، بەلام لەڕاستیدا بەدوای ماددەدا ئەگەڕێن و ، دلدارانیش هەرچەند بەدیمەن وێلی دوای هەوا و ئارەزۆی نەفسن ، بەلام لەڕاستیدا بەدوای ڕەحەتیی ڕۆحدا ئەگەڕێن ، کەواتە عیشقی ڕاستەقینە و خوایێ لای ئمانە نەك لای سۆفییەکان .

وردەکارییەکی‌تریش لەم بەیتەدا هەیە . لەنیوەی دۆهەمیا (لەب) و (لەبان) هەیە کە بە هەردۆ ئەبێ بە (لەب‌لەبان) واتە ماچ . لە لایەکی‌کەشەوە (لەبان) بە شێوەی نوسینی کۆنی (لبان) مەعنای شیر ئەگەیەنێ . ئەوەش شتێکی جوانە چونکە واتە : لێوی نالێ موشتاقی شیری لەعلی لێوی یارە ، کە وا ئەگەیەنێ منال چەند موحتاجی شیری مەمکی دایکیەتی ، ئەمیش ئەوەندە موشتاقی مژینی لێوی یارە .

بۆ (عم) : بەو . لەعلی : هەمۆ نوسخەکان ، (عم) نەبێ ، لەعل ، کە لەگەل (بۆ)دا بۆ (لەعلی) ئەگونجێ . (عم) : لەعلە . بۆ ئەم نوسخەیە ئەبێ هەر وا بێ چونکە لەجیاتی (بۆ) نوسیویە (بەو) .

— ١١ —

(١) عوبۆر : پەڕینەوە . قوبۆر : جەمعی قەبرە .

واتە : ئەی زاهیدی لەخۆبایێبو ! بە مەرگی خۆت قەسەم ، تەمەنت هەرچەند درێژیش بێت ، لەوە زیاتر نییە کە بازدان و پەڕینەوەیەکە لە سەردەمی پێش هاتنە دنیاوە بۆ ئەو دنیا .. ئارامگای دوایشت ئەبێ سەرەنجام لە گۆڕستانێکا بێ لەپال کۆمەلە گۆڕێکدا ..

لەنێوان (عوبۆر) و (قوبۆر)دا جیناسی لاحیق هەیە .

خۆت (چر) و (عم) و اکم) و (گم) و (ت) و (مز) و (عب) و (من) : تۆ . مەنزلت («پەراوێزی» چر) : مەرجیعت .

(٢) واتە : دلم ئەگەر بەردێکی بێبایەخ و هیچ و پوچ بێ ، با ئاخێکی

شوعاعی ڕۆت لە گەردنتدا دیارە دڵ دەسوتێنێ
بنازم بەم تەجەللایە ، چ خورشید و بلورێکە ! (٣)

لە خەڵوەت هاتەدەر سۆفێ ، گڵ و بەردی بەسەرما دا
مەکەن مەنعی لەبەر خەڵوە ، ئەویش تازە غورڕۆرێکە (٤)

---

سەخت و گەردەنکەش بێ ، هەرچۆن بێ بە سوك سەیری مەكە ، بەخۆڕایی و بێ هۆ نەسوتاوە ، هۆی سوتانی ئەوەیە ئەمیش ، وەك چۆن کێوی طور کەوتە بەر تەجەللای نوری خوا و سوتا ، کەوتووەتە بەر گڕی ئاگری عەشق . بۆیە دڵی منیش لەجیاتی ئەوەی بە چاوی سوك سەیری بکرێ ، شایانی ئەوەیە وەك کلەی کێوی طور چاوی پێ بڕێژرێ .

لە نیوەی دۆهەمی ئەم بەیتەدا حوسنی تەعلیل هەیە .

شاخە (عم) و (گم) : سوتا . مەنوازێ (عم) و (کم) و (گم) و (من) : مەنوازە .

(٣) شوعاع : تیشك .

واتە : تیشکی هەتاوی ڕۆت کە لە ئاوێنەی گەردنی وەك بلوورتا ئەدرەوشێتەوە ، دڵی دلداران ئەسوتێنێ . ماشەڵڵا لەم جوانییە ! ڕۆمەتت خورێکی چەند پرشنگدارە و گەردنت بلورێکی چەند بێ گەردە . .

هێنانی (خورشید) و (بلور) بەدوای (ڕۆ) و (گەردن)دا لەف و نەشری مورەتتەبە ، چونکە (خورشید) بۆ (ڕۆ) و (بلور)یش بۆ (گەردن) ئەگەڕێتەوە .

ڕۆت (چر) و (عب) : ڕۆی . دەسوتێنێ (کم) و (من) : ئەسوتێنێ .

(٤) خەڵوەت : گۆشەگیریی سۆفییانە کە ماوەیەك لە ژوورێکدا ئەمێننەوە و ناچنە دەرەوە . ئەوە جۆرە خواپەرستییەکی سۆفییانە . گڵ و بەرد : وادیارە مەبەست لێی ئەو گڵەتك و بەردانەیە کە سۆفی لەکاتی (خەتمە)دا لەجیاتی تەزبیح بەدەستیەوە ئەگرن .

واتە : سۆفیی بەدیمەن دەست لە دنیا هەڵگرتوو ، لە خەڵوەت خانەکەی هاتەدەر و گڵ و بەردەکەی دەستی دا بە سەرما و بە سوك سەیری کردم . . لێی مەگرن واتەکا ، تازە لە خەڵوەت هاتووەتەدەر ، خۆی لێ بایی بووە ، وائەزانێ ئەم دنیا لە خۆی بەولاوە کەسی تیا نییە و هەمو کەسێکی تری لا هیچە .

خەڵوەت (ت) و (ك) و (ح) : خەڵوە . سۆفێ (چر) و (چن) و (عم) و

غەمی چاوت لە چاومدا ، هەمی قەددت لە سینەمدا
لەبەر سستی و ضەعیفی ئەو خەویکە ، ئەم خوطوریکە ! (٥)

بە ظاهیر شادمانیمە لەبەر کەتمی هەمو دەردان
کە « نالی » گەر بنالینی ئەمیش نەشئە و سورووریکە (٦)

---

(کم) و (گم) و (عب) و (من) : زاهید . خەلوە (ت) : خەلوەت . ئەویش (چر) و (عم) و (کم) و (عب) و (من) : ئەمیش . (گم) : ئەمەش .

(٥) هەم : خەم . خوطور : خەیال .

واتە : خەم و خەفەتی دووریی چاوت لە چاوما نیگای کیشراوە و ، دەردی دووریی بالات لە سینەمدایە . ئەمە ئەختی دلم زەحمەت ئەکات ، چونکە وردەبەلە پەیوەندم لەگەلت پی پەیدا ئەکا . بەلام چەرخی رۆزگار ئەوەشم پی رەوا نابینی . لەوەتە لەبەر سستیی دل و بی هیزیی چاوم خەمی چاوەکەت وەك خەو بینین و دەردی دلەکەت وەك خەیالیکیان لی هاتووە لام و ، بەشی ئەوە ناکەن پییان بحەسیمەوە .

لە نیوە بەیتی دووەمدا ( سستی ) بۆ (دل) و (ضەعیفی) بۆ (چاو) ئەگەریتەوە و لەف و نەشری موشەووەشە . بەلام (ئەو خەویکە) بۆ (غەمی چاو) و (ئەم خوطوریکە) بۆ (هەمی قەددت) لەگەریتەوە و لەف و نەشری مورەتتەبە . لە کۆکردنەوەی (چاوت) و (چاوم)دا موقابەلە و جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (چاو) و (قەد) و (سینە) و (خەم) و (خوطورە)دا تەناسوب هەیە .

لە چاومدا ، هەمی ئەددت (کم) و (گم) و (من) : لە چاومدایە هیی قەددت . (مز) : لە چاومدا هەمی عەشقت .

(٦) واتە : من لەبەرئەوەی هەرچی خەم و بەزارە و دەردمە هەموی ئەخۆمەوە و هیچی دەرنابڕم ، وا دیمە پیش چاوی خەلك کە شادمان بم ، کەچی ناخی دەروونم پڕە لە مەینەت و ئازار . ئەمەش جۆرە ئەگبەتییەکە کە ناتوانم بنالینم ، چونکە لەگەر بیت و بتوانم بنالینم ، نالینەکەم ئەبیتە جۆرە شایی و خۆشییەك و کەمیك ئازارمی پی سوك ئەبی . بەلام کوا !!

لە کۆکردنەوەی (ظاهیر) و (کەتم)دا طیباق هەیە . وشەی (هەمو)یش هەلئەگری (هەمو)ی بە مەعنا (گشت) بی یا (هەم و ) بی واتە (هەم)ی بمەعنا خەم لەگەل ( و )ی عەطف . کەواتە لە (هەمو دەردان)دا لەطافەت

— ١٢ —

سەری هەر مۆی بەدەنم طەرزە تەمەنناییکە
گەردشی تۆکی سەرم دۆکەلی سەوداییکە (١)

وەرە سەر سەیری صەفاگاهی نەظەرگەی چاوم
کە عەجەب مەنظەرەیی سەیر و تەماشاییکە (٢)

---

هەیە . لە کۆکردنەوەی (نالین) و (نەشئە) و (سورزۆر)یشدا طیباق هەیە .
نەشئە و (عم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : شادیی و .

— ١٢ —

(١) طەرز : جۆر . تەمەننا : ئاوات . گەردش : سوڕانەوە . سەودا : عەشق.

وانە : هەزار جۆرە ئاوات لە دەرونما پەنگی خواردووەتەوە و هیچیم بۆ نایەتەدی ، بەجۆرێکم لێ هاتووە ئەتوانم بڵێم سەری هەر تاڵە مۆیەکی لەشم ئاواتێکی پێوەیە . هەر مۆیەکی سەرم کە لەجوڵێ بە ئەنێری دۆکەلی عەشقێکە لە کەللەما ئەیجوڵێنێ .

دیارە ئەم پارچە شیعرە بەرهەمی بارێکی دەرونیی زۆر سەخت و ماتەماویی نالییە .

سەری هەر مۆی (ت) و (اح) و («پەراوێزی» خا) و (خب) : هەر سەری مۆی . دۆکەلی (چن) : دۆکەلە . (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) و (خا) : هێلەکی .

(٢) صەفاگاە : جێگای ڕابواردن . نەظەرگە : دوورنما . مەنظەرە : جێگای تەماشا .

وانە : ئەوەندە دیمەنی جوان و سەیر کە لە ژیانما بە چاوی خۆم دیومن ، لە ناوچاوما وێنەیان کێشراوە ، چاوم بووە بە جێگای تەماشا و ڕابواردنێکی سەرسامکەر .. وەرە تەماشای کە بزانە چ دیمەنێك ئەبینێ . ئەشتوانرێ مەعنای بەیتەکە وا لێبدرێتەوە کە ئەوەندە فرمێسك لە چاوی ڕۆیشتووە ، چەند جۆرە گوڵ و گوڵزار لە چاویا ڕوواوە و بووە بە سەیرانگا و مەیدانی ڕابواردن .

سەیری : ئەمە تەنها بەپێی تێکستی (عم)ە . نوسخەکانی تر بەمجۆرەن: (چر) و (چن) و (عب) و (خب) : سەیر . بۆ مەعطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) و (خا) : سەیر و .

سۆزشێکی نەفەس و شۆرشی نائیی نایێ
هەریەکە نەوعە غینایێکە ، بە مەعنایێکە (۳)

حەلقە حەلقەی چەدەکەی داوی کەمەندی زولفت
بۆ دلی خەستە کەوا بەستەیی هەودایێکە ؟! (٤)

---

صەفاگاهی (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (عب) و (خا) و (خب) : صەفاگاه .
بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . (عم) و (گم) : صەفاگاه و .

(۳) سۆزش : سۆز . نەفەس : هەناسە . شۆرش : دەنگ و هەرا . نائێ :
دۆر . نای : شمشاڵ . غینا : غناء ، گورانێ .

واتە : سۆزی هەناسەی خەمباران و ئاوازی دۆری شمشاڵێك ،
هەریەکی جۆرە گۆرانییەکە . بەڵام هەردوکیان یەك مەعنایان هەیە .
هەردوکیان ، هەریەکە بە شێوەی خۆی ، دەردی دڵی ئادەمیزاد باس ئەکا .

ئەشکونجێ مەعنای (بە مەعنایێکە) وا لێ‌بدرێتەوە کەوا هەریەکی
مەعنایەکی تایبەتیی هەیە ، ئەویان شتێك ئەگەیەنێ و ئەمیان شتێکی‌تر .

هەرچۆن بێ لەنێوان (سۆزش) و (شۆرش)دا هاوئاوازییەکی جوان و ،
لەنێوان (نائێ) و (نایێ)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ناڵە) و (نای)دا
تەناسوب هەیە .

سۆزشێکی (کم) و (من) : سۆزشی . (خب) : شۆرشی . نائیی نایێ
(عم) و (گم) : نای و ناڵەی . (ت) : ناڵەی نایێ . (ك) : نایێ نائێ .

ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە نوسخەی (چر) و (عب)دا لەجێی
یەکتردان .

(٤) خەستە : نەخۆش . بەستە : بەستراو ، گیرۆدە . هەودا : تاڵی مۆ .

واتە : ئەوە خەریکی چیت ؟ بۆچی زولفت هەڵقە هەڵقە ئەکەیت و
داوی لێ دروست ئەکەی بۆ دڵی عاشقە بیمارەکان ؟ خۆ دڵی عاشقی
خەستە تەنها تاڵێکی مۆی زولفتی بەسە پێی گیر ببێ ، ئیتر بۆچێ خۆت
ماندۆ ئەکەی ؟!

لەنێوان ( خەستە ) و ( بەستە )دا جیناسی لاحیق هەیە .

حەلقە حەلقەی : ئەمە تێکستی (ت)یە . نوسخەکانی‌تر هەمۆ
نوسیویانە : حەلقە حەلقە . چەدەکەی («پەراوێزی» چر) و (ت) و (اح) و
(من) و (خا) : کە دەکەی . (کم) : کە ئەکەی .

هەردەمە فەرشی کەسێکی‌کەیە بێ مەهر و نیکاح
دوور لە چاکانی ، عەجەب فاحیشە دنیایێکە ! (٥)

« نالی » ئاسوودە نییە طوولی نەمامی عومرت
بە نەفەس دێت و دەچێت ، ئەصڵی لەسەر بایێکە (٦)

---

(٥) هەردەمە : هەرکاتێ . فەرش : ژێرەخەر . مەهر : مارەیی . نیکاح : مارەبڕین . فاحیشە : ئافرەتی داوێن پیس .

واتە : ئەم دنیای بێوەفایە هەر ڕۆژێ ژێرەخەری بەکێکی تازەیە بە ناحەق ئەکەوێتە ژێردەستی ، وەك ئافرەتی داوێن پیس کە بێمارەیی و مارەبڕین لەژێر هەرکەسێکا بیبەوێ ڕادەکشێ .. ئای لەم دنیایە ، دوور لە پیاو چاکەکانی ، دنیایەکی چەند بێناموس و داوێن پیسە !

فەرشی (عم) و (کم) : عیرسی . کەسێکی‌کەیە بێ مەهر و (چن) : کەسێکە کە بە بێ مەهر و .

(٦) طوول : درێژی . نەفەس : هەناسە .

واتە : ئازیز ! نالی بەدرێژیی عومری ئەتۆ و باراو و لاوی وەك نەمامی تۆ ناحەسێتەوە . تەنها بە هەناسە دێت و دەڕوا ، تەنها هەر هەناسەیەکی تیایە ، ئەگینا هیچ نیشانەیەکی‌تری ژیانی پێوە نییە ، ڕیشەی لەسەر ( با )یەك بەندە کە لای تۆوە بۆی بێت ، ئەگەر ئەو بایەی بۆ نەیەت هەناسەکەی خۆیشی نامێنێ .

( لەسەر بایەك وەستاوە ) یا ( لەسەر بایەك بەندە ) لە کوردیدا ڕستەیەکی کینایەیە لە بێگیانێ و نزیکی لە حالی گیانە؟ و مردن یا پیریەکی تەواو .

ڕێیشی لێ ئەچێ بەیتەکە خیطاب بێ لەگەڵ نالی خۆی و مەعنای بەمجۆرە لێك بدرێتەوە کەوا ئەی‌نالی ، تەمەنی بێهێزت بەدرێژایی خۆی ئاسوودە نییە . تەمەنت هەمۆ بریتییە لە هەناسەیەك دێ و دەچێ و لەسەر ئەو هەناسەیە وەستاوە ، کە وەستا عومرت تەواوە .

طوولی نەمامی (عم) و (کم) و (ت) : طوولە نەمامی . (ك) و (خا) : طوولی تەمامی . لەسەر (چر) : لەگەڵ .

— ١٣ —

شاهێنی دو چاوت کە نیگا و مەیلی بە دانگە
کێشانی بە قوللابی دلاوێزی بژانگە (١)

صۆفی و سەر و مێزەر ، من و زولف و سەر و دەسماڵ
من کوشتەیی لاجانگم و ، ئەو کوشتەیی جانگە (٢)

---

— ١٣ —

(١) شاهێن : لە فارسیدا (شاهین) میلی تەرازووە کە تاکانی تەرازووەکەی پێوە شۆڕ ئەکرێنەوە . لە دیالێکتی هەورامییشدا بە تەرازوو ئەڵێن : شایەن ، لێرەدا ئەم مەعنایە مەبەستە . پەلەوەرێکی ڕاو پێکردنە لە چەشنی هەڵۆ ، چاوی باری پێ ئەشوبهێنن لە توانای ڕاوکردنی دڵی دلدارانیدا . نیگا : بە لا ڕوانین . دانگ : بەشێك لە شتێك . کینایەیە لە کەمێ . قوللاب : قولاپ . دلاوێز : دڵ پیا هەڵواسراو . بژانگ : برژانگ .

واتە : تەرازوی چاوەکانت کە بەئاستەم نەبێ بەملا و بەولادا سەرناکەن و یەکێك لە دڕستان هەڵناوێرن بەسەر ئەوانیکەدا تا تۆزێك زیاتر بۆلای ئەو بڕوانن ؛ بە قولاپی دڵ پیا هەڵواسراوی برژانگەکانت کێشانە ئەکەن . مەبەستی ئەوەیە بڵێ دڵی دلداران لەناو چاوتان و بە قولاپی برژانگەکانت بەراوردیان ئەکەی تا بزانی کامیان لات خۆشەویستتر و قورسترە تۆزێ چاوی بەلادا لار بکەیتەوە .

نالی لە لایەکیکەشەوە مەعنای (ڕاوکەر)یشی لە وشەی (شاهێن) مەبەست بووە . بەمپێیە مەبەست لە (قولاپی برژانگ)یش چنگی شاهێنەکەیە کە چۆلەکەی دڵی دلداران ڕاو ئەکا و مەبەستیش لە ( کێشان ) ڕاوکردن و بەکێشکردنە . بەمجۆرەش مەعناکە هەر تەواوە .

نیگا و مەیلی بە دانگە (کم) و (من) : نیگاهێکی بە دەنگە . دیارە (بەدەنگە)کەی هەڵەیە . بژانگە : (چر) و (خا) : مژانگە . ئەگەر هەڵە نەبێ، بشێ پەیوەندێکی بە (موژگان)ەوە هەبێ ؟

(٢) لاجانگ : نێوانی چاو و گوێ .

واتە : سۆفی حەزی لە سەر و مێزەرە کە لفکەی مێزەرەکەی بە لاجانگیا بێتە خوارەوە و خۆی پێ بنوێنێ ، منیش ئارەزۆم لەوەیە

فەرمۆتە کە بانگم کە ، شەوێ ، دێمە کەنارت
قوربان ! وەرە شەو ڕۆیی ، ئەوا وەعدەیی بانگە (٣)

بنوێنە برۆ ، یەعنی هیلالی سەری ماهت
چون وەعدەیی ماچی سەری کولمت سەری مانگە (٤)

---

زولف و سەر و دەسماڵی یار ببینم بە لاجانگیا شۆڕ بۆبێتەوە . من کوشتەی لاجانگی نازدارانم و ئەویش کوشتەی ئەو جەنگی سەر لێشێواوییەیە کە لەخۆیەوە دەستی داوەتێ لەگەڵ هەرچییەکدا بەئارەزۆی دڵی نەبێ . یاخود من بە بێجەنگ لە مەیدانی دڵدا کوژراوم و ، ئەویش لە جەنگی ڕیاکاریدا کوژراوە کە دنیا و قیامەتی تیا لەکیس چووە .

لاجانگم و (چن) : لاجەنگم و .

(٣) کەنار : لا ، پاڵ . بانگ (ی دۆهەم) : بانگی سبەینان . بانگکردن .

واتە : ئازیز ! تۆ خۆت بەڵێنت دامێ ، وتت شەوێ بانگم کە ، دێمە لات .. دەفەرمۆ ، شەو وا بەسەرچۆ ؛ وەعدەی بانگی بەیانییە ؛ یا فەرمۆ ، وەرە ، وەعدەی بانگکردنەکەیە .

لەنێوان (بانگ)ی یەکەم و (بانگ)ی دۆهەمدا ـ کە بەمەعنا بانگدان بێ ـ جیناس و ئیشتیراك و ، لە (بانگ)ی دۆهەمیشدا لەطافەت هەیە .

وەعدەیی (عم) و (گم) و (عب) و (خا) و (خب) : وادەیی .

(٤) ماه : مانگ .

واتە : گفت دابۆمێ کەوا سەری مانگ ڕۆژۆی بێماچیم ئەشکێنێ و ماچم ئەدەیتێ . دەسا برۆی وەك مانگی یەکشەوەی ڕاسەری مانگی ڕۆمەڵت دەرخە ، بۆئەوەی بە دەرکەوتنی ، مانگ نوێ بێتەوە و ، وادەی ماچی لێوت بۆ من دابێ و ، منیش بە میوەی خۆش و بەڵام و زەرد و سۆری سەری کولمت بەربانگ بکەمەوە . ■

ئەمە مەگەر کاری نالی بێ لە یەك کاڵدا مانگی یەکشەوە و مانگی پێکەیشتو کۆبکاتەوە !

برۆ (عم) و (گم) و (خب) : برۆت . کولمت (چر) و (عم) و (گم) و (ت) و (عب) و (خا) و (خب) : ماهت .

■ هیچ ئیشارەی بۆ ڕۆژوو و بەربانگ کردنەوە و میوە تیدا نیە .

« نالی » مەکە ، تۆرا بو ، لەبەر جەبهەیی گرژت
نایێتە ئەلات ، عیجزی لەبەر دۆکەڵی قانگە (٥)

— ١٤ —

بنوارە وشکە صۆفی‌یو ڕەقصی بە هەلهەلە
دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ‌مەلە (١)

---

(٥) مەکە : وازبێنە . بێ‌دەنگ بە . لومــەز . تۆرا : تۆرە ، باخــود لەگەڵ (بو)رەکەی پاشەوەیدا پێکەوە (تۆرابو)ن . جەبهە : ناوچاوان . عیجز : عاجزی . قانگ : دۆکەڵی پەنگ خواردووەوە .

واتە : نالی ، بێ‌دەنگ بە وازبێنە ، یــار تۆرە بووە یاخــود تۆراوە ، لەداخی ناوچاوی گرژ و مۆنت نایەتە لات ، لە دۆکەڵی هەناسـەی ساردی لە سینەدا قانگ دراو و پەنگ خواردووەوەت پەست و بێزارە .

مەکە (ك) و (عب) و (خا) : هەکە ، واتە : هاکا .

ئەم بەیتە لە (ت) و (عب) و (اح)دا نییە .

— ١٤ —

(١) وشکە صۆفی: ئەو جۆرە صۆفییانەی کە مەسـەلەی ئایینیان بە شێوەیەکی زۆر وشك گرتووە و لەئاسـتی سادەترین ڕابواردنی حـەڵالدا چاوپۆشی پیشان نادەن . هەلهەلە : هــەلەلە ، قریوە کردن . هــەوا : ئاسمان . ئارەزۆبازی . پێ‌مەلە : جۆرێکە لە جۆرەکانی مەلە ، ئاوی زیاتر بە پێ یا لە ژێ لائەدری .

واتە : سەیری وشکە صۆفی بکە چۆن لەزێی خـۆی لای‌داوە و ، بە قریوە کێشانەوە کەوتووەتە سەماکردن و لـە دەریای وشـك و بێ‌ئاوی ئاسمانا ( کە هەوای نەفس و ئارەزۆبازییە ) کەوتووەتە پێ مەلەکردن . ڕستەکە گشتی کینایەیە لە کاری ناوەخت کە مەرجە پێویستەکانی دیار نەبن و لە یەکنەکەوتنی کردار و گوفتار .

لە کۆکردنەوەی ( ڕەقص ) و ( هەلهەلـە )دا تەناسـوب و ، لەنێوان (بەحر) و (وشك) و ، (بەحر) و (هەوا)دا طیباق و ، لەنێوان (بەحر) و ( پێ‌مەلە )دا تەناسوب و لە ( هەوا )دا لەطافەت هەیە .

ئەم ئەرضە مەزرەعەی عەمەلە و کولخەنی ئەمەل
هەندی بووە بە مەسجید و ، هەلدی بە مەزبەلە (۲)

شێخم ، چ گەرمە حەلقەیی ذیکرت بە زەشبەلەك !
حالی ئەمانە خۆ بە جەنابت موحەووەلە ! (۳)

---

(۲) مەزرەعە : کێڵگە . دێمەر . عەمەل : کار . کولخەن : تونی حەمـام . ئەمەل : هیوا . مەسجید : مزگەوت . مەزبەلە : شوێنی ڕێژتنی پل و پۆش و پیـسایی ناومال .

واتە : ئەم جیهانە شوێنی کردەوەیـە و بنیادەم تەنیا بـە کردەوە تیا سەرنەکەوێ و ، بۆ هیوا و ئاواتی زۆت وەك تونی حەمام وایە ، چۆن ئەو هەرچیی لێبخەی ئەسوتێ ، ئەمیش هەمو ئاوات و هیوایەکی تیـا ئەبێ بە هیچ ، وەك چۆن ئەو شوێنەی بە نیازی پاکەوە خواپەرستیی تیا بکرێ ئەبێ بە مزگەوت و بـیرۆز و بەڕێز و ، ئـەو شـوێنەی پیـسایی مالانی لێ بڕێژرێ ئەبێ بە سەلوێنك و مەگەر هەر سـەگ و پشـیلە مۆشەی تیا بکەن .

لەنێوان ( عەمەل ) و ( ئەمـەل )دا جیناسـی موضـاریع و ، لەنێوان ( مەزرەعە )دا کە بۆژانەوە و پێگەیشتن و ژیان ئەگەیەنێ و ( کولخەن ) کە مانای سوتان و نەمان ئەبەخشێ ، هەروەها لەنێـوان ( مەسجید ) و ( مەزبەلە )دا کە ئەمیان واتای خاوێنێ و ئەویـان واتای پیسـێ ئەدا ، طیباق هەیە . لەم بەیتەدا لەف و نەشری مورەتتەبیش هەیـە ، چونکە ( مەسجید ) بەرابەر بە ( مەزرەعەی عەمـەل ) و ( مەزبەلە ) بەرابەر بە ( کولخەنی ئەمەل )ە .

مەسجید («پەراوێزی» چر) و (ت) و (عب) : مزگت . هەنـدی (چن) و (ت) و (مز) : بەعضی .

(۳) شێخ : شێخی طەریقەت . لە کوردستانی سەردەمی نالیـدا طەریقەتی نەقشبەندێ و قادرێ بووە و ئیـستاش هەن . حەلقەیی ذیکر : کۆبوونەوەی دەروێشی قادرێ یا صوفیی نەقشبەندێ بـۆ ناوهێنان و یادکردنەوەی خوا . زەشبەلەك : هەلپـەڕکێی پێکـەوەی پیـاو و ژن . حال : حال لێهاتن ، وەزعێکی تایبەتییە بەسـەر دەروێش و صوفیدا دێت و جڵەوی خۆیانیان تیا لەدەست دەرئەچێ . تێکڕای بار و وەزع . موحـەووەل : سـپاردە .

دائیم لەدوَیە مێگەلی ژن ، نێرگەلی پیاو
بەم ڕیشەوە لەپێشەوە بۆگی بە سەرگەلە ! (٤)

---

هەمیشە تاقمێ شێخی درۆزن لە کوردستانا بوون ، بەپێچەوانەی پێڕەوی ڕاستەقینەی شەرع و طەریقەتەوە ، دروشمی خواپەرستێ و شێخیەتییان بۆ سودی تایبەتیی خۆیان بەکارهێناوە و ، بە ناوی حاڵ لێهاتن و شتیواوە گەلێ کاری ناشەرعییان کردووە ، وەك کۆکردنەوەی ژن و پیاوی نامەحرەم پێکەوە و ، مەلاکانیش هەمیشە دژی ئەوە بوون . نالی لەم بەیتەدا گاڵتە بەوجۆرە شێخانە ئەکا و ئەڵێ : یاشێخ ! حەلقەی ذیکرت بەهۆی ڕەشبەڵەك و کۆبونەوەی ژن و پیاوەوە بەناو بۆ خواپەرستێ و لەڕاستیدا بۆ ڕابواردن ، زۆر گەرمە . دیارە وەزعی ئەم ژن و پیاوە ڕەشبەڵەككەرانەش بەدەست خۆتە و ، خۆت ئەزانێ چییان لێئەکەی ، هەرکەس بەپێی لێهاتنی و ئەوەی بۆی ئەشێ ! . یاخود خۆت بەرپرسیاریانێ لای خوا وا گومڕات کردن و لە خشتەت بردن !

حالی (ت) : ئیشی . خۆ (مز) : هەم .

(٤) مێگەل : ڕانی بزن و مەڕ . لێرەدا مەبەست کۆمەلی مێینەیە . نێرگەل: کۆمەلی نێر . سەرگەلە : ئەو حەیوانەی لەپێشی ڕانەوە ئەڕوا کە سابرێنێکی ڕیش درێژە .

واتە : یاشێخ ! هەمیشە کۆمەلێ ژن و پیاوت شوێنکەوتون کە ئەوەندە نەفامن ئەڵێی مەر و بزنن . خۆیشت بە کوڵێ ڕیشەوە وەك سابرێنی سەرگەلە کەوتویتە پێشیان و ئەوەندەش تێنەگەیشتوی نازانی بۆ کوێیان ئەبەیت .

لە کوردیدا وشەی ( مێگەل ) بۆ کۆمەلی مەڕ و بزن ، چ نێر چ مێ ، بەکاردێ. ئەوەندەی ئێمە ئاگامان لێ بێ ، هەر نالییە وا بۆ یەکەمجار بۆ (کۆمەلی ئافرەت)ی بەکارهێناوە و ویستویەتی ئافرەتەکان لە نەفامێ و فەقیریدا بشوبهێنێ بە مەڕ. (نێرگەل)یش کە لە بەرابەری ( مێگەل )یەوە بەکارهێناوە ، نەمانبیستوە کەس پێش ئەو بەکاریهێنابێ . دیارە ویستویەتی ، سەرەڕای قنجکردنەوەی لەئاستی ( مێگەل )دا ، لە گەلێ ڕووەوە ئیشارەتی پێ بکا بۆ (نێرگەلە) و لە دوای شێخەوە بیخاتە ڕێ..

نێرگەلی (چن) و (گم) و (من) و (ك) و (عب) : نێرگەلەی . بەم (عم) و (ت) و (مز) و (عب) و (خب) : بەو .

دنیا مەحەللی کەون و فەسادێکە ، حیز و دوون
مەعلومە چەن بەحیلەیە ، عەییارە ، چەند دەڵە ! (٥)

تۆ شێخ و ئەو عەجوزە ، عەجەب دۆستی یەکترن !
بێ شاهید و نیکاحە دیارە موعامەلە .. (٦)

«نالی» ! سەرت لە گونبەدەکەی خانەقا دەکا
لایێ پڕە لە مەشعەلە ، لایێ      لە مەشخەلە .. (٧)

---

(٥) مەحەلل : شوێن . کەون : بوون . فەساد : خراپ بوون و فەوتان . دوون : بێبایەخ . عەییار : فێڵباز . دەڵ : مێچکە مێچکەکەر بۆ ئەم و ئەو . دەڵە سەگ کە لەکاتی دەڵەبەبادا گەماڵ وەك ڕەوگ ئەکەونە دوای. (دەلە) لە فارسیدا بە ژنی فێڵبازیش ئەوترێ .

واتە : لەم جیهانە بەقای بۆ کەس نییە ، شوێنی لیا پەیدابوون و فەوتانە . چیی لیا پەیدا بێ ، پاشان ئەفەوتێ . شتێکی هیچ و پووچ و بێبایەخە وەك دەڵەسەگ وایە گەماڵ شوێنی کەوتبن ، فێڵباز و تەڵەکەچییە ، بنیادەم ئاگای لە خۆی ئەبێ لە خشتەی ئەبا .

حیز و دوون (چر): حەیزەبوون کە بە عەرەبێ واتە پیرەژن .(«پەراوێز»)ی چر) : حیزە ، دوون . (کم) و (گم) و (لد) و (اح) و (من) و (خـا) : خیرە ، دوون . خیرە بە فارسی واتە کەللەڕەق و یاخی و بێشەرم و هیچ و پووچ . بەحیلە ( « پەراوێزی » چر ) و (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) و (خـا) و (خب) : موحیللـە . واتە حەرام حەڵاڵکەرە .

(٦) واتە : یاشێخ ! تو شێخی و ( شێخ )یش واتە پیر و ، دنیاش کۆنە وەك پیرەژنی بەساڵاچوو . هەردوو کەوتوونەتە یەك و دەستتان خستووەتە دەستی یەك .. دیارە ئەم کارەی تۆ کردووتە کە لەجیاتی ئەوەی لەم ئاخری عومرەدا بگەڕێیتەوە و تۆبەیەکی پاك بکەی ، دەستت خستووەتە دەستی کۆنە داوێن پیسێکی وەك دنیا ـ بێ ئاگاداریی کەس بووە و ، بە حەرام بوون بە هاوسەری یەك و شایەت و مارەبڕین لەئارادا نییە .

تۆ شێخ و .. تاد (چر) :

تو شێخ و ئەو عەجوزەوو دەستی دەکێشیی

نیکاحە : لەمە لێکستی (کم) و (گم) و (من)ە . نوسخەکانیتر : (نیکاح) . دیارە هەڵەکە هیی شێوەی نووسینەوەیە ، ئەگینا لەمانیشدا هەر ( نیکاحە )یە .

(٧) گونبەد : گومەز . خانەقا : جێگای خواپەرستیی پەیڕەوانی تەریقەتی

— ١٥ —

شکەنجی عەرض و طوڵی پێچی زوڵفت بۆ سەرەنجامە
مەئەل طوڵی ئەمەل ، عومری خضر ، زنجیری سەودامە (١)

نەقشبەندێ . مەشعەلە : چرا . شەمعدان . مەشغەلە : سەرقاڵی و هەرا و ئاشوب .

واتە : ناڵی سەرت وەك گومەزەکەی خانەقای لێ هاتووە ، لەلایەکەوە پڕە لە چرا و چراخان و شەمعی خۆشەویستی و دڵداری و بیری ڕوون . لە لایەکی کەشەوە پڕە لە هەرا و ئاژاوە و سەری خۆ قاڵکردن بە زۆر هەڵماڵینی ئەم و ئەو و دەرخستنی ناڕاستییان و،بەمە ئاژاوە و هەرا لەناو خەڵکا ئەنێتەوە ، چونکە قسەکانت لەوانە نین بە مێشکی هەمو کەسێکا بچن و هەموان لێی حاڵی ببن .

بشێ مەبەست لەوشەی (خانەقا) لەم‌بەیتەدا خانەقای مەولانا بێ و ، نیشانەی پەیوەندێك بێ لەنێوان (خانەقای مەولانا) و ئەو شێخەدا کە ناڵی قسەی لێ ئەکا ؟!

دەکا (کم) و (من) : ئەکا . (مز) و (عب) و (خب) : دەچێ . مەشعەلە (چر) و (کم) : مەشغەلە . مەشغەلە (چر) و (کم) : مەشعەلە .

٥

— ١٥ —

(١) شکەنج : ئاڵۆزی و باخواردن و شکانەوەی زوڵف . عەرض : پانایی . طوڵ : درێژی . سەودا : عەشق .

واتە : ئاڵۆزی و باخواردنی زوڵفی پێچ پێچت بەلای پانی و درێژیدا ، شتێکە بنیادەم سەری لێ دەرناچێ و ناگاتە ئەنجامێك لەبارەیەوە . بەڵام منیش هیوام لا نابڕێ و هەمیشە هەر بە تەمای ئەوەم شتێکم لەم‌ڕووەوە دەسگیر ببێ و ، چونکە بنیادەم تا ئەمرێ ئومێدی هەر زۆرتر ئەبێ ، ئەگەر عومری حەزرەتی خضریشم بدرێتێ ، کە ئەڵێن تا قیامەت ئەژێ ، کەڵکەڵەی ئەم هیوایە وەك زەنجیر هەر ئەمبەستێ بەخۆیەوە و لە کەڵلەم دەرناچێ .

ئەشکونجێ مەعنای بەیتەکە بەم‌جۆرە لێك‌بدرێتەوە کەوا ئەم ئازار و سزایەی لە بادانی زوڵفی پێچ پێچتەوە بە باری پانی و درێژیدا تووشم ئەبێ ، بڕانەوەی نییە ، وەك چۆن هیوای ئادەمیزاد و عومری حەزرەتی

به شەڕ هاتن ڕەقیب و موددەعی ، من خۆشی خۆشیمە
کە دەعوایە ، لە هەر لایە بکوژرێ سوودی ئیسلامە (۲)

ئیشارەم کردە ئەبرۆی ، یەعنی : میحرابت کەچە ، فەرمووی :
ئەمە قیبلەی تەمامی عالەمە ، جێی جیلوە ئیمامە (۳)

---

خضر و زنجیری عەشقی تۆ کە منی پێ گیرۆدە بووم ، ئەوەندە دوور و درێژن وەك بڵێی بڕانەوەیان نەبێ .

بەپێی مەعنای پێشوو ڕستەی ( عومری خضر ) لەطانەلی تیا نەبێ ، چونکە ئیشارەتە بۆ عومری حەزرەتی خضر پێغەمبەر و ، ئالیش ناوی ( خلر ) بووە .

زولفت (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : زولفی . مەثەل : (چر) و (کم) و (عب) و (من) و (خا) : بەڵێ . (گم) : وەکوو !

(۲) موددەعی : ئەوەی لەخۆیەوە ئیددیعای خۆشەویستیی یار ئەکا و بەدرۆ خۆی پیا هەڵئەواسێ . دەعوا : هەرا .

وانە : بەدکاری ناحەز و خۆ هەڵپەسێنەری درۆزن بۆ بە شەڕیان لەسەر خۆشەویستیی یار ، کە یاریش لەڕاستیدا هیچیانی خۆش‌ناوێ و یاری ئێمەیە . من خۆشی خۆشیمە کەوا ئەوان هەردوکیان لەناو خۆیانا هەرایانە، هەر کامیان بکوژرێ سوودی ئێمەیە کە دڵداری ڕاستین، چونکە وەك چۆن دوو کافر لەبەینی خۆیانا ببێ بەهەرایان ، سوودی ئیسلامە ، لەبەرئەوە کە هەر کامیان لەناوبچێ ، بەش‌بەحالی ئیسلام کافرێ کەم بووەتەوە ــ بەگژی‌یەکاچوونی ئەمانیش سوودی ئێمەیە .

(۳) کەچ : لار . تەمام : هەموو . ڕاست . جیلوە : دەرکەوتن . ئیما : ئیشارەت .

وانە : ئیشارەتم کردە برۆی یار ، تێم گەیاند کەوا برۆکانی لارن و ، یاریش لە وەڵامدا فەرمووی بەڵێ ڕاستە برۆم لارە ، بەڵام قیبلەی ڕاستەقینەی هەموو خەڵکی جیهانە و ، جێی دەرکەوتنی ئیشارەت کردنمە بۆ دڵدارانم ، کە ئیشارەت بۆ یەکێکیان بکەم لە برۆمەوە دەرئەکەوێ .

ئەشکونجێ مەعنای ( جێی جیلوەی ئیمامە ) ئەوەبێ کە : دەرکەوتنی پێش‌نوێژە ، کە چاومە . دیارە چاو لە ناوەند دەرئەکەوێ و برۆ وەك میحرابی مزگەوت وایە .

له سایەی زۆری تۆوە شامی خەڵقی طەلْعەتی صوبحە
له شامی زولفی تۆوە صوبحی ئێمە ظولمەتی شامە (٤)

---

له وشەی ( تەمام )دا لەطافەت هەیە ، چونکە مەعنای ( هەمو )یش و مەعنای (ڕاست)ی بەرابەری (کەچ)یش ئەگەیەنێ .

له وشەی ( ئیما )شدا کە لەگەڵ ضەمیری موتەکەللیمی (م) و ضەمیری غائیبی ( ە ) یەکخراوە و بوون بە ( ئیمامە ) ، ئیشارەتێك بۆ وشەی ( ئیمام ) پێکهاتووە کە واتە پێشنوێژ و ، تالێ گەیاندنی مەعناکەشی مەبەست بووە و ، لەگەڵ ( میحراب ) و ( قیبلە ) و (عالەم )دا تەناسوبیان لەنێواندایە .

میحرابت کەچە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : میحرابی کەچی . بەم‌پێیە ئەگونجێ (کەچی) صیفەتی (میحرابی) بێ و ئەشگونجێ وەڵام بێ . تەمامی (عم) و (گم) : تەواوی .

جێی جیلوەی (چن) و (عم) و (گم) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : جێ جیلوەی . (کم): جێی سوجدەی . (من) : جێ سوجدەیی . (ت) : میحرابی . ئیمامە ــ بەمەعنا : ئیشارەتمە ــ ( چن ) و ( عب ) : ئیمامە ــ بەمەعنا : پێشنوێژە ــ . (من) : عامە .

(٤) سایە : سێبەر . شام : ئێوارە . طەلْعەت : هەڵاتن . ظولمەت : تاریکی .

واتە : بەهۆی زۆری ورشەداری تۆوە کە ئاراستەی خەڵکی ئەکەی ، خۆراوایان وەك کاتی خۆرهەڵاتنی لێ هاتووە ، وا ڕۆشن بووەتەوە . بەهۆی زولفی ڕەشیشتەوە کە ڕۆژی لێمان پێ ئەشاریتەوە ، سبەینانی ئێمە بووە بە تاریکە شەو .

له بەکارهێنانی وشەی ( سایە )دا زیادەڕۆوییەکی جوان هەیە . ئەوەتە ئەڵێ : ڕۆژی تۆ ئەوەندە ڕۆناك و ڕۆناككەرەوەیە ، تەنانەت سێبەرەکەشی کە بکەوێتە سەر شوێنێك دنیا وا ڕۆشن ئەکاتەوە ، وەك خۆر هەڵاتبێ . جا نەخوازەڵا ئەگەر خۆی ئاراستەی شوێنێك یا کەسێك بکرێ !

لەنێوان ( ڕۆ ) و ( زولف )دا تەناسوب و ، لەنێوان ( طەلْعەت ) و (ظولمەت) و ، (صوبح) و (شام)دا طیباق هەیە .

له سایەی (گم) : له صوبحی . تۆوە ــ له هەردو نیوە بەیتەکەدا ــ (عم) : تۆیە . شامە (من) : عامە .

لە ئاب و تاب و ئەشك و ئاهی خۆمدا بۆم بە بوریانی
لەباتیی پوختەگی سوتام و ئیستەش پێم دەڵێ : خامە (٥)

نیشانەی پوختەگی بێ‌دەنگیە «نالی» ! ئەگەر پوختەی
بە حوججەت طەی بکە نامە ، بە حیددەت پەی بکە خامە (٦)

---

(٥) ئاب : ئاو . تاب : تاو ، گەرما . ئەشك : فرمێسك . ئاه : هەناسەی دەردەدار . بوریانی : لاشەی سوورەوە کراو لە تەنوردا پاش کوڵاندنی . پوختەگی : کوڵان . خام : کاڵ ، نەبرژاو ، پێنەگەیشتو .

واتە : وەك چۆن کە گۆشت ئەکوڵێنن ئاگری بۆ ئەکەنەوە و ئاوی بۆ ئەنێنە سەر و خوێی تێ ئەکەن و فوی بۆ لەکەن لە ئاگر ، منیش لەناو ئاوی سوێری فرمێسکدا و لەسەر ئاگری گڕی دەروون و بە ئاگر خۆش‌کردنی هەناسە هەڵکێشانی خۆم ، لەجیاتیی کوڵان سوتاشم ، کەچی ئێستاش وا یار پێم ئەڵێ : هێشتا کاڵە و پێنەگەیشتووە ، واتە شارەزای دەردی دڵ نەبوە و تازە کارە ، یاخود گۆشتی کاڵە . . .

ئاب و تاب و (چن) و (ك) و (اح) و (خب) : ئاب و تاب . مەطلەبش و نیضافەش هەڵئەگرێ . (مم) : ئاب و تابی . سوتام و (خب) : سوتاوم و ئێستەش (چن) و (مم) و (کم) و (ك) و (اح) و (من) : ئێستەیش . (گم) : هێشتا . دەڵێ (کم) و (من) : ئەڵێ .

(٦) پوختەگی : پوختەیی . کوڵان . حوججەت : بەڵگە . هێز . توند . طەی : پێچانەوە . حیددەت : تیژ . پەی‌کردن : بڕین . خامە : قەڵەم .

واتە : نیشانەی پوختەیی ، یاخود نیشانەی کوڵان لەسەر ئاگری عەشق ، ئەوەتە بنیادەم بێ‌دەنگ بێ و مل‌کەچ بکا . جا ، نالیا ! ئەگەر تۆیش پوخت و بێ‌گەردی و لەسەر ئاگری عەشق بەتەواوی کوڵاوی ، مل کەچ کە و بێ‌دەنگ بە و ، لەجیاتیی دەربڕینی نازەزایی و وتنی شیعری ڕاز و گلەیی ، کاغەزی شیعرت توند بپێچەرەوە و بیخەرە باخەڵ و قەڵەمەکەت ببڕەوە و بیشکێنە و جارێ‌تر لەبارەی بێ‌ڕەحمیی یارەوە نە هیچ بڵێ و نە هیچ بنوسە .

لەنێوان (حوججەت) و (حیددەت)دا هاوئاوازییەکی جوان و ، لەنێوان (طەی) و (پەی)دا جیناسی لاحیق هەیە .

— ١٦ —

سەودازەدەکەی زولفت ، ئەزهاری لەکن پەشمە
دوور لەو گوڵە بێخارە ، گولزاری لەکن پەشمە (١)

سۆفی کە گرانبارە ، بێمەغز و سەبوكبارە
سۆفپۆشی غەمی بارە ، ئەوباری لەکن پەشمە (٢)

---

— ١٦ —

(١) سەودازەدە : ئەوەی دەردی عەشق لێیدابێ . ئەزهار : جەمعی زەهرە واتە گوڵ . پەشم : هیچ و پووچ . خار : دڕك .

واتە : ئەوکەسەی گیرۆدەی دەردی خۆشەویستیی زولفی ڕەشی تۆ بووبێ ، گوڵی زەرد و سووری لا هیچ و پوچە و ، مادەم لای گوڵی بێدڕکی ڕووی تۆدا نەبێ ، گولزاری بەلاوە بێبایەخە .

لەنێوان (گوڵ) و (خار)دا طیباق هەیە .

زولفت (لە) : خاڵت . ئەزهاری (چر) : ئیظهاری ، واتە دەربڕینی خۆشەویستییەکەی . بێخارە (کم) و (من) : یەعنی ڕۆ . (ك) : بێچارە . بەمپێیە ئەم وشەیە پەیوەندی بە ڕستەکەی پاشەوەیەوە نەبێ .

(٢) بێمەغز : بێمێشك و لێنەگەیشتوو . گرانبار : بار قورس . سەبوكبار : بارسووك . کینایەیە لە بنیادەمی پووش و هیچوپووچ کە شتێك نەبێ مێشکی پێوە خەریك بکا . سۆفپۆش : کەسێ بەرگی خوریی لەبەرکردبێ . ئەوبار : جەمعی وەبەرە واتە کورك .

واتە : سۆفی کە ڕیش و مێزەرە و تەزبیحێکی گەورەی هەڵگرتووە و باری خۆی پێ قورس کردووە ، لەڕاستیدا کابرایەکی بێمێشك و بێکارە . ئەو خوریی پۆشەی کە باری خەمی بەسەر شانەوە بێ و بیربکاتەوە، گوێ بە کورك و خوریی نادا و ئەو جۆرە شتانەی بەلاوە هیچ و بێئایە و مایەیە .

سۆفپۆشی غەمیبارە (چر) و (خا) : سۆفپۆشەوو غەمبارە . (چن) : سۆفپۆش و غەمی بارە . (عم) و (گم) : سۆفپۆشی غەمی بارە. (کم) و (من) : سۆفپۆش و هەمبارە . (ت) : سۆفپۆش غەمبارە . (ك) و (اح) : سۆفپۆشە هەمبارە .

دێوانە کە شەیدا بێ ، تـوکی سەری سەودا بێ ،
قەط هیچی لەسەر نابێ ، دەستاری لەکن پەشمە (٣)

سینەی دڵی بێ‌کینە ، صافە وەکو ئاینە
مەستـورە بە پەشمینە ، ئەسراری لەکن پەشمە (٤)

---

(٣) دەستار : مێزەر .

واتە : دێوانە کە گرفتاری دەردی دڵ بێ و عاشق بێ و مەشق تەنانەت گەیشتبێتە توکی سەریشی و ڕووتاندبێتیەوە ، هیچی نابێ دایپۆشێ و هیچیش نانێتە سەری و مێزەریشی بەلاوە قسەی تۆزە .. تەنها ئەوانەن گوێ بە دیمەن ئەدەن ، کە لەڕاستییەوە دوورن و پێویستیان بە شاردنەوەی کون و کەلەبەر و نالەواویی خۆیان هەیە .

لە ڕستەی ( قەط هیچی لەسەر نابێ )دا مەعنایەکی ناسکیش هەیە ، ئەوەتە : تەنانەت ئەگەر (هیچ)یش بکاتە سەری ، کە دیارە (هیچ) هیچ نییە تا بکرێتە سەر ، مێزەر هەر ناکاتە سەری !

هاوئاوازییەکی جوان لەنێوان ( شەیدا بێ ) و (سەودا بێ) و ( لەسەر نابێ )دا هەیە .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (عب)دا بەمجۆرەیە :

**توکی سەری شەیدا بێ ، دێوانە کە ڕسوا بێ**

(٤) واتە : ئەو سینەیەی کە دڵی بێ‌کینەی تیابێ ، وەك ئاوێنە صاف و خاوێن و بێ‌گەردە ، تەنها پارچە قوماشێکی خوریی بەسەرەوەیە دایپۆشیوە ، هیچ ڕازێك لە کەس ناشارێتەوە و جێگەی فرت‌وفێڵ و پیلان نانەوە نییە ، ڕازداریی بەلاوە کارێکی هیچ و پوچە ، ئارەزوی ئەوەیە بەئاشکرا و بێ‌پێچ‌وپەنا مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکا .

لەنێوان (سینە) و (کینە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ئەم دوانە و (ئاینە) و (پەشمینە)دا هاوئاوازییەکی ناسك و جوان هەیە . لەنێوان (مەستورە بە پەشمینە) و (ئەسراری لەکن پەشمە)شدا جۆرە طیباقێکی جوانی مەعنا هەیە .

صافە : (ت) و (ك) و (اح) و (عب) : صافێ . ئاینە (چر) و (هم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : ئاوێنە .

عاشق کە دەکا ڕاوی ، ظولماتی شەوە داوی
موژگانی تەڕە چاوی ، بێداریی لەکن پەشمە (٥)

صۆفی ! چییە ئیشی تۆ ؟ هەر کایە حەشیشی تۆ !
عاشق وەکو ڕیشی تۆ ، هەوساری لەکن پەشمە (٦)

چەن واسیعە ئەم ذیهنە ، ئەفلاکی تیا ڕەهنە
ئەجبالی لە لا عیهنە ، ئەدواری لەکن پەشمە (٧)

---

(٥) واتە : دلدار کە ئەیەوێ باری خۆی دەسگیر بێ و ڕاوی بکا ، تاریکیی شەو ئەکا بە داو و ئەیەوێ بەهۆی تاریکییەوە دەستی پێبکا . مەسەلەی شەونوخونیی بەلاوە شتێکی ئاسانە و لەوە ناترسێ کە خەو ڕێگای لێ بگرێ ، چونکە برژانگی هەمیشە تەڕی فرمێسکە و ، کەسێکیش کە برژانگی تەڕ بێ خەو ناچێتە چاوی .
دەکا (کم) و (من) : ئەکا .

(٦) کایە حەشیش : ئەوەی خەریکی کاری هیچ و پووچ بێ . هەوسار : ئەو پەتەی لە ملی وڵاخی ئەکەن و ئەیبەستنەوە پێی .
واتە : صۆفی ! تۆ خەریکی چیت ؟! تۆ کابرایەکی مایە پووچی ، یاخود کردارت وەك پووش وایە و لە کا بەولاوەشی لێ پەیدا نابێ ، مەبەستی لە بێمایەیی کردارەتی . بەڵام دلدار ، خۆی بەم شتە هیچ و پووچانەوە خەریك ناکا کە تۆ خۆتیان پێوە خەریك ئەکەی . ئەو هەوساری وڵاخ و ڕیشی تۆی لا چونیەکە کە کردوویە بەهۆی بەستنەوەی ئازادی و سەربەستیت .
لەنێوان (ئیش) و (ڕیش)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئیشی تۆ) و (ڕیشی تۆ) و (حەشیشی تۆ)دا هاوئاوازییەکی بەتام هەیە .
صۆفی (عب) : واعیظ .

(٧) ڕەهن : مەرهوون ، ڕاگیراو . ئەجبال : جەمعی جەبەلە واتە کێو . عیهن : خوری . ئەدوار : جەمعی دەورە واتە چەرخی گەردوون .
واتە : ماشەڵڵا لە ئاسۆی بیرم چەند بەدەرەتانە .. ئەم گێتییەی هەمو تیایە و هەموی تیا ڕاگیراوە و ، لە هەمو شتێ ئەزانم و شارەزام .. کێوی سەختم لا وەك خوری وایە و ، چەرخی گەردوونم لا شتێکی بێبایەخە . مەبەستی لەوەیە گرانترین بابەتم بەئاسانی بۆ لێك ئەدرێتەوە و ،

« نالی » کە قەدەح نۆشە ، مەستانەوو سەرخۆشە
خامۆش و نەمەدپۆشە ، ئەشعاری لەکن پەشمە (٨)

— ١٧ —

بایێ لە طەرەف قیبلەمەوە دێت و وەزانە ،
یا بۆیی هەناسەی دەمی غونچەی لەرەزانە ؟! (١)

---

لەسەر هیچ شتێ بەکەم ناکەوێ و هیچم بە گران نایەتە پێش چاو .

چەن : تەنها (چر) . نوسخەکانی‌تر هەمو : (چەند) .

(٨) قەدەح‌نۆش : نۆش‌کەری پیالەی مەی . نەمەدپۆش : ئەوەی فەرەنجی لەبەر بکا . کینایەیە لە بنیادەمی دەروێش مەشرەب . ئەشعار : جەمعی شیعرە .

واتە : نالی ئینسانێکە مەیخوار و عاشق و سەرمەست و بێ‌ئاگا لە دنیا و هەرچی بە دنیاوەی بەستێتەوە .. بێ‌دەنگە ، خۆی لە کاری کەس تێ‌هەڵناقورتێنێ و تەنانەت شیعریش ، کە شاکاری دەستیەتی ، بەلایەوە هیچە ، یاخود ئەوەندە ئاسان بەدەستیەوە دێت ، بە هیچی ئەزانێ .

لەنێوان (نۆش) و (خۆش) و (پۆش)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (چن)دا بەم‌جۆرەیە :

(نالی) کە نەمەدپۆشە ، مەستانەوو سەرخۆشە
خامۆشە ، نە مەدهۆشە ، ئەشعاری لەکن پەشمە

ئەگەر لەبەر ناکۆکیی نێوان (مەستانەوو سەرخۆشە) و (نە مەدهۆشە) نەبوایە ئەم نوسخەیەمان هەڵئەبژارد ، بەڵام ئەو ناکۆکییە لێمان نەگەڕا .

قەدەح‌نۆشە (ك) و (اح) : نەمەدپۆشی . مەستانەوو (ت) : مەستانەیی . سەرخۆشە (ك) و (اح) : سەرخۆشی .

— ١٧ —

(١) طەرەف : لا . قیبلە : یار ، کە وەك قیبلە دڵان هەمو ڕوی تێ‌ئەکەن . بۆ : بۆن . لەرەزان : لەرزیوە .

واتە : ئاخۆ بایەکە لەلای یارەوە هەڵی‌کردووە ، لە بۆن و بەرامەی یار تلاوە و ، ئیستا کە دێ بەسەرمانا ئەو بۆن و بەرامەیەمان ئەدا بە لوتا ، یاخود ڕاستە و ڕاست بۆنی هەناسەی دەمی وەك خونچەیەلی کە بەدەم سروەی بای سبەینانەوە ئەلەرێتەوە ؟

ئەشکم ، کە لەگەڵ عەشقمە ، طیفلێکی فەهیمە
هۆشم ، کە لەگەڵ خۆشمە ، پیرێکی نەزانە (٢)

---

لەنێوان (بایێ) و (بۆیێ)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (با) و (بۆ) و ، (هەناسە) و (دەم)دا تەناسوب هەیە .

بایێ (عم) و (کـم) و (من) و ( ٭ بەراوێـزی ٭ خا ) : بایە . دێت و (ك) و (اح) و (خا) : دێتە . بۆیی : ئەمە لێکـتێ (چن)٭ . نوسخەکانی‌تر ، (عم) و (گم) نەبێ ، نوسیویانە : مەطری . (عم) و (گم) : بۆنی . غونچەی (گم) : خونچەی . لەرەزانە (چر) و (چن) لە ڕەمزانە . بەم‌پێیە مەعناکەی وای لێ‌دێتەوە : با بۆنی هەناسەیەلی لە ڕەمزە دێمەکانەوە دێ . بەڵام ناچێ بـە دڵا . (عم) و (کم) : لەرزانـە . (ك) و (مز) و (مب) و (اح) و (من) و (خا) : لرزانە . ئەمیش بەپێی ڕێنوسی کۆن بۆ (لەرمزانە) دەستئەدا .

(٢) فەهیم : تێگەیشتو و فامیدە .

واتە : زۆر سەیرە ! فرمێسکم زادەی عەشقە و تازەیە و ، عەشقیش سەرەڕۆیە و لە تێگەیشتنەوە دۆرە و ، ئەبۆ زادەکەشی کە فرمێسکەکەیە لەبەرئەوە کـە زادەی ئەوە و تازەشـە ، لێ‌نەگەیشتو بووایـە ، کەچێ ساوایەکی زانا و وریا و فامیدەیە ئەزانێ کەی ئەڕژێ . بەڵام هۆشم کە لەگەڵ هاتنە دنیامدا پەیدا بووە و دەمێکە لامە و هەمیشە لامە ، ئەبۆ زانا و فامیدە بووایە ، کەچێ بەپێچەوانەوە پیرێکی خەرەفاو و هیچ نەزانە .

نالی لەم‌بەیتەدا ناکۆکیی نێـوان (عەشق) و (هۆش) لە قاڵبێکی زۆر جوانا دەرئەبڕێ . ئەشك بە زادەی عەشق دائەنێ و مادەم زادەی ئەوە خۆشەویستە و ، بە ساوایشی پیشان ئەدا چونکە ساوا نیشانەی تازە بونەوەی ژیانە و ، هۆش و بیرکردنەوە و بێ‌مەشقی ئەکا بە یەك شت و ، بە پیری و نەزانی و خەرەفاویان دائەنێ .

ئەمە سەرەڕای ئەو وشەئارایی و ڕوخسـار ڕازاندنەوەیەش کە لـە بەیتەکەدا کردویـە . ئەوەتە لەنێـوان (عەشق) و (ئەشـك)دا ، ئەگەر سەیرێکی هاوڕەگەزیی ( ٭ ) و (ع) و لە یەك نزیکیی ( ك ) و (ق) بکەین ، ئەتوانین بڵێین جۆرە جیناسێکی موضاریع هەیە و ، لەنێوان (هۆش) و (خۆش)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێـوان (طیفل) و (پیر)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی (طیفل) و (نەهیم) و ، (پیر) و (نەزان)دا طیباقێکی وردتر و جوانتر هەیە . ئەگینا کێ دیویە ساوا زانا بێ و پیری کۆنەساڵ نەزان بێ .. شتی‌وا مەگەر هەر لە حیسابی عەشقدا دروست و ڕەوا بێ و نالی بیهۆنێتەوە !

تێزاوی سوروشکم وەکو ئیکسیری سوهەیلە
ڕوخسارەیی زەردم وەکو ئەوراقی خەزانە (٣)

شێخم ! وەرە دەر ، فەصلی بەهار و گوڵ و گەشتە
ئەییامی لە گەرمابە خزان وەقتی خەزانە ! (٤)

ئەو شێخە بە کوم مەگرە کە پەشمینە مەریدە
ئەو ڕیشە بەسەر دارەوە ڕیسێکی بوزانە (٥)

---

عیشقمە (مز) : عیشقم و . خۆشمە (مز) : خۆشم و .

ئەم بەیتە لە (مم) و (من)دا بەیتی سێهەمە .

(٣) تێزاو : تێزاب ، شلەیەکی کیمیاییە زێڕی بێگەردی لە ناپاك بێ جیا ئەکرێتەوە. ئیکسیر : مایەیەکی کیمیاییە گوایە ئاسن و مس پێ ئەکرێ بە زێڕ . سوهەیل : ئەستێرەی گەشی سوهەیل کە نیشانەی پایزە و کە هەڵات ئیتر گەڵای دار دەست ئەکا بە زەرد بون . ڕوخسارە : ڕوخسار ، ڕو . ئەوراقی خەزان : گەڵای پایز .

واتە : فرمێسکی سوێر و تیژم ئەڵێی ئیکسیری ئەستێرەی سوهەیلە . ڕوخساری زەرد هەڵگەڕاویشم ئەڵێی گەڵاداری پایزانە ، چۆن ئەستێرەی سوهەیل بۆ گەڵای دار ئەبێ بە ئیکسیر و زەردی ئەکا وەك ئیکسیر زێڕی بێگەرد دەربخا ، فرمێسکی وەك تێزابیشم ڕوی وەك ڕەنگاوی سوورم زەرد هەڵئەگەڕێنێ .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (مز)دا نییە .

(٤) ئەییام : ڕۆژان ، سەردەم . گەرمابە : گەرماو ، حەمام .

نالی لەم بەیتەوە یەکسەر پایزی بەجێهێشت و بەهاری هێنا و ، ئەوەتە ڕۆژنەکانە ئەوانەی دڵیان مردووە و تەنها بۆ ڕۆژباماڵی لەژین و ، شێخی ڕیاباز لەکا بە نمونەیان و پێی ئەڵێ : ئەم وەرزە وەرزی گوڵ و گەڕانە بەناو گوڵاندا و ، سەردەمی ئەوە نییە بنیادەم بخزێتە ناو گەرماو . . پایز کاتی خزانە گەرماوە نەك بەهار ، کە ئەبێ بنیادەم چاو بە گوڵزار و چڕی درەخت و شینایدا بگێڕێ .

لەنێوان ( خزان ) و (خەزان )دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

لە گەرمابە (لە) و (اح) و (خا) : لەگەڵ مامە . دیارە ئەم تەعبیرە واتایەکی سەرگوزەشتەیی هەیە ، بەداخەوە ئێمە نەمانزانی چییە .

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ، ئەما
غەوواصی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە (٦)

---

(٥) کوم : قوڵ . مەرید : یاخی ، کینایەیە لە شەیتان . ڕیس : مۆ و خوریی ڕێسراو . بوزان : جەمعی بوزە واتە بزن .

واتە : دەست مەگرە بە قوڵی ئەو شێخەوە کە شەیتانێکە ، بۆ خۆشاردنەوە بەرگی خوریی لەبەرکردووە . ڕیشەکەشی بەسەر داری باڵایەوە مۆی ڕێسراوی بزنە .

ئەشکونجێ ( کوم ) نەبێ و (کەم) بێ . واتە : بە کەمی مەزانە چونکە . . تاد . هەروا ئەشکونجێ (مەریدە) نەبێ و (موریدە) بێ ، واتە موریدێکی خوریی لەبەرە . نیوەی دووەمی بەیتەکەش لە زوربەی نوسخەکاندا بەجۆرێ نوسراوەتەوە ئەگەر بهێنرێتە سەر ڕێنوسی کوردیی نوێ وای لێ دێتەوە :

ئەو ڕیشە بە سەردار و ڕەلیسێکی بزانە

بەڵام ئێمە پاش لێکۆڵینەوە گەیشتینە ئەوە کە بەمجۆرە مەعنایەکی ئەوتۆ نابەخشێ و ئەبێ ڕاستییەکەی بەمجۆرە بێ کە لە (مەتن)ەکەدا نوسیومانەتەوە و ، پەراوێزێکی (چر)یش پشکێکی بۆ خستینە سەر ڕێگای ئەم لێکدانەوەیە ، ئەوەتە لەسەر وشەی (بزانە) نوسیویە (جەمع)، واتە (بوزانە)یە و جەمعی (بوز)ە بەمەعنا (بزن) .

ئەو شێخە بە کەم مەگرە (چن) : ئەو شێخە بە کەم بگرە . (گم) و (من) لەو شێخە بە کەم مەگرە . (اح) و (خا) : لەو شێخە بەکەم مەگرە . بەپێی ئەم نوسخانەی دوایێ ئەتوانین (بەکەم) وا مەعنا لێ بدەینەوە کە ئەو ڕەنگەیە جلی پێ ڕەنگ ئەکەن یا قوماشی عەمارەپۆیە ، کەواتە (بەکەم) کینایە ئەبێ لە شتی بێ کەڵك و ئیددیعای درۆی خواناسێ . پەشمینە مەریدە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : شێخە نە موریدە . بزانە («پەراوێزی» چن) و (کم) و (ك) و (اح) و (خا) : مەزانە .

(٦) غەوواص : ئەوەی ئەچێتە بنی دەریا دوڕ و گەوهەر و مرواری دەرئەهێنێ . تەعمیق : قوڵکردنەوە. تۆچوون. بزان : زانا .

واتە : دەریای بێ بنی غەزەلەکانم پڕیەتی لە دوڕ و گەوهەری گرانبەهای مەعنای ورد و جوان . بەڵام وەنەبێ هەر کوڵکە مەلەوانێ بتوانێ بەئاسانێ ئەو دوڕ و گەوهەرانە دەربێنێ و ئەو مەعنایانە لێ بداتەوە. دەریاگەردی وای ئەوێ بزانێ قوڵ بۆی داچێ و بتوانێ بچێتە بنی ئاوی لێکدانەوە و لە

پڕ دانەیە ، ئەمما نەوەکو دانەیی چەڵتــوك
بەحرم وتووە ، نەك وەکو گۆلی مەرەزانە (٧)

حوسنی نەظەرە ئەصلی نەظەر حوسنی بە عیصمەت
صۆفی کە دەکا تەرکی ، بە ئینسـانی مەزانە (٨)

ئەو گەوهەرە تۆکە کە لە «نالی»ی دەدزن خەڵق
ئاوی لیـە ، وەك ئاگری بێشەوقی دزانە (٩)

---

شـیعرەکانم ورد بێتەوە و لە وردەکاریەکانم بگا .

بەیتی پێشوو یەکێکە لە بەلگەکانی ڕاستیی ئەم قسـەیەی نالی .

دەوێ (کم) و (من) : ئەوێ .

(٧) دانە : دەنك .

واتە : دەریای غەزەلەکانم پڕە لە دانە ، دانەی گەوهەری ئاقانە و دوڕی ناپاب و مرواریی گرانبەها ، نەك دانەی چەڵتوك کە نیوەی پووش و ئـەو نیوەکەی برنجە .. من باســی دەریـام کردووە ، باســی گۆلە مەرەزەم نەکردووە ، تا کەسێ وا گومان بەرێ من دەنکـە چەڵتوکم لایـە ، نـەك دەنکی گەوهەر و دوڕ و مـرواری . کەواتە ، ئەوانـەی تەنهـا ئەوەندە ئەتوانن بچنە ناو ئاوەوە ، ئـاو لە ئەژنۆیـان سەرنەکـەوێ و ، ئەوانەی لەجیاتیی گەوهەر و دوڕ و مرواری بەدوای پووشی چەڵتـوك ، یا ئەگەر هەر زۆر پایەبڵند بن بەدوای چێشتی برنجدا ئەگەڕێن ، خۆیان نەدەن لە قەرەی شـیعری من .. شیعری من خۆراکی ئەو جۆرە کەسانە نیە و نایەت بەدەسیانەوە .

(٨) واتە : ڕاســتەکەی تەماشـاکردنی جوانی لەگەڵ داوێن پـاکیدا ، شێوەی ڕەوا و باشی سـەرنجە . جا ئەگەر وشکە صۆفی سـەیری جوانی نەکـا و هەمو سـەیرکردنێکی جوانیی بەلاوە ناڕەوا و حەرام بێ ، گوێی مەدەرێ و بە بنیادەمی مەزانە ، ئەگەر بنیادەم بووایە تەماشـای جوانیی نەئەخسـتە پشـتگوێ کە خۆراکی یەکەمی گیان و دەروونی ئادەمیزادە .

(لەصلی نەظەر .. ئاد) موبتەدایە دواکەوتووە و ، (حوسـنی نەظەرە) خەبەرەکەیەتی لێی پێشکەوتووە .

حوســنی ـ ی دۆهەم ـ (هب) : حوسـنە .

(٩) واتە : ئەو قســە ورد و پڕمەعنایانەی کە وەك گەوهەر وان و هەندێ کەس

— ١٨ —

ئەلا ئەی نەفسی بوم‌ئاسا ، هەتا کەی حیرصی ویرانە !
لەگەڵ ئەم عەشقبازانە برۆ بازانە ، ئازانە ! (١)

---

لە نالییان ئەدزن و ئەیاندەنە پاڵ خۆیان و خۆیان ئەکەن بە خاوەنیان ، گەوهەری ناو دەریا نین و نادرەوشێنەوە ، وەك ئەو ئاگرە کز و بێ‌تیشکەوان کە دز بە شەو ئەیکەنەوە ، چۆن ئەوان ناوێرن گڕی ئاگرەکەیان بەرزکەنەوە نەوەك خەڵك پێیان بزانن و بییانگرن ، ئەمانیش ناوێرن وردەکارییەکانی نالی بەتەواوی بدزن و بیخەنە ناو شیعری خۆیانەوە ، چونکە خوێندەوار و ڕەخنەگر دەس‌بەجێ ئەیانناسنەوە کە هیی نالین . لەبەرئەوە کەم بەکاریان‌دێنن ، کە کەم‌کەمیش بەکاریان‌هێنان دیارە مەعنای تەواوی خۆیان نابەخشن و لەچاو گەوهەری بێ‌ئاوی بیری نالیدا وەك پارچە گەوهەری شکاو و دەسکردیان لێ دێ کە بایبەکی ئەوتۆی نییە .

ئەم بەیتە جۆرە ئیشارەتێکیشی بۆ ئەو پەندە کوردییە تیایە کە ئەڵێ «مۆرۆی دزیەتی ، مەگەر بە شەو بکرێتە مل» .

لەم‌بەیتەوە دەرئەکەوێ کە نالی لە سەردەمی خۆیدا ناوبانگێکی زۆری لەناو خەڵکا بووە و شیعری بەسەر زمانی زۆرشنبیرانەوە بووە و ، خەڵك شانازیان پێوە کردووە ، بۆیە هەندێ بەناو شاعیری لەڕاستیدا ناهونەرمەند کە نەیانتوانیوە پیا بگەنەوە ، وردەکارییەکانی ئەویان دزیوە و خستویانەتە شیعری خۆیانەوە ، بەڵام بەهۆی بڵاوبونەوەی شیعری نالییەوە بەسەر زمانی خەڵکەکەدا ، دزیەتییەکەشیان بەباشی پێ‌نەکراوە و نەیانتوانیوە کەڵکی تەواو لە ماڵە دزێنییەکە وەربگرن . ئەتوانین ئەم بەیتە بکەین بە بەڵگە بۆئەوە کە هەر وردەکارییەك لە شیعری شاعیرێکی سەردەمی نالیدا هەبێ و لە هەمان‌کاتا لە شیعری نالی خۆیشیدا هەبێ ، بە هیی نالیی دابنێین و شاعیرەکەی‌تر بە تاوانی دزییەوە بگرین .

گەوهەرە (کم) و (گم) و (من) : گەوهەری . (مز) : گەوهەر و . نوکتە (ت) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : نوکتەی . ئاگری (هم) : ئاوری .

— ١٨ —

(١) بوم : کوندەبەبۆ . بوم‌ئاسا : عادەت وەك کوندەبەبۆ . بازانە : وەك باز . ئازانە : ئازایانە .

موسوڵمان ! لێرە ماڵی خان و مانت هەر نەمان دێنێ
پەشیمان بە، کە دەرمانی نەمانت مایەی ئیمانە (٢)

بلا بۆ کولەبۆ بێ ، مفتی مشك و ماری کەندۆ بێ
خەطیرەی گەنجی وێرانە ، ذەخیرەی کولیجی کاشانە (٣)

---

واتە : ئەی نەفسی حەز لە ئاوەدانی نەکردۆی ، وەك کوندەبەبۆ وێرانەنشین ! ئەم دنیا ، لەچاو ئەو دنیادا ، وەك کەلاوە و وێرانە وایە .. دەسا تۆ تا کەی دەس‌بەرداری ژیانی ئەم کەلاوە وێرانەیە نابی ! ئازایانە هەڵسە ، وەك بازی تیژپەڕ بفڕە و ، لەگەڵ عاشقانی ڕێگای ڕاستیدا ڕووبکەرە ئاوەدانیی عەشق و خواناسی .

دوریش نییە مەبەستی نالی لە ( وێرانە ) سولەیمانیی پاش ڕوخانی بابانەکان بێ و ، ئەم قەسیدەیەی لەپاش بەجێ‌هێشتنی کوردستان و ڕوکردنە مەککە و مەدینە دانابێ .

بازانە ، ئازانە (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) : نازانە ، بازانە .

(٢) مان : مانەوە . خان و مان : جێگە و ڕێگە و ماڵ و مەڵبەند . مایە : سەرمایە .

لەم بەیتەشدا نالی لەسەر سەرزەنشت کردنی نەفسی خۆی بەردەوامە و بە خۆی ئەڵێ : ئەی موسوڵمان ! مانەوەی دەست و پەیوەندت لەم دنیایەدا ئەنجامەکەی هەر نەمان و ماڵ وێرانییە و ، دنیا بۆ ئەوە ناشێ کەس پشتی پێ ببەستێ . پەشیمان بەرەوە لەم جۆرە ڕەوشتە ، چونکە تەنها باوەڕ بە خوا و پشت لە دنیا کردن دەرمانی دەردی نەمان و مسۆگەرکەری مانەوەی ڕاستەقینەیە بۆت .

لەنێوان (مان) و (خان) و (مان)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (مان) و (نەمان)دا بێجگە جیناسی ناقیص طیباقیش هەیە .

مایەی ئیمانە (چن) : مایە ئیمانە . لەوە ئەچێ ئەمیش هەر (مایەیی) بوبێ . (عم) و (ت) و (لك) و (اج) : مایەیی مانە . بەپێی ئەم نوسخانە مەعناکەی‌وای لێ دێتەوە : ئەو دەرمانی دەردەت کە بریتییە لە نەمان و بێ‌پەیوەندی لەگەڵ دنیا ، هۆی مانەوەی هەمیشەییتە . بەڵام ئەم مەعنایە قورس دێتە پێش چاو .

(٣) بلا : لێی‌گەڕێ . مفت : خۆڕایی . کەندۆ : کەندۆی قوڕ یا قامیش کە لە ماڵانی لادێدا زەخیرەی زستانی تێ‌ئەکەن . خەطیرە : گرنگ و خاوەن

بەقیـەی عومری ضایع گەر مورادت پێ تەدارەك بێ
حەیاتی مەککەت و مەوتی مەدینەت جەبری نوقصانە (٤)

پایە . کاشانە : خانوی بچوك و بێ‌بایەخ کە هەژارانی تیا ئەژین .

واتە : لێ‌گەڕێ لە دنیا ، بایەخ‌دار و بێ‌بایەخی .. هیچیت نەوێ .. با گەنجی شاراوەی ژێر کەلاوە کۆنی ، بۆ کوندەبەبۆ بێ کە هەر بەسەریەوە ئەترێنێ و هیچی لێ دەسگیر نابێ . . با زەخیرەی سوچی مالی هەژارانیشی بۆ مشك و ماری ناو کەندۆ بێ .. هیچی هیچ نییە و بۆئەوە ناشێ بنیادەم دلی پێوە ببەستێ .

نالی لەم بەیتەدا خاوەن گەنجانی دنیاپەرستی بە کوندەبەبۆ و ، هەژارانی دنیا پەرستی بە مار و مشك شوبهاندووە . دیارە سەرنجی ئەوەش ئەدرێ کە نالی هەرچۆن بێ هەژارە دنیا پەرستەکانی لە دەولەمەندە دنیا پەرستەکان بە بەهرەمەندتر داناوە ، چونکە لە هەمو حالێکا مار و مشکی ناو کەندوی هەژار زۆرتری دەستگیر ئەبێ لە کوندەبەبۆی سەرگەنجی دەولەمەند !

خەطیرەی (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (ت) : خەطیرە . (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : خەطیرە و . گەنجی (چر) : کونجی . (ت) : کونج . (ك) و (اح) و (خا) : گەنج و . (عب) : کونجی . ذەخیرەی (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (من) : ذەخیرە . کونجی (ت) و (اح) و (خا) : کونج . (ك) : گەنجی . وێرانە (عب) : کاشانە ..

(٤) بەقیبە : پاشماوە . ضایع : فەوتاو : تەدارەك : فریاکەوتن . جەبری نوقصان : پڕکردنەوەی ناتەواوێ .

واتە : ئەگەر ئەتەوێ فریای ئەو ماوەیەی تەمەنت بکەوێ کەوا خەریکە لەکیست ئەچێ و هێشتا بەتەواوێ لەکیست نەچوە ، بڕۆ لە مەککە بیبەرە سەر و پاشان بڕۆ لە مەدینە بمرە ، بەوە هەمو ناتەواوییەکی زوت پڕئەکەیتەوە .

ئەم بەیتە نیشانەی ئەوەیە نالی ئەم پارچە شیعرەی لە سەرەتای سەفەری مەککە و مەدینەیدا وتووە ، جا خوا دو جار سەفەری مەککە و مەدینەی هەبێ یا یەك‌جار . هەروا لەوانەشە بێ بە جۆرە نیشانەیەکی ئەوە کە لە مەدینە مردبێ ، ئەخوازەلا ئەگەر بیبەستێن بە پارچە موستەزادەکەیەوە کە لە دوا سالەکانی پیریدا و بەر لە چونە مەدینەی وتویەتی .

لەنێوان (حەیات) و (مەوت)دا طیباق و ، لەنێوان (مەککە) و (مەدینە)دا تەناسوب هەیە .

چ مەککە ؟ دار و بەردی قاعیدەی ئەرکانی ئیسلامە
چ طەیبە ؟ ماء و خاکی مائیدەی ئەنواری ئیمانە (٥)

فیداکاری تەن و جان بە ، لە ئاسانێ هەراسان بە
کە داغ و دەردی ڕێگەی مەککە باغ و وەردی مەردانە (٦)

---

(٥) قاعیدە : بناغە . ئەرکان : گۆشەکان . مائیدە : سفرە و خوان .

واتە : لە کام مەککەدا بژیم ؟ ئەو مەککەیەی کە دار و بەردی بووە بە بناغەی گۆشەکانی ئیسلام و ئەگەر نەبوایە چوار گۆشەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و باکور و باشووری وڵاتی ئیسلام نەئەبوو ، یاخود گۆشەکانی ئاینی ئیسلام کە شایەتیمان و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەجن دانەئەمەزران ، بەومەعنا کە ئاینی ئیسلام لە مەککەوە هەڵقوڵاوە و لەوێ وەحی هاتووەتە خوار بۆ پێغەمبەر .. لەکام مەدینەشدا بمرم ؟ ئەو مەدینەیەی کە ئاو و خاکی بووە بە سفرەیەك و نوری ئیمان لەسەر ئەو سفرەیەوە بڵاو بووەتەوە بۆ جیهان .

دوور نییە وشەی ( قاعیدە ) ئیشارەت بێ بە ئایەتی ( وَاِذْ يَرْفَعُ اِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ ) واتە : کاتێك ئیبراهیم پایەکانی ماڵی کەعبەی بەرز ئەکردەوە و دروستی ئەکرد ..

لەنێوان (دار) و (بەرد) و ، (قاعیدە) و (ئەرکان)دا تەناسوب و ، لەنێوان (ماء) و (خاك) و بەڵکو (مائیدە)شدا تەناسوب هەیە چونکە مائیدە بێئاو نابێ .

مائیدەی (چر) و (خا) : مایەیی . (اح) : مائیدە . لەمیش هەر ( مائیدەی )یە .

ئەم بەیتە لە (کم) و (گم) و (مب) و (من)دا نییە .

(٦) تەن : لەش . جان : گیان . وەرد : گوڵ .

واتە: گیان و لەشت بکە بە قوربانێ و ڕێگەی پڕ دەرد و مەینەتی مەککە بگرەبەر و ، لە حەسانەوە و پشوودان بێزار بە ، چونکە داخ و دەردی ڕێگەی مەککە ، باخ و گوڵزاری مەردانە و شایانی ئەوەیە بنیادەم بۆی بچێ .

لەنێوان ( تەن ) و (جان)دا تەناسوب و ، لەنێوان (داغ) و (باغ) و ، (دەرد) و (وەرد)دا ، لە لەفظدا جیناسی لاحیق و ، لە مەعنادا طیباق هەیە ، سەرەڕای لەف و نەشری مورەتتەبیش . جگە لەوە کە هاوئاوازییەکی جوانیش لەنێوان (ئاسانێ) و (هەراسانێ)دا هەیە .

ئەگەرچی ڕێگە : خاکی خوێنە ، دار و بەردی ئێسقانە ،
نیشانەی تیری ڕێگەی عەشقە ئەم ئێسقانە سپیانە (٧)

وتم : داخۆ چییە سوور و سپی تێکەڵ !؟ کە تێفکریم
سەراسەر کەللەیی ئوشتر ، لەبالەب خوێنی ئینسانە (٨)

---

داغ و (عم) و (گم) : داخ و . باغ و وەردی (عم) و (گم) : باغی وەردی.
نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە پەراوێزی نوسخەی (من)دا بە خەتێکی نوێ ، بەمجۆرە نوسراوەتەوە :

**کە داغ و دەرد و ڕێگی مەککە وەردی ویردی مەردانە**

بەلای ئێمەوە ئەگەر لەجیاتیی (دەرد و) ، (دەردی) و ، لەجیاتیی (ویردی) ، (وردی) نوسرابوایە مەعنایەکی جوانی ئەبەخشی ، چونکە (ڕێگ) واتە : وردە لم .

(٧) واتە : هەرچەند خاکی ڕێگای مەککە هەموی هەر خوێنە و ، دار و بەردی هەموی هەر ئێسقانە و لەوانەیە ئەوەی بچی بۆ مەککە گیانی لە ڕێگادا دانێ ، مەککە هەر شایانی ئەوەیە بنیادەم بۆی بڕوا ، چونکە ئەو ئێسقانانە کە بەدرێژایی ساڵ سپی بونەتەوە، نیشانەی تیرێکن کە بە ڕێگای مەشقدا یا لەپێناوی مەشقدا نراون بە نیشانەیەکەوە .

ئەم ڕەنگ سووریەی خاکی ڕێگای مەککە ، کە نالی بە خوێنی مەعنا لێئەداتەوە ، ئەوەیە کە ڕێگای مەککە لمی سوورە و ، ئەو ئێسقانانەش کە بە نیشانەی تیرێکیان دائەنێ بە ڕێگای یا لەپێناوی مەشقدا نرابن بە نیشانەیەکەوە،ئێسقانی حوشتری مردارەوەبوی یا کوژراوی کاروانین. بەلام ئەم ، وەك لە بەیتی داهاتودا ڕوونی ئەکاتەوە ، ئەیەوێ بیپانکا بە شتێکی ئایینی و پیرۆز و سووریی لە سوورەکە ئەکا بە خوێنی حاجی کە چەتە ڕێی پێ گرتون و کوشتونی، یا بە خوێنی شەهیدان کە لە غەزاکانی دەوروبەری مەککەدا ڕژاوە و ، ئێسقانی حوشترەکانیش ئەکا بە ئێسقانی حوشتری کوژراوی حاجییە چەتە کوشتووەکان یا ئێسقانی حوشتری غەزاییەکان کە بە تیری دوژمن کوژراون .

ڕێگە خاکی (چر) و (ت) و (ك) : ڕێگە خاك ، بۆ (خاك و) بۆ (خاکی)یش دەست ئەدا . (چن) و (اح) و («پەراوێزی» خا) : ڕێگە خاك و . (عم) و (گم) : خاکی ڕێگەی . بەردی ئێسقانە (چر) : بەرد و ئێسقانە . (ت) و (ك) و (اح) و («پەراوێزی» خا) : بەردە ئێسقانی .

(٨) لەبالەب : لێوانلێو .

بەڵێ بەم ڕێگەدا جەممازە جانبازە کە ڕۆژ و شەو
دەکا سەیر و سولوکی دائیمەن سەرخۆش و مەستانە (٩)

قەطاری زەنگ و قۆڕی ئوشتر و ئێستر لەسەر کێوان
دەڵێی ژیڕەی صەدای قاز و قولنگی ئەوجی کەیوانە (١٠)

---

واتە : لە دڵی خۆمدا وتم ئاخۆ ئەم سوور و سپییە چییە لەم ڕێگایەی مەککەدا تێکەڵی یەك بوون . کە ورد بوومەوە بۆم دەرکەوت سپییەکە هەمووی کەللەسەری حوشتری زۆر حاجییانە و سوورەکەش خوێنی حاجییەکان خۆیەتە ، کە چەتە و ڕێگر ئەهاتنە ڕێی کاروانی حەج و ئەبوو بە شەڕ و دەیان حاجی و حوشتری حاجیی تیا ئەکوژرا و صەدانیشی تیا ڕووت ئەکرایەوە و حوشترەکانیان بە تاڵان ئەبرا . .

ئەشکونجێ ، وەك لە بەیتی پێشووشدا ئیشارەتمان بۆ کرد ، خوێن ڕشتن و حوشتر کوشتنەکە بۆ سەردەمی غەزای لەسحابان بگەڕێتەوە . .
ئوشتر (چر) و (مم) و (کم) و (گم) : وشتر . (من) : حوشتر .
لە کۆکردنەوەی (سەراسەر) و (لەبالەب)دا تەقابولێکی جوان هەیە .

(٩) جەممار : وشتری تیژڕەو . جانباز : ئەوەی گیانی خۆی ئەخاتە مەترسییەوە و مل ئەنێ و گوێ بە مەترسی نادا . سەیر . ڕێ تەی کردن . سولوك : ڕێ گرتنەبەر .

واتە : لەم ڕێگای حەججەدا وشتری بارەبەری تیژڕەو گیانی خۆی خستووەتە سەر لەپی دەست و شەو و ڕۆژ خەریکی ڕێڕەوییە و ، بێ وچان ، وەك سەرخۆش و مەست ، لە گەشت و گەڕاندایە .

لەنێوان (جەممار) و ( جانباز )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (شەو) و ( ڕۆژ )دا طیباق هەیە .

ڕێگەدا (مم) و (کم) و (گم) : ڕێگە وا . (ك) و (عب) و (اح) : ڕێیەدا . سەیر و (چر) و (چن) و (ت) و (اح) : سەیر . بۆ (سەیر و) و (سەیری)یش دەستنەدا . (مم) و (کم) و (گم) : سەیری . دائیمەن (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (عب) و (من) : دائیمی .

(١٠) قەطار : کاروان ، ڕیز . زەنگ و قۆڕ : ئەو زەنگڵەی ئەکرێتە ملی وڵاخی باری کاروان لە سەفەری دووردا و لەدوورەوە دەنگی دێ . ئەوج : بەرزی . کەیوان : ئاسمان .

چ ڕێگیکی سپی واشە ، ئەوەندەی کەهکەشان دوورە
چ سەحرایێکی شین ڕەنگە ، بە قەد نۆ ئاسمان پانە (١١)

مەگەر ڕێی حاجیانە وا تیا سەیارە سەیارە !
مەجەڕڕە ئالەتی جەڕڕی جەریری سارەبانانە ! (١٢)

---

واتە : دەنگی زیزی زەنگ و قوڕی ملی حوشتر و ئێستری حاجی کە لەسەر کێوەکانی دەوروبەری مەککەوە دائەبەزنەخوار و ، زایەلەی لە دوورەوە دێ ، ئەڵێی ئاوازی قاز و قولنگی ئاسمانە بە بەرزەوە ئەیژێنن .

قەطاری (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : قەطار . بۆ (قەطار و) و ( قەطاری )یش دەستنەدا . (خا) : قەطار و . زەنگ و (ت) : زەنگ . ئەمیش هەر (زەنگ و) وە. لوشتر و لێستر (عم) و (ت): ئێستر و نوشتر. لە (كم) و (گم) و (عب) و (من)دا نیوە بەیتی یەکەم تێکرا جیاوازە و لەنێوان ئەو نوسخانە خۆیشیاندا جیاوازی هەیە . لە ( کم ) و ( گم )دا هەڵەی گەورەی لیایە بۆیە نەمانئوسییەوە ، هەرچەند تێکرا لە شێوەی ئەوەیە کە لە (عب) و (من)دایە . لە (عب)یشدا : خوصوصەن دەنگی زەنگی گەردنی ئێستر .. تاد . لە (من)یشدا : خوصوصەن دەنگی زەنگی گەردنی حوشتر .. تاد .. دەڵێی : (كم) و (من) : ئەڵێی .

ئەم بەیتە لە نوسخەکانی (کم) و (گم) و (من)دا لەپاش بەیتی دوازدەهەمەوەیە .

(١١) سپی واش : سپی ڕەنگ، مەیلەوسپی. کەهکەشان : کۆمەڵە ئەستێرەی کاکێشان ، کە لە دوورەوە سپی ئەکاتەوە . مەبەست لە ئاسمانە .

واتە : ئەم ڕێگای حەجە کە دەشتێکی لینی کاکی بەکاکیە ، ڕێگایەکی چەند سپی ڕەنگە ، ئەوەندەش دوورە ئەڵێی ڕێی کاکێشانە بە ئاسمانەوە . ئەم دەشتە ئەبڕاوەی مەککەیەش چۆن دەشتێکە لەبەر دووری شین ئەکاتەوە و ئەوەندەی نەك تەنها حەوت ئاسمان ، بەڵکو ئەوەندەی نۆ ئاسمان پان و گەورەیە .

(١٢) سەیارە : کاروان. سەیار : ڕەوندە. ئەستێرە گەڕۆکەکان . مەجەڕڕە : کۆمەڵە ئەستێرەی کاکێشان . جەڕ : ڕاکێشان . جەریر : جڵەو ، ڕەشوەی ولاخ . سارەبان : حوشترەوان ، ئەو زەلامەی لەگەڵ وشتردا ئەڕوا و ئاگاداریی ئەکا .

واتە : بشێ ئەم ڕێیە ڕێی حاجیان بێ وا کاروان پیا تێئەپەڕێ ، وەك.

فەضا بەحری موحیط و وشتری تێدا سەفینەی بەڕ
سەرابی میثلی نیل و دیجلەوو جەیحوون و عومانە (١٣)

لە صەد جێ کلکی ئوشتر گەییە ئەرضی مەهلەکە ، هێشتا
یەمی فەججی عەمیقی ئالی هەر بێ قەعر و پایانە (١٤)

---

ئەستێرە بە ڕێی کاکێشانا ئەڕوا و ، ئەستێرەکانی ڕێی کاکێشانیش بۆین بەهۆی ڕاکێشانی جڵەوی دەستی وشترەوانەکان و ڕێیان بۆ ڕۆشن بکەنەوە !!

لیا (چر) و (عم) و (عب) و (خا) : تێدا . مەجەڕڕە (ك) : مەجەڕڕەی . هەندێ لە نوسخەکانی‌کەش بە هەڵە بە (میجەڕڕە)یان نوسیوە . جەریری ( « پەراوێزی » خا ) : جەریدی . جەرید : چڵی خورمایە کە توێکڵەکەی لێ‌کراێتەوە . سارەبانانە ( « پەراوێزی » خا ) : پاسەبانانە .

(١٣) فەضا : بۆشایی . بەحری موحیط : دەریای گەورەی بێ‌پایان ، کە دەوری زەویی دابێ ، ئوقیانوس . سەفینە : کەشتی . بەڕ : وشکان . سەراب : وردە زیخی بریقەدار کە ڕێبوار لەدوورەوە وائەزانێ ئاوە . جەیحوون : ڕووبارێکە لە تورکمانیا . عومان : دەریای عومان .

واتە : چۆڵایی بێ‌پایانی ڕێگای نەبڕاوەی حەج وەك دەریای بێ‌سنوور وایە و ، وشتریش لەم وشکانییەدا بووە بە کەشتی (*) و ، وردە زیخی بریقەداری ژێر تیشکی هەتاویش وەك ئاوی نیل و دیجلە و جەیحوون و دەریای عومان دێتە پێش چاو .

فەضا (عم) و (گم): فەضای.موحیط و(عم) و (کم) و (گم) : موحیطە و. (اح) : موحیط . (من) : موحیطە . وشتری (عب) و (من) : ئوشتری . سەرابی (عم) و (گم) : سەراوی . دیجلەوو (ت) و (ك) و (اح) : دیجلەیە .

(١٤) مەهلەکە : شوێنی فەوتان . یەم : دەریا . فەج . ڕێگای دوور . عەمیق : قووڵ . قەعر : بن .

واتە : حوشتر لە صەد جێگادا گەیشتە گیان دەرچوون و تەنانەت کلکیشی گەیشتە ئەوە بنیشێتە زەویی فەوتان و گیانی تیا نەمێنێ ، کەچی هێشتا دەریای شینی ڕێگـای دووری بەناخاچوی بیابـان نە بنی دیارە و نە کەناری .. مەبەست لە دووریی ڕێگاکەیە . باس‌کردنی کلکی

---

(*) عەرەب ئەڵێن : « البعیر سفینة الصحراء » واتە : حوشتر کەشتیی بیابانە .

لەنێو ڕێگی ڕەوانی قوم نوقوم بۆ وشتر و بۆ گوم
ئەما گوێی بیستنی ( "قم" "قم" ) ، چ جای ئیمکانی هەستانە (١٥)

تەنی حاجی لەسەر چوار چێوەیی ناجی دەڵێی نەعشە
لوعابی خۆر لەسەر ئیحرامی وەك كافوری ئەكفانە (١٦)

---

حوشتریش لەوەوەیە كە مەشهوورە ئەڵێن « فلانەكەس لە كلكی گەڕابوەوە، ئەگینا مردبوو » گوایە كلك دوا شوێنی گیانلەبەرە گیانی تیا نامێنێ .

نوشتر (عم) و (كم) و (گم) و (من) : وشـــتر . مەهلەكە (گم) و (من) : مەهلەكە و . عەمیق و ئالی (چن) و (اح) : عەمیق ئالی . بۆ ( عەمیق و) و (عەمیقی)یش دەستـنـەدا . (عم) و (كم) و (گم) و (من) : عەمیقی ئالی . (ت) : عەمیقی ڕێگە .

(١٥) ڕێگی ڕەوان : ئەو جۆرە لەی لە شوێنێكا جێگیر نابێ و بەدەم باوە ئەڕوا . قوم : لم . ( "قم" "قم" ) : هەسـتە ! هەستە !

واتە : وشتر لەناو لمی با هەڵگرتوی بیابانا نوقم بـوو و لم دایپۆشی ، بەجۆری كە لەبەر دیارنەبوونی لاق و سكی،بنیادەم وانەزانێ چۆكی داداوە. بۆیە وشترەوانەكان هەرچەند لێیئەخوڕن كە هەسـتێ ، ئـەو گوێی بە دەرەوە نییە تا ببیسێ ، چجای ئەوە بتوانێ هەڵسـێتەوە .

لەنێو (كم) و (من) : لەناو . ڕێگی (عم) و (گم) : ڕێگەی . ڕەوانی (عم) : ڕەواندا . وشتر و ( عم ) : وشتریش .

(١٦) تەن : لەش . ناجی : حوشتری تیژڕەو كە سواربووەكەی بە سەلامەتی ئەگەیەنێتە جێ . نەعش : تەرم ، تابووت ، مردوو لەناو دارەمەیتا . لوعاب : شتێكە وەك تەنراوی جاڵجاڵۆكە لـە گەرمـای نیوەڕۆكاندا ئەبینرێ لە ئاسمانەوە بەرەو خوار ئەبێتەوە . ئیحرام : بەرگی ئیحرام ، قوماشێكی نەدوراوە حاجی لەكاتی حەجدا ئەیكاتەبەر . كافور : دەرمانێكی بۆنخۆشی سپییە . ئەكفان : جەمعی (كفن)ە .

واتە : لەشی حاجیی ماندوی شەكەت و وەك كەوتوو ، بەسەر پشتی حوشتری لەڕ و لاوازی حاجیگواستنەوەوە كە ئەوەندەیان ڕەتاندووەتەوە هەر چوار چێوە و ئەسكالتەكەی ماوە ، ئەڵێی تەرمی مردووە لەناو دارە مەیتا . هەروەها زێڕینەی خۆریش لە ترچەی نیوەڕۆدا كە ئەدا بەسەر بەرگی سپیی ئیحراما كە حاجی لەبەری كردووە ، ئەڵێی كافوری سپییە و بەسەر كفنی مردوودا كراوە .

مەلێ : دەشتە ، بلێ : دنیا هەمو خانێکە ئەم حەوشە
چ حەوشێکە ؟ کە ئافاقی حەصار ، ئەفلاکی سەربانە (١٧)

مەلێ ڕێگەی کەشندە ، یا کوشندە ئەژدەرە ، یاخو
کەمەندە ، یا طەنابی خێوەتی گەردونی گەردانە (١٨)

---

لەم تەشبیهەدا حوشتر وەك دارە مەیتی لێهاتووە و ، لاشەی ماندوی حاجی بووە بە لاشەی مردوی ناو دارە مەیت و ، بەرگی سپیی ئیحرام بووە بە کفن و هەسونە زێڕینەی خوریش بووە بە کافوری سەر کفنی مردو .

لەنێوان (حاجی) و (ناجی)دا سەرەڕای جیناسی لاحیق ، تەناسوب و، لەنێوان ( ئەکفان ) و ( نەعش ) و ( کافور )یشدا تەناسوب هەیە .

دەڵێی (کم) و (من) : ئەڵێی .

(١٧) خانێکە : خانەیەکە ، خانویکە . ئافاق : جەمعی (ئوفوق)ە بەمەعنا ئاسۆ . حەصار : شورە .

وانە : دەشتی چی ؟ نەکەی هەرگیز بلێی ئەم ڕێگای حەججە دەشتە . . بەڵکو بلێ : جیهان تێکڕا خانویکە و ئەم ڕێگای حەججە حەوشەکەیەتی و، ئاسوی دوری کەس پێنەگەیشتویش شورەکەیەتی و ، ئاسمانەکانیش سەربانەکەیتی .

(١٨) کەشندە : ئەوەی بکشێ و نەبڕێتەوە . کوشندە : بکوژ . ئەژدەر : ئەژدەها . کەمەند : پەتێکی ئەستوری درێژە بۆ گرفتار کردنی کەسێك یا گیانلەبەرێك بەکاردێ . طەناب : تەناف . گەردان : سوڕاوە .

وانە : مەڵێ ، پێویست ناکا بلێی ڕێگای حەج درێژە و ئەکشێ و نابڕێتەوە . ڕێگای حەج ڕێگا نییە ، ئەژدەهای کوشندەیە ، کەمەندی گرفتار کردنی خەڵکە ، تەنافی دەواری ئاسمانی سوڕاوەیە کە بەسەر زەویدا هەڵدراوە . جا تەنافی تەنافی دەوارێکی گەورەی وەك ئاسمان بێ ، لەبێ چەند درێژ بێ !

لەنێوان ( کەشندە ) و (کوشندە)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لەنێوان ( کەشندە ) و ( کەمەندە ) و ، لەنێوان ( گەردون ) و (گەردان)دا جیناسی لاحیق هەیە .

عوقونی گەرم و سوێراوی میثالی چاوی گریانە
ڕوعوونی شاخی سوتاوی شەبیهی جەرگی بوریانە (١٩)

لە بن خاکی مەغاکی ئاتەشینی ، لەعلی لەب تونیە
لە سەر ئابی سەرابی ، سەروی سێرابی موغەیلانە (٢٠)

---

ڕێکەی (ك) و (عب) : ڕێکە . بەپێی ئەم نوسخانە مەعنای نیوە بەیتەکە وای‌لێ‌دێتەوە : ناوی ڕێگا مەهێنە ، ڕێگا نییە ، مارێکی کشاوی کوشندە هەیە .. ئاد .

طەنابی (عم) : طەنانی . (کم) و (گم) و (من) : کەنانی .

(١٩) عویون : جەمعی (عەین)ە بەمەعنا سەرچاوەی ئاو . ڕوعون : جەمعی (ڕەعن)ە بەمەعنا لوتکەی شاخ .

واتە : سەرچاوەکانی ئاوی گەرم و سوێر لەسەر ڕێگای چۆلی حەج ، وەك چاوی گریاناویی دلداران وان کە فرمێسکی گەرم و سوێریان لێ ئەڕژێ . لوتکە سوتاوەکانی شاخەکانی دەوروبەری ڕێگاش وەك جەرگی سوتاوی ڕەش‌بووەوەیان وان .

(٢٠) مەغاك : ڕۆچوو . ئاتەشین : گەرم وەك ئاگر . تونە : تینو . ئاب : ئاو . سێراب : تێراو . موغەیلان : درەختێکی کورتەبنەی دڕکاوییە، لە دەشتە بێ‌ئاوەکانا ئەڕوێ .

واتە : سەیری بنەوەی ئەم خاکە لەکەی ، چالاییەکانی کە ئەبوا ئاویان تیا بوایە ، لێوی ئاڵیان تینووە بۆ دلوپێك ئاو . سەیری سەرەوەشی ئەکەی ، سەراب بووە بە ئاو تیایا و دار سەروی تێراوی قەراغ ئاوی سەرابی ، بریتییە لە دڕکی موغەیلان کە لە وشکانا ئەبێ ئاڕوێ ! وێنەیەکی جوانە بۆ دەربڕینی بێ‌ئاویی ڕێگای حیجاز .

لەنێوان (بن) و (سەر)دا طیباق و ، لەنێوان (خاك) و (ئاب) و (ئاتەش)دا تەناسوب و ، لەنێوان (سەرئاب) و (سەراب)دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان (سەراب) و (سێراب)یشدا جیناسی ناقیص هەیە .

لە بن (چر) و (خا) : لەسەر . ئابی سەرابی (عم) : ئاوی سەراوی . سێرابی (عم) و (کم) : سێراوی .

سماقی ئەحمەرە ، یا قوتی ڕۆح و ئاگری نەفسە ؟!
حەصاتی ئەبیەضە ، یا شوهب و ئەجمی ڕەجمی شەیطانە ؟! (٢١)

بە ظاهیر گەر مەگەس‌دارە ، بە باطین صەد چەمەنزارە
بە صورەت یەك بە یەك خارە ، بە مەعنا صەد گولوستانە (٢٢)

---

(٢١) ئەحمەر : سور . حەصات : حصاة ، وردە بەرد . شوهب : ئەو ئەستێرانەی بە ئاسمانا ئەکشێن . ئەجم : ئەستێرە .

واتە : ئاخۆ ئەم خۆڵی سوری ڕێگای مەککەیە ، ترشە سماقی سورە، یاخود خۆراکێکی سورە بۆ گیان و ئاگرە بۆ سوتاندنی نەفس ؟ ئەم بەردە وردە سپیانەشی ، هەر بەڕاستی وردە بەردی سپین ، یاخود ئەو ئەستێرانەن بە ئاسمانا ئەکشێن بۆ ڕەجمی شەیتانەکان و دوور خستنەوەیان لە دەوروبەری مەککە و پاشان کەوتونەتە خوارەوە ؟

ئەشتوانرێ دوو وشەی ( یا قوتی ) بە یەك وشە دابنرێن و ( یاقوتی ) بن ، چونکە باس باسی خاکی سوری ڕێگای مەککەیە و ( یاقوت )یش سورە .

لەنێوان ( ئەحمەر ) و ( ئەبیەض ) و ، (ڕۆح) و (نەفس)دا تەناسوب و طیباق و ، لەنێوان ( ئەجم ) و ( ڕەجم )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( ئاگر ) و ( شوهب )دا تەناسوب هەیە .

ئاگری (عم) و (گم) : ئاوری . شوهب و (عم) و (خا) : شوهبی .

(٢٢) مەگەس : مێش . چەمەنزار : جێگای سەوزی . خار : دڕك .

واتە : ئەگەرچی ڕێگای مەککە بەدیمەن خاوێن نییە و پڕە لە مێش ، لەڕاستیدا شوێنی گوڵ و سەوزییە . هەرچەندیش کە بنیادەم سەیری ئەکا هەر دڕك و داڵ ئەبینێ ، لەڕاستیدا ئەوەندەی صەد باخچە خۆش و جوانە .

تەنها لە نوسخەی (چن)دا نوسراوە : مەگەس‌دارە . ئێمە دڵنیا نین لەوە کە تێکستی ڕاست ئەمەبێ ، چونکە تێکستی نوسخەکانی تر هەرچەند لەناو خۆیانا جیاوازن ، بەڵام لەیەکیشەوە نزیکن . ئێمە نوسخەی (چن)مان لەبەرئەوە هەڵبژارد چونکە مەعنای بەئاسانتر لەمەدا بەدەستەوە . نوسخەکانی تر بەمجۆرەن : (چر) و (عم) و (گم) و (عب) و (خا) : گەز بە گەز دارە . ( « بەراوێزی » چر و خا ) و (اح) : گەر بزەدارە . (گم) : گرنە گردارە . لەوانەیە ( گرنە گەر دارە ) بێ . گرنە : دارێکی دڕکاوییە .

نەیستان و خەسەلکزاری سوتوفی شەوکەیی خاری
گەلێ خۆشتر لە سەروستان و ، دلکەش‌تر لە بوستانە (٢٣)

قەتاد و عەرفەج و خیطمێ و عەضات و عەوسەج و ئەثلی
چ دامەن گیر و شێن و دڵنشینی ڕێی غەربانە ! (٢٤)

---

بەم‌پێیە مەعناکەی وای‌لێ‌دێتەوە : هەرچەند گزنە بەدیمەن درەختە ، بەڵام .. تاد . (ت) و (ك) : گەزنە گەزدارە . (من) : گەر بە گەزدارە .. ئەوەش بزانین نە دەرختی ( گەز ) و نە دڕکی ( گەزنە ) سروشتیان لەوانە نییە لە شوێنی بیابانێ و وشکا بڕوێن . ئەوەش هۆیەك بۆ بۆئەوە کە ئێمە چاو لەم تێکستانە بپۆشین و تێکستی (چن) هەڵبژێرین .

(٢٣) نەیستان : قامیشەڵان . خەسەلکزار : شوێنی دڕکاوێ . سونوف : جەمعی ( صِنف )ە واتە جۆر . شەوکە : دڕك . دلکەش : دلگیر .

واتە : هەرچی لە ڕێگای مەککەدا هەیە لە قامیشەڵان و جاڕەدڕك و هەر جۆرە دڕك و داڵێك ، زۆر خۆشترە لە باخی سەرو و دلڕفێن‌ترە لە ناوباخ و بێستان .

سونوفی (ت) و (اح) : صوفوفی. شەوکەیی (چن) و (اح): شەوکەوو.

(٢٤) قەتاد : دارێکی سەختە دڕکێکی وەك دەرزێ تیژی هەیە . عەرفەج : ڕووەکێکی دەشتییە . خیطمێ : هێرۆ . عەوسەج : درەختێکی بچکۆلەبەلقی دڕکاوێ و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی هەیە . ئەثل : درەختێکە لە شوێنی لمینا لە نزیکی ئاوا ئەڕوێ ، گەڵاکانی باریك و گوڵەکانی هێشوویین ، لە ماڵیشا دەڕوێنرێ . عەضات : دارێکی دڕکاوییە .

واتە : ئەو هەموو دڕك و داڵانەی کە ناوی هێنان ، لەگەڵ ئەوەشا کە دڕك و داڵن ، وەك دۆست دەست لە یەخەی ڕێبواری نامۆ ناکەنەوە و ، وەك گوڵی شێن وان لە دڵیا و ، لە دڵیدا جێگای خۆیان ئەکەنەوە . نالی ویستویەتی دڕکایەتییەکانیان بکا بە نیشانەی خۆشەویستی ..

نالی لەم بەیتەدا لە ڕیزکردنی وشەکانیشـــدا هاوسەنگییەکی جوانی کردووە .

هەندێ لـە نوسخەکان لە ڕاگرتنی وشـە عەرەبییەکاندا کەوتوونەتە هەڵەوە . لەبەر ئاشکرایی هەڵەکانیان پشت گوێمان خستن .
ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە .

شەفیری چالی شۆری هەر دەڵێی لەعلی نمەکپاشە
حەفیری چاهی وشکی هەر دەڵێی چاهی زەنەخدانە (٢٥)

لەباتیی لالەیی حەمرا جگەر پوڕ داغی خورشیدە
لەباتیی سونبولی تاتا سەر و سەودا پەرێشانە (٢٦)

موغەیلانی جل و مێزەر دڕێنی صۆفییە ، یەعنی
ئەمە ڕێی موحریمانی مەحرەمی سەر ڕۆت و عوریانە (٢٧)

---

(٢٥) شەفیر : لێوار . شۆر : سوێراو . نمەکپاش : ئەوەی خوێی پیا وەشێنرابێ . کینایەیە لە خۆش و بەتام . حەفیر : هەڵکەنراو ، قوڵایی . چاه : چاڵ . زەنەخدان : چاڵایی سەر چەناکە .

واتە : لێواری چاڵ و بیری سوێراوی ڕێی مەککە کە ڕەنگی خۆڵەکەی سوورە و توێژێ خوێی زەویە شۆرەکەشی بەسەرەوەیە ، ئەڵێی لێوی وەک لەعل سوور و بەتام و خوێی یارە . قوڵایی چاڵی وشکی بێئاوبشی کە مەگەر تەنها چەند دڵۆپێ ئاوی تیابێ ، وەک چاڵایی چەناکەی وایە کە دڵۆپێ دوان ئارەقی پێوەیە ..

ڕێی لێنەچێ نالی ئەم تەشبیهەی لەبەرئەوە کردبێ کە ڕێبوار لەڕادەبەدەر لەو ڕێگایەدا هیلاکە بۆ ئاو . بەڵام تێکڕا هەستی ئاینییە بالی پێوە ناوە ئەو ڕێگا گەرمە بکا بە نەکەرۆز و ئەو دڕک و داڵە زۆرە بکا بە گوڵ و شینایی و ئەو لمە سوورە بکا بە لێوی وەک لەعلی یار ، تەنانەت کە خۆیشی هەموو ناخۆشییەکانی ڕێگاکە ئەخاتە ڕوو .

ئەم بەیتە لە نوسخەی ( گم )دا نییە .

(٢٦) حەمرا : سوور . پوڕ : پڕ . تاتا : تەڵ تەڵ وەستاو . سەودا : مەشق .

واتە : لەم ڕێگە وشک و دوور و بێئاو و شینایییەی مەککەدا جگەرمان بە لێنی داغی خۆر سوور بووەتەوە و جێگەی گوڵاڵە سوورەی بۆ گرتوینەتەوە . خەیالیشمان پەرت بووە و مەشق لە کەللەمانا نماوە و لەو پەرت و بڵاوییەیە جێگەی گوڵی تاڵتاڵی سونبولمان بۆ ئەگرێتەوە .

پوڕداغی (چر) و (کم) و (گم) : پەرداغی . سەر و (چر) : سەر . بۆ (سەر و ) و (سەری)یش دەست ئەدا . (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (خا) : سەری .

(٢٧) موغەیلان : دارێکی دڕکاوییە لە بیاباندا ئەڕوێ . موحریم : ئەوکەسەی

★ ★ ★

شوتوربانا ! ئەمە پەرژینی باغی ڕەوضەیە ، یاخۆ
عەرار و عەرعەر و بانی خیابانی بیابانە ؟! (٢٨)

---

ـیازی حەجی هەبێ و چوبێتە ئیحرامەوە و جل و بەرگی نەدوراوی ئیحرامی پۆشیبێ و سەری ڕووتکردبێ .

نالی کە باسی سەختی و ناڕەحەتیی ڕێگای مەککەی کرد و ویشی ئەو ڕێگایە بەو هەموو ناڕەحەتییەشەوە کە هەیەتی لای خواناسان و عاشقانی ڕاستەقینە ڕێگایەکی خۆش و پڕ گوڵ و گوڵزارە ، دەمی لوانج ئاراستەی وشکە صۆفیی درۆزن و ڕیاباز ئەکا و ئەڵێ : دڕکی ڕێگای مەککە جل و مێزەری صۆفییان ئەدڕێ و ڕووت و قوتیان ئەکاتەوە و ڕاستییان ئەخاتە ڕوو ، واتە : ئەوەی ڕێگای مەککە ئەگرێتەبەر ئەبێ خۆی لە هەموو شتێکی دنیایی ڕووتکاتەوە ، خۆ ئەمەش بە وشکە صۆفییەکان ناکرێ ، کەواتە ڕێگای حەج ڕێگایەك نییە ئەوانە بیگرنە بەر و تەنها بە مەردانی ڕاساڵ و بێ کۆڵ و بار ، تەی ئەکرێ ..

لەنێوان (موحریم) و (مەحرەم)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە . هەروەها لە کۆکردنەوەی (سەر ڕووت) و (موریان)دا لەگەڵ (مەحرەم) تەناسوبێکی جوان هەیە ، چونکە لەناو ماڵا هەر مەحرەم ئەتوانێ سەر ڕووت کا و جلەکانی داکەنێ .

یەعنی (کم) و (گم) و (من) : نالی . موحریمانی مەحرەمی (چر) و (ت) : مەحرەمانی موحریمی . (کم) و (گم) محرمان محرمی . بۆ هەردوو ئیحتیمالەکە دەست ئەدا . (ك) و (اح) و (خا) : محرمان محرم و . لەمیش بۆ هەردوو ئیحتیمالەکە دەستئەدا .

بەپێی نوسخەکانی (کم) و (گم) و (من) کە لەجیاتیی (یەعنی) نوسیویانە (نالی) ئەم بەیتە ئەبێ بە دوابەیتی ئەم پارچە هەڵبەستە و بەیتی داهاتوو ئەبێ بە سەرەتای پارچەیەکی نوێ . بەڵام ئێمە ڕێکەی زۆربەی نوسخەکانمان هەڵبژارد لەبەر یەکێتیی کێشی هەموو بەیتەکان و ، لەبەر ناهاوسەنگیی دوابڕگەی هەردوو نیوەکەی بەیتی پاشەوە و ، چونکە ئەو نوسخانەی لەجیاتیی (یەعنی) نوسیویانە (نالی) لەڕاستی نوسخەکانیتردا ئەوەندە جێگای متمانە نین .

(٢٨) شوتوربان : وشترەوان . ڕەوضە : باخچە ، مەبەست حەوشی حەرەمی مەککەیە . عەرار : گوڵە گاچاو . عەرعەر : درەختێکە لە چەشنی سنەوبەر . بان : درەختێکی بەرزی ڕێکە گەڵای وەك گەڵای داربی وایە.

ئەسیری سیلسیلەی بەندی مەھاری سەرقەتارت بم
کە دەمکێشێتە ڕەوضەی حەی وەکو مەجنونی دێوانە (۲۹)

چ ڕەوضە ؟ ڕەوضەیی جەنەت ! چ جەنەت ؟ جەنەتی قوربەت !
چ قوربەت ؟ قوربەتی ڕاحەت ! چ ڕاحەت ؟ ڕاحەتی جانە ! (۳۰)

---

خیابان : شەقام . بیابان : دەشت .

نالی وا پیشان ئەدا کە ئاگری شەوق و سۆزی مەککە و مەدینە هەڵی گرتووە و ئۆقرەی لێبڕیوە ، لەبەوێ ساڵێ زۆر بگاتە بەرەوە . بۆیە بە هەر شوێنێکدا بڕوا لەپرسێ ئەمە کوێیە و بە شوێنێکی پیرۆز و خۆشی پیشان ئەدا . لەم بەیتەدا لە وشترەوانەکەی ئەپرسێ ئاخۆ ئەو دار و دەوەنانەی ئەیانبینێ بەرزینی دەور و پشتی باخی مەککەن ، یاخود گوڵە گاچاو و سنەوبەر و بانی شەقامەکانی ناو ئەو دەشتەن ؟ .

لە کۆکردنەوەی (مەرار) و (عەرعەر) و ، (خیابان) و (بیابان)دا جیناسی لاحیق هەیە ، جگە لەو جوانییەی لە کۆکردنەوەی (بان)و (خیابان)و (بیابان)دا هەیە .

عەرار و (کم) و (من) سیواری . عەرعەر و (چن) و (عم) و (گم) و (من): مەرمەری. (ك) و (اح): عەرعەرە. بانی (چر) و(خا): بان و.(چن) و (عب) : بان . بۆ (بان و) و (بانی)یش دەستنەدا . خیابانی (چر) : خیابان و . (چن) و (ك) و (اح) : خیابان . بۆ (خیابان و) و (خیابانی)یش دەستنەدا .

(۲۹) مەھار : دارێکە ئەکرێتە لوتی وشتر و پەتێکی تێوە ئەبەسترێ . سەرقەتار : سەرقافڵە . حەی : هۆز . مەجنون : شێت ، یاخود قەیسی لەیلای بەناوبانگ .

واتە : یاخوا بە دیل و دەست بەستەی ئەو زنجیرە بم کە بە داری لوتی وشترە سەرقافڵەکەوە بەستراوە ، کە وەکو شێت ، یا وەکو بەکێش کردنی مەجنونی لەیلا بۆ ناو هۆز ، ڕام ئەکێشێ بۆ باخچەی مەککە.

دەمکێشێتە (کم) و (من) : ئەمکێشێتە . حەی : (چن) و (ك) و (اح) : خۆی . مەجنونی (چر) و (عم) : مەجنون و . (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : مەجنون . بۆ هەردوکیان دەستنەدا .

(۳۰) قوربەت : نزیکی . ڕاحەت : حەسانەوە .

واتە : ئەو باخچەیە کە منی بۆ ڕاڵەکێشرێم ، باخچەیەکی عادەتی نییە ،

مەقام و زەمزەمەی حادیٓ ، لە شەوقی کەعبەوو حوجرەی
مەقام و زەمزەمە ، وا ئوشتری هێنایە جۆلانە (٣١)

---

بەلکو باخچەی بەهەشتە .. بەهەشتی نزیکی لە خانەی خودا و مەرقەدی پێغەمبەرەوە (د.خ) .. نزیکییەك کە ئەبێتە هۆی ڕەحەتی و حەسانەوەی گیان نەوەك حەسانەوەی لەشی ڕۆت .

(٣١) مەقام (ی یەکەم) : ئاهەنگ و ئاوازەی مۆسیقا . بە ئاوازێکی تایبەتیش ئەوترێ . زەمزەمە : گۆرانی لەبەرخۆوە وتن . حادیٓ : ئەوەی کە وشتر ڕانەکێشێ و وردە وردە لەبەرخۆیەوە گۆرانیی بۆ ئەڵێ . مەقام ( ی دوەهەم ) : مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم ، شوێنێکە لە کەعبە لەوێن ئیبراهیم نوێژی تیا کردووە . زەمزەم : بیرێکە لە مەککە ، حاجییان ئاوی لێ ئەخۆنەوە بۆ پیرۆزی و لێیشی دێننەوە بۆ ماڵی خۆیان .

رالە : مەقام و وردە گۆرانی وتنی جلەوکێش و وشترەوانە لەبەر سۆز و ئارەزۆی بینینی کەعبە و حوجرەی مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم و بۆ گەیشتن بە ئاوی بیری زەمزەم ، وا ، سەرباری ماندوێەتیی ڕێگای دوور و ناخۆش ، حوشتری خەتووەتە هەڵخستنەوە لەسەر ئاوازی ئەو مەقام و وردە گۆرانییە .

مەقام و : لە هیچ نوسخەیەکدا ئەم (واوی عەطف)ە نەبوو . (عم) و (کم) و (گم) و (من) نوسیبوویان : (مەقامی) . نوسخەکانیتر هەموو نوسیبوویان : (مەقام) . ئێمە ، پشت بەوە کە ئەوەی ئەم نوسخانە ئەشکونجێ (مەقام و) بێ ، واوی عەطفمان لەدوای وشەی (مەقام)ەوە دانا ، چونکە مەعنای بەیتەکە وا باش ئەهات و ڕێنوسی کۆنیش ڕێ ئەدا . زەمزەمەی (چر) و (کم) و (عب) و (من) و (خا) : زمزم و . ئەگەر ئەمیش بە (زەمزەمە و) ئەخوێنینەوە ــ کە بۆیشی دەستلەدات ــ مەعنا نابەخشێ . حادیٓ : تەنها (عم) و (گم) بەمجۆرە و بە ڕاستیان نوسیوە . (چر) و (کم) و (ت) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : حاوی ، بەڵام دیارە هەڵەیە . ئەوەندە هەیە ئەوەی نوسخەی (خا) لە (حادیٓ)یشەوە نزیکە . (چن) و (ك) و («پەراوێزی» خا) : چاری . حوجرەی : ئەمە تێکستی تەنها نوسخەی (عم)ە . نوسخەکانیتر هەموو نوسیویانە (حیجرە) ، واتە حیجری حەزرەتی ئیسماعیل کە شوێنێکی پیرۆزە لە مەککە . ئێمە نوسخەکەی (عم)مان هەڵبژارد چونکە مەعنایەکی زیاتر و بەپیتتر ئەبەخشێ . مەقام و زەمزەمە وا : ئەمە تێکستی تەنها نوسخەی (مم)ە و لەگەڵ (حوجرەی) دەستئەدا . (چر) و (خا) مەقام و زەمزەمەی وا . (چن) و (ت) و (ك) و

**صەریری جونبوشی تەخت و مەحەففەی مەخمەلیی سەوزی**
**دەڵێی تەسبیحی مورغانە ، لەسەر تەختی سولەیمانە (٣٢)**

---

(اح) : مەقام زەمزەمەی ئەو . ئەمیش هەر (مەقام و)وە . (کم) و (گم) و (من) : مەقامی زەمزەمەی وا . (عب) : مەقام زەمزەمە وا . ئەبێ ئەمیش (مەقام و زەمزەمەی وا) بێ . نوشتری (کم) و (گم) و (من) : حوشتری . تێکڕای لـەم نوسـخانە ، جگـە لە (مم) ، لەگـەڵ ئەوە ئەگونجێـن کە (حوجرەی) بە (حیجری) بخوێنرێتەوە .

(٣٢) صەریر : جیزە جیز . جونبوش : جمەوجـوڵ . مەحەففـە : کەژاوە . مەخمەل : جۆرە قوماشێکی قەیفەییی جوانە . تەسبیح : سوبحانەڵـلا کردن . مورغ : پەلەوەر . سولەیمان : حەزرەتی سولەیمان .

واتە : جیزە جیزی بەهۆی جوڵەوەی تەخت و کەژاوەی ، سەوزی لە مەخمەل دروسـتکراوی ، سەر پشتی حوشتری بە زیڵگای مەککەدا ، وەك سـوبحانەڵلا کردنی پەلەوەرەکان وایە بەسـەر تەختـی حـەزرەتی سولەیمانەوە . لە ئایەتی قورئانا هەیە کە حەزرەتی سـولەیمـان زمـانی پەلەوەری زانیوە . بۆیە، دیارە ئەبێ هەمیشـە هەمو جۆرە پەلەوەرێکی لە دەور خڕبوبێتەوە .

لەنێوان هەردو وشـەی (لەخت)دا جیناسـی تەواو هەیە ، هەرچەنـد مەعناشیان جیاوازە .

صەریری (چر) : صـەریر . بەڵام دیارە (صـەریری)یە بەنیشـانەی ئەوەدا لەپاش (تەخت) (و) دانراوە . خۆ ئەگەر بە (صـەریر و)یشـی بخوێنینەوە ، دیارە مەعناکەی هەر دێت و (جونبوشی) معطف ئەبێتە سـەری . (چن) : صـەریرەی . (کم) و (عب) و (من) : حەریرە . (ت) و (اح) : حەریر . (ك): صـەریرە . بەڵام دیارە ع (صـەریرە) و ع (صـەریرەی) و ع (حەریر) و ع (حەریرە) هەمووی هەڵەیە . جونبوشـی (چـر) و (چـن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) : جونبوش . بەڵام دیارە (جونبوشی)یە . لەخت و (مم) و (کم) و (گم) و (من) و (خا) : تەختی . (ت) و (عب) و (اح) : لەخت. مەحەففـەی (مم) و (کم) و (گـم) : مەحەففـە و . (من) : موحەففـا . مەخمەلێ : ئەمە تێکـتی تەنها نوسـخـەی (چر)ە ، لەمیشـــدا (ی)کەی پێوە نیـیـە ، بەڵام ئەنوسـینی ئـەو ( ی )یە بە ڕێنوسی کۆن بـاوە . لە نوسخەکانی‌ترا بەمجۆرەیە (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (من) : مەحفەلی. (ت) و (عب) : مەحمەل . (ك) : مەحمەل و . (خا) : مەحفەل و . ئێمـە نوسـخەکەی (چر)مان پێ باشتر بۆ چونکە ع (مەحمەل) و ع (مەحـفەل)

کەژاوە و دار و بار و تەختەیی لوختی لەسەر بوختێ
دەناڵێنن لە شەوقی طەیبە وەك ئەستونی حەنانە (٣٣)

چ نورێکە لەنێو فانوسی بەرگی کەعبەدا ، ظاهیر
دەکێشێ خەلق و ، باطین ئیمتیثالی ئەمری یەزدانە ؟! (٣٤)

---

هەردوکیان هەر مەعنای (مەحەففە) ئەگەیەنن، بەلام (مەخمەل) مەعنایەکی نوێ ئەبەخشێ و بەیتەکە بەپیتەر ئەکا .

(٣٣) لوخت : زۆت . بوختێ : وشتری دۆ کۆپارە ، جۆرە وشترێکی بەهێزە ، باری زۆر هەڵئەگرێ و ڕەنگی سورە . ئەستونی حەنان : کۆلەکەیەك بوە لە مزگەوتی پێغەمبەردا لە مەدینە ، لە کتێبەکانی سیرەتدا هەیە کەوا پێغەمبەر (د.خ) بەرلەوەی مینبەر و میحراب بۆ مزگەوتەکەی دروست بکا ، ئەچو پاڵی بە کۆلەکەیەکەوە ئەدا خوتبەی ئەخوێندەوە . پاشان کە مینبەری بۆ مزگەوتەکەی دروستکرد ، کۆلەکەکەی بەجێهێشت . کۆلەکە دەستی کرد بە زیرەزیر و گریان ... پێغەمبەریش چو باوەشی پیاکرد و دلی دایەوە .. ئەویش بێدەنگ بو و لە زیرەزیر کەوت ..

واتە : هەمو پارچەکانی کەژاوە و تەختە زۆلەکەی لەسەری دانراوە و بە کۆلی حوشترەکەدا بەستراوە ، هەمو لەبەر سوزی گەیشتن بە مەدینە، وەك کۆلەکەکەی مزگەوتی پێغەمبەر ئەزیرێنن.نالی ئەیەوێ مەعنای جیزە جیز و تەقەتەقی تەختە و قەوارەی کەژاوەکە بە کۆلی حوشترەوە بە سوزی گەیشتن بە شاری مەدینە مەعنا لێبداتەوە .

لەنێوان (لوختی) و (بوختێ)دا جیناسی لاحیق هەیە .

کەژاوە و (چن) : کەژاوەی . (کم) و (من) : کەژاوە . داروبار و (چر) و (عم) و (خا) : دار و باری . (کم) و (من) : دور باری . (گم) : دۆر باری . (ت) و (ك) و (اح) : دار و بار . بۆ هەردو ئیحتیمالەکە دەستئەدا . لوختی (چر) و (گم) : سەحقی . (چن) : سەختی یا سوختی . (کم) و (ت) و (ك) و (من) : سحقی . (عب) و ( خا ) : سوحقی . ( اح ) : سحق . لەسەر (خا) : لەبەر . بوختێ (عم) و (کم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : بختی . دیارە ئەبێ هەر (بوختێ) بێ . (گم) : بەختی . دەناڵێنن (کم) و (من) : ئەناڵێنێ . (گم) : دەناڵێنێ .

(٣٤) واتە : ئەمە چ نورێکە لەناو فانوزێکدا کە بریتییە لە بەرگی کەعبە، بەدیمەن

چ جەذبە ؟ جەذبەیی ضەوئە لە قیندیلی حەرەمدا ، وا
دەبێ ئینسان لە طەوفیدا بسوتێ میثلی پەروانە (٣٥)

چ تورێکە لە حوجرەی ڕەوضەدا وا قالیمە قوبەی ،
قەوامی عەرش و فەرش و قەلبی ئینس و قالەبی جانە ! (٣٦)

---

خەڵك ڕانەکێشێ بۆلای خۆی ، بەڵام لەڕاستیدا خەڵکەکە بە بێدەسەڵاتی خۆیان دێن و ، فەرمانی خوا وایە و ، ئەوان فەرمانی خوا بەجێدێنن ، چونکە کاتێ کە حەزرەتی ئیبراهیم ماڵی کەعبەی کردەوە و ئیسماعیلی کوڕی و دایکی لە مەککە بەجێهێشت، ئەیزانێ کەوا لە شوێنێکی بێنان و ئاوا بەجێیهێشتون ، بۆیە لە خوا پاڕایەوە کە دڵی خەڵك ڕاکێشێ بۆلایان ، وەك لە قورئانا باسی لێکراوە .

نالی لەمبەیتەدا ماڵی کەعبەی شوبهاندووە بە فانوز و ، پایەی کەعبەی لە دڵی موسوڵمانانلدا بە تیشکی چرا و ، موسوڵمانان خۆیان بە پەروانە ( هەرچەنید ناویشی نەهێناوە ) و مەعنای بەیتەکەی گێڕاوەتەوە بۆ سەرگوزەشتە و ڕازی حەزرەتی ئیبراهیم لە مەککەدا ، وەك قورئان باسی لێئەکا .

لەنێو (من) : لەناو . دەکێشێ (کم) و (من) : ئەکێشێ . خەلق و (کم) و (من) و (خا) : خەلقی . (چن) و (گم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : خەلق . بۆ (خەلق و) و (خەلقی)یش دەستنەدا . یەزدانە (عب) و (اح) : سوبحانە .

ئەم بەیتە لە (مم)دا نییە .

(٣٥) جەذبە : هێزی ڕاکێشان . لای ئەهلی تەصەووفیش بارێکی دەروونیی تایبەتییە بەسەر بنیادەمدا دێت . ضەوء : ڕۆناکی . قیندیل : چرادان . طەوف : سوڕانەوە ، تەواف .

واتە : ئەمە چۆن هێزێکی ڕاکێشانە مەککە هەیەتی ! هێزی ڕاکێشانی ئەو ڕۆناکییەیە لە چرادانی حەرەمدا هەیە ، کارێك ئەکا لە بنیادەم بە دەوریا بسوڕێتەوە و وەك پەروانە بسوتێ .

جەذبە جەذبەیی («بەراوێزی» چر) و (عب) : جەذبە و جەذوەوو . جەذوە : پشکۆی ئاگر . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : جەذبە و جەذوەیی . دەبێ (کم) و (من) : ئەبێ .

(٣٦) ڕەوضە : مەرقەدی پێغەمبەر (د.خ) . قائیم : ڕاوەستاو . بەپێوەبۆ .

چ حوجره ؟ حوجرەیی عولیا ، کەوا ئەعلەینی خوددامی
دوڕی تاجی سەری قوطب و وەلییو شاه و سولطانه ! (٣٧)

چ حوجره ؟ وا له خاکی میللەتی دەولەت پەناهیدا
کەمینه خادیمی سولطان و ، شاهەنشاهی دەربانه ! (٣٨)

---

قوبه : گومەزێ . قەوام : هۆی ڕاگیر بوون . عەرش : عەرشـی خوا . فەرش : ڕوویی زەویێ . ئینس : بنیادەم . جان : جانّ ، جنۆکه .

واته : ماشەڵڵا ئەمه چۆن نوورێکه له مەرقەدی پێغەمبەردا کەوا بووه به گومەز و چەتری هەڵداوه و ، عەرشـی خوا و ڕوویی زەویێ و دڵـی ئادەمیزاد و قەوارەی پەریان هەمو لەسەر ئەو بەنده. ئەم بەیته ئیشارەته به حەدیثی قودسـیی ( 'لولاكَ 'لولاكَ .. لَما خلقتُ الأفلاكَ ) .

لەنێوان (عەرش) و (فەرش)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (قەلب) و (قالەب)دا جیناسـی نـاقیص و ، له کۆکردنەوەی (ئینـس) و (جـان)دا طیباق هەیـه .

فەرش و (عم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : فورش . له کوردیـدا (عەرش و فورش) مەشهووره . وادیاره به کوردیێ کراوی (کورسی)یه .

(٣٧) عولیـا : بەرز . ئەعلەین : جووته پێڵاو . خوددام : جەمعی خادیمه واته : نۆکەر . قوطب ، وەلیێ : لای ئەهـلی ئەمـەووف دوو پلـەن لەو پلانەی بنیادەمی خواناسیان پێ ئەگا .

واته : حوجرەی مەرقەدی پێغەمبەر چۆن حوجرەیەکه ؟ ئەو حوجره بەرزەیه که سۆلی پێی خزمەتکارەکانی ، بۆ ئەوه ئەشـێ ببێ به دوڕڕی تاجی سەری گەورەترین پیاوانی دین و دنیا .

(٣٨) کەمینه : کەمتر و بێبایەختر . دەربان : دەرگاوان .

واته : حوجـرەی مەرقەدی پێغەمبـەر ئەو حوجرەیه کـەوا ئەگەر وادابنێین له خاکی میللەتی خاوەن دەولەت و دەولەتداریدایه ، حوجرەیەکی ئەوەنده پایەبـەرزه ئایەختـرین خزمەتـکاری بۆ ئەوه ئەشـێ ببێ به پادشای وڵاتان و ، پادشای وڵاتانیش بۆ ئەوه ئەشێ ببێ به دەرگاوانی .

حوجره وا (چر) و (عب) و (خا) : حوجره و دەر . (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (اح) و (من) : حوجره دەر . («پەراوێزی» خا) : حـوجره دوور . میللەتی دەولەت (چن) : دەولەتی میللەت . (من) و (خـا) : دەولـەت و میللەت . کەمینه (چر) و (خا) : کەمینەی .

چ قوبه ؟ سیلسیلەی قیندیل و شەمعی باب و میحرابی
شوعاعی نوری دیدەی کەوکەبی ئەیوانی کەیوانە (٣٩)

مەکانی واسیطەی ئیمکان ، مەکانەت بەخشی ئینس و جان
مەکینی لامەکان سەیران تێدا تەشریفی میوانە ! (٤٠)

---

(٣٩) باب : دەرگا . کەوکەب : ئەستێرە : کەیوان : ئاسمان . ئەستێرەی زوحەل .

واتە : گومەزی سەر مەرقەدی پێغەمبەر چۆن گومەزێکە ؟ گومەزێکی وایە زنجیرەی چرادان و شەمعی دەرگا و میحرابی ، بوون بەهۆی ئەوە کە چاوی ئەستێرەکانی ئاسمانی بینا بێ ، ئەو ئاسمانەی وەك هەیوان هاتووەتەوە .

لەنێوان ( ئەیوان ) و ( کەیوان )دا جیناسی لاحیق هەیە .

قوبه ( چر ) : قوبیە و . (عب) : قوبیەی . سیلسیلەی (چر) : سیلسیلە و . قیندیل و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : قیندیل . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . (عم) و (گم) و (خا) : قیندیلی . شەمعی (چر) و (عم) و (گم) و (من) : شەمع و . (چن) و (کم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : شەمع . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا . باب و (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : باب . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستئەدا .

(٤٠) مەکان : شوێن . واسیطەی ئیمکان : هۆی بوون . مەکانەت بەخش : هۆی قەدر و پایە . مەکین : پایەدار . لامەکان سەیران : ئەوکەسەی لە شوێنی ناشوێندا سەیرانی کردووە .

واتە : ئەو گومەزە نیشانەی شوێنی ئەو پێغەمبەرەیە کە هۆی بوون و دروستبوونی هەمو گیتییە و مایەی قەدر و پایەی ئادمیزاد و پەریانە و ، ذاتێکیوا گەورە و پایە بلندی تیا میوانە کە سەیرانی لە شوێنێکا کردووە بۆ کەسیتر نەبوە بە شوێن . ئەم ڕستەیە ئیشارەتە بۆ چوونی پێغەمبەر بۆ ئاسمان لە شەوی میعراجدا . مەبەست لە میوانییەکەشی لە تەبرا ئەوەیە کە تا ڕۆژی قیامەت بە لەش لەویا ئەبێ ، پاشان بەهەشتی بالا ئەبێ بە جێی . .

لەنێوان ( مەکان ) و (مەکانەت )دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان ( مەکان ) و ( مەکین )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( مەکین ) و ( لامەکان )دا طیباق هەیە .

چ میوانێکە ؟ صاحێب جێ و جاه و عیزەت وعەزمە
کە دوو عالەم طوفەیلی دەعوەتی و ، ئەو صاحیبی خوانە ! (٤١)

موحەممەد ، ئەحمەدی مورسەل ، مونیری مینبەر و مەحفەل
بەشیری ئاخیر و ئەووەل ، نەذیری خوێش و بێگانە (٤٢)

---

مەکانی (عم) و (گم) : مەکانەت . لێرەدا (عم) مەعنای لێکداوەتەوە و نووسیویە : (مکان تو) . بەڵام هەڵەیە . ئەگەر ئەو دوو نوسخەیە ڕاست بن ، ئەبێ وشەکە ( مەکانەت ) بێ ، واتە پایە .

(٤١) واتە : ئەو پێغەمبەرەی لەو شوێنەدا بووە بە میوان چۆن میوانێکە ؟ میوانێکە خاوەن ڕێ و شوێن و خانەخوێیە .. خاوەن شان و شکۆ و ئیرادەی نەبەزیوە .. هەرچەند بەدیمەن لەوشوێنەدا بووە بە میوان ، بەڵام هەردو جیهان هەمو مفتەخۆری سەر دەعوەتی ئەون و ، هەر ئەوە سفرە و خوانی بۆ هەموان ڕاخستووە . مەبەست لە هەردو جیهان جیهانی بنیادەم و پەریان ، یا جیهانی ئاشکرا و نهێنی ، یا جیهانی دنیا و قیامەتە .

میوانێکە (عم) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : میوانێکی . شێوەی نووسینی (کە) لە (چر) و (چن)یشدا بۆ (کی) دەستنەدا . دەعوەتی و . ( «پەراوێزی» چر) : دەعوەتە و . (چن) و (ت) و (اح) : دەعوەت . بۆ ( دەعوەتێ ) و ( دەعوەت ) و ( دەعوەتی ) دەستنەدا . (کم) و (من) : دەعوەتێ یا دەعوەتی . (ك) و (عب) : دەعوەت و .

(٤٢) مورسەل : فرووستادە . مونیر : ڕووناککەرەوە . مینبەر . لەو شوێنەی مزگەوت کە خوتبەخوێن لیا ئەوەستێ بۆ خوتبە خوێندنەوە . مەحفەل : جێگای کۆبوونەوەی خەڵك . بەشیر : مژدەدەر . ئاخیر و ئەووەل : هەمو وەچەکانی ئادەمیزاد لە سەردەمی هاتنی پێغەمبەرەوە تا ڕۆژی قیامەت . نەذیر : ترسێنەر . ئەم سیفەتانە هەمو سیفەتی پێغەمبەرن ( د. غ ) .

لەم بەیتەدا ئیشارەت بەم دوو ئایەتە کراوە : ( یا ایها النبیُ انا ارسلناكَ شاهداً ومبشراً ونذیراً ، وداعیاً الی الله باذنه وسراجاً منیراً ) .

لەنێوان ( بەشیر ) و ( نەذیر ) و ، (ئاخیر ) و (ئەووەل) و ، (خوێش) و ( بێگانە )دا طیباق هەیە .

سیراجی ئەنبیا ، خەتمی ڕوسول ، نوری موبینی حەق
کە عالی کەعب و قەدر و دەست و صەدر و خاتەمی شانە (٤٣)

لەسەر ئەو ظولمەت ئابادی شەوی کوفرە کە طالیع بو ،
صەلا هەستا لە ئینس و جان کە ڕۆژی نوری ئیمانە (٤٤)

لە نەفخی صور و نەشری بەعثەتی دینی حەق ئیحیا بو
لە قەبری جاهیلییەت هاتەدەر هەرچی موسولمانە (٤٥)

---

(٤٣) عالی کەعب : کەسێ ئەوەندە پایە بەرز بێ کەس نەگاتەوە بە قولە پێیدا . عالی قەدر : پایە بلند . عالی دەست : بەدەستەلات . عالی صەدر : سنگ بەرز : کینایەیە لە پیاوی دەرکەوتو و خاوەن شکۆ . خاتەمی شان : مەشهورە پێغەمبەر نیشانەیەك بە ناو شانیەوە بووە ، لەوە نیشانەی پێغەمبەرێ بووە . مەبەست لە (عالی خاتەمی شان) ئەوەیە مۆری ناوشانی لە هەمو کەس دیار و ئاشکرا بووە .

کەعب و (ت) و (ك) و (اح) : کەعب . ئەمیش هەر ( کەعب و )وە . قەدر و (ەم) و (ت) و (اح) : قەدر . ئەمیش هەر (قەدر و )وە . دەست و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : دەست . ئەمیش هەر (دەست و )وە . خاتەمی (چر) و (کم) و (ت) و (عب) و (من) : خاتەم و . (اح) : خاتەم .

(٤٤) ظولمەت ئاباد : تاریکستان . طالیع : هەلاتو . صەلا هەستا : بانگ بەرز بووەوە .

واتە : کە لە تاریکستانی شەوی تاریکی کافریدا نوری پێغەمبەر دەرکەوت ، بانگەوازی شادمانی لە ئینسان و پەری بەرز بووەوە کەوا ئەمڕۆ ڕۆژی نوری ئیمانە و وا خوری موسولمانەتی هەلهات .

لەنێوان (شەو) و (ڕۆژ) و ، (کوفر) و (ئیمان) و (ظولمەت) و (نور) و ، (ئینس) و (جان)دا طیباق هەیە .

بەکارهێنانی وشەی (طالیع) بۆ پێغەمبەر ئیستیعارەی موصەڕڕەحەیە ، چونکە لەئەسلدا بۆ مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە بەکاردێ و ، پێغەمبەر شوبهێنراوە بە ڕۆژ و دەرکەوتنیشی بە هەلاتنی .

صەلا ( ە پەراوێزی ە چر ) و (خا) : صەدا .

(٤٥) نەفخی‌صور : فوکردن بە کەڕەنادا لەو دنیا بۆ زیندو کردنەوەی مردووان و بردنیان بۆ لێپرسینەوە . نەشری بەعثەت : بلاو کردنەوەی

له سایەی ئەمر و نەهیی ، حەق و باطیل بۆ بە دۆ فیرقە
بە میثلی فەرقی ڕۆژ و شەو کە فاریق نوری ئیمانە (٤٦)

سەعادەت بۆ بە نـور و صاعیدی ذەروەی هیدایەت بۆ
عەلامەت نوری ئیمانی ( بیلال ) و ( وەیس ) و ( سەلمان ) ٠ (٤٧)

---

هەوالی ناردنی پێغەمبەر لای خواوە بۆ گەیاندنی نامەی خوا بە خەڵك .
ئیحیا : زیندو کردنەوە . جاهیلییەت : نەزانی ، سەردەمی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام .

نالی لەم بەیتەدا سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەری شوبهاندووە بە گۆرستانی پاش مردنی هەمو خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا و ، ناردنی پێغەمبەریشی شوبهاندووە بە زیندو کردنەوەی مردووان و ، بڵاوبونەوەی هەوالی سروش بۆ هاتنی پێغەمبەریشی شوبهاندووە بە فوکردن بە کەڕەنای مردو زیندو کردنەوەی ڕۆژی قیامەتدا و ، ئەڵێ : بەهۆی بڵاوبونەوەی هەوالی ناردنی پێغەمبەرەوە لەلایەن خواوە فو کرا بە کەڕەنادا و ، دینی خوا کە لەبەر تەوژمی بتپەرستی ون بوبو ، زیندو بووەوە و هەمو موسولمانان لە گۆڕی نەزانی و گومڕایی دەرچون و هاتنە دنیای ڕۆشنی خواپەرستییەوە .

صور و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : صور . بۆ ( صـور و ) و ( صوری )یش دەستنەدا .

(٤٦) واتە : بەهۆی ئەمر بە چاکە کردن و نەهی لە خراپە کردنی پێغەمبەرەوە ، حەق و ناحەق ڕۆن بووەوە و خاوەن باوەڕ و بێباوەڕ لە یەك جوێ بونەوە و بون بە دو تاقم ، وەك ڕۆژ و شەو و ڕوناکی و تاریکی کە لە یەك جیان و ، جیاکەرەوەی دو تاقمەکەش لە یەك بریتی بو لە نوری ئیمان کە لە نارچاوی تاقمێکیانا دیارە و ئەو تاقمەکەیان لێی بێبەشە .

لەنێوان (ئەمر) و (نەهی) و ، (حەق) و (باطیل) و ، (ڕۆژ) و (شەو)دا طیباق و ، لەنێوان (فەرق) و (فاریق)دا جیناسی ناقیص هەیە .

(٤٧) صاعید : سەرکەوتو . ذەروە : چلەپۆپە ، لوتکە . هیدایەت : ڕێنموێی . عەلامەت : نیشانە . بیلال : بیلالی حەبەشی ، یەکێکە لە هاوڕێکانی پێغەمبەر . وەیس : ئووەیسی قەرەنی ، کە وەیسی مایدەشتیشی پێ ئەڵێن ، یەکێکە لە تابیعین . سەلمان : سەلمانی فارسی ، یەکێکی ترە لە هاوڕێکانی پێغەمبەر .

شەقاوەت بۆ بە دۆد و داخیلی کۆرەی ضەلالەت بۆ
ئەمارەت خوسری خوسرەو ، کەسری کیسرا ، شەققی ئەیوانە (٤٨)

★ ★ ★

---

واتــە : لەورۆژەوە کــە پێغەمبــەر هاتــووە ، بەختیــاری بــووە بە ڕۆشنابییەك و چووەتە ســەر چلەپۆپــەی ڕێنمونی . مەبەســت لەوەیە هەرکەس خوا هیدایەتی نەدا و شارەزای ڕێگای ڕاســت نەبێ ، بەختەوەری ڕۆی لێناکا . بــەڵگەی ڕاستیی ئــەم قــســەیەش موســوڵمان بــوون و بەختەوەربی بیلالی حەبەشی و وەیسی قەرەنی و ســـەلمانی فارسییە ، کە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی مەککە و مەدینە نەبۆن و لەنانەت هەرمیش نەبۆن ، بەهۆی ئیســلام بۆنیانەوە ئەوەندە بەختیار بۆن ، بۆن بەو پیاوە پایە بلندانەی لە مێژۆی ئیسلاما ناویان دەرکرد .

نۆر و (عم) و (کم) و (من) : نۆری . (ت) و (اح) : نۆر . ئەمیش هەر ( نۆر و )وە . (خا) : نۆرێ . صــامیدی (چر) و (چن) و (عب) و (اح) : صامید . ئــەمیش هەر (صــامیدی)یە . (عــم) و (کم) و (من) و (ت) : صــامید و . دەروەی (چر) و (چــن) و (عب) : دەروەی . ئــەمیش هەر (دەروەی)ە . ئیمانی (چن) و (عم) و (کم) و (من) : ئیمان . ئەمیش هــەر (ئیمانی)یە . (ت) و (اح) و («بەراوێری» خا) : ئیمانە .

ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە .

(٤٨) شەقاوەت : بەدبەختی . دۆد : دۆکەڵ. ضەلالەت : گومڕایی . ئەمارەت : نیشانە. خوسر : زیان لێ‌کەوتن. خوسرەو : خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی . کەسر : شکان . کیــسرا نازنــاوی پادشاکانی ســاسانییە . شەق : درز لێ‌بۆن . ئەیوان : هەیوان و تاقی کیــسرا .

واتە : بەدبەختیش بۆ بە دۆکەڵی ڕەش و چووە کۆرەی گومڕاییەوە . ئیتر لەوڕۆژەوە هەرکــەس ڕێگای ڕاســتی ئیــسلامەتی نــەگرێ هەر ماڵوێرانیی بۆ لەمێنێتەوە . نیشانەی ڕاستیی ئەم قــسەیەش ئەوەتە کە لەگەڵ لــەدایکبۆنی پێغەمبــەردا ( د. خ ) تــاقی کیسرا درزی لێبــۆ . خوسرەوی پەروێزیش کە ئایینی ئیــسلامی پەســند نەکرد ، لەســەر دەستی شێرۆیەی کوڕیدا کوژرا و ، کیسرا شکا .

نیوەی دۆهەمی ئەم بەیتە لە (کم) و (گم) و (من)دا بەمجۆرەیە :

**شەقاوەت (نالی) ، وەك دۆکەڵ بە کۆرەی گومڕەهیدا چۆ**

له جوملەی موعجیز ئەندەر موعجیزی : ئەحکامی قورئانە
کە میعراجی بولەندی ئەووەلی ئایاتی « سوبحان »ە (٤٩)

لە نوری موعجیزەی تیغی نەما قەت ظولمەتی شوبهەت
کە ڕۆناکیی شەوی میعراجی ، ڕۆژی بەدری بورهانە (٥٠)

---

(٤٩) موعجیز : یا موعجیزە ، ئەو کردەوە لە عادەت بەدەرەیە کە تەنها لەوکەسانە ئەوەشێتەوە کە ئیدیعای پێغەمبەریێ ئەکەن . ئەندەر : لەناو . سوبحان : مەبەست لێی سوورەتی ( ئیسراء )ە کە سەرەتاکەی بەم ئایەتە دەست پێئەکا ( سُبْحانَ الَّذي أسْرى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ المَسْجِدِ الحَرامِ الى المَسْجِدِ الأقصى الَّذي بارَكْنا حَوْلَهُ .. ) .

واتە : یەکێ لە موعجیزەکانی لەناو موعجیزەی قورئان ئەوەیە باسی میعراجی بەرزی پێغەمبەر و چۆنی بۆ ئاسمان ، یەکەمین ئایەتی سوورەتی ( سبحان الذي اسرى )یە کە سوورەتی ئیسرایە .

ئەمەی نالی ئەیڵێ وردەکارییەکی زۆر جوانە ، چونکە قورئان خۆی موعجیزەیە و ، میعراجیش هەر موعجیزەیە و ، باسی میعراج لە قورئانا ( موعجیزەی ناو موعجیزە )یە .

موعجیز ئەندەر ( چن ) : موعجیزالی .

(٥٠) ظولمەت : تاریکێ . شوبهەت : گومان . بەدر : غەزای بەدر .

واتە : بەهۆی ڕۆناکیی موعجیزەی شمشێری پێغەمبەرەوە ، تاریکایی گومان ، بە هیچ کلۆجێ ، لە دڵی کەسا نەما .. چونکە پێغەمبەر وەنەبێ تەنها هەر موعجیزەی پیشان دابێ . بۆ پشتگرتنی موعجیزەکانی هێزیشی بووە ، لەوەتە بەلگەی ڕاستیی و ڕۆناکیی شەوی میعراج ، بە سەرکەوتنی شەڕی ڕۆژی ( بەدر )دا دیارە کە ئەصحابەکانی پێغەمبەر بتپەرستەکانی مەککەیان شکاند .

ئەشکونجێ نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە بەمجۆرە مەعنا لێکبدەینەوە کەوا بەهۆی ڕۆناکیی و ئاشکرایی موعجیزەی پێغەمبەرەوە تاریکایی گومان لێغ و بزندەبیی نەما ..

لە کۆکردنەوەی (نور) و (ظولمەت) و ، (شوبهەت) و (بورهان) و ، (شەو) و (ڕۆژ)دا طیباق و ، لەنێوان (ڕۆژ) و (بەدر)دا جۆرە طیباقێك و ، لەنێوان (شەو) و (بەدر)دا جۆرە تەناسوبێك هەیە .

موعجیزەی (چر) و (عم) و (خا) : موعجیزی . دوور نییە ئەمیش هەر

## شەوەمما ، شەوچراغی جەدی و ثەور و مەرتەعی شامی ،
## دوصەد قەرنی غەزالە و قۆچی صوبحی عیدی ، قوربانە (٥١)

---

(موعجیزەی) بێ . (ك) : موعجیزە : میعراجی : تێکستی هیچ نوسخەیەك وا نییە . تەنها (عب) نوسیویە (میعراج و) ئەوانیکە هەمو نوسیویانە (میعراج) . ئێمە خۆمان کردمان بە (میعراجی) چونکە یەکەم وشەی (بەدری) لەدواوە واتەکەیەنێ ئەمیش (میعراجی) بێ و ، دوەم ڕێنوسی جارانیش مەیدانی شتیوای لیایە . بە لێکدانەوەیەکی کەمێك دوور (میعراج و)یش مەعنای دێت .

(٥١) شەوەمما : شەو ئەمما . جەدی : یەکێکە لە برجەکانی ئاسمان . ثەور : یەکێکیترە لە برجەکان . مەرتەع : لەوەڕگە . قەرنی غەزالە : شاخی ئاسك . یەکەم سەردەرهێنانی خۆر لە سبەینێدا .

نالی لەم بەیتەدا کەلکی لەوە وەرگرتووە کە گەلێ لە وشەکان پتر لە مەعنایەکیان هەیە و بۆ پەیوەند کردنیان بەیەکەوە دوو مەعنای لە هەندێکیان مەبەست بووە . ئەوەتە ئەڵێ : ئەو شەوەی کە پێغەمبەری لیا چو بۆ میعراج ، ڕاستە شەو بۆ ، بەلام چۆن شەوێك بو !! شەوێ بۆ ئەستێرەی شەوچرای وەك ئەستێرەی جەدی و ثەور و لەوەڕگەی شامی لەور ــ لێرەدا « ثەور »ی بە « گا » مەعنا لێداوەتەوە ــ و دوصەد هەڵهاتنی تازەی خۆری بەیانێ ــ کە بە عەرەبی پێی‌ئەڵێن « قرن الغزال » واتە « شاخی ئاسك » ــ و قۆچی بەیانیی جەژنی قوربان ، لە ئاست ڕۆشناییی لەو شەوی میعراجەدا ئەبن بە قۆچی قوربانێ .

ئەشکونجێ وای مەعنا لێبدەینەوە (شەوچراغی) بۆ (شەو) بگەڕێتەوە ، نەك بۆ (جەدی) و (ثەور) . هەروا ئەشکونجێ (مەرتەعی ثەوری) بۆ (دوصەد قەرنی غەزالە) بگێڕینەوە ، نەك بۆ (ثەور) . بەم‌پێیە وشەی (قوربانە) ئەبێ بە خەبەری موبتەدا نەك (قۆچی) .

جەدی و (گم) و (ت) : جەدی . ئەبێ ئەمیش هەر (جەدی و) بێ . ثەور و (چر) و (چن) و (ت) و (اح) و (من) : ثەور . بۆ (ثەور و) و (ثەوری)یش دەستنەدا . (ك) و (خا) : ثەوری . شامی (چر) و (خا) : شامێ . ( « بەراوێزی » چر و خا ) : شاهێ . (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : شاهی . دوصەد (عم) : کە صەد . قەرنی (ت) و (اح) و ( « بەراوێزی » خا ) : قەرقی . غەزالەو (کم) و (گم) و (عب) و (من) : غەزالە . (ت) و (خا) : غەزالەی .

له خەوف و خەجلەتی ، بەدری شەمی ئەنجوم سوپەهـ ئیستەیش
کە هەڵدێ ، زەردیو سوورێ لە طەلعەتیا نومایانە (٥٢)

شەوئەما ، کەوکەبەی هەر کەوکەبی نیلی فەلەك دەتگوت
لە میصری ڕۆژی زینەت دەستی مووسای ئیبنی عیمرانە (٥٣)

---

(٥٢) خەجلەت : خەجالەتی . شەرمەزاری . بەدر : مانگی چواردە . ئەنجوم : جەمعی (نەجم)ە واتە ئەستێرەکان . سوپەهـ : لەشکر . طەلعەت : هەڵهاتن . ڕوو . نومایان : ئاشکرا و دیاری .

واتە : مانگی چواردە کە شاهێکە ئەستێرەکانی ئاسمان لەشکرینی ، لەترسی ڕووناکیی شەوی میعراج و لە شەرمەزاریی خۆیدا لەعاستی ڕووناکیی ئەودا ، ئێستاش کە هەڵدێ ، زەردێ ، و سوورێ لەڕوویا ئاشکرایە ، زەردیی ترس و سووریی شەرمەزاری . مەبەستی نالی ئەوەیە بڵێ ئەم زەردێ و سووریی مانگی چواردەیە لە شەوی میعراجەوە پەیدا بووە و هۆیەکەشی ئەوەیە کە باسی کرد ..

ئەشکونجێ مەعنای (هەڵدێ) وا لێبدەینەوە کە لە (هەڵهاتن)ی بەمەعنا (ڕاکردن) وەرگیرابێ . بەمپێیە هەڵاتنەکەشی هەر بەردەوامیی ڕاکردنی ئەبێ لەبەر ترس و شەرمەزاری . بەگوێرەی ئەم مەعنایە تەناسوبێکی جوان لەنێوان (هەڵاتن) و (شەهـ) و (سوپەهـ)دا ئەبێ .

شەمی ئەنجوم سوپەهـ ئیستەیش (چر) و (عم) و (گم) و (من) و (خا) : شەمی ئەنجوم سوپیهر ئیستەیش . (چن) : سەپوە ئەنجومە ئیستەیشە .

(٥٣) کەوکەبە : گەشەداری و شان و شکۆ . نیلی فەلەك : ئاسمانی شین . ڕۆژی زینەت : ڕۆژی شایی و ئاهەنگ لە میسر کە حەزرەتی مووسا دەستی لە ڕووی فیرعەونا لیا کرد بە باخەڵیا و دەری‌هێنا وەك چرا گڕا و بەکی جادووی جادووگەرانی فیرعەونی پێ‌خست ، وەك لە ئایەتی ( قالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ )دا ئیشارەتی بۆ کراوە .

واتە : ڕاستە ، شەوی میعراج شەو بوو ، بەڵام شەوێ بوو ئەتوت شان و شکۆی هەر ئەستێرەیەکی ئاسمانی شینی ، دەستی حەزرەتی مووسای کوڕی عیمرانە لە ڕۆژی زینەتدا کە ئەیکرد بە باخەڵیا و دەری‌ئەهێنا ، ئەگڕا .

کەوکەبەی (کم) و (من) : کەوکەبی . هەر کەوکەبی (عم) و (گم) : هەر کەوکەبەی . دەتگوت (کم) و (من) : ئەموت . (صب) : دەموت .

شەوێمما ، غیبطەیی نوری سوورەیدایی دڵ و دیدە
شەوێمما ، خۆر تیا گۆیا لە شەرمی نوری پەنهانە (٥٤)

شەوێمما ، ڕۆژی ڕۆشن نەیگەیشتێ گەرچی ئیستاکەش
لەدوای شەو کەوتووە ، دەڕوا بەسەر سەر ، گەرمی سەیرانە (٥٥)

لە هیجری یوسفی میراجی ، یەعقوبی فەلەك ، چاوی
نوجومی بۆ سپی ، هێشتاکو هەر حەیران و سەهرانە (٥٦)

---

(٥٤) غیبطە : ئەوەتە کەسێك ئاواتی ئەوە بخوازێ شتێکی باشی دەسگیر بێ کە کەسێکی‌تر هەیبێ . سوورەیدا : ڕەشێنەی چاو . ناوکوڕۆکی دڵ . گۆیا : گوایە .

وانە : هەرچەند ئەوکاتەی پێغەمبەری تیا چوو بۆ میعراج ، شەو بۆ و نوری گلێنەی چاو و خوێنی ڕەشی دڵ ئاواتەخواز بوون وەك ئەو ڕەش بونایە .. شەوێکی‌وا ڕووناك بو ئەتوت خۆر لە شەرمی نوری ئەو خۆی شاردووەتەوە .

(٥٥) وانە : بەڵێ ، شەوی میعراج شەو بوو و شەویش تاریکە ، بەلام ڕۆیشتنی پێغەمبەر لەوشەوەدا بۆ ئاسمان ، ڕۆشنییەکی‌وای پێبەخشی ، ڕۆژی ڕۆشن ئیستاش لەسەر سەر بەدوایدا ڕائەکا و سەرگەرمی گەڕانە بەدوایا بەڵکو پێی‌بگاتەوە شتێکی لەو ڕووناکییەی لێ بستێنێ ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر پێی ناگاتەوە .

هەرچەند لە بە دوای یەکا هاتنی شەو و ڕۆژا ناتوانرێ دیارێ بکرێ کامیان لەپێشەوەیە و کامیان لەپاشەوەیە ، بەلام چونکە میعراج لە شەوا بووە و ڕۆژ بەدوای ئەوا هاتووە ، ئالی وای بڕیار داوە کە شەو لەپێشەوەیە و ڕۆژ بەدوایا ڕائەکا ..

لەدوای (خا) : کە دوای . لە ( «پەراوێزی» خا )یشدا هەر : کە دوای . سەرگەرمی سەیرانە (چر) و (ك) و (خا) : سەرگەرم سەیرانە . دیارە ئەمیش هەر (سەرگەرمی)یە . (چن) : سەرگەرم و شێرانە (عم) و (گم) و (ت) : سەرگەرم و حەیرانە . (مب) : سەرگەرم شێرانە . دیارە ئەمیش (سەرگەرم و)وە . (اح) : سەرگەرم وێرانە . دیارە ئەمیش (سەرگەرم و)وە . ( « پەراوێزی » خا ) : سەرگەرم و وێرانە .

(٥٦) هیجر : دوری . حەیران : سەرسام . سەهران : شەونوخونی‌کێش .

فەلەك پەردەی شەب ئەندەر ڕۆژی سەر فانۆسی ئافاقی
زەمین و ئاسمان ، لەم بانە تا ئەو بانە تابانە (٥٧)

شەوەما صوبحی بیداریی طالیع بۆ کە جوبرەئیلی
ئەمین بۆ خزمەتی طاها تیا مەئمووری فەرمانە (٥٨)

---

نالی لەم بەیتەدا ئاسمانی شوبهاندووە بە حەزرەتی یەعقوب و ، شەوی میعراجی شوبهاندووە بە حەزرەتی یوسف و ، ئەستێرەکانی ئاسمانی داناوە بە چاوی حەزرەتی یەعقوب ، واتە چاوی ئاسمان . ئەم شوبهاندنانەشی لەسەر بناغەی ئەوە داناوە کە چاوی حەزرەتی یەعقوب لەبەر دووریی حەزرەتی یوسف کوێر بۆبوو و سپی بۆبوەوە . نالی ئەڵێ : هەروەك چۆن چاوی حەزرەتی یەعقوب لەبەر دووریی حەزرەتی یوسف کوێرایی داهات و سپی بووەوە ، ئاسمانیش لەبەر دوورکەوتنەوەی شەوی میعراج و نەمانی ، کوێرایی داهات و چاوی سپی بۆ ، ئەوەتە ئەستێرەکانی سپین وەك چاوێ ئاوی سپیی داهاتبێ .

حەیران و (ت) : حەیران . دیارە ئەمیش هەر (حەیران و)وە. سەهرانە (چن) : هەراسانە . بەڵام ئەوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ ، مەگەر وشەی (هەر)ەکەی پێشەوە نەبێ . (کم) و (من) : دامانە .

(٥٧) شەب ئەندەر ڕۆژ : شەو لەناو ڕۆژا ، شەبەنگە بە ڕۆژ ، کینایەیە لە کۆبونەوەی هەمو ڕەنگە ڕۆشن و تاریکەکان . فانوس : چرادان . تابان : تیشکدەرەوە .

واتە : پەردەی بەرفراوانی ، هەمە ڕەنگی ، سەر چرای ئاسۆی ئاسمان و زەوێ ، لە بانی زەوییەوە تا بانی ئاسمان تیشك ئەداتەوە و ڕۆشنە بەبۆنەی چونی پێغەمبەرەوە بۆ میعراج .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (مم) و (کم) و (من)دا هەندێ جیاوازیی هەبو ، بەڵام هەمو ئەو جیاوازیانەمان بە هەڵە زانی ، بۆیە پشت گوێمان خستن .

(٥٨) طالیع : بەخت و چارە . طاها : یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر ( د. خ ) .

واتە : بەڵێ ، ڕاستە شەو بۆ کە جوبرەئیلی ئەمین چو بۆ لای پێغەمبەر ، فەرمانی ئەوەی پێ سپێرابۆ لەگەڵ خۆیی بەرێ بۆ میعراج ، بەڵام شەوێ بۆ بەخت تیا بێدار بۆبوەوە ، شەوی بەخت نەبۆ ، سبەینێ بۆ .

به فەرموودەی خودا فەرمووی : بفەرموو ا ، هەستە هەر ئێستە
لەجێی بەدری دوجاوو دوڕڕی یەکتا ، دوڕڕی یەکدانە (٥٩)

ئەمن مەهدیی ئەتۆ هادیی ، شەوی تەجرید و تەقریبە
لەبەرکە خەلعەتی قورئان و ئەم تەشریفی ڕیضوانە (٦٠)

---

طالیع بوو (عم) و (کم) و (گم) و (من) : طولووعی بوو . تیا (چر) و (عم) و (کم) و (عب) : تێدا . فەرمانە (عم) و (کم) و (گم) و (من) : قورئانە .

(٥٩) بەدری دوجا : مانگی چواردە کە شەوی تاریك ڕووناك ئەکاتەوە . دوڕڕی یەکتا : ئەو دوڕڕەی کە بەتەنها لە سکی ماسیدا ئەبێ ، لەبەرئەوە دوڕڕێکی گەورە و گرانبەها ئەبێ . یەکدانە : تاقانە و تەنها ، وەك یەکتا .

واتە : جوبرەئیل کە لەو شەوەدا چووە لای پێغەمبەر ، بە فەرموودەی خودا پێیوت ئەی مانگی چواردەی تاریکەشەو و ئەی دوڕڕی تاقانەی گرانبەها ، هەر ئێستە هیچ مانڵ مەبە ، هەستە، لەشریف بێنە لەگەڵم .
لەنێوان ( فەرموودە ) و ( فەرمووی ) و (بفەرموو ) و ، لەنێوان (هەستە) و ( ئێستە )دا وشە ئاراییەکی جوان هەیە .

بە فەرموودەی (چن) : بە فەرمووبێ . هەستە هەر ئێستە (عم) : زوود هەر ئێستە . دیارە ( زوو دە )یە . (گم) : زووکە هەر ئێستە . (من) : تۆ هەر ئێستاکە . بەدری دوجاوو (چن) و (ك) و (اح) : بدر الدجیوو .

(٦٠) مەهدیی : ڕێگا پیشاندراو . هادیی : ڕێگا پیشاندەر . تەجرید : ڕووت بوونەوە لە ماددیات . تەقریب : نزیك بوونەوە لە خوا . خەلعەت : خەڵات . تەشریف : شەرەفمەند کردن . ڕیضوان : ڕەزامەندیی خوا .

واتە جوبرەئیل بە پێغەمبەری ڕاگەیاند کەوا هەرچەند من بەدوای تۆدا هاتووم ، بەڵام من لە حوزووری تۆدا شایانی ئەوە نیم ببم بە ڕێ‌پیشاندەر . تۆ ڕێ پیشاندەری منی و من نەشارەزا و ڕێ پیشاندراوم ، چونکە ئەمشەو وەك شەوەکانی‌تر نییە ، ئەمشەو شەوی ڕووت بوونەوەیە لە ماددیات و لەوە کە منیش بەجێ‌هێنەری ئەرکی سەرشانی خۆم بم وەك شارەزایەك لە ئاسمان . ئەمشەو شەوی نزیك بوونەوەیە لەخوا و تۆیش پایەت لای خوا لە من بەرزترە .. دەسا فەرموو خەڵاتی قورئان لەبەرکە کە بریتییە لەوە ئایەتی قورئان هەواڵی میعراجت ڕاگەیەنێ و ، بە شەرەفی ڕەزامەندیی خوا بەهرەمەند ببە کە لەوەتە بانگی کردوی بۆ حوزووری خۆی .

که مەدعۆی لازەمان و لامەکان و قوربی بێچۆنی
سوار بە لەم بوراقە باریقە ، لەم ڕەخشە ڕەخشانە (٦١)

وەها هەستا بە باڵی جاذیبەی قودرەت ، لە نیوەی ڕێ
بەجێما ئەسپ و پەیك و ڕەفرەف و ئەم چەرخی دەورانە (٦٢)

---

ئێمە وای بۆ ئەچین وشەی (قورئان) لەم شوێنەدا (قوربان) بوبێ ، واتە نزیکێ لە خوا و ، نوسخەکەی (چن) و ( « پەراوێزی » خا )یش ، وەك پاشان باسی لەکەین ، هەرچەند بەرودوایەکیان لیایە ، پشتی ئەم بۆچونەمان ئەگرن .

قورئان و ئەم تەشریفی ڕیضوانە (چن) و ( « پەراوێزی » خا ) : ڕیضوانی لەم تەشریفی قوربانە . (کم) و (من) و (خا) : قورئانی ئەم تەشریفی ڕیضوانە . (لە) و (اح) : ڕیضوان ئەم تەشریف قورئانە . دیارە (ڕیضوان و ئەم تەشریفی قورئانە)یە .

(٦١) مەدعۆ : بانگکراو . لازەمان : ئەوەی لەکاتا نییە . کینایەیە لە خوا . لامەکان : ئەوەی لە شوێندا نییە . کینایەیە لە خوا . قورب : نزیکێ . بێچۆن : بێهاوتا . بوراق : ئەو ئەسپەیە کە سیرەتنوسان ئەڵێن پێغەمبەر لە شەوی میعراجدا سواری بووە . باریق : تیژ وەك برۆسکە . ڕەخش : ناوی ئەسپەکەی ڕۆستەمی زالە . لێرەدا لەو مەعنایەوە خوازراوە بۆ بوراق . ڕەخشان : درەخشان .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بانگکراوی لەلایەن خواوە کە نە لە کاتایە و نە لە شوێندا ، بانگکراوی بۆ نزیکێ لە خواوە ، نزیکییەکی ئەوتۆ نە بە جێکەیە و نە بە کات . کەواتە فەرمۆ سواری ئەم بوراقە تیژڕەوە و ئەم ڕەخشە جوانە ببە .

کە مەدعوی (چن) : لە دەعوەی . لامەکان و (چر) : لامەکان . بۆ (لامەکان و) (لامەکانی)یش دەستنەدا . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : لامەکانی لازەمانی . (عب) : لازەمان لامەکان و . دیارە (لازەمان و )وە . بوراقە (چن) و (ت) : بوراق . بۆ (بوراقە) و (بوراقی)یش دەستنەدا . (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : بوراقەی .

(٦٢) جاذیبە : ڕاکێشەر . پەیك : فروستادە . مەبەست لە جوبرەئیلە . ڕەفرەف : شتێکی‌ترە سیرەت نوسان ئەڵێن پێغەمبەر پاش دابەزینی لە بوراق لە شەوی میعراجدا سواری ئەو بووە . چەرخی دەوران : ئاسمانەکان .

سوشەڕزەف بۆ بە تەختی عەرش و تاجی قوربی ( عند الله )
بە هەرچی دەرجی ( او ادنی ) و ( ما اوحی )ی قورئانە (٦٣)

بە هەرچی چاوی دینی عیشقی تێدا شاهیدی صیدقە ،
بە هەرچی دیدەیی عەقلی تیا شەوکوێر و حەیرانە (٦٤)

---

واتە : پێغەمبەر کە ڕاسپێرییەکەی خـوای پێگەیشت ، بەجۆری گورج ڕاست بووەوە و بە باڵـی هێزی ڕاکێشەری توانای خودا ڕێگای بڕی ، بـوراقیش و جوبـرەئیلیش و ڕەفرەفیشی لە نیـوەی ڕێگەدا بەجێهێشت ، چونکە لەوان هەریەکە ڕادەیەکیان بۆ دانرابۆ ، نەئەبۆ لەو ڕادەیە زیاتر لەگەڵی بڕۆن . چەرخی ئاسمانەکانیشی بۆیە بەجێهێشت چونکە ئەبۆ سنووری مادديات بەجێبێڵێ . . .

ئەسپ و پـەیك و ڕەفـرەف و (چن) و (لد) و (اح) : ئەسـپ پەیك ڕەفرەف . دیارە لـەم نوسـخانەشدا لەبێ بـە ( و )ی عەطفەوە بێ . نوسخەکانیتر بە دانەنانی (و)ی عەطف و دانانی (ی)ی ئیضافە لەسەر ئەم وشانە ، کەوتوونەتە هەڵەوە ، بۆیە پشتگوێمان خستن . لە نوسخەکەی (صب)دا ئەم نیوە بەیتەمان بۆ نەخوێنرایەوە ، چونکە کوژابوەوە . دەورانە ( چن ) : گەردانە .

(٦٣) دەرج : نوسـراو . تیا دانراو .

واتە : پێغەمبـەر لەو شەوە پیرۆزەدا شەرەفمەند بـۆ بە دانیشتن لەسەر تەختی عەرشی خوا و بە لەسەرنانی تاجی نزیکی لای خوا و ، بە زانینی هەمۆ ئەو ڕاز و نهێنییانەی دۆ ئایەتی ( فکانَ قابَ قوسَینِ اوْ ادْنی ) و ( فاوحی الی عَبْدِه ما اوْحی ) ئەیانگەیەنن .

(٦٤) دین : بینین . شاهیدی صیدق : شاهیدی ڕاستی .

واتە : پێغەمبـەر لەو شەوەدا ، دیسانەوە شـەرەفیاب بۆ بە دیتنی هەرچی کە تەنها چاوی بینینی خۆشەویستی لە ئیددیعای بینینیا باوەڕی پێئەکرێ و بە شاهیدی ڕاستگۆ دائەنرێ . هەروەها شەرەفیاب بۆ بە بینینی هەرچی کە ئەنانەت چاوی عەقڵیش شەوکوێر و حەیرانە تیایدا و پێی بەدی ناکرێ .

نالی لەم بەیتەدا دۆ چاوی بۆ بینین داناوە ، چاوی خۆشـەویستی و چاوی عەقـڵ . . چاویتری هەر بـە هیچ داوەتە قەڵەم . لـە چاوی خۆشەویستی و چاوی عەقڵیش ، وزەی دیتنی ڕاستەقینەی داوە بە

موخەصـەص بۆ ، مورەخخەص بۆ بە ئەسراری کە تەقریری
ئەجەلل و ئەعظەم و ئەعلا لە تەعبیری سوخەنداتە (٦٥)

پەیاپەی هاتەوە سەر جێگەیی گەرمی لەگەڵ توحفەی
صەلات و هەم سەلام بێ لەو حەبیبی پاکی سوبحانە (٦٦)

---

چاوی خۆشەویستی و ، مەبەستی ئەوەیــە بڵێ ئیدراك و تێگەیشتن و دیتنی ڕاستەقینە هەر تەنها لە تـوانای خۆشـەویستیدایە کارێك بکا دەسەڵاتی بنیادەمی بەسەرا بشکێ و تەنانەت مەقڵیش لەئاستی شتیوادا داماو و پەککەوتەیە . بە وشەی (دیـن) کە واتە بینین ، ئیشارەتی بۆ مەعنای (ئایین)یشی کردووە ، کە ئەوەش واتەگەیەنێ ئایینی ڕاستەقینە تەنها بە خۆشـەویستییەوە ئەبێ و چاوی عەقڵ توانای دیتنی ئاینێ بۆ بنیادەم مسۆگەر ناکا .

عیشقی (چن) و (کـم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) : عیشـق . دیارە ئەمیش هەر (عیشقی)یە . تیا (چن) و (گم) و (ت) : تێدا .

(٦٥) سوخەندان : قــەزان .

واتە : پێغەمبەر لەو شەوەدا شتی نهێنیی‌وای پێ‌وترا و ڕێگای درا بە ڕاز و نیازی‌وا بزانێ ، گەلێ لــە ڕۆری ئەوەوەیە بنیادەمی قــەزان و زیرەك و لێ‌هاتوو بتوانێ باسـی لێ بکا و بیگێڕێتەوە ، چونکە تەنانەت قورئانیـش کورتە ئیشارەتێکی بۆ ئەو شتانە کردووە . .

(٦٦) پەیاپەی : دەس‌بەجێ . توحفە : دیاری .

واتە : پێغەمبەر (د.خ) پاش ئەوەی گەیشتە حوزووری بارەگای خوا ، دەس‌بەجێ گەڕایەوە بۆ سەر جێگە گەرمەکەی ، چونکە ئەم سـەفەری میعـراجەی ئەوەنـدە کاتی نەخـایاندبۆ جێـگاکەی سارد ببێتــەوە ، دیاریەکیشـی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ موسـوڵمانان کە پێنج فەرزەی نوێژە . دەسـا صەلات و سەلامی خوای لێ بێ ئەو خۆشـەویسـتی پاکی خودای بێ‌گەردە !

وشەی (صـەلات) ئیشـارەتێکیشـی تیایە بۆ ئەوە کە دیاریەکە نوێژە ، چونکە ( صـەلات ) بە عەرەبێ بەمەعنا (ڕەحمەت)یش و بەمەعنا (نوێژ)یش هاتووە .

سەلام بێ لەو (چن) : سەلامە لەو . (مم) و (گم) : سەلام بۆ ئەو . (ت) و (عب) : سەلامێ بۆ . (ك) و (اح) : سـەلام و بۆ . ( « پەراوێزی » خا ) .

لەگەڵ ئال و لەگەڵ صەحبی ، خوصوصەن چار یاری دین
ئەبوبەکر و عومەر ، عوثمان و حەیدەر شێری یەزدانە (٦٧)

بە قوربانی عولومی ئەووەلین و ئاخیرینت بم
لەگەڵ ئەسراری قورئانت کەوا ئەلطافی ڕەحمانە (٦٨)

مورادم ذیللەت و پاڕانەوەی حاڵە ، نەوەك نەعتە
بە چەن بەیتێکی کوردانە ، کە قورئانت ثەنا خوانە (٦٩)

ئەگەرچی کوردی دوری شارەزوری قەسوەتم ، ئەمما
وەسیلەم طەیبەوو حیلمی شەفیع و فەضلی مەنانە (٧٠)

---

سەلام بێ بۆ .

(٦٧) ئال : موسوڵمانانی هۆزی بەنی هاشم و بەنی موطەلیب . صەحب : ئەصحابە : ئەوکەسانەی بە موسوڵمانی پێغەمبەریان دیبێ و بە موسوڵمانی مردبن .

ئال و (چر) : ئالی . چار (عم) و (گم) : چوار . ئەبوبەکر و (چر) و (صب) : ئەبابەکر و .

ئەم بەیتە لە (ت)دا نییە .

(٦٨) واتە : بە قوربانی زانستی وەچەکانی پێشەوە و پاشەوە بم کە هەمو زانستی تۆیە و ، بە قوربانی نهێنییەکانی قورئان بم کە لوطفی خوان بە تۆ گەیشتون .

ڕەحمانە (چن) و (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : سوبحانە .

(٦٩) ذیللەت : زەلیلی . نەعت : پیا هەڵدان . ثەناخوان : تەعریف‌کەر .

واتە : مەبەستم لەم چەند بەیتە کوردیە ڕەمەکیە ئەوە نییە بە شان و باڵتا هەڵدەم ، چونکە تۆ خوا خۆی تەعریفی کردوی و پێی‌وتوی ( وَاِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ ) . ئیتر ئەبێ تەعریف‌کردنی من چی بێ .. مەبەستم باسی کوڵوڵیی خۆم و پاڕانەوەیە لە بارەگاتدا .

لە کۆکردنەوەی (حاڵ) و (نەعت)دا تەناسوب هەیە ، چونکە هەردوکیان زاراوەی عیلمی نەحون .

حاڵە (کم) و (من) : خۆمە .

(٧٠) قەسوەت : دڵڕەقی . شەفیع : شەفاعەتکار . مەبەست لە پێغەمبەرە .

به سەر هاتوومە ئەو خاکەی کە هەر مثقالە ذەڕڕێکی
به میزانی شەفاعەت کێوی حیلم و بەحری غوفرانە (٧١)

---

مەننان : خاوەن خێر و ڕەحمەت .

واتە : هەرچەند من کوردێکی دوور وڵاتی خەڵکی شارەزووری دڵڕەقی و بێڕەحمیم ، بەڵام ترسم نییە ، چونکە هۆی ڕزگاربوونم شاری پیرۆزی مەدینە و لێبووردنی پێغەمبەری شەفاعەتکار و گەورەیی و بەخشندەگیی خوای بەدەست و دەهەندەیە .

لەنێوان وشەی (شارەزووری)دا بەپێی شێوەی جارانی نووسین کە ئەنووسرا (شارزور) و بۆ (شاری زۆر و) یا (زۆر و)ی عەرەبیی بەمەعنا (بوختان) دەستی ئەدا ، لەگەڵ وشەی (قەسوەت)دا تەناسوبێکی جوان هەیە .

شارەزووری (چر) : شارەزوورە . (چن) : شارەزوور و . (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : شەهرەزوور . ئەمیش ( شەهرەزووری )یە . (حا) : شەهرەزووری . طەبیەوو حیلمی شەفیع و . (عم) و (گم) و (من) : طەیبەی حیلمی شەفیعی . (کم) و (عب) : طەیبەوو حیلم و شەفیعی . (ت) و (ك) و (اح) : طەیبەیی حیلم شەفیع . ئەبێ (حیلم و شەفیع و) بێ . (چن) : طەیبەیی عیلم شەفیع . ئەبێ (عیلم و شەفیع و) بێ و مەبەست لە (طەیبەی عیلم) پێغەمبەر بێ بە ئیشارەت بە حەدیسی ( أَنَا مَدِينَةُ العِلْمِ وَ عَلِيٌّ بَابُهَا ) .

(٧١) میزان : تەرازوو .

واتە : بە سەر ، نەك بە پێ ، هاتوومەتە ئەو خاکە پیرۆزەی کە هەر تووسقاڵێکی لە تەرازووی شەفاعەت و تکاکاریدا هاوسەنگی کێوێك چاوپۆشی و دەریای لێبووردنە . بۆیە پشت ئەستوورم لەوە کە خوا لە گوناهم خۆش ئەبێ .

لە کۆکردنەوەی (مثقال) و (کێو) و (بەحر)دا طیباق و ، لە (خاك) و (کێو) و (بەحر)دا تەناسوب هەیە .

حیلم و بەحری (چر) : حیلم و میهر . دیارە (میهر و ) وە . (ت) و (عب) و (اح) : حیلم میهر . دیارە (حیلم و میهر و)وە . (ك) : حیلم بەحر . دیارە ( حیلم و بەحری )یە . (خا) : حیلم و میهری .

ئەبێ ڕۆم بێمە خاکی چاکی پاکی طەیبە ، تا بیستم :
بە سەگێ نابێ مولەووەث ئاوی زەرقا ، بەحری ئیحسانە (٧٢)

چ زەرقا ؟ بۆ سیاهیی دەفتەری هەر ناصیە ماحێ
چ طەیبە ؟ بۆ تەبایی دەردی هەر دەرماندە دەرمانە (٧٣)

---

(٧٢) مولەووەث : پیس . زەرقا : شین ، دەریا. کانییەکە لەسەر ڕێی مەدینە .
وات : لەبەر گوناهباریی خۆم ڕۆم نەئەهات بێ بنێمە خاکی پاکی مەدینە ، تا بیستم کەوا ئاوی دەریا کە شینە ، یا ئاوی کانیی (زەرقا) بە دەم تێخستنی سەگێ پیس نابێ ، چونکە دەریای چاکەیە و دەریاش گلاوێ هەڵناگرێ

لەنێوان (خاك) و (چاك) و (پاك)دا جیناسی لاحیق هەیە .

چاکی پاکی (چر) و (ت) و (خا) : پاکی چاکی . (کم) و (من) : چاك و پاکی . زەرقا (چن) : زەرق و .

(٧٣) سیاهێ : ڕەشێ . ناصیة : ناوچاوان . ماحێ : لەناوبەر و کوژێنەوە .
تەبایێ : نابوێ و کەڵك پێوەنەبون . دەرماندە : داماو .

وات : ئەو کانیاوی زەرقایەی کە هەرچەند خۆی مەعنای (شین) ئەگەیەنێ ، بەڵام ڕەشیی ناوچاوانی هەمو گوناهبارێك ئەسڕێتەوە ، کە وەك دەفتەر کردەوەی چاك و خراپی خاوەنەکەی تیا نوسراوە . ئەو مەدینەیەش کە ئیماری دەردی هەر داماو و پەككەوتویەکە .

لە کۆکردنەوەی (زەرقا) و (سیاهێ) و (دەفتەر)دا تەناسوب هەیە .
هەروەها لەنێوان (دەرماندە) و (دەرمان)یشدا جیناسی ناقیص هەیە .
سەرەڕای ئەو نزیکییەش کە لەنێوان (طەیبە) و (تەبایێ)دا هەیە .

نالی بۆیە وشەی (سیاهێ)ی خستووەتە پاڵ دەفتەر ، چونکە سەرەڕای ئەوە کە مەعنای (ڕەشێ) ئەگەیەنێ و دەفتەری سپییش کە لێی نوسرا ڕەش ئەبێتەوە ، وشەکە بەپێی شێوەی نوسینی جاران بە (سیاهەی)یش ئەخوێنرێتەوە کە وات : لیستە . وات ناوی گوناهەکانی بەڕێز تیا نوسراوە .

بەم دوا بەیتانەی ئەم قەسیدەدا وادەرئەکەوێ نالی لەسەفەری مەدینەدا و پاش زیارەتی مەککە تەواوی کردووە . هەروەها ئەوەش دەرئەکەوێ کە ئەمجارە ئەوەندە لە مەککە نەماوەتەوە و دوای زیارەتی مەککە ڕاستەوخۆ چووە بۆ مەدینە . کەوات ئەمجارە ئەوجارە نییە کە لە

دەری ڕەحمەت کەوا بەحری موحیطی عاصیە « نالی »
تیا جان و تەن ئوفتادەی شەپۆلی سەیلی عیصیانە (٧٤)

— ١٩ —

سوورشکی من کە لێڵاوە ، غوباری کۆه و هامۆنە
وەرە سەرچاوەکەم بنوازە ، وەك ئاوێنە ، چەند ڕۆنە ! (١)

---

مەککەوە چووە بۆ مەدینە و «ئەی کە ڕۆژەردی مەدینە. .تادەی لیاوتووە .

(٧٤) دەر : دەرگا . تەن : لەش . ئوفتادە : کەوتۆ . سەیل : لافاو .

واتە : نالییا ! نائومێد مەبە ، چونکە تۆ لە بەر دەرگای ڕەحمەتی خوادا کەوتۆی کە دەریایەکی بێپایان و سنوورە بۆ گوناهباران . گیان و لەشی یەك کەوتۆی لافاوی گوناهبشت ، لافاوەکە ڕایئەمالێ و ئەیخاتە ناو ئەو دەریا بێسنوورەی ڕەحمی خواوە و پاك ئەبێتەوە لە گوناه .

ئەبایێ (چر) و (عم) و (کم) و (من) و (عب) و (خا) : ئەباھێ . (ك) : ئەبانێ .

سەیلی (کم) و (گم) و (من) : بەحری .

ئەم بەیتە تەنها لە (عم) و (کم) و (گم) و (من)دا کراوە بە دوا بەیت . نوسخەکانی تر هەموو کردوویانە بە بەیتی پێش دوابەیت . ئێمە ئەو نوسخانەمان لا پەسەند بۆ کە کردوویانە بە دوابەیت و وەك ئەوانمان کرد .

— ١٩ —

(١) کۆه : کێو . هامۆن : دەشت و بیابان .

واتە : فرمێسکی من کە ئەیبینن لێڵاوە ، لە خۆیا وا نییە . بەهۆی تۆز و گەردی کێو و دەشت و بیابانەوە کە دێ بە ڕوما و فرمێسکەکەم لێڵ ئەکا ، وای لێهاتووە . ئەگینا وەرە سەر چاوم کە سەرچاوەی فرمێسکمە ، بزانە کانییەکی چەند پاك و ڕۆنە ئەڵێی ئاوێنەیە .

ئەشتوانرێ نیوە بەیتی دووەم بەمجۆرە بخوێنرێتەوە : « وەرە سەر ، چاوەکەم ! بڕوانە .. » تاد و ، بەوپێیە مەعنای لێبدرێتەوە .

نالی لەیەوێ بڵێ لەناو دەردی دووریی یار سەرم لێشێواوە و ڕێگەی دەشت و بیابانم گرتووەتەبەر و هەمیشەش هەر ئەگریم ، بۆیە ئەو تۆز و گەردی دەشت و بیابانە کە دێ بە ڕوما ، تێکەڵی فرمێسکەکەم ئەبێ و ئەیکا بە لێڵاو و فوڕاو و پیا دێتە خوار .

مونەججیم کەرگەس و لاشەی لە لا شەیتێکە ، نەیزانی
کە ئەم ئەفلاکە چەند لاکە ، کە ئەم گەردوونە چەند دوونە (٢)

---

دووریش نییە نالی مەبەستی ئەوەبێ گلەیی لە چەرخی گەردوون بکا کە بنیادەمی پاك و خاوێن بەهۆی تێکەڵیی پیاو خراپانەوە بەدناو ئەبێ و ناتۆرەی خراپی شوێن ئەکەوێ . بەم پێیە مەبەستی لە فرمێسکی سەرچاوە ڕوون جەوهەری مرۆی چاك و ، مەبەستی لە تۆز و گەردی ڕێگا و بان ئەو هاوڕێی خراپ و کەند و کوسپانەیە لە ژیانا دێنە ڕێی بنیادەم .

وشەی (سەرچاوەکەم) دوو مەعنا ئەبەخشێ یەکەم وا کە (سەر) و (چاوەکەم) بێ ، دووهەمیش وا کە (سەرچاوە) و (کەم) بێ . مەعنا لێدانەوەکەی ئێمەش بەجۆرێ بو هەردوو مەعناکەمان پێکەوە کۆکردەوە .

لێلاوە (چن) و (ت) و (اح) : لێلاو . بۆ (لێلاوە) و (لێلاوی)یش دەستئەدا . (مم) و (کم) و (ك) و (من) و (خا) : لێلاوی . (خب) : لێلاوو .. کوە و (چر) و (مب) : کوە . بۆ عەطفیش و بۆ ئیضافەیش دەستئەدا . (مم) و (گم) و (خب) : کێو و . هامۆنە (کم) و (من) : ئامۆنە . ئاوێنە (کم) و (من) : ئاینە .

(٢) مونەججیم : ئەستێرەگرەوە . کەرگەس : داڵە کەرخۆرە ، کە لاشەی گیانداری تۆپیو ئەخوا . لاشە : لاشەی گیانداری تۆپیو . ئەفلاك : جەمعی (فەلەك)ە واتە ئاسمانەکان . لاك : زەبوون و بێدەسەڵات . دوون : هیچ و پووچ .

واتە ئەستێرە گرەوە کە دوای خەیاڵ کەوتووە و وائەزانێ جوڵەی ئەستێرە و ئاسمان ئەم جیهانە بەڕێوەئەبا و ، داڵە کەرخۆرەی لاشەی تۆپیو خۆر و لاشەی تۆپیوی فڕێدراو لە یەك ناکاتەوە و ، بە یەك شتیان ئەزانێ ــ ئەوەندە ناتێگەیشتووە هێشتا لەوە حاڵی نەبوە کە ئەم ئاسمانانە، کە ئەو بە بەڕێوەبەری کاروباری جیهانیان ئەداتە قەڵەم ، دەسەڵاتیان لە لاکە تۆپیوێك زیاتر نییە و ئەم گەردوونە کە ئەو بە شتێکی بەبایەخی دائەنێ زۆر دوون و بێقابیلەتە .

بە نیشانەی ئەوەدا کە نالی لەمبەیتەدا وادائەنێ کەوا ئەستێرەگرەوە (داڵی لاشەخۆر) و (لاشەی خوراو)ی لا وەك یەکە و ، بەنیشانەی شیعری داهاتوشدا ، بۆمان دەرئەکەوێ کەوا مەبەستی لە مونەججیم بنیادەمێکی هەڵەلەکاسە و هەلپەرستە کە چاوەڕوانی گۆڕانی بارێکی تایبەتی بووە و خۆی بۆ ئەو بارە تازە چاوەڕوانی کراوە ئامادە کردووە .

له دەورانی طەبیعەتدا لەگەڵ ثەوری فەلەك جوتە

له ملیا چەمبەری دەوران و طەوقی چەرخی گەردوونە (٣)

---

لەنێوان (لاشە) و (لاشەینێکە)دا جیناسی تەرکیب هەیە . هەروەها لەنێوان (ئەفلاکە) و (لاکە) و ، (گەردوونە) و (دوونە)دا هاوکێشییەکی جوان هەیە .

ئەشکونجێ بەیتەکە وا مەعنا لێبدەینەوە کەوا ئەستێرەگرەوە وەك داڵە کەرخۆرە وایە و لاشە توێیوی بەلاوە شتە .. تاد .

کەرگەس و (چن) و (ت) : کەرکەس . ئەبێ (کەرکەس و) بێ . (عب) و (اح) و (خا) : کەرکەس و . لەلا : ئەمە تێکستی لەتها (چن)ە . نوسخەکانی‌تر هەمو نوسیویانە : (لەکن) . ئێمە بۆ مەبەستی یاریی بە وشەکردن ئەممان لا پەسەندتر بو . شەینێکە (چر) و (مم) و (گم) : شەینە کە . (چن) : شەینکە . ئەمیش هەر شەینێکەیە . (ت) و (اح) و (خب) : شییە کە . بۆ (شەینە کە) و (شەینێکە)ش ئەگونجێ . ئەیزانێ (ك) و (اح) و (خا) : نازانێ .

(٣) دەوران : سوڕانەوە . ثەور : گاجوت . چەنبەرە : چەڵەمەی ملی گاجوت . طەوق : تەوق ، کوت .

لەم بەیتەشدا نالی هەر لەسەر پلارگرتنە ئەستێرەگرەوە بەردەوامە کە حیسابی ڕۆژاوی دوارۆژ ئەخوێنێتەوە . نالی ئەڵێ : کابرای ئەستێرەگرەوە ، لە سروشت وەرگەڕاندا وەك برجی (ثەور)ی ئاسمان وایە* ، یا وەك گاجوت وایە هەر جارێ ڕۆڵەکانە لایەك بۆ جوتکردن . چەڵەمەی زەمانە و تەوقی چەرخی گەردوونی لە مل کراوە ، ئەوان چۆن وەرسوڕێن ئەمیش هەر وا وەرئەسوڕێ .

لە بەکخستنی (ثەور) و (فەلەك) و ، (ثەور) و (جوت) و (چەمبەرە)دا تەناسوب هەیە ، هەروەها لە کۆکردنەوەی (چەمبەرە) و (طەوق)دا .

ثەوری (چر) و (چن) و (عب) : ثەور . دیارە هەر (ثەوری)یە . چەنبەرەی (چن) و (کم) و (من) : چەمبەرەی . (مم) و (گم) : چەنبەری .

---

* لەمبەیتەوە شتێکی‌وا دەرئەکەوێ کە بەپێی ئاسمان شناسیی کۆن ، برجی (ثەور) خاسیەتێکی سروشت گۆڕانی بێ . لەمبابەتەوە شتێکی ئەوتۆمان بۆ ڕاست نەکرایەوە .

لەسایەی شەخصێکی هیمەت بلند ، ئاسوودەیە شارێ
بەڵێ خیطەی ( سولەیمانی ) سەوادی ظیللی ( کودرۆن )ە (٤)

وەرە سەیری خیابان و بەیاضی دەفتەری نالی
کە صەف صەف ، مەصرەعی بەرجەستە ، ڕێزی سەروی مەوزوونە (٥)

---

(٤) خیطە : پارچە زەوی ، ناوچە .

واتە : لەسایەی ئاقە کەسێکی پایەبەرزی هیمەت باڵاوە ـ کە ئەو (کودرۆن) ناوەیە کە لە نیوەی دووەمی بەیتەکەدا باسی کراوە ـ شارێک هەموی حەساوەتەوە ، نەک تەنها چەند کەسێک لە دانیشتووانی . بەڵێ ڕاستە ناوچەی سولەیمانی هەموی کەوتووەتە بەر ڕەشایی سێبەری (کودرۆن) و ئەو باڵی خۆی بەسەرا کێشاوە .

ئەبێ ئەم (کودرۆن) ناوە دارۆغە بازاڕی شار بوبێ و کابرایەکی توند و تیژ و لێهاتوو و بە وێڵ بوبێ و لە سەردەمی ئەوا دز و درۆزن و پیاو خراپ لەناو شارا نەبوبێ .

ئاسوودەیە («پەراوێزی» چر) و (کم) و (عب) و (من) : ئاسوودە ژیی .
کودرۆنە (چر) و (چن) و (مم) و (گم) و (ك) و (اح) و (خا) : گەردۆنە .
(کم) و (من) : کۆرۆنە . («پەراوێزی» ك) : کۆرۆنە .

(کودرۆنە) هەرچەند تەنها تێکستی (ت) و (مب) و (خب) بوو ، ئێمە لامان پەسەندتر بوو ، چونکە یەکەم : ئەگەر (شەخصێکی هیمەت بلند)مان بە کەسێکی تر مەعنا لێ بدایەتەوە ، (بەڵێ)کە مەعنای نەئەمات . کەواتە ناوێکمان پێویست ئەبوو بۆ نیوە بەیتی دووەم . دووەم : دووبارە کردنەوەی وشەی (گەردۆنە) لە دوو بەیتی لەپاڵ یەکدا شتێکی جوان نییە . سێیەم : ئەم چاکەیە کە نالی باسی ئەکا لەوە گەورەترە کە هیی میری وڵاتێک بێ و زیاتر لە چاکەی بەڕێوەبەرێکی پۆلیس ئەچێ کە ئەوسا (دارۆغە بازاڕ)یان پێوتووە . چوارەم : تێکستی (کم) و (من) و («پەراوێزی» ك)یش پشتی ئەوە ئەگرن کە (کودرۆنە) بێ .

(٥) خیابان : ئەو هێڵە سپییەی لەنێوان دوو نیوە بەیتی قەسیدەدا ستوونی دائەکشێ . هەروەها سپێتیی نێوان دێرێک و دێرێک . بەیاض : سپێتیی قەراخی دەفتەری شیعر . مەصرەع : نیوەبەیت . بەرجەستە : هەڵکەوتوو .

واتە : وەرە تەماشای هێڵی ستوونی و ئاسۆیی نێوان دێڕ و نیوە

— ٢٠ —

دڵ سیاسەنگ نەبێ ، مائیلی خاکی وەطەنە
خاڵی لەعلی حەبەشە ، ساکینی بوردی یەمەنە (١)

---

دێڕەکانی شیعری نالی بکە ، بزانە نیوەکانی چەند هەڵکەوتوون ئەڵێی ڕیزی درەختی سەرووی ڕێك و پێك و ئەوەندەی یەکن ، تەنانەت تیپی وایش هەڵنەبژێری لە هەردوو نیوەکانیدا ، لە یەك گەورەتر نەبن و جێگەی زۆرتر لە یەکتر نەگرنەوە .

دیارە بۆ هاوسەنگیی شیعر هەر ئەوەندە مەبەستە بڕگە و تەفعیلەکانی نیوەکان لەناو خۆیانا و ، هەردوو بەیتێك بەرابەر بە یەك ، ئەوەندەی یەك بن ، ئیتر ئەگەر لە نووسینا جێگای زیاتر و کەمتر بگرنەوە ، ئەوە مەبەست نییە . بەڵام نالی بۆ پێ سەلماندنی هونەرمەندیی خۆی ئەڵێ تەنانەت ئەو پیتانەیەش کە نیوە بەیتەکانی هەر قەسیدەیەکم ئەیگرنەوە زیاتر و کەمتر نین لە یەکتر .

مەصرەعی (ك) و (اح) و ( ‌ ‌پەراوێزی ‌ خا ) : مەصرەعەی . ڕیزی (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : ڕیزەی . (خا) : ڕیزە .

— ٢٠ —

(١) سیاسەنگ : بەردی ڕەش . کینایەیە لە ڕەقی . بوردی یەمەن : جۆرە قوماشێکی خوریە لە یەمەن دروستی ئەکەن وەك شیرداغ هێڵی سپی و ڕەشی تیایە .

واتە : دڵ ئەگەر ڕەق و بێ ڕەحم نەبێ و لە سەنگی سەخت دروست نەبوبێ ، حەزی لە زێد و ماوا و نیشتمانی خۆیەتی ، بۆیە دڵی منیش هەمیشە حەزی لەوەیە لای یار و لەگەڵ بیرەوەریی ئەودا بێ ، یا بۆیە هەمیشە حەزی لە ژیانی ئەو نیشتمانەیە تیا هاتوەتە دنیاوە (وەك بە دوا بەیتی ئەم پارچە شیعرەدا دەرئەکەوێ) . ئەوەتە خاڵیش (خاڵی یار) کە وەك لەعلی حەبەشە ڕەشە ، لە بوردی یەمەنیدا نیشتەجێ بووە کە بریتییە لە سەر ڕومەتی سپی و ژێر زوڵفی تاڵ تاڵ و ڕەشی یار ، یاخود بۆ ڕاستیی قسەکەم ئەم نموونەیە ئەهێنمەوە کە ئەوەتە خاڵی یار کە وەك لەعلی حەبەش ڕەشە ، لەناو بوردی یەمەنیی سەر ڕومەتی سپی و ژێر زوڵفی ڕەشیدا ئەژی .

لە چاپکردنی ئەم شوێنەدا بۆین مامۆستا هێمنی موکریانی هاتە

پەرچەمی سونبولی‌یو ، قەددی ( قضیب البان )ی
زولف بەهلتولی‌یو ، خەط زەنگی‌یو ، وەجهی حەسەنە (٢)

طەلعەتی ئایەتی جان ، مەظهەری ئیعجازی بەیان :
لەبی دورج و ، دەهەنی سیڕڕ و ، کەلامی عەلەنە (٣)

---

سەرلێدانمان . مەعنای ئەم بەیتەمان لێپرسی ، وتی : وابزانم مەبەستی نالی لە (خالی لەعلی حەبەشە) بەردی (حجر الاسود)ی دیواری کەعبە و لە ( بوردی یەمەن ) ئەو بەرماڵە بێ کە پێغەمبەر ( د . خ ) بەردەکەی لێخست و هەر چمکێکی دایە دەست سەرۆک هۆزێک و خۆیشی بەردەکەی هەڵگرت و لەجێی خۆی دانا لە دیوارەکەدا . بەمپێیە مەعناکە وای لێدێتەوە ئەگەر ئەم بەردی (حجر الاسود)ە (سیاسەنگ) نەبوایە لە بەهەشت هەڵنەئەگیرا بۆ سەرزەوی . هەرچەند ماموستا هێمن ئەیوت دڵنیا نیم لە ڕاستیی ئەم مەعنایە ، بەڵام لێمە لامانوایە بۆچوونێکی ورد و بەجێیە و وا بەسوپاسەوە بە ناوی لەو خۆیەوە ئەینوسینەوە .

ناسکییەکی زیرەکانەی تیا ئەبێ ئەمە کە ( نالی ) بە ( حجر الاسود )ی وتبێ ( سیاسەنگ ) چونکە مەعنای هەردوکیان یەکێکە و وەك پێشان وتمان واتە : بەردی ڕەش .

سیا سەنگ : (عم) و (ت) : سییەهـ سەنگ .

(٢) پەرچەم : ئەو بەشە قژەی بەسەر ناوچاواندا دێتەوە . سونبول : جۆرە گوڵێکە لە گوڵدانا ئەیبێژن و بۆ ئەورۆزی ئامادە ئەکەن . (قضیب البان)ی : وەك لقی بان . بان : درەختێکە گەڵایەکی سەوز و بۆنخۆشی هەیە . زولفی بەهلتولی : زولفی ئاڵۆز و پرژ و بڵاو . لەوەوە هاتووە کە (بەهلول) بە شێت و بەرەڵڵا ناوبانگی دەرکردووە . خەط : ڕازاندنەوەی مۆی برۆ . زەنگی : ڕەش . وەجهـ : ڕوو . حەسەن : جوان .

پەرچەمی : ئەمە لێکستی («پەراوێزی»چر)ە . (چر) و (چن)و (کم) و (ت) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : پەرچەم . (ك) : پەرچەم و . سونبولی‌یو («بەراوێزی» چر) : سونبول و . قەددی («پەراوێزی» چر) : قەددی تۆ . زولف . بۆ (زولفی)یش دەستنەدا . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : زولفی .

(٣) طەلعەت : دەرکەوتن . ئایەت : نیشانە . بەیان : قسە و گفتوگۆ . دورج: قوتوی بچوك . دەهەن : دەم . سیڕڕ : نهێنی . عەلەن : ئاشکرا .

دەست لە خوێنم مەدە ، ئالوودە مەکە دامەنی پاك
خوێنی من ئایەتە ، باطیل نیە وەك ڕەنگی خەنە (٤)

وەك گوڵی ئاتەشی ، خەملیوە بە بەرگی چەمەنی
قامەتی نارەبەرە ، ناروەرە ، نارموەنە (٥)

---

واتە : دەرکەوتنی ڕۆمەنی یار کە خۆی ئەنوێنێ ، مایە و نیشانەی گیان هاتنەوەبەری دڵدارانە و ، موعجیزەیی گفتوگۆ و قسەشی بەوەدا دەرئەکەوێ کە لێوی وەك ئەو قوتووە بچۆکانە وایە شتی گرانبەهایان تیا ئەشارێتەوە ـ کە ددانەکانیەتی ـ و ، دەمی ئەوەندە بچۆکە وەك نهێنی وایە و ، قسەشی ئاشکرایە هەمو پێی ئەزانین .

لە وشەی ( ئایەت ) و ( موعجیز ) و ( بەیان )دا جۆرە ئیشارەتێك بۆ قورئان کراوە کە ئەویش موعجیزەیە و لە (ئایەت) پێکهاتووە و (بەیان)یشی هەیە واتە فەصیحە و کەس ناتوانێ شتیوا بڵێ . هەروەها لە نهێنییەتی دەم و ئاشکرایی قسەشدا ئیشارەتێکی ئیقتیباس ئامێز هەیە چونکە کەلامی خوا ئاشکرایە و خوا دەمیشی نییە .

ئایەتی جان ، مەظهەری ئیعجاز و بەیان (چر) و (عب) : مەظهەری جان، ئایەتی ئیعجاز و . (چن) ... ئیعجاز ... (عم) و (گم) : .... مەنطیقی ئیعجازی . (ت) : ئایەتییو مەظهەری ئیعجازی . لەبی دورج و (چر) و (کم) و (ت) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : لەبی ڕۆح و. (عم) و (گم) : لەب و ڕۆح و .

(٤) ئالوودە : تێکەڵ . شتێ لە شتێکەوە گلابێ . ئابیت : ڕەنگی نەچێتەوە .

واتە : مەکوژە و خوێت لە خوێنمەوە مەگلێنە و دەستی خۆتی لێوەرمەدە و داوێنی خاوێنی خۆتی پێ پیس مەکە . خوێنی من خوێنێ نییە ڕەنگی بچێتەوە . لە هەرچییەکەوە تلا لێی‌نابێتەوە و دەستی هەرکەسی تێوە گلا تا مردن هەر پێیەوە ئەنالێنێ . خوێنی من وەك ڕەنگی خەنە نییە پاش بەینێك کاڵ ببێتەوە .

خەنە (ت) و (اح) و (خب) : حەنە . حەنە : خەنە . بەپێی ئەم نوسخانە ئەشگونجێ (حەنە) ناوی کابرایەکی جولەکە بوبێ . مەعنای بەیتەکەش بۆ ئەم ڕێ‌لێ‌چونە دەست‌ئەدا .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عب) و (کم) و (من)دا بەیتی پێنجەمە .

(٥) گوڵی ئاتەشی : گوڵێکی سورە . خەملیوە : ڕازاوەتەوە . چەمەنی :

ڕۆشنیی دیدە بە ئینسانە ، کە مژدەی قەدەمت
ڕۆشنیی دیدەیی غەمدیدەیی ( بیت الحَزَن )ە (٦)

دڵی « نالی » کە ئەنیسی ( قەرەداغ )ە ، ئێستەیش
داغی ( سەرچاوە )وو (دێوانە)یی دار و دەوەنە (٧)

---

ئەوەی ڕەنگی وەك چیمەن سەوز بێ . نارەبەر : ئەوەی بەرەکەی هەنار بێ . ناروەر : ئەو ئافرەتەی مەمکەکانی وەك هەناریان لێهاتبێ (*) . نارەوەن : درەختێکی دار سەخت و ، گەڵا ددانەدارە ، بەر لە پشکوتنی گەڵای ، گوڵەکانی ئەوەرێن .

واتە : یار وەك گوڵی ئاگر بە بەرگی سەوزەوە ڕازاوەتەوە . گوڵە ، بەڵام وەك ئاگر دڵداران ئەسوتێنێ و جلوبەرگی سەوزی جوانی لەبەرکردووە . کە سەیری ڕومەتی سوور و مەمکی سەرسنگی ئەکەی ، ئەڵێی داری هەنارە ، ئافرەتێکە مەمکەکانی وەك هەناریان لێهاتووە ، لە خۆڕاگرتن و سەوزێ و ڕازاوەییشدا ئەڵێی نارەوەنە .

نارەبەرە (ك) و (اح) : بارەبەرە .

ئەم بەیتە لە (کم) و (گم) و (من)دا بەیتی شەشەمە .

(٦) ئینسان : گلێنەی چاو . قەدەم : هاتن . بیت الحزن : خەفەتخانە ، دڵ .

واتە : ڕۆشنایی چاو بەهۆی گلێنەی چاوەوە ئەبێ . تۆیش گلێنەی چاوی منی . لەبەرئەوە ، مژدەی هاتنت ئەبێ بە مایەی ڕۆشن بونەوەی دیدەی غەم دیتوی ناو خەفەتخانەی چاوم .

دیدە بە ئینسانە (چن) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (من) و (خا) و (خب) : دیدەیی ئینسانە . غەمدیدەیی (چن) و (خب) : غەمدیدە . (گم) : خەمدیدەیی .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عب) و (کم) و (من)دا بەیتی چوارەم و لە (گم)دا بەیتی پێنجەمە .

(٧) ئەنیس : ئولفەت پێوەگرتو . قەرەداغ : دێی ( زەردیاوا ) و تێکڕای ناوچەی (قەرەداغ) لە هەرێمی سلێمانی. داغ : سوتاو و ڕەش هەڵگەڕاو.

---

(*) لە لاپەڕە ١٢) و ١٣)یشدا وشە و مەعنای وشەی (ناروەر) بەپێی ئێرە ڕاست بکەنەوە .

— ٢١ —

لەر وەختەوە بیستۆمە دیتن بەقەدەر چاوە ،

هەر مۆم لە بەدەن یەکسەر ، وەك عەینی فەنەر ، چاوە (١)

---

سەرچاوە : لەگەر ناوی شوێنێکی تایبەتی نەبێ ، تێکڕای سەرچاوە و کانێ و ئاو . دێوانە : شێت . دار : داری گەورە . دەوەن : وردە دار کە لەپاشاندا ئەبنە داری گەورە .

واتە : دڵی نالی کە ئێستاش لەپاش ئەم عومرە و لەگەڵ ئەم دووریەش هەر ئولفەتی بە قەرەداغەوەیە و بیری ئەکاتەوە و لەناخیدا ئەژێ ، بۆ دیتنێکیتری سەرچاوەکانی ڕەش هەڵگەڕاوە و برژاوە و ، بۆ دار و دەوەنەکانی بووە بە ( دێوانە ) و شێت بووە و کەژ و کێوی گرتووەتەبەر. وشەی ( دێوانە ) ئیشارەتیشە بۆ چەمی دێوانە کە چەمێکە لە چیای (سەگرمە)وە پەیدا ئەبێ و بە قەرەداغدا ئەڕوا و لە نزیکی (دەربەندیخان)ەوە ئەڕژێتە (سیروان)ەوە .

لەم بەیتەوە وا دەرئەکەوێ نالی ئەم پارچە شیعرەی لە نامۆییدا و لە سەردەمی پیریدا وتبێ .

قەرەداغە (خب) : قەرەطاغە . ئێستەیش (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : ئێستایش . (كم) و (گم) و (من) : ئێستا .

سەرچاوەوو دێوانەیی (چر) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : سەرچاوەوو دێوانەوو .

— ٢١ —

ئەم پارچە شیعرەمان تەنها لەپاڵ کتێبێکی دەستنوسی خۆماندا دی ، نوسرابووەوە .

(١) فەنەر : کاغەزێ یا شتێکیوایە لوول ئەکرێ بە دەوری شەمعدا بۆئەوەی کە با لێیدا نەیکوژێنێتەوە .

واتە : لەوکاتەوە کە بیستومە توانای دیتنی هەرکەس بەئەندازەی چاریەتی ، دوو چاوی هەبێ زیاتر و باشتر ئەبینێ لەوە کە یەك چاوی هەبێ و ، چاوی ساغ بێ باشتر ئەبینێ لەوە کە چاوی کز بێ ، ئا لەوکاتەوە هەرچی مۆی لەشمە ، وەك چاوی لە فەنەر پێچراو ، یاخود وەك فەنەر خۆی بووە بە چاو بۆئەوەی باشتر یار ببینم .

فەرمێسکی کە هەمێ دەم بێ گریان و ، شەویش نەنوێ
ئەم بەندەیە مەئمورە ، ئەم ئەمرە لەسەر چاوە (٢)

جێگایێ نەظەرگا بێ ، شەش جانیبی دەریا بێ ،
ئەی مەردومی سەیرانێ ، لەم خیططەیە هەر چاوە (٣)

چاویشی لە «نالی» کرد ، دین و دڵ و جانی برد
گەر زوڵفە ئەگەر تازە ، گەر خەندەیە ، گەر چاوە (٤)

---

زۆری شوبهاندنی (مۆ) بە (فەنەر) لەوەوەیە کە مۆ لوول ئەخوا وەك فەنەر . لەوانەیە بۆیەش ولبێتی (بیستۆمە) و نەیوتووە (زانیومە) چونکە (زانین) بە تەجرەبەی شەخسیی ئینسان خۆی دێتەدێ ، بەپێچەوانەی (بیستن)ەوە و ، ئەویش لەوکاتەدا کە ئەم پارچە شیعرەی وتووە چاوی نەبوبێ . بەڵگەی ئەم بۆچوونەشمان ئەوەیە کە لە دوا بەیتدا ئەڵێ : « چاویشی لە نالی کرد .. » تاد .

(٢) واتە : یار فەرمووی ئەبێ گریانم هەمیشەیی و بەردەوام بێ ، یاخود گریانم هەر خوێن بێ و لەجیاتیی فرمێسك خوێن لە چاوم بڕوا و ، شەویش نەنوم ، یاخود گریانەکەم شەویش نەخەوێ واتە نەبڕێتەوە .. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانەی یار من ئەمرم پێ‌کراوە و بە «بەسەرچاو» جێبەجێی ئەکەم ، یاخود بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانی یارە من هیچ بەدەس نیم ، تەنها هەواڵ گەیێنێکم ، فەرمانەکە ئەگەیەنم بە چاو و ئەبێ ئەو بەجێی بهێنێ .

(٣) نەظەرگا : لە کوردەواریدا بەو شوێنانە ئەڵێن کە چاکانی خوا ماوێك تیا دانیشتوون یا زۆری بەرەکەتیان تێ کردووە و پاش ئەوە خەڵك کردوویانن بە زیارەتگا . شەش جانیب : شەش‌لا ، سەر و خوار و ڕاست و چەپ و بەر و دوا . مەردوم : خەڵك . بیبیلەی چاو . سەیرانێ : سەیرانکەر . جێگایەك بۆ سەیران بشێ . خیططە : ناوچە .

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك‌ئەدەینەوە .

(٤) واتە : ئەی خەڵکی سەیرانکەر ، یاخود ئەی گلێنەی چاوم کە سەیرانگای یاران بوی ، شوێنێ کە یار جارێ بە زۆری لوطفەوە تەماشای کردبێ ، یا وێنەی ئەوی تیا عەکس بوبێتەوە و سەیرانگای نازاران بوبێ و بۆ ئەوە بشێ تیا دانیشن و هەر شەشی لاکەی ئاو ( ی فرمێسك )بێ ، لەم

ئەو سیلسیلە وا میشکی خەتا تێوی براوە ،
پڕ پێچ و شکەن ، خەم بە خەم و ، حەلقە کراوە ، (١)

لەولاوێکە لەولاوە بە ئەملاوە کشاوە ،
یا یاسەمەنی خاوە بە ڕوی ڕۆژدا ڕژاوە ؟! (٢)

یا دۆکەلی جەستەی منە بەو شەمعە سوتاوە ،
یا هەوری سیاتاوە کە مانیع لە هەتاوە ؟! (٣)

---

ناوچەیەدا هەر چاوم بۆ ، یار لە چاویش بێبەش و نائومێدی کردم و ، بەو لێسەندنەی چاوم دین و دڵ و گیانمی بەجارێ بە تاڵان برد .. بەڵام نازانم چۆن چاوی بردم ، بە زەبری زولف بردی ، یا بە هێزی ناز .. بە زەردەخەنەی لێو بردی ، یا بە ڕوانینی چاو .. هەرچۆن بێ بردی و منی لێ بێبەش کرد و ، ئەو سەیرانگایەشی نەهێشت کە نازاران ئەهاتنە ناوی و ، لەڕاییی لە دەوری ئەو دوڕگەیە بڕێ .

وەك پێشان وتمان لەوانەیە ئەم بەیتەش نیشانەی کوێر بۆنی نالی بێ لە دوا ساڵەکانی ژیانیا ..

— ٢٢ —

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە نوسخەکانی (عم) و (گم)دا هەیە ، بەڵام هەمو نیشانەیەك وائەگەیەنێ هیی «نالی»بێ .

(١) سیلسیلە: زنجیرە. میشک : میشك. خەتا: ناوچەیەکە لە تورکمانستان. تێو : ناو . پێچ و شکەن : لوول و تێکشکاو . چەمیوە و ئەلقە ئەلقە .
معنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێ .
میشکی ( گم ) : میشکی .

(٢) واتە : ئاخۆ ئەو زنجیری زولفە کە لە ڕەشێ و بۆن خۆشیدا پێی‌ئەڵێن (میشکی خەتا) و ، پێچ و لوول و ئەلقە ئەلقەیە ، لەولاوە لە باڵای یار ئاڵاوە و ، لە لای ڕاستەوە لەچێ بۆ لای چەپ و بەپێچەوانەوە ، یاخود گوڵی یاسەمەنی خاوە بەسەر ڕوی یاردا بڵاو بووەتەوە ؟
بە ئەم لاوە (گم) : بە ئەولاوە .

(٣) جەستە : لاشە . سیاتاو : هەوری ڕەشی باراناوێ .

داوێکە لە ڕۆی دانەیی خاڵت تەڕاوە
زنجیرە لە پێی مائیلی ئەو ڕۆتە نراوە (٤)

هەی هەی ! غەلەطم گوت ، ئەمە ظولمەت ، ئەوە ئاوە
بەو ظولمەتە ، بەو ئاوە ، حەیاتم غەلەطاوە (٥)

---

واتە : یاخود دۆکەڵی لاشەی منە کە سۆمی ڕۆی گەشی تۆ سوتاندویەتی ، یا هەوری ڕەشی باراناویە و ڕێگای لە دەرکەوتنی ڕۆژی ڕۆت گرتووە !!

وشەئاراییەکی جوان لە کۆکردنەوەی (سوتاو) و (سیاتاو) و (هەتاو)دا هەیە . لەنێوان (هەور) و (دۆکەڵ)یشدا تەناسوب هەیە .

دۆر نییە وشەی (شەمعە) پێشان (شەمتە) بوبێ کە لە (شەم) و (تە) پێکهاتووە و ، نوسیاران دەسکاریان کردبێ . ئەگەر وابێ هاوئاوازیەکی جوان لەنێوان (جەستە) و (شەمتە)دا ئەبێ .

(٤) مائیل : ئارەزۆمەند . لار .

واتە : زولفت تەلەیەکە بەسەر دانەوێلەی خاڵتەوە نراوەتەوە بۆئەوەی چۆلەکەی دڵی دڵداران بێن و ببن بە داویەوە . زنجیرێکە کراوەتە پێی ئەوانەی عاشقی ڕۆتن ، یاخود کراوەتە پێی لار ڕۆیشتوی ڕۆت ، یاخود کراوەتە پێی لار ڕۆیشتوی ئەو دڵدارە ڕۆت و تولەی وێراوبە تۆی خۆش بوێ .

لەنێوان (لەنراوە) و (ڕۆتە نراوە)دا ، بە چاوپۆشییەوە لە وشەی ( ڕۆ ) ، جیناسی تەرکیب هەیە .

(٥) هەی هەی : وشەی سەرسامییە . ظولمەت : تاریکستانێ . غەلەطاوە : وەرچەرخاوە . وەرگەڕاوەتەوە .

واتە : ئەخەیر ، هەڵەم کرد کە زولف و ڕۆی یارم بەو شتانە شوبهاند کە باسم کردن . وانییە ، زولفی یار تاریکستانێ و ڕۆی یار ئاوی حەیاتە . بەهۆی ئەو تاریکستانێ و ئاوی حەیاتەشەوە ژیانی من وەرگەڕاوە و کەوتووەتە مەترسییەوە ، چونکە کە ئەمەوێ بکەمە سەر ئاوی حەیاتی ڕۆمەتی و بیمژم و ژیانی هەمیشەیی بۆ خۆم مسۆگەر بکەم ، تاریکایی زولفی ڕێم لێئەگرێ و ناهێڵێ بڕۆم .

دارشتنی ئەم بەیتە لە بابەتی ( ئاوی حەیات ) وەرگیراوە کە ئەڵێن لە

دڵ تینووە ، سووتاوە ، بە بێ طاقەت و تاوە
ڕێگەم بە سەراوە ، کە دەچم ڕێم بەسراوە (٦)
ئەو شەربەتە ، ئەو جامە شەراوە لەبێ ئاوە
بۆ « نالی »یە ئاخر کە خودا بۆ ئەوی داوە (٧)

— ٢٣ —

زولفت بە قەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە ،
ئەمڕۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بە داوە (١)

---

تاریکستانیدایە و کەس ناتوانێ پێی‌بگات .

(٦) تاو : هێز و توانا . سەراو : کانێ .

واتە : دڵم تینووە بۆ مژینی لێوی یار ، توانا و هێزم لەبەر بڕاوە ، ڕێگەم بۆ سەر سەراو و کانیاوی دەم و لێوی یارە ، بەڵام زولفی هاتووەتەوە بۆ سەر دەم و لێوی و ڕێی لێ بەستووم و ناهێڵێ بگەمە ئەوێ.

لەنێوان ( بە سەراوە ) و ( بەسراوە )دا جیناسی تەرکیب هەیە .

(٧) شەراو : شەراب .

واتە : ئەو شەربەتەی ئەمەوێ بچم بیخۆمەوە و ، ئەو جامی شەرابەی ئەمەوێ بچم بینێم بە دەممەوە ، پێی‌ئەڵێن ( شەربەتی لێو ) یا ( جامی شەرابی لێو ) و سەرەنجام هەر بۆ نالی نەبێ ، چونکە خوا بۆ ئەوی داوە .

ئەشکونجێ وشەی ( ئاوە ) بەمەعنا ( ئیسم ) نەبێ ، بەڵکو یا بەمەعنا ( ناب ) بێ یا هەر (ناب) بێ و وەك چۆن ( شەراب ) کرا بە (شەراو) ، ئەمیش کرابێ بە ( ناو ) . (ناب) یا (ناو) واتە : خاوێن و بێ‌گەرد .

بەکارهێنانی وشەی (شەراو) لەجیاتیی (شەراب) کە زاراوی هەندێ ناوچەی کوردستانی عێراق و ئێرانە ، نموونەیەکی‌تری ئەو ڕێبازەی نالییە کە وشە لە دیالێکتە جیارازەکانی کوردییەوە ئەخوازێ و ئەیخاتە ناو شیعری خۆی .

— ٢٣ —

(١) شیفتە : دڵدارێ کە یار دڵی بردبێ . ئاڵۆز : شێواو . بەداو : سەر بە گۆبەند و دەم بە بیانوو .

واتە : زولفە درێژ و شۆڕەکانت کە بە قەد و باڵاتدا پرژ و بڵاو

ئەم عومرە عەزیزە کە لە بۆت نەقد و دراوە ،
صەد حەیف و دریغا کە موسولمانی نەماوە ! (۲)

عومرێکی درێژە بە خەیالی سەری زولفت
سەوداوو پەرێشانم و ، سەودایەکی خاوە (۳)

---

بۆنەیەوە و دلی دلدار ڕاکێشن بۆ لای خۆیان ، ئەمڕۆ لە منیش ئالۆز و شێواو و سەر بە گۆبەند و دەم بە بیانوون و گیرم بە دەستیانەوە خواردووە .

بە ئەدەلدا (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (ك) و (مـن) : لـە ئەدەلدا . ئەمڕۆ : ئەمە تێکستی تەنها (گم)ە ، نوسخەکانی‌تر هەمۆیان ، (چر) نەبێ : امرو ، کە بۆ (ئەمڕۆ)یش و (ئیمڕۆ)یش دەستئەدا . (چر) : ئیمڕۆ .

(۲) نەقد : نەخت ، پارە . دراو : سکە ، لێدراو . بەخشراو . دریغا : داخەکەم .

لێکدانەوەی ئەم بەیتە پێویستی بە ( تەقدیرکردنی ) خەبەرێك هەیە بۆ ڕستەی نیوە بەیتی یەکەمی و بەو تەقدیر کردنەوە مەعنای بەیتەکە وای لێدێتەوە کەوا عومری عەزیزی خۆم وەك نەختینە و دراو بۆ تۆ دانا ، یا پێم بەخشیت و دامە دەستت . بەلام صەد حەیف و صەد مەخابن کەوا موسولمانەتی نەماوە تا تۆ وەفات هەبێ و لەو عومر بەخشینە و لە ژیان بوردنەی منت لە بەرچاو بێ و ، قەدری پیاوەتیی کەس نازانی .

لە وشەی ( دراو )دا لەطافەت هەیە ، چونکە بۆ هەردوو مەعناکەی دەستئەدا .

لەم بەیتە تەنها لە (چر) و (عب)دا هەیە و لەم شوێنەدایە . لە نوسخەکەی (چر)دا بە خەتێکی بێگانە لە خەتی ئەسلی کتێبەکە نوسراوە « هیی نالی نییە » . بەلام وەك پێشتر باسمان کردووە نوسخەی (عب) نوسخەیەکی کۆنە و لە ( ۱۳۱۸ ی . ك = ۱۹۰۰ ــ ۱۹۰۱ ی . ز )دا نوسراوەتەوە و جێگای گومان لێکردن نییە ، بۆیە ئێمە ئەم بەیتە بە هیی نالی دائەنێین . نەقد و (عب) : نەقد . بۆ (نەقد و) و (نەقدە)یش دەستئەدا . حەیف و (عب) : حەیف . بۆ (حەیف و) و (حەیفە)یش دەستئەدا .

(۳) سەودا (ی یەکەم) : عاشق . سەودا (ی دووەم) : خەیال . مەشق
وانە : ماوەیەکی دوور و درێژە بیر لە سەری زولفی درێژی تۆ

هەرچەندە کە ڕۆتم ، بەخودا مائیلی ڕۆتم
بێبەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە .. (٤)

---

نەکەمەوە و ، بەو بیرکردنەوەیە گرفتار و پەریشـان و خەیاڵ پەرت و بڵاو بووم . بەڵام لەم خەیاڵ و بیرکردنەوەم خەیاڵێکی پووچ و بێمایە و کردارێکی بێ سوود و کەڵکە و دوای کڵاوی بابردوو کەوتوم .

له کۆکردنەوەی ( خەیاڵ ) و ( خاو )دا ئیشارەتێکی ناســك کراوە بۆ ڕستەی کینایەیی (خەیاڵی خاو) کــە لە کوردیــدا زۆر بەکــاردێ . لــە کۆکردنەوەی (زولف) و (خاو) و ، (زولف) و (پەرێشـان)یشدا تەناسوبێکی جوان هەیە .

لە ژێرکردنی بەیتەکانی ئەم پارچە شیعرەدا شوێنپێی (چر) و (مب)مان هەڵگرتووە . نوسـخەکانیتر جیاوازییان هەیە . تێکرای نوسـخەکان لە بەیتی یەکەم و دووەمدا هاوڕێن . ئەم بەیتی سـێهەمەش لــە (چن) و (عم) و (ت) و (اح) و (خا) و (خب)دا حەوتەمە .

(٤) واتە : هەرچەند کابرایەکی لات و بێدەســەڵات و ڕۆت و قــوڵم و بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی شایانی ئەوە نیم و بۆم ڕەوا نییە بیر لە خۆشەویــتیی نازدارێکی پایە بڵندی وەك تۆ بکەمــەوە ، بــەڵام چــار چییــە ! هێزی خۆشەویستی هێزێك نییە دان بە جیاوازیی هەژار و دەوڵەمەند و داب و نەریتی کۆمەڵایەتیدا بنێ .. حەزم لە دیداری ڕۆتە و هەژاری نـایێ بە کۆسپ لە ڕێی دەربڕینی ئەم خۆشەویستییەمدا .. بەڵکو هەر لەبەر ئەم هەژارییەم پێویستم پێتە و لەوانەبو ئەگەر هاوڕێ و هاوسـەرێکی خۆمم بوایە بیرم لە تۆ نەکردایەتەوە .. هەژار بۆیە حەز ئەکا بچێتــە بەرخۆر چونکە هیچی لەبەرا نییە و ئەیەوێ گەرمی بێتەوە . ئەگەر جل و بەرگی گەرم و نەرمی باشی لەبەرابێ کاری بە خــۆر و بەربەڕۆچکەی زستانان چییە !

لەنێوان هەردوو ( ڕۆتم )دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان ( هەتیو ) و (هەتاو)دا جیناسی لاحیق و ، لە هێنانی نیوە بەیتی دووەمدا بەدوای نیوە بەیتی یەکەمدا حوسنی تەعلیل هەیە . تەشــبیهێکی جــوانیش لە بەیتەکەدا هەیە کە نالی خۆی کردووە بە هەتیو و ، هاوڕێ بە بەرگ و ، ڕووی یار بە خۆری زستان ..

بەخودا ( کم ) و ( گم ) : بەخوا .

( مانی ) لیبەتی قووەتی تەصویری برۆی تۆ
ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەففیس نەکشاوە (٥)

بۆچی نەگریم ، صەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی !
بۆ مەی نەڕژێ ، شیشە لە صەد لاوە شکاوە ! (٦)

---

(٥) مانی : وێنە و نەخشکێشێکی بەناوبانگی ئێرانی بووە . ئیدیعای پێغەمبەریشی کردووە . لە سەردەمی بەهرامی یەکەمی ساسانیدا بە شێوەیەکی دڕندانە کوشتیان ، پێستیان گرۆ و پڕیان کرد لە کا و لە بەردەرگای شاریجوندیشاپوردا هەڵیانواسی تا خەڵك سەیری بکەن ..
تەصویر : وێنەکێشان . موتەنەففیس : هەناسەدەر ، گیانلەبەر .

واتە : برۆت ئەوەندە جوان و ڕازاوەیە ، تەنانەت نیگارکێشێکی بەناوبانگی وەك مانییش ناتوانی وێنەی بکێشی . کەوانی برۆی تۆ بەدەستی ئادەمیزاد ئامادە نەکراوە بۆ تیر نان بە دڵی دلدارانەوە .. هەر خوا ئەتوانی کەوانی وەكبرۆی تۆ دروست بکا هەمیشە ئامادەی ڕاوکردنی دڵی دلداران بێ .

نیوەی دوەمی ئەم بەیتە حوسنی تەعلیلی تیایە بۆ نیوەی یەکەمی و ، لەنێوان (قەوس) و (نەکشاوە)شدا تەناسوب هەیە .

ئەم قەوسە (چر) : ئەو قەوسە . (من) : ئەم نەقشە .

ئەم بەیتە لە نوسخەکانی جگە لە (چر) و (عب)دا بەیتی هەشتەمە .

(٦) واتە : ڕۆژی صەد جار دەست بە ڕۆمەوە ئەنێی و دڵم ئەشکێنی ، ئیتر چۆن نەگریم اشەرابی خوێنی دڵم چۆن لە چاوەکانمەوە نەڕژێ و سەرنەکا، مادەم شوشەی دڵمت لە صەد لاوە شکاندووە !

نیوە بەیتی دوەم ئەنجامی نیوە بەیتی یەکەم لێك ئەداتەوە .

بە شوبهاندنی (مەی) بە (فرمێسك) و،(دڵ) بە (شوشە) ئیستیعارەیەکی موصەڕڕەحە پێکهاتووە .

بۆچ مەی (چر) و (عم) و (من) : بۆ مەی . (کم) و (خب) : مەی بۆ . (گم) : مەی بۆچ . شیشە (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و ( ٭ بەراوێزی ٭ خا ) : شوشە . لاوە (چر) و (کم) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : جێگە . (ت) : جێگا .

ئەم بەیتە لە (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) و (خا) و (خب)دا بەیتی دوەمە .

بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان
بۆ عاشقی بێچارە زووەم ئاوە زڕاوە ! (٧)

هەر جۆگەوو جێگێکی کەوا سوور و سوێر بێ
جێی جۆششی گریانی منە و خوێنە زڕاوە (٨)

---

(٧) زووەم : زۆر ئەم .

واتە : لۆمەکردنی دلدار و ڕێگای گریان لێ گرتنی داد نادا . عاشقی بەدبەخت لە زووەوە ئەم ئاوەی بۆ زڕاوە کە ئەبێ بەشــی هــەر گریان و بەدبەختی و کوڕۆزانەوە بێ .

ڕستەی ( ئاو بۆ زڕان ) لە کوردیدا کینایەیە لە داب و نەریت .

لە بەکارهێنانی (ئاو) و (زڕان)دا وردەکارییەکی جوان هەیە ، چونکە مەسەلەکە پەیوەندی بە فرمێسك و گریانەوەیە .

ئەم بەیتە لە (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب)دا بەیتی پێنجەمە . لە (کم) و (گم) و (من)یشدا بەیتی شەشەمە .

(٨) جێگێکی : جێگەیەکی . جۆشش : هاتنە جۆش و هەڵقوڵان .

واتە : هەر جۆگەیەك کە ئەیبینی ڕەنگی سوورە و تامی سوێرە ، خوێنی چاوەکانی منــە زڕاوە ، یاخود خوێنی منی بە بێتاوان کــوژراوە ، بۆیە سوورە و ، شوێنی هاتنەجۆشــی گریانی منە بۆیە سوێرە .

لە مەعنا لێــدانەوەی ئەم بەیتــەدا ئەگونجێ ( ســوور ) و ( سوێر ) هەردوکیان پێکەوە بۆ ( جۆگە ) و ( جێگە ) بگێڕێنــەوە و ، ئەشگونجێ ( سوور ) بۆ ( جۆگە ) و ( سوێر ) بۆ (جێگە) بگەڕێنــەوە و لەف و نەشری مورەتتەب بێ .

ئەشگونجێ ڕستــەی ( خوێنە زڕاوە ) بە (خوێ نەزڕاوە) بخوێنرێتەوە وەك لە هەندێ نوسخەدا نوسـراوە و هەرچۆن بێ پیتەکانی ڕســتەکە بۆ هەردوو دانرشتنەکە ئەگونجێن و نالیش بە عادەتەکەی خۆی هەر ئەوەی مەبەست بووە .

لەنێوان (جۆگە) و (جێگە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێــوان (ســوور) و ( سوێر )دا جیناسی ناقیص هەیە .

جێگێکی کەوا (عم) : جوبار کەوا . دیارە ( جۆباری )یە . (کم): جێگایە کەوا . (گم) و (من) و (خب) : جۆباری کەوا . (ك) و (اح) : جێگایێ کەوا :

سۆزی دڵمە باعیسی ئاو و کوڵی گریان
مەعلومە کە ئاگر سەبەبی جۆششی ئاوە (٩)

« نالی » وەکو زوڵفت کە موطیعی بەری پێتە
تێکی مەشکێنە ، بە جەفا مەیخەرە لاوە (١٠)

---

جێی (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : جێ . منه و : ئەمە تێکستی (چر) و (عم)ە . نوسخەکانی تر هەمو : منە ، (کم) نەبێ کە هەر لە بنەڕەتا وشەکەی تیا نییە . خوێنـــە ڕژاوە (چر) و (گم) و (اح) و (« پەراوێزی » خا ) : خوێنە ڕژاوە . ئەبێ مەبەستی ( خوێ نەڕژاوە ) بێ . (عب) : خوێی نەڕژاوە . ( خوێ )کەی بە هەڵە بە دوو (ی) نوسیوە .

ئەم بەیتە لە (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب)دا بەیتی سێهەم و ، لە (کم) و (گم) و (من)دا بەیتی پێنجەمە .

(٩) واتە : سۆزی ئاگری عەشقی دەروونمە بووە بە هۆی ئاوی گەرم و بەکوڵی گریانم . ئەمەش شتێکی سەیر نییە ، چونکە هەموان ئەزانن ئاگرە ئەبێ بە هۆی هاتنەکوڵی ئاو .

لە نیوە بەیتی دووەمدا حوسنی تەعلیل و ، لەنێوان ( تاو ) و (ئاو)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئاگر) و (ئاو)دا طیباق هەیە .

مەبەستی نالی لـە بەکارهێنانی وشەی (باعیث) بۆ پەیـوەندی نێوان ( سۆزی دڵ ) و ( تاو و کوڵی گریان ) و ، بەکارهێنانی وشەی (سەبەب) بۆ پەیوەندی نێوان ( ئاگر ) و ( جۆششی ئاو ) ئەوەیە بڵێ پەیوەندی ئەم دوانە وەك یەك نین و هی یەکەم بەتینتر و بەهێزترە .

تاو و (چر) : تاوی . (اح) : تاو . بۆ هەردوکیان دەست ئەدا . (خا) : تاب و . ئاگر (عم) : ئاور .

ئەم بەیتە لە (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب)دا بەیتی شەشەم و ، لە (کم) و (گم) و (من)دا بەیتی حەوتەمە .

(١٠) واتە : نالی کە لە بەرپێتا کەوتووە و گوێ ڕایەڵ و فەرمان بەردارتە وەك زوڵفە درێژەکانت کە ئەکەونە بەرپێت ، مەیشکێنە یـەك و ئازاری دڵی مەدە و پشت گوێی مەخە و یادی بکەرەوە .

هەرچەند ( تێك شکاندن ) و ( بەلاداخستن ) لەم بەیتەدا دراونەتە پاڵ نالی ، بەڵام کۆکردنەوەیان لـەگەڵ زوڵفـدا لـە یـەك بەیتـدا شتێکی بێ موناسەبەت نییـە ، چونکە لە بنچینەدا ئـەبێ بدرێنـە پاڵ زوڵف .

— ٢٤ —

تا لە من ئەو زولفە ڕێی بۆسە و کەناری گرتووە
ناودەمم بێ شوبهە تامی زەهری ماری گرتووە (١)

خۆش لەسەر سینەی سەری هەڵداوە دوو گۆی سەر بە مۆر
مات و حەیرانم کە عەرعەر کەی هەناری گرتووە ! (٢)

---

مەبەستی نالی ئەوەیە بڵێ ، هەرچەند من وەك زولفەکانت کەوتوومەتە بەرپێت ، بەڵام ئەمە واناگەیەنێ لە هەموو شتێکا وەك زولفتم لەگەڵ بکەی.

وەکو (عب) : سری = سەری . بەمپێیە ئەبێ (نال)ی (نالی)یش بە تاڵە باریکەکەی ناو قەڵەم مەعنا لێبدەینەوە . بە جەفا (کم) و (ت) و (اح) : بە جەفا و .

— ٢٤ —

(١) واتە : لەوکاتەوە کە زولفی یار ڕێی ئەوەی لێ گرتووم لە باوەشی گرم و ماچی‌کەم ، ناودەمم تاڵە و تامی ژاری مار ئەدا ، چونکە وەك چۆن گرانەتادار کە هیچ ناخوا ، لێوی بار ئەگرێ و تامی دەمی تاڵ ئەبێ ، منیش لەبەر بێبەش بوون لە خۆراکی ماچی دەمی یار تامی دەمم تاڵ بووە ، یاخود لەبەرئەوە کە هەرچەند دەم ئەبەم گۆنای یار ماچ بکەم ، دەمم بەر زولفی وەك ڕەشماری ئەکەوێ و ڕەشماریش ژاراوییە . بەڵام ئەم مەعنای دووهەمە لەگەڵ قەدر زانینی یاردا ناگونجێ .

زولفە ( « پەراوێزی » چر ) و (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : شوخە . بۆسە و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (عب) و (من) : بۆس و . زەهری ماری (چر) : زەهری مار . (عب) : ژارە ماری .

(٢) عەرعەر : درەختی سەروی شاخی ، درەختێکە وەك سەروی عادەتی ، بەڵام کەمێك کورتتر و بچووکترە لەو .

واتە : چەند جوان دوو گۆی سەربەمۆر لەسەر سنگی یار سەریان هەڵداوە ( مەبەست لە گۆکان جووتە مەمکی یار و لە سەربەمۆر یا گۆی مەمکەکان یا کەس دەس بۆ نەبردوویانە ) . من لەوە سەرسامم کەوا کەی شتی‌وا ڕوویداوە درەختی عەرعەر هەنار بگرێ . ( مەبەست لە عەرعەر باڵای یار و ، لە هەنار مەمکەکانیەتی ) .

عەرعەر کەی ( « پەراوێزی » چر ) و (عب) : بۆچ عەرعەر . دیسان

ئەژدەهای زولفی لە دەوری گەنجی حوسنی حاریسە
حەلقە حەلقە ، چین بە چین ، سەرتا بە خواری گرتووە (٣)

ماهی من تەنها مەهێکە صەد نوجومی مەحو کرد
یاری من تەنها گولێکە صەد هەزاری گرتووە (٤)

---

( « پەراوێـزی » چر ) و (عم) و (گم) : چۆن عەرعەر . (کم) و (من) : عەرعەر چۆن . (ت) : کەی عەرعەر .

(٣) گەنج : گەنجینە ، خەزێنە . حاریس : پاسەوان .

واتە : زولفی یار ، وەك ئەژدەها ، دەوری گەنجینەی زێڕ و گەوهەری ڕۆمەتی داوە و پاسەوانیەتی و ، پەیکەی لەسەر کردووە و ، هەموی ، لەسەرەوە تا خوارەوە ، گرتووەتەوە . ئەم بەیتە ئیشارەتە بەو ئەفسانەیە کە ئەڵێن مار بەسەر گەنجینەوە هێلانە ئەکا .

زولفی ، حوسنی (عم) و (گم) و (عب) : زولفت ، حوسنت .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو لە (عم) و (گم)دا بەرودوان . لە (عب)یشدا دوابەیتی پارچە شیعرەکەیە و نازناوی پێوە نییە .

(٤) ماه ، مەه : مانگ . نوجوم : جەمعی نەجمە واتە ئەستێرە .

واتە : یـاری دلبەری من مانگێکی تاقانەیە ، بەڵام ڕوناکییەکەی صەد ئەستێرەی لەناو بردووە و نەویاندووە . تاقە گولێکە ، بەڵام صەد گولی گرتووە و بـۆ هەرکوێیەکی ئـەڕوانێ گولێکە بۆ خۆی . یاخـود صەد دلداری گیرۆدە کردووە . ئەشکونجێ مەبەست لە ( ماه ) مانگی بەمەعنا سێ ڕۆژ و لە نوجوم جەمعی نەجمی بەمەعنا بەش بێ . واتە : هەرچەند یار جوانی تەنهـا وەرزێکە ، بەڵام جوانیـەکەی بەجۆرێـکە هەرگیز کز نابێ و صـەد وەرز ئەگرێتەوە . وشەی (هەزار)یش بەگوێـرەی شێوە نوسـینی کۆن بۆ (هوزار)ی بەمەعنا بولبولیش دەستئەدا . واتە : یار هەرچەند تاقە گولێکە ، بەڵام صەد بلبل عاشقی بوون .

مەحوکرد (ت) : پێـوەیە . (عب) : کرد مەحو . هەزار : لـە گەلێ نوسخەدا بە (هوزار) نوسراوە ، بەڵام ڕاستەکەی نالی هەردوو مەعناکەی مەبەست بووە . (کم) نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و نیوەی یەکەمی بەیتی داهاتوی لیـا نییە .

ئەم بەیتە لە (عب)دا بەیتی پێنجەمە .

دامەنی پاکی مەداری دائیرەی خامەك نیە
خوێنی مەقتولانە وا دامێنی یاری گرتووە (٥)

گەرد و بادی هیجری تۆ وا عالەمی لێ کردمە تۆز
نەك دو چاوم ، بەڵکە حەتتا دڵ غوباری گرتووە (٦)

شەربەتی عونتابی لێوی شەککەر و بادامی چاو ،
سەروی قەددت ڕاستە ئەنواعی ثیماری گرتووە (٧)

---

(٥) دامەن ، دامێــن : داوێن . پاکی مەدار : خولگەی پــاکی و خاوێنی . دائیرە : بازنە ، خولە . خامەك : قوماشێکی ئاوریشمە گەلێ ڕەنگی هەیە ، ڕەنگی هەرە باوی مۆرە . مەقتول : کوژراو .

وانە : داوێنی یار کە خولگەی پاکی و خاوێنییە و هەمو پاکی و داوێن پاکییەك ئەچێتەوە ســـەر ئەو ، وەنەبێ لەبەرئەوە شین بکاتــەوە کە لە قوماشی خامەك دروســت کرابێ . ئەو ڕەنگە شینەی پێوەیەتی ڕەنگی خوێنی دڵدارە کوژراوەکانیەتی داوێنی گرتووە .

دامێنی (عم) و (ت) و (عب) : دامانی .

ئەم بەیتە لە (عب)دا بەیتی سێهەمە .

(٦) وانە : گەرد و بــای دوریی تۆ بەجۆرێ بەرچاوی گرتــوم و دنیای هەمو لێ کردوم بە تۆز ، نەك تەنها چاوەکانم کە بەدەرەوەن ، تەنانەت دڵیــشم تۆز دایگرتووە .

گەرد و بادی (عم) و (گم) : گێژ و لوولی . هیجری تۆ (ت) : هیجرەلت . (عب) : هیجرلە . دوریش نییە (هیجرەتە) بێ واتە کۆچ کردن و نالی ئەم پارچە شیعرەی پاش بەجێهێشتنی کوردستان وتبێ . بەیتی دەهەمیش پشتی ئەم بۆچونەمان ئەگرێ .

(٧) عونناب : عەننــاب ، درەختێکی دڕکاوییە ، شەش میتــرێك بڵندە ، گەڵاکانی هێلکەیی و ددانەدارن . گوڵێکی زەرد و هێشــوویی ئــەگرێ ، دارەکەی ڕەق و ســورە . بەرێکی ورد و خڕ و بەتام و شیرینی هەیە . لە پایزا پێ ئەگا . بۆ دەرمانیش بەکاردێ . ثیمار : جەمعی ثەمەرە بەمەعنا میوە .

وانە : لە لایەکەوە شەربەتی شیرینی لێوی وەك عونناب سورت و ،

لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە ، شەککەر بارە
لێوی میحنەتباری من بێئاوە ، باری گرتووە (٨)

پڕجەفایە ، بێ وەفایە ، زۆد جەنگە ، دێر صولح
سەد دریغ و حەیفە طەبعی زۆزگاری گرتووە (٩)

---

لە لایەکی‌کەوە بادامی چاوتە . ڕاستە کە ئەڵێن درەختی سەروی باڵات چەند جۆرە میوەی وەك عوناب و بادامی گرتووە .

لێو و (چن) : لێو . دیارە (لێوی)یە . قەددی (« پەراوێزی » جر ) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) : قەددت .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (« پەراوێزی » چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (من)دا بەمجۆرەیە .

**پێتویە بادامی چاو و شەککەر و عوننابی لێو**

تەنها لە (کم)دا (شەککەر و)وەکە کەوتووە .

ئەم بەیتە لە (عم)دا دەمەم و ، لە (کم)دا شەشەمە .

(٨) لەعل : بەردێکی گرانبەهای سوورە . لێرەدا کینایەیە لە لێوی یار . بار : توێژێکە لە لێوی نەخۆش و تینوو لەنیشێ .

نالی لەمبەیتەدا بەراورد لەنێوان لێوی خۆی و یاردا ئەکا و ئەڵێ : لێوی وەك لەعلی ئاڵ و شیرینی تۆ ، تەڕ و پاراو و تێراوە ، شەکری بە سەرەوەیە . لێوی مەینەتباری منیش لە خەم و خەفەتدا وشك هەڵگەڕاوە و تەڕایی لێبڕاوە و ، باری تاڵی لێ نیشتووە .

لەنێوان هەردوو (شەککەربار)دا جیناسی تەراو و ، لەنێوان (تێراوە) و (بێئاوە)شدا طیباق هەیە . هەروەها لەنێوان هەردوو (بار)دا جیناس هەیە .

تۆ (عم) و (گم) : ئەو . تێراوە (چر) : تێراوی .

(٩) زۆد : زوو . دێر : درەنگ . صولح : ئاشتبوونەوە .

واتە : یار زۆرم ئازار ئەدا و ، بەڵێن و پەیمانی نییەو ، زوو ئەکەوێتە شەڕ و درەنگ ئاشت ئەبێتەوە . سەد حەیف و سەد مخابن وا ئەمیش سروشتی ڕۆزگاری گرتووە و وەك ئەوی لێهاتووە .

لەنێوان (جەفا) و (وەفا)دا جیناسی لاحیق و طیباق و ، لەنێوان (زوو) و (دێر) و ، (جەنگ) و (صولح)دا تەنها طیباق هەیە .

ڕۆزگاری (گم) : ڕۆژگاری .

یادی.( کانی دمدم ) و سەرچاوەکەی ( مێگوڕ ) دەکا
( بەکرەجۆ )ی چاوم کە شێوەی ( سەرچنار )ی گرتووە (١٠)

بێ مەحابا ئاو دەڕژێ گەه بە فەور و گەه بە دەور
چاوی من موددێکە شێوەی ئابشاری گرتووە (١١)

شەمعی بەزمی من کەوا سووتاوە ، زەرد و ئەشك ڕێژ
قەت لیە فەردێك ئەڵێ ڕەنگی مەزاری گرتووە (١٢)

---

(١٠) ئەبێ (کانی دمدم) یا (کانی دەمدەم) و (مێگوڕ) ناوی دوو سەرچاوە بن ، وەك (بەکرەجۆ) و (سەرچنار) .

سەرچاوەکەی (مێگوڕ) دەکا : ئەمە تەنها لە تێکستی (چن)ەوە نزیکە کە بەمجۆرە نووسراوە : سەرچاوکە میگر دکا . تێکستی هیچ کام لە نوسخەکانی‌ترمان بۆ ڕاست نەکرایەوە . بۆیە وا وەك خۆیان ئەیاننووسینەوە . (چر) : سەرچاوە گرمی کردکا . ( ٭ پەراوێزی ٭ چر ) و (عب) : سرچاوە کرمی کردکان . (ت) : سەرچاوکەء میکرد دکا . (ك) : سرچاوە کرمی سردکا . (اح) و (خا) : سەرچاوەء کومی کردکا . (من) : سرچاوە گومی کردکات .

ئەم بەیتە لە هەموو نوسخە دەستنووسەکاندا ، (عب) و (من) نەبێ ، دوابەیتە و نازناویش نییە . لە (عب)دا بەیتی پێش دوابەیتە و دوا بەیت بەیتی سێهەمی ئێرەیە . بەڵام لە (مم) و (گم)دا پێنج بەیتی‌تریش هەیە کە یەکێکیان هەروەها لە (کم) و (من)یشدا هەیە .

(١١) مەحابا : لایەنگری . گەه : جارجار . فەور : پەلە . دەور : نۆبە . ئابشار : تافگە .

واتە : چاوی من هەمیشە ، بێ خۆبەستنەوە بە کاتێکی تایبەتییەوە ، جارجار بە پەلە و جارجار بە نۆبە ، فرمێسك ئەڕێژێ ، چاوی من ماوەیەکە وەك تافگەی ئاوی لێ‌هاتووە و سەرەمز ئاوی لێ ئەڕوا .

ئەم بەیتە تەنها لە (عم) و (کم)دا هەیە و لەو دوو نوسخەیەشدا بەیتی هەشتەمە . ئێمە لێرەدا داماننا چونکە لە نوسخە دەستنووسەکاندا نەبوو .

(١٢) نالی لەم بەیتەدا چاوی خۆی شوبهاندووە بە مۆم و ئەڵێ : مۆمی بەزم ڕازێنەوەی مـن کە چاومە ، سووتاوە و زەرد هەڵگەڕاوە و فرمێسك ئەڕێژێ کە دڵۆپەی مۆمە تواوەکەیە ، ئەوەندە کپ و بێ‌دەنگە و بێ‌دەنگ

مووددەمێ زەجرم دەکات و ، پێم‌دەڵێ : صەبرت بێ
کەر بە لەعنەت بێ کە کەی عاشق قەراری گرتووە ! (١٣)

« نالی » وا دائیم کە مەشغوولی فوغان و نالەیە
باعیثی هیجرانی یارە دڵ شەراری گرتووە (١٤)

---

بۆ خۆی ئەگرێ ، کەس نییە ئەڵێ ڕەنگی کوردستانی لێ نیشتووە .
ئەم بەیتەش هەر لە (عم) و (گم)دا هەیە .

(١٣) زەجر : سەرکوتاندنەوە .

واتە : کابرای لە خۆشەویستی نەگەیشتوو سەرم ئەکوتێنەوە کەوا من بەدەست دەردی دڵەوە نازەحەتم و پێم‌ئەڵێ خۆت ڕاگرە .. دەك پیاوی کەر بەلەعنەت بێ ، ئەگەر ئەو کەر نەبوایە لەیفامێ کەوا دڵدار هەرگیز خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ .

ئەم بەیتەش هەر لە (عم) و (گم)دا هەیە .

لەم دوو نوسخەیە و لە (کم) و (من)یشدا پاش ئەم بەیتە بەیتێکی‌تریش هەیە . ئەو بەیتە ئەوەیە لە (کم)دا کراوە بە دوا بەیت . لەبەرئەوە کە ئەو بەیتە لە زۆر ڕووەوە لە بەیتی دەهەمی ناو ئەسڵی شیعرەکان ئەچێ ، نەمانئووسیەوە . ئەو بەیتە ئەمەیە :

**چاوی « نالی » دائیمەن فرمێسکی لێ دەڕژێتە خوار**
**وادەزانم هەر کە شێوەی سەرچناری گرتووە**

(١٤) شەرار : شەرارە ، بڵێسە .

واتە : نالی کە هەمیشە ئەنالێنێ و هاوار ئەکا ، بەهۆی دووریی یارەوەیە کە ئاگری بەرداوەتە دڵ و دەروونی .

ئێمە، هەرچەند لەم پێنج بەیتە زیادەمان بلاو کردەوە کە هەر لە نوسخە چاپەکاندا هەن ، لەو باوەڕەدا نین هیی نالی بن . نە شێوە و نە ئەکنیکی داڕشتن و نە ناوەڕۆك هیچیان وانساگەیەنن بەشی یەکەم و دووهەمی ئەم پارچە شیعرە لە یەك جۆر بن . نەبوونی نازناویش لە دوابەیتی بەشی یەکەمدا کە بەیتی دەهەمە ، شتێکی سەیر نییە . سەرەڕای ئەوە کە هەر لەوانەیە نالی خۆی نازناوی‌دانەنابێ ، لەشکونجێ گۆڕانێ بەسەر دوابەیتا هاتبێ ، یا بەیتی‌تر بڕێ و فەوتابێ .

لە نوسخەکانی (کم) و (گم) و (من)دا وردە جیاوازییەکی بێ‌بایەخ لەنێوان تێکستەکانی ئەم بەیتەدا هەیە .

گولبنی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە
غونچە بەم شیرینییە قەط نەی‌شەکەر نەیکردووە (١)

نەخلی باڵاٚت نەوبەرە ، تازە شکۆفەی کردووە
تۆ کە بۆی شیرت لە دەم دێ ، ئەم مەمەت کەی کردووە ! (٢)

---

— ٢٥ —

(١) گولبن : درەختی گوڵ . چەپکە گوڵ . قوبــە : گومەز . نەی‌شەکەر : قامیشی شەکر .

واتە : باڵای وەك گوڵباخت ، بەسەر گومەزی سنگتەوە کە مەمکەکانتە، خونچەی کردووە کە کۆکانیەتی .. خونچەیەکی ئەوەندە بەتام و خۆش و شیرینی کردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا کاڵە ، قامیشی شەکر پیا ناگاتەوە لە شیرینیدا .

دیارە نالی ئەم پارچە شیعرەی بۆ کچۆلەیەکی تازە پێگەیشتوو وتووە .

گولبنی (کم) و (من) : گولبەنی . (گم) و (تـو) و (خـا) : گولبونـی . کردووە ، نەیکردووە (چر) و (لو) و (عب) و (خب) : کرلووە ، نەیکرلووە. قەط (کم) و (لو) و (عب) و (خب) : قەد . (گم) و (من) : قەت .

(٢) نەوبەر : تازە بەر گرتو . شکۆفە : کۆپکە ، هەڵاڵە . نەخل : دار خورما . بۆ : بۆن . مەمە : مەمك .

واتە : باڵای وەك دار خورما بەرز و رێك و پێکت ، تازە بەری گرتووە و هەڵاڵەی کردووە .. تۆ ئەوەندە منالی هێشتا بۆنی شیر لە دەمت دێ ، چۆن وا مەمکت کردووە ! ( مەمك کردن ، بێجگە لە مەعنا دیاریەکەی ، کینایەشە لە گەورە بوون و پێگەیشتن ) .

لەنێوان (دەم) و (ئەم) و (مەم)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (شیر) و (مەم)یشدا تەناسوبێکی جوان هەیە ، چونکە شیر لە مەمکەوەیە. تازە ( خب ) : دوێنێ .

ئەم بەیتە لە (چر) و (کم) و (گم) و (عب) و (من)دا سێهەم و ، لە (لو)دا چوارەمە .

قامەتت نەخلە ، بە شیری ، فائیقەی پەی کردووە
نەحلی بێ نێشی مەمەت شەهدی سپیی قەی کردووە (٣)

---

(٣) نەخل : دار خورما . کینایەشە لە بالابەرزی . فائیقە : حوشترێکە هەر لەگەڵ دۆشینیا گوانی پڕ ببێتەوە لە شیر . فائیق : لای سەرۆی گەردن کە سەر و ملی تیا بەندئەگرێتەوە . پەیکردن : قاچ بڕینەوە . نەحل : هەنگ . بێ نێش : بێ چزۆ . بێ ئازار . شەهد : هەنگوین . قەیکردنەوە : ڕشانەوە .

لێکدانەوەی مەعنای نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ، بە مەینەتێکی زۆر تەواو بۆ بۆمان ، چونکە تێکستی هەرکام لە نوسخەکانی بەردەستمان بە تەنها خۆی مەعنایەکی تەواوی نەئەدا بەدەستەوە . لێمە ئەم تێکستەی ئێرەمان لە لێکدانی وشە زۆلێچووەکانی هەمۆ نوسخەکان داڕشتووە . بەر لە لێکدانەوەی مەعنای بەیتەکە وەك خۆمان بۆی چووین ، وا بە باشتر ئەزانین تێکستی هەمو نوسخەکانی بەردەستمان بە شێوە نۆسەکەی خۆیان بخەینە بەرچاو .

(چر) و (لۆ) و (عب) و (خا) :

قامت نخلی بشیری فایقی کی کردوه

(چن) : قامتت نخله به شیر فایق پی کردوه

(عم) : قامتت نخله و به شهدی فایقی کی کردوه

(کم) : قامتی نخلی بشیری فایقی کەی کردوه

(گم) : قامتت نخله به شهدی فایقی کی کردوه

(لد) : قامتت نخل بشیر فایقی پی کردوه

(اح) : قامتت نخل بشیره فایق پی کردوه

(من) : قامتی نخلی بشیری فایقی قەی کردوه

(خب) : قامت نخل بشیر فاتقی فی کردوه

ئەمە بەشبەحاڵی نیوە بەیتی یەکەم . بەشبەحاڵی نیوە بەیتی دۆهەمیش ، جیاوازیی بێهەڵە هەر ئەمە بۆ : بێ نێشی (چن) و (عب) : بێ مێشی .

مەعنای بەیتەکەش ، وەك ئێمە بۆی ئەچین ، بەمجۆرەیە : بالات وەك دار خورما بەرزە ، بە شمشێری دەستی ، یاخود بە شیری مەمکەکانی ،

نەخل و ڕوممان پێکەوەن ، یا باغەبان وەی کردووە :
سەروی هێناوە لە سێب و بەی موتوربەی کردووە ! (٤)

---

حوشتری شیرای ، یاخود شوێن پێوەندی سەر و گەردنی پەی کردووە و بڕیوەتەوە . هەنگی ئازار نەگەیێن و بێ چرژی مەمکیشت ، هەنگوینی سپی هەڵهێناوەتەوە .

لەوانەشە لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا ، لە (ئەحلی بێ نێش) و (شەهدی سپی)دا ئیشارەت بە حاڵەتی (حەسانەوەی ئافرەت) کرابێ .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (ت)دا نییە و ، لە (چر) و (کم) و (گم) و (من) و (مب)دا چوارەمین بەیتە . تەنها لە نوسخەکانی (عم) و (گم)دا لەپاش ئەم بەیتەوە ، ئەم بەیتەی خوارەوەش هەیە کە لەگەڵ شێوەی تێکڕای پارچە شیعرەکەش ناگونجێ و مەعناکەشی زۆر سادەیە و لە چەشنی نالییەوە دوورە :

خۆم بە قوربانی سەر و دەسماڵ و دوگمەی کردووە
خۆم بە قوربانی دو چاوی پڕ لە سورمەی کردووە

(٤) ڕوممان : هەنار . باغەبان : باخەوان . سێب : سێو . موتوربە : پێوەند، تلقیح . وەی : وای ، وەهای . لە نوسخەکانی بەردەستمانا نوسراوە ( وای ) . ئێمە ئەومان لا هەڵە بو ، بۆیە بەم جۆرەی ئێرەمان نوسیبەوە .

واتە : سەرم لەم باڵای وەك دار خورما بەرزی بەبەری هەنارەوەی یارە سوڕماوە . نازانم ئاخۆ هەر لە سروشتدا وایە دار خورما بەری هەناری گرتووە ، یاخود باخەوان هاتووە داری بەرزی سەروی لە داری سێو و بەی موتوربە کردووە و باڵای وەك سەروی یار مەمکی وەك سێو و بەیی گرتووە .

نەخل و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : سێب و . (عم) و (گم) : سێو و . موتوربەی : لە هەموو نوسخەکاندا ، (عم) و (گم) و (خب) نەبێ ، بە هەڵە بە ( مطربەی ) نوسراوە . (عم) بە (مربی) و (گم) بە ( مطربە )ی نوسیوە ! تەنها (خب) بە بێ هەڵە نوسیویەتەوە لەسەر ڕێنوسی کۆن . زۆر سەیرە کۆمەڵێ نوسەر وشەیەکی ڕەسەنی کوردییان لێ بێ بە عەرەبی !

ئەم بەیتە لە (چر) و (ت)دا سێیەم و ، لە (چن) و (اح) و (ك) و (خا) و

بۆ مەمك « نالی » چ منداڵانە وەی وەی کردووە
گەرچی مۆی وەك شیرە ، بەو شیرە شکۆفەی کردووە (٥)

خۆش بە هەردوو دەست و دەم گرتـوویە تۆخەی کردووە
کیذب و توهمەت ، ئیفتیرا و بوهتان کە تۆبەی کردووە (٦)

---

(خب)دا چوارەم و ، لە (کم) و (گم) و (من) و (لو) و (عب)دا دووەمە .

(٥) واتە : بڕوانە بۆ نالی چون وەك منداڵ بۆ مەمکی یار ئەگری و کەوتووەتە هاوار هاوار .. هەرچەند پیریش بووە و مۆی وەك شیر سپی بووە ، بەو شیرەی مەمکی یار هەڵاڵەی کردووە و پێگەیشتووە .

ئێمە وای بۆ ئەچین وشەی (بەو) بە (بۆو) بخوێنرێتەوە واتە (بۆ ئەو) و مەعنای بەیتـەکە وای لێدێتەوە : بـۆ لـەو شـیرە منـاڵ بووەتەوە و کەوتووەتەوە گڕ و گاڵ و وەك درەختی بەهاران هەڵاڵەی کردووە .

دووریش نییە مەبەستی لە (شکۆفە کردن) سپی بوونی ڕیشی بێ و بڵێ ئەو سپیەتییە لەئەنجامی سپیەتیی شیری مەمکی یارەوەیە .

وەی وەی (چر) و (عب) : وای وای . بەو (چر) و (کم) و (گم) و (لو) و (عب) و (خب) : لەو .

(٦) خۆش : زۆر باش . توهمەت ، ئیفتیرا : بوختان .

واتە : سـەیری نالی کە چەند چاك بە هەردوو دەست و بـە دەم مەمکی یاری گرتووە و لە خۆشـییاندا هەر ( تۆخەی .. تۆخەی ! )یەتی .. درۆ و بوختانە ئەڵێن تۆبـەی کردووە و دەستی لە مەمکی یـار هەڵگرتووە . شتیوا ڕاست نییە و دڵداری ڕاستـەقینەی وەك نالی هەرگیز تۆبەی پێ ناکرێ .

بوهتان ( گم ) : بوختان .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو تەنها بەگوێرەی (عب) بەرودوا بەیتی پێنجەم و شەشەمن . ئەگینا لە هەموو نوسخەکانیترا ، لە (چر)دا نەبێ ، لە جێی یەکتردان . ئێمە شێوەی نوسخەی (عب)مان پەسەند کرد چونکە بەیتی نوسخەکانیتر مەرجەعی ضەمیری ( کردووە )کـانی بەیتی پێشـوو دیار نەلەبۆ کە لەوەش دروست نییە . لە نوسخەی (چر)دا نیـوەی یەکەمی بەیتی پێنجەم و نیوەی دووەمی بەیتی شەشەم گۆڕاون بە بەیتی پێنجەم و، نیوەی یەکەمی بەیتی شەشەم و نیوەی دووەمی بەیتی پێنجەم گۆڕاون بە بەیتی شەشەم . لە پەراوێزیشدا بە فارسی نوسراوە « در نسخە قدیمە

— ٢٦ —

گەرمێ و تەڕیی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە
پشکۆی گوڵاڵەشێن بە نەسیم بۆ گەشایەوە (١)

---

مصرع ثانی ( بو ممك .. الخ ) ، ( گرچه موی .. اه ) است ، و مصرع ثانی ( خوش بهردو .. اه ) ، (کلب و تهمت .. است) ». واته لە نوسخە کۆنەکەدا نیوەی دۆهەمی ( بۆ مەمك .. تاد ) ، ( گەرچی مۆی .. ) » و نیوەی دۆهەمی ( خۆش بە هەردۆ .. تاد ) ، ( کیلب و توهمەت .. )» . واته : ئەو نوسخە کۆنەیەش کە (چر) ئیشارەتی بۆ ئەکا ، هەر وەك نوسخەکانیتر و ئەم نوسخەی ئێمەیە وایە .

— ٢٦ —

ئەم قەسیدەیەی نالی ، سەر تا خواری تەرخانە بۆ باسی بەهار .

(١) گوڵاڵەشێن : گوڵ ئاڵەشێن ، گوڵی وەك ئاگر سۆر . نەسیم : سرەوەی ناسکی با .

واته : بەهۆی گەرمێ و تەڕیی هەوای بەهارەوەیە وا پشکۆی ئاگری زستان کوژایەوە ، چونکە کە گەرما داهات پێویست بە ئاگر نامێنێ و کە دنیا تەڕ بۆ ئاگر ئەکوژێتەوە . بەهۆی سرەوەی ناسکی بای بەهاریشەوە بۆ پشکۆی گوڵی سۆری وەك ئاگر خۆڵی بەسەرەوە نەما و گەشایەوە و ڕەنگە سۆرەکەی دەرکەوت .

دۆر نییە نالی بە ڕستەی ( پشکۆ کوژایەوە ) ئیشارەتێکی بەپێچەوانەشی کردبێ بۆ زاراوەی ( سقوط الجمرة ) کە بە کاتی سەرەتای داهاتنی گەرما و شکانی سەرما ئەڵێن و مەبەست لێی ئەوەیە پشکۆیەکی ئاگر کەوتووەتە سەرزەوێ و دنیا تۆزێ سەرمای شکاوە . ئەگەر وابێ نالی (سقوط)ەکەی کە لە زاراوە عەرەبییەکەدا بەمەعنا کەوتنە زەوییە ، بە (کوژانەوە) مەعنا لێداوەتەوە .

نالی هەروەها لەم دۆ نیوە بەیتەدا طیباقێکی جوانی بەدیمەن دروست کردووە کە ئەوەتە ئەڵێ (پشکۆ کوژایەوە) و (پشکۆ گەشایەوە) و لەڕاستیشدا (کوژانەوە) و (گەشانەوە)کە یەك شتن . لەنێوان هەردۆ وشەی (پشکۆ)شدا ئیشتراك هەیە .

گوڵاڵەشێن بە نەسیم بۆ (چر) و (کم) و (ت) و (ك) و (تو) و (عب) و (اح) و (خا) : گوڵاڵەشێنی نەسیم بۆ . (من) : دڵاڵەشێنی نەسیم بۆ .

لاله که مەجمەرێکە بە با خۆش و گەش دەبێ
ناوی کە پڕ خەڵوزە بە شەبنم گەشایەوە (٢)

گوڵ زاری وا ، کە هەرچی دەمێکی بو پێکەنێ
غونچەی گەشا کە یەعنی گرێی دڵ کرایەوە (٣)

---

(٢) لالە : گوڵێکی جوانە پتر لە شوێنی شێدار و قەراخئاودا ئەڕوێ . بە عەرەبی پێی‌ئەڵێن (شقائق) یا (شقائق النعمان) ، گەلێ جۆری هەیە . هەیەتی سێ پەڕە و هەیەتی پێنج پەڕەی هەیە . مالیش و کێویشی هەیە . کێوییەکەی پەڕەکانی سوور و بنی پەڕەکانی لەکەیەکی ڕەشی پێوەیە . لە سەرەتای بەهارا بە سەلك ئەنێژرێ . مەجمەر : مەقەڵێ ، جێگای پشکوی ئاگر . شەبنم : شەونم .

وانە : گوڵی لالە کە ئەڵێی مەقەڵییە پڕە لە پشکوی ئۆتکە سوور و گەش و بن ڕەش کە هێشتا هەر خەڵوزە و گەش نەبوەتەوە و . . بە شنەی بای بەهار ئەگەشێتەوە و وەك ئاگر خۆش بکەی ، خۆش ئەبێ ، نارەکەی کە هێشتا ڕەشە و سوور نەبوە ، بە شەونمی بەهار گەش ئەبێتەوە . . سەیرە خەڵوزی ناو مەقەڵێ بە با گەش ئەبێتەوە ، بەلام ڕەشیی گوڵی لالە بە شەونم ئەگەشێتەوە کە ئاوە و ئەبێ وەك چۆن ئاو پشکۆ ئەکوژێنێتەوە ، ئەمیش بەشە سوورەکەی ئەوی ڕەش کردایەتەوە .

دەبێ (کم) : ئەبێ . شەبنم (کم) : شەونم . گەشایەوە (چن) و (عم) و (گم) : کوژایەوە . ئەگەر (کژایەوە) نەبوبێ و دەسکاری کرابێ ، دیارە هەڵەیە .

(٣) زار : دەم . وا : کراوە . گەشا : گەشایەوە .

وانە : گوڵ دەمی کراوەتەوە کە ئەوەش وانەگەیەنێ هەرچی گەلایەکی‌کراوەی هەیە هەموی بووە بە دەم و هەرچێ دەمیشی هەیە هەموی هاتووەتە پێکەنین . خونچەش گەشاوەتەوە و پەڕە یەك لە یەك پێچراو و ئالۆزەکانی لە یەك جوێ بونەتەوە و ، ئەو کرانەوەی ئەوانەش وانە گرێی دڵی خەفەتباران کراوەتەوە کە جاران زستان لە کونی ژوورەوەی توند کردبون .

ئەتوانین نیوە بەیتی یەکەم بە جۆرێکی‌تر مەعنا لێبدەینەوە لەسەر بناغەی ئەوە کە (گوڵ) و (زار) بە (گوڵزار) بخوێنینەوە و (وا) بکەین بە خەبەری ، وانە : گوڵزاری بەهار بەجۆرێك بۆ هەرچی دەمێکی هەبۆ ،

فەصلێ کە هەر لە فەرقی بەشەر تا ڕەگی شەجەر
وشکێ بە غەیری صۆفیبو عاصای نەمایەوە (٤)

لەم فەیضی نوورە هەرچی کەوا نارە مردووە
بەم نەفخی صوورە هەرچی کە خاکە ژیایەوە (٥)

---

یا هەر کاتێکی هەبێ ، پێیەکەنێ . بۆیە لە (زار) و (وا) و (دەم)دا لەطافەت هەیە .

دەمێکی بو (چر) و (ت) و (اح) و (خا) : دمێکی کە . («بەراوێزی»چر): دەمێ هەبیو . (چن) : دەمێك بو . ئەبێ ئەمیش (دەمێکی) بێ . فونچەی: ئەمە تێکستی تەنها (چر)ە . نوسخەکانی‌تر هەمێ (غونچە) . (گم) : خونچە! گرێی دڵ کرایەوە (چر) : گوژەی یا گژەی دڵ کەژایەوە یا گژایەوە . (ت): کری دڵ کرایەوە . بۆ هەمێ ئیحتیمالەکان دەست ئەدا . (لـو) : گژی دڵ کوژایەوە . (اح) : کژیی دڵ کرایەوە . لەوانەیە (کژێ) بەمەعنـا (کرژێ) بێ . (خا) : کژەی دڵ کژایـەوە . بۆ (گژەی) و (گوژەی) و (گەژایەوە) و (گژایەوە) ئەگونجێ .

(٤) فەرق : تەوقی سەر . شەجەر : درەخت : عاصا : داری دەست .

واتە : وەرزێکی‌وا پڕ لە خۆشی و ژیانە هەر لە تەپڵی سەری بنیادەمەوە تا ڕەگ و ڕیشەی گیا و درەخت هەموی تەڕ بووەتەوە و کەوتووەتـەوە گەشەکردن و ، لە وشکە سۆفی و دارە ڕەق و تەقەکەی دەستی بەولاوە کە یەك لە یەك وشـك و بێ‌گیـانترن ، شت نەمـاوە نەخوسـابێتەوە و نەبوژابێتەوە .

صۆفیبو عاصـای (چن) : صۆفی عەصـایێ . بەپێـی ئەم نوسـخە زیادەڕەویەکی لەڕادەبەدەر پێك‌دێت .

(٥) نەیض : لێشـاو . نار : ئاگر . نەفخی صوور : فوکردن بەو کەڕەنایەدا کە مردوی پێ زیندو ئەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا .

واتە : لەم وەرزی بەهارەدا بە هێزی لێشـاوی نووری خودا ، هەرچـی ئاگرە و لە سروشتی ئاگردایە و سەرکەشـە ، سارد بووەتەوە و مردووە . هەرچی لە خاکیشـە و سروشـتی خاکیـە ئەبوژێتـەوە و ئەژێتـەوە و سەر لە خاك دەرئەهێنێ .

لەنێوان (نوور) و (نار)دا جیناسی لاحیق و طیباق و ، لەنێوان (صوور) و (نوور)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (نار) و (خاك) و ، (نەفخی صوور) و (مردووە) و (ژیاوە)دا تەناسوب هەیە .

هەنجیری ئەو شکۆفە کە پڕ بۆ لە شیری صاف ،
طیفلی عینەب شکۆفەیی کرد و ڕشایەوە (٦)

دایەی زەمین کە حامیلی ئەبنایی مەحشەرە
هەر تۆوێکی تیا کە ئەمانەت بو ، دایەوە (٧)

---

(٦) ئەوشکۆفە : تازە گوڵ کردن . ڕشایەوە : ڕشانەوەی ترێ لە کوردەواریدا بەو کاتە ئەوترێ کە تازە هێشوی بەرسیلە دەرئەکەوێ و دەنکەکانی ئێجگار وردن .

نالی لەم بەیتەدا تەقلە هەنجیری تازە هەڵتۆقیوی ساق پڕ لە شیلەی وەك شیری شوبهاندووە بە مەمکی کچی تازە پێگەیشتو و ، بەرسیلەی تازە دەرکەوتوی ترێیشی شوبهاندووە بە منداڵ و ، لەبەرلەوە کە بەو دەرکەوتنی بەرسیلەیە ئەڵێن (ڕشانەوەی ترێ) ،دایناوە کەوا منداڵەکە کە بەرسیلەکەیە ڕشاوەتەوە و ڕشانەوەکەشی داوەتە پاڵ پڕبونی مەمکی هەنجیر لە شیر ..

نالی ئەڵێ : کە تەقلە هەنجیری تازە هەڵتۆقیو پڕ بو لە شیری خاوێن و بێ گەرد ، بەرسیلەی تازە دەرکەوتوی ساواش گەشایەوە و ڕشایەوە ..

لەم بەیتەدا لەنێوان (هەنجیر) و (عینەب) و ، (طیفل) و (ڕشانەوە)دا تەناسوب هەیە .

هەنجیری (چر) و (ت) و (خب) : ئەنجیری .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (چر) و (عب)دا بەیتی حەوتەم و ، لە نوسخەی (لو)دا بەیتی هەشتەمە .

(٧) دایە : دایك . حامیل : هەڵگر ، دوگیان . ئەبنا : ئەبناء ، جەمعی ئیبنە بەمەعنا منداڵ .

نالی لەم بەیتەدا بەهار ئەشوبهێنێ بە ڕۆژی حەشر کە هەمو مردو زیندو ئەبنەوە . مردووە زیندوبووەکانیشی ئەو تووە جۆربەجۆرانەن کە لەناو زەویدان و ئەڕوێن و سەر دەردێنن . لە لایەکی‌کەشەوە زەویی کردووە بە دایکی دوگیان و گژ و گیا و گوڵی سەر دەرهێناوی کردووە بە منداڵی ناو سکی ئافرەتی دوگیان و ، ئەڵێ : دایکی زەوی کە ئاوسە و تووی هەمو جۆرە ڕووەکێك لە سکیایە ، وەك چۆن زەویی ڕۆژی مەحشەر لەم هەمو خەڵکەی لە نێوایە ، هەمو ئەو تووانە ئەداتەوە کە بە ئەمانەت لای دانراون ، وەك چۆن زەویی ڕۆژی مەحشەر هەمو مردووەکانی ناوی

سوبول لەبەر ڕوحوتەکی شمشادی تازەدا
هات و بە طەعن و دەورە بەسەریا شکایەوە (٨)

خەضرا ، دەڵێی زەمینە بە (چین) و (خەطا)یەوە
غەبرا ، دەڵێی سەمایە ، بە شەمس و سوهایەوە (٩)

---

هەڵئەدانەوە بۆ سەر زەوێ .

لە کۆکردنەوەی (دایە) و (حامیل) و (ئەبنا) و (آلو) و ، هەروەها لـە کۆکردنەوەی (زەمین) و (آلو)دا تەناسوب و ، لەنێوان (دایە) و (دایەوە)دا وشە ئارایی هەیە .

ڕوێکی (چر) : لـوی کە . (عم) و (ت) و (اح) و (خـا) و (خـب) : ڕوێکی . (کم) و (من) : ڕوخی . (گم) : ڕوی . یا کە (چن) : تێدا بو . (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : تێدا کە . ئەمانەت بو (چر) : ئەمانەت . دایەوە (چر) : درایەوە .

ئەم بەیتە لە نوسخەکانی (چر) و (لو) و (عب)دا بەیتی شەشەمە .

(٨) ڕوحوتەت : بێعەقلی . شمشاد : داری شمشاڵ . طەعن : ڕم پیاکردن . دەورە : خول بە دەورا خواردن . ئەم دوانە زاراوەی جەنگن .

واتە : سونبولی تازە دەرهاتوی بەهار کە بێعەقلیی داری شمشالی دی هەر هەڵئەچێ و خۆی لێ بایی ئەبێ ، ڕێی لیر و ڕمی خۆی لێ کرد و بەدەوریا پێچی خوارد و شکایـەوە بەسـەریا . مەبەسـت لە بێعەقلیـی داری شمشاڵ ئیشارەت کردنە بەو درۆ فۆلکلۆریە کە ئەڵێ : « دریژ بێعەقلە » !

لەبەر (چن) : لەسەر . (کم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) و (خا) و (خب): بەسـەر . بەطەعن و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : بە طەعن . دیارە ئەبێ لەگەل (و)ی عەطفدا بێ . بەسـەریا (کم) و (ت) و (اح) و (من) و (خا) : بە شـیر (؟) .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (چر) و (لو) و (عب)دا بەیتی حەوتەمە .

(٩) خەضرا : سـەوز ، ئاسـمـان . خەطا : خەتـا و خوتەن ، دوو ناوچەن لـە تورکمانسـتان . غەبرا : ڕۆزاوێ ، ئاسـمان . سەما : ئاسـمان . سـوهـا : یەکێکە لە ئەسـتێرەکانی کۆمەڵەی حەوتەوانە .

واتە : زەوێ ئەوەندە سـەوز و نەخش و نیگاراوێ و بۆنخۆشـە ، وای

( بَرْدُ العَجوز )ەێکی کە ئەیتۆ بە غەیری بەرد
دنیا ئەمە چ ڕەنگە ، چ بێتێکە دایەوە ! (١٠)

غەیری تەڕیی عیشقی حەرارەتنوما ، نەمــا
بەفریش لە سەرد و گەرمی خەجالەت توایەوە (١١)

---

لێ‌هاتووە تەنانەت ئاسمانی سەوز و ڕازاوەشی پێ ئەشوبهێنرێ و ئاسمان لە سەرزێ و ڕازاوەییدا لە زەوێ ئــەچێ . زەوییش ئەوەندە جوان و ڕوناکە ئەڵێی ئاسمانە بە خۆر و ئەستێرەی حەوتەوانەیەوە .

لەنێوان (خەضرا) و (غەبرا) و ، (زەمین) و (ئاســمان) و (شــەمس) و (سوها)دا طیباق هەیە . لەنێوان (سەما) و (سوها)یشدا نیمچە جیناسێکی لاحیق هەیــە .

دەڵێی ــ لە هەردوو نیوە بەیتەکەدا ــ (کم) : لەڵێی .

(١٠) برد العجوز : برجی پیرەژن ، چەنــد ڕۆژێکە لە دوازرۆژەکانی زســتان ، هەوایان تیا زۆر سارد ئەبێ .

واتە : تا دوێنێ (برد العجوز)ێك بۆ لە سەرمــایەکی وەك بەردی ڕەق بەولاوەی نەبۆ بیدا بە ڕۆی بنیادەما ، نازانم ئێستا دنیا چ ڕەنگ و بۆنێکی خۆشی بەهار ئەداتەوە و ئەمە هەمووی لەکوێوە هات وا زۆ ! . یــاخود دنیا تا دوێنێ لە ڕەنگ و ڕۆدا وەك (بەرد) و وەك (پیرەژن) وابۆ ، ئێستا چۆن وا وەرگەڕا و ڕەنگ و بۆنی بەهاری وەرگرت کە ئەڵێی کچی ڕازاوەیە کولاوی داوە لە سەر و ڕۆی !!

(برد العجوز)ەیێکی (چــر) و (عــم) و (گــم) و (لــو) و (عــب) : ( برد العجوز)ەیێکە . بە غەیری (عب) : لە غەیری .

(١١) حەرارەت نوما : گەرما نوێن .

واتە : بە داهاتنی بەهار ، بێجگە لە تەڕیی دڵی دڵداران کە ئەویــش نیشــانەی گەرمایە ، هیچ شتێکیوا نەما سەرما بکەیەنێ . تەنانەت بەفریش بەسەر کێوانەوە بەهۆی سەرما و گەرمای شەرمەزارییەوە کەوا سەردەمی بەسەرچۆ ، توایەوە . سەرما و گەرما : کینایەن لە گۆڕانی حاڵ .

لەنێوان (نوما) و (نەما)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

تەڕیی (چر) و (چن) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : تەڕیو . عیشقی (چر) و (عــمب) و (خــا) : عیشــق و . (چــن) و (عــم) و (ك) و (لــو) و

هەر چاوەیێ کە وشك و عەقیمی بوڵەندییە ،
وەك طەبعی من بە نەظمی خوشی نەغمە زایەوە (١٢)

صاف و ڕەوان و نەرمە وەکو زەمزەم و فورات
نەك ڕەنگی نیلە یەعنی کە هات و گەڕایەوە (١٣)

صۆفیێ زیایە خەڵوەتی ، بینی بەهاری کرد
هاتەدەرێ لە سایەیی چایەر ، حەسایەوە (١٤)

---

(اح) و (خب) : عیشق . دیارە ئەبێ (عیشقی) بێ . نوما نەما (عم) و (گم) و (ك) و (اح) : نەما نەمـــا !

(١٢) چاوە : سەرچاوە و کانیاو . عەقیم : نەزۆك . طەبع : تەبیعەت . خوش : خۆش . نەغمە : ئاواز . زایەوە : تەقیێ .

واتە : هەر کانیاو و سەرچاوەیەك بەهـۆی بەرزیی شوێنەکـەیەوە وشکاوی هاتبێ و ئاوی لەبەر نەڕوا ، لەم بەهارەدا تەقیوەتـەوە ، وەك چون سروشتی من بە شیعری خۆش ئاواز تەنیوەتەوە و هەمیشـە شیعری جوان لە سەرچاوە و کانیاوی دەمم لێشـاو ئەکـا .

ئەشکونجێ (وەك طەبعی من) بەسرایێ بە(وشك و عەقیمی بوڵەندییەوە)و ئیشارەتێکی ناسکی تیابێ بۆئەوەی هەرکەس سروشتی بەرز بێ و سـەر دانەنەوێنێ ، سـەرچاوەی ڕزق و ڕۆزیی وشك ئەکا و هیچی دەسگیر نابێ، چونکە لەم جیهانە لیـــتانی هێشتا زۆری لەسەر ڕۆپـاماڵێ و ماسـتــاو کردن و شانەکاندن و درۆ لەگەڵ خۆدا کردن بەندە . .

لەنێوان (عەقیم) و (زایەوە)دا طیباق هەیە .

وشك و عەقیمی (چر) و (لو) و (عب) : وشکـی عەقیمـی . (چـن) : وشك و عەقیم و . نەظمی (ك) و (خا) : نەظم و .

(١٣) واتە : ئەو سەرچاوە تەقیوانە ئاویان ساف و ڕەوان و سۆکە بۆ گەدە ، وەك ئاوی زەمزەم و فورات وان کە پیرۆز و خاوێن و سازگارن و ، وەك ئاوی نیل لێڵ نین کە دێت و هەڵئەچێ و پاش ماوەیەك ئەنیشـێتەوە و ئەگەڕێتەوە دۆخی جارانی .

نەرمە (ت) و (عب) و (من) و (خب) : بەزمـە (!) . گەڕایـەوە (چر) و (اح) و (خا) : کوژایەوە .

(١٤) چایەر : بەهاربەند ، تەویلە .

«نالی» بە داوە شەعری دەقیقی خەیالی شیعر
بۆ ئەوکەسەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە (١٥)

---

واتە : سۆفی بۆ ڕیا خۆی لە خەلوەدا حەشار دابوو . هەر کە بۆنی بەهاری کرد هاتەدەر و خۆی لە سێبەری تەویلە ڕزگار کرد و کەوتە گەشتی ناو باخ و گوڵ و گوڵزار . یاخود : سۆفی کە بۆنی بەهاری کرد ڕیایە خەلوەتخانەکەی خۆی و پیا ڕۆژاند و بەجێیهێشت و لە سێبەری بەهاربەند دەرباز بوو و حەسایەوە لێی .

نالی ، بە هەردوو مەعنا ، لەم بەیتەدا خەلوەتخانەی سۆفیی شوبهاندووە بە تەویلەی چوارپێ و سۆفیی خۆیشی شوبهاندووە بە گوێرێژ .

ڕیایە خەلوەتی (چن) : ڕیائی خەلوەتی . (ك) و (عب) : ڕیایی خەلوەتی.

(١٥) داوە شەعر : تالە مو . دەقیق : ورد و باریك .

واتە : نالی بە خەیالی شیعریی بۆ لە وردەکاریی خۆی کە ئەڵێی تالەمووی باریکە، صەد داوی ناوەتەوە بۆ هەر شاعیرێك، یا بۆ هەرکەسێك هەست بکا و بە خۆی بزانێ ، داوی وا کە بە هیچ کلۆجێ سەری لێ دەرنەچێ .

زیادەڕۆوییەکی جوان لەوەدا هەیە کە تالەمووی باریکی خەیالی شاعیرانە ئەوەندە زۆر بێ صەد داوی پێ بنرێتەوە .

ئەشکونجێ مەعنای (دەقیقی خەیالی) وا لێبدرێتەوە کەوا مەبەستی ئەوەبێ ( خەیالی وەك خەیالی « دەقیقی » ) کە یەکێك بووە لە شاعیرە هەلکەوتووەکانی ئێران .

لەنێوان (داوە) و (داو)دا جیناسی موحەڕڕەف و ئیشتیراك و ، لەنێوان (شەعر) و (شیعر)دا جیناسی موحەڕڕەف و ، لە کۆکردنەوەی (شاعیر)دا لەگەڵ (شەعر) و (شیعر) جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (شیعر) و (شاعیر)یشدا تەناسوب هەیە .

تەنها لە نوسخەکانی (م) و (گم)دا پارچە شیعرێك بە ناوی (نالی)یەوە بلاوکراوەتەوە بەیتی یەکەمی ئەمەیە :

هێندە بێزاری کە ژانیوەمە بە ژاری نایەوە
دوور لە بالاکەت سەرینی ناڵومێدیم نایەوە

— ٢٧ —

سەری زولفت کە ڕشتەی عومری خضرە ، نیوە هەودایە
چ هەودایە ؟ کە هەر حەلقەی دوصەد زەنجیری سەودایە ! (١)

---

بەپێی ئەو ڕێ و شوێنەی لە ڕێکخستنی قەسیدەکانی (دیوانی نالی)دا گرتوومانەتەبەر ، ئێرە شوێنی دانانی ئەو پارچە شیعرەیە . بۆیە ئەگەر لەلاوە شتێکی ئەوتۆمان لەبارەیەوە بۆ دەرنەکەوتایە ، بۆ قەدرگرتنی وردیی مامۆستا مەلی موقبیل و پوختیی ئازادەیەکی نوسخەکەی ، ئێمەش لێرەدا بڵاومان ئەکردەوە . بەڵام مامۆستا هێمن موکریانی، لە وەڵامی نامەیەکماندا لەبارەی خاوەنی ئەم پارچە شیعرەوە وتارێکی بەپێزی لە ژمارە ٢٥٧ی ڕۆژی ١٩٧٥/٣/٧ی ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاو کردەوە ، ئەوەی تیا باس کرد کە ئەم پارچە شیعرە هیی (مەلاصالحی حەریق)ە و (حەریق) یەکێکە لە قوتابییەکانی قوتابخانەی شیعریی نالی‌و ئەو بۆ شێوەی نالیی گەیاندە موکریان و تەنانەت بە شیعریش مل‌ملانێی لەگەڵ کردووە و بلاریشی تێ گرتووە . مامۆستا هێمن لەو وتارەیدا سەرێکی مێژۆی ژیانی حەریقیشی باس‌کردووە و ، لە هۆی دانانی ئەو پارچە شیعرە دواوە . بۆیە ئێمەیش وازمان لێ‌هێنا بۆ خاوەنی خۆی و هیوامان وایە بەم‌نزیکانە دیوانی حەریقیش بە هەمو شیعرەکانیەوە بڵاو بکرێتەوە و ، سوپاسێکی زۆریش بۆ مامۆستای شاعیر و ئەدیب هێمن موکریانی . ( بڕوانەرە : هێمن ، وەڵامێکی دۆستانە ، هاوکاری ، ژمارە ٢٥٧ ، ١٩٧٥/٣/٧ ، ل ٣ ) .

— ٢٧ —

(١) ڕشتە : دەزۆی هۆنینەوەی ملوانکە و تەزبێح و شتی‌وا . هۆنراوە . خضر : حەزرەتی (خضر) پێغەمبەر ، یا (مەلا خدری نالی) خۆی . هەودا : تاڵ . سەودا : عەشق .

واتە : سەری زولفت کە لە درێژیدا وەك عومری هۆنراوەی حەزرەتی خضر درێژە ، یا ئەو تاڵەبە عومری مەلا خدری نالیی پێوە هۆنراوەتەوە ، ئەوەندە باریکە ، ئەڵێی نیوە تاڵە ، واتە لە تاڵیش باریکترە . بەڵام نیوە تاڵێکی چۆنە ؟ نیوە تاڵێکی ئەوتۆیە هەر لۆل خواردنێکی کاری دۆصەد زنجیری دلداری ئەکا .

خضرە (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (خا) : خضری . بەم پێیە ئەبێ وشەی (نیوە)یش بە (نێوە) بخوێنینەوە واتە : .. کە بە ڕشتەی

برۆت نیغێکه وسمەی صەیقەل و مەسلۆل و مۆکارە
کە عیشوەی جەوهەرە ، ڕەمز و ئیشارەی ئاوی مەودایە (٢)

بە نەشئەی سستیو مەستی وەها مەستور و مەخمورە
نزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە ! (٣)

---

مومری خضری ناو ئەبەن .. (ت) و (اح) : خضر . بۆ سەر و بۆر و ژێر دەستنەدا . (ك) : خضر و . نیوە (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : نیمە . حەلقەی دوصەد (چر) و (عم) و (گم) و (ت) و (عب) : حەلقێکی صەد . سەودایە (چر) و (چن) و (عم) و (گم) و (ت) و (اح) و (خا) و (خب) : تێدایە .

(٢) وسمە : گیایەکە وشکی ئەکەن و ئەیکوتن و ژنان ئەیگرنەوە و ئەیکرنە سەریان بۆ ڕەش‌کردنی سەر و زولفیان . صەیقەل : زاخاو دەرەوە . مەسلۆل : ڕوت کراو . مۆکار : ئەڵێن ئەو تیغە مۆ ئەکا واتە زۆر تیژە ئەنانەت مۆ لەژێریا ناتوشێتەوە ، بەلکو دەس‌بەجێ ئەقرتێ . عیشوە : ناز . جەوهەر : ئەو نەخشە ئاویانەی لە خەنجەری دەبانا دەرئەکەون لەکاتی ئەمدیو و ئەودیو پێ‌کردنیا . مەودا : تیژی .

واتە : برۆت ، نازیز ! ، تیغێکە ، بە وسمە زاخاوی ئەدەی ، باریك و ڕوت کراوە ، دڵی دڵداران وەك مۆ لەت‌ئەکا . جەوهەرەکەی نازکردنەکەیەتی کە وردە وردە بەم‌لا و بەولادا ئەیجوڵێنیتەوە . ئیشارەت پێ‌کردنیشی ئەو دەورە ئەبینێ کە ئاوداری خەنجەر ئەیبینێ بۆ نیشاندانی تیژی . ئەڵێن : خەنجەرێکی ئاودراوە ، واتە تیژە .

تیغێکە (ت) : سەیفێکە . وسمەی (عم) و (گم) : وسمە . صەیقەل و (چر) و (کم) و (عب) : صەیقەل . بۆ (صەیقەلە) و (صەیقەلی) و (صەیقەل و)یش دەستنەدا . (عم) و (گم) و (من) : صەیقەلی . مەسلۆل و (چر) و (کم) و (من) : مەسلۆلی . ئاوی مەودایە (چن) : ئەو بەمەودایە . (عم) و (گم) : ئاو و مەودایە . (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : ئاو مەودایە . (عب) : ئاب مەودایە . دیارە ئەبێ لە هەردوکیانا لەگەڵ ( ی )ی ئیضافەدا بێ .

لەم بەیتە لە نوسخەی (عب)دا بەیتی چوارەمە .

(٣) نەشئە : حالەتێکی نیمچە بێ‌ئاگایی و نیمچە سەرخۆشییە . سستی : لاوازی و نەخۆشی . مەستور : داپۆشراو ، شاردراوە . مەخمور : مەی‌زەدە ، سەرخۆش . نزانم : نازانم .

له سایەی کوفری زولفت دڵ (فنا فی النور)ی ئیمانە
مەڵێن ظولمەت خراپە ، وەصلی پەروانە لە شەودایە (٤)

---

ستی و بێهێزی نیشانەی نەخۆشین . چاوی نەخۆشیش بە چاوێك ئەڵێن پێلووەكانی تازادەیەك بەسەریا هاتبنەوە و ، ئەوە یەكێكە لە حاڵەتە هەرە جوانەكانی چاو و وەك خەواڵو و مەستی لێ ئەكا . نالیش ئەڵێ بە یار : چاوەكانت بەهۆی بێماری و مەستیانەوە ، بەجۆرێك داپۆشراون و پێڵوبان بەسەردا هاتووەتەوە و خەواڵو و سەرخۆشن ، من سەرسام ماوم ( خەو ) و (چاوت) كامیان بووە بە جێگەی ئەویان و كامیان لەناو ئەویاندایە !

دیارە ئەم جیاكردنەوەی ( خەو لە چاوا بۆن ) و ( چاو لە خەوا بۆن )ە لە یەك و دانانیان بە دۆ حاڵەتی جیاواز ، شتێكی وەهمییە و ، نالیش مەبەستی لە پیشاندانی ئەم وێنەیە ، تەنها زیادەڕەوییە و دەربڕینی لەڕادەبەدەر بۆنی مەستیی چاوی یار . بەڕاستی جوانیشی بۆ هاتووە و وێنەیەكی هونەرمەندانەی پیشانداوە .

لە كۆكردنەوەی ( سستی ) و ( مەستی )دا لە لەفظدا جیناسی لاحیق و لە مەعنادا پەیوەندی و تەناسوب هەیە. هەروەها هاوئاوازییەكی جوانیش لەنێوان ( مەستۆر ) و ( مەخمور )دا هەیە .

سستی‌یو مەستی ( چر ) : مەستی‌یو سستی . (ت) : هەستی‌یو مەستی . (خا) و (خب) : سوستی‌یو مەستی . مەستۆر و مەخموره (كم) و من : سەرمەست و مەخمورە . (ك) و (اح) : مەستۆرە مەخمورە. (عب) : مەخمور و مەستۆرە . نزانم (چن) : نەدانەم ، كە بە فارسی واتە نازانم . (عم) و (گم) : نەزانم . ئێمە تێكستی (نزانم)مان پەسەند كرد ، چونكە لەگەڵ ڕێبازەكەی نالی لەگونجێ كە وشە لە دیالێكتە جیاوازەكانی زمانی كوردییەوە دێنێ .

ئەم بەیتە لە نوسخەی (عب)دا بەیتی پێنجەمە .

(٤) سایە : سێبەر . كوفر : كافری . فنا في النور : لە زاراوەیەكی صۆفییانە وەرگیراوە ، واتە : توانەوە لە ڕۆناكیدا . ئیمان : باوەڕ بە خوا ، موسوڵمانەتی . ظولمەت : تاریكی .

واتە : بەهۆی ئەوەوە كە هەر شتێ بەپێچەوانەكەیدا ئەناسرێتەوە ، لە سایەی كافری زولفتەوە ــ كە ڕەشە و كافریش ڕەشە ــ ، دڵ لە ڕۆناكیی باوەڕدا تواوەتەوە ــ كە باوەڕ لای موسوڵمانان ڕۆناكییە لە بەرابەری كافریدا . كەواتە كەس نەڵێ تاریكایی خراپە . پەروانەش بە شەو نەبێ

هەناسەم زولفەکەی لاداوو مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنکوت و شەو ڕابورد و نەرگس هەر لە خەودایە (٥)

---

بە مەبەستی خۆی ناگا و بە وەصلی مۆم شاد نابێ .

ئەشتوانرێ مەعنای نیوەی یەکەمی بەیتەکە وا لێکبدرێتەوە کەوا : دڵ لەژێر زولفی وەك کافرێ ڕەشی یارەوە ، ڕۆنـاکیی ڕۆی وەك باوەڕ ــ ڕۆناکی یاری دۆزیوەتەوە و تیا تواوەتەوە .

لەبارەی ( فنا فی النور )ەوە کـە وتمان لـە زاراوەیەکی صۆفییانە وەرگیراوە ، مەسـەلەکە بەمجۆرەیە : لای ئەهلی تەصەووف سێ پلە هەیە بۆ صۆفێ بەرلەوەی ببێ بە پیاوێکی تەواوی خوا . پلەی یەکەم ( فنا فی الشیخ )ە کە هەمیشـە بیر لە پیر ئەکاتەوە وائەزانێ ئەوی کردووەتە بەری خۆی . . دۆهەم ( فنا فی النبی )یە کە قۆناغێ لە پێشترەو صۆفێ لەم قۆناغەدا هەمیشـە بـیر لە پێغەمبەر ئەکاتەوە و هەسـت بە بەکێتێ ئەکا لەگەڵی . سێهەم (فنا فی الله)یە کە هەرە بەرزترین پلەی خواناسییە و صۆفێ لەو پلەدا هەمیشە بیر لە خوا ئەکاتەوە و لەو بەولاوەی بەلاوە هیچ نییە و وائەزانێ لەگەڵ ئەودا یەکی گرتووە . نالی هیچکام لەم قۆناغانەی نەویستووە و لە ڕۆناکیی ڕۆمەتی یاردا تواوەتەوە و ئەوەی بە ڕۆناکیی ئیمان دانـاوە و بـەمە جـۆرە سـۆفیەتیەکی تایبـەتیی بـۆ خـۆی دروستکردووە .

لەنیوە بەیتی دۆهەمدا حوسنی تەعلیل هەیە .

زولفت (چر) و (عب) و (خا) : زولفە . مەڵێن (ت) و (اح) : مەلێ .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشو لە (چر) و (اکم) و (من) و (خا)دا لـە شوێنی یەکتردان . هەروەها ئەم بەیتە خۆی لە (عب)دا سێهەمە .

(٥) ئەنکوت : هەڵیکرد .

واتە : هەناسـەم دای لە گۆنای یار و زولفی لەسـەر ڕۆی لادا ، بەلام ئەو چاوێکی نەترۆکاند و لایەکی نەکردەوە . هەناسـەم وەك شـەی بای بەیان وابو ، هەڵیکرد و شـەوی زولفی یـاری لادا ، کـەچێ نەرگـسی چاوی یار هەر لە خەودایە و نەپشکوتووە .

نالی لەم بەیتەدا هەناسـەی خۆیی بە نەسـیم و، زولفی یاری بە شـەو و، چاوی یاری بە نەرگس شوبهاندووە .

هێنانی (نەسیم) و (شەو) و (نەرگس) بەدوای (هەناسە) و (زولف) و (چاو)دا لەف و نەشری مورەتتەبە .

له دووریی تۆیە ئەی خورشیدی پڕتەو بەخشی شەوگەردان
کە «نالی» وا لە حاڵەتی میحاقی ماهی نەودایە .. (٦)

---

ئەرگس (کم) و (گم) و (من) : نێرگس .
ئەم بەیتە لە (مب)دا پێنجەمە .

(٦) خورشید : خۆر . پڕتەوبەخش : ڕووناکیدەر . شەوگەردان : جەمعی شەوگەردە واتە ئەوەی بە شەو بگەڕێ لە مانگ و ئەستێرە و بنیادەم و هەرچییتر . حاڵی میحاق : ئەو کاتەی مانگ ئەگاتە ڕادەی ئەوپەڕی باریکی و لاوازی و لە بەرچاو ون ئەبێ کە ئەوەش لە دوازۆژەکانی مانگی هەرەبێ و لە یەکەم ئێوارەی مانگی نوێدا ئەبێ کە مانگ زۆر بێ‌لینە و بەزەحمەت بەدی‌ئەکرێ . ماهی نەو : مانگی نوێ .

واتە : بەهۆی دووریی تۆوەیە ئەی یارێ کە وەک خۆر وای ، ڕووناکی بە مانگ و ئەستێرە گەڕۆکەکانیتری ئاسمان ئەبەخشی ، نالی کەوتووەتە حاڵەتی کزی و لاوازی وەک چۆن مانگ لە حاڵەتی میحاقدا ـ کە ئەبێ بەهۆی نوێبوونەوەی مانگ ـ زۆر لاوازە .

بەپێی ئەم مەعنا لێدانەوەیە ڕووی شوبهاندنی نالی بە میحاقی مانگی نوێ ، تەنها باریکی و لاوازییە و ، دووری و نزیکی مەبەست نییە ، چونکە ئەگەر دووری و نزیکی مەبەست بووایە ، ئەبوو نالی لە حاڵەتی دووریدا لە یار گەش و پڕ و ، لە حاڵەتی نزیکیدا لێیەوە لاواز و باریک بووایە ، وەک چۆن مانگ کە تا دوورتر بێ لە خۆر گەشتر و پڕترە و ، تا لێیەوە نزیکتر بێ لاواز و باریکترە .

ئەمە لەسەر ئەوە کە سەرەتای بەیتەکە وا بخوێنینەوە : « لە دووریی تۆیە » بەگوێرەی ئەوەی هەموو نوسخەکانی بەردەستمان ، (چر) و (خا) نەبێ ، نوسیویانە « للوری » یا « لە دوری » و بۆ « لە دووریی » و « لە دەوری »یش دەستئەدا . خۆ ئەگەر وای بخوێنینەوە «لە دەوری» وەک «چر» و «خا» بە سەر و ژێر بۆ کردن دیاریان‌کردووە ، لەوە ئەبێ بڵێین واتە : بەهۆی بوونەوەیە لە دەور و پشتی تۆ ئەی خورشیدی ڕووناکی بەخش بۆ شەوگەردان ، نالی لە حاڵەتی میحاقی مانگی نوێدایە ، کە هەم مانگ لە شەودایە و لەوانەیە دەرکەوێ و هەم وردە وردە خۆیشی ئەگرێتەوە و پێ‌ئەگاتەوە ، نەک میحاقی ئاخری مانگ کە ئەکەوێتە سبەینان و لەبەر لینی تیشکی ڕۆژ کەم کەس پێی بەدی ئەکرێ . بەم‌پێیە ڕووی شوبهاندنەکە لەوەوە دێ کە مانگی حاڵەتی میحاق لە نزیکترین پێوانەدایە لە خۆرەوە . ئەگەر سەرنجی یەکێتیی بابەتی

— ٢٨ —

بیستم لە هەمو لایە مەیلی شەڕ و دەعوایە
سەودا لە سەرمدایە ، باکم چ لە غەوغایە (١)

فەرموی بە مژەی مەستی ، ئازانەو تەڕدەستی
سادەی لە دلی ستی ، تیری ، بە تەمەنایە (٢)

---

پارچە شیعرەکە و وردەکاری کردنی نالی بدەین ، ئەم مەعنایە زیاتر ئەچێ بەدڵدا (*) . بەلام کەس یەکێتیی بابەت و نەبونی ناکۆکیی لەنێوان بەیتەکانی قەسیدەی لە هیچ پارچە شیعرێکی کلاسیکیدا بە مەرج دانەناوە .

— ٢٨ —

(١) واتە : بیستومە لە هەمولایەك هەرا و ئاژاوەیە و خەڵك بەربونەتە گیانی یەکتر . بەلام من گوێ بە هیچی نادەم ، هەوای عەشقم لە کەللەدایە و خەریکی عەشقی خۆمم ، چش با خەڵکی یەکتر بخۆنەوە .

دیارە نالی ئەم پارچە شیعرەی لە سەردەمی پشێوەیەکی گەورەدا وتووە .

چ لە غەوغایە (چر) : چی لە سەودایە . (چن) و (ك) : لە چی غەوغایە . نوسخەکانی بەردەستمان هەمو لەجیاتیی (چ) نوسیویانە ( چی ) . ئێمە خۆمان کردمان بە (چ) .

(٢) ئازانە : ئازایانە . تەڕدەستی : ئەوەلە بنیادەم زۆ بێتە دەست و کار هەلسوڕێنێ .

واتە : یار فەرمانیدا بە برژانگە مەستەکانی کەوا ئازایانە بێنە دەست و تیری بنێن بە دلمەوە ، چونکە دل دەمێکە چاوەڕوانی ئەو تیرەیە ، یاخود یار ئەیەوێ ئەو تیرەم پێوە بنرێ .

وەصفکردنی (مژە) بە (مەست) مەجازە ، چونکە (مەست) بۆ (چاو) بەکارئەهێنرێ نەك بۆ (مژە) ، بەلام چونکە (مژە) شێوەی لە (تیر) ئەچێ و

---

(*) بۆ تێگەیشتنی ئەم مەعنایە بە شێوەیەکی فراوان و بە لێکدانەوەیەکی دوور و درێژەوە ، بڕوانەرە : مەسعود موحەممەد ، چەپکێك لە گوڵزاری نالی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، ل ٥٦ — ٦٠ .

چەرخی چەپی گەردوونە ، ڕاست و چەپی چەند دۆلە
بێ چاکە چ بێچوونە ، ڕاستی لە چەپێ نایە (٣)

پێم‌گوت : مەکە چاك‌چاکم ، پێش‌خزمەتی زۆر چاکم ..
فەرمووی : بە سەری کاکم ، داغت لە دڵمدایە ! .. (٤)

زاهید ! مەکە مەنعی دڵ ، بۆ تۆ نییە سوودی گوڵ
خاکت بەسەر ئەی غافڵ ! کەوترە چ سەودایە ؟! (٥)

---

(تیر)یشی (چاو) ئەیتەقێنێ ، صیفەتی (مەست)ی (مژە) دراوە بە (چاو) .
لەنێوان (مەستی) و (دەستێ) و (ستی)دا جیناسی لاحیق هەیە .

(٣) دۆن : سووك و بێبایەخ و پەست . بێچوون : بێ‌هاوتا ، بێ‌وێنە .
واتە : چەرخی گەردوون کە هەمیشە خراپ وەرئەسووڕێ ، مرۆ بخاتە لای ڕاست یا بیخاتە لای چەپ هەموی هەر هیچە و ، بنیادەم نە بە پێش‌خستنی پێش‌ئەکەوێ و نە بە پاش‌خستنی پاش‌ئەکەوێ . لە چاکە نەکردندا هاوتای نییە ، دیارە شتێ بۆ کردنی خراپە دروست‌کرابێ چاکەی لێ ناوەشێتەوە .
ڕاست و چەپی (ك) و (عب) : ڕاست و چەپ . دیارە ئەبێ (چەپی) بێ . بێ‌چاکە (ك) : پەحجا کە . پەحجا : وشەی سەرسامییە .

(٤) چاك چاك : لەت‌لەت . پێش‌خزمەت : خزمەتکار .
واتە : تکام لە یار کرد کە دڵم لەنجن لەنجن نەکا و ئازار دانم بەسی بێ و بگەیتە پەلێ ، چونکە من خزمەتکارێکی بەوەفام و هەرگیز خراپەم لێ نابینێ .. کەچێ لە وەلاما وتی : بە سەری کاکم داخت لە دڵمدایە و هەر ئازارت ئەدەم و تا نەتکوژم وازت لێ نایەنم ..
وشەی (چاك) بە دوو مەعنای جیا بەکارهێنراوە و ، لەنێوان (چاك) و (کاك)دا جیناسی لاحیق هەیە .
پێم‌گوت (کم) و (گم) و (عب) و (من) : پێم‌وت . داغت (چن) و (گم) و (عب) : داخت .

(٥) واتە : ئەی وشکە سۆفیی بەڕواڵەت دەست لە دنیا داشۆریو ! تۆ لۆمە و سەرزەنشتی دڵی من ئەکەی کە گیرۆدەی ڕوخساری وەك گوڵی یار بووە و ، داوام لێ ئەکەی پاشگەز ببمەوە و بێمە سەر ڕێکەی تۆ ..

«نالی» مەکە وەصفی تۆ ٠٠ باریکە ئەمامی تۆ ٠٠
مەعلومە کە سەروی تۆ بێمیثلە لە دونیایە ٠٠ (٦)

— ٢٩ —

سەرمایەیی سەودا کە دەڵێن زولفی دو تایە
هەر پێچشی تاێکی صەد ئاشوبی تیایە (١)

---

گوایە گوڵی ڕاستەقینە ئەوەیە کە تۆ شیفتەی بووی .. مەکە ! وا نییە و ، تۆ هەرگیز گوڵت دەستگیر نابێ و سودێکت لێیەوە چنگ ناکەوێ . خاکت بەسەر هەی نەفام ! دوای کڵاوی بابردو کەوتوی و نەتەوێ منیش لە خشتە بەری ..

لەنێوان (دڵ) و (گوڵ)دا جیناسی لاحیق هەیە .

سودی (کم) و (گم) و (من) : وەصڵی . کەوتویە (چن) : کە وتوتە ، واتە: بە منت وتووە ئەمە چ خەیاڵێکە شوێنی کەوتوی ..

(٦) واتە : نالی ! پێویست نییە تۆ دەس‌کەی بە تەعریف‌کردنی یارەکەت و بە شان و باڵیا هەڵبدەی .. مەکە ! هەموو‌کەس ئەزانێ یاری تۆ قەد باریك و باڵابەرزە ، هەموان لەزانن سەروێکە هاوتای لەو دنیایەدا نییە .

مەکە (ك) : مەدە . بێمیثلە (کم) و (گم) و (من) : مەشهورە .

— ٢٩ —

(١) دو تا : دولا . پێچش : پێچ و ئەڵقە خواردن و لولبون .

واتە : سەرمایەی دڵداری و ئەوەی کە دڵداری لەوێوە دەست پێ‌ئەکا و دڵداران لەپێشا گیرۆدەی ئەو ئەبن ، کە زولفی دو لاتەی لای ڕاست و لای چەپی ڕومەتە ـ هەر لول خواردن و بە ئەڵقەبونێکی تاڵێکی صەد ئاشوب و هەرای بە دەمەوەیە بۆ دڵداران .

لەنێوان (تایە) و (تیایە)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (تاێکی) و (صەد ئاشوب)یشدا طیباق هەیە چونکە یەکەم (یەك) ئەگەیەنێ .

سەودا (اح) : زولفت . دەڵێن (کم) و (من) : ئەڵێن . پێچشی : لە هیچ نوسخەیەکدا بەم‌جۆرە نەنوسراوە ، بەڵام (چر) و (چن) و (عب) و (خب) نوسیویانە : (پێچش) کە بۆ (پێچشی) و (پێچشی)یش دەستەدا و ئێمە دوهەمیان لا پەسەند بو . (مم) و (کم) و (گم) و (ك) و (اح) و (من) و (خا) :

بیده به دڵم ، شیفته بۆ شیفته چاکه ..
بیخه ملم ، ئەو قەیدە بە دێوانه ڕەوایه .. (٢)

ئەو خاکی دەرە مەسکەنی صەد ساڵەمە ، شایەد
جارێ لە دەمی تۆ ببیەم : « سەگ بەوەفایه » (٣)

زوڵفت سەبەبە ، دڵ بە عوذارت کە دەسوتێ
سوتچێ شەوە وا قاتیلی پەروانە چرایه (٤)

---

پێچش و . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ (تابێکی)یش بە (تابێکی) بخوێنینەوە وەك لە (گم) و (من)دا نوسراوە . (کم) : تابێکە .

(٢) شیفته : شێواو . ئالۆز . قەید . کۆت . ڕەوا : شایان .

واته : ئەو زوڵفە شێواوەت ببەخشە بە دڵم ، چونکە ئەو شێواوە و دڵی منیش شێواو و ، شێواو بۆ شێواو چاکە .. ئەو زوڵفە وەك کۆت و زنجیرەت بخەرە ملم چونکە من دێوانە و شێتی تۆم و دێوانە و شێتیش شایانی ئەوەن کۆت و زنجیریان لە ملی بکرێ .

طیباقێکی مەعنەویی ناسك لەنێوان نیوەی یەکەم و دوەمی بەیتەکەدا هەیە . نیوەی یەکەم دڵ نەرمێ و خۆشەویستێ و بەزەیی ئەگەیەنێ و ، نیوەی دوەم گرفتاری و ئازار .. هەرچەند ئەوەش هەر بە دیمەنە و ڕاستی مەعنای هەردو نیوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ یەك سەرچاوە .

(٣) دەر : بەردەرگا . شایەد : بەڵکو . ببیەم : ببیسم .

واته : خاکی بەردەرگای ماڵت جێگای ساڵەهای ساڵمە ، چەندین ساڵە تیا کەوتوم .. دەبا جارێ لە دەمت ببیسم بڵێی نالی سەگی بەوەفای بەردەرگامە و لەگەڵ ئەو هەمو دەرد و مەینەتەشدا کە لە بەردەرگای ماڵمدا چەشتی هەر بەجێینەهێشتم ..

جارێ (خب) : بارێ .

(٤) عوذار : بناگوێ . موی نارچاو . گونا . ڕوخسار .

واته : بەهۆی زوڵفتەوەیە دڵم بە گڕی ئاگری ڕومەتت ئەسوتێ ، چونکە زوڵفی ڕەشت شەوەزەنگێکی بەرپا کردووە و ، ڕومەتیشت تیا بووە بە چرا و ، دڵی منیش پەروانەیە و ، پەروانە لە هەرکوێ چرا ببینێ ڕوی لێ ئەکا و خۆی ئەدا بەدەم گڕیەوە . کەوابە وا دەرکەوت

« نالی » کە ویقاری نییە ، بێباکە لە خەڵقی
سۆفی کە سلوکێکی هەیە ، عوجب و ڕیایە (٥)

ـ ٣٠ ـ

موشەخخەص لەشکری خەططت لەسەر تەسخیری باڵایە
کە طورزەی (میری میران)ت نیشانەی ئەبتی طوغرایە (١)

---

سوتانی دڵم بەهۆی زوڵفتەوەیە .
دەسوتی (کم) و (من) : ئەسوتی .

(٥) ویقار : قورسی و سەنگینی . سولوك : ڕەوشت . خوا پەرستیی ئەهلی تەصەووف . عوجب : لەخۆڕازیبوون .

واتە : نالی کە ڕاستیی خۆی ناشارێتەوە لە خەڵك و ، چۆنە خۆی وا پیشان ئەدا ، هیی ئەوەیە لە کەس نالرسێ و قازانجی لای کەس نییە تا چاوشۆڕیان بێ و ڕۆپامالیان بۆ بکا .. بۆیەش بێترس ڕێگای عەشقی گرتووەتەبەر و گوێ نادالە تیر و تانە و لۆمە و سەرزەنشتی کەس . بەڵام وشکە سۆفی کە خۆی قورس ڕاگرتووە و خۆی بە خواناس ئەدالە نەڵەم ، ڕیاباز و خۆپەسەندە و ، هەرچی ئەکا هەر بە دیمەنە و لەگەڵ خۆیشی و لەگەڵ خەڵکیش درۆ ئەکا .

ـ ٣٠ ـ

یەکێ لە گیروگرفتە هەرە تۆشەکانی ڕاستکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی ، نەزانینی هۆ و مێژووی دانانی پارچە شیعرەکانە . ئەم دیاردەیە لە شیعری نالییشدا گەلێ جار زەق دەردەکەوێ ، وەك لەم پارچە شیعرەدا بەئاشکرا هەستی پێ ئەکەین . لەم پارچە شیعرەدا ( مەحمود ) ناوێك و ( مولکی ڕۆم ) و ( بەغدا )یەك هەیە و ، ( میری میرانی )یەك و دیاریی ناردن و بانگکردنێك و گەلێ بابەتیتر دێتە پێشچاو کە بێ زانینی ئەوانە زەحمەتە بڵێین توانیومانە شیعرەکە ڕاست بکەینەوە . گریمان وتمان باس باسی ( مەحمود پاشای بابان )ە کە لە سەرەتای فەرمانڕەواییدا والیی بەغدا لەلایەن ڕۆمەوە پایەی ( میری میران )ی داوەتێ و ماوەیەکیشی لە بەغدا بەسەربردووە ، بەڵام خۆ ئەبێ لە خۆمانەوە و بەست بە تەنها گەیاندنێکی سەرپێیی چەند بەیتێك بڵێین دیارییەکە خەڵاتی ( میری میران )یە و ، پاشا نالیی بانگ کردووە بچێ بۆ لای بۆ بەغدا و ئەویش بۆی نەلواوە بچێ .. بەڵام ئەی ناوی (خاکێ) و (کوردێ) چی ، کە بە ڕێز لە دوا

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

---

بەیتدا لەگەڵ ناوی (نالی) کۆکراونەتەوە ؟ ئاخۆ پاشا ئەوانیشی بانگ کردووە ، یاخود ئەوانیش لە دانانی پارچە شیعرەکەدا بەشدار بوون ، یا چۆن ؟ ئەی بۆچی قسە لە تەواوی پارچە شیعرەکەدا بە ( صیغەی موفرەدی موتەکەللیم ) کراوە ؟ ئەمانە هەمو پرسیاریوان ئێمە ڕێگا بە خۆمان نادەین لەخۆمانەوە وەڵامیان بدەینەوە . مافی تەنها ئەوەمان هەیە لەو ئیشارەتە بکەین کە بە بیرمانا دێ و وا کردمان . لەوە زیاتر با بمێنێتەوە بۆ ڕۆژمرەوەی دوارۆژ کە بەڵکو ئەمە خوایە بوی بلوێ باشتر لە ئێمە قوڵی لێ هەڵماڵێ و تۆزی گەردۆن لەسەر لاپەڕەی مێژوی ئەدەبمان داتەکێنێ و شتی نوێمان بۆ دەرخا .

جێی خۆیەتی لێرەدا ئەوەش بڵێین ئەم پارچە شیعرە لە هەمو نوسخە دەستنوسەکاندا نییە و ، (چن) لە پەراوێزەوە لەسەری نوسیوە : « ئەم غەزەلە ( علی الظاهر ) فەرمایشی نالی نییە » ، هەرچەند ئێمە لەم ڕایەیدا لەگەڵی نین .

(١) موشەخخەص : دیاری و ئاشکرا . تەسخیر : داگیرکردن . طوڕڕە : ئیمزا . تۆل . طوغرا : جۆرە مۆرێکی سوڵتانەکانی عوسمانییە . خاڵ .

واتە : ئاشکرا و دیارییە کەوا لەشکری خەت و خاڵ و مۆی تازە دەرهاتوت سەودای داگیرکردنی باڵای لە کەللەدایە و ئەیەوێ بگاتە ئەزنۆت ، چونکە دیارە کەوا زوڵفی تۆلی طوڕڕەیت نیشانەیە و بەسەر خاڵی طوغرایتدا چەسپیوە .

ئەمە مەعنا دیارییەکەی بەیتەکە و ، گفتوگۆش لەگەڵ پیاو ، بەکارهێنانی ئەو نیشانانەی کە هی پیاو نین وەک خەت و خاڵ و زوڵف و شتیوا ، لە ئەدەبی کلاسیکدا باوە و جێی گلەیی نییە .

لەبن مەعنا لەودیوییەکەشی ئەوەیە : دیارە لەشکری نامە و دەستخەتی نوسراوت وانەگەیەنێ نیازی داگیرکردنی لای سەرەوەت هەیە ( کە ناوچەی بابانە ) ، چونکە مۆری ( میری میران )یت بۆ بووە بە نیشانە و لەسەر طوغرای حوکمڕانیت نوسراوە .

مەعنا دیارییەکەی ئەم بەیتە لەوانەیە ئەوەش بگەیەنێ کەوا مەحمود پاشا ـ ئەگەر نالی ئەم پارچە شیعرەی بۆ ئەو نوسیبێ ـ لەوکاتەدا لە سەردەمی پێگەیشتندا بووە .

خەططت (عم) و (گم) : خەططی . میرانت (عم) و (کم) و (گم) و (من) : میرانم .

خوصتوصەن هیندووی خەططی بەیاضی ڕۆیی (مەحمۆد)م
له مولکی (ڕۆم)مدا ئیستەش (خەلیفە)ی شاری (بەغدا)یە (٢)

له بازاڕی مەحەبەتدا هەدیەی توحفەیی میران
له بۆ خورشیدی تابانم پیاڵەی شۆخی مینایە (٣)

---

(٢) هیندۆ : خالی ڕەش . بەندەی زەنگی . خەڵی ڕەش بەسەر کاغەزەوە .
بەیاض : سپیەڵی . کاغەز .

ئەم بەیتە بەڵگە هێنانەوەیە بۆ ڕاستیی ئەو حوکمەی لە بەیتی پێشوودا گەیاندی . واتە : نیشانەی ئەوە کە لەشکری (خەطت) نیازی لەسخیری (باڵای) هەیە ، ئەوەتە کە پایەت ئەوەندە بەرز بووە لەنانەت بەندەی خەطی ڕەشی سەر کاغەزی سپیی ڕۆت لە وڵاتی ڕۆمدا ئەوەندە بەدەسەڵات و قسە ڕەوایە ، وەك خەلیفەی شاری بەغدا وایە و هەرچیت بوێ بۆت ئەکرێ .

نالی لەم بەیتەدا بە عادەتی شاعیرەکانی کۆن کەڵکی لەوە وەرگرتووە کە ئەو وشانەی بەکاریاندێنێ هەریەکێ پتر لە مەعنایەکیان هەیە و کە یەکەمیان بۆ مەعنایەکی بەکاردێنێ ، دووەمیان ئەبەستێتەوە بە یەکەمەوە لە ڕێگای مەعنایەکی ترەوە کە پەیوەندی لەگەڵ مەعنایەکی ئەم وشەی دووەمە بێ و ، هەر بەمجۆرە . لەوەتە لێرەدا ئەڵێ : بەبایەڵێ هیندۆی خەڵی ڕەشی سەر کاغەزی سپیی ڕۆی مەحمود پاشا ( لێرەدا لای «ڕۆ»وەکەدا «هیندو»ەکەی کردەوە بە «خال» تا لەگەڵ «ڕۆ»ی «مەحمود پاشا»دا بگونجێ ) ، ئیستاش لە وڵاتی ڕۆمدا خەلیفەی شاری بەغدایە ( لەم نیوە بەیتەی دووەمدا « هیندۆ »ی کردووە بە « بەندەی زەنگی » بۆ پێ سەلماندنی زیادە ڕەوییەکەی کە ئەوەتە کۆیلەیەك بکا بە خەلیفەی بەغدا لە وڵاتی ڕۆمدا » .

هەر لەم بەیتەدا ئیشارەتێکی ناسك بۆ ئەوەش کراوە کە سوڵتان مەحمودی سەبوکتەگینی غەزنەوی وەزیرێکی بووە پێشان کۆیلە بووە و ڕەشیش بووە ، کە ناوی (ئەیاز) بووە و لە فۆلکلۆری کوردیدا پێی ئەڵێن ( هەیاسی خاس ) و ، (مەحمود پاشا ) بووە بە ( سوڵتان مەحمود ) و کۆیلە ڕەشە (هیندو)وەکەی بووە بە (ئەیاز)ای وەزیری و بەغداش لەژێر دەسەڵاتی سوڵتان مەحمود و ئەیازی وەزیریا بووە و ئەوان خەلیفەی ڕاستەقینە بوون .

(٣) توحفە : دیاریی نایاب و گرانبەها . مینا : شوشە . پیاڵەی شۆخی مینا :

له کۆهی ( نەجد )ە ئیستاکە وەکیلی ( قەیس )ی ماڵ وێران
منم (مەجنوون) و زنجیرم گرێی گێسوویی (لەیلا)یە (٤)

کولاهی فەخر و تەعظیمم گەیشتە چەرخی ئەطڵەس ڕەنگ
کە بیستم قەلبی میرالم لەسەر مەملوکی ئاغـایە (٥)

---

ئەبێ مەبەست لێی ئاوێنەکەی جەمشـید بێ کە ئەڵێن دنیای تیا دیوە .

وانە : ئەو دیاری و خەڵاتی ڕولبەی (میری میران)یەی لەلایەن ڕۆمەوە پێندراوە ، لە دەستی کەسێکی وەك ڕۆژ ڕووناکی چون تۆدا وەك ئاوێنە جوانەکەی جەمشـید وایە ، چۆن ئەو هەموو دنیای لەو ئاوێنەیەدا ئەدی ، تۆیش هەموو شتێکت بەو ڕولبەیە بۆ مەیسەر ئەبێ .

هەدیـەی (مم) و (کم) و (گم) و (من) : هەدیە و . لە بۆ (مم) و (کم) و (گم) و (من) : لەبەر .

(٤) کۆە : کێو . نەجد : وڵاتی نەجد کە مەجنوونی لەیلا سەرگەردان بۆبۆ بە شاخەکانیا هەڵئەگەڕا . گێسو : زولف .

ئێمە وامان بە بیردا دێ مەبەستی نالی لە (کێوی نەجد) شاخەکانی دەور و پشتـی سـولەیمانی و ، لـە (وەکیلی قەیس) فەرمانـڕەوای ئەوڕۆژەی سولەیمانی بێ و ، ئەو فەرمانڕەوایەش ئاحەزی مەحموود پاشا بۆبێ و کە هەواڵی نیازی هێرش هێنانی مەحموود پاشای بیستبێ شاری بەجێهێشتبێ و دابێتیە چیا . ئەگەر وابێ کە ئێمە بۆی چووین ئەوە مەعنای بەیتەکە وای لێدێتەوە : هەرچەند فەرمانڕەوای وەك قەیسی عامری شێت و ماڵوێران شاری بەجێهێشتووە و داویەتە کێو ، کە ئەبۆ بە حوکمی شێتێ لە شاردا ببەسترایەتەوە ، من بووم بە (مەجنوون) و گرێی زولفی (لەیلا)م لێ بووە بە زنجیر و پێیەوە بەسراومەتەوە ، بۆیە ناتوانم شار بەجێبێڵم و بێم بۆلات .

لەوانەیە نیـوەی دوایی بەیتەکە ئیشارەت بێ بە بەندبـوونی نالی بە خۆشەویستیی یارەکەیەوە و بۆیە شاری پێ بەجێنەهێلرابێ .

له کۆهی نەجدە ئێستاکە : ئەمە تێکستی (کم) و (من)ە . (چر) و (چن) و (لە) و (عب) : بە کۆهی نەجـدە . (مم) و (گم) : بە کێوی نەجـد . ماڵ وێران (چر) و (عب) : ماڵ کاول .

(٥) کولاە : کڵاو . چەرخی ئەطڵەس ڕەنگ : ئاسمانی شین . مەملوك : بەندە . ئێمە وای بۆ ئەچین مەبەستی نالی لـە (مەملوك) یەکێ لە کۆیلەمەنە

له دنیا جەنەتی باقی تەلاری شاهییە ، ساقی !
(حەبیبە) طورزەیی طەوقی ملی (شیرین) و (عەذرا)یە (٦) .

---

حوکمڕانەکانی بەغدا بێ و ، مەعنای بەیتەکە وابێ کەوا کە بیستم دڵی (میران) واتە مەحموود پاشا بەسەر والیی مەمالیکیی بەغدادا ئاغا و حوکمڕانە و والی وەك مەملوك و بەندەی وایە چیی لێ بوێ دەس بەڕوویەوە نانێ ، لەخۆشییانا سەری گەورەیی و شانازیم گەیشتە ئاسمانی شین .

ئەناسوبێکی ناسك لەم بەیتەدا لەنێوان (کولاه) و (سەر)ی (لەسەر)دا هەیە هەرچەند بەمەعنای (سەر)ی ئەندامی لەشیش نییە .

مەملوکی : ئەمە تێکستی (عم) و (گم)ە و هەر بەمجۆرەش بەیتەکە مەعنا ئەگەیێنێ . (چر) و (چن) و (ك) و (عب) و (من) : محلول ، مەحلولی (؟) .

(٦) باقی : ئەبڕاوە و هەمیشەیی . حەبیبە : یارەکەی نالی . شیرین : مەعشوقەی فەرهاد و ماشیقەی خوسرەوی پەرویز . عەذرا : پاڵەوانی داستانی خۆشەویستیی (وامیق) و (عەذراء) .

لێرەدا نالی لایەك ئەکاتەوە بەلای خۆی و پەیوەندی خۆیا لەگەڵ بنەماڵەی بابان و ئەڵێ : کاکەی مەیگێڕ ! بەهەشتی نەبڕاوە و هەمیشەیی لەم دنیایەدا بریتییە لە تەلاری شاهانە . (حەبیبە)ی خۆشەویستی منیش لە هەموو نازداران جوانتر و خۆشەویستترە ، ئەمانەت بەنیسبەت شیرینی فەرهاد و عەذرای وامیقیشەوە وەك لیرەی ملوانکەی مل وایە و ئەوانە بە حەبیبەی لای منەوە ئەنوێنن .

دیارە نالی ئەوەشی مەبەست بووە کە وشەی (ساقی) بە (ساقی)ی بەمەعنا (لاقی)یش بخوێنرێتەوە ، واتە : لاقی (حەبیبە) مووری ملوانکەی ملی (شیرین) و (عەذرا)یە ، واتە (شیرین) و (عەذراء) ، گەردنیشیان ناگاتە لاقی (حەبیبە) ، ئەوەندە ئەم لە جیهانی جوانی و نازداریدا پایە بڵندە ..
دووریش نییە (تەلاری شاهی) ناوی کۆشکێکی (میرانی بابان) بووبێ .

شاهییە (چن) : شاهیدە . شیرین و (چر) و (چن) : شیرین . دیارە ئەبێ بە ( ی )ی ئیضافەوە بێ .

دوور نییە وشەی (شاهییە) بەمجۆرە بووبێ : (شاهیدە و) . نوسخەکەی (چن)یش بەشێکی ئەم بۆچوونەمان پڕئەکاتەوە . ئەگەر وابێ مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێدێتەوە : بەهەشتی نەبڕاوە بریتییە لە کۆشکی یار و لە مەیگێڕ و مەی و خواردنەوە .

لیشانەی فەخرە بۆ من گەر بە سەر بێم ئەك بە پێ ، ئەمما
بە مەرگی تۆ قەسەم ، شاهم ا ، عوذر مەسموعە ، سەرمایە (٧)

بە حەققی تاری کاکۆلی سەراپا لۆولی ئەو شۆخە
ئەگەرچی پەشمە ، ئەمما دڵ لە طورڕەی زولفی سەودایە (٨)

موحەققەق مەشرەبی « نالی » لە شیعرا هەروەکو «خاکی»
خەیالی « کوردی »یە ، بەیتی سەراپا زولفی دوو تایە (٩)

---

(٧) عوذر مەسموعە : واتە ئەو عوذر و بیانووەی ئەیهێنمەوە بۆت بۆنەوەی لێم‌بیوورێ کەوا نەهاتم ، شایانی ئەوەیە گوێی لێ بگیرێ . سەرمایە : وەك ئەتوانرێ بە (سەرما) مەعنای لێ بدرێتەوە ، بۆئەوەش لەشێ بەم‌جۆرە بخوێنرێتەوە : سەر (ما)یە ، واتە : سەرم نییە ، واتە : سەربەست نیم و دەسەڵاتم لە دەستی خۆمدا نییە . ئەگەر وابێ پەیوەندی نەچوونەکەی نالی بە ناکۆکییە هەرگیز نەبڕاوەکەی نێوان ( میرانی بابان ) خۆیانەوە ئەبێ .

(٨) تار : تاڵ . کاکۆل : قژەسەر . پەشم : خەیاڵی خاو . خورێ و مۆ . سەودا : پەرێشان .

واتە : قەسەم بە تاڵی قژەسەری لەسەر تا خوار لوولی ئەو یارە نازدارە ، دڵم بەهۆی زولفی لوولیەوە ئاڵۆز و پەرێشانە ، هەرچەند ئەم دڵ پەرێشانییەم خەیاڵێکی پووچ و بێ‌مایە و بەرهەمە ، یان هەرچەند ئەو زولفەش کەوا دڵ گیرۆدەی بووە ، هیچ نییە ، هەر خورێ و موورە !

(٩) موحەققەق : دیارە . بێ‌گومان . مەشرەب : چەش . ئارەزوو . ڕێباز .

واتە : بێ‌گومان ڕێبازی شاعیرانەی نالی ، بیرکردنەوەی (کوردی)یانەیە ، وەك چۆن وڵات و (خاکی)شی هەر (کوردی)یە و کوردستانە .. شیعرەکانیشی کە تێکڕا وەك زولفی یار ئاڵۆز و جوان و درێژن ، دوو سەرن و دوو مەعنا ئەبەخشن و بە دوو جۆر لێك ئەدرێنەوە .

نالی لەم بەیتەدا ئیشارەتێکیشی بۆ ناوی (خاکی) و (کوردی) کرد . (مەشرەب)ی بەمەعنا (ئاو)یشی بەرابەر بە (خاك) دانا .. بەڵام بۆ ؟ نازانین !

کوردییە (چر) و (عب) : کردیە . ئەمیش بۆ (کوردییە) دەستئەدا .

تەنها (هم) و (گم) ، وشەی (نالی) و (خاکی)یان خستووەتە ناو دوو کەوانەوە و (کوردی)یان خستووەتە پشت گوێ . نوسخەکانی‌تر هیچ نیشارەتێکی لەم چەشنەیان تیا نییە .

— ٣١ —

ئەللا .. ئەللا .. کە چ عەقڵ و چ کەماڵێکی هەیە !
لەگەڵ ئەو عەقڵ و کەماڵە چ جەماڵێکی هەیە ! (١)

دڵڕفێنێکە لە بۆ مەدحی ، سەراپایی ئەوێ
واجبە مەدحی بکا هەرچی کە ماڵێکی هەیە (٢)

ئەهلی ئەم شارە هەمو نۆکەر و ئەتباعی ئەون
یوسفی میصرە ، عەجەب جاه و جەلالێکی هەیە ! (٣)

گەر خەیاڵی دەهەنی بێنمە نێو ئەم غەزەلە ،
دێن دەڵێن ئەم غەزەلە وردە خەیاڵێکی هەیە ! (٤)

---

— ٣١ —

(١) ئەللا .. ئەللا : وشەی سەرسامییە ، وەك (ماشەللا) و شتیوا . کەماڵ : وێل و فام . جەماڵ : جوانی . دیارە ئەگەر جوانی و تێگەیشتن پێکەوە لە ئافرەتێکدا کۆببنەوە ، ئەو ئافرەتە ئەبێ بە نمونە و لە هەمو لایەك پەنجەی بۆ ڕاکێشن و باسی ئەکەن .

(٢) واتە : یار دڵڕفێنێکە بۆ تەعریف کردنی ، پێویست بە بەشداری کردنی هەموانە و کار بە یەك و دو مەیەسەر نابێ . بۆیە پێویستە هەرکەس خاوەنی دەسمایەیەك بێ لە تەعریف کردنا ، لە تەعریف کردنیا بەشدار بێ و تەعریفی بکا .

دڵ ڕفێنێکە لە بۆ ( « پەراوێزی » چر ) : دڵرەفێکە کە لە بۆ . ئەوێ ( « پەراوێزی » چر ) و (عم) و (گم) : قەدی ئەو .

ئەم بەیتە لە (مب) و (من)دا بەیتی چوارەمە .

(٣) واتە : یارەکەم ئەوەندە جوان و بە شان و شکۆیە خەڵکی ئەم شارە هەمو شوێنی کەوتون و بوون بە خزمەتکاری .. یارەکەم یوسفی میصری سەردەمی خۆیەتی ، ماشەللا پایەیەکی چەند بەرزی هەیە !

ئەم (ت) : لەو .

(٤) دەهەن : دەم .

واتە : ئەگەر بیر کردنەوە لە دەمی بۆنخۆشی یار بێنمە ناو ئەم غەزەلەوە ، ئەوانەی کە غەزەلەکە ئەخوێننەوە هەست بەو بۆنە خۆشە

خەطی سەبزی لە کەناری لەبی ، « نالی » ! هەروەك
« خضری زینده » لەسەر چاهە ، زولالێکی هەیە (٥)

— ٣٢ —

عاشقی بێ دڵ دەناڵێ ، مەیلی گریانی هەیە
بێشکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هەیە (١)

---

ئەکەن کە بنیادەم سەرخۆش ئەکا و ئەڵێن ئەم غەزەلە وردە سەرخۆشییەکی هەیە .

(٥) خەطی سەبز : گەنەمۆی سمێڵی تازە دەرهاتو . خضری زینده : خدری زیندە کە ئەڵێن تا ڕۆژی قیامەت نامرێ چونکە ئاوی ژیانی خواردووەتەوە . چاه : چاڵ ، کانێ‌ئاو . زولال : سازگار .

واتە : نالیا ! سەوزەی گەنەمۆی سەر لێوی یار ، ئاوێکی سازگاری بە ئەراخی لێوی یارەوە هەیە کە ئەڕاییی ئاودەمیەتی ، وەك چۆن خدری زیندەش بەسەر کانیی ئاوی ژیانەوەیە ئاوێکی سازگاری هەیە . دیارە نالی لەم شوبهاندنەدا ئەوەی ڕەچاو کردووە کە ناوی (خضر) مەعنای (سەوز) لەگەیەنێ و گەنەمۆی سەر لێوی یاریشی بەسەوز داناوە و ئەوە ڕۆیەکی شوبهاندنەکەیە .

ئەم مەعنایەمان بەگوێرەی ئەوە لێدایەوە کە (چن) لە پەراوێزی ئەم بەیتەدا نوسیویە : « ( نالی ) منـادی ، لا مضـاف الیه » واتە : ( نالی ) بانگ لێ‌کراوە ، دراوە پاڵ نییە ، واتە : ئەی نالی ! نەك : لێوی نالی . بەڵام لەشکرێ ، وەك نالی خۆی هەمو جارێ واتەکا ، لە وشەی ( نالی ) هەم ناوی نالییش و هەم مەعنا لەفظییەکەیشیمان مەبەست بێ . ( نال ) بە قامیشی باریك و لاواز و ناو بۆش ئەڵێن . کەواتە ئەتوانین بڵێین واتە : لێوی وەك قامیش باریك و ناو بۆشی یار .. تاد .

خەطی سەبزی (گم) و (من) : خەطی سەوزی . (گم) : خەتی سەوزی ! خضری (من) : خدری . لەسەر چاهە (چن) و (ت) و (ك) : لەسەر چاه . (عم) و (عب) : لەسەری چاهە . زولالێکی (چر) و (ت) : زولالێکە . (چن) : زولالێك . بۆ (زولالێکی) و (زولالێکە)یش دەستئەدا .

لەنێوان (سەبز) و (کەنار) و ، (خضر) و (چاه)دا تەناسوب هەیە . هەروەها لەنێوان (سەبز) و (خضر)یشدا . لە (خضر) خۆیشیا لەطافەت هەیە چونکە نالی خۆیشی ناوی (خضر) بووە .

چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی صاف و خوێنی گەش
دا بڵێن دەریای عومانە دوڕڕ و مەرجانی هەیە (٢)

پەرچەمی زۆر دادەپۆشێ ، پێچی زولفی پێچەیە
دا بە زۆریش پێی بڵێن شەممی شەبوستانی هەیە (٣)

— ٣٢ —

(١) نالی لەم بەیتەدا دڵـداری شوبهاندووە بە بەهـار و ، هاوار و ناڵەیی شوبهاندووە بە هەورە تریشقە و ، گریانی شوبهاندووە بە تاوە باران و ، ئەڵێ کە دڵدار دەستی کرد بە هاوار و ناڵە دیارە ئەبێ بیشگرێ ، چونکە هەورە تریشقە ئەبێ تاوە بارانێکی بەدوادا بێ .

لەنێوان ( بێشکە ) و ( تریشقە )دا وشەئارایییەکی جوان هەیە .

تاوی (چن) و (کم) : تاوە . (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : تاو . بۆ(تاوە) و (تاوی)یش دەست لەدا .

لەرتیبی بەیتەکانی ئەم پارچە شیعرەمان بەگوێرەی نوسخەکانی (جن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) ڕێکخستووە . جیاوازیی نوسخەکانی تریشمان ، بەشبەحاڵی هەر بەیتێك ، لەئاستی خۆیدا ڕوون کردووەتەوە .

(٢) دا : تا . دەریای عومان : دەریایەکە لە ڕۆژهەڵاتی نیمچە دوڕگەی عەرەب ، لە باشوری ڕۆژئاوایەوە وڵاتی (عومان)یش هەیە کە پایتەختەکەی شاری (مەسقەط)ە .

لەم بەیتەشدا نالی چاوی خۆی داناوە بە دەریای عومان و ، فرمێسکی سپی و سوری داناوە بە دوڕڕ و مەرجان کە لە بنی دەریا دەرئەهێنرێن . ئەڵێ : چاوم بۆیە جاروبار فرمێسك و خوێن ئەڕێژێ ، تا بڵێن دەریای عومانە دوڕڕ و مەرجانیهەیە و فرمێسکەکانی دوڕڕ و مەرجانەکانیتی .

لە هێنانی (دوڕڕ) و (مەرجان)دا بەدوای (ئاوی صاف) و (خوێنی گەش)دا لەف و نەشری موڕەتتەب هەیە .

نالی لە نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەدا ئەوەشی مەبەست بووە بەمجۆرەش بخوێنرێتەوە :

**چاوی من دەم ، دەم دەڕێژێ ئاوی صاف و خوێنی گەش**

واتە : چاوم لەبارەی تەڕییەوە بووە بە دەم و ، دەمیشم ئاوی صاف و خوێنی گەش ئەڕێژێ .. تاد . ئەم ویستە کە نالی ویستوبەلی وردەکارییەکی ئێجگار ناسك و جوانە .

ئاسمانی حوسنی مەحبوبەم لە ئەبرۆ و زولف و ڕۆ
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە (٤)

---

(٣) پەرچەم : مووی ناوچاوان کە دێتەوە بەسەر ڕوودا . پێچ : لوول خواردن . پێچە : پەچە ، پارچەیەکی ڕەشی تەنکە ژنان جاران لەیاندا بە ناوچاویاندا بۆئەوەی نامەحرەم نەیانبینێ ، ئێستاش هێشتا لە هەندێ شوێنا هەر باوە بەتایبەتی لەناو ژنانی بەساڵاچوودا . شەبوستان : حەرەم سەرای شاهان و تەختی نوستنیان کە تەنیا مۆمێکیان تیا دائەگیرساند . .

واتە : پەرچەمی یار ڕووی دائەپۆشێ و لوولی زولفیشی وەك پێچە بەسەریا دێتەوە و ئەیکا بە تاریکستانێ و شەبوستانی شاهانە و مۆمی ڕوویشی لەژێر پەرچەم و زولفەکەیەوە ئەگرێ . یار بۆیە وائەکا تا بڵێن دەم و چاوی حەرەمسەرای شاهانەیە دەستی کەسی ناگاتێ و ڕوومەتی مۆمە دایگیرساندووە تیا .

پێچی زولفی پێچەیە : لەگەڵ هەندێ جیاوازیی شێوەی نوسینا ، بەهۆی شێوەی ڕێنوسی کۆنەوە ، لەمە تێکستی (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (عب) و (خا)یە . ( ٭ بەراوێزی ٭ چر ) : چینی زولفی پێچەیە . (چن) : پێچی زولفی پێ چییە . (کم) و (من) : چینی زولفی پەچەیە . (خب) : پێچی زولفی پێچشی . دا (عم) و (کم) و (گم) : تا . نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (عم) و (گم)دا بەمجۆرەیە :

ڕوومەتی خۆی دادەپۆشێ ئەو بە پێچی زولفەکەی

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی شەشەم و ، لە (کم) و (گم)دا بەیتی هەشتەمە .

(٤) نالی لەمبەیتەدا ڕووی جوانی یاری شوبهاندووە بە ئاسمان و ، برۆکانی کردووە بە دوو مانگی یەکشەوە و ، زولفە ڕەشەکانی بە دوو شەوی تاریك و ، ڕوومەتەکانی بە دوو مانگی تابان و ، ئەم هەموو شتە ناکۆکەی بەجارێ لە ڕوویدا کۆکردووەتەوە و لە ئاسمانی تێپەڕاندووە کە نە دوو ـ دوو تیا کۆنابێتەوە و ، نە مانگی یەکشەوە و مانگی تابان بەجارێ و ، نە شەوی تاریك و مانگی تابان پێکەوە .

حوسنی (چن) و (اح) : ڕوویی . مەحبوبەم : تێکستی هەموو نوسخەکانی بەردەستمان (مەحبوبم) بوو . ئێمە هەم لەبەر مۆسیقای بەیتەکە و ، هەم لەبەر موناسەبەت لەگەڵ (ئەبرۆ) و (زولف) و (ڕۆ) و ، هەم لەبەر هاوتایی (حەبیبە) و (مەحبوبە) کە لە زۆر بەیتێکی نالیدا دێن ، وامان نوسیوەوە ، هەرچەند (مەحبوب)یش لە ئەدەبدا جێی (مەحبوبە)

هەر لەبت ، یا سینەشت هەردوو بەدەرخە ، دا بڵێن :
لەعلی ڕوممانیی هەیە ، یا لەعل و ڕوممانی هەیە (٥)

وەحشییە لێمان لەبەر طەعنەی ڕەقیبی سەگ صیفەت
ڕاستە هەر ذیڕۆح ، بۆ وەسواسە ، شەیطانی هەیە (٦)

---

نەگرێتەوە .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی پێنجەمە .

(٥) ڕوممانی : وەك هەنار . ڕرممان : هەنار .

واتە : یا هەر لێوی سوورت ، یا لێو و سینەت پێکەوە دەرخە بۆ خەڵك تەماشایان بکەن ، بۆئەوەی بڵێن هەر لەعلی سووری ڕەنگ وەك هەنارت هەیە کە لێوتە ، یا بڵێن لەعلیش و هەناریشت هەیە کە لێوی سوور و مەمکی خڕتن .

هەر لەبت یا سینەشت هەردوو بەدەرخە : ئەمە تێکستی (چر) و (عم)ە . ( « پەراوێزی » چر ) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : هەر لەبی یا سینەشی هەردوو بەدەرخا . (چن) : دوو لەبی یا سینەشی هەردوو بەدەرخا . (عب) : هەر لەبت یا سینەشت هەردوو بەدەرخە . (خب) : گەر لەبی یا سینەشی هەریەك بەدەرخا . بڵێن (عم) و (کم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) : بڵێم . لەعلی (چر) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : لەعل . ئێمە بە (لەعلی)مان خوێندەوە . (چن) : لێچكلە . (کم) و (عب) و (من) : لەعل و . (خا) : لەعل . لەعل و (عب) و (خب) : لەعل . ئێمە بە (لەعل و)مان خوێندەوە . (کم) و (من) : لەعلی .

ئەم بەیتە لە (کم)دا نییە و ، لە (عب) و (من)یشدا بەیتی حەوتەمە .

(٦) وەحشی : دوورەپەرێز و کەنارەگیر . طەعنە : تانە و لۆمە . ذیڕۆح : گیانلەبەر . وەسواسە : وەسوەسە . خورپەی دڵ .

واتە : یار لە ترسی لۆمە و سەرزەنشتی بەدکار لێمان تەرایە و خۆی نادالە قەرەمان و ناکەوێتە ڕمت . بەڵێ دیارە هەر مرۆڤێك ئەهریمەنێکی هەیە دوودڵی و دڵەخورپە ئەخاتە دڵیەوە و ئەیترسێنێ و بەدکاریش بەشبەحاڵی یار لەو ئەهریمەنەیە .

ڕاستە (عم) : ڕاسە . ذیڕۆحێ (چر) و (عب) و (من) : ئینسانە . (خب) : ذیڕۆح . وەسواسە (ت) و (ك) و (اح) : وەسواسی . (لو) : وەسواس .

ئەم بەیتە لە (چن)دا نییە و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی نۆهەمە .

دڵ موشەبەك بۆ لەبەر ئێشانی ئێشانی موژەت
حەیفە قوربان ! ئاخر ئەم ئێشانەیی شانی هەیە (٧)

لەحظەیێك و لەمحەیێك چاوم بە چاوی ناكەوێ
كێ دەڵێ وەحشیی غەزالە مەیلی ئینسانی هەیە ! (٨)

---

(٧) موشەبەك : كون كون وەك پەنجەرە . ئێشان : ئێش كردن و ئازار چەشتن . نیشان : بە نیشانە نانەوە . ئێشانە : نیشانە . شان : سەرشان .

واتە : ئازیزەكەم ! دڵم بەهۆی ئازاری بە نیشانە نانەوەیەوە بۆ برژانگەكانت بۆ بە پەنجەرە ئەوەندەی كون لێ بۆ . . حەیفە وای لێ ئەكەی . . دڵی من شتێكی بێبایەخ نییە ، نیشانەی شان و شكۆ بەسەرشانیەوەیە كە ئەوەتە تۆی تیا دانیشتوی . . ئەوەندەی ئازار مەدە . .

ئێشانی نیشانی (چر) و (ك) و (اح) : بە بێ (ی)كانی ئیضافە . بەڵام ڕێنوسی كۆن ڕێ ئەدا بە (ی)وە بخوێنرێتەوە . (چن) و (ت) و (مب) : ئێشان و نیشان . دیارە (نیشانی)یە . (مم) و (كم) و (گم) : ئێشان و ئێشانی . نیشانەیی شانی : هیچكام لە نوسخەكان ڕاستەكەیان نەزانیوە . نوسخەكان هەمو ، بێجگە لە (كم) و (خا) و بە ( « پەراوێزی » خا )یشەوە : ئێشانە ئێشانی . (خا) : نیشانە ئێشانی . ئەگونجێ تێكستی ئەم نوسخانەش بەمجۆرە بخوێنینەوە ( نیشانە ئیی شانی = نیشانە ئیشانی ) . واتە : نیشانەی هەیە ، هیی سەرشان ، كە لەگەڵ مەعنای پێشودا ئەبێتەوە بەیەك . (كم) : ئێشانە نیشانی .

ئەم بەیتە لە (چر)دا بەیتی نۆهەم و ، لە (مب) و (من)دا بەیتی چوارەمە .

(٨) لەحظە : ماوەی چاوكردنەوەیەك . لەمحە . ماوەی تێپەڕینی برۆسكەیەك . وەحشیی غەزال : ئاسكی كێوی .

واتە : هەرچی ئەكەم و ئەكۆشم ئەنانەت بۆ ماوەی چاو تروكاندنێك و تێپەڕبونی برۆسكەیەكیش چاوم بە چاوی ناكەوێ . مەبەستی لەوەیە ئەوەندەش چاو ناكاتەوە و ترۆسكاییی چاوی بۆ ئەو ماوە كەمەش بە پێش چاویا ناڕوا . . وا دیارە ئەم ئاسكە كێوییە چاو جوانە ئارەزوی دیتنی ئادەمیزاد یان دیتنی بیبیلەی چاوی ئادەمیزادی نەبێ ، بۆیە وا تاوێكی كەمیش چاوی ناكاتەوە . زۆری شوبهاندنی یار بە ئاسكی كێوی ئەوەتە ئەم جۆرە ئاسكە هەمیشە سڵ ئەكاتەوە لە خەڵك و خۆی ناخاتە بەرچاو .

نالی لەمبەیتەدا بەشێوەیەكی ئێجگار ناسك و هونەرمەندانە باسی

تۆ ئەگەر هەستی ، لە جێ ڕاوەستی ، دێو و کافریش
دێن دەڵێن : بەخودا قیامەت ڕاستە هەستانی هەیە (٩)

فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە
« نالی » ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە ، دیوانی هەیە ! (١٠)

---

خەوالوویی چاوی یار ئەکا ..

لەشکۆنجێ وشەی (کێ دەڵێ) کە بە شێوەی ڕێنووسی کۆن بەمجۆرە نووسراوە (کی دلی) ، بە (کەی دڵی)یش بخوێنرێتەوە .

وەحشیی (چر) : وەحش . ئەمیش هەر (وەحشی)یە . غەزالە (کم) : غەزالان .

ئەم بەیتە لە (چر)دا بەیتی حەوتەم و ، لە (کم) و (گم) و (عب) و (من)دا بەیتی سێهەمە .

(٩) واتە : ئازیزەکەم ! ئەگەر تۆ تاوێك لەجێی خۆت بجوڵێیت و خۆت دەرخەیت ، دێو و کافریش کە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نییە ، دێن سوێند ئەخۆن کەوا قیامەت ڕاستە و سەرەنجام هەر بەرپا ئەبێ . مەبەستی لەوەیە بڵێ بە دەرکەوتنی تۆ شۆر و نوغانێك پەیدا ئەبێ ، هەرگیز ڕۆژی نەدایێ و عالەم هەموو لێت خڕ ئەبنەوە وەك بڵێی ڕۆژی قیامەت داهاتووە !

دێو و (خا) : دێوی . دەڵێن بەخودا ( « پەراوێزی » چر ) و (گم) : ئەڵێن بێشك . هەستانی (عب) : هەڵسانی .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە ( « پەراوێزی ) چر »دا بە جۆرێکی‌کەش نووسراوەتەوە کە ئەگەر بیهێنینە سەر ڕێنووسی نوێ و هەڵەکانی ڕاستکەینەوە وای لێدەرئەچێ :

**تۆ کە هەستی ، شۆر و شینێکە کە دەهڕێ و کافریش**

ئەم بەیتە لە (چر) و (عب) و (من)دا بەیتی هەشتەمە .

(١٠) دیوان : بارەگای حوکمڕانێ . دیوانی شیعر .

واتە : دەرامەتی وڵاتی فارس و کورد و عەرەبم هەموو خستووەتە ناو دەفتەری خۆم .. من لەمڕۆ فەرمانڕەوای ئەم سێ وڵاتەم بۆیە دەرامەتیان لە دەستی مندایە و لیستەی دێنە دەفتەری منەوە .. من ئەمڕۆ دیوانی حوکمڕانیم هەیە حوکمی لەم سێ وڵاتەی لێوە ئەکەم ..
ئەمە مەعنا بەدیمەنەکەی بەیتەکە . مەبەستی ڕاستەقینەش لە دەرامەت

— ٣٣ —

بەرگی دنیا هێندە کورت و کۆنەوو بازاڕیە
چونکە ناگاتە گوێی دێوانەکەی ، لێی عاریە (١)

زمانی ئەدەب و ، لە موڵك توانای شیعر وتن و ، لە دیوان دیوانی شیعرە .
واتە : من ئەمڕۆ دەسەڵاتم بەسەر ئەم سێ زمانەدا ئەشکێ و ، شیعرم بە هەر سێ زمانەکە خستووەتە دەفتەری خۆمەوە و ، دیوانی شیعرم بەم سێ زمانە هەیە .

ئەم بەیتە کە باسی زمانی تورکیی تیا نییە ، نیشانەی ئەوەیە نالی بەر لە بەجێهێشتنی کوردستان وتویەتی . هەروەها بەڵگەی ئەوەشە کە نالی شیعرێکی زۆری بەم سێ زمانە وتووە ، کە بەداخەوە ئیستا هەر ئەم چەند پارچە کوردیی و دوو سێ پارچە فارسییەیمان لە بەردەستدایە ..
بەڵکو لە دوازۆزۆا لە ( سنە ) و ( شام ) و ( ئەستەموڵ ) و ( مەککە ) و ( مەدینە )ش شیعری تری سەر هەڵبدا .

مولکه (خب) : شەهرە .

— ٣٤ —

(١) عاریە : عەیب و شوورەیی لێ دێ .

واتە : ئەو جل و بەرگەی کە بریتییە لە سەروەت و سامانی دنیا ، هەرچەند بەدیمەن جوان و ڕازاوە بێ ، لەڕاستیدا ئەوەندە بێدەوام و تەمەن کورت و دەسەودەس پێکراو و لایەخە ، هەرگیز ناتوانێ مرازی بنیادەم جێبەجێ بکا ، لەبەرئەوە وەك بەرگێکی کورت وایە گوێی دانەپۆشێ . بۆیە تەنانەت ئەوکەسەش کە شوێنی دنیا کەوتووە و بۆی شێت بووە ، شەرمی لێدێ لەبەری بکا . لێرەدا نالی بۆ تەواوکردنی قسەکەی و ئیسپاتکردنی بێبایەخیی دنیا ، هاتووە شێتی کردووە بە بەڵگە کە خۆی دانماڵێ و بە ڕووت و قووتی ئەگەڕێ و ، ماڵی دنیای شوبهاندووە بە بەرگی شێت و ، دنیا پەرست بە شێت خۆی و ، بەرگی لەخۆداماڵینی شێتی بە دەربڕینی دەنگی نارەزایی ئادەمیزاد داناوە لە دنیا .. واتە شێت لە شێتیی نییە جلەکانی لەبەری دائەکەنێ ، لە ڕیریەتی و دنیای بەلاوە هیچ و پوچە ، بۆیە خۆی لێ ڕووت ئەکاتەوە .

بەڕای ئێمە ئەبێ وشەی (عاریە) هەر بەمجۆرە لێك بدرێتەوە کە ئێمە لێکمانداوەتەوە ، نەك بە (عارێ)ی بەمەعنا (ڕووت) و ضمیری ( ە ) ، چونکە ئەگەر وابوایە پێویست بەو پرسیار و وەڵامە نەئەما کە لە بەیتی دووەمدا هەیە .

من له بێبەرگیی (مەخە)م پرسی ، کە بۆچ ڕووتی ؟ وتی :
« ڕەببی من شێت بم ، ئەگەر شاد بم بە بەرگی عاریە ! » (٢)

خەلعەتی تەشریفی هەرکەس بێ چییە ، غەیری کەفەن !
هەر ئەوە هەم فاخیرە و بۆ ئاخیرە و یەکجارییە (٣)

---

کۆنەوو (چر) و (مب) و (من) و (خب) : کونە و ــ کۆنەهـ و . بەڵام ئاشکرایە هەڵەیە چونکە (کۆنەهـ)یش هەر (کورت)ەکەیە . گونی ( مـم ) : کنی . خۆیشی بە (نزدش) واتە (لای) مەعنای لێداوەتەوە ، بەڵام ئاشکرایە بەهەڵـەدا چـووە . دیوانەکـەی (چر) و (ك) و (مب) و (اح) و (مـن) : دیوانەکە . لێی : ئەمە تێکـشی (چر) و (مب) و (من)ە . نوسخەکانیتر ، (ت) نەبێ ، : لێ . (ت) : پێ .

(٢) مەخە : لەوانەیە کورتکراوەی ( مەخۆل ) بێ کـە ئەویش کورتکراوەی ( محمود )ە . دیارە ناوی شێتێکی دیاری بووە لە سولەیمانیی سەردەمی نالیدا ، زۆرجار بە ڕووت و قوڵی گەڕاوە . عاریە : خواستەمەنی .

واتە : لە ( مەخە )م پرسی : بۆچ وا ڕووتی ؟ لە وەڵاما وتی : «خوا شێتم کا ئەگەر بە بەرگی خواستەمەنی شاد بم » . مەبەستی ئـەوە بووە بڵێ : دنیا شتێ نییـە بنیـادەم پشتی پێ ببەسـتێ و مـالی دنیـا وەك مالی خواستەمەنی وایە ، بۆیە منیش لەبەری ناکەم و بە ڕووتی لەسوڕێمەوە .

ئەمەی نالی بە دەمی ( مەخە )وە ئەیگێڕێتەوە پەنجەی ئاوانبار کردنی تێکڕای کۆمەڵە و وائەکەیەنێ ئەم کۆمەڵە هەمووی شێتە لەوانـەی ئەبێ داب و نەریتی کۆمەڵایەتییان پشت گوێ خستووە . .

لەنێوان ( بێبەرگی ) و ( بەبەرگی )دا طیبـاقو ، لـەنێوان (ڕووتی) و ( وتی )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان ( شێت ) و (شاد)یشدا ــ بەوپێیە کە (د) وەك (ت) ئەخوێنرێتەوە ــ وشەئارایییەکی جوان هەیە .

مەخەم (عم) : مەحەم . (عم) لەسەریشی نوسیوە : « بفتح میم ، محمد نامی بوده » واتە میمەکەی سەری هەبێ ، موحەممەد ناوێك بووە . (کم) : محەم . لە نوسخەکانی (ت) و ( « پەراوێزی » مب و من ) و (اح) و (من و (خا)دا بە هەڵە نوسراوە . گوتی (عم) : وتی . ڕەببی من : ئەمە تێکـشی (چن)ە . نوسخەکانیتر هەموو : ( یا رب ) و ( یا ربی ) . .

(٣) خەلعەت : خەڵات . تەشریف : قەدر زانـین و گەورە کردن . کەفەن : کفن . فاخیر : نایاب و گرانبەها . ئاخیرە : ڕۆژی قیامەت .

واتە : خەڵاتی قەدر زانین کە بە بنیادەم بدرێ ، لە هەرکەسەوە بێ ،

کونجی ڕاحەت ، تاجی عیزەت خاریجی مەعمورەیە
کوندەبۆ هەر بانگە بانگ و ، هودهودیش هاوارییە (٤)

پۆست بە کوڵی (عامیرێ) فەرمێی کەوا بۆ پوختە بێ
جەونی سەرکێوان گەلێ چاتر لە (تاڵێ شاری)یە (٥)

---

هیچ‌بایەخی نییە . تاقە خەڵاتێ کە بایەخی ببێ کفنە ، چونکە شتی بایەخ‌دار ئەوەیە بەردەوام بێ ، لە ماڵی دنیایشدا هیچ شتێ لـە کفن بایەخدارتر نییە ، چونکە هەر ئەوە لە یەککاتدا پاك و خاوێن و جوانیشە و سەراپای لـەش دائەپۆشـێ و دوا بەرگیشـە تـا ڕۆژی قیامـەت و لەوپـەڕی پێویستییشایە بۆ ئادەمیزاد .

لەنێوان ( فاخیرە ) و ( ئاخیرە )دا جیناسی لاحیق هەیە .

خەلعەتی (چر) و (چن) و (عب) و (اح) و (من) و (خب) : بە بێ (ی)ی ئیضافە . ئەمیش هەر ( خەلعەتی )یە . فاخـیرە و بۆ ئاخـیرە و : ئەمە لێکستی تەنها (عب)ە . نوسـخەکانی‌تر ، (عم) نەبێ کە هەڵەیە ، فاخیرە بۆ ئاخیرەت .

(٤) مەعمورە : ئاوەدانێ . هودهود : پەپوە سـلێمانە .

واتە : گۆشـەیەك کە بنیادەم تیا بحەسـێتەوە و ، تاجێکی سەربەرزێ کە بنیادەم بینێتە سـەری ؛ لەناو خەڵك و ئاوەدانیدا دەسگیری نابێ . ئەبێ بۆی دوورکەوێتەوە لە خەڵك و کونجی دوورەپەرێزێ بگرێ و لە درۆزنێ و ماسـتاو کردن و فێـڵ و تەڵەکەی کۆمەڵ تەرا بێ .. هـەر بۆیەشە وا کوندەبۆ و پەپوە سلێمانە بانگە بانگ و هاوار هاوارییانە و ئەم ڕاسـتییە لە خەڵك ئەگەیەنن و خۆشـیان لـە ئاوەدانێ دوور کەوتونەتـەوە و ئەوەتە یەکەمیان کونجی چۆڵی وێرانە و دووەمیان تاجی سـەربەرزیی دەسگیر بووە کە پۆپنەکەی سـەریەتی !

لە هێنانی (کوندەبۆ) و (هودهود)دا بەدوای (کونج) و (تاج)دا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

کونجی (عم) و (کم) و (گم) و (من) : گەنجی . مەعمورەیە : نوسـخەکانی بەردەستمان ، (خا) نەبێ ، هەمووو بەم‌جۆرەیان نوسـیوە : (معموریە) کە بۆ ( مەعمورەیە ) و (مەعمورییە)ش دەسـتنەدا . ئێمـە (مەعمورەیە)مان هەڵبژارد . (خا) : مەعمورییە . بانگە بانگ و هودهودیش ( «بەراریزی» چر ) و (عب) : بانگە بانگە هودهود هـەر . (کم) و (گم) : بانگـە بانگە ، هودهودیش .

قوش قوشی ڕاوێ نەبێ ، مورغی کولانە و ئاخوڕە
سەگ سەگی تازێ نەبێ ، کادینی‌یو ئەنباریە (٦)

فەرقی کۆساران لە پاساران دەفەرمۆی وەك چیە ؟
وەك عەزیزیی باز و وەك بێ‌حورمەتیی پاساریە (٧)

---

(٥) پوستبەکۆڵ : ئەوەی پێستی حەیوان لەبەرلەکا . مەبەست لە (مەجنونی لەیلا )یە . عامیرێ : ئەوەی لە هۆزی ( بنی عامر ) بۆ . جەوت : گلاوی بەڕۆی بەری دار بەڕۆ کە ئەیکوڵن و پێستەی پێ خۆشئەکەن و ئەیکەن بە کوندە و مەشکە . ئالی شارێ : دەرمانێکە بۆ خۆش‌کردنی پێستە بەکاری‌دێنن .

لەم بەیتەشدا نالی بەڵگە بۆئەوە دێنێتەوە کەوا دۆرە پەرێزێ و لە ئاوەدانێ دۆرکەوتنەوە چاکترە بۆ بەختەوەریی مرۆڤ لەوەی لەناوخەڵکا بێ . ئەڵێ : مەجنونی کەوڵ بەکۆڵ کە خۆی یەکێ بۆ لەوانەی ئاوەدانییان بەجێ‌هێشتبو و کەوتبۆنە چۆڵەوانێ و ئاقێ کردنەوەی تایبەلیی لەم مەیدانەدا هەبۆ ، وتویە بۆ پوختە بونی پێستەی حەیوان جەوتی سەرکێوان کە بەرهەمی شاخ و کێو و چۆلییە لە ئالی شارێ باشترە کە دەرمانێکە لە بازاڕی شارەکاندا ئەفرۆشرێ . کەوابە بۆ پوختەبونی ئادەمیزادیش ژیانی شاخ و کێو چاترە تا ژیانی ناو شار و ئاوەدانێ .

ئەرمۆی کەوا بۆ پوختەبۆن (مم) : وابۆ بە کێوێ پوختە بۆ . جەوتی (مب) : جوت . ئەمیش هەر (جەوتی)یە . چاتر (مب) : خۆشتر .

(٦) قوش : پەلەوەرێکە وەك باز ڕاوی پێ‌ئەکەن . مورغ : مریشك . تازێ : تانجی . کادینێ : نیشتەجێی کادان . ئەنبارێ : نیشتەجێی عەمار .

واتە : بنیادەم بێ یا هەرچێ ، ئەبێ کار لێ‌هاتو بێ و بۆ ئەو کارە دەس‌یدا کە بۆی دانراوە . بۆیە ، ئەگەر قوش قوشێ ئەبێ ڕاو بکا ، فەرقی لەگەڵ مریشك چییە ! سەگ ئەگەر سەگی ڕاو نەبۆ ، مەگەر هەر لە کادانا لێی‌بکەوێ و پاسی عەمار بکا .

کادینی‌یو (خب) : کادینەوو . (عم) و (گم) : گاوی بنەی .

(٧) کۆسار : کوێستان . پاساران : پەنا گوێسەوانە . عەزیزێ : خاوەن عیززەتێ . پاسارێ : چۆلەکە پاسارێ .

ئەم بەیتەش هەر بەڵگەبەکی‌ترە نالی ئەیهێنێتەوە بۆ ئیسپات کردنی باشیی چۆڵەوانێ و دۆرەپەرێزێ .

واتە: ئەگەر لەپرسێ فەرقی کۆسار و بێ‌پاسار چییە کە هەردوکیشیان

سەهم هەتا جوعبە نشین بێ ، گۆنە زەردی خەڵوەتە
قەوس هەتا چلە گوزین بێ ، هەر ئەسیری خوارییە (٨)

نوسحی «نالی» زەنگە هەرکەس بیبێ ، بیکاتە گوێ
چونکە ئەظمی صاف و وردە ، هەروەکو مرواریە (٩)

---

هەر نێتکی لەبەخشن و ئەویان خۆری لیا بێ‌لینە و ئەمیان خۆر نایگرێتەوە ئەڵێم ئەرقیان وەك فەرقی خاوەن شان و شکۆیی باز و بێ‌حورمەلیی چۆلەکەپاساری وایە . باز چونکە بەدەرموەیە ، ئەوەندە دەرۆن بەرزە خۆی لە ئەرەی هیچ شتێکی پیس و ناشیرین نادا و هەر گۆشتی پەلەوەری خۆ ڕاو کردو ئەخوا ، بەڵام چۆلەکە پاساری چونکە لە ئاوەدانی و لە بنپاسارا ئەژێ ، حەیا و حورمەلی نییە و هەر تاوێ نە تاوێ نێر و مێیان لەناو خۆیاندا لە یەك ئەبەزن !

لەنێوان (کۆساران) و (پاساران)دا وشە ئارایی و ، لەنێوان (پاساران) و (پاساری)دا تەناسوب هەیە .

کۆساران (چر) و (چن) و (ت) و (لد) و (عب) و (اح) و (خب) : کۆهساران .

(٨) سەهم : تیر . جوعبە : تیردان . گۆنە : گۆنا . قەوس : کەوان . چلە : ئەو ژێیەی کەوانەکە ئەچەمێنێتەوە . گوزین : هەڵوێردن و پەسەند کردن .

واتە : تیر ، تا شاراوەی ناو تیردان بێ ، ڕووی زەردە ، چونکە خەڵوەت نشینی کردووە بە پیشەی خۆی . کەوانیش تا هاوڕێی ژێکەی بێ و لەو هەڵوێری و لێی جیا نەبێتەوە ، ئەبێ ملکەچ و پشت کۆماوە و دیلی بەستی بێ .

لە یەکخستنی (سەهم) و (قەوس) و ، لەنێوان ( گۆنە زەرد ) و ( خەڵوەت )دا تەناسوب هەیە . نالی بەتایبەتی وشەی ( خەڵوەت ) و (چلە)شی خستووەتە پاڵ یەك ، چونکە (چلە)ی صۆفییانیش چل ڕۆژە لە خەڵوەتخانەدا بەسەری ئەبەن .

سەهم هەتا (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (لد) و (اح) و (خب) : سەهم تا . قەوس هەتا (چن) و (عم) و (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : قەوس تا . ئەمیش هەر ( قەوس هەتا )یە . گۆنە زەردی (چر) و (چن) و (کم) و (ك) و (عب) و (خا) : گۆن و زەردی . (من) : گۆن و زەرد و . گوزین بێ (ت) : گوزین . ئەبێ (گوزینە) بێ .

— ٣٤ —

با ڕەفیقانم بکەن شینم کە وەقتی زاریە
قەط مەکەن تەقصیر لە گریان ، شیوەنم یەکجاریە (١)

تیرەکەی ئەوڕۆژە مەحبوبەم کە لوطفی کرد بە من
گەر نەبەخشێ مەرهەمی وەصلی ، برینم کاریە (٢)

(٩) نوصح : ئامۆژگاریی . ببیێ : ببیسێ . نەظم : هۆنینەوە . شیعر .
وانە : ئامـۆژگاریەکانی نالیی ئەوەندە بەجێ و دلگیرن ، لەوانەیە هەرکەس بیبیسێ ، وەك گوارە بکاتە گوێی ، لە گوێیان بگرێ و بیانگرێتە دڵ و لە بیری نەچنەوە ، چونکە لە گوارەیەکی مرواری ئەچن دەنکەکانی ساف و ورد بێ و جوان هۆنرابێتەوە ، کە دەستی هەر کچێ بکەوێ هەرگیز دایناکەنێ لە گوێی .

نوصحی (عم) و (گم) : نەظمی . ببیسێ (گم) : بێ کە ئەو . بیکاتە (چر) : بیگرێتە . وردە (گم) : دوڕژە .

— ٣٤ —

ئەم پارچە شیعرە لەبەر سادەییە لەڕادەبەدەرەکەی ، زەحمەتە هیی نالی بێ و تەنها لە نوسخەکانی (عم) و (گم)یشدا هەیە . ئەگەر هیی نالی بێ دیارە لە سەرەتای شیعر وتنیدا وتویەتی . د. مارف خەزنەداریش بە هیی نالیی نازانێ . ئەڵێ : « هێشتا بۆم ساغ نەبوەتەوە هیی کێیە . بۆ (هیی) تاهیر بەگ دەشێ » . ( بڕوانەرە : د. مارف خەزنەدار ، چەند پەراوێزێکی دیوانی نالی ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ٣٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٥و کانونی دوەمی ١٩٧٦ ، لاپەڕە ١٢)) . کاکە حەمەی ناریش پارچە شیعرێکی هەیە زۆر لەمە ئەچێ .

(١) تەقصیر : درێغی . شیوەنم یەکجاریە : شیوەنی مەرگمە .

(٢) مەرهەم : مەڵهەم .

وانە : یار لوتفی لەگەڵ کردم ، سەیرێکی کردم ، بەو سەیرکردنەی تیرێکی پێوەنام . لەگەر مەڵهەمی بەیەکگەیشتنیشم پێ نەبەخشێ برینەکەمی پێ چاك بکەمەوە ، دەردم کاریە و ڕاست نابمەوە .

ئەوڕۆژە ( عم ) : ئەم ڕۆژە .

حەپسی چاهی میحنەتم ، کافر بە حاڵی من نەبێ !
کار و پیشەم دائیمەن گریان و شین و زاریە (٣)

هەر بە ئومێدی عەیادەت بەڵکە جارێ بێتە لام
من ، ئەگەرچێ بیشمرم ، پێم‌خۆشە ئەم بیماریە (٤)

کەس نەکا مەنعی گوڵم ، گەرچێ دڵی کردۆمە خوێن
چونکە مەعلومە کە ئیشی خونچە هەر خوێن‌خواریە (٥)

کۆچە کۆچە خۆن چەکەی پەیکانی موژگانی گوڵم ،
بۆ شەهیدێ شاهیدە دائیم کە خوێنم جاریە (٦)

---

(٣) چاه : چاڵ . میحنەت : مەینەت .
پیشەم (عم) : ئیشم .

(٤) عەیادەت : سەرلێدانی نەخۆش .
وانە : پێم‌خۆشە نەخۆش بم ، با بیشمرم ، بەمەرجێ یار لەکاتی نەخۆشییەکەمدا تاقە جارێك بێ سەرم لێبدا .

(٥) مەبەستی ئەوەیە بڵێ یار خونچەی نەپشکوتووە و ، خونچەش کە ئەپشکوێ و ئەبێ بە گوڵ و گەڵاکانی سور ئەکەنەوە ، ئەو سوریەی سوریی خوێنی دڵی دلدارانە .
خونچە (عم) : غونچە .

(٦) کۆچە : کۆڵان . خۆن‌چەکە : زەوان‌بونی خوێن . پەیکان : تیر . موژگان : برژانگ .
واتە : ڕژانی خوێنی دڵم ، دڵۆپ دڵۆپ ، بەکۆڵانانا ، بەهۆی تیری برژانگی یاری تۆ وەك گوڵمەوە ، نیشانەی ئەوەیە خوێنم هەمیشە ئەڕژوا و شەهیدی دلداریم . لەم بەیتەدا ئیشارەت بەو ئەفسانەیە کراوە کە ئەڵێ (شەهیدی غەزا) تا ڕۆژی قیامەت هەر خوێنی لێ ئەڕژوا !
خۆن‌چەکەی (عم) : غونچەکەی . (عم) و ئامادەکەری ئەو دەستنوسەی ئەم لەبەری نوسیوەتەوە لەو فەرقە گرنگە نەگەیشتون کە ئەبێ (خ) لەم شوێنەدا هەیەتی لە (غ) لە (خونچە) و (غونچە)دا و نەیانزانیوە مەسەلە لە (غونچە) و (خونچە)دا نییە .. وابزانین (گم)یش لەبەر هەست کردن بەم جیاوازیە و لە تێگەیشتنی داوی بەیتەکەوە نیە (غونچە)ی بە (خونچە)

هەرچی مەحبوبان دەکەن خۆشە ، بەڵام داخی ڕەقیب
دەمکوژێ ، طەرحی مرێ ، هەر وەك کەری بێکارییە ! (٧)

ناڵە ناڵی «ناڵی»یە وا خەڵقی خستە زەلزەلە ،
یا نە خۆ حەشرە ، گونەهکارە وەها هاوارییە ؟! (٨)

— ٣٥ —

بیدی مەجنونە وجودم لە هەمو بەر بەرییە
نە کەسێ موتەفیعی یەك بەری یا سێبەرییە (١)

چیت لە کاکۆڵی سەر و مۆیی میانی داوە ؟
هەمو هەر هەمم و پەرێشانیی‌و دەردی سەرییە (٢)

---

نوسیوە ، بەڵکو ویستویەتی بە عادەتەکەی خۆی (ناڵی بکا بەکوردی) !

(٧) طەرح : شێوە .

واتە : نازیزان هەرچی ئەکەن خۆشە و پێویستە بنیادەم باریان لە ئەستۆ بگرێ . بەڵام داخی بەدکار مــن ئەکوژێ ، کە وەك کەری بێکار هەمیشە خەریکە و خۆی ماندو ئەکا و هیچیشی بۆ خۆی نییە .

(٨) واتە : ناڵە ناڵی دەروونی زەبوونی ناڵییە خەڵکی بێزار کردووە و دنیای ناڵۆزاندووە ، یا نە خۆ ڕۆژی حەشرە ، هەر گوناهبارە و لەناستی خۆیدا کەوتووەتە هاوار و پاڕانەوە و ، دەنگە دەنگیان گوێی عالەم کەڕ ئەکا .

— ٣٥ —

(١) بیدی مەجنون : شۆڕەبی . موتەفیع : کەڵك وەرگر .

واتە : بوونی من وەك شۆڕەبی وایە ، هیچ جۆرە بەرێکی نییە ، کەس قازانجی لە بەری یا لە سێبەری دەس ناکەوێ . (ناڵی) بۆیە سێبەری شۆڕەبیی بە بێ سود داناوە ، چونکە هەمیشە با لقەکانی بەملاوبەولادا ئەبا و هەرکەس لە سایەیا دانیشێ هەر ناوەناوێ سێبەرەکەی لەبێ بە خۆر .

لە کۆکردنەوەی (بەر) و هەردو (بەری) و (سێبەری)دا وشەئارایییەکی جوان هەیە . لە کۆکردنەوەی ( یەك بەر ) و (سێبەر)یشدا ، هەرچەند دوومیش یەك وشەیە و (سێ) و (بەر) نییە ، طیباقێکی ناسك هەیە .

(٢) میان : ناوقەد . هەمم : هەمّ ، خەم .

به ڕیا باری تەکالیفی ڕوسوومی بۆ خەڵق
چ دەکێشی ؟ ئەمە حومقێکە عەلاوەی کەرییە (٣)

موطمەئین خاطر و ئەیمەن مەبە هەر گیز لە شەڕی
نەفسی ئەممارە ، کە ئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕییە (٤)

---

واتە : واز لە قژی بە کاکۆڵ کراوی سەری یار و لە ناوقەدی وەك مو باریکی بێنە .. هەمو هەر مایەی خەم و خەفەت و پەرێشانی و دەردی سەرییە ، دەس‌بەرداری بی باشترە بۆت .

لەنێوان (سەر) و (مو)دا تەناسوب و ، لەنێوان (هەمو) و (هەمم و)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

کاکۆلی (چر) و (چن) و (ت) و (مب) و (اح) و (خا) : کاکۆل . بۆ مەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستنەدا . ئێمە ئەوەمان لا پەسەندتر بۆ کە عەطفی کرابێتە سەر . (کم) و (گم) و (ك) و (مز) و (من) : کاکۆل و . مۆیی (کم) و (ك) و (مب) و (من) : مۆی و . میانی داوە ( ٥ پەراوێزی چر )و (کم) و (مز) و (عب) و (اح) و (خا) : میان داوە کە مۆ . (عم) و (کم) : میانت داوە . (ت) : میانتدایە کە مۆ .

(٣) تەکالیف : تەکلیفات ، باری قورس لە ئەستۆ گرتن . ڕوسووم : داب و نەریت . حومق : بێ‌عەقلی .

واتە : باری قورسی کرداری ڕیاکاری بۆ ئەگریتە ئەستۆی خۆت لە خۆڕایی ! کرداری‌وا نەفامییەکە تەنانەت کەریەتیشی ناگاتێ .. مەبەستی نالی لەوکەسانەیە کە بۆ ڕووپامالی و خۆ بە پیاو چاك دانە قەڵەم ئەرکی‌وا ئەگرنە ئەستۆی خۆیان ، نە خوا لەسەری فەرزکردوون و نە لە خۆیشیدا پێویستە .

لەنێوان (تەکالیف) و (ڕوسووم) و (کەری)دا کە بە ڕێنووسی جاران ئەنووسرا (کری) و لەوانەبو بە (کری)یش بخوێنرێتەوە، جۆرە تەناسوبێك هەیە .

تەکالیفی (چر) و (چن) و (ت) و (مز) و (مب) و (اح) و (خا): تەکالیف. بۆ مەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستنەدا . ئێمە ئیضافەکەمان لا پەسەندتر بۆ . (عم) و (گم) : تەکالیف و .

ڕوسوومی بۆ خەڵق . (عب) و (من) : ڕوسوومی بۆ خەڵك . (خا) :

لۆمەیی «نالی»یی دێوانە مەکەن ئەی عوقەلا !
ئەمە موددێکە زەدەی لەطمەیی دەستی پەریە (٥)

---

زۆر سۆزم بۆ خەلقی . دەکێشی (کم) : نەکێشی ، حومقێکە : لەمە تێکستی (چر) و (چن) و (عب)ە . نوسخەکانی تر : بارێکە .

(٤) موطمەئین خاطر : دڵنیا . ئەیمەن : ئەمین . نەفسی ئەممارە : دەروونی فەرماندەر بە خراپە کردن . شەڕیە : شەڕیەلی ، یا شەڕانییە .

واتە : هەرگیز دڵنیا و بێ ترس مەبە لە نەفسی خۆت کە ڕێگای خراپەت پیشان نەدا و فەرمانت نەدائ کە خراپە بکەی و ، هەڵت نەخەڵەتێنێ .. ماری نەفس لەمێژە لەگەڵ بنیادەمدا لە شەڕایە و ئەیەوێ بە لازێیدا بەرێ و ، مرۆی زیرەك نابێ لێی پشتەسۆر بێ و پاڵی لێ بداتەوە .

لەنێوان (ئەممارە) و (ئەم مارە)دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان (شەڕی) و (شەڕیە)دا جیناسی ناقیص هەیە .

(٥) دێوانە : شێت . عوقەلا : جەمعی عاقلە . زەدە : لێدراو . دەست لێوەشێنراو . لەطمە : شەقازلە .

واتە : زیرینە ! لۆمە و سەرزەنشتی نالیی شێت مەکەن کەوا لەوانەیە قسەی لەجێی خۆیا نەبێ . ماوەیەکە پەریان دەستیان لێ وەشاندووە و گرفتاری تیری نیگای نازداران بووە و ، بەدەم دەردەوە ئەناڵێنێ و ئەماڵوەتەوە سەر خۆی .

نالی ئەوەشی مەبەست بووە کە وشەی ( « نالی » یی ) بە ( ناڵەیی )یش بخوێنرێتەوە ، واتە : ناڵەی دێوانە ..

لەنێوان (دێوانە) و (عوقەلا) و ، (دێوانە) و (زەدە) و (پەری) و ، (زەدە) و (لەطمە)دا تەناسوب هەیە .

ئەمە موددێکە زەدەی لەطمەیی : لەمە تێکستی (چر)ە . ( « پەراوێزی » چر و خا ) : موددەیێکە زەدەیی لەطمەیی . (چن) : موددەیێکە زەدەیی لەطمەیی . (عم) و (کم) : موددەیێکە کە زەدەی لەطمەیی . (کم) و (خا) : موددەیێکە کە زەدەی لۆمەیی . (ت) : کە دەمێکە زەدەیی لەطمەیی . (ك) و (اح) : موددەیێکە کە زەدەی لەطمەیی . (مز) : چونکە موددێکە زەدەی لەطمەیی . (عب) و (من) : کەمە موددێکە زەدەی لەطمەیی . کەمە : کە ئەمە .

— ٣٦ —

صەوتی نەغمەی بولبولە یا چەهچەهەی خڕخاڵیە ؟!
دەنگی سۆلە ، یا لەژێر پێی نالەناڵی نالیە ؟! (١)

— ٣٧ —

لەوکەسە دینی ئەتۆ نوری دڵ و ئیمانیە ،
ڕۆ بە زولفت دامەپۆشە ، یەعنی کافرسانیە (١)

---

— ٣٦ —

لەم تاکە بەیتە لە دەستنووسەکاندا تەنها لە نوسخەی (ت) و (خب) و ، لە چاپەکانیشدا تەنها لە (مم) و (گم)دا هەیە . لە نوسخەی (ت)دا لە دوادوایی دیوانەکەوە نووسراوەتەوە و پاش ئەوە نووسراوە « تمت شد .. » واتە : تەواوبوو . لە نوسخەی (خب)یشدا لەپاش پارچە شیعری (ئەللا .. ئەللا .. چ جەماڵ و چ کەماڵێکی هەیە .. ) وە نووسراوەتەوە ، وەك بڵێی دوابەیتی پارچەکەیە ، هەرچەند ئاوازیشیان جیایە لەیەك . لە نوسخە چاپەکانیشدا بەشێوەی تاقانە بەیت دانراوە .

(١) صەوت : دەنگ . نەغمە : ئاوازی بولبول . چەهچەهە : ئاوازی بولبول و پەلەوەرە دەنگ خۆشەکانی تر ، لەو مەعنایەوە خوازراوە بۆ مەعنای ( زڕە ) . خڕخاڵ : بازنگ .

واتە : ئەم ئاوازە خۆشەی دێتە گوێم ، نازانم دەنگی بولبولە لەخوێنێ ، یا زڕەی بازنگەکانی قۆڵی یارە ! دەنگی سۆلەکانی پێیەتی ، یا نالەناڵی نالی ژێر کەوشەکانیەتی ، لەژێر پێیدا ئەزیزێنێ و ئەزریکێنێ ! مەبەستی لە (نالی ژێـر کەوشەکان) شەخصی (نالی) خۆیەتی ، گوایە هەمیشە زەلیلی ژێر پێی یارە و هەرگیز لێی جوێ نابێتەوە .

نالی ئەوەشی مەبەست بووە کە وشەی (نالیە) کە جاران لەگەڵ ( « نالی » یە )ی ئێستا وەك یەك ئەنووسران ، واش بخوێنرێتەوە .

سۆلە (عم) و (ت) و (خب) : صۆلە . لەژێر پێی (مم) : لەژێر پێ . (ت) : لەژێر پای .

— ٣٧ —

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە نوسخە چاپەکانی (مم) و (گم)دا هەیە .

دڵ کەوا هەم قاسیە ، هەم عاصیە، دوورە لە تۆ
موزنەجیر نابێ ، کە حوبی تۆ لە قاسێ دانیە (٢)

---

ئێمەش بە هیی (نالی)ی نەزانین . کەسیش نەبوووە هیی ئەو نیە .

(١) دین : بینین . کافرسانێ : کافرستانێ ، وڵاتی کافران .

واتە : کەسانێك هەن بینینی تۆ لەجێی نووری دڵ و باوەڕدایە بۆیان . دەسا ڕووی وەك ڕۆژی خۆت لە ڕووی ئەوکەسانەدا دامەپۆشە و زوڵفی ڕەشی خاوی بەسەردا مەهێنە و ، ئەو سەرچاوەی باوەڕەیان لێ مەکە بە کافرسانێ ..

لەنێوان (ئیمان) و (کافرسانێ)دا طیباق و ، لەنێوان (دین) و (ئیمان)دا جۆرە لەناسوبێك هەیە ، هەرچەند (دین) لێرەدا بەمەعنا (ئایین) نیە .

ئێمە لەوباوەڕەداین وشەی (لەوکەسە) ، لەبنچینەدا (لەوکەسەی) بووە و بە هەڵەی نووسیاران گۆڕاوە .

(٢) قاسێ : ڕەق . عاصێ : گوناهبار . موزنەجیر : ئەوەی لەسەر کردنی شتێ لێی تۆرە بێ و ئەویش لە کردنی ئەو شتە دەسبەردار بێ . قاسێ : دوور . دانێ : نزیك .

واتە : دڵم کەوا ڕەقیشە چونکە لەبەر ئەم سزای دووریەی تۆدا خۆی ڕانەگرێ و ، گوناهباریشە چونکە بێگوێیی تۆ ئەکا کە لەئەوێ دەس لە یەخەت بکاتەوە و نایکاتەوە ، بۆیە وایە چونکە دوورە لێت . ئەگەر لە خۆت نزیك بخستایەتەوە ، هەرچیت پێ بووتایە بەگوێی ئەکردی . بەڵام ئەو هەر لەبەر دووری لێتەوە دەسبەردار نابێ لە خۆشەویستیت ، چونکە خۆشەویستیی تۆ فەرقی دوور و نزیکی تیا نیە و ، ئەوەی خۆشی بوێت ، دووری و نزیکی چون یەکە لای .

نالی ئەم بەیتەی وا داڕشتووە وەك بڵێی (نیل) بکا لە یار . پێی ئەڵێ : تۆ هەر تەنها دڵم لە خۆت نزیك بخەرەوە ، ئیتر هەموو شتێ بەئارەزووی دڵی تۆ ئەبێ .. بەڵام یار بۆچی نزیکی ناخاتەوە ؟ چونکە نایەوێ لێیەوە نزیك بێ .. کە نزیکی خستەوە لە خۆی ، ئیتر چیی تیا ئەمێنێ و ، چی ئەمێنێ دڵ بەگوێی بکا تیایدا ؟!

جیاکردنەوەی (قاصێ) و (دانێ) لەیەك ، کاری ئێمە خۆمانە . نوسخەکانی (مم) و (گم) نووسیویانە (لە قاسێدا نیە) . ئێمە ئەممان لا هەڵە بۆ ، چونکە مەعنایەکی ئەوتۆ نابەخشێ و وشەی (قاسێ)یش دوو جار لە بەیتەکەدا دووبارە ئەبێتەوە . ئەگەر بیانووسیبایە (لە قاصیدا نیە)

گوێت لە ئاوازی سوروشکی من گرانی گوارەیە
غافڵی لەم دوڕڕی بەحرەین و عەقیقی کانییە (٣)

ڕۆمەتت شەمعی شەوی قەدرە ، دڵم پەروانەیە
نەحری مێنای ڕۆژی عیدە ، ڕۆحەکەم قوربانییە (٤)

---

ڕێی لێ نەچوو ، هەرچەنــد ئەو جوانییەی نەئەبوو کە (قاصــی) و (دانی) هەیانە .

لە (قاسی) و (عاصی)دا ، ئەگەر بەهۆی نزیکیی (سین) و (صاد)ەکەیانەوە لەیەك ، چاوپۆشی لــە جیاییەکەیان بکەین ، ئەتوانین بڵێــین جیناسی لاحیق هەیە . لەنێوان (عاصی) و (مونزەجیر)یشدا لەناسوب و ، لەنێوان (قاصی) و (دانی)یشــدا طیباق هەیە .

(٣) بەحرەیــن : گەورەترین دوڕگــەکانی وڵاتی بەحرەینە کە لــە ٢٣ دوڕگە پێکهاتــووە لەناو کەنــداوی عەرەبــدا . عەقیق : مۆرڕیــەکی سووری گرانبەهایە .

واتە : تۆ بەهۆی قورسیی گوارەوە گوێت گران بووە و دەنگی داچۆڕانی فرمێسکی منت گوێ لێ نییە ، نازانی چۆن دوڕڕێکی بەحرەین و ئاقیقێکی کان لە کانیی چاوی من دائەوەرێ کە فرمێسك و خوێنی چاومن و ، گەلێ لە گــوارەکانی خۆت شایانتــرن بۆئەوەی گوێت لــە داوەرینیان بێ و (بیانکەیتە) گــوێ .. کەواتە لــە (دوڕڕ) و (عەقیق)دا ئیستیــعارەی موصەڕڕەحە هەیە .

نالی لەم بەیتەدا گەلێ وردەکاریی جوانی کردووە : داوەرینی فرمێــسکی چاوی خۆی شوبهاندووە بە مۆســیقا . لە قورسیی گوارەوە چووە بۆ گرانیی گوارە و ، لە گرانیی گوارەوە چووە بۆ گوێ گرانی . فرمێــسکی چاوی شوبهاندووە بە دوڕڕ و ، خوێنی چاوی شوبهاندووە بە ئاقیق . لە وشەی (بەحرەین) هــەم وڵاتی (بەحرەین) و هەم هەردوو چــاوی خۆی مەبەست بووە . لە وشەی (کانی)یش هەم (کان) و هەم (کانی)ی مەبەست بووە .

(٤) شەوی قەدر : شەوە تاکەکانی دەی دوایی مانگی ڕەمەزان کە عادەت وابــوو زۆرکــەس تا بــەیانی نەئەنوســتن و مۆمیان دائەگیرساند و خواپەرستییان ئەکــرد و ، لەوێدا دوعای تیا گیرا ئــەبێ . نەحر : لای سەرۆی سنگ . سەربڕین . حەیوانی سەربڕاوی ڕۆژی جەژنی قوربان . مێنا : مینا ، مینی ، شوێنێکە لە مــەککە قوربانی ســەربڕین و هەندێ

خوێنی صیرفە پێی سەر و دەستت حەنایێ کردووە
ڕەنگی دەست و سەر نییە ، ڕەنگی سەری دەستانییە (٥)

دوور لە تۆ « نالی » سەگێکە ، بێوەفایە ، هەرزەگۆ
بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە کە نانی نانییە ؟! (٦)

---

بەشی‌لەری حەج لەوێدا جێبەجێ ئەکرێ .

واتە : ڕۆمەت ئەو مۆمەیە لە (لیلة القدر)دا دائەگیرسێنن و (لیلة القدر)ەکەش زولفتە ، دڵی منیش پەروانەیە بە دەوری مۆمی ڕۆتدا ئەخولێتەوە . سنگت وەك (مینا)ی مەککە وایە لە ڕۆژی جەژنی قورباندا کە حەیوانی تیا سەرئەبڕن بۆ قوربانی و ، گیانی‌منیش لە (مینا)ی سنگتدا ئەبێ بە قوربانی .

نالی لە وشەی (نەحر)ی بەمەعنا لای سەرۆی سنگ ، ئەوەشی مەبەست بووە کە مەعنای (سەربڕین)یش ببەخشێ و بەم‌مەعنایە لەگەڵ وشەی (قوربانی)دا تەناسوبیان لەنێواندا ئەبێ . لە وشەی (مینا)ی بەمەعنا شوێنیش ، ئەوەی مەبەست بووە کە مەعنای (شوشە)ش بگەیەنێ و لەگەڵ (نەحر)ی بەمەعنا (سنگ) تەناسوبیان لەنێواندا بێ . جگە لەم تەناسوبانە تێکڕا لەنێوان (شەمع) و (پەروانە) و ، (نەحر) و (مینا) و (ڕۆژی عید) و (قوربانی)یشدا تەناسوب هەیە . لە (مینا)شدا لەطافەت هەیە چونکە دوو مەعنا ئەبەخشێ .

(٥) صیرف : ڕووت . حەنایێ : خەناوێ . دەستان : داستانی .

واتە : ئەو ڕەنگەی تۆ دەست و سەرت پێ خەناوێ کردووە ، ئەو ڕەنگە نییە خەڵکی ئەیدەن لە دەست و سەریان ، ڕەنگی ، واتە خوێنی سەرە داستانییەکانی دڵدارەکانتە کە هەریەکێ ژارێکیان لەگەڵت بووە و بەجۆرێك بە کوشتت داون .

ئەمە ئەو ئەندازەیە کە ئێمە لەم بەیتە بۆمان هەڵکۆڵینراوە . لاشمان وایە نیوەی دووەمی بەیتەکە ، بەتایبەتی دوا بڕگەی ، شتی‌لەری تیابە . لەوەش‌بڕانین کە (دەستان) مەعنای (فێڵ و فێڵ ) و (ئەفسانە)ش ئەبەخشێ .

لە کۆکردنەوەی وشەی (پێی) و (سەر) و (دەست)دا تەناسوب هەیە ، هەرچەند مەبەست لە وشەی (پێی) ، (پێ) نییە .

(٦) هەرزەگۆ : ئەوەی قسەی هیچ و پووچ بکا . کەلب : سەگ . نانی نانی : ئەوەی بە تەماعی‌نانەبەر هەڵئەخەڵەتێ .

ئاخ لەگەڵ ئێمە ( حەبیبە ) سەر و پەیوەندی نییە
نەیشەکەر قەددە ، بەڵآ بەندی هەیە ، قەندی نییە (١)

عادەتێکی هەیە هەرگیز لە کەسێ ناپرسێ
ظالمێکی وەیە قەط خەوفی خوداوەندی نییە (٢)

---

واتە : عەیب نەبێ لە ڕۆژگاردا ، نالی سەگێکی بێوەفا و هەڵەوەڕە . بۆ کەمێك ڕۆی نادەیتێ ! لایەکی لێ بکەرەوە و پارۆیەك نانی بۆ هەڵدە ، بە کلکەلەقە مل شۆڕ ئەکا و دێ بۆ لات و بێدەنگ ئەبێ .

— ٣٨ —

(١) سەر و پەیوەند : سەر و ساخت . نەیشەکەر : قامیشی شەکر . بەڵآ : بەڵام .

واتە : ئاخ کەوا (حەبیبە) لەگەڵ ئەوەش کە گیرۆدەی عەشقی خۆیی کردین ، سەر و ساختی لەگەڵمان نییە و گوێمان نادالێ . باڵای ڕێك و شیرینە وەك قامیشی شەکر ، بەڵام ئەوەی بە ئێمە ئەبڕێ شیرینییەکەی نییە ، بەند و گرێ و زنجیرەکانیەتی . (نالی قەفەکانی نەیشەکەرەکەی داناوە بە بەند و گرێ و زنجیر) .

لەنێوان (قەدد) و (قەند)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (بەند) و (قەند)دا جیناسی لاحیق هەیە .

سەر و : لەسە تێکستی (ك) و (مس)ە . (هم) و (گم) : سەری . نوسخەکانی‌تر هەمۆیان : (سەر) ، بۆ (سەرو) و (سەری)یش دەستئەدا . بەڵآ (مز) : بەڵێ . بەندی هەیە ، ئەندی نییە (چر) و (چن) و (ك) و (مز) و (اح) و (خا) و (خب) : قەندی هەیە ، بەندی نییە . (چر) وشەی (بەندی) بە (مابین قفها) واتە : نێوان قەفەکانی مەعنا لێداوەتەوە . بە (نقل از نسخەء قدیمە) واتە : بە نەقڵ لە نوسخەیەکی کۆنەوەشەوە ئەو تێکستەی نوسیوەتەوە کە ئێمە پشتمان پێ بەستووە . (گم) : بەندی هەبە و قەندی نییە .

(٢) وەی : بەڵآ .

واتە : خۆیەکی هەیە ئەوەتە کەس بەسەرناکاتەوە .. زۆردارێکی بەڵایە ، ترسی خوای لە دڵآ نییە ، ئارەزۆی لە چێ بێ ئەیکا .

دەرحەقی من زەهر و سرکەفرۆشە بە برۆ
دەرحەقی غەیری ئەمن غەیری شەکەرخەندی نیە (۳)

دولبەرێکم هەیە مەشهوورە بە بێ مانەندێ
بێ شك و شوبهە ، خودا شاهیدە ، مانەندی نیە (٤)

ئەهلی دنیایی لەبەر حیرص و طەمەع هوشیارن
بە خوصوصی بگەزێنی مەست و خیردەمەندی نیە (٥)

---

ئەشکونجێ (ظالمێکی وەیە) بە (ظالمێکی‌وایە) مەعنا لێ‌بدرێتەوە .

لەنێوان (هەیە) و (وەیە)دا هاوئاوازێ و ، لەنێوان (هەیە) و (نیـە)دا طیباق هەیە .

هەرگیز (خب) : ئەصلـەن . لە کەســێ (چن) : لە کەسـێك . وەیە (چن) و (مم) و (گم) و (ت) و (ك) و (مر) و (اح) :بەدە .

(۳) زەهرفرۆش ، سرکەفرۆش : کینایەیە لە ڕۆگرژ و ڕۆترش . شەکەرخەند: پێکەنینی وەك شەکر شیرین .

واتە : یار هەمیشە توڕەیە لە من و بە ڕۆی گرژەوە سـەیرم ئەکـا . لەگەڵ خەڵکی‌تریشـدا لە پێکەنینی ڕۆخۆشـانە بەولاوە هیچی‌تری نیـە .

بەراوردێکی جوانە لەمەی نالی ئەیکا لەنێوان دۆ حاڵەتدا کە یار لەگەڵ ئەم و خەڵکی‌تریا ئەکا .

بۆ ڕاگیرکردنی ئاوازی نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ئەبێ توزێ درێژە بـە (مێ)ی (زەهر فرۆش) بدرێ لە خوێندنەوەدا .

دەرحەقـی من زەهر و (مم) و (کم) و (گم) و (مـب) و (من) : دالیمـا دەرحەقی من .

(٤) مانەند : وێنە .

واتە : دولبەرێکم هەیە ناوبانگی بە بێ‌هاووێنەیی دەرکردووە . خوا ئاگادارە ، هیچ گومانی لیا نییە ، دولبەرەکەم بێ‌هاوتایە .

بێ‌مانەندێ (چر) و (مم) و (کم) و (گم) و (ت) و (خا) : بە بێ‌هەمتایی . (« پەراوێزی » چر ) : لە دنیادا وا .

ئەم بەیتە لە (مم) و (گم)دا بەیتی پێنجەمە و ، لە (مب) و (من)دا بەیتی شەشەمە و ، لە (خب)یشدا نییە .

خانەقاش هەروەکو مەیخانە ، کە هەر ئاوا بێ
مەجلیسێکی هەیە ، ئەمما گەپ و گۆبەندی نیە (٦)

---

(٥) واتە : دنیا پەرستان بەهۆی پولەکییەوە و تەماعی مالی دنیاوە ، ئاگایان لە جیهانی دڵ و مەی و مەستی نییە . بەناویانا بگەڕێی ، بەدەگمەنیش یەکێکی زیرەك و وریایان تیا نادۆزیتەوە دەستی لە دنیا داشتبێ و مەستی شەرابی خۆشەویستیی ڕاستەقینە بووبێ ..

بەدیمەن لەنێوان (حیرص) و (طەمـەع) و (هوشیار)دا تەناسوب و ، لەنێوان (مەسـت) و (خیرەدمەند)دا طیباق هەیە . بـەڵام لەڕاستیدا وانییە ، چونـکە نالی ئەیەوێ بـڵێ ئەوەی (تەماعـکار) بێ (هوشیاری ڕاستەقینە) نییە و ، ئەوەی (خیرەدمەند) بێ (مەست)ە .

ئەهلی دنیایی لەبەر (مم) و (گم) : ئەهلی دنیا لەبەری . (ت) و (مز) و (خب) : لەهلی دنیا کە لەبەر . بگەڕێی (جر) و (ك) و (من) : بگەڕێ . (چن) و (ت) و (مـز) و (خب) : بگـرێ . بۆ (بـگەڕێی) و (بگڕێ)یش دەستئەدا . (خا) : بگڕێ . لەنانەت مەعناشی بە فارسی لێداوەتەوە ، بەڵام بەئاسانی مەعنای نایەت .

ئەم بەیتە لە (چر) و (چـن) و (ت) و (ك) و (مز) و (خـا)دا لەپێش دوابەیتەوە و ، لە (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خب)دا لەپاش بەیتی (مەدرەسە مەحبەسـەیە .. تاد)ەوەیە . ئێمە لامان وابۆ جێگای ڕاستەقینەی ئێرەیە چونکە وا باشتر لەگەڵ باسی خانەقا و حوجرە و فەقێکاندا ئەگونجێ و ، عەطف کردنەوەکەی (خانەقاش) ڕاستئەکاتەوە .

(٦) واتە : خانەقاش وەك مەیخانە ، خوا ئاوەدانی کا ، خەڵکی تیا کۆئەبنەوە ، بەڵام خەڵکەکەی بێتام و خوێن ، نوکتە و گاڵتە و گەپ نازانن و بۆئەوە ناشێن بنیادەم بێ بە هاوڕێیان .

ئەشکونجێ ڕستەی (خوا ئاوای کا) بـە (خوا ئا وای کا) بخوێنینەوە واتە : وای لێ بکا .

خانەقاش (عم) و (مز) : خانەقایش . (عب) : خانەقەیش ـ خانەقایش . هەروەکو (گم) : گەروەکو . (مز) : وەکو . مەیخانە کە (خب) : مەیخانەیە .

ئەم بەیتە لە (کم) و (ت)دا نییە . لە (کم)دا لە نیوەی یەکەمی بەیتی پاشەوە و نیوەی دووەمی ئەم بەیتە بەیتێك پێکهاتووە بەمجۆرە :

والیمەن خانەقا خۆش زەمزەمێکی تێدایە
مەجلیسێکی هەیە ئەمما کپ و گۆبەندی نییە .

واقیعەن خانەقە خۆش زەمزەمەیێکی تێدا ــ
یە ، بەڵێ قەندی هەیە ، گەندی هەیە ، ڕەندی نیە (٧)

مەدرەسە ، مەحبەسەیە ، مەبحەثەیی وەسوەسەیە
کەسی تێدا هەیە ، ئەمما خۆش و خورسەندی نیە (٨)

طالیبی ڕاهی ( حیجاز )م ، لە (موخالیف) هەڵدەن
بۆ ( نەوا ) قەلبی حەزینم نەوەتی بەندی نیە (٩)

---

(٧) واقیعەن : ڕاستەکەی . زەمزەمە : هەرا و زەنا . گەند : بۆگەن . مرۆی بێ کەڵك . ڕەند : زیرەك . کەمتەرخەم . سەربەست .

واتە : ڕاستە خانەقا هەرا و بەزمێکی خۆشی تیایە ، بەڵام هەرا و بەزمەکەی زیرەکانە و سەربەستانە نییە ، هەرچەند شتی خۆش و ناخۆشیشی تیایە .

لەنێوان (قەند) و (گەند) و (ڕەند)دا جیناسی لاحیق هەیە .

واقیعەن («پەراوێزی» چر) و (عب) و (خب) : واقیعی . خانەقە : (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : خانەقا . زەمزەمەیێکی (عب) و (من) و (خب) : زەمزەمەیێکە . بەڵێ (مز) : بەڵێ . گەندی (ت) : بەندی .

(٨) مەدرەسە : حوجرەی فەقێ . مەحبەسە : حەپسخانە . مەبحەلە : جێگای باس و لێکۆڵینەوە . خورسەندێ : شادمانێ .

واتە : حوجرەکانی فەقێ بەندیخانەی گیان و بیرن و ، باسەکانی کە فەقێکان باسیان لێ ئەکەن هەمۆ وەسوەسە و خەیاڵی بێ مایەن و ، ناڵێم فەقێکان بنیادەمی زیرەك و لێهاتویان تیا نییە ، هەن ، بەڵام خۆشی و شادمانێ لە دەم و چاویانا بەدێ ناکرێ .

لەنێوان (مەدرەسە) و (مەحبەسە) و (مەبحەلە) و (وەسوەسە)دا هاوئاوازییەکی جوان و ، لەنێوان (مەحبەسە) و (مەبحەلە)دا ــ بە چاوپۆشییەوە لە جیاوازیی (سین) و لێ ــ جیناسی قەلب هەیە .

مەبحەلەیی (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خب) : مەبحەثی پڕ . کەسی تێدا هەیە ئەمما (مم) و (عب) و (خب) : کەسی تیا نەبوە دڵێکی « لەگەڵ هەندێ وردە هەڵەی نوسینەوەدا » . خۆش و (گم) : دڵی .

(٩) ڕاه : ڕێگا . حیجاز : وڵاتی حیجاز . ئاوازێکی مۆسیقایە . موخالیف : ناحەز . ئاوازێکی مۆسیقایە . بێنەوا : هەژار . بێ ئاوازی مۆسیقا .

شیعرەکانم ، کە جگەرگۆشی منن ، دەربەدەرن
دڵی « نالی » چ زەقە ، قەط غەمی فرزەندی نییە ! (١٠)

بەند : ڕاگیر بوون .

واتە : مادەم وڵاتی خۆم ، ئەهلی دنیای ئەوەن کە باسم کردن ، خانەقا و حوجرەی فەقێ و فەقێبیشی هەروا ، من ئەم وڵاتە بەجێدێڵم و ڕێگای حیجاز ئەگرمەبەر و ، ئەوەی پێیناخۆشە بیدەنە بەر شەق . دڵەی خەفەتباری هەژارم هێزی خۆڕاگرتنی لەم وڵاتەدا نەماوە و ئەبێ بڕۆم .

دیارە لەباری لەطافەت و ناسککاریشەوە ئەتوانرێ مەعنای بەیتەکە وا لێبدرێتەوە کە : حەزم لە گوێ لێبوونی مەقامی (حیجاز)ە و مەقامی (موخالیف)م ناوێ و ، دڵم بێ (ئاوازی مۆسیقا) خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ .

قووەتی (چر) و (ك) و (مر) و (عب) و (اح) : بێ (ی)ی ئیضافە ، لەبەر ڕێنووسی کۆن . (چن) : قەوەتی . نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لە پەراوێزی (عب) و (من)دا بەمجۆرە نوسراوەتەوە :

**بە ئەوا قەلبی حەزین قووەتی سەربەندی نییە**

بەڵام مەعنایەکی ئەوتۆ نابەخشێ .

(١٠) جگەرگۆش : جگەرگۆشە ، لایەك لە جگەر . فرزەند : کوڕ ، منال .

واتە : شیعرەکانم کە زادەی بیر و هۆشمن و زانێکی سەخت گرتوومی پێیانەوە تا لەدایكبوون و ، وەك پارچەیەك لە جگەرم وان ، ئێستا لە کۆشی خۆما نەماون و دەربەدەر کەوتوون و ، هەریەکێ پارچەیەکیانی بەلایەکدا بردووە .. ئای لە من ، باوکێکی چەند دڵڕەقم ، خەمی منالی شیعری خۆمم نییە و ، بە کۆلانانا بەرەڵلایان لەکەم ئەم و ئەو بیبانەن و لەوانەشە هەندێکەس هەندێکیان بکەن بە هیی خۆیان ! .

بە بۆچوونی ئێمە ئەتوانرێ چەند شت لەم پارچە شیعرە وەرگیرێ .. یەکەم : ئەمە کە نالی لە سەرەتای بەجێهێشتنی کوردستانا وتوویەتی و لەو سەردەمەدا لەباری ئەهلی دنیا و ئەهلی دینی وڵاتەکە بێزار بووە و ، شێوەی هەڵسوڕان و بیرکردنەوەی فەقێ و شێخ و مەلای بە دڵ نەبووە . دووەم : هەندێکەس شیعری ئەویان دزیوە و کردوویانە بە هیی خۆیان ، یا هیچ نەبێ لە شیعری خۆیاندا کەڵکیان لێ وەرگرتووە . سێهەم : ئەوە کە نالی شیعری خۆی کۆنەکردووەتەوە . چوارەم : ئەوە کە ژنی نەهێناوە و منالی نەبوە .

قەط (کم) و (گم) و (من) : قەت . (خب) : ئەمە . غەمی (گم) : خەمی . ئەم بەیتە لە (خا)دا نییە .

## تیپی یێ

— ١ —

حەریقی ضیقی زیندانم ، نەسیمی صوبحدەم با بێ !
ئەگەر ڕۆحی منت باقێ دەوێ ، ساقی ! مەیی نابێ ! (١)

لە وەصلی تۆ زیاتر خەوفناکم ، نەك لە هیجرانت
بە میثلی شەمع و پەروانە ، بەڵێ عاشق دەبێ وا بێ ! (٢)

---

— ١ —

(١) حەریق : سوتاو . ضیق : تەنگی . نەسیم : شنەبا. صوبحدەم : دەمەوبەیان . ناب : بێگەرد و خاوێن . صیفەتی شەرابە .

واتە : سوتاوی زیندانی تەنگی دووریتم ، دەسا با دەرگام لێ بکرێتەوە و شنەبای دەمەوبەیان بێتە ژوورەوە تۆزێ دەروونم فێنك کاتەوە و لە شەوی گەرمی زیندان ڕزگار بم .. لازیز ! ئەگەر ئەتەوێ بە لەش ساغ بم و گیانم دەرنەچێ ، بۆم بیە بە مەیگێڕ و شەرابی بێگەردم لە پیاڵەی سووری لێوت بدەرێ .

ئەشگونجێ (با بێ) وا بخوێنینەوە کە یەك وشە بێ و (بابێ) بێ ، واتە ( ئەی شنەبای بەیانیان ، دەرگایەکم لێ بکەرەوە ) .

لەنێوان (بابێ) و (نابێ) و ، (باقێ) و (ساقێ)دا جیناسی لاحیق هەیە .

حەریقی («پەراوێزی» چـن) : حەریفی . بەپێی ئەم نوسخەیە ، هاوئاوازیی وشەکان وا پێویست ئەکا (ضیقی)یش (ضیفی) بێ واتە (ضیعفی ، لاوازیی) . (گم) و (خب) : سیجنی .

زیندانم (مم) و (خب) : هیجرانم . (گم) : حیرمانم . دەوێ (کم) و (من) : ئەوێ .

(٢) خەوفناك : دڵ پڕ لە ترس .

واتە : دڵداران هەموو ئاواتیان ئەوەیە بە یاریان بگەن و هەمیشە شکاتیانە لەدەست دووری . بەپێچەوانەی ئەوانەوە من لە نزیکیی یار زیاتر ئەترسم تا لە دووریی ، چونکە کە لە یار نزیك کەوتمەوە دەسبەجێ گڕم تێ بەرئەبێ ، وەك چۆن پەروانە کە ئەگا بە مۆم ئەوەندە بەدەوریا دێت و دەچێ تا گڕی تێ بەرئەبێ .

نیە دەخڵم لە شانامە و مەصافی ، غەیری ئەم نوکتە :
کە کوشتەی بەندی تۆیە هەرکەسێ ئازاد و ئازا بێ (٣)

کەسێ پوشتانی باڵاتە ، حەریفی ئاڵ و واڵاتە
کە شیبهی کاکوڵی ژۆلیدە سەرگەردانی سەودا بێ (٤)

---

شاعیرەکانی پێشتر گەیشتن بە یاریان لا ناخۆشە ، چونکە لەڵێن جیابونەوەی بەدوادا دێ . بەڵام نالی دڵنیایە کەوا لە یەکەم گەیشتندا بە یار گڕی لێبەرنەبێ و نامێنێتەوە بۆنەوە جارێکیتر دەردی دووری بچێژێ ، بۆیە لە پێگەیشتنی ئەترسێ .

زیاتر (گم) : زیادتر ! . دەبێ (کم) و (من) : ئەبێ .

ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوە لە (چر) و (عب) و (من)دا لە شوێنی یەکتردان .

(٣) شانامە : شاهنامەی فیردەوسێ ، شاکاری ئەدەبی فارسێ . مەصاف : لەوەی لە ژێردا بێ .

واتە : هەقم بەسەر شانامە و کتێبی وەك شانامەوە نییە و ، تەنها ئەو شتەم لا بەبایەخە تیایاندا کە ئەڵێ هەرکەس ئازاد و ئازا بێ و سەر بۆ شتی هیچ و پوچ شۆڕ نەکا ، خۆ ئەداتە تۆ و ئەکەوێتە بەندی تۆوە و لەو ڕێگەیەدا سەری خۆی دائەنێ .

لەنێوان (بەند) و (ئازاد)دا بەدیعەی طیباق و ، لەنێوان (ئازاد) و (ئازا)دا جیناسی ناقیص هەیە .

لە (مم) و (گم) : بە . شانامە و (مم) : شەهنامە و . مەصافی : هەمو نوسخەکان ، جگە لە (مم) و (گم) : مەصاف . دیارە ئەبێ بە (ی)ی ئیضافەوە بێ .

(٤) پوشتان : هاوقەد و دەسلەمل . حەریف : هاودەم . ئاڵ وواڵا : ڕەنگاوڕەنگ . کاکوڵ : کاکۆڵ : تۆی درێژی لاوان . ژۆلیدە : ئاڵۆز و تێکچو .

واتە : کەسێك ئەو بەختەوەرییەی دەسگیر ئەبێ کە ببێ بە هاوقەدت و دەس بکاتە ملت و هاودەم بێ لەگەڵ دیمەنی شۆخ و ڕەنگاوڕەنگت ، کە وەك کاکۆڵی شێواو و تێکچو ، بەهۆی دەردی عیشقتەوە سەرگەردان بوبێ . ڕۆی ئەم شوبهاندنە ئەوەیە کە مۆی کاکۆڵ هەمیشە تێکچووە و بە شان و ملدا دێتەخوار و دەست ئەکاتە مل و بەسەر سنگ و پشتدا بڵاو

**فیدای تەشریفی ڕێگەت بێ خەراجات و خەزێنەی دڵ**
**نیساری تۆزی پێت بێ گەر لە چاودا قەطرەیێ مابێ (٥)**

---

نەبێتەوە .

لەنێوان (باڵاڵە) و (ئاڵاڵە)دا جیناسی لاحیق هەیە . ( ۆ )ی (کاکۆڵ)یش بۆ ڕاگرتنی کێشی بەیتەکە نەبێ بە کورتێ بخوێنرێتەوە .

کە شێبهی (چن) و (خب) : بە میثلی . (ت) : لە میثلی . (ك) و (اح) و (خا) : مەثەل . سەرگەردانی : هەمۆ نوسخەکان ، (چن) و (کم) نەبێ ، : سەرگەردان و . ( چن ) : سەرگەردان . بۆ ( سەرگەردان و ) و (سەرگەردانی)یش دەستنەدا . (گم) : سەرگەردانی . ئێمە لامانوایە ڕاستەکەی (سەرگەردانی)یە .

(٥) تەشریف : قەدردار کردن . خەراجات : خەرج و باج . نیثار : بەخشش. شاباش .

نالی لەمبەیتەدا خۆشەویستیی شوبهاندووە بەو پارە و خەرج و باجەی لە گەنجینەدا دائەنرێ و ، دڵیشی شوبهاندووە بە گەنجینەکە و لەڵێ : هەرچی خۆشەویستییەك لەوانەیێ لە دڵدا بێ هەمۆی بەقوربانی ئەوە بێ کە ڕێگا پیرۆز ئەکەی و دێی بۆ لام . هەر دڵۆپە فرمێسکێکیش لە چاوما مابێ و ، لە گریانا لەبەر دەردی دۆریت نەمرشتبێ ، بێ بە بەخشش و شاباشی تۆزی بەری پێت و ڕێتی پێ ئاوڕشێن بکرێ ، چونکە هەر ئەمەم هەیە پێشکەشتی بکەم و «دیاریی شوانیش یا شنگە یا هەڵەکۆکە» .

ئەشتوانرێ وشەی (مابێ) بە (ما بێ) بخوێنرێتەوە واتە : ئەگەر چاوم دڵۆپێ ئاوی تیابێ .

لەنێوان (تۆز) و (قەطرە)دا تەناسوب هەیە ، چونکە بە (قەطرە) ئاو زەوێ ئاوڕشێن ئەکرێ و (تۆز)ی لێ هەڵئەگیرێ .

ڕێگەت (چن) و (عم) و (ت) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : ڕێگەت . خەراجات و (چر) و (ت) و (عب) و (خا) : خەراجات . بۆ مەطفیش و بۆ ئیضافەش دەستنەدا . (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (من) : خەراجاتی . تۆزی پێت بێ گەر : ئەمە تێکستی (چر)ە . (چن) : تۆزی بەرپێتە لەچاو گەر . (عم) : تۆزی پێگەت بێ لەچاودا . بەراوردێکی جوانی تیایە لەنێوان (ڕێگەت) و (پێگەت)دا . (کم) و (گم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خب) : تۆزی بەرپێت بێ لە چاودا . (خا) : تۆزەکەی پێت بێ لەچاو گەر.

لە عەکسی ذاتی بێڕەنگت هەتا کەی دیدە ڕەنگین بێ ،
جوقونی لەیل و مەیلی نەقشبەندی عەکسی ئەسما بێ ؟! (٦)

مەگەر هەر یاری نەقشینم ببێتە نەقشبەندی دڵ
کە نەقشی غەیری ڕەنگی ئەو بە ئاوی دیدە شۆرابێ (٧)

---

(٦) نەقشبەندی : پەیڕەوی تەریقەتی صۆفییانەی نەقشبەندی .
ڕاتە : تاکەی چاوم بە وێنە تیا دانەوەی دیمەنی ذاتی بێڕەنگ و وێنەی تۆ ڕەنگین بێ ! تاکەی شێتیی مەجنون بەهۆی لەیلاوە و ئیدیعای مەیلی صۆفیی نەقشبەندی لە خۆشەویستیی خوا و پیر ـ کە ناوی (نەقشبەندی) لەیکەیەنێ و واتە وێنە و یادی ئەوان لە دڵیا نەقش بووە ـ بەپێچەوانەی مەعنای ناوەکانەوە بێ !

بە بۆچونی ئێمە ، مەبەستی نالی لە نیوە بەیتی یەکەم ئەوەیە بڵێ بە یار لایەك بکەرەوە بە لامدا و ، بە خۆتم بکەیەنە و ، با بەسی بێ هەر بیر لە وێنەت بکەمەوە و وێنەت لەپێش چاوم بێ و خۆت لێم دوور بی . مەبەستی لە نیوە بەیتی دوهەمیش ئەوەیە بڵێ شێتیی مەجنون کە دراوەتە پاڵ لەیلا و ئەڵێن بەهۆی لەیلاوە شێت بووە ، بەپێچەوانەی ناوەکەیەوە ، شێتی نییە ، عاقڵییە و ، دڵدار شێت نابێ . ئیدیعای مەیل و خۆشەویستیی نەقشبەندییش بۆ خوا و بۆ پیر ، کە ناوەکەی وانەگەیەنێ وێنە و یادیان لە دڵیا نەقشە ، بەپێچەوانەی ناوەکەیەوە ، درۆیە و ڕاستیی تیا نییە .
ئەمەی نالی ئەیڵێ کە یار ڕەنگی نییە ، کەچی وێنەشی لە چاویا ڕەنگ ئەداتەوە ، زیادەڕەوییەکی ئێجگار هونەرمەندانەیە .

لەیل و مەیلی نەقشبەندی عەکسی (چر) : لەیل و مەیل نەقشبەند و عەکس . دیارە (مەیلی) و (عەکسی)یە بەنیشانەی بونی (و)ی (لەیل و)دا . (چن) و (ت) و (عب) : لەیل و مەیل نەقشبەند عەکس . دیارە (مەیلی) و (نەقشبەندی) و (عەکسی)یە . (گم) : لەیلە .. تاد . (لا) و (اح) و (خا) : نە (و ـ واو) و نە (ی ـ یێ) بە هیچکام لە وشەکانی ڕستەکەوە نییە .
ئەم بەیتە لە (عم) و (کم) و (گم) و (عب) و (من)دا لەپێش دوا بەیتی ئەم پارچە شیعرەوەیە .

(٧) نەقشین : نەخشین ، نەخشاوی . نەقشبەند : نەخشی چەسپکراو و داکوتراو .

ثوبوتت باعیثی نەفیی منە ، وەك لامی زولفەینت

لە هەردوو لا قەدت بگرێتە ئاو ، وەك (لامەلفلا) بێ (٨)

---

واتە : مادەم نەخشی ڕەنگی لە یار بەولاوە کەسێکیتر لە چاوما نەبێ و، هەموی بەهۆی گریان و فرمێسکی چاومەوە شۆرابێتەوە ، ئەوا ئەبێ هەر یاری نەخشێن و نازەنینم ببێتە نەخشی دڵم و ، وێنەی ئەو لە دڵما نەخش بێ ، چونکە هەر ئەوە هەمیشە لەمێنێتەوە و هیچ نیبە بتوانێ لەجێی خۆی هەڵیەکێنێ .

لەنێوان (ئەو) و (ئاو)دا جیناسی ناقیص هەیە .

هەر («پەراوێزی» چر) و (کم) : وا . (چن) : هەر . کە نەقشی غەیری ڕەنگی (چر) و (مم) و (کم) و (من) : کە نەقشی ڕەنگی غەیری . ئەوەندە هەیە (چر) بە هەڵــە (کە)کەی بە (لە) نوســـیوە و (کم)یش (نەقشـــی)ی کردووە بە (نەخشی) ! . (ت) : کــە نەقشی ڕەنگی ماســوا . دوور نییە (ماسیی وا) بێ ، چونکە مەســەلەکە پەیوەندی بە (ئاوی دیــدە)وە هەیە ! (لد) و (اح) و (خا) و (خب): کە ڕەنگی نەقشی غەیری. ئاوی (ت) و (خب): ئــاوی .

(٨) ثوبوت : بون . باعیث : هۆ . نەفی : نەبون . لامەلفلا : لا ..

واتە : بونی تۆ هۆی نەبونی منە ، چونکە من بەهۆی خۆش‌ویستنـــی تۆوە لەناو چووم ، هەروەك چۆن زولفەکانت بە لای ڕاســـت و چەپــدا هاتونەتە خوار و لە سەرەکانیانەوە وەك سەری لیپی (ل) چەمیونەتەوە و چوون بەیەکدا و بەهەردوکیان ( لا ) یەکیان دروســت کردووە و دەوری باڵایــان داوە و شاردویانەتەوە .مەبەســـتی ئەوەیە بڵێ : بــونی تۆ بووە بەهۆی (لا)یەتیی من ، وەك چــون جۆڵــە زولفەکەی تۆ بە هەردوکیــان (لا)یەکیان پێکهێناوە و بوون بەهۆی (لا)یەتیی باڵات .

وەك (کم) و (مب) و (من) : تا . لامی : لە زوربەی نوســخەکانا بێ (ی)ای ئیضافە . لە هەردوو لا (ت) و (کم) : کە هەردوو لا . (خب) : لە هەر لایێ . نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە (کم)دا بەمجۆرەیە :

وجوودت باعیثی نەفیە بە ئەلف و لامی زولفەینت

ئەم بەیتە لە (مم) و (کم) و (کم)دا بەیتی حەوتەم و ، لە (مب) و (من)دا بەیتی نۆهەمە .

گەهێ ئاهۆ ڕەوش شاهی ، گەهێ گەوهەر مەنیش ماهی
بلا با سینە صەحرا بێ ، بلا با دیدە دەریا بێ ! (٩)

کەمەندی زولفی دۆ لانە ، لە بۆ گەبر و موسولمانە
دەکێشێ بێ موحابانە ، چ لەملا بێ ، چ لەولا بێ ! (١٠)

لەئالیی ئەشکی «نالی» بێ‌کەسە ، غەلطانی ێو خاکە
مەگەر سەمعی قەبۆڵت موشتەریی لۆلۆیی لالا بێ ! (١١)

---

(٩) گەهێ : گاهێ ، هەندێ جار . ڕەوش : ڕۆیشتن . مەنیش : خۆ ، سروشت . ماهی : مانگی . بلا : با .

ئەشکونجێ وشەی (ماهی) بە (ماهێ) بخوێنرێتەوە، واتە : وەك ماسێ لە بنی ئاودا .

ئەم بەیتە لە (ەم) و (کم) و (گم)دا هەشتەم و ، لە (عب) و (من)دا حەوتەمە .

لەنێوان (شاهی) و (ماهی)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئاهۆ) و (صەحرا) و ، (گەوهەر) و (دەریا)دا تەناسوب هەیە .

گەوهەر ( « پەراوێزی » چر ) و (گم) : لوءلوء . با ـ ی یەکەم ـ (چر) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) و (خا) : سا . با ـ ی دۆهەم ـ (کم) و (گم) و (ت) و (عب) و (من) : سا . دەریا (کم) و (گم) و (من) : بالا . نیوەی دۆهەمی ئەم بەیتە لە (ت)دا بەمجۆرەیە :

**بلا با دیدە دەریا بێ ، بلا با سینە صەحرا بێ !**

(١٠) کەمەند : جۆرە تەنافێك بووە جاران لە جەنگدا بەکارهێنراوە بۆ خستنەمل و بەکێش کردنی جەنگاوەری بەرەی ئەولا . دۆ لانە : دۆباد . گەبر : ئاگرپەرست . موحابات : هەڵاوێردن .

واتە : تەنانی زولفی دۆبادی یار لە لای ڕاست و لای چەپەوە دلدار بەکێش ئەکا ، وەك تەنانی جەنگاوەران نییە ، لەبەرەی موسولمانانەوە کافر بەکێش بکا و ، لە بەرەی کافرانەوە موسولمان بەکێش بکا . فەرقی بەرەی موسولمان و کافری لا نییە ، لە هەمو لایەکەوە خەلك بەدیل ئەگرێ و هیچ لایەك بەسەر لایەکی‌تردا هەڵناوێرێ .

ئەم بەیتە لە (عم) و (کم) و (گم)دا نۆهەم و،لە (عب) و (من)دا هەشتەمە.

(١١) لەئالێ : جەمعی لوءلوئە ، واتە مرواری . غەلطان : تێکەڵ . تێوەگلاو .

— ٢ —

مەستورە کە حەسناوو ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ ! (١)

---

سەمع : گوێ لێ گرتن .

لولو : لوولوە . لالا : لەولاو ، ئیشلەدەرەوە .

واتە : دڵۆپە فرمێسکەکانی نالی بێ کەسن ، کەس (گوێ)یان نادائێ و لێیان ناپرسێتەوە ، وەك دانەی مرواری لە چاوی دائەوەرێن و بەناو خاکا ڕۆئەچن . مەگەر گولێ پەسەند کردنی تۆ ، نازیزەکەم ، گولێ لە گریانم بێ و بەزەیی پیاما بێتەوە و دەستێ بە چاوما بێنێ و دانەیەك لەو مرواریە گەشانەی فرمێسکم بەدەستتەوە بچێ و (بیکرێ) لێم ...

— ٢ —

لەم پارچە شیعرەی نالیدا سەرەتای ئەدەبی ڕۆهەڵماڵراوی کوردێ بەدێ ئەکرێ کە تائیستاش داب و نەریتی کۆمەڵایەتێ نەیهێشتووە جێگای خۆی لە ئەدەبیاتماندا بکاتەوە و ، شێخ ڕەزای تاڵەبانیی لێ دەرکەی کەسی تر ئەم ڕێگەیەی نەگرتووەتەبەر. هەروەها هەرچەند ناتوانرێ ئەم پارچە بە پارچەیەکی (هەجو) دابنرێ، چونکە تێکڕا لە چوارچێوەی پیاهەڵوتن و شان و شکۆ پێدانا داڕێژراوە، لە دیمەنێکی بەدناو کردن و ئابڕوو بردنیش بێ بەش نییە ، نەخوازەلا کە بەرابەر بە یەکێ لە میرکچەکانی ئەردەڵان وتراوە و ، ئەویش لەو کەمکەسانەیە ناویان بە شیعر و ئەدەبەوە دەرکردووە . بۆیە لەم ڕووەشەوە هەر بە پارچەیەکی ڕچەشکێن دائەنرێ و ، شێخ ڕەزا لەم مەیدانەشا بە قوتابیی قوتابخانەی نالی ئەدرێتە قەڵەم .

وتنی شیعری وا لەلایەن خوێندەوارێکی مزگەوتەوە و ، پتر لە ١٥٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ و ، لە شارێکی لەڕادەبەدەر داب و نەریت ڕاگر و سەرپۆش لەسەری وەك سنەدا و ، بەرابەر بە میرکچێك ، نیشانەی چاونەترسان و بزێوێ و جەسارەتێکی بێ سنوورە لە نالییەوە و ، بەڵگەی ئەو ئاگری یاخی گەرییەیە لە سینەیدا کڵپەی سەندبوو . بۆیە ، بە ڕای ئێمە ، لەبێ لەم ڕووەوە بە چاوی ڕێز لێ گرتن و قەدر زانینەوە سەیری بکرێ و ، وادابنرێ شتێکی نوێ و گرانبەهای خستووەتە سەر گەنجینەی ئەدەبی کورد .

ڕازی بوونی نالی لە سنەدا و ، چی لەنێوان ئەو و ( مەستورە خانم )دا

• • • • • • • • • • • • • • • • • • • • • •

ڕۆیداوە و ، ئەم قەسیدەیەی بۆ وتووە و ، چۆنجامێکی لێ وەشاوەتەوە، دیار نییە . ئەوەی لێمان ئاشکرایە تەنها ئەوەندەیە مەستوورە ناوی ( ماه شەرەف خانم ) و کچی ( ابو الحسن بەگ ) نــاوی لەلــەی شازادەکانی ئەردەڵانە و لە ١٢٤٤ ی . ك ( ١٨٢٨ ــ ١٨٢٩ی . ز )دا خوســرەو خان بە نیاری دڵدانەوەی ئەبولحەســەن بەگی باوکی مــارەی کردووە (*) . ئافرەتێکی شاعیر و ئەدەب پەروەر بووە .

جگە لە نوســخەکانی بەردەســتمان ، ئــەم پارچــە شــیعرەمان لــە کەشکۆڵێکی‌تریشا دیەوە ، دۆستی خۆشەویــستمان شــێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی بە کۆڕی زانیاری کوردی نۆوشتبۆ . بۆ ئەم نوســخەیەش ئیشارەتی (کش)مان داناوە . ئەو کەشکۆڵە تەنها ئەم قەسیدەیەی نالیی تێدابۆ .

(چر) لەســەر ئەم قەســیدەیەی نۆسیوە : « جواب و سوئالی حەزرەتی نالی لەگەڵ مەستوورەی ژنی والی » . (گم)یش لەسەری نۆسیوە : « نالی لەو بەندی خوارەوەیدا پەلامارێکی زۆر ناشیرین و ناڕەوایانەی بردۆتەســەر بوێژی ناودار و وێژەوانی پایەبەرز کە ماە شەرەف خانم ( مەستوورە )ی کوردســتانیی خێزانی والیی ســنەیە (**) » . (ك)یش بە « قصیدەء احتلامیة » واتە : قەسیدەی شەیتانی بۆن ناوی هێناوە . لــە (تو)یشدا لەسەری نۆسراوە : « قصیدەء در تمدح مستورە حرم والی سنندج در زمان فقیهی درآنجا بخواب دیدەاســت ، اینراســت فرمودە » . واتە : قەسیدەیەك لە پیاهەڵدانی مەستوورەی حەرمی والیی سنەدا لە ســەردەمی فەقێیەتیدا لەوێ لە خەودا دیویە ، ئەمەتە فەرمۆیەتی » . لە (عب)یشدا لەسەری نۆسراوە: « قصیدەء کە در تمدح مستورە زن والی گفتەاست» . واتە : ئەو قەسیدەیەی لە پیاهەڵدانی مەستوورەی ژنی والیدا وتۆیەتی . لە (اح)یشدا لەسەری نۆسراوە : « در خواب دیدن نالی رحمە الله احتلام بدختر شاه سنە ، بچە نوع گفتگو کردەاند » . واتە : لە خــەوا بینینی شەیتانی بۆنی نالی ، بەڕەحمەت بێ ، بە کچی شای ســنــەوە ، چــۆنیان گفتوگۆ کردووە . (خا)یش لەسەر بەشی یەکەمی نۆسیویە « سوئال » و لەسەر بەشی دۆهەمی نۆسیویە « جواب » .

---

(*) آیت الله آقای شیخ محمد مردوخ کردستانی ، تاریخ مردوخ ، جلد دوم، صفحە ١٦١ ، بدون سال و محل طبع .

(**) بگەڕێرەوە بۆ ل ٦٨ ــ ٧٣ی ئەم کتێبە .

هاتۆم ، وتی ، عوقدەم هەیە ، قەط موەکینە وا بێ ؟
هیی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەل کەی بە جەوابێ (٢)

---

لە هەندێ بەشی ئەم پارچە شیعرەدا نالی شێوەیەکی ناتەواوی (لەرجیع‌بەند) و (دەور)ی بە دووبارەکردنەوەی وشەی (قلەشابێ) بەکارهێناوە .

(١) حەسنا : حەسناء ، ئافرەتی جوان . عیتاب : لۆمە و گلەیێ .

واتە : مەستوورە کە بە ئافرەتێکی جوان و ئەدیبی دائەنێن ، ئەمشەو هاتە خەوم ، بەڵام چۆن نازێکی بەسەردا ئەکردم و چۆن بە گلەیێ و لۆمە بۆ لێم !!

بە چ نازێك و عیتابێ (خب) : بە چ ناز و چ عیتابێ .

(٢) موقدە : گرێ . وا : کراوە (مفتوح) . لەگەرەم : ئەگەر ئەم . مەسئەلە : پرس . داوا .

واتە : لە خەوما هاتە لام و ولی گرێ و ئاڵۆزییەکم هەیە ، ئاخۆ لەتوانادا هەیە چار بکرێ و بکرێتەوە ، یا ئاخۆ رەوایە هەروا بە چار نەکراوێ و نەکراوەیێ بمێنێتەوە !! ئەگەر تۆ بتوانێ ئەم پرسیارەم بۆ یەکالا بکەیتەوە و ، ئەگەر بشێ ئەم گرێیەم بە وەڵامێ بۆ چار بکرێ کە ڕاستەوخۆ جێی خۆی بکرێ ، یا ئەگەر بێتو ئەم داوایەم جێبەجێ بکەی ، ئەبم بە هیی تۆ .

دیارە گرێکە کچێتێ و ، چارەکردن و کردنەوەکەشی لاقەکردنی مەستوورە خۆی و بە ژن کردنیەتی .

لە وشەی (جەواب)دا ئیشارەتێکیش کراوە بە وشەی (جەوواب)ی عەرەبێ واتە (گەڕاڵ) کە کینایە ئەبێ لە هینەکەی پیاو کە لێرەدا نالی خۆیەتی .

لە (وا بێ)دا لەطافەت هەیە چونکە دوو مەعنا ئەبەخشێ .

هاتۆم : لەمە تێکستی لەنها ( کش )ە . نوسخەکانی‌تر هەمویان : هات و . ولی (عم) و (گم) و (ك) و (عز) و (لو) و (عب) و (من) و (کش) : گوتی . قەط (گم) و (من) : قەت . (مز) و (کش) : قەد . هیی تۆم ئەگەر (عم) و (گم) : هەر تۆ مەگەر . (عز) : هاتۆم . دیارە (لەگەر)ەکەی پەڕیوە . (اح) و (خا) : ئیی تۆم لەگەر . (خب) : بێتو ئەگەر . مەسئەلە (عم) و (گم) و (ك) و (لو) و (خا) و (خب) و (کش) : موشکیلە .

هەر مەسئەلە بیکرێ کە بە تۆ شەرحی کرابێ
مومکین نییە کەس دەخلی بکا چین و خەطا بێ (۳)

ئاینە بە ماینە دەبێ ڕەنگ نوما بێ
( مەستورە ) بەمەستورە دەبێ موهرەگوشا بێ (٤)

---

حەل کەی (ت) : حەل بێ .

(۳) مەسئەلە بیکر : مەسئەلەی بیکر ، ئەو بابەتەی کەس ڕێی بە لێکدانەوەی نەبردبێ . شەرح : لێکدانـەوە . (بەکالا کردنەوە) . چین و خەطا : وڵاتی چین و وڵاتی خەتا و خوتەن .

واتە : وەرە تۆ چاری ئەم مەسـەلەیە بکە و لێکی بدەرەوە ، چونکە هەر مەسـەلەیەکی کەس ڕێ پێنـەبردێ کە تـۆ بە زیـرەکی و توانـای خوت لێکتدابێتەوە ، با وڵاتی چین و خەتا و خوتەنیش هەڵسـن و هێرش بێنن، کەس ناتوانێ توخنی بکەوێ و خۆی بدا لەقەرەی .

(بیکر) ئیشارەتە بۆ کچێتیی مەستورە خانم و ، (شەرح)یش کینایەیە لە بە ژن کردن و ، مەبەسـت لە (دەخل)یـش لاقەکردنـە . (خەطـا)یش ئیشارەتێکی بۆ مەعنای تاوان تیایە . مەبەستی نـالی ئەوەیە بە زوبـانی مەستورەوە بلێ وەرە تۆ لاقەم بکە و بمکە بە ژن ، چونکە هەر کچێ کـە داوا لە تۆ بکا بیکەیتەوە و تۆیش بیکەیتەوە ، کەسیتر ناتوانێ تـاوانیوا بکا دەستی بۆ بەرێ .

شەرحی : لەمە تێکستی (عم) و (گم) و (لو) و (خا)یە . نوسخەکانیتر هەمو : (شەرح) . دیارە مەبەست هەر (شەرحی)یە . مومکین (عم) و (گم): لایق . خەطا : (عم) و (گم) : خەتا .

ئەم بەیتە لە (من)دا نییە .

(٤) ئاینە : ئاوێنە . ماینە : ئاواوێ ، تێکەڵ بە ئاو . ڕەنگنوما : ئـەوەی ڕەنـك بداتەوە . بەمەستورە : بەم ئەستورە ، یاخود : بە مەسـتورە ، واتە : بە شتی داپۆشراو کە هینەکەی نالییە . موهرەگوشا : سەرقـاپ کراوە ، کینایەیە لە کچی بە ژن کراو .

واتە : ئەبێ (ئاوێنەکەی) مەستورە خانم بە شتێکی ئاواوێ و وەك ئاو پاك بکرێتەوە تا ڕەنگ بداتەوە و ، سەرقاپی مەستورە خۆیشی بەم شتە ئەستورە یا بەم شتە شارراوەیەی نالی بکرێتەوە . . .

لەنێوان (ئاینە) و (ماینە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (مەستورە) و

نوکتێکی ظەریفە بە نەصیبی ظورەفا بێ
تەعریفی دەکەم ، بەڵکو لە بۆ دەرد شیفا بێ (٥)

ئەم سیرڕە چییە میثلی سوها بێ ، نەسوابێ ؟!
دوڕڕێ کە وەکو دوڕڕی سەما بێ ، نەسابێ ؟! (٦)

---

(بەم ئەستورە)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

ئاینە بە مائینە : ئەمە لە تێکستی ئەنها (خا) وەرگیراوە کە نوسیویە ( مائینە ) .(چر) و (مز) و (من) و («بەراوێزی» خا) : ئایینە بەم ئاینە . (مم) و (گم) : ئاوێنە بەم ئاوێنە . (ت) و (مب) : ئائینە بەم ئاینە . (ك) : ئاینە بەم ئاینە . (اح) : ئاینە بەم ئایینە . (خب) و (کش) : ئایینە بەم ئاینە . لە هەمو حاڵێکدا ئاشکرایە نالی مەبەستی لە داڕشتنی (بە مائینە)دا بەجۆرێ کە وەك (بەم ئایینە) بێتە پێش چاو ، وشەئارایی و پیشاندانی دوو وشەی (ئاینە) پێکەوە و دروستکردنی جیناسێك بووە ، وەك لە (مەستورە بە مەستورە)دا ، ئەگینا زانیویە کەس ناکەوێتە ئەو هەڵەوە نەزانێ (بەم ئایینە) واتە (بە مائینە) و (بە مەستورە) واتە (بەم ئەستورە) . نوسیارە شارەزاکانیش هەر بەم مەبەستە (بە مائینە)یان بە (بەم ئاینە) نوسیوەتەوە . بەمەستورە (چر) : بە مەستورە . (مم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : بەم ئەستورە . (لو) و (مز) و (مب) و (کش) : بەمستورە ، بەم ئەستورە ، یا بە مەستورە . موهرە گوشا بێ (چر) و (ك) و (خب) : مهر شکابێ . بۆ (موهری) و (موهرە)ش دەستەئەدا . (ت) و (اح) : مهرکشا بی . ئەمیش هەر (موهرە گوشا بێ)یە . (مز) : موهرە شکابێ . (لو) و (کش) : موهری شکابێ . (مب) و (من) : مۆری شکابێ .

(٥) نوکتە : قسە یا بابەتی خۆش . ظەریف : خۆش . ظورەفا : جەمعی ظەریفە ، واتە مرۆڤی زۆرخۆش و خۆشکردار و قسەخۆش .

واتە : ئەو پرسیارە ئاڵۆزە ، یا ئەو داوایە بابەتێکی یا شتێکی زۆر خۆش و باشە ، خوا بە نەصیبی باشانی کا ! . بۆڵی باس ئەکەم و لێکیئەدەمەوە ، بەڵکو ببێ بە دەرمانی دەرد . . .

بەڵکو (مم) و (خا) و (خب) : بەڵکە . (گم) : بەڵکی. دەرد (چر) و (مم) و (گم) و (ك) : دەردی .

(٦) سیرڕ : شتی نهێنێ . سوها : یەکێکە لە ئەستێرەکانی حەوتەوانە بەئاسانی نابینرێ . نەسابێ : نەسمرابێ ، کون نەکرابێ .

دوککانی توحەف ، کانی حەیا ، کالیی بەقا بێ
قوبەی لە قیبابی نوقەبا بێ ، نەقوبابێ (٧)

---

وانە: ئەو شتە نهێنییە چییە کە وەك ئەستێرەی سوها ون و نادیارییە و، لەبەرئەوەش ون و نادیارێ نییە کە سواوە و فەوتاوە ، نەسواوە ، هێشتا ساغ و تازەیە .. دوڕڕێکی پرشنگدارە لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان ئەچێ و هێشتا نەشمراوە . مەبەستی لەوەیە دوڕ کاتێك پرشنگ ئەداتەوە بسمرێ و بکرێتە مل یا بکرێ بە گوارە .. مەبەستی مەستورە لە (شتەکەی) خۆیەتی .

لەم (ئەکرانە مل) و (ئەکرانە گوێ)یەشدا کە لە (ئەسمران)ی دوڕڕەکەوە دەرئەکەوێ ، ئیشارەتێکی‌تری ناسك بەیدا ئەبێ .

لەنێوان (سیڕنا) و (دوڕنا) و ، لەنێوان (سوها) و (سوا) و (سەما)دا جیناسی لاحیق هەیە . لەنێوان (سەما بێ) و (ئەسمابێ)یشدا ، لەسەر شێوەنوسی کۆن بەدیمەن ، طیباق هەیە .

دوڕڕێ کە وەکو دوڕڕی سەما بێ (عم) : دوڕڕەی وەکو دوڕڕێ کە سمابێ . (گم) و (مز) و (عب) : دوڕڕێکی .. تاد . (ت) و (تو) و (کش) : دوڕڕێ وەکو دوڕڕێتیی سەما بێ . (ك) : دوڕڕێ وەکو دوڕڕێ کە سمابێ . (اح) : دوڕڕێ وەکو دوڕڕێکی سەما بێ . (خا) : دوڕڕێ وەکو دوڕڕیی سەما بێ . (خب) : دوڕڕێکی یەتیمی کە سما بێ . بەگوێرەی ئەو نوسخانەی کە وشەی (سەما)یان بە (سما) نوسیوە ، مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێدێتەوە : دوڕڕێ وەکو دوڕڕی سمراو وانەبێ ، ئەسمرابێ .

(٧) توحەف : جەمعی توحفەیە وانە نایاب و عەنتیکە . قوببە : گومەز . قیباب : جەمعی قوببەیە . نوقەبا : نوقەباء ، جەمعی نەقیبە ، پلەیەکە لەو پلانەی ئەهلی تەصەووفی پێ‌لەگەن .

وانە : ئەو شتە چییە کە وەك دوکانی عەنتیکە نایاب و گرانبەهایە و ، کانی شەرم و شکۆ و حەیا و ، کانیی ژیانە چونکە منداڵ لەوێوە دەرئەچێ و سەرچاوەی ئاوی زیندەگانییە و ، لوتکەکەی لە گومەزی خاسانی خوا ئەچێ ئەوەندە بەرز و پیرۆز و دەست پێ‌نەگەیشتووە و کەس (پێی) بیا نەناوە تا بقوپێ !.

لەنێوان (دوککان) و (کان) و (کانی)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (نوقەبا بێ) و (نەقوپابێ)یشدا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

دوککانی : ئەمە تێکستی (عم) و (گم) و (عز) و (من)ە . نوسخەکانی‌تر

وەك خەیمە بە پەردێکی دو ئەستونە بە پا بێ
سەر تیلەکی ئەختێ بە نەزاکەت قلەشابێ (٨)

وەك هیممەتی سۆفێ کە لەنێو خەلوە خزابێ
مەستور و عەزیزی شەرەف و ڕیفعەت و جا بێ (٩)

---

هەمو بە بێ (ی)ی ئیضافەن ، بەڵام دیارە هەر لەبەر ڕێنوسی کۆن وایان نوسیوە . کانی (چر) و (ت) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) و (کش) بە بێ (ی)ی ئیضافە.دیارە لەمیشدا هەر لەبەر ڕێنوسی کۆن وایان نوسیوە. کانێ : ئەمە تێکستی (عم) و (گم) و (عز) و (من)ە . نوسخەکانی تر ، (لـو) نەبێ کە نوسیویە (کان) ، هەمو نوسیویانە : کان ، بەڵام دیارە هەڵەیە . نیوە بەیتی دوەمیش بە ڕێنوسی نوێ لە (عب) و (من)دا وای لێ دێتەوە :

**قوبەی نوقەبا بێ ، لق و پا بێ ، نەقوپابێ**

(٨) خەیمە : خێوەت : ئەستون : هەسون ، کۆڵەکە ، ئەو دارەیە کە ئەدرێتە ژێر تەختەی دەوار . سەرتیلەك : لوتکەی بەرزایی دەوار ، ئەو شوێنەی دەوار کە لای سەرەوە هەردو سەرەکەی دەوارەکەی تیا بەیەلوەنەگەنەوە . نەزاکەت : ناسکێ .

واتە : ئەو شتە وەك دەواری دو هەسون وایێ ( هەسونەکانی هەردو ڕانی مەستورە خۆینی) کە لای سەرتیلەکەیەوە بەئاستەم درزی لێ بوبێ.

دو لەستونە (عم) و (گم) : دو ئەستونی . سەرتیلەکی (چر) : سەرشیلەکی . شیلەگە : ئەو کەندە بچکۆلەیە لە جۆگەی دائەدرێن بـۆ ئاو هەڵگرتن بۆ سەرزەوێ . (عم) و (ت) و (ك) و (عز) و (لو) و (من) و (کش) : سەرتەپلەکی . قلەشابێ (لو) : قەلەشابێ . (من) : قلیشابێ .

(٩) عەزیز : خاوەندەسەڵات بە جۆرێ کەس نەتوانێ دەستی بـۆ بەرێ . ڕیفعەت : پایەبەرزێ . جا : جاە ، پایە .

واتە : ئەو شتە وەك هیممەت و بەرەکەت و لێهاتنی سۆفێ وایێ کە خۆی خزاندبێتـە کونی خـەلوەت خانـە و کـەس نەیبینێ و ، بەهۆی شەرەف و پایەی بەرز و شان و شکۆیەوە کەس نەتوانێ دەستی بۆ بەرێ و لە بەرچاو نەبێ . .

شەرەف و (ك) : شەرەف . بۆ مەعطفیش و بۆ ئیضافەش دەست لەدا . ڕیفعەت و (ك) : میرزەت . (کش) : ڕیفعەت . بۆ مەعطفیش و بۆ ئیضافەش ئەگونجێ .

یا کۆمەڵە زیوی بوخەلا دوور لە سەخا بێ
موغلەق بە بەخیلی ، بە مەثەل مشتی مەلا بێ (١٠)
کاسێکی بلوورینی نخوونی لە سەرابێ
تەختێکی لەبەر مەوجی لەطافەت قڵەشابێ (١١)

---

ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (مم) و (گم) و (ت) و (اح) و (خا) و (خب)دا لە شوێنی یەکتردان .

(١٠) بوخەلا : بوخەلاء ، جەمعی بەخیلە واتە زۆرد و پارە پیس . سەخا : بەرچاو فراوانی و بە دەس و دەمەنەبێ . موغلەق : داخراو ، قوچاو . مشتی مەلا : کینایەیە لە نەکرانەوە و هیچ لێ نەبوونەوە .

هێشتا مەستوورە هەر لەسەر پرسیارەکەی ئەڕوا و وردە وردە نیشانەکانی دەرئەخا ، بۆئەوەی لێپرسراو هەڵیبێنێ چییە ، ئەڵێ : ئەو شتە چییە کە لەڵێی کۆمەڵە زیوی بنیادەمی پارە پیسە کە هیچی لە دەست نەبێتەوە و ، لەبەر زۆردی دەرگاکەی داخراوێ وەك بڵێی مشتی مەلایە نوقاوە ، کەس بۆی ناکرێتەوە !!

سەخا (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : خەلا . خەلا : چۆڵی . بەمپێیە ئەم نیوە بەیتە وا ئەخوێنرێتەوە :

**یا کۆمەڵە زیوی بوخەلا ، دوور ، لە خەلا بێ**

واتە : لە شوێنێکی دوور شاررابێتەوە ، لە چۆڵییەك . بەگوێرەی ئەم نوسخانە لەنێوان (بوخەلا) و (خەلا)دا جیناسی ناقیص ئەبێ .

(١١) بلوورین : شووشەیێ . نخونی : سەرەو نخوون کراوە . سەراب : سەراو . مەوج : شەپۆل .

واتە : ئەوە چییە کە کاسەیەکی شووشە لە سەرناوێك سەرەونخوون کرابێتەوە و ، لەبەر ناسکیی لەڕادەبەدەری خۆی توزێکی درزی بردبێ !

ئەشتوانرێ ( لە سەرابێ ) بە ( لەسەرا بێ ) بخوێنرێتەوە ، واتە : بەسەرەوە بێ . بەمپێیە نیوە بەیتەکە تێکرا صیفەتی (زیوەکەی) بەیتی پێشوو ئەبێ .

کاسێکی (چر) : کاسێکە . (مم) : کاسەیکی . (گم) : کاسەیێکی . بەڵام سەنگی بەیتەکە تێك ئەدا . بلوورینی نخونی : ئەمە تێکستی (من) و (خا)یە . (چر) و (لو) : بلوورین نخوون بێ . بۆ (بلوورین و) و (بلوورینی)یش دەس ئەدا . (مم) و (گم) : بلوورین و نخونی . (ت) : بلوورین نخونی . بۆ (بلوورین و) و ( بلوورینی )یش دەست ئەدا . (ك) و (عب) و (اح) : بلوورین و نخوون بێ .

یاخۆ پەلە بەفرێکی کە ئەصلەن نەشکابێ
قەندیلی مونیر و گوزەری ئاب و هەوا بێ (١٢)

کام ئاب و هەوا ؟ موعتەدیلی نەشئو نوما بێ
یەعنێ لە وەسەط کانیە گەرمێکی تێزابێ (١٣)

لەو کانیەدا چۆزەرە ڕێواسێ ڕووابێ
بەو چۆزەرە ڕێواسە کەمێکی قەڵەشابێ (١٤)

---

(مز) و (خب) : بلـۆربێ کە نخۆن بێ . (کش) : بلۆرینی نخـۆن بێ .
لە ســەرابێ (ت) و (مز) و (لو) و (عب) و (من) و (خب) و (کش) : لەسەر
ئابێ . هەر بە (لە سەرابێ) ئەخوێنرێتەوە . لەبەر (من) و (کش) : وەکو .

(١٢) قەندیل : چیای قەندیل لە ڕۆژهەڵاتی باکوری کوردستانی عێراق . مونیر :
ڕۆناککەرەوە .

مەعنای ئەم بەیتە و دۆ بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێکئەدەینەوە .

کە ئەصلەن (من) : لە ئەصـــلا . مونیر و (مم) و (گم) و (ك) و (لو) و
(خا) و (خب) : مونیری . (ت) و (عب) و (اح) : مولیر . بۆ عەطفیش و بۆ
ئیضافەش دەستئەدا . (من) : نـەمیری ( ! ) . گوزەری (ت) و (عب) و
(اح) : گوزەر . دیارە ( گوزەری)یە .

(١٣) موعتەدیل : گونجاو . لێنـك . نەشئو نوما : پێگەیشـــتن . وەسەط :
ناوەڕاست .

ئاب و (گم) ئاو و ا. نەشئو نوما : ئەمە تێکستی (خا)یە . نوسخەکانیتر
هەمۆیان : نەشوو نوما . کانیە گەرمێکی : ئەمە تێکستی (مم) و (گم)ە .
(چر) و (مز) و (لو) و (عب) و (کش) : کانی گەرمکی ، بەڵام سەنگی بەیتەکە
تێکئەدا و (چر) خۆیشی لە پەراوێزا نوسیویە ئەبێ ( کـانیەوە ) بـێ .
(ت) و (ك) و (اح) و (خا) لەگەڵ هەندێ جیاوازیی ڕێنوسـدا : کانیەکی
گەرمکی . (من) : کانییێ گـەرمکی . دیـارە ( گەرمێکی )یـە . (خب) :
کانیەکی گەرمی . تێزابێ : ئەمە تێکستی (مم) و (گم)ە . نوسخەکانیتر
هەمۆیان : زابێ ، بۆیە دیارە هەندێکیان لەنگ ئەبن .

(١٤) واتە : یاخۆ ئەو شوێنە کامەیە کەس ڕچەی تیا نەشکاندووە و بەسەریا
نەڕۆیشتووە و ، لوتکەی بەرز و سپیی قەندیل ئاسـا و گوزەری ئاو و

یا قەصری موعەللا کە لە ئاوێنە کرابێ
یا غونچەیی نەشکوفتە کە ئاوی نەدرابێ ؟! (١٥)

یا گومبەدی نەزهەتگەهی ێو باغچەسەرا بێ
ئەلوانی گوڵامێز و شەکەرێزی تیابێ ؟! (١٦)

---

هەرای لەبارە بۆ پێگەیشتن و گەورە بوون ، چونکە لە ناوەڕاستی ئەو بەفرە ساردەدا کانییەکی گەرم تەقیوە و ، بەو کانییە گەرمە بەهـار هاتووە و چۆزەرە ڕێواسێك ڕواوە و ، بە ڕووانی ئەو چۆزەرە ڕێواسەش کەمێك لە پەڵە بەفرەکە شەقی بردووە ؟

مەبەست لە پەڵە بەفر ئەمبەر و ئەوبەری ڕانی سپیی مەستوورەیە کە شوێنی بەرزی هەیە شوبهاندۆیەتی بە قەندیل و شوێنی نزمیشی هەیە کە (ئاو) و (هەوا)ی پیا لەڕوا و مایەی نەش و نومـای منالـە لـە سکی دایکدا . مەبەست لە (کانیی گەرم) و (چۆزەرە ڕێواس) و (قلەشانەکەشی) ئاشکرایە . .

لەو کانییەدا (چر) و (مز) و (تو) و (عب) و (من) و (کش) : لەو کانییەوە. ڕێواسێ (چر) و (ك) و (مز) و (تو) و (عب) و (من) و (کش) : ڕێواسێکی . (عـم) : ڕێـواس . دیـارە (ڕێواسێ)یە . (ت) : ڕێواسـکی . دیـارە ( ڕێواسێکی )یە . ڕووابێ (چر) و (ت) و (ك) و (تـو) و (عب) و (من) و (کش) : دابێ . بەو (ت) : لەو .

(١٥) قەصری موعەللا : کۆشکی بەرز . نەشکوفتە : نەپشکوتوو .

واتە : باخـود ئەمـە چییـە ئـەڵێی کۆشـکێکی بـەرزە لـە ئاوێنە دروستکراوە ، یا خونچەیەکی نەپشکوتووە چونکە ( ئـاو )ی نەدراوە تا ( بپشکوێ ) ؟ دیارە ئەگەر خونچە ئاو نەدرێ ناپشکوێ ، بەڵکو سیـیش ئەبێ و ئەمرێ . .

غونچەیی (گم) : خونچەیێ . (من) : باخچەیێ .

(١٦) گومبەد : گومەز . نەزهەتگەه : شوێنی ڕابواردن و سەیران . ئەلوان : هەموو ڕەنگ . گوڵامێز : گوڵئامێز ، تێکەڵ بە گوڵ . شەکەرێز : ئەوەی ئەوەندە شیرین و خۆش بێ شەکر لە بەرچاوی خەڵك بپژرێنێ .

واتە : باخود ئەمە چییە ئەڵێی گومەزی جێگای سەیران و ڕابواردنە لەناو باخچەی کۆشك و تەلار تێدا ، هەموو جۆرە بۆن و تامێکی خۆشیوای تیایە کە لە گوڵدا هەبێ و شەکر لە بەرچاوی بنیادەم بپژرێنێ ؟!

یا قورسی نمەك هەروەکو مەڕمەڕ بە ضیا بێ
جێی قەطرەیە ئاوێکی لەنێودا قلەشابێ ؟! (١٧)

یا گردەکی گردێکی کە شیرین هەڵیدابێ
گردی نمەکین ، یەعنی گیای لێ نەڕووابێ (١٨)

---

گومبەدی (چر) و (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : گونبەدی . نەزهەتکەهی نێو (ت) و (خب) : نەزهەتکە لەنێو « لەگەڵ هەندێ وردە هەڵەی نوسینەوەدا » . ئەلوانی (ك) : ئەنواعی . گوڵاميز و (عم) و (گم) : گوڵاميزی . (ت) و (ك) و (اح) و (خب) : گوڵاميز . بە نیشانەی ( شەکەر بێزی )دا دیارە ( گوڵاميز و )وە . (مز) : گوڵاوێز و .

نیوەی دوەمی ئەم بەیتە و بەیتی پێشەوەی لە (چر) و (ك) و (او) و (عب) و (من) و (کش)دا لەجێی یەکتردان .

(١٧) قورسی نمەك : پارچە خوێ کە بوبێ بە کوڵو . ضیا : تیشك .

واتە : یاخود ئەمە چییە خوێ ئەڵێی کوڵو خوێیە و وەك پارچە بەردی مەڕمەڕ تیشك ئەداتەوە و تەنها جێی دڵۆپێ (ئاو) لە ناوەڕاستەکەیدا درزی بردووە !!

جێی (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) و (کش) : جێ . بۆ (جێی)یش دەستئەدا . لەنێودا (چر) و (عب) و (من) و (کش) : لەناودا .

(١٨) گردەك : لەپۆلکەی بچکۆلەی سەر گرد . هەڵیدابێ : پەیدابوبێ و هەڵکەوتبێ . نمەکین : خۆش و بەتام و خوێ . شورە زەوێ کە سپی بکاتەوە و گیای لێ نەڕوێ .

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .

مەبەست لە (گردەك) و لە (گرد) و لە (گیا) ئاشکرایە ..

لەنێوان (گردەك) و (گردێك) و (گردی)دا جیناسی ناقیص هەیە . لەنێوان (شیرین) و (نمەکین)یشدا تەناسوبێکی جوان هەیە .

گردەکی (گم) : هەروەکو . شیرین (چر) و (عم) و (گم) و (ك) و (او) و (عب) و (من) : تازە . گردی (چر) و (ت) و (او) و (عب) و (اح) و (خا) : گرد . بۆ (گردو) و (گردی)یش ئەگونجێ . (من) : گرد و .

دامێنی بە ئەنواعی گوڵ و مڵ خەملابێ
گەنجێکی تێدا بێ کە طیلەسمی نەشکابێ (١٩)

حوقەیێکی زمڕی صافی لەسەر بانی لرابێ
ئەختێکی بە صەد صەنعەتی ( مانێ ) قەڵەشابێ ؟! (٢٠)

---

(١٩) دامێن : داوێن . خەملابێ : ڕازابێتەوە . گەنج : خەزێنە . طیلەسم : طەلیسم ، پارچە کاغەزێك یا پارچە میتاڵێکە جادوگەران چەند وشە و نەخش و خشتەیەکی لێ ئەنوسن گوایە بۆ چاوەزار و شتیوا باشە . کراوە بە کینایە لە ڕاز و نهێنێ و شتی پەی پێ نەبراو .
تێدابێ (ت) و (اح) و (خا) : تیا بێ .

(٢٠) حوقەیێکی : حوقەیەکی . حوقە : سندوقی بچکۆلانەی بۆنخۆشی و وردە شتی پێویستی ئافرەتە . زمڕ : زێڕ . مانێ : وێنەکێشێکی بەناوبانگی ئێرانی بووە .

واتە : یاخود ئەمە چیە گردۆلکەیەك بەسەر گردێکەوە هەڵکەوتبێ و دیمەنی لۆر جوان بێ ، گردۆلکەیەکی بەتام و خوێ بێ ، سپی بکاتەوە و گیای لێ نەڕوێ ، داوێنەکەی بە هەمو جۆرە گوڵێکی جوان ڕازابێتەوە و، گەنجێکیشی تیا شاررابێتەوە کەس هێشتا دەستی بۆ نەبردبێ ، (مەشهورە گەنجینە تەلیسمی هەیە تا تەلیسمەکە نەکرێتەوە گەنجینەکە دەرناهێنرێ ) ، توتویەکی زێڕی بێگەردی بەسەرەوە دانرابێ ، توزێك لەو توتووە بە هەزار زەحمەت بە هونەرمەندێکی وەك ( مانێ ) درزێکی بچوکی لێ کرابێ !!

لەم بابەتی (گەنج) و (طیلەسم)ەدا ئیشارەتێکیش بۆ ئەو ئەفسانەیە هەیە کە ئەڵێ مار بەسەرگەنجەوە بەپکە ئەکا . بە بەستنەوەی ئەو ئەفسانەیەشەوە بە بابەتی ئەم بەیتەوە و ، لەگەڵ مەعنا لێدانەوەی (گەنج)دا بەوجۆرە کە (نالی) بە زوبانی (مەستورە)وە مەبەستی بووە ، مەعنایەکی نوێ بۆ (مار) لێرەدا پەیدا ئەبێ . لە وشەی (مانێ)یشدا بە پەیوەند لەگەڵ وشەی (صەنعەتی) ، ئیشارەتێکی ناسك بۆ (مەنێ) کراوە .
زمڕی (چر) و (ت) و (عز) و (لو) و (عب) و (اح) و (خب) و (کش) : زمڕ . دیارە (زەڕی)یە . صافی (عم) و (گم) و (اح) و (خب) : صاف . دیارە (صافی)یە . (عز) و (کش) : سورخ . صەنعەتی (کش) : صەنعەت . دیارە ئەویش هەر (صەنعەتی)یە . بانی (اح) و (خا) : بان . دیارە (بانی)یە.

یا ڕەنسی یەتیمێکی کە بێ بەرگ و نەوا بێ
غەلطان و سەراسیمە : نە داکێك و نە بابێ (٢١)

فێسێکی سپێ و توندی لە کەللەی کەلی نابێ
هێشتاکو لە حەق جێگەیی خاصی نەدڕابێ (٢٢)

چەسپیدەوو خۆ هەروەکو بەر قالبی دابێ
نەختێکی لەبەر توندی‌یو سفتێ قڵەشابێ ؟! (٢٣)

---

مانێ (چر) و (لو) و (عب) و (من) : بانێ . بانێ : خوداوەند . (کش) : بان .
دیارە ئەویش هەر ( بانی )یە .

(٢١) ڕەنس : سەر . یەتیم : هەتیو . بێ‌بەرگ و نەوا : ڕووت و لات و بێ‌ناز .
غەلطان : تێوەگلاو . سەراسیمە : سەرسام و داماو .

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك‌ئەدەینەوە .

یەتیمێکی کە بێ (عم) و (گم) : هەتیوێکی کە بێ . (ت) و (اح) : یەتیمێ
کە بە بێ . غەلطان و (لك) و (کش) : غەلطان . دیارە ئەمیش بە (و)ەوەیە .
داکێك و (گم) : دایکێك و .

(٢٢) سپێ و (عم) و (گم) و (ت) و (خا) و (خب) : سپی . توندی (چر) و
(ت) و (لك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) و (کش) : توند. دیارە
(توندی)یە . لە حەق (خا) : بە حەق .

(٢٣) چەسپیدە : چەسپاوو پڕ بە پڕ .

واتە : یاخود ئەمە چییە سەرێکی ڕووتی بێ‌کڵاو و بێ‌نازی هەتیوێك ،
تووشی دەرد و مەینەت و سەرگەردانی بووبێ کەسێکی نەبێ خزمەتێکی
بکا و دەستێکی پیا بێنێ ، فێستێکی سپێ و توند و تۆڵی نابێتە سەر
خۆی ــ کە وەك سەری کەچەل هیچ مووکی پێوە نییە ــ ، فێستەکەش
خڕ و پڕبەپڕی سەرەکە بێ وەك بڵێی لە قالب درابێ و ئەوەندە لووس و
توند بێ بە سەرەکە ، بەتەواوی نەیگرتبێ ، بۆیە تۆزێکی شەقی بردبێ ؟!

مەبەست لە (سەر) و لە (بێ‌مووکی سەر) و لە (فێستی سپێ)یش
ئاشکرا و دیارییە و لەوە زیاتر ڕوون کردنەوەی ناوێ .

هەروەکو بەر (چر) و (لو) و (عب) و (من) : هەروەك ئەبەر . هەروەها
لە (مز) و (کش)یشدا بەلام لەگەڵ هەڵەیەکدا لە نووسینەوەی (هەروەك)دا

دورجێکی موجەوهەر کە هەمو حوسن و بەها بێ

دوڕڕێکی مونەووەر کە هەمو ئاوی صەفا بێ (٢٤)

بەیضێکی شوتورمورغێ کەوا تازە کرابێ

وەك بەیضەیی بەیضا بە ضیاوو بە سەنا بێ (٢٥)

---

بە (هەروەکو) . قالبی (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : قالب . ئەمیش هەر (قالبی)یە . توندی‌یو سفتی (عم) و (گم) و (اح) و (خـا) و (خب) : سفتی‌یو توندی .

(٢٤) دورج : قوتوبەکە ژنان زێڕ و خشڵ و شتی گرانبەهـای خۆیـانی تیا هەڵئەگرن . موجەوهەر : پڕ لە گەوهەر . حوسـن : جـوانی . بەها : ڕازاوەیی . مونەووەر : ڕۆناك . صەفا : بێگەردی و خاوێنی .

واتە : یاخود ئەمە چیبە قوتوبەکی پڕ لە گەوهەر هەموی هەر جوانی و ڕازاوەیی بێ !! ئەمە چیبـە دوڕڕێکـی ڕۆناك کـە هەمولایەکی ئاوێکی خاوێن و بێگەرد بێ وەك بڵێی تەنانەت خۆیشی ئاوە ؟!

لەنێوان ( دوڕ ) و ( ئاو )دا تەناسوب هەیە .

مونەووەر (چر) : مودەووەر . مودەووەر : خڕ . هەمو (خب) : پڕی .

(٢٥) بەیضێکی : بەیضەیێـکی ، هێلکەیەکی . شوتورمـورغێ : وەك هی وشترمورغ . بەیضە : پەردەی بوك . بەیضا : بەیضاء ، سپی . سەنا : بەرزی و شکۆ .

واتە : یاخود ئەمە چیبە لە هێلکەی وشترمورغ ئەچێ تازە کردبێتی هێشتا هەڵمی ناوسکی وشترمورغەکەی لێ هەڵسێ وەك پەردەی بوك سپی و خاوەن‌شکۆ و بەرزی بێ ؟

لەنێوان هەردو (بەیضە) و (بەیضا)دا جیناسـی لاحیق و ، لەنێوان (بەیضا) و (بە ضیا)دا وشەئاراییەك هەیە ، لەسەرێکەوە لە جیناسی تەرکیب و لە سەرێکی‌کەوە لە جیناسی قەلب ئەچێ .

بەیضێکی (عم) : بەیضەیکی . شوتورمورغی (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (عز) و (تو) و (اح) و (خب) و (کش) : شوتورمورغ . سەنا (ت) : بەصەفا . (اح) و ( «بەراوێزی» خا ) : سیا . ڕەنگە مەبەست لە تاریکایی بێ .

خرچێکی مردەووەر ، بە عەسەل ئاوی درابێ
ئەختێکی لەبەر حوسن و حەلاوەت قڵەشابێ !؟ (٢٦)

یاخود وەکو خۆی شاهیدە ، با وەصفی وەهابێ :
سیمین مەمکێکی هەکە تازە هەڵیدابێ (٢٧)

یا تازە هەنارێکی کەناری گولی مابێ
بێ درز و قلیش میثلی شەمامێکی تەڵا بێ (٢٨)

---

(٢٦) خرچێکی : خرچەیەکی . خرچە : کالەکی نەگەیو . عەسەل : هەنگوین . حەلاوەت : شیرینی .

واته : یاخود لەو کالەکە خرچە پێنەگەیشتووە چیە لەگەڵ پێنەگەیشتنیشیا لەوەندە شیرینە لەلایی بە هەنگوین ئاودراوە و ، لەبەر شیرینییە لەزادەبەدەرەکەی تۆزێکی بەئاستەم درزی بردووە !؟

خرچێکی (مم) : خرچەیکی .

(٢٧) سیمین : سپی وەك زیو . هەکە : کە ، زاراوەیەکی (گۆرانی)یە .

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .

با (مم) و (گم) : بۆ . مەمکێکی هەکە تازە : ئەمە تێکستی (مب) و (لو) و (من) و (کش)ە . ئێمە ئەممان هەڵبژارد چونکە چوار نوسخە لەسەری هاودەنگ بوون و ، وشەیەکیشە بۆ یەکەمجار نالی بەکاری دێنێ و ، زاراوەیەکی ڕەسەنی یەکێ لە دیالێکتە کوردییە کۆنەکانە و ، نالیش عادەیەلی وشە لە زۆر دیالێکتەوە ئەخوازێ . (چر) : مەمکێکی بێ کە تازە . (مم) و (گم) و (مز) : مەمکێکی تەڕ و تازەی . (ت) و (اح) و (خا) : مەمکێکی تەڕ و تازە . (ك) : مەمکێکی وەکو تازە . هەڵیدابێ (لو) : گولی‌دابێ .

(٢٨) کەنار : لێوار ، قەراخ . شەمام : شەمامە . تەڵا : زێڕ .

کەناری گولی : ئەمە تێکستی تەنها (مم) و (گم)ە . نوسخەکانی‌تر هەندێکیان ( ی )یان لەپاش (کەنار) یا (گول) یا هەردوکیان دانەناوە و ، هەندێکیان (گولی)یان بە (کولی) نوسیوە کە ئەوەش بەپێی ڕێنوسی کۆن دروستە . (ك) : کە تازە و گولی . (عز) : کەنارە گولی . مابێ (ت) : دابێ . ئەشگونجێ (کەناری گولی) بە (کە ناری گولی) بخوێنرێتەوە واته : کە گولی هەناری . قلیش (چر) و (عم) و (خا) : قلش . (گم) : تەلەش .

بۆ تەجرەبە تا لەذذەتی شیرینی ئەدا بێ
ئەختێکی وەکو دیدەیی دەرزێ قڵەشابێ ؟! (٢٩)

یاخۆ ، مەئەلا ، میثلی نە وا بێت و نە وا بێ
مەشهوور و خەفێ هەروەکو عەنقاوو وەفا بێ (٣٠)

---

تەلا : ئەمە تێکستی تەنها (خب)ە . نوسخەکانیتر هەموویان : طەلا .

(٢٩) ئەدا : جێبەجێکردن . دیدە : چاو .

والە : یاخود ئەو پرسیارە وەڵام ئەدراوە بەو شتانە ئەشوبهێنین کە ئائیستا باسمان لێ کردن ، بەڵکو شتە پرسیار لێکراوەکە لەخۆیدا چۆنە هەروا وەصفی بکەین ، بڵێین ئەو مەمکە سپییە زیوینە کامەیە کە تازە و تەڕ هەڵیداوە و دەرکەوتووە ! ئەو هەنارە تازە دەرکەوتووە کامەیە کە هێشتا گوڵەکەی نەوەریوە و بە قەراخیەوە ماوە ، دەرز و قڵیشی لێنەبوە وەك هەنارێ کە بارانی پایز لێیدا و ، ئەڵێی شەمامەی زێڕە ، تەنها بۆ تاقی کردنەوە و هەستکردن بە شیرینیەکەی ئەختێکی ئەوەندەی کونی دەرزیەك شەقی بردووە !

بە گوێرەی ئەم مەعنایە ، لەوەی کە نالی وای گوایە شتە پرسیار لێکراوەکە ، وەك خۆی چۆنە وای وەصف ئەکا ، تەنها بۆ زیادەڕەوی بۆ . ئەگینا ئەم جۆرە وەصفکردنەش هەر شوبهاندن بۆ .

ئەشتوانرێ مەعنای نیوەی یەکەمی بەیتی یەکەمی ئەم سێ بەیتە وا لێبدەینەوە بڵێین با وەك مەستوورە خۆی چۆنە وا وەصفی ئەو شتە پرسیار لێکراوە بکەین و ئەو شتە بەوشتانە بشوبهێنین کە لە مەستوورە خۆیدا دیارن ..

تا (چر) و (ت) و (عز) و (او) و (من) و (خب) و (کش) : وا . هەڵەیە . لەپێشانا (دا) بووە . (اح) : دا . قڵەشا (گم) : قەڵەشا . (من) : قڵیشا .

(٣٠) مەئەلا : بۆنمونە . خەفێ : نادیار ، نهێنی . عەنقا : باڵدارێکی ئەفسانەییە دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە .

والە : یاخود ئەمە چییە نە وەك ئەو شتانەیە پێشان شوبهاندمان پێیان و ، نە وەك ئەو شتانەیە پاشان شوبهاندمان پێیان .. شتێکی بەناوبانگە ، کەچی لە بەرچاویش نییە وەك پەلەوەری عەنقا و وەك ڕەفا و پیاوەتی لەبەرچاوبوونی دۆستان کە خەڵك باسیان ئەکەن و لە زبانیشمانا ژیمان تێیان ناکەوێ .

صاحێب زەڕ و زیوێ کە فریبی عوقەلا بێ
ئیکسیری طەلای ئەحمەری چەند قەطرە لە لا بێ (٣١)

دەعوای ئومەرا چەندە لەسەر تەختی کرابێ
چەند خوێن کە ڕژابێت و چ خوێنی نەڕژابێ (٣٢)

---

مەئەلا (ك) و (مز) و (لو) و (عب) و (من) و (کش) : مەئەلی . میثلی (ت) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : میثل . دیارە ئەمیش هەر (میثلی)یە .

(٣١) فریب : هەڵخەڵەتاندن . ئیکسیر : مایەیەکی کیمیاییە ئەڵێن مس ئەکا بە زێڕ . طەلای ئەحمەر : زێڕی سوور .

واتە : یاخود ئەمە چییە کە خاوەنی زەڕ و زیوێکە تەنانەت پیاوی زیرەك و تێکەیشتوویشی پێ هەڵئەخلەتێ و ، چەند دڵۆپێك لەو شتەی لایە کە لای خەڵك ئەوەندەی ئەو ئیکسیرە ، گرانبەهایە ، کە زێڕی سووری پێ دروست ئەبێ . مەبەست لە خوێنی کچێنییە کە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا زۆر بەبایەخە و بە نیشانەی سەربەرزیی کچ ئەدرێتە قەڵەم .
زیوێ کە فریبی (چر) و (ك) و (لو) و (عب) : زیوێ کە فریب . ئەمیش هەر (فریبی)یە . (ت) و (اح) و (خا) : زیو بێت و فریب . ئەمیش هەر (فریبی)یە . (کش) : زیوی فریب . بەپێی ئەم نوسخەیە ئەبێ (صاحێب) بە (صاحێبی) و (فریب)یش بە (فریبی) بخوێنرێتەوە .
ئەم بەیتەوە تا دوایی لە (خب)دا نییە .

(٣٢) دەعوا : کێشە و هەرا . ئومەرا : جەمعی ئەمیرە واتە پادشاە .

واتە : یاخود ئەمە چییە ئەوەندە نایاب و بەنرخە پادشاهان چەند شەڕیان لەسەر تەختەکەی کردووە و هەرکامیان ویستوویە خۆی لەسەر تەختی دانیشێ و ، چەند خوێن لە شەڕا لەسەر ئەو ڕژاوە و ، ئەو خۆی کەس نەیتوانیوە دەستی بۆ بەرێ و خوێنی بڕێژێ . مەبەست لە (تەخت) لاشەی مەستوورە و ، مەبەست لە (خوێن ڕژاندنی) لاقە کردنیەتی . .

ئەشکونجێ مەعنای نیوە بەیتی دوەهەم ئەوەبێ مەستوورە چەند جار خوێنی عادەتی مانگانەی لێ ڕژابێ ، بەڵام خوێنی کچێنیی هێشتا لێ نەڕژابێ .

ئومەرا (خا) : ئومەرای . چەندە (چر) : چەند . بۆ (چەندە) و (چەندی)یش ئەگونجێ . (مم) : چەندی . خوێن کە ڕژابێت و (مم) : خوێن ڕژابێت و . (گم) : خوێنێ ڕژابێت . ئەمیش هەر لەگەڵ ( و )ی عەطفدا ئەبێ .

کێ بێ لە جیهاندا چ گەدا بێت و چ شا بێ
ئەرکێکی وەها ناسك و پڕ لەذەتی .... !! (٣٣)

★ ★ ★

دێوانە کە زانێ کە دەبێ عوقدەگوشا بێ
هەستاوو گوتی : ئەشکی ڕەوانم بە فیدا بێ ! (٣٤)

---

(٣٣) ئەرك ، ئەرەك : کچی نەکراوە . ئەشکونجێ (لورك) بێ کە کینایەیە لە نازدار و دلدار .

لەپاش ئەو هەموو پرسیار و ناوونیشان هەلدانە کە (نالی) بە زوبانی (مەستوورە)وە گێڕایەوە ، ئەم بەیتە ئەبێ بە پوختەی پرسیارەکە و ، بەیتەکانی پاشەوەش وەلامی پرسیارەکەن .

ئەرکێکی : ئەمە لێکسنی (اح) و ( « بەراوێزی » خا ) یە . (چر) و (ك) و (لو) و (عب) و (من) و (کش) : سیڕڕێکی . یا بەمەعنای (نهێنییەکی) یا (سوڕڕەیەکی)یە ، واتە : ناوکێکی ، کە کینایە بێ لە خوار ناوك ! . (عم) و (گم) : سمتێکی . (ت) و (خا) : طورفەیکی . طورفە بە شتێ ئەلێن ئەوەندە نایاب بێ کەس وێنەی نەدیبێ . نازك (عم) و (گم) : ناسك .

لەگەل ئەوەش کە هەموو نوسخەکانی بەردەستمان ، (خب) نەبێ ، ئەم بەیتەیان تیایە و لەبەرئەوە مەیدانی دانی ئەپال کەسێکی‌تر لە نالی بەولاوە ، ئێجگار تەسك ئەبێتەوە لەڕۆی ڕەخنەگردا ، ئێمە هێشتا هەر بەلای ئەوەدا ئەچین کە هیی نالی نەبێ و شاعیرێکی‌تر لەلاوە هالبێ و دایناب و خستبێتیە جوار جێوەی پارچە شیعرەکەوە و لەگەل بەیتەکانی‌کەی لێ‌هەلکێش کردبێ . بەلگەی ئەم بۆچوونەشمان ئەمەیە :

١ ــ پرسیارەکە تێکڕا پڕە لە تەعبیری ناسکی ئەدەبی و مەجاز و کینایە و شوبهاندنی ڕەوانبێژانە و ، بەزەحمەت لەگەل ئەم زەقی و بێ‌پەردەییەدا ئەگونجێ کە لەم بەیتەدا هەیە .

٢ ــ پارچە شیعرەکە لە دوو بەش پێکهاتووە ، بەشێکی پرسیار و بەشێکی وەلام . ئەگەر بشلێین بەیتەکە هیی نالییە ، لەبوو لە داوێنی وەلامەکەوە و بە دارشتنێکی‌تر دایناییە ، نەك لێرەدا کە بەجارێ سیحری پرسیارەکە هەمووی بەتال ئەکاتەوە و هیچی تیا ناهێلێ .

(٣٤) دێوانە : شێت . دەروێش . کینایەیە لە (هینەکەی) نالی . عوقدەگوشا :

**ئەم صاحێبی تەشریحە دەبێ هەیئەتی چا بێ**
**هەم شاریح و هەم جاریح و مۆضێحەگوشا بێ (٣٥)**

گرێکەرەوە . کینایەیە لە وەڵامدانەوەی مەستورە و جێبەجێکردنی داواکەی . ئەشکی ڕەوان : فرمێسك . کینایەیە لە (ناو) .

واتە : کە مەستورە لە پرسیارەکەی بووەوە و (دیوانەکەم) تێگەیشت کەوا (کردنەوەی لەم گرێیە)ی خراوەتە ئەستۆ ، ڕاست بووەوە وتی : یاخوا (فرمێسکی ڕەوان)م بەقوربانت بێ ! .. تاد . پاشماوەی قسەکانی لە بەیتەکانی پاشەوەدا باسکراوە ..

لە (چر) و (ك) و (خا)دا لەسەر ئەم بەشەی ئەم پارچە شیعرە نوسراوە : «جواب» واتە : وەڵام . (مم)یش نوسیویە : «وله في الجواب» واتە : هی نالییە لە وەڵامدانەوەدا . (گم)یش نوسیویە : «ئەوەی خوارەوەشی جارێکیدیکە لە وەڵامیدا داناوە» . (ت)یش بەیتی پێشوی ، وەك درابەیتی هەمو پارچە شیعرێك ، بە خەتی سور نوسیوە کە واتە ئەمە قەسیدەیەکیترە . (لو)یش نوسیویە :«حضرت نالی خودش از زبان مستوره در جواب این قصیدەرا باز گفته». واتە:جەنابی نالی خۆی ئەم قەسیدەشی لە وەڵامدا بە زوبانی مەستورەوە وتووە . بەڵام وانییە چونکە وەڵامەکە بە ناوی نالی خۆیەوەیە نەك بە زوبانی مەستورەوە . (عب)یش نوسیویە : « جواب خودرا از زبان مستوره چنین دادە » واتە : (نالی) وەڵامی خۆی بە زوبانی مەستورەوە داوەتەوە . ئەمەش هەر هەڵەیە . (اح)یش هیچ نیشانەیەکی جیاکردنەوەی لەنێوان ئەم دو بەشەی پارچە شیعرەکەدا دانەناوە .

گولی : ئەمە تێکستی (مم) و (ك) و (عن) و (لو) و (عب) و (من) و (کش)ە. نوسخەکانیتر هەمو : ولی .

(٣٥) صاحێبی تەشریح : خاوەنی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و یەکالاکردنەوە . هەیئەت : دیمەن . چا : چاك . شاریح : لێکدەرەوە و یەکالاکەرەوە . جاریح : ڕەخنەگر و برینداركەر . مۆضێحە گوشا : ڕۆنکەرەوەی لێکدانەوە . برینێك بکاتە سەر ئێسك .

واتە : ولی پرسیارەکەت پرسیارێکی قورس و گرانە و بە هەمو کەس لێکنادرێتەوە ، کەسێکی جوان و شۆخ و لێهاتوی لەوێ ، شت باش لێکبداتەوە و پێیبکرێ یەکالای بکاتەوە و ، ڕەخنەگر بێ و بتوانێ زام بکا و ، ڕۆنکردنەوەکانی لێکبداتەوە و برین بکەیەنێتە سەر ئێسك ..

بێجگە ئەم دو مەعنایەش کە بۆ هەرکام لە وشەکانمان باسکرد و ،

بۆ توند و ڕەقی مەتنی حوکەما بێ
تەدقیقی ئەمیش سیڕزە دەبێ خوفیه ئەدا بێ (٣٦)

یەکێکیان بەدیمەن مەعنای مەلایانە بۆ و ئەویان ناخی مەبەستەکەی مەستوورەی ئەپێکا ، ئەم بەیتە گەلێ ئیشارەتی لەریشی تیایە . بۆنموونە (لەشریح) ئیشارەتە بۆ کتێبی (التشریح الافلاك) کە کتێبێکی مەلایانەیە لە زانستی ئاسمان شوناسیدا ، (بهاءالدین العاملی) دایناوە . (هەیئەت ـ الهیئة)یش زانستی ئاسمانشوناسیی کۆنە . زاراوەی (هەیئەتی چاك) لە حوجرەی فەقێیدا بە کتێبی زۆر چاکی زانستی هەیئەت ئەڵێن . (شاریح)یش بەوکەسە ئەڵێن لەسەر (مەتن)ی کتێب ئەنووسێ . ئەوەش بزانین کە (مەتن) خۆیشی بە عەرەبی واتە (پشت) .. (جاریح)یش کەسێکە لە گفتوگۆی زانستیدا قسەی بەرابەرەکەی لەکەدار بکا . ( موضیحە )یش زاراوەیەکی شەرعە لە باسی (قیصاص)دا ، بە زامێك ئەڵێن ئێسکی زامارەکەی دەرخستبێ .. سەرەڕای ئەوە کە لە کتێبی حوجرەدا لە چوارچێوەی هەندێ بابەتدا ، لەسەر هەندێ وردە بابەت ئەنووسرا (موضحة) یا (مسئلة) یا (مهمة) یا شتیتری‌وا . کەواتە لە کۆکردنەوەی ئەم وشانەدا تەناسوب هەیە و لە هەرکامێکیشیاندا ، بەشی‌بەحاڵی خۆی ، تەوریە هەیە . لەنێوان (شاریح) و (جاریح)یشدا جیناسی لاحیق هەیە .

لەوانەیە ئەم بەیتە ئیشارەتێکیشی بۆئەوە تیابێ کە نالی لە سەردەمی لاوێتیدا کوڕێکی شۆخ و قۆز و بزمێن بووبێ ، چونکە لەلایەکەوە ئەڵێ جێ‌بەجێ کردنی داواکەی مەستوورە کەسێکی‌وای ئەوێ و ، لە سەرێکیکەشەوە عەقڵ نایگرێ دەست بەو خێری خواوە بنێ بۆ کەسێکیتر .

(٣٦) مەتن : کتێبی خوێندنی مەلایانە کە بەتەنها خۆی ڕاست نەکرێتەوە و پێویستی بە لێکدانەوە و لەسەر نووسین بێ . پشت . مەتین : پتەو و توند . حوکەما : جەمعی حەکیمە واتە فەیلەسوف و زۆرزان . تەدقیق : وردەکاری . خوفیە : نهێنی . ئەدا : بەجێ‌هێنان .

واتە : ئەوەی ، یا ئەوشتەی ، ئەم پرسیارە لێك‌ئەداتەوە یا ئەم شتە بەکالا ئەکاتەوە ، ئەبێ لەبارەی توندی و ڕەقییەوە وەك تێکستی ئەو کتێبانە بێ کە فەیلەسوفەکان نووسیویانە ، یا وەك پشتی ئەوان قایم و پتەو بێ . دیارە وردکردنەوە و لێکدانەوەی ئەمەش بە هەموکەس ناوترێ و ئەبێ بە دزییەوە بکرێ ، یاخود ئەم (لێکدانەوەیە) کارێکە ئەبێ بە نهێنی و لە شوێنی تایبەتیدا جێ‌بەجێ بکرێ .

نەرم و خۆش و موتنیج وەکو بەسطی ئودەبا بێ
طوولانیو بەرجەستە وەکو دەستی دوعا بێ (٣٧)

شەو نائیم و قائیم ، عەلەمی بابی ڕەضا بێ
بێ‌دیدە هەڵستێ بە مەثەل عەینی عەصا بێ (٣٨)

---

لەنێوان (مەتن) و (حوکەما) و (تەدقیق)دا تەناسوب و ، لە (مەتن) و (تەدقیق)دا تەورییە هەیە . لە هێنانی وشەی (مەتن) و دانەپاڵی (توندی) و (ڕەقی)یشدا بۆلای ، ئیشارت بۆ ئەو پەیوەندە کراوە کە لەنێوان (پشت) و (ڕووی پیاو)دا هەیە . لە (نهێنییەتیی لێکدانەوەی مەتن)یشدا ئیشارەت بەوە کراوە کە جاران ئەوانەی بابەتێکی بایەخداریان نەزانی ، بە هەموو کەسیان نەئەوت و لە چوارچێوەیەکی تەسکدا نەبوایە کەسیان ئیتر نەئەکرد .

(٣٧) موتنیج : بەرهەمدار . بەسط : پەخشان . طوولانی : درێژەدار . بەرجەستە : دیار و دەرکەوتوو .

نالی لەم بەیتەدا ڕوویەکی‌تری بەکاڵا کەرەوەی پرسیارەکەی مەستوورە لێک‌ئەداتەوە ، چونکە دیارە هەمیشە لە حاڵەتێکدا نییە و باری جیاجیای زۆرە .. لێرەدا ئەڵێ : نەرم بێ ، خۆش بەدەستەوە بێ ، بەرهەمدار بێ ، وەک پەخشانێکی ڕەوان بێ کە ئەدیب نووسیبێتی .. درێژ بێ ، دیار و هەستاوە بێ وەکو دەستی کەسێک کە بۆ لەخواپاڕانەوە دەستی درێژ کردبێ ..

وشەی (موتنیج) زاراوەیەکی عیلمی مەنطیق و ، وشەی (بەسط)یش لە زاراوەکانی بەلاغەیە .

(٣٨) نائیم : نووستوو . قائیم : بێدار . هەستاو . عەلەم : ئاڵا . بابی ڕەضا : دەرگای ڕەزامەندیی و قەناعەت بەوەی خوا داویە . عەینی عەصا : هەروەک عاسا ، کینایەیە لە کوێریی و بێ‌چاویی .

واتە : لەوەی ئەم گرێ‌کوێرەیە ئەکاتەوە و چاری ئەم مەسەلەیە ئەکا لەبێ بەدەم خەویشەوە بێدار بێ و هەستابێ و ، لە دەرگای قەناعەت و ڕەزامەندیدا بە هەرچی خوا دای ، وەک ئاڵایێ قنج ڕاوەستابێ و ، کوێرانە هەستێ هەروەک عاسا ، شەلم کوێرم ناپارێزم ، ڕێ بداتەبەر ..

خۆ ئەگەر مەبەست لە (بابی ڕەضا) کەیخوسرەو خانی ناکام بێ کە پاشان مەستوورەی مارەکردووە و ، کوڕێکیشی بووە ناوی (ڕەضا قولی

مەجذوبی طورروق ، مورتەعیشی لەرزش و تا بێ
ساڵیك ڕەوشی مەسلەكی ڕێگەی صولەحا بێ (٣٩)

---

خان) بووە ، ئەوە ئەبێ مەعنای بەیتەكە وا لێبدەینەوە كە ئیشارەتە بۆئەوە (هینەكەی) نالی وەك ناڵێی قنج لە دەرگای ماڵی باوكی ڕەضا قولی خانـا وەسـتابێ بۆئەوەی نەهێڵێ باوكی ڕەضا قـولی خان ، واتە كەیخوسرەو خان ، دەرچێ خۆی بگەیەنێ بە مەسـتورە و ماڵەوەی‌كا یا ئەگەر مارەی كردبێ بیگوێزێتەوە . بۆیە مەعنای بەیتەكە بەمجۆرە لێك‌ئەدەینەوە چونكە تێكڕای پارچە شـیعرەكە وائەگەیەنێ كە كاتێ نالی ئەم «خەوە»ی دیوە ، مەستورە كچ بووە ، كە كچیش بۆ ئیتـر چێ ئەكا لە ماڵی باوكی ڕەضا قولی خانـدا ؟ .

ڕێیشـی تێئەچێ مەبەسـتی نالی لە ( بابی ڕەضـا ) دەرگای مەشـهەدی ئیمام ڕەضا بێ و بەیتەكە ئیشارەت بێ بە شیعەیەتیی میرە ئەردەڵانییەكانی سـنە . كەسـیش بـۆی نییە بڵێ نالی لەشبیهی وا چـۆن ئەكا ! لەوێ (هینەكەی) بشوبهێنێ بە دەستی بۆ لەخواپاڕانەوە درێژكراو ، بۆ ئەبێ نەیشوبهێنێ بە عەلەمی قنج‌كراوەی دەرگای مەرقەدی ئیمامێك ..

لەنێوان (نائیـم) و (قائیم)دا جگە لە طیباقی بەدیعـەن ، جیناسی لاحیقیش هەیە . ئیقتیباسـیشـە لە حالەتی خواپەرسـتان كە پێیان‌ئەڵێن (قائم باللیل) . لە كۆكردنەوەی (بێدیدە) و (عەینی عەصا)یشدا تەناسوب هەیە چونكە عاسا هیی كوێرانە .

نائیم و (چر) : نائیم . دیارە ئەبێ لەگەڵ ( و )ی عەطفدا بێ . ڕەضا (عز) و (كش) : ڕەجا . بێدیدە هەڵسێ (ت) و (خا) : بێ دیدەیی هەستێ .

(٣٩) مەجذوبە : ژنی جەذبە لێهاتوو . جەذبە حالەتێكە لەو حالەتانەی بەسـەر پەیڕەوانی تەریقەتی نەقشـبەندیدا دێن . طورروق : جەمعی (طەریقە)یە كە تەریقەتی ئەهلی تەصەووفە ، یا جەمعی (طەریق)ە بەمەعنا ڕێگاوبـان . مورتەعیش : موچوڕكە پیاهاتوو . لەرزش : لەرز . سـالیك : ئەهلـی سولوك بەگوێرەی ڕێ و شوێنی ئەهلی تەصەووف . ڕێ‌گرتووەبەر . ڕەوش : ڕەوشت . مەسلەك : ڕێگا . صولەحا : جەمعی صالیحە .

نالی لەم بەیتـە و بەیتی پاشەوەدا پێشوبهێنراوەكانی لـە جیهانی تەصەووف وەرئەگرێ و ئەڵێ : ئەو شـتە وەك صۆفیی جەذبە لێهاتوو یا وەك شێتی ناوكـۆڵان و ڕێگاوبان و ، وەك لەرزوتـادار لەخۆشـیانا موچوڕكەی بەلەشدا بێ و ، ئەو ڕێگایەی گرتبێتەبەر كە چاكانی خوا هەموو گرتوویانەتەبەر . مەبەستی لەوەیە چاكانی خوا هەموو ئەو شتەیان كردووە

فەرقێکی هەبێ : داخلی میحرابی ڕەجا بێ
چاوێکی هەبێ : غەرقەیی فرمێسکی بوکا بێ (٤٠)

ڕێی حورمەت و بێحورمەتیی هەرگیز نەکوتایێ
چەند ئاوی ڕژاییت و ، چ ئاوی نەڕژایێ (٤١)

---

کە لەو نەیەوێ بیکا . .

لەرزش و : ئەمە تێکستی تەنها (اح)ە . نوسخەکانی تر هەمو : لەرزەوو . ئێمە ، لەبەر هاوسەنگێ لەگەڵ (مورتەعیش) و (ڕەوش) ئەمان لا پەسەندتر بو . مەسلەکی : ئەمە تێکستی (عم) و (گم) و (عز) و (لو) و (کش)ە . نوسخەکانی تر هەمو : مەسلەك . دیارە لەوانیشدا هەر مەبەست (مەسلەکی)یە .

(٤٠) فەرق : تەوقەسەر . غەرقە : غەرق ، نوقم . بوکا : بوکاء ، گریان .

واتە : ئەو شتە تەپلە سەرێکی هەبێ لە (میحراب)ی ئاواتا نایێتبە (زەوێ) و ، (چاو)ێکی هەبێ ، تەنها چاوێك ، هەمیشە لە (فرمێسك)ی گریاندا نوقم بێ . .

لە وشەی (میحرابی ڕەجا) و (فرمێسکیبوکا)دا تەوریە هەیە . هەروەك چۆن ( فەرقە )ش ئیشارەتێکی بۆ ( خەرقە )ی ئەهلی تەصەووف تیایە ، واتە وەك چۆن ئەوان خەرقە لەدەن بەکۆڵیانا ، ئەمیش ( فرمێسکەکەی ) ئەکا بە خەرقە بۆ خۆی . .

غەرقەیی (لو) : غەرقە . ئەبێ ئەمیش (غەرقەیی) بێ ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ .

نیوەکانی ئەم بەیتە لە نوسخەکانی (عم) و (گم) و (ت) و (اح) و (من) و (خا)دا بەرودوان .

(٤١) حورمەت : حەرامێ .

واتە : ئەو شتە هەرگیز ڕێگای حەرام و بێحورمەتیی نەکوتایێتەوە و ، چەند ئاوی ڕشتبێ ، بەڵام بە جۆرێکیوای نەڕشتبێ ئابڕۆی پێ بچێ .

ئەشکونجێ ڕستەی ( ڕێی حورمەت و ) بە ڕستەیەکی سەربەخۆ دانێین و مەعنای وا لێبدەینەوە : ڕێگای ، ڕێگای حورمەت بێ و ، بە ڕێگای بێحورمەتیدا نەڕۆیشتبێ .

حورمەت و (چر) و (ك) و (عب) و (کش) : حورمەت . بۆ (حورمەت و) و (حورمەتی)یش دەستلەدا . (ت) و (عز) و (لو) و (من) : حورمەتی .

لەم ڕێگە سەریشی کە بچێ ، یەعنی کوژاێ
گەردن‌کەچێ بەرپێتە ، قەدەم ڕەنجەکە ، سا بێ (٤٢)

تا گەرمڕەوی ڕێگەیی ظولماتی بەقا بێ
( ماء الخضر )ت قەطرە لەسەر قەطرە فیدا بێ (٤٣)

---

چەند ئـاوی (چـر) و (مـب) : چـەن ڕۆی . (مـز) : چـەند ئـاو .
(«پەراوێزی» خا) : چەند ئاو کە .

(٤٢) قەدەم ڕەنجەکە : ئازاری پێت بدە . کینایەیە لە داوای هاتن لە کەسێکی خاوەن پایە و ڕێ و شوێن .

واتە : دەسا فەرمو ، ڕەحمەت نەبێ تەشریف بێنە ، ئەگەر لەم‌پێناوەدا هینەکەم سەریشی لیا بچێ و بدرێ بەکوشت، هەر گەردن‌کەچی بەرپێتە و ئامادەیە بۆ جێ‌بەجێ کردنی داواکەت و کردنەوەی گرێ‌کوێرەکەت .

نالی بۆیە ( سەرلیاچوون )ی بە (کوژران) مەعنـا لێداوەتەوە ، تا لەوە حالی ببین کـە مەعنای (سـەر پیاچـوون)یش ئەگەیـەنێ .. هەروەهـا ( گەردن‌کەچی بەرپێتە )یش بێ‌بەش نییە لە ئیشـارەتێکی ناسك ...

بەرپێتە (ت) و (اح) و («پەراوێزی» خا) : سەر پێتە .

(٤٣) گەرمڕەو : ئەوەی تونـد و تیـژ ڕێ ببڕێ . کەسـێ زۆر پەلـەی بێ بە مەبەستی خۆی بگا . ظولماتی بەقا : ئەو تاریکاییەی سەرچاوەی ژیان و مانەوەی بەرەی ئادەمیزادە . منداڵدانی ئافرەت . مـاء الخضر : ئاوی خضر ، ئەو ئاوەی حـەزرەتی خضر پێغەمبەر لێی خواردووەتەوە و بۆیە نامرێ .. لێرەدا مەبەست لە ( ئاوی مەلا خدری نالی ) خۆیەتی . قەطرە : دڵۆپ .

ئەم بەیتە پەیوەندی بە بەیتی پێشوورەوەیە و مەعنای لەو تەواو ئەکا . واتە : ئەو (شتە) گەردن‌کەچی بەرپێتە و سەریشی لیا بچێ هەر ناگەڕێتە دواوە ، دەسا فەرمو وەرە ، تا بە تیژێ و بە پەلە ڕێگای ئەو تاریکستانییە بگرێتەبەر کە سەرچاوەی ژیانە و ئاوی ژیانی تیایە ، یاخوا دڵۆپ دڵۆپ ئاوی زیندەگانیت ، یا (ئاوی مەلاخدرت) تا دوا دڵۆپ بەقوربان بێ و دوا چۆڕی بۆ تۆ بڕژێتەوە !

گەرمڕەوی (چر) : گەرمڕەو . ئەمیش هەر ( گەرمڕەوی )یە . (گم) : گەرمڕەویی . (ت) و (کش) : گرمڕوی . ئەمیش هـەر (گەرمڕەوی)یە . ڕێگەیی : ئەمە تێکستی (ت) و (خا)یە. نوسخەکانی‌تر هەمو: (قەطرەیی) .

کێ بێ وەکو تۆ بەم شەوە ڕەحمی بە منا بێ !
مەجلوبە صیفەت ، یەعنی صیلەی ڕەحمی تێدابێ ! (٤٤)

هەم جاذیبەوو قابیلەیی ئەخذ و عەطا بێ !
مەستورەوو مەخفێ ، شەبەهی بادی صەبا بێ ! (٤٥)

مەستانە هەڵستێت و بە کوڕیی ڕوقەبا بێ
ئەم بابزەنە گەرم و تەڕی کا بە کەبابێ (٤٦)

★ ★ ★

---

بەمپێیە مەعنای بەیتەکە وای لێ دێتەوە : تا تیژ ڕۆیشتنی ئەو دڵۆپە ئاوە هەبێ کە ڕێگای تاریکستانی سەرچاوەی ژیانی گرتووەتەبەر ، ئاوی زیندەگانێ یا ( ئاوی مەلاخدر خۆی )ت ، دڵۆپ دڵۆپ بەقوربان بێ .

(٤٤) صیلەی ڕەحم : بەسەر کردنەوەی خزم و کەس وکار .

مەعنای ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك لەدەینەوە .

مەجلوبە صیفەت (اح) و ( «پەراوێزی» خا ) : مەجلوبی صەفێ یان صەلێ . (خا) : مەجلوبی صیفەت . دیارە ( مەجلوبێ صیفەت)ە بە (ی)ای مەصدەریەت . («پەراوێزی» خا) : مەجلوب صیفەت . دیارە ئەمیش ( مەجلوبە صیفەت)ە . صیلەی (چر) و (ك) و (مز) و (او) و (عب) و (من) و (کش) : صەلای ( ؟ ) . (خا) : صیلە . دیارە ئەبێ (صیلەی) بێ . تێدا (ت) و (او) و (عب) و (من) : تیا .

(٤٥) جاذیبە : ڕاکێش . قابیلە : وەرگر . ڕەزامەند . ئەخذ : وەرگرتن . عەطا : دان .

جاذیبەوو قابیلەیی: ئەمە تێکستی (مز) و (خا) و (کش)ە. نوسخەکانی تر هەموو : جاذیبەیی قابیلەیی . مەستورەوو (ت) : مەستورەیی .

(٤٦) ڕوقەبا : جەمعی ڕەقیبە واتە بەدکار . بابزەن : شیشی کەباب .

ئەم سێ بەیتەش هەروا مەعنای دوو بەیتەکەی پێشوو تەواو ئەکەن . واتە : کێ بێ ، وەك تۆ ، بەم تاریکە شەوە بەزەیی بە مندا بێتەوە و وەك ڕنە صۆفێ کە شێخ جەذبەی لێ هێنابێ و ڕایکێشابێ بۆلای خۆی ، بێ بەلامەوە و ، صیلەی ڕەحمی لەبەر چاو بێ و ، هەم هێزی ڕاکێشانی منی بێ بۆلای خۆی و هەم ئەیشم لێ وەربگرێ و بۆ ( وەرگرتن و دان )

. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .

---

دەس‌یدا و کەلکی ناڵوکۆڕی پێوەبێ ، شارراوە و نهێنیش بێ وەك سروەی بای سبەینان .. بەکوێرایی چاوی ناحەز و بەدکار ، بێ‌ترس و بێ‌پەروا وەك سەرخۆش هەڵسێ پێت بەدەممەوە ، تا (شیش)ەکەی منیش ( کەباب )ێکی بدالێ و بەو کەبابە گەرم و تەڕی کاتەوە ... بەپێی ئەم مەعنایە ( شیش )یش و (کەباب)یش هەر بەڵە شتێ و ( شتەکە ) جارێکیان لە ڕوویەکەوە کراوە بە ( شیش ) و جارێکی‌کە لە ڕوویەکی‌ترەوە کراوە بە ( کەباب ) .

لە وشەی ( ڕەحم )دا ئیشارەت کراوە بە ( ڕەحەم )ی ئافرەت و لە وشەی ( مەستوورە )شدا تەورییە هەیە .

ئەم مەعنایە کە ئێمە لێماندایەوە لەسەر تێکستی زۆربەی نوسخەکانە . ئێمە لامانوایە ئەگەر لە نوسخەی (مم) کە لەجیاتیی (گەرم و تەڕی) نوسیویە (گرم بری) و ئەتوانرێ بە (گەرمە بە ڕێ) بخوێنرێتەوە ـ ئەم ڕستەیە وەربگرین و ، لە نوسخەکانی‌تریش ( کا بە کەبابێ ) کە بێنین و نیو بەیت بەمجۆرە پێکەوە بنێین :

ئەم بابەزنە گەرمە ( یا : گەڕمە ) بە ڕێ کا بە کەبابێ

مەعنایەکی جوانترمان دێتە دەست کە لەگەڵ مەعنای بەیتەکانی پێشەوەش باشتر ئەگونجێ ، چونکە مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێ‌دێتەوە : ئەم ( شیش )ە گەرمە یا گەڕەی من بە بێ‌بەخشینی ( کەبابێ ) بە ڕێ بکا . بەپێی ئەم مەعنایە ، مەعنای (شیش) و (کەباب) یەکێ نابێ و جیا ئەبن لەیەك و (شیش) لای (نالی) و (کەباب) لای (مەستوورە) ئەبێ . هەروا بەپێی ئەم‌مەعنایە ئەشتوانین ( بابەزەن ) لەجیاتیی ( شیش ) بە ( دەرگا کوتەوە ) مەعنا لێ‌بدەینەوە ، واتە : ( کەبابێ ) بدا بەم (هێنە)ی من کە دەرگاکەی ئەکوتێتەوە .

بە کوێریی ڕوقەیا بێ (ت) و (عز) و (لو) و (عب) و (اح) و (من) و (کش): کوێریی ڕەقیبان. گەرم و تەڕی کا بە کەبابێ (چر) : کرم تری کانی کبابی. (گم) : گەرم بەربی کوانی کەبابێ . (خا) : کرم تڕی کانی کبابی . مەعنای هیچ‌کام لەم نوسخانە دیار نییە . (کش) : کرم.. تاد. دیارە یا (گەرم و)وە یا ( گەرمە )یە .

لە (مم) و (گم)دا نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو نییە و لە نیوەی دووەمی هەردوکیان بەیتێك پێکهاتووە .

« نالی » ا وەرە هەزلێکی کە عاری شوعەرا بێ
زۆزمش مەکە پێی صەفحەیی هەر لەوح و کیتابێ (٤٧)

تەحریری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێتە حیسابێ ،
دەروێش و گەدا شاە و ، دەبێ شاە گەدا بێ (٤٨)

---

(٤٧) هەزل : گاڵتەوگەپ . عار : نەنگ و شوورەیێ . صەفحە : ڕوو ، لاپەڕە .

نالی باش‌ئەوەی ڕۆداوی خەوەکەی و گفتوگۆی نێوان خۆی و مەستوورەی هەمو گێڕایەوە و لێبووەوە ، بە عادەتی شاعیران چاوێکی زەخنە ئامێز بە خۆیا ئەگێڕێتەوە و ، ئەوەتە لەم سێ بەیتەی دوا بەشی پارچە شیعرەکەیدا داوا لە خۆی ئەکا واز لەم جۆرە قسە بێ‌جێیانە بێنێ و ، بە خۆی ئەڵێ بنیادەم بە خەو و خەیاڵ نابێ بە هیچ و ، چاتریش لەوەیە لەجیاتیی قسەی هیچ و پووچ شتێ بڵێ و بنووسێ کە بۆ دواڕۆژی پاش مردنی چاك بێ .

واتە : نالی ! ڕووی لاپەڕەی کتێب بەو گاڵتەوگەپ و قسەی هەڵەق مەڵەقانە ڕەش مەکەرەوە کە شاعیران شەرمیان لێ دێ . کتێب و دیوانی شیعر بە بابەتی‌وا بەدناو ئەبێ و ئابڕووی بێ ئەچێ . .

پێی (چر) و (عم) و (لا) و (لو) و (عب) و (من) و (خا) و (کش): پێ. هیچ (چر) و (خا) : هەر .

ئەم بەیتە لە (من)دا دوابەیتی ئەم پارچە شیعرەیە . وادیارە نازناوەکەی (نالی)بە هەڵەیدا بردووە .

(٤٨) تەحریر : نووسین .

واتە : ئەگەر بنیادەم حیسابی خەو و خەیاڵ بکا و بینووسێتەوە و بەتەمای بێ بێتەدی ، ئەبێ گەدا بێ بە پادشا و پادشاش بێ بە گەدا و هەمو شتێ ئاوەژۆ بێ ، کە ئەوەش هەرگیز نابێ .

تەحریری (عم) و (گم) : تەعبیری . خەیاڵ و (عم) و (گم) : خەیالی . (ت) و (اح) : خەیاڵ . بۆ (خەیاڵ و) و (خەیالی)یش ئەگونجێ . بێتە (لو) و (عب) و (اح) و (من) و (کش) : بێنە . دەروێش و (لو) و (هب) و (کش) : دەروێشی . بۆ (دەروێش و) (دەروێشی)یش ئەگونجێ . شاە و : نوسخەکانی بەردەستمان هەمو نووسیویانە (شاە) ، بەڵام دیارە ئەبێ بە ( و )ی عەطفەوە بێ .

وا چاکە خەیاڵ و خەوت ئەسراری هودا بێ
نەك بەحثی سورڕور و عەلەم و بادی هەوا بێ .. (٤٩)

— ٣ —

خۆشا ڕەندێ لە دنیا بێ موبالات و موجەڕڕەد بێ !
بە ڕۆژ زیندەی جەماعەت بێ ، بە شەو مات و موجەڕڕەد بێ ! (١)

---

ئەم بەیتە لە (مم) و (گم)دا دوابەیتی بەشی پرسیارەکەیە . لە (تو) و (کش)یشدا دوابەیتی بەشی وەڵامە ، واتە لەگەڵ بەیتی پاشەوە لەجێی یەکتردان . لە (من)یشدا لەگەڵ بەیتی پێشوو لەجێی یەکتردان .

(٤٩) ئەسراری هودا : ڕازی پەی بردن بە ڕاستێ و ڕێگە دۆزینەوە بۆ لای خودا . سورڕور : خۆشی . عەلەم : ئالایێ . باد : با . هەوا : ئارەزووبازێ .

واتە : واباشترە بیر لە دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست ، ڕێگای لای خوا بکەیتەوە ، نەك هەر خەریکی باسکردنی ڕابواردن و (ئالایی هەڵکراو ) و شەکانەوەی بە بای ئارەزووبازێ بێ .

خەیاڵ و خەوت (مم) و (گم) : خەیاڵت لەگەڵ . (ت) و (مب) و (اح) و (کش) : خەیاڵ خەوت . بۆ (خەیاڵ) و (خەیالی)یش دەستنەدا . (مز) و (من) : خەیالی خەوت . عەلەم و (مم) و (گم) : عەلەمی . (ت) و (اح) و (خا) : عەلەم . بۆ عەطفیش و ئیضافەش ئەگونجێ . بادی (چر) و (مب) و (اح) و (خا) و (کش) : باد . بۆ (بادو) و (بادی)یش دەستنەدا . ئەشکونجێ لە ئەسڵدا (یاری) بوبێ و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ . (گم) : بابی .

— ٣ —

(١) خۆشا : چەند خۆشە ، خۆزگەی پێ بێ ! ڕەند : ئەوەی خۆی بەهیچەوە نەبەستێتەوە . موجەڕڕەد : ڕووت .

واتە : خۆزگە بە حاڵی ئەوکەسەی خۆی بە دنیاوە نەبەستێتەوە و لە هەمو پەیوەندێکی دنیایێ ڕزگار بوبێ و ، هەرچی ئەکا لەپێناوی سودی گشتیدا بێ .. بە ڕۆژ سەربەدەرەوەبو و کاروبار هەڵسوڕێنی ناو خەڵك بێ و ، بە شەویش بۆ خۆی سەر کز و مات بکا و ، خۆی لەم جیهانە هەمو دوور بخاتەوە و لەگەڵ خوای خۆی خەریك بێ ..

لەنێوان (ڕۆژ) و (شەو) و ، (جەماعەت) و (موجەڕڕەد)دا طیباق هەیە .

به سورەت : جەلوەتێ ، غەرقی عەلایق هەروەکوو خەڵقێ
بە مەعنا : خەلوەتێ ، مەستی موناجات و موجەڕڕەد بێ ! (٢)

ئەگەر عالەم ببێتە خەلعەتی تەشریفی سەرتاپای ،
وجوودی بێ‌وجوودی بێ موباهات و موجەڕڕەد بێ ! (٣)

---

هەروەها طیباقێکی بەدیمەن لەنێوان (زیندە) و (مات)یشدا هەیە ، چونکە (مات) بەدیمەن وەك (مات)ی بەمەعنا (مرد) وایە .

خۆشا (چر) و (عب) و (من) : خۆشە . زیندەی (عم) : زیندوی . (ت) : زیندە .

(٢) سورەت : دیمەن . جەلوەتێ : نیسبەتە لە پاڵ جەلوە ، واتە نومایش و دەرکەوتن . عەلایق : پەیوەند . خەلوەتێ : گۆشەگیر . موناجات : پاڕانەوە لە خوا لەژێر لێوەوە .

واتە : خۆزگە بە حاڵی ئەوکەسەی بەدیمەن بەدەرەوە بوو و نوقمی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە وەك ئەم هەموو خەڵکە .. لەڕاستییشدا دوورەپەرێز و کەنارەگیر بێ و تەنانەت لە پاڕانەوەشدا لە خوا دەنگی هەڵنەبڕێ .

لە بەرابەری پێ‌کردنی (مەعنا) و (سورەت)دا طیباق و ، هەروەها لەنێوان (جەلوەتێ) و (خەلوەتێ)یشدا . سەرەڕای ئەوە کە ئەم دوانەی دوایی جیناسی لاحیقیشیان لەنێواندایە .

خەلوەتێ (عم): خەلوەتێ و. (اح) و (خا): خەلوەت . دیارە ئەمیش هەر (خەلوەتێ)یە . موناجات و (چن) : موناجات . دیارە ئەمیش (موناجات و)وە .

(٣) خەلعەت : خەڵات . وجوود : بوون . ذات . موباهات : شانازی و فیرکردن .

واتە : بەڕادەیەك دەستی لە دنیا داشۆردبێ ، ئەگەر ئەم دنیایەی هەموو بۆ بکەن بە خەڵاتێك و بیکەنە بەری سەرتاپای داپۆشێ ، ئەو هێشتا تۆسقاڵێك نەگۆڕێ و خۆی لێ بایی نەبێ و گوێی نەدات ، وەك هیچ ڕووی نەدابێ .

بێ موباهات و (ت) : بێ موبالات و . ئەم بەیتە لە (چن) و (ك) و (من)دا لەگەڵ بەیتی پاشەوەی لەجێی یەکتردان و ، لە (عب) و (اح) و (خا)یشدا نییە .

به ظاهیر طاوسی ڕەنگین ، صیفاتی ( تیهٌ علیٰ التاهیر )
بە باطین قومری‌یو خاکستەری ذات و موجەڕڕەد بێ ! (٤)

ئەگەر تەکیە ، ئەگەر شێخە ، هەمو داوی عەلایق بۆن
بلا « نالی » بچێ مەستی خەرابات و موجەڕڕەد بێ ! (٥)

---

(٤) خاکستەری : ڕەنگ وەك خۆڵەمێش . هەژار و بێئازار .

واتە : بەدیمـەن بنیادەمێك بێ وەك تاوسی هەزار ڕەنگ ، فیـز بکا بەسەر هەرکەسێکا کە فیز بەسەر خەڵکا بکا . لەڕاستیشا وەك کۆتری بەستەزمانی خۆڵەمێش ڕەنگ و ، مرۆیەکی هەژار و بێئازار بێ ، هیچ پەیوەندێکی بە دنیاوە نەبێ .

ئێمە مەعنای ڕستەی ( تیهٌ علی التاهی )مان وا لێداوەتەوە کە ( تیهٌ ) فیعلی ئەمری عەرەبییە لە ( تاهَ یَتیهُ ) واتە : فیزی کرد . بەمپێیە ئەبو ئیسمە فاعیلەکەی ( تائِهٌ ) بێ نەك ( تاهێ ) ، بەلام وای بۆچووین کە نالی لەخۆیەوە بۆ شوێنە گومکێ و هاوئاوازی لەگەڵ ( تیهٌ ) شوێنە گۆڕکێی بە (یێ) و (هێ)کە کردووە .

طاوسی (چر) و (چن) و (کم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : طاوس . ئەمیش هەر (طاوسی)یە . (گم) : تاوسی ! صیفاتی (چر) و (عب) : صیفاتە . قومری‌یو : ئەمە تێکستی (چن)ە . نوسخەکانیتر هەمو (قومری) کە بۆ (قومری‌یو) و (قومری‌بێ)یش دەستئەدا . ذات و (چر) و (عب) : ذات . ئەمیش هەر (ذات و)وە .

ئەم بەیتە جۆرە ئیشارەتێکی تیایە بۆ لایەنی ( اذِلّةٍ علی المؤمنینَ ، اعِزّةٍ علی الکافرینَ ) لە باسی موسولماناندا .

(٥) عەلایق : پەیوەند . خەرابات : کەلاوە کۆن و وێرانە .

واتە : نە تەکیە و نە شێخ هیچیان بۆنەوە ناشێن کەس خۆیان پێوە ببەستێتەوە ، چونکە هەمو هەر داون و خەڵك ئەبەستنەوە بە دنیاوە و نۆشی ئاشوبی دنیا پەرستییان ئەکەن . کەواتە با (نالی) سەری خۆی هەڵبگرێ و ڕۆبکاتە کاول و وێرانەکان و سەرخۆشی عەشقی یەزدانی بێ و ، دەست لە هەمو جۆرە پەیوەندێکی دنیایی داشۆرێ .

تەکیە (عم) و (عب) : تەکیە و . شێخە (عب) : شێخی . داوی (چر) و (چن) و (ك) و (اح) : داو . ئەمیش هەر (داوی)یە . (عب) و (من) : عەرلی . بلا (چن) : بلێ . بچێ (کم) و (گم) و (من) : بەچێ .

— ٤ —

له چاوی ( ڕۆدبار )م ( نوری ) دیتن وەقتە تاریّ بیّ
ئەمیش با ماجەرای هیجرانی ( نـوری ڕۆدباریّ ) بیّ (١)

— ٤ —

نالیّ ئەم پارچە شیعرەی بەبۆنەی بۆ حەج چوونی (نوریی ڕۆدباری)یەوە وتووە کە دیارە یەکێك بووە لە دۆستانی و ، وەك بە پارچـە شیعرەکەدا دەرئەکەویّ سەر بە تەریقەتی نەقشبەندیّ بووە .

لەبارەی ئەم (نوریی ڕۆدباری)یەوە ئێمە هەر ئەوەندە ئەزانـین لە دێی (ڕۆدبار = ڕووار) لە هەورامان بنەماڵەیەکی ئاینـیّ بووە ، یەکێك لـەو بنەماڵەیە ناوی (صبغة الله) بووە . مادەم نالییش باسی (نوریّ) ناوێکـی (ڕۆدباریّ) ئەکا و ناوی (صبغة الله) ناوێك و (ید الله) ناوێك ئەهێنیّ ، ئەبیّ ئەو ( صبغة اللەی ڕۆدبـاری )یە ئەمە بیّ کە لێرە ناوی هـاتووە و ئەبـیّ پەیوەندێکی بەم (نوری)یەوە هەبیّ و وادیارە باوکی بووە و ، بەنیشـانـەی وشـەی (شوهود)یشدا لە بەیتی سێهەمدا ، لەوەئەچیّ لەوکاتەدا کە نالیّ ئەم پارچە شیعرەی دانەوە ئەو ئەماوە . هەروەها وادیارە (ید الله)یـش مامی نوریّ بووە و ، بەنیشانەی وشەی (دەستیار)دا لە بەیتی سێهەمدا ، وادیارە لەکاتی دانانی ئەم پارچە شیعرەدا لە ژیانا بووە . مامۆسـتا مەسعود موحەممەدیـش لەبارەیـەوە ئەڵـیّ : « من لەبـارەی ئەم (شـێخ نوریّ ڕۆباری)یەوە هەر ئەوەنـدە دەزانم بەیتێـك لە کۆیێ ژیـاوە و پیاوێکی بەرچاو و ڕێز لیّ‌گیراویش بووە . بەپێی گێڕانەوەی دەماودەمی باوکم لـە باپیرەمەوە شێخ نوریّ نانی بە شێخایەتیّ پەیدا نەکردووە ، خۆی خـاوەن بەخشێن بووە و بە ماڵی خۆی خزمەتی خەڵقی کردووە »* .

(١) ڕۆدبار : چەم . نـاوی دێیەکـە لە هەورامـانی بەری ئێـران ، خەلکیّ پێی‌ئەڵێن (ڕووار) . تاریّ : هەلاتو . ماجەرا : ڕۆداو . ئەنجام .

واتە : چاوی پڕ لە فرمێسکم کە لەبەر زۆریی گریان بووە بـە چەم ، خەریکە لێلایی دابیّ و ئیشکی بینینی لیّ تـار بیّ . ئەمـەش ئەنجـامی دوورکەوتنەوەی نوریی ڕۆدبارییە .

وەقتە (مم) و (کم) و (گم) : وەختـە . نـوریّ (چر) و (چن) و (ت) و (خا) : نور .

---

* مەسعود موحەممەد ، چەپکێـك لە گوڵزاری نـالیّ ، ١٩٧٦ ، بەغـدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، ل ١١٢ .

چ میمارانە بۆ تەعمیری کەعبەی دڵ دەچێتە حەج !
خودا یار و مەدەدکار و نیگەهداری عەماریی بێ ! (٢)

بە وەقتی تەلبیــە مەستی شوهوودی (صبغة الله) بێ !
بە گاهی تەروییە سیڕڕی (ید الله) دەستیاری بێ ! (٣)

---

(٢) میمار : وەستا بەننا . تەعمیر : ئاوەدان کردنەوە . مەدەدکار : یارمەتیدەر . نیگەهدار : ئاگاداریکەر . عەماری : کەژاوە .

واتە : ماشـەڵڵا تۆری چەند وەستایانە کەولووەتەڕێ بۆ حەج بۆئەوەی دڵی خۆی بە یادی خوا ئاوەدان بکاتەوە . خوا یاری بێ و بەفریای بکا و ئاگاداری ئەو کەژاوەیە بێ کە لە سەفەرەکەیدا تیا دائەنیشێ .

دەچێتە (کم) و (من) : ئەچێتە . نیگەهداری (چر) و (چن) و (ت) و (صب) و (اح) و (خب) : بێ (ی)ی ئیضافە . بەڵام دیارە ئەبێ بە (ی)وە بێ .

(٣) تەلبیە : خوێندنی دوعای ( لبّیكَ .. اللّهمّ لبّیكَ .. ) . کە حاجی لەپاش ئیحرام دابەستن بۆ حەج و لەکاتی سوڕانەوەیاندا بەدەوری کەعبەدا و لە هەندێ کاتیتردا ئەیخوێنن . شوهود : یەکێکە لەو حاڵەتانەی بەسەر ئەهلی تەصەووفدا دێن و،وایان تیا دێتە پێش چاو کە هەمیشە لە حوزووری خوادان . صبغة الله : کردەی بێگەردی خوا . ئیشارەتە بە ئایەتی ( صِبغَةَ اللهِ ، وَمَنْ احسَنَ مِنَ اللهِ صِبغَةً ) . ید اللـه : دەستی هێز و توانای خوا . ئیشارەتە بە ئایەتی ( یَدُ اللهِ فَوقَ ایدِیهِم ) . دەستیار : یارمەتیدەر .

واتە : یاخوا ئەم دۆستەم لە وەختی ( لبّیكَ .. لبّیكَ )کردنا مەستی حاڵەتی شوهود بێ و ، لە نووری کردەی بێگەردی کردگاردا نوقوم بێ .. لەکاتی ئاو هەڵکوستنی ڕۆژی هەشتی قوربانیشدا خوا دەست بداتە باڵی و یارمەتیی بدا و کاری بۆ ڕاپەڕێنێ .

وەك پێشان وتمان بەم بەیتەدا دەرئەکەوێ کەوا (صبغةالله) و (یدالله) ناوی دۆکەسن و لەکاتی وتنی ئەم پارچە شیعرەدا یەکەمیان مردێ و دووەمیان زیندێ بووە و ، بە پێشخستنی ( صبغةالله )یشدا ئەبێ ئەو باوکی نوری و ( یدالله ) مامی بووبێ .

بە وەقتی (عم) و (کم) و (من) : بەوەختی . تەلبیە (چر) و (ك) و (اح) و (خا) : تەلبییەت . صبغة الله بێ (عم) : صبغة اللهي . تەرویــە (چر) : تەربییەت . (عم) و (کم) و (من) و (ت) و (ك) و (صب) و (اح) و (خا) و

فوتوضانی ( سەفا)وو (مەروە) هەروەك ناودان دەمدەم
لە یەنبوعی دڵی پڕ زەمزەمەی میزابی جاری بێ ! (٤)

ئەگەر خەڵوەت نشین بێ ، (جانی جانان) بێ ئەنیسی ئەو
وەگەر هیجرەت گوزین ، ڕۆحی (عەزیزان) یاری غاری بێ ! (٥)

---

(خب) : تەربییە . بەڵام هەمۆی هەڵەیە .

(٤) فویوضات : لافاوی بەرەکەت . سەفا و مەروە : دۆ بەرزایین لە مەککە حاجی بەنێوانیانا ڕاڵەکەن و ئەوە بەشێکە لە نەریتی حەج . ناودان : بلۆسکی باراناو . یەنبوع : کانێ . زەمزەمە : شەوق و سۆز . میزاب : بلۆسك . جاری : ڕەوان .

واتە : یاخوا لۆلەی لافاوی فەیض و بەرەکەتی سەفا و مەروە ، ناوناو ، وەك بلۆسکی ناو ، لە کانیاوی دڵی پڕ شەوق و سۆزی نۆریی زۆدبارییەوە بڕوا .

لە وشەی (یەنبوع)دا ئیشارەتێك بۆ شاری (یەنبوع)ی حیجاز و ، لە وشەی (زەمزەمە)شدا ئیشارەتێك بۆ (زەمزەم) کراوە کە بیرێکە لە مەککە .
میزابی (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : میزاب . دیارە (میزابی)یە .

(٥) خەڵوەت نشین : ئەوەی لە شوێنێکی چۆڵدا بەتەنها دائەنیشێ خەریکی خواپەرستی ئەبێ . جانی جانان : روح الارواح . کینایەیە لە خوای گەورە و هێمایشە بۆ نازناوی یەکێ لە پیرانی تەریقەتی نەقشبەندی کە ناوی (شێخ مەظهەر) بووە . هیجرەت گوزین : ئەوەی کۆچ کردن لە وڵاتی خۆی هەڵوێری بەسەر مانەوە لیایدا . نیوەی یەکەمی بەیتەکە ئیشارەتە بەوە کە پێغەمبەر (د.خ) بەرلەوەی سرۆشی لە خواوە بۆبێ لە ئەشکەوتی (حیرا)دا خەڵوەت نشینیی ئەکرد . نیوەی دۆهەمیشی ئیشارەتە بە کۆچ کردنی لە مەککەوە بۆ مەدینە و پەناگرتنی لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر لە ئەشکەوتی ( ثەور )دا . عەزیزان : خۆشەویستان . ئیشارەتە بۆ نازناوی یەکێکی تر لە پیرانی تەریقەتی نەقشبەندی کە ناوی (سەیید عەلیی ڕامیتەنی)ی مامۆستای (بابا موحەممەدی سەمماس)ی مامۆستای (ئەمیر کولال)ی مامۆستای (شاهی نەقشبەند)ە . یاری غار : هاوڕێی ئەشکەوت . ئیشارەتە بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر .

واتە : ئەگەر نۆریی زۆدباری لەپاش بەجێهێنانی فەرزی حەج نیازی مانەوە و خەڵوەتنشینی و گۆشەگیریی هەیە لە مەککەدا ، لەوا ئەو خوایە

شەمائیر یەك‌بەیەك مەسرووری سیرری غەیبی لارەیبی
مەساعی سەربەسەر مەشکووری دەرکی بەیتی باری بێ ! (٦)

نیشانەی (صبغة اللهی) لەسەر ئیسم و موسەممایە
بە بێ نەیرەنگی ئەو رەنگە کە رەنگی ئیفتیخاری بێ (٧)

---

هاودەم و ئاگاداری بێ کە ئافەریدەکاری هەموو زیندەوەرانە . خۆ ئەگەر نیازی کۆچ کردنیشی هەیە بۆ مەدینە ، ئەوا گیانی پاکی خۆشەویستانی خوا هاوکۆچ و هاورێی ریگای بێ .

وەك لە سەرەتادا ئیشارەتمان بۆ کرد ، بەم‌بەیتەدا دیارە نووریی زۆدباری لە پەیرەوانی تەریقەتی نەقشبەندی بووە .

گوزین (چر) و (کم) و (گم) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : گوزین بێ . (من) : نوشین بێ . زۆحی (چر) و (کم) و (گم) و (ك) و (عب) (اح) و (خا) و (خب) : زۆح .

(٦) شەمائیر : جەمعی شەعیرەیە بەو کردەوانە ئەڵێن کە پێویستە لە حەجدا بکرێن . غەیب : نادیاری : لارەیبی : خوای گومان لێنەکراو . مەساعی : جەمعی مەسعایە واتە هەوڵ و تەقەلا . مەشکوور : سوپاس‌کراو . دەرك : لێ حاڵی بوون . دەرگا . بەیت : خانوو . باری : خوا .

واتە : یاخوا نووریی زۆدباری داب و نەریتی حەج بەجۆری بەجێ‌بێنێ خوای نادیاری گومان لێنەکراو خۆش‌حاڵ بێ لێی .. هەرچی هەوڵ و تەقەلایەکیش ئەدا لە ریگەی خوادا ، لە قاپیی ماڵی خوادا ئەوەندە پەسەند بێ سوپاسی بکرێ لەسەری .

شەمائیر یەك‌بەیەك : تێکرای نوسخەکان تیا کەوتوونە هەڵەوە ، ئێمە خۆمان بەپێی رێ و شوێن راستمان کردەوە . ئەمەش ئەوەی لە نوسخەکاندا نووسراوە . (چر) و (کم) و (اح) و (خا) : شیمارێکی بە یەك . (چن) و (عم) و (گم) و (ت) و (ك) و (عب) : شیماری یەك‌بەیەك . غەیبی : ئەمە تێکستی (عم) و (کم) و (من)ە . نوسخەکانی‌تر هەموویان : غەیب . دیارە ئەمیش ( غەیبی ) یە .

(٧) صبغة اللهی : ئەوەی خوا رەنگی رشتبێ . موسەمما : ناونراو . نەیرەنگ : فێڵ و تەڵەکەبازی . ئیفتیخاری : شانازی پێوە کردن .

واتە : نووری نیشانەی ئەوەی پێوەیە کە خوا رەنگی رشتووە و رەنگی ئەوی پێوەیە و لەو جۆرە بنیادەمانەیە کە ئەو خۆشی ئەوێن ، یاخود

به کوێرێ دوور له ( نوری ) مایەوە « نالی » لەمێ ، یارەب !
فریوضی توزی ڕێگەی کوحلی چاوی ئەشکباری بێ ! (٨)

— ٥ —

ئەی قەلعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورجی !
وەی قوللەیی دووری کە دەڵێی قامەتی حوجی ! (١)

---

نیشانەی چوونەوە سەر ( صبغة‌الله )ی پێوەیە لەڕووی پیاوچاکییەوە و ، لەمبارەوە ناو و خاوەن ناو یەکیان گرتووەتەوە ، بێ فرت‌وفێڵی ئەوە کە ئەو ڕەنگی خواییە پێیەوە نیشانەی شانازی بەخۆوە کردن و خۆ بە زل زانین بێ .

لەنێوان (ئەیرەنگ) و (ئەو ڕەنگە) و (ڕەنگی)دا وشەئاراییەکی جوان هەیە .

نیسم و : ئەمە شێوە ڕاستەکەیەتی ، هەرچەند لە هیچ نوسخەیەکدا وا نەنووسراوە . (عم) و (کم) و (گم) و (من) : نیسمی . بەڵام هەڵەیە . نوسخەکانی‌تریش هەموو : نیسم . دیارە ئەبێ ( نیسم و ) بێ . لە نێوە بەیتی دووهەمیشدا زوربەی وشەکانی ( ئەیرەنگی ) و ( ڕەنگی ) ، (ی)ای نیشانەکەیان پێوە نییە .

(٨) لەمێ : لێرە . کوحل : کله . ئەشکبار : فرمێسکاوی .

واته : نالی بەهۆی دووریەوە لە نوری ئەوەندە گریا ، ناوی چاوی داهات و کوێر بوو و بە کوێری بۆ خۆی لێرە ماوەتەوە بەتەنها .. دەسا خوایە بەرەکەتی توزی ڕێگەی سەفەری حەجی نوری بکە بە کلەی چاوی پڕ لە فرمێسکی بوونەوەی ڕووشنایی لێ‌بکەوێتەوە .

لە نوری (عم) و (کم) و (گم) : لە تۆ وا . لەشکباری : ئەمە تێکستی تەنها (چن)ە . نوسخەکانی‌تر هەموو : ( لینتیظاری ) .

— ٥ —

بە بۆچوونی ئێمە لەوە ئەچێ نالی ئەم پارچە شیعرەی بۆ دۆستێکی تازە پێگەیشتووی خۆی وتبێ کە بە فەرمانڕەوایی دوورکەوتبێتەوە بۆ قەڵایێک ، چونکە لە پارچە شیعرەکەدا ناوی (قەلعە) و (بورج) و (قوللـە) هەیە و ، بەمانە و بە (مەجلیس) و (ڕاو) و (سواری)یشدا لەوە ئەچێ ئەو دۆستە شیعر بۆ وتراوە یەکێ بووبێ لە میرانی بابان و ، کێ ئەڵێ مەبەست ئەحمەد

وەك قافی زەمین قابیلی ئیکمال و تەرەققیی ..

وەك بورجی سەما لایقی ئیقبال و عورۆجی ! (٢)

---

باشا نەبێ لە سەرەتای لاویدا !! ئەم پارچە شیعرە لە گەڵێ سەرەوە لەگەڵ پارچە شیعری «ئەم تاقمە موشتازە ..»دا پەیوەندی هەیە و ، لێرەش وەك لەوێ بە شان و باڵی ئێرینەدا هەڵدان ، تەنها دیاردەیەکی باوە لە ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژهەڵاتدا و بە هیچ کلۆجێ ناچێتەوە سەر شێوەیەکی پەیوەندی ئارەزوای جینسێ .. بەتایبەتێ کە نالی لێرەدا ڕۆی دۆستەکەی ئەشوبهێنێ بە کەعبە و مۆی دەرهاتوی سمێڵ و ڕیشیشی دائەنێ بە سوپای ڕەشی حەبەشە کە هاتن مەککەیان داگیر کرد و ، باسی ڕابواردنی مەردانەی وەك ئەنجومەنی ئارایێ و ڕاو و سوارێ ئەکا .

(١) قەلەمە : قەڵا . ماە : مانگ . ئەوج : لوتکە . بەرزترین پلەی ئەستێرە . بورۆج : جەمعی بورجە ، بەمەعنا قەڵا ، یا هەرکام لە دوانزە بورجەکەی ئاسمان . قوللە : لوتکە . قامەت : باڵا . عۆج : عۆجی کوڕی عەنەق ، زەلامێکی ئەفسانەییە ئەڵێن باڵای ئەوەندە بەرز بووە بە دەستێکی ماسی لە بنی دەریا دەرهێناوە و ، بەو دەستەکەی داویەتە بەر خۆر برژاندویەتی!

مەعنای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە لێك ئەدەینەوە .

ماهم (خب) : مولهەم (أ) . دەڵێی (چر) و (ت) و (عب) : قەڵەڵا . ئەوجی : ئەمە تێکستی (کم) و (گم) و (من)ە . نوسخەکانیتر هەمو : (ئەوج) ، دیارە لەوانیشدا مەبەست هەر (ئەوجی)یە . وەی (عب) : ئەی . دۆرێ (مم) : درهم . (گم) : دەرهەم (أ)

(٢) قاف : کێوی ئەفسانەیی قاف . لیکمال : بەرەو تەواوێ چوون . تەرەققی : سەرکەوتن و بەرزبونەوە . لیقبال : ڕوتێ‌کردن . شان و شکۆ . عورۆج : بۆ سەرکەوتن .

واتە : ئەی مانگی لە قەڵادا دانیشتوم ، کە قەڵاکەت ئەوەندە بەرزە بۆت بووە بە بورج و خۆیشت بویی بە ئەستێرە کە لە بەرزترین پلەدا بێ .. ئەی لوتکەی دۆرێ کە لە دۆریدا ئەڵێی باڵای عۆجی کوڕی عەنەقێ کەس دەسی ناگاتێ .. ئەی لە قەڵای بەسەر کێوەوە دروستکراودا نشین ، کە خۆیشت وەك کێوی قاف لە زەویدا هەمیشە زیاد ئەکەیت و بەرز ئەبیتەوە .. ئەی پایە بەرز وەك بورجی ئەستێرەکانی ئاسمان ، کە شایانی ئەوەی ڕوت لێبکرێ و شان و شکۆت زۆر بێ و ، وەك چۆن پێغەمبەر سەرکەوت بۆ ئاسمان ، تۆیش کەسانی پایەبەرز بێن بۆلات .

ئەی ئاهووی نادیدە بە تەئثیری مەهیبێ
یـا گەوهەری ئەصدافی‌یو یاقوتی دورڕۆجێ (٣)

بۆ مەجلیس و یاری سەبەبی شەوق و سیراجێ
بۆ زاو و سـواری عەلەمی زین و سورۆجی (٤)

---

لە ئەفسـانەی سەبارەت بە کێوی قافدا هەیە کەوا بەشـی زۆری لەناو ئاوایە و ، چوار دەوری تۆپی زەویی داوە و ..٥٠ فرسـەق بەرزە .. تـا نیوەڕۆ تیشکی خۆر بەسـەریەوە سەوزە و لەوەوپاش شینـە .. ئەبـێ (ئیکمال) و (ئەرەنقی)ی کێوی قاف ئیشارەت بێ بەو ئەفسانەیە .

ئیکمال و : ئەمە تێکستـی (چن) و (مم) و (کم) و (ك)ە . (کم) و (من) : لیکمالی . نوسـخەکانی‌تر هەمو (ئیکمال) کە بۆ مەطفیش و بۆ ئیضـافەش دەسـت‌ئەدا . سـەما («بەراوێری» چر) و (مب) و (من) : فەلەك . ئیقبال و (چر) و (ت) و (اح) و (خا) و (خب) : ئیقبال . ئەمیش هەر (ئیقبال و)وە.

نالی لەم دۆ بەیتـەدا کۆمەڵـە وشـەیـەکی بەکارهێنـاوە کە هەمویان تەناسوبیان لەنێواندایە ، لە ڕۆی لەفظـەوە یا لە ڕۆی مەعنـاوە ، وەك (قەلعە) و (ئەوج) و (بورج) و (سەما) و (عورۆج) و ، (قاف) و (زەمین).

(٣) ئاهو : ئاسك . نادیدە : لەبەرچـاو نەبو . مەهیبـێ : سـام‌لێ‌کراوێ و هەیبەت‌دارێ . ئەصداف : جەمعی صـەدەفە . صـەدەف گیاندارێکی بچوکی ئاوییە لە قاپلۆغێکایە پێی‌ئەڵێن صەدەف و بەناوبانگترین جۆری ، جۆرێکە پێی‌ئەڵێن صـەدەفی مرواری ، مایەیەك لە گیانی خۆیا پەروەردە ئەکا وردە وردە ڕەق ئەبـێ ، ئەوە لەو مایەیە کە پێی‌ئەڵێـن مرواری . دورڕۆج : جەمعی دورجە واتە لەو سندوقە بچکۆلەیەی کە ئافرەتان شتی گرانبەهای خۆیانی تیا هەڵئەگرن .

واتە : لەوەندە لێمان دۆرکەوتۆیتەوە لەبەر سام لێ‌کراوی و بەرچـاو نەکەوتنت وەك ئاسکـی وەحشـیت لێ‌هـاتورە کە خۆی ناداتـە دەمەی ئاوەدانی ، یاخود ئەڵێی گەوهەری ناو صـەدەفی ، نابینرێی ، یا یاقوتی ناو قوتوی گەوهەر و زێڕ و شتی گرانبەهای ..

بەتەئثیری : ئەمە تێکستی (من) و (خب)ە . (چر) و (مم) و (کم) و (ك) و (اح) و (خا) : بە تەئثیر . بۆ (بە تەئثیری) و (بە تەئثیر و)یش دەست‌ئەدا . (چن) : بە تەئثیر و . مەهیبی (مم) و (کم) و (کم) و (ت) : کەمینـی (؟) . (خب) : مەحەبەت . ئەصدافی (کم) : صەددافی .

صەد حەیفی لە بۆ کەعبەیی حوسنت کە بەسەریا
نەججاشی‌یی خەط هاتووە نێزیکە خورۆجی (٥)

---

(٤) سیراج : چرا . سورۆج : جەمعی سەرجە واتە زین .

واتە : بۆ لە کۆڕی یاری‌کردن و ڕابواردنا ، یا لە کۆڕی دۆستایەتیـدا مایەی سـۆزی دڵی دۆسـتان و هاوڕێیـان و چـرای ڕۆناکەرەوەی ئەنجومەنیانی . لە مەیدانی ڕاوکردن و سواری و ڕمبازیشدا وەك ئاڵایی بەسەر زینی پشتی ولاخەوە قیت و قنجی و لە هەموولایەکەوە دیاری .

لەنێوان ( سیراج ) و (سورۆج )دا وشەئارایی هەیە .

مەجلیس و (کم) و (گم) و (من) : مەجلیسی . (اح) و (خـا) و (خب) : مەجلیس . بۆ ( مەجلیس‌و ) و (مەجلیسی)یش دەستئەدا . شـەوق و (چر) و (ت) و (اح) و (خا) : شەوق . بۆ (شـەوق و) و (شـەوقی)یش دەستئەدا .(چن) و (ك) : شەوقی . مەلـەمی (چر) و (اح) و (خا) : عەلەم و . بـەلام هەڵەیە . (ك) و (عب) و (خب) : عەلـەم . ئەبێ هەر (عەلەمی) بێ . زین و (چن) و (ت) : زین . دیارە (زین‌و)وە .

(٥) نەججاشی : نازناوی پادشاهانی ئەوسای حەبەشە بووە . خەط : مووی دەم‌وچاو .

نالی لەم بەیتەدا ڕووی برادەرەکەی شوبهاندووە بە ( کەعبـە ) و مووی تازە دەرهاتووی ڕیش و سمێلیشی شوبهاندووە بە (نەججاشی)ی پادشای حەبەشـە ، لەوەدا وەك چۆن لەشکری حەبەشە بە سەرکردەیی (ئەبرەهە) هات کەعبەی داگیر کرد ، لەشکری ڕەشی موویش هاتووە بەسەر ڕووی ئەو برادەرەدا و خەریکە داگیری‌کا . خەلەتیش ئەخوا بۆئەوەی کە ڕووی ئەو برادەرە جـوانی و گەشـییەکەی جـارانی نەمێنێ و مووی ڕیش و سمێل دایئەپۆشێ .

حەیفی : ئەمە تێکستی (اح) و («بەراوێزی» خا)یە . (چر) و (چن) و (کم) و (گم) و (ك) و (من) و (خا) و (خب) : حەیفە . (عم) و (ت) و (عب): حەیف . بۆ هەردوکیان دەس‌ئەدا . نەججاشـی‌یی (چن) و (ك) و (اح) و («بەراوێزی» خا) : بێخانەیی . خەط («بەراوێزی»چر) و (عم) و (کم) و (گم) : خەطت . بەپێی ئەم نوسخانە ئەبێ ( نەججاشی‌یی ) بە (نەججاشی) بخوێنرێتەوە . نێزیکـە (چن) : نەزدیـك . دیارە (نەزدیکە)یە . (اح) : نێزدیکە ! . (خا) و (خب) : نەزدیکە .

هەرچەندە دەکەن قەطعی سەرت ، دێیەوە ئەی خەط
وەك (هیندووی سەححاری مەجوسی) چ لەجوجی ! (٦)

تەلوینی ڕەقیبت چ بەیان کەم بە (مەقامات) !؟
مەشهوورە حیکایاتی (ئەبو زەیدی سوروجی) ! (٧)

---

(٦) قەطع : بڕین . هیندو : هیندی . سەححار : جادوگەر . مەجوس : ئاگرپەرست . لەجوج : منجڕ .

نالی لەم بەیتەدا گلەیی لەوە ئەکا کە مووی دەرهاتووی ڕیش و سمێڵی برادەرەکەی گەیشتووەتە ئوزاغی ئاشیی‌و ، تازە هیوای ئەوە بڕاوە کە دەم و چاوی بە ڕوشنییەکەی جارانی ببینرێتەوە . ئەڵێ : ئەی مووی ناپەسەند و منجڕ ! هەرچەند سزات ئەدەن و سەرت ئەبڕن ، ئەوەندەی پێ‌ناچێ قوت سەر هەڵئەدەیتەوە ، ئەڵێی جادوگەری ئاگرپەرستی هیندییت کە هەرچەند سەریان لەبڕی دەس‌بەجێ زیندو ئەبوەوە .

دیارە ئەم مەسەلەی ( جادوگەری ئاگرپەرستی هیندی )یە بابەتێکی مێژووییە و ، لە مێژوودا کابرایەکی‌وا بووە ئێستا وەك نموونەی منجڕی و لاساری ناوی ئەهێنن .

هەرچەندە (چن) و (عم) و (ت) و (ك) و (اح) و (من) : هەرچەند . دەکەن (چن) و (عب) و (من) : دەکا . (کم) : ئەکەن . دێیەوە (چر) : دێیتەوە « لەگەڵ هەڵەیەکی نووسینەوەدا » . خەط (کم) و («پەراوێزی» من ) : خەت . (ك) و (اح) : موو . سەححاری (چن) و (ك) : سەححارە . (ت) و (عب) و (اح) : سەححار . لەمیش هەر ( سەححاری )یە . مەجوسی چ لەجوجی (ك و (اح) و ( «پەراوێزی» خا ) : بێ‌عار و لەجوجی .

(٧) تەلوین : ڕەنگاوڕەنگ کردن . مەبەست لە دوزمانی و فرە ـ ڕوییە . ڕەقیب : بەدکار . مەقامات : جورە پەخشانێکی ئەدەبیی کونی عەرەبییە ناوەڕوکی زیاتر لە چیروك ئەچێ . ئیشارەتە بەو کتێبانەی بەم‌ناوەوە نوسراون وەك (مەقاماتی بدیع الزمانی هەمەدانی) و (مەقاماتی حەریری) . ئەبو زەیدی سوروجی : کابرایەکی فێڵباز و خوازلوك بووە زوّر لە بەردەمی خەڵکا کوڕووزاوەتەوە بوئەوەی بەزەییان پیایێتەوە و شتی پێ ببەخشن . گەلێ سەرگوزەشتەی لە مەقاماتی حەریریدا نوسراوەتەوە .

واتە : هیچ پێویست ناکا باسی دوزمانی و ساختەچییەتیی بەدکارت بو بکەم و ( مەقامات )ی لەبارەوە بنوسم کە دێتە لات چی ئەڵێ ، چونکە

مەعلوومە لەوێ ڕاز و خوطووری دڵی «نالی»
( إذ حَلّ بقلبي ، وَ بِأسرارِ نوجِي ) (٨)

— ٦ —

گەر بازی نەظەر بازی ، لەم دەست و نیگارەت چی !
بۆ باری‌یو دەسبازی ، لەم ڕاو و دیارەت چی ! (١)

---

بەدکار بەش‌بەحاڵی خۆی ئــەبۆ زەبدێکی سورۆجیی‌ترە و ، دەنگوباسی ئەبۆ زەیدی سورۆجییش لای هەموو کەس ئاشکرا و دیاریە .

ئەلوینی : ئەمە تێکستی (من)ە . نوسخەکانی‌تر هەموویان ، (عم) و (گم) نەبێ : ئەلوین کە ئەویش هەر (ئەلوینی)یە . (عــم) و (گــم) : ئەلبیس . مەشهوورە (چر) و (عب) و (من) : مەعلوومە .

ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لــە (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب)دا لەجێی یەکتردان .

(٨) خوطوور : ئەوەی بە دڵدا بێ .

واتە : ڕاز و نیازی دڵی ( نالی ) هەموی لەوێ لای دۆســـت ئاشکرا و دیاریە و ، پێویست بە وتنی هیچ ناکا و ، بەدکاریش ناتوانێ کار بکاتە سەر دڵی دۆست ، چونکە دۆســت جێی خۆی لە دڵما گرتووە و ، هەموو نهێنییەکی دڵمی چیێنراوە بەگوێدا . .

ڕاز و خوطووری : ئەمە تێکـــــتی (کم)ە . (چر) و (ت) و (ك) و (اح) : بە بێ (و)ی عەطــف و (ی)ی ئیضافـــەکە . (چن) و (عب) : ڕاز حوضوور ، دیارە (ڕازی حوضووری)یە . (عم) و (گم) : ڕاز و نیازی . (خا) : ڕاز و خوطوور . دیارە (خوطووری)یە .

— ٦ —

(١) نەظەر باز : چاوکراوە . عادەت وایــە باز بــەرلەوەی بەری‌دەن بەدوای نێچیرا چاوی ئەبەستن و لەکاتی بەردانیــا چــاوی لەکــەنەوە . نیگار : نەخش و وێنە . دیار : وڵات .

نالی لەم بەیتەدا قســە لەگەڵ خۆی ئەکا و ئەڵێ ئەگــەر تــۆ بە نیازی دڵداری کردن هاتووی بۆ ئێرە و بــازێکی چاوکراوە و زیــرەکی بــەدوای نێچیرێکی‌وادا لەگەڕێی بۆ ڕاوکردن بشێ ، ئەوە ئەم یــارە لەوانە نییە و

گەردنکەچی زوڵفی بۆی ، سا دڵ مەدە بەر موژگان
وا خۆت لە تەناف داوە ، ئیتر لە قەنارەت چی ! (٢)

ئەو چاوە کە هەڵدێنێ ، صەد عەربەدە دەڵوێنێ
هەر ڕۆحە کە بستێنێ ، لەم غەمزە دوبارەت چی ! (٣)

---

نێچیرێکی ئەوتۆ نییە بازی بخرێتە سەر ڕاوی بکا .. خۆ ئەگەر تەنها ڕابواردن و دەسبازیشت لەوێ ، ئەوە لە شوێنی خۆیدا ئاسان بۆ و پێویستی بەوە نەبۆ بێی بۆ ئەم وڵاتە بۆ ڕاو .

دەست و نیگارەت (مم) و (کم) و (گم) و (« پەراوێزی » من) : ڕاو و شکارەت . (ت) : دەست نیگارەت . بۆ (دەست و ) و (دەستی)یش ئەگونجێ . (اح) : دەستی . لەم ڕاو و دیارەت : ئەمە تێکستی (چن) و (مب)ە . (چر) و (خا) و (خب) : لەم یار و دیارەت . (« پەراوێزی » چر): لەو ڕاو و دیارەت . (عم) و (گم) : لەم دەست و نیگارەت . (کم) و (من) : لەم ڕاوی دیارەت . (ت) : لەو یارە دیارە . (ك) : لەم یارە دیارەت (اح) : لەم یارەوو یارەت .

(٢) قەنارە : دارێکە قولاپی ئاسنی پێوەیە قەساب گۆشتی پیا هەڵئەواسێ .

نالی لەم بەیتەشا هەر لەگەڵ خۆی قسە ئەکا و ئەڵێ : گەردنت بۆ زوڵفی یار کەچ کردووە ، باشە ، ئیتر بەسە و لەوەزیاتر دڵیش مەدەرە بەر قولاپی موژەی .. تۆ کە ملی خۆت داوە لە تەنافی زوڵفی یار ، دڵیشت بۆ بە قولاپی برژانگەکانیا هەڵئەواسی !!

زوڵفی (ك) و (اح) و (خب) : زوڵف . دیارە ئەمیش ( زوڵفی )یە . بۆی (چن) : بۆ . بەمپێیە ( گەردنکەچی ) بە ( گەردن کەچی ) ئەخوێنرێتەوە کە بێن بە موبتەدا و خەبەر . موژگان (چر) و (اح) و (خا) : هیجران . تەناف (چر) و (مم) و (مب) و (خا) : طەناف . قەنارە (من) : قەیارە . لە پەراوێزی (من) خۆیدا نوسراوە : « سیلاحێکی وەك شمشێرە ، ڕۆر تەنکە» . بەڵام ئێمە خۆمان لە فەرهەنگەکانی بەردەستمانا هیچمان نەدی.

(٣) عەربەدە : سەرخۆشی و بەدمەستی .

لێرەدا نالی ڕوی دەمی ئەکاتە یار و پێی ئەڵێ : بە ئاوە چاو هەڵهێنانێك کارێك ئەکەی بە صەد بەدمەستی کردنی لێسانێکی سەرخۆش ئەکرێ .. بەڵام من تەنها گیانم هەیە بە تیری چاو هەڵهێنانت دەری کەی ، کەواتە ئیتر غەمزەی دۆبارەی پاش چاو هەڵهێنانەکەت بۆچی و لەپای چی و ،

گەنجینەیی تێو سینە ، ژەنگینە بە سەد کینە

ئەی لەککەیی ئاینە ، یا ڕەببی بە غارەت چێ ! (٤)

موژدەی قەدەمی سەر بو ، دڵ هات و لە ڕێدا چو

جان ماوە لە بۆ وەصڵی ، بدرێ بە بەشارەت چێ ؟! (٥)

---

چیی‌تر هەیە بەو غەمزەیەت لێم بستێنی ؟

هەڵدێنێ (چن) و (کسم) و (ت) و (عب) و (خب) و (من) : دەنوێنێ . بەم‌پێیە ئەم (دەنوێنێ)یە بەمەعنا (دەخەوێنێ)یە . (عم) و (کم) : ئەنوێنێ . غەمزە («پەراوێزی» چر) و (ت) و (عب) و (من) : عومرە . (چن) : عومر . بۆ (عومرە) و (عومری)یش ئەگونجێ . (عم) و (کم) و (گم) : عومری .

(٤) لەککە : پەڵە . ئاینە : ئاوێنە .

واتە : گەنجینەی ناو سنگت کە دڵتە سەد پەڵەی چڵکنی ڕق و کینەی لە دڵدارانت لێ نیشتوە و وەك ڕەنگی بەسەردا کرابێ پێی ژەنگاوێ بووە . . دەسا ئەی کینەی ناو دڵی یار کە بۆیی بە پەڵە بەسەر ئاوێنەی دڵیەوە ، لە خوام ئەوێ بە تاڵان بڕۆیت و ، دڵی یار پاك ببێتەوە لێت !

تێو (کم) و (من) ناو . ژەنگینە : ئەمە تێکستی (چن) و (کسم) و (گم) و (خب)ە . نوسخەکانی‌تر هەموو : ژەنگینە ، واتە ژەنگاوییە . ئاینە : ئەمە تێکستی (چن) و (کم) و (گم) و (من)ە . نوسخەکانی‌تر هەموویان : ئاوێنە .

(٥) واتە : سەرم لەپێناوی پێیا دانا کە بێت بۆ لام و ، بۆی بۆ بە قوچی قوربانێ . . دڵیشم هەر زوو چوو بۆ لای و لە ڕێگادا یا لە ڕێگای خۆشەویستیدا تیاچو . . ئەوی مابێ لەپێناوی پێگەیشتنیا دایبنێم ، تەنها هەر گیانمە ، کەواتە ئەی چێ بدەم بەوکەسەی مژدەی پێگەیشتنیم ئەداتێ ؟! یاخود هەر گیانم ماوە بیدەم بە ( بەشارەت‌چێ ) و مژدە گەیێنی پێگەیشتنی ؟ . ئیتر خۆیشم هیچ !

قەدەمی (چن) و (ك) و (خب) : قەدەمت . (ت) و (اح) : قەدەم . دیارە ( قەدەمی )یە . دڵ (چر) و (عم) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : ڕۆح . لە ڕێدا (چر) و (ت) و (اح) و (خا) : بە غارەت . جان (عم) و (گم) : گیان . لەبۆ (ت) : لەسەر . بدرێ (عم) و (کم) و (گم) : بیدەی . (خب) : بیدا .

ئەم بەیتە و بەیتی پێشەوەی لە (عب)دا لەجێی یەکتردان .

بچووك و شیرین و خۆشی یار . تۆیش ، ئەی کابرای پارووی زل گلێنی ناو تەکیە ، پیاوی ئەم مەیدانە نیت و شایانی ئەوە نیت بێیت لە قەراخی ئەم سفرەیەدا دانیشی و دەستی بۆ ڕاکێشی . . .

ئەشتوانری مەعنای بەیتەکە بەمجۆرە لێكبدرێتەوە کە وا بکەبەنی : ئەم گوێ ئاوی فرمێسکەم کە وەك سفرە و خوانی ئاوەدان بە گوڵاڵەی شیعری جوان ڕازاندۆمەتەوە ، بۆ نازارانی نوقڵە دەمم ئامادە کردووە و بۆ ماچ و مۆچی ئەوان . . تۆیش ئەی سۆفیی مفتەخۆری لیکە گلێنی ناو تەکیە ، هەر بۆ پارووی زل لێدانی ناو تەکیە باشی و بۆ ئەوە ناشێی ڕوو بکەیتە ئەم گوڵ و گوڵزار و قەراخ ئاوە . .

ئەشتوانین مەعنای (وا) وا لێكبدینەوە کە لەگەڵ (من)دا بەرابەر بە (تۆ)ی نیوە بەیتی دووهەم بێ و بەمەعنا ( با بڵێین ) بێ .

خوانی (کم) و (گم) : خوێنی ( ؟ ) . لوتەخۆری (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : لوتەخۆر . دیارە ( لوتەخۆری )یە . تەکیە (چر) و (اح) و (خا) : مشکە .

(٧) مەردوم : گلێنەی چاو . کولبە : کەلاوە . تار : تاریك .

وێنەی یار لە چاوی (نالی)دا نەخشی بەستووە و هەرگیز لە بەرچاوی ون نابێ . لەبەرئەوەش کە لەو بەولاوە کەسی خۆش ناوێ ، ئەڵێ لە وێنەی تۆ بەولاوە هیچیتر لە چاوما نییە . بەڵکو بەهۆی بینایی چاویشی دائەنێ . . لەوڕووەشەوە کە یار خۆی دیار نییە و نایبینێ ، چاوی خۆی بە وێرانە و کەلاوە کۆن و تاریك ئەداتە قەڵەم و ، دیسانەوە ئەگەڕێتەوە وێنەکەی ئەکا بە مایەی بینایی چاوی و ، ئەڵێ مادەم یار خۆی دیار نییە کوێرابیم دابێ باشترە ، واتە وێنەکەشی لەچاویا نەمێنێ . . لەکوێری

... ئومێدی . دڵبەستە . ئەوەی دڵی بە شتێکەوە پەیوەند بێ . لیدێ : ئیتر . عاشقی لەجریدێ : ئەوەی دوور لە ماددە دڵداری بکا .

واتە : نالییا ! نائومێد بوون شتێکی خۆشە و (الیاس احدی الراحتین) . هیچ نەبێ بنیادەم بە بارێکا ئەکەوێ و لە چارەنووسی خۆی دڵنیا ئەبێ . مادەم تۆش نائومێد بوویی لەوە کە بە یار بگەی ، ئیتر دڵی خۆتی چیتر پێوە مەبەستە .. تۆ ئەگەر ڕاست ئەکەی ، دڵدارێکی میثالی و دوور لە ماددیاتی ، ئەمە بۆ تۆ باشترە و واز لەم ولاتە و لەم یارەت بێنە و ، ڕێگای عەشقی ڕاستەقینە بگرەرە بەر ..

ئێمە وای بۆ ئەچین ئەم پارچە شیعرە ئاوێنەی کێشەیەکی سەختی دەروونیی نالی بێ و ، خەیاڵ نەبێ و ، پاش نائومێد بوون لەخۆشەویستەکەی وتبێتی .. بەیتی حەوتەمیش زیاتر ئەمە لەچەسپێنێ و ، بەو شێوە پڕ لە هونەرە ئاواتی ئەوەی تیا دەرئەبڕێ ، کە ئەتانێت وێنەی یاریش لەبەرچاوی ئەسێنێ و ، نائومێدییەکەی بۆ ببێ بە مایەی حەسانەوەیەکی ڕاستەقینە ..

هەروەها لە بەیتی یەکەم و چوارەمەوە نیشانەیەکی ئەوە دەرئەکەوێ کەوا ئەو خۆشەویستەی نالی کچێکی ( عەیار ) بووبێ و ، دەستێکی بووبێ لە هەڵخەڵەتاندنا و بەدیمەن بەجۆرێ لەگەڵ نالی جوڵابێتەوە و ڕاستەقینەکەشی جۆرێکیتر بووبێ . بەیتی پێنجەمیش نیشانەی ئەوەی تیایە کە نالی بە دڵ چووەتە مەیدانی ئەو خۆشەویستییەوە و قوربانییەکی زۆری لەپێناودا داوە و ، بەیتی شەشەمیش وەڵامدانەوەی ئەوکەسانەیە کە خۆیان لەم کاری دڵدارییەی نالیدا هەڵقورتاندووە و لەملا و لەولا لێیدواون و کردوویانە بە مایەی ناوهێنانی نالی . لە بەیتی حەوتەمیشەوە

— ٧ —

ئەی خەستەیی چاوت هەمو ئاهوویی تەتاری !
وەی بەستەیی زولفت هەمو شێرانی شکاری ! (١)

خەندەت بووەتە باعیثی گریانی دەمادەم
بەرقە سەبەبی بارشی بارانی بەهاری (٢)

---

ئەوە دەرئەکەوێ کەوا کچەکە لەئەنجاما بەهۆی شوکردنەوە بە کەسێکی‌تر دەسی نەدایێ بە دڵی نالیەوە .. لە بەیتی هەشتەمیشدا نیشانەیەکی ئەوە دیارە کە نالی پاش ئەم نائومێدبوونە و دوای دانانی ئەم شیعرە لەو شوێنەی بەجێ‌هێشتبێ کە یارەکەی لیا بووە .

یارْ و دیارەت (ل) و (اح) : یارەوو یارەت . بەڵام لەگەڵ بەرزیی مەعنای خۆشەویستیدا ناگونجێ .

— ٧ —

(١) خەستە : نەخۆش . کەوتوو . ئاهوی تەتاری : جۆرە ئاسکێکە ناوبانگی بە چاو جوانێ دەرکردووە . بەستە : گیرۆدە و بەسراوە . شکاری : ڕاوی .
واتە : لەی ئەو دلبەرەی ئەوەندە چاوت جوانە هەرچی ئاسکی چاو جوانی تاتارییە ، هەموو نەخۆش و خەستەی چاوی مەستتن و ، هەرچی شێری ڕاوییە ، واتە هەرچی دلداری نازداران ڕاوکەرە ، هەموو بە تاڵی زولفەکانت گیرۆدە بوون و بەسراونەتەوە . مەبەستی ئەوەیە بڵێ هیچ جوانێ لەئاستی جوانیی ئەوا ناوێنێ و ، کەس لە بەرابەر نازداریی ئەوا خۆی پێ ڕاناگیرێ .
لەنێوان (ئەی) و (وەی) و ، (خەستە) و (بەستە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (ئاهو) و (شکار)دا تەناسوب هەیە .

(٢) دەمادەم : پەی‌دەرپەی . بەرق : برۆسکەی هەور . بارش : بارین .
واتە : پێکەنینی تۆ بووە بە هۆی گریانی پەی‌دەرپەیی مــن ، چونکە نیشانەی کەمتەرخەمیتە بەرابەر بە دلدارەکانت و ، منیش کە بەو کەمتەرخەمیتە ئەزانم ، هەر ئەوەم بۆ ئەمێنێتەوە لە خەفەتانا دەس بکەم بە گریان . پێکەنینی تۆ وەک تیشکدانەوەی برۆسکەی ئاسمان وایە ، کە ئەو تیشک ئەداتەوە ، هاوار لە منەوە هەڵئەستێ و دەس‌ئەکەم بە گریان و چاوم وەک هەوری بەهار فرمێسک دائەڕێژێ .

سەهمی نیگەهت خەتمی ، هەستامەوە ڕاکەم
ئەگریجەوو زولفت بە جەفا هاتنە یاریی (۳)

وای فەرمو کە ماچت نەدەمێ ڕۆژەشی تۆ بم
ئەم ساڵە بەجێ‌دێ ئەثەری وەعدەیی پاریی (٤)

---

لە نیوەی دۆهەمی ئەم بەیتەدا حوسنی تعلیل هەیە بۆ نیوەی یەکەمی بەیتەکە و ، لەنێوان (خەندە) و (دەمادەم)یشدا جۆرە تەناسوبێك هەیە هەرچەند (دەمادەم) پەیوەندی بە مەعنای (دەم)ەوە نییە . لەنێوان (خەندە) و (گریان)یشدا طیباق و،لەنێوان (بەرق) و (باران) و (بەهار)یشدا تەناسوب هەیە .

بەرقە : ئەمە لێکستی (ت) و (عم)ە . نوسخەکانی‌تر هەمو : بەرقت .

(۳) سەهم : تیر . نیگەه : لاکردنەوە . یاریی : یارمەتی‌دانی .

واتە : ئاوڕدانەوەت بە ناز بۆ بە تیرێك و دای لە جگەرم و خەتمی . هەستامەوە خۆم لە دەست تیری تەماشات دەرباز کەم ، ئەگریجە و زولفت ، بەنیازی ئازاردانم ، هاتنە یارمەتی‌دانی نیگات و لێم بون بە داو و زنجیریان کردم .

ئەم هاتنی ئەگریجە و زولفە بەیارمەتیی تیری نیگای یارەوە ، هێمایە بۆ نزیك بونەوەی گۆنای یار لە دەمی شاعیر و ماچ کردنی. بەیتی پاشەوەش ئازادەیەلو ئەم هێمایە بەهێز ئەکا .

ڕاکەم (کم) و (گم) : زام‌کرد . ئەگریجەوو (چن) و (ك) و (اح) : ئەگریجەیی .

(٤) واتە : یار ، یارەکە فەرموی ڕۆژەشی لای تۆ بم ئەگەر ماچت نەدەمێ .. وا ئەم‌ساڵ ئەنجامی بەڵێنەکەی پاری دەرئەکەوێ ..

بۆ لێکدانەوەی چۆنیەتیی هاتنەدیی بەڵێنەکەی پاری یار ، یا ئەبێ بلێین مەبەست لە ڕۆژەش بونەکە ئەوەتە لەجیاتیی ماچ پێ‌دان ، بە ئاڵی زولفی بەستویەتیەوە . یا مەبەست هاتنی زولفی ڕەشیەتی بەسەر ڕویا . . لەوانەشە بوترێ ناڵی بەم پارچە شیعرە قسە لەگەڵ کوڕ ئەکا و مەبەست لە ڕۆژەش بون دەرهاتنی موی ڕیش و سمێڵە . ڕاستە ئەم مەعنایە لە چوارچێوەی تەنها ئەم بەیتەدا ئەگونجێ ، بەڵام لەگەڵ تێکڕای پارچە شیعرەکە و لەگەڵ ڕێبازی گشتیی ناڵیدا ناجۆرە .

وای فەرمو (چن) و (ك) و (اح) : وات فەرمو . (ت) : دەیفەرمو .

مەغشوشی زەڕە ، عاجزی زیو ، دەرهەمی دیرهەم
بۆچ تێکچووە صۆفیی کەرەبۆز بۆ غەمی باری ؟! (٥)

هەر یارێ کە مالآن گەڕ و بێگانەیە « نالی »
کەندۆمە ددانی طەمەعی بۆس و کەناریّ (٦)

---

ئەمساڵە : نوسخەکانی بەردەستمان هەمو نوسیویانە (ئەمساڵ) . بۆ ئەو تێکستەی ئێمە لێرەدا هەڵمانبژاردووە ، ڕاستەکەی (ئەمساڵە)یە ئەگینا بەیتەکە لەنگ ئەبێ . ڕێنوسی کۆنیش ڕێگا ئەدا هەردو وشەکە وەك یەك بنوسرێـن . بەجێدێ (چر) و (عم) و (کم) و (گم) : کە بەجێدێ . بەپێی ئـەم نوسخانە ئەبێ (ئەمساڵە) بە (ئەمساڵ) بخوێنرێتەوە . (ت) و (عب) و (من) : بەچێ دێ (آ) . (خا) : کە بەچـێ دێ (آ) .(خب) : بەجـێدێنێ . لەلەری («بەراوێزی» چر) و (عب) و (من) : سەبەبی .

(٥) مەغشوش : تێکچو . زێڕی مس تێکەڵ کراو . دەرهـەم : تێکشکاو . لەخەفەتابۆ ، بەپێی ئەوە کە لە (دەر) و (هەم) پێکهاتبێ .

واتە : سۆفیی کەرەبۆز ، ئەگـەر کەسـێك بوبێ بەو نـاوەوە ، یاخود سۆفیی خاوەنی کەرەبۆز بەدوای پەیـدا کردنی زێڕی نـاپوخت و زیوی بێڕەواج و دوەمی تێکشکاردا ئاڵوز و عاجز و خەمگین بووە .. بەڵام بـۆ خەمی ئەم بارە بێسودەی ئەخوا ؟ بۆ ڕێگای دڵدارانی ڕاستی ناگرێتەبەر و دەسبەرداری ئەم دنیا پەرستییە نابێ ؟! .

مـەغشوشی (عب) و (من) و (خب) : مەخشـوش . نوسـخەکانیتر هەمو : مەغشوش . بەڵام هەرکامیان بێ ئەبێ بە (ی)ی ئیضـافەوە بێ . زەڕە : ئەمە تێکستی (چر) و (عب) و (من)ە . نوسخەکانیتر هەموویـان : زەڕ و . عـاجزی : ئەمە تێکـستی (عم) و (کم) و (گم) و (من)ە . (چر) و (چن) و (ت) و (عب) و (اح) و (خـا) و (خـب) : عـاجز . ئەمیـش هەر (عاجزی)یە . (ك) : عاجزە . دەرهەمی دیرهەم : لەگەڵ جیاوازیی شێوەی نوسینیشدا لەمە تێکستی زوربەی نوسخەکانە . (عب) و (من) : دەرهەمی کەوکـەب (آ) . بـۆچ (عم) و (گم) : بـۆ . کەرەبـۆز (ت) و (ك) و (اح) : کەرەبۆر . غەمی (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : غەم . بەڵام دیارە (غەمی)یە . باری (عم) و (گم) و (خا) : یاری . نیوە بەیتی دوەهەم لە (گم)دا بەمجۆرەیە :

«نالی» کرە صۆفیی کەرەبۆزەی غەم و یاری

(٦) دان کەندن : کینایەیە لە دەسبەردار بون. طەمەع : تەما. بۆس . بۆسە،

— ٨ —

بێ جوێ بۆنەوەیێ ، زەخم و برین و ئەثەرێ ،
تیری موژگانی درێژت لە جگەر تێدەپەڕێ .. (١)

ماچ . کەنار : لەباوەش گرتن .

نالی لە بەیتی پێشوودا ناڕەزایی خۆی لە بەدوای زێڕ و زیو و درەما گەڕانی سۆفێ دەربڕێ . لەم بەیتەشدا مالی دنیا ئەشوبهێنێ بە یاری بێوەفا و ماڵانگەڕ لەوەدا کە هەمیشە لە دەسی کەسێکا نامێنێ و هەر ئاوێ هیی یەکێکە و ، ئەڵێ : هەر یارێ ماڵانگەڕ و بێگانە و بێوەفا بێ ، دانی ئەوەم کەندووە کە بەتەمای ماچ کردن و لەباوەش گرتنی بم .

بێگانەیە (عم) و (گم) : بێگانە بێ .

ئەم بەیتە لە (چن) و (کم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب)دا نییە . (خا) و (کم) نەبێ هەمو ئەم نوسخانە نیشانەی ئەوەیان پیشان داوە کە بەیتێك ناتەواوە . (کم)یش ، وەك وتمان ، بەیتی پێشوی کردوە بە دوا بەیت و نازناوی (نالی)ی تیا داناوە . (خا)یش هیچ .

— ٨ —

(١) واتە : تیری برژانگی درێژت ، بێئەوەی جیابونەوەیەکی لە کەوانی برۆت ببێ و ، بێئەوەی زامێك یا برینێك یا نیشانەیەك بە لەشی دڵدارەوە بەجێبێڵێ ، جگەری ئەسمێ و کونی ئەکا .. مەبەستی ئەوەیە بڵێ تیری نیگات تیرێکی کاریگەرە ، هەرچەندیش بەدیمەن نیشانەیەك بەجێناهێڵێ .

ئەمەی ئێمە نوسیومانەتەوە تێکستی تەنها نوسخەی (خب)ە کە لە هەمو نوسخەکانی تر وردتر و جوانتر بۆ لامان . (چر) و (عب) :

لێ جوێ بونەوە بۆ زەخم و نیشانەی لەئەرێ (*)

(«بەراوێزی» چر ) و (چن) و (ك) و (اح) و (خا) :

بۆ جوێبونەوە بۆ زەخم و برین و لەئەرێ

(عم) و (گم) :

بۆ جوێبونەوە بۆ زەخم و نیشانەی ئەئەری (**)

(*) لەبەرئەوەی کە ئەبو بەپێی ئەم نوسخانە ( ئەثەرێ ) بە ( ئەئەری ) بخوێنرایەتەوە ، (چن) لەسەری نوسیوە : « بالأمالة » واتە : بە لارکردنەوەیەکەوە . مەبەستی ئەوەیە بە ( ئەئەرێ ) بخوێنرێتەوە .

(**) (عم) لەسەر (بۆ جوێ) نوسیویە : «چرا جدا ؟» واتە : بۆ جیا ؟ و لەسەر (بۆ) نوسیویە : « برای » واتە : بۆ .

سۆفی‌یی خەڵوە نشین بۆ تەماشەرێکی گوڵی ڕۆت
ڕەنگە وەك نەرگسی تەڕ چاوی سپی بێت و دەرێ (٢)

زوڵفی دوو تایی ترازوو مەثەلی دڵکێشت ،
ڕۆح دەکێشن بە دوو سەر ، ئەم بە سەرێ ، ئەو بە سەرێ ! (٣)

---

(کم)یش هەروەك (عم) و (گم) وایە ، بەڵام لەجیاتی ( نیشانەی ) نووسیویە : (برینی) . لێدەبەڕێ (کم) : لێ‌ئەپەڕێ .

(٢) نەظەر : سەیرکردن .

واته : تەنانەت سۆفیی خەڵوەنشین و گۆشەگیریش کە هەرگیز لە کونی تاریکی پەرستنگای خۆی نایەتە دەرەوە و سەری هەڵنابڕێ سەیری عالەم بکا ، لە ئاستی تۆدا لەبیر ئەچێتەوە و ، لەوانەیە بۆ چاوپێکەوتنێکی گوڵاڵە سوورەی ڕۆت ، چاوی وەك نەرگسی تەڕ سپی ببێ و کوێر ببێ و دەرپەڕێ ، یاخود لەوانەیە دەس‌بەرداری ئەو وشکە سۆفییەلییەی ببێ و ، چاوی بە تاریکایی فێربوی سپی و ڕۆشن ببێتەوە و ، لە کونەکەی دەرچێ و بێتەدەرێ .

چاوی نەرگس : ئەو خاڵە سپییە تەڕانەیەلی کە پەڕەکانی گوڵەکەیان بەسەرەوە ئەڕوێ .

لە کۆکردنەوەی (بێت) و (دەرێ)دا تەناسوب هەیە ، چونکە هەرچەند (بێت) لە (بوون) دروست کراوە ، بۆئەوەش ئەشێ لە (هاتن) دروست بوبێ و ، دیارە بەم مەعنا لەگەڵ (دەرێ)ی لە (دەرچوون) دروست‌کراوا بێ‌پەیوەند نییە .

نەرگسی (کم) و (من) : نێرگسی . بێتە (چن) و (ت) و (ك) و (اح) : بێت و .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (گم)دا بەیتی چوارەم و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی سێهەمە .

(٣) تا : تای ترازوو . مەثەل : وەك . دڵ‌کێش : کێشانەکەری یا ڕاکێشەری دڵ . سەر : تای ترازوو .

واته : زوڵفەکانت کە وەك تای ترازوو وان لەوەدا کە تاڵەکانیان وەك پەتی ترازووەکە و شکانەوەکەشیان لە دامێنەوە وەك کاسەکانی ترازووەکەیە ، هەریەکی لەلایەکەوە وەك قوڵاپ دڵی دڵدار ڕائەکێشن و ئەیخەنە ناو تای خۆیانەوە و ، بەو ڕاکێشان و بەکێش کردنەی گیانی

من لە ئیحرامی ئەدەبدام و ، ئەتۆش صەیدی حەرەم
موددەعێ ، هەروەکو سەگ ، بۆچی بە ئێمە دەوەڕێ ؟! (٤)

یادی چاوی بە فوتوورت لە دەروونما مەرەضە
غەمی زولفی بەخەمت بۆ لە دلمدا بە گرێ (٥)

---

دلدار نەکێشن . لەبەرئەوەش کە هەردوو سەری ترازووەکە هەر دلی تیایە و دلیش هەر دلێکە ، لا نییە تا قورسێ و سووکێ دەرکەوێ و ، کاری کێشانەکە هەرگیز نابڕێتەوە. هەروەها لەبەرئەوە کە کاری ئەم ترازووانەی زولفی یار تەنها دڵکێشانە و کارێکی تریان نییە ، دیسانەوە کێشانەکە هەرگیز نابڕێتەوە .

زۆح (ت) : دل . دەکێشن (عم) و (گم) : دەکێشێ . (کم) : نەکێشێ .
ئەم بەیتە لە (چر) و (گم) و (مب) و (من)دا بەیتی دووەمە .

(٤) ئیحرام : حاجی بەرلەوەی بگاتە مەککە ، لە چەند کیلۆمەترێك دوور لە مەککەوە بەرگی تایبەتیی خۆی دائەکەنێ و بەرگێکی تری تایبەتێ لەخۆیەوە ئەپێچێ دروومانی تیا نەکراوە ، هەروەها هەندێ کردەوەی تایبەتییشی لێ حەرام ئەبێ وەك ڕاوکردن و سەربڕینی حەیوان و هەر جۆرە خوێن ڕشتنێك و ، وەك چوونە لای ئافرەت . بەوە ئەلێن حالەتی ئیحرام .
حەرەم : حەرەمی مەککە کە ڕاوکردنی تیا حەرامە . موددەعێ : بەدکار .

نالی لەم بەیتەدا خۆی شوبهاندووە بە کەسێك کە لە ئیحرامدا بێ ، بەڵام ئیحرامی حەج نا ، ئیحرامی ئەدەب کە نزیکی یار ناکەوێتەوە و قسەی ناشیرین لە دەمی دەرنەچێ . یاریشی شوبهاندووە بەو نێچیرەی لە حەرەمی مەککەدا بێ کە کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ . بەدکاریشی شوبهاندووە بە سەگ کە بە حەق و ناحەق هەمیشە لەخۆیەوە بوەڕێ .. ئەلێ : من لە ئیحرامی ئەدەبدام ، نە لە یار نزیك‌ئەبمەوە و نە وەڵامی قسەی ناپەسەندی وەك سەگوەڕی بەدکاریش ئەدەمەوە . یاریش وەك نێچیری ناو حەرەمی مەککە وایە کە کەس دەستی بۆ نابا .. ئیتر بەدکار لەبەرچی لەخۆیەوە ، بەخۆڕایی ، دەستی کردووە بە وەڕین و ، بۆ لە گەلە ناکەوێ ؟ چیی ئەوێ ؟

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (گم)دا بەیتی شەشەم و ، لە (مب) و (من)دا بەیتی پێنجەمە .

(٥) فوتوور : مەستێ و سستێ . مەرەض : نەخۆشێ . خەم : لوول .

وەکو پەروانە بە شەو هێندە بە موشتاقی دڵم ،
بە چرای کولمتەوە ، زەنگە عەسەس لێم بگەڕێ (٦)

لە جگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ
بێ خەطا کەس نییە ڕاضی کە لە ئەولادی درێ .. (٧)

---

واتە : لەبەرلەوەی لە هەر شتێك ، شتێکی وەك خۆی پەیدا نەبێ ، منیش،یادی چاوە سـت و مەسـت و نەخۆشەکانت بووە بەهۆی نەخۆشی بۆم و ، خەمی زولفە لوولەکانت بووە بە گرێ لە دڵما .

چاوی (چر) و (گم) : دیدەی . غەمی (گم) : خەمی .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (گم)دا بەیتی سێهەم و ، لـە (من)دا بەیتی حەوتەمە . لە (مب)یشـدا نییە .

لەنێوان (غەم) و (خەم)دا جیناسی موضاریع و ، لەنێـوان (خـەم) و (گرێ)دا تەناسوب هەیە .

(٦) عەسەس : پاسەوانی شەوی ناو شار .

واتە : ئەوەندە بەسوزەوە ، وەك پەروانە ، بە شەو دڵم بە ڕۆی چرای کولمتەوە ، لەوانەیە پاسەوانی شەویش کە هەر.شەوگەڕێکی لێوش بێ نەیگرێ ، لە سوزی دەروونم حـالی بێ و لێم گـەڕێ بێم‌بۆلات و ڕێم لێ نەگرێ .

یاخود : وەك پەروانەی شەو ، ئەوەندە بەسوز و پەلە دڵم بـۆ لات ، لەوانەیە پاسەوانی شەو گومانی شتێکی خراپم لێ بکا و ، لەبەر ڕۆناکیی کولمتدا کە تاریکیی شەوی ڕۆن کردووەتەوە ، بەدوامـا بگـەڕێ .

پەروانە بە شەو (کم) و (خا) : پەروانەیی شەو .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (گم)دا بەیتی حەوتەم ، لە (مب) و (من)دا بەیتی شەشەمە .

(٧) جگەرگۆشە : پارچەیەك لە جگەر . کینایەیە لە منـال کە پارچەیەکە لە جگەری دایك و باوکی .

نالی لەم بەیتەدا شیعرەکانی خۆی شوبهاندووە بـە منـالی مەزیز و خۆشەویـستی خۆی و ، مەعنا لێدانەوەشیانی بە هەڵـە شوبهاندووە بە لێدان و ئازاردانیان .

واتە : باش لە شیعرەکانم حالی بین و بەڕاستی مەعنایان لێبدەنەوە .

ڕاستیِ جەوهەرییە تیغی زوبانی « نالی »

نەرم و توند ، ئاوی گەلۆگیرە ، قسەی پێ دەبڕێ .. (٨)

---

شیعرەکانم منالی جگەرگۆشەمن و ، بە خراپ لێحاڵیبوونیان مەیانخەنە بەر فەلاقە و دارکاریێ .. هیچ باوکێك ڕازی نییە منالێکی خراپەیەکی نەکردبێ ، بە ناحەق لێی بدرێ ...

بێگومان ئێمەش گەلێجار نەمانتوانیوە ئەم داوا بەجێ و بەسۆزەی نالی بەجێبێنین ، بەڵام چار چییە ! لەسەریکەوە وردیی نالی خۆی و لە سەرێکیکەشەوە نوسینەوەی خراپ و نەبوونی جارانی ڕێنوسێکی تایبەتیی بۆ کوردیێ ، بوون بەهۆی ئەوە کە منالی خۆشەویستی نالی و دەیان شاعیری کولۆلیترمان بە شوولی هەنلوی تەڕی مەعنا لێدانەوەی خراپ لەشیان سوور بکرێتەوە ... هەولی ئیستای ئێمە بۆئەوەیە تازادەیەك فرمێسك لە چاوی ئەم جگەرگۆشانەی نالی بسڕینەوە و کەمێك نازی باوك و دایکیان پێ ئاشنا بکەینەوە .

نیوەی دووهەمی ئەم بەیتە حوسنی تەعلیلە بۆ نیوەی یەکەمی .

بێخەطا (گم) : بێخەتا .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (گم)دا بەیتی پێنجەم و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی چوارەمە .

(٨) جەوهەریێ : جەوهەردار ، دەبان . ئەڵێن : تیغی دەبان جەوهەری لێ ئەتکێ .. گەلۆگیر : لە نوزگا گیراو .

واتە : بەڕاستیِ زوبانی نالی تیغە و ، تیغێکی جەوهەرداریشە وەك تیغی دەبان .. تیغێکی نەرمە ، چونکە گۆشتە . توندیشە ، چونکە قسەکانی بەتوێکڵ و ڕەق و کاریگەرن . ئەوەندە ڕەوانە ئەڵێی ئاوە ، بەڵام ئاوێکی لە قوڕگا گیراوە ، بەربەرچی دوژمن ئەداتەوە و دەمی ئەبەستێ و مەودای قسەی لێ ئەبڕێ .

ئەشتوانین بڵێین : ( ڕاستیِ «بەمەعنا دژی درۆ» ) موبتەدایە و ، (جەوهەرییە) خەبەریەتی و ، ڕستەکەش گشتی خەبەری موبتەدایەکیترە کە (تیغی)یە و ، نیوە بەیتی دووهەمیش کۆمەڵە خەبەرێکیتری ئەم موبتەدایەن . بەمپێیە ئەبێ (جەوهەرییە) بە (جەوهەریە) بخوێنرێتەوە و ، مەعناش وای لێدێتەوە : ئاوەڕۆکی تیغی زوبانی نالی بریتییە لە ڕاستیِ .. تاد .

نەرم و توند (چر) و (عم) و (عب) و (من) : توند و نەرم . ئاوی : ئەمە

— ٩ —

ساقی ! وەرە ، مەیخانەیی دڵ کۆنە ڕەحیقی
گەر مایلی طەوفی حەرەم و بەیتی عەتیقی ! (١)

یەك ڕەنگم و بێ ڕەنگم و ڕەنگین بە هەمۆ ڕەنگ
بەم ڕەنگە دەبێ ڕەنگ ڕژێی عیشقی حەقیقی (٢)

---

تێکستی تەنها (عم) و (گم)ە . (چر) و (عب) و (من) : ناوە . (چن) و (ك) : ناو و . (اح) و (خا) و (خب) : ناو . بۆ هەر سێ ئیحتیماڵەکە ئەگونجێ . گەلۆ (گم) : گەرۆ !

—٩—

(١) ڕەحیق : مەی . طەوف : طەواف ، بەدەوراگەڕان . حەرەم : حەرەمی مەککە . بەیتی عەتیق : البیت العتیق ، کۆنماڵ ، کەعبە . ئیشارەتە بە ئایەتی ( إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا ) .

واتە : کاکەی مەیگێڕ ، ئەگەر حەزت لەوەیە بەدەوری حەرەمی مەککە و ماڵی کەعبەدا بسوڕێیتەوە و تەواف بکەی ، وەرە نــاو مەیخانەی دڵم ، چونکە دڵم جێگای مەشــقی ڕاســتەقینەیە و شــەرابی کۆنی بێگەردی خۆشەویستیی بێمەبەست و نیازی تیایە . .

دڵ ، کۆنە ڕەحیقی (عم) : کە تــۆ کۆنە ڕەفیقــی . (گــم) : دڵ کۆنە ڕەفیقی . .

(٢) ڕەنگڕژێ : ڕەنگڕشتن .

واتە : وەرە ناو مەیخانەی دڵم ، لە هیچلایەك دۆستێکی لەری وەك منت دەسگیر نابێ، من یەك ڕەنگم و دۆڕۆ نیم و خوا بە یەك ئەزانم و کەسی کەی ناکەم بە هاوبەش . . ( بێڕەنگم و لە دڵداریدا تەواوم و فەوتاویش ڕەنگی نییە ، یاخود توانای ئەوەم نییە دەرد و مەینەت لە خــۆم دوورخەمەوە و قازانج دەستی خۆم بخــەم . . هەمۆ ذات و صــیفاتی جیهان لــە مندا کۆبووەتەوە وەك لەشساغی و نەخۆشی و گەورەیی و بچوکی و زانایی و نەزانی و هوشیاری و بێهۆشی ) . لە هــەمۆ ڕوویــەك و دیمەنێکی ئەم جیهانەدا دەرئــەکەوم و ، لــە هــەمۆ لایەك نیشــانەی بــوونم هــەیە . خۆشەویستیی ڕاستەقینەش ئــەبێ بەمجۆرە ڕەنگی بۆ بڕێژرێ کــە من بۆم ڕشتووە . (یاخود خوا کە ڕەنگڕێژی مەشــقی ڕاستەقینەیە ، ئەبێ

مرواریی ئەشکم وەکو یاقوتی ، ڕەوانە
ساقی ! بدە لەو لەعلە شەرابێکی عەقیقی .. (٣)

دائیم لە حەضەردا سەفەری بە .. لە وەطەنا
غوربەتکەش و عاجز بە ، ئەگەر ئەهلی طەریقی (٤)

---

بەمجۆرە بکا ) (*) .

لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا ، بەتایبەتی لە وشەی (ڕەنگ زۆری )دا هەموو نوسخەکان (چر) و (چن) و (خا) نەبێ کەوتوونەتە هەڵەوە .

(٣) مرواریی ئەشك : فرمێسکی وەك دەنکی مرواری سپی. ڕەوان : ڕۆیشتوو، جاری . لەعل : بەردێکی گرانبەهای سوورە . عەقیق : ئاقیق ، بەردێکی گرانبەهای سووری ترە .

واتە : فرمێسکم وەك مرواریش بە سپیەتی و ، وەك یاقوتیش بە سوری ئەڕوا لە چاوم .. مەبەستی لەوەیە بلێ چاوم مرواریش و یاقوتیشی لێ دائەوەری .. دەسا تۆیش ، کاکەی مەیگێڕ ، لە لەعلی لێوی سوری یار شەرابێکی وەك عەقیق سوورم بۆ تێکە ، بۆئەوەی بیم بە خاوەنی ئەم هەموو گرانبەهایانە ..

لەو ( « پەراوێزی » چن ) : ئەو . بەمپێیە ئەبێ ( شەرابێکی )یش ( شەرابێکە ) بێ . عەقیقی (کم) و (عب) و (من) : حەقیقی .

(٤) حەضەر : خانەنشین . غوربەتکەش : ئەوەی لە نامۆییدا بژی . ئەهلی طەریق : ئەهلی طەریقەت . ئەوەی ڕێگەی ڕاستی گرتبێتەبەر .

واتە : ئەگەر بەڕاستی ئەهلی طەریقەتی یا ڕێگەی ڕاستت گرتووەتەبەر، خۆت بە نیشتەجێ دامەنێ و ، لەکاتی نیشتەجێیەتیدا خۆت بە ڕەوەندی بزانە ، چونکە ڕێگای مەرگت لەبەرە .. لە ولاتی خۆتا خۆت بە نامۆ دابنێ، چونکە نیشتمانی ڕاستەقینەت گۆڕستانە و سەرەنجام لەبێ لەوێ ئۆقرە بگری و نیشتەجێ بیت .

دائیم (چر) و (عم) و (کم) و (ك) و (خا) و (خب) : دایم . سەفەری بە (ت) و (عب) و (من) و (خب) : سەفەری بەو . عاجز (چن) و (مم) و

---

(*) ئەو ئەندازە لێکدانەوەیە کە خستوومانەتە نێو دوو کەوانەوە ، هی ( چنگنیانی ) و ( مەزناوەیی )یە لە پەراوێزی نوسخەی (چن)ەوە لە فارسییەوە کردوومانە بە کوردی .

خەلقێ کە هەمو کۆدەکن و بەستە زوبانن ،
با بێن و لە « نالی » بیەن شیعری سەلیقێ (٥)

— ١٠ —

( بَرِقَ البَصَرَ ) لەبەر بەرق تەلەئلوئی لەئالی
( خَسِفَ القَمَرَ ) لە ئیشراق قیامەتی جەمالێ (١)

---

(ك) و (من) و (عب) و (اح) : مەحرۆن . طەریقی (عب) : حەقیقی !

(٥) کۆدەك : منال . بەستە زوبان : زمان بەسراو ، بێ دەسەلات . سەلیقێ : لە ( سەلیقە )وە هاتو ، ئەوەی لەخۆیەوە بێت و خۆ پێوە ماندو کردنی نەوێ .

واتە : ئەم خەلقە هەمو منال و نەفامن و زمانیان بەیەکادێ ، هیچ لە شیعری ڕاستەقینە لێناگەن . . بلێن با بێنە لای (نالی) ، شیعری خۆیان بۆ بخوێنێتەوە کە وەك ئاوی ڕەوان لەخۆیەوە دێ ، بەلکو زمان و بیریان بکرێتەوە و فێری چەشکردنی شیعر و ئەدەب بن .

دوور نییە مەبەستی نالی لەم بەیتە بەربەرچدانەوەی هەندێ ڕەخنەگر بوبێ کە بە چاوێکی بێبایەخ سەیری شیعرەکانیان کردبێ .

کە هەمو کۆدەکن و ( « پەراوێزی » چر ) و (کم) و (گم) و (عب) و (من) : کە طونەیلین و هەمو . (چن) : کە هەمو کینك و کەمز و . کینك : بە فارسی (کینیك) واتە زەرد و سوك . سەلیقێ (چر) و (خا) : دەقیقێ . (کم) و (گم) و (عب) و (من) : حەقیقێ .

— ١٠ —

(١) بەرق : شەوق دانەوە . تەلەئلوء : بریسکانەوە . لەئالی : جەمعی لوئلوئە بەمەعنا مرواری . ئیشراق : هەلهاتن .

نالی لەم بەیتەدا ددانەکانی یاری شوبهاندووە بە دانەی مرواری و ، دەرکەوتنی ئەو ددانانەی شوبهاندووە بە دەرکەوتنی برۆسکەی ئاسمان کە چاو لەئاستیا ئەبلەق ئەبێ . ڕۆیشی شوبهاندووە بە ڕۆژی قیامەت لەوەدا کە دەرکەوتنی وەك دەرکەوتنی ڕۆژی قیامەت دنیا ئەشلەژێنێ و ، دەرکەوتنی ئەو ڕووەشی کردووە بە هۆی مانگ گیران .

وانە : لەبەر شەوقدانەوە و بریسکانەوەی ددانە وەك مرواریەکانی یار ، چاوی تەماشاکەران ئەبلەق بۆ . . لەبەر هەلهاتنی ڕۆژی جوانییشی ،

نیە دیدەیی چ مەردوم ، نیە مەردومی چ دیدە
لە فرۆغی خەددی فاریغ ، لە خەیالی خالی خالیٖ (۲)

سەری هەردو کولمی داخۆ گولی نەوبەهارە ، یا خۆ
طەرەفی نەهارە ، زولفی ( زُلَفٌ مِنَ اللَّیالیٖ ) !؟ (۳)

---

کە رەعد دەرکەوتنی ڕۆژی قیامەت وایە ، مانگ گیرا ..

لەنێوان (بَرق) و (بەرق)دا بەدیعەن وشەئارایی و بەمەعنا طیباق و ، لەنێوان (بەر) و (بەرق)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (خَسف) و (ئیشراق)دا طیباق هەیە .

لەبەر بەرق (عم) و (کم) و (من) و (خب) : لە بەرقی . ئیشراق (عم) و (کم) : شەرقی .

(۲) مەردوم ـ ی یەکەم ـ : خەڵك . مەردوم ـ ی دوەهەم ـ : گلێنەی چاو . فرۆغ : گەشی و ڕۆناکی . خەد : کولم . فاریغ : بەتاڵ . خالی : چۆڵ .

واتە : کەس لەو جیهانەدا نەماوە گیرۆدەی جوانیی یار نەبوبێ .. چاوێك نییە ڕۆناکی و شەوقی چاوی ئەوی تیا نەبێ و ، گلێنەی چاوێکیش نییە ڕەنگی خالی ڕەشی ڕوومەتی ئەو نەخشی تیا نەبەستبێ .

نالی ، لەمبەیتەدا سەرەڕای ئەوە کە ئەیەوێ چاوی هەموکەس بە ڕۆناکیی کولمی یار و ، گلێنەی چاوی بە ڕەشیی خالی ڕوومەتیەوە خەریك بکا ، ئەیەوێ بشڵێ هۆی بریقەدانەوەی چاوی خەڵك بریتییە لە ڕۆناکیی کولمی یار و ، هۆی ڕەشیی گلێنەی چاویان ڕەشیی خالی ڕوومەتیەتی . بۆیە (فرۆغی خەد) و (خەیالی خالی) بە شێوەی لەف و نەشری مورەتتەب بەدوای (دیدە) و (مەردوم)دا دێنێ .

لەنێوان (دیدەیی چ مەردوم) و (مەردومی چ دیدە)دا جیناسی قەلب و ، لەنێوان (خالی) و (خالی)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

دۆ پارچەکەی نیوە بەیتی یەکەم لە (عم) و (کم)دا لەجێی یەکتردان .

(۳) داخۆ : ئاخۆ ، ئایا . یا خۆ : یاخود . طەرەف : بەش . نەهار : ڕۆژ .

نالی لەمبەیتەدا جارێك تەنها سەرنجی دۆ گۆنای یار ئەدا و بە گولی سەرەتای وەرزی بەهاری ئەشوبهێنێ کە بەهار لە ترۆفی لاویدایە و گولیش لەوپەڕی گەشی و جوانیدا .. جارێکیش لەگەڵ زولفیدا سەیر لەکا و ، سوور و سپیەتیی کولمی گەش و ڕەشیی زولفی ڕەش بەراورد ئەکا و ، هونەرمەندانە شەوی تاریك و ڕۆژی ڕوناك لە ڕوومەتی یاردا

یەمی دیدە پڕ لە مەرجان ، وەك یەشمی ئابدارە
شەبەیە شەیەی زولفی سیاهی وەك زوخالی (٤)

---

کونەکانەوە کە بێ یەك نایانگرێ و یەکتر تەواو ئەکەن و جوانیی هەرکامیان بە بەراورد لەگەڵ هیی ئەویان دیار ئەدا .

واتە : ئەگەر تەنها سەیری سەری دۆ کولمـی ئەکەی ، ئەڵێـی گوڵی سوری تازە بەهاری جوان و لاو و بۆنخۆشـە . ئەگەر بە بەراورد لەگەڵ زولفیش سەیری ئەکەی ، ئەڵێی ئەوکاتەیە شەو و ڕۆژ لە یەك نزیك ئەبنەوە و ڕۆناکیی ڕۆژ لە ئاسۆی تاریکدا لیزگ ئەدا ، یا لەوکاتەیە کە ڕۆژ لە زەردەپەڕی ئێوارەدایە و تاریکی خەریکە هێرش بێنێ .

لەنێوان (داخۆ) و (یاخۆ) و ، (بەهار) و (ئەهار)دا جیناسی لاحیق.و ، لەنێوان (ئەهـار) و (لەیل)دا طیباق و ، لەنێـوان (زولف) و (زلف)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە .

داخۆ (کم) : ئاخۆ . نوسخەکانی‌تر کۆمەڵێ جیاوازی‌تریان تیا هەیە ، بەڵام هەموی هەڵەیە .

(٤) یەم : دەریا . مەرجان : گیانداریکی دەریاییە وەك گیا وایە ، چەسپ بووە بە زەوییـەوە ، سـور و سـپی و ڕەشـی هەیە . بـۆ جوانی لە جەواهیرسازیدا بەکاری‌دێنن . یەشم : بەردیکی ساف و بریقـەدار و ، نوختە نوختەیە ، نوختەی سپی و سەوز و شینی تیایە . شەبە : شەوە . مۆرۆیەکی ڕەشە .

نالی لەم بەیتەدا چاوی باری شوبهاندووە بە دەریای پڕ لە مەرجان و مەرجانەکەش ئەو گلەیەیە کە چاوی پێ لەڕێژێ ، هەروا شوبهاندویەتی بە یەشم کە نوختە نوختەی ڕەش و سـپیی تیایێ ، نوختە ڕەشـەکانی گلەکـەیە و ئاوداریـیەکەشی سـپێنەکەی چاوەتی . بـۆ دەربـڕینی زیادەڕەویش شەوەی شوبهاندووە بە زولفی وەك خەڵوز ڕەشی یار ، لەجیاتی ئەوەی زولفی بشوبهێنێ بە شەوە ..

واتە : دەریای چاوی یار پڕە لە مەرجانی ڕەشی گلە و ، سپێنەی چاوەکانی لەگەڵ ئەو گلەیەی پێی ڕشتووە وەك یەشمی ئاودار وایە کە نوختە نوختـەی سپی و ڕەشی تیایـە . زولفیشی ئەوەنـدە ڕەش و بریقەدارە تەنانەت شەوەی ڕەش و بریقەداری پێ ئەشوبهێنرێ .

یەمی (چر) و (جن) : یەم . دیارە (یەمی)یە . (ك) و (اح) : هەم . وەك (چر) : دەڵێ !. («پەراوێزی» چر) و (عم) و (گم) و (مب) و (من) : لـە ،

به مەلاحەتی تەکەللوم هەمو زەمزەم و مەلیحی
به فەصاحەت و تەبەسسوم هەمو کەوثەر و زولالی (٥)

---

بەڵام له (عم) و (گم)دا لەگەڵ (و)ێکی معطف لەپێش (له)وه . (ت) و (خب) : وەکو . شەبەیه شەبیه (شەبیهی) : ئەمه تێکستی (چن)ه . (چر) و (عب) و (خب) و (اح) : له شبیه شبه . ئەگونجێ به (له شەبەیه شیبهی) و به (له شەبیهی شەبه)ش بخوێنرێتەوه . (عم) و (گم) : شەوەیه شەبیهی . (کم) : له شبیهی شبهی . دیاره (له شەبیهی شیبهی)یه . (ت) : له شەبیه شبه . دیاره (له شەبیهی شەبه)یه . (ك) : شەبەهـ شەبیهی . (خا) و (من) : له شەبیهی شیبهی . زولفی (چر) و (کم) و (عب) و (خا) : زولفەینی . (ت) و (من) و (خب) : زولفەین . دیاره (زولفەینی)یه . سیاهی : ئەمه تێکستی (ك)ه . (چر) و (عب) و (من) و (خا) : سیاه و . (چن) و (ت) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) و (خب) : سیاه . بەپێی وشەی پاشەوەی به (سیاهی) یا (سیاه و) ئەخوێنرێتەوه . (عم) و (گم) سیاهتەر . (کم) : سیبەهـ . وەك زوخالی : ئەمه تێکستی (چن)ه . (چر) : لەعلی ئالی . (عم) و (گم) : له خالی . ( « پەراوێزی » چر ) و (ت) و (ك) و (اح) و ( « پەراوێزی » خا ) : ئابداری . (عب) و (خب) : لەعل ئالی . دیاره (لەعل و)وه . (خا) : لەعل و ئالی .

(٥) مەلاحەتی تەکەللوم : خۆشی و بەتامیی قسه . زەمزەم : بیری زەمزەم له مەککه . فەصاحەت : قسه ڕەوانی . تەبەسسوم : زەردەخەنه . کەوثەر : حەوزی کەوثەر له بەهەشتدا . زولال : سازگار .

واته : دەمی یار له ڕۆی خۆشی و بەتامیی قسەوه ئەڵێی ئاوی زەمزەمی تیایه . لەبارەی قسه ڕەوانی و ناسکیی زەردەخەنەشەوه ، لێوی وەك لێواری حەوزی کەوثەره .

مەلاحەت و (چن) و (کم) و (ت) و (ك) و (اح) : مەلاحەت . بۆ ( مەلاحەت و ) ( مەلاحەلی )یش دەستئەدا . زەمزەم و : («پەراوێزی» چر ) و (کم) و (ك) و (عب) و (من) و (خب) : زەمزەمه . (چن) : زەمزەمه و . (ت) : زەمزەم . دیاره (زەمزەم و)وه . فەصاحەت و (چن) و (ك) : صەباحەت . بۆ (صەباحەت) و (صەباحەلی)یش دەستئەدا . (کم) : صەباحەلی . (اح) و (عب) و (خب) : صەباحەت و . (من) : فەصاحەلی . کەوثەر و ( « پەراوێزی » چر ) و (چن) و (کم) و (ك) و (عب) و (من) و (خب) : کەوثەره . (ت) : کەوثەر . بۆ (کەوثەر و) و (کەوثەره)یش دەستئەدا . بەیتەکە تێکڕا له (عم) و (گم)دا بەمجۆرەیه .

نەظەرم پڕە لە نووری شەو و ڕۆژی طەلعەتی تۆ
کە بە ڕۆ شوعاعی شەمسی ، بە برۆ خەمی هیلالی (٦)

ڕوخی تۆ گولێکە صەد وەك هەزاری عاشق ، ئەما
لە هەمو چەمەن دیارە بە ئوصوولی نالە « نالی » (٧)

---

به صەباحەتی تەبەسسوم هەمو زەمزەمی مەلیحی
بە مەلاحەتی تەکەللوم هەمو کەوثەری زولالی

(٦) نەظەر : چاو . طەلعەت : ڕوو . شوعاع : تیشك . خەمی : چەماوەیی .

واتە : هەمیشە دیمەنی شەو و ڕۆژی ڕووی تۆم لەبەرچاوایە و چاوم لێی پڕە . ئەوەتە کە سەیری ڕوومەتت ئەکەم تیشکی ڕۆژم دێتە بەرچاو و، کە سەیری برۆی چەماوەت ئەکەم مانگی یەکشەوەم بۆ دەرئەکەوێ .

لە کۆکردنەوەی (شەو) و (ڕۆژ) و ، (نوور) و (شەو)دا طیباق و ، لە کۆکردنەوەی (ڕۆژ) و (طەلعەت)دا کە بەمەعنا (هەڵهاتن)یش هاتووە تەناسوب و ، لەنێوان (بە ڕۆ) و (برۆ)دا بەپێی شێوەنووسی جاران کە هەردووکیان وا ئەنووسران (برو) جیناسی تەواو و ، لەنێوان (شەمس) و (هیلال)یشدا تەناسوب هەیە .

نووری (چر) و (مم) و (کم) و (گم) : زیبی . (چن) و (ك) : نور . دیارە (نوری)یە . (مب) و (من) : زیب و . ڕۆژی (جر) و (چن) و (ت) و (مب) و (اح) و (خب) : ڕۆژ . دیارە (ڕۆژی)یە ، لە (مب)دا نەبێ کە لەوانەیە (ڕۆژە) بێ چونکە (زیبی)یش (زیبە) بۆ . (من) : ڕۆژە . بە ڕۆ (ت) : ڕۆ ؛ بە برۆ (کم) و (عب) و (من) : برۆ .

(٧) ڕوخ : ڕوو . هوزار : بلبل .

واتە : ڕوومەتی تۆ گوڵێکی تاقانەی بێهاوتایە هەزاران بلبل عاشقی بوون و بۆی ئەخوێنن ، بۆیە ئەبوا دڵدارێکی وەك نالی لەناو کۆڕی ئەم هەمو دڵدارانەدا هەر دیار نەبوایە .. کەچی لە هەمو لایەکی چەمەن و گوڵزار و لەناو هەمو دڵداراندا بەگوێرەی ناڵەناڵی خۆی و بە هاوار و کوڕوزانەوەیدا دیارە ، چونکە دڵدارێکی ڕاستەقینەیە ..

ئەشکونجێ (نالە «نالی») بە (ناڵەناڵی) بخوێنرێتەوە و مەعنای بەیتەکە وای لێبێتەوە : ڕووی تۆ گوڵێکە صەد دڵداری وەك بلبلی هەیە ، بەڵام بلبل لەناو هەموویاندا بەشێوەی تایبەتیی ناڵەناڵی خۆیدا دیارە . بەپێی ئەم مەعنایە بەشی دووەمی وشەی (ناڵەناڵی) کە (نالی)یە نیشارەت ئەبێ

— ١١ —

## بنوارە نەوبەهار و فوتوحالی گولشەنی
## گول زاری کردەوە ، لە دەمی ، غونچە پێکەنی (١)

بۆ نازناوی (نالی) و بلبلەکە (نالی) خۆی لەبیر .

لەنێوان (زوخ) و (هوزار)دا هەم طیباق و هەم تەناسوب هەیە ، چونکە (زوخ) ناوی باڵدارێکی ئەفسانەییشە . هەروەها لە کۆکردنەوەی (صەد) و (هوزار)دا بەپێی شێوەی نوسینی جاران کە ئەنوسرا (هزار) تەناسوب هەیە . لەنێوان (نالە) و (نالی)یشدا جیناسی موضاریع هەیە .

وەك (چن) و (عب) و (من) : بەرگ . (عم) و (کم) : بەرگ و . بەرگ : بەرە ، گەڵا .

— ١١ —

(١) فوتوحات : بەرەکەت . گولشەن : باخێ کە گوڵی زۆری تیابێ .

واتە : سەیری وەرزی بەهاری نوێ و بەرەکەتی باخچەی گوڵان بکە ، هەر گوڵە و گوڵی لێ ئەبێتەوە ، گوڵ دەم ئەکاتەوە ، هەر کە ئەو دەم ئەکاتەوە خونچە بەدەمیەوە پێئەکەنێ و ئەبشکوێ .. ئەڵێی خونچە بێچوی گوڵە ..

کۆکردنەوەی ( گوڵ ) و ( زار ) وشەکارییەکی جوانە ، هەرچەند مەبەست لە ( زار ) دەمە و شوێنی گوڵ نییە . بۆیە لە ( گوڵ زار )دا تەورییەیەکی بەدیمەن هەیە ، ئەوەتە بەڕواڵەت مەعنای (باخ) و لەڕاستیدا مەعنای (دەم) ئەگەیەنێ . هەروەها بە ڕواڵەت لەنێوان ( زاری ) و ( پێکەنی )دا طیباق هەیە .

نەوبەهار و (ك) و (اح) : نەوبەهار . ئەمیش هەر (نەوبەهار و )وە . زاری (چر) و (لو) و (عب) و (اح) : زار . ئەمیش هەر ( زاری )یە . کردەوە (چن) و (کم) و (ت) و (اح) و (خب) : گرتووە ، وەك بڵێی پێی گرتووە ، یا گرتەوە ، وەك چۆن ئەڵێن چۆلەکە دەمی گرتەوە . (خا) : گرتووە . لە دەمی (چر) : لیرەمی . ئەبێ ئیشارەت بێ بە (باخچەی ئیرەم) کە لابەلی ( إرَمَ ذاتِ العِمادِ ، التي لم يُخلَقْ مِثلُها في البِلادِ ) باسی لێ ئەکا . (ت) و (لو) : لە دم . (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خب): لەم . دیارە هەموی ( لە دەمی )یە .

لەم پارچەڵۆکە هەورە بە قەد ڕۆی هەمۆ زەمین
بەم ژاپەڵە قەدیفەیی سەوزی عەجەب تەنی (٢)

بورجی درەختی سەوز و بولەندی وەك ئاسمان
پێوە شکۆفە هەروەکو ئەنجم بەرەوشەنی

---

(٢) پارچەڵۆك : پارچەی بچوك . بە قەد : ئەوەندەی . ژاپەڵ : تـان ( تانی تان و پۆ ) . قەدیفە : قەیفە . تەنی : تەنین ، چنینی ژاپەخ .

نالی لەم بەیتەدا ئەوبەهاری شوبهاندووە بە وەستا و ، دڵۆپی باران کە لە ئاسمانەوە دائەچۆڕێ ـ بە ژاپەڵ و ، گیای سەوزی ڕۆی زەویی بە فەرش و ، ڕوانی گیای لەسەر زەوی بە چنینی فەرش داناوە .

واتە : سەیری ئەوبەهار بکە چۆن وەستایەکە ( دیارە دانی وەستایی لەپاڵ ئەوبەهار مەجازە ) : لەم پارچە بچوکەی هەور و ، بە ژاپەڵی بێ پۆی بارانی وەك تاڵە دەزو ، پارچە قەیفەیەکی سەوزی ئەوەندەی ڕۆی زەوی ـ گەورەی چنی !

ئەشتوانرێ ( پارچەڵۆکە ) بە ( پارچە لۆکە ) بخوێنرێتەوە و ( هەور ) بشوبهێنرێ بە ( لۆکە ) .

بە قەد ڕۆی هەمۆ زەمین (مم) و (کم) : بە قـەد ڕۆی هـەمۆ زەوی . (کم) و ( اح) و (خا) : بە قەدەر ڕۆی هـەمۆ زەمین . (من) : بـە ئەددی ڕووی زەمین . (خب) : بە قەدەر ڕووی زەمین .

(٣) شکۆفە : هەڵاڵە . ئەجم : ئەستێرە .

نالی لەم بەیتەدا درەختی شوبهاندووە بە ئاسمان لەوەدا کـە بەرز و دیاریە و وەك ئاسـمان گومەزێ ئەنوێنێ و ، هـەڵاڵەی تـازە دەرهاتوی درەختیشی شوبهاندووە بە ئەستێرەی ئاسمان لە سپیەڵی و ڕۆشنیدا .

واتە : شوێن هەڵاڵەکانی درختـە سەوز و بەرزەکان ، هەڵاڵەی تازە پشکوتو سپی لەکاڵەوە پێیـانەوە ، وەك بڵێی لەستێرەن بـە بورجەکانی ئاسمانەوە .

بورجی (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : بورج . دیارە (بورجی)بە . درەختی (چـر) و (عـم) و (کـم) و (گـم) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : درەخت . بۆ (درەختی)یش دەستنەدا . سەوز و (لو) و (عب) و (من) و (خب) : سەوزی . بولەندی (چر) و (مم) و (کم) و (گم) و (اح) و (خا) : بولەندە . (خب) : بولەند . بۆ هەردوکیان لەنی .

بەزمی هوزارە ، قەل فڕی ئەغیارە ، دەوری گوڵ
سۆفی ! بڕۆ ، مەبە بە دڕك ، تۆ لە ئێمە نیی .. (٤)

هەر دارە بەرگ و ، هەر گوڵە ڕەنگی خەڵاتیە
هەر جۆدی ئەوبەهارە کە عالەم دەکا غەنی (٥)

دیسان لە بگرە بەردەیی گوڵچین و باغەبان
بولبول کەناری گرت و دڵی غونچە ڕاچنی (٦)

---

(٤) هوزار : بلبل : قەل‌فڕ : کینایەیە لە دەرکردن و دوورخستنەوە . ئەغیار : بێگانە و ناحەز . نیی : نیت .

واتە : سەردەمی ڕابواردنی عاشقانە کە وەك بلبل وان و ، کاتی دەرکردن و دوورخستنەوەی بەدکار و ناحەز و بێگانەیە و ، ڕۆژ ڕۆژی گوڵانە .. کەواتە ئەی وشکەسۆفی جێی تۆ لای ئێمە نییە .. تۆ نە بلبلی و نە گوڵی .. تۆ بێگانەی و .. لە ئێمە نیت .. دەسا لێمان مەبە بە دڕك و بڕۆ دوورکەوەرەوە ، دڕك و گوڵیان پێکەوە نەرواوە ..

مەبە بە دڕك (لـو) : بڕۆ بە دەرەك . دەرەك : چینی بنەوەی دۆزەخ . (خب) : مەبە بە دەرەك ..

(٥) جود : بەخشش . غەنی : دەولەمەند ، بێ‌ئیحتیاج .

واتە : دنیا هەمو ڕازاوەتەوە .. هەر درەختێ ئەگری بەرگی گەڵای نوێی پۆشیوە و ، هەر گوڵێك ئەبینی ڕەنگێکی تازەی خەڵات کراوە .. مەبەستی لەوەیە درەختە ڕووتەکانی زستان هەمو گەڵایان کردووەتەوە و ، ناوباخ و ڕووی زەوی هەزاران گوڵی ڕەنگاوڕەنگی لێ ڕواوە .. ئەمە هەمو دەس و دەهەنەداریی بەهارە وا جیهانی دەولەمەند کردووە و ، بەرگی کردووەتە بەری درەختی ڕووتاوە و ، زەویی بە گوڵی هەمەجۆرە ڕازاندووەتەوە .

بەرگ و (چر) : بەرگی . ڕەنگی (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : ڕەنگ . ئەبێ ( ڕەنگی ) بێ . دەکا (من) : ئەکا .

(٦) بگرە بەردە : بگرە و بەردە ، گیرە و کێشە . گوڵچین : ئەوەی گوڵ کۆئەکاتەوە و ئەیکا بە چەپك . باغەبان : باخەوان . ڕاچنی : داچڵەکا .

لەم‌بەیتەدا یار و دڵدارێکی ڕاستەقینە هەیە کە (بلبل) و گوڵن و ،

خارایی سەوز و شینی لەبەرکردووە جەبەل
دامێنی وەردی سوورە کە دەستم بە دامەنی ! (٧)

---

باخەوان و گولچینیش هەن کە کێشەیانە بۆ سوودێکی لەسکی ڕۆژانە . گوڵ ئەیەوێ بمێنێتەوە و بە ڕۆژی بلبلەوە بشنێ و ، بلبلیش ئەیەوێ بۆ گوڵ بجریوێنێ .. باخەوانیش خزمەتی گوڵ ئەکا و دڵی بە گوڵەکانی خۆشە و ئەیەوێ خۆی لێ بەهرەمەند بێ ، گولچینیش خواخوای ئەوەیەتی خونچەیەك زۆر پێشکوێ و ببێ بە گوڵ و بیکاتەوە و بیبا بەدیاری یا بیفرۆشێ .. نالییش ئەڵێ لەم بکرە.و بەردەی باخەوان و گولچینەدا کە هەرچۆن بێ بە زەرەری گوڵ و بلبل تەواو ئەبێ ، بلبل باخی لێ ئەبێ بە دۆزەخ و هەڵئەفڕێ و دوور ئەکەوێتەوە و ، گوڵیش ڕائەچڵەکێ کەوا هەم بلبلی لێ دوورکەوتەوە و هەم هاکا گولچینیش کردیەوە و بردی و سراندی ..

ئەشتوانین بلبل و خونچە بە دڵدار و یاری ڕاستەقینە مەعنا لێبدەینەوە ، بڵێین کە باخچە و باخ وایان لێهات گولچین و باخەوان زۆریان لێ بکەن ، ئیتر دڵداران و یاران دوور ئەکەونەوە و زۆریان نایێ خۆیان دەرخەن و ، ئەو گۆشەگیر ئەبێ و ئەمیش لە خەفەتا دڵی ڕائەچڵەکێ ..

خۆ ئەگەر ( بکرە بەردەیی ) بە ( بیکری پەردەیی ) بخوێنینەوە ، وەك لە هەندێ نوسخەدا نوسراوە و پاشان ئیشارەیان بۆ ئەکەین ، ئەوا مەعنایەکی‌تری ناسك دێتە ئاراوە و ، ( بیکر ) واتە (کچ) بالەبانەکە ئەبێ و پاسەوانیی (باخەکەی) خۆی ئەکا و ، مەبەست لە (گولچین)یش لای ئەولا و ، مەبەست لە (بولبول کەنار گرتن)یش ئەوە ئەبێ کە بەری ئەولا جێیەکی تایبەتی بۆ خۆی بگرێ و ، مەبەستیش لە (ڕاچنینی دڵی خونچە) ترس لێنیشتنی خونچەی نەپشکوتوی (بیکر)ەکە ئەبێ ..

بکرە بەردەیی (عم) و (کم) و (گم) : بیکری پەردەیی . (ت) و (من)یش هەر لەم ئاقارەدا ئەسوڕێنەوە، بەڵام بە هەڵەوە . گولچین و (عم) و (گم) : گولچینی . (ت) و (خا) و (خب) : گولچین . بۆهەردوکیان ئەگونجێ .

(٧) خارا : جۆرە قوماشێکی ئاوریشمە لە جوانیدا وا دێتە پێش چاو کەوا شەپۆل ئەدا . دوو جۆری هەیە : سادە و خەت خەت . جەبەل : چیا . دامێن : داوێن ، بنار . وەرد : گوڵ ، یا زەویی کێڵراو کە ئامادە کرابێ بۆ تۆو یا داچاندن .

واتە : شاخ بەرگی گیا و گەڵای سەوز و شینی پۆشیوە کە لە

وادیێ بووە بە وادیی پڕ نووری ( طوور )ی ( نار )
( نەعلەین ) لە پێ فڕێ بدە « نالی » بە ( ئەیمەنی ) (٨)

---

شەپۆلدانەوەی ڕەنگدا ئەڵێی پارچەی خارایە لەبەریا . داوێنی شاخیش هەمۆ هەر گوڵاڵە سورەیە ، یا زەویی هەلگێڕراوەیە سور ئەکاتەوە .. دەستم بە داوێنی شاخ بێ و لە خێـر و بەرەکەتی ئەو گوڵاڵە سورەیە یا ئەو وەردە هەلگێڕراوەیەم دەسگیر بێ ! .

هێنانی ڕستەی (دەستم بە دامەنی) بۆئەوەیە لێ‌بکەین کە ئەشتوانرێ ( جەبەل ) بە ( ئافرەتی بالابەرز ) مەعنای لێ‌بلرێتەوە و ، ئەو کاتە مەعنای ( وەردی سوور ) و چۆنیەتیی ( دەس بە دامێن بۆن )یش ئاشکرا ئەبێ ..

لەنێوان ( سەوز ) و (شین) و (سوور)دا تەناسوب و ، لەنێوان (دامێن) و ( دامەن )دا جیناسی ناقیص هەیە .

شینی (اح) : سووری. دامێنی (چر) و (مم) : دامێن. دیارە (دامێنی)یە. (گم) : داوێنی . وەردی (چر) : وەردە . (اح) : وەرد . بۆ ( وەردی ) و ( وەردە )یش ئەگونجێ . سوورە (چر) و (اح) : سەوزە .

(٨) وادیێ : شیو . طوور : کێوی طوور . ( نەعلەین ) : جوتە نەعل ، جوتە کەوش . ئەیمەن : هێمن .

نالی لەم بەیتەدا ئیشارەت ئەکا بۆ ئایەتی ( فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ اِنَّكَ بِالوادِ المُقَدَّسِ طُوىً ) لە باسی حەزرەتی مووسادا ، واتە : پێلاوەکانت داکەنە ، چونکە تۆ لە شیوی پیرۆزدای کە شیوی داوێنی کێوی طوورە کە نوری خوای تیا دەرکەوت بۆ مووسا و شاخەکە بەو نورە گڕی لێ‌بەربوو سوتا .. هەروەها لە وشەی (ئەیمەن)یشدا ئیشارەت بە دوو ئایەتی‌تر کراوە کە هەر باسی ئەم بابەتە ئەکەن ، ئەوانەش ئایەتی ( .. مِنْ جانِبِ الطّورِ الاَیْمَنِ ) و ( .. مِنْ شاطِئِ الوادِی الاَیْمَنِ )ن .

واتە : دۆڵ و شیو بەهۆی داهاتنی بەهارەوە وەك شیوە پڕ لە نورەکەی طوری لێ هاتووە کە گڕی لێ‌بەربوو .. کەواتە تۆیش ئەی نالی ، وەك مووسا، پێلاوەکانت داکەنە و بەهێمنی بە پێی ڕۆڵی بەسەر ئەو گوڵ و گیایەدا بڕۆ .

لەنێوان (نوور) و (طوور)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (نوور) و (نار)دا جیناسی لاحیق و تەناسوب و، لەنێوان (وادیێ) و (نەعلەین)دا تەناسوب و، لە (وادیێ) و ( نەعلەین ) و ( هێمنی )دا ئیقتیباس هەیە .

طوری (چر) و (کم) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) : طوور . دیارە ( طوری )یە . (لو) و (مب) و (خب) : طوور و . مەعنای نایەت .

— ١٢ —

قەدری من چەندە لەلای دەوڵەتی دنیایی دەنی ،
قەدری ئەو کەمتر و ، هەردوو لە غەمی یەکدی غەنی (١)

— ١٢ —

ئەم پارچە شیعرەمان لە دۆستی خۆشەویستمان د. عزالدین مصطفی رسولەوە دەس کەوت لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکی جیاجیای تردا ، لەسەر پارچــە کاغەزێکی کــۆن و بە خەتێــکی کۆن و فارسی ئامێــز لەلایەن (محمد) ناوێکەوە نووسرابووەوە . کاغــەز و خەتەکە لەوانە نەبوون لەوەدا دوودڵ بین کە هیچ نەبێ هیی ٨٠ ــ ٩٠ ساڵێك بــەر لە ئەمڕۆن . لــەلای سەرەوەشیەوە نووسرابو «مناظره (مناضره) نالی سلیمانی مع میرزا صفــا الشیرازی» . واتە یەکتر بەزێنیی نالیی سولەیمانەیی لەگەڵ میرزا صەفای شیرازی . لە هیچکام لە نوسخەکانی بەردەستیشمانا نیشانەیەکی کەمی ئەم پارچە شیعرە نییە ، بەڵام شێوەی داڕشتنی، دەق، شێوەی داڕشتنی شیعری نالییــە .

لەبارەی ئەم میرزا صەفای شیرازییەوە هیچ ئاگاداریەکمان نییــە . بەڵام لە چەند بەشێکی پارچە شیعرەکەوە هەندێ شتمان بۆ دەرئەکەوێ . بۆنموونە لێیەوە دەرئەکەوێ کەوا ئــەم میرزایە کابرایەکی دەســەڵاتداری ئێرانی بــووە و فارسیش بووە و شیعەش بووە . هــەروەها ئەوەش دەرئەکەوێ کە زیاتر لەوانەیە نالی لە مەدینە چاوی بەم میرزایە کەوتبێ و، لەســەر مەسەلەیەکی ئاینیش و سیاسییش ( بە نیشــانەی ناوهێنــانی کورد و فارس و عەرەبدا لە پارچە شیعرەکەدا) لەگەڵیا تێگیرابێ و بۆیە ئەم پــارچە شیعرەی وتبێ .

ســەرێکی هەستی سیاسی نالی لەم پارچە شیعرەوە بەئاشکرا دیارە ، ئەوەش ئەوەیستنی عەجەمە کە لە هەندێ شیعری تریشیا دەرئەکەوێ . لە پــاڵی بەکــا زیزکردنــی نــاوی کــوردو عەرەبیــش نیشــانەی جــۆرە دۆستایەتییەکیەتی لەگەڵ عەرەب . سەرەڕای هەموو ئەمە ، ئەم پــارچە شیعرە نیشانەی پایەی کۆمەڵایەتیی نــالی و سەربەدەرەوە بوونیەتی . ئەگینا مەلایەکی کوردی بێ کەس و بێ دەر و نامۆ چییەتی لە غەریبیدا خۆی بدا لە قەرەی کابرایەکی دەســەڵاتداری ئێرانی و بە زۆریا هەڵشاخێ و بە شیعری سەرشکێنی خۆی بەدناوی بکا و بیزڕێنێ .

(١) دەنی : سوك . یەکدی : یەکتر . غەنی : بێ‌ئیحتیاج .

طاغی‌یو باغی‌یو ، باغی گوڵ و نەیرەنگ و فەنی
شاد و شادابە بە گوڵ ئاتەشی‌یو نارەوەنی (٢)

هێندە دڵخۆشە لەبەر سەبزی‌یو دار و دەوەنی ،
کە دەڕەقصێ وەکو شاخ و فەنەن و نەستەرەنی (٣)

لە خەزان بێ‌خەبەرە بەرگی بەهار و چەمەنی
بێ‌بەقایی گوڵ و سەرو و سەمەن و یاسەمەنی (٤)

---

واتە : سامان و دەسەڵاتی بێ‌بایەخی دنیا بە چ چاوێك سەیری منی شاعیری دەروون‌بەرز و سەر شۆڕنەکردوو بکا و چەندم ژێر لێ‌بگرێ ، منیش هەر بەوچاوە سەیری ئەو ئەکەم و ئەوەندەی ژێر لێ ئەگرم . . چونکە وەك ئەو ئیشی بە من نییە و هیچی لەسەر من پەکی نەکەوتووە ، منیش هەر وام . .

مەبەستی نالی لە (دەولەتی دنیایی دەنی) خاوەن دەولەتەکەیە کە میرزای شیرازییە .

(٢) طاغی : سەرکەش و ستەمکار . باغی : یاخی ، لەخوانەترس . نەیرەنگ : فڕوفێڵ و جادووگەری . فەن : هونەر و جوانی . فڕوفێڵ . شاد : شادمان و گەش . شاداب : تێراو . گوڵئاتەشی : گوڵەهەنار ، گوڵێکی سوورە . نارەوەن : درەختێکی گەڵاپڕی سێبەر خۆشە .

واتە : میرزای دنیادار کابرایەکی سەرکەش و لە خوا یاخی و زۆردارە ، باخی بەدیمەن پڕ لە گوڵ و کاری هونەرمەندانە و لەڕاستیدا پڕ لە فڕوفێڵی ، گەش و تێراوە بە گوڵ و درەختی بەدیمەن جوان و لەڕاستیدا بێ‌بۆن و بەری وەك گوڵە هەنار و دار نارەوەن .

لەنێوان (طاغی) و (باغی)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (باغی) و (باغ)دا جیناسی ناقیص هەیە .

(٣) دەڕەقصێ : سەماتەکا . شاخ : لق . فەنەن : لقی ڕاست . نەستەرەن : گوڵێکی بۆنخۆشە ، سوور و سپیی هەیە . . بە هەر لقێکیەوە چەند گوڵ ئەڕوێ . درەختەکەی دڕکاوییە . وەك گوڵەباخی لای خۆمان وایە .

واتە : شیرازی ئەوەندە لەبەر سەوزی و دار و دەوەنی باخی دنیا شادمان و دڵخۆشە ، وەك لەرینەوەی چڵ و دار گوڵەکانی بەدەم شنەی باوە ، کەوتووەتە سەما . .

(٤) واتە : میرزای شیرازی بەجۆری بایی و غەڕا بووە و وانازانێ ڕۆژان

فەلەکی میهر مەهی ، وەقتە تەواو بێ زەمەنی
کەوکەبەی ئەنجومی‌بو دائیرەیی ئەنجومەنی (٥)

خوانی ئەلوانی زەمین و صەفی سینێ و صەحەنی
طەشت و طاس و طەبەق و لەنگەر و شەمع و لەگەنی (٦)

من وەکو ڕەعدم و تۆ وەك گوڵ و سەبزەی دیمەنی
من دەگریێم و دەناڵێنم و تۆ پێ‌دەکەنی (٧)

---

تۆزیان لەدوایە ، تەنانەت گەڵای سەوزی درەختی بەهار و چیمەنی شینی زینی بەختەوەری ، ئاگایان لەوە نییە کەوا پایزێکیش بەڕێوەیە ، جێگای بەهار ئەگرێتەوە و ، گوڵ و سەرو و سەمەن و یاسەمەن هەموو سیس ئەبن و ئەوەرێن و دواییان دێ .

(٥) میهر مەهـ : مانگی میهر ، یەکێکە لە مانگەکانی ساڵی شەمسی ، لە ئاخری ئەیلولەوە دەس‌پێ‌ئەکا و سەرەتای پایزە . زەمەن : زەمان ، کات . کەوکەبە : کۆمەڵی بەشان‌وشکۆ . ئەنجوم : ئەستێرەکان . دائیرە : کۆزبەستن و خڕبونەوە .

نالی لەم بەیتەدا ڕستەی ( تەواو بێ )ی لە بەلوکاتا بە دوو مەعنای جیا بەکارهێناوە و ، کردویە بە ( فیعل ) بۆ دوو فاعیلی جیا . ئەڵێ : میرزای شیرازێ ئاگای لەوە نییە کەوا هاکا ئەستێرەی پایزی گەیشتە برجی خۆی و پایزی بە تەواوێ دامات و ، کەوا هاکا سەردەمی ئەستێرەی بەختی بەسەرچوو و ، کۆڕی خڕبووەوەی دەوری ، لەبەر نەمانی خۆی بڵاوەیان لێ‌کرد .

(٦) خوان : سفرە . ئەلوان : ڕەنگاوڕەنگ . صەف : ڕیز . صەحەن : قاپ و قاچاغ . طاس : تاسە، کاسە . طەبەق : قاپی گەورەی چێشت . لەنگەر : لەنگەرێ . شەمع : مۆم .

واتە : میرزا لەوەش بێ‌ئاگایە کەوا هاکا خوانی ڕەنگاوڕەنگی پڕ لە هەموو جۆرە خواردن و ڕیزە سینێ و تەشت و قاپ و قاچاغ و ، چێشتخانەی ئاوەدانی بڕایەوە و هیچی بەسەر هیچەوە نەما .

(٧) ڕەعد : گرمەی هەور . دیمەن : جەمعی دیمنەیە واتە سەر سەلوێنك .

واتە : من کە ئەناڵێنم و ئەگریم هەوری بەهارم گرمەم دێ و باران بەسەر زەویدا ئەبارێنم .. تۆیش کە بە هاوار و ناڕەحەتیی من زیاتر

ئەی دەراتۆ لە دو مەجرایی دو میزابی مەبـال
مەبە بادێ وەکو خەرزیە بەهەوای کیبر و مەنێ (٨)

تەنی ڕاضێ بە خەشین پۆشییی وەك شێر و شوتور
بێ نیازە لە برێشم تەنیو پیلەتەنێ (٩)

---

ئەبۆژێیتەوە ، گژوگیای سەر سەلوێنکی بە بارانی فرمێسکی من سەوز ئەبێ و ئەڕوێی .

هێنانی ڕستەی ( دەگرێیم ) لەم بەیتەدا نیشانەی بێدەسەلاتی نالی نییە لە بەرابەر میرزای شیرازیدا ، بەلکو نیشانەی‌لەخوالرسێ و بێ ناخۆش‌بۆنیەتی بە مل‌کەچ‌نەکردنی میرزای شیرازێ بۆ ڕاستێ . وەك چۆن (ڕەمد) کە واتە گرمە نیشانەی هێزە و ( سەبزەی دیمەن )یش سەرەڕای مەعناکەی ئیشارەتە بە فەرمودەی پێغەمبەر کە ئەفەرموێ ( ایـاکم ْ و خَضـْرَاءَ الدِّمَنِ ) واتە خۆتان بپارێزن لە ئافرەتی بەدیمەن جوان و بە ڕەوشت بەد و نارەسەن کە وەك گیای سەر سەلوێنك وایە .. کەواتە را نالی میرزای شوبهاند بەوجۆرە ئافرەتانە .

(٨) دەراتۆ : دەرهاتۆ . مەجرا : شوێنی بیا ڕۆیشتنی ئاو . میزاب : بلۆسك . مەبال : میزکردن . بادێ : بایێ . خەرزیە : ئالەتی پیاو . کیبر : فیـز . مەنێ : ئاوی پیاو .

واتە : ئەی کابرای ناجیر کە لە دۆ بلۆسکی میزی پیاوێك و ئافرەتێك هاتۆیتە دەرەوە ، لە خۆت بایێ مەبە و ، وەك ( هێنی ) پیاو کە هەستێ و لەبەر پڕبون لە ( ئاو ) هەلاوسێ ، با مەکەرە خۆت .

ئەشتوانرێ وشەی ( مەنێ ) بە ( منێ ) بخوێنرێتەوە واتە ( من .. من کردن ) .

لەنێوان (مەبال) و (خەرزیە) و (مەنێ)دا تەناسوب هەیە .. هەروەها وشەنارایییەکی وردیش لە (میزاب)دا هەیە کە سەرەڕای مەعناکەی ، بەدیمەن بۆ ئەوەش دەست ئەدا لە (میز) و (ئاب) پێکهاتبێ .

(٩) خەشین پۆشین : لەبەر کردنی بەرگی زبر . شوتور : حوشتر . برێشم تەنێ : چنینی قوماشی ئاوریشم . پیلەتەنێ : پالەوانێ .

واتە : لاشەی من کە وەك شێر و حوشتر فێری ژیانی تال و سوێر بووە و ، ڕازییە وەك ئەوان پەلاستێکی زبری لەبەرابێ ، بەلەمای هیچ نییە لەم دنیایەدا و پێویستی بەوە نییە جلی ئاوریشم لەبەرکا و زۆری

گوتم ئەی قیبلە قوزە ! بۆچی بە تەحریری حەریر
ڕاغیبی لیبسی عەجەم ، تاریکی بەرگی یەمەنی ؟ (١٠)

گوتی تاجی عەرەب و ، ئالی عەبا فەرمۆیان :
عەیبە تەن پەروەرییو نەرمییو نازك بەدەنی (١١)

ئێمە مەردین و هەمۆ شێری خەشینپۆشی مەصاف
کرمی قەز هەرچی تەنی ، بو تەنی نیسوالی تەنی (١٢)

---

بارۆی خۆی بەکاربێنێ دەسدرێژیی پێ بکاتە سەر خەڵك .

(١٠) قیبلە قوزە : ئارەزۆباز و شەهوەتپەرست . تەحریر : ئامادەکردن . حەریر : ئاوریشم . ڕاغیب : ئەوەی ئارەزۆی لە شتێ بێ . تاریك : ئەوەی واز لە شتێ بێنێ .

واتە : بە میرزام وت هۆ کابرای ئارەزۆپەرست ، بۆچی بە ئامادەکردنی جلی ئاوریشم و لەبەرکردنی ، پیشانی ئەدەی کەوا حەزت لە جلی ئالووالای ئێرانییە و جلی سادەی یەمەنی لەبەرناکەی ؟

داوای لەبەرکردنی جلی سادەی یەمەنی ئیشارەتە بەوە کە پێغەمبەر ( د.خ ) بوردی یەمەنیی لەبەرکردووە .

لە نوسخەکەی بەردەستمانا وشەی (قیبلە قوزە) بە ( قیبلە قەزە ) نوسراوە . قەز : واتە هێنەکەی پیاو . ئێمە لامانوابو ئەوە هەڵەیە و ڕاستەکەی بەوجۆرەیە کە خۆمان نوسیومانە ، چ لە ڕۆی مەعناوە و چ لە ڕۆی وشەئارایشەوە بۆ پەیوەند لەگەڵ (قەز)ی بەمەعنا کرمی ئاوریشم .

وشەی ( قیبلە قوزە ) کە بە ڕێنوسی جاران لەشخوێنرایەوە ( قیبلە قەزە ) واتە لەوەی ئاوریشم قیبلەیەتی ، نیشانەیەکیتری یاری کردنی نالییە بە وشە .

(١١) تاجی عەرەب : پێغەمبەر ( د. خ ) . ئالی عەبا : ئالوبەیتی پێغەمبەر کە هەمۆیانی لە عابایەکەوە پێچاوە . تەنپەروەری : خزمەتکردنی لەش .

وەنەبێ وشەی (گوتی) لەمبەیتەدا وەڵامی میرزا بێ ، بەڵکو هەر درێژەی قسەی نالییە بەڵگە بۆ ڕاستیی ئەو قسەیە دێنێتەوە کە لە بەیتی پێشودا کردی . واتە : پێغەمبەر کە تاجی سەری میللەتی عەرەبە و ئالوبەیت کە تۆ لای خۆت ، خۆت بە شوێنکەوتویان دائەنێی ، فەرمۆیانە شورەییە پیاو ئەوەندە خۆی بە خزمەتی لەش و لەبەرکردنی شتی نەرم و ، ناسکیی بەدەنیەوە خەریك بکا .

قەز ، برێشم ، کە حەرامە لە ڕەجول ، نەك نیسوان
سونەتی شەرعە ، ئەگەر تابیعی ئەهلی سونەنی (١٣)

تەرکی ئارایشی تەن نەقدی ڕەواجی عەرەبە
تۆ عەجەم ، مەردی موزەخرەف تەنی‌یو قەلبەزەنی (١٤)

---

(١٢) مەصاف : مەیدانی جەنگ . کرمی قەز : کرمی ئاوریشم . تەنی ــ ی یەکەم و سێهەم ــ : لە تەنینەوەیە . تەنی ــ ی دووهەم ــ : لەشی .

ئەمەی ئەم بەیتە قسەی نالی خۆیەتی و بەلگەی ڕاستیی ئەو قسانەیە کە لە دوو بەیتی پێشوودا وتنی و ، پلارە تێگرتنە میرزا . واتە : ئێمە پیاوین ، شێری بەلاس لەبەرکەری مەیدانی جەنگین .. لەو خاو و خلیچکانە نین کە بەرگی ئاوریشم لەبەرلەکەن ، چونکە کرمی ئاوریشم هەرچی ئاوریشمی تەنیوە ، بۆ لاشەی ئافرەتی تەنیوە ..

نالی ، بە مەبەستی یاریکردن بە وشە ، ئەوەشی مەبەست بووە (کرمی قەز) بە جۆرێکی‌تریش بخوێنرێتەوە و ، شوبهاندنێك دروست بێ .

لەنێوان هەر دو ( تەنی ) و ( تەنی )دا جیناسی تەرکیب و ، لەنێوان هەردو ( تەنی ) خۆیاندا جیناسی تەواو هەیە .

(١٣) ڕەجول : پیاو . نیسوان : ژنان . ئەهلی سونەن : ئەهلی سوننەت و جەماعەت ، بەرابەرەکەی ( شیعە ) و ( ئەهلی بیدعەت )ە .

واتە : ئاوریشم کە حەرامە لە پیاو و حەلاڵە بۆ ژن ، بۆیە وایە چونکە پێغەمبەر (د.خ) وای داناوە . جا تۆیش ئەگەر شوێن ڕێ و شوێنی پێغەمبەر کەوتوی مەیکەرە بەرت و ، ئەگەر شوێنیشی نەکەوتوی چی ئەکەی بیکە .

لەتوانرێ وشەی ( برێشم ) بە ( بە ڕێشم )یش بخوێنرێتەوە ..

(١٤) ئارایش : ڕازاندنەوە . نەقدی ڕەواج : پارەی بە برەو و مامەلە پێکراو . موزەخرەف : ئەوەی خەریکی شتی هیچ‌وپووچ بێ و خۆی هەر بەدیمەن جوان کردبێ . قەلبەزەن : بێکارە .

واتە : عادەتی باو لەناو عەرەباندا ئەوەیە خەریکی تاس و لوس‌دانی خۆیان نەبن . تۆی عەجەمیش کە هەر خەریکی ئارایش‌دان و ڕازاندنەوەی خۆتی ، خەریکی کاری بێ‌مایەیت و پیاوێکی هیچ‌وپووچی .. یاخود لاشەیەکی ساختە و هیچت هەیە و ، هەرچەند بەناو پیاوی ، وەك ئافرەتێکی تەلب و بێکارە وای ( بەپێی ئەوە کە « قەلبەزەن » بە « قەلب

میللەتی کورد و عەرەب هەردویەکە تەفرەقە بۆن
لە جەفاوو میحەنی مولکی (سەبا)وو یەمەنی (١٥)

وەکو ئەو کرمە لەنێو قوبەیی ئەبرشمدا
عاقیبەت موردەیی یەئسی عەمەل و بێکەفەنی (١٦)

---

زەن »یش لەخوێنرێتەوە . بەم‌پێیە کۆکردنەوەی ئەم (زەن)ە لەگەڵ ( مەرد ) بێ‌ملامەت نییە !

هێنانی وشەی (لەرك)یش لە سەرەتای ئەم بەیتەدا کە جاران ئەنوسرا (ترك) و بە (تورك)یش ئەخوێنرایەوە ، بێ‌پەیوەندی نییە لەگەڵ (عەرەب) و (عەجەم) لەم بەیتەدا .. زاراوی ( مەردی موزەخرەف )یش جۆرە جنێوێکی ئێرانییانەیە .

(١٥) میحەن : جەمعی میحنەلە واتە بەلا . سەبا : دەولەتی سەبەء لە یەمەن .

نالی لە بەیتی پێشودا تەعریفێکی عەرەبی کرد و پلارێکی گرتە عەجەم . لێرەشدا وەك بلێی بیر ئەکاتەوە و بەدوای شتێکا ئەگەڕێ کورد و عەرەب یەکیان تیا گرتبێ و تیا هاودەرد بن ، ئەبینێ هەردولا وەك یەمەنییەکانی پاش ڕۆخانی عەماراوی (مەئرەب)یان لێ‌هاتووە کە پرژ و بڵاو بۆنەوە و هەر کۆمەڵێکیان کەوتنە لایەك . کوردە ، میرنشینییەکانی بابان و سۆران و ئەردەڵان و میرنشینییەکانی‌تریان هەبو ، ڕۆم و عەجەم هەموویان یەك لەدوای یەك قوت دان و ، عەرەبیشە ، لە سەرانسەری وڵاتەیان و بەرینەکەیانا دەولەتێکی سەربەخۆیان نەبو لە دەولەت بچێ ، بەپێچەوانەی عەجەمەوە کە هەرچۆن بێ خاوەنی شتێ بۆن بۆ خۆیان .

ئەم وشەی (یەمەنی)یە لە دەستوسەکەی بەردەستمانا بۆ (یەمەنی) و بۆ (میحەنی)یش دەستنەدا ، بەڵام ئەگەر (یەمەنی) بێ ، نوختە بۆ (ی)کەی نەکراوە و ، سەری (ی)کە زیاتر لە سەری ( م ) ئەچێ . ئێمە (یەمەنی)مان لا لەبارتر بو ، بۆیە وامان‌نوسییەوە .

(١٦) کرمی ئاوریشم خێوەتێ بە دەوری خۆیا ئەتەنێ و لەناو خێوەتەکەدا بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ خەریکی ئاوریشم لەنین ئەبێ . جا کە بیبانەوێ ئاوریشمەکەی کۆبکەنەوە ، یا لەبەر تیشکی هەتاو یا لەناو ئاوی گەرمدا دای‌ئەنێن تا کرمەکە ئەمرێ . ئەگەر بشیانەوێ سود لە گەراکەی وەربگرن و کرمەکە زۆر بکەن ، ئەوا لێی‌ئەگەڕێن تا پێ‌ئەگا و (بالغ) ئەبێ و خێوەتەکەی بەجێ‌ئەهێڵێ و دەس‌ئەکا بە گەرا فڕێ دان و ئەگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی .

چونکە «نالی» ا لەسەر ئەم ئەرضە غەریبی وەطەنی
هەستە باری مەدەنی بە ، مەدەنی بە ، مە دەنی (١٧)

— ١٣ —

موساوی وەك یەك و لوولن لە هەر دوو لاوە زولفەینی
نموونەی عەکسی حەرفی (میم) و (نوون) و (واو)ە زولفەینی (١)

---

ئەم بەیتەش مەعنای بەیتی پێشوو تەواو ئەکا و ، نالی لەم بەیتەدا پارچە پارچە بوونی کورد و عەرەبی شوبهاندووە بەو حاڵەتەی کرمی ئاوریشم کە لەژێر خێوەتەکەی دەرئەچێ بۆ گەرا فڕێدان و لەپاش گەرا فڕێدانەکە ، گەراکانی ئەبن بە کرم و ئەچنە ژێر خێوەتێکی نوێ کە خۆیان ئامادەیان کردووە و ئەکەونە ئاوریشم دروستکردن و پاشان بۆ وەرگرتنی ئاوریشمەکەیان ئەمرێنرێن و بە نائومێدی و لەئەنجامی کارکردنیانا بێکفن (واتە بێخێوەت) سەر ئەنێنەوە .

لە هەیبەدارکردنی میرزای شیرازییەوە بەوە کە بەرگی ئاوریشم لەبەرئەکا و ، لە وەصفکردنی عەرەب و کوردەوە بەوە کە وەك کرمی ئاوریشم وان ، ئاوریشمەکە دروست ئەکەن و پاشان ئەمرن و ئەفەوتێن ، وا دێتە پێش چاو نالی ویستبێتی بڵێ عەرەب و کورد کار ئەکەن و عەجەم ئەیخوا . .

(١٧) هەستە : بوون . هەستەبار : لەوەی بوونی بار بێ بەسەر شانی کەسێکەوە. ئەشکونجێ (هەستە) بەتەنها خۆی فیعلی ئەمر بێ .

بە وردی مەعنای جیاوازی ئەم سێ وشەی (مەدەنی)مانە بۆ ڕاست نەکراوەتەوە . ئەوەندەی بۆی بچین لامانوایە مەبەستی نالی ئەوەبێ بە خۆی بڵێ : مادەم نامۆ و دوور لە نیشتمانی و ژێت کەوتووەتە ئەم مەدینەی پێغەمبەرە ( د. خ ) ، خۆت بکە بە باری سەرشانی ئەو بوونەوەی لەودنیا تکاکارت بێ و، بیە بە خەڵکی مەدینە و، سووك و بێحورمەت مەبە، قەدری ئەو پێغەمبەرەت لە بەرچاو بێ کە لەپەنایدای . بەمپێیە (مە)ی دوا (مەدەنی) بە مەعنا (نە) ئەبێ .

— ١٤ —

(١) موساوی : چونیەك . عەکس : پێچەوانە .

واتە : هەردوو زولفی یار لە هەردوو لای ڕوویەوە یا لە سەر و خواری هەردوو زولفیەوە وەك یەك وان و هەردوکیشیان لوولن ، هەر ئەڵێی حەرفی (میم) و (نوون) و (واو)ن ، چلۆن ناوی ئەم سێ حەرفە لە هەر سەرێکەوە

به داوە ، کرژ و خاوە ، یەعنی ئالۆزاوە زولفەینی
دۆ تاوە ، دۆ سیان و شێوەکەی شێواوە زولفەینی (٢)

پەرێشان و شکستە و سەرنیگوون داماوە زولفەینی
تومەز بادی صەبای چین و خەطای لێ داوە زولفەینی (٣)

---

بیخوێنیتەوە هەر (میم) و (نوون) و (واو)یان لێدەرنەچێ ، یاخود وەك چۆن ئەگەر شێوەی ئەم سێ حەرفە هەلگێڕیتەوە ، بە خۆیان و پێچەوانەکەیانەوە وەك زولفی چون یەك و لوولی یاریان لێ دەرنەچێ .

میم و نوون و واوە (کم) و (گم) و ( «بەراوێزی» من ) و (خا) : نوون و میم و واوە . (لو) و (مب) و (من) : میم و واون داوە .

(٢) به داوە : داوی بەدەمەوەیە ، فێلبازە . دۆ تاو : لەوەی بە دۆ جۆر هۆنرابێتەوە . سیا : ڕەش .

واتە : زولفەکانی یار ، دلدار ئەکەن بە داوەوە و ، ئالۆزن ، بەشێکیان کرژ و بەشێکیان خاوە و ، لە خاوێ و کرژیدا چون یەك نین ، نە هەمۆیان کرژ و نە هەمۆیان خاون ، بە دۆ جۆر هۆنراونەتەوە ، دۆ زولفی ڕەشن و شێوەکەیان شێواو و تێکچووە .

دو تاوە (مم) و (گم) : دو تان و .

هەرچەند هەمۆ نوسخەکانی بەردەستمان لە نیوە بەیتی یەکەمدا نوسیویانە ( بە داوە ) و ، لە نیوە بەیتی دۆهەمدا ، (مم) و (گم) نەبێ ، نوسیویانە ( دو تاوە ) ، ئێمە لامانوایە ڕاستەکەی (بە داو و) و ( دو تاو و )وە ، چونکە ئەگەر وابێ (تا) بەرابەری (سیان) ڕادەوەستێ کە (تا) واتە یەك و ، (دوتا) خۆیشی واتە : پێچ و لوول و شکاوە و ، بۆ زولف باشتر لەگونجێ تا (دو تاو) کە هۆنینەوەی بەن و مۆ و شتیوایە .

لەنێوان (کرژ) و (خاو)دا طیباق و ، لەنێوان (داو) و (خاو)دا جیناسی لاحیق و ، لە کۆکردنەوەی (دۆ) و (سیان)دا بەدیمەن طیباق هەیە .

ئەم بەیتە لە (کم)دا نییە .

(٣) پەرێشان : بلاو . شکستە : ئەو زولفەی ڕاست نەبێ ، لوول بێ . سەرنگوون : سەرەوخوار بووەوە . بادی صەبا : ئەو بایەیە لە بەینی ڕۆژهەلات و باکورەوە هەلئەکا .

واتە : زولفەکانی ئالۆز و تێکشکاو و پرژ و بلاون و ، وەك جاران سەریان ڕۆی نەکردووەتە یەك ، شۆڕ بونەتەوە . پێشان ئەسمەزانی بۆچی

له جێی پاوانەوو گەردنلێی داناوە زولفەینی
کە وەك ئەژدەر لە پێوو گەردنی ئاڵاوە زولفەینی (٤)

دو جادوو ماری مەغزی ئادەمی خواری قەرار داوە
لەسەر شانی ، وەکو ضەححاك و ، ناوی ناوە زولفەینی (٥)

---

وایە ، پاشان بۆم دەرکەوت تومەز ئەمە خەتای بای صەبای چین و خەتایە چینەکانی زولفی یاری تێکداوە .

پەرێشـان و (عم) و (گم) : پەرێشـانە و . شـکسـتە و (چن) و (ك) : شکست و . ئەمیش هەر (شکستەو)ە . (اح) و (من) و (خا) و (خب) : شکستە . تومەز (چر) و (عم) و (لو) : لمەز . ( « پەراوێزی » خا ) : تومەس . بادی (چـر) و (ك) و (لو) و (عب) و (اح) و (خب) : بـاد . ئەمیش هەر (بادی)یە . (گم) : بایی . صەبای (گم) : سەبا ! . (خب) : صەبا . خەطای (عم) : خەتای . (کم) و (گم) : خوتـەن . (لو) و (عب) و (من) : خەطا . لێداوە (کم) و (گم) : لێیداوە .

(٤) پاوانە : خشلێکی زێڕە ژنان ئەیکەنە پێ . گەردنلغ : خشلێکی‌تری زێڕە ئەکرێتـە مل و بە لیرەیـەکی زۆر ڕازاوەتـەوە . ئـەژدەر : مارێـکی ئەفسانەییە ئاگر لە دەمی دەرئەچێ . ئەژدەها .

وانە : زولفەکانی یار ئەوەندە درێژن بەسـەر سنگیا بڵاو بۆنەتەوە و وەك پاوانە گەیشتونەتە بەر پێی . بۆیە لەلێی ماری ئەژدەرن لە گەردن و قاچی ئاڵاون .

هێنانی (پێ) و (گەردن) بەدوای (پاوانە) و (گەردنلغ)دا لەف و نەشری مورەتتەبە .

گەردنلغی (کم) : گەردانلغی . (گم) : گەردانەیی .. لە پێوو (عم) : لەسەر پێ و . (کم) و (گم) : لە شۆشـەی !

(٥) جادوو مار : ماری سیحرباز . مەغز : مێشك . خوار : بخـۆر . قـەرار داوە : داناوە . ضـەححاك : ئەژدەهاکی بەناوبانگ .

نالی لەم بەیتەدا ئیشارەتی بـە ماری سیحربازەکانی فیرعەون و ، بە مارەکانی سەرشانی ئەژدەهاك کردووە و زولفەکانی یاری داناوە بەهەرکام لەم دوو کۆمەڵە مارە و ، دەستبەسـەراگرتنی بیر و دڵی دڵدارانیشی داناوە بە خواردنی مێشکیان لە ئەفسانەکەی ئەژدەهاکدا . ئەڵێ : یار جوڵێ مـاری وەك مارەکانی سیحربـازەکانی فیرعـەون ، سـیحر لە

به طورڕه وەك پەڕی طاوس ، بە گەردەن ئاهووه ، یەعنی
لەسەر ئاهوویی گەردەن هەر دو حەلقەی داوه زولفەینی (٦)

بە ظاهیر ظولمەت و دوودە ، بە باطین نور و ، نارێکی
لە عود و عەنبەر و میشکی خەطای بەرداوه زولفەینی (٧)

---

دلداران‌کەر و ، وەك مارەکانی سەرشانی ئەژدەهاك ، عەقل لە دلداران
سێنی خستووەتە سەرشانی خۆی و ئەڵێ گوایە ئەمانە زولفن .. ئەمانە
زولف نین مارن .

ضەححاك و : (چن) ضەححاك . دیارە (ضەححاك و)وە . (لو) و (عب) و
(من) : ضەححاکە .

(٦) طورڕە : مووی ئەم‌لا و ئەولای ناوچاو . ئاهو : ئاسك .

واتە : بە مووی جوانیا کە وەك تیشکی خۆر ئەدرەوشێتەوە ، ئەڵێی
طاوسە و ، بە گەردنی بەرزیا ئەڵێی ئاسکە . زولفی طاوسینی بە سەر
شان و ملی ئاسکانەیدا ئەڵقە ئەڵقە بووە و لوولی خواردووە .

طورڕە (من) : طورڕەی . وەك پەڕی (مم) و (عب) و (من) : پەڕڕی .
طاوس (مم) : طاوۆسە و . (گم) : تاوس ! (عب) و (من) : طاوۆس و .
داوە («پەراوێزی» چر) و (عب) و (لو) و (من) : چاوە .

(٧) ظولمەت : تاریکی . دوود : دووکەڵ .

وانە : زولفەکانی یار بەدیمەن لەبەر رەشی ئەڵێی تاریکین و ، لەبەر
لوول‌خواردن و پێچ‌پێچی ئەڵێی دووکەڵی باریکن .. بەڵام مەسەلەکە هەر
ئەوەندە نییە ، تاریکایی زولفی یار لەڕاستیدا ڕۆشنایی دڵی دلدارانە و ،
لە بن ئەو دووکەڵی زولفەوە ئاگرێك هەیە (کە ئاگری ڕووی یارە) گڕی
بەرداوەتە عود و عەنبەر و میشکی بۆن‌خۆشی خەتا و خوتەنی ـ زولفەکە و
ئەو بۆنە خۆشە کە لە زولفی یارەوە دێ هی ئەوەیە .. بەپێی ئەم
مەعنا لێدانەوەیە (زولفەینی) نابێ بە فاعیلی فیعلی (بەرداوە) ، بەڵکو
فاعیلی فیعلەکە ئەگەڕێتەوە بۆ نوور و (زولفەینی)یش (موضافو ئیلەیهی)ی
(خەطای)ە و (بەرداوە)یان کەوتووەتە بەینەوە .

ئەشکونجێ (زولفەینی) فاعیلی (بەرداوە) بێ و مەعناکە وای لێبێتەوە :
زولفەکانی یار ئاگرێکیان بەرداوەتە عود و عەنبەر و میشکی خەطا و
خوتەنی خۆیان و ، لە هەمان‌کاتیشا کە ئاگر بەرئەدەنە خۆیان ، بۆیشن بە
دووکەڵ . بەپێی ئەم مەعنایەش دیان مەبەست لە ئاگر لێبەردانەکە

شکەنجی تاری پڕ میشکی تەتار و تارە ، ئەما ئەو
دوتا و ، هەر تایە بارێکی لە عەنبەر ناوە زولفەینی (٨)

وەکو دوودی سیاهە ئاهی « نالی » و ، ئەم ، ڕەقیبانە
.لە سەر تا پێ لە بەرگی مەرگ و ماتەم تاوە زولفەینی (٩)

---

بڵاوبونەوەی بۆنە خۆشەکەی زولفەکانە .

نارێکی : ئەمە تێکستی (چن)ە . نوسخەکانیتر هەموو نوسیویانە : (ئاریکی) . ئێمە تەنها (چن)مان لێرەدا بە ڕاست زانی . میشکی (چر) و (لو) و (اح) و (خا) و (خب) : میسکی . (چن) و (ك) : میسك . دیارە (میسکی)یە . خەطای (مم) و (گم) : خەتای . بەرداوە (کم) و (گم) : داناوە .

(٨) شکەنج : پێچ و لوولی زولف . تار ـ ی ـ یەکەم : تاڵ . میشکی تەتار : جۆرە میشکێکە ناوبانگی بۆنخۆشی دەرکردووە . تار ـ ی دووەم ـ : ڕەش و تاریك . دوتا : دووباد . تا : تاڵ .

واتە : یار بەچەشنێکە ، پێچ و لوولی تاقە یەك تاڵی زولفی ، پڕە لە میشکی تاتار و بەتەنها خۆی ڕەش لەکاتەوە ، کەچی ئەو زولفەکانی دووبادن و ، ٠هەر تاڵێکی ئەو زولفە دووبادانەی بارێکی لە عەنبەر بار کردووە .. جا یارێك کە هەر تاڵێکی زولفی دووبادی ئەوەندەی عەنبەر پێوەبێ ، ئەبێ چجۆرە بۆنخۆشییەك بە دەوروبەریدا بڵاو بکاتەوە !

لەنێوان (تار) و (تەتار)دا جیناسی ناقیص و ، لەنێوان (تا) و (بار)دا تەناسوب هەیە .

میشکی (چن) و (اح) : میسك . دیارە (میسکی)یە . (عب) : میشك . دیارە (میشکی)یە . تایە (مم) و (گم) : تایی .

ئەم بەیتە لە (خب)دا نییە .

(٩) ڕەقیبانە : وەك ڕەقیب ، وەك بەدکار .

واتە : ئاە و هەناسەی نالی ، لەبەر دەردی دووریی یار ، وەك دووکەڵی ڕەشی لێ هاتووە ، کەچی یار لەجیاتیی ئەوەی نیشانەیەکی خۆشی پیشان بدا و کارێك بکا تۆزێ خۆشییش بخاتە دڵی نالی ، وەك ناحەز و بەدکار کە هەر ئازەحەتیی مرۆی بوێ ، سەرتاپای زولفی ڕەش کردووە و بەرگی ڕەشی مەرگ و ماتەمی کردووەتە بەری ..

– ١٤ –

نەفەس بگرە لە هاتوچۆیی خۆڕایی هەتا ماوی
کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی (١)

---

لەنێوان (بەرگ) و (مەرگ)دا جیناسی لاحیق هەیە .

سیاهە (گم) : سیایە . (ئو) و (عب) : سیاه و . (خب) : سیاهە . بۆ (سیاهە)یش و (سیاه و)یش دەستئەدا . نالی و : ئەمە تێکستی لەتها (چر) و (عم) و (گم)ە . نوسخەکانیتر هەمویان : نالی . ڕەقیبانە ( « پەراوێزی » چر ) و (چن) و (عم) و (گم) و (ك) و (ئو) و (عب) : ڕەقیبانەش . پێ (کم) : پای . (ئو) : پێی . لە بەرگی (چر) و (عب) وُ (خب) : لە بەرگ . دیارە (بەرگی)یە . (چن) و (ك) و (اح) : بە بەرگ . دیارە (بە بەرگی)یە. (کم) : بە بەرگی.مەرگ و (چر) و (ك) و (اح) و (خب): مەرگ . دیارە (مەرگ و)وە . (چن) و (کم) و (گم) و (خا) : مەرگی ( ؟ ) .

– ١٤ –

(١) نالی لەم پارچە شیعرەدا ، وەك هەر خواپەرستێکی ڕاستی پێ لە هەڵە و نالەواریی خۆ ـ ناو ، بە سەر و گوێلاکی خۆیدا دێ و لەرزە شکێنی ئەکا و ، بێباریی چەرخی گەردوون و بێبەریی ڕابواردنی دنیای لەخالە پێش چاو و دارای گەڕانەوەی لێ ئەکا لە خراپە و ، ئەڵێ :

ئەو ئەندازە عومرەی تائێستا بەسەرتبردووە ، لازە لە دەست ڕۆیشتووە و بۆت ناگێڕرێتە دواوە تا چۆن باشتر بێ وای بەسەربەری . کەواتە ئەبێ بیری لەوەی بکەیتەوە کە ماوە . بۆیە ، تا ماوی هەناسەت بگرە مەهێلە بەخۆڕایی بڕوا ، چونکە هەر ئەو هەناسە بەخۆڕایی دانەیە تائێستا عومری داوی بە با . .

لەڕاستیدا تێپەڕبونی ژیانی مرۆ هەر ئەو هەناسانەیە کە ئەیاندا . جا ئەگەر ئەو هەناسە دانانەی بەدەم کارێکی بەسودەوە بۆبێ ، ئەوە دیارە عومری لەخۆڕایی ڕایە نەبوە . خۆ ئەگەر بەکارێکی بەدەوە یا بەخۆڕایی و بێ هیچ کارێك هەناسەی دابێ ، ئەوە دیارە عومری بە با ڕۆیشتووە .

لەنێوان هەردو وشەی (با)دا ، سەرەڕای ئەوەی کە هەرکامیان بۆ مەعنایەك بەکارهاتووە ، جیناسی تەواو هەیە .

هاتوچۆیی : ئەمە تێکستی (چر) و (چن) و (خب) و (من)ە . نوسخەکانیتر هەمو : (هاتوچونی) . کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە (چن) : هەتا ئێستاکە ئەم بایە .

حەیاتت نەقدی تەحصیلی بەقاوو ڕیبحی ڕیضوانە
ئەتۆ دەیکەی بە مایەی دەخل و خەرج و کەسبی بەدناوی (٢)

عەجەب ماوم لە جەرگت ، ئەی دلەی غافل ، کە موددێکە
لەسەر ئەم ئاگرەم داناوی ، هێشتا هەر نەبرژاوی (٣)

مەئەل دنیا ژن و ، چەرخیش خەڕەك ، دەمدەم بە دۆخی غەم
ڕەگی تاری وجودت با دەدا ، هێشتاکو هەر خاوی (٤)

---

(٢) نەقد : پارە . تەحصیل : پەیداکردن . بەقا : ژیـانی هەمیشـەیی لـەو دنیادا و نـاوی چـاك لەم دنیـادا . ڕیبـح : قـازانج‌کردن . ڕیضوان : ڕەزامەندیی خوا و ، ناوی دەرگاوانی بەهەشـتیشـە . دەخل : دەسکەوت. خەرج : سەرف‌کردن . کەسب : پەیدا کردن . کاسبی .

والە : ژیانت وەك پارەیەك وایە خوا نابێتیە مشتت بۆلەوەی ناوی چاکی ئەم دنیا و ژیانی هەمیشـەیی ئەو دنیای پێ پەیدا بکەی و ، ڕەزامەندیی خوا و دەرگاوانی بەهەشتی پێ دەسخـەی ، کەچی تۆ کردوتـە بەهۆی دەس خستنی مایەی بەدناوی و ئابڕوچون بۆخۆت. ڕیبحی (چر) و (چن) و (عب) و (خا): ڕیبح . دیارە (ڕیبحی)یە . (ك) ڕیبح و. ئەتۆ دەیکەی (کم) و (گم) : ئەتۆ ئەیکەی . (خب) : وەرە مەیکە .

(٣) والە : ئەی دلەی بێ‌ئاگا .. من سەرم لە تۆ سڕ ماوە ، چەند بەجەرگ و لەرەسەختی .. مـاوەیەکی زۆرە لەسـەر ئاگری ئەم دنیـای بێ‌بەقایەم داناوی . کەچی هێشـتا قاڵ نەبویت و نەبرژاوی و هێشـتا هەر کاڵ و کرچ و بێ‌ئەجرەبەی .. ڕۆژگار ئاتیـشاش کاری لێ نەکردوی ، ئەڵێی نە بات دیوە و نە بـاران .

هەرچەند لێرەدا (جەرگ) بەمەعنا (جگەر) نییە ، کۆکردنەوەی لەگـەڵ (دڵ) تەناسوبێکی جوانی لیایە .

دلەی غافل (چر) و (خـا) : دلی غـافل . (چن) و (ك) و (اح) : دلەی نازك . (کم) و (گم) : دلەی بەدخو . (ت) : ئەی دڵ ، ئەی غافل . (خب) : ئەی دلی نازك . لەسەر (ت) و (عب) : لە کوشـەی . ئەم ئاگرەم . (مم) و (گم) : ئەم ئاورەم . هێشتا هەر (چر) : لیـستا هەر . (من) : هێشـتاکو .

(٤) خەڕەك : ئالەتێکی دەستیـە ژنان لە ماڵا لۆکەی پێ ئەڕێسن و ئەیکەن بـە دەزو . دۆخ : ئەویـش هەر خەڕەکە . ئەبێ ئەو بەشـەی بێ کە لۆکەکە

**زەمانە چەرخ و ، چەرخی ئاسمانیشی ، فەلەك فیلکە**
**سەری ڕشتەی وجودی چەللە باداوی‌یو هەر ماوی (٥)**

---

ئەڕزێـــێ . تار : تاڵ . وجود : لەش .

واتە : دنیا وەك ژنێك وایە بەســـەر خەڕەکێکەوە خەریکی لۆکە ڕستن بێ و ، چەرخی گەردونیش خەڕەکەکەیە ، هەمیشــە بە دۆخـی خەم و مەینەت تاڵی ڕەگەکـانی لەشت بـادەدا ، لەگـەڵ ئەوەشـــدا تۆ ئەوەندە بێعاری تاڵەکانی لەشت با ناخۆن و هەر خاون و کرژ نابنەوە .

لەنێوان (دەم) و (غەم)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ژن و (عم) : ژنە و . (کم) و (گم) : ژنە . دۆخی (چر) و (چن) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : دۆخ . دیـارە (دۆخـی)یە . (ت) : دۆك . دۆك : دۆخ . دیـارە ( دۆکـی )یـە . ڕەگـی : ئەمــە تێکـــستی (چن)ە . نوسخەکانی‌تر هەمو : (ڕەگەو) . بادەدا (کم) : بائەدا .

(٥) چەرخ ـ ی یەکـەم ـ : هـەرچی کـە بـــوڕێتەوە . لێرەدا مەبەست تەشـیە . چـەرخ ـ ی دۆهـەم ـ : ســـوڕانەوە . ئاســمانیشی : ئەبێ بە (نون)ێکی گـیراو بخوێنرێتەوە کە ئەگەر بیکەیتـەوە ببێ بە دو نون و ببێ بـە (ئاسمان نیشی) . ئەوکاتە (نیش) واتــە جرۆ و لێرەدا مەبەست قولاپی ســەرە تەشـیە کە خوریەکە یـا لۆکەکەی پێوە بەند ئەکرێ و لەئەنجامی هەڵسـوڕاندنی تەشیەکەدا ئەیکا بە بەن یا بە دەزو . فەلەك : ئاسـمانەکان . فیلکە : سەرە خڕەکەی تەشیەکە کە کراوە بەسەر دارە ستونییەکەیدا و قولاپەکەی لێ گیر کراوە . ڕشتە : تاڵ . وجود : گیان ، لەش .

نالی تەشبیهی ئەم بەیتەی لە زانستی ئاسمان شناسیی کۆنەوە هێناوە، ئەڵێ : زەمانە وەك تەشێ وایـە و ، ســوڕانەوەی ئاسمانیش لەبەرئەوە کە ئەبێ بەهۆی هەڵاتن و ئاوابونی ڕۆژ و پەیدابونی چوار وەرزەکە ، وەکو نوکی تەشیەکەیە و، فەلەکیش واتە ئاسمانەکان وەك سەرە خڕەکەیەتی و هەمیشــە لــە سوڕانەوەدایە . ئەم تەشیی چەرخی زەمانـەیە ، ئائێستا چەندین جار سەرە تاڵی گیانتی باداوە . بەڵام تۆ هەر خوریە خاوەکەی جارانی و ناڕێسـرێی و چەرخی زەمانە کارت لێ ناکا .

چەرخ و (عم) و (کم) و (گم) و (من) : چەرخە . چەرخی (چر) : چەرخ . دیارە ئەمیش (چـەرخی)یە . سەری : ئەمە تێکســتی (عم) و (گم)ە . نوسخەکانی‌تر هەمو : (سەر) ، بەڵام دیارە (سەری)یە . وجودی : ئەمە

مەگەر مەیخانەیە دنیا کەوا کاسی لەبەر کەئسی ا
به نەغمەی عوودی سوتاوی ، بە نەشئەی طاسی تاساوی ا (٦)

ئەمێستەیش ، گەرچی عەیش و عوشرەتت هەر تاڵ و تاڵاوە
بە مەرگی تۆ ، لە پاشانیش دمخۆی تاڵاوی تاڵاوی (٧)

---

تێکستی (چر)ە . نوسخەکانی‌تر هەموو : (سروشتی) . چەندە (عم) : چەند .
خاوی (عم) : ماوی .

ئەم بەیتە لە (چن) و (ت) و (لد) و (اح) و (خا)دا نییە . بەکێکیش ، بێ دەربڕینی هیچ جۆرە بەڵگەیەك ، لە پەراوێزی (چر)دا نوسیویە : « هیی نالی نییە » .

(٦) کەئس : پیالە . نەغمە : ئاواز . طاس : تاس ، پیالەی مەی .

واتە : ئەڵبەت ئەم جیهانە مەیخانەیە و ، تۆیش بە کاسەی شەرابی ئەم مەیخانەیە کاس بوویی و ، ئاوازەی عود و ساز و سەنتوری وا کاری تێ‌کردووی ، سوتاندوویتی و ، نەشئە و کەیفی پیالەی شەرابی لە گەرووت گیراوە و تاساندوویتی ..

لەنێوان (کاس) و (کەئس)دا جیناسی موضاریع و ، لەنێوان (کاس) و ( طاس )دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (سوتاوی) و (تاساوی) و ، (طاس) و (تاساو)دا وشەئارایی هەیە . لەنێوان (عود) و (سوتاوی)یشدا جۆرە تەناسوبێك هەیە چونکە (عود)ی داری بۆن‌خۆش ئەسوتێنرێ ، هەرچەند لێرەدا مەبەست لە (عود)ی موسیقایە .

مەیخانەیە دنیا (خا) : دنیا مەیخانەیە . عودی (چن) و (کم) و (ت) و (عب) و (من) : عود . ئەمیش هەر (عودی)یە . طاسی (چن) و (کم) و (عب) و (اح) : طاس . دیسارە (طاسی)یە . (گم) و (خب) : تاسی . تاساوی : ئەمە تێکستی (کم) و (گم) و (ت) و (خب)ە . نوسخەکانی‌تر هەموو : (طاساوی) ، بەڵام هەڵەیە چونکە وشەکە کوردییە .

(٧) ئەمێستەیش : ئێستەیش . عوشرەت : ڕابواردن .

واتە : هەرچەند ئەوەش کە ئێستە بە خۆشی و ڕابواردنی دائەنێی ، لەڕاستیدا خۆشی و ڕابواردن نییە ، تاڵاو و ژاری مارە ، بەڵام پاش مەرگیشت ، یا بە مەرگت ئەسەم لەمەولاشیش ، لەودنیا تاڵاوێکت دەرخوارد ئەدرێ ئەوەندە تاڵ بێ وەك پوختە و خەستەی تاڵاوی ئەم دنیا وابێ ..

هەوای سەیری بەڕ و بەحر ئاگری بەرداوەتە عومرت
كە تۆزێ مونعەقید خاكی ، دڵۆپێ مونجەمید ئاوی ! (٨)

كە خاكی ، خاكی دامەن بە ، وەگەر نە ، تۆزی بەربادی
كە ئاوی ، ئاوی گەوهەر بە ، وەگەر نە ، بڵقی سەرئاوی (٩)

---

عەیش و (ت) : عیشق . دیارە (عیشق و)وە . عوشرەتت (چر) و (ت) و (عب) : عوشرەتی . (من) : عوشرەت . دیارە (عوشرەتی)یە . تاڵاوی (چر) و (چن) و (عم) و (ك) و (اح) : تاڵاو . دیارە (تاڵاوی)یە . (كم) و (گم) و (خا) : تاڵاو و . (ت) : هەر تاوێ .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی پانزەهەمە .

(٨) هەوا : ئارەزوو . با . سەیر : گەڕان . تەماشا . تۆزێ : كەمێك . مونعەقید : بەیەكەوە نوساو . مونجەمید : مەییو .

واتە : تۆزێ كە ئەوەندە ناچیزی ، لە تۆزێ خاكی بەیەكەوە نوساوی بە نوێ بۆ و ، لە دڵۆپێ ئاوی مەییو پەیدا بووی ، ئارەزووی گەشتی وڵاتان عومری بەلەتەرات بردووی و ئاگری لێبەرداوە .. چیتداوە لەم ئارەزووبازییە ، لەجێی خۆتا داكەوە بیرێ لە خوای خۆت بكەرەوە .

لەشتوانرێ مەعنای (هەوا) بە (با) و (سەیر) بە (تەماشا) لێبدرێتەوە .

مەبەست لەو (خاك)ەی كە بناغەی ئادەمیزادە ، ئەو خاكەیە كە خوا حەزرەتی ئادەمی لێ دروست كردووە و ، مەبەست لە (ئاو)یش ئەو ئاوەیە كە ئەو خاكەی پێوە شێلراوە ، یا تۆوی ئادەمیزادە .

لەوانەیە نالی ئەم پارچە شیعرەی لە سەفەری حەجیدا وتبێ و ، دووریش نییە لەوە بكەیەنێ كە بە ڕێگای دەریادا ڕۆیشتبێ بۆ حیجاز .

لە كۆكردنەوەی (بەڕ) و (بەحر) و ، (ئاگر) و (ئاو) و (مونعەقید) و ( مونجەمید )دا طیباق و ، لە كۆكردنەوەی (تۆزێ) و (خاك)یشدا جۆرە تەناسوبێك هەیە ، هەرچەند (تۆزێ) لە (تۆز) نییە و بەمەعنا (نەختێك)ە .

ئاگری (عم) : ئاوری . عومرت (ت) : بەرگت . (خا) : فیكرت . خاكی : لەمە تێكستی (چر) و (چن) و (كم) و (گم)ە . نوسخەكانی تر هەمۆ : ( خاك و ) .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی سیانزەهەمە .

(٩) خاكی دامەن : ئەو خۆڵ و تۆزەی ئەتۆسێ بە داوێنەوە . بەرباد : فەوتاو،

هەتا شەقەی فەلەك نەبوە بە كافوری كفن ، هەستە
كە ئەمشەو فرصەتە ، هێشتا فەلەك ماوی ، ئەتۆش ماوی (١٠)

---

بابردوو . ئاوی گەوهەر : ئەو دڵۆپە بارانەی ئەكەوێتە سكی صەدەف و ئەبێ بە دوڕڕی یەكتا .

واتە : مادەم تۆ لە تۆزی خۆڵ و دڵۆپێ ئاو دروست كراوی و خاك و ئاوی ، فیز مەكە و خۆت بە زل مەزانە و ئەو خاكە بە كە ئەنوسێ بە داوێنی خەڵكەوە ، ئەگینا نابی بە هیچ و با ئەتبا وەك تۆز .. ئاوێكی بەنرخیش بە وەك ئەو دڵۆپە ئاوەی ئەچێتە ناو سكی صەدەفەوە و ئەبێ بە دوڕڕی یەكتا ، ئەگینا هیچ نیت و بڵقی سەراویت و پوچیت و هەر ئەوەندەت زانی ئەقیتەوە و بۆی بە هیچ .

تۆزی (چن) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : تۆز . بۆ (تۆزی)یش و (تۆزو)یش دەستنەدا . (عب) و (من) : تۆز و . سەر ئاوی ( « پەراوێزی » چر ) و (خا) : بێ‌ناوی .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی چواردەهەمە .

(١٠) شەقە : پارچە قوماش . فەلەك : ئاسمان . كافوری كفن : كفنی سپی وەك كافور . ماوی : شینی كاڵ ، ئاسمانی .

واتە : تا خوا ئاسمانەكانی وەك پارچە خامی سپی كفن نەپێچاوەتەوە و ئیسرافیل فوی نەكردووە بە صورا و خەڵك هەموی نەمردووە ، ڕاستبەرەوە ، بیری لە دوارۆژی خۆت بكەرەوە .. هێشتا هەل لە دەست دەرنەچوە و دەرگای تۆبە دانەخراوە .. هێشتا ئاسمان شینی كاڵە و تۆیش ماوی ، ئەگینا كە قیامەت داهات یا كە تۆ مردی ، مەیدانی تۆبە كردن نامێنێ و دەرگات لەڕوودا دائەخرێ .

ئەم بەیتە ئیشارەتە بۆ ئایەتی ( يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ) .

لەنێوان (كافور) و (كفن)دا تەناسوب و ، لەنێوان (ماوی) و (ماوی)دا جیناسی تەوار هەیە .

شەقەی (چر) و (چن) و (خا) : شەق . دیارە (شەقی)یە . (عب) و (من) : شەقی . كافوری : ئەمە تێكستی (عم) و (كم)ە . (چر) و (چن) و (ك) و (اح) و (خب) : كافور . دیارە (كافوری)یە . (ت) و (عب) و (من) : كافور و . بەلام هەڵەیە . هەستە (چن) : هەڵسە . هێشتا (خب): هەرتا . ماوی : ئەمە تێكستی (چر) و (عب) و (من)ە . نوسخەكانی‌تر

نەواڵەی تۆبە دەرێنە ، هەتا تەن نەبوەتە سفرە
پیاڵەی شیشە بشکێنە ، هەتا وەك کوپە نەشکاوی (١١)

بە میعراجی سولوکی سالیکاندا تا نەچی ڕۆژی ،
لەناو جەهلی موڕەککەبدا دەمێنی هەروەکو ماوی (١٢)

---

هەمو : (ماوە) . نەتۆش (عم) و (گم) : نەتۆیش .

لەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی هەژدەهەمە .

(١١) نەواڵە : پاروولە . تەن : لەش .

نالی لەم‌بەیتەدا تۆبــە کردنی شوبهاندووە بە پاروولە ئامــادە کردن بۆ خواردن و ، مردن و دەسەڵات نەمانیشـــی شوبهاندووە بـەوە کە لەشی بنیادەم ڕاکێشری لە گۆڕدا و بکرێ بە سفرە و خوانی مار و مێرو .

واتە : بەرلەوەی ببی بە سفرە و خوانی مار و مێروی ناو گۆڕ، پاروولەی تۆبە دەربێنــە و نــانی خۆت بخۆ و بە ســکی تێرەوە بڕۆ بــۆ ســەفەری دوارۆژ .. بەرلــەوەی ببی بــە گۆزەی شکاو ، پیاڵەی خۆت دەربێنە و شەرابی خۆت بخۆرەوە کە شــەرابی گەڕانەوەیە لە گوناه و مــۆگەر کردنی بەختیاریی دوارۆژە .

لەنێوان ( نەواڵە ) و (ســـفرە) و ، (پیاڵە) و (شیشـــە) و ، (پیاڵە) و (کوپە)دا تەناسوب هەیە .

پیاڵەی (چن) : پیالە . دیارە (پیالەی)یــە . (عب) و (من) : پیالە و . شیشــە (چر) و (خا) : نۆبە . (کم) و (گم) و (ت) : تۆبە . بشکێنە (کم)(عم) (گم) : مەشکێنە . کوپە ( ا پەراوێزی ا چر ) : شیشــە .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی حەفدەهەمە .

(١٢) میعراج : هۆی بەرز بوونەوە . بەرزبوونەوە . سـولوك : ڕێ‌گرتنەبەر . لە زاراوەی ئەهلی تەصەووفدا جۆرە خواپەرســتییەکی تایبەتییە لە ڕێگای ئازاردانی دەروونەوە . سـالیك : ڕێ گرتووەبەر . ئەو صۆفییەی خەریکی سولوك بێ . جەهلی موڕەککەب : ئەوەیە بنیادەم نەزان بێ و نەشزانێ کە نەزانە . بەرابەرەکەی (جەهلی بەسیط)ە کە ئەوەتە بنیادەم نەزان بێ و بزانێ کە نەزانە .

واتە : تا ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێت نەکەوێتە ئەو ڕێگـایە کە چاکانی خوا گرتوویانەتەبەر ، ئەوەنـدەی تۆسـقاڵێ خـوا بەڕاسـتی ناناسـی و ، وەك لەمەوبەر نەتزانیوە کە خوات نەناسیوە ، هەروا بە نەزانییش ئەمێنیتەوە.

گەدا ئینسان و دنیا غوربەتە « مِنْ حَیْثُ لا تَشْعُرْ »
به هیممەت طالیبی چشتێکی نازانێ بلێی ناوی (۱۳)

شتێکە بێ شەبیه و جینس و فەصل و کەشف و تەقریرە
موبەڕڕایە لە تەقریر و حەدیثی حادیث و ڕاوێ (۱٤)

---

بەلام ئەگەر ڕێت کەوتە ئەو ڕێگایەی ئەوان ، هیچ نەبێ ئاگادار ئەبێ کەوا تا ئەو کاتە نەزان بووێ و مەیدانی ئەوەت بۆ بەرەللا نەبێ کارێك بکەی ئەو نەزانییەت نەهێلێ و خوا بەڕاستێ بناسێ .

زاراوەی (جەهلی موورەککەب) لە زاراوەکانی زانستی مەنطیقە .

تۆزێ ( « پەراوێزی » چر ) و (عب) و (من) : هەروا . لەناو : ئەمە تێکستی (چن) و (کم)ە . نوسخەکانیتر هەموو : (لەنێو) .

ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی پانزەهەمە .

(۱۳) ئەم بەیتە وەك بەلگەی بەیتی پێشوو وایە . لە بەیتی پێشوودا وتی تا ئەو ڕێگایە نەگریتەبەر کە چاکانی خوا گرتویانەتەبەر ، هەر بە نەزانی ئەمێنیتەوە و نایشزانی کەوا نەزانی .. لەم بەیتەشدا ئەڵێ .. تەنها گرتنەبەری ئەو ڕێگایە ، دەلاقەیەك بۆ بنیادەم ئەکاتەوە بە ڕۆژی خواناسیدا، چونکە تۆ ئەی بنیادەم ، لەم جیهانەدا وەك کابرایەکی لات وای کەوتبێتە غەریبی و ، داوای شتێ بکەی خۆیشت ناوەکەی نەزانێ و ، بشتەوێ بەخۆڕایی بتدەنێ .. دیارە ئەو شتەت هەرگیز دەسگیر نابێ .

گەدا : ئەمە تێکستی («پەراوێزی» خا) و (عم) و (کم) و (گم)ە . (چر) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : کە تۆ . (چن) و (خب)یش هەر بەم ئاقارەدا لەسوڕێنەوە لەگەڵ هەندێ هەڵەدا کە نیوە بەیتەکەیان پێ تێکئەچێ. مەعنای نیوە بەیتەکە بەپێی تێکستی ئەم نوسخانە باش نایەت. لاتشعر (عب) : لایشعر . (خب) : لانشعر . بلێی : ئەمە تێکستی (گم) و (عب) و (من)ە . نوسخەکانیتر هەموو : (بلێ) ، بەلام لە ڕێنووسی کۆندا هەردوو وشە وەك یەك نووسراون . ئەم بەیتە لە (عب) و (من)دا بەیتی حەوتەمە .

(۱٤) بێ شەبیه : بێ وێنە . جینس و نەصل : دوو زاراوەی عیلمی مەنطیقن . مەنطیقییەکان بیانەوێ شتێك بە کەسێك بناسێنن لەپێشا بەجۆرێ باسی ئەکەن کە ئەو شتە و شتیتری لە گەڵێ شتا وەك ئەویش بگرێتەوە ، بەوە ئەڵێن تەعریف بە جینس . پاشان بە جۆرێکیکەش باسی ئەکەن کە لە

**ئەزانینت لەبەر عیجزە ، ئەوەك جەهلە ، كە ئەم چشتە**
**قەدیمە ئایەتە تەقریری قەولی حاكیی بو زاوی (١٥)**

---

بێگانەی جیا بكاتەوە، بەوەش ئەڵێن تەعریف بە ئەصل . بۆنموونە كە باسی بنیادەم ئەكەن و پێمانی ئەناسێنن ئەڵێن «گیانداریكی گۆیایە» . «گیاندار» جینسە و هەموو گیانداری ئەگرێتەوە . «گۆیا»یش فەصلە و تەنها بنیادەمی پێ لەكەوێ . كەشف : دەرخستن . زاراوەی ئەهلی تەصەووفە، بە حالەتێك ئەڵێن لە قۆناغێكی تایبەتیدا بۆ پیاوانی خوا پەیدا ئەبێ و توانایان ئەبێ هەندێ شتی‌وا بزانن بنیادەمی تر نەیزانێ و لە ڕێگای خوێندن و فێربوونیشەوە نایزانن . تەقریر ـ ی یەكەم ـ : زاراوەیەكی مەلایانەیە ، بەوە ئەڵێن كە مامۆستا بابەتێك بۆ فەقێ لێك‌ئەداتەوە . موبەڕڕا : پاك . تەقریر ـ ی دووەم ـ : جۆرێكە لە جۆرەكانی حەدیثی پێغەمبەر (د.خ) . حەدیث : فەرموودە یا كردەوەی پێغەمبەر یا بێدەنگ‌بوونی لە شتێ . حادیث : شتێ نەبووبێ و پەیدا بووبێ ، دژی ( قەدیم )ە . حادیث و قەدیم لە بابەت و زاراوەكانی عیلمی كەلامن . زاوی: ئەوەی قسەی پێغەمبەر لەگێڕێتەوە دەماودەم .

واتە : ئەو شتەی بەدوایا وێڵیت و نایناسی ، شتێكە لە وێنەی نیبە ، بە هیچ جۆرە ناساندنێك بە كەس ناناسێنرێ ، نە شێخ ئەتوانێ بیدۆزێتەوە و نە مەلا ئەتوانێ لێكی‌بداتەوە .. نە ( عولومی عەقلییە ) پەیی پێ ئەبا و نە ( عولومی نەقلییە ) .. نە عیلمی كەلام سەری لێ دەرئەكا و، نە حەدیثی پێغەمبەریش دۆزی ئەكاتەوە ..

وشەی ( بێ‌شەبیهـ ) ئیشارەتە بە ئایەتی ( لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ) .

لەنێوان (جینس) و (فەصل)دا تەناسوب و ، لەنێوان (كەشف) و (تەقریر)دا طیباق و ، لەنێوان (حەدیث) و (حادیث)دا جیناسی لاحیق و، لەنێوان (حەدیث) و (ڕاوی)دا تەناسوب هەیە .

شتێكە (چن) : كەسێك . دیارە ( كەسێكە )یە . (كم) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : شتێكی . كەشف و (عم) و (كم) و (گم) : دوور لە . لە تەقریر و (ك) و (من) و (خب) : لە تەقریری . (اح) و (خا) : لە تەقریر . بۆ هەردوكیان ئەگونجێ . حادث و (چن) و (ك) و (اح) : حادیث . بۆ ( حادیث و ) و (حادیثی)یش دەست‌ئەدا . (عب) و (من) : حاكیی بو .

ئەم بەیتە لە (ت)دا نیبە و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی هەشتەمە .

(١٥) عیجز : بێدەسەڵاتی . حاكی : ئەوەی شتێ بگێڕێتەوە .

واتە : كە نازانی كونهی ذاتی خوا چییە ، لەبەرئەوە نیبە خۆت

له قورئاندا به ( ما اُختفِي لَهُمْ ) مەکتوم و مەختومە
بەیان ئابێ بە تەفسیری دوصەد ( کەششاف ) و ( بەیضاوی ) (١٦)

---

کابرایەکی نــەزانی ، لەبەرئەوەیە دەســەڵات نیــیە بیزانی و خوا هەر ئەوەندەی دەسـەڵات داوێتێ کــە ئیــستا هەیە .. خوا خوایەکی قەدیم و بێ‌سەرەتایە ، بە قــسەی کەس باسی ناکرێ و ڕوون ناکرێتەوە .

ئێمە وای بۆ ئەچین ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو ، نالی یەکێکیانی لەجێی ئەویان نوسـیبێ کە بە دلی ئەبووبێ ، چونکە لە گەلێ شتا لەیەك ئەچن و دووبارە کردنەوەی وشـەی (ڕاوی)یش لە دوو بەیتی لەپاڵ یەکدا ئازادەیەك بێ‌ئامە . لاشمان‌وایە پێشوویانی لەجیاتی ئەمیان دانابێ ، چونکە تێکڕا ئەو پڕمەعناترە .

تەقریری (چــر) و (ك) : تەقریر و . (عم) و (کــم) و (ت) و (اح) : تەقریر . بۆ هەردوکیان دەست‌ئەدا . (گم) : تەقریر . (مب) : تەعبیر . دیارە (تەعبیری)یە . (من) : تەعبیری . قەولی (گم) : بە قەولی .

ئەم بەیتە لە (مب) و (من)دا بەیتی دوانزەهەمە .

(١٦) مەکتوم : شــاراوە . مەختوم : مۆرکراو . کەششـاف : تەفــسیرێکی قورئانە ناوی (الكشـاف عن حقائق التنزیل ، وعیون الاقاویل ، في وجوه التاویل)ە ، موحەممەدی کوڕی عومەری خوارەزمی (٤٧٦ ــ ٥٣٨ی . ك ١٠٨٣ ، ١٠٨٤ ــ ١١٤٣ ، ١١٤٤ی . ز) دایناوە . تەفسیرێکە بەپێی ڕێبازی بـیری موعتەزیلە و لەبارەی دەڕبــڕینی ڕووەکانی ڕەوانبێژیی قورئانەوە پایەیەکی باڵای هەیە . بەیضاوی : تەفسیرێکە ناوی ( انوار التنزیل واسرار التاویل )ە لەبوسەعید ناصیروددین عەبدوڵلای کوڕی عومەری بەیضاوی دایناوە کە لە (٥٦٨٥ی . ك ــ ١٢٨٥ ، ١٢٨٦ی . ز)دا مردووە .

واتە : ئەو خوایە کە کەس لە کونهی ناگا ، لە قورئانا بە ئایەتی ( فَلا تَعلَمُ نَفسٌ مــا اُخفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ اَعيُنٍ ، جَــزاءً بِما كانوا يَعمَلُونَ ) باسی لێ‌کراوە کە ڕاسـتییەکەی شاردووەتەوە چییە و دەرگای پەی‌بردن بە حەقیقەتی ئەوی مۆر کردووە و دووصەد تەفسیری قورئانی لە چەشنی (کەششـاف) و (بەیضاوی) ناتوانن ڕوونی بکاتەوە . ئەم ئایەتە واتە : هیچ‌کام لەو پیاو چاکانە نازانن چییان لەو دنیا بۆ هەلگیراوە لە پاداشی کردارییانا لەوشتانەی چاویان پێ فێنك ئەبێتەوە ، لەو شتەش دیتنی خوایــە ، وەك خوا لە لایەکی‌تری قورئانا ئەفەرمــوێت ( وُجوهٌ يَومَئِذٍ ناضِرَةٌ ، الى رَبِّها ناظِرَةٌ ) واتە : لەو ڕۆژە زۆر ڕوو گەشە

موبەیەن بۆ لە قورئاندا بە نـوری ( قُرَّةُ الأَعْيُن )
نە واضیح بۆ بە ( کەششاف ) و ، نە ڕۆشن بۆ بە (بەیضاوی ) (١٧)

کە جێگەت بۆ عیـادەت بێ ، چ فەوقانی ، چ تەحتانی
کە حوببت بۆ سیادەت بێ ، چ ( بەرزنجی ) ، چ ( باراوی ) (١٨)

---

چونکە بۆ خوای خۆی ئەژوانێ .

مەکتوم (مب) و (من) : مەکتوب .

ئەم بەیتە لـە (ت)دا نییە و ، لە (عم) و (کم) و (گم)دا لەگـەڵ بەیتی دوایی لەجێی یەکتردان و ، لە (مب) و (من)یشـدا بەیتی نۆهەمە .

(١٧) موبەیەن : ڕوون کراوە .

مەعنای ئـەم بەیتەش دەق وەك مەعنای بەیتی پێشـوو وایە . (قرة الاعین)یش بەشێکە لەو ئایەتە کە (ما اخفی لهم)ی بەیتی پێشوی تابۆ و لەوێ لێکمانداوەتەوە .

ئێمە لامانوایە نالی یەکێ لەم بەیتە و بەیتی پێشوی لەجێی ئەویان نوسیبێ ، چونکە جیاوازیەکی ئەوتۆیان نییە .

موبەیەن بۆ لە قورئاندا (عم) و (کم) و (گم) : لە قورئاندا موبەیەن بۆ .

ئەم بەیتە لە (مب) و (من)دا بەیتی دەهەمە و ، لە (خب)یشـدا نییە .

نەناسراوێك لە نوسـخەی (چر)دا بە لاپاڵی بەیتی دوانزەهەمەوە تا ئەم بەیتە نوسیویە : « شێوەیان بە هی نالی ناچێت » . بەڵام بۆ ؟ هیچی ڕوون نەکردووەتەوە .

(١٨) فەوقانی : سـەرخان . تەحتانی : ژێرخان . سـیادەت : سـەیدایەتی . بەرزنجی : سـەیدی بەرزنجەیی . بەرزنجە : مەڵبەندی ناوچەی سرۆچکە لە هەرێمی شارباژێر لە شارستانی سـولەیمانی . باراوی : سـەیدی باراوی . باراو : دێیەکە لە ناوچەی چوارتا لە هەرێمی شارباژێر .

واتە : تـۆ کە جێت بۆئەوە بـوێ خواپەرسـتیی تیا بـکەی ، هیچ جیاوازییەك لەنێوان سـەرخان و ژێرخاندا نییە و ، ئەگەر بنیادەمت بۆئەوە خۆش بوێ کە لە نەوەی پێغەمبەرە (د.خ) ، هیچ جیاوازییەك لەنێوان سـەیدی بەرزنجە و سـەیدی باراوا نییە و هەمو هەر نەوەی پێغەمبەرن و ، ئەوە هیچ بایەخی نییە کە سەرخان بەرزە و ژێرخان لە بنەوەیە و ، بەرزنجـە بەناوبانگە و بـاراو لەوانـەیە زۆرکەسی خەڵکی ناوچەکەش ناوی نەبیسـتبێ ..

مەکە دەعوایی پاکیی نەسەب بۆ جیفەیی دونیا
کە سەیید بی ، چ ( بەرزنجی ) ، چ (پیریایی ) ، چ ( باراوی ) (١٩)

وەرە ئەم نیکتەیە من پێت‌بڵێم « نالی » ئەگەر فەرضەن
هەمو دنیات بێ ، هێشتاکو هەر حەیران و داماوی (٢٠)

---

جێگەت ( « پەراوێزی » چر ) و (عب) و (من ) : مەبلت . (چن) و (ك) و (اح) : جێگە . چ فەوقانی ، چ تەحتانی (عب) و (من) : چ تەحتانی ، چ فەوقانی .

ئەم بەیتە لە (ت)دا نییە و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی نۆزدەهەمە .

(١٩) جیفە : بۆگەن ، مردارەوەبو .

واتە : ئیددیعای ئەوە مەکە کە سەییدی ( صحیح النسب)ی و کەس گومانی لەوەدا نییە کە ئەچیتەوە سەر پێغەمبەر (د.خ) و مەبەستیشت کۆکردنەوەی ماڵی دنیا بێ کە وەك مردارەوەبو وایە . سەیید ، مادەم ڕاست بێ سەیید بێ ، فەرقی نییە سەییدی (بەرزنجەیی) بێ کە هەموان بۆیان مۆر کردوون سەییدن ، یا سەییدی (پیریایی) بێ ، یا سەییدی (باراوی) بێ کە لەوانەیە ئەوەندەی سەییدی (بەرزنجە) بەناوبانگ نەبن ..

بە ڕای ئێمە نالی یەکێ لەم بەیتە و بەیتی پێشوویشی لە جێی ئەویان نوسیوە و ، وایشی بۆ ئەچین بەیتی پێشووی لە جێی ئەم نوسیبێ ، چونکە ئەو لەبارەی هونەرییەوە سەرکەوتوترە .

جیفەیی ( « پەراوێزی » چر ) و (چن) و (ك) و (اح) و (خا) : زینەت . دیارە (زینەتی)یە . پیریایی (ك) و (عب) و (اح) : پیریادی .

ئەم بەیتە لە (عم) و (کم) و (گم) و (ت)دا نییە و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی شانزەهەمە .

لە نوسخەی (چر)دا بە خەتی کەسێکی‌تری غەیری (چروستانی) ، لەسەر ئەم بەیتە نوسراوە : «هیی نالی نییە» .

(٢٠) فەرضەن : فرضا ، گریمان ، با وای‌دانێین .

واتە : وەرە ، نالی ، قسەیەکی ڕاست و وردت بۆ بکەم . لەم دنیایشە هەمووی هیی تۆ بێ ، بەوە نابی بە هیچ و هەروەکو ئیستا داماو و سەرسام ئەبی ، چونکە دەوڵەمەندیی ڕاستەقینە بە پارەداری نییە ، بەوەیە دەروون دەوڵەمەند بێ و ، ئەو دەردەش تۆ بەدەستیەوە گرفتاری ،

— ١٥ —

**گوڵ کە باڵغ و دەم دڕاو بێ ، کەوتە لاف و ڕەنگ و بۆی**
**باغەبان گوێی گرت و ، وا هێنای بە دەستی بەستە بۆی (١)**

---

دەردی بێ‌چارەیێ نییە ، دەردێکی گەلێ قوڵترە ، لە ناخی دەروونی خوتایە .. ئەو دەردەیە کوشەیەکیت لە شیعرەکانتا دەربڕیوە .

بێ (چر) و (چن) و (ت) و (خا) : بخوێ . هێشتاکو (ك) و (اح) : هێشتاکە .

— ١٥ —

(١) بەستە : بەسراو .

واتە : گوڵ کە پشکوت و دەمی کردەوە و کەوتە هاشووهۆش و گەزاف لێدانی ئەوە کەوا خاوەنی ڕەنگی جوان و بۆنی خۆشە و ، ویستی شان لە شانی یار بدا ، باخەوان زۆر بە سوکی گوێی گرت و بە دەستی بەسراو هێنایە خزمەتی یار .

نالی لەم‌بەیتەدا بە خەیاڵ دایناوە کەوا کردنەوەی گوڵ و بە چەپك کردنی و بردنی بۆ یار ، لە حوکمی گرتن و بەدیل بردنیایە و ، لە تۆڵەی ئەوەدایە کە گوڵ ئیددیعای ئەوەی کردووە وەك یار جوانە و ، ئیددیعاکەشی ، کە دیارە دەم‌کردنەوە و وتنی ئەوێ ، بریتیە لە پشکوتنی. لەبەرئەوە کە ئەم ئیددیعایەشی بە جۆرە بێ‌حەیاییەك داناوە لەئاستی یاردا ، بە ( دەم‌دڕاوێ )ی داناوە و ، بڕیاری داوە کەوا لەبێ لەسەر ئەو دەم دریژیە تەمێ بکرێ .

وشەی ( دەستی بەستە ) هەروەك مەعنای گیراوێ و دیلی ئەگەبەنێ ، بەپێی ڕێنووسی کۆن ئەتوانرێ بە ( دەستەی بەستە ) واتە چەپکی بەسراویش بخوێنرێتەوە .

لەنێوان هەردوو ( بۆی )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان ( دەستە ) و ( بەستە)دا جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (دەم) و (دەست) و (گوێ) و ، ( ڕەنگ ) و (بۆ)یشدا تەناسوب هەیە .

کە باڵغ و : لەمە تێکستی (چر) و (چن) و (مم) و (« پەراوێزی» خا)یە. (کم) : کە باڵغ . (گم) : کە یاخێ و ! . (ت) و (من) : لە باڵغ و . (مب): لە باڵغ . (اح) و (خا) و (خب) : کە باڵغ و . دەستنەدا لە (بەغی) بێ یا درابێتە پاڵ (باغ) . دەم دڕاو بێ (چر) و (خا) و (خب) : دەم دڕاوە . (ت) و

ڕەنگی زەرد و سووری خەوف و خەجلەتی ، ئاوی حەیای
وا تکاو ، ئەرجوو دەکەن عەفوی بکا وەك عەبدی خۆی (٢)

---

(ك) و (اح) : دڕابو . ڕەنگ و بـۆی (چن) : ڕەنگی بـۆی . (أ) . (کم) و (خب) : ڕەنگ بـۆی . دیارە ( ڕەنگ و بـۆی )ە . گوڵی : ئەمە تێکستی (چر) و (کم) و (گـم) و (عب)ە . نوسـخەکانی‌تر هـەمو : گوێ . دیارە مەبەست (گوێی)یە . وا هێنای (چر) : هێنای را . (عم) و (کم) و (گم) : دای‌هێنا . (ت) : وای‌هێنا .

(٢) خەجلەت : خەجاڵەتی ، شەرمەزاری . تکاو : ڕژاوە خـوار . ئەرجوو : تکاکاری .

وانە : گوڵیش لەترسی ئەوەی کە کردیانەوە و بردیان بۆلای یار و ، لە شەرمەزاریی ئیدیعاکەی پێشوی خۆیدا کە حەیـای پێ چو ، ڕەنگێکی هێنا و ڕەنگێکی برد و ، ئێستا ئەم ڕەنگی زەرد و سـوورەی و ئەم ئاو لـە ڕوو بڕانەی تکای بۆ لەکەن لای یار کە وەك بەندەی خۆی لێی ببوورێ و لێی خۆش بێ .

نالی لەم بەیتەشدا دایناوە کە زەرد و سـووریی گـوڵ ، کە دیارە گوڵ هەندێکی زەردە و هەندێکی سوورە ، و کاڵ و کز بوون و ئاو لە ڕوو بڕانی ، کە دیارە گوڵ کە کرایەوە وردە وردە لەڕاین لە ڕوی ئەبڕێ ــ لە ترس و لە شەرمەزارییەتی لەوە کە ئیدیعای جوانیی کردووە لەئاستی یارا و شانی داوە لە شانی .. جوانتر بوو ئەگەر نالی باسی گرییەکەشی بکردایە و ئەویشی بە ترس و شەرمەزاری دانایە ، خۆ دیارە گوڵی کراوە گریشە و بەرەو سیس‌بوون ئەڕوا .

هێنانی ( خەوف ) و (خەجلەت) بەدوای ( زەرد ) و (سـوور)دا لەف و نەشری مورەتتـەبە .

زەرد و (چر) و (اح) و (خا) : زەردە و . سووری : ئەمە تێکستی تەنها (ك)ە و ئێمە لامان‌وایە هەر ئەمە ڕاستە . ئەمەش تێکستی نوسخەکانی‌تر : (چر) و (خا) و (من) : شـووری . (چن) : سـوورە . (عم) و (کم) و (عم) : شوور و . (ت) و (عب) و (اح) و (خب) : شوور . خەوف و (چن) و (خا) : خەوف . بۆ ( خەوف و ) و (خەوفی)یش ئەگونجێ . (عم) و (کم) و (گم) : خەوفی . خەجلەتی (عم) و (کم) و (گم) و (اح) : خـەجلەت و . (ت) و (عب) و (خا) و (خب) : خەجلەت . بۆ هەر سـێ ئیحتیمالەکە ئەشێ . (ك) : خەجلەتە . وا تکاو (چن) : وا تکا . (ت) : وا دکا و . بەش‌بەحاڵی (وا تکاو) ، ئێمە لامان‌وایە ڕاستەکەی (داتکاو) بێ و بە هەڵەی نوسیار

چونکە بێنی بێوەفایی و ناز و شۆخیی لێ دەهات ،
ناردیە بازاڕی ڕیسوایی کە بیدا شوست و شۆڕی (٣)

دەست بە دەست چۆ تا گەیشتە دەستی عەططاری سەفیە
نایە سەر نار و عەذابی ڕۆحی داوو سفت و سۆڕی (٤)

---

گوڕاین . ئەرجو دەکەن (مم) و (گم) : ئەرجو دەکا . (کم) : ئەرجو نەکـا .
(من) : ئەرجو نەکا .

نالی لەمبەیتەدا ( وا تکـاو )ی بۆ دوو مەعنـا بەکارهێناوە : لەلایەکەوە پەیوەندی بە ( ئاوی حەیـای )ەوە هەبێ و ، لە لایەکی کەشەوە (ئەرجو)ی عەطف کرابێتە سەر .

(٣) ڕیسوایی : بێئابڕوویی . شوستوشۆ . داشتن ، شوردن .

واتە : یار گوڵی نەدایە گوڵ و تکا و پاڕانەوەکەی هیچ کاری لێ نەکرد، لەبەرئەوە کە بۆنی بێوەفایی و فیزکردن و خۆ بە شت زانینی لێنەهات و ئەوەی لەبیر چوبۆ کە جوانیی لە جوانیی یارەوەیـە ، ناردیە بازاڕی ڕۆهەڵماڵراوێ کە لەوێ هەزاران کـەس ئەیبینن ، بۆئەوەی لـەوێ لە تەشتی گوڵاو گرەوەکانا دایشۆرن و هەرچی بۆنی هەیە هەمووی بکرن و لە تلپێکی بێبۆن و هیچوپووچ بەولاوە هیچی لێ نەمێنێتەوە .

نالی لێرەشا بازاڕی گوڵاوگرەوەکانی داناوە بە حـەمام لەوەدا کە گوڵ ئەخەنە ناو تەشت و، کردنەوەی چەپکە گوڵەکانی داناوە بە ڕووتکردنەوە و ڕیسواکردن و ، هەڵغلیتاندنی گوڵی لەناو تەشتا داناوە بە شتن و ، گوڵاو گرتنەکەی داناوە بە پاککردنەوە لـە بۆنی بێوەفایی و فیزکردن و خۆ بە زل زانین ..

بێنی (مم) و (کم) و (گم) و (من) : بۆنی . شۆخیی (خب) : هیشوەی .
لێدەهات (کم) : لێنەهات .

(٤) عەططار : گوڵاوگر . سەفیە : نەفام . نار : ئاگر . سفت و سۆ : دەست پیا هێنانی شت و ئەمدیو و ئەودیو کردنی تا هیچی پێوە نەمێنێ .

واتە : گوڵە بەچەپککراوەکە لە بازاڕا چەند ئەم دەس و ئەودەسی کرد تا سەرەنجام گەیشتە دەستی وەستای گوڵاو دروستکەری نەفام کە قەدری گوڵی لا نییە ، گوڵەکەی خستە سەر ئاگر کوڵاندی و سزای گیانی دا و ئەوەندە دەستی پیاهێنا و ئەمدیو و ئەودیوی پێ کرد تلپی لەڕێ لێ بڕێ ..

چونکە مەنشووری گوڵەندامیی بە ناوی خۆی دەوێ
یار ، ئەگەر لەو باغیانە کەس بچنێ ، عارە بۆی (٥)

مەهـ بە شەو هەڵدێ ، پەنا دەگرێت و دەنوێنێ بە زۆر
دا بگاتە سێزی پەچچەی پەرچەم و وەصفی بڕۆی (٦)

---

لەدوای وشـەی ( سفت و سۆی )ەوە نیملێکی (دا) لەبەر ناچاریی سەنگی بەیتەکە فڕێنراوە کە (دا) ی ( عەذابی ڕۆحی دا ) جێگەکەی گرتووەتەوە و مەعناکەی ئەبەخشێ .

نالی لەم بەیتەدا گوڵی شوبهاندووە بە بنیادەم و کوڵاندنەکەیی شوبهاندووە بە ( عەذابی ڕۆح ) .

دەست بە دەست (چر) و (عم) و (گم) : دەس بە دەس . نار و (ت) و (عب) و (خب) : نار . دیارە ئەمیش (نارو)وە . عـەذابی (خا) : عەذاب . دیارە ئەمیش ( عەذابی )یە .

(٥) مەنشوور : فەرمانی بڵاوکراوەی میرێ . باغی : گوڵی ناو باخ یاخود یاخی بوو و لە ڕێ لاداو . عار : شوورەیی .

واتە : یار ئەیەوێ لەم جیهانەدا کەس نەبێ لـە جوانیدا بەربەرەکانێی بکا و بوێرێ لە ڕووبا بڵێ منیش هەم .. ئەیەوێ فەرمانی بەخشینی لەقەبی ( گوڵەندامی ) هەر بە نـاوی خۆیەوە دەرچێ و کەسی تر ئـەو لەقەبەی نەدرێتێ . بۆیە ئەگەر یەکێك لەو گوڵە باخانە ، یا لەو جوانە یاخی بووانە کە سەری بـۆ نانەوێنن ، بچنێ لـە دنیادا ، شوورەییە بـۆ ئەو و ، لەبەرئەوەش بـۆ ئەم گۆبەندەی ساز کرد و گوڵی کوڵۆڵی گەیانـد بەو سەرەنجامە ناخۆشە کە خستیانە سەر ئاگر و کوڵاندیان .

وشەی ( یار ) لـەلایەکەوە فـاعیلی ( دەوێ )یـە و ، لە لایەکی کەوە موبتەدایە و ڕستەی ( عارە بۆی ) خەبەریەتی .

مەنشووری (چن) و (کم) و (عب) و (اح) و (خا) : مەنشـوور . دیارە ( مەنشووری )یە . بە ناوی (چر) و (کم) و (ك) و (اح) و (خا) : بە نامی . (مب) : بە ناو . دیـارە ئەمیش ( بە ناوی )یـە . (خب) : بە تاڵەی ، بە طالیعی . لەو باغییانە (چن) : لەو یاغییانە .

(٦) واتە : مانگ بە شەو هەڵدێ وەك مانگی یەکشەوە و وەك مانگی تەواو و ، بە زۆریش خۆی ئەشارێتـەوە و ئەخـەوێ ، بۆئەوەی بە شەو دوور لە خۆڕاگرتنی بەدکار و ناحەز ، لە کاتی یەکشەوەیدا بە حوکمی ئاشنایی

گەر بڵێم : شەمسی ، دەڵێ : ئەو خۆش ڕووە بێ پەردەیە
وەر بڵێم : سەروی ، دەڵێ : ئەو ئەحمەقە کوا گفتوگۆی ! (٧)

---

لەگەڵ برۆی یار و بە حوکمی لەیەکچوونیان بتوانێ بە سەربەستی تەماشای برۆی بکا و حاڵی ببێ چییە . لەکاتی تەواویشدا بە حوکمی ئەوەی لە ڕۆی یار ئەچێ بدا لێی و لەو نزیکەوە لە ڕازی زوڵفی بکا کە بووە بە پەچە بەسەر ڕۆیەوە . بۆیە بە ڕۆژیش خۆی حەشار ئەدا چونکە ڕۆناکیی ڕۆژ ڕۆناکیی ڕۆی یارە و ، لەبەر ئەو ڕۆناکییە تەماشای هیچی پێ ناکرێ . .

ئەشتوانین مەعنای بەیتەکە وا لێبدەینەوە کەوا زوڵف و برۆی یار ڕەشن و لە ڕەشیدا لە جینسی شەوی تاریکن . مانگیش بۆیە بە شەوی تاریک هەڵدێ تا بە تاریکایی شەوەوە شتێك لە ڕازی ڕەشیی زوڵف و برۆی یار حاڵی ببێ .

دەنوێنن : ئەمە تێکستی تەنها (چن)ە و هەر ئەم نوسخەیەش مەعنای تازادەیەك دیارە . (چر) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) و (خب) : دەنوێنێ . (عم) و (کم) : ئەنوێنێ . دا (عم) و (کم) و (گم) : تا . بەچپچەیی (عم) و (گم) و (ت) و (عب) و (من) و (خب) : پێچەیی . بەرچەم و (عم) و (کم) و (گم) و (من) : بەرچەمی . وەصفی : ئەمە تێکستی (چر) و (چن) و (خا)یە ، بەلام بە شێوەی (وەصف) کە دیارە ( وەصفی )یە . (عم) و (کم) و (گم) : کەنف و . (ت) و (ك) و (اح) : سەففی ، بەلام لەشێوەی ( صفێ )دا . (عب) و (خب) : کەشف . دیارە ( کەشفی )یە .

(٧) واتە : لەگەر یار بە خۆر بشوبهێنم لە جوانیدا ، ڕازی نابێ و بە کەمی ئەزانێ بۆ خۆی و ئەڵێ بەڵێ ڕاستە خۆر ڕوخساری جوانە ، بەلام بەداخەوە ڕۆی بەدەرەوەیە و هەمو کەس ئەیبینێ . ئەگەر بە سەرویشی بشوبهێنم لە بەرزیی بالایا ، دیسان هەر رازی نابێ و بە کەمی ئەزانێ بۆ خۆی و ئەڵێ بەڵێ ڕاستە سەرو بالای خشت و بەرزە ، بەلام بەداخەوە ئەو کەرە قسە ناکا . .

(کەریەتی)ی سەرو ئیشارەتە بەوە کە درێژە و ، درۆیەکی فۆلکلۆریش هەیە کەوا گوایە بنیادەمی درێژ بێ‌عەقڵە . بێ‌گفتوگۆیشی ئیشارەتە بەوە کە گەڵای نییە تا کە با لێیدا خشەی بێ .

دەڵێ ــ لە هەردوو نیوە بەیتەکەدا ــ (کم) و (من) : ئەڵێ . خۆش‌ڕووە (چر) و (عب) و (اح) و (من) و (خا) : خۆش‌ڕۆ . دیارە ئەبێ راوێکی مەعطفیش لەدوایەوە بێ . (چن) : خۆش‌ڕۆ و ، خۆش‌ڕۆی . (عم) و (کم) و (گم) و (ت) : خۆش‌ڕووی . وەر (چن) و (من) : گەر .

دیدەوو دڵ هەردو وا جۆبار و جۆیای قەددی تۆن
سەروی دڵجۆی عەرعەر و ، دڵجۆی نەمامی دیدەجۆی (٨)

چونکە باوکی ڕۆمی‌یو دایکی حەبەش بۆ ، ما بە بەین
ڕۆژ و شەو ، کافور و میسکی ، ڕۆ گەنم ، خاڵ دەنکە جۆی (٩)

---

(٨) جۆبار : جۆگا . جۆیا : ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێ . قەدد : باڵا . دڵ جۆ : ئەوەی دڵ بیبەوێ . دیدەجۆ : لەوەی چاو بەدوایا بگەڕێ .

واتە : چاوم بووە بە جۆگا و وێنەی تۆ لە قەراخیا ڕواوە و دیمەنت هەرگیز لە بەرچاوم ون نابێ .. چاوم هەمیشە بەدوانا ئەگەڕێ ئەیەوێ بتبینێ .. یادت لە دڵما ڕواوە و هەرگیز لێی هەڵناکەنرێ و هەمیشە بیرت لێ ئەکەمەوە . تۆ ئەوەندە شۆخ و بالابەرزی ، هەرچەند سەروی ، بەڵام عەرعەر بە دڵ عاشقت بووە .. تۆ کەسێکی ئەوەندە شۆخی تەنانەت ئەو نەمامانەش کە دیدە بەدوایانا ئەگەڕێ ، یا دیدە بووە بە جۆگە و لەوان لە قەراخیا ڕواون ، بە دڵ بەدوانا ئەگەڕێن و بیرت لێ ئەکەنەوە .

دیدەوو (کم) و (خب) : دیدەیی . مەگەر بڵێین بۆ دڵیش دۆ چاوی داناوە . هەردو وا جۆبار و (چر) و (کم) و (ك) : هەردو جۆباری . ئەبێ (هەردووە) بێ . (عم) و (گم) : هەردویان جۆبار و . (ت) و (عب) : هەردۆ وا جۆبار . دیارە (جۆبار ر)وە . (اح) و (خا) و (خب) : هەردو جۆبار . دیارە (هەردووە جۆباری)یە . سەروی (چر) و (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : سەرو . دیارە (سەروی)یە . عەرعەر و : ئەمە تێکستی (عب) و (خب)ە . نوسخەکانی‌تر هەمۆ : (عەرعەرە) . نەمامی (چن) و (ت) و (ك) و (عب) و (اح) و (خا) و (خب) : نەمام . دیارە (نەمامی)یە .

(٩) واتە : لەبەرئەوەی کە یار باوکی ڕۆمێ و سپیە و دایکی حەبەشەیێ و ڕەشە ، خوێشی لەو ناوەدا ماوەتەوە ، بۆیە ئازیز تۆ نە سپیی تەواو و نە ڕەشی تەواوی ، لە هەردولات پیایە ، ڕۆی ڕۆناکی وەك کافورت لە باوکتەوە و زولفی ڕەشی وەك میسکت لە دایکتەوە بۆ هاتووەتەوە ، ڕۆی گەنم ڕەنگت لە باوکتەوە و خاڵی وەك دەنکی جۆ ڕەش ڕەشت لە دایکتەوە پێ بڕاوە ..

باوکی (عب) و (خب) : باوك . ڕۆمی‌یو : ئەمە تێکستی تەنها (چن)ە . نوسخەکانی‌تر هەمۆ : میصری‌بو . ئێمە ئەوەی (چن)مان لا ڕاستتر بۆ . دایکی (چر) و (خا) : داکی . (ك) و (عب) و (اح) و (خا) : دایك . بۆ (دایکی)یش

من گوتم : سەروی قەدت مەوزوونە ، ئەو طەبعەم هەیە
ئەو گوتی : « نالی » بە میزابی کینایەتمان دەشۆری (١٠)

– ١٦ –

تەشریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ
دڵ ، چونکە میثلی غونچەیە ، بۆیێ دەپشکوێ (١)

لەم وەعدە خۆشەدا گوڵ وگوڵ چیهرە تێکەڵن
یەك ڕەنگ و موتتەحید ، بە دڵ ، ئەمما بە تەن جوێ (٢)

---

نەگونجێ . ما بە بەیێ : ئەمە لێکسێتی (چر) و (ت) و (ك) و (اح) و (خا)یە . نوسخەکانی‌تر کەوتۆنەتە چەند هەڵەی جۆربەجۆری مەعنا نەبەخشەوە . ڕۆژ و (ت) و (ك) و (اح) : ڕۆژ . دیارە (ڕۆژ و)وە . کافوور و (ت) و (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : کافور . دیارە (کافوور و)وە .

(١٠) میزاب : پلوسك .

واتە : بە یارم وت : باڵای وەك سەروت بەرز و ڕێکە ، بۆیە کاریشی کردووەتە من و وا سروشتم ڕێك‌وپێکە و شیعری جوانم بۆ دێ ( یاخود بە کینایە مەبەستی ئەوەیە بڵێ بۆیە منیش ئارەزووم لێتە ) . یاریش لە وەڵامدا وتی : بە ئاوی پلوسکی کینایەی وەك میراوت دامانمەشۆ . ( مەبەستی یا ئەوەیە بڵێ کینایەکانت ئەوەندە بێ‌بایەخن شایانی شانی من نین و لەوە ئەچێ بتیادەم بە ئاوی پلوسکی باراناو داشۆرێ ، یاخود بەم‌کینایە بێ‌ئامانە مەمکە بە بنێشتە خۆشەی ژێرزمانی خەڵك و ناوم مەخەرە ناو ناوان ) .

گوتم ، گوتی (کم) و (من) : وتم ، وتی . ئەو طەبعەم (عم) و (کم) : وا طەبعم . کینایەتمان (چر) و (چن) و (خا) : کیتابەتمان . لە (دپەراوێزی چن)یشدا (کینایەتمان) هەیە .

– ١٦ –

(١) واتە : تەشریف هێنانی بەهارە ، جیهان نوێ ئەکاتەوە و ، دڵیش وەك خونچە وایە بۆیە بە هاتنی بەهاری نوێ ئەپشکوێ و ئەکرێتەوە .

(٢) گوڵ چیهرە : ئەو نازدارانەی ڕوویان وەك گوڵ وایە . موتتەحید : بە یەك بوو .

واتە : وەرزێکی ئەوەندە جوانە گوڵی پشکوتو و نازدارانی ڕوو وەك گوڵی تیا تێکەڵ بوون ، نازداران بەناو گوڵزار و باخچەکانا ئەسوڕێنەوە ،

هەرعەر عەدیلی قەددیە ، یەعنی بەرابەرن
سونبول شەبیهی زولفیە ، فەرقی نیە موێ (٣)

لەم خۆشیە کە هێزمی مەطبەخ سەوز بووە ،
ماوم عەجەب لە دیدەیی صۆفی کە ئاژوێ ! (٤)

---

لەبارەی دەرژنەوە هەموو لە یەك ئەچن و بنیادەم ناتوانێ لە یەکیان جیا بکاتەوە ، چونکە هەرچی گوڵە یاری بولبولە و هەرچی نازدارانیشن یاری دلداراننانن ، تەنها بەدیمەن لە یەك جوێن ، کەسێ بۆیان بڕوانێ ، دیاریان لەکا و لە یەکیان ئەکاتەوە .

خۆشەدا (مم) و (گم) : خۆشە وا . گوڵ و (اح) : گوڵ . دیارە (گوڵ و)وە . (خا) : گوڵی . مەعنای نایەت . گوڵ چیهرە (چن) : گوڵ غونچە .

ئەم بەیتە ، لەگەڵ بەیتی پاشەوەی لە (مم) و (کم) و (گم)دا پاش و پێش و ، لە (عب) و (من)یشدا بەیتی چوارەمە .

(٣) عەدیل : هاوتا . موێ : مۆیەك .

واتە : لەم باخ و گوڵزاری بەهارەدا کە نازدارانی لێ‌ژاوە ، داری بەرز و باریکی عەرعەر ، دەق ، وەك بالای یار وایە و ، ئەوەندەی یەکن . تاڵی گیای بۆنخۆشی سونبولیش کوتومت لە زولفەکانی ئەچێ ، مۆیەك چیە جیاوازیان لەبەینا نیە .

شوبهاندنی عەرعەر بە بالای یار و ، سونبول بە زولفی ، بۆ دەربڕینی زیادڕەویە لە بەرزی و باریکیی بالای یار و ، بۆنخۆشیی تاڵەکانی زولفیدا و پێی‌ئەڵێن (تەشبیهی مەقلوب) ، ئەگینا ئەبوو بالای یار بە عەرعەر و ، زولفی بە سونبول بشوبهێنرایە . وردەکاریەکی جوانیش لەوەدا هەیە کە تاڵی ئەڵێ زولفی یار و سونبول مۆیەك جیاوازیان لەبەینا نیە ، لەکاتێکا کە زولف خۆی مووە .

ئەم بەیتە لە (کو) و (عب) و (من)دا بەیتی پێنجەمە .

(٤) هێزم : دار . مەطبەخ : چێشتخانە . ئاژوێ : سەوز نابێ . لەژ نابێتەوە . ئەبلەق نابێ .

واتە : لەم وەرزە خۆشەدا کە هەموو شت لە جم‌وجۆڵ و گەشەکردن و بوژانەوەدایە ، تەنانەت داری وشکی زەنگەڵیشی چێشت خانەیشی

تیپی شکۆفە ، خەیمەیی داوە لە هەر طەرەف ،
یا شاهی نەوبەهارە ، هەڵیداوە هۆردوێ !؟ (٥)

دنیا کە گوڵ گوڵی بووە ، قوربان ، ئەتۆش وەرە ..
طالیب بە گوڵ بە ، فەیدی چییە گوڵ گوڵی بوێ ! (٦)

---

سەوز بووەتەوە ، سەرم لە سۆفی سڕماوە کە چەند وشك و دڵڕەقە ، فرمێسکی شادمانی ناکەوێتە چاوی و ، چاوی بە تەماشای ئەم دیمەنە جوانانەوە ئەبلەق نابێ . دیارە سۆفی وەك دڵی کوێرە ، چاویشی کوێرە و هیچ نابینێ .

سەوز بووە (عم) و (کم) : ڕوایەوە .

ئەم بەیتە لە (لو)دا بەیتی سێهەم و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی دۆهەمە .

(٥) شکۆف : شکۆفە ، هەلاڵەی درەخت . خەیمە : دەوار . طەرەف : لا . هۆردۆ : لەشکر .

واتە : نازانم ئەم دیمەنە سپییە جوانەی ئەیبینم ، تیپی هەلاڵەی درەختەکانە بۆ هەر لایەك لەڕوانێ دەواری خۆی هەڵداوە ، یاخود شای نەوبەهارە بارگەی ئۆردۆی خستووە و خێوەتی سپیی بۆ داکوتاوە !!

تیپی : (عم) و (کم) نەبێ ، هەمۆ نوسخەکانی بەردەستمان تیا کەوتۆنەتە هەڵەوە و وایانزانیوە عەرەبییە بە (طیپ) یا (طیب)یان نۆسیوە ! بۆیە لەڵێین هەڵە چونکە ئاشکرایە لێرەدا مەبەست (طیب)ی عەرەبیی بەمەعنا بۆنخۆشی نییە . یا شاهی (ت) : پاشایی . بەپێی ئەم نوسخەیە نیوە بەیتی دۆهەم معطف نابێ بۆسەر نیوە بەیتی یەکەم و ، لە هیچکام لە دۆ نیوە بەیتەکەدا پرسیار نابێ ، بەڵکو هەمۆی (جوملەی خەبەری) ئەبێ و (شکۆف)یش (شکۆفە) ئەبێ و نیوە بەیتی دۆهەم (حوسنی تەعلیل) ئەبێ بۆ نیوە بەیتی یەکەم .

ئەم بەیتە لە (لو) و (عب) و (من)دا بەیتی شەشەمە .

(٦) گوڵگوڵی : گوڵگوڵین . ئەوەی هەمۆ گیانی گوڵ بێ .

واتە : دنیا یەك پارچە بووە بە گوڵ و ڕازاوەتەوە . قوربان تۆیش وەرە بۆ سەیر ، مەڵێ من خۆم گوڵم ، پێویستم بە دیتنی گوڵ نییە .. هەر گوڵت بوێ چاکە ، فەید ناکا ئەگەر گوڵ بێ بۆ سەیری گوڵ ..

لەنێوان (گوڵگوڵی) و (گوڵ ، گوڵی)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

بولبول ، که گەرمە نەغمەیی ، ئاگر دەکاتەوە
غونچە ، حەزینە ، جەرگ و دلی بۆ دەکا تویّ (٧)

«نالی» ! زوبانەکەی تەڕ و پاراوی سەوسەنت
حەیرانی چاوی نێرگسە ، وەك لالە ، نادویّ .. (٨)

---

ئەتۆش (خب) : ئەتۆیش .

ئەم بەیتە لە (تو) و (عب) و (من)دا بەیتی حەوتەمە .

(٧) واتە : بولبول دلی لە عەشقی گولدا ئەوەندە پڕە لە سۆز ، بە ئاوازێکی ئەوەندە گەرم و بەکول ئەخوێنیّ ، ئاگر بەرئەداتە دلی خونچەی دلداری . خونچەش یارێکی بەوەفایە پڕی دلیە لە خەفەت بۆ بولبولی دلداری ، بۆیە ئەپشکویّ و جەرگ و دلی خۆی بۆ تویّ ئەکاتەوە تا بە ئاگری ئاوازی ئەو بیبرژێنیّ .

لەنێوان (دەکاتەوە) و (دەکا تویّ)دا جۆرە جیناسێکی تەرکیب هەیە .

گەرمە نەغمەیی (عم) و (گم) : گەرمیی نەغمەیە . (کم) : گەرم نەغمەیە . بۆ (گەرمی)یش دەسنەدا . (ت) : گەرمە نەغمەیە. ئاگر (عم) و (گم) : ئاور . غونچە حەزینە (چر) : غونچەی حەزینە . (گم) : خونچە حەزینە ! (خا) : غونچە حەزینەیی .

ئەم بەیتە لە (تو)دا بەیتی چوارەم و ، لە (عب) و (من)دا بەیتی سێهەمە.

(٨) سەوسەن : گیایەکە گەڵایەکی باریك و درێژ و گولی جوان و ڕەنگاوڕەنگی هەیە .

واتە : نالیا ! زوبانی درێژ و تەڕ و پاراوت کە ئەلێی گەڵای سەوسەنە، لە ئەتوانایی نیە ئاوانیّ شیعریّ بلیّ شایانی ئەم نەوبەهارە جوانە بیّ .. حەیرانی چاوی خەوالوی نەرگس بووە ، وەك خەوی لیّ خستبیّ وای بەسەرهێناوە و ، لالی کردووە و لە گۆی خستووە ..

لە کۆکردنەوەی (تەڕ) و (پاراو) و ، (سەوسەن) و (نێرگس)دا تەناسوب هەیە . هەروا لەگەڵ (لالە)ش بەدیمەن ..

زوبانەکەی (گم) : زمانەکەی . (کم) : زمانێکی . (من) : زوبانێکی . پاراوی (چر) و (چن) و (تو) و (ك) و (عب) و (خا) : پاراو . دیارە (پاراوی)یە . (کم) و (ت) و (اح) : پاراوە .

— ١٧ —

یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ لە گریانی دەوێ
ئارێ ئارێ گوڵ لە باغان ئاوی بارانی دەوێ (١)

هەرکەسێ ڕۆی تۆ دەبینێ ، خۆی بە قوربانت دەکا
چونکە ئەبرۆی تۆ هیلالی عیدە ، قوربانی دەوێ (٢)

---

— ١٧ —

(١) ئارێ : بەڵێ .

واتە : یار گوڵە سوورەی باخانە ، بۆیە حەز لە شتێ ئەکا لە چەشنی خۆی بێ ، لەبەرئەوە ئەیەوێ دڵی دلدارەکانی هەمیشە پڕ بێ لە خوێن و ، بۆیەشە پەیدەرپەی ئازاری دڵیان ئەدا . لەبەرئەوەش کە گوڵەباخ هەمیشە پێویستی بە بارانە ئاوی بدا ، ئەیەوێ چاوی دلدارەکانی هەمیشە پڕ بێ لە گریان .

خوێنین و (ت) و (اح) : خوێنین . بۆ ( خوێنین و ) و (خوێنینە)یش دەستنەدا . باغان (گم) : باخان ا . ئاوی (ك) و (اح) و (خا) : ئاو . دیارە (ئاوی)یە . (من) : ئاوی . دەوێ ـ لە هەردوو نیوە بەیتەکەدا (گم) و ، تەنها لە نیوەی دووەمدا (من) : ئەوێ . .

لە نیوەی دووەمی ئەم بەیتەدا حوسنی تەعلیل هەیە .

(٢) قوربان ـ ی دووەم ـ : قوربانێ . (ی)کەی ضەمیری غائیبە .

واتە : هەرکەس چاوی بە ڕۆمەتی وەك مانگی چواردەت ئەکەوێ ، ئەوەندە گرەویدەی ئەبێ، خۆی لە دەورت ئەگێڕێ و خۆی ئەکا بە قوربانێ بۆت ، کە قوربانییش لە (١٠) تا (١٤)ی مانگی قورباندا ئەکرێ و ڕۆی تۆیش وەك مانگی (١٤) وایە . بۆیەش ئەوکەسەی چاوی بە ڕۆت بکەوێ خۆی ئەکا بە قوربانیی ، چونکە برۆت لە مانگی یەکشەوەی شەوی جەژنی قوربان ئەچێ کە خەڵك زۆر بەپەرۆشەوە بەدوایا ئەگەڕێن و ، هەر کە دیانەوە خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ قوربانێ کردن . کە ڕۆژیشیان دێ ، تێ ئەگەن گەیشتوونەتە ڕۆژانی جەژن و (ایام التشریق) و ، کاتی قوربانێ کردنەکە هاتووە و خۆیان ئەکەن بە قوربانێ بۆت .

لەنێوان (قوربانت) و (قوربانی)دا جیناسی لاحیق هەیە .

ئاو لە چاوانم بە خوڕ دێ ، ئاگری دڵ ناکوژێتەوە
وەك جەهەننەم ئەم تەنورە ئاوی طۆفانی دەوێ (٣)

عەشق سولطانێکە هەر گا زۆ لە وێرانێ بکات
ئاهی سەرد و ، ئەشکی گەرم و ، قەلبی بوریانی دەوێ (٤)

---

بەقوربانت (عم) و (گم) و (خب) : بـەقوربانی . دەکـا (کم) : ئەکا . هیلالی (چن) و (گم) و (من) : هیلالە . (ت) و (ك) و (عب) و (اح) : هیلال. دیارە (هیلالی)یە . (خـا) : هیـلال و . (گم) و (من) : عیدی . دەوێ ــ لێرە و لە هەموو بەیتە داهاتووەکانیشا ــ (کم) و (من) : ئەوێ .

(٣) ئەڵێن گریان و فرمێـسك ڕشتن کەف و کوڵی دڵ دائەمرکێنێتەوە و باری دڵ سوك ئەکا ، بەلام ئەمە بەشی‌بەحالی نالی ڕاست نییە . بۆیە ئەڵێ : من هەمیشە چاوم بەخوڕ فرمێسکی لێ ئـەڕژوا ، لەگەڵ ئەوەشا ئاگری دڵم ناکوژێتەوە. . وادیارە تەنوری دەروونی من ئەوەندە بەلینە لەئاستی ئاگری جەهەننەمدایە و بە گریانو فرمێسك چاری ناکرێ ، پێویستی بە تۆفانێکی وەك تۆفانەکەی نوحە هەڵـسێ دایمرێنێتەوە .

لە دوو تەعبیری ( ئاو بەخوڕ هاتن ) و ( نەکوژانەوەی ئاگر )دا طیباقێکی جوان بەدی ئەکرێ .

ئاگری دڵ (چر) و (عم) و (اح) و (خا) : ناری دڵ . ( « پەراوێزێکی » چر ) : ئاگری . ئەم (ت) و (اح) و (خا) : ئـەو . طۆفانی (گم) : تۆفانی / (خب) : بارانی .

(٤) سولطان : خاوەن دەسەلات . هەرگا : هەرکـاتێ . وێرانێ : وێرانەیەك. بوریان : برژاو و هەڵقرچاو .

واتە : خۆشەویـستی پادشایەکی‌خـاوەن دەسـەڵاتی‌وایە زۆ بکاتـە هەرلایەك کاری خۆی هەر ئەکا ، تەنانەت ئەگەر ڕێیشی بکەوێتە دڵێکی وێرانەی‌واوە کە هەرگیز مەعنای دڵداری نەفامیبێ ، ئاه و هەناسەی سەرد و فرمێسکی گەرم و دڵی بەکەباب‌بوی لێ ئـەوێ و پێیشی پەیـدا ئەکا . .

لەنێوان (سولطان) و (وێران) و ، (سـەرد) و (گـەرم)دا طیبـاق و ، لەنێوان (قەلب) و (بوریان)دا تەناسوب هەیە .

هەرگا (چن) و (عب) : هـەرگاه . (عم) : وەقتێ . لە وێرانێ (چر) و

دوور لە تۆ دڵ هێندە بێئارام و بێحاڵ کەوتووە
ئەی مەسیحای عەصر ! لەو لێوانە دەرمانی دەوێ (٥)

ڕەنگم ئەوا زەرد بوو وەکوو پایز لە هیجران « نالیا »
عەشق ئێستاکەش لە من سەیلی بەهارانی دەوێ ! (٦)

---

(اح) و (خا) : لە وێرانە . (عم) : لە هەر موڵکێ . (ك) : لە جێگایێ .
(عب) : لە وێرانێك .

ئەم بەیتە لە (ت)دا نییە .

(٥) مەسیحا : حەزرەتی عیسا کە بە چاککردنەوەی نەخۆش بەناوبانگ بووە .
عەصر : چەرخ .

واتە : بەهۆی دەردی کاریگەری دووریی باڵای تۆوە ئارام و ئۆقرەم لێ بڕاوە و دڵم لەسەر خۆی نەماوە . دەسا ئەی ئەوەی لەم چەرخەدا جێگەی حەزرەتی عیسات گرتووەتەوە ، دڵ دەرمانی دەردی خۆی لەو لێوانەی تۆ ئەوێ کە ماچێکە . . .

ڕستەی ( دوور لە تۆ ) بۆئەوەش دەستئەدا کە ڕستەی نزا بێ ، وەك ئەڵێن : دوور بێ لێت ، زۆر نەخۆشم . .

هێندە (گم) : ئێستە . بێحاڵ (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (من) و (خا) : بەدحاڵ . مەسیحای (عم) : مەسیحایی . عەصر (مم) : زەمان .
لێوانە (مم) و (گم) : لێوە .

ئەمبەیتە لە (عب) و (خب)دا نییە .

(٦) واتە : من لەتاو دەردی دووریی یار ، ڕەنگم وەك گەڵای زەردی پایز زەرد هەڵگەڕاوە و ، هێز و توانای گریانم لەبەر بڕاوە و کانیاوی چاوم وشکاوی هاتووە . . کەچی عەشق هێشتا دەست لە یەخەم ناکاتەوە و ئەیەوێ وەك لافاوی بەهار فرمێسکی بۆ هەڵڕێژم . . مەبەستی لەوەیە بڵێ من گەیشتوومەتە پایزی تەمەن و خەلەت لە هەموولایەکەوە گەسارۆی داوم ، کەچی عەشق ئەیەوێ ئێستاش لە تۆفی گەنجایەتی و هەرەتی لاویدا بم .

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە نوسخەکانی بەردەستمانا جیاوازیی زۆری تیایە . ئێمە لێرەدا لەسەر تێکستی (عم) و (کم) و (گم) و (من) ڕۆیشتووین و ، وا تێکستی نوسخەکانی تریش وەك خۆیان ئەنووسینەوە :

(چر) : ڕەنگم لەوا «نالی» کەوا زەردە لەبەر هیجرانی یار

خالێ نییە ڕەشماری دو زوڵفت لە بەلاێ
حەلقەی شەڕیان بەستووە هەر یێکە لە لاێ (١)

عاشق دڵی نایێ لە دلارامی جودا بێ
ئەلبەت کە دلارامێ لەوێ بێ ، دڵی نایێ (٢)

---

(چن) و (عب) و ( « پەراوێزی » من ) :

ڕۆم ئەوا « نالێ » ئەوا زەرد بۆ لەبەر هیجرانی تۆ

( « پەراوێزی » چر ) و (خا) :

ڕۆم ئەوا زەرد بۆ وەکو پایز لە داغی هیجری تۆ

( « پەراوێزێکی‌تری » چر ) :

ڕۆم ئەوا « نالێ » کە زەردە وا لەبەر هیجرانی یار

(ت) و (لـ) و (اح) و (خا) :

ڕۆم ئەوا « نالێ » کە زەردە وا لەبەر هیجرانی تۆ

(خب) : ڕۆم ئەوا «نالێ» کە زەرد بۆ من لەبەر هیجرانی یار

— ١٨ —

(١) واتە : زوڵفەکانت کە ئەڵێی ڕەشمارن بەلایەکیان بەدەمەوەیە ، بێ‌مەلامەت نییە هەریەکەیان لە لایەکەوە ئەڵقەیان بەستووە و لــە بەرابەری یەکتردا ڕاوەستاون خۆیان ئامادە کردووە بۆ شەڕ .

مەبەستی نالێ ئەوەیە بڵێ : بە هەر جۆر ئەگەر بەگژاچوونەکەیان زیانی بۆ خۆیان بووایە .. ئەوە ناخۆشە ، ئــەوەی زیــانی تۆش ئەبێ لەوناوەدا دڵداری بێ‌چارەیە کە گیرۆدەی داوی ئەو زوڵفانە بووە .

زوڵفت (لـ) : زوڵفی .

ئەم بەیتە لە (من)دا بەیتی شــەشــەمە .

(٢) دلارامی : مایەی ئارامیی دڵەکەی ، یارەکەی . جودا : جیا . دلارامێ : دڵ ئارامیی ، ئارامیی دڵ .

واتە : دڵدار حەز ناکا و دڵی نایەت لە مایەی ئارامیی دڵی خۆی جیا ببێتەوە کە یارەکەیەتی و ئەیەوێ هــەر لای بێ . دیــارە کە ئارامیی دڵی

بنوارە خۆشیی ڕەقصی لەگەڵ خەرقەیی ئەزرەق
مومکین نییە بەم پاکییە ، لەم ئەرضە ، سەمایێ (٣)

مومکین نییە جەلبی دڵی خۆبان بە من و تۆ
ئەمییستووە تەسخیری مەلایك بە مەلایێ (٤)

---

دلدار لای یار بێ ، دڵ هەرگیز ناگەڕێتەوە و یار بەجێناهێڵێ و نایەت .

لەنێوان هەردو ( دڵی نایێ )دا جیناسی تەواو و ، لەنێوان (دلارامی) و (دلارامێ)دا جیناسی تەرکیب هەیە .

ئەڵبەت کە (چر) و (مب) : ئەلبەتە .

ئەم بەیتە لە (کم)دا نییە .

(٣) ڕەقص : سەما ، هەڵپەڕکێ . خەرقەی ئەزرەق : پاڵتۆی شین . سەما : ڕەقص . ئاســمان .

واتە : سەیرکە زەوێ بە بەرگی شینی بەهارییەوە چـۆن ئەشنێتەوە ئەڵێی سەما ئەکا .. ســەیرکە شنەکەی ســەمایەکی چــەند جوانە .. ســەمای وا پاك ، یا ئاسمانی وا سایەتەی ساماڵ و خاوێن ، لەم ڕۆی زەوییەدا هەرگیز نایەتەدێ . بەپێی مەعنای دۆهەم نالی ڕۆی زەوی بە بەرگی بەهارییەوە شوبهاندووە بە ئاسمانی بێ پەڵە هەور .

لە کۆکردنەوەی ( ئەرض ) و ( سەما )دا بەدیەمن طیباق و ، لە وشەی ( سەما )دا تەورییە هەیە .

خۆشیی ڕەقصی : ئەمە تێکستی تەنها (ت)یە . (چر) و (ك) : خۆشی و ڕەقصی . («پەراوێزی» چـر) و (عم) و (کم) و (مب) و (مـن) : چ خۆش ڕەقصێ . (چن) و (خب) : خۆشیی ڕەقص . دیارە (ڕەقصی)یە . (گم) : چخۆش ڕەقص . (اح) و (خا) : خۆشێ و ڕەقص . بەم (گم) : بەو . لەم ئەرضە سەمایێ (گم) : لە ئەرز و لە سەما بێ . (خب) : لەم ئەرضە سەما بێ .

ئەم بەیتە لە (مم) و (کم) و (مب)دا بەیتی چوارەمە .

(٤) جەلب : ڕاکێشــان . خۆبان : جوانــان . تەسخیر : هێنانــە ژێربار و ڕامکردن . مەلایك : مەلائیکە ، فریشتە .

نالی لەم بەیتەدا ڕۆی دەمی ئەکاتە خۆی و هەر یەکێ بگری لە دلداران . ئەڵێ : دڵی نازداران بە داماوی وەك من و تۆ ، ڕاناکێشرێ .. نازداران

نەقدی دڵ و جان بۆ قەدەمت نیمە بەهایە
غەیری ئەمە ، قوربان ، بە خودا نیمە بەهایێ (٥)

ئەی شەمع ! بترسە لە هەناسەم کە بگاتە
ئەو دۆکەڵی زوڵفە کە پەرێشانە بە بایێ (٦)

---

لەومندە لە زۆکیف یاخـیێ ، ئەڵێی مەلائیکەی خـوان .. مەلائیکەی خوا لەکوێ بە مەلایەکی بەسەزمان ئەهێنرێتە ژێر بار !

لە نیوەی دۆهـەمی ئەم بەیتـەدا حوسنی تەعلیـل هەیـە . لەنێوان (مەلایك) و (مەلایێ)یشدا جیناسی لاحیق هەیە .

مومکین (چر) : قابیل . نەمبیـــتووە (چر) : مومکین نیـیە . (من) و (خب) : نەمدیوە . ئەبێ ( نەمدیتووە ) بێ ، ئەگینا بەیتەکە لەنگ ئەبێ .

ئەم بەیتە لە (چر) و (عم) و (کم) و (گم) و (عب)دا بەیتی پێنجەم و ، لە (خب)دا بەیتی شەشەمە .

(٥) نەقد : پارەی نەخت . قەدەم : هاتن ، پێ و قودوم . نیمە : نیوە . بەها : بایێ ، نرخ .

واتە : تۆ ئەومندە نازاری ئەگەر بنیادەم دڵ و گیـانی بکا بە شاباشی رێت ، هێشتا کەمە و نیوەی ئەو ئەندازەیەیە کـە شابانیەڵی . منیش ، نازیزەکەم ، هەر ئەم نیوە شك ئەبەم و وا لەبەر پێتا فڕێی ئەدەم ، هیوام وایە بەسـەندت بێ ..

ئەشتوانین مەعنـای بەیتەکە وا لێبدەینـەوە بڵێین : ئەوەی شـایانی شاباشی رێت بێ ، نەختینەی دڵ و گیانە ، بەڵام من دەمێکە دڵ و گیانم لەپێناوتا داناوە ، بۆیە ئەم نەختینەیەم نەمـاوە . نازیزەکەم ، بەخوا ئەم نرخە شك نابەم ، شتێکیتر بفـەرمۆ ، بەڵکو بمبێ بیکـەم بە شاباشی رێت ..

لەنێوان ( نیمە بەهایە ) و ( نیمە بەهایێ )دا جیناسی تەرکیب هەیە .

نیمە ـ ی یەکەم ـ (عم) و (کم) و (گم) و (من) : نیـوە . بەهایە ـ ی یەکەم ـ (ك) و (اح) و (خا) و (خب) : بەهایێ . بەخـودا (کم) و (گم) و (من) : بەخوا .

ئەم بەیتە لە (چر) و (خب)دا بەیتی چوارەم و ، لە (عم) و (کم) و (گم) و (عب)دا بەیتی سێهەمو ، لە (من)دا بەیتی یەکەمە .

(٦) شەمع : مۆم .

تا چاکی نەکەی پڕ لە هەوا سینەیی « نالی »
وەك زەنگڵە ئاوازەیی نالەی دڵی نایێ (٧)

— ١٩ —

وەرە ساقی ! بە شین و نەدب و واوەی
ئەوا فەرشی حەیاتی خۆم دەکەم طەی (١)

---

نالی لەم بەیتەدا کولمی یاری شوبهاندووە بە شەمعی داگیرساو و ، زولفی ڕەشی شوبهاندووە بە دوکەڵی شەمعەکە کە زۆر باریك و ناسکە و ، هەناسەی خۆیشی شوبهاندووە بە بایەکی توند و بەمە وێنەیەکی ئێجگار جوانی دروست کردووە ، ئەڵێ :

ئەی مۆمی کولمی هەڵکراوی یار ! با بەس بێ ئازاردانی دڵەی دلدارانی دەروون بیماران ! بترسە لە هەناسەی ساردی نائومێدیم ، کە بکاتە زولفی ڕەشی وەك دوکەڵی گزی کولمت ، کە ئەوەندە ناسك و تاڵ تاڵە کەمترین با بڵاوەی پێ ئەکا و لەیبا بە ئاسمانا ، چجایێ هەناسەی ساردی من کە «کێو لە بن دێنێ » !

ئەو ( « پەراوێزی » چر ) و (خا) : ئەم . دوکەڵی (چر) و (چن) و (ت) و (عب) و (خا) : دوکەڵ . دیارە (دوکەڵی)یە . (ك) و (اح) و (خب) : دوکەڵە . زوڵفە (چن) : زولفەی .

ئەم بەیتە لە (من) و (خب)دا بەیتی پێنجەمە .

(٧) چاك : لەت . درز . هەوا : فو . هەوای عەشق . زەنگڵە : زەنگ .

واتە : تا شمشاڵی پڕ لە (هەوا)ی دلداریی ، سنگی نالی ، بە هێزی (ژەندن) زۆر چاك لەت نەکەی ، یا تا زۆر چاك پڕی نەکەی لە هەوا ، ئاوازەی نالەی دڵی ، یا نالەی قامیشێکی بە چەشنی زەنگ لێ نایەت .

نالی لەم بەیتەدا یەکێکی تری لە شاکارە هونەرییەکانی خۆی دەربڕیوە : لە یەڵەکالدا (چاك)ی بەمەعنا (باش) و (درز) و ، (هەوا)ی بە مەعنای (فو) و (ئارەزوی دلداری) و ، (نایێ)ی بە مەعنای (شمشاڵێك) و (نایەت) بەکارهێناوە .

نالەی (چن) و (مم) و (کم) و (گم) و (عب) و (خب) : دەنگی .

(کم) ئەم پارچە شیعرەی لە لیپی (هێ)دا هۆنیوەتەوە و دوا لیپەکانی بە (هێ) داناوە ، بەمجۆرە : لایە ، نایە .. تاد .

دەزانی خۆ دەچینە جێی غەریبان
بە مەرگی خۆت ئەگەر چاوان سیا کەی ! (٢)

— ١٩ —

(١) ساقی : مەیگێڕ ، کینایەیە لە یـار . نەدب : گریان و هاوار و ڕۆ ڕۆ . واوەی : سۆزکراوەی ( واوەیل )ە ، واتە : بەدبەخت خۆم ! . طەی : پێچانەوە .

واتە : نازیـز ! تا گیانێکم لیابۆ جارێك بە وەصلی خـۆت دلشـادت نەکردم .. دەسـا هیچ نەبێ ئێسـتا کەوا لەناو دەردی دووریت فەرشی ژیانم ئەپێچمەوە و کۆچی دوایی ئەکەم ، وەرە تۆزێ بە سەرما بگری و کەمێك شین و ڕۆ ڕۆم بۆ بکە .

بە شین و نەدب و واوەی : ئەمە تێکستی (چن)ە . ئەمەش تێکستی نوسخەکانی‌تر وەك خۆیان : (چر) و (ت) و (عب) و (اح) و (خب) : بە شین ملەب وی . (عم) و (گم) : بە شینی مەذهەبی دەی . (کم) و (من) : بە شین و مەذهەب و وەی . دەکەم (کم) و (من) : ئەکەم .

ئەم بەیتە لە (خا)دا نییە .

لە دەستنوسێکی دیوانی نالیدا کە وەختی خۆی دەست کاك موحەممەد موصطەفا هۆشەنگ کەوتووە و لەگەڵ نوسخە چاپەکەی (کم)دا بەراوردی پێ کردووە و وێنەیەکی بەراوردەکەی بۆ ناردوین* ، لەم پارچە شیعرەدا، لەپاش ئەم بەیتەوە ، ئەم بەیتەی خوارەوەش هەیە :

**عەزیزم ! بۆ ویصالت ، نالە تا کەی !**
**هەتا کەی ، چاوەکەم ، دەردم ! دەوا کەی !**

لە دەستنوسەکەی کاك هۆشەنگدا (تا کەی) بە (تاکەی) نوسراوە . دیارە هەڵەیـە .

(٢) واتە : تۆ هەرگیز بە دەربەستی دڵی منەوە نەبوویی .. توخوا ئەمجارە تۆزێ دڵم ڕاگرە و هاوبەشی دەردم بە ، ئەزانی ئەچمە ئەو شوێنەی کە دانیشتووانی هەمیشـە بە غەریبی ئەمێننەوە و ژیان ناکەوێتەوە ناو کەس و کاریان (مەبەستی لە گۆڕستانە) .. سـا توخوا ئەمجارە چاوت مەزێژە و با تۆزێ نیشانەی گریان بە چاوتەوە دیار بێ ..

* لە باسی «ناخۆ دەستنوسێکی (دیوانی نالی) هەیە بە خەتی نالی خۆی ؟»دا ، لە دوا لاپەڕەکاندا ، بەدرێژی باسی ئەم دەستنوسە کراوە .

گلە ناکەم ئەوەندەی دەنکە جۆیێ
ئەگەر کەللەی سەرێشم پڕ لە کا کەی (٣)

هەمۆ وەقتم دوعایە : داخۆ کەی بێ
بە تیرێکم شەهیدی کەربەلا کەی !؟ (٤)

---

نالی لەبەرئ بڵێ یار ئەوەندە دڵڕەقە پرسە گرتنیشی لە پرسە گرتنی خەڵك ناچێ . خەڵکێ کە کەسێکیان ئەمرێ بەرگی ڕەش ئەپۆشن .. ئەمیش کە دڵدارێکی دڵسۆزی وەك منی ئەمرێ (ڕەش) ناکاتەبەری ، ئەیکاتە چاوی .. دیارە ئەم ڕەشکردنە چاوەش وەك ڕەشپۆشین نییە و ، نیشانەی شادییە . بۆیە نالی پێیئەڵێ ڕەش مەکەرە چاوت و با تۆزێ نیشانەی خەفەتت پێوە دیار بێ ، بەڵام بە شێوەی لەوە پێیئەڵێ کەوا بڵێ : بە مەرگی خۆت سوێند ئەدەم خەفەتم بۆ مەخۆ و (ڕەش)م بۆ مەکەرە چاوت ..

دەزانێ (چر) و (عم) و (گم) و (ت) و (عب) و (خب) : دەزانم . (کم) و (من) : لەزانێ . دەچینە ( « بەراوێزی » چر ) و (کم) و (ك) و (اح) (من) و (خا) : ئەچینە . (عم) و (گم) : دەچیتە ( ! ) .

لە دەستنوسەکەی لای کاك هۆشەنگدا، لەپاش ئەم بەیتی دۆهەمەشەوە، ئەم بەیتە هەیە :

بشمکەی شمق شمق و لەت لەت لەپاشان
حەطەب سوزم کەی و خاکم بە با کەی !

(٣) گلە : گلەیی .

واتە : نازت لەسەرمە چونکە خۆشم ئەوێی ، بۆیە ئەگەر پاش مردنیش کەللە سەرم پڕ بکەی لە کا و لە مەیدانا وەك گۆ یاریی پێ بکەی ، ئەوەندەی دەنکە جۆیەك گلەییت لێ ناکەم .

( پڕکردنی کەللەسەر لە کا ) کینایەیە لە کرداریێوا نیشانەی ناحەزێ و دوژمنایەتی بێ .

لەنێوان (گلە) و (کەللە)دا بەپێی ڕێنوسی کۆن جیناسی لاحیق و ، لەنێوان (دەنکە جۆ) و (کا)یشدا تەناسوب هەیە .

ئەوەندەی (کم) : ئەمەندەی .

(٤) کەی بێ : کەی ڕۆبدا . شەهیدی کەربەلا : حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلی .

چ خۆشە من وەکو تــازی بنۆڕم
ئەتۆش هەروەك غەزالەی بەڕ هەڕا کەی ! (٥)

بە حەسرەت عومری من یەکبارە فەوتا
مەگەر عومرێ دوبارەم بۆ عەطا کەی (٦)

گوت : «نالی» ! ئەتۆ بمرە ئەمن دێم
خودا کەی بێ ، خودا کەی بێ ، خوداکەی ! (٧)

---

ئەم بەیتە وەك تەواوکەری بەیتی پێشو وایە . واتە : گلەییت لێ ناکەم هەرچیم لێ بکەی ، چونکە من دلدارم و، دلداریش لای‌وایە هەرچی لــە یارەوە بێ خۆشــە .. بۆیە هەمیشــە دەســەو دوعام و لە خوا لەپاڕێمەوە ئاخۆ کەی بێ بە لێرێکی نیگای ستەمکارت شەهیدم بکەی .

ئەشکونجێ مەبەستی نالی هەر دەربڕینی سۆزی دیدار بێ و ، بەیتەکە پەیوەندی بە بەیتی پێشووەوە نەبێ .

وەقتم (مم) و (کم) و (عب) و (من) و (خب) : وەختم . (گم) : کاتم !! . داخۆ (کم) : ئاخۆ . بێ (کم) و (ت) و (من) : دێ . (گم) : بێی .

(٥) چ : چەند . تازی : تانجی ، سەگی ڕاو . بنۆڕم : نۆڕە جۆرە دەنگێکی سەگە وەك لوورە و قوزە ، لە کاتی هەست بە بێدەسەلاتی و بێچــارەییدا لێیەوە دەرئەچێ .

واتە : چەنــد خۆشە وەك تانجی بەدواتا ڕاکەم و پــاتا نەگەمەوە و لە خەفەتی ئەوەدا بنۆڕێنم و ، تۆیش وەك ئاسکی دەشت هەڵبێی و بدەیتە غــار و .. بەوچەشــنە لەنێوان ئومێد و نائومێدیدا بم !

تازی (چر) و (مب) و (من) : تاژی . غەزالەی (مم) و (گم) : غەزالی . ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (چر)دا لە شوێنی یەکتردان .

(٦) حەسرەت : داخ و خەفەت . یەکبارە : بەیەکجاری .

واتە : ئازیز ! لە داخی دەردی دووریت عومــرم بەجاری لەناوچوو .. مەگەر عومرێکی نوێم بۆ ببەخشیتەوە و زیندووم کەیتەوە ، ئەوەش بەوە کە بە وەصلی خۆت شادم کەی ..

(٧) واتە : ئازیز ! تۆ پێت وتم بمرە ، دێمە سەرت .. منیش لە خۆشیی ئەو مژدەی هاتنەی تۆدا چاوەڕوانی مردنم و ئاواتەخوازیمی .. سا خوایە

— ٢٠ —

( بِحَمْدِ الله ) دو چاوی یارم تۆخەی
بە بێ مەی مەستە ، بێ مەی مەستەبێ مەی (١)

لە بوستانی ( ئیرەم )دا قەط نیە وەك
شەمامەی وەك شەمامەی وەك شەمامەی (٢)

---

ئاخۆ کەی بێ بمرم و ، ئاخۆ لەخۆوە هاتەکەی ئەویش کەی بێ !
بەمپێیە (بێ)ی یەکەم واتە : (ڕۆیدا) و فاعیلەکەی ضەمیرە و ئەگەڕێتەوە بۆ (مردن) و ، (بێ)ی دۆهەمیش هەر واتە : (ڕۆیدا) و فاعیلەکەی (خوداکەی)ی سێهەمە و ، واتە (خود ئا کەی) بمەعنا (لەخۆوە هاتەکەی) کە ضەمیرەکەی لەگەڕێتەوە بۆ یار .

ئەشکونجێ نیوە بەیتەکە بەمجۆرە بخوێنینەوە :

**خوداکەی بێ خودا ، کەی بێ خوداکەی !**

و (خوداکەی)ی دوایێ ، وەك هەر لە مەعنای پێشوودا بە (خودئاکەی) مەعنا لێبدەینەوە ، واتە : ئەی خوایە کە هەر بۆ خۆت بویی و خوات بۆ خۆت نیە ، ئەم لەخۆوە هاتنەی یار بە بۆنەی مردنی منەوە کەی بێ و کەی بێ بە ڕاستا !! .

هەروەها ئەشکونجێ ڕاست و ڕەوان مەعنای نیوە بەیتەکە وا لێبدەینەوە : خوایە کەی بێ بمرم .. خوایە کەی بێ یار بێتە سەرم و (خودا کەی)ی سێهەمیش بۆ دۆپات کردنەوەی ئەوەی یەکەم و دۆهەم بێ .

خودا (کم) : خوا . بێ ــ هەردۆ جارەکە ــ : (عم) و (کم) و (گم) و (ك) و (من) : دێ .

— ٢٠ —

(١) مەستەبێ : مەست ئەبێ .

واتە : تۆخەی لە سایەی خواوە ، چاوەکانی یارم بێئەوەی شەراب بخۆنەوە مەستن ، ئەوەش شتێکی سەیر نیە چونکە چاوەکانی یار خۆیان لەخۆیاندا لە حوکمی شەرابدان و ، شەرابیش بێئەوەی پێویستی بە مەی خواردنەوە بێ ، خۆی لەخۆیدا مەستە چونکە مەستی لەوەوە پەیدا ئەبێ .

(٢) بوستانی ئیرەم : باخی بەناوبانگی ئیرەم کە لە قورئاندا بە ئایەتی ( اِرَمَ

شەوی هیجر و بەقای عومری ڕەقیم
خودا طەی بێ ، خودا طەی بێ ، خودا طەی (٣)

وەرە ، موطریب ، بە کوێریی چاوی ئەغیار
صەدای نەی دێ ، صەدای نەی دێ ، صەدای نەی (٤)

لە دووریی تازەنینم ڕەنگ زەردم
وەکوو بەی ، هەروەکوو بەی ، هەروەکوو بەی (٥)

لە نەهرەینی دو چاوم ئەشکی خوێنین
پەیاپەی دێ ، پەیاپەی دێ ، پەیاپەی (٦)

---

ذاتِ العِمادِ ، التي لم يخلَقْ مِثلها في البلادِ ) باسی لێکراوە و ئەڵێن شەدداد دروستی کردووە گوایە بەهەشتی ڕۆی زەوییە . شەمامە ــ ی دووەم ــ : مەمك .

واتە : هەرگیز لە باخی ئیرەمدا شەمامەیەکی خڕ و بۆنخۆشی وەك مەمکی وەك شەمامە خڕ و بۆنخۆشی یارم ، دەسگیر نابێ .

(٣) طەی : پێچانەوە . دوایی هێنان . دوابڕین .

واتە : خوایە شەوی دووری لە یار و تەمەنی وەك شەو درێژ و تاریکی بەدکار بپێچرێنەوە و دوایی بێن و دوایان بڕێ .

(٤) نەی ــ یەکەم ــ : شمشاڵ . نەی ــ ی دووەم ــ : یاری باڵا وەك داری شمشاڵ بەرز . نەی ــ ی سێیەم ــ : (نە) و (ی)ی ضەمیری غائیب .
واتە : کاکەی گۆرانیبێژ ! وەرە ڕۆژ ڕۆژی خۆمانە .. وا بەکوێرایی چاوی بەدکار دەنگی شمشاڵی کۆڕی ئاهەنگی یارم دێتە گوێ و ، دەنگی یاری باڵا وەك شمشاڵ بەرز خۆشی ئەبیسم کە بە بەدکار ئەڵێ (نە) و ڕێگای نادا بێتە ژوورەوە .

(عم) وشەی (دێ)ی بە (دەی) نووسیوە کە فیعلی ئەمر بێ ، واتە دەستپێبکە .

(٥) واتە : ڕەنگم لە خەفەتی دووریی یار ، وەکو بەی زەرد هەڵگەڕاوە ، لە بەی نەبێ ، لە هیچیتر ناچم .

(٦) نەهرەین : جووتە جۆگا . پەیاپەی : یەك لەدوای یەك . لە پشتی سەری یەکەوە . لەدوای یەکەوە .

گوتی : « نالی » ! ئەتۆ بمرە ، ئەمن دێم
خودا کەی بێ ، خودا کەی بێ ، خودا کەی ! (٧)

---

واتە : بێوچان دڵۆپی فرمێسکی خوێنین ، یەك لەدوای یەك بەژێر لە هەردوو چاوی وەك جۆگامەوە دائەوەرێ .

(٧) ئەم بەیتە لە پارچە شیعری پێشوویشدا هەبوو . لەوێ بەدرێژی مەعنامان لێداوەتەوە .

ئەم پارچە شیعرە تەنها لە نوسخەکانی (عم) و (گم)دا هەیە . ئێمەش هیچ گومانی ئەوەی لێ ناکەین کە هیی نالی نەبێ .

لە نوسخەکەی (گم)دا پارچە شیعرێکی دوانزە بەیتیی‌تریش هەیە سەرەتاکەی ئەمەیە :

دەرویش نییەم کەوتومە دۆی ئێل بە هەی هەی
مەجنون نییەم بەحر و بەڕ و بید ئەکەم طەی

ئەگەر ئەم پارچە شیعرە هیی نالی بوایە ، ئەبوو لەم شوێنەدا بماننوسیبایەتەوە ، بەڵام بەڵگەیەکی‌وامان دەسکەو بۆ ئەوە بکەیەنێ هیی نالی نییە ، بۆیە پشت گوێمان خست . سەرەڕای ئەوە کە لە هیچ نوسخەیەکی چاپ و دەستنوسی‌تریشدا نییە .

بەڵگەی هیی نالی نەبونی ئەم پارچە شیعرە ئەوەیە کاك جەمال موحەمەد کە یەکێکە لە دەرچووانی ئەمسالی بەشی کوردۆلۆژیی زانکۆی سلێمانی لە ڕۆژنامەی ( هاوکاری )دا ، لەژێر شادێڕی « هۆنراوەیەك لەنێوان (نالی) و (فیکری)دا » وتارێك و پارچە شیعرێکی بلاو کردەوە ، لە وتارەکەیدا باسی ئەو پارچە شیعرە ئەکا کە وەك ئەڵێ لەمدواییەدا لە دەستنوسێکی کۆنی باوەڕپێکراوا دیویەلی هەشتا ساڵێك بەر لە ئەمڕۆ نوسراوەتەوە و دراوەتە پاڵ فیکری(*). هەرچەند ئەو پارچە شیعرە کە کاك جەمال بلاوی کردووەتەوە ١٣ بەیتە و ئەوەی (گم) بلاوی کردووەتەوە ١٢ بەیتە و ، هەرچەند هەندێ جیاوازییان لەنێواندا هەیە ، تێکڕا هەر یەك پارچە شیعرن و جیاوازییەکانیشیان لەو جۆرەن زۆر جار لە تێکستە دەستنوسەکاندا بەرچاو ئەکەون . بۆیە ئێمە ئەوەی کاك جەمالمان پێ لا

---

(*) هاوکاری ، ژمارە ٣٢١ ، ١٩٧٦/٦/١٠ ، ل ٤ .

جێگەی بڕوا بۆ و پارچە شیعرەکەمان بەجێهێشت بۆ خاوەنی خۆی .

سەرەڕای ئەوەش کە کاکە جەمال نووسیویە ، د. مارف خەزنەداریش هەمان پارچە شیعری داوەتە پاڵ فیکری و ئەڵێ : « دوازدە دێڕ شیعرە.. ( ل ٨٥ ) . ( واتە لە لاپەڕە ٨٥ی دیوانی نالیی چاپی گیوی موکریانیدا ) لە دەستنووسێکدا دۆزیمەوە کە لە دوا ساڵانی سەدەی ڕابردوودا نووسراوەتەوە لەگەڵ غەزەلێکی حەوت دێڕی و پێنج خشتەکییەکی حەوت پارچەیی (*) » . ئەگەر ئەو دەستنووسەی کاکە جەمال و د. خەزنەدار قسەی لێئەکەن ، یەکێ بێ ئەوە هیچ ، خۆ ئەگەر دوانی جیا جیا بێ ئەوە بەڵگەکە زیاتر بەهێز ئەبێ کە پارچە شیعرەکە هیی (فیکری)یە .

(*) د. مارف خەزنەدار ، لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی : چەند بەراوردێکی دیوانی نالی ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ، ژمارە ٢٤ ، کانوونی یەکەمی ١٩٧٥ و کانوونی دووەمی ١٩٧٦ ، ل ٤١ – ٤٤ .

# پرژ و بڵاو

— ١ —

بڕۆ پارچەی غەزەل یارم ، کەوای کرد
بڕۆ بەندی دڵم یارم ، کە وای کرد (١)

— ٢ —

یەك نیم رخت : ( أَلَسْتُ مِنكُم بِبَعِيدٌ )
وان نیم دیگر : ( إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ) (١)

---

— ١ —

ئەم تاقە بەیتەم لە سەردەمی فەقێیەتیما بیستووە کە هی نالییە و لەو وەختەوە لەیادمە . هەموو نیشانەکانی شیعری نالییشی پێوەیە — م. ع. م

(١) غەزەل : جۆرە قوماشێکە .

واتە : یار پارچەی غەزەلی بڕۆ بیکا بە کەوا . . یار کە وای کرد و مەقەستەکەی هێنا بە قوماشەکەدا ، لەوەندە بەنازەوە پیا هێنا ، بەندی دڵمی بڕۆ .

— ٢ —

ئەم چوارخشتەکییەمان لە دەستنوسەکەی (ت)دا دیەوە لە دوایی دیوانەکەوە نوسیبویەوە . هەروەها لە کەشکۆلێکیشا برای بەڕێز شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی پیشانی داین و چەند پارچە شیعرێکی تریشی تیا بوو هی نالی و لە ساڵانی ١٢٢٨ — ١٣٣٦ی . ك (١٩١٠—١٩١٨ی. ز)دا نوسرابووەوە .

(١) واتە : نیوەی ڕوومەتت کە داینەپۆشی ، لەگەڵ ئەوەشدا کە لێمانەوە نزیکی ، وانەگەیەنی لێمانەوە دووری و ، وەك ئەوە وابە بڵێی : ئاخۆ

برگرد رخت نوشته : ( يَحيْي وَ يُميت )
( مَنْ ماتَ مِنَ العِشْقِ ، فَقَدْ ماتَ شَهيدْ ) (٢)

— ٣ —

گۆشتی قەلەو حوققە بە چواردە پارە
وەقتێ گوتت ( حوققە ) ، ضەمیر دیارە (١)

---

لێتانەوە دوور نیم !! بەڵێ دوورم .. دیارە دووری و نزیکی بە کەڵک لێ وەرگرتنە ، تۆش کە زۆرت داپۆشی و نەتهێشت بیبینین و کەڵکی لێ وەربگرین ، بە نزیك دانانرێی . ئەو نیوەکەیشی کە دەری‌نەخەی ، ئاگر بەرنەداتە دڵمان و ، وەك ئەوە وایە پێمان بڵێی : سزای من بۆ ئێوە سزایەکی سەختە .

(٢) واتە : بە دەوروبەری ڕۆنیدا نوسراوە : ژیێنەر و مرێنەرە ، ماچی بە کەسی بدا ئەیژێنێتەوە و ، ڕۆ لە کەسی وەرچەرخێنی ، لەداخا ئەیکوژێ و ، هەرکەسیش بە دەردی دڵداری بمرێ شەهیدە ..

( اِنَّ عذابي لَشَديد ) و ( يُحيِي وَ يُميت ) لە ئایەتی قورئان ئیقتیباس کراون .

لە دەستنوسەکەی (ت)دا (الست) بە (الهت) و ، (شەهید) بە (شهیداً) و ، لە هەردو نوسخەکەدا (یحیی) بە (محیی) نوسرابووەوە . دو هەڵەی پێشومان لەبەر ڕۆناکی کەشکۆڵەکە و ، ئەو هەڵەکەی‌ترمان ، لە خۆمانەوە بۆ ڕاگیرکردنی هاوسەنگیی دو وشەکە و ، ڕاستیی لەبارەی ڕێزمانەوە و ، تەواوی ئیقتیباسەکە ـ ڕاست کردەوە .

— ٣ —

(١) مامۆستا مەسعود موحەممەد لە خوالێخۆشبو مەلا موحەممەدی مەلا ئیبراهیم ( دلاوەر )یەوە ئەگێڕێتەوە کەوا نالی (حەرفی شەرحی موغنی)ی بە شیعر کردووە بە کوردی و لەناو فەقێیاندا باو بووە . دلاوەر خۆی تەنها ئەم بەیتەی لەیاد بو کە میسالی ( اَلبُرُّ ، الكرُّ ، بِستّين دِرهَماً )ی پێ هێناوەتە سەر کوردی و ، واتە چۆن لە عەرەبییەکەدا لەپاش ( الكرُّ )وەوە ( مِنه )یەك تەقدیر کراوە ، لە کوردییەکەشدا لەپاش ( حوققە )وە (ی)یەك تەقدیر کراوە (*) .

---

(*) مەسعود موحەممەد ، چەپکێك لە گوڵزاری نالی ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، ١٩٧٦ ، ل : شەست و دو و شەست و سێ .

— ٤ —

وەك دوڕ و یاقوت نەقشە : دندان و لەبی ئاڵی

هەر وەك بەڕەزا پەخشە : ئەگریجە لەسەر خاڵی (١)

— ٥ —

بدور دایری قنجـانٌ چینی

شکاندی دایری فنجانٌ چینی (١)

---

جەمال ناوێـکی فەقێی مەلا موحەممەدی ناوبـراویش ئەم بەیتە و باسەکەی بۆ خۆم گێڕایەوە . بەداخەوە ئێـستا ناوی باوکی لەو جەمالەم لەبیر نەماوە — م. ع. م.

— ٤ —

ئەم بەیتە لەپـاڵ کتێبێکی ( جـامکالی )ی مەنطیقدا نوسرابووەوە . کتێبەکە ئیـسماعیلی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شـێخ خضری کوڕی شێخ نووەیـس (*) نـاو لـە ١١٤١ی . ك ( ١٧٢٨ — ١٧٢٩ی . ز )دا نوسـیویەوە . خـەتی بەیتەکەش هەر کۆن بو . کتێبەکە یەکێـکە لە کتێبـەکانی بنەماڵەی ڕەحمەتی موفتیی هەڵەبجە ، دۆستی خۆشـەویستمان شێخ موحەممەد مەلی قەرداغی پیشانیدایْن .

(١) بەڕەزا : گیایەکی کوێستانییە ، ئەخورێ . پەخش : بڵاو .

لە دەستنوسـەکەدا ( وێڕێك ) بۆ ( شینی نەقشـەکە ) کرابۆ ، وانە بیێ . بە ( نەوشی ) . ئێمە ئەومان لا هەڵە بۆ .

— ٥ —

ئەم بەیتە لە دوایی کتێبی تەرکیبی ( ئاقا حوسەینی خوانساری )یەوە نوسراوەتەوە کە موصطەفا ناو بۆ شـێخ مەعرۆفی برای نوسـیوەتەوە لە ١٢٧١ ی . ك ( ١٨٥٤ — ١٨٥٥ ی . ز )دا لە دێی خەرپانێ . کتێبەکە هیی کتێبخانەی بنەماڵەی موفتیی هەڵەبجەیە ، دۆستی خۆشەویستمان شێخ موحەممەد مەلی قەرەداغی پیشانیدایْن .

(١) مەعنـای بەیتەکەمـان بـۆ ڕاسـت نەکرایـەوە ، بۆیـە ، دەق ، بـە ڕێنوسەکەی خۆی نوسـیمانەوە .

---

(*) ئەم شێخ نووەیسە لە بنەماڵەی سەیدە مەلاکـانی تەکیـەی قەرەداغە و باپیرە گەورەی بنەماڵەی شێخە مەلاکانی خەرپانییە .

## لەبارەی (نـالی)یەوە نوسیویانە

هیچ زیادەڕەویەکی تیا نیە ئەگەر بڵێین لەناو ئەو شاعیرانەدا بە زاراوەی کرمانجیی خوارو شیعریان وتووە ، کەسیان ئەو قەدر و پایەیەی نەدراوەتێ کە بە نـالی دراوە . دەیان جار دیوانەکەی نوسراوەتەوە ، مەلا و فەقێ شانازیان بە نالی زانیبەوە کردووە . ڕۆشنبیرانی بیری نوێی ناو ئەدەبی کوردیش هەر لـە سەرەتاوە هەستیان بە ڕێ و شوێنی نالی کردووە و لێیدواون .

وا لێرەدا تێکستی چەند بابەتێـك بلاو ئەکەینـەوە (ئەمـین فەیضی) لـە (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد) و ، (پیرە مێرد) لە ڕۆژنامەی (ژیان) و (گۆران) لـە لاواندنەوەی پیرە مێرددا ، لەبارەی نالیەوە نوسـیویانە .

ئەمین فەیضی نوسیویە ئەڵێ :

**« نالی خەڵقی دێیەکە لە شارەزوور کە واقیـع بووە لە طەرەفی شـەرقی سولەیمانی ، ئیـسمی (خاکوخۆڵ)ە .**

**« مەرحوم تەحصیلی لە قەرەداغ و لە سـولەیمانیدا ئیکمـال کردووە . قەرەداغ شەش سەعات دوورە لە سولەیمانییەوە .**

**« نالی بۆ ئیفای حەج چووەتە حیجاز .**

**« لەوێ دەرحەق حەضرەتی فەخری ڕەسول قەصیدەیەکی موکەممەل و موطەووەلی نەظم کردووە .**

**« چووەتە ئەستەموڵ ، لە ئەثنای صـوحبەتا لەگەڵ ئودەبـا و فوضـەلای ئەوێ ، گەلێ ئاثاری فیکر و فەطانەتی نواندووە و ، زۆر مەظهەری تەوەججوهـ بووە . تا نیهایەتی عومری لە ئەستەمۆڵ ماوەتەوە . مەدفەنی موبارەکی ئەوەتە لە (ئوسکودار) . ئەکای نالی ئینکار ناکرێ . لاکین لەوەندەی صەنایعی لەفظییە ئیستیعمـال کردووە ، پیـاو زەنگـە بڵێ شـیعری ئـەو نەتیجـەی عیلـم و ئیشتیغالە » (١) .**

---

(١) لەمین فەیضی ، ئەنجومەنی ئەدیبـانی کورد ، ئەسـتەموڵ ، چاپخـانەی « تەرجومانی حەقیقەت » ، ڕەبیعولئەووەلی سالی ١٣٣٩ .

( ئێمە خۆمان تێکستی نوسراوەکەی ئەمین فەیضی و ئەوانیترمـان هێنایە سەر شێوەی ڕێنوسی کۆڕی زانیاری کورد ) .

خاوەنی (ئەنجومەنی ئەدیبان) چەند پارچە شیعر و چەند بڕگەیەکی چەند پارچەیەکیشی لە شیعرەکانی نالی ، خستووەتە ئەنجومەنەکەیەوە . یەک دوو بەراویزیشی بۆ ئەو پارچە شیعرانە کردووە و ، مەعنای هەندێ وشەشی ڕوون کردووەتەوە .

★ ★ ★

( پیرە میرد )یش ، لەژێر ناونیشانی «خدمەتێکی بێ هەمتا . بە موناسەبەتی طەبعی دیوانی نالییەوە»دا نووسیویە ، ئەڵێ :

« تەقریبەن نەوەد ساڵ لەمەوپێش ، ڕۆژێکی ڕەنگ زەردی پاییز کە شینایی ئاسمان هەورێکی کەثیف دایپۆشیبوو ، لە دەمەدەمی بەیانیدا پیرێکی سەر و ڕیش سپیی ئیفتادە ، مێزەر بەسەر ، بە مات و مەلووڵی ، لەپشت ئەسپێکی بەکورتانەوە ڕوو بە (وەیس) لە سولەیمانی دەرچوو .

« لەدوایەوە غەیری چەند فەقێیەکی خانەقا نەبێت ، تەشییعکەرێکی نەبوو . گاەگاە ، بە دەنگێکی حەزینی گریاناوییەوە ، قسەی لەگەڵ ئەم جەماعەتە بچووکە ئەکرد و لە هەموو هەنگاوێکدا جارێ ڕوی بۆ لای سولەیمانی وەرئەگێڕا . لەگەڵ هەموو ئاوڕ دانەوەیەکدا ئاهێکی گڕاویی تێکەڵاو بە فەضا ئەبوو و فرمێسکێکی مرواری بەسەر ڕیشی سپیدا گلۆر ئەبووەوە .

« ئەم پیری فتادەیە مەلا خضر ( نالی ) بووە ! ...

« لەپاش ( ئاژاوەی کۆیە ) و ئیحتیلالی ئەم ناوە لەطەرەف ڕۆمەوە و پاش کوژانەوەی ئەستێرەی (بەبە)کان ، دڵی نالی قبووڵی مانەوەی نەکرد لە وڵاتەکەیدا .

« بە صەد مەشەققەت ، بە صەد دڵ بڕین ، چەمەنزاری بەهاری شارەزوور ، هەوای ڕەوح بەخشی کوێستانی کوردستانی ، مەهبەطی وەحیی مولهیمی ئەشعاری بەجێ هێشت .

« ئەو کوردستانی بە کوردەوە ئەویست ، چاوی بینینی ئێزەی (حەیتە) و (فەرمینا)ی (ڕۆم)ەکانی نەبوو . مەردانە پێی نا بە دڵیا ، خەیاڵی (حەبیبە)ی خستە ئەولاوە ، ڕوو بە مەجهووڵات ، بە غوربەت سەری نایەوە .

« پاش ئەوەی (ئەحمەد ــ موختار) مەجبوور بوو بە تەرکی تەختی (بەبە) ، (نالی)ش بە ئارەزوو و ئیختیاری خۆی تاجی (ملك الشعرا)یی لە سەری خۆی فڕێدا و نایە ژێر پێیەوە ، چونکە لە نەظەر ئەودا مولکی بێ تەخت شاعیری بێ تاجی ئەویست ! ..

« لە لای دەشتی وەیس ، بە کوڵی گریانەوە ، خوا حافیزی لە

تەشییع کەرەکان کرد. بە وەجد و ئیستیغراقەوە فەدری سەیری گردی سەیوان، دەشتی فەقێکان ، چوار باغ و کانێسکانی کرد ، وەقائیعی ماضییەی هێنایە پێش چاو ، ڕمبازێ و جلیتێنی لاوچاکانی بابان ، شەڕە تۆپ و قەلە مردارەی فەقێکان، حەوشی خانەقا و ئیجتیماعی کۆڕی(۲) (سالم) و سائیری شاعیرەکانی بە سۆزی دڵەوە تەخەططور کرد ... موقابیل بەمانە هەمۆی دۆ قەطرە سروشکی گەرمی بە یادگار ـ فەقەط بە یادگاریکی سەرمەدێ ـ بۆ ڕەوانە کردن .

« لەپاشدا سواری بارگیرەکەی بۆ و ، ڕۆی کردە دۆڵ و شاخەکانی بازیان ....

« نالی ، ئەمە ئەوەڵ هەنگاوی بو کە بۆ عەدەم هاویشتی ـ عەدەمی ماددی، نەك مەعنەوی .

« ئەگەر شیعر بە غایە ـ وەسیلە نا ـ عەد بکرێت و ئەگەر شیعر عیبارەت بێ لە صەنعەتێکی بەرزی بەدیعی .. و ئەگەر لە شیعردا ئیبداع شەرطێکی ئەعظەم بێت ، بێ‌گومان ( نالی ) گەورەترین شاعیری کوردە .

« بەلێ ، موحتەمەلە ئەظەر بە ذیهنییەتی حاضرە ئەشعاری نالی ئینتۆیەتیی حیسسییات ئەشکێنێ ، وەکەنا موحتەمەلە ئەظەر بە تەلەققیی عەصری حاضر لە شیعرەکانیدا حیسسییاتی ورد و بەرزی کەمتر تیا بێت و کەمتر هەیەجانێکی بەدیعی بیەخشێت ، فەقەط لازمە لە بیرماندا بێت ( نالی ) لە زەمانێکدا ژیاوە کە شەرائیطی کەمالی شیعر عیبارەت بووە لە جیناس ، ئیستیعارە و لەف و نەشر، جەمعی ئەضداد و سائیرە . وەلحەق لەمانەدا قەلەمی نالی لە هیی شاعیرەکانی‌تر زیادتر مووەففەق بووە .

« عەلاوەی ئەمانە صاحیبی ئوسلوبێکی طەننانە ، شیعرەکانی خۆش ئاهەنگ و ڕەوانە ، وە لە ئەکثەری مەنظومەکانیدا فکری ورد ( تەشبیهاتی خۆ ـ کرد ) و خەیالی بلندی بە طەرزێکی ڕەنگین و ناودار ئەدا کردووە .

« لە ئەظەر ( نالی )دا شیعر ئەصڵ و غایەیە ، قەت بە وەسیلەی لە عەمەل ئەهێناوە . حەیات ، عیشق ، حەتتا حیسسییاتی باوکی لەلای ئەو عیبارەتن لە شیعر . بۆ ئەو ( گوارە )یەك ، (گوڵ)ێك ، ( مۆدنە)یەك ، (بانی‌بەرز)ێك موتەساوییەن باعیثی ئیلهام و جۆششی حیسسییاتی بووە .

« لەسەرەوە وتمان ( حەتتا حیسسییاتی باوکی لەلای ئەو عیبارەتن لە شیعر ) . بۆ ئیثباتی ئەمە قەطعەی ئاتییە کافییە :ـ

---

(۲) لە سەرچاوەکەدا نوسراوە : ( کوردێ ) . ئێمە ئەوەمان بە هەڵەی چاپ زانی ، یا ئەبێ (کوردێ و) بێ .

شیعرەکانم کە جگەرگۆشی منن ، دەربەدەرن
دلی (نالی) چ زەفە قەت غەمی فرزەندی نییە

« لە نەظەر مندا حەتتا ( حبیبە )ی مالیاوەش شەخصییەتێکی حەقیقی نەبوە و تەنها زەمزێکە حەضرەتی نالی کردۆیە بە واسیطەی ئیظهاری دەهای شاعیرانەی .

« ئەی ڕۆحی بلندی نالی ! هیچ شوبهەم نییە ئەو دۆ قەطرە فرمێسکەی ئەوەد سال لەمەوپێش لەمزێك گردی شێخ محیدینەوە ، تێکەلاوت کرد بە ئەبەدییەت و کە تائێستا جاری بۆ ، ئیستا بە تەخلیدی ناوت و طەبعی شیعرەکانت ـ جگەر گۆشە دەربەدەرەکانت ـ گەڕاوەتەوە بۆ سینەت و ئاگری فیراقی وەطەنی کوژاندۆتەوە .

« پێش ئەوەی خیتام بەم دۆ کەلیمەیە بهێنم ، ئەمەوێ موقابیل بە حوسنی ئینتیخابیان و بەو ئەذییەت و کولفەتەی لە کۆکردنەوە و چاپدانی ئەم دیوانە قیمەتدارەدا کێشاویانە ، بە دڵ تەشەکوری ( مەریوانی ) و ( کوردی ) بکەم .

« شوبهە نییە پاراستنی ئەشعاری پێشینانمان لە فەوتان ، گەورەترین خزمەتێکە بۆ ئەدەبییاتی کوردی ئەکرێت . وا ئەم دۆ لاوە بەقیمەتە بەشی خۆیان ئەم خدمەتەیان ئیفا کرد . فەقەط لەسەر خوێندەوارانی کوردیش لازمە لە تەشویق و تەشجیع غافل نەبن » (٢) .

( پ .... )

★ ★ ★

( گۆران )یش ، نوسیویە ، ئەڵێ :

« مامۆستا پیرە مێرد !

« لەکاتێکا تۆ چاوت بۆ قەلەم ئەگێڕا ئیلهامی خۆتی پێ بنوسێ ، لە کوردستانی عێراقا قەلەم بەدەست سێ چوار مامۆستای گەورەوە بۆن :

« قەلەمێك بەدەست پیری یەکەمی شێوەی سلێمانی ، نالییەوە بۆ ، شیعری کلاسیکی پێ ئەنوسی . بەپێچەوانەی ئەو هەستی پەسەند و حورمەتەوە بەرامبەر بە نالی لەدلتا بۆ ، دەستت بۆ قەلەمی ئەو نەبرد ، چونکە لەو وەستایەکی بەهرەدار بو ، بەلام لەسەر تان و پۆی ئەدەب و عەرۆضی بێگانە

---

(٢) ڕۆژنامەی ( ژیان ) ، ژمارە ٢٩٣ ، ١٤ی ئەیلولی ١٩٣١ ، بەبۆنەی لەچاپدانی یەکەمجاری ( دیوانی نالی )یەوە لەلایەن ( کوردی و مەریوانی )یەوە .

نەخشی ئەچنێ . تەنیا چینی بەرزی خوێندەواری سەردەمی دەرەبەگی
نەیتوانی(٤) تێی‌بگا . هەرچی تۆ بۆیت ، ئەگەزایت کالایەك دابێنی ، بەلەواوی
خۆمالی بێت . بەرز و نزمی گەلی کورد زمان بتوانن لەبەری‌کەن » (٥)

* * *

(٤) لە سەرچاوەکەدا نوسراوە : نەیانتوانی ، بەلام دیارە هەڵەی چاپە .

(٥) وتاری مامۆستا گۆران لە کتێبی ( یادی پیرەمێرد )دا کە لەسەر ئەرکی ( یانەی سەرکەوتن ) و لەژێر چاودێریی مامۆستا ( علاءالدین سجادی )دا لەچاپدراوە . ل٥٧، بەغدا، ١٩٥١ . کتێبی ناوبراو ئەو وتار و شیعرانەی تیا کۆکراوەتەوە کە لە ئاهەنگی چلەی کۆچی دوایی پیرەمێرددا خوێنراونەتەوە یا بەوبۆنەوە نوسراون .

## لەبارەی نوسخەکانی بەردەستمانەوە

هەرچەند لە سەرەتای ئەم کتێبەدا وردە باسێکی ئەو نوسخانە کراوە کە لەکاتی نوسینی سەرەتاکەدا لە بەردەستمانا بون و ، پاشانیش کە نوسخەکانی کاک جەمال موحەممەد و دوای ئەویش کە نوسخەکانی بەڕێز شێخ موحەممەدی خالمان بۆ هات ، کەمێك لەو نوسخانەش دوابن ، وای بە باش لەزانین لەم دواییەشدا بە شێوەیەکی فراوانتر لە تێکڕای ئەو نوسخانە بدوێین بۆئەوەی تەماشاکەری بەڕێز لە یەك شوێندا و بە شێوەیەکی تەواوتر لەو نوسخانە ئاگادار و شارەزا بێ .

★ بەر لە هەرچی وا ناوی نوسخەکانی بەردەستمان و خاوەنەکانیان دوبارە ئەکەینەوە :

- چر : نوسخەی دەستنوسی مەلا موحەممەدی چروستانی .
- چن : نوسخەی دەستنوسی مەلا عارفی چنگنیانی .
- عم : نوسخەی چاپی عەلی موقبیل .
- کم : نوسخەی چاپی کوردی و مەریوانی .
- گم : نوسخەی چاپی گیوی موکریانی ( چاپی دووەم ) . چاپی یەکەمیش هەروەك چاپی دووەم وایە .
- ت : نوسخەی دەستنوسی ڕەسوڵی حاجی ئەحمەدی توربەتی .
- ف : نوسخەی دەستنوسی مەلا فەتاحی کاگردەڵی .
- عز : نوسخەی دەستنوسی مەلا عەزیزی ڕێشاوی .
- لو : نوسخەی دەستنوسی کتێبخانەی ئۆلیق وەهبی .
- مز : نوسخەی دەستنوسی کتێبخانەی موحەممەد ئەمین زەکی بەگ .
- هب : نوسخەی دەستنوسی مەلا عەبدوڵلای گەلالی .
- اح : نوسخەی دەستنوسی مەلا ئەحمەد ناوێك .
- عن : ئەو نوسخە دەستنوسەی بە هەڵە داومانەتە پاڵ مامۆستا نەجمەددین مەلا .

خا : نوسخەی دەستنوسی یەکەمی کتێبخانەی شێخ موحەممەدی خاڵ .

خب : نوسخەی دەستنوسی دوەهەمی کتێبخانەی شێخ موحەممەدی خاڵ .

گش : ئەو کەشکۆڵەی شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی بە کۆڕی زانیاری کوردی فرۆشتووە .

★ تێکڕای نوسخەکان ، کەم و زۆر ، چاودێریی ڕیزی پیتەکانی ئەلف و بێیان کردووە ، عب نەبێ لەم ڕێگایە لای‌داوە : لەپێشانا پارچە درێژەکەی **ئەلا ئەی ئەفسی بۆم ئاسا** و ئەوجا **لەی ساکینی ڕیاضی مەدینەی مونەووەرە و دەروونی لیدار الشارزور** و **مائەم وەکو زولفەینی سیەه و مەستورە کە حەسناوو ئەدیبەی** نوسیوەتەوە ، ئەنجا هاتووەتە سەر بیسمیللا کردن و نوسینەوەی پارچەکانی‌تر ، ئەویش بە بێ چاودێری کردنی ڕیزی ئەلف و بێ .

★ نوسخە تەواوەکان کە ڕیزی پیەکانی ئەلف و بێیان ڕاگرتووە ، هەمویان پارچە شیعری **ئەی جیلوەدەری حوسن** و یان خستووەتە پێشەوە ، گم و **من** نەبێ **یا بدر علوا**یان کردووە بە یەکەم و **ئەی جیلوەدەری**یان لەدوای ئەوەوە داناوە . گم‌یش **ئاتایی سەری طوتڕەیی**ی کردووە بە یەکەم و **ئەی جیلوەدەری حوسن** و ی کردووە بە سێهەم ..

★ نوسخە دەستنوسەکانی **چر** و **چن** و **ت** و **ك** و **مز** و **عب** و **اح** و **من** و **خا** و **خب** ، وەك نوسخە چاپەکانی **عم** و **کم** و **گم** بە نوسخەی تەواو دائەنرێن ، هەرچەند لێرە و لەوێ پارچە شیعرێك یا بەیتێك لە نوسخەیەکیاندا هەبێ و لە نوسخەیەکی‌تریاندا نەبێ . نوسخەکانی **لو** و **مز** بە نوسخەی تەواو نائەژمێررێن .

★ نوسخەی **چر** ، هەرچەند لەچاو نوسخە دەستنوسەکانی‌تردا نوسخەیەکی تازەیە ، ئەتوانرێ لە هەمویان بە پاکتر و وردتر دابنرێ . نوسەر لە زۆر شوێندا سەر و بۆری بۆ وشەکان کردووە . لە پەراوێزەوە (نوسخە)ی زۆری نوسیوەتەوە . لە هەمو نوسخە دەستنوسەکانی‌تر زیاتر واوی عەطف و یێی ئیضافەی داناوە کە عادەتی نوسەرانی کۆن وابووە خستویانەتە پشت گوێ . زۆری مەبەست بووە بە ئەمانەت تێکستەکە بنوسێتەوە . لە داوی نالی گەیشتووە . نەیویستوە زۆ شت بیزێتەوە . لە پشتی کتێبەکەوە نوسیویە « عائد الی محمد عبدالرحیم الچرستانی .

وبانامله کتب » و ئیمزای کـردووه . والـه هینی موحەممەدی کوڕی عەبدورڕەحیمی جروستانییە و بە پەنجەی ئەو نوسراوەتەوە . لەدوای کتێبەکەوە ناوی خـۆی و سالی نوسـینەوەی نەنوسـیوە ، بەلام ئێمە خەتەکەی ئەناسـین ، دیـارە خەتی خۆیـەتی و کـاك مەلا یەحیا و کاك ئەحمەدی کوڕیشی ئەلێن خەلی باوکیانە .

★ نوسـخەکەی چین‌یش لە نوسـخە چاکەکانی بەردەسـتمانە . بە خەتێکی جوانی فارسی نوسراوەتەوە . لە زۆر شوێنا سەر و بۆری بۆ کراوە . نوسەر لەجیاتیی (حەوت)ی سەر ( ی ) ، (داکشاوە)ی بەکارهێناوە . لە هەندێ شوێنیشا لەسەر ( ی )ی حەوت‌خواز نوسیویە : « بالامالة » واته بە لارکردنەوەیەکەوە تا بە ( ی )ی بۆش بخوێنرێتەوە . جاروباریش ، بەلام کەم ، ئیشارەتی بۆ مەعنا کردووە ، یا لە ڕێگای ئیعرابی نەحویـەوە یارمەتیی داوە بۆ مەعنا زانین . ئەم نوسـخەیەمان بە هۆی کاك مەعصومی کوڕی حاجی مەلا عارفی چنگنیانییەوە دەسگیر بو . نوسـەر ناوی خۆی و سـالی نوسینەوەی نەنوسـیوە ، بـەلام کاك مەعصوم ئـەلێ دەسنوسی باوکیەتی .

★ چاپەکەی مم واته عـەلی موقبیل هەرچەند تاڕادەیەك بەسـەر حازردا هاتووە ، چاپێکی خوێندەوارانە و ڕێکوپێکە و پەراوێزەکانیشی بێ‌سود نین .

★ نوسـخەی گم یەکەمین نوسـخەی لەچاپدراوی دیوانی نالییـە . ئێکرا ڕەخنەگر هەسـت ئەکا کەوا تا ڕادەیەك نوسخەیەکی پـاك و ئەمینە و دەسکاریی دەسنوسـەکەی تیا نەکراوە و زوربەی هەڵەکانی هیی ئەوەن کوردی و مەریوانی کە دەسنوسەکەیان خسـتووەتە ژێر چاپەوە ، بە باشی بۆیان نەخوێنـراوەتەوە . لەگـەل ئەوەشا ئەبێ ڕەخنەی لـەوەیان لێ بگرێ کە هەمو دەگاکانیان کردووە بە ئەگا و دەوێ بە ئەوێ و گوتی بە وتی ، کەچی لە نوسـخە دەسنوسـەکاندا ئێکرا دەگا و دەوێ و گوتی‌یە .

★ چاپەکەی گم تاڕادەیەکی زۆر لە ئەمانەتی ئەدەبییەوە دورە . گم بێ‌ئەوەی گوێ بـەو ڕاستییە بدا کـە بەرهەمی هـەر ئەدیبێك زادەی سـەردەمی خۆی و جۆری کولتور و زمانی ئەو سـەردەمەیە ، هەولێکی زۆری داوە بۆئەوەی وشە عەرەبی و فارسییەکانی دیوانەکە بکا بە کوردی . تەنانەت وشەی‌وای لێ‌خستووە تائێستا لەپاشماوەی ئەو سەردەمەدا بەرچاوی کەس نەکەوتووە .

هەرچەنـد ئێمە لە چەنـد شوێنێکیشـدا کەلکمان لـەم نوسـخەیە وەرگرتووە ، ئەتوانین بلێین لەبـەر ئەو هەمو دەسکاریەی تیا کراوە ، تێکڕا وەك (نوسـخە) پشتی پێ نابەستریٚ .

گەر هەرچەند دیارە نوسخەی دەستنوسینی لابووە ، زیاتر پشتی بە نوسخە چاپەکەی عەلی موفیبل بەستووە .

★ نوسخە دەستنوسەکەی ت کە ڕەسوڵ ناوێـکی کوڕی حاجی ئەحمەدی توریـەیی لە ١٣١٠ی . ك ( ١٨٩٢ ـ ١٨٩٣ی.ز )دا نوسـیوبەتەوە ، نوسـخەکەی عبای لێ دەرکەی ، لە هەمـو نوسخە دەسـتنوسەکانی بەردەستمان کۆنتـرە . نوسەرەوەی لـەم نوسخەیە لـە نوسینەوەدا کەوتووەتە کۆمەڵێ هەڵەی دیاریەوە ، بۆیە لەوە ناچێ خوێندەوارێکی تەواو بوبێ .

★ نوسـخەکەی ف نوسـخەیەکی تا بلێی نایابـە و بە خەتێکی فارسیی جوان نوسراوەتەوە . دیـارە مەلا فەتاحی نوسـەری مەلایـەکی پێکەیشتو و خوێندەوارێکی باش بووە . لەوە ئەچێ زۆر شـانازیی بە دیوانی شاعیرانی کوردەوە کـردبێ و زۆر جاری نوسـیبێتەوە و دۆسـت و بـرادەر لێیان سەندبێ و بۆیان نەگێڕابێتەوە . ئەوەتە لە سەرەتای ئەم نوسخەیەدا کە لە بەردەستی ئێمەدایە نوسیویە ئەڵێ : « صد هزار بار قسم بقرآن و قسم و قسم بجمیع مقـومات تا حیات عاریە در بدنم باقی باشد اشعار نالی یا اشعار مولوی علیهما الرحمـة بکس نبخشم و نفروشم . العبد الاثیم عبدالفتاح ١٣٢٠ » . واتە صـەد هەزار کەرەت سوێن بە قورئان و سوێن بە هەرچی سوێنی پێ بخورێ تا گیانی خواستەمەنی لە لەشما مابێ شـیعری نالی یا شیعری مەولـەوی بەڕەحمەت بن ، بـە کەس نەبەخشم و نەفرۆشم . بەندەی تاوانبار عەبدولفەتتاح ١٣٢٠ .

لە داوێنی دیوانەکەشەوە نوسیویە : « تمام شد غزلیات نالی رحمه الله از دست فقیر همکـار عبدالفتاح پسر عبدالعزیز پسر احمد مشهور بە کاگردلی و نورولی در قریەء شمیران در خدمت جناب شیخ عبدالله روز پنجشنبە و نصف آخر جمادی الاولی ١٣٢٧ سال شهید شدن شیخ سعید حفید بدست موصلی ، وبعـد از سال وفات ملا عبدالقادر ابن المؤمن . شیخ محمد امین باباکوچکی سالی قبل از ملا قادر ، و ملا عزیز روغزادی سالی قبل از شیخ محمد امین متوفی شدند . الهم اغفر لنا ولهم واحشـرنا فی زمرتهم آمین ثم آمین » . واتە : غەزەلـەکانی نالی بەڕەحمەتبێ تەواو بون بەدەستی هەژاری خەمبار عەبدولفەتتاحی کوڕی

عەبدولعەزیزی کوڕی ئەحمەدی ناوبانگ کاگردەڵی و نەورۆڵی لە دێی شەمێران لە خزمەتی جەنابی شێخ عەبدوڵلادا ، لە ڕۆژی پێنجشەممەی نیوەی دوایی جومادەلئولای ١٣٢٧ (١٩٠٩)ی سالی شەهید بونی شێخ سەعیدی حەفیددا بەدەستی مۆسلیەکان و ، پاش سالی کۆچی دوایی مەلا قادری مەلا مۆمن . شێخ موحەممەد ئەمینی باوەکۆچەکێ سالێ بەر لە مەلا قادر و ، مەلا عەزیزی ڕۆژفزایێ سالێ بەر لە شێخ موحەممەد ئەمین‌کۆچی دوایان کرد . خوایە لە ئێمەش و لەوانیش خۆش بی و لەگەڵ ئەوانا زیندوومان بکەیتەوە . ئامین !

★ بەداخەوە خاوەنی نوسخە دەستنوسەکەی عـز ئەوەندە مەودای نەداین کەلکی تەواوی لێ وەرگرین . جگە لەوە کە پارچە شیعری **فاتیحە ئەسغیرە شاری دڵ**مان لەبەری نوسیەوە کە لە هیچ نوسخەیەکی‌تردا نەبو و ، بەراوردی چەند قەسیدەیەکی کەمیشمان پێ کرد . بۆیەشە وا ناوی لەم کتێبەدا کەم دێ .

★ نوسخەکەی تو تەنها چەند پەڕەیەکی جیا جیایە پێکەوە جوزوبەند کراون و لە چەند پارچە شیعرێك زیاتری تیا نییە . بەڵام لەبارەی نوسینەوەوە دیارە کەسێکی خوێندەوار و بە شێوەیەکی فایدە نوسیویەتەوە . سەر و بۆری بۆ گەلێ وشەش کردووە . هیچ شتێکی بە گلمۆێ و تێکەڵ و پێکەڵی بەجێ‌نەهێشتووە . ئەم نوسخەیە ئێستا لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کورددایە .

★ نوسخەکەی مزیش بە نوسخەیەکی تەواو ناژمێررێ . (ئەمین) ناوێك نوسیویەتەوە لەوانەیە هەر موحەممەد ئەمین زەکێ بەگ خۆی بێ . لە شوێنێکیا مێژوی ڕۆژی یەکشەممە ٤اى شەشەڵانی ١٣٢١ (١٩٠٤)ی‌زاى پێوەیە . بە خەتێکی جوان و ڕێك‌وپێك نوسراوەتەوە ، بەڵام لەبارەی ڕاگرتنی تێکستەوە ئەوەندە پوخت نییە . لە لاپەڕەی یەکەمی نوسراوە : « فدای روح » و ، لە لاپەڕەی دوەمیشیدا پارچە شیعرێکی تورکێ و ئەم بەیتە کوردیە :

شیعری نالی وەکو شەکر ، من هەروەکو طوطیی ئەوم
بێ شەکر مومکین نییە طوطی بیبێتن بەر حەیات

و ئەم بەیتە فارسییە پێشکەش‌کراوە بە نالی :

الا ای پیر شیرین دم تو هستی مفخر اکراد
چو خواندم نظم رنگینت فرستادم به تو اوراد

دەستنۆسەکە لە دوایشیەوە هەندێ بەیت و پارچە شیعری تورکی و فارسی و عەرەبیی تیایە . ئەم دەستنۆسە ئێستا لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری کورددایە .

★ نوسخەکەی عب هەرچەند وەك وتمان ڕیزی ئەلف و بێی لە ڕێکخستنی پارچە شیعرەکانا زۆر سەرنج نەداوە ، بەڵام تا بڵێی نوسخەیەکی جوان و خەت خۆشە و تەمەنی لە تەمەنی نوسخەکەی ت‌دایە . وەك لە دواییەکەیەوە نۆسراوە لە ٢٦ی ڕەبیعولئەووەلی ١٣١٠ی . ك (١٨٩٢ — ١٨٩٣ی.ز )دا نۆسراوەتەوە . نۆسەرەکەی ناوی مەلا عەبدوللای گەلالییە . دیارە کەسێکی خوێندەوار بووە . لە سەرەتای دیوانەکەوە نۆسیویە : « كليات رئيس الشعراء مولانا ملا خضر نالی رحمه الله » . لە داوێنەکەشیەوە پێنج خشتەکیی **وەفایی** لەسەر پارچە شیعری **گوڵبنی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە** و ، پێنج خشتەکیی **سالمی** لەسەر پارچە شیعری **هەرچەندە کە عومری خضر و جامی جەمت بۆ** و ، پێنج خشتەکیی **فایقی** لەسەر پارچە شیعری **ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بۆمن** و لەسەر پارچە شیعری **نەفەسی بگرە لە هاتوچۆیی خۆڕایی هەتا ماوی** نۆسیوەتەوە . ئەم دەستنۆسە هیی کتێبخانەی کاك عەبدوڕڕەحمانی مزوورییە و بەهۆی کاك جەمال موحەممەدەوە دەسگیرمان بۆ .

★ نوسخەکەی اح نوسخەیەکی جوانە بە خەتێکی خۆشی فارسی و بە یەك دەست نۆسراوەتەوە لە ١٣١٧ی . ك (١٨٩٩—١٩٠٠ی . ز)دا . نۆسەری ئەم نوسخەیە **ئەحمەد** ناوێکە بۆ برادەرێکی خۆیی نۆسیوەتەوە کە ناوی **مەلا عەبدوڕڕەحمانی چۆڕی** بووە . تێکڕا نیوەکانی دوابەیتی پارچە شیعرەکانی لە دوو دێڕا سەر و خوار نۆسیوەتەوە . سەر و بۆر و پەراوێزی پێوە نییە . لە چوار شوێندا کە پارچە شیعرەکان ناژناویان تیا نییە ، شوێنی دێڕێکی بە سپیەتی بەجێهێشتووە ، وەك بڵێی وا لە خوێندەوار بگەیەنێ کە بەیتێك سەری تیا چووە . ئەم نوسخەیەشمان هەر بەهۆی کاك جەمال موحەممەدەوە دەسگیر بۆ .

★ نوسخەکەی کە ناومان ناوە **من** و داومانەتە پاڵ **مامۆستا نەجمەددین مەلا** ، لەڕاستیدا ئەبوو ناومان بنایە **مج** چونکە دەستنۆسی **مەلا جەلالی مەلا ئەحمەدە** و ، لەسەر نۆسینی کاك جەمال موحەممەد لە سەرەتاوە بە هیی مامۆستا نەجمەددین مەلامان دانا و کە بە هەڵەی خۆمان و کاك جەمالمان زانی مەیدانی ڕاستکردنەوەی هەڵەکە لەدەست دەرچوبۆ . مەلا جەلال گەلێ پەراوێز و سەر و بۆر و دەسکاریی بۆ کردووە . لە زۆر شتدا لە نوسخەی کم ئەچێ . هەروەها لە نوسخەی عبیش ئەچێ . لەوە ئەچێ

نوسەر لەبەر ئەو دوانە نوسیویتیەوە . ساڵی نوسینەوەی پێوە نییە . ئەم نوسخەیەشمان هەر لە رێگای کاك جەمال موحەممەدەوە دەس کەوت .

★ نوسخەکەی «ط» نوسخەیەکی زۆر جوانە ، هەرچەند مایەی داخە کەوا لاپەڕە (٥) و (٦) و ، (١٠) و (١١)ی نەماوە . لە یەکەم لاپەڕەیدا نوسراوە : « از افکار ابکار و درر غرر جناب نالی ، والی ملك معانی و مقالی رحمەالله الباری‌است » . واتە ئەمە هەندێکە لە بیرە بە بیری کەسا نەهاتووەکان و مرواریە ڕۆنەکانی جەنابی نالیی فەرمانداری وڵاتی مەعنا و وشە ، ڕەحمەتی‌خوای لێ بێ . دوو سێ کەسی خەت خۆش لە نوسینەوەیدا بەشدار بوون ، بەڵام کەسیان ناوی خۆی نەنوسیوە . یەکێکیان لە داوێنی دیوانەکەوە بەر لە تەواوبوونی ( لیپی هێ ) بە هەشت پارچە ، نوسیویە : « عجالة حسب الفرمایش جناب ملا عبدالحمید ترقیم پذیرفت . آه از دست حرارت سلیمانی » . واتە : بەپەلە لەسەر فەرمودەی جەنابی مەلا عەبدولحەمید نوسرایەوە . ئاخ لەدەس گەرمای سلێمانی . ئەمەیان لەوانیان زیاتر بایەخی بە کارەکەی داوە . تێکڕای کتێبەکە پڕیەتی لە سەر و بۆر و (نوسخە) و تاك و تەرایش مەعنای هەندێ وشەی لێدراوەتەوە . نوسەرەکان جار جار دوو جۆر سەر و بۆریان داناوە ، واتە بە هەردوو جۆرەکە ئەگونجێ . لە پایانی کتێبەکەشدا نوسراوە : « در هجدهم شهر صفر المظفر مطابق هزار و سیصد و بیست و یکم هجری این چند غزل نالی علیه الرحمة از دست فقیر و چند کسان دیگر قلمی پذیرفت . والسلام علی تابع الحق ١٣٢١ » واتە : ئەم چەند غەزەلەی نالی ڕەحمەتی خوای لێبێ ، لە هەژدەی مانگی سەفەری ڕێکەوتی هەزار و سیصەد و بیست و یەکدا ( ١٩٠٣ ــ ١٩٠٤ی . ز ) بە دەستی منی هەژار و چەند کەسێکی‌تر نوسرایەوە . سڵاوی خوا لەوەی شوێنی ڕاستی بکەوێ ١٣٢١ . تێکڕا ئەم نوسخەیە ئەوەمان پیشان‌ئەدا کەسانێکی زیرەك و خوێندەوار نوسیویانەتەوە . ئەم نوسخەیە ئیستا لە کتێبخانەی بەڕێز شێخ موحەممەدی خالدایە و ، ئەو دایە لامان .

★ نوسخەکەی «خب» ساڵی نوسینەوە و ناوی نوسەری پێوە نییە ، بەڵام دیارە زۆریش کۆن نییە . لە هەندێ شوێنا سەر و بۆری بۆ کراوە . پەراوێزی بەسەرەوە نییە . خەتەکەی خۆشە . ئەم نوسخەیەش ئیستا لە کتێبخانەی بەڕێز شێخ موحەممەدی خالدایە و ئەو دایە لامان .

★ کەشکۆلەکەش کە شێخ موحەممەد عەلی قەرەداغی فرۆشتبوی بە کۆڕ و بە نیشانەی کش ئیشارەتمان بۆ کردووە ، تەنها پارچە شیعرەکەی لەمەڕ مەستورەی تیابو .

★ ★ ★

# ئاخۆ دەستنووسێکی ( دیوانی نالی ) هەیە به خەتی ( نالی ) خۆی ؟

وەختێ خۆی کاک موحەممەد موستەفا هۆشەنگ کە لە ئاژانسی دەنگوباسی عێراق کار ئەکا ، بەراوردێکی نوسخە چاپەکەی (کم) و نوسخەیەکی دەستنوسی بۆ ناردبووین کە ، وەك ئەڵێ ، زۆر لە مەلا یەحیای کوڕی مامۆستا مەلا موحەممەدی چروستانیی وەرگرتبوو و ، نووسیبووی : « ئەم تەصحیحات و زیادیانەم لە دیوانێکی دەسخەتی مەلا خضری نالی وەرگرت کە ئەو دیوانە هیی مەلای چررستانی بوو ، بەهۆی مەلا یەحیای کوڕیەوە خواستم و سوودم لێ وەرگرت ( لە ) ۱۹٤۱ ( ی )مدا لە سولەیمانی » .

زۆری پێنەچوو ، وەك لە پێشەکییەکەدا وتمان ، دەستنووسێکی تەواوی دیوانی نالیمان لە رێگای کاك ئەحمەدی چروستانییەوە دەسکەوت بۆ مامۆستا مەلا موحەممەدی چروستانیی باوکی نووسیبوویەوە . ئەو نوسخەیە ، چەند پەڕە بەراوردەکەی کاك هۆشەنگی لەبیر بردینەوە و من خۆم کە بەراوردی نوسخەکانم ئەکرد ئەوەم بە بیردا نەهاتبوو کە مەبەستی کاك هۆشەنگ لە « دیوانێکی دەسخەتی مەلا خضری نالی» ئەوەیە دیوانەکە بە خەتی نالی خۆی نووسراوەتەوە و، ئیددیعایەکی‌واش لێکۆڵینەوە و کەوتنە پەیجۆرێکی باشی ئەوێ . .

تا لەمدوایییەدا کە ئەم دیوانە خرابوە ژێر چاپ و موحەممەدی برام پێش چاپ پیا ئەچوەوە ، لەبارەی بابەتێکی سەر بە نالییەوە تەلەفۆن بۆ کاك هۆشەنگ ئەکا . هۆشەنگ پێی‌ئەڵێ کەوا بەراوردەکەی لەسەر دەستنووسێکی نالی خۆی ، ئامادەکردووە . کە موحەممەد ئەوەی بۆ گێڕامەوە ، هەستم بەو هەڵەیە کرد کە تێی‌کەوتبووم و بەراوردەکەی هۆشەنگم لەیاد چووبوو . لەچاپدانی دیوانەکە لە دوادوایدا بوو ، بۆیە مەیدانی ئەوە نەبوو کەڵکێکی ئەوتۆ لە بەراوردەکە وەربگیرێ . لەگەڵ‌ئەوەش کەوتینە بەراورد کردنی لەگەڵ دەستنووسەکەی چروستانی خۆی . بۆمان دەرکەوت ئەو دەستنووسەی کاك هۆشەنگ دیویە ، ئەوەندەی کە خۆی دەس‌نیشانی کردبێ ، لە ۱۲۲ شوێندا جیاوازیی لەگەڵ چاپەکەی (کم) هەیە و ،

لە ٥) شوێنیشدا جیاوازیی لەگەڵ نوسخە دەستنوسەکەی چروستانی هەیە ، جیاوازیی تریشی لەگەڵ هەردوکیان هەیە کە ئەو نیشانەی بۆ نەکردوون . بەڵام زوربەی ئەو جیاوازیانەی کە کاك هۆشەنگ ئەڵێ تێکستی ئەو دەستنوسەن ، چروستانی بە (نوسخە) لە دەستنوسەکەی خۆیدا نوسیونیەتەوە و ، ئەگەر بەراوردی دەستنوسەکەی ، کاك هۆشەنگ وائەزانێ ، نالی و دەستنوسەکەی چروستانی بکەین ، بۆمان دەرئەکەوێ ئەوەی چروستانی زۆر بەجێتر و لەبارترە و لەتوانین لە دەرفەتێکی داهاتودا بەراوردی هەردو تێکستەکە بخەینە بەرچاوی ڕەخنەگرانی ئەدەب . بەنیازی وردبونەوەیەکی زیاتر لە مەسەلەکە چومە لای کاك هۆشەنگ و نوسخەکەی چروستانییشم لەگەڵ خۆم برد ، بەتایبەتی کە ئەم نوسخەیەش وەختی خۆی کەوتبوە دەستی کاك هۆشەنگ و دیارە لەوکاتەدا چاپەکەی (کم)یشی لابورە چونکە وەك کلیشەکەی ئەو چاپە لە پشتەکەی نوسیوە « دیوانی نالی » و لەجیاتیی (یمنی)ی نوسەری کلیشەکە نوسیویە (هۆشەنگ) و ئەمەشی لێ نوسیوە : « مەحافی کردن وە ڕێکخستنی ئەم دیوانە جوانەم بە یادگار بۆ برای هاوخوێن و هاودین و هاوزمانم کرد لە تەئریخی ١٩٣٩/٦/٦دا بە یاریدەدانی یەزدانی خاوێن لە شاری سلێمانی . م . هۆشەنگ » . ئەمویست دیسانەوە مەسەلەکە لە کاك هۆشەنگ بپرسمەوە بزانم ئەڵێ چی ! دیتم کاك هۆشەنگ هەر سورە لەسەر ئەوە کەوا وەختی خۆی دەستنوسێکی دیوانی نالیی بە خەتی نالی خۆی لە مەلا یەحیای کوڕی ماموستا مەلا موحەممەدی چروستانی وەرگرتووە و ، ئەو دەستنوسە کتێبێکی تەوارە بچوك بووە و ، لەدوای هەر پێتێکەوە چەند لاپەڕەیەکی بە سپیەتی هێڵرابوەوە و ، لە زۆر لاوە لای گۆشەی سەرەوە بەتایبەتی کە غەزەلی تازە دەستی پێ بکردایە مۆرێکی نالیی پێوەبو ، مۆرەکەش مۆرێکی هێلکەیی بو ، لێی نوسرابو « ملا خضر نالی » و ، لەپاڵ ئەو نوسخەیەدا کتێبێکی ( آلام ڤرلر )ی گۆلەش هەبو نالی کردبوی بە عەرەبی ...

بەرابەر بەم قسانەی هۆشەنگ و بەو هەمو جیاوازیەی لەنێوان دەستنوسەکەی چروستانی و ئەو دەستنوسەدا هەیە کە هۆشەنگ دیویەتی و ئەڵێ خەتی نالی خۆی بو ، ئەبێ بڵێین هۆشەنگ نوسخەیەکی تری دیوە ؛ بەڵام بێگومانیشین لەوە کە ئەو نوسخەیە نەك تەنها دەستنوسی نالی نەبوە ، بەڵکو نوسخەیەکی باشیش نەبوە . بەڵگەشمان ئەمانەن :

١ ـ وەك وتمان بە بەراوردی ئەو دەستنوسە و دەستنوسەکەی چروستانیدا دەرئەکەوێ کەوا لەمەی چروستانی گەلێ وردتر و پوختتر و ڕاستترە .

٢ ـ هۆشەنگ ئەڵێ لەو دەستنوسەدا لەسەر پارچە شیعری ماتەم وەکو زولفەینی سیەهـ گرتی سەراپات نوسرابو : « مرثیه حضرت نالی برای پدر

حبیبە » . واتە : لاواندنەوەی حەزرەتی نالی بۆ یارکی حەبیبە . بەڵام چۆن نالی بە خۆی ئەڵێ : « حضرت نالی » ؟

٣ ـ هۆشەنگ ئەڵێ : لە دەستنوسەکەدا لەنێوان بەیتی ٦٨و ٦٦٩دا فاصیلەیەك ئەوەندەی سەطرێك بە سپێتی بەجێهێڵرابو ، واتە جێگەی بەیتێکیتر بو . ئەگەر نوسەری ئەو دەستنوسە نالی بێ ، ئەبێ ئەو جێگایەی بۆچی بە سپێتی بەجێهێشتبێ ؟ بشێ خۆی شیعری خۆی بۆ نەخوێنرابێتەوە !

٤ ـ هۆشەنگ ئەڵێ : لە غەزەلی ئەمەردم من لەگەر ئەمجارە بێ تۆدا لەدوایدا بەیتێك نوسرابو . بەیتەکە ئەمەیە :

ئەگەرچێ خۆم بە تەن دوورم لە لای تۆ
خوا لەیزانێ ڕۆحم وا لە لای تۆ ..

ئەنجا ئەڵێ : دیارە کە (ئەم بەیتە) سەرەتای پارچە شیعرێکە و دەست نەکەوتووە .. جارێ با گوێ نەدەینە ئەوە کە ئەم بەیتە بێتامە ، لە بازاڕی هیچ ڕەخنەگرێکدا بە هیی نالی دانانرێ .. بەڵام چۆن ئەشێ نالی خۆی شیعری خۆی دەس نەکەوتبێ !

٥ ـ ئەگەر نوسخەیوا دەستنوسی نالی لای چروستانێ بوبێ ، بۆچی بە هیچ جۆرێ لە دەستنوسەکەی خۆیدا پەنجەی بۆ ڕاناکێشێ و نوسخەکانی لەسەر ڕاست ناکاتەوە و ، ئەو هەمو جیاوازیی نوسخانە ئەنوسێتەوە ؟

٦ ـ ئەگەر ڕاست بێ نالی ( آلام فرتر )ی گوتەی وەرگێڕابێتە سەر عەرەبێ ، دیارە ئەبێ لە تورکییەوە وەری گێڕابێ .. بەڵام کوێڕا نالی ئەو تورکییە فێر بۆ بتوانێ یەکێك لە شاکارەکانی ئەدەبی ئەڵمانیی لێوە بکا بە عەرەبێ و ، ئەبێ چەند کتێبی ئەدەبی نوێی خوێندبێتەوە ، تا بگاتە ئەوە کتێبێکیوا هەڵبژێرێ بۆ وەرگێڕان .. ئەمە لە حاڵێکا کە ئەم کتێبە لەو سەردەمەدا کرابێتیش بە تورکی !

بەڕای ئێمە ئەگەر کتێبیوا لەپاڵ ئەو دەستنوسەدا بوبێ ئەبێ کەسێك نوسیبێتیەوە و ، یەکێکیتر لەبەر نەزانێ دابێتیە پاڵ نالی .

٧ ـ مەسەلەی مۆرەکەش شتێکی سەیر نییە . دوور نییە نالی مۆرێکی بوبێ و کەوتبێتە لای کەسێك و هەر لەبەرئەوە کە دەستنوسەکە شیعری نالی بووە ، مۆرەکەی نالییشیان پیا نابێ ، مادەم کاك هۆشەنگ نالی نالی لە داوێنی دیوانەکەوە نوسیبوی کەوا خۆی نوسیویەتەوە .

٨ ـ کاك مەلا یەحیای کوڕی چروستانی خۆیشی بۆی دوپات کردینەوە کەوا نوسخەیوایان هەرگیز نەبوە .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ سوپاسێکی زۆری کاک هوشەنگ بکەین کە هەر لە سەرەتاوە پیاوانە هات بەدەم بانگەوازمانەوە و ئەو بەراوردانەی بۆ ناردین و ، ئەبێ ئەوەش بڵێین کەوا لە بەراوردەکانیا ، لە پارچە شیعری **گوڵبنی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووەدا** بەیتێك هەبوو ، ئەو بەیتە لە (عم) و (گم)یشدا هەبوو ، بەڵام ئێمە بە هیی نالیمان نەزانی ، بۆیە لە پەراوێزا نوسیمانەوە . دەرکەوت هەمان بەیت لە پێنج‌خشتەکییەکی ( وەفایی )یشدا بەسەر ئەو پارچە شیعرەوە هەبوو ، لە داوێنی نوسخەی (عب)دا نوسرابووەوە ، هەرچەند (عب) بۆخۆی لە دیوانەکەی نالیدا نەینوسیبووەوە . ئێمە لەکاتی خۆیدا پێمان‌نەزانی کەوا لەناو بەراوردەکانی کاک هوشەنگیشدا هەیە ، ئەگینا هەر لەگەڵ خستنە پەراوێزەکەیدا باسی ئەوەشمان ئەکرد . هەروەها لە پارچە شیعری **وەرە ساقی ! بە شین و نەدب و واوەی**یشدا دوو بەیت لەو بەراوردەدا هەبوو ، یەکێکیان لەپاش بەیتی یەکەم و ئەویان لەپاش بەیتی دووهەمەوە . ئەو دوو بەیتەشمان لە شوێنی خۆیاندا لە پەراوێزا نوسیبەوە .

**فاتح عبدالکریم**

# پاشەکی

بەر لە هەرچی ئەبێ خوێندەواری خۆشەویست لەوە ئاگادار بکەین کەوا ئەم کتێبە لە دۆخێکی ڕاست و ڕەواندا نەخراوەتە ژێر چاپ . وەك کاکم لە سەرەتاکەیدا باسی کرد ، ئەو جارێك بە کارەکەی باوکمدا ڕۆیشتووەتەوە و تێکستی شیعرەکانی کە لەبەر نوسخە چاپەکاندا نوسرابونەوە ، لەگەڵ نوسخەکانی چر و چن بەراورد کردووە و ، پاشانیش جارێکی‌تر لەگەڵ نوسخەکانی ت و ك و دیوانەوە عز و تو و مزی بەراورد کردووە . کە بڕیاری لەچاپدانیش درا و من کاری سەربەرشتیی چاپ و ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپم گرتە ئەستۆ ، دیم پێویستمان بە چاو پیا گێڕانەوە و پیاچونەوەیەکی‌تریشە . بەم‌پێیە منیش پارچە پارچە بە شیعرەکان و نوسینەکەی کاکم و باوکمدا ئەچومەوە و ، دیارە لە ماوەی ئەم کارەدا گەلێ بابەتی‌تر ئەهاتە ئاراوە و بیر و ڕای نوێ پەیدا ئەبو و ، لەگەڵ کاکم و باوکم و بەتایبەتی لەگەڵ کاکم ئەکەوتینەوە لێکدانەوە و زۆر جار وائەبو لەسەر تاقە بەیتێك ماوەیەك پەکمان ئەکەوت ، تا ڕامان بەجۆرێ یەکی ئەگرت . ئەم کارە هەرچەند مەینەت و ئەرکێکی گران بو بو هەمومان ، بەڵام لەگەڵ‌ئەوەشدا کارێکی ئێجگار بەسود بو ، بۆیە مەینەتی حەوت هەشت مانگی ئاڵوگۆڕ کردنی بیر و ڕا ونوسینەوە و دارشتنەوەی سەرلەنوێی لێکدانەوەکە ، بەش بەحاڵی باوکیشم و کاکیشم و خۆیشم مایەیەکی ڕاستەقینەی بەختەوەریی ژیانە ...

هەر لە ماوەی ئەم‌کارەدا ئەرکێکی نوێ کەوتە ئەستۆی کاکم . دەس‌کەوتنی ئەو سێ دەستوسەی کاك جەمال موحەممەد بۆی ناردین و پاشانیش ئەو دو دەستوسەی مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ بۆی ناردین ، کاکمی ناچار کرد بەراوردی ئەم نوسخانەش لەگەڵ تێکڕای دەستوسەکان بگرێتە ئەستۆ و ، ئەبێ بڵێم ئەگەر ناتەواوییەکیش لەم بەراوردەدا هەبێ ، نابێ ئەوە بشارێتەوە کە خوێندنەوە و ڕاستکردنەوەی ئەو پێنج دەستوسە کارێکی ئاسان نەبو بۆ کاکم ، بەڵام بە باشی لە هەقی هات .

لە سەرەتاکەدا وتراوە کەوا جیاوازییە زۆرلێ چووەکانی تێکستەکان لە پەراوێزدا نوسراونەتەوە و ، ئەوەی سۆر زانرابێ هەڵەبە خراوەتە لاوە . لێرەدا پێویستە ڕوونی بکەینەوە کەوا کام تێکست لە هەموان بە ڕاستتر و لەبارتر و لەگەڵ شوێن و ، چەشنی نالی و قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی ، بە گونجاوتر دانرابێ خراوەتە بڕبڕەی شیعرەکانەوە . تێکرایش تێکستێوا لای چڕ و چڕ و طا و ظ و عب و لویە . باقیی جیاوازییەکانیش مەگەر سۆر زانرابێ هەڵەن، ئەگینا لە پەراوێزدا نوسراونەتەوە. گەلێ جار جیاوازییواشمان نوسیوەتەوە کە دڵنیا نەبووین لە ڕاستی و ناڕاستیی ، هەر لەبەرئەوە نوسیومانەتەوە کە مەعناکەیمان بۆ ڕاست نەکراوەتەوە . بەڵکو گەلێ جار جیاوازییوایشمان نوسیوەتەوە کە لامان وابوە هەڵەیە ، بەڵام هەر لەبەرئەوە کە لە نوسخەیەکی وەک چڕ یا چنددا وا نوسراوە ، پشت گوێمان نەخستووە . ئەبێ ئەوەش بڵێین کەوا تێکڕا ئەمە لە نیوەی دووەمی کتێبەکەدا دیارترە .

وەک ئاشکرایە نوسخە دەستنوسەکان مەگەر سەر و ژێریان بۆ وشە کردبێ، ئەگینا بەپێی ڕێنوسی فارسی نوسراونەتەوە و وائەبێ وشەیەک دەستێدا بە چەند جۆر بخوێنرێتەوە . ئێمە پشت بە زانینی کوردی و فارسی و شارەزایی لە ئەدەبی کلاسیکی کورد بە زاراوە و مەعنا و فۆرمیەوە و ، شارەزایی لەو بابەتانەی ئەم ئەدەبە لێیان ئەدوێ و ، هونەری وشەلارایی و جیناس و تەورییە و خوێندنەوەی شکستەی فارسی ، توانیومانە تێکستەکان بخوێنینەوە و بڕیار بدەین کام خوێندنەوەی گونجاو مەبەستە و کامیتریش هەر لەوانەیە مەبەست بێ و کام خوێندنەوە مەبەست نییە . هەر بەم پێیەش نوسخە جیاوازەکانمان هێناوەتە سەر ڕێنوسی نوێ ، ئەگینا خۆ دیارە ڕێنوسی تێکستەکان هەمووی ڕێنوسی کۆنی فارسییە . ئەو ئیپانەی ئێستا ئێمە لەجیاتیی جوڵە ( حرکە )بەکاریان ئەهێنین و ، لەو نیشانانەی ( ڕ ) و ( ڵ )ی قەڵەویان پێ لە ئاواز و ، (ۆ) و (ێ)ی بۆشیان پێ لە هیی کورت و درێژ جوێ ئەکەینەوە ، ئەوسا نەبوون . تەنانەت باو نەبوە (و)ی معطف و (ی)ی ئیضافەش بنوسن و زۆر جار (گ)یشیان بە (ک) نوسیوە . ئێمە هەموو ئەمانەمان بەپێی ئەو ڕێ و شوێنە ساغکردووەتەوە کە ئێستا باومان لێ کرد. خۆ ئەگەر کەسێکیش لای وابێ خراپی بۆچووین ، ئەتوانێ تێکستەکە بگێڕێتەوە بۆ سەر ڕێنوسی کۆن و خۆی سەرلەنوێ هەوڵی ڕاستکردنەوەی بدا و دووریش نییە ڕێی لە شتێکی نوێ و وردتر بکەوێ .

سەرەڕای نەبوونی ڕێنوسێکی تایبەتیی کوردی کە بووە بە هۆی ئەوە تێکستی کوردی بەپێی ڕێنوسی فارسی بنوسرێتەوە و ، ئەوەش بووە بە هۆی

ئەوە زۆرکەس وشەیەك نەزانن و بە هەڵە بیخوێننەوە و بینووسنەوە ، هۆیەکی‌تری گرنگی پەیدابوونی ئەم هەموو نوسخە جیاوازانە و نەتوانینی ڕاستکردنەوەی قەسیدەکی کلاسیکی کوردی بەشێوەیەکی بێ‌گومان و تەواو ، ئەوەیە تێکڕا ئەدەبی کورد لای خوێندەواری کورد واتە لای مەلا و فەقێ بایەخی نەبوە و ، ئەوانەی خۆیان بەم ئەدەبەوە خەریك‌کردووە زیاتر کۆلکە مەلا و فەقێی ناسەرکەوتوو بوون . بۆیە ئەگەر مەلایەکی باش و فەقێیەکی زیرەکیش خۆی دابێتە ئەدەبی کورد ، تێکستی نیوە و ناتەواو و پڕ لە هەڵەی دەسگیر بووە و نەیتوانیوە ئەو مەبەستەی هەبەلی بەتەواوی بەجێی‌بێنێ . کۆلکە خوێندەواریی ئەوانەی بەرهەمی ئەدەبییان نووسیوەتەوە ، بووە بە هۆی ئەوە وشەیەکیان لێ بگۆڕێ بە وشەیەکی‌تر و ئیپێك بە ئیپێکی‌تر و ، ئیستاش ئێمە کە کەرەستەی بە هەڵە نوسراوە ڕاست ئەکەینەوە ، گەلێ جار لەم ڕێگەوە بۆی ئەڕۆین و هەرچی وشەی نزیك لە وشە نەخوێنراوەکە و ، هەرچی ئیپی نزیك لە ئیپەکانەوە هەبێ ، خۆیان لەکەینەوە و ڕێگا ڕێ‌لێ‌چووەکانی بەهەڵەداچوون ئەهێنینە بەرچاومان و ، بە بەراورد لەگەڵ مەعنای گونجاودا ئەگەڕێین بەدوای ڕاستیدا و ، گەلێ‌جاریش دەرئەکەوێ بەم‌پێیە ئەگونجێ ئەو وشەیە بە چەند جۆری ڕاست بخوێنرێتەوە . دیسانەوە لەناو ئەوانەشدا بەدوای جوانتر و گونجاوتریاندا ئەگەڕێین .

سەیرە لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆش‌بەختانە گەلێك لەوانەی ئەم دەستنوسانەی بەردەستی ئێمەیان نوسیوەتەوە مەلای باش بوون و نیشانەی ئەوە بە دەستنوسەکانیانەوە دیارە کە نالییان باش زانیوە و هەوڵیان‌داوە بە باشی بۆ خوێندەواری ڕوون بکەنەوە ، تێکڕا لە بابەلی‌وادا کەوتونەتە هەڵەوە کە پێوەندی بە زانستی ئیسلام یا زمانی عەرەب یا زمانی کوردەوە هەبە و نەئەبوو نەیزانن ، بۆنموونە وشەی (تەرەح — ل ١٦٦) کە وشەیەکی عەرەبییە و واتە خەفەت ، لە هەموو نوسخەکاندا ، تەنانەت لە نوسخەی (گم)یشدا کە هەموو ئیپە عەرەبییەکان بە کوردی ئەنوسێتەوە ، بە (طەرەح) نوسراوە ، وەك بڵێی زمانی عەرەبی ئیپی (ت)ی تیا نەبێ و ، وشەی (حەظیرە — ل ٤٣٢) کە وشەیەکی عەرەبییە لە تێکڕای نوسخەکانی بەردەستمانا نوسراوە ( خەطیرە ) و ، وشەی (موتوربە — ل ٥٤٦) کە وشەیەکی کوردییە تاقە نوسخەیەك بە ڕاستی نوسیوە و ، وشەی (شەعائیر — ل ٦٣٦) کە زاراوەیەکی ئاینییە، لە هەموو نوسخەکاندا بە (شعار..) نوسراوە .

لە سەرانسەری ئەم دیوانی نالییەدا دوو پارچە شیعر لە دەستنوسەکانا هەیە

لەسەریان نوسراین بەبۆنەی چییەوە دانراون* ، کە لاواندنەوەکەی سلێمان پاشا و قەصیدەکەی (مەستورە)ن و ، ئەویتری هەمو ئەبێ بە لێکدانەوە و بە ورد بونەوە لە مەعنای پارچە شیعرەکاندا شتێکیان لێ بزانین . نەبونی بەکێتیی بابەتیش لە شیعری کۆندا زیاتر ئەم کارە ئالۆز ئەکا . نەزانینی بۆنەی دانانی پارچە شیعرێك ئەوەندەیتر کۆسپ دێنێتە رێی ساغکردنەوەی مەعناکەی . ئەمەش کە مەعنای شیعری کلاسیکی کوردێ پێوەندی بە هەمو سەرێکی کولتوری ئیسلامەوە هەبە و ، مەلای کوردیش تا لێکدانەوەی کتێبێکی قەواعیدی عەرەبێ و مەنطیق و کەلامی یۆنانێ و شیعری ( امریء القیس ) و (حافظی شیرازێ) و شیعری نایێن و سۆفێکەرێ لەئارادا بوبێ خۆیان بە (خانێ) و (جزیرێ) و (نالێ) و (مەولەوی)بەوە خەریك نەکردوە ، ئەوەندەیتر ئەرکی ساغکردنەوەی شیعری نالێ و هاوچەشنی نالیی قورستر کردووە .

ڕاستە ئەبێ هەمیشە هەولێ ئەوەمان بێ کارمان پوخت و ڕێك‌وپێك بێ ، بەلام ئەبێ ئەوەش بزانین لەبەر گەلێ هۆیوا کە لە سنوری دەسەلاتی بنیادەم بەدەرن ، مرۆ بێ‌ناتەواویش نابێ . دیارە ئەم کارەی ئێمەش لەم قانونە بەدەر نییە .

وا جارێ پێشەکی ئێمە هەندێ ناتەواویی کارەکەی خۆمان ئەخەینە پێش چاو . بە دلیش چاوەڕوانی ڕەخنەی خوێنەوارانین بۆئەوەی هەم ئێمەش لە کاریتری لەمەوپاشماندا کەلك لەو ڕەخنانە وەربگرین و ، هەم کەسیتریش نەکەوێتە ئەو هەلانەی ئێمەوە .

● لەبۆ لەچاپدانی سەرەتاکە بکەوتایەتە پاش لێبونەوە لە چاپکردنی کتێبەکە خۆی بۆئەوەی پوختتر و وردتر بێ . هەر بۆیەش دور نییە خوێندەوار جاروبار هەست بە وردە ناکۆکییەك لەنێوان هەندێ ڕای ناو سەرەتاکە و ناو کتێبەکەدا بکا . دیارە لە حالێکا کە ناکۆکیی‌وا هەبێ پشت بە ڕای ناو کتێبەکە ئەبەسترێ .

● لە ماوەی لێکدانەوەی شیعرەکاندا گەلێ بابەتی ــ وابزانین ــ بەبایەخمان دیارێ و دەس‌نیشان کردووە کە تائیستا کەس ئیشارەتی بۆ نەکردون . ئەگەر

---

* بەلێ لە هەندێ نوسخەدا چەند حالەتێکی ئیشارەتکردن بۆ هۆی دانانی چەند پارچە شیعرێك هەیە وەك لە پەراوێزەکاندا ڕونمان کردووەتەوە ، بەلام یا هەلەن یا مەعنایەکی ئەوتۆ نابەخشن و ڕوناکییەکی‌وا نادەن بەدەستەوە .

سەرەتای کتێبەکەمان پاش لەچاپدانی دیوان و لێکدانەوەکە بخستایەتە ژێر چاپ ، ئەو بابەتانەمان نەخستە سەرەتاکەوە . بەڵام مادەم سەرەتاکە هەر لە سەرەتادا چاپکرا ، هیچ نەبێ ئەبوو ئەو بابەتانەمان بە لیپی زەش لەچاپ بدایە ، تا بەئاسانی بدۆزرێنەوە .

● ئەبوو هەر لە سەرەتاوە ڕوونمان بکردایەتەوە کەوا بەگوێرەی ڕێنووسی ئێستای کوردی وشە لەیەك جووت کوردییەکان بە سەنگ و تەرازووی جیناسی عەرەبی ناکێشرێن ، چونکە لە کوردیدا لیپ جێگەی جووڵەی عەرەبی ئەگرێتەوە. بۆیەش ، دوور نییە لە هەندێ شوێندا لە دیاری کردنی جۆری جیناسدا کەوتبینە هەڵەوە .

● وەك چۆن نووسیومانە فلانە بەیت لە فلانە نوسخەدا نییە ، ئەبوو بشمانوتایە فلانە پارچە شیعر لە فلانە نوسخەدا هەیە و ، لە فلانە نوسخەدا نییە ، هەرچەند ئەشتوانرێ ئەمە بە بەراوردکردنی نوسخەکانا بزانرێ .

● ئەبوو جیاوازیی نوسخەکانمان لە پەراوێزێکی‌ترا لە داوێنی لاپەڕەوە بنووسیایەتەوە ، تا ئەوکەسەی مەبەستی تەنها زانینی مەعنای بەیتەکانە ، کاتی خۆی بە تەماشاکردنی جیاوازیی تێکستەوە نەبالەسەر .

● ئەبوو جیاوازییەکانمان بە ڕێنووسی کۆنیش دەس‌نیشان بکردایە ، لەگەڵ دەس‌نیشان کردنیاندا بە ڕێنووسی نوێ .

● ئەبوو ناوی ئەو نوسخانەمان بنووسیایە کە تێکستی شیعرەکان ، وەك ئێمە نووسیومانەتەوە ، لەو نوسخانەدا بەوجۆرەن . ئێستا هەر ئەوەندە ئەتوانین بڵێین تێکستی شیعرەکان لە هەر بەیت و وشەیەکدا وەڵا تێکستی ئەو نوسخانەیە کە ناویان بەجۆرێکی‌تر نەهاتووە لە پەراوێزا .
● نەئەبوو ئەوەندە زۆر بایەخ بە هەندێ جیاوازی بدەین کە لەڕاستیدا جیاوازی نین و سروشتی ڕێنووسی کۆن وایە ، وەڵا نەبوونی واوی عەطف یا یێی ئیضافە بەدوای هەندێ وشەوە .

● نەئەبوو ئەوەندە بایەخ بە هونەرەکانی وشەئارایی و جیناس بدەین و لەبریتیی ئەوە ئەبوو خۆمان بە لێکدانەوەی ئیستیعارە و تەشبیە و مەجازەکانەوە زیاتر خەریك بکردایە .
● ئەبوو نوسخەی (من)مان ، لە حاڵی پێویستیدا نەبێ ، نەکردایە بە بشتێ ، چونکە جیاوازییەکی ئەوتۆی لە نوسخەی (کم) نییە .

محمدی مەلاکریم

# ئاگاداری و ڕوونکردنەوە

★ لەگەڵ شاعیری ناسک کاک حەمە عەلی مەدهۆشدا باسی شیعری نالیمان ئەکرد . ڕاستییەکی گەلێ سادەی لێ گەیاندم کە بەداخەوە ئێمە کەسمان بۆی چوبووین و نە ـ من بزانم ـ کەسی تریش ختوویەتیە سەر کاغەز . ئەوەش ئەوەیە وشەی (مالیاوا) لە شیعری :

جەننەتی وەك جێنان کردم بە ماوا
( حەبیبە )ی ( مالیاوا ) ، مالی ئاوا

دا (ل ــ ١٢٢) ، ناوی دێیەك نییە (حەبیبە)ی یاری (نالی) لەوێ ژیابێ . مەبەست لە (مالیاوا) ، (مالی ئاوەدا)یە ، واتە : حەبیبەیەك کە لە ماڵێکی وەك دڵی منا ئەژێ ، یاخوا هەمیشە مالی ئاوا بێ کە دڵەکەی منە و ، هەرگیز دڵم لە خۆشەویستیی ئەو چۆڵ و خالی نەبێ و کوێر نەبێتەوە . م

★ دوو وشەی (بۆ ڕیا) لە بەیتی :

ڕیشەکەی پان و درێژە ، بۆ ڕیا خزمەت ئەکا
ظاهیرە هەرکەس بە طوڵ و عەرضی ڕیشیا ڕیا

دا (ل ــ ١٢٨) ، ئەشکونجێ (بۆریا) بێ . (بۆریا) ئەو قامیشە باریکەیە لەیکەن بە چیغ . واتە : سۆفێ کە ڕیش ئەهێڵێتەوە و پەروەردەی ئەکا ، ڕیشەکەی بۆ ئەوە باشە بیکەن بە چیغ . . .

★ وشەی (چەقیبوو) لە بەیتی :

هێند مونتەظیری تۆ بو هەتا چاوی سپی بۆ
نەرگس ، کە لەسەر یەك قەدەم و دیدە چەقیبوو

دا (ل ــ ٣٧٧) ، ئەشکونجێ بە (چەقی بوو) بخوێنرێتەوە ، واتە دۆخی چەقینی هەبوو .

★ هەندێ وشە وەك (طەلیسم) و (تەلیسم) و (طیلەسم) و ، (عەشق) و (عیشق) و ، (طاق) و (تاق) و شتیوا ، وانەبێ بە شێوەی جیا جیا نوسراون . ڕێبازی ئێمە تێکڕا ئەوە بووە وشەی لە عەرەبییەوە هاتوو و بە عەرەبییەتی ماو ، بە لیپەکانی خۆیان بنوسینەوە .

★ وانەبێ شێوەی نوسینەوەی وشەیەك لە دوو نوسخەدا جیایە ، بەڵام هەردولا لەوەدا کەوا وشەکە فلانە وشەیە ـ هاودەنگن . ئێمە بە پێویستمان نەزانیوە نیشانەت بۆ دۆخیوا بکەین .

★ لەبەر بێکاتی نەمانتوانی بەراوردێکی نوسخەکانی (مب) و (اح) و (من) و ، (خا) و (خب) لەگەڵ ئەو پارچە شیعرانە بکەین کە پێش دەسکەوتنی ئەو پێنج نوسخەیە لەچاپ درابوون .

★ بەهۆی شوێنپێکەوتنی (هەڵەی باو)ەوە ئێمەش وشەی (هەزار)ی بەمەعنا (بولبول)مان لەم دیوانەدا بە (هوزار) نوسیوەتەوە . بەڵکو لە گەلێ لادا هەندێ لە نوسخەکانیش (بۆر)یان بۆ (هێ)کە کردووە .. بەهۆی ئەم هەڵەیەوە گەلێ جار باسی جیناسی موحەڕڕەفمان لەنێوان (هەزار)ی بەمەعنا ژمارە و (هوزار)ی بەمەعنا بولبولدا کردووە . لێرەدا ئەمانەوێ بڵێین کەوا هەر باسێکی لەم چەشنە هەڵەیە و ، مەسەلەکە لەو حالەتانەدا کە وشەی (هەزار) بۆ دوو مەعنا دەسریدا ، لە تەوریە و لەطافەت بەولاوە نییە . ئەوەندەی ئێمە شوێنی ئەم هەڵەیەمان دۆزیبێتەوە ، لەم لاپەڕانەدا هەیە : ( ٤٥ ، ٤٨ ، ١٤٤ ، ١٦٨ ، ٥٢٩ ، ٦٦١ ، ٦٦٤ ) .

★ بە هەڵە پارچە شیعری :

خاڵی نییە ژمشماری دو زولفت لە بەلایێ
حەلقەی شەڕیان بەستووە هەریێکە لە لایێ

کە پارچەی هەژدەهەمە (ل ـ ٧٠٤) کەوتووەتە پێش پارچەی نۆزدەهەم و بیستەمەوە و ، ئەبۆ ئەم پارچەی بیستەم بووایە .

# پێڕستی پارچە شیعرەکانی دیوانی نـالی

| ژمارە | نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك | لاپـەڕە |
|---|---|---|

**تیپی ئەلف**

| ژماره | نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |



### ئیپی بێ



### ئیپی تێ



### ئیپی ثێ



### ئیپی چیم



### ئیپی حێ



### ئیپی دال

ژماره نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك لاپـەڕە

| ژماره | نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك | لاپەڕە |
|---|---|---|



## لیپی کاف



## لیپی میم



## لیپی نوون

| ژماره | نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك | لاپــەڕە |
|---|---|---|



## لیپی واو



## لیپی هـێ

| ژماره | نیوەی یەکەمی یەکەم دێڕی هەر پارچە شیعرێك | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |

## پیتی یێ

## پرژ و بڵاو

# ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی چاپ

| هەڵەکان | لاپەڕە | دێڕ | ڕاستکردنەوەکەیان |
|---|---|---|---|
| نەبور | ٦ | ١ | نەبوو |
| ١٣١٢ ی | ١٢ | ٢١ | ١٣١٠ ی |
| هەمو | ١٣ | ٢٣ | زوربەی |
| گولخەنی | ١٩ | ٥ | کولخەنی |
| گولخەنی | ١٩ | ٧ | کولخەنی |
| گولخەنی | ١٩ | ٩ | کولخەنی |
| لەشکرەکەشیی | ٣٩ | ١٢ | لەشکرکەشیی |
| بیە | ٤٤ | ٢٣ | نەما |
| باث | ٤٥ | ٣ | باس |
| نالە | ٤٥ | ٢٢ | نالە |
| تەکللوم | ٤٨ | ٩ | تەکەللوم |
| باث | ٥٢ | ١٣ | باس |
| باث | ٥٢ | ١٤ | باس |
| مایەی | ٦٨ | ١٥ | بەمایەی |
| لیپی | ٧٥ | ٢ | پیتی |
| گەورەیی | ٧٥ | ١٧ | گەورەیی |
| لەرزی | ٨٣ | ٥ | لەرزێ |
| لەرزی | ٨٣ | ٢٥ | لەرزێ |
| قوت | ١٠٢ | ٦ | قوت |
| خوڕدا | ١٠٩ | ٢٤ | خۆردا |
| بەلام.. تاد دێڕی پاشەوەی | ١١١ | ٢٢ و ٢٣ | — |
| هەبون | ١١١ | ٢٤ | هەبە |
| بۆنخۆشییەکەی | ١١٢ | ٧ | بۆنخۆشییەکەی |
| بەلام.. تاد دێڕی پاشەوەی | ١١٢ | ١٣ و ١٤ | — |

| هەڵەکان | لاپەڕە | دێڕ | ڕاستکردنەوەکەیان |
|---|---|---|---|
| نوسرابۆ | ١١٣ | ٢٣ | نوسراوە |
| بـوك | ١١٧ | ٢٩ | بـوك |
| کـور | ١٦٠ | ٨ | کوڕ |
| کـوڕ | ١٦٢ | ٨ | کوڕ |
| ١٣١٦ ی | ١٧٠ | ١٢ | ١٣١٠ ی |
| ١٨٩٨ – ١٨٩٩ ی | ١٧٠ | ١٣ | ١٨٩٢ – ١٨٩٣ ی |
| جوڕە | ١٧٠ | ٢٢ | جۆرە |
| شێوەسۆر | ١٧٨ | ١٤ | شـیوەسـۆر |
| داخو | ١٨٨ | ٣ | داخـۆ |
| لەهی | ٢٠٠ | ٢٠ | لیهی |
| غەیبەوە | ٢٠١ | ٧ | غەیبەوە |
| پێنج | ٢٠٥ | ٦ | شەش |
| ٤ | ٢١٧ | ٣ | ٥ |
| ٤ | ٢١٧ | ٣١ | ٥ |
| ٥ | ٢١٩ | ١ | ٦ |
| ٦ | ٢١٩ | ٤ | ٧ |
| ٥ | ٢١٩ | ١١ | ٦ |
| ٦ | ٢١٩ | ٢٦ | ٧ |
| شیعرەکانی | ٢٣٠ | ١٠ | شیعرەکانیان |
| ڕێی لێ چێ | ٣٠٣ | ٢٨ | ڕێی لێ ئەچێ |
| ئەبەر | ٣٠٧ | ١٨ | ئەبەر . |
| تەڵەسی | ٣٤٣ | ٢٨ | لەڵەسی |
| جەمجا . | ٣٧٤ | ٢٦ | جەمجـا : |
| بەستۆن | ٤٤٤ | ٨ | ئەبەستۆن |
| ئـاهی : | ٤٤٧ | ٦ | ئـاهی |
| شەهـەوارەیی | ٤٤٧ | ١٧ | شەهـەوارەیی . |
| کف' | ٤٥٠ | ٥ | کف' |
| بژانکە : | ٤٦٤ | ٢٥ | بژانکە |
| («بەراوێز»)ی | ٤٦٩ | ١٥ | («بەراوێزی» |
| بچکۆلەبە | ٤٩٤ | ١٧ | بچکۆلەیە |
| حەی : | ٤٩٧ | ٢٦ | حـەی |
| موعجیزە : | ٥٠٩ | ٣ | موعجیزە . |
| شێرانە | ٥١١ | ٢٥ | شێرانە . |

| هەڵـەكان | لاپـەڕە | دێڕ | ڕاستكردنەوەكەیان |
| --- | --- | --- | --- |
| نێـدا | ٥١٥ | ٢ | تێدا |
| لێلاوو .. | ٥٢١ | ١٤ | لێلاو و . |
| لەراستـبشـدا | ٥٤٨ | ٢٧ | لەڕاسـتیـشـدا |
| بـی | ٥٩٧ | ٢ | بـێ |
| بەمجۆرەیە . | ٦٦٠ | ٣٢ | بەمجۆرەیە : |
| (هێمنی) | ٦٦٦ | ٢٩ | ( ئەیمەنێ ) |
| ( « پەراوێزی » خا ) و (عم) و (كم) و (گم)ە . | ٦٨٦ | ١٩ | (عم) و (كم) و (گم) و («پەراوێزی» خا)یە . |

A PUBLICATION OF THE KURDISH ACADEMY

---

# THE COLLECTION OF NALI'S POETRY

## (( MALA KHDR AHMAD SHAWAYS MIKAILI ))

COLLATED AND EXPLAINED
BY
MALA ABDULKAREEM MUDARRIS
&
FATIH ABDULKAREEM

REVISED BY
MUHAMMAD I MALA KAREEM
ASSOCIATE MEMBER OF THE KURDISH ACADEMY

---

Kurdish Academy Press
BAGHDAD
1976